# شەرەفنامە

## مێژووی ماڵەمیرانی کوردستان

میرشەرەفخانی بدلیسی

وەرگێڕانی

مامۆستا هەژار

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس



خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین
سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب

**ناسنامە**

ناوی کتێب: شەرەفنامە
نووسەر: میرشەرەفخانی بدلیسی
وەرگێڕ: مامۆستا هەژار
نوویسیار: ماجد مەردۆخ ڕۆحانی
بڵاوکراوەی: ئاراس- ژمارە: ٤١٠
پیتچنین و ڕازاندنەوە: ئاری عەبدی
هەڵەگری: ئەفشین بەهاریزەر، ئاراز عەبدی
ڕووبەرگ: حەمیدڕەزا زەڕی
نووسینی ڕووبەرگ: سەعید غەفووری
سەرپەرشتی چاپ: شوان ماجد
چاپی سێهەم: ٢٠٠٦
ناونیشان: گەڕەکی خانزاد، هەولێر، کوردستان

# ناوەرۆك

| سەردێڕ | لاپەڕە |
| --- | --- |

## شەرەفنامە ١



**ڕووپەڕی یەکەم:**

**فەرمانڕەوایانی دینەوەر و شارەزوور (٥ بەند)**



**ڕووپەڕی دووەم: (٥ بەند)**

## ڕووپەڕی سێهەم: (۳ بەش ، ۲۵ بەند)

### بەشی یەکەم: (۹ بەند)

## ڕووپەڕی چوارەم: (٤ بڕ)



## کۆتایی

# دەسپێك

ئەم کتێبە سێهەم چاپی وەرگێڕاوەی مێژووی لە مێژینەی کوردان (*شەرەفنامە*) بە قەڵەمی سەنگین و ڕەنگینی مامۆستا هەژارە؛ کە بە شێوازێکی تازە و بەم چەندە ئاڵوگۆڕەوە، پێشکەشی خوێنەران دەکرێ:

١- خاڵبەندی[1]: ڕاستە لە ماوەی ئەم دە- دوازدە ساڵەدا، چاپەمەنی بە زمانی کوردی شوکور زۆر گەشەی کردووە و پەرەی ساندووە؛ بەڵام بە داخەوە هێشتا لە باری خاڵبەندییەوە، کتێب و نووسراوەی کوردی زۆر لاوازە. بە دەگمەن کتێبێکی وا دەستت بگرێ لەم بارەوە کارێکی لە سەر کرابێ و بۆ باشتر و زووتر تێگەیشتنی خوێنەر، حەولێکی دەگەڵ درابێ.

تاقمێك لە خاڵ (.) بەو لاوە، هیچ نیشانەیەك دانانێن؛ بەم بۆنەوەیە دەبینین بڕێ جاران تاقە ڕستەیەك دوو- سێ مانا هەڵدەگرێ و جاروبارەش مانای مەبەست بە هیچ جۆرێ خۆ نانوێنێ و بە تەواوی سەر لە خوێنەر دەشێوێنێ.

دەستەیەکیش بە ئیشتیا و بە بێ یاسا بۆی دادەنێن! دەی جا وەرە و خوێنەری هەژار سەر دەرکە چی نووسراوە و واتە و مەبەست لە کام شوێن حەشاردراوە؟

تۆ بڵێی ئەم کتێبە بایەخدارەش بەم بۆنەوە بێ تا ئەوڕۆکە - وەکوو شیاوە- نەناسراوە؟

لەم چاپەدا کتێبەکەمان لەسەرڕا پیت چنیوە و بە شێوەیەکی جەموجۆرتر و جوانتر دەرمانهانیوە.

بۆ خاڵبەندیش تا ئەو ڕادە پێم کراوە و لێم زانیوە، نیشانەکانی { . و ، و ؛ و : و ... و - و - - و « » و ( ) و [ ] و ! و ؟ و / و ⇆ }م لە جێگای خۆیان داناوە؛ بەو هیوایە خوێنەری هێژا، ساناتر بڕواتە سەر مانای ورد و زمانی ڕازاوە و وێژەی تایبەتی وەرگێڕاوەکە و باقی بەرهەمەکانی ئەم کتێبەوە.

---

٢- شەرەفخان لە ساڵی ١٠٠٥ی کۆچی مانگیدا مێژووەکەی دوایی هێناوە. کەوابوو دیارە لە

---

١- ئەم وشە بەرامبەری «نقطه گذاری» فارسی و « الترقیم» عەرەبی و «Punctuation» ئینگلیسی داندراوە.

بەشی ئەمیرانی ئەردەڵانی، تا سەرەتای سەردەمی هەڵۆخانی ئەمر باس دەکا و ئیتر بەولاوەتر ناچێ.

مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی - لە پەراوێزی وەرگێڕاوە عەرەبییەکەی *شەرەفنامەی بدلیسی*دا- درێژەی بەم باسە داوە و بە کورتی تا بڕانەوەی ئەمارەتیانی هێناوە. مامۆستا هەژاریش هەر لە پەراوێزدا، ئەو بەشەی کردۆتە کوردی و داینـاوە.

دەوری بیست ساڵێك لەوە دوا، مامۆستا پێنج مێژووی تایبەتی بە بەرە و هۆزی ئەردەڵانی هانی و مێژووەکەی مەستوورە خانمی کردە بناغەی کارەکە و ئەوانی خوسرەویەگی ئەردەڵانی و سمایلی مەلا محەمەدو ئایەتوڵڵا مەردۆخ و مەلاشەریفی قازی و مەلا جەمیلی - یەك بە یەك- بەرامبەر کرد و هێنایە سەر زمانی کوردی و ئەوی وردەکاری بێ لێ دەکار کرد و کردیە کتێبێکی سەربەخۆ؛ بە ناوی: *مێژووی ئەردەڵان*.[۱]

ئاشکرایە ئێستاکە لە سەرینەی ئەم کتێبەدا، ئەو پەراوێزە لاوازە و جێگای پێشووی ناگرێتەوە. کەوا بوو لەم چاپەدا دەستمان لێ هەڵگرت.

۳- لە کۆتایی دوو چاپی پێشووی *شەرەفنامەی* بەکوردی -وەکوو پاشگر- «*فەرهەنگیلەی شەرەفنامە*» و دوو نامیلکەی: «*بە سەر چلی ژیننامەی هەژاری وەرگێڕ*» و «*لە شوێن چوونێك*» -کە لەمەڕ ناوچەی بارزان و ئەمر بارزانی نووسراوە- دانـدرابوو. ئەورۆ، کە کتێبخانەی کورد خاوەنی هەنبانە بۆرینە و چێشتی مجێور و دەیان کتێب و پەرتووکی تایبەت بەو پیاوە گەورەیە، ئەم سێ وتارە -وەك دیارە- چاوکەن لە چاوی ڕووبارێ و گەڕەکن لە حاندی شارێ. بەم بۆنەوە ئەو سێ بەشەشمان لەم چاپەدا نەهێنا.



لە بەرامبەر کردنەوە و پێداچوونەوەی ئەم وەرگێڕاوە دەگەڵ مێژووە فارسییەکەی شەرەفخانـدا، چەند خاڵێکم بەرچاو کەوت کە بە کورتی ئەمانەیە:

۱- سەردێڕەکان -بە تایبەت لە ڕووپەڕی سێهەم بەو لاوە- ئاڵۆزابوون و یەکیان نەدەگرتەوە. لە پێڕستەکەشدا ئەم ناتەباییە زەق دیار بوو. زیاد لەوە، لە چەند شوێنێك - تاك و تەرا- سووکە هەڵەی وەك ژمارەی منداڵان و ساڵەکان و جێگۆڕکێ کردنی شوێنی ڕووداوەکان، ڕوویان دابوو. لەم چاپەدا ئەوانە چوونەتەوە سەر دەقی خۆیان.

---

۱- *مێژووی ئەردەڵان* سێ جاران -لە هەولێر و لە تاران- لە چاپ دراوە.

٢- وەك دەزانین، مامۆستا هەژار قەت بڕوای بە وەرگێڕانی ڕستە بە ڕستە نەبووە و لە هەموو پاچقەکانیدا، بەرگی بێگەردی زمانی پاراوی خۆی، دەبەر مانا و مەبەستی وەرگێڕاوەکانی کردووە. جا دیارە لەم شێوە وەرگێڕانەدا، گرینگ کاکڵی مانایە و توێکڵ زۆر بایەخی نیە. لەم کارەشدا بەو بۆنەوە، بڕێ جاران وادیارە خەریکبێ لە ماکی فارسیەکە نەختێ دوورکەوێتەوە؛ بەڵام کە دەگاتە ئاکام، پوختەی مانا پڕ بە پڕی خۆی دێتەوە. جا کە وابوو، ئەگەر کەسێ ویستی ئەم پاچقە کوردیە دێڕ بە دێڕ و ڕستە بە ڕستە لەگەڵ فارسیەکەیدا بەرامبەردانێ، شوێن بۆ قامك لە سەر دانان فراوانە؛ بەڵام ئەگەر پوختەی مانامان مەبەست بێ، بێشك کارێکی بێقسەیە.

٣- میرشەرەفخان لە ئاخر و ئۆخری چەرخی دەیەمی کۆچیدا مێژووی *شەرەفنامەی* نووسیوە. ڕاستە دەورانی سەفەوی سەردەمی کزبوونی وێژە و زمان و فەرهەنگی فارسیە؛ بەڵام ئەو میرە زانایە بۆ خۆی نووسەرێکی توانا و وێژەوانێکی هەلکەوتە و کتێبەکەی باشترین وێنەی پەخشانی فارسی ئەو سەردەمانەیە. لەو لاشەوە، هەموو شاعیرانی گەورە و ناسراوی فارس، وەك: حافیز، سەعدی، مەولەوی، فیردەوسی، خاقانی، نیزامی و عەتتار و سەنایی، پێشتر لە چەرخی ئەو ژیاون و هەموو شیعر و بەرهەمێکیان لە کتێبخانەی شەرەفخان، شوێنی تایبەتی خۆی بووە. سەرانسەری *شەرەفنامە* بە شیعری بەرز و زۆر جوانی ئەو کەڵە شاعیرانە ڕازاوەتەوە. مامۆستا نەك خۆی لەم بەشە نەبواردووە و چاوی لە وەرگێڕانیان نەقووچاندووە، یەکبەیەکی ئەو شیعرانەی - هەر لە سەر کێشی خۆی - کردوونەتە کوردی و بەڕاستی یەکجار جوانیشی خولقاندوون.

بۆ وێنە لە باسی شەڕی میرسەیفەددینی سۆران و حوسێن بەگی کوردی داسنی — نۆکەری چاو لە دەستی سوڵتان سولەیمانخانی خوێنمژ - کە میری سۆران بە مەردی و نەبەردی، جار لە دووی جار دوژمنانی ڕادەماڵێ و نیشتمانی لە تورکان و بەردەستانیان دەسڕێتەوە، سوڵتانی بێفەڕ و قوشقی، ڕك و قینی دڵی پیسی، بەسەر حوسێن بەگی داماودا ئەڕژێنێ و فەرمان ئەدا بە هەزار ئەشکەنجە و ئازار، لەکۆڵ دنیای ئەکەنەوە. شەرەفخان بۆ ئەوە ئەم دەرسەمان لەبیر نەچێتەوە و نەبینە نۆکەری دوژمنی بێگانە و دڵخۆش بە خۆفرۆشی نەبین، ئەم سێ بەیتە فارسیەمان بۆ دێنێتەوە کە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| کسی کو با کسی بد ساز گردد | بدو روزی همان بد باز گردد |
| به چشم خویش دیدم بر گذرگاه | که زد بر جان موری مرغکی راه |
| هنوز از صید منقارش نپرداخت | که مرغی دیگر آمد کار او ساخت |

مامۆستا هەژار -کە قسەکەی زۆر بەدڵە و تەواو قسەی دڵی خۆیە- بەکوردی ئاوەهای دەخەملێنێتەوە:

| | |
|---|---|
| کەسێ هاوکاری زۆرداران بوو پیشەی | دەسی زۆردار بە بیور دای لە ریشەی |
| کە تاژی ڕاوی پێ نەکراو شەکەت بوو | لە لای ڕاوکەر لەژێر داردا سەکەت بوو |
| کەوێك هاوخوێنی خۆی بێنێتە سەر داو | نەدوورە خێوی، خۆی لێنێ بە شۆرباو |

زیاد لەمەش لە چەند شوێنان کە باری قسەکەی خۆش دیوە، خۆی شیعری - بۆ شادە - لێ زیاد کردووە. وەك لەوێ کە قسەی حەسەنبەگ ناوێکی گەورەی هۆزی عیتاق دەکا - کە پیاوێکی پارە زۆر و نانەخۆر بووە و بە چکووسی و پیسی ناوی ژیانی حێق کردووە- ئەم سێ بەیتەی بۆ داناوە:

کێ زۆر چنۆك و پیسە، بە ڕژدی بیبەزێنە
زێڕ باخنە قولینچکان، وەك مشکی سەر خەزێنە
ئەو ڕۆژی دەچیە بن گڵ، هەزار گرێ لە سەر دڵ
مشکان لە مێشکی وشکت بازباز و گەزگەزێنە
کۆت کردەوە بە بێهۆ، ویستت نەخۆی دە بیخۆ!
ئەو بازە سڵبەزێنە، ئەو گازە دڵتەزێنە

بە کورتی، ئەو *شەرەفنامە* میرشەرەفخان نووسیویەتی، مێژوویێکی یەکجار بەنرخی لە مێژینەیە؛ بە زمانێکی پوخت و پاراو. بەڵام ئەوی مامۆستا هەژار -با بڵەین- وەریگێڕاوە، پێش هەموو شتێ شاکارێکی زمان و وێژەوانیە؛ تژی لە وشە و ڕستەی ڕەسەن و جوانی کوردی.

بەو هیوایە کە ئەم کتێبە هێژایە باشتر لە پێشوو بناسرێ و زووتر جێگای یەکجار بەرز و تایبەتی خۆی لە کتێبخانەی کوردیدا بگرێتەوە، چاپی سێهەمی بە خوێنەرانی هێژا پێشکەش ئەکەین.

دوایین قسە، دروودی بێ بڕانەوەیە بۆ گیانی پاکی ئەو دوو زانا دڵسۆزەی گەلەکەمان: شەرەفخانی بدلیسی و مامۆستا هەژار.

**ماجد مەردۆخ ڕۆحانی**
سنە، خەرمانانی ١٣٨٤ (٢٠٠٥.ز)

# پێشەکی وەرگێڕ

## من و شەرەفنامە

منالێك بووم؛ تەمەنم لە چاردە بەهاری تێنەپەڕاندبوو؛ لە خوێندەواریشدا هێز و پێزێکی تەواوم نەستاندبوو؛ کە بۆ یەکەمجار -لە سەر دەلاقەی دیوەخانی قەرەنیاغای مامەش- کتێبێکم بەرچاو کەوت، بە درشتی لە پشتی نووسرابوو: *شەرەفنامە*. چەند پەڕێکم لێ هەڵدایەوە و ئەودیو ئەمدیوم کرد، هەر ئەوەندەی تێگەیشتم کە تاریخە و ئیتر چیترم بۆ نەبرایەوە سەر یەك.

ساڵ هاتن و ساڵ چوون. دەماودەم لەو و لەمم دەبیستەوە کە شەرەفخان لە سەر فلان ڕووداو ئاوای فەرمووە و *شەرەفنامە* وای باسی فیسارەکەسی کردووە. تازە زانیم ئەو *شەرەفنامە*ی کە من هیچم لێ نەزانیبوو، مێژووی کورد و کوردستانە و کوردێکی گەلپەروەر و خاوەن هونەر بە فارسی نووسیویە و وەریش گەڕاوەتەوە سەر زۆر زمانان و دوو جاریش لە لایەن دوو کوردی زانا و دڵسۆزەوە کراوە بە عارەبی. واتا ئەو مێژووە هێژایەی کوردە، هەر بە زوانی کوردی نەوێ، بە هەموو زمانێك دەست دەکەوێ!

# گێژی گێژاو

هەڕەمە و جەنگەی بەهاری ساڵی هەزار و نۆسەد و شێست و نۆ -کە نزیکەی نۆ ساڵ بە سەر شۆڕشـە مەزن و پیـرۆزەکەی کوردستاندا لە عیـراق ڕادەبرد و پاڵەوانی نەتەوەی کورد و ڕۆڵەی هەرە دڵـسۆزی کوردستان (مەلا مستەفای بارزانی) سەرکردایەتی دەکرد و پـێتی بـە پـیتی دوژمـن‌سـووتێنی نـەیار ڕەتێنی، ڕۆژ بە ڕۆژ و کات بەکات لە هەڵکشان و تیشك داندا بوو- منی هەژاریش بۆ یەکەمـجار لـە ژیانـمدا، بەختم هێنابووی و دەژێر سێبەری باڵی ئەو قارەمانە پیێ و قەدەم پیـرۆزە خزابووم و لە ڕیزی پێشمەرگەی کوردستاندا ڕێگە درابـووم و بـەو ڕێگەدانـە سـەرفراز کرابـووم و بـە پێـی وزە و توانـای هەژارانەی خۆم، لە ڕێگەی ئێزگەی شۆڕش و چاپەمەنیەکانی خەباتی کوردستانەوە، دەستەچیلەی خـۆم وەبەر دەدا و دەستەوارەی هەژارانەم دەخستە سەر ئەو بڵێسە بە ودمە و بە دەست و داوێـن باوەشـێنم دەکرد.

ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی مانگی بانەمەڕدا، لە جەنگە و گەرمەی جەنگ و شەڕدا، لـە لانزارێکـەوە، لە بەر پەسارێکەوە، لە لێڕەوارێکەوە، پاڵم دابوو بە کۆتەدارێکەوە و لە ئاقارێکـەوە لـە دیـمەنی پـڕ مێرگ و چیمەنی نەخشیـن و ڕەنگیـنی کوردستانی خەمگینم دەڕوانی؛ چی ببینم؟

شینکەی دەشت و دەر و گژ و گیای کەژ و چیا، لە بەرێك و شـینە دووکـەڵی بۆمبـای ناپـاڵمی دوژمنانی کوردستان لە سەرێکەوە، لە هەر دەرێکەوە لێك هاڵابوون. هـاڵاوی سووتـمانی بۆمبـارانی بەدکاران، لە هەر سات و کاتێکدا هەزاران و هەزاران پەلك و لاسکی شلك و ناسـکی تـورت و خـاوی چنوور و بەڕەزا و مەندێ و بێزا و هەڵاڵە و بەیبوون و خاوی بە دیـمەن لاو و بە بۆن و بەرامـە خۆشـی هەڵدەپرووزاند. چروچاوی ساوا و تازە لە خـەم ڕەخـساو و ژن و پیـاو و کیـژ و لاوی شـۆخ و شـەنگی کوردی هەڵدەکرووزاند. کۆڵیت و کۆختەی وەرزێران و جووتێران، بە وێران کراوی و کەس تێدا نەماوی و مووچە و کێڵگەی کێڵدراو و داچێنراوی برسی و رووت و هەژاران، بە تێکدراوی و لێکـدراوی و لانـەی هەڵوەشاوی مەل و باڵداران -لە بن بنچك و لە سەر داران- بە شپرێوی و شێواوی، دەگـەڵ پـۆل پـۆلی لۆرك و خەشخاش و مێلاقە و سوێسنی گۆل گۆل داوەستاوی ڕاوەستاو لە باپەناو بـاگردا، بـەدەم گـڕی ئاگری کوردستان داگرەوە -لە دوورەوە- هـەروا سـوور دەچـوونەوە و بـەرەو تـوونی نـەمان و نـەبوون

سەرنـخوون دەبوونەوە.

لەو دیـمەنە بە سامانە، بە دەم ڕامان و دامانەوە وا تاسا بووم، بە گێژ و وڕی وەنەوزم دەدا و لە خەفەتان خەونووچـکە دەبیـــردمەوە؛ بـەڵام هـەر زۆر زوو تـینی ئـاگری بـێ ئامـان و نالـە و زالـەی لەشبەزامانی کورد و گرمەی بۆمبا و زرمەی گوللەی داگیـرکەرانی کوردستان، وشیاریان دەکردمـەوە و خاوی و خەویان لە بیـر دەبردمەوە و دەرگای هەراوی خەیاڵاتـم بەڕوودا دەکرایەوەو هەر ئەوەندەم بۆ دەمایەوە لە بەر خۆمەوە پیش بـخۆمەوە و پێسیـر دادڕم و چاوی کز و سـیس و فرمێـسکاویم بـەرەو عاسـمانی پڕ لە فڕۆکە و دووکەڵاوی هەڵبـڕم و بە قوڵپی گریانەوە لە ژێر لێوانەوە بە وتەیەکی هەناسە ساردانەوە بڵێم: خوایا دەبەر بەشت مرم؛ تاکەی هەڵی دەگری؟ ئێمە بۆچـی دەبـێ هـەروا چـارەڕەش و کلۆڵ بیـن و خۆشیەك بۆ کورد لە ئارادا نەبێ و کوردستانی نیشتمانـمان هەر پێخوستی بێگانە بـێ و بۆ خۆشـمان -کە خاوەن ماڵیـن و گەلێکی تەمەن شەش هەزار ساڵیـن- لە ژێر چـەکمەی زۆردارانـدا بناڵیـن و ئاوا ژیانتاڵ بیـن و ئاوارەی چیا و چۆڵ و شـیو و دۆڵ و شـکێر و ئەشـکەوت و بـن بـەرد و نزاران بیـن و دوچاری ژان و ئێش و کوڵ و کەسەر و دەرد و ئازاران بیـن و هێمان پێمان ڕەوا نەبیـــنن و بیانی بێ بەزەیی بیانوومان پێ بگرن و خانوومان پێ دەست لـێ هـەڵگرن و بـە بـن بـەرد و شـاخ و هەردان بساچێنن؟ کەچی بیانەوێ لە وەندیشمان بکەن و لەوەندەشـمان دەرپـەڕێنن و ئـەو تـۆزە دار و دەوەنەشـمان لە چنگ دەرێنن!

## بەرەو نەماو

هەروا بە دەم ورده خەیاڵات و نزامەوە بـەرەو ڕۆژگـاری کـەونارا و لـە مێژینـەم گەڕامـەوە و ڕوو بـە بناوانی ماڵەباوانی پاڵەوانانی ئەم کوردستانە پێدا چووم و پێ هەڵاچوومەوە، تا تووشی هەوارگەی چۆڵ و کۆنە ئاورگی بێ تیـن و پڕ لە خۆڵەمێشی بادینان هاتـم و لەگەڵ کوڕەکوڕەی کوڕماژانـدا ڕوویـەڕوو بوومەوە و بە تاسەوە ماچ و مووچێکمان کرد و پێکەوە سەرێکمان لە کاولگەی بارەگـای ئەردەشـێری شوانکارە دا و بە لارەملی کڕنۆشێکمان برد.

لەو گەڕان و سووڕانەوەدا تووشم هات بە تووشی دەبدەبە و شکۆی کەیانەکانەوە. گـەلێك خـاوەن

تەخت و بەختی وەك کاوس و کاقوباد و کاخوسرەوم هاتنە بەر چاو، کە تانـجی خونکاری لە سەر سەر و لە سەر تەختی سەروەری، بە دڵنیایی پاڵیان بە پاڵپشتی گەوهەربەنـدەوە دابـوو. لـە بـەر بارەگـای ئەوانەدا ڕوستەمی کوردی مازندەرانی بۆ برەو پێدانی زەند و پازەند و ئەوێستا -وەك چیای ئـەلبورز- هەڵوێستابوو؛ مەچەك و زەندی هەڵکراوی و چاکی مەردانەی بەلادا کـراوی، زراوی پـۆڵای ئاودراویـان دەبرد و دڵی بەردیان دەکردە ئاو. کەللەی دێوی سەربزێوی بە لاتیلاگی سەریەوە نابوو، گیو و گـۆدەرز و بیژەن و برزو، دەوریان لێ دابوو. بە نیازی ئـازادی بەخـشی، بیـوە نەخـشی سـەر پـشتی ڕەخـشی بەناوبانگ و بانگی لە دوژمنانی نیشتمانی دەکرد: ئەگەر مەردن خۆ دەرخەن با خوێنتان بـخۆمەوە.

بارامی چوبینەی سەرکردەم بە سەر کردەوە؛ کەللەی لە کەللەی خوسرەو پەروێزی سواری شەودێز دەدا و دەیـخستە ناو هەمێزی سەرداری ڕۆمەوە.

تەیسەفوونی ساسانیم بە ئاوەدانی هاتە بەر چـاو و هێنـدێك چـاوم پێـدا گێـڕا و لـەوێڕا بـەر و بوخچەی نیوەخاڵیم لە کۆڵی خەیاڵم شەتەك دا و دیسان بەرەو پێشووم پێ هەڵـچوومەوە و ڕوویـەڕووی هەگبەتانی پاتەختی کوردەکانی ماد بوومەوە و لەوێوە لە تەك لاوانی کوردی پاڵـەوان و تیـرئەنداز و نێزەباز و چاپك سوار و بەکاردا، لەڕێوە چوینە سەر نەینەوا و تەواو کەوتـمە ناو تەپ و تۆزی هـەرا و کێشەی دوو هۆزی گەورەی ماد و بانیپاڵەوە و لە پاڵەوە دنەی کوڕە کوردانـم دەدا: کوڕیـنە! نەکـەن بیدۆڕێنن.

من کە لەو خەیاڵاتەمدا تەمی خەمم لێ ڕەویبوو، لە خۆشـی ئـەو ڕابـردووە پـڕ لـە شـانازییە، هەموو کوڵ و کەسەرم لە بیـر چووبوونەوە؛ لەپڕ و نەکاوێك کوڵنگی گیانی فەرهادی کـەڵوڕ -زۆر بـە تاو و گوڕ- لە چیای بێستوونەوە دەنگی دایەوە و گوێچکەی دڵی خەیاڵاویـمی پێ زرینگایەوە. گرمژن و خرمژنی بەردی بەردەستی فەرهادی مەرد ڕاپیەڕاندم و تێگەیاندم کە: خەیاڵ پلاو دادێـك نـادا؛ نـان ئەو نانە ئەمڕۆ لە خوانە. بەرەو خۆتی ئێستا بگەڕێوە بزانە چیت بەسـەر هـاتووە و ئێستا بـەرت بـە کوێوەیە؟

# ڕاستی ڕووداو

ڕاست بە سەر شۆپی ڕاستی ڕووداودا، بەرەو دوا گەڕامەوە. لووزەوی هەوەڵیـن دەستەسوارانی داگیرکەرانی کوردستان، ئۆغریان لێ بریمەوە و بەرپەرچیان دامەوە. زۆر بە سەرسامیەوە دەمڕوانی کە چۆن بە برووسکەی شیریان و بارانی تیریان، سووڵاوی خوێنی گەشمان لە لەشمان هەڵنیشت و بە سێڵاوی زۆرداری و گزیکاری، بزیسك و ترووسکەی مان و ژیانی ئەم کوردە بێ زیانە -وەك پەنگر و پیتی کوانووەکەی- هەتاهەتایە کوژایەوە و تازە ببـڕای ببـڕای نەگەشایەوە! دەستە دەستە کیژە کوردی گەردن زەردی ڕووسوور و مەستەچاوم بە بەرچاودا تێپەڕیـن کە لە پاش کوژرانی برا و باویان، ڕاویان کردبوون و گرابوون و بەدیل برابوون؛ زنجیر لە مل کراو و بە زنجیرە تێك خراو، لە شار و بازاڕاندا بە دەست کڕیار و فرۆشیارانەوە دەستاودەستیان دەکرد.

هەر تەژەیەکی ملهوڕ و مەندەبۆر و خاوەن زێڕ و زۆر بوایە، کیژۆڵەی کوردی چاوشین و قژزێڕینی هەڵبژاردەی بە دیاردە هەڵدێنا و بۆ خۆی دەبردن.

بە بارستایی چیا بەرزەکانمان جەندەکی لاوانی خوێنگەرمی کوردی سەربەرز و ئازا بوو کە بە تاوانی ئەوینی سەربەستی و لە سەر هەستی نیشتمانپەرستی، پەل پەل کرابوون و وەسەر یەك نرابوون و لە گیشە درابوون.

هەر لە بناوانی دەجلە و فوراتەوە تا تێکدانەوەی دواوانەکەی حاتم. هەمووی بەرۆندك و ئەسرینی گەش و ئاڵی بێوەژنی بابان وێران و بێماڵ و حاڵی پیاوانەماوی زگسووتاوی کوڕکوژراوی کیژفرۆشراو، ڕەنگابوون و سوور هەڵگەڕابوون. هەر پەلکە گوڵاڵەیەکی تورت و ئاڵی ئەو هەموو لاپاڵ و نواڵانە، بەڵگەی کاڵ و منداڵانی کوردی لە خوێندا گەوزیوی خۆشی لە ژیان نەدیو بوون.

چەند سوڵتان و شاهەنشای ئێران و تووران بە فیزەوە خۆیان لە بەر چاوم ڕانا، کە لە خۆڵی لەشی و خوێنی گەشی کورەکوردان خشتیان پێژاوە و داموودەزگای زۆرداری و بەدکاری خۆیان پێ داناوە. کوردیان بە کورد بە کوشت داوە و ئەوی لە بەر مردن بە بەرماو ماوە، بە بێ سڵ کردن دەمیان تێناوە و توونیایەتیان بە خوێنمان شکاوە و ورگیان بە گۆشت و پێشەمان هەڵمساوە.

نوقمی بیری ئەو بیرە پڕ لە ناسۆرانە بووم و ژیانی پڕ ژانی ڕابردووم و لێکدانەوە و بەراوەردی

بەرپیوار و نادیاری ڕۆژگاری داهاتووم لێ ببوونە تارمایی و وەك شریتێکی سینەمایی، بە بەر لێلایی چاوی تەڕ و سوورمدا ڕادەبرد و هەنیسك و هەناسەی بە تەوژم و پڕ لە تاسە، ملیان بە ملی یەکەوە نابوو؛ بەربینگیان لێ گرتبووم و پەلپیان پێ گرتبووم و بۆ سەرکەوتن و دەرکەوتن ملەیان دەکرد و لەز و پەلەیان بوو.

## کوڵ و زووخاو

بیر لەو ڕابردووە پڕکوێرەوەریە و کوێندەبەریە، زۆر بەدەرد و ژان بوو. خوێن بە فیڕۆ چوون و تۆڵە نەستاندنەوەش زۆر لە سەر دڵ گران بوو؛ بەڵام ناسۆری هەرەگەورە و جەرگبڕ، بێ سەر و شوێن چوونەکەمان بوو. هەیاران! چەند داخێکی گەرم و داغە، لەو هەموو ڕۆژگارە پڕ لە ئازارەدا کە کوردی زۆرلێکراوی تێدا ژیاوە و بە شوێن ئەو هەموو پەت پەتێنەدا کە بە سەریان هێناوە، نووسەرێکی وامان لێ پەیدا نەبووە کە دەماری کوردایەتی ببزوێ و تەزوێکی کوردە ناموسی بە لەشدا بێ و لە سەر بەسەرهاتی ئەو گەلە کلۆڵەی خۆی شتێك بخاتە سەر کاغەز و لە مەڕ باب و باپیرە لێقەوماوەکانیەوە کەمێك بنووسێ و دەمێك بدوێ. هەبووە و نەبووە، تەنیا و تەنیا شەرەفخانێك لە دەور و زەمانێکا هەڵکەوتووە و وێکەوتووە و لێرە و لەوێ چی لە نووسراوی دوژمن و بێگانان چاو پێکەوتووە و چی -بە پەرژ و بڵاوی- لە پیرەپیاوی سەردەمی خۆی و لە چیرۆکوانی دیوەخانی بیستووە، تێکی خستوون و ڕێکی خستوون و بە پێی توانا و بەش بە حاڵی خۆی هیچ دریغی نەکردووە. با نیوە و نیوەچڵیش بووبێ، بناخە و هیمێکی توندی دڵپەسندی بۆ داڕژتووین و کەلەپوورێکی باش و لەباری لەو بارەوە بۆ بە جێ هێشتووین. بەڵام هەزار حەیف و مخابن! ئەوەی ئەویش پێی ڕەوا دیوین و بۆی نووسیوین، بە زمانێکە کە هاوزمانەکانی تێناگەن. بریا بە کوردی بوایە! خۆزیا کوردیش تێی بگەیشتایە! کاشکی وابوایە! چەند خۆش دەبوو ئەگەر ئاوا نەبوایە!

## چپەی دنەدان

کەچی لە پڕ هەستم کرد وەك پەری هومێدەواری بـمدوێنێ و بە گوێما بسرکێنێ کە: بەسیەتی! ئـاخ و داخ و خۆزیا و بریا ماڵی کەسی ئاوەدان نەکردۆتەوە. پیاوی پیاو دەبێ بە هەوای شاقەلی کەوای خـۆی تێکەوێ و لە ڕێی پێك هێنانی ئاوات و نیاز و ئارەزوویدا، هەرگیز تەسـرەوێ و بـە دڵ پتـەوی چـاکی مەردانەی بکا بە لادا و بە زەبری مەچەك و باهۆی لـێ بـڕان، ملـی دێوەڵووکـەی ناهومێـدی بـادا و گێژەڵووکەی دەستەوستانی و بێ دەرەتانی لە بەرخۆ ڕادا و کۆسپ و لەمپەر و بەرگر و بەرهەڵستان لـە سەر ڕێگە لادا. *شەرەفنامە* ئەگەر بە فارسی نووسراوە و دەسـتی کـوردانی پـێ ناگـا و خـزم و هـۆزە هەژارەکەتی تێناگا، تۆ کە فارسی و کوردی بە ئەندازەی خۆت دەزانـی و دەتـوانی -بـە پێـی توانـا- کارێك بکەی و بۆ ئەو دەردە چارێك بدۆزیەوە، هەستە و کەمەری کۆشـش و مانـدوو بـوون ببەسـتە و هەتا ماوی و لە بەر چاوی و ماوەت هەیە، دەست بەکار بە و خۆت لەو خەمەشت ڕزگار کە و بیکە بە کوردی. با ئەگەر مردی لە بیـر بیـریش بچیەوە؛ با ئەو کارەی کە دەیکەی -لە مەڕ مێژووەوە- کەس بـە هیـچی نـەگرێ؛ بـا لـە لای نووسـەرانی دوارۆژی کـوردەوە نرخێکـی پـێ نـەدرێ؛ بـا پـەیوین و نووسینەکانت کاڵ و کرچیش بن؛ با توێڵ و هێڵی دێڕ و پیتەکانیشت هەڵقرچاو و بێنـموود و پـڕ لـە لۆچ و چرچیش بن؛ هەر ئەوەندە بۆ تۆ زۆرە کە کوردیەکەی ئەمڕۆ دەخەیە سەر کاغـەز و بەشـێك لـە زوانە جوان و شیـرینەکەت لە پـارێزی دز و چـەتەی داگیـرکەر دەپـارێزی و هـەر چـۆنێك بێـت، لـە سووچێکەوە کەلینێکی پێ پڕ دەبێتەوە و هەرگیز بە یەکجاری ناپووچێتەوە.

لەوانەیە نووسەرانی باشی کوردی لەمەوپاش -کە ئەم نووسراوەی تۆیان دێتە بەر چاو- بزەیان بە نەخوێندەواری و کۆڵەواری تۆ بێتێ و بەزەیان بە نەداری و هەژاری ئاسەواری کوردەواریدا بێتەوە و لـە سۆنگەی تۆوە ئیشتیای نووسینیان بکرێتەوە و بۆ ئەوە دەریـخەن کە دەتوانن زۆر لە تـۆ چاکتـر ئـەو ئەرکە پێك بێنن، شان بدەنەبەر و سەروبەرێکی وا بە نووسیـن و ئاخافتنمان بدەن کە بە شانازیەوە خۆ بنوێنن و لە باتی ئەم گوشـمەیەت مەیرە و لۆرك بـخەنە سەر خوان و لە جیاتی ئەم چەند مۆرە خـوار و بۆرە، کۆشك و تەلاری جوان و لەبار و سپی‌کار، هەڵخەنەوە.

تۆ سەر پلی تەشیەکە خۆش کە، ئەوسا ڕیس و کر و نەخشی ڕەنگیـن و بەوێنـە، بـا لـە سـەر

دەستڕەنگین و شیرینکاران بێ. تۆ بەو کاڵەو پێتاوە بە بەن داپێچراوەت، ڕچەیەک بشکێنە، ڕاوی پڵنگ و شکاری شێران، کاری چاپکسواران بێ. خوای گەورە فەرموویە: لە توانا بەدەر ناخەینە سەر کەس. پێشینیانی کوردیش گوتوویانە: سمۆرە گوتی لە دار کەوتمە خوار دوو مەنم کەم کرد! پرسیان: تۆ خۆت نیو مەن نابی، ئەو دوو مەنەت لە کوێ هێنا؟ وتی: کاکی خۆم هەر کەس بە مەنی خۆی.

## لە هیچی نەبوو

مرخی خۆم لێ خۆش کرد و بڕیارم دا کە لە سەر بۆرپای خۆزیا و بریا لاچم و بەرانبەر بە وزە و توانای خۆم، دەگژ ئەو کارە دژوارە ڕاچم؛ بەڵام «ئاسمان دوور و زەوی سەخت!» منی پێشمەرگەی هەڵوەدای چیا و چۆڵ و بێ دەرەتان و کلۆڵ، هەر چوار لام لێ تەنراوە و ڕێگەی شار و بازێڕانم لێ بەربەست کراوە، *شەرەفنامە* لە کوێ بێنم و وەیخوێنم و وەریگێڕم و کام کتێب وەک سەرچاوە بدەمە بەرچاو و بۆ بەراوردکردنی ڕاست و خواران، لە کام نوسخە و کام نووسراو بنهێرم؟ بە گێژ و وڕی و بە دڵپڕی بە دەوری خۆما خولم دەخوارد و ڕامدەسپارد. تەنانەت ڕێونگ و ڕێبواریشم هەڵنەدەبواردن؛ بەربینگم پێ دەگرتن و وەبەر پرسیارانم دەدان؛ تا لە پڕێکا خوای گەورە «کڵاوی بۆ بەڕووکرد» و منی دەگەڵ کاک ساڵح مەحموودی بارزانیدا ڕووبەڕوو کرد. ئەو برا بەنرخ و هێژایە لەو چۆڵ و دەشتە، لێم بوو بە فریشتە و *شەرەفنامەی* فارسی و عەرەبیەکانی محەمەدعەلی عەونی و مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی بۆ هێنام و بەو دیارییە نایابەی، لەو کۆسپە ڕزگاری کردم و لەو دەردە گرانەش چاری کردم. منیش بێ سێ و دوو کردن لێی وەخۆ کەوتم و لە پێداچوونەوەی *شەرەفنامەدا*، بە سەر شتی هێندە سەیر و سەمەرە و سەرسووڕێنەردا کەوتم، کە هەرگیز بە بیری بیریشمدا ڕانەبردبوون.

## دوژمنان و ڕەسەنمان

سەعدی شیرازی دەڵێ: کابرایەک لە خەودا شەیتانی زۆر بە جوانی دیت. لێی پرسی: تۆ لە ڕووکاری گەرماوان وێنەت بە تاکە چاوێکە و شاخ و کلکیشت لێ ڕواوە. ئێستا ئەو شۆخ و شەنگی و

نازداریەت لە کوێ هێناوە؟! لە وەراما پێی گوت: من فریشتەم و فریشتەش هەموویان جوانن؛ بەڵام بنووسە کە لە دەست دوژمنان دایە؛ هەر چاکە ئەوەندەشیان پێوە هێشتووم! کوردیش دەڵێن: پیاو کەسێکی بدزێ، خەونی گولیەی پێوە دەبینێ.

ئێمەی کورد بۆ خۆمان مێژووی خۆمان نەنووسیوە. زانا و مێژوونووسە کوردەکانیش هەر بە بەژن و باڵای داگیرکەرانی کوردستانیان هەڵگوتووە و هەرگیز چاویان خۆیانی نەدیوە. بێگانە داگیرکەرەکانیش چاویان دە خواردنمان بڕیوە و خەونی ناخۆش و پیسیان پێوە دیوین. ئەگەر جار و بارەیەک -بۆ بەرژەوەندی خۆیان- تاک و تەرا لێرە و لەوێ، بە دەگمەن یادیان کردووین، بە جوێن و نەفرینەوە بۆمان هاتوون و فڕیان پێدا داوین و هەر بە جارێک بەربادیان کردووین.

کۆمەڵێک کوردی بازرگانی هۆزی «باجن» لە لای بۆتانەوە چوونەتە تایف و لە سەر دەستی پێغەمبەر موسوڵمان بوون. لەو ڕۆژەوە «باجن» کراون بە جنی نوسەیبین و هەموو نەتەوەی کورد لە سایەی ئەو نۆ موسوڵمانانەوە- لەو تیرە جنۆکانەن کە سەرپۆشیان لە سەر لادراوە!

سولەیمان شای جوولەکان، بە دێو و درنجاندا کەنیزەکی بۆ بە دیاری هاتوون. لە ڕێگەدا ئەو داوێن پیسە نەگریسانە، دەستیان دەگەڵ تێکەڵ کردوون و زگیان پەنەماندوون و بێژوویان تێدا گۆڕاوە و سلێمان لەو کەنیزە بێ شەرمانە تۆراوە؛ ئەگەرچی عیبری زمانیش بووە بە عارەبی فەرموویە: «اکردوهن فی الـجبال» واتا: بەرهەڵدای کێوانیان کەن با کوردیان لێ بکەوێتەوە. ئیتر بەو پێودانیە، هەرچی کوردە و ڕۆڵەی کوردستانە، زۆڵە و لە دێوانە و لەوساوە هەڵوەدای کێوانە!

ڕۆژێک کوردی کوڕی مورِدین و چەلێک جووجەڵەی سەعسەعەین و هەلێک -بە هەوا- هەوازنین و تاوێک باوکمان موزیقای بەچکە بارانەیە و دەمێک لە هێلکەی ڕەبیعەی بەکرەوە سەرمان دەرێناوە و چاخێک مامانی مناڵەکانی موزەر، ناوکی بڕیوین و سەردەمێک ژنەکەی دەواری نزارنشین، فرچکی پێ مژیوین. تەنانەت بوێژ و زانایەکی عەرەب لە مەڕ مێژووی کوردەوە سوێندی خۆی کردۆتە بەڵگە و فەرموویە:

بە خوا سوێندم کورد نە فارسن بێچوولەی عەمری کوڕی حارسن

مامۆستا فیردەوسی خاوەنی *شانامە* -خوا خێری بنووسێ- گوایە بەزەی پێماندا هاتۆتەوە، لە

ناو کەڵپ و پەنجەی زەهاکی خوێنمژ و ناپاکی دەرهێناوین و بەرەو چیا ڕاوی ناوین و لە سایەی سەری ئەو چیا ڕژد و هەڵەمووتانەوە ماوین و بە بێترس حاواوینەوە. کەچی -لە پڕ و نەکاو- باو دەخوا و با دەداتەوە سەرمان و بە سەر و پۆتڕاکماندا دێتە خوار و گەزارەمان لێ دەکێشێ و کارێکمان پێ دەکا یا بە دەواری شڕی نەکردووە. بە بێ ئەوە میوانمان بوویێ و کەسمان لێ بناسێ، بە خانوویەلاسی خوانەناسی بێفەڕ و بەگەڕمان ناو دەبا!

ئەبوو موسلیمی خوراسانی زۆر بە هاسانی هەموو ئیمپەراتۆریەتی ئیسلامی ئەوسای، بە زۆری باسك و باهۆی پتەوی خۆی لە چنگ بەرەی ئەمەوی دەرێناوە و وەك هێلکەی پاکراوی خوێ لە سەر، لە بەردەمی عەبباسیانی داناوە و دەستەونەزەر لە بەردەستیان ڕاوەستاوە؛ کەچی لە پاداشی ئەو پیاوەتیەدا، بە گزی و دزی کوژراوە و ئەبوودولامەی شاعیری دەرباری مەنسووری لێ هاندراوە کە لە دوای کوژرانی فڕی باوێتێ و پێی بڵێ: «باوك و باپیرە کوردەکانیشت وەك خۆت غەددار و بێ ئەمەگ بوون». [illegible] گەمەی لە هەمووان خۆشتر ئەمەیە: ئوغوزخانی تورکستانی، بوغدوزناوی کوردستانی ناردە لای پێغەمبەر. بوغدوز ئەوەندە ناشیرین و ڕەزاگران بوو پێغەمبەر بێزی لە چڕوچاوی هەڵقرچاوی هەستا و لە داخانی تووك و نەفرینی لە هەموو کوردی سەر زەمین کرد!

ئاخر با بڕوانین ئەو نووسەرە ساویلکانەی لە دوژمنایەتی کوردان و بۆ دراوی گیرفانیان، ئەو چیرۆکەیان هەڵبەستووە و ئەم بوختانە گەورەیان بە پێغەمبەر کردووە و دەناو ڕوویەڕی مێژوویان ئاخنیوە، ئەوەندەیان بە مێشك و دڵا تێنەپەڕیوە کە ئەو هەویرە چەند ئاو هەڵدەگرێ و لێکیان نەداوەتەوە کە گوناهێکی چەند گەورە ملیان دەگرێ و چۆن لە بەری دەردەچن؟ نەیانزانیوە کە پێغەمبەری خوا دەیزانی بنیادەمی دزێویش دەسکاری خوایە و ئەگەر کرێك لەبار و ڕێك نەهات، لە کرگارەوەیە؟ لە لایەکیتریشەوە ئەگەر خوانەخواستە باوەڕ بەو درۆیە بکەین، وای لێدێتەوە ئەگەر ئەو بوغدوزە کوردە بەدبەختە، لاوێکی لووس و پووس و لەبار و بەرچاو و چاونەرم و بێ شەرم بوایە، دەبوایە بە کۆڵێك نزای باشەوە بگەڕێتەوە کوردستان! حاشا کە پێغەمبەری خوا ئاکاری وا نالەباری بوویێ و ئەم درۆ پووچ و بەربادە لە دەمی ئەوانە زیادە کە بۆ لاکی مرداری دنیا، ڕێکیان خستووە.

# هەر خۆم بە خۆم کرد

زۆر سەیر و سەمەرەیە ئەو هەموو هۆزان و زۆرزانە کوردانە -کە بە درێـژایی مێـژووی ئیسلامەتی هاتوون و ڕابردوون و بە عارەبی و تورکی و فارسی ئەو هەموو کتێبانەیان نووسیون و لە سـەر یـەکیان هەڵچنیون و نامەخانەی دنیایان لێ ئاخنیون و ناوبانگیان سەرزەوی تەنیوەتەوە و ئێستاش زۆریـان لـە بیـر نەچوونەوە و شوێنەواریان کوێر نەبوونـەوە، پیاوانی وەك ئیبنوئەسیـرەکان و کـوڕی خەڵـەکان و ئەبولفیدا و هەزار ئەوەندەی وەك ئەوانـمان لێ هەڵکەوتووە -هەرگیز لە بەرامبەر ئـەو هـەموو درۆ و دەلەسە و بوختان و پێدا هەڵخووشانەدا، گنجیان نەپەڕیوەتە توێڵ و تۆزکاڵێکیش شلوێ و لێڵ نەبوون و دەمیان بووە بە تەڵەی تەقیو و خوستیان لـە خـۆ بڕیـوە و ببـڕای ببـڕای لـە ڕووی دژمـان بێـژ و فڕهاوێژان هەڵنەگەڕاونەوە و جارێك لە جاران بە دەمیان دا نەداونەوە. لە ناو ئـەو هـەموو بلیمـەت و هەڵکەوتووانەدا یەکێکیان بە خۆیدا ڕانەپەرمیوە و لە وەرامی ئەو نەزانانەدا نەیفـەرمووە: بابـە ئێـوە هیچ نەبێ وەرن و ئاوێنەیەك بێنن و دە سەر و سەکوتی ئێمە و تـەرح و دیـداری خۆتـان ڕامێـنن، تـا بۆتان دەرکەوێ ئاخۆ کامـمان لە کامـمان لاو و بەدەوتر و ڕێك و لەبارتریـن و کێهەمان لە کێهـەمان بۆر و دزیوتر و خێچ و خوارتریـن؟! کەی خودا بەرداره ئەم برا کوردە بێچارە و بێ تیـن و هاودینـەتان لە تیـرەی بنیادەم هەڵداوێرن و بنە و بنەچەکەی بە جنۆکە و خێو و درنج و دێوان دەسپێرن؟!

مێژوونووسانی کورد تاریـخی داگیـرکەرانیان نووسیوە و لە مەڕ خۆیانەوە مـتەقیان لە خۆ بڕیوە. کوردێك و بێگانەیێکیش -کە ئەوەی لەوانەوە دیووە- گوتوویە: بێ دەنگی نیشانەی پێ ڕازی بوونـە و ئەگەر هیچ پاکانەی خۆیان ناکەن دیارە هەرچی دەربارەیان نووسراوە، بە ڕاستی دەزانن و ئـەوانیش لـە خەڵکیتری باشتـر تێ دەگەن.

کۆلکەمەلای کەمزان و بەستەزمانی کوردانیش ئەو فەرمایشتە جوانەیان لە ناو کتێبی پەڕزەردی پیۆازیدا خوێندۆتەوە و هەر چونکە ناوی کتێبە، ناشێ درۆی تێدابێ. لـە گـوێ ئـاگردانی زسـتان لـە مزگەوتان دەسەر و مێشکی کوردی نەخوێندەوار و ساویلکەیان پەستاوتووە و هێندەیان بـۆ دووپاتـە و هەزارپاتە کردوونەوە کـە خۆیـان لـە بیـر خۆیـان بردوونـەوە و بێزیـان لـە ڕەسـەنیان و قێزیـان لـە نەتەوەکەیان هاتۆتەوە.

مامۆستای بە نرخ و هێژا مامۆستا شێخ عومەر وەجدی، کاتێ لە جامعالازهری قاهیرە مامۆستای ڕەواقی کوردەکان بوو (پایزی ساڵی ١٩٥٨) -لە ڕێگەی چوونە مۆسکۆدا- چوومە دیدەنی و لە ناو گەرمەی وتووێژی کوردانەمان ئاخێکی هەڵکێشا و فەرمووی: «هەژار! دەردی گەلی کورد دوو سەرەیە؛ ئێمە دەربارەی خۆمان هیچمان نەنووسیوە؛ دوژمنان لە هەموو بارێکەوە هەموو شتی پێداویستی خۆیان نووسیوە. شتیش کە نووسرا و بەرگی تێگیرا و بوو بە کتێب، ئەگەر هەزار درۆی شاخداریشی تێدا بێ تازە دەبێ بە ڕاست و هەر گوتت: لەل! دەڵێن بچین کتێبت بۆ بێنین؟ ئیتر قسەت پێ نامێنێ و قسەی دوور لە کتێب لە لای کەس خۆ نانوێنێ.»

جا هەر ئەم ئاهۆیە بۆتە هۆ کە زۆربەی زۆری ئەو کوردانەی بوونە خاوەن زۆر و بە پایە و مایە گەیشتوون، خۆیان لە دایك و بابە جنۆکە و دێوەکەیان دزیوەتەوە و شان و شەپیلکیان لە هاوڕەسەنی کوردی ڕەمەکی و بۆرەپیاگ تەکاندووە و تەکیونەوە و تەکیان داوە بە تەکی عارەبی بنیچە پاك و خانەدان و جوان چاك و بە هەزار درۆ و دەهۆ، سەرەتای کەونارایان بە یەکێك لەوانەوە لکاندووە.

خالتی هۆزێکی لە مێژینەی کوردن و زۆربەیان ئێستاش یەزیدین. میری بۆتان- کە بە شوورەیی زانیوە سەر بە وان بێ- فەرموویە: نەوەی خالیدی کوڕی وەلیدم. بە داخەوە نەشیزانیوە کە خالیدی کوڕی وەلید هیچ زار و زیچی لێ نەکەوتوونەوە!

هەرکێ هەباس ناوێکی لە تیرەیدا گومان بردبێ -بە بێ ئەوە لێکی دابێتەوە کە دنیا چ باسە- خۆی کردووە بە عەباسی و ئەوەی لە پێشوودا بزنەوان بووە و مەزنایەتی دەست کەوتووە، فەرموویە ئێمە لە مەڕوانیەکانین!

ئەو نەخۆشی و خۆ لێگۆڕان و خۆگۆڕینە، ئەوەندە گران و هەموانی بوو، تەنانەت جاروبارە هۆزە ڕەمەکیەکانیشی وەبەر خۆی داوە و نەشیانوێراوە لاسای بەگزادە و گەورەماڵەکان بکەنەوە؛ هەوڵیان داوە تا سەنگی خۆیان لەو کۆنە عارەبانە بدۆزنەوە و بە باپیر و باوەپیارەی خۆیانی بقۆزنەوە. وەك هۆزی سوێدیەکان؛ کە گوایە باپیرەگەورەی خوالێخۆشبوویان کۆیلەیەکی ڕەشی مەدینەنشین بووە!

لە سەرتاسەری *شەرەفنامە* بڕوانی -جگە لە شەرەفخان و دوو سێ بنەماڵەی خزمیان نەبێ- کە

خۆیان داوەتە پاڵ ساسانی و بەرمەکیان- هەموو میرە کوردێك، عارەبێکی بە ئارەزووی خۆی هەڵبژاردووە و ڕەگەز و بنیچەی خۆی پێ هەڵپەساردووە. جا ئەگەر باپیرە لە درۆ تاشراوەکەی، کۆنەمیر و گزیریش نەبوویێ، هیچ نەبێ دەرۆزەکەر و گۆشەگیرێك هەر بووە.

## ئەمەگ ناسی

وەك دەیزانن لەو ساوە کە ئیسلامەتی لە ناو کورداندا بۆتە باو و بڵاو بۆتەوە و زۆر و زەبەندە نووسەر و زانای بەرز و بەرێزمان لێ پەیدا بوون، گەلێك نووسراوەی لەمەڕ وێژە و مێژووی گەلانیان نووسیوە؛ بەڵام هەرگیز یەك لەوانە گەل و هۆزەکەی خۆی بەسەر نەکردۆتەوە و خزم و کەسی خۆی لە بیر نەبووە و دەمی بۆ دەنگ و باس و ڕووداوی کورد و کوردستان نەچووە. کەچی زیاد لە هەمان و سەرەڕای هەموو دەمان، لە چەرخی یازدەهەمی کۆچیدا دوو کەسمان لێ هەڵکەوتوون کە بەزەییان بە گەلە لێقەوماوەکەی خۆیاندا هاتۆتەوە و نان و لان و باوەشی گەرمی کوردانیان لە بیر خۆ نەبردۆتەوە؛ بە نووسین و هاوار و دادێك، کوردیان یاد کردۆتەوە. ئەو دوو کەسەش شەرەفخان و ئەحمەدی خانی بوون. سەیر و سەمەرەش ئەوەیە لە پاش ئەو دوو دڵسۆزانە، دیسان ئەو دەرگانە داخراوەتەوە و نزیکەی چوارسەد ساڵ بە گاڵەدراوی ماوەتەوە. جاڵجاڵۆکە لە دەوری تەنیوە و بە شەداری ژەنگی هانیوە و جارێك حاجی کۆیە هاوارێکی بۆ کردووە و کەس ئاوڕی وێ نەداوە و کە ئەویش مردووە، کەسیتر تا ئەم دواییانە بە لایەوە نەچوە. لەم دواییانەشدا حوسێن حوزنی و ئەمین زەکی بۆیان ڕەخسیوە و هەر یەکە بە پێی توانا تێکۆشیوە کە ئاسەواری لە ناو چوومان کۆکاتەوە؛ دەنا کەسیتر دە خۆی ڕانەدیوە سەری لێ بداتەوە و سەرەوبەرەی پێ بداتەوە.

گەلۆ! لەو ڕۆژگارەدا چۆن بووە بە تایبەتی ئەو دوو کەسە -زیاد لە هەموو کوردێك- کوردایەتیان بزوتووە؟ دەربارەی خانی لە بەرکولەکەی مەم و زینە موکوریانیەکەمدا بیر و بڕوای خۆم لەو بارەوە خستۆتە ڕوو. شەرەفخانیش -کە هەر لە ڕۆژی هاتنە دنیایەوە، بەژەکی زانست فرچك دراوە و بە لاوی لە ماڵی شای ئێراندا پەروەردە کراوە و شان بە شانی شازادان پێی خوێندراوە و وەك ئەوان ڕاهێنراوە- هەموو هونەرێکی دەورە داوە و بەژێهاتی و لەباری بار هاتووە.

وەك خۆشی بۆمان دەگێڕێتەوە: لە باس و خواسی ڕابردووان و لــە هونــەری مێژووناسیـــندا، زۆر سەرکەوتووە و ئەوەندە هۆگری ئەو بابەتە خوێندەوارییە بووە کە هەموو کـات و سـاتی تـەنیایی خـۆی دەگەڵ بەسەرهاتی ڕابردوواندا ڕابردووە و ویستوویە لە تاریخ نووسیـن و مێژوو ناسیـندا، جێگەیـەکی بەرز داگیـرکا و ناوێك دەرکا. لە هەر دەرکێکی داوە و لێی نۆڕیوە، دیتوویـە لـە پـێش ئـەودا چـەند کەسێکی زۆر کارامەی تێ خزیوە و هیچ مەودایەکی وای بەدی نەکردووە کـە هـەر خـۆی تاکەسواری مەیدانەکە بێ و بە ئارەزوو ئەسپی هونەری تێدا تاودا. تا لەپڕ و نەکاودا فریـشتەی بـەختی ئـاوڕێکی بەخێری لێ داوەتەوە و گەلە ئازا و نەبەز و مەرد و ڕەندەکەی خۆی وەبیـر هێناوەتەوە. ئەوسا دیتوویە دەتوانێ بە تیـرێك چەند نیشانە بپێکێ:

١- مێژووی کوردستان کەس دەستی بۆ نەبردووە؛ ئەگەر ئـەو بیـــنووسێ، دەسـتی خـۆی پـێش خستووە و لەو کارەدا بە داهێنەرێك ناو دەر دەکا.

٢- ناوی ناودارانی کورد لە ناو نەچێ؛ وێڕای ئەوانیش نـاوی بـاب و باپیـرانی -کـە میــرانی بتلیسن- بە زیـندوویی بـمێننەوە و کـوڕانی دواڕۆژیـش باسـی شـان و شـکۆی ئـەو گـەورە ماڵـە بخوێننەوە.

٣- بۆ خۆی -هەر وەك لە ژیاندا میـر و خوونکارە- بەو کارە لە دواڕۆژیشدا بە پایەداری لە ناو کوردەواریدا دەمێنێ و لە سەر ڕووپەڕی ڕەنگیـنی نووسراوەکەیەوە بـە سـەربەرزی دەنـوێنێ و کـوردە ڕۆشنبیـرەکانی دوای خۆی لە هونەر و کردەوەی خۆی تێ دەگەیەنێ و هەرگیز کەمایەسی ناهێنێ.

چونکە تێر و تەسەلیش بووە، ئارەزووی نەکردووە لە باتی نووسیـنەکەی بەخششێکی لە دیـوانی تورکانەوە پێ بگا. هەر ویستوویە کوردەکەی خۆی و نووسەری هاوچەرخی لـە هونەرمەندیەکـەی تـێ بگا و ئیتـر چاوی لە چیتـر نەبووە؛ دەستی داوەتێ و لە ڕاستیشا دادی داوە و هەر چۆنێك خۆی نیازی لێ گرتووە، وای هێناوەتەوە. مێژووی کوردی نووسیوە و مردووی بۆ زیـــندوو کردویـــنەوە و کـارێکی وای کردووە کە تازە نەمریـنەوە. سوپاس بۆ میـرشەرەفخانی گـەورە کـە گـەرای ژیانـەوەی لـە نـاو توێیەکانی پەڕی *شەرەفنامە*دا بۆ هەڵگرتیـن و ئێستا وا خەریکیـن سەر هەڵدەیـنەوە و ببووژیـنەوە و بە ئاشکرا و بە شانازی ئەو میـرە ژیر و سەرفرازە یاد کەیـنەوە و هـەتا دنیادنیایـە لـە بیـرخۆمانی

نەبەینەوە. هەتا هەتایە ئەم گەلی کوردە -ئەگەر دەوڵەمەند و ئەگەر هەژاریەتی- هەر ملکەچ و منەتبار و سوپاسگوزاریەتی.

## شەرەفنامە ئازانامەیە

ئەگەر تۆزێك بە زیتی لە ناوئاخن و دێڕ و پیتە بە پیتەکانی *شەرەفنامە* ورد بیینەوە و ژیرانە لێی بکۆڵینەوە، سەرەڕای ڕووداوەکانی -کە زۆر دڵگر و لە بەرچاون- ئەوی زۆرتر سەرنجی پیاو ڕادەکێشێ، ئازایەتی بێ وێنەی ئەم گەلی کوردەیە. سەرلەبەری *شەرەفنامە* بپشکنە، لە هیچ لایەکەوە کوردێکی قزە و ترسەنۆکت نایەتە بەرچاو و هەمووی هەر پیاوی چاونەترساو و دوژمنترسێن و گەڕناسی بێوێنەیە!

هەرکەس بە چاوێکی بێ لایەن، لە دەراوێکی ڕووناکەوە سەیری سەربەوردی ئەم گەلی کوردە بکا، هیچ گومانی نامێنێ کە لەو ساوە باوەدەم و دایکەوا لە بەهەشتەوە دەرکراون و بەرەو دنیا ڕاونراون و لە سەرزەوی دامەزراون و خانە و لانەیان پێکەوە ناوە و نەوە و نەوەچڕکیان لێ پاشەکەوت بووە، هەرگیز لە گەلی کوردیان ئازا و بەجەرگتر لێ نەکەوتۆتەوە. زۆر لە مێژوونووسان لایان وایە کە واتای وشەی کورد ئازایە و دراوسێکانمان -کە ئاسیوییانین و زانیوییانە چەند ئازا و بەجەرگ ڕسکاوین- ئەو ناوەیان لێ ناوین. تەنانەت زۆر لەو زانایانەی مانایان لە قورعان لێداوەتەوە، باوەڕیان وایە ئەگەر خوای مەزن بە ئیسلامانی فەرمووە: دەنێردرێنە سەر نەتەوەیێکی زۆر ئازا و بەهێز؛ نیازی کوردە و کەسی تر نیە و لە کورد پێوە کەس ڕێی ناکەوێ خوا پەسنی ئازایەتی بدات.

لە ڕاستیدا ئەم ناوی کورد و نەترسانە -کە هەر زۆر لە مێژینەوە بوونەتە ئاواڵ دوانە- نازناوێکە پڕ بە پێست و کاڵا ڕێکی باڵایە و داپیرەی جیهان تا وێستا نەبەرد و مەردی وەك گەلی کوردی نەدیوە و بە دەوروبەری بیریشیدا تێ نەپەڕیوە.

ئەوانەی کە خۆیان زۆر دە خۆیان ڕانابینن و لە ئاوێنەی خۆیاندا سەیری گەلی کورد دەکەن و گوێز لە هەمبانەی خۆیانەوە دەژمێرن و لایان وایە -لە ئازایەتیدا- کوردیش خۆیان ئاساییە و شتێکی نائاسایی تێدا نییە، با بێن و لەگەڵ منا ئاوڕ لە ڕۆژگاری نزیك بە خۆیان بدەنەوە و مێژووی پڕ لە

شانازی کورد لەم سەد ساڵەی دواییدا بێننە بەرچاو و بە دڵ لێکی دەنەوە و بەسەری کەنەوە و بڕوانن و بزانن ئەم نەتەوە دڵ پتەوە، چیە و چۆنە و چی کردووە و کردەوەی هەتا کوێ چووە؟ هەروا لە ڕابردوویێکی زۆر نزیکدا -کە یان خۆمان لە بیرمانە یا خۆ باب و کاڵ و نەنك و باپیرانمان دیویانە، ئان لە بەیت و سەرگورۆشتە و چیرۆکاندا بیستوومانە- ئەم کوردە تازا و پیاوە- لەسەر ئەو هەموو بێکەسی و لێك بلاوی خۆشی ڕا- لە مەیدانی نەترسانا، چەندی هونەر نواندووە و چەند لەشکری بەزاندووە و چۆن دوژمنی بزداندووە.

ئەگەر پیاو بۆ خۆی کورد نەبێ یان دەماری کورد باش نەناسێ، لە باسی ئازایەتی ئەم گەلەدا سەری دەماسێ و لای وایە بەشێکن لە چیرۆك و ئەفسانە و شتی وا ڕووی نەداوە.

دوازدە سوارەی مەریوان، باپیرئاغا و هەمزاغای مەنگوڕ، شێخ عوبەیدوڵلای نەهری، سمایلاغای سمکۆ، قەدەمخێری بەختیاری، هۆزی بچووکی سوێسنی، بەگزادەی بانە، جافرسان، کۆمەڵی ژێ کافی مەهاباد -کە دەگژ دەوڵەتی ئێرانی دەوڵەمەند و لە مێژینە ڕاچوون- چیان بەسەر هێناوە؟ شێخ سەعیدی پیران، پاڵەوانانی ئاگری داغ و چیای ساسۆن، تەنانەت هێزی کەم دەستی هەمەوەند -کە دژی ئیمپراتۆری عوسمانی ڕاپەڕیون- چۆن پەت پەتێنێکیان بەو دەوڵەتە زەبەلاحە کردووە و چەندیان خوێن و ماڵ تێ چووە تا بەردەست کراون؟

شێخ مەحموودی حەفید بەو لەشکرە کەم و ڕووت و نەدارەیەوە -کە هەر یەکەی لە دێیەکەوە و هەرچەکەی لە جێیەکەوە پێکەوە نابوو- وەهای تەنگە بە ئینگلیس و پادشایەتی عیراقی دەستندەخۆری ئینگلیس هەڵچنی کە زۆربەی لەشکری عیراق و ئینگلیس و سیك و گورگەی لێ دەنگ دراو، هەموو چەکی تازەبابەتی ئەو ڕۆژەی لێ دەکار کرا، هێشتا ئەگەر کوردی بێهۆش و نیشتمانفرۆش نەبوونایە، بۆیان چارە نەدەکرا و پێی نەدەچاران.

زۆر جاری وا هەبوو هەر تاك و تەرای کورد، لە چنگ پەل هاوێژی داگیرکەران و دەست درێژی زۆرداران، وەتەنگ هاتووە و کێردی گەیشتۆتە ئێسکان و لە ناچاری خۆی لە سەر خۆی وەدەنگ هاتووە و دەستی لە خۆی شوشتووە و ڕێگەی چیای داگرتووە و دەگژ دەوڵەتێك ڕاچووە و کاری وای لە دەست هاتووە کە بە لەشکرێکی بێگانە ناکرێ. خەلیل خۆشەوی، عەلیکی بەتێ، شێخ عەتا، حەمەتاڵی بانە، خولەپیزە و هەزارانی دیکەی وا، کە ناویانگیان هەر ماون و بە پاڵەوانی گەل ناسراون

و هەموومان لە چیرۆکەکانی گوێ ئاگردانی زستاندا، زۆر لەو ئاکەسوارانەی مەیدانمان بۆ باس کراوە و بە ئاسەوە لە گۆشەی دڵ و مێشکماندا جێمان بۆ کردوونەوە و لە بیر خۆمان نەبردوونەوە.

ئەمیرنیزامی گەڕووسی کاربەدەستێکی ئێران بووە و لە کوردستان بووە. لە نامەیەکدا بۆ گەورەتر لە خۆی نووسیوە، دەڵێ: «هەمزاغای مەنگوڕ و دوو برازای -کە بۆ ئازایەتی لە دنیادا وێنەیان نەبووە- بە دەستی سەربازەکانی ئێران کوژران». هەر کەسیش توزێ شارەزای ئەو ڕووداوە بێ باش دەزانێ کە دەوڵەتی ئێران لە شەڕدا پێیان نەوێراوە و بە بەڵێنی درۆ و بە سوێند و پەیمانی نامەردانە فریو دراون و بانگهێشتن کراون و لە ناو خێوەتدا لە نەکاو بەر گوللە دراون.

ئیحسان نووری پاشا لە نووسراوە فارسیەکەی خۆیدا بۆمان دەگێڕێتەوە، دەڵێ: «لە شۆڕشەکەی ئاگری داغ دا، تورکان هەر کوردێکیان بە دیل بگرتایە سەریان دەبڕی و لە گوێ پرد و دەم ڕێگایان بەسەر داریانەوە دەکرد تا کوردەکانی پێ چاوترسێن بکەن. شۆڕشگێڕانی ئاگری داغ -هەر دەستەیەک نۆرەی دەرچوون و دەگژ ڕاچوونی تورکانی دەهات- بەر لە هەموو کارێك ڕیشی خۆیان لووس دەتاشی و سمێڵیان قیت با دەدا و تاوێکی باش بە خۆدا دەهاتن؛ دەیانگوت: ئەگەر کیژە کورد سەری براومان بە سەر دارانەوە ببینن، با جوان و لەبار و بەرچاو بین و حەزمان لێ بکەن و بێزمان لێ نەکەن».

جا دەشزانین کە ئەستێرە هەر هێندە بە دیمەن و جوانن تا خۆرەتاو خۆی دەردەخا؛ هەر ئازایەتیەکی لە درێژایی مێژووی کەون و نوێدا، مرۆ لە خۆی نیشان داوە، هەمبەر بە مێرخاسی و گەڕناسی بارزانیان، چڵەکایەکە لە ڕاست چیایەك و تنۆکە ئاوێکە لە حاند دەریایەك. بڕوام وایە ئەگەر ئازایەتی و نەترسان لە بیچم و تەرزی پیاوێکدا بهاتایەتە سەر دنیایە، تووشی هەر بارزانییەك بوایە، بە سەرکزی کڕنۆشی بۆ دەکرد و بە لارەملی سوژدەی بۆ دەبرد.

هەر لەم سێ یەکە چەرخەی بیستەمەدا و لەم ڕۆژگارە دژوار و حەستەمەدا -کە بە سەر کوردا تێپەڕیوە- هەزاران مەردی وا نەبەرد لەو هۆزە سەربەرز و پیرۆزە ڕەخسیوە کە ناوی پاڵەوانانی ئەفسانەییشی لە ناو سیایی ناوی بەکاران سڕیوەتەوە. ئەم هۆزە کەم ژمارە و باوەڕدارە، زۆر جاران لە سەر کورد و کوردستانی نیشتمانمان دەگژ لەشکری زۆری زۆرداران ڕاچوون و بە ڕژانی خوێنی پاکی خۆیان، ئابڕووی ڕژاوی گەلی کوردیان کڕیوەتەوە و بە مەچەك و باهۆی لێ بوردن و باوەڕ بەخۆیی، دەست و زەندی گەلێك لە زۆردارانیان لە بندا بڕیوەتەوە. هەتا دنیا دنیایە و هەتا کوردستان کوردی

تێدایە، ناوی شێخ عەبدوسەلام و شێخ ئەحمەدی بارزانی لە سەر تەتەڵەی ڕێزنامەی مێرخاسان و گەڕناسانی هەرە سەربەرزی دنیادا بە پیتی زێڕین و بە زێری و بەرزی جێگەی بۆ دیاری دەکرێ و بە ڕەنێو هێنی سەبەرزانی بارزان ناویان دەبرێ.

پێشینە گوتوویانە: شاگردی هونەرمەند نیشانەی هونەرمەندی مامۆستایە. ئەو شێخانەی بارزان کە ئەو فێرگە ئابڕوومەندەیان بۆ هونەرمەندی دامەزراندووە، شاگردی وەك مستەفا بارزانیان پەروەراندووە و پێگەیاندووە؛ کە سەرەتای کوردایەتی و ئازایەتی چۆن دەست پێ دەکرێ و ئەو ڕێگە پڕ پێچە چۆن ڕێی تێ دەبرێ و ئامانجی پاك و ئاکاری چاك چەندی دەرد و چەوسان و بەجەرگی و نەبەزین گەرەکە و چقاس پشوو لە سەر خۆیی و شەکەتی پێ دەوێ تا سەر دەگرێ و سەر دەکەوێ.

وابزانم تەنیا ناوی مستەفا بارزانی بەس بێ بۆ بەڵگەی ئازایەتی کورد. وەك مەولانای ڕۆمی فەرموویە:

بەڵگەیە بۆ ڕۆژی ڕوون تیشکی هەتاو بۆ پەسندی گوڵ بەسە بۆنی گوڵاو

بێ گومان بە هاتنە ناوی ناوی بارزانی، باوەڕی هەموو دوو دڵ و گوماندارێکیش -لە مەڕ ئازایەتی بێ وێنەی کورد- دەگاتە سەر چڵەپۆپەی بێ گومانی و هەموو دڵخورتیەك لەم بارەوە لە ناو دڵان بار دەکا.

ئەوانەی ئەمڕۆ لە سەر دنیا دەژین و ئەوانەش کە لە دوارۆژدا دەخرێنە ناو مەیدانی ژیانەوە، کێمان دەست دەکەوێ کە ئەم ناوەی بەر گوێ نەکەوتبێ یان نەکەوێ و ئەو پیاوە نەناسێ و بە چیرۆکی ئەو ئازا پایەبەرزە ئاشنا نەبێ؟

نیشتمانی کورد- بە بێ هیچ ماندوو بوون و وەستان، هەوڵیان داوە و خوێنیان ڕژاوە و کۆڵیان نەداوە و کۆڵەی دوژمنیان کوتاوە؛ تا بە زەبری باوەڕی بەهێز و دڵی پتەویان، دڵ و دەزگای کوردستانخوازان لەرزی و درزی برد و کوڕانی ئێستا و چینەکانی دوارۆژ کە دێن و مێژووی شۆڕشە خوێناویەکانی بارزانی دەخوێننەوە و بە وردی شی دەکەنەوە و بە لێزانی شێو و وەردی دەدەنەوە و بە زیرەکی دەگەڵ ڕووداوەکانی شۆڕشەکانی دیکەی دنیادا بەراوەردی دەکەنەوە، چۆن هەبووە و چۆن ڕووی داوە، وای تێدەگەن. بە تایبەتی کە دەربارەی شۆڕشە مەزنەکەی نێوان ساڵانی ١٩٦١-١٩٧٠ دەدوێن؛

که ده ساڵی ڕەبەق بارزانی و پێشمەرگەکانی کوردستان -بۆ ئازادی ئاوازەی نەبەردی و زەبر و زەنگی ئەم گەلە جەنگاوەرە بە باوەڕە، لە ناو چاڵی فەرامۆشیەوە -بە موژدەی ڕزگاری و خۆشییەوە- سەری هەڵدایەوە و دەنگی زەنگی پێشەنگی کاروانی خۆڕانانی پاڵەوانانی کورد، لە درێژایی و پانایی ئەم زەمینە خڕ و پان و بەرینەدا زرینگایەوە و لە ناو هەموو دڵ و مێشکێکدا دەنگی دایەوە؛ ئیتر کەی گومان و سۆ دەمێنێ و کێ هەیە باوەڕ بەوە نەهێنێ کە ئەم گەلی کوردە، ئەگەر وەك گەلانی ئازاد و سەربەستی دیکە هەر لە سەرەتاوە خاوەنی خاکی خۆی بوایە و بە ڕاشکاوی و بە بێ لەمپەر و بەرگر بەخۆدا بهاتایە، هیچ هێزێك لە دنیادا دەگەڵی دەرنەدەبرد و هیچ خاوەن زۆر و خوونکارێك باشاری نەدەکرد.

بە بیری کێدا دەهات لە ڕۆژ و ڕۆژگارێدا کە کوردستانی نیشتمانی کورد لە شەش لایانەوە لە لایەن داگیرکەرانەوە چوارمێخە کێشرابێ و زۆردارانی خاوەن زۆر و کوردخۆر چۆکیان لە سەرسنگی دادابێ و زمانی هاوار و ناڵەشی بەسترا بێ و کرکرەی هەناسە دانیشیان لێ گرێ دابێ، مەلا مستەفا ناوێك پیاوێکی هەژار و بێچەك و جبەخانە و بێ خانە و لانە، لەو مەڵبەندە بچووك و بەردەڵانەی کوردستانەوە -کە ناوی مەڵبەندی بارزانە- بە بێپەروا لە ڕووی داگیرکەرانی کوردستان هەڵگەڕێتەوە و ڕاپەڕێ و بەشێکی زۆر کەم و باوەڕ زۆر، لە کوردی هەژار و ڕووت و برسی و بێدەرەتانی ڕەگەڵ کەوێ و بە کۆنەقەسەڵی و سێ تیرە ژەنگاوی و چفت و شینکەی ڕاوی و خەنجەری ڕوزە و تیخەڵەی برشاویەوە، دەگژ دەوڵەتێك ڕابچن کە خاوەنی زێڕ و زۆری زۆر و سوپای ڕێك و پێك و تازەبابەت و لەبار و پڕ چەك و تەیار و خاوەنی تانك و زرێپۆش و فڕۆکەی بۆمباهاوێژ و خێوی سەتان تۆپی پێنج بە پێنج و لوولەدرێژ و چیادابێژ بێ و تەنیا سنگی ڕووتی لاوی خوێنگەرمی نیشتمانپەرستی کورد، قەڵخانی گوللە و بارووت بێ و برسی و تینوو -لە ئەشکەوت و بن بەرد و سەر هەردانەوە- مەردانە هێرش بێنێ و سەرەڕای لەشکری بێگانەش، چەند جار ئەوەندەی خۆی، کوردی ناموسفرۆش و بێهۆش، پێشی لێ گرتبێ و خۆی بە داگیرکەری وڵات، بەکرێ دابێ و کوردی هاوخوێنی خۆی بۆ بکوژێ؛ کەچی ئەم هەموو نەیارە بشکێنێ و بیانڕەتێنێ و لە ئەنجامدا سەر بە دوژمنی ڕەگەزپەرست و دۆستانی دوژمنانی بچەمێنێ و واز نەهێنێ تا خەڵکی هەموو دنیا مافی ڕەوا بۆ گەلی کورد دەسەلمێنێ.

ئێمە لێرەدا زۆر بە سەرچڵی، باسی تۆزێك لە ئازایەتی بارزانی و پێشمەرگەکانی کوردستانمان -تەنیا بۆ نموونەیەك لە ئازایەتی کورد- هێنایەوە؛ تا بۆمان دەرکەوێ کە هەرچی لەمەو بەر لە مەڕ ئازایەتی کوردەوە گوتراوە و نووسراوە، هێشتا زۆر ناتەواوە و کەمێکە لە زۆر و شەمێکە لە چاوخۆر. ئەگینا بارزانی و شۆڕشەکانی، پێویستیان بە زۆر شۆڕشنامەی زۆر گەورە هەیە و لە توانادا نیە لە پێشەکیەکی وادا سەروبەری لێك دەینەوە و گەویەگەوی ئەو زرێ پڕگرێ و پتەوە، بە وردی لە بەر یەك هەڵوەشێنێن و بە وەستایی لێکی دەینەوە و تێکی خەینەوە. ئەگەر مەرگ مەودا بدا، لەمەولا منیش -وەك زۆرکەسی‌تر- ئەوەندی بۆم بلوێ لە کتێبێکی سەربەخۆدا لێیەوە دەدوێم.

## ئەو ئازایە چۆن تێچووە

هەر دڵێکی لە سووچێکەوە کەمووسکەیەك تروسکەی کوردایەتی وێ کەوتبێ، بیر لەو مەتەڵۆکە دەکاتەوە و بە بیری خۆی لێکی دەداتەوە و دیارە ئەو پرسیارە، بە سەر زۆر دەم و زارانەوەیە و ماڵم حەقە، پرسێکی زۆریش بەڕێ و جێیە: هۆی دوا کەوتن و سەرنەکەوتنمان چیە؟ یان کێیە؟

وەك من بە بیری خۆم بۆی چووم، کوردەکە هەر وەك لە هەموو کەس ئازاتر و بێ باکترە، لە هەموو کەسیش ڕاست و دڵپاکترە و هەتا بڵێی خۆش باوەڕ و بێ‌گەڕ و گزییە. جا ئەم ڕەوشتە پەسندانەی لێ بوون بە سندان و لە سەر دڵی خڕبوون و گەستوویانە و بەستوویانە و خستوویانە!

ئایینی پاك و بێ گەردی ئیسلامەتی -کە لە سەرەتاوە پەیدا بووە- تیشکی برایەتی و یەکسانی، وە چیاکانی کوردستانیش کەوتووە. تاریکایی ئاگرپەرستی لە سەر ڕەواندوین و چاکان و پاکانی ئیسلامی پێشوو تێیان گەیاندووین کە موسوڵمان هەموو پێکەوە بران و ڕەش و بۆر و سپی و مۆر و زەرد و کەوەیەك لە ئارادا نیە و هەموو ڕەگەز و تیرە و هۆز و نەتەوەیەك -لە بەرانبەر بارەگای خودای بەرزا- یەکجۆرن و یەکتەرزن. نەژادپەرستی ستەمکارانە، کاری بەدکارانە و هەوێنی بێ‌ئاکاری و پەستیە. کەس لە کەس زلتر نیە. هەموو موسوڵمانێك -خاوەنی هەر ڕەنگێك و خێوی هەر زمانێك بێ- لە بەربەرۆچکەی خۆرەتاوی ئیسلامەتی‌دا، بە سانایی دەحاوێتەوە و هیچ بێ‌هێز و پێزێك، هەرگیز لە بۆتەی دەستەڵاتدارانی ناتاوێتەوە. پلەی لە پێشی و گەورەیی، بە ئەندازەی ئاکاری

باش و له خواترسانه.

کوردیش -که چوونەتە ژێر سێبەری ئاڵای پیرۆزی ئەم ئایینە پاکەوە- دیتوویانە وەك بیستوویانە وایە و موسوڵمان هەمووی پێکەوە برایە و هەموو بۆ یەکتر پشت و پەنان و ئەگەر جاران کەمێکی بێ کەس بوون -وا لە سایەی ئایینی تازەوە- بوونەتە زۆر و کەس زۆریان لێ ناکا. ئایین و ڕەوشتی نوێیان بە لاوە زۆر لە ڕێوشوێنی پێشینی پڕئازاری ئاگرپەرستیەکە، لەبار و چاکتر بووە و لە سایەی ئەو فەرمانە ئاسمانیەدا- کە قورئانە- ماوەیەکی زۆر باش حەساونەوە. بەڵام هەزار داخ و مخابن! کە ئەم جەژنە پیرۆزە زۆری نەخایاندووە و لەشکری خەم و پەژارە دووبارە سەری لێ داونەوە و بە سەربەستی نەماونەوە. دەسەڵاتدارە ڕاست و دروستەکانی ئیسلام، بەرەبەرە لە ئاسۆی ژیان ئاوابوون و کە ئەوان چوون، خوونکار و زۆرداری بە ناو موسوڵمان و بە هەناو دوورەویژدان -وەك گورگی کەپەنەك بە شان- خۆیان ناو ناوە شوان و لە فەرمانەکانی خوا هەرچی بۆیان نەلواوە، پاش گوێیان داوە و دەستیان کردووە بە ڕەگەزپەرستی و ملیان ناوە لە نەتەوە هەڵاواردن و بێهێز خواردن.

لەو نێچیر هەڵبژاردنەدا، کاتێ کوردیان بە دیاردە هەڵناوە و دە کەژ و چیای ڕژد و هەڵەمووتی کوردستانیان هەڵڕوانیوە و گەلی کوردیشیان زۆر لە خۆیان بە ئازاتر ناسیوە، هەرگیز دە خۆیان ڕانەدیوە ڕووبەڕوو بە شیری ڕووتەوە هەڵمان کەنێ و پەلامارمان بدەن و بەردەسمان بکەن. زانای زۆر وریا و گزیزانیان، بیریان لێکردۆتەوە و زانیویانە ئەو بەرووداره گرێداره، بەوان هەڵناکەنێ و ئەگەر دەسکی بیور و هۆرە و پوازی لەخۆ، بۆ نەتاشن و لە ناو خۆیدا کرمی پێ هەڵنەهێنن، زۆریان پێ ناشکێ و شکاندنی زۆر دژوارە. ئەگەر دەکرێ کارێکی واپکەن هەر کوردەکە کوردەکەیان بۆ بکاتە پاروەچەورە و بیخاتە دەمیانەوە. ڕاوی کەو بە کەو بکەن و هەر کەوێکی لە داو کەوت بیخۆن و ئەگەر کەوگرەکەش لە ڕاو کەوت، هاسان دەخورێ. جا بۆ ئەو مەبەستە هەستان بە ناوی برایەتی و هاوئایینی و هاوسایەتیەوە، خۆیان دە ناو هەڵکێشاوین و بێ هەست و خشپە چوونەتە بن کلێشەمانەوە و چنگوڕکیان خستۆتە ڕیشمانەوە. مەلای بێ نان و پیری نەزانیان بە زێڕ و زێو کڕیوە و دەستی گەلی بەستەزمانیان پێ بڕیوە؛ مێشك و دڵیان وا لە پڕوپووچ ئاخنیوین هەر بە جارێك تاساوین و تەزیوین و بێگانەش لە بن سێبەری مێزەر و پرچ و ڕیشی خۆمانەوە داوی ڕاویان بۆ تەنیوین و تەپکە و فاقەیان بۆ ناوینەوە؛ هیچ بە خۆمان نەزانیوە تا تێکەوتووین و پێوە بووین و لە فڕە و پەلەقاژە کەوتووین.

بە زمانی لووس و بزەی ژەهراوی و سوێند و پەیمانی درۆزنانە، فریویان داوین و ئێمەش -کە ڕاست و دڵپاك ڕسکاوین- باوەڕمان کردووە و گوتومانە: برای هاوئاییین دڵسۆزمانە و وەك خۆمانە و هەرچی بوومانە خستوومانەتە بەردەمی برای میوان و بۆ خۆمان بە برسیایەتی سەرمان ناوەتەوە. برای دەسبڕیش -لە باتی چاکە- لە بن دوو گردی فێڵبازیەوە، وازی بە ئاوەزمان کردووە و مرخی لە دڵ و مێشکمان خۆش کردووە و لە بیری نەتەوایەتی و گەلپەرستی دایتەکاندوین و تەکانی پێداوین، تا لە ڕاستەڕێی ژیانی کلاکردووین و بە دەردێکی بردووین کەس نەزانێ ماوین یان مردوین. ئەوسا هەر بە هالاوی دەمی گەرمی، وا کولاوین و تولاوینەوە، کە تۆزکالێکیش بە چیرِی نەماوینەوە و هەر بە لێوان خوراوین.

## چارەنووس

بە درێژایی هەزار و ئەوەندە ساڵە، زۆربەی هەرەزۆری کورد، وا تێ گەیەنراوە کە هەرچی بە سەری دێ، هەر ڕۆژی بەرێ لە چارەی نووسراوە و کۆشش و ماندوو بوونی بێ بەهرەیە و زۆر دەمێکە هەموو شت براوەتەوە و هەرگیز مانای ئەو فەرمانەی خوای بۆ لێ نەدراوەتەوە کە فەرموویە: بە تێکۆشان نەبێ، مرۆ هیچی دەسگیر نابێ.

## بە گەڤی گەرم سارد بووینەوە

منداڵی کورد هەر لە ڕۆژی چاوکردنیەوە بە دووپشکی حەوگری و ماری سەرپان و ئاگری بێتامانی دوای نەمانی فرچك دەگرێ و ڕێگەی هەموو خۆشی و شادی و ئاواتی دنیای لێ بەربەست دەکرێ و بێچارە چاری خۆی هەر لەوەندەدا بەدی دەکا، پرچ و ڕیش بەرداتەوە و هانا بۆ پیری بێ پیر بەرێ و بگری و بکڕوزێتەوە و ئەرکی ژیانی لە بیر بچێتەوە. هەموو تەمەنی هەر ئامۆژگاری دەکرێ کە پیاو دەبێ بە بەشی بێبەشی ڕازی بێ و ڕووت و نەداری سەر دنیا لەولا دەوڵەمەندە و نەخۆشی و لەش بەباری بەهرەی خودایە و دەرمان و بژیشك چیان لە دەس نایە و چاری دەرد و ژان، لە نوشتەی مەلا و خاکی سەر گۆڕی چاك و پیرانەوەیە و هەرچی دم دە دمی مەلا بنێ، هاواری دین و دنیایەتی و هەر

کەس نەچوویێتە ژێر سایەی پیـرێکەوە، شەیتان ڕێبەر و کوێخایەتی.

بە هەزار و ئەوەندە بەند و باوی بن شڕ و بڵاو، بڕستیان لێ بڕیوین و بە هـەودای داهـۆ، چـاویان دادووریوین و بە دڵنیایی شیشاونە گیانـمان و هەرچـی هەسـت و نـستمانە، بـە خڕوپـڕی ڕایانـداوە و تەنانەت هونەر و ڕەسەن و مێـژووی پـڕ لـە شانازیـشمان لێـدزراوە و بـە ڕووت و قـووتی کەوتووینـە دەشتەوە و بە پاڵەپەستۆ خزاندوویانینە چیاوە و ئەوسا تیرمان پێ پێکەنیون و گوتویانە: ئێـوەی بـرای موسوڵمانـمان ڕووت و بێبژیون! وەرن -بە خێری ئیمـانی خۆمـان- بـەخێوتان کەیـن! لـە سـەرمانە پیاوانە و موسوڵمانانە بە سەرتان کەیـنەوە؛ ئەوەی لە خۆتانـمانەوە پێگەیـشتووە، هـەزار یـەکێکتان دەدەیـنەوە؛ با لە برسان نەمرن. بەڵام دەبێ ئێوەش نەمەگتان لە چاودابێ و بە کـاری ئێمـە بـچارێن. پیاوی ناچاریش هەموو شتێکی بۆ ڕەوایە. کەوایە لە ڕێی نان و ژیاندا کوشتـن و خۆ بەکوشت دانـیش ڕێ تێدەچێ. داگیـرکەرانی کوردستان بـە درێـژایی مێـژوو کوردیـان خـستۆتە پـێش خۆیـان و بەگـژ دوژمنیاندا کردووە. هەر کوردێکی لە تاوی گیانی خـۆی لەوانـە هەڵگەڕابێتـەوە کـوردی هاوڕەگـەزی خۆیان ناردۆتە سەر و لاساریان پێ لە سەر ڕێگە لابردووە.

کورد کە خاوەنی ماڵی خۆی نەبووە، بـە دەسـندەخۆری و نـەمر و نـەژی، بـەخێو کـراوە و واش تێگەیەنراوە کە خـزم و کـەس دادی پیـاو نـادەن و دەر و دراوسـێ، نەتـەوی و نەویـستـن و دەسـتی هەنگویناوی بـخەیە زاری خزمانەوە، دەیگەزن و دار و بەردی دەور و بەرت پێت دوژمنە. هەر خەلیفە و پاتشای موسوڵمان -کە ئەویش کـورد نیـە- لـە ڕۆژی تەنگانـەدا جێگـەی هانـا و هاوارانـە و لـە قیامەتیشا فریاڕەس هەر خۆیـەتی. ئـەو هـەزار و سـەدان سـاڵە، ئـاوا گـۆش کـراوین و هاوکـاری و کوردەناموسیمان لەبیـر براوە و بیـر و بڕوای نەتەوەخوازی و کەڵکی کۆمەڵایەتی و بـەهرەی دەسـتی گەلـمان لێ وەلا نراوە و تەنانەت زمانە زکماکەکەی خۆشـمان لە بەرچاو خراوە و بـە شـات و شـووتی درۆنەخشینان، ڕەچەڵاك و بنیچە و نەژادەکەی بووشـمانە، لە بەرمان بێزراوە و سەروبەری هەموو کـار و کردەوەیەك -کە هەر لە مێژینەوە فێرمان کـراوە و بۆمـان بـە کەلـەپوور ماوەتـەوە- هـەموو هـەر ئەوەیە: ئەم لا دەکەیـن، ئەولا دەکەیـن، بە بلوێری داگیـرکەر سەما دەکەیـن!

خۆشەویستی نیشتمان و خزمایەتی و هاوخوێنی خۆمان لە دەست داوە و کەســمان نازانیـــن چ

بووین و چۆن بووین و چیمان بە سەرهات و چۆن چووین؟ لە هەموو ڕەوتاندا بە ڕەوتێك فێرین؛ ئەویش سوێسکەییە. لە مێژووی خۆمان هەر ئەوەندە دەزانین کە بابەڵبابمان نۆکەر و دەسندەخۆری بێگانەی داگیرکەر بووە و هەتا مردووە پارووی بە خوێنی هاوخوێنی خۆی تەڕکردووە و ڕەگی خۆناسین و سەربەخۆیی تێدا مردووە و هەستی بە سووکایەتی نەکردووە.

پیاوی سووك دەردی سووکی ناکێشێ      زامی ئەندامی مردوو نائێشێ

کەسی واشمان نەبووە چش لە بەرماوی بێگانە بکا و هەلپەرستی بە گەلپەرستی بگۆڕێتەوە و دەنگ هەڵێنێ و لەو خەوە بێبڕانەوەیەمان ڕاپەڕێنێ و تۆزێکمان لە دەردی خۆمان تێبگەیەنێ.

خوێندەوارمان -کە شادەمارمانن- لە فێرگەی داگیرکەراندا زمان و ئەدەبیاتی بێگانەیان پێخوێندراوە و ڕەسەنی و پێکەوتوویی و پایەبەرزی خۆیان و نزمی گەلانی ژێردەستەیان فێر کردوون و زمان و دڵ و دەست و قەڵەمیان بۆ خۆشەویستی ئاغا و خێزان و خزمی ڕاهێندراوە و دادراوە و ئەوا پێیان سپێراوە، نەخوێندەوارە ساویلکە و بەستەزمانەکەیان بۆ بەردەست و بێهەست بکەن و ئەو لە گۆشتە براشتەکەمان بنەوێ و ئەمانیش ئێسکە هەلکروزاوێك و تیکە بەرماوێکیان بەر بکەوێ.

## ماکی ناسۆر

ئەگەر میرشەرەفخان و سەیدای خانی، تاوانی یەك نەگرتن و لێك دووریمان دەخەنە سەر ملی ملهوڕی و لاساری و دەمار ئەستووریمان -دەبێ لێم ببوورن- بە بڕوای دڵی من، پەروەردەکرانی هەزار ساڵەمان دەو چاڵەی خستووین و ئەوەی پێ کردووین کە کردوویە و چاوبەستن و گزیکاری بەدکار و نالەباران بەو دەردەی بردووین.

ئەوەندەی چڕی و دڕی شاخ و داخ و چیا و کەژە ڕژد و دژوارەکانمان و زۆری و خوڕی ڕووبارەکانمان، بوونەتە لەمپەر و بەرگری پێك گەیشتن و تێك گەیشتنمان، سەد ئەوەندە و بگرە سەدهەزار ئەوەندە، بەندوباوی پڕ لە تەفرە و ژەهراوی برایانی دەمگەرم و دەسبڕ و ئاشنایانی بە دیمەن جوان و بنشڕ، ئەو پەندەیان پێداوین و لەو بەند و داوەدا شەتەك دراوین و تا ئێستاش هەر بە دیلی و هەژاری و خاکەساری ماوینەوە.

گاوا، مامۆستاکەی سولتان مراد دەیفەرموو: «کورد ئەوەتەی هەیە —لە وتەی شادە و ئیماندا نەبێ- یەکتریان نەگرتووە!» نابێ نەشیزانیبێ کە خەتی خوار دەبن سەری گای پیر دایە و ئەنگوستی سولتان و کلکی باب و باپیرانی سولتانیشی تێدابووە. ئەو سولتان سەلیمەی گوتویە: «مێش، کێشەیان دەناو کەوێ، پیاو دەتوانێ تێر بخەوێ!» دەیزانی کەولی خەز و کیسە لیرەی هەلمساو، مامۆستا مەلا ئیدریسی بۆ تاو دەکا و لێی دەپاڕێتەوە کە ترکێك بکە بە میری میرانی کوردستان؛ ئەوسا کوردەکان قزلباشانت بۆ لە کوردستان دەردەکەن! ڕەنگە مەلا لەو کاتەدا کە فلوریەکانی خستبێتە ناو گیرفانی کەولە خەزەکەوە، فەرموویێتی: «بەرێکی من شیرین بار بێ، با بەشی کورد ژەهری مار بێ!»

ئەو مەلا ئیدریسەی کە هەموو کوردی هاوچەرخی بە پیاوێکی پیرۆز و پایەبەرزیان زانیوە، ئەگەر بە شیری کۆیلەیی پەروەردە نەکراباو هەروا تۆزکالێك دەماری کوردایەتی تێدابا، کوردەکانی تێدەگەیاند کە ئێوە عەجەم لە کوردستان دەردەکەن؛ مەبنە نۆکەر و نانخۆری عوسمانی و وەرن خاوەنی نیشتمانی خۆمان بین. ئەگەر خان بۆ خان و بەگ بۆ بەگ سەر ناچەمێنێ، با من کەیخودا و ڕیش سپیتان بم و بە کارتان ڕابگەم؛ مامۆستایەکی بەناوبانگی کوردستان، لە دەرکەوانێکی تورك و بێگانە باشترە! بەڵام وای نەکردووە تا بزانین دەیانکرد یان هەر گرنەیان لە تورکی دەرکەوان دەگرت؟!

چیرۆکی سەیر و سەمەرە وا لای کەریمخانی زەندە؛ ئەو پادشا زل و بەدەستەڵاتەی ئێران، لای وابووە چونکە کوردە، ڕێی ناکەوێ ناوی شایەتی پێوە بێ! بە خۆی گوتووە: وکیل‌الرعایا (دەمراستی مسکینان)!

مەلای خەتێ، هەمەکارەی میری ڕەواندز بووە و لە لای سەرووی خونکاری کوردستان ڕۆنیشتووە؛ بەڵام نانی میر نانێکی خۆماڵیە و بە دەمی مەلا خۆش نایە؛ ئەو فێری جیرەی خانەدانی بێگانەیە. بە فتوایەك دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆی سەرەوژێر کرد و تا خۆی نەکردەوە بە نانخۆری داگیرکەر، ئۆقرەی نەگرت!

هیچ دوور نەڕۆین، هەر لە ڕۆژگاری خۆماندا و لە نیوەی دووهەمی چەرخی بیستەم دا، گەلێك

خوێندەواری بە ناو کورد و کوردیزمان، لە قەوارەی کوردستانی نیشتمانیان بوونە پواز و بۆ نەمانی کوردەکانی ئازادیخواز و بۆ سڕینەوەی ناوی پیرۆزی کوردستان، بە دڵ و بە گیان تێدەکۆشان!

بە چاوی خۆمان دیمان، لە جەنگەی شۆڕشە خوێناویەکەی بارزانیدا، کە هەزاران لاوی کوردی هەژار و نەخوێندەوار و دەربەدەر -گیان لە سەر دەست و دەست لە سەر خەنجەر- دە گژ داگیرکەری ڕەگەزپەرەست و بێ بەزەیی ڕا دەچوون، ئەو خوێندەوارانەمان لە پێش لەشکری دوژمنانەوە چەك بە شانەوە دەهاتن و گوندی کوردستانی نیشتمانیان دەسووتاند و کوردیان دەکوشت و جوتێر و وەرزێری بێچارەیان دەڕووتاندەوە و ماڵی کوردیان تالان دەکرد و منالی ساوایان دەخستە سەر گڕی ئاگری سوور و لە دوورەوە فڕۆکەی دوژمنیان شارەزا دەکرد کە چۆن بۆمبامان بە سەردا ببارێنن و چۆن هەست و نستمان بتارێنن... بۆچی؟ چونکە ئەو خێزانەی ئەوانی لە ناودا پەروەردە بووە، نەیانزانیوە جگە لە ژێردەستی و بێگانەپەرستی، ڕەوشتێك هەیە! لە فێرگەش هەر ئەو بەند و باڵۆرە فێر بوون. ئەگەر لەم لاولاش، لە مەڕ ئازادی و سەربەستی گەلەوە چپەیەکیان وە بەر دڵ و گوێ کەوتووە، تەواو جێگەی خۆی نەکردۆتەوە و هێندەی ڕەگ دانەکوتاوە کە تازە هەڵنەکێشرێتەوە. لە سەرەتای شۆڕشی گەورەی کوردستاندا -کە لایان وابوو سەیرانێکە دەکرێت و قەیرانێکە بە چەند ڕۆژێك بە سەر دەچێت- هاتنە ناوەوە کە ناو دەرکەن و پلاو بخۆن؛ بەڵام کاتێ زانیان ڕێگای ئەم پیاوەتیە هەڵەموت و دژوارە و زۆر حەستەم و پڕ ئازارە، گورج کەوتنەوە سەر هەوای تەلار و ژیانی ناوشار و وەك پیرێژنەکە، بە دەردی پار چوون و دایانەوە سەر شۆپ و ڕێکی باب و باپیران؛ کە ژیانی نۆکەری و دوور لە دەردیسەریە. لە کوردەواری خۆمان دەڵێن: «خویەکی بگری بە شیری، بەری نادەی بە پیری».

من بە بڕوای خۆم ئەم ئاهۆی بە نۆکەری فێربوونەمان و ئەم خۆ بە کەم زانینەمان، ماکی هەموو دەرد و بەڵایەکمانە. هەرگا بیری زۆربەی کورد بگاتە ئەو قۆناغە کە بڕوای وابێ ئەویش وەك خەڵکیتر وایە و مافی ژیانی پێ ڕەوایە و ئەوندە لە مەندە کەمتر نیە و کۆیلەیی کردن شەرم و شورەییە، هەرگیز نە خاینی خوێندەوار و نە جاشی نەخوێندەوارمان لێ پەیدا دەبێ و نەش وەك مەلای خەتێ، لە خەت دەردەچێ.

---

جارێك حەمەداغا ناوێکی موکوریانی، بە نۆکەرێکی پیر و زورهانی خۆی دەڵێ: ڕیشت سپییە

و پێم شەرمە لە پاشخانە بەرماوی من بخۆی؛ لە دیوەخان دانیشە با لەگەڵ منا سینیت بۆ بێنن. مام خدری نۆکەر دەڵێ: ئاغا شازدە تەنەکە ڕۆنت پێشکەش دەکەم ژیانی چەند ساڵم مەگۆڕە. دەنا ناچارم بار دەکەم و دەچم لە پاشخانەی ئاغایەکی دیکە دەژیم. تازە بە سەری پیری دەستم پێ لە بەرماو خواردن هەڵناگیرێ!

وای دەزانم ئەم چیرۆکە، چیرۆکی هەموو کوردێکە. تا بیری نۆکەری و بەرماو خواردن نەگۆڕێ، نابێتە دیوەخانشین و تا دەشی گۆڕێ، زۆر کارێکی چەتوونە. هەر کە گۆڕیشی ژیانی بەرەو باشی دەگۆڕێ. مامۆستای نەمرمان جەنابی مەلای کۆیە زانیوویە دەڵێ چی کە فەرموویە:

ئەوی ڕێگای لە کوردەکان گۆڕی    لەعنەتی خوای لە ئەلحەد و گۆڕی

## شەرەفنامە هونەرنامەیە

ئەو کەسانەی شارەزای ئەدەبی فارسی کۆن و نوێن و دەیخوێننەوە و لێی دەدوێن، بۆیان دەردەکەوێ کە ئەدەبیاتی فارسی لە ئێراندا، لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی سەفەویەکاندا -کە میرشەرەفخانی تێدا ژیاوە- ڕەنگێکی تایبەتی بە خۆیەوە گرتووە و بەرگێکی زۆر فش و فۆڵ و ناقۆڵای دەبەر خۆی کردووە. وشە و ڕستی ناپێویستی ڕەق و تەقی دەروێشانە و ناوناخن و شڕە بزگوری بێکارە و ناهەمواری تێ خزاوە. فارسەکان خۆیان ئەو ڕۆژگارە بە قەیرانی کەنەفتی ئەدەبەکەیان دەژمێرن و لایان وایە لەو ماوەیەدا لە گەشە کردن وەستاوە و بگرە سیسیش هەڵگەڕاوە. ئەگەر ئەو نووسراوە فارسیانەی لەو چاخەدا نووسراون، دەگەڵ فارسیەکەی *شەرەفنامە*دا، لە بەر یەکیان ڕاگرین، گومان نامێنێ کە شەرەفخان سەرتۆپی هەموو نووسەرانی فارسی زمانی ئەو زەمانە بووە و بۆ کەرەستەی *شەرەفنامە*کەی، هێناویە پوختەی فارسی ئەوسای گوڵبژێر کردووە و چەپکی سەرسەوەتەی ئەدەبیاتی فارسی ئەو سەردەمەی نیشانی خەڵکی دنیا داوە. وەك گوتیشمان، ویستوویە لە مێژوونووسینیشدا کارێك بکا کە گرۆ لە هەموو مێژوونووسێکی هاوچەرخی بباتەوە و کەس دەخۆی ڕانەبینێ، دەمەلاسکەی بکاتەوە. واتا بە تیرێك، دوو نیشانەی هەنگاوتووە: مێژووی کوردی کۆ کردۆتەوە و لینگە مرواریەکی نایابیشی لە ئەدەبی فارسیدا هۆندۆتەوە.

ئەم شیرینکاریەی ئەو شاسوارە خونکارە، منی هەژاری دنەدا کە لە وەرگێڕانی نووسراوە بەدەنگ و ناوەکەیدا، بەردێك بگرمە دوو چێشکەوە:

رووداوی مێژوویی -وەك لە شەرفنامەدا هەیە- بە زمانی کوردی بگێڕمەوە. هەوڵیش بدەم بە پێی توانا، ئەدەبی ئەمڕۆی کوردی تێدا جێ کەمەوە. جا ئەگەر نەشم پێکا، بۆ هەژارێکی وەك من هەر مایەی شانازییە؛ خۆ هیچ نەبێ، باڵە کلۆیەکم بە دیاری هێناوە.

عەزیزم ئەهلی میسرێ بوون بە کڕیارت بە گیان و دڵ
کەچی کوردی، لەشی وەك داوەمووی دێنێتە بازاڕت

## چۆنم وەرگێڕاوە

وەرگێڕانی *خەیامم* بە دەستەوە بوو؛ مامۆستایەکی پایەبەرز لێی پرسیم: فلانە وشەی فارسیت چۆن بە کوردی جێ کردۆتەوە؟ گوتم: ئەزیەنی! من نیازم وا نیە فارسی فێری کورد بکەم، تەنیا و تەنیا بیر و بڕوای خەییام بۆ کورد دەگێڕمەوە. لە وەرگێڕانی *شەرەفنامەشدا*، هەر ئەو ڕچەیەم ڕەچاو کردووە. پوختەی ڕووداوە مێژووییەکەم بە کوردی بۆ کورد گێڕاوەتەوە. لەو جێیانەشدا کە شەرەفخان -بۆ سەرپێ خۆش کردنی بەندەکان و ڕازاندنەوەی کۆڕی شەڕ و پێداهەڵگوتنی میر و مەزنەکان- ئەدیبانە بە فارسی دەستی خۆی وەشاندووە و خۆی ڕاناوە، من لە جیاتی ئەوە، کوردانە ملم لێ ناوە و ئەوەندەی شیرم بڕیویە، شنگڵم لەخۆ داوە، کوردییەکی ئەدەبی، یان ئەدەبێکی کوردی بخەمە بەرچاوی هاوزمانانم. هەڵبەستە فارسی و عەرەبی و تورکیەکانیشم کردوون بە شێعری کوردی و زۆربەی زۆریشیانم هەر لە سەر کێشی پێشوو هۆندوونەوە و هەر لە بیچمی خۆیاندا هەڵم خستوونەوە.

## تۆزە بژارێك

خوێندەواری ژیر و خوێن شیرین! دنیای ئێستامان نیوەی دووهەمی چەرخی بیستەمە و بنیادەم لە سەرپشتی مانگ، پاڵی داوەتەوە و بای باڵی دەدا کە ئەستێرەکانی کاکێشانیش بخاتە ژێر باڵ و بیانکاتە لانە و ماڵ و بەهرەیان لێ وەرگرێ. زۆر دەمێکە جن و دێو و دێوەزمە و خێو -لە بەر

تیشکی کارەبا- بە شەوارە کەوتوون و لە دنیا ئاوارە بوون. کێوی قـافیش -کـە قـەفقازە- ئەوەنـدەی کارگەری سۆڤیاتی تێ خزاوە، جێگەی لاپرەسەنانی ئەفسانەی کۆنی لێ نەماوە. چوار چەرخ لەمەوپـەر زۆر کەس لای وابووە کە ئەو جۆرە نادیاریانە دەس بـەکار و دەسـەڵاتدارن؛ بـەڵام ئـەمڕۆ باسـی ئـەو پیـرهەڤۆك و شەوە و ئاڵانە، گاڵتەجاڕی منداڵ و کـوڕ و کاڵانـە و کـەس بـە ڕیـەیان نـاپێوێ و کـەس لەمەڕیان ناخێوێ.

لەوەتا زانستی تازە بابەت وەکار کەوتووە، تووك و نزای دەروێش و پیـریش لـە کـار کـەوتووە و بەرپیوار و نادیاری لە ئارادا نەماوە و هەرچی هەیە، هەیە و لە بەرچـاوە و چـاونوقاندن و پرتـەپرت و ورتاندن سەر لە زانا ناشێوێنێ.

میـرشەرەفـخان کە ئەو ڕۆژە بە دەس پاکی دەسـتی بـۆ بـردوون و دەسـکاری نـەکردوون و وەك بیستوویە گێڕاویەتەوە -دیارە هیچ بە دڵیشی نەبوون؛ بەڵگەشم ئەوەیـە تـا لـەو مەبەسـتانەوە دواوە، پینەی «خوا بۆ خۆی دەیزانێ»ی پێوە ناوە- هەر خۆشی لە پێشەکیە بە نرخ و خۆشەکەیدا دنەی داوین و لێشمان پاڕاوەتەوە کە هەڵەی بۆ هەڵگرینەوە. ناچار بە هاواریەوە چووم و هێندێك جنۆکە و منۆکـە و بوغدوزی خوێنتاڵ و شتی لە ئاوەز بە دوورم لێ دوور خستەوە و کێشامنە ناو پێشەکیەکەی خۆمەوە و لە هەتیتەم داون. بە هومێدم گیانی پاکی ئەو میـرە نازدارە لەو بژارە هەژارانەیەم گـەش و شـابێ و لێم نەڕەنـجابێ.

خۆم زۆر بە بەختەوەر دەزانـم کە هەرچەندی لە دەستم هاتووە درێغم نەکردووە و هەر ئەوەندەشـم لەدەستهاتووە. هەرکەسیش هەر چەندی بۆی دەلوێ بیکا، کارمان زۆر دەچتە پێش.

لەم کارەمدا سەرکەوتووم، یان بەسەر سەردا کەوتووم، ئەوە خۆم نایزانـم؛ خوێـندەواری ژیر و بـە بیـر دەیزانن. هەر هێندەم لە دەست دێ لە بەریان بپاڕێمەوە کە بە چاوێکی بێلایەن و بە هێمنی، بـە وردی لە کردەوەکەم بڕوانن. بەڵام دیسان دووپاتەی دەکەمەوە کـە زۆر وشـەی کـوردیم خستۆتە سـەر کاغەز؛ ئیتـر کاکڵ و بەهرەیتریان هەبێ یان نەبێ، خۆم بە کردە پەشیمان نازانـم.

عبدالرحـمن «هەژار»

بێخۆڵان- چۆمان (١٩٧٠/٧/٢٠)

پاکنووسکردنی ئەم پێشەکیەی سەرەوە سەعات چواری بەیانی ڕۆژی سێشەمـمە ١٩٧١/٤/٥ دوایی هات.

# پێزانین

فەرموودەیە کە دەڵێ: چاکەی خەڵکت لە چاودا نەبێ، چاکەی خوداشت لە بیر نابێ. بۆ بەرهەم هاتنی ئەم *شەرەفنامە* کوردیە چاکەی زۆر کەسم لە سەرە کە لە سەر خۆمی بە پێویست دەزانم سوپاسیان بکەم.

زۆر سوپاس بۆ باوکی هەژارانی کورد (کاک مستەفا بارزانی) کە ئەگەر سایەی پیرۆزی ئەوم بە سەرەوە نەبا، هەرگیز نەمدەتوانی خزمەت بە زمانەکەم بکەم و هەلی نووسینم بۆ نەدەڕەخسا.

سوپاس بۆ مامۆستایان: محەممەدعەلی عەونی و یەحیا خەشاب و یەڤگینیاڤاسیلیڤا کە بە پێشەکیە بە نرخەکانیان بەهرەیان بە مێژووی کورد گەیاندووە؛ منیش لە وەرگێڕانی *شەرەفنامە*دا زۆرم سوود لێ وەرگرتوون.

سوپاس بۆ مەلاجەمیل بەندی ڕۆژبەیانی کە بۆ *شەرەفنامە* عەرەبیەکەی خۆی، زۆر بە وردی لە نووسراوەکانی حوسێن حوزنی و ئەمین‌زەکی بەگ و گەلێك کتێبی‌تریش ورد بۆتەوە و گوڵبژێری کردوون و هەرچی *شەرەفنامە*ی پێ تەواو دەبێ کردونیە ناواخنی نووسراوەکەی و بەو کارەی ڕێگەی دووری بۆ نزیك کردوومەوە و ئەگەر ئەو نەبا، من نەمدەتوانی ئەو کارە گرانە بکەم.

سوپاس بۆ شاعیری گەورەی کورد کاك هێمن مهابادی کە زۆر بە پشوودرێژی سەرلەبەری نووسراوەکەی پشکنی و زۆری هەڵە و پەڵە بۆ هەڵگرتمەوە و بە ئامۆژگاری زانایانەی گەلێکی بەهرە پێگەیاندم.

سوپاس بۆ مامۆستایان مەسعوود محەممەد و عەلائەدین سەجادی و دکتۆر کەماڵ مەزهەر کە لە سۆنگەی هەڵسەنگاندنیدا خۆیان بە خوێندنەوەی ماندوو کرد و بیروڕای خۆیان لەسەر دەربڕی.

سوپاس بۆ چیرۆکنووسی بەنرخی کورد کاك محەممەد مەولوود(مەم) کە بۆ دۆزینەوە و بردنەوە سەر یەکی بنەماڵەی میرانی سۆران، زۆری خۆ ماندوو کرد و سوپاس بۆ مامۆستا نوورەدین بەهائەدین ئەندامی دادگای تەمیزی عیراق کە لەوبارەوە درێغی‌نەکرد و بە شارەزایی ڕێنموونی کردین.

سوپاس بۆ هونەرمەندی بێوێنەی کورد، کاك بەدیع باباجان کە بۆ کلێشە و وێنە بەنرخەکانی ئەوپەڕی ئەرکی خستە سەرشان؛ خوا بە گەلی کوردی بێڵێ.

سوپاس بۆ کۆڕی زانیاری کورد، کە لە سەر ئەرکی خۆی چاپی کرد.

**هەژار**

ئەوانەی کە زۆریان خۆ بە مێژووی کوردەوە ماندوو کردووە و بۆ *شەرەفنامە* کوردیەکە بەهرەیان پێ گەیاندووم:

## مێژوونووسی کورد، حوسێن حوزنی موکوریانی



لە سەیدەکانی ینچکە و شقۆیفە کە دوو گوندن دەکەونە نزیك بۆکان. ساڵی ١٣١١ی کۆچی لە شاری سابلاغ (مەهاباد) لە گەڕەکی حاجی حەسەنیان هاتۆتە دنیاوە.

لە تەمەنی لاویدا ئاوارەی وڵاتان بووە. هەموو کوردستانی بەردەستی ئێران و عوسمانی ئەوسا گەڕاوە و بە مۆرهەڵکەنی بەڕێ چووە. ساڵی ١٩١٥ لە حەلەب چاپخانەییەکی گچکەی پێکەوە ناوە؛ بۆ بڵاوکردنەوەی ئەدەب و مێژووی کوردی تەرخان کردووە.

شێخ عومەر وەجدی مامۆستای ڕەواقی ئەکراد لە ئەزهەر بۆ مامۆستا گیو موکوریانی نووسیوە، دەڵێ: لە محەمەدعەلی عەونیم بیستووە گوتویە: «چاپخانەی حوزنیم لە حەلەب دیتووە کە ئەدەب و مێژووی کوردی پێ چاپ دەکرد. خەیاڵم بووە بچمە سوێرەك و سەر لە خزمان بدەم؛ بەڵام حوزنی ئەوەندەی کار تێکردم وازم لە سەفەر هێنا و گەڕامەوە میسر و بڕیارم دا منیش چاو لەو پیاوە بکەم و -بە پێی توانا- خۆم بۆ خزمەتی مێژووی کورد تەرخان بکەم.»

حوزنی ساڵی ١٩٢٥ هاتۆتە ڕەواندز و چاپخانەی زاری کرمانجی دامەزراندووە. ساڵی ١٩٤٣ لە ڕەواندز دوور خراوەتەوە و تا مردووە لە بەغدا ژیاوە.

هێندێك لەو کتێبانەی کە حوزنی لە سەر مێژووی کوردی نووسیون ئەمانەن: *مێرگەی دڵان*، *خونچەی بەهارستان*، *پێشکەوتن*، *ئاوڕێکی پاشەوە*، *میرانی سۆران*، *کوردستانی موکوریان*، *ناودارانی کورد*، *بە کورتی هەڵکەوتی دێریکی*، *لاپەڕەیەك لە دێریکی کوردستانی موکوری*، *ناودارانی کورد*، گەلێکی تریشی نووسیون و بڵاو نەکراونەوە. هەروەها لە سەر ڕووپەڕی گەلێك گۆڤار و ڕۆژنامە و بە گەلێك نامیلکەی هێژا، خزمەتی زۆری بە ئەدەب و مێژووی کورد کردووە.

حوزنی لە ٢٠ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٧دا لە شاری بەغدا مردووە و تەرمەکەی ڕاگوێزراوەتە هەولێر و ئێستا گۆڕی ئەو پێشمەرگە دڵسۆزە لە شاری مێژوویی هەولێرە.[1]

---

١- ئەو زانیارییەم لە مامۆستا گیوموکوریانی -دایك برای حوزنی موکوریانی- وەرگرتووە. هەژار

## مێژوونـاسی کورد، ئەمیـنزەکی بەگ



ساڵی ١٨٨٠.ز لە شاری سلێمانی لە گـەڕەکی گۆیـژە هاتۆتە دنیاوە. بە زمانی فارسی و عـەرەبی و تـورکی خوێندوویـە و لـە فێرگـەی ئـەرکانی حـەربی تورکیـا دەرچووە و بووە بە ئەفسەر. گەلێك کارویـاری دیـوانی تورکیا و عیراقی بە دەستەوە بووە و زۆر جاران وەزیـر و نوێنەر بووە.

*خولاسەی تاریـخی کورد و کوردسـتانی* لـە دوو بەرگدا نووسیوە. بـەرگی یەکـەم سـاڵی ١٩٣١ چاپ کـراوە و سـاڵی ١٩٦١ لـە چـاپ دراوەتـەوە، بـەرگی دووهەم ساڵی ١٩٣٧ چاپ کـراوە. *مـشاهیـرالاکرادی* نووسیوە، *تاریـخی سـلێمانی و فـەرمانڕەوایانی* -کـە ساڵی ١٩٣٩ چاپ کراوە- بەرهەمی قەڵەمی ئەوە.

ساڵی ١٩٤٨ لە ٩ی تەموزدا لە شاری بەغدا مردووە و تەرمەکەی براوەتەوە شـاری سـلێمانی و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە.

# زانای دڵسۆزی کورد، محەمەدعەلی عەونی



ساڵی ١٨٩٧.ز لە کوردستانی بەردەستی تورکیا، لە شاری سوێرەك، لیوای دیاربەکر هاتۆتە دنیاوە. پلەی یەکەم و دووهەمی خوێندنی لە تورکیا تەواو کردووە و بۆ فێر بوونی زانستی ئائینی و عەرەبی هاتۆتە میسر و لە قاهیرە، لە ئەزهەر خوێندوویە و کارنامەی بەرزی ساندووە.

زمانی فارسی و فەرانسیشی زۆر باش زانیوە. دەگەڵ ماڵە بەدرخانیەکاندا لە دامەزراندنی کۆمەڵی خۆیبووندا بەشدار بووە. لەبەر کوردایەتی کردنی، تورك نەیانهێشتووە بگەڕێتەوە نیشتمانی خۆی و هەر لە میسر ماوەتەوە و لە دیوانی شاهیدا بە وەرگێڕی زمانە ڕۆژهەڵاتیەکان دامەزراوە.

*شەرەفنامەی* فارسی لە چاپ داوەتەوە و پێشەکی و پەراوێزی زۆر هێژای لە سەر نووسیوە. هەروەها *شەرەفنامەی* کردۆتە عەرەبی و لە پاش مەرگی ئەو -ساڵی ١٩٥٨- وەزارەتی تەربیەی میسر لە چاپی داوە.

مەسەلەی کورد (القضية الكردية)ی بلەچ شێرکۆ- عەرەبییەکەی- ئەونووسیویە. *خولاسەی تاریخی کورد و کوردستان* و *تاریخی دوەل و ئەماراتی کوردی* مامۆستا ئەمین زەکی بەگی کردوون بە عەرەبی و بە پەراوێزی زۆر بایەخداری ڕازاندوونەوە. جزمی دووهەمی مشاهیرالاکرادی ئەمین زەکی بەگی لە چاپ داوەتەوە. گەلێك نووسراوی زۆر بە نرخی لە سەر کورد و کوردستان هەیە کە تا ئێستا بلاو نەکراونەوە.

ساڵی ١٩٥٢ لە ١١ی تەموزدا مردووە و لە قاهیرە، لە تەکیەی شێخ مغاوری لە جەبەل مەقتەم، لە نزیك گۆڕی «عمر ابن الفارض» نێژراوە.[١]

---

١- ژینامەی محەمەدعەلی عەونیم لە مامۆستا نەجمەدین عەونی - برای- وەرگرتووە. هەژار

## مێژووزانی هێژا، مەلا جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی



ساڵی ١٩١٢ لە گوندی فورقان لە وڵاتی کەرکووک هاتۆتە دنیاوە. لە مەدرەسەی ئاینی خوێندووە. لە کوردی و تورکی و عەرەبی و فارسیدا زۆر شارەزایە و بە هەر چوار زمانان زۆر نووسەری چاکە. *شەرەفنامەی* بدلیسی کردۆتە عەرەبی و گەلێك پەراوێزی جوان و بە کەڵکی لێ ناوە و ساڵی ١٩٥٣ لە بەغدا چاپ کراوە.

هەر وەها *تاریخی سلێمانی و فەرمانڕەوایانی* - کە مامۆستا ئەمین زەکی بە کوردی نووسیوە- مەلاجەمیل کردوویەتە عەرەبی و ساڵی ١٩٥١ چاپ کراوە. گەلێك نووسراویتریشی لە زۆر بابەتەوە هەیە و بڵاو نەکراونەوە.

هومێد وایە ئەو زانا هێژایە زۆرتر خزمەت بە زمان و ئەدەبیاتی نەتەوە بێکەسەکەی خۆی بکا و لەو ڕێگەیەدا ماندوو بوون و وەستان نەزانێ.[1]

---

١- ژینامەی مامۆستا ڕۆژبەیانیم لە دوکتۆر مارف خەزنەدارەوە پێگەیشت. هەژار

بە داخەوە لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٢ی زایینی، لە شاری بەغدا، بە شێوەیێکی دڕندانە، چرای ژیانی بە دەستی بەعسیەکان کوژایەوە. ماجد

بیــروبڕوای ئەو زانایانەی *شەرەفنامە* کوردیەکەیان بەر لە چاپ دیوە و هەڵیانسەنگاندووە و نرخیان بڕیوە:

## بڕوای کاك مەسعوود محەمەد

١٥/٦/٩٧١

کتێبی *شەرەفنامە* وەرگێڕانی مامۆستا هەژار لە فارسیەوە بۆ کوردی، بە چـاوی ڕخنـە گـرتن لـە زۆر شـوێنانیم خوێنـدەوە. فـەرمانێك کـە خرابـووە ئەسـتۆم ئـەوە بـوو: لـە بـاری ئـەدەبی و داڕژتـنی عبارەتەکانیەوە سەرنج بدەم. دووری و نیزیکی وەرگێڕانەکە لەگـەڵ ئەسـڵی فارسـی چـەندە و چـۆنە؟ شتێك نیە من لێم کۆڵیبێتەوە چونکە بەراوەردیم لەمـەیانی هـەردووکیان نـەکردووە تـا تـێ بگـەم و ڕاگەینم. لە باری ئەدەبیەوە ئەوەی بۆ من ڕوون بووە لـە هـەموو ئـەو شـوێنانەی کـە وەك نـموونەی سەرتاپای کتێبەکە خوێندومنەوە ئەمە بوو: کە وا مامۆستا هەژار چەشنێك نووسیـنی لە کار هێنـاوە ئەوەی تەکەللوفە تێیدا نیە؛ هەر دەڵێی قسەی ئادەمیزادێکە بـە لـووس و لێکـی و بێقـورت و گـرێ

داستانێك دەگێڕێتەوە و دڵ و مێشكی خوێنەر بۆ خۆی ئەكێشێ. مەبەسم هەڵدان و پێدا هەڵگوتن نیە؛ بەڵكو ڕاستی ئەوەی خوێندومەتەوە دەگێڕمەوە.

یەك لە نرخە زلەكانی دیكەی نووسینەكە ئەمەیە كە وا نمونەییێكی ئەوتۆ دەخاتە پێش چاوی خوێنەری كورد، ئاشنا بێ بە هەموو شوێن و مەڵبەندەكانی كوردستان و لە «ئیقلیمیەتی تەسك» خۆی ڕزگار كردبێ.

ئەوەندەی لەو كتێبەم هاتە پێش چاو و بە سەرنجی تەواوەوە دەمخوێندەوە؛ لە یەك جێگادا نەمدی نەفەس كورتی وەیا بڕینی بێدەسەڵاتانە وەیا هەڵاتن لە مانای مەبەس یا هەر كەم و كوڕیەك لەوانەی دەبن بە هۆی دالەنگاندنی بەرهەمی ئەدەبی و هونەری. ئەگەر لە گوێرەی گرنگی و درێژی كتێبەكە درێژە بدەم بەم ڕەخنەیەم، ماوەییێكی زۆر و ماندوو بوونێكی بێسنوورم پێ دەوێ. بۆیە بە كورتی و سادەگی ئەڵێم ئەم شێوە نووسینەی مامۆستا هەژار داهاتێكی تازە و نرخدار دەخاتە كۆڕی ئەدەبی و هونەری كوردییەوە.

**مەسعوود محەمەد**

**١٩٧١/٦/١٥**



مامۆستا مەسعوود محەمەد كوڕی جەنابی مەلا (مەلامحەمەدی كۆیە) و یادگاری هەرە بەنرخی خانەدانی جەلیزادەیە. ساڵی ١٩١٩ لە شاری كۆیە هاتۆتە دنیاوە. لای باوكی خوێندوویە و لە مەكتەبی دەوڵەتیش لە حقووق دەرچووە. لە كار و فەرمانی میریدا نایب و وەزیر بووە و ئەندامی تەرخانی «مجلس الخدمە»ش بووە.

ئێستا ئەندامی تەرخانی «كۆڕی زانیاری كورد»ە و خزمەت بە وێژە و زمانی كوردی دەكا. چاكترین كتێبێ كە لە سەر حاجی قادری كۆیی نووسرابێ ئەو نووسیویە و دوو پاژی گەورەیە و لە سەر ئەركی كۆڕی زانیاری كورد لە بەغدا لە چاپ دراوە[١].

---

١- مامۆستا مەسعوود محەمەد ساڵی ٢٠٠٢ی زایینی، لە سلێمانی كۆچی دوایی كردووە و لە كۆیە نێژراوە. ماجد

# بڕوای مامۆستا عەلائەدین سەجادی

شەرەفنامە

شەرەفنامە کە کتێبێکی مێژووی کوردانە و شەرەفخانی بتلیسی بەناوی خۆیەوە
لە ساڵی ١٠٠٥ی کۆچیدا بە زمانی فارسی دایناوە. ئەم کتێبە بەڕاستی بۆ مێژووی
کورد زەنگێکی گەورەی هەیە، ناڵێم مێژووی ڕێکوپێکە، ناخر بەداخەوە ئەوەتیم
مێژووی ئەمارەت و عەشیرەت و بنەماڵەی کورد لەم ڕووەوە وەکوو چۆنە
یەکەم کتێبە لە ئاستی خۆیدا هەر لێوەکەمە.

ئەم کتێبە لە لایەنی گەلێ کەسەوە وەرگێڕاوەتە سەر غەیری زمانی فارسی،
بە تایبەتی عەرەبی وەکوو مامۆستا جەمیل بەندی ڕۆژ...
بە سەرچاوەیەکی زۆر بەنرخ لە مێژووی کوردا لە ل...
لە کوردەواریدا... ئەو کەسانەشی ڕۆژهەڵاتناسیکا...
نایەوە سەر زمانی کوردی، کتێبەکە مێژووی
ئەو مێژووەی خۆی ~~...~~ بێبەشی بووە!
ئەو کتێبە کە تا ئێستە هەر بە فارسی قسەی ل...
عەبدولڕەحمان هەژار وەری گێڕایە سەر ئەو زمانە کە مێژووەک...
کتێبەکە هیچییە سەر زمانی کوردی. لەم ڕووەوە م...
تەنی، فارسییەکەدا بەراوردم کرد، لە ئەنجاما وام ب...
وەرگێڕانی فارسییەکە نەبوایە ئەمتوانی بڵێم ڕاست...
بە هێزترە لە فارسییەکە چونکە جگە لەوە کە بە تەواو...
کە لە ئەسڵە فارسییەکەدا هەن عیبارەتە کوردییەکە هەمووی ڕاوە بە دەستەوە،
هێز و پێزێکی ئەدەبیشی بەرانبەر بە ئەسڵی زمانە کوردییەکە هاتۆتە ناوەوە؛
هاتۆتە ناوەوە بە مەرجێ کە شکڵی مەعنا فارسییەکە هیچ تێک نەچووە لە بەری
ڕێگای وەرگێڕانەوە. ئەم کتێبە ڕێگای وەرگێڕانی مەعنای گرتووە نەوەک شێوەی
تەرجەمەی حەرفی، بەڵکوو لە هەموو لایەکیشەوە چ لە لێکدانەوەکانیدا و چ لە
پەراوێزەکانیدا بە تەواوی حەقی خۆی داوەتێ. کە وا بوو بەلای منەوە
ڕاستە ئەم وەرگێڕانی شەرەفنامەی فارسییە بە کوردییە وەرگێڕانێکە پڕ بە
پێستی و هیچ کەم و کورتییەکی تێدا نابینم، بەڵکوو ئەتوانم بڵێم کتێبخانەی کوردی
بەم کتێبی شەرەفنامە کوردییە سامانێکی نوێی دەست ئەکەوێ.

علاء الدين سجادي

١٩٧١/٦/١٠

# شەرەفنامە

*شەرەفنامە* کە کتێبێکی مێژووی کوردە و شەرەفخانی بدلیسی بە ناوی خۆیەوە لە ١٠٠٥ی کۆچیدا بە زمانی فارسی دایناوە، ئەم کتێبە بەرانبەر بە مێژووی کورد نرخێکی کەورەی هەیە. ناڵێم مێژووی ڕەچەڵەك و بناغە بەڵکو ئەڵێم مێژووی ئەمارەت و عەشرەت و بەرە و تیرەی کورد؛ لەم ڕووەوە وەکو چۆن یەکەم کتێبە لە ڕاستیشدا هەر یەکەمە.

ئەم کتێبە لە لایەن گەلێ کەسەوە وەرکێڕاوەتە سەر غەیری زمانی فارسی؛ بە تایبەتی عەرەبی وەکو مامۆستا جەمیل بەندی و مامۆستا محەممەدعەلی عەونی و هەروەها بووە بە سەرچاوەیەکی زۆر بەرز لە مێژووی کورددا لە لایەن ئەو کەسانەوە کە باسیان لە کوردەوە کردووە؛ ئەو کەسانەش ڕۆژهەڵاتی ناسەکان بووبن یا غەیری ئەوان.

مایەوە سەر زمانی کوردی. کتێبەکە مێژووی کوردە؛ کەچی زمانی کوردی لەو مێژووەی خۆی بێبەش بووە! ئەم جارە و لەم ڕۆژەدا ئەو کتێبە کە تا ئێستە هەر بە فارسی قسەی لێوە ئەکرا لە لایەن مامۆستا عەبدولڕەحمان هەژارەوە خرایە سەر ئەو زمانە کە مێژووەکە هی ئەوە. واتە ئەو هێنای خستیە سەر زمانی کوردی. لەم ڕووەوە من چاوم پێ کەوت: لەگەڵ «نص»ە فارسیەکەدا بەراوردم کرد. لە ئەنجاما وام بۆ دەرکەوت ئەگەر کوردیەکە وەرگێڕراوی فارسیەکە نەبوایە، ئەمتوانی بڵێم دارشتن و بەپێزی ئەم، گەلێ بەهێزترە لە فارسیەکە؛ چونکە جگە لەوە کە بە تەواوی ئەو مەعنا و مەفهومانە کە لە ئەسڵە فارسیەکەدا هەن عبارەتە کوردیەکە هەمووی داوە بە دەستەوە، هێزوپێزێکی ئەدەبیشی بەرانبەر بە ئەسڵی زمانە کوردیەکە هاتۆتە ناوەوە. هاتۆتە ناوەوە بە مەرجێ کە شکڵی مەعنا فارسیەکە هیچ تێك نەچووبێ لە باری ڕێگای وەرگێڕانەوە. ئەم کتێبە ڕێگای وەرگێڕانی مەعنای گرتووە نەوەك تەرجەمەی حەرفی؛ بەڵکو لە هەموو لایەکدا -چ لە هۆنراوەکاندا و چ لە پەخشانەکاندا- بە تەواوی حەقی خۆی دراوەتێ. کەوابوو بە لای منەوە ڕاستە ئەم وەرگێڕانی *شەرەفنامەی* فارسیە بە کوردی وەرگێڕانێکە پڕ بە پێستی و هیچ کەم و کوڕیەکی تێدا نابینم، بەڵکو ئەتوانم بڵێم کتێبخانەی کوردی بەم کتێبی *شەرەفنامە* کوردیە سامانێکی زۆری دەست ئەکەوێ.

**عەلائەدین سەجادی**

**١٩٧١/٦/١٠**

ساڵی ١٩١٥ هاتۆتە دنیاوە. لە مەلایەتی خوێندووە و گەلێك نووسراوی هێژای بە کوردی بڵاو کردۆتەوە. لە مێژوودا، شۆڕشەکانی کورد و مێژووی ئەدەبی کوردی نووسیوە و کتێبە ئەدەبییەکانیتری وەك ڕشتەی مرواری و گەشت لە کوردستان و گەلێکیتریان زۆر بەناوبانگن. ئێستا لە کۆڕی زانیاری کورد، ئەندامی کارایە و خزمەت بە ڕێژەی کورد دەکا.[1]

---

١- مامۆستا عەلائەدین سەجادی ساڵی ١٩٨٤ی زایینی، لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە. ماجد

# بەرهەمی لێکۆڵینەوەی مامۆستا هێمن مەهابادی

## هەژار و شەرەفنامە



تەڕەسالّی وام نەدیبوو. هەوری ڕەش و چڵکن بەربینگی عاسمانیان بەرنەدەدا. تەم لە سەران نەدەڕەوی و باران هەڵی نەدەبرینگاند. ڕۆژ نەبوو چەند ڕەهێڵەی توند نەهێنێ و شەو نەبوو چەند ڕێژنەی بە خوڕەم نەبارێ. شریخ و هۆڕی هەوران نەدەپساوە و بە بێ نێوبڕ، بریسکەی دەدان. لەنگێزە و باسریشك و قوڕ و چلپاو و جلێتاو، بڕستیان لە کەڵ دەبڕی. کەویە بەفر و ڕونو هەرەسیان دەهێنا. زەوی دەجمی و ڕێوبان جمگەیان دەدا.

لەو بەهارە تەڕ و تووشەدا و لەو ڕۆژە گرژ و مۆنانەدا، لە بناری کێوە سەربەرزەکانی کوردستان، لە بنکەیەکی پێشمەرگە، تووشی یەك هاتینەوە.

من و هەژار لە منداڵیەوە هاواڵ بووین؛ وێکڕا پەڕەوازە و گەورە ببووین. هەڕەتی لاوەتیمان پێکەوە لە ناو چواردیواری قوڕماوی و پڕ لە جۆلاّتەنەی حوجرەی کۆنە مزگەوتاندا ڕابواردبوو. ئێستاش وا بە سەری پیری، پاش بیست و ئەوەندە ساڵ لێك دووری و هەڵبڕان و تامەزرۆیی، یەکترمان دەدیتەوە. نەهاتی و لێقەومان هەردووکمانی کەنەفت و کەلەلا و پیر و زۆرهان کردبوو. ئەو ئەستوور ببوو من لاواز؛ ئەو لە بەر ورگ و گەد و گیپاڵی پشووی لێ بڕابوو، من لەبەر کزی و بێهێزی هەر لاکەی سەرم دەهات. دیسان سەرمان گەیشتەوە یەك و بووینەوە یەك ماڵ؛ ماڵی چی؟ دوو لێفەی شڕ و پەتوڕ، سەر و سەرینی پەڕبلاو و هەڵوەشاو، هەر یەکە تەختە شکاوێك و بە هەردووکمان چرایەك و چادانێك و دوو پیاڵەی ڕووکێش و ئاوخۆرەوەیەکی گڵینە و ئاوێ بێنە و دەستان بشۆ.

ژوورەکەمان بە وشکە بەرد داندرابوو. دیوارەکانی خوار و خێچ بوون؛ لە هەموو لایەکەوە زگیان

دابوو. هیچ دیوێکی سواغ نەکرابوو؛ باگێڕەوەی نەبوو. ناڵودارەکانی کەڕواوی بوون و چەکەرەیان دەرکردبوو. هەڵاشەکەی داچۆڕابوو؛ بۆساردێکی پیسی لێدەهات. هێندە تەنگ و تەسك بوو بە چیرەچیر جێمان دەبۆوە. هێندە تاریك بوو بە نیوەڕۆ چرای دەویست. هێندە نەوی بوو تێیدا هەڵنەدەهاتینەوە.

قسەی خۆمان بێ زۆریش تێروپڕ نەبووین؛ دەگەڵ پێشمەرگە جوان و جحێڵەکان لە سەر خوانێك کۆ دەبووینەوە و ژەمەنانمان یەك بوو. زێدە پارووی چەور و نەرمی پیری چلێس و گردەنشینمان بۆ دیاری نەکرابوو. گوزەرانمان پێکەوە مێخۆش بوو؛ ترش و شیرن تێکەڵاو بوو. یادی ڕۆژانی ڕابردوومان دەکردەوە و دوارۆژمان بەراورد دەکرد. ئەوەندەمان خۆشی و ناخۆشی بە سەر دڵ و مێشکدا تێدەپەڕی کە وەك دەروێشەکانی چیرۆکی کۆن دەگریاین و پێدەکەنین. گریانمان بە پێکەنین سواغ دەدا. یاخود بڵێین زۆر زۆر پێ دەکەنین و قاقا دەگریاین. شەوگار شەق دەبوو، لە بێداری بێزار دەبووم باوێشك دەمیان گەزێك پێ دادەچەقاندم بە وەنەوز و وردەوێژینگانەوە دە بیرەخەو ڕادەچووم و دە لێفە شڕەکەم دەخزام و دەمەویست سەرخەوێك بشکێنم و شەکەتی و کفتیم نەمێنێ؛ ئەو تازە وەخۆ دەکەوت، چوارمێردەکی لە سەر تەختە بێبەختەکەی بە پانەوە دادەنیشت؛ کاغەز و قەڵەمی لە سەر گۆشی دادەنا؛ کەوڵە تیسکنەکەی بە خۆی دادەدا و ملی خوار و سەری زل و شان و کەوڵی کە سێبەریان دەخستە سەر دیوار، ئەو شەولەبان و غوولی بیابانەی وە بیر دێنامەوە کە دایکم بە ساوایی لێی ترساندبووم.

دیارە من لێم نەدەپرسی چ دەکەی. ئەویش نەیدەگوت چ دەکەم؛ بەڵام دەمدی *شەرەفنامەی* فارسی و عەرەبی لە دەوری خۆی دادەنان و لە بەر یەکی ڕادەنان و بە تێڕامان چاوەکانی بن چاویلکەی بازبازێنیان بە سەردا دەکردن هەر لە بن لێوانیشەوە پرتە و بۆڵەی دەهات و ورتەورتی بوو. جار لە دوای جاریش جیرەی قەڵەمە بۆری دەهات. بەوەدا دەمزانی خەریکی وەرگێڕانی *شەرەفنامەیە*؛ کە وەختی خۆی بە فارسی لە سەر مێژووی کورد نووسراوە و بە چەند زمانێکیش تەرجومە کراوە؛ بەڵام وادیارە هیچ کوردێك بە پێویستی نەزانیوە -یان دەخۆی ڕانەدیوە- بیکاتە کوردی؛ چونکە:

*شەرەفنامەی* فارسی یان بڵێین فارسی *شەرەفنامە* زۆر سەخت و گرانە و ئەمڕۆ لە ناو فارسیزمانیشدا هەموو خوێندەوارێك تێی ناگا. بۆ ئەوە ئەم ڕاستیە ڕوون کەینەوە دەبێ تۆزێك بەرەو

پاش وەگەڕێیـن و سووکە ئاوڕێك لە ئێرانی زەمانی سەفەوی بدەینەوە.

سەفەویەکان زۆڵەکوردی تازەتورکی لـە ڕێ دەرچـووی دووڕەگ بـوون و بـە ملـهوڕی و گـەلۆری دەژیان. لە ژێر پەردەی ئاییـن و بە ناوی وسێن و هەباسەوە شەڕیان بە خەڵك دەفرۆشت و لە کوشتار و تالآن و بڕۆ بەولاوە نەیاندەزانی دنیا چ باسە. گولله تۆپێکیـان بـە سـەد کتـێبی بـاش نەدەگۆڕیـەوە. هونەری جوان و شێعری پڕ مانا و ڕەوان، لە لای ئەوان شیـر و مەتاڵ و تیـروکەوان بوو. ئەگەر کاریان بکەوتبا نووسینیش نووسەرێکی وایان دەویست کە بە پاروە بەرماوێك و چنگە دراوێك کلکەسـووتەیان لە بەر بکا و کێچیان بۆ بکاتە گا و بە کەر بڵێ شێر و کوێر بـە چـاوتیژ دانـێ و دز و بێویـژدانان بـە خدری زیندە قەڵەمداد بکا. نووسەری هونەرمەند و کارامە و بڕوابەخۆ شەرمیان لـە خۆیـان دەکـرد و پێیان زۆر شوورەیی بوو ئاوروویان بە ئاوەڕۆ داکەن و ویژدان بە گیـرفان بفرۆشـن؛ بـە ناچـاری خزینـە گۆشە و کەنارانەوە و هەڵوەدای شاران بوون و هێندێك لە هینـد سـەری هەڵدایـەوە و گـەلێکیش بـێ ناوونیشان توایەوە. خوێڕی و تۆڕیش -کە ببوونە گۆشتی سەرچەپەر- بە بلـوێری خـاوەن زێـڕ و زۆران کەوتنە سەما و سەر و گوێلاکی ئەدەبی فارسیان لە بەر پێدا پلیشاوە و خـمی لێ شێوا و لەبـەر یـەك هەڵوەشا و ڕەتێنرا و نسکۆی برد و ئەگەر سەفەوی گۆڕیان گوم نەبووبا، لـە مـردن نەدەگەڕایـەوە؛ لـە پاش ئەوانیش هەتا درەنگ هەر خۆی بە سەر پێوە نەگرتەوە.

شەرەفخان لەو ڕۆژگارە ئەنگوست لە چاوەدا چاوی کردۆتەوە و لە ناو تەپ و تۆز و گێژەڵووکەی سەفەویدا بەخۆدا هاتووە. لە ماڵی شادا ئەو فارسیە دزێو و بن شڕەی پێ خوێندراوە؛ بەڵام ئـەو کـابرا بلیمەت و هەلکەوتووە -زۆر بە دەخۆڕادیوی- باسکی لێ هەڵماڵیوە و لەو گێژاوە خۆی پەڕاندۆتـەوە و هێناویە ئەدەبیاتە بێزەلەتەکەی ئەو ڕۆژەی بە با کردووە و لە کەوی داوە و بەردبـژێری کـردووە و بـە دانستە سپی کردووە و توێکڵی فڕێ داوە و کاکڵێکی پاك و خاوێن و تێرگۆشتی لێ هەڵبـژاردووە و لـە سەر پەڕی *شەرەفنامەی* داناوە و بە نـموونەی ڕەوانی و جـوانی پێشکەش بـە فارسـیدۆستانی ئـەو زەمانەی کردووە؛ بەڵام لە ڕاستیدا ئەو کاکڵە جوان و بەرچاوەش چونکە بـەری داری ئـەو دێمەکارەیـە هێندە ڕەق و چیـڕە ددان دەشکێنێ. جا من هەر چەند دەمزانی هەژار فارسی دەزانـێ و زۆر باشیـشی دەزانێ، بەڵام لە دڵی خۆمدا پێم وانەبوو دەتوانێ ئەو گابەردە لە سەر شان دانێ و لەو کەل و بەندەنـە ڕژد و کووڕە سەرکەوێ.

وەرگێڕانی ئەو کتێبە ڕەق و زلە، پشووی درێژ و جیکلدانەی گوشاد و لە کار نەوەستان و ڕەنجی فەرهای دەوێ؛ پیاوی دەوێ بە درێژایی ساڵ و مانگ، سێسەرەی لە سەر هەڵنەگرێ و هەتا ئەو کەلاوە هەراوە لە هەموو لاوە سەرنەگرێ، کاری بە کاری کەس نەدابێ. هەژاری وا شل و شەوێق و پەرژ و بلاو، لە لایەکەوە بە بنکە ڕابگا، لە لایەکەوە دەستەچیلەی گڕی شۆڕش بۆ ئێزگە کۆ بکاتەوە و لە لایەکیتریشەوە کەرەستەی ڕۆژنامە و شەونامە ئامادە بکا؛ سەرەڕای هەموانیش وەرگێڕانی *شەرەفنامەی* شەرەفخانیش سەربار بێ و ئەویش ڕاپەڕێنێ؟ هەیهوو! چی بە سەر چیەوە؟ بڕوام وابوو هەوایەکە لە کەللەی داوە و کرمێکە لە سەریدا دەجوولێتەوە و هەر سەرێکە و لێی وەڕەز دەبێ و وازی لێ دێنێ.

بەهار پیر بوو. باران وەستانەوە. هەور ڕەوین. تاو خۆی نواند. تەم و مژ بوونە هالاو و دەگەڵ بەفری پار چوونەوە. گز و گومبەت گەرما شالاوی هێنا و جڕوجانەوەر ژیانەوە و دوژمنانی کوردستانیش دەگەڵ تینی گەرما بووژانەوە؛ وەك ژەنگە سوورە هارووژان و دە سەروچاوی نیشتمانپەروەرانی کورد هالان. ڕۆژانە لە بەر گڕی فڕۆکە و گرمە و زرمەی بۆمبا و تەق و تۆق و شەوانە لە بەر هاشەهاشی ماران -کە بە درزی دیوار و کون و کەلێنی باندا، بۆ ڕاوی مشك و نانی وشك سەریان بە ژوورەکەماندا دەکرد- ئۆقرەمان لێ هەلگیرا و سانەوەمان لێ تۆرا و لە هێلانەکەی تەرەبوو. بەر لەوەی بزانم *شەرەفنامەی* کوردی سەری بە کوێ گەیشت، چاری ناچار لێك هەڵبڕاین و هەر یەکە بۆ لایەك بازرە بووین و وێڕای کەودەری دەگەڵ بەفران هەڵدەکشاین.

ساڵ پایزێکی درنگ بوو. سیخوار لە بەر پەساران هەڵی نابوو. تاور خۆشەویست ببوو. لە دەوری ئاورگی پڕ لە پۆلوی داربەڕوو، دیسان ژیانی دوو برالە دەقی جارانی گرتەوە.

ئێمەی وا سوێر قسە، هێشتا لە چەنەچەنی چاك و خۆشی نەوەستا بووین و هەژدەر- هەژدەر قسەمان لە دەم دەردەپەڕی، هەستا و لە سەر لاقەوە لە کۆنە تەوڕاتێك نەوی و خستیە ئامێزمەوە و گوتی: دەها بیخوێنەوە؛ بەلان گەردنت ئازا نەبێ ئەگەر بە چاوی دوژمن سەیری نەکەی و ئۆبالم بە ملت ئەگەر هەر ڕەخنەیەکت بە بیردا دێ، چاوی لێ بپۆشی و پێم نەڵێی. ئەگەر دۆستی بمگریەنە و نامەوێ قانەقدیم دەی. ئەگەر چرووك و پووکت وە بەرچاو بێ و دەنگ نەکەی، تووك لە مندالت نەیە. منیش بە بێ فوو لە دۆ کردن، خۆم دانا و هەژارنامەی کوردیم زۆر بە وردی خوێندەوە و دەگەڵ

ماکەکەیدا لە بەر یەکم ڕانان و چۆنم هاتە بەرچاو ئاوای دەگێڕمەوە:

پیاو هەق بڵێ، دەربارەی مێژووی کورد هەرچی شەرەفخان بە دڵ نیازی لێگرتووە و دەستی بۆ بردووە و خستوویەتە سەر کاغەز، نووك و بەدی هەر لە سیر هەتا پیوازی زۆر بە دەسپاکی ڕاگوێزراوە و بەرگە عەجەمیەکەی لی داڕناوە و جوان و قازاخ شۆڕاوە و جل و بەرگی زۆر نایابی کوردی دە بەر کراوە و بە خشڵ و زێڕ و سسلە و پیلە و خرینگە و ئۆییەی کوردانە ڕازاوەتەوە و ئەگەر دەیبینی هەژار قورعان دەخۆی کە ئەو کتێبە هەرگیز بە بۆرەخزمایەتیش نەچۆتەوە سەر فارسی و هەر زکماك کوردیە و بە کوردی ڕسکاوە.

هەر کەس بزانێ تەرجەمە کردن دەبێ چۆن بێ، تێدەگا کە هەژار ئەو کوردیە چۆن فێر بووە؛ بەڵام بۆ من کە لە گەپ و گەمەی سەر سەرانگوێلکانەوە دەگەڵی گەڕاوم و دەزانم چۆن ژیاوە و لە کوێ ژیاوە لە چەند سەرچاوەی هەڵێنجاوە، هیچ شتێکی سەمەرە نیە و بە لای منەوە باری خۆیەتی. بە بڕوای هەموو کوردیزانێکی لە ڕاستی نزیك و لە شەڕەگەڕەك بە دوور، تەنانەت بە بڕوای زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسانی ڕۆژاواییش، لە ناو زاراوەی سۆرانیدا شێوەی موکوریان لە هەمووان پاك و ڕەوانتر ماوە و شەوراوێژی دەمی بێگانەی زۆر کەمتر تێخزاوە. لە ناو موکوریانیشدا ناوچەی بۆکان لەو بارەوە سەرتۆپە. هەژار موکوریانیە و سەر بە ناوچەی بۆکانە و منداڵی ئەو ناوە هێشتا سەریان لە هێلکە نەجووڵاوەتەوە لە کوردیدا بلبلن و زمانیان هەتا بلێی ڕەوانە. بابی هەژار زانا و کوردپەرست بوو؛ هەموو کوردستان گەڕابوو؛ کرمانجی و سۆرانی زۆر باش دەزانی و لە ئەدەبی کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکیدا دەستێکی باڵای هەبوون. هەژار لە سەر کۆشی ئەو بابە زمانی گرتووە و قسەی خۆش فێر بووە و دڵ و مێشکی بە شێعر و چیرۆکی کوردی ڕاهاتووە. لە دێ گەورە بووە. دەگەڵ منداڵان بەو کوردیە بێگەرد و ساکارە دواوە. دەگەڵ کیژۆڵاندا لەوبەر لەوبەری چیاوە باللۆرەیان بۆ یەکتر هەڵداوە. شەڕەجنێو و فڕپێك دادان و تەوس و پلار و توانجی پیرێژنانی بیستووە. شەوانە بە لایەلایەی دایکە کوردی موکوریانی دە خەو ڕاچووە؛ بەیانی بە ورینگەورینگی دڵتەزێنی کیژە کوردی مەشکەژێن وە ئاگا هاتووە. لە مزگەوتی لادێ، بەیت و لاوك و حەیران و گەلۆ و شەو و نیوەشەو و درکانە و ئازیزە و پایزە و سوارۆ، گوێچکەیان ئاوداوە. بە مێرمنداڵی لە خانەقای شێخی بورهانی خوێندووە؛ کە دەتگوت کەشتی نووحە و هەموو توخم و تۆوێکی لێ کۆ ببۆوە. هەر شێوە و

زاراوەیەکت بویستایە دە بەردەستدا بوو. لە پەرێز و خێرۆکی پیران و زانایانی وەك: سەید ڕەشید و سەیفی قازی و شێخ محەمەد و مامۆستای فەوزی، دەسکەنەی کردووە و گوڵی هەڵگرتوونەوە. کە پێشگەیشتووە، دۆست و هاونشینی شاعیران و نووسەران و کوردیزانانی وەك: مەلا مارف و خاڵەمین و قزڵجی و حەقیقی و جەوهەری و کاکە ڕەحمانی موهتەدی بووە کە لەو باو خۆشتر بوون و هەر یەکەیان لە ئەدەبی کوردەواریدا دەریایەك بوون. لە بەر دەست و لە ژێر چاوەدێری پێشەوا قازی محەمەدی ئەدیبپەروەردا فێری ڕۆژنامەنووسی بووە و شێعری بە کۆماری کوردستان و شۆڕشەکەی هەڵگوتووە و نازناوی شاعیری میللی پێ دراوە. لە ژیانی ئاوارەییشدا بە دەردی خۆی گوتەنی: بە شەقی زەمانە فێری شێوە لێك جیاوازەکانی کرمانجی کراوە. لە ژیانی پێشمەرگەییدا شارەزای شارەزوور و شارباژێڕ و گەرمیان و بیتوێن و هەولێر و کۆ و خۆشناو و سوورچی و باڵەکایەتی و ناودەشت و گەلێك شوێنی‌تریش بووە و هەر پیرێکی کوردی‌زان و زیندووی دەست کەوتووە، زۆر بە وردی دۆزیویە و هەرچی لە دەمیانەوە دەرچووە، قۆزیویەتەوە و ئەو هەموەی کۆ کردۆتەوە و بە کاوەخۆ لە بێژنگی داون و بنژیلی جودا کردۆتەوە و ساغ و پتەوی هەڵبژاردووە و بە مێشك و دڵی خۆی سپاردووە. ئیدی بۆ سەیرە کە هەژار کوردیزانێکی هەڵبژاردە بێ؟

هەژار بۆ تەونی ئەو کرە لە بار و سفتەی خۆی، شێوەی موکوریانی کردۆتە تەخت و بۆ نەخش و وێنەکانی وشەی ڕەنگین و خۆرەنگ و جوانی، هەموو زاراوەکانی تێوەداوە و تا بۆی کراوە خۆی لە ڕایەڵ و پۆی وشەی نامۆ و بێگانە و کوردی داتاشراوی ناقۆڵا و ناڕەسەنی تازە پێداکەوتوو پاراستووە.

سەیر لەوە دایە دەڵێی شەرەفخان و هەژار لێکیان گێڕاوەتەوە. لە ڕۆژگارێکدا کە هەژار *شەرەفنامەی* کردووە بە کوردی، زمان و ئەدەبی کوردی لە بەر بێ سەرە و بەرەیی و بەرەڵڵایی خەریکە بە مەرەدی زمان و ئەدەبی فارسی زەمانی سەفەوی بچێ. لە سایەی نەزانانی خۆپەسندەوە ئالۆزی و شێواویەکی زۆری تێ کەوتووە و مەترسیەکی گەورە هەڕەشەی لێدەکا.

بێگومان هەژاریش هەستی بەو مەترسییە کردووە و لام وایە مەبەستی هەرە گەورەی لە وەرگێڕانی *شەرەفنامە* بووژاندنەوەی زمانی کوردی بووە و دەیەوێ لە مردنی بپارێزێ. جا چونکە مەیدانێکی فرت و فرەوان و پان و بەرینیشی بۆ هەڵکەوتووە، توانیویە بە کەیفی خۆی قەڵەمی تێدا باژوێ و خزمەتێکی هێژا بە زمان و ئەدەبی کوردی بکا. هیچ بە دووریشی نازانم کە هێندێك لەو

کەسانەی چەند ساڵە دەگەڵ ئەو خم لێ شێوانەی زمانەکەدا ڕاهاتوون، نووسینی هەژاریان بە دڵ نەبێ. ئەوانەی لە دەباغخانەدا کار دەکەن بە بۆنی گوڵاو دەپشمن و سەرەگێژە دەگرن و تا فێر دەبن ماوەیەکی دەوێ.

من لەو بڕوایە دام کە *شەرەفنامەی* هەژار دەبێ بکرێتە بەردی بناغە بۆ کوردی ئەدەبی و زمانی یەکگرتوومان. هیوادارم هەموو کوردێکی کوردیخواز و دڵسۆز کەڵکی لێ وەرگرێ. هەژاریش هەر بەوەندەوە نەوەستێ و درێژە بە خزمەت کردنی زمانەکەمان بدا و درێغی نەکا؟

**هێمن**

**١٩٧١**

من لەو بڕوایە دام کە شەرەفنامەی هەژار دەبێ بکرێتە بەردی بناغە بۆ کوردی ئەدەبی و زمانی یەکگرتوومان هیوادارم هەموو کوردێکی کوردیخواز و دڵسۆز کەڵکی لێ وەرگرێ، هەژاریش هەر بەوەندەوە نەوەستێ و درێژە بە خزمەت کردنی زمانەکەمان بدا و درێغی نەکا

هێمن

هێمن موکریانی - ١٩٧١ شەرەت چوار ساڵە ... [illegible]

شاعیری بەناوبانگی کورد محمد امین شیخ الاسلامی (هێمن) ساڵی ١٩٢٢ لە گوندی لاچین نزیك بە شاری مەهاباد لە مەڵبەندی موکوریان هاتۆتە دنیاوە. لە کۆمەڵی «ژ.ك»دا ئەندامێکی بەکار بووە و لە لایەن کۆماری کوردستانەوە نازناوی «شاعیری میللی» پێدراوە. شاعیرێکی بێ هاوتا و کوردی زانێکی کەم وێنەیە. شێعر و نووسینی یەکجار زۆرە؛ بەڵام کەمی بڵاو کراوەتەوە.[1]

١- مامۆستا هێمن نەورۆزە مانگی ساڵی ١٣٦٥ی کۆچی-هەتاوی (١٩٨٦.ز) لە ورمێ کۆچی دوایی کردووەو لە زیارەتانی بداغسوڵتانی مەهاباد نێژراوە. ماجد

## بیروڕای دوکتۆر کەمال مەزهەر

له سه‌ر داوای ماموستا هه‌ژار
خوی گه‌لیك له ده‌ستنووسی شه‌ره‌ف
نامه که کردوویه‌تی به کوردی له گه‌ل چاپی
رووسی و عه‌ره‌بی ئه‌و کتیبه‌دا به‌راورد
کرد. له ئه‌نجامدا ده‌رکه‌وت که ته‌رجه‌مه‌که
زور ریك و پیك و ئه‌مینه و له هیچ شوینیکدا
جیاوازیم به‌رچاو نه‌که‌وت.

که‌مال مه‌زهه‌ر
١٩٧١/٦/١٤

لەسەر داوای مامۆستا هەژار- خۆی- گەلێك لە دەستنووسی *شەرەفنامە* کە -کردوویەتی بە کوردی- لەگەڵ چاپی ڕووسی و عەرەبی ئەو کتێبەدا بەراوردم کرد. لە ئەنـجامدا دەرکەوت کە تەرجەمەکە زۆر ڕێك و پێك و ئەمینە و لە هیچ شوێنێکدا جیاوازیم بەرچاو نەکەوت.

**کەمال مەزهەر**

**١٩٧١/٦/١٤**



دوکتۆر کەمال مەزهەر، ساڵی ١٩٣٦ز لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیاو دوا پلەی خوێندنی لە یەکیەتی سۆڤیەتی تـەواو کـردووە و کارنامـەی دوکتۆری لە تاریـخی کورددا وەرگرتووە. ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری کوردە و سکرتێری گشتی کۆڕیشە.

## ڕێ خۆشکردنێک

ئەوانەی ویژدان بکەنە ڕێشاندەر و بە وردی لە ڕابردووی گەلی کورد بکۆڵنەوە، زۆر باش تێدەگەن کە ئەو گەلە لە هەموو ڕۆژگارێکا - پێش ئیسلام و دوای ئیسلامیش- مێژووی پڕە لە شانازی و لە ئاکاری چاك و مەردانەدا، دەستی هەرە باڵای هەبووە.

لە پتەو کردنی بناغەی ئیسلامەتی و بەرز کردنەوەی کۆشکی ڕۆشنبیری عەرەبدا - بە بێ دریغی کردن- بەشداری کردووە. لە هەر دەرێکەوە و لە هەر سەرێکەوە بۆ هەر هونەرێکی ناو ئیسلامەتی بگەڕێی، دەستی بە کاری کوردی تێدا کەوتۆتە کار و پڕی کردووە لە نەخش و نیگاری هەمە جۆرە. بەڵام مێژوونووسانی ئەم ڕۆژهەڵاتە هەر لە سەرەتاوە و بە تایبەتی لە سەدەکانی ئەم دواییەدا بیری گەلپەرستی خۆیان کردۆتە ڕووگە و هەر ئەدیبێك سەر بە کام ڕەگەز بووبێ هەر بە یاری خۆی هەڵگوتووە و هەرگیز بە پێویستیان نەزانیوە ئاوڕ لە هاودین و هاوسا کوردەکەیان بدەنەوە و هاوارێکیان بۆ بکەن.

پیر و زانا ژیر و هۆزانەکانی کوردانیش گەلێك کتێب و نووسراویان بە عەرەبی و فارسی و تورکی و فەڕەنسی و ئنگلیسیش نووسیوە و بە خەڵکیان هەڵگوتووە و هەرگیز بە بیریاندا تێنەپەڕیوە کە بیر لە خۆیان و لە زمانەکەی خۆیان بکەنەوە و ئاوڕێك لە ڕەگەز و هۆزی خۆیان بدەنەوە. ئیتر لە سۆنگەی ئەو کەمتەرخەمیەدا، هەرچی کورد بۆ ئیسلامی کرد و هەر شانازیەکی لە مێژوودا گومانی دەبرد، لە بیر کورد و بێگانەش چوونەوە و زمانی شیرین و ڕەوانی کوردیش لە زۆربەی شارەگەورەکانی کوردستان وەك مووسڵ و دیاربەکر و سنە و ماردین ڕووی لە کزی و کەنەفتی ناوە زمانی بێگانەیان بە جۆرێك تێ خزاوە ئەگەر ڕێبوارێکی نەشارەزا و ناوشیار سەریان لێ بدا، وا ئەزانێ ئەو شارانە فڕیان بە سەر کوردستانەوە نەماوە. دەگەڵ ئەوەشا کە زۆربەی هەرەزۆری دانیشتوانی ئەو شارە گەورانە خوێن و زمان و ڕێ و شوێنیان کوردانەی پاکە، بەڵام وای لێهاتووە وەختە زمانی عەرەبی و تورکی و فارسی زمانەکەیان لێ داپۆشێ.

لە زۆر جێگە هەر بە دەشتەکی و ڕەوەندان دەڵێن کورد و شارستانیەکان بە کورد نازانن!

جا من کە ئەوانەم دەدیت دڵم کورکاندی کە بە شوێن جوغرافیا و مێژووی کورد و کوردستاندا هەڵوەدا بم و کەل و قوژبنی کتێبخانەکانی قاهیرە و ئاستانە بپشکنم و ئەو دەسنووسانەی لە مەڕ کوردەوە دەدوێن و تۆزی هەڵنەدانەوەیان لێ نیشتووە، بیانتەکێنم و بیانبزوێنم و بیاننوێنم.

ڕۆژێك کە بۆ ئەو مەبەستە دەمڕوانیە *کشف‌الظنون*، ناوی هێندێك تاریخانم هاتە بەرچاو؛ وەك *مفرج‌الكروب في اخبار بني ايوب* و *تاریخی شەرەفخانی بدلیسی* و *الروضتين في اخبار الدولتين(النورية و الايوبية)* و *سيرة الصَّلاحية* و چەند کتێبێکی تریش کە لەو مەبەستانە دواون و لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە عەرەبی و فارسی نووسراون.

لە پاشان ئاشنایەکم پێی گوتم: *شەرەفنامە* ساڵی ١٨٦٠.ز واتا ٧٠ ساڵ لەمەوبەر لە ڕووسیا بە فارسی چاپ کراوە و کراوەتە فەڕانسیش و لەو ساوە لە ناو ڕۆژهەڵاتناساندا وە برەو کەوتووە و هەر کەس خۆی بە تاریخ و جوغرافیای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە خەریك بکا، زۆری پێویستی بەو کتێبە هەیە؛ چونکە *شەرەفنامە* هەر چەند تاریخی کوردە، بەڵام بۆتە فەرهەنگێکی گەورەی مێژوویی و جوغرافی بۆ ئەو دوو مەڵبەندە کە گەلێك ڕووداوی گرینگی بە خۆیەوە دیووە. وەك: لێشاوی تەتار و تورکمانی وێرانکار و ڕووخانی دەور و دوکانی عەبباسیان و سەرهەڵدانی گەلێك دەوڵەتۆکە و وردەپاشایان کە لە بن باڵی تەتار و سەلجووقیانەوە دەرکەوتبوون وەك ئاققۆیینلووەکان و قەرەقۆیینلووەکان.

هاوینی ساڵی ١٩٢٢ ڕێم کەوتە حەلەب و دەگەڵ دۆستێکی زانا و کوردپەرستمدا لەو مەبەستانەوە دەدوایین؛ *شەرەفنامە*م وە بیرهاتەوە و پێم گوت: دەڵێن لە ڕووسیە چاپ کراوە. کەچی ئەویش مزگێنی پێدام کە نوسخەیەکی دەسنووس لە حەلەب هەیە و لە کتێبخانەی مەدرەسەی عوسمانی دایە. ئیتر بە بێ خۆگرتن چووم کتێبەکەم خوازتەوە و دەستم کرد بە نووسینەوەی بەشە زۆرەکەی کە باسی کورد و کوردستان دەکا و بەشە کەمەکەشم بەجێ هێشت کە دانەر لە مەڕ عوسمانیان و پادشایانی ئێرانەوە نووسیویە و ناوی کۆتایی لێناوە.

بۆم دەرکەوت کە *شەرەفنامە* لەو کتێبە بێهاوتا و هەرە باشانەیە کە لە سەرەتای ئیسلامەوە دەربارەی کورد و دەوڵەت و میر و مەزنەکانیانەوە نووسراوە و تا ساڵی ١٠٠٥ی کۆچی هێناوە.

ئاخر و ئۆخری ساڵ بوو کە گەڕامەوە بۆ میسر؛ مامۆستای زانا شێخ فەرەجوڵلا زەکی کوردیم تێگەیاند کە چیم بە دیاری هێناوە. چونکە دەشمزانی ئەو پیاوە چاکە لە چاپ کردنی کتێبە بەنرخەکان زۆر خێرایە، ڕووم لێنا کە *شەرەفنامە*ش بە چاپ بگەیەنێ.

لە وەراما درکاندی کە خۆشی زۆر لە مێژە خەریکی ئەو کارەیە و نوسخە چاپکراوەکەی ڕووسیە و دەسنووسێکی سورەییا (ثریا) بەدرخانیشی پەیدا کردووە و نیازی وایە لە چاپی بدا؛ ئیتر بە هەموو لایەک لێی وەخۆ کەوتین.

## پێداچوونەوە و لە بەر یەک ڕانان

ئەو سێ نوسخەیەمان لە بەردەستا بوو. مامۆستای زاناش جەنابی شێخ محیەدین سەبری کوردی[1] -کە زۆری سەر لە فارسی دەردەچێ و لە ئەدەبیاتی کەون و تازەیدا زۆر شارەزایە- پیاوانە هاتە یاریدەمان و ملمان نا لە بەراورد کردن و لە بەر یەک ڕانانی هەر سێك نوسخە و ئەگەر زیادیەکمان لە دەستنووسەکاندا دەست ئەکەوت ئەمانخستە سەر چاپکراوەکەی ڕووسیا. شێخ فەرەج زەکی جگە لەوە کە چاپکردنی کردبووە ئەرکی خۆی، ڕاست کردنەوەی هەڵەی چاپخانەشی وەستۆ گرت. منیش چونکە شارەزاییم لە جوغرافیای مێژوویی ئاسیای تورکیا و بە تایبەتی ولایاتە شەرقیەکەیدا هەبوون کارم ئەوە بوو ناوەکان بەرمەوە سەر یەك و ئەگەر هەڵەیەکی تێدابێ ڕاسیان کەمەوە.

ساڵێکی ڕەبەق بەو ئاوایە بە پێداچوونەوە و لە بەر یەك ڕانان و لێکۆڵینەوە و پشکنینەوە خەریك بووین. هەموو سەری حەوتووان لە ماڵی شێخ فەرەجوڵلا کۆ دەبووینەوە و هەرکەسە کردەوەی خۆی ڕادەنا.

نوسخە چاپکراوەکەی ڕووسیەمان دانا بە ماك. هەر چی لە دەسنووسەکاندا زیادی بوو، لاشمان وابوو زۆر پێویستە هەبێ، خستمانە ناو ناوەڕۆکەوە و ئەوی زۆریش گرینگ نەبوون لە کەنارەدا جێمان کردنەوە و ڕاشمانگەیاند کە ئەو نوسخانە لە کوێدا جیاوازییان هەیە.

شەرەفخان لە پێشەکیەکەدا ناڵێ باسی گەڵباخی دەکەم، بەڵام کە ئێمە لە دەستنووسەکاندا چاومان پێ کەوت، وامان بە باش زانی ڕەگەڵی خەین و چاپی کەین.

---

[1]- باوکی زکریا محی‌الدینە؛ کە دەستی ڕاستی جمال عبدالناصر بووە. هەژار

# ئەمەگداری

کورد هەمیشە دەبێ چاکەی مسیۆ ف. فیلیانوف، زرنوفی لە چاو دابێ و ئەو ڕۆژهەڵاتناسە پیاوچاکە لە بیر نەکا کە بۆ یەکەمجار لە ساڵی ۱۸٦۰ز دا *شەرەفنامەی* چاپ کردووە و لە ڕۆژاوا بڵاوی کردۆتەوە. خوالێخۆشبووی ئەمر پێشەکیەکی زۆر هێژای بە فەرانسی لە سەر *شەرەفنامە* نووسیوە. ئێمەش بە ناوی ئەمەگداریەوە وەریدەگێڕین و تەنیا ئەوە نەبێ کە بەسەرهاتی شەرەفخانی دووبارە گێڕاوەتەوەو لە کۆتایی کتێبەکەدا هەیە، هەرچی نووسیویە دەیخەینە بەرچاوی خوێندەواران؛ تا هەموو کەس بیزانێ کە ئەو زانا پایەبەرزە و ڕۆژهەڵاتناسانی ڕۆژاوایی هاوکاری، بۆ پەیدا کردنی نوسخەکانی دەسنووسی *شەرەفنامە* چەندیان هەوڵ داوە و چەند پاتەختی خۆرهەڵات و خۆرنشینیان پشکنیوە و لە ڕێگەی زیندوو کردنەوەیدا چەندیان دەرد و ئازار دیوە.

بە ئاواتەوەم زانا و نووسەرە وریا و دریاکانی ڕۆژهەڵاتیش تێبگەن، کە زیندوو کردنەوەی ئاسەواری باب و باپیری هاونیشتمانە کوردەکانم بەهرەی زۆری هەیە؛ بە تایبەتی ڕوو ئەکەمە ئەندامانی کۆمەڵی «یانەی سەرکەوتن» لە بەغدا، کە شنگڵێك لە خۆ بدەن و بۆ پاراستنی ئاسەواری گەلی کوردی چارەڕەش کۆششتێك بکەن.

زۆر بە داخەوە تاوێستا زانا و نووسەرەکانی کورد لە ئاخافتن و نامەنووسی و کتێب داناندا زمانی زگماکی خۆیان وەلا ناوە و زمانی ئەو گەلانەیان بە دەمەوە گرتووە کە تەنانەت مافی ژیانیش بە گەلە کلۆڵەکەی ئەوان ڕەوا نابینن!

خۆزی چاپ کردنی ئەم کتێبە گیانی کوردایەتی لەو کوردە زلانەدا زیندوو بکردایەتەوە و دنەی دابان کە *شەرەفنامە* بکەن بە کوردی و بیشیخەنە سەر ئەو زمانانە کە ڕۆشنبیرانی کورد لێی تێدەگەن.

ئارەزوومە کۆمەڵی بەڕێزی ناوبراو ئەو پێشەکیە فەرانسیە بکەنە ئاوێنەی تێکۆشان و بە هەموو توانا هەوڵ بدەن ئەدەبیاتی کورد زیندوو کەنەوە و زمانەکە لە ناو خوێندەواراندا پەرە پێ بدەن و لە گفتوگۆ و نووسین و چاپەمەنیەکانیاندا هەر زمانی کوردی دەکار بێنن. خەبات بکەن کە زاراوە لێك جیاوازەکانی باکوور و باشوور و ڕۆژاوا تا لوڕستان بگەیەننەوە یەك و ئەو دەسنووسانەی کە لە مەڕ

کورد و کوردستانەوە دەدوێن و لە ڕۆژهەلات و خۆرنشیندا خزیوونەتە گۆشەی بێکەسییەوە، بیاندۆزنەوە و تۆزیان بتەکێنن و بەهرەیان لێ هەلگرێنن.

ئێمەش بەش بە حالی خۆمان ئەگەر بزانین زانایانی کوردی عەرەبیزان و عەرەبەکانی دۆستی کورد یاریدەیەکمان دەدەن، ئامادەین ئەم کتێبە نایابە بکەینە عەرەبی تا فارسی‌نەزانیش بزانن چی تێدایە.

خۆ ئەگەر ئەندامانی بەڕێزی «یانەی سەرکەوتن» خۆیان بیانەوێ بیکەن بە عەرەبی ئێمە کە لە پێداچوونەوە و لەبەریەك ڕانان و دۆزینەوەی ناوی ڕاستی جوغرافی و تاریخیدا ئەزموونمان هەیە و لە کلێ دەرهاتووین، ئامادەین بە پێی توانا هەموو جۆرە کۆمەگێکی زانستی و ئەدەبی بەو برایانە بکەین.

داخم ناچێ: ناوی سەدوحەفتاوسێ کتێبمان لە میرسورەییا بەدرخانەوە بۆ هاتبوو کە لە مەڕ کورد و کوردستانەوە دواون و جێگە و سالی چاپکردنیشیان دیاری کرابوو؛ هەروەها دوو پێرستیشمان ساز کردبوو؛ لە دوامین کاتا نەمانتوانی بیخەینە پال ئەم چاپە فارسیەوە.

زۆر سوپاسی میرسورەییا بەدرخان ئەکەین و هەر وەها چاکەی جەلادەت بەدرخانی براشیمان لە سەرە کە هاوینی سالی ١٩٢٦ بۆ ماوەیەك یاریدەی داین.[1]

**محەمەدعەلی عەونی**

---

١- شەرەفنامە بە فارسی، سالی ١٩٣٠ز لە میسر لە چاپ دراوەتەوە. هەژار

وێلیا زۆف

## پێشەکی زێرنۆف، کە ساڵی ١٨٦٠ز لە سەر یەکەم چاپی *شەرەفنامە* -بە فەڕانسە- نووسیوە

*شەرەفنامە* کتێبێکە هەر لە ڕۆژگارانی کەوناراوە تا ساڵی هەزار و پێنجی کۆچی دەربارەی هۆز و بنەماڵەکانی کورد دەدوێ. دانەرەکەی شەرەفخان کوڕی شەمسەدین میری وڵاتی بدلیسە. بدلیس -لەگەڵ بچووکیشیدا- لە هەموو مەزننشینەکانی کوردستان گرینگتر و لەڕووتڕە.

«لێرەدا باسی ژیانی شەرەفخان و باب و باپیرانی دەکا. جا چونکە ئێمە لە دواییدا هەر ئەینووسین لامان داوە. م.ع»

بەڵام زۆر دژوارە بزانین کەی دەستی پێ کردووە؟ ئەگەر لە پێشەکیەکەی ورد بینەوە وا دەرئەکەوێ زۆر لە مێژساڵ بووە بە ئاواتی نووسینەوە بووە. چونکە زۆری سەر لە تاریخ دەرچووە و لێش براوە تاریخێك بنووسێ کەسیتر ڕێی تێ نەبردبێ و کاری تێدا نەکردبێ؛ بەڵام لە بەر کار و فرمانی زۆری خۆی بۆی نەکراوە ئەو ئاواتە پێك بێنێ. لە دواییدا کە تووشی ئارامی و سانەوە بووە، تاریخی گەلی کوردی خۆی بە سەر ڕوویەڕەوە چەسپاندووە. منیش و مسیۆ ولکو لامان وایە دوای ئەوە سوڵتان مراد شەرەفی هێناوەتەوە سەر جێگەی باب و باپیرانی، ئەوسا نووسینی کتێبەکە دەستی پێ کراوە. کەرستەی *شەرەفنامەی* لە بەڵگەی هەمە جۆرەی ڕۆژهەڵاتی و لە گێڕانەوەی دەماودەمی پیرانی باوەڕپێکراو و لە بیرەوەری خۆیەوە پێك هێناوە.

نرخی زانستی ئەم مێژووە کوردیە جێگەی گومان و کێشە نیە. دەگەڵ ئەوەشا کە سێسەد ساڵی بە سەرا تێپەڕیوە، هێشتا لە ڕۆژهەڵاتدا کارێکی دیکەی وا نەکراوە کە بە سەنگی *شەرەفنامە* بێتەوە.

لە ڕاستیدا جگە لە *شەرەفنامە*، دەربارەی کوردان چەند بزگوڕ و تیتۆڵێك لێر و لەوێ و چەند پارچەیەکی کەم نەبێ -کە کەوتۆتە ناو کتێبانەوە- چیترمان دەس ناکەوێ؛ ئەم چەند پارچانەش با زۆریش بن، بەڵام شتێکی وا نادەنە دەست کە پیاو وەدەنگ نەهێنێ و بەوانە ناگەینە دامەزرانی تاریخێك بۆ گەلی کورد؛ کە گەلێك لکی لێ دەبنەوە و هەر لکەی مێژووی سەربەخۆی خۆی هەیە.

شەرەف جگە لەو ڕووداوانەی لە تاریخی عەرەب و فارس و تورکەوە کۆی کردۆتەوە، بەشێکی زۆری لە بەسەرهاتی تازە و گرینگی وا خستۆتە سەر کە زۆر بە کارن؛ هۆزەکانی بە ڕێکی و تەکوزی

بردۆتەوە سەر یەك و بەو کارەی والاّییەکی زۆری لە تاریـخی گەلانی ئاسیادا پڕ کردۆتـەوە و لێـرەدا زۆری چاکە کردووە.

لە مەڕ جوغرافیا و سروشتی گەلان و چلۆنایەتیان، زانیویە کامی چاك و پاکـە، هەڵبـژاردووە و لە تاریـخەکەیدا جێی کردۆتەوە و بەوە نرخی ئەدەبی نووسراوەکەی زۆر باڵا بردووە.

ئەو ڕەخنانەی دەتوانیـن لە شەرەفـی بگریـن دوانی سەرەکیـن:

یەکیان ڕێ و شوێنی کتێب دانانە و ئەوی تر تەرزی داڕشتنیەتی.

هەرچی ڕووداوی مێژوویی کوردە، دەبوایە بکرایـە بـە دوو بەشـەوە و بەشـێکیان زۆر لـەوی تـر جیاواز بوایە:

ئەو لایەنە کە زۆر سەرنج ڕادەکێشێ ئەو مەبەستانەیە کە لە پێشدا نەنووسراون و لە کوردانـەوە مێژووی ڕابردوانی بیستووە و هێندێکیشی بۆ خۆی بە چاو دیتوویە. کتێبەکە لەو بارەوە سەرچاوەیەکە هەرگیز لێڵ نابێ و وشـکاوی دانایـە. بـەڵام ئەوانـەی لـە کتـێبی‌تریـەوە وەرگرتـووە لـە گێڕانـەوەی ڕووداوەکاندا زۆری هۆش نەداوەتێ و خۆی لە هەڵە نەپارازتووە.

هێندێك جاران گێڕانەوەی ڕووداوەکانی لێ ئالۆزاوە و ناوی بە هەڵەی نووسیون و تووشی بێ‌سەرە و بەرەیی واهاتووە کە ناکرێ دڵمان ئاوی لێ بـخواتەوە. لە مەڕ تـەرزی نووسیـــنەکەشی ئەگـەر ئـەو شێعرە زۆرانە و ئەو چەند وشە هەڵمساو و گرانە کەمانە نەبێ -کە ڕۆژهەڵاتیەکان حەزی لێ دەکـەن و بە لای ئێمەشەوە باش نییە- بە گشتی نووسینەکەی ڕەوان و هاسانە؛ چەند ڕووداوێکی لە ڕاسـتی بـە دووریشی تێدا بەرچاو دەکەوێ.

لە چاپ کردنا نیشانەی پرسیارم (؟) لە سەر ئەو وشانە دانا کـە لێیـان دوو دڵ بـووم. لـە دوای کتێبەکەوە بە درێژی لەوانەوە دەدوێم و دەیکەم بە نووسراوی خۆم!

دەگەڵ ئەوەشا نابێ ڕەخنەکانم بە گرینگ بگیـرێن، چونکە نەك هەر شەرەفـخان، بگرە هـەموو نووسەرانی ڕۆژهەڵات، گوێ بەوە نادەن کە دەبێ پیاو لـە لێکۆڵینـەوەی زانیاریـدا بـاش ورد بێتـەوە. ڕۆژهەڵاتیەکان زۆربەیان لە ڕووی بیـرەوەری خۆیانەوە تاریخ دەنووسنەوە و لایان وایە وا باشتـرە.

تەرزی نووسیـــنەکەش دەکرێ بۆ پیاوێکی وەك شەرەفـخان چاوپۆشی لێ بکرێ؛ چـونکە زۆربـەی ژیانی لە فەرمانی دیوان و لە هەرا و شەڕ و شۆڕدا بەخت کردووە.

له وڵاتی ڕۆژهەڵاتا *شەرەفنامە* زۆر کەم بڵاو بۆتەوە. هۆیەکەشی زۆر هاسانە: گەلی کورد لە ئاسیادا دەورێکی گرینگی نەبووە و تاریخەکەشی بۆ خەڵکی ڕۆژهەڵات زۆر بەکار نەهاتووە. دیسان سەرەڕای ئەوەش لە فەرهەنگی هونەر و کتێباندا -کە حاجی خەلیفەی کاتب چەلەبی نووسیویە- ناوی *شەرەفنامە* جێگەیەکی باشی بۆ تەرخان کراوە. (بڕوانە: *کشف الظنون*، چاپی فلورجل، ژمارە: ٢١٣٥-٢١٤٤).

ئەو نووسەرە گەورەی کتێبی *جیهان نومای* لە جوغرافیادا نووسیوە، هەر وەها زەینەلعابدین، کە کتێبی *ریاض السیاحە*ی داناوە، هەردووکیان دەربارەی کوردان زۆر شتیان لە *شەرەفنامە* وەرگرتووە. دوو جاریش لە ئاسیادا *شەرەفنامە* کراوەتە تورکی؛ یەکیان سامی ناوێك بۆ میرێکی کوردی وەرگێڕاوە؛ کە ناوی مستەفا بەگ بووە. (بڕوانە: مۆرلی. پێڕستی دەسنووسە عەرەبی و فارسیە مێژوویییەکان؛ کە لە کتێبخانەی کۆمەڵی ئاسیایی پادشایی بریتانیاو ئیرلەندە).

حاجی خەلیفە بە ناوی *تاریخی شەرەفخانی بدلیسی* ناوی بردووە. لە ئەورووپادا بۆ یەکەم جار دێربلو باسی لێوە کردووە و لە دوو وتاردا لە مەڕ کتێبخانە ڕۆژهەڵاتیەکەیەوە لێی دواوە: جارێك *«تاریخی شەرەفخانی بدلیسی»* پێ دەڵێ و جارێك بە*«تاریخی کوردان»*ی ناو دەبا. (بڕوانە: مایسترخت). هەر دوك وتاریشی بێ زیاد و کەم لە فەرهەنگەکەی حاجی خەلیفەوە وەرگێڕاون و وا دیارە سێر جان مالکۆلم لە پێش هەموو ئەورووپاییەکدا نوسخەی *شەرەفنامە*ی وەگیر کەوتووە. ئەویش مەزنی هۆزی محێزی کورد داویەتێ، لە سەری نووسیوە: کوردین کوڕونیك هی فۆن شەرەف ئەو نوسخەیە لای مەکۆی ئاسیایی پادشایی بریتانیای مەزن و ئیرلەندەیە (بڕوانە: پێڕست). زۆریش سەیرە کە تاریخی فەرمانڕەوایی ئەردەڵانیشی لە دواوە ڕەگەڵ خراوە کە لە ساڵی ١٢٢٥ی کۆچی(١٨١٠زایینی)دا نووسراوە. (بڕوانە: کەتەلۆگی مۆرلی و ماریلو).

مالکۆلم لە تاریخە فارسیەکەیدا کە ساڵی ١٨١٥ بڵاوی کردۆتەوە، زۆر جار باسی *شەرەفنامە* دەکا و تەنانەت چەند کورتە ڕووداوێکیشی لێ ئەگێڕێتەوە؛ بەڵام زۆر بە گرینگی نەگرتووە و بە درێژی

لە ناوەرۆکی نەدواوە.[1]

تـا سـاڵی ١٨٢٦ ئـەورووپا نرخـی *شـەرەفنامەی* نـەزانیبوو؛ چـونکە سەرنـجی ڕۆشنبیـرانی ڕانەکێشابوو. من لێرەدا دە خۆ ڕادەبینم ئەم ڕاستیە بـخەمە ڕوو کە لە سایەی زانایانی ڕووسەوە ئـەو دیاریە هێژایە پێشکەش بە زانست کراوە (بڕوانە: دورن. مەکۆی ئاسیایی. بەشی دووهەم).

مسیۆ فراش یەکەم کەسێك بووە کە لە ساڵی ١٨٢٦دا بانگاوازی بۆ ئەو تاریـخە کوردیە کـرد و کورتە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەیەکی لە سەر نووسی و لە کۆتاییدا بە ئاواتی خواست کە ئەم تاریـخە گرینگە ئاسیاییە تەرجەمە بکرێت. دەڵێ: «وەرکێڕانی ئەو ئاسەوارە بە نرخـە دەبێتـە پەنـجەرەیەك، تاریـخی ئاسیامان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە.»

هەر لە هەمان ساڵدا مسیۆ ولکو یادداشتێکی لە سـەر مێـژووی فـارس بـلاو کـردەوە و نـاوی *شەرەفنامەشی* لە سەر نووسی و بڕێکیشی باسی شەرەفخان کرد (ڕۆژنامەی ئاسیا، بەشـی ٨، سـاڵی ١٨٢٦ ڕووپەڕ ٢٩١، ٢٩٨).

دوای ئەوەش بە ماوەیەك مسیۆ شارموا - کـە لـە سـان پتـرسبورگ مامۆستای زمانـەکانی ڕۆژهەڵات بوو- لە سەر ئامۆژگاری مسیۆ فـراش فرایهیـن دەسـتیدا تەرجەمـە کردنـی *شـەرەفنامە* (بڕوانـە: فـراش ژیـانی شـێخ سەفـی ئـەردەوێلی). ئەگـەر نەخۆشـی ڕێگـەی لـێ نەبەسـتایە، ئـەو ڕۆژهەڵاتناسە هێژایە کردەوەیەکی وای دەخستە ڕوو کە سەرنـجی زانایان ڕابکێشێ.

لەم ڕۆژانەی دواییدا کە لە سایەی تێکۆشانی زانایان و دنیاگەڕانەوە لێکۆڵینەوە لە زمان و تاریخ و جوغرافیای کوردستان زۆر لە برەو دایە، *شەرەفنامە* بـۆ ئـەو مەبەسـتە تایبەتیانـە زۆر بەکەڵکـە و ئەوانەی بەهرەی لێ دەبینن ڕۆژ بە ڕۆژ ڕوو لە زیادین.

---

١- ئەو نووسەرە ئینگلیسیە بە شەرەفنامە دەڵێ: مێژووی کوردان" بە دانـەریش دەڵـێ: شـەرەفەدین. نـاوی مێـژووی کوردان لە ئەورووپا و ئاسیا بە سەر کتێبەکەدا بڕاوە. مسیۆ ڕیخ [لە ڕووپەڕ ١٢ی چاپەکەی میسردا وا نووسراوە. بەڵام ڕەنگە: ڕیچ بێ. هەژار] کە پاش مالکۆلم بە دە ساڵ هاتۆتە کوردستان هەر وای ناو دەبا.

«بڕوانە *باسی مانەوەی لە کوردستان و دیـمەنی نەینەوای کۆن*، چاپی لەندەن، ساڵی ١٨٣٦.ز، بەشی هـەوەڵ، ڕووپـەڕ ١٠٩، ٢٤٧، ٣٠٢ و ٣٨٠».

ناتوانیـن بڵێیـن ناوی شەرەفەدین هەڵەیە؛ چونکە شەرەفخان هەر خۆی بە شەرەف باس کردووە. هەموو شەرەف ناوێك دینێکی دەگەڵە. مۆرلی لە پێڕستی مالکۆلـمدا هەر دەڵێ: شەرەفەدین و لە پێڕستی سانپتـرسبۆرگیشدا هەر وایە.

مسیۆ کاترمر لە تاریـخی *مغول و فارس*، چاپی پاریس، ڕووپەڕ ۳۱۹-۳۲۹، چەند پارچـەیەکی لە *شەرەفنامە* خوازتۆتەوە. ئەگەر لە پێڕستی *دەستنووسەکانی ڕۆژهەڵات*، لە کتێبخانەی قەیسەر لـە سانپـترسبۆرگ، هی ساڵی ۱۸۵۲، ڕووپەڕ ۲۹۵ بڕوانی، وتارێکی سەربەخۆ بۆ ئەم تاریـخە تـەرخان کراوە. دوکتۆر هاینریش ئالفرێد بارب[1] لە ئاکـادیمی زانستی پادشاهی ڤیـەن بەشـی فەلسەفـی ـ مێژوویی[2] -کە دەربارەی فەلسەفەی تاریـخەوەی نووسـیوە و باسـی تورکیـا و فـارس ئـەکا- لـە دوو وتاراندا پوختەی *شەرەفنامەی* سەر لە بـەر جێکردۆتـەوە و لێیـەوە دواوە. هـەر وەهـا ئـەو نووسـەرە وتارێکی سێهەمی لە سەر پێنج بنەماڵەی کورد نووسیوە کە دەتوانیـن بڵێیـــن بەشـی یەکـەمی پـێ تەواو کردووە.

مسیۆ مورلیش لە پێڕستی *شەرەفنامە*دا، ناوی ئەو هۆز و مەزنانەی بە هەڵە نووسراون لـە بـەر دوو تەرجەمە تورکیەکەوە کە لە موزەی بریتانیادان ڕاستی کردوونەوە.

مسیۆ لیـرسن لە باسـی کوردانـدا کورتـە وتـارێکی لـە سـەر تاریـــخی کـورد هەیـە و چـەند ڕووداوێکی سەیر ئەگێڕێتەوە کە لە *شەرەفنامەی* وەرگرتووە؛ کـە لـە دواییـدا مـسیۆ کۆتیـک ڕاسـتی ئەوەی گوت و نووسراوەکەی بڵاو کردەوە تا بەتاڵایی پڕکاتەوە و پێداویستێك پێك بێنێ.

بیسرم لێ کردەوە، تێگەیشتم چاپ کردنی *شەرەفنامە* جگە لەوە کـە بـەهرەی فـرەی هەیـە، بـۆ زانستی مێژوویی دەربارەی کورد زۆر زۆر پێویستە. بڕیارم دا نوسخە فارسیەکە بـە تەرجەمـەوە بـڵاو بکەمەوە و چەند کەنارە و لێدوانی فەلسەفـی و مێژوویی و جوغرافیش بـخەمە سەر ئەو بەشـەی کـە من دەری دەخەم و جگە لە کۆتاییەکە سەرلەبەری *شەرەفنامەکە* دەبێ و ئەمەش کە من چاپی دەکـەم بۆ مێژووی کورد زۆر گرینگە؛ چونکە باسی هەر هۆزەی بە جیا تێدایە و بە باسـی بەسـەرهاتی دانـەر دوایی پێ دەهێنم و کۆتاییەکەش دەکەوێتە سەر بەرگی دووهەم. جا وا من لە چەند وشـەیەکدا ڕوونـی ئەکەمەوە کە بۆ بڵاو کردنەوەی ماکە فارسیەکە چم کردووە:

---

۱- HEINRICH ALFRED BARB

۲- Sitzungseerichte der Kaiserlichen Akademie der Wissenschaften. Phil-Hist. Klasse. Wien ۱۸۵۳.

له چوار دەسنووسم ڕوانییووە:

١- دەسنووسی کتێبخانەی قەیسەر لە سانپترسبۆرگ، کە ساڵی ١٠٠٧ کۆچی، پاش دانانی کتێبەکە، بە دوو ساڵ نووسراوەتەوە و دانەریشی چاوی پێدا خشاندووە.[1]

٢- دەسنووسی مسیۆ خانیکۆف: ئەم زانا ڕۆژهەڵاتناسە ساڵی ١٨٥٤ لە فارس کۆنسوڵی گشتی رووسیە بووە. ئەو نوسخەی لە دیلمەکان- لای سلماس- کڕیوە. دوو دەسنووسی دیکەشی لە کتێبخانەی یەحیاخان، خانی فەرمانڕەوای ئازەربایجان وەرگرتووە" لە بەر یەکی ڕاگرتوون و هینەکەی خۆی لە بەر چا کردوون.

مسیۆ خانیکۆف -کە هەموو کەس دەزانێ لە ڕێگەی زانستدا چەند پیاوە- هەتا لە چاپ کردن بوومەوە، دەسنووسەکەی خۆی لە لا دانام.

دەسنووسی خانیکۆف نۆزدەی مانگی شابانی ساڵی ١٢٥٢ی کۆچی (١٨٣٧.ز)، کابرایەك بە ناوی مەحموودڕەزا کوڕی سابر عەلی کەربەلایی بە فەرمانی ڕەوشەن ئەفەندی لە گوندی دیلمەکان، لە بەر دەسنوسێکی شەرفەخانەوە نووسیویەتەوە؛ کە مێژووی دەگەڕێتەوە سەر ساڵی ١٠٠٧ کۆچی و لە کۆتاییدا ئاوای نووسیوە: «دانەری هەژار و نووسەری بێکارە و چاو لە بەزەیی خوای گەورە، شەرەف کوڕی شەمسەدین ڕۆژەکی کیسرایی، لە کۆتایی مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٠٠٧ کۆچی پێغەمبەر - دروودی خوای لە سەر- لە شاری بدلیسێ خوا لە بەڵایانی بپارێزێ، لە نووسینەوە و ڕاست کردنەوە و بژار کردنی بوومەوە. بە یاریدە و کۆمەکی خوای بەخشندە، کزترین کۆیلە و لە بەرد و دار بێکارتر محەمەدڕەزا کوڕی کەربەلایی سابر عەلی، لە گوندی دیلمەکان لە ڕۆژی سێشەمە نزیك چێشتەنگاو، ١٩ی مانگی شابانی بەرێز، نووسینەوەی ئەو کتێبەی تەواو کرد.»

لە دەسنووسەکەدا زۆر جار جێ مۆری ڕەوشەن ئەفەندی دەبینرێ. مۆرەکەشی بە فارسی لێی هەڵکەندراوە: تىجلى‌الله ناگاه آيد اما بر دل آگاه آيد (خوا لە پڕ خۆی دەر دەخا بەڵام دڵی وشیاری گەرەکە) لە ناوەڕاستیشا ناوی ڕەوشەن و ساڵی ١٢٥١ بەرچاو دەکەوێ.

---

١- ئەم گفتە ڕاستە؛ لە برانەوەی دەسنووسەکەدا نووسراوە: لە برانەوەی مانگی شەشەکانی ساڵی هەزار و حەوتی کۆچی پێغەمبەر دروودی خوای لە سەر، لە شاری بدلیسێ خوا لە گزی شەیتانی بپارێزێ، بە دەستی دانەری کتێب، خوا هەر پایەدار و باڵادەستی بکا، ڕاست کردنەوە، بژاری ئەم کتێبە کۆتایی هات.

دەسنووسی خانیکۆف ٢٥٠پەڕەیەوهەمووی کەسێك نووسیویەتەوەوزۆرڕەوانەودێڕیشی لێكنزیکن.

٣- دەسنووسی مووزەی ئاسیا، زانکۆی قەیسەر لە سان پترسبۆرگ، ژمارە ٧٥٦، لە سەر شوێنی پێشووی ڕۆسۆ. ئەو دەسنووسە ٦٠٥ پەڕەیە و خەتەکەی ناخۆشە؛ بەڵام باش دەخوێندرێتەوە. بە دیاری بۆ مسیۆ ڕۆسۆ هاتووە. کابرای خاوەنی لە رووپەڕی یەکەما نووسیویە: «لە باداخانی حاکمی ساوجبلاغەوە، نزیك گۆلی وان» بەڵام نە تاریخی نووسینەوەی لە سەرە و نە ناوی نووسەر. هەر دەسنووسەکەش چوار خەتی لە دواوە نەماوە. ئەم نوسخەی ڕۆسۆیە دراوە بە مسیۆ ولکو. ئەویش وتارەکەی لە سەر نووسیوە و لە ڕۆژنامەی ئاسیاییدا بڵاوی کردۆتەوە.

٤- دەسنووسی مووزەی ئاسیا، ژمارە ٥٧٦ کە بارۆن بود لە فارسەوە هێناویە و تەنیا سەد لاپەڕەیە و بە: «کە ایوان کیوان با وجود علومکان» کە لە پێشەکیە فارسیەکەدایە دەست پێ دەکا و بە: «سبحان بگ و سلطان احمد بگ» -کە باسی سوێدیەکانە- دەبڕێتەوە.

دەسنووسەکە بە خەتێکی زۆر جوانە و دیارە کۆنە و ئاگاداریشی لێ نەکراوە. لە سەرەتا و برانەوەشدا چەند نووسراوێکی لە بابەت خوا و دینەوە وەسەر خراوە. بەندێکی زۆر تازەشی لە سەر مێژووی ئەردەڵان لە دواوە ڕەگەڵ خراوە و پێکەوە دە بەرگ گیراوە. دوو کەمایەسی زل لەو دەسنووسەدا هەیە. یەکیان بە ڕستی «محمدی خان‌الشهیر» دەست پێ دەکا؛ تا دەگاتە ئەم وشانە: «و شایستە رفعت آن کس است». «بڕوانە یەکەم چاپی *شەرەفنامە*، رووپەڕ ١٢٩-١٥٩ بەشی یەکەم». دووهەم: بە دوو وشەی «آثار شجاعتش» دەست پێ ئەکا؛ تا دەگاتە: «و پنج پسر داشت». «بڕوانە چاپە فارسیەکەی ڕووسیە، بەشی یەکەم، ڕووپەڕ ١٨٩-١٩٧». شتیتریشی تێدا ئەدۆزرێتەوە و پەڕەکانیش هەموو لە جێگەی خۆیان نین.

بەلای منەوە لەو چوار دەسنووسانە هەر دوانیان تەواون: نوسخەی مسیۆ خانیکۆف و نوسخەی ئاسیا، ژمارە ٥٧٦؛ کەچی ئەوانیش بەو پێیە کە شەرەفخان لە پێشەکیەکەدا هێناویە، هەر دووکیان چوار بەندیان کەمە کە باسی زەرزا و ئەستونی و داسنی و تەرزایە. من دەڵێم دەبێ دانەر خۆی باسی نەکردبن. ئیتر یان چی لەوانەوە نەزانیوە، یان زەمانە ماوەی نەداوە، وازی لێ هێناون. ناوەکانی نووسیون بۆ ئەوە لە هەلێکی باشتردا بگەڕێتەوە سەریان و ئەو هەلەش نەڕەخساوە کە بۆیان بابداتەوە. ئەم بیرە لە هەموو شتێك پتری ڕێ تێ دەچێ؛ چونکە شەرەفخان بە گشتی گوێی بەوە

نەداوە بە ناوەکانی پێشەکیەکەیدا بێتەوە یەك لە دوای یەك بە سەریان کاتەوە.

ئەو ڕێك و پێکیەی کە ئێستا تیا دەبینرێ بۆیەیە کە مـن خـۆم پێڕستەکەم تـەکوز و لـەبار کردووە. دەسنووسەکەی مووزەی ئاسیا ژمارە ٥٧٦ لـە بەشـی دووهـەمی (ڕووپـەڕی سـێهەم)دا کـە دەبوایـە لـە نێـوان فـەرمانڕەوایانی ماهیدەشـت و بانـەدا باسـی تـەرزا بکـا تـەرزاش لـە هـەموو دەسنووسەکانی کەوتووە؛ بەڵام لێدوانێکی سەربەخۆی دەربارەی گـەڵباخی تێدایـە. «بڕوانـە نوسـخەی سێرجان مالکۆلم پێڕستی مۆرلی ڕووپەڕ ١٤٩».

ئەو بار سووڕان و ئاڵ و گۆڕانە منی هێناوەتە سەر ئەو بیـرە کە دانەر خۆی دەستێکی تێـداوە و بۆی تەواو نەکراوە؛ بەڵام هەر بۆ خۆم وا بیـر دەکەمەوە. پیاو تەواو دڵـی ئـاو ناخواتـەوە تـا گـەلێك نوسخەی دەسنووسی *شەرەفنامەی* دەس نەکەوێ.

من کە هەر چوار نوسخەم بەرچاو کەوتووە، ناچارم هەر چی لەو چوارانەدا لێك جیاوازن لـە داوی بەشی دووهەمی کتێبەکەدا بیانـخەمە بەر چـاوان و لـەوە بـەولاوەش ئـەو وتارانـەی دەربـارەی ئـەو دەسنووسانەوە دەنووسرێن، نرخی هەمووانیان دیاری دەکا.

بۆ لە بەر ڕانان و لە چاپ دانی ئەو کتێبە، دەسنووسـەکەی کتێبخانـەی قەیـسەرم بـەلاوە پـێ باشتـر بوو؛ چونکە شەرەفخان بە دەستی خۆی چاکی کردووە. کارگێڕی کتێبخانەکە -پیاو هەق بڵێ- زۆر بە ڕووی خۆشەوە ڕێگەی دام، کەڵك لەو دەسنووسە وەرگرم. جـا چـونکە ڕێ و شـوێنی کتێبخانـە وابوو، نەدەبوایە کتێبی لێ دەرکەوێتە دەر، ناچار بـووم هـەر لەوێـدا دەگـەڵ نوسـخە دەسنووسـەکەی خانیکۆفـدا لـە بـەر یـەکیان ڕاگـرم و گەلالـەی چاپەکەشـم هـەر لـە بەرانبـەر ئـەودا ڕادەنـا. هـەر کەموکورییەکیش کە لە نوسخەکەی کتێبخانەدا هەبوون لە بەر ئەوەکەی خانیکۆف چـاکم کـرد. ئیتـر گومانـم نەما کە کتێبەکەی من زۆر لە دەسنووسەکەی ناو مووزەی ئاسـیا باشتـر دەرچـوو. خـۆ بـە تایبەتی کە سەر لە بەر دوو جارانیشی پێدا چوومەوە. جا داومە چاپ بکرێ. مەگیـن چۆنەکاییش ووبێ دەنا هیچ دەسکاریشم لە خۆمەوە تێدا نەکردووە.[1]

ئەگەر جارویارە -ئەویش زۆر کەم- بە تاڵاییەکم پڕ کردۆتەوە، بۆم ڕوانیوەتە نووسـراوی ئەوانـەی

---

١- لێرەدا بە چەند دێڕێك باسی تەرزی نووسیـن و درۆشـمی سەر پیتەکانی کتێبە فارسـیەکە دەکـا. جـا چـونکە لـە کوردیەکەدا کارمان پێ نامێنێ، ناچار بووم دەرمهاویشت. هەژار

شەرەفخان خۆی بەهرەی لە کتێبیان وەرگرتووە. وەك: ئیبنو خەلـەکان و عەبـدورڕەزاق و هـی‌تـریش. چونکە من -وەك گوتـم- ڕاست کردنەوەی هەڵە و بەڵگە لە سەر هێنانەوەیان هەڵدەگرم بۆ دوایە و بـە دوور و درێژی لە سەری دەڕۆم.

بەر لەوە لەو پێشەکیەم ببمەوە کە ویستم خوێندەواران بـزانن بـۆ چـاپ و بـڵاو کردنـەوەی چـۆن شێوەیەکم ڕەچاو کردووە، بە پێویستم زانی بۆ شارەزا کردن، ناوی ئەو *شەرەفنامە* دەسنووسانە بنووسم کە وەك من ئەیزانـم لە ئەورووپا دەس دەکەون.

جگە لە چوار نوسخەی کـە مـن کتێبەکـەم لـە بـەر چـاپ کـردووە و لـە ڕووسـیە هـەن، سـێ دەسنووسیش لە نەمسا لای دوکتۆر بارب هەیە. سێرجان مالکۆڵم لە لەندەن نوسـخەیەکی هەیـە کـە ئێستا لە پاڵ کۆما کتێبی کۆمەڵی ئاسایی پادشایی بریتانیا و ئیـرلەندە دایـە. «بڕوانـە کەتـەلۆگی مۆرلی ڕووپەڕ ٥١». لە پاریس دەسنووسێك هەیە و بەشێکە لە کۆمەڵە کتێبێـك، بـە خـەتێکی زۆر جوانیش نووسراوەتەوە. «بڕوانە: ولکۆ وتارەکانی ڕۆژنامەی *ئەزمانك* ساڵی ١٨٢٦، بەشی ٨، ڕووپـەڕ ٢٩١، وتاری تاریـخی مغول و فارس، کاترمر، ڕووپەڕ ٣٠١».

لێم ڕوونە لە مووزەی بریتانیاشدا نوسخەی مسـتـرریچ هەیە -کە لە کوردستان دەستی کەوتووە- چونکە هەموو دەسنووسەکانی دران بەو مووزەیە. «بڕوانە چیـرۆکی مانـەوەی ڕیـچ لـە کوردسـتاندا، بەشی یەکەم، ڕووپەڕ ٢٤٧ و کەنارەی بارب ڕووپەڕ ٥».

هەر وەك باسیشمان کرد، دو تەرجەمـەی ترکی لە *شەرەفنامە* هان لە مووزەی بریتانیادا. مـسیۆ ڕیۆ کورتە باسێکی لە سەر نووسیون. «بڕوانە کەتەلۆگی موڕلی-١٤٥ و کەنارە ژمارە ٣».

**ڤ. ڤلیامینـۆڤ زێرنۆڤ**

**سان پتـرسبۆرگ، مانگی یەکەم، ساڵی ١٨٦٠ میلادی**

# لێدوانێك بە دانستە

## دەربارەی کورد و کوردستان

کوردستان یان کوردەواری، وڵاتێکی گەورە و هەراو و بەرینە و بەشی هەرە زۆری وەبەر تورکیە کەوتووە. بەشێکی زۆر گەورەشی خراوەتە سەر ئێران و هێندێکیشی لای ژوورووی عیراقی لێ پێك هاتووە و هەر بە ناوی دانیشتووەکانیەوە ناو دەبرێ کە هەموو کوردن.

تورکان بۆ مەبەستی سیاسی خۆیان ناوی کوردستانیان لە جوغرافیا و دەفتەری دیواندا سڕیوەتەوە. ئەو وڵاتەی لە تورکیا ناوی کوردستان بووە و هەروەها ئەستانی کوردستانی ئێرانی ئێستا، هەموو شار و مەڵبەندەکانی کوردنشین ناگرێتەوە و سنوورەکانی نەتەوایەتی کوردستان داناگرن.

دیاری کردنی سنوورەکانی نەتەوایەتی کوردستانی گەورە زۆر دژوارە کە بە وردی دیاری بکرێن. چونکە:

١- هەر زۆر لە زووەوە لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە تورکمان و فارس و عەرەب کۆچیان پێ کراوە و دە کوردستان خزێنراوە و تێکەڵاو بە کورد کراون.

٢- زۆر کورد لە کوردستان ئاوارە بوون و دەگەڵ بێگانەی دراوسێدا ڕەگەزیان لێك هاڵاوە.

٣- دەوڵەتە ئیسلامە گەورەکان، زۆریان ئاڵ و گۆڕی ئیداری و سیاسی کردووە و کوردیان لێك هەڵاواردووە و شوێنەوار و سنووری نەتەوایەتی گەلانیان دەسکاری کردووە.

٤- هۆی هەرە گرینگیش ئەوەیە خوێندەواری کورد هەستی نەتەوایەتی خۆیان بەرانبەر بە ڕێ و شوێنی تازەی زانیاری پەروەردە نەکردووە و لە نووسین و بڵاوکردنەوەی بیر و باوەڕدا زمانی خۆیان دە کار نەهێناوە و بەو هۆیەوە زمانی نیشتمانیان وەختە لە شارە گەورەکاندا لە ناو بچێ و زمانی کوردی هەر لە چیا و چۆڵان ماوە و خەڵکی گوندان و کۆچەران هێشتوویانەتەوە.

هەر چۆنێك بێت، ئێمە دەتوانین لە ڕووی ئەو مەڵبەندانەوە کە زۆربەی کورد لەواندا بە زمانی کوردی داخێون، سنووری نەتەوایەتی مێژوویی کوردستان نیشان بدەین؛ ئیتر بە کوردی دەنووسن یان نا، کارمان بەوە نیە.

کوردستان له شیماڵەوە دەگاتە چیای ئارارات؛ کە ئەو چیایە لەمپەرێکی جوغرافی و سیاسی نێوان ئێران و ڕووس و تورکیە و سنووری نیشتمانی ڕەگەزایەتی کورد و فارس و ئەرمەنە. لە جنووبەوە دەگاتە جەبەل حەمرین؛ کە لە نێوان عیراقی عەرەب (بەغدا و بەسرە) و عیراقی کورد یان کوردستانی عیراق (ولایەتی مووسڵی پێشوو) دایە. ڕۆژهەڵاتەکەی لەو سەری لوڕستانەوە دەست پێدەکا و ڕۆژاوای دەگاتە ولایەتی مەڵاتیە لە تورکیا.

بەو پێیە هەموو ویلایاتی شەرقی تورکیای ئاسیا- جگە لە ویلایاتی تەرابزون و بەشێك لە ویلایەتی ئەرزەڕۆم- کوردە و لە ناو سنووری کوردستاندا هەڵکەوتووە. هەروەها بەشی جەنوبی ئێستای ولایەتی تەورێز و هەموو ئەیالەتی کوردستان و لوڕستان لە ئێران دەکەونە سەر کوردستانی مەزنەوە.

زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی شارەکان و دانیشتووی چیاکان و ڕەوەندەکانی ناو ئەو سنوورە پانە، بە خوێن و زمان و ڕێ و شوێن کوردن. زمانی تورکی و فارسی و عارەبی کە لە شارە گەورەکانی کوردستاندا دەبیسرێن، فیتی ئێران و تورکیە و عیراقە کە کوردستانیان بە سەردا دابەش کراوە.

## سنووری کوردستان

پوختەی سنووری کوردستان ئاوایە:

لە شیماڵەوە: کۆماری ئەرمەنستانی بەردەستی ڕووس.

لە ڕۆژهەڵاتەوە: ئازەربایجانی ئێران و عیراقی عەجەم و مەڵبەندی فارس.

لە جەنووبەوە: خۆزستانی ئێران و عیراقی عەرەب و چۆڵی شام (لیوای دێرزۆر)

لە خۆرنشینەوە: چەمی فورات و بڕێك لە ویلایاتی شەرقی لە ئەنادۆڵ.

## زەوی و هەوای کوردستان

لە هەموو لایەکەوە چیای زۆر سەربەرز دەوری کوردستانیان داوە؛ تەنیا لە بەشە جەنووبییەکەی نەبێ کە

زۆری بانو هەن و کانیاوی بە تەوژمی تێدان و دەشت و مەزرای زۆریشی هەیە کە بە ئاوی چەم و کانیاوەکان پاراو دەبن. بەشی جەنووبی و جەنووبی شەرقی -کە چەمی دەجلە و فورات و رووبارەکانی زێی گەورە و چووک و چەمی خاپووریان پێدا ڕادەبڕێ- لە هەموو شوێنەکانیتری کوردستان بە پیت و ڕێژەوترن.

چیای هەرە بەرزی کوردستان لەوپەڕی شیمالەوە هەلکەوتووە؛ پڕیەتی لە لێڕی چڕ و بەهرەدەر و شیو و دۆڵی زۆر بە پیت و سوودی لە دەورەیە و بە هاوین و بە زستان هەر ئاوەدانە و پڕ لە شار و گوندە. کێوەکانی نێوانی ئێران و تورکیا ڕووت و قاقڕ و کراڵن. نە لێڕەوارە و نە لەوەڕە و لە بەردی ڕەقی ئاگرپژێن پێك هاتوون و کەڵپە و گڕەبەردی وا پشتی گرتوون کە لە وزەی هیچ لەشکرێکدا نیە لێیانەوە ئاوا بێ. زۆربەی چۆماوەکان وەك فورات و هەردوك لکی و دەجلە و زۆر لە رووبارەکانی لەو کێوە ڕژد و سەختانەوە سەرچاوە هەڵدەگرن. ئەم چەمانە هەموو بەرەو جەنووب ڕادەخوشێن. جگە لە چەمی قەتور کە لکی چەمی کوڕە و دەڕژێتە ناو دەریای قەزوێنەوە.

گەلێك ڕووبار و جۆباری تریشی هەن؛ هێندێکیان دەڕژێنە دەریاچەی وانەوە و بڕێکیان ڕوو دەکەنە گۆلی ورمێ؛ کە لە وڵاتی عەجەمە و دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی گۆلی وانەوە.

## کوردی هەندەران

ئێمە لە سنووری کوردستان دواین و گوتمان ئەو مەڵبەندە پان و هەراوەیە کە زۆربەی خەلکەکەی کوردن؛ بەڵام گەلێك هۆز و تیرەی کوردیتریش لە دەرەوەی کوردستان دەژین. بۆ نموونە لە شیمالی سووریە لە نێوان ئەسکەندەروونە و حەلەبدا لە ناوەڕۆکی دەشتی خەسیب، کوردێکی یەکجار زۆر هەیە کە ژمارەیان نزیك بە سەد هەزار کەسە. لە ڕۆژهەلاتی حەلەبیش چەند گوندێکی یەکپارچە کورد هەیە.

لە زۆر جێگەی ئانادۆڵیش لە دەشتەکانی قوونیە و بانوی سیواس و جورم و دەشتی ئەدنە گەلێك هۆزی کوردی تێدایە.

لە ویلایاتی جەنووبی قەفقازیش کورد هەر یەکجار زۆرە و ئاگاداران بە نیو میلیۆنیان دادەنێن.

زۆربەی زۆری هۆزەکانی لای خوراسان و سەجستان لە ڕۆژهەڵاتی ئێران، کوردی تەواو عەیارن و تەنانەت ئەفغانستان و بەلووچستانیش زۆر و زۆربە کوردی ڕەوەندیان تێدایە.

## ژمارەی کورد

لە مەڕ ژمارەی سەرجەمی کورد بە تایبەتی دانیشتوانی کوردستان، زۆر قسەی تێک پەڕیو و لێک دوور و دژی یەکتر هەن! چونکە ئەو دەوڵەتانەی کە دەستیان بە سەر کوردستاندا گرتووە تاوێستا هەرگیز سەرژماریەکی بە ڕاست و درووستیان لە کوردستاندا نەکردووە و تا توانیویانە کەمیان نیشان داوە. بۆ نموونە خوالێخۆشبوو شەمسەدین سامی ئەرناوتی لە قاموس‌الاعلامی تورکیەکەیدا فەرموویە «ژمارەی کورد نزیکەی دوو میلیۆن و نیوە.»

*«دائرة‌المعارف اسلامی»* بە زمانی فەڕەنسی دەنووسێ: ژمارەی هەموو کوردان لە پێش جەنگی ساڵی ١٩١٤دا سێ ملیۆن بووە.

گومان لەوەدا نیە چەندەی زەوی لە عاسمانەوە دوورە ئەو فەرمایشانەش ئەوەندە لە ڕاستیەوە دوورن! چونکە دنیاگەڕان و ئەوانەی لەولاوە هاتوون و لە سەر کورد و کوردستانیان نووسیوە، کاتێ دیتوویانە خەڵکی شارە گەورەکانی کوردستان زمانی تورکی و فارسی و عەرەبی ڕەگەڵ کوردی دەخەن، وایان زانیوە کورد نین و داگیرکەرانی کوردستانیش میوانە بێگانەکەیان بە شارەزووی خۆیان تێگەیاندووە کە چۆنمان لە سەر بنووسێ و تا ئێستاش دەستیان لەم گەندەڵ فێڵانە هەر بەرنەداوە.

بیانی نەشارەزا وایانزانیووە کە تەنیا هەر خەڵکی ناو چیا و گوندی و ڕەوەندەکان کوردن و چیتر! ئیتر شارستان و بەندەرنشینەکانی کوردیان نەهاتۆتە بەر چاو -کە ئەوانە کەلەپووری سێ مەدەنییەتی گەشەداری ڕۆژهەڵاتی کەونارای ئاشووری و میدی و کەیانیان بۆ ماوەتەوە و هیمی هەرە گرینگی دوارۆژی کوردن- ژمارەی کوردیان کەم نووسیوە و سنوور و کەوشەنی کوردستانیان بە شارەزووی خۆیان هەڵقرچاندووە؛ بەڵام هەرچی گوتوویانە و دەیلێن دەگەڵ ڕووداوی ڕاستی تاریخی و زانستی ڕەسەن ناسین و بەڵگەی‌تری نەتەوایەتیدا عاسمان و ڕێسمانن.

بەڵگە لە مێژینە و کەوناراکانی کوردی و لێکۆڵینەوەی وردی مێژوویی و پێداگەڕان و لێڕوانینی

ئەو کوردستانە بەرفرەوانە کە لە ئەنقەرەوە تا خوراسانی داکرتووە و گەلی کوردی تێدا دەژی، بۆمان دەردەخا کە ژمارەمان بە لوڕی لوڕستان و کەڵوڕی کرماشان و هەمەدانەوە هیچ نەبێ خۆ لە شەش ملیۆن دەدا. ئەگەر ئەو لاپڕەسەن و بیانیانەی کوردستانیش بە زیادەوە دانێین، هەر ملیۆنێك دەبن. بەو پێیە ژمارەی کوردەکانی کوردستان و هەندەران بە لانی کەمەوە لە حەوت ملیۆنی نزیك دەکاتەوە. ئەمەش سیاییەکەیەتی:

| | |
|---|---|
| لە ئێران | ١٥٠٠٠٠٠ |
| لە ڕووسیە | ٢٥٠٠٠٠ |
| لە هەموو تورکیە | ٤٥٠٠٠٠٠ |
| لە عیراق | ٥٠٠٠٠٠ |
| لە هەموو سوریە | ٢٥٠٠٠٠ |
| هەمووی حەوت ملیۆن[1] | ٧٠٠٠٠٠٠ |

## ڕەگەز و زمان

زانایان دەربارەی ڕەگەزی کورد پێك نەهاتوون؛ هەر وەك بۆ هەموو شتێکی تری سەر بە گەلی کوردیش یەکتریان نەگرتووە! هێندێك لە ڕەسەنناسان لایان وایە کورد لە هۆزە تاریەکانەوە کەوتۆتەوەو هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە لە کاردۆکیا (وان و بدلیس) دانیشتووە و بۆ پارازتنی ئازادی و سەربەخۆیی خۆی -کە داخواز و پیشەی هەمیشەی ئەو گەلە چیانشینە بووە- پاڵی بەو کەژە سەرکەشانەوە داوە؛ کە بە سەر ئاشورستانی کەونیدا ڕوانیوە.

بەڵگەی بە هێز بۆ ئەم مەبەستە نووسراوەکەی گزەنەفۆن مێژووزانی پێشینی یۆنانە کە باسی پاشەکشە کردنی دەهەزار شەڕکەری یۆنانی دەکا کە ساڵی ٤٠١ پێش عیسا لە ئێرانەوە بەرەو شیمال هاتوون و ڕوویان کردۆتە لای دەریای ڕەش و لە ڕێگەی نێوان چیاکانی ڕەواندز تا دەگاتە دەرسیم و ئەرزنجان بە ناو گەلێکی زۆر ئازا و نەترسا تێپەڕیون کە ناویان کاردۆخ بووە. بێگومان کاردۆخ

---

١ - ئەم ژمارەیانە ئەگەڕێتەوە بۆ ٦٥ ساڵی پێش. ئەوی ئێستا تا ڕادەیەك ڕۆشنە، ژمارەی کوردی عیراقە: دەوری پێنج میلیۆن. ماجد

کورده و یۆنانی گۆڕیویانه. بەو پێیە وا بوو بە نزیکەی سێ هەزار ساڵ گەلی کورد لەو نیشتمانەدا دەژی و ڕەوشت و ئاکاری ئەو کۆنە باپیرانەی بۆ ماوەتەوە.

هێندێکی‌تر لە زانایان لایان وایە کورد تەنیا هەر ئەو کوردۆکیانە نەبوون، لەوانیش و لە یۆنانیش لە مێژینەترن؛ چونکە لێکۆڵینەوەی زانستی تازە بابەت دەریخستووە کە لە سەرەتای تاریخەوە لەو چیا بەرزانەدا کە بە سەر ئاشوور و میدیایاندا دەڕوانێ، کەلێك بە ناوی گۆتۆ تیاندا ژیاوە و گۆتۆش بە مانا پاڵەوان و شەڕکەرە. ئاشوریەکان کۆتۆیان بە کاردۆ یان کاردۆ گوتووە. استرابوون جوغرافی‌زانی پێشووش هەر ئەو ناوەی دەگەڵ باسی کارداسیسدا هێناوە. ئەگەر وەك گومانی لێ دەکرێ کاردۆکی توورانیش بووبێ، هەر لە سەرەتای تاریخەوە تێکەڵاوی ئاریەکانی دەوروبەری بووە و بووە بە لکێك لەو ئاریە هەرە کەونارایانەی کە ئاسەواری شارستانیەتیان زۆر لە ئاسەواری شارستانیەتی ڕۆژئاوای ئاسیایی وەك شارستانیەتی ئاشوری و حەیسی و سۆزی و عیلامی و بابلی پتر بووە.

## گۆتۆ

وا دەردەکەوێ لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی ئاشوراندا جۆرە سەربەستیەکی سیاسی پێکەوە نابێ؛ بەڵام لە پاش تێکچوونی نەینەوا، دەگەڵ میدیەکاندا بوونە یەك. ئەو میدیانەی باپیرانی ئەو کوردە شەڕکەر و ئازایە بوون و دەستیان گەیشتۆتە جەنووبیش و فارس و خۆزستانیان دەست بە سەر ڕاگرتووە. چونکە ئەو شارستانیەتەی لە کرماشان و هەمداندا هەبووە، تەواو لەو شارستانیەتە دەکا کە گۆتۆ لە شیمالدا لە کاردۆکیای دامەزراندووە و هەر وەك شارستانیەتەکەی میدیا و ئاشوریانیش دەچێ.

ئاسەواری کەونارا وا نیشان دەدا کە وشەی گۆدەرز واتا گەورەی گۆتۆ. هۆزی کەلهوڕ خۆیان بە تۆرەمەی ئەو گۆدەرزە دەزانن. هەروەها گۆرانیش (کوردی عیراق و ئێران) لایان وایە بە ڕەسەن دەچنەوە سەر گۆدەرزی کوڕی گیو کە گیویش کوڕێکی هەبووە ناوی ڕەحام بووە و بەهەمەنی کەیانی ناردوویە ئورشەلیمی پێ وێران کردووە و جوولەکەی بە دیل گرتوون و ئەو ڕەحامیە کە عەرەبان بە بەختونەسری ناو دەبەن. ئەو ڕەحامە دوایی لە سەر تەختی پادشایی ڕۆنیشتووە و نەوە و نەتەوە

دەسەڵاتدارەکانی بە گۆران ناوبانگیان ڕۆیشتووە. لە نزیك قەسری شیرینەوە لە سەر هێندێك بەردی بێستوون هەڵکەندراوە:گیوی کوڕی گۆدەرز ڕاستەوە هەبووە.«بڕوانە گۆڤاری کۆمەڵی ئاسیایی٩-١١٤.»

جا بە هەرتك باران دا، گەلی کورد بە هەر چوار لکیەوە (کرمانج و کۆران و لوڕ و کەلوڕ) لەو گەلە ئاریە هەرە لە مێژینانەیە کە شارستانیەتی زۆر گەشەداریان لە بانوی ئێران و دەوروبەری دامەزراندووە و بە سەر هەموو هۆزە هاونەژادە ئاریەکانی پێشووی خۆیاندا زاڵ بوون. پاتەختیان ئەکباتانی لای کرماشان بووە و لە سەرچاوەی دەجلە و فوراتەوە تا خەلیجی فارس کەوتۆتە ژێر قەڵەمڕەویان. لە سەرانسەری ئەو ئیمپەراتۆریەدا زمانی کوردی زمانی کشتی بووە و ناوی پەهلەوی لێنراوە کە واتا زمانی پاڵەوانان و ئەمەش هەر مانای گۆتۆ و کاردۆ دەکرێتەوە. کوردی شانامەش هەر بە مانا ئازایە و چونکە بە درێژایی مێژوو لە هەموو کەس ئازاتر و گیانبازتر بوون ئەو ناوەیان بە سەردا براوە.

زمانی پەهلەوی ماکەی ئەم کوردەیەی ئێستایە کە بوەتە زاراوەی کرمانجی و گۆرانی و لوڕی و کەلوڕی. لوڕیش لەوانی‌تر لە پەهلەوی نزیکترە؛ چونکە لوڕ کەمتر تخوونی کلدان و ئاشۆران بوون. کەلوڕی و ئەوجار گۆرانی و لە پاشان کرمانجی زۆریان ئاشوری و کلدانی تێکەڵ بووە؛ چونکە هاوسای یەکتر بوون.

بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم مەبەستە دژوارە، پوختەی نووسراوەی خاوەنی جوغرافیای *مەلتەبرون* دەخەینە بەرچاو، کە نزیکەی سەدەیەك لە مەوبەر لە سەر وشەی «ئێران، یەران» وەك شەرقی دەیڵێن و «ئێریانە، ئاریانە» وەك ڕۆژاواییەکان ئەیدرکێنن، دەڕوا و باسی گۆڕانی زمانی خاوەن شارستانیەتەکانی گەورە دەکا.

دەڵێ: پێشینەکان ئاری و ئەسقوسی(تەتەر) و توووران و ئێرانیشیان لێك هەڵداوارد؛ کە لە دیوارەکانی ئیستەخر ناوی ئاریانە نووسراوە. یۆنانەکانیش هەر ئەوەیان دەگوت؛ ئەڵبەت هێندێك لە زاناکانی یۆنان تەنیا بە ڕۆژهەلاتی ئێران واتا بە خوراسان و ئەفغانیان دەگوت ولاتی ئاریانە. بەلام باوکی تاریخ -کە هیرۆدۆتە- لە سەر ئەوە سوورە کە ڕۆژهەلات و خۆرنشینی ئێران هەمووی

مەڵبەندی ئاریانەیە و خەڵکی میدیاش بێگومان ئارین.

کۆنترین زمانی ئاریانە زەند و پەهلەوانە. زەند یان زەندئاویستا، زمانی پیرۆزی مەجووسان بووە و زمانی ئایینی کەونی ئێرانیانە و دەگەڵ زمانی سانسکریتیدا -کە زمانی پیرۆزی هیندۆکانە- خزمایەتی هەیە و زۆر وشەی ئەو دوو زمانە لە ڕیشەدا یەکتر دەگرنەوە.

زمانی پەهلەوی واتا زمانی پاڵەوان و شەڕکەران، خۆیا دەگا لە عیراقی عەجەم و میدیای گەورە و پەرت(فارس)دا زۆر بە برەو بوویێ و لە کۆشک و دیوانی پادشایانی بنیچەی سیرۆس (کوورش)دا، هەر زمانی پەهلەوی دە کار هێنراوە.

ئەگەرچی پەهلەوی گەلێك وشەی کلدان و ئاشۆرانیشی تێخزاوە، بەڵام هەر لە زووەوە کتێبی ئایینی مەجووسان لە زەندەوە کراوە بە پەهلەوی.

نووسینی دەورەی ساسانیانیش بە زمانی پەهلەوی هەر ماوەتەوە. ئەمەش بەڵگەیە کە لە زەمانی ساسانیانیشدا هەر زمانی دیوان بووە. بەڵام لە نێوانی ساڵانی ٢١١.ز تا ٦٣٢.ز وا دیارە خۆیان لە زمانی پەهلەوی نەبان کردووە و لە برەویان خستووە. لەو ساوە ڕوویان کردۆتە چیاکانی پارس و بە فەرمانی پادشا زمانی فارسی کراوە بە جێنشینی زەندە و پەهلەوی؛ چونکە لە هەردوکیان هاسان و ڕەوانتر بووە.

کاتێ کە عەرەب لە سەدەی حەوتەمدا دەستیان بەسەر ئێراندا گرت و دەوڵەتی فارسیان لەناو برد، زمانە فارسیەکەش لە برەو کەوت و ئەو وچانە تا ساڵانی ٩٧٧.ز خایاند. تا دەیلەمیەکان لێ بڕان کە زمانی کۆنی خۆیان تازە کەنەوە و برەو بە زمانی نەتەوایەتی بدەنەوە؛ فارسیەکەیان هەڵبژارد؛ کە لە خۆیان نزیکتر و لە کۆنەکان هاسانتر بوو. بەڵام فارسیش زۆر گۆڕابوو؛ گەلێك وشەی عەرەبی تێخزابوو. بوێژان و نووسەران تێکەوتن لە زەند و لە پەهلەوی (کوردی کەون) و لە فارسیە تێکەڵاوەکەیان، زاراوەیێکی هاسان و دەوڵەمەند و ڕەوانیان پێکەوە نا و ناویان نا فارسی تازە؛ کە ئێستا لە وڵاتی عەجەمدا باوە. فارسیە کەونەکەش لە سایەی شانامەی فیردەوسی و لە سۆنگەی کتێبی ئایینی ئاگرپەرستان مایەوە و لە ناو نەچوو. «بڕوانە: وتاری پەنجا و پێنجەم لە مەڕ ئاسیاوە، تەرجەمە عەرەبیەکەی ملتبرون، ڕووپەڕ ١٢١».

لە پوختەی ئەم باسانەوە بۆمان دەردەکەوێ کە گەلی کورد یەکێکە لە گەلانی ئێرانی هەرە کەونو شارستانیەتیەکی زۆر گەشەداری لە بانوی ئێرانی مەزندا دامەزراندووە و هەر لە «سەند»ەوە ڕۆژهەڵاتی بە دەستەوە بووە و بەرەو خۆرنشینیش هاتووە و تا دەجلە و فوڕاتی داگرتووە. زمانە کوردیەکەشی -کە پەهلەوی (زمانی پاڵەوانان) بووە- لە هەموو ئیمپەڕاتۆریەتی پێشووی ئێراندا (ئەوەی ئەسکەندەری مەکدونی تێکی داوە) زمانی هەمووانی بووە. لە پاشان کە وردە پاشا هاتوونەتە سەرکار و لە مێژووی فارس بە ڕۆژگاری ئەشکانیان ناو دەبرێ، ئەوانیش سەرێك لە سەر سەرداری هەموو ئێران دەست و پەنجەیان لێك نەرم کردووە و دەگژ یەکتر ڕاچوون؛ تا لە ئەنجامدا پادشای مەڵبەندی فارس (شیراز) هەموو وردە پاشاکانی دەردەست کردووە و ئیمپەڕاتۆریەتی دووهەمی لە ئێراندا دامەزراندووە و ناوی ناوە ساسانی. وشەی فارس لەو ساوە دەگەڵ ئێراندا شان بە شان هاتووە و بە هەموو ئێرانی کەون و نوێیان وتووە و بەو بۆنەوە بە ئیمپەڕاتۆریە کوردی و پەهلەویەکەشیان هەر گوتووە فارسی.

گەلی فارس لەگەڵ ئەوەشا کە لە شارستانیەت و دەسەڵاتداریدا زۆر خاوەن ڕەگە، بەڵام لە چاو گەلی کوردی برای، تازەکارە و کورد زۆر لە مێژترەوە شارستانیەتی یەکەمی لە ئێراندا دامەزراندووە.

ئەو نووسراوانەی بۆ ئەم پێشەکیە و بۆ کەنارە و لێدوان دەربارەی *شەرەفنامەوە* لێم ڕوانیوون ئەمانەن.

١- *مسالك الابصار* ٢- *التعريف بالمصطلح الشريف* ٣- *صبح الاعشى* ٤- *معجم البلدان* ٥- *مراصد الاطلاع* ٦- *قاموس الاعلام التركى* ٧- *ئەنسا کلوپیدیای ئینگلیس* ٨- *دائرة المعارفى اسلامى بە فەرانسی* و چەند کتێبێکی تاریخی و جوغرافی تورکی و فارسی دیکەش و هێندێکیش یادداشت و گەڕانی کوردانەی خۆماڵی.

**محەمەدعەلی عەونی**

وەرگێڕی تورکی و فارسی لە دیوانی خاوەن شکۆ: پادشای میسر

# کورد و کوردستان[1]

## بەشی یەکەم: ڕەگەزی کورد

(۱)

نووسەرانی موسوڵمانی پێشوو، لە سەر ڕەگەزی کوردان پێك نەهاتوون؛ هێندێك دەڵێن لە عـەرەبانن و تەنانەت لەمەشدا یەکدەنگ نیـن! دەستەیەك بنەچەکەیان بە ڕەبیعەی کوڕی وائلی دادەنێن. کۆمەڵێك دەیاندەنە پاڵ موزەڕی کوڕی نزار و گوایە نەتەوەی کوردی کـوڕی مـوڕدی ڕۆڵـەی سەعـسەعەن و لـە هۆزی هەوازنن. بڕێکیشیان فەرموویانە وەچەی ڕەبیعە و موزەڕن. بـەڵام تێکـڕا لایـان وایـە هـەر لـە مێژووی زۆر دوورەوە، بە هـۆی زۆر شـەڕ و شـوڕەوە - کـە لـە نێـوان کوردەکـان و عـەرەبی بـەرەی غەسساندا ڕووی داوە- یا خود بە شوێن چایەران و لەوەڕ و پووش و پاوانان، هەڵوەدای بیابانان بوون و لە ناو چیا گیـرساونەوە و ئەو لە گـەل تەرەبوونـەیان و تێکـەڵ بوونیـان بـە نامۆیـان، بۆتـە مایـەی لەبیـرچوونی زمانە عارەبیەکەیان و خۆشیان زۆر بە زل دەزانن بۆیە فێری عەجەمی بوون.

مێژوونووسی موسوڵمانی وەهاش هەبووە کوردی کردۆتە تۆرەمەی جنـد و شـەیتان و گوتوویـە: «شەیتانێك لەو شەیتانانەی کە بە جەسەد بەناوبانگە و کۆیلەی ماڵی سولەیمان بوو، لـە سولەیـمان هەڵگەڕاوە و دەری کرد و پەلاماری کەنیزە حیزەکـانی دا و جندۆکـەی تێـدا گوڕانـدن و کـاتێ خـودا سولەیـمانی سەر خستەوە، فەرمووی: ئەو داوێن تەڕانە ئاوارەی شاخ و کێوان کەن. کوردی ئێستا لـەو

---

۱- مامۆستا مـحەمەدعەلی عەونی شەرەفنامەی وەرگێڕاوەتە سەر زمـانی عـەرەبی و لـە سـاڵی ۱۹۵۸.ز لـە سـەر ئەرکی وەزارەتی پەروەرێن و فێرکردنی میسر لە چاپ دراوە و لە لایەن مێژوونووسی میسری مامۆستا یەحیا خەشابەوە ئەم پێشەکیەی بۆ نووسراوە.

کیژانە کەوتوونەوە پیژی شەیتانی ئاژاوەن.»[1]

(۲)

خاوەنەکەی *شەرەفنامە* -کە لە سەدەی یازدەی کۆچیدا کتێبەکەی خۆی نووسیوە- وتەی هێندێك نووسەرانی ڕاگوێزتووە کە ڕەگەزی گەلی کوردیان بە خەلکی ئێران زانیوە و گوتوویانە: «کورد ئێرانین؛ بۆ مژی پارێزی خۆیان لە چنگ زەحاکی مار بە شان، داویانەتە کەژ و ڕازان و ڕەوەزیان کردۆتە زێد و زار و زیچیان خستۆتەوە و ناوی کوردیان لێ نراوە و کە زۆر بوون و لە کۆ جێیان نەبۆتەوە، بەرەو پێدەشتان خزیون.[2] خۆشی لای وایە وشەی کورد واتا ئازا. بۆ بەلگەی ئەو ئازایەتیەش ناوی ڕوستەمی کوڕ زاڵ و بارام چووبینە و فەرهادی دلدادەی شیرین و خێرەدین پاشای وەزیری ئورخانی عوسمانی دێنێ. بدلیسی میرانی جزیر دەباتەوە سەر خالیدی کوڕی وەلید و خانەدانی بدلیسیانیش بە نەوەی کیسرا دادەنێ.

(۳)

مینۆرسکی لە لای وایە کورد گەلێکی ئێرانیە و لە ولاتانی فارس و قەوقاز و تورکیا و عیراق نیشتەجێن. زمان و مێژووشیان دەگەڵ گەلانی بانی ئێراندا لێك جیاواز نابێتەوە و ئەگەر بیچم و دیمەنیشیان لە یەك نەکا گرینگ نیە.

زۆر وێدەچێ ڕەگەزی کورد، لە ئالی ڕۆژهەلاتەوە (خۆرنشینی ئێران)، بەرەو ڕۆژئاوا (کوردستانی ناوەندی) کۆچابن و بەر لەوانیش گەلانیتر لەو خۆرنشینەدا ژیابن و بە ناوی کاردۆ ناسرابن و دەگەڵ کوردە ئێرانیەکان لێك درابن.

سیرۆدانجن لە خوێندنەوەی ئاسەواری ئاشووریاندا ناوی «کار-دا-کا»ی دیتووە و لای وایە

---

١- *مروج الذهب للمسعودی*، بەرگی ١، ڕووپەڕ ٣٠٧ و ٣٠٨، چاپی میسر، یەحیا خەشاب.

بە پێی فەرمایشتی مەسعوودی، کورد بەر و پشت ئەتلەسن! هەژار

٢- مینۆرسکی لە *دائرة المعارفي ئیسلامیدا* دەلێ: «هەموو سالێك لە ئێران لە ڕۆژی ٣١ اغطوسدا بۆ بیرەوەری نەمانێ زەحاك جێژنێك دەگێڕێ کە «جێژنی کورد»ی پێ دەلێن.

مەڵبەندێك بووە دراوسێی گەلی سۆ بووە. درایڤەر دەڵێ: سۆ جەنووبی گۆلی وانە. شەرەفخـان دەڵـێ: قەڵای سۆ لە نزیك شاری بدلیسە و لە پاش ئەوەش بە هەزار ساڵ تگلات پلیسر هیـرش دەباتـە سـەر گەلی کورتی لە چیای ئازۆ. درایڤەر ئازۆ بە حەزۆی ئێستا (ساسۆن) دەزانێ. بـەڵام «کـورتی»یـەکـە تەواو دیار نیە! هیـرۆدۆت لە سەدەی پێنجی پێش میلاد ئەو ناوە نابا؛ بـەڵام گوتوویـە: «مەڵبەنـدی سێزدە لـە ئیمپـەڕاتۆری ئـەکمینی خراوەتـە سـەر ئەرمەنـستان و نـاوی بوختەیوخـە. کـە هێنـدێك ڕۆژهەڵاتناسان لایان وایە بوختان، بوهتانە.

گەزەنفۆن ٤٠١-٤٠٠ بەر لە میلاد ناوی گەلی کـوردۆك دێـنێ کـە لـە خـاوەری (کنتـــریتس، بوختان) دەژی. هەر ئەم ناوە زۆر جاری دیش لەو شوێنانەی کەوتوونـە لای ڕۆژئـاوای دەجلـە و چـیای جودی، دەبیسرێ و مێژووناسان بە کوردۆئیـنیان ناسیوە. ئارامیەکان ئەو ناوچەیان ناو لێناوە حـەوزی کاردۆ شاری جزیری ئێستاشیان گازارتای کاردۆ پێ وتووە.

شاری جزیر لە پێشوودا ئەرمەنیەکان ناوی کوردوزیان لـێ نـابوو؛ عـەرەب کردیـان بـە بقـردی. یاقووت لە زمان ئیبنوئەسیرەوە پێمـان دەڵـێ: بـەقردا پـاژی جزیـری ئیبنوعومـەرە. دوای ئیـسلام بقرداشیان نەهێشتووە و لە کتێبە عەرەبیەکاندا جزیرەی ئیبنوعومەر (بووهتان) نووسراوە. مینۆرسکی لەو سەر باسە دەڕوا و دەڵێ: «کاردشۆی (نیشتمانی لە مێژینـەی گـەلی کـاردۆ) نیـشتمانی ئێـستای کوردە و دەبێ ئەوەش بسەلـمێنیـن کە وشەی کاردشۆی هەر کوردە و لە سەرەتای چـەرخی بیـستەمی ئێستاوە هەموو کەس لەو باوەڕەیە. کورد و خەلدیش هەر یەك ناون.

ریسك دەڵێ: «ناوی خەلـدی و کـورد و کوردیـای لێـك جیـا نیــن.» دەربـارەی زمانەکەشـیان تۆژینەوەی پسپۆڕانی زۆر بە وردی خوێندۆتەوە و دەڵێ: «کورد بۆتە نـاو بـۆ گـەلێکی ڕەگـەز ئێرانـی دوتۆوە؛ یان گەلێکە کە هاوسای ئێرانیان بووە؛ کە عەرەب هاتوونە ئێـران، بیـانی دەگـەڵ ئێرانیانـدا تێکەڵ بوون و حوکماتیشیان لە سەر کردوون.»

(٤)

سیدنی سـمیت لە بارەی زمان و مێژووەوە پێشەکیەکی هێژای هەیە تیا دەڵێ: «لە مەڕ زمـانی کوردەوە لە ڕۆژگاری تازەدا بیـری زانایان گۆڕاوە و بە ڕیشاژۆی زمـانی فارسـی نـازانن و لایـان وایـە

زمانێکی سەربەخۆیە و کەونارایە و گۆڕانی بە سەردا هاتووە و ناسك و ڕەوانتر بووە و کوردی لەو فارسیەش کۆنترە کە شوێنەواری دارایە.[1] زمانی کورد شەشسەد ساڵ بەر لە میلادیش هەر زمانێکی سەربەخۆ و خۆژی بووە و لەو چاخەوە کە میدیەکان هاتوونە وڵاتی میدی و ئێرانی هاتوونە ئێران، گەلی کوردیش لە کوردستان دامەزراوە».

سیدنی سمیش -کە پسپۆڕی زمانە کەوناراکانە- لە لای وایە کوردی و فارسی لێك جیان و فڕیان بە یەکەوە نیە و لاشی وایە کە پاش ساڵی ٦٥٠ی پێش میلاد، کورد هاتوونە کوردستان و بەڵگەشی ئەو ئاسەوارەی ئاشووریانە کە بەر لەوە ناوی کوردیان تێدا نیە.

(٥)

سافراستیان لە دائرةالمعارفی بریتانی بەرگی ساڵی ١٩٤٤دا دەڵێ: «بەر لە ئیسلام هیچ وەختێ کورد سەری بۆ کەس نەچەماندووە و لە دەورانی ئەکمینیدا تەواو بوونە شاری نەژاد و ئەوسا وەکو ستاریەکان شەڕکەریان بۆ دەوڵەت دەنارد و پارێزگاری ئاگردانی زەردەشتیانیش هەر خۆیان بوون.

(٦)

ئەمین زەکی بۆ ئەو باسە دوورتر دەڕوا و دەڵێ: «کوردستان یەکەم نیشتمانی دووەم بنچینەی مرۆڤە و گەلان بە هۆی کارەسات و ڕووداوی کۆن لەوێوە ئاوارە بوون و لە هەندەران نیشتەجێ بوون. هەر لە سەرەتای مێژوودا چیای زاگرۆس نیشتمانی گەلەکانی لولو و گۆتی و خالدی (کالدی) و سوبارو (هوری) بووە. لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەو مەڵبەندەش عیلام ژیاون. جگە لە گەلی عیلامی، ئەو گەلانە بنەچەکەی هەرە کەونی گەلی کوردن».

لەمەڕ «میدی» چەرخی نۆهەمی پێش میلاد ئەو لای وایە: «میدیەکان هیند و ئەورووپین و لە وڵاتی «باختریانە»ی ڕۆژهەڵاتی دەریای قەوقازڕا بەرەو ڕۆژاوی باکووری بانوی ئێران واتا: وڵاتی میدیا بزوتوون و ئەمە زۆر ڕاستە کە دەڵێن: میدی ئەو هۆزە کوردانەن لە ڕۆژهەڵاتی وڵاتی ئاشووریەکاندا نیشتەجێن. میدی بە ڕەگەز ئارین و زمانیان لە زمانەکانی هیند و ئەورووپی بەشێکە و هەر زمانی کوردی کۆنەیان ئەو بنچینەی ئەمە بووە و هەر وەك گەلی پەرتی و فارس کە تێکەڵ بوون، پەرتی پەرت و بڵاو بوونە، میدیەکانیش کە کەوتوونە ناو فارسەوە بە مەرەدی ئەوان چوونە».

---

١- Early Histry of Assyria.

ئەمین زەکی پلارێ دە سیدنی سمیسی دەگرێ کە گوتوویە: «بەر لە ساڵی ٦٥٠ی پێش میلاد، ناوی کوردان لە شوێنەواری ئاشووریان دیاری نیە.» بەڵگەی تۆژینەوەی «هۆل»ە کە لە مێژووی ڕۆژهەڵاتی نزیکدا درکاندوویە: «سێهەم خونکاری ئاشووری کە ئاداد(نیراری) بووە، ٨١٢ی پێش میلاد پەلاماری هۆزەکانی کوردی لای باکووری داوە». بەوەدا باش دەردەکەوێ کە گەلی کورد لە ٦٥٠یەکە زۆر کۆنترە».

پاشان دەڵێ: «خوا کوردەکان قەوقازی بن و لە پاش کۆچ و کۆچباری زۆر لە چەرخی نۆیەم و هەشتەمی پێش میلادا بووبنە ئاری -وەك هێندێك خاوەرناس دەڵێن- خوا هەر ئاری حەسڵ بووبن و ڕاست هیند و ئەورووپایی بن- وەك زۆر مێژوونووس دەینووسن -ئەوی بێگومان سۆیە بیروبڕوای ئەوانەیە کە ڕەگەز و ڕەسەنی کورد زۆر بە کەونارا دەزانن و لایان وایە زۆر بە ڕەگە. دەگەڵ هێمان پێویستمان بە زۆر بەڵگەیتریش هەیە کە بۆمانی ڕوون کەنەوە. دەگەڵ ئەوەش من لام وایە ئەوەی دەڵێن کوردان لە چەرخی حەوتەمی بەر لە میلاد هاتوونە کوردستانەوە، بە سەرچوون و تێی نەگەیون.».

جا بۆ بەڵگەی ئەم داوایەش ئاوا دەڵێ: «ئەو ناوە لێك جیایانەی کە لە گەلی کورد نراون نایگەیێنێ کە چەند گەلی جیاواز بووبن. ئاڵوگۆڕی باری ژیان پێشچوون و گەشەکردنی ناو گۆڕانی بە شوێندا دێ. بەڵگەش قسەی سپایزەرە کە گوتوویە: گۆڕانی ناو و ناتۆرە لە ناو هەموو گەلان زۆرە؛ بۆ نموونە: کاسی وەرگەڕا بۆ: کاسای، کۆسی، کاششو، کۆشی و هەروەها لولو کردیانە: لولوبوم، لوللومی و نوللو.»

ئەو ناوی لە کورد نراون و هێندێك بە ڕواڵەت لێك جیان، ڕۆژهەڵاتناس لایان وایە لە بنچینەدا هەر یەك ناون. جا یان بە هەموو کورد گوتراون یان ناوی تیرە و هۆزانن کە کوردیان لێ پێکهاتووە و ئێستاش هەر هۆزەی سەربەخۆ ناوێکی تایبەتی هەیە. لە ڕۆژگاری کەونارادا ناوی کورد بەم چەشنە بووگە:

لای سۆمەریەکان: گۆتی، جۆتی، جوودی.

لای ئاشووریەکان: گۆتی، کوتی، کورتی، کارتی، کاردۆ، کارداکا، کاردان، کارکتان، کارداك.

لای ئێرانیەکان: کورتیوی، سیرتی، کوردراها.

لای ڕۆمانی و یۆنانی: کاردوسۆی، کاردخۆی، کاردۆك، کەردۆکی، کەردۆخی.

لای ئەرمەنان: کوردۆئیـــن، کورچیخ، کورتیخ، کەرخی، کورخی.

لای عەرەبان: کوردی، کاردۆی، باقاردا، کارتاویە، جوردی، جودی.»

ئەمیـن زەکی لە بڕانەوەی باسەکەیدا، خۆی لای وایە کە دەربارەی سەرچـاوەی ڕەگـەزی کـوردان بەڵگەی وا دەست نەکەوتووە کە تەواو لێی پشت ئەستوور بیــن.

# بەشی دووهەم

## کوردستان لە سەرەتای ئیسلامەوە هەتا جەنگی یەکەمی جیهانی

(١)

هەر لەو ساوە کە عەرەبان خاکی فارس و ڕۆمانیان گرت، مێژووی کوردیش لەوە دەرچوو مێژووی کەونی بۆ بڕوانی و بۆ زمانەکەی کەونارا بپشکنی. هەر لە سایەی کتێبی مێژووی ئیسلامی، مێژووی کوردیش شی کراوە و ڕوون و ڕەوان باسی کراوە!

کوردان زۆر شانازی دەکەن کە هەواڵێکی پێغەمبەر ناوی گابانی کورد بووە. کوڕی گابان -کە مەیموون ئەبوویەسیر[1] بووە- لە لای کورد زۆر خۆشەویستە. گابان وەك سەلمان فارسی -کە فارس خۆی پێ ڕادەنێن- زۆر لە پێغەمبەر نزیك و فەرموودەکانی لەبەر بوون. لە چەرخەکانی سەرەتای دەوڵەتی خاوەری ئیسلام، نێوی کورد لە زۆر شوێناندا دێتە بەر چاو. سالی ٢٢٤.ك (٨٣٩.ز) بە سەرکردەیی سەرداریان جەعفەری کوڕی فەهرجس لە لای مووسڵ شۆڕشێکیان دژی موعتەسم عەبباسی هەڵگیرساند و والی مووسڵیان وە دەر نا و خەلیفە چاری ناچار بوو لەشکرێکی یەکجار زۆری بە سەرکردەیی ئیتاخ ناو نارده سەریان و جەعفەر کوژرا و کوردەکان قەلاچۆ کران و ساف لە سافیش تالان کران.[2]

سالی ٢٥٢.ك (٨٦٦.ز) کە مساور دەگژ والی مووسڵ ڕاچوو، کورد هاوکاری مساور بوون. شۆڕشی زەنج و سەففاری -کە دژی بەغدا دەجەنگین- کورد یاریدەی شۆڕشیان کرد. یەعقووبی لەیسی سەففاری لە پاداشتی ئازایەتی، ئەهوازی دا بە محەمەد کوڕی عوبەیدوڵڵا کوڕی هەزار مەرد؛ بەڵام محەمەد دەیەویست هەر بۆ خۆی هەمەکارە بێ. ئەبووهەیجا کوڕحەمەدان تازە ببووە والی مووسڵ، هاواریان بۆ هێنا و گوتیان: محەمەد کوڕی بیلال و کوردەکانی هەزەبانی دەوری نەینەوایان داوە و هەر کوردەکان پێنج هەزارن. ئەبووهەیجا لە مەعرویە -کە لە سەر چۆمی خازره- چووە جەستەیان و لە شەڕدا لەبەر کورد شکا و هاتەوە مووسڵ و دووبارە خۆی بۆ شەڕ ساز کردەوە؛

---

١- کورد و کوردستانی ئەمین زەکی کە ئەویش لە تەفسیری روح المعانی ئالوسی ڕاگوێزتووە.یەحیا خەشاب

٢- ئیبنوئەسیر، ڕووداوەکانی سالی ٢٢٤.

بە لەشکرێکی زۆرەوە چووە سەریان. محەمەد کەوتە تەنگانە و داوای شەڕ وێستانی کرد و بەڵێنی دا کوڕەکانی خۆی دە گرۆ دانێ و خۆیشی بدا بە دەستەوە. کە چوو کوڕانی بنێرێ، کوردەکانی خۆی تێگەیاند کە بچنە ئازربایجان و خۆ ڕزگار کەن. ئەبووهەیجا کە تێگەیشت محەمەد فریوی داوە، خۆی گەیاندنێ و دەوری گرتن. دەورە درا و کە زانیان دەرەتان نەما، هاتنە بەر داڵدەی دوژمن و ئەبووهەیجاش عافووی کردن و منداڵ و ماڵی کوردانی -کە بردبوون- وێی دانەوە. لە پاشان کوردی حەمیدی و کوردەکانی چیای داسن هاتنە پەنای ئەبووهەیجا و شەڕ و ئاژاوە داکوژا.[1]

وەك ئیبن مسکویە ٣٣٧.ك (٩٤٣.ز) دەڵێ: حوسێن حەمەدانی هێرشی کردە سەر ئازربایجان و دەگەڵ مەزنی هۆزی کوردی هەزەبانی پەیمانی دۆستایەتی بەست و مەڵبەندی سەلماسیشی گرت.

وەکو *تاریخی بەیهەقی* و چەند مێژوونووسی دیش دەڵێن: غەزنەویەکان بەشی زۆری لەشکرەکەیان هەر کورد بوون. لە ڕاستیشدا کورد هەمیشە بە ئازا و بوێر و شەڕکەر بە ناوبانگ بوون.

بدلیسی هەتا تاریخی ١٠٠٥ باسی بنەماڵەی کوردان دەکا.

**(٢)**

بەشی ڕۆژئاوای مەڵبەندی ناو چیا (اقلیم الجبال) بە کوردستان ناو براوە.[2] مستوفی دەڵێ: لە دەوری نیوەی سەدەی شەشی کۆچی، سوڵتان سەنجەری سەلجووقی ٥١١.ك (٥٥٥.ز) ئەو ناو چیایەی لە کرماشان جیا کردەوە و ناوی کوردستانی لێ نا و سولەیمانشای برازای خۆی لە سەر دانا. باج و پیتاکی کوردستان ئەو ڕۆژگارە دوو ملیۆن دیناری زێڕ بوو.[3]

*«مروج و الذهب»*ی مەسعوودی، ٣٣٢.ك (٩٤٣.ز) ناوی چەند هۆزی کورد دێنێ:

شاهجان: لە لای دینەوەر و هەمەدان.

ماجوردان: لە کەنگاوەر.

---

١- لوسترانگ، *بلدان الخلافه الشرقیه*، تەرجەمەی بشیر فرنسیس و گورگیس عواد، ل ١٨.

٢- مینۆرسکی، *دائرة المعارف الاسلامیة*، *خلاصه تاریخ کوردستان* ٣٧٤، ٣٧٥. *بلدان الخلافة الشرقیة*، ٢١٦، ٢١٧. یەحیا خەشاب

٣- هەر ئەو سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٧-٢٢٨.

هەزەبانی و برات: لە ئازەربایـجان.

شادنـجان، لازیا، مادنـجان، مازدەنکان، باریسان، جەلالی، جەبارقی، جـاوانی[1]، موسـتەکانی: ئەوانە لە ناو چیا دەژیـن.

دەبابلا: لە شام دەژین

کوردە مەسیحیەکانیش وەك تیرەی یەعقوبی (جورقان) لە لای مووسڵ و چیای جـودین. هـەر مەسعوودی لـە کتـێبی *التنبیـه والارشـاد*، رووپـەڕ ٨٨-٩١دا هـۆزی بازنــجانی کـورد نـاو دەبـا. ئیستەخری (٣٤٠/٩١٥) لە لاپەڕە ١١٥ی کتێبەکەیدا ناوی ئەو هۆزانە دێـنێ: ناشـاویرا، بوزیکـان، کیکان. دەشڵێ: لە لای مەرعیش دەژیـن. لـە لاپـەڕەی ٢٨٢شـدا هێنـدێك مەڵبەنـدی کوردنـشیـن ناونووس دەکا؛ وەکو: فارس، سەجستان، خوراسان (گوندێکە لای ئەسەداباد) ئیسفەهان -جگـە لـەوە کە بازێڕێکی گەورەیە و بە شاری کوردان ناسراوە[2]- ناوی تیـرەیەکی کوردی سەر بە هۆزی بازنـجانە.

نیاز لە ناو چیا: الـجبال، ماهی کوفە و ماهی بەسرە و ماسەبەدان (ماسەبەدان) و هەمـەدان و شارەزوور و دەور و بەری داراباد و سەمەغان و زیـمکان و ئازربایـجان و ئەرمەنستان بووە و لە دویـن یان تووین -کە پێشوو ناوی دبیلێ بووە و لە سەر چەمی ڕس هەڵکەوتووە- کوردان خانووی بـە بـەرد و خـشتی کاڵیـان لـێ سـاز داوە. مەقدەسـی دەڵـێ: «کوردەکـانی سـەر چـەمی ڕس بەشـی زۆربـەیان مەسیحیـن». هەروەها ئەرانیش کوردە و یـەك لـە دەروازەی بەرزەعـە بـە دەروازەی کـورد دەناسـرا. مسکویە دەڵێ: «حاکمی ئەران ساڵی ٣٣٢ك (١٠٤٢ز) -کە ڕووس پەلاماریان دابـوو- هیمـدادی لـە کوردەکان خواست.»

بیلقان و باب الابواب (دەربەند) و جزیرە و شام و سغوور (سەرحەدان) کوردیان لێیە.

ئیستەخری باسی پێنج مەڵبەندی کوردنشیـن دەکا کە لە فارس دان[3] و هەر کۆمەڵە کوردێك لەو

---

١- بۆ باسی جاوانی بروانە *نامیلکەی دکتۆر مستەفا جەواد: «جابان، القبیلة المنسیة الکردیة»* کە مامۆسـتا هـەژار کردویەتە کوردی بە ناوی «*هۆزی لەبیرکراوی گاوان*» و کۆڕی زانیاری کورد لە ساڵی ١٩٧١.ز لەچاپی داون. ماجد

٢- *الیعقوبی*، ل ٢٧٥ ئیستەخری، ل ١٢٥. یەحیا خەشاب

٣- ئەو شوێنانەی کە کوردی لێ بوون «ڕم»یان پێ دەگوتن. *دائرة المعارف اسلامی*، وتاری مینۆرسکی، *مفاتیح‌العلوم* خوارەزمی، بەندی حەوتەم. یەحیا خەشاب

مەڵبەندانە پاتەخت و سەرداری خۆیان هەیە و پیتاکی خۆی دەدەنێ و ئەویش دەیانپارێزێ. ئەو پێنج مەڵبەندەش بریتیـن لە:

١- جیلویە: لە نێوان ئیسفەهان و خۆزستاندا.

٢- لەوەلیجان: لە نێوان شیـراز و خەلیجی فارسدا.

٣- دیوان: لە ناوچەی سابوور (شاپوور).

٤- کاریان: لە لای کرمان.

٥- شەهریار: لە لای ئیسفەهانە و بازنـجانیشی پێ دەڵێن؛ لە بەر ئەو هۆزە کـوردەی کـە بـەو ناوەن و هێندێکیان ڕاگوێزراونە ئیسفەهان.

لە پاشان هەر ئیستەخری باسی سی‌وسێ تیـرەی کورد دەکا کە لە فارس دان و ناوی ئەوانەی لـە *دیوانی صدقاتدا* دەرێناوە؛ ئەوانیش ئەمانەن:

کرمـانی، ڕامـانی، مودەسـەر، مـحەمەد بـن بەشـەر و بقیلـی. مەقدەسـی دەڵـێ: ثعلبـی، بوندامەهری، مـحەمەد بـن ئیـسحاق، سـەباهی، ئیـسحاقی، ئـەدورکانی، شـەهراکی، تـەهمادانی، زەبادی، شەهرەوی، بونـدادەکی، خوسـرەوی، زەنـجی، سـەفەری، شـەهیاری، میهرکـی، مویـارکی، ئیشتامەهری، شاهونی، فوراتی، سەلـمونی، سیـری، ئازادختی، بەرازدوختی، موتەللەبی، مـەمالی، شاهکانی، کجتی، جەلیلی.

ئەو هۆزانە هەموویان کۆچەر و دەوارنشیـن بوون و ژمارەیان پێنج سەدهەزار خێزان بوو. جگـە لەوانەش ئیستەخری لە کوردەکانی ناو فارس ناوی هۆزی لوریش دێنێ. ابن البلخـی ٥٠٠ك (١١٠٧ز) دەڵێ: «کابرایەك بە ناوی عەلەك لەو کوردانە ببووە ئیسلام؛ ئێستاش وەچەی لە وڵاتی فارسدا مـاون؛ بەڵام کوردەکانی دیکە کە لـە وڵاتـی فـارس دەژیـان، لـە کەوشـەنی ئیـسفەهان بـوون و عـضدالدولە ڕایگوێزتوون». ابن البلخی[1] بە تایبەتی لە مەڕ کـوردی شـوانکارەوە دەدوێ و دەڵـێ: «هێزێکـی زۆر گەورە بوون و لە دەورانی بویەهیەکان بەناوبانگ بوون.»

ڕامانی -کەوا ئیستەخری باسیان دەکا- لکی هۆزی شـوانکارە بـوون. *شـەرەفنامە* هـیچ باسـی

١- *فارسنامە*، ل ١٦٨.

شوانکاره ناکا! ئەمە بۆمانی دەردەخا کوردەکانی ناوچەی فارس دەگەڵ کوردی کوردستان (شول، لور) لێك جیاوازن. بەڵام زۆزان (هاوینەوار) -کە بە گشتی بە کوردستانیان گوتووە- هێشتا زۆر ڕوون نەبۆتەوە.

یاقووت لە معجم دا[1] دەڵێ: «زۆزان وڵاتێکی جوانە و لە نێوانی چیاکانی ئەرمەنستان و ئەخلات و ئازربایجان و دیاربەکر و مووسڵ هەڵکەوتووە. دانیشتووەکانی ئەرمەنن و کەلێك هۆزە کوردیشی لێن.

یاقووت لە زمان ئەسیرەوە ڕایگوێزتووە: «زۆزان مەڵبەندێ هەراوە و لە ڕۆژهەڵاتی دەجلەوە تا جزیرەی عومەرە و سنوورەکەی لە دوو ڕۆژەڕێی مووسڵەوە دەس پێدەکا و ئەخلاتیش وە بەر خۆ دەدا و لە سەڵماسی ئازربایجان کۆتایی دێت؛ هەمووش بە دەست کوردەکانی بەشنەوییە و بەختیەوەیە. قەڵای برقە و قەڵای بەشیر لە دەست بەشنەویەکاندایە و قەڵاکانی جورزەقیل و ئاتیل و عەللوس و بازی سوور، هی بەختیانە و جورزەقیل پایتەختیانە و جێ و ڕێی هەرە سەختیانە. قەڵای ئەلقی و ئەروەخ و باخۆخە و بەرخۆ و کینکور و نێروە و خەوشەب هی خاوەنەکانی مووسڵن.

قلقشندی لە *صبح‌الاعشی*[2]دا دەڵێ: *مسالك الابصار*[3] دەڵێ: «ئەگەرچی کورد زۆر ڕەگەزیان کەوتوونە ناو، بەڵام ڕەسەنێ سەربەخۆن و هاوسای عیراق و عەرەبن و زۆر نەچوونەتە ناو فارس. کورد لە شام و یەمەنیش هەن و لە زۆر شوێنیتریش دەژین و ئاپۆرەیان زۆر لە دەورەی خاکی عەجەم و عیراقە». لە مەڕ وڵاتی کێواتیش ئاوا دەڵێ: «نیاز لە کێوات ئەو کەژانەن کە لەمپەرن. هۆزەکانیان هەرچی باشم نەناسیبێ ناوم نەبرد و لەوانیشدا ناوی پادشا و ئەمیرەکانم باس کردوون. لە چیاکانی هەمەدان ڕا دەست پێدەکەین و بە شارەزوور و هەولێردا دێینە دەوروبەری مووسڵ و لە جزیرە دێینە سەر دەجلە و ئەو بەر دەجلەی بەرەو فوڕات گوێ نادەینێ -چونکە لامان گرنگ نیە- ئیتر جگە لە کوردەکانی جزیرە و کوردی گوندەکانی ماردین چیتر نیە.»[4]

---

١- *معجم‌البلدان*، ب ٤، ل ٤١٥، چاپی میسر.

٢- *صبح‌الاعشی*، پاژی ٤، ل ٣٧٣-٣٧٩. یەحیا خەشاب

٣- هی «فضل‌الله العمري»یە. یەحیا خەشاب

٤- ئەم نەخشەکێشانەی «قلقشندی» دەڵێ بۆ تێلگراف کردن نووسراوە! هەژار

قلقشندی ۸۱٤ك (۱٤۱۱ز) هۆزەکانی لور و شول و شـوانکارەش نـاو دەبـا و دەڵـێ: «لـوڕ دوو تیـرەن: لوڕی گەورە و لوڕی پچووك؛ یەکجار زۆرن و زۆریشیان بڵاو بوونەوە و پادشا و میـری خۆیـان هەیە و بەشی زۆریان لە وڵاتی میسر و شامێن و شامیەکانیشیان زۆرترن و زۆریش ئازا و گفت ڕاست و شایی بەخۆن. هۆزی شول وەکو شوانکارەن، لە ئاوەزدا بەرانبـەرن و دەسـت و دڵاواز و بەخـشندەن و پەنادەری هەژاران و بەخێوکەری ڕێبوارانن؛ بەڵام بە گـژ یەکـدا دەچـن و پەیـمان هەڵدەوەشـێننەوە و خوێنی یەکتـری دەڕێژن. شوانکارەکان لە لوڕەکان ڕەوشت پاکتـر و چاکتـرن و خاوەنی گفتی خۆیانن و خودان باوەر و ئیمانن.»

خێوی *مسـالك الابـصار* دەربـارەی «اقلیـمالـجبال» دەڵـێ: «کەوشـەنەکەی سـەر زنـجیـرەی کێوەکانی هەمەدان و شارەزوورە و لە کن شورە قەڵاکانی کافرەکانی وڵاتی تکفور دوایی دێت. تکفـور مەملەکەتی سیسە و ئەو شوێنەشە کە سەربەویّ لە دەست مالّی لاون دایە.»

ئەوسا باسی بیست شوێن دەکا کە هەر شوێنەی هۆزە کوردێکی لیّ هەیە:

۱- ماهیدەشت: لە کێواتی هەمەدان و شارەزوورە و کوردی گۆرانی لیّ دەژین.

۲- دەرەتەنگ: ئەویش هەر هی گۆرانانە و میـری سەربەخۆیان هەیە و هەر دوو لا لەو گۆرانانە پێنج هەزار پیاوێکیان هەیە.

۳- داتسرك و نەهاوەندیش تا دێتە نزیك شارەزوور، جێگەی هۆزی کەلالییە و بە کۆمەڵی شێر ناسراون؛ هەزار شەڕکەرێکیان هەیە و دەستیان لە سەر کوردەکانی هاوساش دەڕوا.

٤- لە نزیك هۆزی گەڵاڵی و لە کێوەکانی هەمەدان کوردی زەنکلی[1] نیشتەجێن.

٥- دەوروبەری شارەزووری، زێدی دوو هـۆزە کوردانـە کـە ناویـان لوسـە و بابرییـە؛ لـە پـاش هەراکەی بەغدایە لەویّ دەرچوون و ڕوویان کردە میسر و شام و هۆزی «خولە» یان «خولسە» هاتۆتـە مەڵبەندەکەیان و تەواو کوردی ڕەسەنیش نیـن.

٦- شوێنێك لە دۆژ شارەزوور و شنۆی ئازەربایـجانە، هۆزی سیولی لیّ دەژین.

۷- ئالیشتـر[1] هۆزی قرتاوی (کرتاوی) لەوێن و چەند جێی دیشیان لە وڵاتی هەولێریّ هەیە.

---

۱- مـحەمەدعەلی عەونی لای وایە: زەنگنەیە و تێکچووە. یەحیا خەشاب

٨- ناوچەی کرکار، هۆزی حسنانی (خۆشناو)ی لێیە و ئەو هـۆزەش بوونـە سـێ تیـرە: عیـسا شەهابەدینی، تلی و جاکی.

٩- دەربەندی (قرابلی)، جێکەی هۆزی قریاوییە؛ پاسانەی دەربەنـدیان هەیـە و خێـوی دەربەنـد دۆستی سولّتانی میسرە.

١٠- کرحیـن و دقوق الناقە[٢]، نیوان کەرکوك و تاوغە. بە فەرمووده‌ی مینۆرسکی شوێنی هۆزی تیـرکارینە.

١١- ناو دوو چیای سەر بە هەولێر، ئـەو کـوردەی لـێن کـە دۆسـت و ناشـنای میـسر بـوون و تەتەریشیان نەڕەنـجاندن.

١٢- مازنـجان، بیـروە، نـجمە، ناوچەی سوران: مازنـجانی -کە سەر بە هۆزی حەمیدین- لەو ناوە دان.

١٣- ناوچـەی سـوران، شـەقلاوە و خـەفتیان ئـەبوو عـەلی (خـەفتیانی چـووك) بـە دەشـت دەربەندیشەوە -کە لەو بەینەن- هۆزی سۆرانی تێدایە.[٣]

١٤- ملازکرد و ڕستاق[٤] شوێنی هۆزی زرزارییە[٥] و دەڵێن عەجەم بوون، بوونە کورد.

١٥- جۆڵەمێرگ، جۆڵەمێرگی لێ نیشتەجێن. دەڵێن عەرەب بوون بوونە کورد؛ پادشـاکەیان لـە لای کوردان زۆر بە ڕێزە و باج دەستێنێ و پێی دەڵێن خێوی جۆڵەمێرگ.

١٦- مەرگەوەڕ: کوردەکانی وێ دەگەڵ کوردی جۆڵەمێرگی هاوپەیـمانن.

١٧- کوار لای ڕۆژاوای جۆڵەمێرگە و هاوکەوشەنن و ئەو کوردانەی لەوێ دەژین هەر بـە کـواری ناو دەبرێن.

---

١- بلدان الـخلافە الشرقیە: ل ٢٢٨-٢٢٩. یەحیا خەشاب

٢- بلدان الـخلافە الشرقیە: ل ٢٢٨-٢٢٩. یەحیا خەشاب

٣- شەقلاوە، هەودیان، وێدەچێ دەربەندەکە گەلیعەلیبەگ و دەشتەکەشی دەشتی حەریر بێ. هەژار

٤- مەلازگرد، ڕۆست.

٥- لە *مسالك*دا دەڵێ: زرزاری بە زمانی عەجەمی بێچوە گورگە. *خلاصـة التـاریخ الکـرد*، ل ٣٨٥، پـەراوێزی عـەلی عەونی.

١٨- ناوچەی دینار: کوردی دیناری لێ دەژین.

١٩- عیمادیە و قەڵای هرور جێگەی کوردی هەکاریە.

٢٠- قمرانیە و کەهف داوود، مەڵبەندی هۆزی تنبکی و بستیکییە.[1] دیسان هەر خێوی *مسالك* باسی بوختی و سندی و ڕاسنی و دونبولی دەکا و دەڵێ دونبولیەکان خەڵك پێیان دەڵێن زازا (ظاظا) و بە خۆ دەڵێن دملی (دونبولی).

خاوەنی کتێبی *التثقیف* ناوی بیست و پێنج مەڵبەند و هۆزی کوردانی نووسیوە کە ڕۆژی خۆی لە دەفتەری دیوانی میسری ڕاگوێزتوون.[2]

مینۆرسکی لە وتارێك کە دەربارەی کوردەکانی لای ڕۆژهەڵاتی ئێرانێ نووسیویەتی، دەری دەخا کە لە مەڵبەندی قەرەباغ لە قەفقازێ، بیست و چوار هۆزە کورد هەیە و دوو هۆزی گل و زەنگەنەش لە خوراسانێدا دەژیان و هۆزی جیگان لە گورجستان نیشتەجێ بوون.

ابن خلدون لە مێژووەکەی خۆیدا دەڵێ: «دوو هۆزی کورد لە وڵاتی جزایر دەژین، ناویان لاوین و بادینە.»

(٣)

*شەرەفنامەی بدلیسی* ١٠٠٥.ك (١٥٩٦.ز) وای ڕاگەیاندووە کە کورد لە باری کۆمەڵایەتی و زاراوەوە دەبنە چوار بەش: کرمانج و لوڕ و کەلهوڕ و گۆران. دەشڵێ سنووری کوردستان بە خەتێ ڕاست لە سەر خەلیجی فارسەوە تا بڕانەوەی مەلاتیا و مەرعەش دەچێ. ئالی باکووری ئەم خەتە وڵاتانی فارس و عیراقی عەجەم و ئازربایجان و ئەرمەنستانی گچکە و ئەرمەنستانی گەورەیە. باشووریش عیراقی عەرەب و ناوچەکانی مووسڵ و دیاربەکرە.

پادشایان و میرانی ئازای کوردستان بە ناوی هۆزیان ناسراون. وەك: هەکاری و سۆری و بابانی و ئەردەڵان. هێندێکیشیان ناویان وێڕای شار و قەڵاکانیان هاتوون. وەك: میرانی، حەسەنکێف و بدلیس و جزیر و حەزۆ و ئەگیل و هیتریش.

---

١- دائرة المعارف الاسلامیة مینۆرسکی. یەحیا خەشاب

٢- *خلاصە تاریخ کرد و کردستان*، ل ٣٨٠.




نەخشەی کوردستان لە زەمانی شەرەفخاندا

فەرمانڕەواکانی کوردان، لە لای بدلیسی چوار دەستەن:

١- سەربەخۆکان کە مێژوونووس ناویان بە پادشا نووسیون.

٢- ئەوەی تەواو سەربەست نەبوون، بەڵام دراویان لە سکە داوە و لە خودبە ناویان وەخوێندوون.

٣- فەرمانڕەوای کوردستانێ.

٤- فەرمانڕەوایانی بدلیس.

**دەستەی یەکەم:**

دەوڵەتەکانی مەروانی، حەسنەوی، لوڕی مەزن، فضلوی، لوڕی بچووک، ئەیوبییەکان؛ کە پادشای میسر و شامێ بوون. دەشلێ شادی کوڕی مەڕوان باپیری سەلاحەدینی کوردی ڕەوەندی دوین بوو لە سەر شەڕی سەلیبیانیش زۆر دواوە.

**دەستەی دووەم:**

ڕەسەنی ئەردەڵانیەکان دەباتەوە سەر ئەحمەدی کوڕی مەڕوان و لە بابە ئەردەڵان دەدوێ و دەڵێ زۆر لە ناو گۆرانان ژیاوە و لە پاشان شارەزووری گرت و ناوی یەکێ لە شاهانی ساسانیشی لە خۆ ناوە. حەمدوڵڵا مستەوفی خێوی *تاریخ گزیدە* دەڵێ: «هەمیشە کورد حوکمی شارەزووریان دەکرد؛ زۆرانبازی زۆرداران بوو. کێ لە گشتان زۆردارتر با، شارەزووری بۆ خۆی دەبرد.»

ئەردەڵانی لە ناو عوسمانی و سەفەوی دابەش ببوون. شەرەفخان لە کتێبەکەیدا بۆ سەفەویان هەر ناوی قزلباش دەڵێ[1]. سورخابی ئەوەی ئەردەڵان ببووە دۆستی شاتۆماسبی سەفەوی (٩٣٠-٩٨٤/١٥٢٤-١٥٧٦) و بە تکای ئەو لە براکەی خۆش بوو؛ کە دژی ئەو ببووە دۆستی سوڵتان سولەیمان قانونی (٩٢٦-٩٧٤/١٥١٩-٢٠-١٥٦٦). ئەردەڵان ببووە مەیدانی شەڕ و هەرای نێوان ئێرانی و عوسمانی. تا لە ئەنجامدا هەڵۆخان چووە ژێر ئاڵای سوڵتان مرادی عوسمانی و دەگەڵ

---

١- قزلباش پاشماوەی ئەو دیلانە بوون کە تەیموورلەنگ بە شێخ حەیدری ئەسپاردن؛ بۆ ئەوەی بناسرێنەوە کڵاوی سووریان لە سەر بوو. لە دوارۆژدا قزلباشی تورک و فارس بوونە سوپای هەرە بەهێزی سەفەوی.

قزلباشانیشدا تێکی نەدا و ئابەم چەشنە خۆ پارێزیە، تا ساڵی ١٠٠٥ک (١٥٩٦ز) -کە شەرەفخان لە *شەرەفنامە* بۆتەوە- ئەو هەر فەرمانڕەوا بووە.

لە باسی هەکاریانیشدا ئێزێ فەرمانێکم بە خەتی ئیگوری دیوە. چەنگیزیەکان بۆ هەکاریانیان نووسیوە و ناوچەکەیان بۆ پشتاوپشت بەو بنەماڵە بەخشیوە؛ کەچی هەرگیز تەمی تورك و گەڕی فارس لەو ناوچەدا نەڕەویوە.

دەستەی سێهەم:

لە پاش میرانی هەکاری، باسی فەرمانڕەوایانی کوردستان (چەمشکەزەك) دەکا کە مەزنەکانی مجەنکورد و پەرتك و سوقمان لەوانن. لە مەڕ میرانی مەرداسی و ئەگیل و پالە و چەرموگ و ساسۆن و خێزان و مەکس و ئیسپایرد و کلیس دەدوێ. سوێدیانیش دەباتەوە سەر بەرمەکیان.

دەستەی چوارەم:

باسی ژیننامە و ڕابردووی میرەکانی بدلیس دەکا کە خانەدانەکەی خۆنی و هەمیشەش لەو کتێبەیدا دەری دەخا کە بێ خوێندنن و بێ فێرگە، هیچ گەلێك بە ئاوات ناگا. بۆ ئەبیووبیان بە شانازی باسی ئەو فێرگانە دەکا کە لە پاشیان بەجێماوە. کاتێ باسی بدلیس دەکا لە بەر خوێنەری ڕادەنێ کە باپیری فێرگە و تەکیەی بنیات ناوە و بۆ خۆی پێنج فێرگەی ساز داوە و هەموویانی ساڵی ٩٩٩ك (٩١-١٥٩٠ز) سەرگرتووە و دەڵێ هەموو پڕ لە فەقێ و مەلای چاکن و ناوی مەلاکانیش دێنێ.

باسی خوسرەو پاشای تورکیش دەکا کە چاکەی دەگەڵ کردووە و لە پاش چل و نەوەندە ساڵ دەربەدەری، هێناویەتەوە ناو ئیسلام!

ناوی قەڵای ئەخلات دەبا کە شاتۆماسب ڕووخاندی و سوڵتان سولەیمان لە باتی چاکردنەوەی خراپتری بە سەر هێنا!

ڕەسەنی خۆی دەباتەوە سەر کیسرایان و ژیننامەی خۆشی نووسیووە کە لە ماڵی شاتۆماسب پەروەریوە و لە دەورانی شائیسماعیل دەمڕاستی کوردەکان بووە و خەڵك ئێرەی پێ بردووە و شایان لێ دردۆنگ کردووە و هەڵیداشتۆتە نەخچەوان و سوڵتان موراد هێناویەتەوە بدلیس و لە شەڕی تفلیس و

گورجیان، شەڕکەری عوسمانی بووە و لە پاداشتی ئازایەتی، شاری موشیان پێ بەخشیوە و لە ساڵی ١٠٠٥دا کوڕی لە جێی خۆی داناوە.

کە ئایینی کورد باس دەکا دەڵێ: کەمیان یەزیدین و زۆربەی زۆریان شافعیىن و لە خوێندن زۆر زیرەکن و مەلای زۆر زانایان هەیە؛ بەڵام بێ ناو و ناوبانگن!

بدلیسی دەڵێ: چونکە کورد نەهاتوونە ژێر فەرمانی تاکە فەرمانداریکەوە بۆیە لە یەکتر نامۆن و خوێنی یەکتری دەڕێژن و گوێ نادەنە هێمنایەتی و ڕێکوپێکی و لە سەر زۆر کەم، زوو هەڵدەچن![1]

ئەمین زەکیش هەر لای وایە چونکە کورد نابن بە یەك و تێکڕا دژی تورك و فارس ناخەبتن، داگیرکەرانی کوردستان دەرفەتی خۆیان لێ هێنان و دەوڵەتۆکە سەربەخۆکانیان کەم کەمە لێ تێکدان و هەر بە کورد کوردیان کوشتووە.[2]

کورد بە ئازا بەناوبانگن: «ئەگەر تووڕە بن لە شێر توندترن؛ ئەگەر ڕاپەڕن لە برووسکە سووك ترن»[3] بۆ ڕێزگرتن، ناو لە کورد نراوە «قورەیشی عەجەم»[4].

١- نووسەر زۆری ناوەڕۆکی شەرەفنامە خستۆتە ئەم پێشەکیەوە؛ ناچار بووم هەڵمقرچاندن.

٢- *خلاصە تاریخ کوردستان*، ل ١٤٩.

٣- *صبح‌الاعشی*، ب ٤، ل ٣٧٩.

٤- *شفاء والغلیل*، ل ٣. بڕوانە کتێبی *تنسر*، یحیی‌الخشاب، ل ٥٢.

# بەشی سێهەم

## کورد لەم ڕۆژگارەدا

(١)

بڕواپێکی و نێوانخۆشی شەرەفخان و سوڵتان مرادی سێهەمیـــن، تـا ماوەیـەك کـورد و تـورکی بـە ئارخەیانی ڕاگرتن؛ بەڵام کورد -پاش وچانێکی کەم- وە کار کەوتن، کە ژێردەستەی تورکان نەبن و بۆ خۆیان سەربەخۆ بژین. نێوانیان دەگەڵ ئێران و هاوسا فەلەکانیان خۆش کرد و بەدرخان بەگی بۆتانی - کە سەرەك هۆزی ڕۆندز و هەکاری بوو- ساڵی ١٨٣٢.ز لە ڕۆژگاری سولتان مەحـــموودی دووهەمـدا، دژی تورکیا ڕاپەڕی و شۆڕشەکەی هەتا ساڵی ١٨٧٤ -کە ڕۆژگاری دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولعەزیزخان بوو- دانەمرکا و لە ئەنـجامدا تورك گەلێك وڵاتی کوردیان بەرخۆ دا و والی تورکیان لە سـەر دانـان. دوایەش سولتان عەبدولـحەمید بۆ ئەوەی کورد و فەلەکان لە یەکتـر بکا بە دوژمن، سـاڵی ١٨٩٠.ز تیپی سوارەی حەمیدیەی لە سوارەی کوردان پێك هێنا و کردنیە قوڵەچـۆماغ و هـەر کـەس لـە ڕووی یاسای تورکان وەرگەڕایەوە، بەو کودرانە تەنبێ دەکرا و لە ئەنـجامدا هەر سوارەی حەمیدیـەی کـورد بوونە هۆی بەدبەختی کورد و کۆسـپی ڕێگـەی سـەربەخۆیی کوردسـتان بـوون و ئەرمەنیـشیان کـردە دوژمنی خوێنی کورد.

کە عەبدولـحەمید لە ١٩٠٩.ز دەرکرا، تیپی سوارەی کوردەکانیش لە نـاوبرا. لـەوەدوا کـوردی ڕۆشنبیـر کەوتنە دنەدانی کوردان کە بۆ ئازادی بکۆشن. دروشـــمی ئەوسـای تورکیـا -کـە ئـازادی و برایەتی و یەکسانی هەموو گەلانی ژێـر بەیـداغی عوسـمانی بـوو- دەرفـەتی دا بـە کوردەکـان کـە بریکاریان بە هەر دوو کۆڕی نوێنەران وەدەنگ بێن و داوای مافـی کوردان بکەن.[١]

جگە لەمەش لە ئاستانە و بەغدا و مووسڵ و تەنانەت لە قاهیـرەشدا کۆمەڵە کورد و گۆڤاریـان بۆ داوای ماف وەکار کەوتن؛ بەڵام تورکان زۆر بە توندی لێیان دان و خپیان کردن. هێندێك لە کۆمەڵی کوردان کە لەم چەرخی بیستەمەدا لە ئاستانەدا پێك هاتوون ئەمانە بوون:

١- کۆمەڵی عەزمی قەوی.

---

١- ئەنسکلوپیێدی بریتانی، کوردستان.

٢- کۆمەڵی تەعالی و تەرەققی کورد.

٣- کۆمەڵی خوێندەواری کورد. ئەم کۆمەڵە فێرگەیێکی بۆ کوردی خوێندن کردەوە و منالّی کورد لە قۆناغی بەراییدا لێیان دەخوێند؛ بەڵام حوکمی ئیتحاد و تەرەققی نوێ کە نیازی وابوو کەلانی ژێردەستەی بکاتە تورك، کۆمەڵەکەی هەڵوەشاند و فێرگەکەشی لێ‌داخستن!

٤- لە ١٩١٠ کۆمەڵی هێڤی دامەزرا و تا ساڵی ١٩١٤ هەر مایەوە و دوای شەڕیش هەڵیدایەوە؛ بەڵام کاتێ ئەتاتورك هاتە سەر کار، لە کار کەوت.

٥- کۆمەڵی ئیستقلالی کورد. کۆمەڵی «تشکیلات اجتماعی» بۆ کوردستان، لکی ئیستقلالی کورد بوو.

٦- کۆمەڵی میللەتی کورد.

بەوەدا باش دەر دەکەوێ کە کوردەکان زۆر تامەزرۆی ژیانی ئازاد و سەربەخۆن. لە دوای ئەوەی کەمالیەکان حوکمی تەواویان گرتە دەست، ئەو کۆمەڵانە هەڵوەشان. بەڵام ئەو دەرد و ئازارەی کورد لە تورکیا تووشی بوون، ڕێگەی نەبەست کە کوردەکان لە هەندەران لە ڕێی زمان و ژیواری کەونارایان چالاکانە خۆ بنوێنن و خەبات بکەن. لە دەرەوە کۆمەڵ یەکیان گرت و داوایان کرد کە ئەوانیش وەك گەلێکی خاوەنی مێژووی کەونارا و خێوی داب و ڕێوشوێنی نەتەوەیی، ڕێز بگیرێن و لە خەلکی‌تر هەڵناوێرێن. کۆمەڵی خۆیبوون (ئیستقلال) لە دەری تورکیا پێك هات و هەموو کوردستانی داگرت و کورد بە گشتی پەسندیان کرد. لە بەغدایەش یانەی سەرکەوتن دامەزرا.

گۆڤارەکان، ئەوانەی کە زۆر گرینگ بوون:

١- *کوردستان*، لە تورکیادا دەردەچوو. پاشان لە پێش شەڕی گەورە گوێزرایەوە بۆ قاهیرە و بە کوردی و تورکی دەردەچوو؛ نیو مانگیش بوو.

٢- *کوردستان* لە ورمێ بوو؛ مژدەدەرە مەسیحیەکان دەریان دەکرد.

٣- *ڕۆژی کورد* ساڵی ١٩١٢ کۆمەڵی هێڤی دەری خست. لە ژمارەی یەك و دوویدا، وێنەی دوو قارەمانی کورد: سەلاحەدینی ئەییوبی و کەریم‌خان زەند -کە کوردەکان بە میری زۆر بە هێزیانی حەساو دەکەن و لە ساڵی ١٧٥٠.ز را تا ١٧٩٤ شای ئێران بووە- چاپ کرابوو.

٤- لە پاشان هەر ئەو گۆڤارە بەرگ و ناوی پێشووی گۆڕا و کرابوو بە *هەتاوی کورد*.

٥- *ژیان*، دوای کۆتایی شەڕی گەورە، لە میسر و لە ئەستەنبوڵ و لە کوردستانیٚ دەر دەچوو.

٦- *پێشکەوتن*، لە شاری سولەیمانی بوو.

٧- *بانگی کوردستان*، زوانی حاڵی حکوومەتی شێخ مەحموود بوو؛ حەوتانەش بوو.

٨- *بانگی حەق*.

٩- *ئومێدی ئیستقلال*.

١٠- *ژیانەوە*، حەوتانە بوو. هەتا ساڵی ١٩٣١ هەر دەر دەچوو.[1]

(٢)

کوردستان بە هەموو مانا و لەو بارەوە کە جێی کوردە، لە مابەینی سیٚ دەوڵەتی ئێران و عێراق و تورکیادا بەش کراوە.

کوردی ئێران بە تایبەتی لە کرماشان و کوردستان (ئەستانێکە بەو ناوەوە) و بەشی باشووری ئازربایجان و کێواتی لای ورمیٚ و خۆی و داوێنەکانی باشووری ئاراراتێدا نیشتەجێن. چەند کۆمەڵە کوردی دیکەش لە خوراسان و فارس و بروجرد (لورستان) هەیە.

لە تورکیا کورد لە نێوان تورك و ئێراندا هەلکەوتوون و لە دەوری زێباری وان دراوسیٚ مەسیحیەکانن. لە لای سەروی چەمی دەجلە و فوراتەوە، کورد لە باکووری ئەوخەتەن کە فیشخابور (نزیك جزیر) دەگەڵ سومەیسات لێك دەدا؛ کە کەوتۆتە باکووری بریجیکەوە. لە ڕۆژئاوای فوراتیش هەن. لە بەدلیس و ئەرزنجان و دیاربەکر و ئەرزەڕۆمیٚ و دامێنەکانی ڕۆژئاوای ئاراراتیٚ، هەرە زۆرن. بەرانبەر بە سەرژماری ساڵی ١٩٣٩ کوردی عیراق نیوملیۆنن و لە سولەیمانی نیشتەجێن و زۆربەی دانیشتووانی هەولێر و کەرکووکیٚ کوردن.[2]

مینۆڕسکی لە *دائرة‌المعارف اسلامی*دا دەڵیٚ کوردی ئێران نزیکەی پێنجسەد هەزارن. ئەویش لە ڕووی ئەو ژمارەی هەڵگرتووە کە ڕووسیا ساڵی ١٩٢٥ بۆ کوردی تورکیای دانا و دەڵیٚ کوردان لە

---

١- *خلاصة‌التاریخ کرد و کردستان*، ل ٣٧٠ و دوای وی. یەحیا خەشاب

٢- *ئینسکلۆپیدی بریتانی*، کوردستان. یەحیا خەشاب

تورکیا دەگەنە ملیۆن و نیوێك! و دەشڵێ تورکـان پێیـان وایـە کـۆنی کوردەکـانی (کۆچـەر؟) تێکـڕا نۆتوشەش هەزارە. بەڵام کوردەکانی عیـراق (لیوای مووسڵ) بە پێی سـەرژمارەی سـاڵی ١٩٢٣-٢٤ دەگاتە چوارسەد و نەوەت و چوار هەزار و حەوت کەس. سەت و هەشتا و نـۆ هـەزاریان لـە ئەسـتانی سولەیـمانیـن و زۆربەی خەڵکی هەولێریشن چونکە سەدوحەفتاهەزار و شەشسەت و پەنـجای لێیە. لە کەرکووکیش زۆربەی دانیشتووانی کوردن. جیا لەوەش لە قەوقازیای سـەر بـە ڕووسـیاش لـە ناوچـەی یەریوان و قارس، کورد هەیە و ساڵی ١٩١٠ سـەت و بیسـت و پێـنج هـەزار بـوون؛ بیسـت و پێـنج هەزاریان یەزیدی بوون. لە سووریا قونسولی ڕووس کوردی وڵاتی حەڵەبی بە سەتو بیست و پێنج هەزار داناوە. گۆڤار *العالم الاسلامی* کوردی لای دیکەی سووریا بە بیست هەزار کەس دادەنـێ! لـە شـاری دەمشق و حەڵەب گەڕەکی کوردەکان هەیە. هێندێك لە نووسەری تازە بۆ ژمارەی کورد وا دەڵێن:

لە تورکیادا چوار ملیۆن واتا چواریەکی دانیشتووان.

لە ئێران سێ ملیۆن و نیو واتا بیست و سێ لە سەتی.

لە عیراقێدا ملیۆنێك واتا لە سەتا بیست و هەشت.

لە سووریا دوو سەت و پەنـجا هەزار کورد.

لە ڕووسیا دەگەنە سەد و شێست هەزار.[1]

(٣)

## مووسڵ لە نێوان ئینگلیز و تورکیا

زۆربەی زۆری دانیشتووانی ئەو لیوایە کوردەکانن. تورك و ئینگلیز لە جەنگەی شـەڕی گـەورەدا و لـە پاشانیش لە سەر وێ، مشت و مڕیان بوو. ئینگلیز زۆر بە چاوچنۆکی بۆ نەوتی مووسڵی دەڕوانی.

## ئاگربەسی مۆدروس

بیست و پێنجی سپتامبـری ١٩١٨ ئینگلیسان کەرکووکیان گرت و هێزەکانیـان گەییـە دوازدەمیلـی

---

١- ساڵی ١٩١٠، ١٢٥هەزار، ٦٣ ساڵ ٢٥ هەزاری زیاد کردووە؛ ڕەنگە لە سەرمان، زە و زوو نەکەن! هەژار بڕوانە بۆ پەراوێزی لاپەڕەی هەشتاویەك.

مووسڵ. ڕۆژی سی مانگ، تورك و ئینگلیز له سەر ئاگربەس پێك هاتن.

مادەکانی ٧ و ١٦ی پەیمانی ئاگربەسەکە بەم جۆرەیە:

مادەی ٧: لە هەر شوێنێك هەر مەترسییەك ڕوو بکاتە هاوپەیمانان، دەتوانن ئەو شوێنە بگرن!

مادەی ١٦: مۆڵگەکانی سوپای تورك و حیجاز و عەسیر و یەمەن و سووریا (میزوپۆتامیا): بین‌النهرین - هەرچەندی هەن- دەدرێنە دەست نزیکترین سەرلەشکری هاوپەیمانان.

ئەوسا بە پێی ئەو دوو مادە، لە دووەمی نوامبری ئەو ساڵەدا، ئینگلیز سێر ولیام مارشاڵی نارده سەر مووسڵ کە بیگرێ.

سەرکردەی لەشکری تورکان (ئیحسان پاشا) لە سەر مانای وشەی (میزوپۆتامیا) کردیە کێشە و دەیگوت مووسڵێ ناگرێتەوە. کە پرسی بە ئاستانە کرد، ڕایان سپارد کە شار چۆڵ کا و بیدا بە سوپای ئینگلیز و فەرمانبەرانی ڕەشاییش -بە ناوی سەر بە عوسمانی- کاروباری خۆیان بکەن.

هەشتی مانگی نوامبرێ، ئینگلیز هاتنە ناو مووسڵەوە و ئاڵای خۆیان لێ هەڵکرد و ئاڵای تورکانیان لێ داگرت. پاشان ئینگلیز هەموو وڵاتەکەی گرت و سەرکردەی لەشکری ئینگلیز، شێخ مەحموودی گەورەی کوردی لە سەر سولەیمانی دانا و کردیە نوێنەری دەسەڵاتی سوپای خۆی.

ئینگلیز پیلانی دانابوو کە لە نێوان مووسڵ و خەلیجی فارسدا دەوڵەتێکی عەرەب پێك بێ. واتا عیراقی ئیستاکێ لە ژێر دەستی ئینگلیز دابێ و ناوێکی واشی لێ بنێ کە نەڵێن موستەعمەرەیە و وەکی دیش موستەعمەرە بێ. ئینتدابی بۆ دۆزیەوە! ئا بەم جۆرە ویلایەتێك و پارچەیەك لە دەوڵەتی عوسمانی ژێرکەوتووی بێ هێز، دابڕا و بڕیار درا کوڕێکی شەریف حوسێنی -کە پێشوو والی مەکە بوو- بکەنە پادشای ئەو پاژە.

وەزارەتی هیند لە لەندەن ناردیە لای حاکم عەسکەری ئینگلیز کە لە خەڵکی وڵاتەکە پرسیار بکا ئاخۆ دەوڵەتی عەرەبی تازە ئیجاد پەسەند دەکەن؟ ئەمیری عەرەبیان دەوێ؟ کێیان بۆ ئەمیر گەرەکە؟[1]

ئەفسەرە ڕاسپێراوەکە لە ئەنجامدا وەرامی پرسیارەکانی وا دایەوە:

---

١- *مشکلة‌الموصل*، ل ١٢٧. یەحیا خەشاب

١- هەموو خەڵکەکە حەز دەکەن ئینگلیز چاوەدێریان بکا تا بۆ خۆیان یەکجاری لە خەم دەڕەخسن!

٢- مەسیحیەکان- کلدانیش و کاتۆلیکیش- ڕاستەوخۆ ئینگلیسیان دەوێ.

٣- کوردی یەزیدی سنجاریێ نایانەوێ فەرماندەریان موسوڵمان بێ.

٤- کوردەکانیش -کە نیوەی خەڵکی ناوچەکەن- حوکماتی عەرەبیان ناوێ.

( ٤ )

لە ڕووسیا شۆڕشی باڵشەوێك ڕوویدا. هێزی ڕووس لەم ڕۆژهەڵاتی ناونجیە خۆی کێشاوە و لە مەیداندا هەر ئینگلیس و فەرانسی مان. کلیمەنسۆی سەرەکوەزیری فەڕانسە خەونی بەو ڕۆژەوە دەدیت کە ڕۆژهەڵاتی عەرەبی وەگیر فەڕانسا بکەوێ و ئاواتی کۆنیان بێتە دی. سەرەکوەزیری ئینگلیسان (لوید جورج) ساڵی ١٩١٦ لە گفتوگۆی سایکس پیکۆ ملی دابوو کە مووسڵ بۆ فەڕانسە بێ و نیازی وابوو کە فەڕانسیان بکاتە هێزێکی لەمپەر لە نێوان ڕووس و ئینگلیسدا. بەڵام کە ڕووس کشانەوە، ئینگلیس پەشیمان بوونەوە و داوایان کرد کە مووسڵ پشکی خۆیان بێ و ئەستاندیشیان! سەرۆکوەزیری فەڕانسە لە پاش دۆڕاندنی مووسڵ، تازە بە برینی خۆی زانی و درەنگ تێگەیشت کە مووسڵ نرخی چەندە و چەندی بەهرە و پیت پێوەیە.

وتووێژ دەربارەی نەوت دەست پێکرا. کلیمەنسۆ پێك هاتنەکەی سان ڕیمۆی پەسەند کرد و ڕۆژی بیستی یەنایری ساڵی ١٩٢٠ خۆی لە حکوومەت کێشاوە. بەڵام لە دوایی کە ئینگلیس بەشێکیان لە نەوتی مووسڵ بۆ فەڕانسە نیشان کرد، پێك هاتنامەکە لە بیستی ئاپریلی ١٩٢٠ ئیمزا کرا و ڕۆژی پاشین بڕیار درا وڵاتی سووریا و لوبنان قەڵەمڕەوی فەڕانسە بێ و بریتانیش لە عیراق و فەلەستیندا دەستیان بڕوا. (*بڕوانامەی کۆمەڵی گەلان*، بەرگەی ٤، مادەی ٢٢).

# پەیمانی سیڤر

ئەم پەیمانە لە دەی تابی ١٩٢٠دا بەسترا و شاهەنشاهی عوسمانیانی هەڵوەشاند و پەیمانی سانرێمۆی چەسپاند و سەرپەرستی «انتداب» وڵاتانی لە عوسمانی دابڕیاوی کردە یاسا. لە سۆنگەی ئەو پەیمانەوە کەوشەنی تورک و عێراقیش دیاری کرا. واتا میزۆپۆتامیا ناوچەی مووسڵیشی گرتەوە.

مادەی ٦٢ و ٦٤ لەو پەیمانە کە دەربارەی مافی کورد دەدوا، ڕای دەگەیاند کە کورد گەلێکن سەربەخۆ و نە تورکن و نە عەرەبن و مافیان هەیە لە نیشتمانی خۆیاندا سەربەست بژین. ناوەڕۆکی ئەو دوو مادەیە بەم جۆرەن:

مادەی ٦٢: لە ڕۆژی وەکار خستنی پەیمانەوە هەتا شەش مانگ، سێ ئەندام سەر بە سێ دەوڵەتی فەڕانسان و بریتانیا و ئیتالیا لە ئەستەمبوڵ کۆ دەبنەوە و ئەو لێژنەیە حوکمی زاتی بۆ کوردستان دیاری دەکا و کوردستانیش ئەو شوێنەیە کە لە نێوان ڕۆژهەڵاتی فوراتی لای سنووری باشووری ئەرمەنستان و باکووری کەوشەنەکانی تورکیا و سووریا و عێراقە و کوردیان تێدا نیشتەجێیە.

مادەی ٦٤: ئەگەر لەو وڵاتانەدا کە لە مادەی ٦٢دا دەست نیشان کراون، تا مەودای ساڵێك لە دەرچوونی ئەو پەیمانەوە ڕوو بکاتە کۆڕی کۆمەڵی گەلان و دەری بخا کە زۆربەی زۆری دانیشتووانی ئەو ناوچانە دەیانەوێ لە تورکیا جیا بنەوە و ئەگەر کۆمەڵی گەلانیش لای وابوو کە ئەو کوردانە شیاوی ئەو سەربەخۆ بوونەن و ئەگەر کۆمەڵی گەلان ڕای‌سپارد کە ئەو مافەیان بدرێتێ، وا تورکیا لە ئێستاوە بەڵێن دەدا ئەو سپاردەیە پێك بێنێ و لەو ناوچانە واز لە هەموو مافێکی خۆی بێنێ. ئەم وازهێنانەشی لە ناو بەینی هاوپەیمانانی سەرەکی و تورکیا، وتووێژی لە سەر دەکرێ و پێك دێن.

جا ئەگەر لە وەختی خۆیدا تورك ئەو کارەی ئەنجام دا، ئەوسا هێزی هاوپەیمانە سەرەکیەکان بە شتێکی ڕەوای دەزانن کە ئەم دەوڵەتە کوردە سەربەخۆیە، کوردەکانی نیشتەجێی مەڵبەندی مووسڵ ڕەگەڵ خۆی خا (ئەگەر خۆیان ئاواتیان بێ). واتا: ئینگلیس لەو ناوەدا پارووی هەرەچەوری ڕفاند و سێ چێشکەی بە بەردێك پێکا:

١- گەلە کەمایەتیەکانی تورکیا و عەربستانی سەر بە تورکی ئاگادار کرد کە هەر کامێك

ئاواتی بێ لە ئاغای هەڵگەڕێتەوە، پەنا و پارێزگاری هەیە.

٢- ئەگەر عیراق نافەرمانی ئینگلیس بکا، زۆر هاسانە ناوچەی مووسڵی لێ دابڕێت کە بەپیتترین شوێنێکە لە عیراقدا.

٣- گوێی تورکیای لە شەڕ دۆڕاو باش ئاو بدا کە بە تەمای مووسڵ نەبێ و تازە بە هی خۆی نەزانێ.

(٥)

## بڕوانامەی نیشتمانی

هاوپەیمانان مستەفاکەماڵ پاشایان کردە گش پشکن (مفتش عام) لە سەر ئەو هێزە چەکدارەی لە سیواس و ئەرزەڕۆم بوون، کە نەهێڵێ لە خەت دەرچن. هەروەها حوکمی عوسمانیش کردبوویە والی ئەرزەڕۆم.

شەڕی گەورە کۆتایی هات. ئیمپەراتۆری تورکیا کوت کوت کرا. خاوەر و خۆرنشینەکەی لە بن چەکمەی بریتانیا و فەڕانسە و ئیتالیادا پێخوست کرا. یۆنانی لە ئیزمیردا بوون. چەندین دوڕگە لە تورکیا درابووە یۆنانیەکان و ئیتالیا. هەروا لیژنەی سوێندخۆران بوو بەرەو ئەستەمبوڵ دەهاتن و پاتەختی ئیمپەراتۆری لە داگیرکەر جمەی دەهات. یەك داوای تاوانی دەکرد؛ یەك وامی کۆنی لێ دەویست. هەرکەسە بۆ خۆی دەکێشا و لە بەر یەکیان دەکێشاوە. مستەفا کەماڵ کە دەیدی زێدی لە دەست نەیاراندا دەناڵێنێ و دوژمنان دەمیان تێناوە، زۆری لە لا شوورەیی بوو کە ژێردەستی بێگانە بێ. لە ئەستەمبوڵ هەڵگەڕاوە و زۆر بە توندی بە گژ هاوپەیماناندا چوو!

١١ی یۆلیوی ١٩١٩ مستەفاکەماڵی یاخی، ئەرکی میری لێدارنا و نیشتمانپەرستی تورکی لە دەوری خۆی کۆ کردەوە. ڕۆژی ٢٧ی تەمووز لە ئەرزەڕۆم حیزبی وەتەنی نوێ ئیجاد، یەکەم کۆنگرەی پێك هێنا و ڕۆژی ١٣ی سپتامبری ١٩١٩ش کۆنگرەیەکی دی بەسترا و بڕوانامەی نیشتمانی پەسند کرا. مادەی یەکەم لە بڕوانامەکە دەڵێ:

ئەگەر چارەمان ناچار بوو ئەو پارچانەی کە زۆربەی دانیشتوەکانی عەرەبن و دە پێشدا سەر بە

توركیا بوون و لە کاتی ئاگربەسەکەی ٣٠ ئۆکتۆبری ١٩١٨دا کەوتبوونە بەردەستی دوژمن، با بە ئازادی دەنگ بدەن و چارەنووسی خۆیان دیار کەن. بەڵام ئەو پارچەکانی‌تر -خوا کەوتبنە بەر خەتی ئاگربەسەوە، یان سەر خەت بن - کە زۆربەی زۆریان عوسمانی و مووسوڵمانن و لە دین و ڕەگەز و دۆز و ئامانج و ئاکاردا یەکن و لە مافی نەتەوایەتی و دابی کۆمەڵایەتیدا لێك نزیکن و ڕێزی یەکتریان لەبەرە و بە تەواوی تێکەڵاون- بە هیچ جۆرێك لە نیشتمان دانابڕێن و بۆ هیچ هۆیەکی قانوونی یان مەنتیقی گوێ شل ناکەین.

دانەری کتێبی مووسڵ لای وایە بەشی دووهەمی ئەم مادە بۆ دوو شت بوو:

١- ناوچەی کلیکیا کە لە سەر پێك هاتنەکەی تورك و فەڕانسە لە ٢٠ی ئۆکتۆبری ١٩٢١دا دراوە بە تورکیا.

٢- ناوچەی مووسڵ کە ئینگلیز خۆی لێ ساز دابوو لە دەست تورکانی دەربێنێ.

ئەو دەمەی کە هاوپەیمانان تورکیایان پەلپەل دەکرد، کۆمەڵەی مستەفا کەماڵ هەڵوەشانی پارلەمان و ئاڵوگۆڕی وەزیران و هەڵبژاردنی نوێی دەخواست.

لە ٢٨ جینوەری ١٩٢٠دا مەجلیسی تازە کۆ بۆوە و قۆڵی لە سەر بڕوانامەی حیزب کێشا. بەو بۆنەوە ئینگلیس ئاستانەی گرت و پەرلەمانەکەی هەڵوەشاند. مستەفا کەماڵ ئەمجارە کۆڕی نیشتمانی گەورەی لە ئەنقەرە کۆ کردەوە و ڕۆژی ٢٣ی ئاپریلی ١٩٢٠ کۆڕ بڕیاری پێك هێنانی بڕوانامەکەی ڕاگەیاند.

(٦)

وەحیدەدین ئاخر سوڵتانی عوسمانی ئامادە بوو هەرچی ئینگلیس و فەڕانسە دەیانەوێ بۆیان بکا. مستەفا کەماڵ وانەبوو. ملی بۆ پەیمانی سێڤر نەدا و دەگەڵ ڕووسیا ڕێك کەوت و ١٦ی مارسی ١٩٢١ پەیمانی دۆستایەتیان بەست. ئیتالیاشی تاق کردەوە و بە دانی چەند سەرپشکی (امتیاز)، ئازالیای لێ وەرگرتەوە. دەگەڵ فەڕانسەش ڕێك کەوتن کە لە ئۆکتۆبری ١٩٢١دا کلیکیای بۆ بەجێ بێڵن. واشی کرد کە هاوپەیمانان لە ١٠ی ئابی ١٩٢١ ڕایانگەیاند شەڕی نێوان تورك و یۆنان بەستەیە بەو دوو دەوڵەتە.

لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٢٢دا ئەنقەرە نوێنەری ناردن کە بۆ ئاشتی و نێوان خۆشبوون دەگەڵ

ئینگلیس وتوویژ کەن. وەزیرانی هەندەرانی بریتانیا و فەڕانسە و ئیتالیاش لە پاریسێ کۆ بوونەوە کە لە کێشەی تورك و یۆنان بکۆڵنەوە و لەو دەسکاریەش ورد ببنەوە کە تورکیا داوای دەکرد لە پەیمانی سێڤر بکرێ.

٩ی سپتامبری ١٩٢٢ مستەفا کەماڵ لەشکری یۆنانی لە ئەزمیر دەرکرد. لوید جورج کە هەوڵی دەدا هاوپەیمان و باڵکانیەکان لە دژی تورك هان بدا، چی بۆ نەکرا؛ پوانکاریە گوتی فەڕانسە بە گژ تورکیادا ناچێ.

ئەم ڕووداوانە بوونە هۆ کە لە ١١ی ئۆکتۆبری ١٩٢٢دا ئاگربەسی مۆدانیا بێتە گۆڕێ و هەر لەوێش مستەفا کەماڵ لە زمانی نیشتمانیەکان وای ڕاگەیاند:

١- بڕوانامەی نیشتمانی بۆ تورکیا مافی هەرە بەرە ژێرە.

٢- هەر هەردێکمان لە دەست چووە گەرەکە بیسێنینەوە.

٣- پرس بە خەڵکی تەراقیای ڕۆژاوایی ئەشێ بکرێ.

٤- سەرپشکیەکان (امتیازات) گەرەکە هەڵوەشێنەوە.

٥- دانیش بەوەدا بنرێ کە تورکیا خێوی هەموو زەمینەکانی خۆیەتی. بەمەدا وا دەردەکەوت کە تورکیا ڕازی نابێ هیچ زەمینێ لێ جوێ وەکەن.

ڕۆژی ١٦ی نوامبری ١٩٢٢ سوڵتان محەمەد وەحیدەدین وە دەر نرا و مستەفا کەماڵ هاتە سەر حوکم و هاوپەیمانان پێی ڕازی بوون و لەوەشدا زۆریان قازانج کرد. چونکە نەمانی خەلافەتی ئیسلام هەر وەك بۆ مستەفا کەماڵ باش بوو بۆ هاوپەیمانان باشتر بوو.

(٧)

## کۆنگرەی لۆزان

لەو کۆنگرە لە سەر مووسڵ، بوو بە هەرای عیسمەت ئینۆنو و لۆرد کرۆزن. عیسمەت دەیگوت: کوردی مووسڵ تورکی موسوڵمانن! بەڵگەشی ئەوە دێناوە چەند نوێنەریان لە پارلەمانی تورکیان! لۆرد کرۆزن ڕەخنەی لە هەڵبژاردنەکە دەگرت و دەیگوت: دەوڵەت بۆ خۆی ناوی داون و لەو کوردانە ئی وا

هەیە لە گفتوگۆ بەشدار نابێ؛ چونکو لە تورکی تێ ناگا.

هەر چۆنێك بوو لە ٢٤ی تەمووزی ١٩٢٣دا پەیمانی لۆزان بەسترا و شەڕ بە یەکجاری کۆتا بوو. هەر کێشەی نێوان دانانی عیراق و تورکیا مابوو کە ئایا مەڵبەندی مووسڵ عیراقە، یان بەشی تورکیا دەبێ؟ بریار وابوو ئەگەر خۆبەخۆ پێك نەیەن، کۆمەڵەی گەلان دەمراست بێ و کێشەکە ببڕێنێتەوە.

دەربارەی مافی کوردانیش پەیمانی سێڤر هەڵقرچا و لە پەیمانی نوێ لۆزاندا باسی ئیستقلال هەر نەما و تەنیا کرا بە بەزەیی هاوپەیمانان بەرانبەر بەو کەم هێزانەی کە لە بەردەستی تورکان دان. مادەی ٣٨ و ٣٩ی پەیمانی لۆزان ئاوایە.

٣٨: تورکیا دەستەبەر دەبێ کە گیان و ژیان و ئازادی دانیشتووانی وڵاتەکەی بپارێزێ و گوێ نەداتە شوێنی زان و ڕەچەڵاك و جۆری زمان و ئایینیان.

٣٩: تورك یاسای وا دانانێ کە بازرگانی ئازاد و ئاییندارى و یەکترگرتنی سیاسی و نووسین و دوان بە زمانی زگماك بەربەست کا.

(٨)

## کۆنگرەی قوستەنتەنییە

ئەو کۆنگرە ١٩ی مارسی ١٩٢٤ دەربارەی مووسڵ گیرابوو. فەتحی بەگ نوێنەری تورك و سەرۆکی پارلەمان گوتی: هاونیشتمانانی ئێمە بە چاوێك تماشا دەکرێن! ئێمە بۆ ڕەگەز و ئایین هیچ جیاوازییەك دانانێین! کورد و تورك -کە هاونیشتمانی یەکدین- نایانەوێ بۆ خاتری چەند هەزار ئاشۆری، نیشتمانیان پارچە بکرێ. کوردەکانی ناوچەی مووسڵ نوێنەریان لە کۆڕدا هەیە! قسەی پێشووی عیسمەت ئینۆنۆی جونەوە! نوێنەری بریتانیا (پرسی کۆکس) پرسی ئەو نوێنەرە کوردانە کێن؟ تورکەکە ڕیزی لێ گرتن: نایب زادە نوری ئەفەندی، سولەیمان فەهمی ئەفەندی، محەمەد نوری ئەفەندی، ئەفتچی زادە، نازم بەگ، فەتاح بەگ.

کابرای ئینگلیس بە ژینامەی ئەو کوردانەدا هاتە خوارێ کە کێن و چن. گوتی: نوری ئەفەندی

نایبزاده لاتێکی ماڵی نابیە و دەستی بابی خۆی بڕیوە؛ گویا دەچێ لە تورکیا کاسبی بکا. لەوەتا بابی زانیویە کە بۆتە نوێنەر لە لاتان، کوڕی خۆی خوێڕی کردووە. سولەیمان ئەفەندی لە مووسڵ باج ئەستێن بوو؛ دراوی بە ملدا هات و هەڵات و لە پارلەمانی ئێوەدا خۆی حەشار دا. نوری ئەفەندی فەرمانبەرێکی عیراق بوو؛ لە بێئاکاریان دەرکرا و خرایە بەر چاوەدێری و هەڵات! نازم بەگ نەفتچیزادە لە پارلەمانی عوسمانی نوێنەری ناوچەی کەرکووک بوو؛ لە عیراقیش لە کۆڕی دامەزرێنەرانی بوو بە ئەندام. ساڵی ۱۹۲۱ کردیان بە کارگێڕی حیللە، نەیویست؛ ویستی کارگێڕی کەرکووک بێ، بۆیان نەکرد. لەو ڕقانە دژی عیراق دەجووڵاوە و عیراق نیازی وابوو بیگرێ؛ هەڵات و لە سولەیمانیەوە چووە تورکیا.

فەتاح بەگیش -کە ژن برای شێخ مەحموودە- لە ئەستەمبوڵ کاری شێخ مەحموودێ دەکا کە دەیەوێ ئێوەڕاستی داردەست بگرێ و هیچ لایەکی نەڕەنجێنێ!

پاشان گوتی: نوێنەریەتی ئەو کوردانە لە پارلەمانی تورکیدا، پێچەوانەی پەیماننامەکەی لۆزانە. مەرج ئەوەیە کە هیچ لایەک کارێک نەکا باری کەوشەنی پێ بگۆڕێ. مووسڵ ئێستا سەر بە حوکماتی عیراقە و بوونی وان لە پارلەمانی تورکیادا ڕەوا نیە.

کۆنگرەی قوستەنتینیە سەری نەگرت و کار کەوتە کۆمەڵی گەلان و لیژنەیەک دەست نیشان کرا کە لەو کێشەیە وەکۆڵێ. قسەکە هاتە سەر ئەوە کە ئایا کورد لە ڕەگەزدا تورکن یان ئێرانین، یان عەرەبن؟! لیژنە لە ١٦ی ئەیلولی ١٩٢٥دا کردەنامەی خۆی پێشکەش کرد کە بەو جۆرە بوو:

«ئەگەر قازانجی خەڵکەکە لە بەر چاوبێ، بە لای لیژنەوە وا باشە مەڵبەندی مووسڵ بەش بکرێ. بەڵگەی گرینگ بە تایبەتی لە مەڕ ئابووری و جوغرافی و ئارەزووی دانیشتووانەوە وا دەردەخەن کە هەر هەردێک لە باشووری خەتی بروکسل دا هەیە، هی عیراق بێ؛ بە دوو مەرج:

۱- ئەم هەردانە بیست و پێنج ساڵ لە ژێر انتداب بمێنن.

۲- چاکە دەگەڵ کوردان بکرێ؛ فەرمانبەریان لە دادگا و فێرگە هەبن و لەو شوێنانەش زمانی کوردی ڕەسمی بێ.

بەڵام ئەگەر مەرجی یەکەمین پێک نەیە، مەترسی سیاسی هەیە و چونکە تورکیا لە باری سیاسی و هێمنایەتیەوە لە عیراق حاڵی باشترە، لیژنە لەو باوەڕەدایە مووسڵ بدرێ بە تورکیا. خۆ

ئەگەر مەرجی دووهەمیش پێك نەهێنرێ، ئەوا زۆربەی ئەو کوردانە حوکمی تورکیان لە هیی عەرەب پێ باشترە.

هەر چۆنێك بێ عیراق دەبێ دیالەی هەر بۆ بمێنێ؛ چونکە لە مەڕ ئاودێریەوە زۆری پێویستی پێ هەیە.

## شۆڕشی شێخ سەعید

هەر لەو سەروبەندانەدا کە تورکیا تێی گیرابوو، شۆڕشێکی کورد هەلگرسا. هێندێك نووسەر لایان وایە بۆیە رووبدا مستەفا کەماڵ بڕیاری کۆنگرەی لۆزانی بە هیچ گرت و هەر لە ساڵی ١٩٢٤ەوە زمانی کوردی یاساغ کرد و کوردەکانی لە جێی خۆیان دەگوازتەوە. کوردەکان بە سەرکردەیی کۆلۆنێل (خالیدبەگ)ی سەرکۆماری هۆزی جبران، بۆ بەربەرەکانێ تورکان خۆیان ساز کرد و زۆر ئەفسەر و ڕۆشنبیری کورد بۆ خەبات کۆ بوونەوە. بڕیاردرا ڕۆژی ٢٦ی مارسی ١٩٢٥ ئەو شۆڕشە دەست پێ بکرێ؛ بەڵام ڕێکەوت وای هێنا کە بەر لە ڕۆژی داندراو تەقە قەوما. هێندێك پیاوی شێخ سەعید -کە سەرۆکی تەریقەی نەقشەبەندی بوو- دەگەڵ پەلێك عەسکەری تورك بە شەڕ هاتن؛ سوپای تورك شۆڕشەکەی لە ناو برد و شێخ سەعید و هاوکارەکانی گرتن و تێکڕا دانی بە مەحکەمە.

مەحکەمەی ئیستقلال ڕۆژی ٢٧مایۆ فەرمانی خنکانی شێخ و دوکتۆر فوئاد و چل و شەش شۆڕشگێڕی ڕاگەیاند و مانگی ئابی ساڵی ١٩٢٥ لە دار دران. سەرۆکی مەحکەمە گوتی ئەوانەی ئەم شۆڕشەیان کرد مافی نەتەوایەتیان دەویست. دوای ئەوە زۆر گەورەی کوردان لە بۆتان و ساسۆن و بایەزیدێ ڕاگوێزران و ناردیاننە شوێنی ناسازگار لە کەناراوی ئانادۆل. بەڵام ئێستاش کورد و تورك لەم ڕێی ئەو سەربەخۆییەدا وێك دەکەون!

هۆیەکانی ئەو شۆڕشە لای مینۆرسکی ئەمانەن:

١- کۆماری تورکیا دینی لە دەوڵەت جیا کردەوە.

٢- ژیانەوەی نەتەوایەتی کورد و ئاواتی سەربەخۆ بوونیان.

٣- پیلانی میرێکی عوسمانی کە لە حەلەب دەژیا.

٤- فروفێلی ئینگلیزەکان.

هێندێك ڕۆژنامەی تورکیاش نووسیان کە فەرمانبەرانی تورك لە دیاربەکر چەند نامەی کومپانیاکانی ئینگلیسیان وە دەست کەوتووە کە بۆ وەزارەتی جەنگی کوردستان نووسراون. ئینگلیس لە پاش ئەو شۆڕشە -لە کۆڕی کۆمەڵی گەلان- گلەی لە تورکیا دەکرد کە مەسیحیان ئازار دەدا و گوێ ناداتە پەیماننامەی سێڤر و لۆزان.

تورکیش بەرپەرچیان دەدان و گازنیان لە ئینگلیز دەکرد کە گەرمان تێدەهاڵێنێ و نیازی وایە ئاواتی داگیرکەرانەی بە سەرمەدا بسەپێنێ و دەشیان گوت کە هەر ئینگلیس دنەی شێخ مەحموودی دەدەن کوردی مووسڵیان لێ هان دا، دژی تورکیا ڕاپەڕن.[1]

سەرەنجام کۆمەڵی گەلان ١٦ی دیسامبری ١٩٢٥ خەتی بروکسلی پەسەند کرد و مووسڵ وە سەر عیراق خرا و دوو مەرجیشی بۆ داندرا:

١- ٢٥ ساڵ عیراق لە ژێر «انتداب» (سەرپەرشتی ئینگلیز)دا بێ.

٢- حکوومەتی بریتانی بەڵێن بە کۆمەڵی گەلان بدات کە بەرژەوەندی کوردەکان دەپارێزێ!

عیراق بەو هەردووك مەرجە ڕازی بوو. هێندێك ئازادیخوازی عیراق لە ٢٥ ساڵ «انتداب» دڵخۆش نەبوون؛ ئینگلیز هەڕەشەی لێ کردن کە مووسڵ دەدا بە تورکان.

٥ی ژووییەی ١٩٢٦ پەیماننامەی نێوان عیراق و ئینگلیس و تورك بەسترا و تورك دانیان بەوە دانا کە مووسڵ سەر بە عیراق بێ و تۆزێك خەتی بروکسل دەسکاری بکرێ و هەتا ٢٥ ساڵانیش دەیەکی داهاتی ئەو کۆمپانیانەی عیراق بۆ تورك بێ:

---

١- شێخ مەحموود سەرۆکێکی کورد بوو لە پاش شۆڕشی شێخ سەعید لە تورکیاوە ڕای کرد و هاتە عیراق بۆ لای ئینگلیز و لە سەر شاری سولەیمانی کردیان بە وەکیلی خۆیان.

مامۆستا یەحیا خەشاب، لە ڕووپەڕ ٣٠ پێشەکیەکەیدا دەڵێ: ساڵی ١٩١٨ سولەیمانی درا بە شێخ مەحموود؛ لە ڕووپەڕ ٣٩دا دەڵێ: ساڵی ١٩٢٤ کرزن گوتی: فەتاحبەگ، شێخ مەحموود ناردوویەتە ئەستەمبووڵ؛ لە ڕووپەڕ ٤٢دا دەڵێ: پاش شۆڕشی شێخ سەعید -کە ساڵی ١٩٢٥ بووە- شێخ مەحموود لە تورکیاوە ڕای کردووە. دەبوایە ئەوەندەی لە بیر بوایە کە ئەم هەڵە زلانەی بە بارێکدا پینە بکردایە؛ چونکە بە کەس داناپۆشرێن. هەژار

١- کۆمپانیای نەوتی تورکی بە پێی مادەی١٠ی ئیمتیازی ١٤ی مایوی ١٩٢٥.

٢- کۆمپانیا، یان کەسانێك بەهرە لە نەوت دەسێنن بە پێ مادەی ٦ی ئیمتیازەکە.

٣- لۆویۆیی کۆمپانیاکانی نەوت، بە پێی مادەی سی و سێهەمی ئیمتیازە گۆڕینەکە.

(١٠)

## کورد و بریتانیا

لە دووهەمی مارسی ساڵی ١٩٢٦دا لە مەڕ مافی کوردانەوە ئینگلیس کردەنامەی «انتدابی» دا بە کۆمەڵی گەلان و تیا دەڵێ: «کوردێکی زۆر لە وەزارەتەکانی دارایی و ناوەخۆ و داد و لە مەڵبەندە کوردنشین و مەڵبەندەکانیتری عیراق دامەزراون و دەست بەکارن؛ لە حکوومەتی ناوەندیشدا بەشیان هەیە لە ٢٠ ئەندامی سەنایە دوویان کوردن؛ لە ٨٨ نوێنەری پارلەمانیش ١٤ کوردن؛ دوو وەزیری کوردیش هەیە؛ لە ناو سوپا و پۆلیسیشدا کورد مشەیە. مەڵبەندە کوردنشینەکان ٢٥ فێرگەی لێ هەیە؛ پێنجیان لەوان هی فەلانن و لە شازدە فێرگەی بیستەکەش دەرسی کوردی دەخوێندرێ؛ زۆربەی مامۆستاکان کوردن. مامۆستای کورد لە زۆر فێرگەی نەکوردیش هەن.»

جگە لەوەش ئینگلیز کارێکی وایان کرد کە ناوەڕۆکی دەفتەر و نامەی ڕەسمی بە کوردی بن.

بەر لە شەڕێ، زمانی کوردی بێ‌باو بوو؛ ئێستاکینێ کە کوردی نووسی بۆتە باو، لە پیاوەتی فەرمانبەرانی ئینگلیسە! تا وێستا لە لیوای مووسڵ کوردی خوێندن پەیدا نەبووە. بەڵام لە ناوچەی هەولێر و سولەیمانی وا خەریکە پەرە دەگرێ.

جیا لە ئینگلیس کاربەدەستانی عەرەبیش لە عیراقدا هەوڵیان دەدا کەمایەتی کورد لە لایانێ گەشە بکا و زمانەکەی دە کار بێنێ و فەرمان و خوێندنی هەبێ. تەنانەت حاکمانی عەرەب کوردیان بۆ ئەوە هان دەدا کە لە ناو دەوڵەتەکەدا ئەوانیش دەوڵەتۆکە بن.

سەرەك وەزیرانی عیراق لە ٢١ی جینوەری ١٩٢٦ لە وتارێکیدا ڕایگەیاند: «لە سەڵ دەوڵەتی عیراقە کە ماف بدا بە کوردان و فەرمانبەریان لە خۆیان بێ و زمانی کوردیش ڕەسمی بێ.»

ئەم وتارە بۆ هەموو وەزارەتێك چوو کە گشت پەیڕەوی لێ بکەن.

لە ئاهەنگێك كە بۆ ئیمزای پەیمانی تازە گیرابوو، مەلیك فەیسەڵ لە مەڕ كوردانەوە گوتی: «یەك لە ئەركی عیراقی ڕاست، دنەدانی برای كوردی عیراقیەتی كە ڕەگەزی بپارێزێ و بێتە ژێر ئاڵای عیراقی».

هەر لەو جێیەش مەندوب سامی بریتانی لە وتاری خوێدا گوتی: «ئەركی گرینگی سەرشانی حكوومەتی عیراقە وا كارێك بكا كە كوردەكان دڵسارد نەبن و شانازی بە كوردایەتی خۆیان بكەن. بێگومانیشم كە عیراق ئەم سیاسەتە بەرنادا».

كەوابوو ئەوە ئینگلیز و حاكمانی عیراقی بوون كە بڕیاریاندا كورد لە ناو عیراقیدا پێناس و زمانی خۆیان بێ، بەرانبەر بەو بارە نوێیە. نایف بەگ[1] - كە سەرەك هۆزێكی كورد بوو- بە پەنجا هەزار كەسەوە لە توركیا باری كرد و هاتە عیراق.

ئازادی پێناس و زمان -كە عیراق بە كوردی بەخشی!- ئازادیخوازی كوردەكانی توركیاشی وا وەكار خست كە باركەن و بێنە عیراق.

ئەگەر بیری دامەزرانی دەوڵەتی سەربەخۆی كوردی، دایە سیس بوون، سەبووری كوردان بەوە بوو كە لەم دەوڵەتە عەرەبە، ڕەگەز و زوانیان بێ ترسە و مافی ڕەوای نەتەوەیی خۆیان هەیە. بەڵام ئینگلیز كە ئیستقلالی كوردی باس دەكرد یان لە توركانی دادەبڕین، هەر بۆیە بوو كە مووسڵ لە تورك ببڕێ و دەگەڵ ئەوەش كە زۆربەی دانیشتووەكانی عەرەب نین، بیخاتە سەر عیراقەوە. مووسڵیشی بۆ نەوتەكەی بوو. سیاسەتی بریتانی لە مەڕ تورك و كورد و كەمایەتیەكانی دیكە و بۆ هەموو شوێنێكی عیراق بناغەی لە سەر نەوت بوو.

كۆمپانیاكانی نەوت لە كێشە و هەرای مووسڵدا زۆر چالاك بوون. لە ساڵانی ١٩١٨-١٩٢٠دا سێر ئارنۆڵد ویلسون بریكاری مەندوبی سامی عیراق بوو. كاتێ كەوشەنی نێوان توركیا و عیراق دیاری كرا، ئەو دەگەڵ سەركردایەتی هاوپەیمانان دەس بە كار بوو. ساڵی ١٩٢٦ كە ئینگلیس بوون بە خاوەنی نەوتی مووسڵ، سێر ئارنۆڵد بوو بە كارگێڕی گشتی نەوتی ئێرانی و ئینگلیسی، لەو شوێنانەی كە نەوتی ئێران و عیراقی لێیە.

---

١- نیازی نایفی پاشایە كە سەرۆكی هۆزی كۆچەر بوو؛ ماڵی هاتبووە سووریا. پەنجا هەزارەكەش خۆی نیە. هەژار

سالّی ١٩٣٢ كه عیراق چووه كۆمەڵی گەلانەوه، نوێنەری عـیراق ڕایگەیانـد كـه مافـی كـورد پارێزراوه. بەڵام چونكه گوێ نەدرابووه مەڵبەندە كوردنشینەكان، ساڵی ١٩٣٣ شێخ ئەحـمەد بارزانی، بەرزنـجی، شۆڕشی كرد و به كۆششی كابتـن فیولیـت سـاڵی ١٩٣٤ دامركێنـرا و سـەرانی شـۆڕش هێنرانه كەركووك و سولەیـمانیه و تا ساڵی ١٩٤٣ لەوێ مان.

ساڵی ١٩٤٣ مەلامستەفا بارزانی برای شێخ ئەحـمەد بارزانی -كه حكوومەت بۆی دانـابوو لـه شاری سولەیـمانی بێ- له گرتووخانەی خۆی هەڵات و پەنای به هۆزی بارزان برد و لەو كارەشدا شـێخ لەتیف بەرزنـجی كوڕی شێخ مەحـموود یاریدەی داوه.

لەو دەمەشدا ئازربایـجانی ئێران لەشكری ڕووسی تێ چووبوو. ڕووس كوردیان دڵخۆش دەكـرد و سەرەك هۆزه كوردەكانیان به دەستەڵاتدار هێشتەوه. ئەو چاكەی ڕووس دەگەڵ كـوردی ئێرانیـان كـرد، كوردی دیكەش بیستیانەوه و لەو سۆنگەوه شێخ لەتیف چووه ئازربایـجان و ڕووس زۆر باشیان به خێر هێنا. ڕووس نیازیان بوو بۆ كورد و ئازربایـجان دوو دەوڵەتی یان سەربەخۆ یـان یەكـدیگیر! درووسـت بكەن. شێخ لەتیف له ئازربایـجان گۆڤارێكی مانگانەی چل ڕوویەڕی به ناوی *نیشتمان* دەردەخست.[1]

هێزی پۆلیسی عیراقێ چوونه سەر مەلامستەفا و به شەڕ دەرۆستی نەهاتن. ئەم جار سـوپای ده گۆ ڕاچوو. ئەویش به شەڕ پێی نەوەستا. نووری سەعیدی سەرەك وەزیر -كه گۆیا ئەویش هەر كوردە- وای پێ باش بوو مافـی كوردان دابیـن بكا و ئـەو شۆڕشـه دامـركێنێ و یەكیـەتی عـیراق بـمێنێ. زەعیمێكی كوردی كرده وەزیر دەوڵەت كه ناوی مەجید مستەفا ماجد بوو؛ بەوی سـپارد كـه وتووێـژ دەگەڵ مەلامستەفا بكا. نووری سەعید مەرجی مەلامستەفای قبوڵ كـرد كـه چـەك لـه بارزانیـەكان نەستێنێ و مافـی كوردیش له مەڕ باری كۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیـریەوه چیـن، بیبدا؛ بـەڵام پەرلەمانی عیراق دژی ئەو پێك هاتنه وێستا و نووری سەعید به ناچاری خۆی لـه وەزارەت كێـشاوه و پاچەچی هاته شوێنەكەی و بەڵێنی نووری سەعیدی به هیچ نەگرت.

مەلامستەفا شۆڕشێكی زۆر توندوتیژی هەڵگیـرساند. ساڵی ١٩٤٥ هێرشێكی گەورەی سـوپای

---

١- شێخ لەتیف مانگی ١١ی ١٩٤٣ چۆته سەردەشت؛ پـاش حـەوت مـانگ هاتۆتـەوه عیـراق. گۆڤاری *نیشتمان* ئۆرگانی كۆمەڵی ژ.ك بوو، له مەهاباد به نهێنی دەردەچوو. یەكەم ژمارەی مانگی پووشپەڕی ١٣٢٢ی هەتاوی، واتـا حزیران - تەمووزی ١٩٤٣ دەرچووه. هەژار

عیـراق چووە سەر کوردان و شۆڕشەکەی لە ناو بردن. ٧ی ئابی ئەویٚ ساڵیٚ مەلامستەفا چووە ئێران و زۆر لە چەکداری هۆزەکەش دەگەڵی چوون. عیـراق داوای لە ئێران کـرد کـە بـارزانی بداتـەوە. ئێـران گوتی: ئەمن دەستم پێی ڕاناگا؛ چونکە لە بەردەستی ڕووسە. کە داوای لە ڕووسیا کرد گوتی: ناتوانـم بیگرم چونکە لە عەرزی ئێرانە!

ڕاستیشت دەویٚ، کوردستان هەمیشە بۆ کاربەدەسـت و حاکمـانی ئێـران بەڵایـە. لـە ڕۆژگـاری ناسرەدینشا بەم لاوە، پیاوی دەوڵەت لـە لای کـوردان زۆر خوێنتـاڵن. فەرمانبـەرانی حکوومـەت لـە جیاتی وەی دڵی کوردان بە خۆ خۆش کەن هەر لە خۆیان دردۆنگ دەکەن.

پاش هاتنی ڕووس بۆ ئێران و پاڵ پێوەنانی ڕەزاشا، ڕووس لیٚ بڕان دەوڵەتێك لە ئازربایـجان بـە سەرۆکی جەعفەر پیشەوەری دامەزرێنن. پیشەوەری بە هاریکاری کوردەکان بە شەڕ دە گـژ هێزەکـانی حکوومەتی تاران چوو؛ گفتیشی بە کوردەکان دا کە لە ناو ئازربایـجاندا دەوڵەتێکی سـەربەخۆیان بـۆ پێك بێنیٚ. ساڵی ١٩٤٦ کە جەعفەر بە ئاوات گەیشت؛ کورد داوای بەشی خۆیان کرد و [illegible] کورد بە سەرۆکایەتی قازی مـحەمـەد پێك هات و پاتەختیشی مەهاباد (ساباڵخ) بوو. کە ڕووس لـە ئێـران دەرکەوتن، وڵاتی ئازربایـجان دیسان دراوە بە تاران و حوکمی جەعفەر پیشەوەری و قـازی مـحەمـەد لە بەین چوون. هێزەکانی مەلامستەفا بارزانیش حکوومەتی ئێران یەك لە دوو ڕێگەی بۆ دانـان: یـان چەك دانێن و لە ئێران بن، یان مەلامستەفا و سەد کورد بە پەنابەر بـمێننەوە و ئەوانیتـر بگەڕێنـەوە بۆ عیـراق. ئەگەر بەو مەرجانەش نەکەن، ئێران هەموانیان دەردەکا.

لە ئەپریلی ١٩٤٧دا مەلامستەفا هاتەوە عیـراق و خۆی تەسلیم کرد.[1]

---

١- وا دیارە مامۆستا یەحیا خەشاب ئەم باسـەی تـەواو دە بـنج و بنـاوان نـەکردووە و لـە نێـوان شـێخ ئەحـمەد و مەلامستەفادا لێی ئاڵۆزاوە. ڕاستیەکەی ئەمەیە: دوای ئەوە کە بارزانی و دەوڵەتی ئێران پێك نەهاتن، لەشکری ئێرانی گەلێك لە هۆزە کوردەکانی بەردەستی خۆشیان وە پێش خۆ دا و هاتنە سەر بارزانیـان. لـە دەشـتی شـنۆ و نەغـەدەدا دەگەڵ بارزانیان دە گژ یەك ڕاچوون و گەلێك شەڕی خوێناوی لە نێواندا ڕوویدا. گەلێك زیان بە گیان و ماڵی لەشکریانی ئێران و کوردەکانی هاوکاریان گەیشت. زستانی زۆر سەخت بوو؛ بەفری زۆر و برسایەتی بڕستی لە بارزانیـان بـڕی. بـە تایبەتی پیـر و ژن و منداڵی وردە، زۆر پەرێشان و بیٚ سەرەوبەرە ببوون. بارزانی بە دەم شەڕەوە خۆیان گەیاندە سنووری عیـراق، بۆ ئەوە کە ماڵ و منـداڵ و پەککەوتـەی بارزانیـەکان لـە بـەین نەچـن. شـێخ ئەحـمەدی بـارزانی و چـەند کەسێك لە شەڕکەران دەگەڵ ئەو خێزان و ماڵانەدا خۆیان تەسلیمی حکوومەتی عیـراق کرد. حکوومـەتی عیـراق←

سالّی ١٩٥٥ رەفێق حیلمی -کە لە کوردە ڕۆشنبیرەکانی عیراقە- گوتی: «کورد مافی ئەوەیان هەیە دەوڵەتی سەربەخۆیان بێ.»

گومان نیە ئینگلیز کە باسی ئازادی کوردیان دەکرد، بۆیە بوو ئەوتیان دەس کەوێ. ڕووسیش بۆیە کوردیان دەویست کە بگەنە نەوتی ئازربایجان. کە وابوو شۆڕشی سالّی ١٩٤٥ی بارزانی و

---

→ شێخ ئەحمەد و چەند کەسێکی لە خزمانی، لە بەسرا زیندانی کرد.

ماڵ و منداڵ و وردەی بارزانیانیش خرانە ناو زنجەوە و ئەمر ئەژی دەژیان و زۆر بە شپرزەیی ڕایان دەبوارد. ماوەیەکی زۆر هەر وا مانەوە تا لە ئەنجاما ڕێگەیان دان بچنەوە وڵاتی بارزان. بەڵام مەلامستەفا و پێنجسەد کەس لە پیاوانی بەکار و بەگوردی بارزانی خۆیان تەسلیم نەکرد و لە ٤٧/٤/٢٨ هاتنەوە لە سنووری عیراق چەند شەڕێکیان دەگەڵ عیراق کرد و لە ١٩٤٧/٥/١٨ سنووری عێراقیان بەجێ‌هێشت و بە ڕێگەی تورکیادا گەڕانەوە و لە چەند جێیەکدا دەگەڵ تورکان تووشی یەك هاتن و بە شەڕ خۆیان ڕزگار کردن. هاتنەوە ناو کوردستانی ئێران و دەیانەویست بەرەو ڕووسیا بچن. ئێرانیەکان لە هەموو جێگە و شوێنێکدا لەشکریان لە سەر ڕێگە دانابوون کە شایەد پێشیان پێ بگرن و وانەکەن مەلامستەفا بگاتە ڕووسیا. بارزانی لەو ڕێگە دوور و پڕ لە مەترسیەدا -کە زۆر کەس سەری لێ سوور ماوە- گەلێك جار تووشی لەشکری ئێران هاتن و شەڕی زۆر خوێناویان لە نێواندا قەوما و بە ئازایەتی خۆیان ڕزگار کرد و توانیان لە چۆمی ئاراز بپەڕنەوە. لە ئازربایجانی سۆڤێتی بوونە پەناهەندەی دەوڵەتی ڕووس. لە پاش ماوەیەك لە ئازربایجانیان ڕاگوێزتن و بردیاننە ئۆزبەکستان. مەلامستەفا لە ئوزبەکستانەوە چووە مۆسکۆ. هەر لە سالّی ٩٤٧ ڕا تا سالّی ١٩٥٨ مەلامستەفا و هەواڵانی بارزانی لە ڕووسیا ژیان و لە پاش شۆڕشی ١٤ی تەموزی عێراق، هاتنەوە بۆ نیشتمانی خۆیان.

سالّی ١٩٦١ پارتی دیموکراتی کوردستان -کە بە سەرۆکایەتی بارزانی بوو- لە سەر داوای مافی نەتەوایەتی گەلی کورد، دەگەڵ عەبدولکەریم قاسمدا نێوانی زۆر خۆش نەبوو؛ کەوتبووە گلە و گازندە کردن. لە ١١ی شابی سالّی ١٩٦١دا عەبدولکەریم قاسم لەشکری ناردە سەر کوردستان و شەڕی هەلگیرساند. هەر لە ١٦ی ئەم مانگەشدا لە خوت و خافڵ فڕۆکەی ناردنە سەر بارزان و بۆمبارانی کرد.

لە بەرانبەر ئەم دەستدرێژیەدا مەلامستەفا -لە سەر ئەمر و فەرمانی شێخ ئەحمەد- بۆ مافی ڕەوای پارێزگاری لە زوڵم و زۆری، ڕاپەڕی و بە گژ سوپای عێراقدا هاتەوە. ئەو شۆڕشە هەتا ١١ی ئازاری سالّی ١٩٧٠دەوامی کرد و لەو ساوە دەگەڵ حکومەتی بەعسی پێك هات کە حوکمی زاتی (ئۆتۆنۆمی) بدەن بە کوردستان. ئیتر دوایی بەو شەڕ و کوشتارە هێنا. ئێستا کە سالّ ١٩٧٢ە، کوردەکان چاوەنۆڕی وەن حکومەتی عێراق بەڵێنەکانی پێك بێنێ و حوکمی زاتی بدا بە کورد و جارێکی‌تر شەڕ و خوێن ڕژتن نەبینن. هەژار

شیاوی باسە: ئێستا کە من ئەو پەراوێزە چاپ دەکەم و وەختیش ١٢ی مانگی نۆی سالّی ١٩٧٣یە لە قەیرانی حوکمی زاتی لە کوردستانی عێراقدا ٦ مانگ ماوە. بە هۆمێدم کوردی هەژار ئەم ئاواتەیان بێتە جێ و حوکمی زاتیان بۆ بچەسپێ؛ پەنا بە خوا. هەژار

شۆڕشی قازی مـحەمەدیش ئەگەرچی بۆ سەربەخۆیی کوردستان بوون، ئەو هیمە تونـدەیان نـەبوو کـە دەوڵەتی لە سەر گێڕ بێ. هەرگا ئەو هیمە قایـمە بۆ کوردەکانیش هەلکـەوێ، ئـەو ئاواتـەی کـە بـە سەرچڵی لێی دواین بۆیان پێك دێ. حەزم دەکرد مامۆستا مـحەمەدعەلی عەونی- کـە *شـەرەفنامەی* بە عەرەبی وەرگێڕاوە و بەو کردەوەی ڕۆشنبیـری ئیسلامەتی بە تێکڕایی و ڕۆشنبیـری کوردەکانی بـە تایبەتی دەوڵەمەند کرد- ئێستا لە سەر دنیا بوایە و بەری ماندوو بوونی زۆری بە چاپکراوی بدیایـە. خوای لێ خۆش بێ و بچێتە بەهەشت.

زۆر سوپاس بۆ شێخ عومەر وەجدی، شێخی ڕەواقی کوردان لە ئەزهەر کـە زۆری خـۆ بـۆ چـاپ کردنی ئەم کتێبە ماندوو کرد و پێڕستیشی بۆ درووست کرد.

**یەحیا خەشاب**

ئاپریل ١٩٥٨

# شەرەفنامە لە کوردناسیی سۆڤێتدا

**دوکتۆر کەماڵ مەزهەر ئەحمەد**

هیچ خوێندەوارێکی کورد و هیچ ڕۆژهەڵاتناسێك نیە ناوی *شەرەفنامە* و شەرەفخانی بدلیسی نەبیستبێ کە تا ئێستە بە گەلێك زمان و بە دەها جار کورت و درێژ دەربارەیان نووسراوە. هەموو ڕۆژهەڵاتناسی سۆڤێت بە گشتی و کوردناسیان بە تایبەتی، بایەخێکی دیار و شایانیان بە هەر دوو بەرگەکەی *شەرەفنامە* و دانەری داوە. ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژهەڵاتناسانی سۆڤیەت لە نووسینەکانیاندا نەك تەنیا دەربارەی کوردستان، بەڵکو دەربارەی زۆر لایتری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش کەڵکیان لە *شەرەفنامە* وەرگرتووە. لە ساڵەکانی ٣٠دا داوا لە کاربەدەستی ئەکادیمیای سوڤێتی ڕۆژهەڵات و کوردناس: ف.ب. ڕاستۆپچین[١] کرا ئەم سەرچاوە کۆنە بگۆڕێتەوە سەر زمانی ڕووسی؛ بەڵام مردنی لە ناکاوی بووە کۆسپ لە بەردەمی جێبەجێ کردنی ئەم کارە پێویستەدا.

بایەخ پێدانی ڕۆژهەڵاتناسی سۆڤێت بە *شەرەفنامە* لە دەساڵی ڕابردوودا گەیشتە بەرزترین پلەی. لە سەرەتای ساڵەکانی شەستەوە، کاربەدەستی زانستی بەشی کوردی دەزگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیای زانستی سۆڤێت، لقی لینینگراد (یڤگینا ڤاسیلێڤا) دەستی کرد بە گۆڕینی ئەم سەرچاوە کۆنە لە زمانی فارسیەوە بۆ سەر زمانی ڕووسی. ساڵی ١٩٦٧ بەرگی یەکەمی بە ڕووسی لە

---

١- ڕۆژهەڵاتناسی سۆڤێتی ف.ب.ڕاستۆپچین، لە ساڵەکانی ٣٠دا چەند باسێکی بە نرخی دەربارەی کورد بڵاو کردەوە. ڕاستۆپچین یەکەم زانایە لە جیهاندا کە یەکەم بیبلیوگرافیای لە سەر کورد داناوە و کاتی خۆی لە ژێر ناوی بیبلیوگرافیا لە بارەی کێشەی کوردەوە، لە گۆڤاری *ڕۆژهەڵاتی شۆڕشگێڕ*دا بڵاوی کردۆتەوە. «بڕوانە: *ڕۆژهەڵاتی شۆڕشگێڕ* بە زمانی ڕووسی، ژمارە ٣-٤، ساڵی ١٩٣٣، ل ٢٩٢-٣٢٦ و ژمارە ٥ی هەمان ساڵ، ل ١٥٩-٧٣.» یەکێك لە وتارە بە نرخەکانی ڕاستۆپچین «سەرنج لە بارەی کوردەوە»یە کە لە ژمارە ١٣-١٤ی ساڵی ١٩٣٢ی گۆڤاری *دەنگ و باسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست*دا بڵاوی کردۆتەوە. گۆڤاری ناوبراو، ل٧٢-٩٣. بۆ لێکۆڵینەوە لە ژمارەیەك، ڕووی گرنگی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی کورد تەرخان کراوە. ڕاستۆپچین لە سەرەتای ئەم وتارەیدا هێرشێکی زۆر توندی کردۆتە سەر ئەو مێژوونووسە دوورنەبینانەی لە خۆڕا خەباتی گەلی کوردیان لەکەدار کردووە. لە هەمان کاتدا ڕاستۆپچین زۆر توند ڕەخنەشی لەو ڕۆژهەڵاتناسە سۆڤێتیانەش گرتووە کە نەزانانە -لە ژێر پەردەی مارکسیەتدا- لەکەی کۆنەپەرستیان بە هەموو جووڵانەوەیەکی کوردەوە لکاندووە.

ژێر چاپدا دەرچوو[1]. بەر لەوەش بە چەند مانگێك کاربەدەستی زانستی دەزگای گەلانی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەراستی ئەکادیمیای زانستی ئازەربایجانی سۆڤیێتی (م.شەمسی) سەبارەت بەو نامەیەی تەرخانی کردبوو بۆ لێکۆڵینەوە لە *شەرەفنامە*، بە ناوی *شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی وەك سەرچاوەی مێژووی گەلی کورد*ەوە[2]؛ کە بەرهەمی کاری بێوچانی چەند ساڵێکی بوو نازناوی دوکتۆری پێدرا.

ئەم دوو شارەزایە بە شێوەیەکی زانیاری قووڵ، نرخی *شەرەفنامە* و گەلێك ڕووی نەزانراوی خۆی و دانەرەکەیان بۆ یەکەم جار بە جۆرێکی ڕێکوپێك خستۆتە بەردەمی ڕۆژهەڵاتناسانی وڵاتەکەیان و دەرەوە؛ کە وا بزانم کورتە باسێکیان لە پێشەکی یەکەم چاپی کوردی *شەرەفنامە*دا کارێکی لەجێ و پێویستە.

بەرگی یەکەمی *شەرەفنامە* بە ڕووسی، ٦١٩ لاپەڕەیە،[3] کە تەنها ٤١٢ لاپەڕەی بریتییە لە وەرگێڕانی نووسینەکەی شەرەفخان؛ ئەوی تری بریتییە لە پێشەکی و پاشکۆ و کورتە باسێکی کتێبەکە بە ئینگلیزی؛ کە لە لایەن ئافرەتی زانای سوڤیێتی (ی. ڤاسیلیێڤا)وە ئامادە کراون.

ی. ڤاسیلیێڤا لە پەنجا و پێنج لاپەڕەی پێشەکییەکەیدا وەستایانە *شەرەفنامەی* هەڵسەنگاندووە و نرخی زانستی دیاری کردووە و گەلێك زانیاری نوێی لەم بارەیەوە بڵاو کردۆتەوە کە زۆربەی هەرە زۆریان لای خوێندەواری کورد نەزانراو بوون. لەم پێشەکییەدا زانای سۆڤیێتی بە درێژی باسی مێژووی لێکۆڵینەوەی *شەرەفنامە* و دەسنووسە کۆنەکانی و ئەو کتێبخانانەی ئێستە تیایاندا هەڵگیراون و گەلێك باسی‌تری لەم بابەتەوە تۆمار کردووە.

وەك ڤاسیلیێڤا نووسیویێتی، هێربێلۆ بە زمانی فەرەنسی ساڵی ١٧٧٦ لە لاپەڕەی ٨٣٦ و ٨٤١ی کتێبەکەیدا (کتێبخانەی ڕۆژهەڵات یا فەرهەنگی گشتی) بۆ یەکەم جار باسی *شەرەفنامەی* بە جیهانی

---

١- ڤاسیلیێڤا دەمێکە دەستی بە گۆڕینی بەرگی دووهەمی *شەرەفنامە* کردووە کە نیاز وایە ئەویش لەم چەندانەدا بخرێتە ژێر چاپەوە.

٢- ئەم نامەیە بە زمانی ئازەری نووسراوە و کورتەکەی بە ڕووسی چاپ کراوە.

٣- هەزار و سێسەد دانە لە بەرگی یەکەمی *شەرەفنامە* بە ڕووسی بە شێوەیەکی جوان و بەرچاو، چاپ کراوە و دەمێکە لە بازاڕاندا نەماوە.

زانیاری رۆژئاوا گەیاندووە[1]. هێربێلۆ لە ڕێگەی یەکێك لە نووسراوەکانی گەڕۆکی بەناوبانگی تورکی سەدەی حەڤدەهەم (کاتب چەڵەبی)یەوە بە *شەرەفنامەی* زانیوە «بڕوانە ل ١٤ی پێشەکیەکەی ی.ڤاسیلیێڤا». دوای ئەوە یەکەم ئەورووپایی کە دەسنووسی *شەرەفنامەی* دەستکەوتووە جۆن مالکۆلم[2] بووە کە تەنانەت لە ڕووی زانستیشەوە کەلکی لێ وەرگرتووە؛ بەوەدا کە لە بەرگی دووهەمی[3] دەربارەی مێژووی ئێران چەند جارێك شتی لە *شەرەفنامە* وەرگرتووە؛ بەڵام بێ ئەوەی ناوی کتێبەکە یا دانەری بێنێت. بێگومان بەکارهێنانی *شەرەفنامە* وەك سەرچاوە -لەو کاتەدا لە لایەن شارەزایەکی وەك مالکۆلمەوە- بەڵگەیەکی مێژووییە بۆ نرخی بەرز و بایەخی بێسنووری *شەرەفنامە*. دوای جۆن مالکۆلم، بە بیست ساڵێك مێژوونووسی فەرانسی (کاترمێر) لە زۆر شوێنی ئەو کتێبەیدا کە ساڵی ١٨٣٦ لە پاریس لە ژێر ناوی *مێژووی مەغولەکانی ئێران*دا بڵاوی کردۆتەوە کەلکی لە *شەرەفنامە* وەرگرتووە.

ڤاسیلێڤا بە درێژی باسی شوێنی *شەرەفنامەی* لە ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسدا کردووە. خ.د.فرین یەکەمین زانای ڕووس بووە کە ساڵی ١٨٢٦ لە یەکێك لە ڕۆژنامەکانی پیتەربورگدا باسی *شەرەفنامەی* وەك سەرچاوەیەکی مێژوویی یەکجار گرنگ کردووە[4]. لە پاشی سێ ساڵ دووبارە فرین لە

---

١- بە پێی ئەو زانیاریانەی لە بیبلیۆگرافیاکەی ژاکە موسەیلیاندا بلاو کراوەتەوە، هێربێلۆ لە پێنج شوێنی کتێبەکەیدا ل ٨٤١، ٨٣٦، ٨٠٧، ٧٠٦، ٣١٧، باسی کورد و *شەرەفنامەی* کردووە: (ژ.س موسەیلیان، بیبلوگرافیای کوردناسی بە زمانی رووسی مۆسکۆ، ١٩٦٣، ل٥٥).

٢- جۆن مالکۆلم ١٧٦٩.ك (١٨٣٣.ز) کاربەدەستێکی دیپلۆماسی بەریتانی ناسراوە؛ ماوەیەکی زۆر لە هیندوستان و ئێران کاری کردووە و شارەزاییەکی زۆری دەربارەی وڵات و گەلەکانی ڕۆژهەڵات هەبووە و گەلێك نووسراوی بە نرخی لە بارەیانەوە بەجێهێشتووە و کاتێك کە لە ئێران بووە، ژمارەیەکی زۆر سەرچاوە و دەسنووسی کۆنی دەستکەوتووە کە یەکێکیان *شەرەفنامە* بووە.

٣- J. Malcolm, The History of Persia From The Most Early Period to the present time, vol.٢ london, ١٨١٥ pp. ٢٠٧-٢٠٨.

٤- پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ لە یەکێك لە وتارەکانی ئەم دواییەیدا باسی ئەوەی کردووە کەوا یەکەم کەسێ کە بە درێژی ساڵی ١٨٢٦ دەربارەی *شەرەفنامەی* نووسیوە، م.ڤۆلکۆڤ بووە. بە پێی ئەم وتارەی مامۆستا کوردۆ جگە لە فرین ژمارەیەکی‌تریش لە ڕۆژهەڵاتناسەکانی ڕووسیا هەر لەو کاتەدا داوای بڵاو کردنەوە و گۆڕینی *شەرەفنامەی*ان کردووە

یەکێك لە نووسینەکانیدا باسی *شەرەفنامەی* کردۆتەوە و داوای کردووە بە زووترین کات فارسییەکەی بڵاو بکرێتەوە و بگۆڕدرێتە سەر زمانێکی ئەورووپایی.

زانا و کاربەدەستی ئەکادیمیا، ڤلیامینۆف زێرنۆف[1] ئەرکی بڵاوکردنەوەی *شەرەفنامەی* بە فارسی گرتە ئەستۆی خۆی و توانی ساڵی ١٨٦٠ بەرگی یەکەمی بە پێشەکییەکی بیست لاپەڕەیی بە نرخەوە بە زمانی فەڕانسی بڵاو بکاتەوە[2]. دوابەدوای ئەوە، بە دوو ساڵ بەرگی دووهەمیشی لەگەڵ پێشەکییەکی فەڕانسی حەوت لاپەڕەییدا بڵاو کردەوە[3]. جێبەجێ کردنی ئەم کارە ئەوەندە پایەی زانستی ڤێلیامینۆف زیرنۆڤی -لە ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسیدا- بەرز کردەوە کە نازناوی ئەکادێمی پێ درا. بەشێکی یەکجار پڕ کەڵك و گرینگی پێشەکییەکەی ڤاسیلیڤا بۆ باسی دەسنووسەکانی *شەرەفنامە* تەرخان کراوە کە ژمارەیان -وەك دەڵێت- یەکجار زۆرە. ژمارەی تۆمارکراوی *شەرەفنامە* تەنها لە کتێبخانە ناسراوەکانی جیهاندا دەگاتە ٢٢ دانە (ل ١٧). ئەمەش بێگومان بەڵگەیەکی ترە بۆ گرنگی *شەرەفنامە* کە وا دیارە زانایان هەر لە زووەوە بایەخێکی زۆریان پێداوە و ژمارەیەکی زۆریان لە سەر

---

(بڕوانە: ك.ك.کوردۆییف، کوردناسی، کتێبی موزەخانەی ئاسیایی لقی لینینگرادی دەزگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیای زانستی یەکیەتی سۆڤیەت، مۆسکۆ، ١٩٧٢، ل٣٨٦-٣٨٧).

١- ڤلیامینۆڤ زێرنۆڤ (ڤیلادیمیر ڤیلادیمیروڤیچ) ١٨٣٠.ك (١٩٠٤.ز) یەکێکە لە ڕۆژهەڵاتناسە ناسراوەکانی ڕووسیا کە شارەزاییەکی تەواوی لە مێژوو، تارکیۆلۆژیا و زماندا هەبووە و گەلێك زمانی دەزانی و ساڵی ١٨٦١ بە ئەندامی ئەکادیمیا هەڵبژێردرا. بەشی زۆری بەرهەمەکانی ڤیلیامینۆڤ زێرنۆڤ بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوو و زمانی گەلە ڕۆژهەڵاتیەکانی ڕووسیا تەرخان کراون. لە بەر ئەوەی یەکێك لەو زمانانەی زێرنۆڤ بە ڕەوانی دەیزانیی فارسی بوو، بڵاوکردنەوەی *شەرەفنامەی* پێ سپێردرا.

٢- لە لاپەڕەی یەکەمی بەرگی یەکەمدا بە زمانی فارسی نووسراوە: «جلد اول از کتاب شرفنامە تألیف شرفخان بن شمس‌الدین بدلیسی کە بە اهتمام اقل عباد ولادیمیر ملقب بە ولیامینوف زیرنوف در محروسە بطربورغ در دارالطباع اکادیمیەی امپراطوریة سنە ١٨٦٠ عیسوی مطابق سنە ١٢٧٦ هجری مطبوع گردید».

٣- لە لاپەڕەی یەکەمی بەرگی دووهەمدا بە زمانی فارسی نووسراوە: «جلد دویّم از کتاب *شرفنامە* تألیف شرفخان بن‌شمس‌الدین بدلیسی کە بە اهتمام اقل عباد ولادیمیر ملقب بە ولیامینوف زرنوف در محرووسە بطربورغ در دارالطباع اکادیمیە امپراطوریة سنە ١٨٦٢ عیسوی مطابق سنە ١٢٧٨ هجری مطبوع گردید».

نووسیوەتەوە[1]. بە پێی ئەو زانیاریانەی ڤاسیلیێڤا کۆی کردوونەتەوە، کۆنترین و بەنرخترین و ڕاستترین دەستنووسی زانراوی *شەرەفنامە* ئەو ژمارەیە کە بە دەستخەتی خودی شەرەفخان لە ژێر ناوی *شەرەفنامەی تاریخی کوردستاندا* نووسراوەتەوە و ئێستە لە کتێبخانەی بۆدلیان لە ئاکسفۆرد هەڵگیراوە. ئەم دەستنووسەی *شەرەفنامە* کەوتۆتە ٢٤٦ پەڕەوە و بە ٢٠ وێنەی نایاب ڕازێندراوەتەوە و لە کۆتایی زولحەججەی ساڵی ١٠٠٥ ك (١٣ی ئابی ١٥٩٧ ز)دا، شەرەفخان لە نووسینەوەی بۆتەوە. واتە ئەمە یەکەم ژمارەی نووسراوەی *شەرەفنامەیە*؛ چونکە شەرەفخان لە مانگی ئابی ساڵی ١٥٩٧ ز لە نووسینەوەی بەرگی یەکەمی کتێبەکەی و لە مایسی ١٥٩٩ ز شدا لە نووسینەوەی بەرگی دووهەمی بۆتەوە.

دووهەم ژمارەی بە نرخی دەسنووسی *شەرەفنامە*، ئەو ژمارەیە کە لە کتێبخانەی گشتی لنینگراد پارێزراوە. مێژووی نووسینەوەی ئەم دەسنووسەی شەرەفنامە، ساڵی ١٥٩٨ە و شەرەفخان خۆی سەیری کردۆتەوە و مۆری خۆی لەسەر داناوە. بەڵام ئەوەی تا ڕادەیەك لە نرخی کەم کردۆتەوە، ئەوەیە کە چەند شوێنێکی کەمی نەماوە[2].

دەسنووسێکیتری کۆنی *شەرەفنامە* کە ساڵی ١٦٠٦ لە شاری کلس لە لایەن حەسەنی کوڕی نوورەدینەوە لە بەر یەکەم ژمارەی *شەرەفنامە* بە بێ دەستکاری لە ٣٢٧ پەڕەدا نووسراوەتەوە، لە کتێبخانەی بۆدلیان هەڵگیراوە. جگە لەمانە ڤاسیلیێڤا باسی ژمارەیەکیتر لە دەسنووسە کۆنەکانی *شەرەفنامە* دەکات کە لە مووزەخانەی بەریتانی و کتێبخانەی ئەستەمبوڵ و هەندێك شوێنیتردا پارێزراون (ل١٧-٢٠).

تا ئێستە *شەرەفنامە* چەند جارێك لە زمانی فارسیەوە گۆڕدراوەتە سەر چەند زمانێکیتر. وەك ڤاسیلیێڤا دەیگێڕێتەوە: کۆنترین گۆڕینی *شەرەفنامە* ئەو دوو گۆڕینەن کە بۆ سەر زمانی تورکی -بە

---

١- زۆر لەوانەیە تا ئێستەش ژمارەیەکی زۆر لە دەسنووسە کۆنەکانی *شەرەفنامە* لە کوردستان وە یا لە هەندێك لە وڵاتەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەبن.

٢- ئەم دەسنووسەی *شەرەفنامە* یەکێك بووە لە دەستکەوتە بە نرخەکانی لەشکری رووس لە کاتی شەڕی رووس و فارسدا لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا (١٨٢٦- ١٨٢٨ ز) کە لە ئەردەبیلەوە لەگەڵ کتێبخانەی سەفەوێکاندا گواستوویانەتەوە پیتەرزبورگ.

جیا- کروان؛ یەکێکیان کورت کراوەی *شەرەفنامە*یە و ئەویتریان هەموویەتی و تا ئێستە دوو دەستنووسی یەکەمیان و دەستنووسێکی دووهەمیان دۆزراونەوە؛ بەڵام هیچکامێکیان بڵاو نەکراونەتەوە. کورت کراوەکەی *شەرەفنامە* لە لایەن محەممەدبەگی ئەحمەدبەگی میرزا ناوەوە ساڵی ١٠٧٨ی کۆچی (١٦٦٧-١٦٦٨ز) تەرجەمە کراوە و ئەویتریشیان لە ساڵەکانی هەشتای سەدەی حەڤدەهەمدا، لە لایەن سامی ناوێکەوە کراوە (ل٢٠-٢١).

دوای ئەوە بە دەوروبەری دووسەد ساڵێك، بەرگی یەکەمی *شەرەفنامە* لە لایەن یەکێك لە ڕۆشنبیرە هەرە زرنگەکانی سەدەی نۆزدەهەمی کوردستان (مەلا مەحموودی بایەزیدی)یەوە[1] بۆ یەکەم جار کراوە بە کوردی. مەلا مەحموود ئەم کارەی ساڵی (١٨٥٨-١٨٥٩) بە هاندانی کوردناسی بەناوبانگی ڕووسی «ئەلێکسەندەر ژابا»وە[2] کردووە و دەستنووسەکەی ئێستە لە کتێبخانەی گشتی لینینگراد هەڵگیراوە. هەر لەو دەوروبەرەشدا، لە ڤیەنا *شەرەفنامە* لە لایەن *هـ.ا.بارب*ەوە کراوە بە ئەڵمانی و بەرە-بەرە لە نێوان ساڵانی ١٨٥٣ و ١٨٥٩دا لەگەڵ پێشەکیەکی وەرگێڕدا، بڵاو

---

١- مەلامەحمودی بایەزیدی زانایەکی پایەبڵندی کوردە کە لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا لە دایك بووە. بایەزیدی جگە لە زمانی زگماکی خۆی، لە زمان و ئەدەبی عەرەبی و تورکی و فارسیدا دەستێکی باڵای هەبووە؛ شارەزایەکی گەورەی قورئان بووە و بۆ ماوەیەکی درێژ نەك تەنها لە بایەزیددا، بەڵکو لە هەموو کوردستاندا مەلایەکی کەم هاوتا بووە. مەلا مەحموود ژمارەیەکی زۆر بەرهەمی ئەدەبی و زمانەوانی کۆمەڵایەتی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە کە لە ڕووی زانستییەوە نرخێکی زۆر گەورەیان هەیە. م.ب.ڕۆدینکۆ لەم ڕووەوە نووسیوێتی دەڵێت: گەلی کورد لە پاراستنی گەلێك ڕووداوی بە نرخی ژیانی، زۆر قەرزداری مەحموودی بایەزیدییە. ئەگەر هەوڵ و تەقەلای مەحموودی بایەزیدی و ژابا نەبوایە ژمارەیەك لە سەرچاوە گرینگەکانی ئەدەبی کوردی سەدەکانی ناوەند تا ئەمڕۆش بە نەزانراوی دەمانەوە. «بڕوانەوە: ملا محمودی بایزیدی، *عادت و رسوماتنامه اکرادیه*، چاپی ڕوسی. گۆڕین و لێکۆڵینەوەی م.ب.ڕۆدینکۆ مۆسکۆ، ١٩٦٣، ل ٤. دەربارەی ژیان و کارەکانی مەلا مەحموودی بایەزیدی، بڕوانە پێشەکی ئەم سەرچاوەیە».

٢- ئەلێکسندەر ژابا کاتی خۆی قۆنسولی ڕووس بووە؛ لە نزیکەوە کورد و کوردستانی ناسیوە و گەلێك نووسینی بایەخداری لە بارەیانەوە بەجێ هێشتووە؛ وەك *جامعیی رسالیان و حکایتان بزمانی کورمانجی* کە بریتییە لە ژمارەیەکی زۆر پەند و چیرۆکی فۆلکلۆری کە کۆی کردوونەتەوە و کردوونی بە فەرەنسی و ساڵی ١٨٦٠ لە پیتەربورگ لە چاپی داون. ژابا هاوڕێیەکی نزیکی مەلا مەحموودی بایەزیدی بووە و بە یارمەتی ئەو توانیویەتی گەلێك دەستنووسی بە نرخ پەیدا بکات و لە گەلێك ڕووی زمان و ژیانی ڕۆشنبیری گەلی بکۆڵێتەوە. نووسینەکانی ژابا و ئەو سەرچاوە دەستنووسانەی لە بارەی کوردەوە کۆی کردوونەتەوە لە کتێبخانەی گشتی لینینگراد هەڵگیراون.

کراوەتەوە. دوای ئەوە بە ماوەیەك کارێکی زانستی یەکجار گەورە بە نیسبەت *شەرەفنامە*وە کرا کە بووە هۆی پێناساندنی تەواوی ئەم سەرچاوە کۆنە، لە جیهانی زانستی ڕۆژئاوادا. ئەوە بوو پرۆفیسۆر ف.ب.شارموا -کە ئەو کاتە وەك زانای هەرە فارسیزان لە ئەورووپا حیساب دەکرا- توانی لە نێوان (١٨٦٨- ١٨٧٥)دا تەرجەمەی فەڕانسی هەر دوو بەرگەکەی *شەرەفنامە* لە پیتەرزبورگ بڵاو بکاتەوە؛ کە بریتی بوو لە بەرهەمی ٣٠ ساڵ کاری بێ وچانی. شارموا چاپەکەی ڤیلیامینۆف زیرنۆڤی بۆ تەرجەمەکەی کردبووە بنچینە و کەڵکیشی لە دوو دەسنووسی کۆنی *شەرەفنامە* وەرگرتبوو.

ئەم چاپە فەڕانسیەی *شەرەفنامە* کەوتۆتە چواربەرگی سەربەخۆوە: بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی ساڵی ١٨٦٨ و بەشی دووەمی بەرگی یەکەمی ساڵی ١٨٧٣ و بەشی دووەمی بەرگی دووەمی ساڵی ١٨٧٥ لە چاپ دراون (ل٥٤٩،٢١).

شارموا لە تەرجەمەکەیدا پەیڕەوی مەرجە زانیاریەکانی گۆڕینی کردووە. بیری خۆی و ئەو ڕاست و ڕوون کردنەوانەی بە پێویستی زانیون، لە پەراوێزی کتێبەکەدا بڵاوی کردوونەوە. جگە لەوەش پێشەکیەکی بۆ نووسیوە کە تێیدا باسی *شەرەفنامە* و هەندێك ڕووی ژیانی کورد و جوغرافیای کوردستانی کردووە. ڤاسیلێڤا لەگەڵ ئەوەشدا کە چەند ڕەخنەیەکی لە پێشەکیەکەی ف.ب.شارموا گرتووە، دان بەوەدا دەنێت کە تەرجەمەکەی تا ئەمڕۆش نرخی زانستی خۆی لە دەست نەداوە (ل٢٣).

دوابەدوای ئەم زانیاریە بەنرخە کەم زانراوانە، ڤاسیلێڤا دەکەوێتە هەڵسەنگاندنی *شەرەفنامە* و بیری خۆی -وەك ڕۆژهەڵاتناسێك- دەربارەی سەنگ و بایەخی دەردەبڕێت و دەڵێت: نرخی زانیاری ئەم سەرچاوەیە ئەوەندە زۆرە کە پێویستی بە پیاهەڵدان نیە. هیچ نەبێت بە یارمەتی *شەرەفنامە* دەتوانرێت جێگەی گرنگی ون بووی گەلی کورد لە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دیاری بکرێت (ل٣٧)؛ ئەمەش بێگومان لە نرخاندن نایەت؛ چونکە: گەلی کورد، هەر وەك چۆن ڕۆژهەڵاتناسی هەرە بەناوبانگی ڕووسیا و سۆڤێت (ئۆربێلی[1])

---

١- ئارکیۆلۆژ و مێژوونووسی بەناوبانگی سۆڤێتی، یوسف ئەبگارەڤیچ ئۆربیلی ١٨٨٧.ك (١٩٦١.ز)، یەکێکە لەو زانا پایەبڵندانەی بە قووڵی لە زمان و مێژووی گەلی کورد و باری ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی تێگەیشتووە و خزمەتێکی زۆری کوردناسی کردووە و لە پێگەیاندنی ژمارەیەك لە زانا کوردەکانی سۆڤێت دەستێکی زۆر باڵای هەبووە.

دەڵێت: «کارێکی یەکجار گەورەی کردۆتە سەر ڕۆشنبیری ڕۆژهەڵات و ئەم گەلە زۆر لە ڕۆڵەکانی خۆی لە ژێر ناوی فارس و تورك و عەرەب و ئەرمەندا لە دەست داوە. بەوەی ناویان وەك شاعیر و مۆسیقار و جەنگاوەری نەمر، مێژووی چەند میللەتێك دەڕازێننەوە و ئەمەش کارێکی وەهای کردووە لە زانستی ئەورووپا و ڕووسدا وەها باو بێت کە گوایە کورد نەك تەنها ناتوانێت شتێکی نوێ لە ژیانی ڕۆشنبیریدا بێنێتە کایەوە، بەڵکو توانای ئەوەشی نیە تەنانەت لە بێگانەشەوە هیچ فێر بێت». بەڵام وەك ڤاسیلیێڤا دەڵێت بە یارمەتی *شەرەفنامە* دەتوانرێت ئەم کەلێنە گەورەیە لە مێژووی گەلانی ڕۆژهەڵاتدا پڕ بکرێتەوە و شوێنی ڕاستەقینەی نەتەوەی کوردی تێدا دیاری بکرێت.

یەکێك لەو ئەنجامە گرنگانەی کە زانای سۆڤیێتی (ژ.ڤاسیلیێڤا) لە بارەی ناوەرۆکی *شەرەفنامە*وە پێی گەیشتووە بریتیە لە دەست نیشان کردنی ڕاستی ئەوەی کەوا ئەم سەرچاوە مێژووییە ڕەسەنە، یاریدەی کوردناسان دەدات کە بە شێوەیەکی قووڵتر لە زۆر رووی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەمڕۆی کورد تێبگەن (ل ٦٧). ئەم بیرەی ڤاسیلیێڤا زۆر ڕاست و دروستە؛ چونکە *شەرەفنامە* گەلێك ڕووی گرنگی خەباتی سەختی نەتەوەی کوردی لە سەدەکانی ڕابوردوودا تۆمار کردووە کە لای مێژوونووسی خۆ و بێگانە نەزانراوبوون و تەنانەت تا ئەمڕۆش بە تەواوەتی نەزانراون و ئەمەش هۆیەکی گەورەی تێنەگەیشتنی جووڵانەوەی ئازادیخوازی نەتەوایەتی گەلی کوردە لە لایەن بێگانەوە.

ڤاسیلیێڤا پتر لە سەدوبیست لاپەڕەی بە ئینگلیزی لە کۆتایی کتێبەکەی، بۆ تێبینی و ڕوون کردنەوە و هەڵە ڕاست کردنەوە و بەراورد کردن و سەرچاوە و مەڵبەند و کورتە باسێك لە بارەی *شەرەفنامە*وە، نووسیوە و هەموو ئەمانەوە بێگومان ئەوندەیتر نرخی زانیاری کارەکەیان بەرز کردۆتەوە. شایەنی باسە ڕۆژهەڵاتناسی سۆڤیێت هەر زوو بایەخی بەم کارەی ڤاسیلیێڤا دا و بە دەستکەوتێکی دیاری کوردناسی لە قەڵەم دا.[1]

---

١- بڕوانە: گۆڤاری *گەلانی ئاسیا و ئەفریقا* (بە زمانی ڕووسی) ژمارە ٦، ساڵی ١٩٦٨، ل ٢٠١، ٢٠٢. ئەم گۆڤارە دانی بەوە داناوە کە تەرجەمەکەی ڤاسیلیێڤا لە هەموو ڕوویەکەوە تەواو و بێگەردە و ئەمەی بە دەستکەوتێکی گرنگی ڕۆژهەڵاتناسی سۆڤێت داناوە.

زانای ئازەریش دوکتۆر محەمەدی شەمسی -جگە لە نامەی دوکتۆریەکەی- زنجیرەیەك وتاری زانستی لە بارەی شەرەفخان و *شەرەفنامە*وە بڵاو کردۆتەوە؛ وەك: *مێژوونووسی کوردی بەناوبانگ شەرەفخان بدلیسی*[1] و *باسی ڕاپەڕینەکانی سەدەی شازدەهەمینی هۆزە کوردەکان لە شەرەفنامەدا*[2]. دوکتۆر شەمسی لە نامەی دوکتۆرێکەیدا بە درێژی باسی ژیان و بەسەرهاتی شەرەفخان و باری ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردستان لە سەدەی شازدەدا دەکا و لە ناوەڕۆکی *شەرەفنامە* دەدوێ. بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم باسانە ژمارەیەکی زۆر سەرچاوەی کۆنی وەك *نزهتالقلوب*ی *حمدالله القزوینی* و بەرهەمی ژمارەیەك مێژوونووسی سەردەمی شەرەفخانی بەکار هێناوە؛ وەك قازی ئەحمەدی غەففاری.

دوکتۆر شەمسیش - هەر وەك ڤاسیلیێڤا- بە درێژی باسی گرنگی *شەرەفنامە*ی کردووە و دەڵێت کەوا مێژوونووسەکانی دوای شەرەفخان بۆ وێنە کاتب چەلەبی و ئەولیا چەلەبی و گەلێکیتر، لە بەرهەمەکانیاندا لە سەرچاوەیەك زیاتر *شەرەفنامە*یان بە کار هێناوە. هەروەها ئەو هەڵەیەشی ڕاست کردۆتەوە کە هەندێك مێژوونووس لەو بارەیەوە کردوویانە؛ کە گوایە شەرەفخان کتێبەکەی بە هاندانی شای ئێران داناوە[3]. لە ڕاستیدا شەرەفخان لەو کاتەدا کە *شەرەفنامە*ی داناوە، زۆر لە سوڵتانی عوسمانیەوە نزیك بووە و بە پێی قسەکانی دوکتۆر شەمسی، عوسمانیێکان تەنانەت یارمەتیشیان داوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمەش زۆر گرنگە کە لە ناوەڕۆکی *شەرەفنامە*دا -تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر- هەست بە بێلایەنی و لانەدان دەکرێت؛ بۆ وێنە شەرەفخان بە یەك جۆر بە شان و باهۆی شاتوهماسب و سوڵتان موڕادی سێهەمیدا هەڵداوە و خۆی لەوە کەڕ کردووە کە ئەو جووتە شێر و تیریان لە یەك دەسوو. جگە لەمە شەرەفخان لە سەرەتای کتێبەکەیدا بە شێوەیەکی ئاشکرا و

---

1- بڕوانە گۆڤاری *هەواڵەکانی کۆڕی زانیاری ئازەربایجانی سۆڤێت* (بە زمانی ڕووسی و ئازەری) ژمارە ١، ساڵی ١٩٦٧، ل ٦٧-٧٢.

2- هەمان گۆڤار، ژمارە ١، ساڵی ١٩٦٨، ل ٤٠-٤٦.

3- بۆ وێنە بڕوانە: شاکر خصباك، *الکرد و للمسائلة الکردیة*، بغداد، ١٩٥٩، ل ١٥. بە بیری دوکتۆر شاکر خصباك گوایە شەرەفخان *شەرەفنامە*ی بە هاندانی شاعەباسی دووەم داناوە؛ لە کاتێکدا کە شەرەفخان هاوژینی شاعەباسی یەکەم بووە!

سەرنجڕاکێشەر بەم جۆرەی لای خوارەوە باسی ئەو هۆیەی کردووە کە بۆ دانانی *شەرەفنامە* پاڵی پێوە ناوە؛ دەڵێ: چونکە مێژوونووسان تا ئێستا هیچیان لە بارەی کورد و کوردستانەوە نەنووسیوە، من ویستم بە پێی توانا لەو بارەوە کتێبێك بنووسم و ناوی لێ بنێم *شەرەفنامە*؛ هەموو ئاواتیشم هەر ئەوەیە کە خانەدانە گەورەکانی کوردستان ناویان گوم نەبێت. کەواتە بەر لە هەموو شتێك و پتر لە هەموو هۆیەك، گیان و هەستی کوردایەتی شەرەفخانیان جووڵاندووە و بەڵگەی ئەمەش هەر لە ناو *شەرەفنامە* جارەهای جار بەرچاو دەکەوێت. بۆ وێنە لە سەراپای *شەرەفنامە*دا هەست بەوە دەکرێت کەوا خاوەنەکەی بە ئاشکرا یا لە ژێر لێوەوە و لە ژێر پەردەی هەڵدان بە شانوباهۆی سوڵتانەکاندا دەڵێت: «کوردستان وڵاتێکە بە کەس داگیر ناکرێت و سەر بۆ کەس شۆڕ ناکات».

سەرەڕای هەموو ئەمانە، شەرەفخانی بدلیسی یەکەم کەسە کە هەوڵی داوە بە شێوەیەکی ڕاست و بێپێچ و پەنا، دەستکاری سنووری کوردستان دیاری بکات. بەر لە شەرەفخان و بە تایبەتی لە سەردەمی سەلجووقییەکانەوە، کوردستان بەو مەڵبەندانە دەوترا کە کەوتبوونە نێوان ئازربایجان و لوڕستان و ڕۆژئاوای زنجیرە شاخەکانی زاگرۆسەوە؛ بەڵام لە *شەرەفنامە*دا سنووری کوردستان لە مەلاتییەوە دەست پێ دەکات و لە سەر ڕۆخەکانی خەلیج کۆتایی دێت[1]. یەکێك لە ڕووە گرنگەکانی کارە زانستییەکەی دوکتۆر شەمسی لە بارەی *شەرەفنامە*وە ئەوەیە کەوا بە یارمەتی ئەم سەرچاوەیە و لە بەر ڕۆشنایی ڕێبازێکی زانیاری ڕاست، توانیویەتی چەند لایەکی پڕ پێچ و پەنا و کەم زانراوی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و چەند ناوچەیەکی کوردستان لە کۆتایی سەدەکانی ناوەندیدا دیاری بکات. زانیارییەکانی ناو *شەرەفنامە* وا دەردەخەن کەوا بناغەی ژیانی ئابووری میرنشینی بدلیس لە سەدەکانی ناوەندا، لە سەر جۆرێ خاوەن مۆڵکێتی پچووك دامەزرابوو. چەوساندنەوەی جوتیاریش قاڵبی تایبەتی خۆی وەرگرتبوو؛ بەوەی لە سنووری تەنها بەرهەم هێناندا نەمابوو؛ بەڵکو جووتیار دەبوو جگە لەوەش پارێزگاری بەرژەوەندە سیاسیەکانی سەرۆکەکانی بکات؛ بە بەشدار بوون لە هەموو شەڕەکانی ئاغایدا؛ کە هەندێکیان بریتی بوون لە شەڕی دەرەبەگایەتی نێوان سەرۆکە کوردەکان. بۆ دواجار لە کوردناسی سۆڤیێتدا، مامۆستا قەناتی کوردۆ (کوردوییڤ) لەو وتارەیدا کە لە ژێر ناوی

---

١- لە ڕاستیدا هەموو ئەمانە نیشانەی ئەوەن کەوا لە سەدەی شازدەدا- سەرەتای دروست بوونی هەستی نەتەوایەتی- ئەم تایبەتیە لە ناو سەردارە کوردەکاندا لە ئارادا بووە.

کوردناسی ساڵی ١٩٧٢ بڵاوی کردۆتەوە[١]، باسی *شەرەفنامەی* کردووە. بە تایبەتی دەستنووسە کۆنەکانی کە لە ئارشیفەکانی لینینگراد پارێزراون. وەك قەناتی کوردۆ باسی دەکات، م.ڤۆلکۆڤ یەکەم کەس بووە کە بە درێژی لە ساڵەکانی بیستی سەدەی نۆزدەدا -لە چەند لاپەڕەیەکدا- وەسفی ئەو دەستنووسانەی کردووە و خ.دفرێنیش یەکەم کەس بووە کە هەر لەو دەورو بەرەدا لە وتارەکانی خۆیدا باسی گرنگی پێویستی بڵاو کردنەوە و گۆڕینی *شەرەفنامەی* کردووە[٢]. دوای ئەوە مامۆستا قەناتی کوردۆ دێتە سەر باسی مێژووی لێکۆڵینەوەی *شەرەفنامە* لە لایەن ڕۆژهەڵاتناسەکانی ڕووسیا و سۆڤێتەوە؛ وەك لە سەرەوە باسمان لێ کرد.[٣]

بەم جۆرە وەك دەبینن *شەرەفنامە* شوێنی شایانی خۆی لە کوردناسی سۆڤێتدا کردۆتەوە و ئەو ڕاستیانەش کە لە سەرەوە باسمان کردن، وا بزانم تا ڕادەیەك یارمەتی دیاری کردنی نرخی زۆری ئەم چاپە کوردیەی *شەرەفنامە* دەدەن.

بێگۆمان مامۆستا هەژار بەم کارە گرنگ و بایەخدارەی کەلەبەرێکی گەورەی لە کتێبخانەی کوردیدا پڕکردەوە و کۆڕی زانیاری کوردیش بە بڵاوکردنەوەی ئەرکێکی گرنگی سەرشانی بەجێ هێنا.

---

١- بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٨.

٢- ك.ك.کوردۆییڤ، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٣٨٦-٣٨٧.

٣- ئەم بەشە لە ژێر چاپدا بوو کە نووسەر، کتێبێکی بە زمانی ئازەری لە دوکتۆر م.شەمسی، بەم ناوەوە وەرگرت: *شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی وەك سەرچاوەی مێژووی گەلی کورد*. بەم جۆرە نامەی دوکتۆریەکەی د.شەمسیش وەك کتێب بڵاو بووە و ئەمەش بێگومان بۆ کوردناسی سۆڤێت دەستکەوتێکی نوێیە. کتێبەکەی دوکتۆر شەمسی سەد و چل و چوار لاپەڕەیە و ١٧٠٠ دانەی لێ چاپ کراوە و دانەری کەلکی لە ١٣٤ سەرچاوەی هەمەجۆر وەرگرتووە؛ کە ناوەکانیان لە کۆتایی کتێبەکەدا تۆمار کراون.

# شەرەفنامە

## مێژووی ماڵەمیرانی کوردستان

میر شەرەفخانی بدلیسی

وەرگێڕانی
مامۆستا هەژار

## سەرەتا

### بە ناوی خودای دەهندە و دلۆڤان

سەرەتای وتارم بە سوپاسی ئەو خودایە دەست پێ دەکا، کە پەسندی ئەو لە دڵی رووناکەوە وەك رۆژی بە تیریژ، زەوی و عاسمان دەتەنێتەوە. ئەو خاوەن شکۆیەی کە هەموو پایەبەرز و سەربڵندێك لە سەر و ژێر رێسمەی دەرگانەی ئەودا، بە لارەملی و سەرکزی سەر دەنێتەوە.

شیرینکارێکە، دەفرێکی گڵینی بۆ داڵدەو پەسیوی گیانی نادەم، لە قوڕ و لیتە هەڵخستۆتەوە و بە تینی تیشکی بەزەیی خۆی، وشکی کردۆتەوە و بە چاو پێداخشاندنێك، وەهای مشت وماڵ داوە و ئەوەندەی رێز لێناوە کە شیاوی کۆڕی بارەگای پڕ شکۆی خۆی بێ و لە بەرە ژوورتر لە نۆپلەی تەختی یەزدانیدا جێگەی بۆ کردەوە و بە شانازیەوە ڕایناوە.

دەس ڕەنگینێکە، لە خاکی ڕەشی نمناك، سکەیەکی وای داڕشتووە کە بە هەزاران هەزار بە بار و بە خەڵوار مرواری و گەوهەر -لە بازاڕی دوڕناساندا- بە قولەقاپەی ڕاناگەن و دەسکی لە دوو ناکەن.

باڵا دەستێکە، ئەو پادشاو خان و بەگلەر و سەردار و سەروەرانەی کە بە لووتبەرزی و فیز و شانازیەوە لە سەر ژێردەستان خۆ ڕادەنێن و تیز بەم و بەو دەکەن، لە بەرانبەر هێز و دەسەڵاتی ئەودا رووت و نابووت و کەساس و بێ‌نەنوان. ئەو گەدا و بێ‌نەوایانەی کە چاوی چاکەیان لە دەستی بەخشندەی خودای تاکە و دەستی نیازیان تەنیا بەرەو بارەگای شکۆداری ئەو بەرز دەکەنەوە و بەس و لەو پێوە کاریان بە کەس نەماوە، ئەگەرچی لە ڕواڵەت و لە دیمەندا بێ‌پایە و مایە و بێ‌سەرە و بەر و شپرزە و پەرێشانن، بەڵام لە ڕاستیدا پادشای سەربەرز و دڵخۆش، هەر ئەوانن.

هەر خۆیەتی هێندێکیان بۆ ماوەیەك بەرز دەکاتەوە و بە سەر کۆمەڵێکیاندا زاڵ دەکا و بۆ ئەزموون و بەڵگە لێ دەرخستن، پەتیان بۆ شل دەکا و سەردەمێك خۆیان لێ دەبوێرێ و لە ئەنجام و ئاکامدا پێمێری گیانکێشانیان بۆ دەنێرێ و لە گۆڕی ژیانیان وە دەر دەنێ و گۆڕی جیهانیان لێ هەڵدەوەژێرێ و بە گۆڕی تەنگەبەر و گۆڕیچەی سەنگەسەر و تاریکیان دەسپێرێ و لە ڕۆژی پرسینەوەدا پاك و پووکیان لێك هەڵداوێرێ و لە بەردەمی دادگای بەرزی خۆیدا بێڕوودەروایسی و بێکەمایەسی چاکە و خراپەکانیان بۆ دەژمێرێ؛ ساغ و پتەویان دەکاتە نەمامی بەهەشت و دەغەڵ و گەندەڵیان بە بەرکڵی دۆزەخەوە هەڵدەپەسێرێ.

کارنەخشینێکە، هەر لە تاکە جووتێکی نێر و مێوە، گەلێك تیرە و هۆزی جۆربەجۆر و سپی و سوور و زەرد و بۆر و ڕەش و گەندمی لە بنەچەکە و ڕەگەزی ئادەمی هەڵخستۆتەوە؛ بۆ ئەوە کە خۆی و خۆیان بناسن. هەر کەسە -بە پێی پێداویستی ژیان- فێری شتێك کراوە و چەشنە زانستێکی وەپاڵ نراوە و ئەرکی فەرمانێکی شایانی پێ سپێراوە تا کاروباری ژیان لە هەموو سەرێکەوە ڕێك بێتەوە و بەند و شیرازەی ژیاننامەی مرۆڤایەتی لە بەر یەك هەڵنەوەشێ و لێك نەبێتەوە و ئەم داموودەزگا گەورە و گرانە و ئەو خانەدانە پڕخێزان و ئاوەدانە، ئاورگی پڕ پەرەنگی دانەمرکێتەوە. دڵ و دەروونی کیژ و کوڕی لە تین و گڕی ئەوین پڕکردووە و بە تیشکی تاسەی پێك گەیینی داگرساندووە. دەردی ژانی لە ژن -بە هەزار ڕەنگی دلڕفێن- ڕەنگاندووە و شەکەتی و ماندووبوونی بێبڕانەوەی، بە پیاو سەلماندووە. هەر بۆیە کە پێت و بلێسەی کوانووی ئەم ژیانە لە سەر ڕووی ئەم جیهاندا هەر بگەشێتەوە و هەرگیز نەکوژێتەوە.

| | |
|---|---|
| هەر لە خۆت جوانە گەورەیی کردن | گەردن کەچی تۆن ژیان و مردن |
| نەوی کردن و بەرزی لە تۆیە | ژیان لە تۆیە بە تان و پۆیە |

## پەسنی پێغەمبەر

درود و ئافەرینێك کە هەرگیز لە بنە نەیە و سەروبنی دیار نەبێ، بۆ دیداری پاکی ئەو پێغەمبەرە دیاری بێ کە فەرموویەتی: پێغەمبەر بووم و هێشتا بابەدەم لە ناو ئاو و لیتەدا دەتلایەوە. ئەو

پێغەمبەرەی کە خودای بانی سەر دواندوویە و دەبارەی ئەو گوتوویە: تۆمسان هەر بۆیە نارد و ئەسپاردەمان بە تۆ ئەسپارد، کە ببیە مایەی سەروەری و بەختەوەری و نموونەی دادگەری بۆ هەموو ئافەریدەیەك.

پێغەمبەرێ کە بە میوانی بۆ سەر خوانی دیوەخسانی یەزدانی مەزن لە سەرووی نۆ نهۆمی عاسمانان بان کرا. بە درێژایی رێبازی -بۆ بەخێر هێنان و پێشوازی- هەر نۆ گومبەزی تەرز و بەرزی بۆ رازایەوە و چراخان کرا. فریشتەکەی بەهەشتەکەی خودا -کە بوراقی ناو نراوە- دیمەنی ئەسپی باڵداری پێدراوە، بۆ گەشتی دەشت و چۆڵی بێ تۆز و خاك و خۆڵی بەرەو خێوەتی شین، بە زین کراوی لە سەرزەوین ئامادەکرا و فەرمانی بزووتنی پێدرا. چاپوك سواری نازدار -بە تەیاری و چەلەنگی- مامزە و ئاوزەنگی لێ بزاوت و بە حاستەم تەرادی هەنگاوت. ئەسپی باڵداری خۆش رەوتی وەخۆ کەوت و لە بای شەماڵ رەوانتر و زۆر لە خەیاڵ تیژباڵتر، نێوانی دەپێوان و بە خۆشبەزی و گورو و تاوی، تەوس و پلاری دەهەرەتی چاو دەگرت. چوارناڵەی گاڵەبێکی وای دەکرد، رێی لە گەرانی مانگ و خۆر دەبرییەوە و بە پەلکەی یاڵ و بژان، دەنکە فرمێسکی قەتیس‌ماوی لە چاوی ئەستێران دەسرییەوە. ئەوەندەچالاك و بەکار بوو کە جوبرایلی جلەودار، دەگەڵی دەرنەبرد و سەرەوودەری دەرنەکرد و بینی تەنگ و پشووی سوار ببوو؛ لە نیوەی رێدا بەجێما و لە سوێی ئەو نیوە و نیوەچڵیە، هەر ئاخ و داخی پێما.

لە شەورۆیی خۆشت کە جبرەیل بە جێما    ورەی بیری پێشەوبرەی تۆ بە کێ ما؟

فریشتە شۆخ و شەنگ و قۆزەکەی بەر رکێفی خۆشەویستی خودا -لە فەر و پیتی سوارە بە ودم و پیرۆزەکەی- جارلەجار مەست و سەرخۆشتر و سەر و دڵخۆشتر و خۆشبەز و باوخۆشتر دەبوو. لە گەرمەی هاتوچۆ و رمبازیدا، شانازی بە خۆی دەکرد و دەهاتە بیری کە دار پیر دەبێ و جارێك بازی بە سەرەوە دەنیشێ؛ با دار کرمۆڵ و دەغەزدار بێ و با باز نازی لێ بشێوێ. پیرۆزەش ئەگەر بەختەوەر با، سێبەری سمی منی بە سەر خۆیەوە دەدیت کە سێبەری خۆشەویستی خودام بە سەرەوەیە. شۆرەسواری میوان لە بەر دەروازەی خانەدانی خانەخوێی مەزنی خۆی، زەنگۆی بە تاڵ کرد و بەرەو ماڵ و بە سەر باڵی پەریەکانی پاسەوانە تایبەتیەکانی بارەگای یەزدانیدا -کە ببووە

پایەنـدازی- وردەهـەنگاوی هەڵـدێنا تـا گەیـشتە جێگـەی دیـاری کـراوی کـە ژێکـەوانێك و بگـرە کەمتـریش، لە بینایی چاوان و داهێنەری گیانلەبەر و بێگیانـان نزیـك کەوتـەوە. ئـەو جێگـەی لـەو دیدارەدا بەو درا -هەتا دنیا دنیایە- کەس ڕێی تێ ناکەوێ؛ تەنانەت کەس ڕێی ناکەوێ خەونیش بـەو پایە و شکۆیەوە ببینێ.

| | |
|---|---|
| لـــە بـــەر ئـــەو کران عاسـمان و زەوی | لە بەر ئەو تەمی کـفـر و چەوتی ڕەوی |
| زەوی کـــاتـــێ زانـــی پلەی ڕێزی خـــۆی | کە پێغەمبەری گرتـــە هـــامـــێـزی خۆی |
| بـــلـــنـــد پـــایـــەتر بوو لە هەر سەروەرێ | بە گەورەییەکـەی خوا مەگـیـن پەی بەرێ |
| هەتا چەرخ و خـــولـــیـــە زەمـیـن و زەمان | بە قەد پەلکی داران و ڕەمـــلـــی چـەمان |
| بە قەد بەفر و باران، گیا و ئـــاو و خـــاك | درووود بـــێ لـــە دیـداری ئەو گیانی پاك |

## پەسنی سوڵتان

هەروەها لە پاش سوپاسی خودا و پێهەڵگوتنی پێغەمبەری مەزن، دەمەوێ سوپاسی پادشـای خۆشـم بکەم. ئەو پادشایەی کە گومبەزە شینەکەی کاکێشانی عاسـمان -بەو هـەمـوو دووری و بەرزییـەوە و بەو هەموو ڕێکی و تەرزییەوە- کەمتـرین خـەمڵ و خـشڵی سـەردەرانەکەیەتی. خونکـاری سـەیوانی چوارەم -کە ناوی خۆرە و بەخشینی تیشك و تیـرێژی حەوڕەنگ نەخشینی بێبڕانەوەیـە و هـەتا بڵێـی زۆرە- لە ڕیزی بێڕێزترینی دەرکەوانان و پاسەوانانەکەیەتی. پوخت و پـاراوی هەڵبـژێراوی ڕەچـەڵاکی شاگەورەکانە؛ نەتەوەی پاکی بنەماڵەی خانەدانە هەرە سایەچەورەکانە. داڵدەو پەنا و پەسیوی کیسرایە و بۆ قەیسەران جێگەی هومێد و هانایە. پادشایانی چیـنوماچیـن دەکەونـە دەسـت و پایـەوە؛ کـاری سوڵتانان ماچ کردنی لاشیپانە و سەردەرانەی دەرگایەتی. سوننی مەزەبان دەپارێزێ و لە گومڕا بوون و گوناهیان دڵی دەبێزێ. هەر چیەك بدرکێنێ، کەس لە گفتی دەرناچێ. بە ڕاستەوچۆیەدا هـەر زۆردار و تاوانبـاران دادەپاچـێ. هـەژاری و خـەمباری لـە شارادا نەهێـشتووە و سـێبەری شـاباڵی بـەزەیی و بەخشندەیی، بە هەموو کەلوکولێنێك گەیشتووە. سەرۆکی دین و دنیایە و بەختەوەری هەر دوو لایـە. خاوەنی دوو دەریا و دوو بەژانە؛ کۆیلە و مفردی مەکە و مەدینانە. دووەمیـن ئەسکەندەری شـاخدارە

و سێهەمیــن عومەری لە خواترس و پارێزگارە. لە سایەی ئەوڕا، دنیا زۆر هێدی و هێمن و ئارام و بێ دەردوژانە. باوکی بێکەس و بێچاران سوڵتان مــحەمەدخانە[1]؛ خوا ڕاوەســتاوی کــاو دەس دەبــن بــاڵی گرێ...

چــۆن پــێت هــەڵبــڵێم ڕۆژی تیــشکدەر؟ — خــۆزگە بەو کەسەی سایەی تۆی لە سەر

خوا بــە هــۆی تــۆوە شادی بۆ ناردین — ئێــمەی خۆش دەوێ بە تۆی ئــەسپــاردین

## پەسنی مێژوو

لە لای ئەوانەی کە زۆر زرینگ و ژیرن و وردەکارن و دوور ئەبینن و بــە ڕاوبیــرن، زۆر ئاشــکرایە کــە هەموو نووسەرێکی لە زەبر و هەموو زانایەکی زۆرزان و دەمڕاست و هەموو ئاگادارێك لە بەســەرهاتی ڕابردووان، لای وایە مێژوو پڕیە لە ئامۆژگاری بە سوود و تۆی لــە ڕێــشاندانی بــە کــەڵك و بەهرەیــە. بەسەرهاتی ڕابردووانــمان بیــر دەخاتەوە و دووری کەونارامان لێ نزیــك دەکاتــەوە و خــۆ بــە تایبــەتی ئەگەر ئەو سەربەورد و ڕووداوانەش، دەم و ڕاوێژ خۆشــان بیگێڕنــەوە و میــرزا چــاکی دەســتوقەڵــەم ڕەنگیــن، ڕووبەڕی کتێبــانی پــێ بنەخــشێنن، دەربــارەی ئــەم تــەرزە دیرۆکانەیــە مــحەمەد کــوڕی خواندشاکوڕی مەحــموود کە بە میــرخواند بەناوبانگە و خــاوەنی تاریــخی «روضتالصفا»یــە، لــە پێشەکی کتێبە هێژا و بە نرخەکەیــدا دەڵــێ: خوێندنــەوەی مێــژوو لــە دەســەرانەوە بــەهرە بــە پیــاو دەگەیەنێ:

١- زانستە بۆ مرۆ.

٢- ئاگاداری و خوێندنەوە، ئاوەدەنگی و خەمڕەوێنە.

٣- ڕێگەی دوور بۆ پیاو نزیك دەکاتەوە و کۆسپ و دژواریش لە ڕێ لا دەدا.

٤- ڕاست و درۆ لێك هەڵدەوێژێرێ و ناڕەوا لە ناو ڕەوا دەبژێرێ.

٥- فرەی هەڵسەنگاندن و بەراورد کردن تێدایە. زانایان گوتوویانە: ئەزموون پیــاوان زانــا دەکــا؛

---

[1] ١- مــحەمەدخانی سێهەم، کوڕی سوڵتان مرادی سێهەم و سێزدەهەمیــن سوڵتانی عوســمانیە. لە ســاڵی ١٠٠٣وە تــا ١٠١٣ پادشایەتی کردووە.

تاقی کردنەویان بە لکێك لە دەلکی زانست زانیوە. پیاو بە مێژوو خوێندنەوە، زۆر فێری لێکدانــەوە و تۆژیــنەوە و ئەزموون دەبێ.

٦- مێژووزان کەمتــر کاری بە پرسیاری لای ئەم و ئەو دەبێ؛ چونکە مەبەستەکە لە بەر دەســتە و بۆی دەڕوانێ و خۆی دەیزانێ.

٧- گەورەپیاوان کە دەگەڵ کاری گران و دژواردا ڕووبەڕوو دەبن، بە خوێندنــەوەی مێــژوو کــوڵی دڵیان دادەمرکێ و ئارامی ڕوویان تێ دەکا.

٨- مێژووناسیــن ژیری و وریایی بۆ پیاو زیاد دەکا و ئاراستەی ڕاوێژ و بیــری ڕاستی دەکا.

٩- ئاگادار لە مێژوو هەمیشە پشوو درێژ و لەسەرخۆیە.

١٠- سەرداران و زۆرداران لە بەسەرهاتی ڕابردووانەوە، بالاّدەستی و دەسەلاّتی خودای مــەزنیان دێتەوە بیــر و بە هێزوگوڕی خۆیان بادی هەوا نابن و بــە ملــهوڕی و لاســاری لــە ڕێ لانــادەن و بــاش تێدەگەن کە نە خۆشی هەتا سەرە و نە ناخۆشی. هەر سەبارەت بەم مەبەستەشە کــە پادشــای هــەموو پادشایان لە قورئانی پیــرۆزدا فەرموویەتی: «بە ڕاستی لە چیــرۆکیاندا، پەند هەبوو بۆ خاوەن دڵان.»

## من و ئەم کتێبە

من کە نووسەری ئەم ڕووپەڕانەم و ناوم شـەرەف کـوڕی شەمـسەدینە و چـاوم لـە بـەزەیی خودایـە و هومێدەوارم کە ئاریکارم بێ و لەم دنیایەدا سەرفراز بـم و لە کێـشەی ئـەو دنیـاش ڕزگـارم بـێ، لـە هەرەتی جوانی و هەرەمەی بەهاری ژیانـمدا، لە دوای ئەوە کە دەستی ڕاست و چەپی خۆم ناسی و لـە خوێندەواریدا هێزوپێزم پەیدا کرد و هـەزارە و دوولایی زانـستـیە ڕواڵـەتی و نهێنیەکانـم یـەك لا کردەوە و هەرچی بۆ دنیا و دینم پێویست بوو، لە هەر شـتەی زۆر شـتم زانـی و بـە سـەر ڕاسـتی و کارامەیی کەوتـمە سەر کاروباری دیوانی؛ لەو سەروبەندەدا هەتا لافاوی وەرەزی ڕووی تێـدەکردم، بـە خوێندنەوەی چیـرۆکان و دیرۆکان بەرم دەگرت. هەرچەند جارێ تەم ومژی پەژارە و کەسەرم بـە سـەردا دەهات، بە سروەی بیـرەوەری ڕووداوی ڕابردووان دەرم دەکرد. هەر چەندی کـزە و سـۆزەی ساردوسڕی ناهومێدی نیازی وابوایە بە لامدا تێپەڕێ، بە پێداچوونەوەی سەرگوروشتەی میـرومەزنەکانی پێـشوو، خۆم سەرگەرم دەکرد؛ تا وام لێهات لەو هونەرە جوانەدا بوومە بژاردە و لە لێدوانیەوە بوومە دەم و پـل ڕەوانێکی وەها کە دنەی دام و هێنامیە سەر ئەو بڕوا و بیـرە کە -بە پێی توانا- منیش چەند گەوێك بـخەمە ئەو زنـجیـرەوە.

ئەوسا مرخی خۆم وا لێ خۆش کردبوو کە لەم زانستە بە مایە و هێژا و پڕ بەهایەدا نووسراوێکی ئەوەندە بە نرخ و سەربەخۆ بـخەمە ڕوو کە هەرگیز بەر لە من دەستی مێژوونووسانی پێش خۆمی پـێ ڕانەگەیشتبێ و ئەوەی من دەیـخەمە بەر چاو، کەسیتر وەك خۆمی تێنەگەیـشتبێ. بـەڵام بـە هـۆی کۆسپی دژوار و ڕووداوی نالەبار و لارگەڕانی ڕۆژگاری ناهەموار، ئەو ئاواتەم هەر بە ئاوات مایـەوە و بووکی ناوپەردووی نیازم، تارای لە سەر هەڵنەدرایەوە. لە هەموو لاوە هەر بای پێچەوانە بوو، کەڵەکی ئارەزووی بە پاشدا دەگێڕاوە و لە هەموو سووچێکەوە هەر گێژەڵووکەی ئاژاوە بوو، سەری لە عاسـمان دەساوی و سەری لە زانا دەشێواند.

دنـــیا وەکوو پرچی یار پەشێو بوو ‌ ‌ ‌ ‌ دیـمەن هەمـوو لا درنج و دێو بوو
ئـــاژاوە جـیهانـی وا تـــەنـیبـوو ‌ ‌ ‌ ‌ خـۆشـی شـڕ و هێـمـنی گەنیـبوو
بـاو باوی شەڕ و گەڕ و گـزی بـوو ‌ ‌ ‌ ‌ پـیس جێگر و ئـــابـڕوو خـزیـبوو

حەشاماتی بەستەزمان لە بیابانی سەرگەردانیدا بە سەرلێشێواوی مابوونەوە؛ دێوەزمـەی دەرد و ئازار دوولینگانەی کوڵ و کەسەری بە سەردا بەردابوونەوە. لـەو ڕۆژگـارە وەیـشوومە و تاڵـەدا کـەس دەهاواری کەس نەدەهات و لە تووك و نزا و ئاه و ناڵە بەو لاوە، هیچیان لـە دەس نـەدەهات. چـاوی سوور و تەڕیان دەبڕیە عاسـمان و دەستی کەمهێز و سستیان بـە لـەرزۆکی پـان دەکـردەوە و لـە بـەر خودای خۆیان دەپاڕانەوە: خوایە! تۆ کارسازی بێـچارانی و فریاڕەسـی بـیّدەرەتـانی. هـەڵگرتنی ئـەم بارەگرانەی ئەم زۆریە زۆرە لە وزە و توانای ئێمە بـەدەرە. تـۆش هەڵێنـەگری و دەفریامـان وەرە و بـە دەستی توانای خۆت ئەو ئەرکە ملشکێنە و ئەو ڕەنـجە دڵتەزێنە و ئەو داخ و دەردە بێوێنەیەمان لـە بەر برەوێنە و لە سەرمان لابەرە.

تیشکی بەزەی خودای تاك و پاك بزووت و سروەی خۆشی و شادی هەنگووت و تـاریکی زۆرداری و هەوری چلکنی نالەباری وەها تەرت و توونا بوو کە ئاداری بە سەر پاداریەوە نەما.

ئـەم پادشـادادگەر و هەژارپـەروەرەمان بـۆ پەیـدا بـوو؛ کـە لـە ودمـی هـاتنی، بـرینی دڵان گۆشتەزونیان هێناوە و بە هەتوانی دڵدانەوەی ئەو، سارێژ بوونەوە. لە ژێر سایەی شاباڵی ئەو پیـــرۆزە پیـرۆزەدا، دڵخورتی و نیگەرانی لە بیـر هەمـوو کەس چوونەوە و ئاگردانی دڵەتەپێ و سەرگەردانی بـە جارێك کوێر بوونەوە و هەژار و نەدار و بیمار و دەردەداری ئەوسا، هەموویان تێر و تەسەل و پۆشـتە و ساغ و بە دەماغ -بە دڵی خۆش و چاوی ڕوونەوە- ژیان بەرێوە دەبەن. کوندەبوومەی وەیشوومە فـڕین و قەلەڕەشکەی بێفەڕ لە قرین کەوت. باوی تووتی شەکرشکێن هاتەوە؛ کە بە گفت و لفتی شیـــرینی خۆی شەکر ببارێنێ و خوێنتاڵی بتارێنێ. بولبول بـەرگی کەساسـی لـە بـەر خـۆ دارنیـوە و پـەردەی بێدەنگی دادڕیوە و زۆر بە ڕاشکاوی بەرانبەر بە گوڵی دڵخـوازی خـۆی دەنـوێنێ و بـۆی دەخـوێنێ و دەچریکێنێ.

جا چونکە ئەوانەی لە بازاڕی وتاردا گەوهەرفرۆش و دوڕناسن و ئەو مێژووناسانەی کە تووتی ناو

شەکەرستانی چیرۆك و دەنگ و باسن، تا وێستا رێگەی خۆیان نەخستۆتە ناو کوردستانەوە و باسوخواسی گەرناسان و سەرناسانی کوردیان بە سەردەمی بنووسدا رانەبردووە و ئەو مێژووە پڕ لە شانازی و خۆشەی -کە لە چێژ و بەرامەدا بەرەوبەری هەنگوین و گەزۆشە- بە داخەوە لەوانەوە نەدیاری بووە و کەوتۆتە بەر پیوار و بە هیچ ئاوایەك دەست و دەمیان لێ نزیك نەکردووە، منی بێتین و توان و بێدەست و زوان، کەوتمە سەر ئەو خەیاڵە کە بە ئەندازەی وزە و توانای خۆم -ئەوەندەی بۆم لوا- لە باسوخواسی گەورە پیاوان و خاوەن ناوان و سەرداران و خونکارانی کورد و کوردستان کۆ بکەمەوە و ئەوەی لە پیاوە پیرە ژیرەکانی ڕاست و بێدرۆوە بیستوومە، بینووسمەوە و ناوی لێ بنێم: *شەرەفنامە*. هەموو نیاز و ئاواتیشم هەر ئەمەیە کە خانەدانە گەورەکانی کوردستان ناویان لە ناو ناوان بمێنێ و لە ناو نەچن.

لە زانایانی پیاوچاك و دڵپاك و بەوەج دەپاڕێمەوە کەوا زۆر بە وردی لە نووسینەکەم ورد ببنەوە و ئەگەر پەشێویەکیان بەرچاو کەوت، بە شێوەیەکی مەردانە بەراوردی بکەن. خۆ ئەگەر هەڵە و لە بیرچوونێکم لە سەر دەدۆزنەوە، هەر بە گاڵتە پێکردن و تیز و تەشەر لێم نەقۆزنەوە؛ پیاوەتیم دەگەڵ بکەن و بە پارچەیەکی چاکتر و بە بزگوڕێکی تازەتر و پاکتر، بۆم پینە بکەن.

هەڵەم بێ‌ژمارە، ئەچی گێف بێ لە سەرکۆنەم     بترسە ڕۆژێ ئەتۆش تەڕبی، مەڵێ سۆنەم

پەڵەی هەڵە هەموو لا دەگرێ، کێیە بێ پەڵەیە؟     بڵاوە بیری مرۆ، هەر خودایە بێ هەڵەیە

## پێشدەستییەك

یەکالاّ کردنەوەی بنج و بناوانی کورد و ڕوون کردنەوەی باری ژیان و چۆنیەتی ئاکاریان بە درێژایی مێژوو.

## ڕووپەڕی یەکەم

دەنگ و باسی ئەو فەرمانڕەوا کوردانەیە کە لە کوردستاندا ئالاّی سەربەخۆیەتیان هەڵکردووە و مێژوونوسان لە ڕیزی پادشایانیان نووسیون؛ ئەویش لە پێنج بەنداندا دێن:

**بەندی یەکەم:** فەرمانڕەوایانی دیاربەکر و جزیر.

**بەندی دووەم:** فەرمانڕەوایانی دینەوەر و شارەزوور؛ کە بە حەسنەوییە بەناویانگن.

**بەندی سێهەم:** فەرمانڕەوایانی فەزلەوییە؛ کە بە لوڕی گەورە ناسراون.

**بەندی چوارەم:** فەرمانڕەوایانی لوڕی بچووك.

**بەندی پێنجەم:** پادشایانی میسر و شام؛ کە بە بنەماڵەی ئەییوبی ناوبراون.

## ڕووپەڕی دووەم

باسی بەسەرهاتی ئەو گەورە پیاوانەیە کە هەرچەندەباوی سەربەخۆیوونی تەواویشیان بۆ نەڕەخساوە و خۆیان بە پادشاناو نەناوە، بەلاّم لە سەربەستی و ئازادیدا گەیشتوونە ڕادەیەك کە هێندێك لەوانە تەنانەت سکەشیان بە ناوی خۆیانەوە لێداوە و خودبەی هەینیش لە سەر بەرزەکی مزگەوتان بە ناوی ئەوانەوە خوێندراوەتەوە. لە پێنج بەندیشدا دەربارەی ئەوانەوە داخێوین:



بەندی یەکەم: فەرمانڕەوایانی ئاردەڵان.

بەندی دووەم: فەرمانڕەوایانی هەکاری کە شەنبۆشیان پێ دەڵێن.[1]

بەندی سێهەم: فەرمانڕەوایانی ئامێدی[2] کە بە بادینان بەناوبانگن.[3]

بەندی چوارەم: فەرمانڕەوایانی جزیر کە بەختی (بەختیە)شیان پێ دەڵێن. ئەویش سێ لکی لێ دەبێتەوە:

لکی یەکەم: فەرمانڕەوایانی جزیر.

لکی دووەم: فەرمانڕەوایانی گۆرکێل.

لکی سێهەم: فەرمانڕەوایانی فەنیک.

بەندی پێنجەم: فەرمانڕەوایانی حەسەن کیف کە بە ملکان (مەلەکان) ناسراون.

## ڕووپەڕی سێهەم

فەرمانڕەوایان و کاربەدەستانی‌تر لە کوردستاندا؛ کە دەکرێن بە سێ بەشەوە. بەشی یەکەمیان لە نۆ بەنداندا لێ دەدوێین:

بەندی یەکەم: فەرمانڕەوایانی چەمشکەزەك. ئەوانیش بە سێ دەستە دابەش دەکرێن:

دەستەی یەکەم: فەرمانڕەوایانی مجەنکورد[4].

دەستەی دووەم: فەرمانڕەوایانی پەرتك[5].

دەستەی سێهەم: فەرمانڕەوایانی سوقمان.

---

١- ناوچەیەکە سەر بە جۆلەمێرگە لە وڵاتی وان و نزیکی بۆتان و چاڵ و ئالبان. لکێکی زێی گەورە لەوێوە هەڵدەقوڵێ و دەڕژێتە ناو دەجلەوە. کوار و شەمدینان و مەحموودی و بێت شەباب لە سەر هەکارین. عەونی

٢- ئامێدی (عیمادیە)، بنیاتی عیمادەدین زەنگیە. ئەبولسعوودی ئامێدی -کە بە «مفتی‌الثقلین» بەناوبانگ بووە- خەڵکی ئەوێ بووە. عەونی

٣- پەیڕەوانی زەردەشت بیهدینان بوون؛ بەم دینەکەش گوتراوە (دینی بهی) واتا: ئایینی باشان و ئایینی باشی. بادینان ڕەنگە بیهدینان بێ. هەژار

٤- شارێکە لە نێوان ئەرزەڕۆم و قارس. عەونی

٥- لە دوازدەکیلۆمیتری باکووری خەرپووت لە سەر زێی فورات هەڵکەوتووە. عەونی

بەندی دووەم: باسی فەرمانڕەوایانی مەرداسی دەکا و ئەویش سێ لکی لێ دەبنەوە:

لکی یەکەم: فەرمانڕەوایانی ئەگیل[1].

لکی دووەم: فەرمانڕەوایانی پالەو[2].

لکی سێهەم: فەرمانڕەوایانی چەرموگ[3].

بەندی سێهەم: فەرمانڕەوایانی ساسۆن[4] ( حەزۆ).

بەندی چوارەم: فەرمانڕەوایانی خێزان کە ئەویش دەبنە سێ دەستە:

دەستەی یەکەم: فەرمانڕەوایانی خێزان[5].

دەستەی دووەم: فەرمانڕەوایانی مەکس[6].

دەستەی سێهەم: فەرمانڕەوایانی ئەسبایرد (ئەسپاروت)[7].

بەندی پێنجەم: فەرمانڕەوایانی کلیس (کلز، کیلس)[8].

بەندی شەشەم: فەرمانڕەوایانی شیـروان[9]؛ کە ئەویش سێلکن:

لکی یەکەم: فەرمانڕەوایانی کفرا.[10]

لکی دووەم: فەرمانڕەوایانی ئێرون (ئەروە).[11]

---

١- شارێکە لە مەڵبەندی ئەرغەنی سی و دوو کیلۆمیتـر لە دیاربەکرەوە دوورە. عەونی

٢- شارێکە ٩٥ کیلۆمیتـر لە دیاربەکرەوە دوورە.

٣- یان چەرمك، لە ٥٠ کیلۆمیتـری باکووری دیاربەکرە. گراوی زۆر لێ هەن و خەڵك دەیچنێ. عەونی

٤- لە وڵاتی بدلیسە و نزیك بە شاری مووشە. چیای ساسۆن دەکەوێتە خۆرنشینی و ٢٦٠٠ میتـر بەرزە. عەونی

٥- شارێکە سەر بە دیاربەکرەو لە ئەسعەرد (سعرت) نزیکە و داری شابەڕووی زۆرە. عەونی

٦- شارێکە ٩٩ کیلۆمیتـر لە وان دوورە. عەونی

٧- ناوچەیەکە سەر بە بدلیس. لە نەخشەی عوسـمانیدا سپاروت نووسراوە. عەونی

٨- شارێکە ٥٠کیلۆمیتـر لە حەڵەب دوورە. یاقووت دەڵێ: کلز گوندێکـە لـەلای أعـزاز و أعـزاز شـارێکی گەورەیـە. عەونی

٩- شارێکە لە لای بدلیس. عەونی

١٠- لە ناوچەی ئەسعردە و سەر بە بدلیسە. هۆزی مەحـمەدیان و ئەستوورکان لەوێن. عەونی

١١- لە ئەتڵەسی عوسـمانیدا «ئەروە»یە؛ شارۆکێکە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەسعردەوە. عەونی
مستـرریچ دەڵێ: لە ئیـرنەوە بۆ کفرا سێ سەعاتە ڕێیە. جەمیل

لکی سێهەم: فەرمانڕەوایانی کرنی (کرتی، کورتی).[1]

بەندی حەوتەم: فەرمانڕەوایانی زەرقی[2]؛ ئەویش چوار دەستەن:

دەستەی یەکەم: فەرمانڕەوایانی دەرزینی.[3]

دەستەی دووەم: فەرمانڕەوایانی گردکان.[4]

دەستەی سێهەم: فەرمانڕەوایانی عیتاق (ئاتاق).[5]

دەستەی چوارەم: فەرمانڕەوایانی تەرجیل.[6]

بەندی هەشتەم: فەرمانڕەوایانی سوێدی.

بەندی نۆیەم: فەرمانڕەوایانی سولەیمانی؛ ئەویش دوو لکی لێ دەبێتەوە:

لکی یەکەم: فەرمانڕەوایانی قولب و باتمان.[7]

لکی دووەم: فەرمانڕەوایانی میافارقین.[8]

بەشی دووەم لە رووپەڕی سێهەم. بە دوازدەبەند کۆتایی دێت:

بەندی یەکەم: فەرمانڕەوایانی سوهران (سۆران).

بەندی دووەم: فەرمانڕەوایانی بابان.

بەندی سێهەم: فەرمانڕەوایانی موکری.

بەندی چوارەم: فەرمانڕەوایانی برادۆست[9]؛ ئەویش دوو دەستەن:

---

١- دووسەعاتە ڕێیە بۆ خێزان و چوارسەعاتە بۆ شیروان و زۆر چڕ و سەختە؛ هۆزی چنگنی عەمبەرلووی لێ دەژین.

٢- ناوچەیەك و گوندێك بەو ناوە لە لای ئەسعرد هەیە؛ هۆزەکانی زەرقی و عەزمانکی و هوێدی و ژەنگانە لەوێ دەژین. عەونی

٣- لە ئەسعردەوە چوار سەعاتە ڕێیە. عەونی

٤- کەوتۆتە نێوان دیاربەکر و میافارقین. جەمیل

٥- ناوچەیەکە سەر بە دیاربەکر. عەونی

٦- ناوی گوندێکە لە لای دیاربەکر. جەمیل

٧- مەڵبەندێکە سەر بە بدلیس و دەکەوێتە لای باشووری کنج.

٨- ٧٠ کیلۆمیتر لە دیاربەکر دوورە و قەڵایەکی کەونارا و بەناوبانگی هەیە و بنگەی قەزای سلوانە.

٩- ناوچەیەکە سەر بە لیوای هەولێر.

دەستەی یەکەم: فەرمانڕەوایانی وەشنی (ئەشنە، شنۆ).[1]

دەستەی دووەم: فەرمانڕوایانی سۆما.

بەندی پێنجەم: فەرمانڕەوایانی مەحموودی.[2]

بەندی شەشەم: فەرمانڕەوایانی دونبولی.[3]

بەندی حەوتەم: فەرمانڕەوایانی زەرزا.

بەندی هەشتەم: فەرمانڕەوایانی ئەستۆنی (ئەستوانی).[4]

بەندی نۆیەم: فەرمانڕەوایانی تاسنی (داسنی).[5]

بەندی دەیەم: فەرمانڕەوایانی کەلهور[6]؛ ئەویش سێ لکی لێ پەیدا دەبێ:

لکی یەکەم: فەرمانڕەوایانی پلنگان (پالەنگان)

لکی دووەم: فەرمانڕەوایانی دەرەتەنگ.[7]

لکی سێهەم: فەرمانڕەوایانی ماهیدەشت.[8]

بەندی یازدەمیــن: فەرمانڕەوایانی بانە.

---

١- شنۆ شارێکە لە ئازربایـجانی کوردستان؛ سێ زانای بەناوبانگی حەدیس بە ناوی ئەشنایی و ئەشنەهی و ئەشـنانی و زۆر مەلای بە ناوی ئوشنەوی، لەو شارە هەلکەوتوون. عەونیەلی کوڕی شێخ حامیدی ئوشنەوی یەك لەوانەیە.جەمیل

٢- مەڵبەندی هۆزی مەحـموودی لە سەر سنووری ئێستای تورکیا و ئێرانە و ٩٠ کیلۆمیتـــری لای ڕۆژهـەلاتی وانـە. عەونی

٣- کتێبی الـمسالك دەڵێ: دونبولی لە پێشدا لە چیاکانی مەقلوب و موختاردا ژیان و ڕاونراون و پەڕیدەی ئازربایـجان بوون و لەوێ مەزنایەتیەکی سەربەخۆیان دامەزراندووە. جەمیل

٤- گوندێك بەو ناوە لە ناوچەی نەهری، لە کوردستانی داگیــرکراوی تورکیادا هەیە. جەمیل

٥- *معجم‌البلدان* دەڵێ: لە باکووری مووسڵ لە لای خۆرنشینی دەجلەوە، چیایەکی مەزن هەیە؛ گەلێکی کورد لێ هـەن و بەداسنی دەناسرێن، ئەمڕۆ بەو داسنیانە دەڵێن یەزیدی. تەوفیق وەهبی دەڵێ: داسنی لە وشەی دئیقەسنەوە هـاتووە. جەمیل

٦- کەلهوڕ (کەڵوڕ) ئەو مەڵبەندەیە کە کەوتۆتە نێوان حلوانی کۆن و کرماشان، تا دەگاتە کەوشەنی سنە (سەنەندەج). هێندێك لە کەڵوڕان لەو مەڵبەندەوە پەڕەوازە بوون. جەمیل

٧- نزیکی زەهاوە و لە دەم دەربەندێکەوەیە؛ چەمی ئەڵوەند لەوێوە دەڕژێتە دەشتەوە؛ پاتەختیشی ڕێژاوە. جەمیل

٨- قەلایەك و شارێکی لە مێژینەیە و لە خانەقینەوە نزیکە. عەونی

بەندی دوازدەمیــن: فەرمانڕەوایانی تەرزا.

**بەشی سێهەم لە ڕووپەڕی سێهەم:**

فەرمانڕەوایانی ئەو کوردانەی کە لە ئێرانن و گۆرانیان پێ دەڵێـن؛ ئەویش چوار دەستەن:

دەستەی یەکەم: فەرمانڕەوایانی سیامەنسوور.[1]

دەستەی دووەم: فەرمانڕەوایانی چەکنی.[2]

دەستەی سێهەم: فەرمانڕەوایانی زەنگنە.[3]

دەستەی چوارەم: فەرمانڕەوایانی پازۆکی.[4]

## ڕووپەڕی چوارەم

فەرمانڕەوایانی بدلیس[5] کە دەبنە باب و باپیـری نووسەری ئەم ڕووپەڕانە. ئەویش بە سەرەتایەك و چواربڕ و کۆتاییەك، کۆتایی پێ دەهێنرێ.

سەرەتا کە باسی شاری بدلیس دەکا؛ کێ دروسـتی کـردووە و هـۆی ئـاوەدان کردنـەوەی شـار و قەڵاکەی چبووە و چۆن بووە؟

---

١- لە ڕۆژگاری سەفەویدا هۆزێکی زۆر ئازا و بە هێز بوون. لە پاشان لەبەریەك هەڵوەشان و بە کوردستان و ئێراندا بڵاو بوونەوە؛ هێندێکیشیان پەڕیوەی ئەفغانستان بوون. خەڵکی گوندی سیامەنسوور لە ناوچەی قەرەحەسەن لە کوردسـتانی عیراق، لەو هۆزەن. جەمیل

٢- یان چنگنی.لەزەمانی سەفەویداهۆزێکی زۆرخاوەن زۆرو زۆردار بوو؛ عەجەم تێکیداون و ئێستا پەرژوبڵاون و ئـەوی لەوانە مان کۆچەر و ڕەوەندن و لە نێوان مەراغە و سولەیـمانیدا گەرمێن و کوێستان دەکەن. جەمیل

گوندێك لە ناوچەی شارباژێڕی لای سولەیـمانی بە ناوی چنگنیان هەیە. هەژار

٣- هۆزێکی کوردە. لە ڕۆژگاری سەفەویدا ئەمیـرنشینی خـۆی دامەزرانـد و ماوەیـەکیش مایـەوە؛ لـە پاشـان هـەر دەوڵەتی ئێران لە ناوی بردووە و بڵاوی کردووە. ئێستاش هێندێکیان لە لای کرند لە ئێران و هێندێکـیشیان لـە لیـوای کەرکووك لە عیراق نیشتەجێن. جەمیل

٤- هۆزێکی کوردە. لە ڕۆژگاری سەفەویدا ناوی دەرکردووە و میـرنشینی خۆی دامەزراندوە؛ لە پاشـان لـە بـەر یـەك هەڵوەشاوە و ئێستاش هێندێکیان لە لای تاران و هێندێکیان لە باشووری ئێرانن. جەمیل

٥- مەڵبەندێکی گەورەیە و شارێکیشە لە کوردستانی بـاکووری و کەوتۆتـە ڕۆژاوای گـۆلی وانـەوە. مـووش و کـنج و ئەسعرد سەر بە بەدلیسن. عەونی



**بڕی یەکەم:** دەربارەی هۆزی ڕوزکی (ڕۆژەکی)ە؛ کە بۆچی ئەم ناوەیان بە سەردا براوە.

**بڕی دووەم:** فەرمانڕەوایانی بدلیس بە ڕەسەن دەچنەوە سەر کێ و چۆن کەوتوونەتە ئەو وڵاتەوە؟

**بڕی سێهەم:** دەبارەی ئەو فەرمانڕەوایانەی بدلیسە کە پادشاگەورەکانی ڕابردوو زۆریان بەڕێز گرتوون و دۆستایەتی و چاکەیان دەگەڵ کردوون؛ ئەویش دەکرێ بە چوار بەش.

**بەشی یەکەم:** مەلیك ئەشرەف.

**بەشی دووەم:** حاجی شەرەف کوڕی زیائەدین.

**بەشی سێهەم:** ئەمیرشەمسەدین کوڕی حاجی شەرەف.

**بەشی چوارەم:** ئەمیرئیبراهیم کوڕی ئەمیرحاجی محەمەد.

**بڕی چوارەم:** ئەو هۆیانەی کە لە سۆنگەیانەوە فەرمانڕەوایی بدلیسیان لە دەست داوە. ئەویش چوار هۆی هەبووە:

**هۆی یەکەم:** کێشەی نێوان میرشەرەف و میرئیبراهیم.

**هۆی دووەم:** دامەزرانی میرشەرەف لە جێگەی میرئیبراهیم و بوونی بە فەرمانڕەوای بدلیس.

**هۆی سێهەم:** باس لەوە دەکا کە چۆن میرشەرەف قەڵای بدلیسی لە قزڵباشان ساندەوە.

**هۆی چوارەم:** بەسەرهاتی میرشەمسەدین کوڕی میرشەرەف.

**کۆتایی:** باس‌وخواسی ئەم بەستەزمان و باڵشکاوەیە؛ هەر لە ڕۆژی هاتنە سەر دنیاوە تا ئەمڕۆ کە بەرانبەر بە مێژووی ساڵی هەزار و پێنجی کۆچیە.

ئەوسا کتێبەکەم بە چیرۆکی بەسەرهاتی پادشایانی بەرز و بەڕێزی خانەدانی عوسمانی و پادشایانی ئێران و توووران و زۆربەی خونکارانی دیکەش لە دنیادا -کە هاوچەرخی ئەوانە بوون- دەبڕێمەوە.

# لێکۆڵینەوەیەک

## دەربارەی ڕەگەزی کورد و چۆنیەتی ژیانیان

لە مەڕ ڕەگەزی کوردەوە زۆر باس و خواسی جۆربەجۆر نووسراوە؛ بۆ نموونە: هێندێك لایان وایە لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی زەهاك (ضحاك)ی ماراندا[1]، کە پێنجەمین پادشای پێشدادیان بووە و لە جێگەی جەمشید لە سەر تەختی ئێران و تووران ڕۆنیشتووە و دەستی بە سەر بەشی زۆری جیهاندا ڕۆیشتووە، ئەو زەهاکە ئەوەندەبەدفەڕ و جووت قۆشە و نەعاملاو و نەگونجاو و ناهەموار و ناهەنجار بوو کە کۆمەڵێك لە مێژوونووسان لایان وایە زەهاك، شەدادە. زانایەکی پیتۆڵ و ژیر و بەبیر، دەربارەی زەهاك دەڵێ:

| | |
|---|---|
| کە جەمشید ڕۆیی بەرەو گۆڕەشار | بە زۆر هاتە جێی ئەژدەهاکی گەمار |
| جیهان کەوتە بەر دەستی وا بێ فەڕێ | وەکوو بێتە بەر چنگی ورچێ، مەڕێ |
| دڵ و دەست و ڕوو ڕەش، دژ و نالەبار | دز و دەسبڕ و شێت و پەتیار و هار |
| هەموو کەس لە دەستی بە گازندەبوو | بە وێرانە فێر بوو وەکوو کوندەبوو |

سەرباری ئەوەش کە ئەوەندەگزیکەر و بە گەڕ و لاسار و نارەسەن و ناپەسند بوو، وەك دەڵێن: دوو ڕەگ وەکوو دوو مار لە سەر شانیەوە هەستابوون کە لە ڕۆژگاری ئێستادا بژیشکان بەو نەخۆشینە دەڵێن شێرپەنجە.

ئەو نەخۆشی شادەماری سەرشانە، زۆر بە ژان و بێتامان بوو. گەلێکیان بژیشك و لوقمان لێ کۆ کردەوە و زۆریان داوودەرمان و تۆزوهەتوان بۆ دەکار هێنا، هیچیان پێ دەگەڵ نەکرا و تاوتوێی ئازار دانەمرکا و ڕۆژبەڕۆژ و سات بە سات لە باریك و بنێسی دەدا و ئاهێکی پێ نەهێشتبوو؛ تا ڕۆژێك شەیتان خۆی گۆڕی و لە بیچم و تەرزی بژیشکدا هاتە لای زەهاك و پێی گوت: چاری ماری سەر

---

[1]- یەك لە پادشایانی «حەمیەری»یە و کوڕی عاد، کوڕی عیملاق، کوڕی حام، کوڕی نووحە. عەونی

شانت، هەر مێشکی لاوانە. ئەگەر بێتوو هەموو ڕۆژێ بە مێشکی تازە و گەرماوگەرم بیانهەنووی، ئیتر هەر یەکاویەکە و بە ئامان و زامان چاکت دەکاتەوە و وەك گوێزی ئازات لێ دێتەوە. بە هەڵکەوت ژانی سەرشانی زەهاك ئەو دەرمانەی پێ دەکەوت و هەتا مێشکی تازەی سەری تازەلاوانیان تێ هەڵدەسوو، بۆ ماوەیەکی باش ئۆقرەی پێدەهات و خرپ، خەوی لێدەکەوت. ئیتر وەك بوێژەکە دەڵێ:

وشتر نەبەسی بوو بارگرانی      وا زەنگۆڵەشی خرا ملانی

لەو ڕۆژەوە هەموو ڕۆژێك دوو لاوی بێتاوان و بەسەزوانیان سەرژێ دەکرد و مێشکیان بۆ چاری ئازاری زەهاك دەبرد. دەڵێن ئەو کابرایەی کە ئەرکی سەر برینی لاوانی پێ سپێراوە، پیاوێکی دڵنەرم و خاوەن بەزەیی و بە ئاکار بووە. لەو کارە زۆر پەرێشان و خەمبار و ئەو ئەرکەی بە لاوە فرە دژوار بووە. گەلێکی لە سەر دڵ گران دەهات و زۆری لێ تووڕە بوو؛ بەڵام کەمی دەست دەڕۆیشت. هەر ئەوەندەی لە دەس دەهات کە هەموو ڕۆژێك لاوێکی لە دوو لاوەکە پاشقل دەدا و خۆی لە سەر برینی دەبوارد و مێشکە مەڕێکی دەگەڵ سەری لاوە سەربڕاوەکەدا لێك دەدا و بۆ پادشای دەنارد. ئەو کەسەی دەشیدزیەوە، بە دزیەوە ڕزگاری دەکرد و مەرجی بۆ دادەنا کە لە ئاوەدانیدا نەمێنێ و ڕوو بکاتە شاخ و کێوان. لەو تاك تاك و کەم کەمە کۆمەڵێکی زۆر و لە هەموو ڕەنگ و جۆر و لە شێوەی زماندا لێك جیا لە چیا لێك کۆ بوونەوە. ژن و ژنخوازی کەوتە نێوان و خزمایەتی هەمووی لە یەکتر کردنە خۆیی و بێگانەیی و نامۆیی لە ناویان کۆچی کرد و نەوە و نەتەوە و تۆرەمە و زار و زێچی زۆریان لێ کەوتەوە و ناویان بوو بە کورد.

جا چونکە بۆ بارەوبار و کار و باران، لە بازێڕان دوورە پەرێز بوون و ڕوویان نەدەکردەشاران و کەمتر چاویان بە بیانی و نەناس و لاپرەسەنان دەکەوت، شێوە زمانێکی تایبەتی و سەربەخۆیان بۆ خۆیان داهێنا و لەو ناو دار و دەوەن و تەلان و بەندەن و ڕەوەز و چرگەن و خر و بودر و ڕژد و چر و لێڕەوار و ئەشکەوت و شکێر و بەربەسار و نزارانەدا، بوون بە خاوەنی ئاوەدانی و خێوی ماڵ و دەستیاندا کشت و کاڵ و زۆربەی زۆریشیان بە ڕەنێو هێنان و بەرهەمی ئاژەڵ و ولسات و پاتاڵەوە خەریك دەبوون و بە شوێن پووش و پاوان و لەوەڕ و بژوێندا دەگەڕان و بەو هۆیە لە هۆز تەریك دەبوون و ڕوویان دەکردەچێنکە و نواڵ و چیمەنان و گەشتیان دەکەوتە پێدەشتان و لەو دیمەن گۆڕانە،

دەگۆڕان و دەشتیان دەکردەنشیمەن و دەشیانکردەنیشتمان و بە یەکجارەکی لە کەل کلا دەبوون.

هێندێك کەس گوتوویانە: لە بەر ئازایەتی و نەبەردی و مەردی -کە ئاکاری هەمیشە و لە مێژینەیانە- ناوی کوردیان بە سەردا براوە.

لە مێژوونووسانیشدا ئی وا هەبووە گوتوویە: کورد لە تۆمی جندۆکەوە گۆڕاون و خوا سەرپۆشی لە سەر لاداون!

هێندێکیتر هەر لەو جۆرە مێژوونوسانە فەرموویانە: دێو بە بنیادەم گەیشتووە و قەوارەی کوردیان داڕشتووە! شتی وا سەیر و سەمەرە مەگەر خوا بزانێ چۆنە؟![1]

هۆزە سەرەکیەکانی کورد لەو بارەوە کە شێوەی ئاخافتن و هێندێك ئاکار و داب و دەستوور و هەڵس و کەوتیان لێك جیاوازە، دەکرێن بە چوار بەشەوە:

یەکەم: کرمانج[2]، دووەم: لوڕ، سێهەم: کەڵهوڕ، چوارەم: گۆران.

سنوور و کەوشەنی وڵاتی کوردان -کە ناوی کوردستانە- لە سەر لێواری دەریای هورمز[3]ەوە -کە لە سەر کەناری دەریای هیند هەڵکەوتووە- دەست پێدەکا و لەوێوە بە خەتێکی ڕاست دەکشێ و دێت هەتا لە مەڵبەندی مەلاتیە[4] و مەرعش[5] دەبڕێتەوە. وڵاتی فارس[6] و عیراقی عەجەم و ئازربایجان و ئەرمەنستانی چکۆلە[7] و ئەرمەنستانی گەورە،[8] دەکەونە لای باکووری ئەو خەتەوە. عیراقی عارەب[9] و

---

١- بڕوانە پێشەکی وەرگێڕ لە ژێر سەردێڕی دوژمنانمان و ڕەسەنماندا. هەژار

٢- خزمانی زەردەشت بە ماژ ناو براون. مانج ڕەنگە ئەو ماژە بێ. هەژار

٣- خەلیجی فارسە؛ تەنگەیەکی بە ناوی هورمز لێ هەیە. عەونی

٤- شارێکە لە مەڵبەندی خەرپووت لە کوردستانی باکووری. عەونی

٥- شارێکە لە باکووری حەلەب و باشووری ئانادۆل. عەونی

٦- مەڵبەندێکی گەورەیە کەوتۆتە باشووری ئێران و بنکەشی شیرازە. عەونی

٧- نیاز کلیکیایە کە ئێستا ئەدەنەی پێ دەڵێن. عەونی

٨- ئەو مەڵبەندەیە کەوا کەوتۆتە نێوان گۆلی وان و چیاکانی قەفقازەوە، پایتەختەکەی ئارانە کە ئێستا یەریوانی پێ دەگوترێ. عەونی

٩- مەڵبەندێکی گەورەیە و بریتیە لە بەغدا و بەسرە؛ لە لای باکوورەوە لە تکریت ڕا دەست پێ دەکا و بە جەبەلحەمریندا دەڕوا و لە دەریای فارس و لە ڕێژگەی شەتولعەرەب و ناوچەی حەسا دەبڕێتەوە.

مووسڵ و دیاربەکر دەبنە باشووری ئەو سنوورە.

سەرەڕای ئەوەش زۆر و زەوەند بە هۆز و تیرەکانی کورد لەو پەڕی مەڵبەندی ڕۆژهەڵاتەوە دایانگرتووە و تێیدا بڵاو بوونەتەوە و ئەو سەریان گەیوەتە ئەو پەڕی مەڵبەندی خۆرنشین.

زۆربەی کوردەکان ئازاد و ئازا و بوێر و جوامێر ومێرخاس و گەڕناس و بەکار و بە فیز و دەمارن. ئەوەندەلە خوازەلۆکی و سەرشۆڕی بێزارن کە ئەگەر کوردێك هەستی کرد دەستی کورتە، چەك هەڵدەگرێ و منەت هەڵناگرێ و نان لە دەمی شێریشدا بێ بە زۆری زۆرداری دەریدێنێ و بۆی دادەنێ. نەخوازا ئەوەندەیان پێخۆشە بە ئازا و نەترساو باسیان بکری و بە بێباك و گەڕناس ناویان ببرێ، زۆری وایان هەیە کە هەر چەند هەرگیز ڕێگری و چەتەیی نەکردووە و شەڕ و شۆڕیشی نەدیتووە، دیسان وا خۆی دەنوێنێ کە بە سەری هاتووە و لەو بارەوە لە کلّ دەرهاتووە. کورد لە لای گران نایە پێی بڵێن بە زۆر شتی لە بێ زۆر ساندووە؛ بەڵام پێی خۆشە بمرێ و نەڵێن دەرۆزەی کردووە و دەستی خوازەلۆکی لە بەر ئەم و ئەو پان کردۆتەوە. بەو فەرموودەڕەفتار دەکەن کە فەرموویانە:

دەستتێ درێژ بێ بە تەمای تۆزێ زیو باشە کە بە برین بچێ بۆ دانگ و نیو[1]

پێشینیان گوتوویانە: «کەسێکی بیر لە دوارۆژ بکاتەوە ترسەنۆك دەبێ». کوردەکان لە ترسی ئەوە کە نەوەك بە ترسەنۆك ناو ببرێن، زۆر بیر لە دوارۆژ ناکەنەوە و بەرو ودوای کار و باری خۆیان لێك نادەنەوە!

زۆربەی کوردەکان سوننی مەزەبن و لە سەر شۆپی ئیمامیشافعی دەڕۆن و لە سەر بەجێ هێنانی

---

١- شێعری سەعدی شیرازیە دەڵێ:

«دست دراز از پی یك حبه سیم به کە ببرند بدانگی و نیم»

دانەری کتێب بەراوەژووی مانا لێداوەتەوە؛ بۆیە نووسیویە بەو فەرموودەڕەفتار ناکەن. کە پێچەوانەکەی ڕاستە و سەعدیش دزی لە گەدایی بە باشتر زانیوە. من «دە»م لە جێگەی «نا» دانا و هەڵەم هەڵگرت. هەژار

ئەم تاقە بەیتە لە چیرۆکێکی زۆر کورتی «گلستان»دایە، لە بابی سێهەم: دزێك بە گەدایەك دەڵێ: شەرم ناکەی لەبەر تۆزێ زێو، دەست بۆ هەر ناکەسێك دادەکێشی؟ ئەویش بەم بەیتە جوابی دەداتەوە؛ واتا: وا باشە، تا لە سەر دزینی دانگ و نیوێك (گرەمێك) بەبرین بچێ. کەوابوو، بۆچوونەکەی شەرەفخانە. بەڵام چۆن مامۆستا هەژاری بلیمەت پێچەوانەی مانا لێداوەتەوە؟! فەرمایشەکەی خۆیە: «بڵاوە بیری مرۆ، هەر خودایە بێ هەڵەیە». ماجد

ڕێ و شوێنی ئایینی خۆیان زۆر سوورن و سەریان بچێ نوێژیان ناچێ و لە چوونە حەج و زەکات داندا هیچ لام و جومیان نیە و بۆ پێك هێنانی هەموو ئەرکی سەرشانیان -لە مەڕ ئایینەوە- هەتا بڵێی چوست و چالاك و ئامادەن و لە ڕووی فەرمانی مەلایاندا لارە ملن و چیان پێ بسپێرن بە موو لێی لانادەن. خزم و یارانی پێغەمبەریشیان زۆر خۆش گەرەکە.

هێندێك هۆز و تیرەی کورد -کەوا کەوتوونە ئالی مووسڵ و شامەوە- وەك: داسنی و خالتی و پەسیان و بڕێکیش لە مەحموودی و دونبولّیەکان، یەزیدین و لە دەستە و بەستەی شێخ عەدی[1] کوڕی موسافیرن؛ کە ئەویش سەر بە پاشاکانی زنجیرەی مەڕوانی بووە.

ئەو یەزیدیانەی لایان وایە ئەو شێخ عەدی (ئادی)یەی -کە لە گەلی لالەش نێژراوە- ئەرکی نوێژ و ڕۆژووی یەزیدیەکانی گرتۆتە ئەستۆی خۆی و دەستەبەر بووە ڕۆژی هەستانەوەی ئەو دنیا بە بێ چەند و چوون و پرسیار و باس و خواس، بیانباتە بەهەشت. یەزیدییەکان لە مەلا ڕوالەت بینەکانی موسڵمانان زۆر دڕدۆنگن و ڕکیان لێیان دەبێتەوە.

لە کوردستاندا بە گشتی و لە ئامێدیدا[2] بە تایبەتی، مەلای چاك و زانای هۆزان گەلێك زۆرە و زۆریەیان لە هەر دوازدەزانستەکاندا زۆر زەبر بە دەستن و گەلێکیان خویندۆتەوە و فرەشیان لە بەرە؛ ڕەنگە لە دانانی کتێبانیشدا بەشدار بووبن؛ بەڵام لەو بارەوە ناوبانگیان دەر نەکردووە[3].

مەلاکانی کورد لە مەڕ ئەو زانست و هونەرانەوە کە زانین و فێربوونیان دەرگای بارەگای

---

١- عەدی کوڕی موسافیری هەکاری، پیرێکی گەورە بووە و لای عەبدولقادری شارەزووری و غەوسی گەیلانی پێگەیشتووە. ساڵی ٥٥٧ی کۆچی لە چیای هەکاری مردووە و لە گەلی لالەش نێژراوە. عەونی

تاریخی مووسڵ دەڵێ: شێخ عەدی دوانن؛ عەدی کوڕی موسافیری هەکاری و عەدی کوڕی ئەبوویەرەکات کە لە چیای هەکاری لە دایك بووە و شێخایەتی کردووە. دەربارەی ئەمەیانەوە مسیۆنۆ دەڵێ: کورد بووە و زەردەشتی بووە و لە سەر ڕچەی ئایینی تیراهی ڕۆیشتووە. جەمیل

٢- نیاز لە ئامێد (ئامد) دیاربەکرە. هەژار

٣- زۆریان کتێب داناون و لەو بارەوە زۆریش خاوەن ناون. *ئەحکامی ئامێدی* لە ئەزهەر بە دەرس دەخوێندری؛ *کافیە و شافیەی ئیبنوحاجیب*، *تاریخی ئیبنوئەسیر*، *موستەلەحاتی ئیبنوسەلاح* (*کشف الغمە فی مناقب الائمە*)ی عیسا هەولێری، لەم دواییانەشدا پیاوی وەك شێخ عەبدولقادری موهاجیر نووسەری *تهذیب الکلام*، زەهاوی، حەیدەری، چۆڕی، پێنجوێنی، بێتووشی و ئەوەندەزۆری دیکەش هەن کە دەژمارە نایەن. فەرەجوڵڵا زەکی

پادشایانی ئێران و تووران بە ڕوودا دەکاتەوە و لە سایەی ئەوانەوە پیاو دەبێ بە خاوەنی پایە و مایـە، ڕەنـجێکیان نەداوە و هیچ بۆی تێ نەکۆشاون.

ڕەمەکی و بۆرەپیاگ و نەخوێندەواری کورد، بۆ بەکاری و ئەمەگداری و ڕێز لە دایك و باب نان و بەخێر هێنانی میوان، لە جیهاندا تاکەسوارەی مەیدانن. لە پێناوی سەردار و مەزنی خۆیاندا بە گیـان و دڵ گیانبازن و بە تێکڕایی هەموویان چاوتێر و دەست و دڵ وازن و لە زیـخی و ئازایەتی و پـەیتی و بەجەرگیدا لە لای ژووروی هەموو کەسێکەوەن. وا دەردەکەوێ کە وشەی کـورد بـە مانـا ئـازا و بـە جەرگ و بێباك لە مەرگە؛ چونکە زۆربەی پاڵەوان و نەبەردانی بەناو و دەنگ و قارەمانانی کۆڕی شـەڕ و جەنگ و سەردارانی سەر بە دەرەوە، لەم گەلی کوردەوە سـەری هەڵـداوە. وەك ئاشـکرایە پاڵـەوانی پۆلاخۆر و خاوەن زۆر و گورز و گۆپاڵ (ڕوستەمی زاڵ) کە لـە ڕۆژگـاری کەیقوبادشـادا ژیاوە، کـوڕە کوردێك بووە و لە سیستان هاتۆتە دنیاوە و بە ڕوسـتەمی زابلـی نـاو بـراوە. هۆنـەری هونەرمەنـدی شانامە (مامۆستا فیـردەوسی) تووسی بـە ڕوسـتەمی کـوردی نووسـیوە.[1] هـەروەها لـە سـەردەمی پادشایەتی هورمزی کوڕی ئەوشیـرواندا، سەرداری هەرە بەکار و پاڵەوانی بەدەمار و پڵنگی مەیدانی جەنگ و شێری پڕ کیـنە (بارامیچۆبینە) کـورد بـووە و لـە تورکـستان و خوراسـان بـەخێو کـراوە و بنەچەکە و ڕەگەزی پادشاکانی کرت[2] و غور[3] بەو دەگەنەوە.

گورگیـن میلاد کە لە جەنگە و جەرگەی شەڕدا کۆنـەگورگی بـاران دیـدە[4] و چاونەترسـاو و لـە مەردایەتیدا بێوێنە و یەکەمیـن پیاو بوو، لە نەتەوەی کوردەوە کەوتۆتەوە و ئەوا نزیکەی چوار هەزار

---

١- حاجی قادری کۆیی فەرموویە:

گـوردی شـانـامە پاکیـان کـوردن     کافـی ئەم سافە کافـی ئەو دووردن

٢- پادشایانی کرتی ئەوانەی کە لە پاش دەوڵەتی ئیلخانی بە فەرمانی مەنکۆقائان ببوونە فەرمانڕەوای غور و هیـرات و سیستان و بلوجستان. هەوەڵینیان مەلیك شەمسەدینمـحەمەد بووە؛ ساڵی ٦٤٣ك فەرمانڕەوایی غورستانی دەسـت کەوتووە. عەونی

٣- پادشای ئەفغانستان و خوراسان و غەزنە و هیـرات بوون.عەلائەدین کوڕی حەسەن کوڕی حوسێن کوڕی سام -کە لە سەدەی شەشەمدا بووە- یەکەمیـن پادشای ئەو بنەماڵەیە. عەونی

٤- «گورگی بالاندیدە»یە؛ بالان بە مانای تەڵە. واتا گورگێك کە پێشتر بەتەڵەوە بوویێت و خەلەستبێ. ماجد

ساڵە ئەوەی لە مەڵبەندی لار[1]دا خونکار و فەرمانڕەوای سەربەستن و کەس لە دەستی نەهاتووە دەست بخاتە کاریانەوە و گەلێك جاریش سکە و خودبە هەر بە ناوی خۆیانەوە بووە. پادشازەلام و زۆردارەکانی عەجەم -بە تۆزێك دیاری و پێشکەشێکی کەم- لە ڕاستیان دەم بەست دەبن و چاو دەقونجێنن و ناوێرن خۆیان لە قەرەی بدەن و نایانەوێ بیانهاروژێنن.

مەلاتاجەدینیکوردی -کە لە پێشدا لە شاری برووسا لە مزگەوتان مامۆستا بوو- لە دواییدا ببووە وەزیری هەرە گەورەی ئورخان و نازناوی خەیرەدین پاشای پێ درابوو.

ئەمجار با بێینە سەر باسی ئەو ئەویندارە دڵ بریندارە بەناوودەنگەی کە لە ڕێی دڵداری و بەندەواریدا، دڵی سەنگی سەخت و چەتوونی کێوی بێستوونی لە بەر یەك دەرێنا و بە ئاواتی گەستنی لێوی شیرینی شیرینی، دەستی لە گیانی شیرینی هەڵگرت و هەر بە یادی ئەوینی شیرینی، دوایی بە ژینی تاڵی خۆی هێنا؛ ئەو کێ بوو؟

| | |
|---|---|
| بڕوانە لە بێستوونی سەرکەش | جەرگ و دڵی پڕ لە زامە ئێستەش |
| کام هێزە دڵی کەژی بڕیوە؟ | کام چەنگە کە کێوی دادڕیوە؟ |
| نووسرا بە دەمی کوڵنگ لە سەر بەرد | هەر کوردە نەبەرد و مەردی بێگەرد |
| سەرتۆپی کوڕانی کوردی کەڵهوڕ | فەرهادەڵەمڕای دڵا چیادڕ |

کوردەکان ئەگەر ئاکارێکی ناپەسندیان هەبێ، هەر ئەوەندەیە: کەسیان سەر بۆ کەسیان ناچەمینی و بۆ یەکتر نایەنە بەرکەمەند و هەر وەك تاکە-تاکە، هەر کەسە بیر لە سەربەرزی خۆی دەکاتەوە، بە تێکڕایی بیر لە سەربڵندی تێکڕایی ناکەن و پشتی یەکتری ناگرن و نابنە یەك. دەربارەی ئەم ئاکارە ناڵەبارەیانەوە مامۆستای زانا مەلاسەعدەدین[2] کە فێرکاری سوڵتان مرادخانی خوالێخۆشبووە، لە ناو مێژووە تورکیەکەیدا -کە بۆ عوسمانییانی داناوە- لە مەڕ کوردیشەوە دواوە و

١- مەڵبەندێکە لە ئێران و سەر بە ئەستانی کرمانە و شارێکیش بەو ناوە، لەو مەڵبەندەدا هەیە. عەونی

٢- خواجە سەعدەدین کوڕی حوسێن، دانەری *تاج‌التواریخ* - کە بە *خوجەتاریخی* بەناوبانگە-ساڵی ٩٧٢ك مامۆستای مرادخان بووە و ساڵی ١٠٠٦ کراوەتە شێخەلئیسلام. عەونی

دەڵێ: «هەموو کوردێك بۆ خۆی سەربەخۆیەکە و ئاڵای ملهوڕی و زۆرداری بەرز کردۆتەوە و لە ناو ئەو شاخ و کێوانەدا بە سەربەستی دەژی. ئەگەر سەرنج بدەیە باری یەکدیگیری و هاوبیری و هاوکارییانەوە، تەنیا لە شادەو ئیماندا نەبێ لە هیچ شتی تردا یەکتر ناگرنەوە.[1]

کورد لە تۆڵە ئەستاندا زەبری زۆر توند دەوەشێنی و تۆڵەی خۆی یەك بە هەزار دەستێنێ. خوێنی پیاوانیان کیژێکە یان ئەسپێکی باشە یا خۆ بە چەند سەرێك لە وڵسات و ئاژەڵ دادەکوژێ.

کورد هەتا چوار ژن دێنن؛ ئەگەر دەوڵەمەندیش بن چوار کەنیزەکیشی دەخەنە سەر. زۆر بە زەو و زوون و زوو زیاد دەکەن. ئەگەر ئەو هەموو کوشت و کوشتارە لە ناویان ڕووی نەدایا، ئەوەندەزۆر و خاوەن زۆر دەبوون کە ئێران و هەموو جیهانیش دەبوو لێیان بترسێ؛ بەڵام هەر خودا بۆ خۆی دەزانێ چی بڕیار داوە.

هەر ئەمە ڕاستە کە خوای گەورە بەرێ داینـاوە     چاو بە ڕاستی کە نەبینێ ئەوە سووچی چاوە

دەستەڵاتدارەکانی کوردستان ئەوانەی هۆزەکەیان گەورە و خاوەن زۆر و زۆر ناو بە

---

١- ئەحمەدی‌خانی لە مەڕ ئەو مەبەستەوە دەڵێ:

هێندەی کە بەجەرگ و دوورەترسن     کەمتر لە بەیەك گەیین دەپرسن

کەس بۆ کەسێ نابێ چاو دەبەر بێ     هەر کەس دەیەوێ زل و لە سەر بێ

لەم سەرڕەقیە و دەماری زلیان     بێگانە دەبن سواری ملیان

هەر خۆیەتی زل کەوە و ڕەش و بۆر     هەر بۆیەیە بوونە هێزی خۆخۆر

کوردیش کە ببایە یەك دڵ و دەست     دەستیان دەکەوت ژیانی سەربەست

پەیدا دەبوو باو و گەورەیی و ژین     ناومان دەرئەکرد بە بیر و زانین

جیاواز دەبوو گفتی پاك و ناپاك     پرنرخ و بەرێز دەبوو شتی چاك

*«مەم و زین»ی خانی، وەرگێڕاوی هەژار*

*دانەر لە مەڕ یەکنەگرتنی کوردانەوە ئەفسانەیێکی زۆر ساویلکانەی گێڕاوەتەوە کە لە نێوان بەغدوزی کورد و پێغەمبەردا ڕوویداوە. لە ڕاستیدا ئەو چیرۆکە سووکایەتیە بۆ پێغەمبەر؛ لەبەر ئەوە ڕامانگوێزتە ناو پێشەکیەکەی وەرگێڕ و لێی دواوین. بڕوانە لاپەڕەی بیستوپێنج، پێشەکی وەرگێڕ. هەژار

دەرەوەن، بە ناوی هۆزەکەیانەوە دەناسرێن؛ وەك: هەکاری، سۆران، بابان و ئاردەڵان. ئەو میر ومەزنانەش کە دژی سەخت و هەڵەمووت، یان شاریان دەبەردەست دایە بە ناوی ئەو قەڵایە، یان ئەو شارەوە ناو دەبرێن؛ وەك فەرمانڕەوایانی: حەسەن کێف و بدلیس و جزیر و حەزۆ و ئەگیل و هی‌تریش.

خاکی کوردستان بە لوڕستانیشیەوە، بەشی زۆری ڕەقەن و چڕ و لێڕەواره و ئەرمانی ئەوەندەنیە کە بەرهەم و دەرامەتی کشت و کاڵی دانیشتووانی هەموو بە تەسەلی تێر بکا.

سەبارەت بە ڕژد و کراڵی زەوی و زارەکەیان، کورد لە چاو دەرودراوسێکانیان هەژار و نەدارن. سەرەڕای ئەوەش هەموویان زۆر چاوتێر و کەم چاونەزێرن و هەرگیز گازندەلە بەختی خۆیان ناکەن. زوربەی زۆری خێزان و ماڵ و منداڵی ڕەمەکی و بۆرەپیاوی کوردستان -بەشی زۆری ساڵ- بە نانی هەرزن و گارس و گاڵ ڕایدەبوێرن و لە سەر ئەو بەلەنگازیەشەوە، شوکرانە بژێرن. لە ڕێنانی گەنم و پێخۆری گەرم و ڕایەخی نەرم و ژیانی کامرانی و پێکەوەنانی دراو و ساماندا، ڕووناکەنە دەرگای خونکاران و زۆرداران و هەرگیز دەستیان لە بەر نامەردان پان ناکەنەوە. پادشایانی زلیش چاویان نەبڕیوەتە وڵاتەکەیانەوە و نیازی داگیر کردنیان دەدڵ نەگرتووە. تەنیا بە دیاری بۆ بردن و پێشکەش کردنی پێشکەشی، چاویان لێ دەپۆشن و لێیان گەڕاون.

ئەگەر شەڕیش ڕوو بدا، ئەوا کوردەکان دەبەن و بە گژ دوژمنی خۆیانیدا دەدەن و خۆیانی پێ دەپارێزن؛ دەنا لەوەبەولاوە کاریان بە کاریان نەداوە و وازیان لێ هێناون. خۆ ئەگەر جار و بارەش وا هەڵکەوتبێ پادشایەك لەو پادشازلانە لێ ڕابێ کە کوردستان بخاتە ژێر چەنگی خۆیەوە، زۆری خوێن و ماڵ لێ بەخت کردووە و زۆر بە گرانی لە سەرکەوتووە.

داگیرکەری کوردستان -هەرکێ بووبێ- هەرگا دەستی بۆ ئەم ئاگرە بێ ئامانە درێژ کردووە، لە ئەنجامدا هەر پەشیمان بۆتەوە و لە دوای داگیرکردنیشی‌چاری ناچاربووەدیسان هەر بە خاوەنی پێشووی ئەسپاردۆتەوە. نموونەش گورجستان و شەکی[1] و

---

١- شارێکە لە ئیقلیمی گورجستان.

شیروان[1] و تالش[2] و گەیلان[3] و ڕوستەمدار[4] و مازەندەران[5] ئوستوراباده[6] کە لە باکووری ئێران و بە سەر کوردستانەوەیە.

زۆربەی بەشەکانی کوردستان کەوتوونە سەر مەڵبەند (اقلیم)ی سێهەم و چوارەم؛ چەند شارێك نەبێ لەو پەڕی کوردستانەوە کە زانایان لایان وایە سەر بە مەڵبەندی پێنجەمە.

وا لێرەدا بنووسی زمان لووس و گەوهەربار، نووسینی پێشەکیە هێژا و بەهادارەکەی بڕاندەوە و بە ئاسوودەیی پاڵیدایەوە و پشووی داو لە شەکەتی سایەوە. سا لەمەولا بەرانبەر بەو بڕیارەی کە دەستەبەری بووم، دەست دەکەم بە درێژە پێدانی مەبەست و لە شی کردنەوەی ناوئاخنی ڕووپەڕی یەکەمەوە تێ هەڵدەچمەوە.

ئاواتمە جێگەی پەسنی یاران بێ     وەرویڕکەی دڵی خوێندەواران بێ

---

١- ناوچەیەکە لە نزیك یەریوان. عەونی

٢- شارێکە لە ئێران؛ هۆزی تالشی کورد لەوێن. عەونی

٣- یان «گیلان»، ئێستا ئەستانێکی ئێرانەو شاری ڕەشت بنکەیەتیو لە باشووری دەریای قەزوێن هەلکەوتووە.عەونی

٤- ناوچەیەکە لە نێوان گەیلان و مازەندەراندا. عەونی

٥- ئێستا ئەستانێکی ئێرانە و کەوتۆتە نێوان دەریای قەزوێن و چیای ئەلبورز. عەونی

بە گفتی زانای بەناوبانگی ئێران (سەعید نەفیسی) لە کۆندا ناوی ئەلبورز (هەرەبەرز) بووە. هەژار

٦- شارێکی گەورەیە لە باکووری ئێرانی ئێستایە و لە ڕۆژهەڵاتی مازەندەرانە و بنکەی تەبەرستانە.

# ڕووپەڕی یەکەم

ئەو فەرمانڕەوایانەی کە لە کوردستاندا ئالآی سەربەخۆ بوونیان هەلکردووە و مێژووناسان لە ڕیزی پادشایانیان نووسیون، ئەویش لە پێنج بەندا باسیان دەکرێ:

## بەندی یەکەم

## فەرمانڕەوایانی دیاربەکر و جزیر

لە بەر ئاوێنەی خاوێنی دڵی ڕووناک و پاکی مێژووناسانی زانا و ئاگادارانی ڕۆژگارانی پێشین و ئاگا لە دەنگ و باسان، شتێکی زۆر دیاری و ئاشکرایە کە یەکەمین کوردێکی لە وڵاتی دیاربەکر و جزیر لە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی سەربەخۆ ڕۆنیشتووە و بە پادشاناویانگی ڕۆیشتووە، ئەحمەدی کوڕی مەروان بووە.[1]

---

١- حکوومەتی ئەحمەدی کوڕی مەڕوان لە سەردار و پەردووی حکوومەتی لە بەر یەک هەڵوەشاوی دۆستەکی دامەزراوە.

حکوومەتی دۆستەکی لە دەوروبەری ساڵی ٣٢١.ك (٩٣١.ز) لە لایەن دۆستەك (دۆشتیك) ناوێکەوە -کە لە خانەدانی حەمیدی (حەمودی) بووە- دامەزراوە. کوڕێکی هەبووە بە ناوی بازنەبوشوجاع، ناوی منداڵی حوسێن بووە و نازناوی ئەبوعەبدولآشی لە سەر بووە. ئەو کوڕە ساڵی ٣٢٤.ك لە شاری دیاربەکر هاتۆتە دنیاوە. لە ئازایەتی و پیاوەتیدا بێوێنە بووە. لە بەر ئاکاری چاکی هەموو کەس خۆشی ویستووە و خەڵکی زۆری لە دەورە هاڵاوە. نیازی پادشایەتی لە کەللەی داوە و بۆشی لواوە لە ساڵی ٣٤٥و٣٤٦.ك (٩٥٥.ز)دا لە پاش داگیر کردنی جزیر و ئەسعرد، حکوومەتی خۆی دامەزراندووە؛ ساڵی ٣٤٨.ك (٩٥٨.ز) دۆستیك مرد و قەڵەمڕەوی ئەویش کەوتە دەست بازی جێنشین. ئەویش هەر بەوەندەشەوە نەوێستا؛ ملی لە پان و بەرین کردونەوەی وڵاتەکەی ناو مەلازگورد و ماکۆی داگیر کرد و شارێکیشی بە ناوی شاباز بنیات نا؛ کە لە دواییدا لە لایەن مەلیك عادلی ئەییوبییەوە ناوەکەی گۆڕاوە و بۆتە عادلجەواز. لە نێوان ساڵانی ٣٥٥و٣٥٦.ك (٩٦٣و٩٦٤.ز) ئەرجیش و دیاربەکر و میافارقین و ئورفە و ئەخلات و وان و بەدلیس و←

←گەلێك جێگەیتریشی دەست بە سەردا گرت. میر و مەزنەکانی حەسەنکێف و جزیر و بۆتان و سروج و نووسەیبین هەموو هاتنە بەر فەرمانی و دیاربەکری کردەپاتەخت. ئەلقادروبیلای عەبباسی نازناوی شاباز ئەبووشوجاعی دایە. ساڵی ٣٦٠.ك (٩٦٨.ز) شاباز سکەی بە ناوی خۆیەوە لێدا و لە خوتبەشدا ناوی لە تەك ناوی خەلیفەی عەبباسیدا دەخوێندرایەوە. کاتێ ئەبوتەغلەبی حەمەدانی و عەزدودەولەی دەیلەمی بوو بە شەڕیان، باز یاریدەی عەزدودەولەیدا.
لە پاش مەرگی عەزدودەولە ساڵی ٣٧٢.ك (٩٨٢.ز) باز بە نیازی داگیرکردنی مووسڵ بە لەشکرەوە لە ژەنگار (شنگال)ەوە هات. سەمسامودەولەی کوڕی عەزدودەولەی بە سەرکردایەتی ئەبووسەعید بارام کوڕی ئەردەشێر لەشکری ناردەپێش و هەردوك لەشکر لە باجلایا بە گژ یەکدا چوون و لە پاش شەڕێکی زۆر گەرم و خوێناوی لەشکری سەمسام شکا. دیسان بە سەرکردایەتی ئەبوالقاسم سەعید لەشکری ناردەجەستەی باز؛ ئەمجارەش لە سەر ڕەخی چەمی خاپوور دەگۆ یەکتری ڕاچوون و سەمسام و لەشکری زۆر پیستر لە پێشوو شکان. باز دەم لە سەر پشت ڕاوەدووی نان و دەناو مووسڵی کردنەوە و ئابلۆقەی دان. لە سەر تکای خەڵکی مووسڵ سێ مانگی بۆ دانان کە دەستیان بۆ نەبا و ئەوانیش لەو ماوەیەدا شارەکە چۆڵ کەن. ئەبووعەلی حاکمی فەنیکی بە هێندێك لەشکرەوە بە دیارەوە دانان و بۆ خۆی گەڕایەوە بۆ دیاربەکر و ئیتر مووسڵیشی لە دەست دەیلەمیان ڕزگار کرد و سەر و سامانێکی باشی بە کار و باری مووسڵ داو ئەمجار بە لەشکرەوە بەرەو بەغدا بزووت و نیازی وابوو دەیلەمیەکان لە بەغدایەش دەربەڕێنێ. سەمسام سەرسام ببوو! لەشکرێکی یەکجار زۆری بە سەرکردایەتی زیاد کوڕی کاکۆیە ناردەسەر ڕێبازی باز و لە تکریت تووشی باز هاتن و پێکداهاتن و باز شکا و گەڕایەوە دیاربەکر.
لە پاش ماوەیەك سەمسام و باز پێك هاتن؛ ساڵی ٣٧٧.ك (٩٨٧.ز) باز دووبارە دەوری مووسڵی گرت. لەو دەمەدا لە لایەن شەرەفودەولەی حاکمی بەغداوە، ئەبوونەسرخواشازە بە سەر مووسڵ ڕادەگەیشت. ئەبوونەسر بە لەشکرەوە هات و بەرەنگاری باز بوو. باز زۆری خستە تەنگانەوە و تەنگەی پێ هەڵچنی و ناچاری کرد کە پەنا بە هۆزەکانی عارەبی بەنوعوقەیل و بەنونەمیر بەرێ کە دەهاواریەوە بێن. باز تەلیعەتودەولەی برای خۆی ناردەسەر ڕێگەیان. ئەو لە شەڕدا کوژرا و لەشکرەکەشی شکا. باز دیسان بۆ جاری سێهەم ساڵی ٣٨٠.ك (٩٩٠.ز) هاتەوە سەر مووسل و ئابلۆقەی داو ڕۆژی دووەمی جیمادی دووەم لە جەنگەی شەڕدا ئەسپەکەی گلا و تازە باز لەو کەوتنە هەڵ نەستایەوە.
دەڵێن عارەبێکی عوقەیلی تووشی لاشەی نیوەگیانی هاتووە و سەری بڕیوە و بۆ حەمەدانیەکانی بە دیاری ناردووە و ئەوانیش بۆ بەغدایان بەرێ کردووە لاشەکەشیان لە مووسڵ لە بابالامارە هەڵواسیوە.
لە پاش نەمانی باز، سەرکردەی لەشکرەکەی (ئەبووعەلیحەسەن کوڕی مەروان) کە برازا یان خوارزای بوو، کراوەتە جێنشینی ئەبووعەلی. لەشکری پەرژوبڵاوی خڕ کردەوە و ڕووی کردەقەڵای حەسەنکێف -کە خێزانی شابازی تێدا بوو- لەوێ خۆی بۆ هەموو پێشهات و ڕووداوێك ئامادەکرد و چاوەنۆڕی چارەنووس بوو.
ئەبووتاهێر ئیبراهیم و ئەبووعەبدولاحوسێن حەمەدانی خۆیان لەوە خۆش کردبوو کە هەموو وڵاتی باز داگیر بکەن. بە لەشکرەوە هاتنە بەرەوە و ئەبووعەلی بەرسینگەی لێ برینەوە و دەرەتانی لێ برین و کوشت و بڕێکی تێخستن، هەر دوژمنێکی کە لە مەیدانی شەڕدا کەلاکی نەکەوتبوو، بە لەشی پڕ برینەوە ڕای کرد. ئەبووعەبدولای حەمەدانی بە دیل گرت و بە پیاوەتی بەرەڵای کرد. هاتەوە سەر دیاربەکر و حکوومەتی مەروانی بەناوبانگی تێدا دامەزراندەوە←

لــە ڕۆژگــاری فــەرمانڕەوایی ئــەلقادروبیلای خەلیفــەی عەبباســیدا، دەســەڵاتی ئــەو پادشـاکوردەگەیوەتە چڵەپۆپەی بـەرزی و بـە پایەیـەك گەیـشتووە کـە خەلیفـەی بەغـدا نازنـاوی: نەسرودەوڵەی پێداوە.

ئەحـمەدی کوڕی مەروان هەشتا ساڵ ژیاوە و پەنـجاودووساڵی ڕەبەق لە سەر تەختی پادشـایەتی دیاربەکر و جزیر مەزنایـەتی کـردووە و زۆر بـە شـادی و دڵگوشـادی و کـامڕەوایی و خۆشـگوزەرانی ڕایبواردووە. بە پیاوی خۆیدا دیاری و پێشکەشی زۆری بۆ سـوڵتان تـوغرولی سەلــجووقی نـاردووە و دۆستایەتی و دڵسۆزی خۆی بۆ دەربڕیوە. یەك لەو دیاریانەی کە بـەوی ڕەوا دیـوە، پارچـە یـاقوتێکی نایاب و گرانبەها بووە کە دەیانگوت بە نرخێکی دوور لە ئاوەز لە پادشاکانی دەیلەمی کڕیوە.

فەخرودەوڵە کوڕی جەهیـر -کـە وەزیـری خەلیفـە بـووە- لـە پێـشدا ئـەویش و ئەبولقاســمی مەغریبیش وەزیری ئەحـمەدی کوڕی مەڕوان بوون.

وەك دەگێڕنەوە: هەمیشە سێسەدوشێستوشەش کەنیزی لووس و لەباری هەبووە. هەر شەوێك لە شەوگاری ساڵدا دەگەڵ یەکێکیان خەوتووە و هیچ کەنیزێك لە ساڵێکدا دوو جار چاوی بە کڕیاری خۆی نەکەوتووە! ساڵی ٤٥٣.ك (١٠٦١.ز) بە مردنی خۆی مردووە.

### نەسرودەوڵە کوڕی ئەحـمەد کوڕی مەروان

لە جێگەی باوکی دانرا و جڵەوی فەرمانڕوایی گرتە دەست و بیستویـەك سـاڵی بـێ زیـاد و کـەم بـە چاوەدێری کوڕی جەهیـری وەزیری پادشایەتی کردووە. چەند شەڕ و پێك هەڵپڕژانێك لە نێوان نەسر و سەعیدی برایدا ڕوویداوە. نەسـر لـە میافارقیــن و سـەعید لـە ئامێـد فـەرمانڕەوایی دەکـرد. لـە

---

← و وڵاتەکەی خۆی زۆر لە جاران پان و پۆرتر کردەوە. لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە گەیشتە وان و لـە لای ڕۆژهەڵاتـەوە مووسل و دەوروبەری وەبەرخۆی داو پیاوی خۆی بە سەرەوە دانان. سکەی بە ناوی خۆی لێدەدا. لـە ئەنــجامدا سـاڵی ٣٨٧.ك (٩٩٧.ز) دەست ڕەشێك بە ڕەشەکوژ کوشتی. ئەبووسەعیدمەنسوور برای ئەبووعەلی -کە لە پاش نەمانی باز لە میافارقیــن دەژیا- کرا بە جێنشیــن. ئەویش وەك براکەی بە مشوور و داب و دەستوور بوو؛ سکەی بە نـاوی خـۆی لێدا و وڵاتەکەی زۆر برەو پێدا. لە ساڵی ٤٠٢.ك (١٠١١.ز) دا، شروە کوڕی ماسە -کە خاوەنی قەڵای ئاتاخ و دۆستی زۆر نزیکی ئەبووسەعید بوو- بانگهێشتنی کرد و زۆر بە نامەردانـە میـوانی خـۆی کوشـت. لـە پـاش مـەرگی ئـەو، مەلیکعادل ناسرودەوڵە ئەحـمەدیمەڕوانی هاتە سەر حوکم. جەمیل

ئەنـجامدا نەسر لە مانگی قوربانی ساڵی ٤٧٢.ك (١٠٨٠.ز) کۆچی دوایی کردووە.

### سەعید کوڕی نەسرودەوڵە ئەحمەد

ماوەیەکی زۆر لە ئامێد[1] (دیاربەکر)دا فەرمانڕەوا بووە. لە ڕاست هەژاران و بێچاران زۆردەست گوشاد و دڵاوا بووە و بۆ داماوان و لـێ قـەوماوان پـشت و پـەنا بـووە. ڕەمـەکی و سـوپایی لـە ڕۆژگـاری فەرمانڕەوایی ئەودا بە کامەرانی و ئارامی ژیاون. ساڵی ٤٦٥.ك (١٠٧٣.ز) خوا بۆ خۆی بردەوە.

### مەنسوور کوڕی نەسر کوڕی نەسرودەوڵە ئەحـمەد

لە جێگەی باوکی دانیشت و لە ئەنـجامدا دەگەڵ فەخرودەوڵە کوڕی جەهیـری وەزیردا بوو بە شـەڕیان و تێ شکا.[2] لە پاشانیش جگەرمژ[3]ی فەرمانداندەی لەشکری مووسڵ بە دیلی گرت و کۆت و زنـجیـری خستە پا و پیلی و لە جزیرێ لە ماڵە جوولەکەیەکدا بەندی کرد. تـا لـە مـانگی مـحەڕەمی سـاڵی ٤٨٩.ك (١٠٥٩.ز) دابەر بەزەی خوا کەوت و دنیای ڕوونی بەجێ هێشت. چوار کـەس لـەو بنەماڵـە نەوەدویەك ساڵ فەرمانڕەوا بوون و بە نەمانی مەنسوور لە بەیـن چوون.

---

١- یاقووتی حەمەوی دەڵێ: ئامێد دژێکی قایم و شارێکی ڕێك و پێکە؛ وارشـێکی بـەرز و پتـەوی لـە دەورە کـراوە. ئێستا ئامێد ناوی دیاربەکرە و پایەختی کوردستانی باکوورییە و دەبەردەستی تورکان دایە. عەونی

٢- ئەو شەڕە لە سەر ئەوە قـەوما، دوای ئـەوە مەنـسوور هـەموو وڵاتەکـەی بـاوك و مـامی خـۆی گرتـە دەسـت و حکوومەتی لێ دامەزراند فەرمانیدا لە خودبەدا ناوی دەگەڵ ناوی خەلیفەی بەغدا بـخوێنرێتەوە. خەلیفە بەوە تـووڕە بوو مەلیکشای سەلـجووقی وای کرد دیاربەکر بدرێ بە فەخرودەوڵە کە لـە پێـشدا وەزیـری مـەلیکعـادل ناسـرودەوڵە ئەحـمەدی باپیـری مەنسوور بوو. فەخرودەوڵە بێنمەکی کرد و لە سەردار و نان بدەی خۆی هەڵگەڕایەوە و بە لەشـکری بێگانەوە هەڵیکوتایە سەر دیاربەکر. مەنسوور خۆی لە بەر نەگرت و کشایەوە بـۆ جزیـر و بۆتـان. فەخرودەوڵـە سـاڵی ٤٧٨.ك دیاربەکری گرت و دەوری جزیریشی دا. بنەماڵەیەکی کورد لە جزیرێ هەبوون ماڵی دهانیان پێ دەگوتن؛ لـە بنەوە بوونە پیاوی دوژمن و بە شەو دەرگای قەڵایان بۆ کردەوە و مەنسوور بـەدیل گیـرا و پادشـایەتی لـەو خانەدانـە بنەبڕ بوو. جەمیل

٣- شەمسەدەوڵە جگەرمژ کوردێکی جزیری و لە ماڵی بەنیوەهبان بوو؛ لـە کـن پادشـایانی دۆسـتەکی نۆکـەر بـوو؛ پیاوێکی بەجەرگ و ئازابوو؛ پایەی درایەو کرایە سەرکردە. لە پاشان لە نان بدەی خۆی هەڵگەڕایـەوەو بـوو بـە پیـاوی فەخرودەوڵەو دواییش هەر ئەو جگەرمژە مووسڵی بۆ خۆی داگیـر کرد. جەمیل

## بەندی دووەم

# فەرمانڕەوایانی دینەوەر و شارەزوور

## کە بە حەسنەوییە بەناوبانگن

وەك لە سەر رووپەڕی پڕ لە بیرەوەری مێژووناسان نووسراوە و لە سەر تەتەڵەی یادی دیرۆکنووسان هەڵکەندراوە و هێشتا نە ئەو سڕاوەتەوە و نە ئەم کڕاوە؛ وەها زانراوە کە حەسنەوییە کوڕی حوسێن[1] دەگەڵ ڕوکنودەولە کوڕی بۆیەدا هاوچەرخ بووە و لە ڕۆژگاری ئەودا کاری حەسنەوییە زۆر باڵا

---

١- میرحوسێنی بەرزیکانی سەرکۆمارێك بووە لە شارەزوور. پیاوێکی زۆر دڵاوا و نانبدەبووە؛ گەلێك کوردی لێ کۆ بۆتەوە. ساڵی ٣٣٠.ك دەستی بە وڵات گرتن کردووە. خەلیفەی بەغدایە (متقي لله ابراهيم) لەشکری ناردۆتە سەر، بەڵام زۆر پیس شکاوە و هەرچی گران باریانە دەست کوردەکان کەوتووە. ئیتر لەوە بەو لاوە وڵاتی خۆی زۆر بەرفرەوانتر کردووە.

وندادو غانم -کە دوو برای میرحوسێن بوون و سەرۆکایەتی هۆزی ئایشانی‌یان دەکرد- دینەوەر و هەمەدان و نەهاوەند و سامغان و چەند جێگەیەکیشیان لە ئازربایجان خستبووە دەست خۆیانەوە.

حەسەنوای (حەسنەوییە) هەر بە زیندی سەری باوکی کرابووە جێنشین. ساڵی ٣٤٨.ك میرحەسەن، ساڵی ٣٤٩.ك وندادو ساڵی ٣٥٠.ك غانم لە دنیا دەرچوون و حەسەنوای میراتی میرایەتی باب و هەردك مامانی بۆ بەجێ ما. خاکی ژێر قەڵەمڕەوی هەموو مەڵبەندی ئەهواز و خۆزستان و ئەسەداباد و شارەزوور و گەلێك شوێنی‌تریشی دەگرتەوە.

موعیزودەولەی بۆیە چاوی تەماحی بڕیبووە موڵکی حەسنەوییەوە. لەشکری بەنی‌تەغلەبی حەمەدانی بە سەرکردایەتی یەناڵکوش ناردەسەری. حەسنەوییە لە ڕۆژاوای هەولێر پێشەوبڕەی دایەوە و بە گژیدا هات و شکاندی و هەموو چەك و جبەخانەی دوژمن کەوتە دەست لەشکری کوردەوە. موعیزودەولە لە تۆڵەدا لەشکری ناردەسەر دینەوەر و تالانیان کرد و ئاواییەکانیان سووتاند. حەسنەوییە سەرەڕێی لێ گرتن و خۆی لێ داگرتن؛ بەڵام بەختیان بە کار بوو، دەداوی نەکەوتن. لەو سەردەمانەشدا ڕوکنودەولەی بویە دەگەڵ کوردەکانی گورگاندا زۆر بە توندی شەڕی بوو؛ دەترسا دەرۆستیان نەیە؛ هاواری بۆ موعیزودەولە نارد. موعیزودەولە بۆ ئەوە کە بتوانێ دەهانای ڕوکنودەولە بێ، ناچار دەگەڵ حەسنەوییەدا ڕێك کەوت. بەو مەرجە ئاشت بوونەوە کە حەسنەوییە پەنجا هەزار زێڕ وەرگری و ناویشی لە تەك ناوی موعیزودەولەدا بخرێتە ناو خودبەوە. حەسنەوییە لەشکری بۆ بۆیەکرد و بۆیان چووە سەر کوردەکانی گورگان. ←

چووه. دەگەڵ ئەوەشابێ ئەمەگی کردووه و لە دژی ڕوکنودەوڵە ڕاپەڕیوە. لە سەر ئەوە ڕوکنودەوڵە ساڵی ٣٥٣.ك (٩٦٩.ز) لەشکرێکی گەورە و گرانی بە سەرکردایەتی ئیبنوعەمیدی وەزیری خۆی ناردەسەر حەسنەوییە. حەسنەوییە کە لێکی دایەوە بە لایەوە زۆرگوج بوو ئەو شەڕە بکا؛ بە زمانی خۆش و بە نەرمی هاتە پێش و کەیخودا و ڕیش سپی خستە نێوان و دەگەڵ ڕوکنودەوڵە ئاشت بوونەوە و لەشکر بە دوادا گەڕایەوە[1]

دەڵێن حەسنەوییە دارا و دەوڵەمەندێکی زۆر قورس بووە زۆریش پیاوێکی دەست بڵاو و خاوەن بەزەیی و خێرەومەند بووە. لە خۆراك و پۆشاکی برسی و هەتیوان و لە پەنادانی بێ پەنا و پەسیوان هەرگیز درێغی نەکردووە. ڕۆژی شەممە سێهەمی مانگی مەولوودی ساڵی ٣٦٩.ك (٩٧٩.ز) چاوی لە دنیا پۆشی و بادەی مەرگی نۆشی و لەو دنیا کەوتە خۆشییەوە.[2]

حەسنەوییە

## بەدر کوڕی حەسنەوییە

لە جێگەی باوکی لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی جێگیر بوو؛ ڕۆژبەرۆژ ئەستێرەی بەختی گەشتر هەڵدەهات؛ هەتا وای لێهات کە ساڵی ٣٨٨.ك (٩٩٨.ز) ئەوەندەی برەو سەند، لە دیوانی بەغداوە

---

←ساڵی ٣٥٦.ك شەڕێك لە نێوان عیززەدەوڵە بەختیار کوڕی موعیززودەوڵە و حەسنەوییەدا قەوما. میرحەسەنوای لەو شەڕەشدا سەرکەوت و زۆر ناوی ئازایەتی دەرکەوت. ساڵی ٣٥٧.ك دیسان پێکەوە ئاشت بوونەوە. عیززەدەوڵە دیاری و پێشکێشی زۆری بۆ حەسنەوییە نارد و ڕاشیسپارد ئەگەر بۆی بە گژ ئەبووتەغلەبی حەمەدانیدا بچێ؛ هەتا سەر زابی گەورەی پێ دەبەخشێت. حەسنەوییە لە ئەبووتەغلەب وەخۆ کەوت و لەشکری حەمەدانیانی ڕاو نا هەتا دەناو شاری ڕەققەی پەستاوتن و بە سەرکەوتوویی بە ڕێگەی هەولێر و شارەزووردا گەڕایەوە بۆ دینەوەر. ڕوکنودەوڵە لەو پێکهاتنەی موعیززودەوڵە و حەسنەوییە زۆر تووڕە و تەنگەنەفەس ببوو؛ لەشکرێکی یەکجار زۆری بە سەرکردایەتی ئیبنوعەمیدی وەزیر ناردەسەر دینەوەر و شارەزوور و لە حەسنەوییەی داگیر کردن و ئەوەی لە ناویاندا ڕووی داوە دانەری کتێب پێمانی دەڵێ. جەمیل

١- ئەمینزەکی و حوسێنحوزنی دەڵێن: ئیبنوعەمید لە ڕێگەدا لە نزیك هەمەدان مرد؛ ئەبولفەتحی کوڕی بوو بە سەرکردەی لەشکرەکە. ئەویش دەیەویست بگەڕێتەوە ڕەی، ئەوەك بەشی بخورێ؛ نەك بچێ و تووشی شەڕ بێ. لەبەر ئەوە دەگەڵ حەسنەوییە پێکهات و پەنجاهەزار زێڕی زیانی لەشکرکێشی پێ بژارد و وازی لێ هێنا. جەمیل

٢- لە شاری سەرماج مردووە؛ کە ئەو شارەش هەر خۆی دروستی کردووە و لە شوێنەوارە هەرە گرینگەکانییەتی. جەمیل

نازناوی ناسرووددەولەی بە خەلات پێ دراوە.[1]

هەر لە دینەوەرەوە بگرە تا ئەهواز[2] و خۆزستان[3] و بروجرد[4] و ئەسەداباد[5] و نەهاوەندی[6] -بە قەلا و چیا و دەشتەوە- بە گشتی دەبەر دەستدا بوو. ساڵی ٤٠٥ک (١٠١٤ز) هێرشێکی گەورەی کردەسەر قەلای کوسجەد؛[7] حوسێنی کوڕی مەنسووری[8] لە قەلاکەدا ئابڵۆقە دا. لە ماوەی ئەو ئابڵۆقەدانەدا

---

١- هەر لەو ساڵەدا کە ببووە فەرمانڕەوا، هەڵیکوتایە سەر لای ڕۆژاوای هەولێر و گەلێك قەلای لە دەست دەیلەمان دەرێنا. عەزدودەوڵە لە سەر ئەوە کە باوکی بەدر بە ڕکەبەرایەتی ئەو چووبوو یاریدەی فەخرودەوڵەی دابوو، بیری تۆڵە و ڕکی کۆنی هەر لە زگدا بوو؛ لێ بڕابوو ئەو بنەماڵەی بە یەکجاری لە بنە بێنێ. لە بنەوە فەخرودەوڵە و موئەیدودەوڵە و گەلێکی تریشی لێ هاندا کە تێی هەڵپێچن و دەگژی ڕاچن. بەدر و براکانی -کە ئەبووعەلا و عەبدوڕەزاق و عاسم و ئەبووعەدنان و بەختیار و عەبدولمەلیك بوون- بە هیچ ئاوایەك دانویان پێکەوە نەدەکولا. هێندێك ببوونە قولەچوماغی دەستی دوژمن و بڕێکیشیان خەریکی شەڕ و هەرای خۆبەخۆ بوون. بەختیار کە لە قەلای سەڕماج بوو، ناردیە لای عەزدودەوڵە کە بێت و قەلاکەی بۆ بەجێ دێلم. دوژمن لەو شەڕەبرایە هەلی دەست کەوت و بە پانەوە لەشکری ناردەسەر ئەو بەشە کوردستانە، بە بێشەڕ هەمەدانی گرت. ئەوسا کاربەدەستانی فەخرودەوڵە و هێندێك لە سەر هۆزەکانی کوردی بەرزیکانیش ڕەگەڵ کەوتن و بەرەو نەهاوەند و سەڕماج هاتن و ملیان لە تالان و شڕەخۆری نا. کوڕانی حەسەنەوییە هەموویان هاتن و دەغالەتیان بە دوژمن کرد.

عەزدودەوڵە لە بەدر و عاسم و عەبدولمەلیك خۆش بوو؛ خەلاتی کردن و براکانی‌تریشیانی خستە زیندانەوە. بەدر سەرەڕای ئەوە کە شیر و ئەسپی بە زینی زێڕدۆزەوە بە خەلات درایە، کرایەوە بە مەزنی کوردەکانی بەرزیکان و لەو مەزنایەتیە تازەشی‌دا، زۆری گەشە بە مەڵبەندی خۆی داو گەلێك کاری پیاوانە و خێرومەندانەی کرد.جەمیل

٢- ئەهواز شارێکە لە باشووری ڕۆژاوای ئێران و بنکەی مەڵبەندی خۆزستانە. شوێنەواری شاری سوسەی پایتەختی ساسانیان لە نزیك ئەهوازەوە هەرماوە. عەونی

٣- خۆزستان یان عەرەبستان،مەڵبەندێکە لەوپەڕی باشووری ڕۆژاوای ئێرانەوە؛ لە کۆندا سوسیانەیان پێ دەگوت.عەونی

٤- شارێکە لە ١٨ فرسەخی هەمەدان. عەونی

٥- ئەسەداباد ناوچەیەکە لە نێوان هەمەدان و کرماشان. عەونی

٦- نەهاوەند لە عێراقی عەجەمە؛ شارێکی کەونارایە. ٦٠ کیلۆمیتر لە باشووری هەمەدانەوەیە و هەزار ماڵێك دەبێ. لە سەرەتای ئیسلامدا شارێکی زۆر قەوغا بووە. عەونی

٧- مینۆرسکی لە باسی گۆراندا دەڵێ: «ئەگەر نیاز لە کۆسجەد، گوشخەد بێ -کە قەلایەکە لە کەناری ئەو سفیدروودەی کەوا دەڕژێتە دەریای قەزوێنەوە- وا دیارئەدا مەیدانی شەڕی بەدر زۆر بەرفرەوان بووە؛ بەڵام ئەگەر نیاز لە سفیدروود چەمی سیروان بێ، دیارە مەبەست لە دژی کۆسەجە کە نزیك بە کۆسەی هەجیجی هەورامانە. جەمیل

٨- مینۆرسکی و ئەمین‌زەکی و حوسێن‌حوزنی بە ناوی حوسێن کوڕی مەسعوودیان ناو بردووە. جەمیل

زستانێکی زۆر تووش و سەخت بە سەردا هات و کەس لە بەربەند و بەستەڵەك لە دەرەوە، خۆی نەدەگرت. لەشکرەکەی کە لە سەرمان حەجمینیان لێ هەڵگیرابوو، زۆری دەستەوداوێن بوون کە هەتا ئەو وشکەبەند و سەرمایە بە سەر دەچێ دەست لە گرتنی ئەو قەڵایە هەڵگرێ؛ بە گوێی نەکردن و پێی داگرت کە هەتا نەیگرم بەرهەڵدای ناکەم. ئەوان لەو مقۆمقۆیەدا بوون، لە پڕونەکاو لەشکرێك لە کوردەکانی جوزقان[1] بە سەر ئابلۆقەدەرانیان دادا و دەرەتانیان بۆ نەهێشتن و لەشکری بەدر بەوەندەڕاگەیشتن ڕابکەن و کەوڵی خۆیان دەرباز بکەن؛ ئیتر ئاواتی گرتنی قەڵا بوو بە زیندەخەون.

## هیلال کوڕی بەدر[2]

هەمیشە دەگەڵ باوکی شەڕ و کێشەیان بوو؛ هەر لە ساڵی ٤٠٥ك (١٠١٤ز)ڕا چەند جارێك لەشکریان لە یەکتر کردبوو. لە ئەنجامدا هیلال لە شەڕێکدا -کە دەگەڵ فەخرەلملووکی وەزیری بەغدایە ڕوبەڕوو ببوو- بە دیل گیرا و خرایە گرتووخانەوە.

جەلالودەوڵە کوڕی بەهائودەوڵە کوڕی عەزدودەوڵە کوڕی ڕوکنودەوڵە -کە دەسەڵاتداری بەغدا

---

١- یان جوزقان چەند تیرە و هۆزێکن لە کوردەکانی حەلوان، ئەبووعەبدولاحوسێن جوزقانی لەوانە. هەروەها ناوی گوندێکیشە کە نزیکی هەمەدانە. عەونی

٢- دایکی هیلال لە کوردەکانی شازنجانی بوو؛ بەدر زۆری ڕوو نەدەدایە و هیلالی کوڕیشی خۆش نەدەویست؛ بەڵام ئەبووعیسای کوڕی -کە لە ژنێکی دیکە بوو- ببووە نازداری باوان و هەمەکارە هەر بۆ خۆی بوو. هیلال پیاوێکی زۆر نازای لێ پەیدا ببوو؛ بابی بە دڵ لێی دەترسا. هەر بۆ ئەوە لە خۆی دوورخاتەوە سامغانی دایە. هیلال لە سامغانەوە هەڵیکوتایە سەر کوێخایەکی باوکی لە شارەزوور، کە ناوی کوڕی مازی بووە. کوێخا و ماڵ و منداڵی هەموو کوشتن و شارەزووریشی تاڵان کرد. بەدر لێ بڕابوو تۆڵەی لێ بکاتەوە؛ بەڵام هیلال لە ژێرەوە بە زەبری دراو و دیاری، کاربەدەستانی باوکی لە خشتە برد و کردنیە دۆستی خۆی و بە سەر دینەوەری دادا و لەشکری باوکی ڕاونا و باوکی خۆی بە دیل گرت و ناردیە قەڵایەکەوە کە لەوێدا بژی و دەست لە دنیاداری هەڵگرێ؛ بۆ خۆشی لە جێگەی دانیشت و بوو بە فەرمانڕەوای سەربەخۆ. بەدر بە دزیەوە هاواری بۆ ئەبولفەتحی عەیار و ئەبووعیساشادی نارد کە تۆڵەی بستێننەوە و دژی هیلال بجووڵێنەوە. ئەو دوانە بە لەشکرەوە بە هانایەوە هاتن و ئەبولفەتح کرماشانی گرت و ئەبووعیسا «سابوور- خاست؟»ی تاڵان کرد و هیلال گەیشتە سەریان و هەرتووك لەشکری تێك شکاند و چوار سەد کەسێکی لە دەیلەمان کوشت؛ لەوانە نەوەدیان هەر میر و مەزن بوون. ئەبووبەکری کوڕی ڕافعی حاکمی هەمەدان و ئەبووعیسای بە دیل گرتن. بەدر کە لەم پیلانەیدا سەر نەکەوت ئەمجار هاواری بۆ ئەمیریبەهائودەوڵەی دەیلەمی نارد. ئەویش لەشکرێکی زۆری بە سەرکردایەتی فەخرولملووك ئەبووغالب بۆ نارد. جەمیل

بوو- بیستیەوە کە وا شەمسودەولە کوڕی فەخرودەولـە و کـوڕی ڕوکنودەولـە حەسـەنی کـوڕی بۆیـە، خاوەنی هەمەدان چاوی بڕیوەتە ولاتەکەی بەدرەوە. هیلالی لە زیندان دەرخـست و بـە لەشـکری زۆر و پڕچەکەوە ناردیەوە کە پارێزگاری ولاتی خۆی بکا. لە مـانگی قوربـانی سـالی ٤٠٥.ك (١٠١٥.ز)دا شەڕێکی زۆر گران و خوێناوی لە نێوان هیلال و شەمس و لەشکریاندا ڕووی دا. هیلال لـەو هەنگامـە بەسامەدا خۆی لە بەر تیشکی تیغی جەوهـەردار و موکـاری شـەمس، بـۆ ڕانەگیـرا و سـەری نایـە سەرئاسۆی ئاوابوون و بە دەستی شێـروەشێنانی خوێنڕێژ، بەرەو شەوی بێ ڕانەوەی مەرگ بەڕێ کرا.

## تاهیـر کوڕی هیلال

هیلال باوکی هێشتا هەر لە شارەزوور دەبەندیـخانەدا بوو کە تاهیـری کـوڕی، لـە ترسـی باپیـری[١] نەیوێرا گیـر بی و ڕایکرد و ڕووی کـردەشـارەزوور. لـە پـاش ماوەیـەك بـە نیـازی دەسـت درێـژی و پەنـجەبازی، هاتەوە جەستەی باپیـری و لە لایەن شەمسودەولەوە دەردەست کرا و هەتا سالی ٤٠٦.ك (١٠١٥.ز) لە ناو چواردیواری زیـندانی ڕەشدا بەربەست کرا. لەوە پاش ڕزگار بـوو؛ بـەلام هـەر لـەو سالەدا لە شەڕێکدا کە دەگەل ئەبوششۆکی کرد، بە کوشت چوو.

١- هیلال سالی ٤٠٤ لە شارەزوور گیـرا و شارەزوور درایە دەست پیاوەکانی بەهائودەولەی وەزیر. تاهیـر کوڕی هیلال هێرشێکی لە نەکاوی بردەسەر شارەزوور و لە بێگانەی پاك کردەوە؛ بـەلام هێـشتا تـەواو خـۆی نـەگرتبوو کـە دەگـەل شەمسەدەولەدا پێك هەلپڕژانەوە و ئەو جارە تێشکا و گیـرا و خرایـە زینـدانی هەمەدانـەوە. شەمـسودەولە لـە پـاش ماوەیەك بیستی کە جەلالودەولە شارەزووری داوە بە ئەبولفەتح‌مـحەمەد کوڕی عـەیار. ئەمـەی لـێ خـۆش نـەهات و تاهیـری ڕزگاری کرد و لەشکری دایە کە بچێ شارەزوور بستێنێتەوە. ئەبولفەتح کە سەرکۆماری هۆزی شازنـجانی بوو ئەبوشۆکی کوڕی خۆی بە لەشکرەوە ناردەشەڕی تاهیـر. ئەبوشۆك شـکا و سـەعدی براشـی لـەو شـەڕەدا کـوژرا و تاهیـر شارەزووری لێ ساندنەوە. لە دواییدا ئەبوشـشۆك و تاهیـر ئاشـت بوونـەوە و تاهیـر خوشـکی ئەبوشـشۆکی خواست؛ بەلام ئەبوششۆك خوێنی برای هەر لە بیـر مابوو. لە بنەوە لێی دەخەفتا هەتا لە هەلێکدا کێسی لـێ هێنـا و لە تۆلەی برای خۆیدا کوشتیەوە. ئیتـر لەو ساوە دەولەتی حەسنەوییە کەوتە کەنەفتی و بنەمالـەی عـەیار هاتـە ڕووی کار. جەمیل

## بەدرکوڕی تاهیــر کوڕی هیلال[1]

ساڵی ٤٠٨.ك[2] لە سەر ڕاسپاردەی ئیبـراهیمیەناڵ کرا بە فەرمانڕەوای قومش و دینەوەر.

## ئەبولفەتح کوڕی عەیار[3]

بۆ ماوەی بیست ساڵ فەرمانڕەوای حەلوان[4] بووە. ساڵی ٤٠١.ك (١٠١٠.ز) کۆچی دوایی کردووە. ئەو ئەبولفەتــحە لە بەرەی حەسنەوییەکان نەبووە؛ لە بنەماڵەیەکی دیکەی کورد کەوتۆتەوە. بەڵام هێندێك لە مێژوونووسان ئەویــشیان لــە ڕیــزی فــەرمانڕەوایانی دینــەوەر و شــارەزووردا دانــاوە و قەڵــەمڕەوی حوکمیشی قومش و شارەزوور بووە.

---

١- پاش کوژرانی بابی، خۆی گەیاندەکرماشان و چەند هۆزە کوردێکی لە خۆی کۆ کردەوە و هەڵیکوتا سەر دینــەوەر و حوکمی خۆی لێ دامەزراند. ئیبــراهیم یەناڵ، کرماشانی پێ سپارد؛ بەڵام زۆری نەخایاند لە ساڵی ٤٣٨دا موهەلــهەل -کە لە بنەماڵەی عەیار بوو- پەلاماری داو وڵاتەکەی هەموو لە دەست دەرێنا. جەمیل

٢- ئەم تاریــخە لە شەرەفنامە فارسیەکەی چاپی پتــربۆرگ، ڕووپــەڕ ٢٢دا نووســراوە: «در سنه ثــمان و ثــمانیــن و اربعمایه». هەر لە هەمان ڕووپەڕدا بۆ تاهیــری باوکی دەڵێ: «سنه ست و اربعمایه» لە فارسیەکەی چاپی میــسریــشدا، ڕووپەڕ ٤١ وا نووسراوە: «در سنه ثمان و ثمانیــن و اربعمایــه» واتا لە ساڵی ٤٨٨دا. کەچی هەر لە هەمان ڕووپــەڕدا ساڵی پێ کوژرانی باوکی بەدر ٤٠٦ نووسراوە! هەروەها لە پەراوێزی ڕووپەڕ ٤٢ی چــاپە فارســیەکەی میــسردا دەڵێ: ئیبــراهیم یەناڵ ساڵی ٤٥٠ کوژراوە. لە تەرجەمە عەرەبیەکانی مــحەممەدعەلی عەونی و مەلا جەلیل ڕۆژ بەیانیشدا، هەر بە ٤٨٨ نووسراوە؛ کەچی مەلاجەمیل لە پەراوێزی ڕووپەڕ ٣٩ی شەرەفنامە چاپکراوەکەیــدا دەڵێ: موهەلــهەل ساڵی ٤٣٨ مولکەکانی لە بەدر بڕیوە. بێ گومانــم کە نە ئیبــراهیم یەناڵ پاش ٣٨ ساڵ مردن فەرمان دەردەکــا و نــە کوڕیش لە پاش ٨٢ ساڵ لە جێگەی بابی دامەزراوە! ڕاستەکەی هەر ئەوەیە ٤٠٨ بــووە و هەشــتایەك بــە هەڵــە خــۆی دەناو خزاندووە. هەژار

٣- سەرکۆماری هۆزی شازنــجان بوو؛ کرابووە سەرداری لەشکری بەدری حەسنەوییە و بە ســەر شــارەزوور و قــومش و کرماشان ڕادەگەیشت. حەلوانیش بە دەست ئەبوششۆکی کوڕیەوە بوو. هەر لە ساڵی (٣٥٠.ك)ەوە خــۆی ئامــادەدەکرد کە مەزنایەتی لە دەست ئامۆزاکانی دەرێنێ. حوسێنحوزنی دەڵێ: بنەماڵــەی عــەیار و حەســنەوییە خزمــی یەکتــری بوون. ئەبولفەتح کوڕی عەیار کوڕی میــرحوسێنی بەرزیکانی بووە کە دەبێتە باوکی میــرحەسنەوییە.

٤- کۆنە شارێك بووە لە نێوان کرماشان و بەغدادا و لە سەر چەمی دیالە و ١٩٠ کیلۆمیتــری بــاکووری ڕۆژهــەڵاتی بەغدا هەڵکەوتووە. عەونی



## ئەبوششۆک کوڕی محەمەد کوڕی عەیار

نازناوی حوسامودەوڵە بووە. ساڵی ٤٢١.ک (١٠٣٠.ز) مەڵبەندی قومای داگیر کردووە. هەمیشە دەگەڵ براکانی هەرا و کێشەی بوو. ساڵی ٤٣٧.ک (١٠٥٥.ز) مردووە[١].

## موهەلهەل[٢]

برای ئەبوششۆک بوو، نازناوی ئەبوماجید بوو. ساڵی ٤٤٢.ک (١٠٥٠.ز) خۆی گەیاندەسوڵتان توغرولی سەلجووقی و تکای لێ کرد کە سورخابی برای لە بەند ڕزگار بکا. سوڵتان تکای گرت و سورخابی- کە گرتبوو- بەریدا.

## سورخاب کوڕی محەمەد[٣]

---

١- لە ڕۆژگاری ئەبوششۆکدا عەلائودەولەی کاکۆیە، هەمەدان و دەورویەری داگیر کرد و هێرشی بردەسەر دینەوەر. ئەبوششۆک خۆی لە بەر نەگرت؛ هەڵات و پەنای بە شەرەفودەولەی وەزیر برد. عەلائودەوڵە لە ترسان وازی لێ هێنا و هاتەوە هەمەدان. ساڵی ٤٢٠.ک ئەبوششۆک، ئەبولفەتحی کوڕی خۆی ناردەسەر ڕێی غوزەکان، کە دەوری دینەوەریان دابوو. ئەبولفەتح قەڵاچۆی خستە ناو غوزەکان و تەرت و توونای کردن و ئەبوششۆک بەو سەرکەوتنە ناوی دەرکرد و خەلیفەی بەغدا نازناوی حوسامەدینی دەگەڵ شێرێکی جەواهێربەند بە خەڵات بۆ نارد.

ساڵی ٤٣٠.ک کرماشان و مەڵبەندی کێوات و گەلێك جێگەی تری گرت و ئەبولفەتحی کوڕیشی بۆ جێنشینی دیاری کرد. لە سەردەمێکدا کە ئەبولفەتح لە باتی بابی بە سەر دینەوەر ڕادەگەیشت، قەڵاکانی بکورا و بیزارشا و سند و سامغان و چەند ناوچەیەکی تریشی لە دەست موهەلهەل دەرهێنا؛ بەڵام لە دواییدا موهەلهەل بە سەر ئەودا زاڵ بوو، بە دیلی گرت و لە زیندانی موهەلهەلدا مرد.

٢- بە سەر بکورا ڕادەگەیشت. کاتێ ئەبوششۆک مرد، هەڵیکوتایە سەر سەعدی کوڕی و مەڵبەندەکەی هەموو داگیر کرد. ساڵی ٤٣٨.ک پەلاماری تاهیری حەسنەوییەی داو کرماشانی لێساند. لەشکری ئیبراهیمیەناڵیشی شکاند؛ کە بە هاواری تاهیرەوە هاتبوو. چووە دیدەنی سوڵتان توغرول لە بەغدایە؛ ئەویش داقوق و شارەزوور و سامغان و سیروانی دایە. لە پاشان سەعدی کوڕی ئەبوششۆک بای دایەوە سەری و بە دیلی گرت و بە تکای توغرولیش بەری نەدا و ئیتر لەو ساوە بێ سەر و شوێن چوو. جەمیل

٣- لەو کاتەدا کە ئەبوششۆک و عەلائودەوڵە شەڕیان بوو، سورخاب خۆی گەیاندەداقوق و داگیری کرد. کە ئیبراهیم یەناڵ لەشکری ئەبوششۆکی شکاند، سورخاب چووە سەر سەعدی کوڕی ئەبوششۆک و بەندنێجن (مەندەلی) لێ داگیر کرد و ماڵیشی بە تاڵان برد و ماوەیەك مایەوە؛ چەند جارێك سەعدی بە گژیا هاتەوە؛ تا لە شەڕێکدا سەعدی بە دیل گرت و خستیە زیندانەوە. کوڕێکی سورخاب -کە ناوی ئەبووعەسکەر بوو- لە باوکی خۆی هەڵگەڕایەوە و بە←

دوای ئەوە کە لە بەندی توغرول ئازاد بوو هاتەوە سەر مەڵبەندی ماهەکی[1] و ڕۆژگاری لەوێدا بەسەر دەبرد. چونکە لەوە پێش لە سۆنگەی ئاژاوە نانەوەدا ساڵی ٤٢٩.ك (١٠٤٧ز) خزمەکانی گرتیان و بۆ ئیبراهیم یەناڵیان برد[2]. ئەویش چاوی هەڵکۆڵی و لە بینایی بێبەش کرد.

## سەعدی کوڕی ئەبوششۆك[3]

سورخابی مامی گرتبووی و لە قەڵای خۆیدا بەندی کردبوو. ئەبۆلعەسکەر کوڕی سورخاب لە پاش کوێربوونی باوکی لە بەندی دەرێنا و ئازادی کرد. ساڵی ٤٤٤.ك(١٠٥٢.ز) توغرول بەگ لەشکرێکی زۆر و تەیاری دایە و هاتە سەر عیراقی عەرەب[4] و موهەلهەلی مامی خۆی گرت و خستیە زیندانەوە.

---

← کۆمەگی کوردەکانی هۆزی ماهەکی، لەشکری باوکی شکاند و سورخابی بە دیل گرت و ناردی بۆ ئیبراهیمیەنال و ئەویش هەرتك چاوی کوڵی. ساڵی ٤٤٣.ك موهەلهەلی برای تکای بۆ کرد و بەریان داو قەڵای ماهەکی درایە. ئەمینزەکی دەڵێ: هەر ئەو ساڵە بە کوشت چووە. جەمیل

١- ماهەگی: هۆزێکی کوردن لە دەورەی کرماشان و حەلیلاندا دەژیان. ڕۆژگارێك میرنشینیەکی پچووکیان دامەزراندووە و بە ناوی حکومەتی ماهەگی ناسراوە. جەمیل

٢- ئیبراهیم یەناڵ یان ئینال، برا گچکەی توغرولبەگی سەلجوقی بووە. دژی برای لە هەمەدان شۆڕشی کردەوە و ساڵی ٤٥٠ کوژراوە و لەشکری لێ بڵاوکراوە. عەونی

دوکتۆر مستەفاجەواد لەو مەقالەدا کە لە سەر هۆزی گاوانی حیللەی نووسیوە و لە بەرگی ٤، جزمی ١-١٩٥٦ی *گۆڤاری مجمع‌علمی*دا چاپ کراوە، دەڵێ: ئیبراهیمیەناڵ دایك برای توغرول بەگ بووە. هەژار

٣- مەندەلی بە دەستەوە بوو؛ سورخابی مامی لێی داگیرکرد. لە ڕۆژگاری دەسەلاتی موهەلهەلدا ئیبراهیمیەناڵ لەشکری غوزی ڕەگەڵ خست و چوو حلوانی داگیر کرد و خودبەی بە ناوی ئیبراهیمیەناڵ تێدا خوێنرایەوە. پاش ماوەیەك موهەلهەل لە حلوانی دەرپەڕاند. سەعدی لە مەڵبەندی مامیدا دەستی کرد بە چەتەیی و ڕێگری؛ سورخاب گرتی و کوڕی سورخاب بەریدا و هاتەوە و حلوانی گرتەوە. سوڵتان توغرول قەڵای ڕادندبیینی پێ سپارد. دیسان دەگەڵ موهەلهەلدا بە گژ یەکدا چوون و موهەلهەلی گرت و بە تکای توغرولیش بەری نەدا. لە ژێرەوەش دەگەڵ مەلیك ڕەحیم نێوانی خۆش کرد. توغرول جێگەی ئەوی دابە بەدر بەگ مەنسوور کوڕی موهەلهەل و لەشکریشی دایە کە بچێ شەڕی سەعدی بکا؛ بەڵام بەدر چی بۆ دەگەڵ نەکرا. دوایی بەدر لەشکری زۆرتری کۆ کردەوە و هاتە سەر سەعدی و ساڵی ٤٤٦.ك هەموو وڵاتەکەی لێ داگیر کرد. لەو ساوە حکومەتی سەربەخۆی خانەدانی عەیار هاتە بەر تیری سەلجووقیان و بەدر کوڕی هیلال بۆیان بە سەر شارەزوور و دینەوەر و حلوان ڕادەگەیشت. جەمیل

٤- نیاز بەغدا و بەسرایە. چونکە عیراقی عەجەم بە ڕەی و نەهاوەند و هەمەدان دەڵێن. جەمیل

## سورخاب کوڕی بەدر کوڕی موهەلهەل

نازناوی ئەبولفەوارسە[1] و بە کوڕی ئەبوششۆك بەناوبانگە و ماوەیەك فەرمانڕەوای شارەزوور و قوما بوو. لە پێشوودا قەلاَی جقندکانیان لێ سێنرابوو. ساڵی ٤٩٥.ك (١١٠١.ز) ئەو قەلاَیەشی خستەوە ژێر دەستی خۆی. سورخاب پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند و بەداهات بووە؛ مانگی شەشەکانی ساڵی ٥٠٠.ك (١١٠٦.ز) عەمری خوای کردووە.

## ئەبولمەنسوور[2]

لە پاش سورخابی باوکی بوو بە فەرمانڕەوا. ئەو خانەدانە ماوەی١٣٠ساڵ دەسەلاَتدار بوون.

---

١- لە پاش بابی بە فرمانی توغرول بە سەر شارەزوور و خفتیانگان و داقوق ڕادەگەیشت. دەگەڵ سولتان بەرکیارقی کوڕی مەلیکشاشدا ببووە هاوپەیمان. ساڵی ٤٩٥.ك ئەمیرێکی تورکمان بە ناوی قەرابلیسلغر بە لەشکرەوە هێرشی بردەسەر؛ سورخاب شکاندی. قەرابلی دیسان خۆی سازکرد و هاتەوە سەری، دیسان شکا. دەستی هەر هەڵنەگرت و جاری سێهەم بە لەشکرێکی زۆر و بێ ژمارەوە هات و ئەو جار سورخاب خۆی لە بەر نەگرت و دایە چیا. لەو شەڕەدا هەزار کوردێك بە کوشت چوو. لە دوای شکانەکەی سورخاب، یەکێك لە هەوالاَنی خۆی لێی هەڵگەڕایەوە و دەستی بە سەر قەلاَی خفتیانگاندا گرت.

بەرکیارق لەشکری ناردەسەر کابرای یاغی؛ بەلاَم بە سەد هەزار زێڕ بەرتیل وازی لێ هێنا. سورخاب تەنیا شارەزوور و داقوقی بە دەستەوە مابوو؛ کابرای یاغی ڕۆژێك دەگەڵ برادەرێکی خۆیدا بوو بە دەمەقاڵەیان و یەکیان کوژرا. ئەوی مابوو ناردیەلای سورخاب کە ئەگەر لێی ببورێ قەلاَکەی دەداتەوە. سورخاب سوێندی بەخشینی بۆ خوارد و بەم جۆرە قەلاَی دەست کەوتەوە. ساڵی ٤٩٩.ك بەلك کوڕی بارام کوڕی ئەرتق قەلاَی جانیجاری لە سورخاب داگیرکرد. سورخاب سێ جاران لەشکری لێ کرد، هیچی بۆ دەگەڵ نەکرا. لە دواییدا ناوبژیکەر کەوتنە نێوانەوە و قەلاَکەی درایەوە. جەمیل

٢- حوسێنحوزنی دەڵێ: مەنسوور لە پاش سورخابی برای فەرمانڕەوای شارەزوور بووە. پیاوێکی زۆر بەمشوور بووە و زۆری گەشە بە وڵاتەکەی داوە و بیست ساڵان فەرمانڕەوای سەربەخۆ بووە. جەمیل

# بەندی سێهەم

## فەرمانڕەوایانی فەزلەوییە

### کە بە لوڕیگەورە بەناوبانگن

لە کتێبی *زبدةالتواریخ*[1]دا نووسراوە کە: ئەوانە بۆیە ناوی لوڕیان بەسەردا بڕاوە، لە مەڵبەندی مانڕود گوندێك هەیە ناوی کوردە. لە نزیك ئەوگوندەوە دەربەندێکە بە لوڕی پێی دەڵێن «کول». لە ناو دەربەندی کولیشدا شوێنێك هەیە «لوڕی» پێ دەڵێن. جا چونکە بنەچەکەی ئەو هۆز و تیرانە لەو شوێنە بووە، ناوی خۆیان ناوە لوڕ.

لە مەڕ ناوی لوڕەوە چەند باس و خواسێکی تریش هەیە؛ بەڵام چونکە بەلامەوە گرینگ نەبوون لە نووسینیان خۆ دەبوێرم.

مەڵبەندی لوڕستان دەکرێ بە دوو بەشەوە: لوڕی گەورە و لوڕی بچووك. گۆیا دو برا هەبوون و پێکەوە ژیاون و لە دەوری ساڵی ۳۰۰.ك (۹۱۲.ز) فەرمانڕەوای خاکی لوڕستان بوون.

فەرمانڕەوای لوڕستانی گەورە ناوی بەدر بوو. لوڕستانی بچووکیش براکەیتر بە سەری ڕادەگەیشت؛ کە پێیان دەگوت ئەبومەنسوور. بەدر بۆ ماوەیەکی زۆر مەزنایەتی ناوچەی خۆی کردووە و کە ئەویش مردووە، نەسیرەدینمحەمەد کوڕی هیلال کوڕی بەدر -کە نەوەی بووە- جێگەی باپیری گرتۆتەوە.

### نەسیرەدین محەمەد کوڕی هیلال کوڕی بەدر[2]

---

۱- *زبدةالتواریخ* سێن؛ دوان بە فارسی و یەك بە تورکی. یەکەم لوتفوڵا هیرەوی بۆ بایسنقورمیرزای نووسیوە و ساڵی ۸۳٤.ك مردووە. دووەم جەمالەدینمحەمەد کوڕی عەلیکاشی دایناوە و ساڵی ۸۳٦.ك مردووە. سێهەم مەلامستەفاسافی کردوویەتە سەرباری *تاج‌التواریخ* و تا ساڵی ۱۰۲٤.ك هاتووە. عەونی

۲- ئەمینزەکی لە *تاریخ‌الدول والامارات‌الکردیە*دا دەڵێ: نەسرەدین نەوەی بەدر -لە لوڕستانی گەورە- جێگەی باپیری گرتەوە. لەو سەردەمەدا نیوەی لوڕستان بە دەست کوردەکانی شوولەوە بوو. سەرۆکیان سەیفەدین بوو. گوایە بنەماڵەیان لە ڕۆژگاری ساسانیانەوە هەر فەرمانڕەوا بوون. جەمیل

دوای ئەوە کە بوو بە فەرمانڕەوای لوڕستانی گەورە، محەممەد خورشیدی کردەوەزیری خۆی. ساڵی٥٠٠.ك (١١٠٦.ز) کوردەکانی چیای سماق[1] لە وڵاتی شام، خۆیەخۆ بەگژ یەکدا هاتن و لەوانە٤٠٠ ماڵیان ئاوارە و پەڕەوازە بوون و ڕوویان کردەلوڕستان و لە لای هۆزەکەی خزمی محەممەد خورشید گیرسانەوە.

ڕۆژێك لە ڕۆژان یەکێك لە نەتەوەی محەممەد خورشیدەوەزیرەکە -کە ئەویش وەزیری فەرمانڕەوا و خۆشەویستی کوردەکانیش بوو- نان و خوانێکی جوانی ڕازاندەوە و زۆر کەسی بانگێشتن کردبوو. لە کاتی نان داناندا ئەبولحەسەنی فەزلەوی -کە سەرۆکی کوردەئاوارەکان بوو- سەرەگایەکی لە پێش داندرابوو. ئەبولحەسەن ودمی سەرەگای بە لاوە پیرۆز بوو؛ بە دەستە و بەستەکەی خۆی گوت ئێمە دەبین بە سەرداری ئەم گەلە.

ئەبولحەسەن کوڕێکی هەبوو ناوی عەلی بوو. ڕوژێك چووبووە ڕاو؛ سەگێکیشی دەگەڵ خۆی بردبوو. تووشی هێندێك دز و چەتان هات و بوو بە شەڕیان و عەلی بریندار کرا و لە هۆش خۆی چوو. دزەکان نەیاندەزانی بووراوەتەوە، وایان زانی مردووە. لە لینگی نەوین و ڕەکێشیان کرد و لە ناو ئەشکەوتێدا ڕایان کێشاو بەجێیان هێشت. سەگەکە بەرەودوا کەوتە شوێن دزان و شوێنی ون نەکردن و دەنیوە شەودا -کە دز دەخەودا بوون- پەلاماری کابرای سەرتەریدەی داو گازی لە باتونی گرت و تا نەیکوشت بەری نەدا. ئەمجارە بە هەڵداوان ڕای کرد و خۆی بە ماڵە عەلیدا کردەوە. نۆکەرانی عەلی کە سەگیان بە دەمی خوێناویەوە دیت، ترسان کە عەلی شتێکی بە سەر هاتبێ. سەگیان دایە پێش خۆیان و ڕاست بردنیە سەر ئەو ئەشکەوتەی کە عەلی تێدابوو. عەلیان بە برینداری هێنایەوە و دەرمانیان کرد و لە مردن خەلەست و لە پاش ئەو کارەساتەش گوایە ماوەیەکی زۆر هەرماوە.[2]

لە پاش مردنی عەلی، محەممەدی کوڕی ڕووی کردەلای بەرەی سولغور کە لەو سەردەمەدا

---

١- کەژێك و بانوێکە لە ڕۆژاوای حەڵەب و نزیکی ئەسکەندەروونەیە. عەونی *دائرةالمعارف*، بەرگی ٣ دەڵێ: ئەو هۆزە کوردەدەگەڵ مەزنە فەزلەویەکەیان لە چیای سماقی وڵاتی سووریاوە چوونە میافارقین و لەوێوە ڕوویان کردەئازربایجان و گەیلان و پەیمانێکیان دەگەڵ میری گەیلان (دیباجی) بەست و لەوێوە هاتنە لوڕستان و ساڵی ٥٠٠.ك (١١٠٦.ز) لە باکووری شوتورانکوە دامەزران. جەمیل

٢- *تاریخی عمومی* دەڵێ: ئەو عەلیە بۆ ماوەیەك مەزنایەتی هۆزی خۆی کردووە. جەمیل

فەرمانڕەوای وڵاتی فارس بوون؛ بەڵام هێشتا ناوی پادشایەتیان لێ نەنرابوو. محەمەد بە ئازایەتی ناوبانگی دەرکرد و زۆر زوو توانی جێگەی خۆی بکاتەوە و پایە و ڕێزی زۆری پەیدا کرد.

لە پاش مردنی محەمەد، ئەبوتاهیری کوڕی ببووە پیاوی باوەڕپێکراوی ئەتابیکسونقور و ئەوەندەبەئازا و نەترساو ناسرابوو کە سونقور لە خۆی جیا نەدەکردەوە و پشتی خۆی پێ سپاردبوو.

ئەتابیکسونقور دەگەل هۆزی شوانکارە[1] شەڕی بوو. ئەبوتاهیری بە لەشکرێکی گەورە و گرانەوە ناردەیاریدەی لەشکریانی خۆی. ئەبوتاهیر بە سەر دوژمناندا سەرکەوت و بە سەربەرزی گەڕایەوە بۆ فارس. ئەتابیک زۆری ئافەریم لێکرد و گوتی بخوازەماڵی دنیایە! ئەبوتاهیر داواکاری ئەسپێکی ئەتابیک بوو؛ پێی بەخشرا. هەمیسان گوتی بخوازە! ئەمجار داوای درۆشمی ئەتابیکی کرد؛ ئەویشیان هەر بۆ پێك هێنا. دیسان گوتی لێم بخوازە! ئەبوتاهیر لە وڵامیدا گوتی زۆر پێم خۆشە ئەتابیک بمنێرێتە سەر لوڕستان؛ دەمەوێ ئەوێش بگرم و بیخەمە ژێر قەڵەمڕەوی ئەتابیکەوە. ئەتابیك سونقوڕ ئەم وەرامەی زۆر لێ خۆش هات و بە لەشکرێکی بەکار و زۆر و ساز و تەیارەوە ڕەوانەی لوڕستانی کرد.

## ئەبووتاهیر

### کوڕی محەمەد کوڕی عەلی کوڕی ئەبولحەسەنی فەزلەوی

ئەبووتاهیر لە دوای ئەوە لە یارمەتیدانی سنقور پشتئەستوور بوو، خۆی گەیاندەسەر سنووری لوڕستان و جار بە شەڕ و گا بە ئاشتی و تاوێکی بە توندوتیژی و زۆر جار بە نەرمی و نیانی، توانی دەست بە سەر خاکی لوڕستاندا بگرێ. کاتێ کە خۆی دیتەوە وا خاوەن زۆر و دەستەڵات دارە و کاری بە نۆکەری کردن نەماوە، ئارەزووی سەربەخۆ بوونی کەوتە کەللە و لە ئەتابیکی ئاغای خۆی

---

١- هۆزێکی کوردی زۆر ئازا و نەبەردەو لە پێنج تیرە پێك هاتووە. ڕۆژگارێك لە ناو جەرگەی فارسدا حکوومەتی سەربەخۆیان هەبووە و نزیکەی سەدوپەنجا ساڵ ئەو حکوومەتە هەر ماوە. دامەزرێنەری حکوومەتی شوانکارە ئەمیرفەزلەوییە کوڕی عەلی کوڕی حەسەنی ئەییوبی بووە. جەمیل

حکوومەتی شوانکارە ساڵی ٤٢١.ك (١٠٣٥.ز) دامەزراوە و تا ساڵی ٧٥٦.ك (١٣٥٥.ز) هەر بەردەوام بووە. *کورد و کوردستانی* ئەمینزەکی، تەرجەمەی محەمەدعەلی عەونی، چاپی بەغدا، ڕووپەڕ ١٣٧. هەژار

هەڵگەڕاوە و فەرمانی داکە هەموو کەس دەبێ پێی بڵێ ئەتابیک. ئیتر لەوساوە کوڕ و کوڕەزاکانی ویش هەر دایانە سەر ئەو شۆپە و بە زۆپە بوون بە ئەتابیک.

لە ڕاستی‌دا ئەم زنجیرە، ئەتابیکی بەڕاستی نین و زرە ئەتابیک بوون؛ چونکە ئەتابیکی ڕەسەن ئەوانە بوون کە پارێزگاری سنووریان پێ دەسپاردن و پادشایانی سەلجووقی منداڵیان پێ بەخێو دەکردن و دەبوایە شازادەکانیش بەو لەلانە بڵێن ئەتابیک واتا باوکەبەگە.[1]

پوختەکەی ئەمەیە: ئەبووتاهیر بە نۆکەری لە کن ئەتابیکسنقور بوو. ساڵی ٥٥٠.ك (١١٥٥.ز) لوڕستانی بە ناوی سنقوری گرت و بۆ خۆی ئاڵای سەربەخۆیی تێدا هەڵکرد و هەتا ساڵی ٥٥٥.ك (١١٦٠.ز) بەوپەڕی سەربەستی فەرمانڕەوایی کرد و بە ئازایی ژیا و بە ئازادی مرد. پێنج کوڕی لە پاش بەجێ مان: هەزار ئەسپ، بەهمەن، عیمادەدین پەهلەوان و نەسرەتەدین ئیلواکوش، قزڵ ئەتابیک.

## هەزار ئەسپ

لە سەر دوا ئەسپاردەی باوك و بە قۆڵ لە سەر کێشانی تێکڕایی براکانی و هەموو هۆز و تیرەکانی وڵات، هەزار ئەسپ کرا بە فەرمانڕەوای سەربەخۆ لە ناو هەموو لوڕستاندا. لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی هەزارئەسپ، ئەو مەڵبەندەبە دەستوورێك پەرەی گرت و گەشەی کرد و بە خۆدا هات و بڕەوی سەند، کە بەهەشتی بەرین هەزار خۆزگەی بە لوڕستان دەخواست. لە هەموو سووچ و کەناران و لە لادێ و لە شارانەوە، لە دەشت و کۆسارانەوە، لە نزیك و لە دوورەوە، هەروا خێڵات و ڕەوەند و کۆچەر بوون سەرەوژێر و سەرەوژوور وەك شارە مێروو ڕچەیان دەبەست و ملەیان دەکرد و ڕانەدەوەستان و لەڕا دەوەستان و ڕوویان دەکردەلوڕستان و خۆیان دەگەیاندەژێر سێبەری ئاڵای ئازادی و سەربەخۆیی کوردستان.

لە ڕاستیدا لوڕستان لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا ببووە چاری بێچاران و دەرمانی دەردەداران و هەتوانی برینداران و بژیوەری هەژاران و ئەنوا و پەنای بێپەسیوان و بزەی سەرلێوی خۆشی نەدیوان و

---

١- پێنج بنەماڵەی فەرمانڕەوا لە کوردستاندا ئەو ناوی ئەتابەکەیان پێوە بووە: فەرمانڕەوایانی ئەرتقی و حوکمدارانی شاەئەرمەن و پادشایانی زەنگی و ئەتابیکانی ئازربایجان و ئەتابیکانی لوڕستان. جەمیل

ماڵی باوکی سێوی و هەتیوان و جیٚسانەوەی شەکەتان و فریاڕەسی داماوان. نەك هەر بۆ کوردان یانەی بووژانەوە و لانەی حەسانەوە بوو، بۆ زۆر تیرە و ڕەگەزی جۆربەجۆری تریش مایەی هومێد و جێگەی هانا بوو. چەندین هۆزی عارەبی وەك عوقەیلیەکان -کە دەچوونەوە سەر عوقەیلی کوڕی ئەبووتالب و هاشمیەکان کە لە نەتەوەی هاشمی کوڕی عەبدی مەناف بوون- دەخۆ نووسان و لە لای شامەوە و لە ئالی چیای سماقەوە باروبنەیان پێچا و لە هیچ کوێ ئاوڕیان نەداوە و لوڕستان بگرە و هاتم! گەلێك و گەلێك هۆز و خێڵی کوردی لاوەکی‌تریش لە هەموو لایەکی کوردستانەوە بەرەو قەڵای ئازادی بزووتن و لە لوڕستانی سەربەخۆدا دامەزران و لە ژێر چەپۆکی بێگانان خەلەستن و ڕۆژی ڕەشیان کۆتایی پێ هێنا. لەو هۆزە کوردانە ئەوانەی ناویان زانراوە ئەمانەن:

١- ئەستەرکی ٢- مەماکۆیە ٣- بەختیاری ٤- جوانەکی ٥- بیٚدانیان ٦- زامەدیان ٧- عەلانی ٨- لووتوەند ٩-بتوەند ١٠- پوازەکی ١١- شنوەند ١٢- ڕاکی ١٣- خاکی ١٤- هاروونی ١٥- ئەشکی ١٦- کۆیی ١٧- لێراوی ١٨- مۆیی ١٩- بەحسەفوویی ٢٠- کەمانکەشی ٢١- مووماستی ٢٢- ئۆمەکی ٢٣- تەوابی ٢٤- گراوی ٢٥- مەدیحە ٢٦- ئاکورد ٢٧- کۆلارد.

گەلێکیش هۆز و تیرەی دیش کە نازانین سەر وە کێ بوون و لە پێشدا لە کوێ بوون، ئاوەکی بوون و لە لۆڕستان گیرسانەوە و بە تێکەڵاو بوونی ئەو هەزارە زیلەی حەشاماتە، دەگەڵ دانیشتوانی لوڕستانی هەزارئەسپ و برایانی، کاروباری لوڕستان ئەوپەڕی باری لە باری گرت و گەشە و هێز و پێزێکی وای پەیدا کرد کە بە بیری بیریشدا نەیە. لەشکری نەبەزی لوڕستان زۆر زوو شوولستان[1]یشی دەس بەسەردا گرت و خستیە سەر لوڕستانەوە. دەسەڵاتی هەزار ئەسپ هەزار ئەوەندەی پێشوو پتەوتر و ناوبانگی دادگەری و شکۆ و سەروەری- سەد هەزار هێندەی بەرێ- وە بڕەو کەوت. هەموو زەوی و بەیارێك، لە هەر ئاقارێك، هەروا تۆزێك نەرمان با و بۆکێڵان دەستی دابا، جووتی لیٚ کرا و تۆوی لیٚ خرا و کرا بە مووچە و مەزرا و ئاوەدانی و گوندی قەوغای لە دەورە دامەزرا. سەروبنی لوڕستانت پشکنیبا، بستە خاکێك نەمابوو کە شێوی نەبڕن و بەوەرد و سیٚگاسنە، دایەنەدڕن و لە سەری وەرزی

---

١- مەڵبەندێکە لە ئەستانی فارس و بە ناوی هۆزی شولی کوردەوە ناو نراوە؛ کە لە سالی ٥١٩.ك دالە موکوریانی ئازربایجانەوە چوون و لەوێ نیشتەجێ بوون. لەو بارەوە شاعیرێك دەڵێ:

جە کوردانی شاهێن و ڕاوەند و شوول     فرە لەشکر ئاما وە لای دێزفول     جەمیل

خۆیدا خەلە و خەرمانی لێ هەڵنەگرن.

دەرگای خۆشی و کامەرانی بە ڕووی گەلی کورددا لە سەر گازی پشتێ کرایەوە و لەو ڕۆژگارەدا، لەو مەڵبەندەسازگارەدا، کەست نەدەدی کە لە بەختی ڕەش و ناهەموار و لە ژانی پڕ لە ناسۆر و دژوار، گلە و گازندەیەك بکا. ئەو بەختەوەری و دادگەرییەی هەزار ئاسپ -بە هەزار ئاوازە- لە دنیادا دەنگی دایەوە.

خەلیفەی بەغدایە بە ناوی ڕێز لێنان و باربووکردنەوە، بەلگەی فەرمانداری بۆ نارد؛ واتا: من پێم خۆشە کە لە قەڵەمڕەوی خۆیدا سەربەخۆیە! هەروەها بە دیاری و خەڵاتی زۆر گرانبەها و ئافەریم و دڵدانەوەی پیاوانەش بە سەری کردەوە.

هەزار ئەسپ ساڵی ٦٥٥.ك (١٢٧٥.ز) گیانی پاکی بە خودای تاك سپارد و ئەو دڵە چاکەی ئاوێتەی خاك بوو.

## ئەتابیك توكلە كوڕی هەزار ئەسپ

دایکی توکلە لە بنەماڵەی سولغوری بوو؛ کە ئەوانیش بە بنەماڵە پادشابوون. لە پاش مەرگی باوکی لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی لوڕستان ڕۆنیشت. لە کاتێکدا کە دەنگوباسی نەمانی هەزار ئەسپ گەیشتە فارس، ئەتابیك سەعدی سولغوری -کە لە دەمێکەوە نێوانی دەگەڵ هەزار ئەسپ و توکلەدا ناخۆش بوو- هەلی بە دەرفەت زانی و هەڵیکوتایە سەر لوڕستان و شکا. دوو جاریتریش بە لەشکرەوە هاتەوە سەر توکلە و جارلەجار خراپتر دەشکا و لەشکری کورد ڕاوی دەنا و هێزی توکلە سەردەکەوت.[1]

---

١- ئەمینزەکی دەڵێ: سەعد بە دوو هەزار کەسەوە -بە گفتی تاریخی عمومی بە دەهەزارەوە- هێرشی هێنا و سەرکردەی لەشکرەکەشی جەماڵەدینعومەری ئامۆزای هەزارئەسپ بوو. لەشکری توکلە پێنجسەد کەس بوون. لە نزیك قەڵای ئیرویە دەگژ یەك ڕاچوون. زۆری نەمابوو توکلە بشکێ تیرێکی لە نەکاو، جەماڵەدینی پێکا و لەشکرەکەی بڵاوەی کرد. سێ جاری تریش لەشکری سولغوری هاتنەوە سەری و هەرسێك جارەکانیش زۆر پیس شکان. توکلە هێندێك لە وڵاتی لوڕی پچووکی لە حسامەدینخەلیل گرت. لە دواییدا خەلیفەی بەغدا لێی ڕەنجابوو؛ لە خۆزستانەوە بە سەرکردایەتی بەهائەدینگەرشاسپ و عیمادەدین یونس، لەشکری ناردەسەر لوڕستان. هێندێك ناوچەیان گرت←

ساڵی ٦٥٥.ك (١٢٧٥.ز) کە هولاکۆخان بەرەو بەغدا دەچوو، توکلە چاوی پێکەوت و ئامادەیی بۆ خزمەتکاری نیشان دا. لە سەر فەرمانی هولاکۆ، توکلە ڕەگەڵ تومان[1] کیتمۆ قانۆییـــن خـرا. لـە پاش ئەوە کە هولاکۆ بەغدای گرت، ڕۆژێك بۆیان گێـڕایەوە کـە وا توکلـە بـە کوشـتنی خەلیفـەی[2] و قڕکردنی موسوڵمانان زۆر پەرێشان و خەمگیـنە. هولاکۆ زۆر ڕقی هەستا و دەیەویست توکلە بکوژێ. توکلە هەستی کرد کە بەڵا نزیکە؛ بە بێ ئەوە خۆی نیشانی خان داو داوای گەڕانـەوەی لـێ بکـا، لـە بەغدا دەرکەوت و بەرەو لوڕستان هاتەوە. هولاکۆخـان کیتمۆ قانۆییـــن و چـەند سـەرکردەیەکی‌تـری تەتەری بە لەشکرەوە ناردەسەر لوڕستان کە توکلەی بۆ دەردەست بکەن. وا ڕێکەوت ئەو مغولانـە لـە ڕێگەدا تووشی ئەڵب ئەرغون برای توکلە بوون کە بەرەو سوپاگەی هولاکۆ دەهـات، گرتیـان و دەگـەڵ خۆیاندا هێنایانەوە بۆ لوڕستان. توکلە نەیتوانی زۆر خۆی لە بەر لەشکری مغـول بگـرێ، بـە ناچـاری پەنای بەقەڵای «مانـخست[3]؟» برد و لەوێدا خۆی قایم کرد. تـەتار دەوریـان لێگـرت و سـەرکردەکانی مغول جارێك بە هەڕەشە و گوڕەشە و جارێك بە دڵدانەوە و لاواندنەوە دەیهاتنێ کە خۆی بـە دەسـتەوە بدا بەهرەی نەدا. هەتا سەرئەنـجام هولاکۆ مێنەکەی دەستی خۆی بۆ نارد؛ کە نیشانەی لێبوردن بوو. ئەوسا توکلـە هاتـە دەر و خـۆی دایـە دەسـت تـەتاران و ڕەوانـەی تـەورێزێیان کـرد. لـە پـاش لـێ پرسیـنەوەیەکی کەم و بە سەر داسەپاندنێکی زۆر، فـەرمانی کوشـتنی درا و لـە تـەورێز کوشـتیان و

---

← و تالآنیان کرد. برایەکی توکلەشیان بە دیل گـرت و لـە قـەڵای لاهـوجدا خـستیانە بەندیـخانەوە. توکلـە خـۆی گەیاندنی و لەشکری خەلیفەی شپرزە کرد و عیمادەدین یونسی کوشت و بەهائەدین‌گرشاسپی گـرت و دەگـەڵ براکەیـدا پێکی گۆڕینەوە. جەمیل

١- لەشکرێکی دەهەزار کەسی تومان، بووە. تومان لە تورکیدا بۆ دەهەزاری دراویش دەکار هاتووە.

٢- «مستعصم‌بالله» کوڕی «مستنصرباللە» دوامیـن خەلیفەی عەبباسی، ساڵی ٦٤٠.ك (١٢٤٢.ز) کرا بە خەلیفـە و ساڵی ٦٥٦.ك (١٢٥٨.ز) هولاکۆ کوشتویە. هێندێك دەڵێن لە ٢٠ی مـحەڕڕەمدا کوژراوە و هێـندێکیش بـە جـۆری تری دەڵێن. جەمیل

٣- ڕۆژهەڵاتناسی ڕووس زێرنوف، نیشانەی پرسی لە سەر کردووە. وەدیارە بە ڕاستی نەزانیوە هێندێك لە مێژوونووسان بە جانبخشستیان نووسیوە. جەمیل

دەبێ جانبخش (جانبەخش) بێ و ئەگەر جانبخشست نووسراوە، «است» بە فارسی -کـە نیـشانەی خەبـەرە- کەوتۆتـە شوێنی و هەمزەکەش بەرانبەر بە دەستووری نووسینی کۆن، لە ناو دەچێ. واتا ئاوا بووە «قلعەی جانبخش است»: قەڵای گیانبەخشە. هەژار

پیاوەکانی لاشەکەیان دزیەوە و هێنایانەوە لوڕستان و لە گوندی زەردە، بە خاکیان سپارد.

## ئەتابیک شەمسەدین ئەلپ ئەرغون

لە پاش کوژرانی توکلە، هولاکۆ فەرمانی بۆ ئەلپئەرغونی برای دەرکرد کە ببێتە جێنشینی توکلە و بە سەر لوڕستان ڕابگا. پازدەساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد و لە ڕۆژگاری ئەودا لوڕستان کەوتە ئەو پەڕی گەشە و خۆشیەوە. ئەلپئەرغون -کە خودای گەورە بۆ خۆی بردەوە- دوو کوڕی لە پاش بەجێ مان: یوسفشاو عیمادەدین پەهلەوان.

## ئەتابیک یوسفشاکوڕی ئەلپ ئەرغون

لە پاش مەرگی باوکی -بە فەرمانی «ئەبقاخان»ی کوڕی هولاکۆخان- کرا بە فەرمانڕەوای لوڕستان. بەڵام لە بەر ئەوە کە دەبوایە هەمیشە بە دووسەد سوارەوە دەگەڵ ئەبقاخاندا بوایە و هیچگا بەجێی نەهێشتایە، ناچار بوو کاروباری لوڕستانی بە هێندێك لە کاربەدەستانی باوەڕ پێکراوی بسپێرێ.

ئەتابیک یوسفشالە گەلێك شەڕ و هەرایاندا خزمەتی زۆر هێژای بە ئەبقاخان کرد[1] و بە ئازایەتی و گیانبازی خۆی، بۆ ئەبقاخانی دەرخست کە پیاوێکی دڵسۆز و بێ پێچ و پەنایە و توانی دڵی خانێ بەرەو خۆی ڕابکێشێ و خان دەیزانی یوسفشاهەرگیز کارێك ناکا کە دڵی پێ بێشێ.

ئەبقاخان پێ ڕاگەیشتنی وڵاتی خۆزستان و کوهکیلۆیە[2] و شاری فەیرووزان و جەربادقانیشی هەر بە یوسفشائەسپارد.

لە دوای مردنی ئەبقاخانیش ئەحمەدخانی کوڕی، زۆری ڕێز لە یوسفشادەنا و هەرگیز لە خۆی دوور نەدەخستەوە. پاش کوژرانی ئەحمەدخانیش ئەرغونخانی برازای وی -کە ببووە خان- یەکجار

---

١- کاتێ ئەبقاخان و بوراقخان شەڕیان بوو، بە لەشکری لوڕستانەوە کۆمەگی زۆر باشی ئەبقاخانی کرد. هەر وەها دەگەڵیدا چووە سەر گەیلان و وڵاتی دەیلەم. لە وەختێکا کە هێندێك لە دەیلەمان پەلاماری ئەبقاخانیاندا و دەورەیان گرت، یوسفشا دەفریای هات و لە مەترسی ڕزگاری کرد. کە لەو سەفەرەش گەڕاوە، چووە کۆهکیلۆیە و هێرشی بردەسەر هۆزی کوردی شوول -کە لە ناوچەی مامەسینی بوون- میرەکەیانی کوشت و لە بەر یەکی بلاو کردن. جەمیل

٢- مەڵبەندێکە لە نێوان شووش و فارسدا.

زۆری دەگەڵ باش بوو.

ئەرغونخان یوسفشای ناردەئیسفەهان کە بچی و خواجە شەمسەدین ساحێب دیوانی بۆ بانگ بکاتە ناو هۆردوو. یوسفشالە ڕێگە تووشی خواجە شەمسەدین هات؛ کە هەر بۆ خۆی بەرەو هۆردووی خان دەهات؛ دەگەڵی گەڕایەوە. ئەرغونخان هەر لەوێ خواجە شەمسەدینی کوشت. یەکێك لە زانایان لە شینی خواجە شەمسەدیندا گوتوویە:

لە وەتا تیشکت بێ سەر و شوێنە ئاسۆ لە شینندا شەلاڵی خوێنە

مانگ جگەرسووتاو، زوهرە ڕەنگ زەردە شەوگار ڕەشپۆشە و هەناسەسەردە

ئەتابیك یوسفشالە ئاخروئۆخری ژیانیدا ئیزنی لە ئەرغونخان خواست کە بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی و لە ناو خزم و کەسانیدا ڕۆژگاری بەسەر بەرێ. خانیش زۆر بە ڕووی خۆشەوە ئیزنیدا و بەڕێی کردەوە. یوسفشاگەیشتەوە لوڕستان و لەوێوە دەچووە کوهکیلۆیە، لە ڕێگە خەونێکی زۆر پەرێشانی دیت و گەڕایەوە. زۆری پێ نەچوو لە ساڵی ٦٨٤.ك (١٢٨٥.ز) دابە یەکجارەکی سەری نایەوە. دوو کوڕی لە پاش بەجێ مان: ئەفراسیاب و ئەحمەد.

## ئەتابیك ئەفراسیاب کوڕی یوسفشا

لە سەرفەرمانی ئەرغونخان ئەفراسیاب کرا بە جێنشینی یوسفشاو هاتەوە بۆ لوڕستانێ. ئەحمەد براشی لای ئەرغونخان هێشتەوە کە لە خزمەتیدا بێ.

ئەفراسیاب پیاوێکی دەست و دڵڕەش و ڕووکەش و زۆرکار و زۆردار و بێبەزە و خوێنڕێژ و بێفەڕ بوو. وەك دووپشك وابوو؛ بگەیشتایە هەر چیەك، چزوێکی تێڕا دەکرد؛ زیانی بە هەمووان دەگەیاند. تەنانەت دۆست و کاربەدەستانی باوکیشی لە گەڕوگزی و گەزندەیی ئەو نەخەلسی بوون. پەلپی بەم دەگرت و بەهانەی بەو دەگرت و هەر ساتە گۆڵمەزێکی دەنایەوە؛ تالانی دەکردن و دەیکوشتن و لە سەر کاری دەر دەکردن و بە پیاوی خوێری و تۆری جێگەی پڕ دەکردنەوە. وای لێهات زۆربەی پیاوماقووڵان و کەیخودایانی لوڕ، لە بەر دەستی ڕایان کرد و پەنایان بە ئیسفەهان برد.

ئەفراسیاب پدەرقزڵ ناوی ئامۆزای خۆی نارد کە بچێ ئەو پەنابەر و هەڵاتووانە لە ئیسفەهاندا

بگرێ و دەستبەستە بۆ لوڕستانیان بەڕێ کاتەوە. لەو سەروبەندانەشدا دەنگ داکەوت کە ئەرغونخانی مغول مردووە. پەدەرقزڵ دەرفەتی لەو هەلە هێنا و دەگەڵ سلغورشادا ڕێك کەوت و خـۆی لـە مغـولان یاغی کرد.

بایدو[1] -کە سەردار و سەر دارۆغەی ئیسفەهان بوو- بە دەستی ئەو قزڵـە کـوژرا و فەرمانیـشی داکە خودبە لە سەر بەرزەکان بە ناوی ئەفراسیابی‌ئەتابیك بـخوێنرێتەوە. ئیتـر لەو ڕۆژەوە ئەفراسیاب سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند و گورجێك چەند کەسێکی لە پیاوانی تایبەتی خۆی دانـا کـە حکوومـەتی عیراقی[2] بۆ بەڕێوە بەرن و بۆ خۆشی لێ بڕا کە پاتەختی مغولان بگرێ.

جەلالەدینی کوڕی توکلەی وەك پێشڕەو دەگەڵ لەشکرێکدا ناردەسەر دەربەنـدی گریهـرود[3] -کـە لەشکرێکی یەکجار زۆری مغولی تێدا بوو- لەشکری لوڕستان بە سەریان دادان و زۆریان شپرزە کـردن و مغول هەلاتن. لوڕەکان بەو سەرکەوتنە زۆر لە خۆ بایی ببوون و کەوتنە شوێن شکـستەیان و خۆیـان گەیاندەناو ماڵ و منداڵان و دەستیان کرد بە تالان و کاری ناشایستە کردن.

مغولەکان کە زانیان نامووس و ئابڕوویان کەوتۆتە دەست دوژمن، ئیتـر خوێنیـان کـوڵی و بـە دڵپڕی بایان دایەوە سەر لوڕان و کارێکیان پێ کـردن بـە داسـتان بگەڕێتـەوە. دەڵـێن ئـەو ڕۆژە ژنـە مغولێك -هەر بە دەستی خۆی- دەلوڕی کوشتووە. کاتێ دەنگ و باسی ئـەم کارەسـاتە گەیـشتە نـاو سوپاگەی هەرەگەورەی مغول و کەیـخاتووخان ئاگادار کرا کە ئەفراسیابی لێ یاغی بووە، ئەمیرتوڵدای یەداجی بە دەهەزار شەڕکەری مغول و بە لەشکری لوڕی بچووکەوە ناردەسەر ئەفراسیاب.

شەڕێکی زۆر خوێناوی لە نێواندا ڕووی داو توڵدای، ئەفراسیابی بە دیـل گـرت و بـاڵی بەسـت و ناردی بۆ لای کەیـخاتووخان. ئەروكخان و پادشاخاتوونی کرمانی تکایان بـۆ کـرد و کەیــخاتووخـان بەوانی بەخشی و ناردیشیەوە سەر لوڕستان.

---

١- بایدونۆغل کوڕی ئەبقاخان، کاتێ ئەرغونخان هاتە سەر حوکم، عیراقی عەجەمی پێ سپارد و لە سـەر ئیـسفەهان کردیە نایبی خۆی. جەمیل

٢- هێندێك لە خزمانی بۆ بە سەر ڕاگەیشتنی هەمەدان و فارس هەتا خەلیجی فارسی دیاری کردبوو. جەمیل

٣- گریهرود یان گەرمرود ڕەنگە کوهروود بێ کە زنـجیـرە کێوێکە لە کوردستانەوە بە ناو فارس و کرماندا دەکشێ تا دەگاتە چیای پشت بامی بەلووچستان؛ لە نێوان ئیسفەهان و کاشاندا ٣٠٠٠ میتـر بەرزە. عەونی

ئەفراسیاب ئەحمەدی برای خۆی لە لای کەیخاتووخان بەجێ هێشت و هاتەوە لوڕستان و دەست بە جێ ئامۆزایەکی خۆی و گەلێك لە سەرداران و پیاوماقووڵانی، بە بێ هیچ سووچ و تاوان کوشت.

کاتێ غازانخان هاتە سەر تەختی پادشایەتی، ئەفراسیاب چووە لای کەوتە خاك و پایەوە و غازانخان ڕووی دایە و هەر وەك پێشوو کردیەوە بە فەرمانڕەوای لوڕستان.

ساڵی ٦٩٥.ك (١٢٩٥.ز) کە غازانخان بەرەو بەغدا دەچوو، ئەتابیك ئەفراسیاب لە سنووری هەمەدان خۆی گەیاندی و دڵسۆزی خۆی نیشان دا. غازانخان زۆری ڕێز لێگرت و بە دڵی خۆشەوە بەرێی کردەوە.

لەو گەڕانەوەیەدا تووشی بوو بە تووشی حاکمی هورقوداق (سورقوداغ) کە لە فارسەوە دەچووە لای غازانخان. نیوەزۆر و نیوەخواهیشت هەرچۆنێك بوو دەگەڵ خۆیدا گێڕایەوە و پێکەوە چوونەوە لای خان. هەرچی ئەفراسیاب کردبووی و هەر کردەوەیەکی ناپەسند و گەندی هەبوو. ئەو ئەمیرە نووك و بەدی لە بەردەمی غازانخان دانا و ئەوەندی بوو چەند ئەوەندیشی خستە سەر و دڵی غازانخانی وا لێ پڕ کرد کە دەست بەجێ فەرمانی کوشتنی دەرکرد.[1]

### ٣٨ ئەتابیك نەسرەتەدین ئەحمەد، کوڕی یوسفشا

لە پاش کوژرانی ئەتابیك ئەفراسیاب، غازانخان ئەحمەدی کوڕی یوسفشا، برای ئەفراسیابی کردەفەرمانڕەوای لوڕستان. نەسرەتەدین پیاوێکی دەستودڵ پاك و ئاکارچاك و گەلدۆست بوو. بە ماوەیەکی زۆرکەم توانی -بەهەتوانی بەزەیی- برینی دڵ و دەروونی گەلە چەوساوەکەی سارێژ بکاتەوە و بە -شنە و سروەی دڵسۆزی- تۆزی نەهاتی و هەژاری، لە پیل و پۆڕی داماوان و پێشێل کراوانی هاونیشتمانی ڕەواند و هیم و بناغەی گەڕ و بێفەڕی، لە بەر یەك هەڵتەکاند و کزەبای ئازادی، ئاڵای خۆشی و شادی لە هەموو لوڕستاندا شەکاندەوە. هەرگیز لە فەرمایشتی خودا و پێغەمبەر

---

١- ساڵی ٦٩٦.ك (١٢٩٦.ز) کوژراوە. ئەمینزەکی دەڵێ: غازانخان فەرمانی قەڵاچووی کوردەکانی دەرکرد. پەنجا هەزار کوردیان کوشت و وردەو یەخسیریان بە تالان بردن. وای لێهاتبوو کوڕە کوردێکی دوازدەساڵەیان بە دوازدەدرەم فرۆشت و گوێلکێکیان بە پێنج درەم دەدا و نرخی شەکێك درەمێك بوو. ئەمەش لە تۆڵەی ئەوە بوو کە ئەو کوردانە -لە دژی خان- یاریدەی میرنەورۆزیان دا. جەمیل

دەرنەدەچوو؛ دابوویە سەر شارێی ڕاستی و دروستی و هەرگیز بە سەر نەدەچوو. ماوەی سی و هەشت ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد و ساڵی٧٣٣.ك (١٣٣٢.ز) بە مردنی خۆی مرد و گیانی پاکی بەرەو بەهەشتی بەرین کەوتە فڕین.[1]

## ئەتابیك ڕوکنەدین یوسفشاکوڕی ئەحمەد

بوو بە جێنشینی باوکی. ئەویش شەش ساڵ[2] بەو پەڕی مەردی و نەبەردی و دڵسۆزییەوە کاروباری دنیاداری ڕاپەڕاند و لە دادگەری و هەژارپەروەریدا لە باوکیشی تێ پەڕاند. واتا لە ڕۆژگاری ئەودا وەك کورد دەڵێ، گورگ و مەڕ پێکەوە ئاوی خواردۆتەوە. ڕۆژی شەشەمی مانگی جیمادی یەکەمی ساڵی٧٤٠.ك (١٣٣٩.ز) گیانی پاکی بۆ بەهەشت بانگ کراوە و تەرمی پیرۆزی لە مزگەوت و مەدرەسەیەکدا -کە ڕوکنابادی ناوە- بە خاك سپێراوە.

## موزەفەرەدین ئەفراسیابئەحمەد کوڕی یوسفشا[3]

١- قوتبەدین کوڕی عیمادەدین پەهلەوانی کردبووە هەمەکارەی خۆی و خوسرەوشای کوڕی مەلیکحسامەدینی بە سەرداری لەشکر دیاری کردبوو. زانای زۆر خۆش دەویستن؛ زۆر کتێبیان بە ناوی ئەو رازاندۆتەوە؛ لەوانە: *التاریخ المعجم فی أحوال ملوك العجم* کە فەزلوڵاقەزوێنی نووسیویە. چوارسەدوشێست مەدرەسەی دینی دروست کردووە؛ چلیان لە شاری ئیزەج و ئەوانی تریش لە جێی دیکە؛ سێ یەکی داهاتی ساڵانەی خۆی لەو مەدرەسانە بەخت دەکرد. حافیزی شیرازی شاعیری بەناوبانگ، کوڕی کەماڵەدینە و کەماڵەدین لە لوڕستانەوە هاتۆتە شیراز. حافیز یەکێك بووە لە شاعیرانی بارەگای ئەم ئەتابیکنسرەتەدینە و لە چەند جێیەکدا پێی هەڵگوتووە. وەك ئەو غەزەڵەی کە تێیدا دەڵێ: «گر نبودی شاەیحیی نصرتالدین از کرم» یان لە جێگەیەکی تردا دەڵێ: «فلك جبینەکش شاە نصرتالدین است» واتا: ئاسمان سوژدەبۆ شا نەسرەتەدین دەبا. جەمیل

٢- لە مردنی باوکیەوە تا مەرگی خۆی دەبێتە هەشت ساڵ. بەڵام ئیبنوبەتوتە لە سەفەرنامەکەیدا، ج ١، ل١٢٢ دەڵێ: ئەتابیك یوسفشا دەساڵ فەرمانڕەوا بووە؛ بەسرا و خۆزستان و فەیرووزان و چەند مەڵبەندێکی تریشی لە ژێر دەستدا بووە و کە مردووە، لە ڕوکنابادی شیراز نێژراوە. حافیزی شیرازی زۆر بەو ڕوکنابادەهەڵ دەڵێ کە هەر دەسکردی ڕوکنەدینیش بووە. جەمیل

٣- ئیبنوبەتوتە لە ئیزەج چاوی بەو ئەتابیکە کەوتووە و دەڵێ: کوڕی ئەتابیك نەسرەتەدینئەحمەد و برای ئەتابیك ڕوکنەدین یوسفشایە. جەمیل

لە پاش مردنی باوکی تاجی فەرمانڕەوایی لوڕستانی بە لاتیلاگی سەریەوە نا. لە ڕۆژگاری ئەودا مانگیلەی ئالای ئەمیرتەیمووری کورەکانی بە تیشکی جیهانگیری سەر زەوینی، تەنیەوە و لوڕستانیش وەکوو هەموو خاك و ئاوی ئێران زەمین، هاتە ژێر قەڵەمڕەوی ئەم. ڕۆژی دووشەممە بیست و سێهەمی مانگی جیمادی دووەمی ساڵی٧٩٥.ك (١٣٩٣.ز) تەیمووریلەنگ فەرمانی فەرمانڕەوایی لوڕستانی بۆ موزەفەرەدین مۆر کردووە. لە پاش ئەو فەرمانە موزەفەر، زۆری بەر لە ژیان نەخواردووە و گیانی پاکی بە خودای نەمر ئەسپاردووە.

## ئەتابیكپەشەنگ کوڕی یوسفشا[1]

لە پاش نەمانی مامی، فەرمانڕەوایی لوڕستان بۆ ئەو مایەوە. ئەویش زۆر لە سەر تەختی دەسەڵاتداری نەمایەوە و لە ناو نوێنی مەرگدا سەری نایەوە.

## ئەتابیكئەحمەد کوڕی پەشەنگ

لە جێگەی باوکی ناوی فەرمانڕەوای لێ نرا؛ بەڵام لە ڕۆژگاری ئەودا لوڕستان بریەتی بوو لە زۆر چۆڵگە و چەند کاولگە و وێرانەیەك، ڕێوی تێدا دەزا و مامزی لێ دەحەسایەوە. لە لانی چەقەڵ و لانەی کوندەبوو بەو لاوە ئاوەدانی تێدا نەما.[2]

---

١- *تاریخی عمومی* دەڵێ: پیاوێکی باش بووە. ئەمینزەکی دەڵێ: لە ڕۆژگاری ئەودا لوڕستان وێران ببوو؛ چونکە هەمیشە دەگەڵ بەرەی موزەفەردا شەڕیان بوو؛ شامەنسووریموزەفەری لە پەستا لە شووشتەرەوە پەلاماری لوڕستانی دەدا. پەشەنگ بە یارمەتی شاشوجاع -کە برای شامەنسوور بوو- توانی شامەنسوورر لە کۆڵ خۆی کاتەوە. هێندێك سکەی شاشوجاع لە ئیزەج دۆزراوەتەوە. مێژوویان لە نێوان ٧٦٢ و ٧٦٤ی کۆچی دایە. جەمیل

٢- هۆیەکەشی ئەمە بوو: ئەحمەد یان پیرئەحمەد و مەلیكهۆشەنگی خزمی بە شەڕ هاتن و هۆشەنگ کوژرا. شامەنسوور لە تۆڵەدا ئەحمەدی لە لوڕستان دەرپەڕاند و لوڕێکی سەرناسی لە جێگە دانا. ساڵی ٧٩٥.ك ئەحمەد چووە لای تەیمووریلەنگ؛ ئەویش لوڕستانی دایەوە. دوو هەزارماڵێکی لوڕیش کە دەگەڵی ئاوارە ببوون هاتنەوە سەر جێڕێی خۆیان. تەیمووریلەنگ ئەفراسیابی برای ئەحمەد و شامەنسووری -وەك بارمتە- بردەسەمەرقەند. لە دواییدا لوڕستانی لە نێوان ئەحمەد و ئەفراسیاب دابەش کرد. لە پاش مردنی ئەمیرتەیموور، پیرمحەممەد، پیرئەحمەدی گرت و لە قەڵای کوهاندزدا بەندی کرد. ساڵی ٨١١.ك دووبارە لوڕستانی دەست کەوتەوە؛←

### ئەتابیک ئەبوو سەعید کوڕی ئەحمەد[1]

لە پاش بابی چەند ساڵێك لە لوڕستاندا مەزنایەتی کرد و ساڵی ۸۲۷.ك (۱٤۲۳.ز) مرد.

### ئەتابیک شاحوسێن

کوڕی ئەبووسەعید کوڕی ئەحمەد کوڕی پەشەنگ کوڕی یوسفشا، بۆ ماوەیەکی زۆر کەم بە سەر ئەو مەڵبەندەڕاگەیشت و هەر لە ساڵی ۸۲۷.ك (۱٤۲۳.ز)دا بە دەستی غیاسەدین کوڕی هۆشەنگ کوڕی پەشەنگ کوژرا.

میرزا سوڵتانئیبراهیم کوڕی میرزا شاڕۆخ، لەشکری ناردەسەر غیاسەدین و لە وڵاتی دەرپەڕاند. ئیتر لەوساوە لەو بنەماڵە کەسیان فەرمانڕەوایەتی لوڕستانیان نەکردووە.

---

گێلی لات وابێ ژیان تا ماوی هەر بۆ لایەکە    کۆنە فرتۆڵی جیهان هەر تاوە بۆ زاوایەکە

---

←بەڵام ئاژاوەیەکی ناوخۆیی لە ناوی برد. جەمیل

دز واتا قەڵا، کوهان دز: قەڵای کێوان؛ یان قەڵایەك کە لە دووگە وشتر دەکا. هەژار

۱- بەر لەوە دوو ساڵان بە بارمتە لە شیراز گل درا بۆوە. جەمیل

# بەندی چوارەم
# فەرمانڕەوایانی لوڕی پچووک[1]

وەك لەمەوبەر گوتمان ئەم ناوی لوڕە بۆیە بە سەر ئەو کوردانەدا بڕاوە کە وەختی خۆی لە «کول»ی مانڕود ژیاون و لە دوایی لە بەر زا و زوی زۆر و وەچە خستنەوە، جێگەیان بەرتەنگ بووە و دەستە دەستە و تیرە تیرەیان لێ جیا بۆتەوە و هەر لایە ڕووی کردۆتە لایەکەوە. هەر کۆمەڵێکیان لە هەر جێگەیەك دەگیرسانەوە، ناوەکەیان دەکرد بە ناوونیشان و بەوێوە دەناسران. وەك هۆزی جەنگروویی و ئۆتری.

ئەو تیرە لوڕانەی کە بە بنیچە ئەچنە سەر کۆنە دانیشتووانی کول، لوڕی تەواو ڕەسەن و بێگەرد نین؛ وەك هۆزەکانی: ١-کرۆسکی ٢- لێنکی ٣- ڕۆژبەیانی ٤- ساکی ٥- شادلویی ٦- دادوعەیانی ٧- محەممەد کەماری؛ کە بە لوڕی ڕەسەن داناندرێن و زرەلوڕن.

هۆزی جەنگرویی -کە فەرمانڕەواکانی لوڕی پچووك لەوانن- لە لوڕە ڕەسەنەکانن و دەچنەوە سەر تیرەی شەلبۆری. هەروەها تیرە لوڕەکانی: ١- کارانە ٢- زەڕنگەری ٣- فەزلی ٤- ستوەند ٥- ئالانی ٦- کاهکاهی ٧- ڕەخوارکی ٨- دڕی ٩- برارەند ١٠- مانگرەدار ١١- ئەنارکی ١٢- بولعەبباسی ١٣- عەلیماماسی ١٤- کێجایی ١٥- سلکی ١٦- خودەکی ١٧- ئەدرۆیی و گەلێك هۆز و تیرەی تریش لەو لوڕە ڕەسەنانەن. بەڵام هۆزەکانی: ١- سامی ٢- ئەسپان ٣- سەهی و ٤- ئەرکی[2]، ئەگەرچی بە شێوەی لوڕیش داخێون، لوڕ نین و تەنیا هەر ئەوەندەیە کە بۆرەپیاگ و

---

١- ئەسکەندەرمونشی خاوەنی تاریخی *عالم‌آرای‌عباسی* دەڵێ: لوڕستانی پچووك دەکەوێتە باشووری عیراقی عەجەم و لە پانایییدا هەمەدان و عەلیشوکر و خۆزستان دەگرێتەوە و لە درێژایییدا لە شاری برووجردەوە تا نزیك بەغدایە دەچێ. مەودای سەد فرسەخێك دەبێ و شارەکانی خوڕەماباد و ئەڵشە و سەدمەرە و خاوا و هەزفین، لە سەر لوڕستانی پچووکن. جەمیل

٢- ئەرکی یان هەرکی، ئێستا بە شێوەی کرمانجی داخێون؛ لە لیوای هەولێر و لە لای شنۆ و مەرگەوەڕێ زۆرن. هەژار

ڕەمەکی بوون و لە گوندەکانیاندا بە مسکێنی دامەزراون.

هەتا ساڵی ٥٥٠ک (١١٥٥ز) لوڕەکان سەرداری سەربەخۆیان لە خۆیان نەبووە و هەر ڕاستەوخۆ لە ژێر فەرمانی خەلیفەی بەغدادا بوون.

لە دواییدا لوڕستان خرایە سەر عیراقەوە و حسامەدین‌شوهلی -کە لە تورکەکانی ئەفشار و سەر بە سەلجووقیەکان بوو- کرا بە فەرمانڕەوای لوڕستان و هێندێك لە خۆزستان. دوو کەس بە ناوی محەمەد و کەرامی، کوڕانی خورشید[1] -کە لە هۆزی جەنگرویی بوون- چوونە لای حسامەدین‌شوهلی و گەلێکیان ڕێز و پایە پەیدا کرد و بوونە پیاوماقووڵ و سەرناس. لە نەتەوەی ئەو دوو برایە، پیاوی زۆر ئازا و کارامە و ژێهاتی هەڵکەوتن و یەك لەوانە شوجاعەدین خورشید بووە؛ کە لە دوایی باسی دەکەین.

هەر لەو سەردەمەشدا سورخاب کوڕی عەیار -کە لەوە پێش شتێکمان دەربارە نووسی- یەك بوو لە دەست و پێوەندەکانی حسامەدین‌شوهلی. ڕۆژێك لە جەنگەی ڕاووشکار، شوجاعەدین خورشید و سورخاب کوڕی عەیار، لە سەر کەروێشکێك لێیان دەبێتە هەرا و کار بە جێیەك دەگا کە هەردووکلا بە شیری ڕووتەوە بۆ یەکتر دەچن. حسامەدین شوهلی ناوبژیان دەکا و شەڕەکە دادەکوژێنێ؛ بەڵام هەردووك لە دڵدا ڕك لە یەکتر هەڵدەگرن و لێك دەخەفتێن.

لە پاش ماوەیەك حسامەدین‌شوهلی گزیرایەتی هێندێك لە لوڕستانی بە شوجاعەدین سپارد. سورخابیشی هەر لەو مەڵبەندەدا کردەگزیری چەند شوێنێك.

چونکە کاربەدەستانی عیراق زۆریان زۆری بۆ دانیشتوانی لوڕستان دەهێنا و بە نامەردی و دڵڕەقی ڕەفتاریان دەگەڵ دەکردن و هەموو لە دەستیان بە زاڵە و شاه و ناڵە بوون، هانایان بە شوجاعەدین برد و تکایان لێ کرد کە بۆ خۆی سەرپەرستیان بێ و لە بەرامبەر دەستدرێژاندا پەنا و

---

١- حوسێن‌حوزنی دەڵێ: ئەو خورشیدەلە هۆزی حوسنی (حەسەنوەند حەسنەوییە)ی کوردەو حکوومەتی لوڕی بچووك، کە پێیان گوتووە حکوومەتی خورشیدی بە ناوی ئەوە. *دائرةالمعارف* دەڵێ: بەر لە دامەزرانی دەوڵەتی لوڕی پچووك، خورشید ناوێك دەبووە وەزیری حاکمانی لوڕستان. دوور نیە ئەو ناوە لەو سەرچاوە هەڵقولابێ. تاریخی عالەم‌ئارا پێیان دەڵێ: عەبباسی. گۆیا خۆیان بە وەچەی هەباسی کوڕی ئیمام عەلی زانیوە. بەڵام ئەمە ڕاست نیە" هەر چونکە دۆستی بەغدا بوون، بۆیە ناوی هەباسیان بە خۆیانەوە نووساندووە. جەمیل

پشتیان بێ.

لەو سەروبەندەشدا حسامەدین‌شوهلی مرد و شوجاع بوو بە هەمەکارە و ڕۆژبەڕۆژ بەهێزتر دەبوو؛ تا وای لێهات لە هەموو لوڕستاندا کەس لە فەرمانی دەرنەدەچوو. وردەوردەپێی بە سورخابی غەنیمی خۆی هەڵکێشاوە و دەستی کورت کردووە و تەنگەتاوی کرد و هێچکی لێ هێنایەوە یەك؛ هەتا کردی بە گزیری خۆی لە مانڕود. ئیتر هەموو وڵاتی لوڕی بچووك کەوتە دەست شوجاعەدین خورشیدەوە.

## شوجاعەدین کوڕی خورشید

### کوڕی ئەبووبەکر کوڕی محەمەد کوڕی خورشید

لە دوای ئەوە کە خودای گەورە ئەو ئاوڕە بەخێرەی لە وڵاتی لوڕستان دایەوە و مەردێکی وەك شوجاعەدینی بۆ ڕەخساندن و فەرمانڕەوایی لوڕستانی بچووکی دامەزراند و سەر و سامانی بە کاروباری دا، ئەوسا دووکوڕی خۆی: بەدر و حەیدەری کردەسەرکردەی لەشکر و ناردنیە سەر سمها بۆ شەڕی هۆزی جەنگرووییی. ئەوانە گەینە بەرەوە و قەڵای ڕەشیان ئابلۆقەدا. لە شەڕی دەوری قەڵادا حەیدەر کوژرا. کوژرانی حەیدەر زۆری کار کردەسەر شوجاعەدین و سوێندی خوارد کە نابێ کەس لەو هۆزە بە زیندوویی بمێنی و دەبێ هەمووان لە خوێنی کوڕی خۆدا بکوژێ. ئەم ئاگری تۆڵەیە سووتمانێکی نایەوە کە خەڵکی ئەو ناوچەیە بەجارێك لە گیان و ژیان بێزار بوون و هەرکەسە شڕە و شاتاڵی پێچایەوە و هەر ئەو ڕۆیشتنە کە پێی ڕۆیشتن، ئیتر ئاوڕیان وەو مەڵبەندەنەدایەوە.

ناوچەی مانڕود بە چۆڵ و هۆڵی کەوتە دەست شوجاعەدین‌خورشیدەوە لە پاش ماوەیەك لە لایەن خەلیفەوە شوجاعەدین و نوورەدین‌محەمەدی برای داواکران و برانە بەغدایە و داوایان لێکردن کە دەبێ قەڵای مانگرە بەجێ بێڵن. ئەمانیش مانیان گرت و نەیاندا و هەردووکیان خستنە زیندانەوە. نوورەدین‌محەمەد لە زینداندا مرد و بەر لە مردنی وەسیەتی بۆ براکەی کرد کە نەکەی هەرگیز دەست لەو بەردەی بەردەی. شوجاعەدین ڕاسپێری برای بەلاوە زۆر پەسند بوو. ماوەیەکی زۆر لە زینداندا ماوە و وەرامی بە داخوازی خەلیفە نەداوە؛ بەڵام لە ئەنجامدا کە لێی ڕوون بوو تا قەڵا نەدا، هەزار تەقەلا بدا بەری نادەن و ئەویش بە مەرەدی براکەی دەچێ، بە ناچاری ملی داو لە

بەرانبەردا قەڵایەکیتری لە خەلیفە خواست و ئەویش ناوچەی تەڕازەکی لە باتی قەڵای مانگرەی پێ بەخشی؛ کە هەر سەر بە خۆزستانە.

شوجاعەدین کە ڕزگار کرا، هاتەوە لوڕستان و سی ساڵیتر فەرمانڕەوایی کرد. لە ئاخروئۆخری ژیانیدا لە بەر پیری خەرەفا بوو؛ چاکە و خراپەی لێك جوێ نەدەکردەوە. بەدری کوڕی و سەیفەدین ڕوستەمی برازای -کە کوڕی نوورەدینێ بوو- هەمیشە لە بەر دەستیدا بوون و کار و باریان بۆ بەڕێوە دەبرد. لەو سەروبەندانەدا مەلیکی بەیات -کە تورکێك بوو- لەشکری هێنایە سەر لوڕستان و دەستی بە تاڵان و بڕۆ و شڕە خۆری کرد. لەشکری لوڕستان بە سەرکردایەتی بەدر و سەیفەدین ڕوستەم، بەرەنگاری ئەو دوژمنە هێرشهێنە بوون و لە پاش شەڕ و کوشتاری زۆر، لەشکری بەیاتی تورك شکا و زۆر بە شپرزەیی ڕاونرا و مەڵبەندی بەیاتانیش خرایە سەر لوڕستانێ.

شوجاعەدین لە ئەنجامی ئەو سەرکەوتنە گەورەدا، بەدری کوڕی و سەیفەدینی برازای -بە جووتە- کردەجێنشینی خۆی و بۆی دانان کە لە پاش مەرگی ئەو، هەردووکیان پێکەوە بە سەر وڵاتەکە ڕابگەن.

سەیفەدین دەیەویست بەدر بفەوتێنی و جێگەی مامی هەر تەنیا بۆ خۆی بمێنێ. چووە بن کلێشەی شوجاعەدینەوە و دڵی کرمێ کرد و وای بردەمێشکیەوە کە بەدر و ژنەکەت دەیانەوێ دەرماندلوت کەن و لە ناوت بەرن. شوجاعەدین -وەك گوتمان- خەرفابوو، هۆش و گۆشێکی ئەوتۆی نەمابوو کە ڕاستی و درۆی ئەو دووزمانیە دەبناوان بکا؛ گورجێ باوەڕی کرد و فەرمانی دایە کە بەدری بۆ بکوژێ. بەلام سەیفەدین ڕوستەم بۆ ئەوە لە دوا ڕۆژدا پاکانەی خۆی پێ بکرێ، ئەنگوستیلەی بە نیشانە لە مامی وەرگرت و بەدری ئامۆزای خۆی کوشت.

بەدر چوار کوڕی لە پاش بەجێمان: حسامەدینخەلیل، بەدرەدینمەسعوود، شەرەفەدین تەهمتەن و ئەمیرعەلی.

ماوەیەك بوو بەدر کوژرابوو؛ ڕوژێك شوجاعەدین پرسیاری کرد: گەلۆ! بەدری کوڕم بۆ نابینم؟ هێندێك لە هاونشینان و هەمدەمانی، چیرۆکی کوژرانی بەدریان بۆ گێڕاوە. بەو خەبەرە پرکەسەر و دڵتەزێنە زۆر تێکچوو. ئیتر پەژارەی مەرگی بەدری جوانەمەرگی، بڕستی لێ بڕی و ساڵی ٦٢١.ك (١٢٢٤ز) بە داخی بەدرەوە سەری نایەوە و ڕووپەڕی ژیانی هەڵدرایەوە.

دەڵێن پتر لە سەد ساڵ ژیاوە. لە بەر دادگەری و ئاکارچاکی، لوڕان بە پیاوچاکی دەزانن و ئێستەش گۆڕەکەی ڕووگەی نیازانە و بۆ ودم دچنە سەری.

## سەیفەدین ڕوستەم

### کوڕی نوورەدین کوڕی ئەبووبەکر کوڕی محەمەد کوڕی خورشید

لە پاش مردنی شوجاعەدین، بوو بە فەرمانڕەوای سەربەخۆی هەموو لوڕستانی بچووک. حسامەدین خەلیل -کوڕە گەورەی بەدر- سەری خۆی هەڵگرت و ڕووی کردە بەغدایە و لەوێ مایەوە.

سەیفەدین زۆر بە دڵنەرمی و دڵسۆزی دەگەڵ ژێردەستانی خۆیدا دەبزووتەوە. لە ڕۆژگاری ئەودا کەس نەیدەتوانی هێندەی پەڕەکایەك ناڕەوایی بکا. کامەرانی و خۆشی و هەرزانی بە یەکسانی هەموو خاکی لوڕستانی تەنیبۆوە. دەگێڕنەوە کە هەر لەو ڕۆژگارەدا ژنێك لە گوندی ئاشجان لە جیاتی ئاوردوو، جۆی کردۆتە ناو تەندوور و نان و شیوی پێ پێژاوە. سەیفەدین کە ئەمە دەبیسێتەوە بانگی ژنە دەکا و سەرکۆنەی دەکا کە چۆن بژیوی بە ئاگرەوە ناوە و ئەو کارە ناڕەوایەی لێ ڕوودادوە؟ ژنەکە لە وەرامدا دەڵێ بۆیەم وا کردووە لە دواڕۆژدا بە چیرۆك بیگێڕنەوە کە لە دەورانی سەیفەدیندا ئەوەندەهەرزانی بووە، دەغڵ و دان بۆ سووتەمەنی خراوەتە تەندوورەوە. سەیفەدین لەو پەرسڤە هێژایە زۆر دڵی پشکوتووە و ژنەکەی خەڵات کردووە.

هەروەها دەڵێن لەو سەروبەندەدا کە سەیفەدین هاتۆتە سەر کار، شێست کەس لە پیاوە هەرە ئازاکانی لوڕ دزی و ڕێگریان کردووە و ڕێگەی هاتووچۆ لە بازرگان و کاروان بڕاوە و کاربەدەستانی عیراق هەرچەندی کردوویانە و کۆشیویانە، دەرۆستیان نەهاتوون و بۆیان بەربەست نەکراون. سەیفەدین دەگۆیان ڕاچووە و بڕستی بڕیون و دەردەستی کردوون و باڵبەستە هێناونی و خستوونیە زیندانەوە. کەس‌وکاری بەدکارەکان کەوتوونە خاك و پایەوە و بۆ هەر سەرێك لەو دزانە، شێست ئێستری شەشدانگیان داوە کە ئێستر وەرگرێ و دەس لە دز هەڵگرێ. سەیفەدین گوتوویە ئەگەر ئەم کارە نالەبارە بکەم، مێژوونووسان لە پاشەملە بۆم دەنووسن کە سەیفەدین بازرگانی دزفرۆش بووا هەرگیز ئەو نەنگە ناخەمە سەر خۆم. هەر شێستی هەر لەجی و دەس بەجێ کوشتوون.

ئەو هەموو ڕاستی و دروستیە، دەگەڵ ئاکاری خێج و خواری لوڕاندا ڕێك نەدەهاتەوە؛ ڕێگە لە

دز و ڕێگر گرتنیان زۆر بە دڵ نەبوو! چوون و لە بنەوە دەگەڵ شەرەفەدینی برای، کاکەوبراڵـەی خۆیـان کرد کە سەیفەدین بکوژن و ئەو جێگەی بگرێتەوە. سەیفەدین ڕۆژێك لە گەرماوێدا خۆی دەشوت کە بەو کەیـن و بەینەی زانی. سەری دەبەر دەستی سەرتاشدا بوو، بە نیوە چڵی هێشتەوە و دەگـەڵ پیـاوێکی خۆیدا ڕای کرد. دوژمنان سەریان دەدوو نا و هەڵیانبـڕی تا گەیشتە چیای کـڵاو. پیاوەکـەی دەگـەڵی دابوو ئەویش دۆستی نەیاران بوو. لە پشتەوەڕا تیخێکی بۆ داهێنا و لاقێکی لە کار خست. سەیفەدین هێزی ڕاکردنی نەما و بە زامداری و لە بەر زۆری دەرد و ئازار بۆ سەربەردێك خشکەی کـرد و کەلـەلا لە سەرلا لێی کەوت. شەرەفەدین ئەبووبەکری برای بە پەیکانە تیـرێك پێکای و عـەلی کـوڕی بـەدری ناردەسەری کە لەبری خوێنبەهای باوکی سەری ببـڕێ و کەلەبەری خوێنەخوێیی پڕ بێتەوە.

## شەرەفەدین ئەبووبەکر کوڕی نوورەدین محەمەد

لە دوای ئەوەی لە چیای کڵاو، برای خۆی کوشت و بە دڵنیایی هاتەوە ناو ئاوایی، خێزانی بـەدر -کـە دایکی حسامەدینخەلیلیش بوو- دەگەڵ پێشوازیکەراندا ئەویش چووبوو بە پیـریەوە و پیاڵەی تـژی لـە خۆشاوی لە پێشی ڕاگرت و گوتی لە مزگێنی ئەو کارەدا کە تۆڵەی شوومت ساندەوە، ئەو خۆشاوە لـە دەستی من وەرگرە بینۆشە و نۆشی گیانت بێ. شەرەفەدین فڕی کرد و هەر لاشی وابوو خۆشـاوە و بـە خۆشەویستی پێدراوە. ئیتـر هیچ بەمەی نەزانی ژەهراوی بە دەمدا کراوە. نەخۆش کـەوت و لـە سـەر جێگا کەوت و زۆری دەرد و ئازار کێشاو زۆری کێشاهەتا کەمێك هەستایەوە. تازە تۆزێك بـە لارەلار، کەمێك دارەدارەی دەکرد، بە نیازی ڕاو و گەشتەوە ڕووی کردەچیا و دەشتەوە. برایەکی شـەرەفەدین -کە ناوی عێزەدینگرشاسپ بوو- لەو دەرچوونەی شەرەفەدین هەلی باشی بۆ هەڵکـەوت و هەڵیکوتایـە سەر عەلی کوڕی بەدر و گوتی ئەگەر برام برای خۆی کوشت، تۆ چکارە بووی خـۆت تێـوە داو ئـاگری دوژمنایەتیت خۆش کرد؟ هەر لە جێدا ئەویش عەلی -لە تۆڵەی برای خۆیدا- کوشت.

حسامەدینخەلیل لە بەغدایە ئەم ڕووداوانـەی بیسـتەوە و بـە هەڵـەداوان کەوتـە ڕێ و بـەرە و لوڕستان هاتەوە. شەرەفەدین دەست و پێوەندی خۆی تێگەیاندن: ئەگەر حسامەدینخەلیل گەیشتەوە و هاتە پرسەی نەخۆشینم، هەرگا من جاجـمم بە سەر خۆم هەڵکێـشا، ئێـوە سـواری سـەری بـن و زوو بیکوژن.



حسامەدین هاتەوە و هاتە دیدەنی نەخۆش و ئەویش وەك داینابوو مەوجەكەی بە سەر خۆی دادا. بەڵام نۆكەران دەستیان نەوەشاند و خۆیان تێنەگەیاند. كاتێ حسامەدین دەرچووە دەرەوە، شەرەفەدین خۆی لە پیاوەكانی تووڕە كرد كە بۆچی بە گوێتان نەكردم و لە كۆڵ دنیاتان نەكردەوە؟! گوتیان میرم خۆشت لە ئێمە باشتر دەزانی كە تازە لەو نەخۆشیە ڕاست نابیەوە. ئەگەر تۆ نەمای جگە لە حسامەدینخەلیل كێمان هەیە دڕوویكمان لە لەش دەرێنی و كاروباری لوڕستانێ هەڵسوورێنێ؟ حسامەدین جێگەی هومێد و هانای دوا ڕۆژمانە چۆنی بوگۆین؟

شەرەفەدین تێگەیشت كە لوڕەكان حسامەدینیان بۆ جێنشینی ئەو داناوە. بە دڵ لێ بڕا كە بە هەر ناوایەك بێ حسامەدینخەلیل لە ناو بەرێ. حسامەدین هەستی كرد كە پەی سەری دەگەڕێن و لێی دەخەفتن بیكوژن، دیسانەوە ڕای كرد و ڕووی كردەوە بەغدایە.

شەرەفەدین لەو نەخۆشیە هەڵنەستاوە و ترووسكەی ژیانی كوژاوە.

## عیزەدینگرشاسپ كوڕی نوورەدینمحەمەد

لە جێگەی برای كرا بە فەرمانڕەوا و لە پاش ماوەیەك براژنە بێوەژنەكەی خۆی -كە خوشكی «سلیمانشاأبوە» بووە- مارە كردەوە. حسامەدینخەلیل كە ئەم دەنگ و باسانەی لە بەغدا پێگەیشت، بڕیاری داكە هەر چۆن بێ لوڕستان بخاتە دەست خۆی. لە خۆزستانەوە هات و لەشكرێكی زۆر بەهێزی كۆ كردەوە و هاتە جەستەی عیزەدینێ. عیزەدین شەڕ و خوێنڕێژی بە دڵ نەبوو؛ ویستی بە بێ هەرا و قڕە لوڕستان بۆ حسامەدینخەلیلێ بەجێ بهێڵێ؛ بەڵام خوشكەكانی كەوتنە تەوس تێگرتن و پلار پێدادانی و زۆر بە ترسەنۆكیان دانا و بە تیز و تەشەرەوە گوتیان تۆ پیاوی شەڕ مەكە! ئێمە ژنین كاری پیاوان دەكەین و بە گژیدا دەچین.

سەركۆنەی ژنان بوو بە هەسان و عیزەدینی تیژ كرد و چاری ناچار لەشكری ساز كرد و بەرەوپیری دوژمنی تاژۆت و لە نزیك گوندێك لەو ناوەدا بەرەنگاری یەكتر بوون. زۆربەی لەشكری لوڕستان دڵیان دەگەڵ حسامەدین بوو. بە دڵ شەڕیان نەدەكرد و عیزەدین شكا و ڕای كرد و نیازی

وابوو خۆ بگەیەنێتە قەڵای کەریەت[1]، کە مەلەکە خاتوونی ژنی تێدا بوو. حسامەدین‌خەلیل پیاوی لە سەر ڕێگە دانا ئەگەر هات بیگرن. عێزەدین بۆی نەکرا بگاتە قەڵا و حسامەدین لە پشتەوەڕا بۆی هات و عێزەدینی بە دیل گرت و گفتی پێدا کە نەیکوژێ. ئەمجار هات قەڵای کەریەتی ئابڵۆقەدا و قەڵاکە سێ ڕۆژان خۆی گرت و لەمە بەولاوە لە سەر قسەی عێزەدینێ مەلەکە خاتوونی ژنی دەرگای دژی بۆ کردنەوە و قەڵا درا بە دەستەوە و ئاگری شەڕێ دامرکا و لوڕستان بە خڕوپڕی کەوتە دەست حسامەدین خەلیل.

## حسامەدین‌خەلیل

### کوڕی بەدر کوڕی شوجاعەدین خورشید

لە دوای ئەوە کە حسامەدین‌خەلیل لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی لوڕستان جێگیر بوو، عێزەدین گرشاسپی بۆ جێنشینی خۆی دیاری کرد. ساڵێك پێچوویوو، ڕۆژێك ناردی بە شوێن عێزەدیندا کە بچێتە دیوانی. مەلەکەخاتوونی ژنی عێزەدین کەوتە دڵخورتیەوە و لای وابوو داوێکیان بۆ مێردەکەی ناوەتەوە، زۆری بە دەورەدا هەڵخوێند کە لەو چوونە خۆ ببوێرێ؛ بەڵام ئەو بە ئامۆژگاری ژنەکەی نەکرد و زۆر بێباکانە ڕووی کردەدیوەخان. حسامەدین‌خەلیلیش زۆر نامەردانە لە ماڵە خۆیدا جێنشینی خۆی کوشت. مەلەکەخاتوون کە زانی مێردەکەی کوژراوە، هەرسێك کوڕەکانی -کە ناویان شوجاعەدین‌خورشید و سەیفەدین‌ڕوستەم و نوورەدین‌محەمەد بوو- بە دزیەوە ناردەماڵی سولەیمان پاشای خاڵیان.

لە سۆنگەی ئەو کارەساتەوە دوژمنیەکی ئەوەند سەخت کەوتە نێوان حسامەدین‌خەلیل و سولەیمانشاوە کە هەر تەنیا لە ماوەی ئاقە مانگێکدا سی و یەك جاریان لەشکر بە گژ یەکدا کرد و لە ئەنجامدا سولەیمانشاشکا و قەڵای بەهار[2] و هێندێك مەڵبەندی دیکەی کوردستان وەدەست لوڕەکان کەوت. سولەیمانشادیسان لەشکری کۆ کردەوە و هاتەوە سەر حسامەدین و لە شوێنێدا بە

---

١- کریە، کریخ، کریق: جێگەیەکە هەشت فرسەخ لە ئەهوازەوە بە لای بەسراوە هەڵکەوتووە. عەونی

٢- بەهار شار و شووڕەیەکی زۆر قایم بوو لە کوردستانی ئێراندا و لە ڕۆژگاری سولەیمانشادا پاتەختی مەڵبەندەکە بوو. عەونی

ناوی دهلیز بەرەنگاری یەکتر بوون و ئەمجار حسامەدین شکا. سولەیمانشاهەر لەوێوە بەرەودوا گەڕایەوە؛ بەڵام حسامەدین دیسان خۆی لێ گیف کردەوە و بۆ تۆڵە کەوتە شوێنیان و دیسان پێک هەڵپڕژانەوە و ئەمجارە حسامەدین، سولەیمانشای زۆر شپرێو کرد و گەلێك لە سەرکردەو کەس و کاری سولەیمانشای کوشت و عومەربەگی براشی یەك لەوانە بوو کە سەریان لەو جەنگەدا چوو.

سولەیمانشابە هەڵەداوان خۆی گەیاندەوە بەغدایە و هانای بە خەلیفە برد و داد و بێدادی لە دەست حسامەدین لە بەر دەم دانا و داوای کۆمەگ و هیمدادی کرد و لەوێوە بە شێستهەزار کەسی چەکدارەوە هاتەوە شەڕی حسامەدین. حسامەدینخەلیل بە سێهەزار سوار و نۆهەزار پیادەوە لە دەشتی شاپور[1] پێشی لێ گرتن و شەڕ دامەزرا. لە سەرەتادا لەشکری سولەیمانشاخۆیان بۆ نەگیرا و ملیان لە هەڵاتن نا؛ بەڵام سولەیمانشابۆ خۆی لە مەیداندا چەقی و کەوتە دنە و هاندان و ناوتێدانی لەشکریانی خۆی و کارێکی کرد زۆربەی زۆری هەڵاتووان گەڕانەوە ناو کۆڕی شەڕ و بایاندایەوە سەر دوژمن.

حسامەدینخەلیل سێبەسێ تەڵاقی خواردبوو کە هەتا دوژمن نەشکێنێ یان دوژمن خوێنی نەڕژێنێ، هەر لە مەیدانی جەنگدا بمێنێ و لە شەڕ واز نەهێنێ. دوژمن زۆری زۆر بۆ هێنا و لە هەموو لایەکەوە گەمارۆیان داو دەناو خۆیان گرت و کوشتیان و ئەوسا لاشەکەیان سووتاند و سەرەکەیان بە دیاری بۆ سولەیمانشابرد و لە بەر دەمیان دانا. سولەیمانشاگوتی ئەگەر بە زیندوویی بۆ منتان هێنابا نەمدەکوشت. بەڵام دەڵێی چی؟ کاری خودایە و هەر دەبا وا بوایە و ئەم چوار خشتەکیەشی خوێندەوە.

| | |
|---|---|
| بێچارە خەلیل خشتی درا بەر پشتی | ئاواتی بەهاری ڕشت و بە خوێن شوشتی |
| دێو هاتبوو تا تەختی سولەیمان بگرێ | دێوێکی سولەیمانی گەییشتێ، کوشتی |

کوژرانی حسامەدین ساڵی ٦٤٠.ك (١٢٤٢.ز) بووە.

---

[1] - دەشتی شاپورر بانوێکە کەوتۆتە نێوان فارس و لوڕستانەوە. عەونی

**بەدرەدین مەسعوود**

**کوڕی بەدر کوڕی شوجاعەدین خورشید**

کاتێ کە براکەیان لە دەشتی شاپوور کوشت، دادی خۆی بردەلای مەنکۆقائان و پێی گوت چونکە هەموو کەس دەزانێ کە ئێمە هەر لە مێژینەوە سەر بە خانەدانی خانین، بۆیە لە بەغداوە یارمەتی دوژمنی ئێمە دراوە و برای من کوژراوە. وا منیش هانام بە تۆ هێناوە و دەبێ بە بارێکدا چارێکمان بکەی. مەنکۆقائان[1] بە ڕووی خۆشەوە وەری گرت و لاواندیەوە و ناردی بۆ لای هولاکۆخان.

کاتێ هولاکۆخان دەچووە سەر بەغدایە، بەدرەدینی دەگەڵدا بوو. لە ڕێگە بەدرەدین داوای لە خان کرد کە ئەگەر بەغدای گرت سولەیمانشای بکاتە بەشە تاڵانی ئەو. هولاکۆ لە وڵامدا گوتی ناتوانم بەڵێنت پێ بدەم، چونکە هەر خوا دەزانێ چۆن دەبێ. کاتێ هولاکۆ بەغدای گرت و کوشت و کوشتار دەستی پێکرد، سولەیمانشاله شەڕێدا شەهید کرا. ئەوسا بەدرەدین لە بەر هولاکۆ پاڕایەوە کە ماڵ و منداڵ و کەسوکاری سولەیمانشای بە بەخشش بداتێ. هولاکۆ بۆی کرد و فەرمانی لەو بارەوە بۆ دەرکرد. بەدرەدین خاووخێزان و دەست و پێوەندی سولەیمانشای هەموو هێنانە لوڕستان. بەڵام لە باتی ئەوە کە تۆڵەیان لێ بکاتەوە، زۆر بە مەردی دەگەڵیان بزووتەوە و لە خزم و کەسوکاری خۆی هەڵناواردن.

لە پاش ئەوەش کە بەغدا ئاوەدان کرایەوە و ئاژاوە کوژایەوە و ژیانی تێدا بووژایەوە، بەدرەدین بە منداڵی سولەیمانشای ڕاگەیاند کە هەر کەس بەغدای پێ لە لوڕستان خۆشترە، با بچێتەوە و لەوێش لە بیرم ناچێتەوە و چاوەدێری دەکەم. هەر کەسیش دەمێنێتەوە و بە خزمایەتی من ڕازیە، ئەوا ئامادەم بیانکەمە بووك و زاوای خۆمان و لە خۆمان هەڵنەبڕێن.

هێندێکیان لە سەر داخوازی خۆیان چوونە بەغدایە و ئەوانەشیان کە مانەوە بە ڕێزەوە گلدرانەوە و لە ماڵە میرانەوە ژنیان پێ دران و کیژیان لێ خوازران و بە خزمایەتی خانەدانەوە دامەزران.

---

١- ئەوەی چەنگیزخان و برای هولاکۆخان و چوارەمین پادشای بەرەی چەنگیزییان بووە. هولاکۆ ڕۆژاوای ئاسیای بەو گرتووە و کەبلایخانی برای تریشی بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ناردووە. لە ڕۆژگاری مەنکۆقائاندا لویسی نۆیەم پادشای فەڕانسە پێی پێشنیار کرد کەخان ببێتە خاچپەرست و هەردووکیان لە دژی موسوڵمانان یەکتر بگرن؛خان گوێی نەدایە. عەونی

بەدرەدین‌مەسعوود پیاوێکی دادگەر و هەژارپەروەر و دڵنەرم و خوێنەدەوارێکی هونەروەر بووە. دەڵێن چوارهەزار مەسەلەی هەر لە مەزهەبی شافعیدا لەبەر کردووە و ئەوەندەش لە خوا ترساوە کە هەرگیز دۆخینی ناڕەوای نەکردۆتەوە.

بەدرەدین شازدەساڵ فەرمانڕەوایی کردووە و لە ساڵی ٦٥٨.ک (١٢٥٢.ز) داخوای گەورە بۆ خۆی بردۆتەوە.[1] لە پاش مەرگی بەدرەدین‌مەسعوود، جەماڵەدین‌بەدر و ناسرەدین‌عومەر -کوڕانی بەدرەدین- دەگەڵ تاجەدین کوڕی حسامەدین‌خەلیلدا لە سەر کورسی فەرمانڕەوایی لوڕستان بە کێشە هاتن. کار گەیشتە ئەو جێگەیە کارەکەیان گەیاندەبەردەمی ئەباقاخانی مغول کە پێی ڕابگا و بۆیان یەکلا بکاتەوە. کاتێ گەیشتنە بارەگای هۆردووی ئەباقاخان، بە فەرمانی خان هەر دوو کوڕی بەدرەدین کوژران و تاجەدین کرا بە فەرمانڕەوای لوڕستان.

## تاجەددین شا

### کوڕی حسامەدین‌خەلیل کوڕی بەدر کوڕی شوجاعەدین‌خورشید

ماوەی حەڤدەساڵ لە لایەن ئەباقاخانەوە بە سەر لوڕستان ڕاگەیشت و ساڵی ٦٧٧.ک هەر بە فەرمانی ئەباقاخان کوژرا و لوڕستان درایە دەست فەلەکەدین‌حەسەن و عیزەدین حوسێن کە هەردووکیان کوڕی بەدرەدین‌مەسعوود بوون. فەلەکەدین کرا بە حاکمی ولای[2] و عیزەدین ینجۆ[3]یان پێ سپارد. بڕیاریش وا درا کە لە پاش فەلەکەدین، عیزەدین بێتە جێنشین.

ئەو دوو برایە ماوەی پازدەساڵ بە جووت فەرمانڕەوای لوڕستان بوون و زۆریان گەشە پێدا و پێشیان خست و گەلێك لە دوژمنان و نەیارانی خۆیان لە سەر ڕێگە لابرد و دەستیان بە سەر وڵاتەکانی

---

١- *تاریخ عمومی*، ج ٥، ل٢٠٥ دەڵێ: ١٨ ساڵ فەرمانڕەوا بووە و ساڵی ٦٦٧.ک مردووە. جەمیل باوکی ساڵی ٦٤٠ کوژرا و ١٦ ساڵی وەسەر خەی دەبێتە ٦٥٦، واتا ساڵی گرتنی بەغدا. دەشڵێ تا ئاوەدان بوونەوەی بەغدا ماوە. وا دەردەکەوێ ماوەی حوکمی وەك گفتی *تاریخی* عمومیە و لە مێژووی مردنیشیدا قسەی شەرەفخان ڕاستە. هەژار

٢- ئەمینزەکی بە دلاری نووسیوە و دەڵێ بە دارایی دەوڵەت ڕاگەیشتنە. جەمیل

٣- ینجۆ واتا: چاوەدێری ملکی تایبەتی‌خان و خەزێنەی خان. جەمیل



بەیات و بیشر و نەهاوەندیش داگرت و ماوەیەکی زۆریش هەر دەبەر دەستیاندا مانەوە.[1] سنوور و کەوشەنی ژێر قەڵەمڕەویان هەر لە هەمەدانەوە گرتبووی هەتا شوشتەر و لە ئیسفەهانەوە دەگەیشتە عەرەبستان. ژمارەی چەکداریان لە حەڤدەهەزاری تێپەڕاند. فەلەکەدین زۆر پیاوێکی وریا و دریا و دانا و دیندار بوو؛ زۆریشی گاڵتە و لاقردی و حەنەك پێخۆش بوو. بەڵام عێزەدین زۆر دڕ و ڕکوونی و مۆر و بەسام بوو. هەرگیز بەزەیی بە گوناهباراندا نەدەهاتەوە. هەردووك برا ئەوەندەهەژاردۆست و دادگەر بوون کە زۆردار و بێزۆریان لە لا نەمابوو. وەك دەڵێن هارویییەکی ناڕەوایان بە هاوڕێیکی زۆر هێژایان ڕەوا نەدەدیت و لە سەر بەرووڵەیەکی بە زۆرداری، سەردارێکیان بە داردا دەکرد. هەردووکیان ئەوەندەیەکتریان خۆش ویستووە کە نەبێتەوە و کەس نەیتوانیوە کێشەیان دەناودا بنێتەوە و بە ڕێکی و بە یەکدڵی، وڵاتی خۆیان بەڕێوە بردووە و بەرزیان کردۆتەوە. پادشایانی ئێرانیش زۆریان دڵ ڕاگرتوون و دەستیان بۆ درێژ نەکردوون. خودای گەورە هەر وەك لە ژیانی جیهانیدا لێکی هەڵناواردن، بۆ لای خۆشی پێکەوەی هەڵبژاردن و لێکی نەکردن هەردووکیان لە ساڵی ٦٩٢.ك (١٢٩٣.ز) دالە ڕۆژگاری دەسەڵاتی کەیخاتووخاندا مردن.

فەلەکەدین کوڕێکی لە پاش بەجێ ما بە ناوی بەدرەدین؛ عێزەدینیش نورەدین محەمەد ناوێکی بەجێ هێشت.

## جەماڵەدین خدر

### کوڕی تاجەدین شاکوڕی حسامەدین خەلیل کوڕی شوجاعەدین خورشید

لە سەر فەرمانی کەیخاتووخان، جەماڵەدین خدر کرا بە فەرمانڕەوای لوڕستان. بەڵام حسامەدین عومەربەگ کوڕی شەمسەدین کوڕی شەرەفەدین تەهمتەن کوڕی بەدر کوڕی شوجاعەدین خورشید، دەگەڵ شەمسەدین لەنبەکی، خۆیان بە لە پێشتر دەزانی و سەریان وەبەر باری نەهانی. لە ساڵی ٦٩٣.ك (١٢٩٣.ز)دا دەگەڵ ئەو مغولانەدا کە لە نزیك خوڕەمابادەوە پاسداری سنوور بوون ڕێك کەوتن و شەوێك لە نەکاو بە سەریاندا داو جەماڵەدین و خزمەکانیان کوشت و ئیتر لەو ساوە نەتەوەی حسامەدین خەلیل بە یەکجارەکی دوابڕاو بوون.

---

١- ئەمینزەکی دەڵێ: ١٧ هەزار کەسیان ناردەسەر بەیاتان و وڵاتەکەیان لێ داگیر کردن. جەمیل

## حوسامەدین عومەر بەگ

هەر بە زۆرەکی خۆی کردەفەرمانڕەوای لوڕستان. شازادەکانی لوڕستان: سەمسامەدین مەحموود کوڕی نورەدین محەمەد و عیزەدین محەمەد و ئەمیردانیاڵ -کە لە بنەماڵەی گرشاسپی بوو- دەگەڵ چەند کەسێکی‌تر لە سەرداران و بەکارانی دیکەدا ڕێك‌کەوتن کە تۆڵەی خوێنی کوڕانی تاجەدین شای لێ بکەنەوە و دەشیان گوت حسامەدین عومەر ڕێی ناکەوێ فەرمانڕەوا بێ؛ چونکە بە بنیچە بەشی بە فەرمانڕەوایانەوە نیە و گەرەکە سەمسامەدین مەحموود ببێتە مەزن و فەرمانڕەوامان؛ چونکە باب و باپیرانی هەمیشە جێ گەورە و فەرمانڕوا بوون.

سەمسامەدین زۆر لاوێکی وریا و پیاوێکی زرینگ و پێکەوتوو بوو. سەمسام لە خۆزستانەوە هات و گەیشتبووە سەر سنووری خوڕەماباد کە ڕیش‌سپی و تکاکاران خۆیان خستە نێوانەوە و نەیانهێشت شەڕەکە بکری و لە سەر ئەم مەرجە پێك هاتن کە شەهابەدین لەنبەکی و براکانی -کە وەك ئاگری بن کایە و مایەی هەرا و ئاژاوە بوون- لە لوڕستاندا نەمێنن؛ حسامەدین عومەریش لوڕستان بداتە دەست سەمسام. ئیتر لەوساوە سەمسام بوو بە فەرمانڕەوای لوڕستان.

## سەمسامەدین مەحموود کوڕی نورەدین محەمەد

لە پاش وەلا نانی عومەربەگ، سەمسام بەوپەڕی بادی‌هەواییەوە لە پاڵە و پشتی فەرمانڕەوایی پاڵی دایەوە و کاروباری وڵاتی زۆر بە ڕێکی گرتە دەستەوە و لە ماوەیەکی زۆر کەمدا لوڕستانی تەواوێك وە برەو خستەوە. ڕۆژگار هاتوچوو؛ ڕۆژێك سەمسام بە تاقی تەنیا چووە جەستەی شەهابەدین ئەلیاسی لەنبەکی و برایانی و کێشەی تێهاڵاندن و ئەوانیش دەستەوەکەریان کرد و پەنجاوچوار برینیان لە لەشی سەمسام کرد! بەڵام سەمسام پەکی نەکەوت و دەست بەرداریان هەر نەبوو تا ڕاوی نان و کەوتە شوێنیان و لە سەر لووتکە کێوێکی پڕ بەفردا حاسیەی کردن و لە سەرمانی کەسیرە کردن و هەمووی گرتن و جووقەواری لێ بڕین.

بە شوێن ئەو ڕووداوەدا ئەوەزایەکی شێخ کاکۆیە چووە لای غازان‌خانی مغول و لەبەری پاڕاوە کە خوێنی جەماڵەدین خدر و شەهابەدین ئەلیاس ون نەکا و تۆڵەیان بستێنێ. غازان‌خان ناردی عومەربەگ و سەمسامیان هێنا و لە عومەربەگی پرسی تۆ بۆچی جەماڵەدین خدرت کوشت؟ عومەر

گوتی: چونکە ئەو منی نەکوشت! غازانخان ئەو جار پرسی: باشە ئەی کوڕە چکۆلەکەیت بۆ کوشت؟ عومەر لە وەراما ڕاما و بەسەرکزی داما. غازانخان دایە دەست کەسوکاری جەماڵەدین و لە تۆڵەی خوێنی خۆیاندا کوشتیان و هەروەها بە فەرمانی خان، سەمسامەدین مەحمودیش لە تۆڵەی شەهابەدین ئەلیاسدا کوژرا. ئەم ڕووداوە ساڵی٦٩٥.ك (١٢٩٥و ١٢٩٦.ز) ڕووی داوە.

## عیزەدین محەمەد

### کوڕی ئەمیرعیزەدینحوسێن کوڕی بەدرەدینمەسعوود

لە پاش کوژرانی عومەربەگ و سەمسامەدین مەحموود، عیزەدینمحەمەد -کە هێشتا منداڵ بوو- کرا بە فەرمانڕەوا. بەدرەدینمەسعوود کوڕی فەلەکەدینحەسەن -کە ئامۆزای بوو، بە تەمەنیش گەورەتر بوو- ببووە بەرهەڵست و خۆی لەو لە پێشتر دەزانی.

لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی سوڵتان محەمەدی خودابەندەدا، لە سەر فەرمانی سوڵتان بەدرەدین مەسعوود، نازناوی ئەتابیکی درایە و کرایە حاکمی ولای لوڕستان و عیزەدین بە ئینجۆ -ملکی تایبەت و دارایی سوڵتان- ڕادەگەیشت. لە پاش ماوەیەك هەردووك ئەرك هەر بە عیزەدین سپێرا و هەتا ما، ئەوکاربەدەستییەی هەربەدەستەوەما و لە ساڵی ٧١٦.ك(١٣١٦،١٧.ز)دا کۆچی دوایی کرد.

## دەوڵەت خاتوون ژنی عیزەدین محەمەد

لە پاش مەرگی عێزەدین بوو بە شاژنی خاکی لوڕستان. بەڵام لە ڕۆژگاری ئەودا کاروباری دنیاداری ڕۆژبەڕۆژ بەرەو گەندی و لەنگی دەچوو. ببووە هەرکەس-هەرکەس و کەس خەتی شاژنی نەدەخوێندەوە. زۆربەی کاروباری لە دیوانی پادشایانی مغولەوە بەڕێوە دەبرا و کە لە ئەنجامدا کارێکی بۆ نەکرا. ناچار عیزەدین برای خۆی، لە جێگەی خۆی دانا و خۆی لە کار کێشایەوە.

## عیزەدین حوسێن برای دەوڵەت خاتوون

لە جێگەی خوشکی جلەوی فەرمانڕەوایی لوڕستانی گرتە دەست و ماوەی چاردەساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد. خەڵکی لوڕستان لە ژێر سێبەری دادگەری ئەودا بە خۆشی و شادمانی و تەسەلی و

خۆشگوزەرانی دەژیان.[1]

## شوجاعەدین مەحموود

لە پاش مەرگی عیزەدین، شوجاعەدین مەحموودی کوڕی کرا بە جێنشین؛ بەڵام پیاوێکی ناپیاو و بێفەڕ بوو؛ هەموو خەڵك لە دەستی وەزاڵە هاتبوون. لە ساڵی ٧٥٠.ك (١٣٤٩و١٣٥٠.ز)دا لێی ڕاپەڕین و کوشتیان و لە کۆڵ دنیایان کردەوە.

## مەلیك عیزەدین کوڕی شوجاعەدین مەحموود

لە پاش باوکەکەی کرا بە فەرمانڕەوا و لە سۆنگەی ئەوەدا کە پەیوەندی دۆستانەی دەگەڵ پادشایانی عیراقدا پەیدا کرد، بەرز بۆوە و ناو و ناوبانگی پێکەوەنا.

دواجار لە ساڵی ٧٩٠.ك (١٣٨٨.ز) ئەمیرتەیمووری کورەکانی لە قەڵای وامیاندا -کە نیوفرسەخی برووجردە- دەوری داو گرتی و ناردیە سەمەرقەند و سەیدی ئەحمەدی کوڕیشیان بردەئەندگان و لە پاش سێ ساڵ دوورخستنەوە -کە ناویان نابوو وچانی پەروەردەکردن- هێنایاننەوە و هاتنەوە لوڕستان و عیزەدین دەستی کردەوە بە فەرمانڕەوایی خۆی؛ بەڵام لە ئەنجامدا لە سەر سەرسەختی و لاساری و بێباری سەیدی ئەحمەدی کوڕی، باجگرانی مغول گرتیان و بە ناوی سەرپێچ و یاغی بردیانە سوڵتانیە و بە زیندوویی کەوڵیان کرد و لاشەیان حەوت ڕۆژان لە ڕاستە بازاڕی شاری سوڵتانیەدا هەڵاوەسی.

## سەیدی ئەحمەد

هەتا ئەمیرتەیموور لە سەر دنیا بوو، نەیوێرا خۆ دەرخا و دابوویە چیا و چۆڵان و هەر ڕۆژە لە جێیەك و هەر شەوە لە دێیەك و هەرتاوە لە شوێنێك و هەر دەمە دەکەلێنێك و کولێنێکدا خۆی دەشاردەوە؛ بەو پەڕی پەرێشانی و چارەڕەشی دەژیا. لە پاش مەرگی تەیموور هاتەوە وڵات و تا ساڵی

---

١- حوسێن‌حوزنی لە سەر ئەم باسە دەڕوا و دەڵێ: سوڵتان ئەبووسەعید مەزنایەتیەکەی دان پێدا ناوە و لە فەرمانڕەواییەکەیدا بە سەرکەوتوویی سەردەکەوت و هەتا ڕۆژگاری ئەمیرتەیموور هەرما. ئەمیرتەیموور دەیەویست بیخاتە بەر فەرمانی خۆیەوە، ملی نەدا و توانی بیگرێ و بیکوژێ. زانیشمان کە بنەماڵەی پێشوو بە مەرگی عیزەدین بڕایەوە و خێزانێکی نوێ هاتە رووی کار. جەمیل

٨١٤.ك (١٤٠١و١٤٠٢.ز) لە لوڕستان مەزنایەتی کرد و ئەوسا مرد.

## شاحوسێن کوڕی مەلیک عیزەدین

لە پاش نەمانی سەیدیئەحمەد، شاحوسێنی کوڕی عیزەدین کرا بە فەرمانڕەوای لوڕستان. شاحوسێن پیاوێکی بزۆز و هاروهاج بوو؛ وەك دەڵێن دەزرێی داودی نەدەوەستا. هێرشی دەبردەسەر هەمەدان و پەلاماری جەربادقان و دەوروبەری ئیسفەهانی دەدا. تەنانەت لە ڕۆژگاری سوڵتان ئەبوسەعید کورەکانیدا هەمەدانی گرت و لەوێوە ڕووی کردەگەرمەسێر و لە شارەزوور هەڵیکوتایە سەر هۆزی بەهارلوو.کوڕ پیرعەلی سەر کۆماری بەهارلوو دەڕۆستی هات و بڕستی لێ بڕی و کوشتی. ئەم ڕووداوە لە ساڵی ٨٧٣.ك (١٤٦٨، ٦٩.ز)دا قەوماوە.

## شاڕوستەم کوڕی شاحوسێن

ماوەیەکی زۆر مەزنایەتی لوڕانی کرد و لە دواییدا خۆی گەیاندەلای شائیسماعیلی سەفەوی و ئەویش پەسندی کرد و بە چاوەدێری شایان و بە لاواندنەوەی شایانە سەربڵندی کرد. زۆر لەو خۆشیەدا نەمایەوە و دوای دەمێکی کەم دنیای پڕ لە خەمی بەجێهێشت و بە یەکجاری سەری نایەوە.[1]

## ئەغوەر کوڕی شاڕوستەم

---

١- ئەمینزەکی و حوسێنحوزنی دەڵێن: دوای ئەوە کە شائیسماعیل بەغدای گرت و بەرەو حەویزە دەچوو، لەشکرێکی دەهەزار کەسی بە سەرکردایەتی حەسەنبەگیلالا و سەرەك هۆزەکانی کوردەکانی تالش و بەیرامبەگی فەرمانلوو، ناردەسەر شاڕوستەم و شەڕێکی زۆر سەختیان لە ناودا قەوما. شاڕوستەم خۆی نەگرت و دایە چیا. لە پاشان خۆی زۆر دەتەنگانەدا دیت، داوای پێك هاتنی کرد و دوای ئەوە کە حەسەنبەگ و بەیرامبەگ مەرجەکانیان قبوڵ کرد، هاتەوە و لە ڕۆژی دووەمی مانگی جیمادی دووەمدا هاتە لای شائیسماعیل و زۆر پێشوازیەکی گەورەی لێکرا و شا زۆر بە ڕووی خۆشەوە بەخێری هێنا و بە زمانی کوردی بە شێوەی لوڕی زۆری دەگەڵ دوا و فەرمانیشیدا ڕیشە درێژەکەی بە جەواهیرات برازێننەوە. هەر تاڵە مووەی ڕدێنی گەوهەرێکی پێوە هەڵاوەسرا و چەند ڕۆژێك بە میوانی گلی دایەوە. ئەوسا مەڵبەندی شووشتەر و دزفوولی پێ بەخشی و فەرمانی فەرمانڕەوایی بۆ مۆر کرد و گەڕاندیەوە پایتەختی وڵاتی خۆی و هەتا سەر هاوسایەتیان هەر خۆشبوو. جەمیل

ئەغوەر کوڕە گەورەی شاڕوستەم بوو؛ لەپاش باوکی بوو بە فەرمانڕەوای لوڕستان. ساڵی ٩٤٠.ك (١٥٣٣.ز) کە عوبەیدوڵڵا خانی ئوزبەگ هێرشی هێنابووە سەر ئێران و گەیبووە خوراسان، ئەغوەر بۆ بەربەست کردنی ئەو هێرشە ڕەگەڵ لەشکری شاتۆماسب کەوت و جیهانگیری براگچکەی خۆی لە لوڕستان بەجێهێشت، کە سەرپەرشتی وڵات بێ. جیهانگیر کێسی لەو دەرفەتە هانی و هۆزەکانی لوڕستانی کردەلایەنگیری خۆی و ڕایگەیاند کە هەر خۆی فەرمانڕەوایە و کاکی هیچکارە نیە.

کاتێ کە لەشکری شابەرەو دوا دەگەڕایەوە، ئەمیرئەغوەرە ئەو دەنگ و باسە ناخۆشەی بیستەوە و داوای گەڕانەوی لە شاکرد و چوارناڵە ئەسپی بەرەو لوڕستان تاودا. لە نەهاوەند هێندێك هەتیومەتیوی لاتولوتی لێ هاڵان؛ بەڵام گەورەپیاوان و کەیخودایانی لوڕ، کەس دانی پێدا نەهێنا و جیهانگیریان لەو خۆشتر ویست. لە پاش هێندێك شەڕ و کوشتار ئەغوەر بە دیل گیرا و کوژرا.

## جیهانگیر کوڕی شاڕوستەم

جیهانگیر لە پاش کوشتنی برای، بوو بە فەرمانڕەوای سەربەخۆ لە لوڕستانداو ماوەی نۆساڵ بە سەربەستی و کامەرانی پادشایەتی کرد. لە ساڵی ٩٤٩.ك (١٥٤٢و ٤٣.ز)دا شاتۆماسب لە تۆڵەی ئەغوەردا کوشتی[1].

---

١- مێژوونووسانی کورد، ئەمینزەکی بەگ و سەیدحوسێن حوزنی دەڵێن: ئەم ئەغوەر بەگە ماوەیەك فەرمانڕەوایەکی سەربەخۆ بووە. ساڵی ٩٤٨.ك (١٥٤١.ز) کاتێ کە شاتۆماسب بۆ تەمێ کردنی والی دزفوول (عەلائەدین ڕەعناشی) لەشکری دەبرد و گەیشتە لای لوڕستان، جیهانگیر چووە لای و دیدەنی لێکرد. بەڵام لە پاش ماوەیەك گوێی نەداوەتە فەرمانی شا و زیانیشی بە وڵاتی هاوسای خۆی گەیاندووە. لە سەر فەرمانی شاتۆماسب عەبدوڵلاخانی ئیستاجلووی تورکمانی ساڵی ٩٤٩.ك (١٥٤٢.ز) لەشکرێکی یەکجار زۆری بردۆتە سەر لوڕستان و شەڕێکی حەستەم و بە سام لە نێوانیاندا ڕووی داوە و جیهانگیر لە شەڕدا بە دیل گیراوە و کوژراوە، بەڵام ڕوستەم و محەمەدی کوڕەکانی جیهانگیر هەڵاتوون و خۆیان گەیاندۆتە بەغدایە.

لە پاشان شاتۆماسب فەرمانی لوڕقڕانی دەرکردووە و دەستی لەشکری لە تاڵان بەرەڵا کردووە. لەشکری قزڵباشان بە شیر و تیر، شیشاونە گیانی لوڕانەوە و پیر و لاو و ژن و پیاو و زورهان و ساوایان نەپاراستووە و تەنانەت تاژەڵ و پاتاڵیشیان سەر بڕیوە و دەغڵودان و باغاتیشیان -سەر لەبەر- لە بنە هێناوە. لە ئەنجامدا ئەمیرشاقاسم -کە

## شاڕوستەم کوڕی جیهانگیــر

لە پاش ئەوە کــە شاتۆماســب میــرجیهانگیــری کوشــت، ئەبوومـوسـلێمی گــوودەرزی -کــە لەلــەی منداڵەکانی جیهانگیــر بوو- شاڕوستەمی کوڕی جیهانگیــری بە نیوەخۆش و نیوەزۆر، ڕەکێش کــرد و بردیە لای شاتۆماسب و کردیە دیاری دەستی خۆی و گوتی: شادۆستیم وای لێکردم کە ئەم کــوڕەم بــۆ هێناوی. دەزیەجێ لە سەر فەرمانی شاکۆت و زنــجیــریان خستە پێ و پیلـی شاڕوســتەم و لــە قــەڵای الــموت[1]دا بەند کرا. لە پاداشتی ئەو کارە چاکەی کە گوودەرزێ کردی! پلەوپایەی میرئاخۆری تایبەتی شاهانەی درایە و لە ناو هاوکارانیدا سەرفراز کرا.

کوڕێکی تری جیهانگیــر کە ناوی مــحەمەدی بوو لــەو کاتــەدا زۆر منــداڵ بــوو، هەڵسووڕانی کاروباری فەرمانڕەوایی لە وزەی ئەودا نەبوو. لوڕەکان بە دزیــەوە بردیانــە چــەنگلە -کــە جێگایــەکی سەخت و بەرپیوار بوو- لەوێ شاردیانەوە. ئیتـر کەسی وا لەو بنەماڵە نەمابوو کە بە سەریان ڕابگــا. ماوەیەك ئەو هۆز و تیــرانە بێ سەر و سەردار مانەوە.

ڕۆژێك لە ڕۆژان کابرایەکی خوێڕی و بێ فەر -کە بە سەر و شکڵ زۆر لــە شاڕوســتەمی دەکــرد- پەیدا بوو، گوتی: من شاڕوستەمتانــم و لە قەڵای ئەڵەمووتەوە ڕام کــردووە و خــەڵکیش بــاوەڕی کــرد. کابرای تاین زۆر بێباکانە و بە بێ‌سڵ کردن ڕووی کردەماڵی شاڕوستەم و خۆی کردەسەرداری ماڵ. ژنی شاڕوستەم -کە چەندین ساڵ بوو مێردی لێ دوور خرا بۆوە- بە هاتنەوەی هەر شاگەشکە بــوو! خــۆی دابە دەستەوە و دەگەڵیدا ڕادەبوارد و بە مێردی خۆی دەزانی و خەڵکیش کە دیتیان وا ماڵ و منــداڵی خۆی پێی شاد و شوکور بوونەوە، ئەوانیش هیچ دوودڵی و گومانیان نەما کە شاڕوستەمی بــە ڕاســتی هەر بە ڕاستی هاتۆتەوە. زۆر بەدڵ هاتنە ژێر فەرمانیەوە و کردیانە فەرمانڕەوای خۆیــان. کــاتێ ئــەو

---

میــرنشینیەکەی بە سەر لوڕستانەوە بووە و کریوی ئەمیــرجیهانگیــریش بــووە- تکــای لــە شــا کــردووە، قزڵباشــیان کێشاوەتەوە و بە ڕوو لێنانی سەیدئەمیــریش لە خانەدانی میــرانی لوڕستان خۆشبووە و هەر شا بۆ خۆی لوڕستانی لــە نێوان ڕوستەم و مــحەمەدیدا بەش کردووە. جەمیل

١- ناوی قەڵایەکی قایــمە و لە لای قەزوێنە. جەمیل

لە شەرەفنامە فارسیەکەدا هەر نووسراوە «قلعەالــموت» مامۆستا ڕۆژبەیانی لە تەرجەمە عەرەبیەکەدا ناوای نووسیوە: قلعە آلموت= الــموتألاحــمر. واتا: ئاڵی کوردی و فارسی دەگەڵ مەوتی عەرەبی لێکداوە و بووە بە مەرگی‌سوور. من لام وایە هەڵەمووتی کوردیە کە بە جێگەی زۆر سەخت دەڵێن؛ چونکە فارسیش بە «ئەلەمووت»ی دەخوێننەوە. هەژار

خەبەرە سەیر و سەمەرە گەیشتە قەزوین و بە گوێی شادا درا؛ گورجێ شارەوستەمی لە گرتووخانە دەرێنا و فەرمانی شاهانەی بۆ دەرکرد کە فەرمانڕەوای لوڕستان بێ و خوڕەمابادیشی پێ بدرێتەوە؛ کە هەر لە زووشەوە پاتەختی خۆیان بوو.

شارۆستەم وەك باڵندەیەك کە لە ڕکە بەردرابێ و پەلەپڕووزەی چوونەوەی هێلانە و سەردانی جووجەڵان بکا وابوو.

هەر دەست و پەلێکی بوو بە باڵێ تـا هـەرچی زووە بگاتە ماڵێ

بە بێ پشوودان و وچان، شەووڕۆژی دەسەر یەك خستەوە و بە پڕتاو بەرەو لوڕستان دەیکوتا و ڕانەوەستا هەتا خۆی گەیاندەوە ناو کەس و کاری. شارۆستەمی گۆرینیش لە خۆگۆڕیـن وازی هێنا و پێی پێوە نا و لە پەناوە بۆی دەرچوو. ڕێویەبۆر کرپاری کەوڵت هاتەوە! بەڵام دۆستانی شارۆستەمی بە ڕاستی نەیانهێشت زڕە شارۆستەم بێ دەردیسەر سەر دەرکا. کەوتنە شوێنی و گرتیان و هێنایانەوە ئاوایی و لە بەر چاوی حەشامات بەردەبارانیان کرد و چاوی نامەردانیان پێ ترساند.

لەو ماوەیەشدا محەمەدی برای شارۆستەم ببووە پیاو و لە سەر مەزنایەتی لوڕستان دەگەڵ شارۆستەمدا کێشە و هەرایان لێ پەیدا بوو؛ تەنانەت کار گەیشتە بە گژ یەکدا چوونی چەکدارانە و شیر و ڕمبیان لە ڕووی یەکتر هەژاند. کەیخودا و ڕیش سپی بوونە بەریوان و ناوبژییان کردن و لە سەر ئەوە پێکیان هێنان کە شارۆستەم چونکە برا گەورەیە چوار دانگ لە شەش دانگی لوڕستانی بە دەستەوە بێ و ئەو دوو دانگی دیکەش کە دەمێنێتەوە، محەمەدی پێ ڕابگا و هەر پێکەوەش بژین. هەر دووك برا بە دڵ دەگەڵ یەکتر ئاشت بوونەوە و زۆر بە خۆشی و برایەتی ڕایاندەبوارد.

لەمەوبەر باسمان کرد کە لە دوای ئەوەی ئەتابیك شاحوسێن بە دەستی غیاسەدین کوڕی کاوس کوژرا و غیاسەدین لە ترسی میرزا شاهرۆخ لە وڵات هەڵات و ئیتر ئەتابیکانی لوڕ ئاسەواریان بڕایەوە، لەوساوە مەڵبەندی لوڕستانی گەورە -کە بە وڵاتی بەختیاری بەناوبانگە- هەر ئاوە و هەر تاوە، لە ناو دەستی ئەم و ئەودا دەستاودەستی دەکرد.

لە ڕۆژگاری شاتۆماسبی سەفەویدا مەزنایەتی بەختیاریەکان بە تاجمیرناوێك سپێرابوو کە سەرکۆماری هۆزی ئەستەرکی بوو. ئەویش دەبوایە هەرساڵە دراوێکی زۆر و زەوەند بە ناوی یاری و دیاریەوە پێشکەش بە شای ئێران بکا. ساڵێکیان تاجمیردراوی دیاری شای بۆ هەڵنەسووڕا و فەرمان



درا لە سەریاندا. لە پاش تاجمیری سەرپەڕاو مەڵبەندی بەختیاری (لوڕی گەورە) درایە دەست میرجیهانگیری بەختیاری و دەبوایە ساڵانە دەهەزار ئێستر بۆ دیوانی شای ئێرانیێ بەرێ بکا.

میرجیهانگیر پیاوێکی سەر بە دەرەوە و لە ناو هۆزەکەی خۆیدا بەڕێز و خۆشەویست بوو. شاڕوستەمی کوڕی جیهانگیر -کە ئێستا باسی ئەو دەکەین- ببووە دەستەبەری ئەو میرە بختیاریە کە هەر گا ئەو ئێسترانەی بۆ نەدرا، ئەو بۆی بدا.

ساڵی ٩٤٧.ك (١٥٦٦.ز) شاتۆماسب ئەمیرخانی مووسڵوی خاوەنی هەمەدانی ناردبوو کە ئەو دەهەزار ئێسترە لە لوڕستانی گەورەدا کۆ کاتەوە و بشچێ باج و پیتاکی خۆزستانیش بۆ شاوەرگرێت. لەو دەمەشدا خۆزستان بە دەست عەرەبەکانی موشەعشەعەوە بوو.

شاپەروەرخانم کچی ئەغوەر و ژنی شاڕوستەم بە دزیەوە فەرمانێکی شای ئێرانی وەرگرتبوو کە دەبێ ئەمیرخانی مووسڵو لە -هەلێکدا کە بۆی هەڵکەوت- محەمەدی برای شاڕوستەمی بگری و بۆ شای ڕەوانەکات!

جا کە ئەمیرخان گەیشتە بەرەوە و لە خوڕڕەماباد نزیك کەوتەوە، محەمەدی چوو بە پیریەوە و دیدەنی لێ کرد. ڕۆژێکیان ئەمیرخانی مووسڵو، محەمەدی و گەلێك لە دەست و پێوەند و هەوالآنی بانگێشتن کردن و لە شوێنێکدا کۆی کردنەوە و محەمەدی و سەدکەسی لە گەورە پیاوانی لوڕستان گرت و باڵبەستە بۆ شای ئێرانی بەرێ کردن؛ شاش هەمووی لە قەڵای ئەڵەمووتدا خستنە ناو زیندانەوە.[1]

ئەگەر خوا دەرفەت بدا بە دووروێژی باسی بەسەرهاتی شاڕوستەم و محەمەدی دەنووسم.

---

١- سیدحوسێن حوزنی ئەم ڕووداوە بە جۆرێکیتر دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەمیرمحەمەدی شۆڕشی نەوەستاندبوو؛ ناوچەکانی دەوروبەری تالآن دەکردن و قەڵەمڕەوی زێدەدەکرد و لەشکری هەر بە هێزتر دەبوو. شاتۆماسب لەشکرێکی یەکجار زۆر و پرچەکی بە سەرکردایەتی ئەمیرخانی حاکمی هەمەدان ناردەسەر. محەمەدی دەگژی ڕاچوو. ماوەیەکی زۆر، زۆر پاڵەوانانە شەڕی دەگەڵ کردن و هەردووك بەرە زۆریان زیان وێ کەوت. بەڵام لە پاشان محەمەدی بە دیل گیرا و بۆ شاتۆماسبیان نارد و خستیە قەڵای ئەڵەمووتەوە. هێندێکیش دەڵێن: شاڕوستەم بانگێشتنەکەی کردووە و بەو فێڵە گرتوونی و خستوونیە زیندانەوە. جەمیل

## محەمەدی کوڕی جیهانگیر

محەمەدی لە قەڵای ئەڵەمووتدا دەساڵ زیندانی کێشا. لە ماوەی ئەو دەساڵەدا چوار کوڕەکانی -کە عەلیخان و ئەسڵەمز و جیهانگیر و شاوێردی بوون- لە شاڕوستەمی مامیان هەڵگەڕابوونەوە و ببوونە گڕێ ئاگر و لە تەشك و داوێنی هەڵگڕا بوون و یەخە و بەرۆکیان بەرنەدەدا و سەر و گوێلاکیان دەکوتایەوە؛ گەڕ و گێچەڵی وایان بۆ دەنایەوە هەنگوین و دۆشاویان بە زاری تاڵ کردبوو. هەر بەوەشەوە نەوێستا بوون، پەلاماری ولاتی ژێردەستی شاشیان دەدا و شاشیان سەرگەردان و شاش کردبوو. هەمەدان و جەربادقان و دەوروبەری ئیسفەهان و چەند شارستانیان پوڕ دەکرد و ماڵی شاپەرستانیان کاول و خاپوور دەکرد. جگە لەوەی کە بە سەر ڕوستەمدا زاڵ بوون، لە ڕاست قزلباشانیش ڕوستەمی زاڵ بوون و پاسدارانی سەرسنووریان وەزاڵە هێنا بوون و بنێشتە تاڵەیان بە بژۆلانەوە نابوون و لە دەست و بردیان حەپەسا بوون. سەردارانی سەر بە شاو شاڕوستەمی دڵ نەشا، هەرچەندی کردیان و کۆشان و ڕووبەڕوویان بوون و دەگژیان ڕاچوون، هەر سەری شکاو و پاشلی دڕاویان بۆ ما و بە هیچ ئاوایەك دەرۆستیان هەر نەدەهاتن و زۆریان نەدەبردن و چاریان نەدەکردن.

دەستدرێژی و دەست گەرمی ئەو بەچکە شێرانە، کێچی خستە کەوڵی شای ئێرانەوە و حەجمینی لێ هەڵگیرابوو؛ تێی گیرابوو نەیدەزانی بە چ‌بارێك چاریان بکا و لە دەستیان ڕزگاری ببێ. ڕاوێژکەرانی شاوایان دەشاگەیاند کە ئەم بەلایە بە هیچ شتێك دوایی نایە مەگین فەرمان دەرکەی و بفەرمووی کە لە محەمەدی خۆشبووی و لە زیندان دەری‌خەیە دەرەوە و ئەوسا دەست بە سەر، بە سەرکردەیەکی قزلباشی بسپێرە و پێودانی بۆ دانێ، دەبێ کوڕەکانی بە بارمتە لە لای تۆ دانێ. ئەودەم بە یەکجاری بەردەدرێ و ڕزگار دەکرێ و لۆڕستانی دەدرێتەوە و لە سەرجێگە و ڕێگەی پێشووی دادەمەزرێتەوە.

شائەم ڕاوێژەی پەسند کرد و چۆنیان شوێن بۆ کێشابوو، لە سەری ڕۆیشت. محەمەدی بە مزگینی ئازاد کردن فریە شاد بوو. بەڵام سەرەڕای مەرجی دەگرۆ نانی کوڕانیشەوە قزلباشان بۆیان خستەسەر کە دەبێ سی‌هەزار سەر ئەسپ و ئێستر و مەڕیش پێشکەش بە شاو نزیکانی شابکا!

محەمەدی ڕەوانەی قەزوین کراو درایە دەست حوسێن‌بەگی‌ئستاجلو -کە سەردارێکی قزلباش بوو- لەوێوە نامەیەکی بۆ کوڕەکانی نووسی کە هیچ گیر نەبن و سی‌هەزار سەر ئەسپ و ئێستر و

پەز بۆ شابێنن و بێنە قەزوێن.

کوڕانی محەمەدی زۆر بە دەستوبردانە وەخۆ کەوتن و وێکەوتن و پێشەکی دەهەزار ئەسپ و ئێستر و ناژەڵیان پێکەوە نا و دوانیان بە هەڵەداوان ئەو وڵسات و پاتاڵەیان ڕەپێچ کرد و بەرەو قەزوێنێ کەوتنە ڕێ.

کاتێ گەیشتنە گوندی شەرەفاباد -کە فرسەخێکی بۆ قەزوێن دەمێنێ- وڵامیان بۆ بابیان نارد کەوا گەیشتوونە بەرەوە و فەرمایشتی لە سەر چییە؟

محەمەدی بە حوسێن بەگی ئستاجلوی ڕاگەیاند کەوا کوڕەکانم لە شەرەفابادن و وڵساتە پێشکەشیەکەی شایان هێناوە و من وای بە باش دەزانم بۆ خۆم بچمە شەرەفاباد و چاوێك بە پاتاڵەکەدا بگێڕم و قرپۆك و ئەیاغی لێ هەڵوەژێرم و گەجەر گوجەری لێ هەڵاوێرم و تێر گوشت و بژاردەکەی بۆ شابنێرم؛ نەوەك ڕۆژەردیمان بێتە سەر. خۆ ئەگەر لەو هەڵاواردن و هەڵبژاردنەشدا کەم و کوورییەك بکەوێتە بەینەوە، لە دواییدا پڕی دەکەینەوە.

حوسێنبەگ ئەم پێشنیارەی بە دڵ بوو؛ چەند کەسێکی لە قزڵباشی تێڕادیوی خۆی ڕەگەڵ خست و بردیانە لای کوڕەکانی.

تا ئەوان گەیشتنە شەرەفاباد، تاریکان داهاتبوو. محەمەدی بە قزڵباشەکانی پاسەوانی گوت: دەڵێن چی؟ ئەم شەو لە لای کوڕەکانم میوان بین؟ چونکە تازە شەوە و چاك و چرووکی ناژەڵ لێك ناکرێتەوە؛ بەیانی بە ڕووناکی لە پاتاڵەکە دەڕوانین و دەزانین کامی قەڵەوە و پتەوە، وەپێش خۆمانی دەدەین و دەیبەین و پێشکەشی دەکەین و ئەوی لەڕ و دالگۆشت و بێ بڕەوە، جیای دەکەینەوە و گلیدەدەینەوە. زۆر دەمێکیشە چاوم بە جگەرگۆشەکانم ڕوون نەبۆتەوە، با ئەم شەو تێریان ببینم و بیاندوێنم. قزڵباشەکان مانەوەی شەو و میوانی کوڕەکانیان بە باش زانی و گوتیان چی تێدایە؟ با وابێ.

محەمەدی تاریکایی شەوی بە دەرفەت زانی و خۆی و کوڕەکانی سەر و ئەسپی زۆر باشیان هەڵبژارد و ناوی خوایان لێ هێنا و مامزیان گەیاندەتەڕادی کەحێلان و دەستەو جڵەو بە سەرڕەو تێیان تەقاند و وەك تیری ساردەکەوان بۆی دەرچوون؛ لوڕستان بگرە و هاتم! شەوەکی ئەو شەوە کە دەنگ و باسی ئەم کۆچ و ڕەوە بە ناو قەزوێندا گەڕا و گوێچکەی شاش بەو دەنگە زرینگایەوە، فەرمان

دەرچوو کە ئەمیـرخانی فەرمانڕەوای هەمەدان و دەسـتەیەکی هەڵبژاردەلـە چـاپك سـوارانی قزڵبـاش بکەونە شوێن مـحەمەدی و کوڕەکانی و دەردەستیان کەن. بەڵام ئەسپی ژێـر ڕکێفـی عەجـەمان ئـەو کردەو دەرهاتووانە نەبوون کە تۆزی سوارچاکانی لوڕ بشکێنن؛ زۆر لە چارەوێکانیان لە ڕێگەدا سەکەت بوون و بە دەم لە پووشی گەڕانەوە.مـحەمەدی و کوڕانی ڕێگای دەرۆژیان بە چـوار ڕۆژ بـڕی و خۆیـان گەیاندەوە لوڕستان.

شاڕوستەم وەك گوتوویانە: ترسی لە بێچووەمار بوو، هەژدیهاشی دوچار بوو! کـاتێ زانیـەوە کـە مـحەمەدی بە کوڕانەوە هاتەوە، دەشـیزانی دەسـەریەوە ناچـێ و هـەر بـە گـەز و ڕیـەی خـۆی بـۆی دەپێوێتەوە، ئۆقری لێ هەڵگیـرا و کونەمشکی لێ بوونە قەیسەری و سەری خۆی دەبن کەوشێ گرت و ئەو هەڵاتنەی پێ هەڵات، ئاوڕی نەداوە هەتا لە کووچە و کۆڵانەکانی قەزوێن خۆی گرتـەوە و لـەوێش دەناو کڵاوسووراندا ماتەی هەڵگرت و تازە ببـڕای-ببـڕای بیـری لە لوڕستان نەدەکـردەوە و نەیـدەوێرا خەونیش بەو ڕۆژەوە ببینێ کە کوێخایەتی کردووە. لە قەزوێنیش چونکە کـەس کـاری پـێ نـەمابوو، کارێکیان پێ نەسپارد و بەرهەڵدا-بەرهەڵدا دەخولایەوە هەتا ڕۆژێـك لـە برسـان و لـە ترسـان سـەری نایەوە و ناوی لە رووپەڕی ژیان کوژایەوە.

مـحەمەدی لە سەر هەموو خاکی لوڕستان بوو بە فـەرمانڕەوای سـەربەخۆ و شـای بـێجوقەـە. بەدەستەڵاتێك بوو خودا نەبێ کەسی بە باڵادەستی خۆی نەدەزانی و دەیگوت پیاوم دەوێ لار بڕوانێتـە لوڕستان و مەردم گەرەکە بـەردم وەبـەر پـێ بـدا. بەویـەڕی سەربەسـتی و ئـازادی دەژیـا و قۆشـە و پوڵەسووتاوێك لە داهاتی لوڕستان بە هیچ ناوێکەوە نەدەچووە گیـرفانی هیچ ناپیاوێکەوە.

مەردی و نەبەردی سامێکی وای بۆ پەیدا کرد کە شاتۆماسب و شائیسماعیلی دووەمیش دڵیـان ڕادەگرت و هیمی دۆستایەتیان دەگەڵ دادەڕشت.

دوای ئەوە کە شائیسماعیلیش مرد و پشتی دەدنیا کرد، مـحەمەدی خۆی کردەلاگیـری سوڵتان مرادی عوسـمانی و سوڵتان بە دۆستایەتی مـحەمەدی زۆر شاد و دڵخۆش بـوو. لـە ئاسـتانەوە بـۆی بڕایەوە کە ناوچەکانی مەندەلی و چەسان و بادرانی و تەرساق -کە مولکی تایبەتی شاهانە بوون- ئەو بە سەری ڕابگا و دەرامەتیان -کە دەیکردە دوازدە کیسە زێڕی عوسـمانی و بەرانبـەر بـە شەشـسەد تومانی عیـراق بوو- مووچەی ساڵانەی مـحەمەدی بێ. فەرمانێکی سوڵتان مرادیشی بۆ دەرچوو کـە

هەتا محەمەدی دۆستی دڵسۆزی دەوڵەت بێ، ئەو مووچە و بەراتەی هەر ببێ. سەرەڕای ئەوەش فەرمانی فەرمانڕەوایی لوڕستانیشی بۆ مۆرکرد و گەلێك خەڵاتی درایە و دراوی زۆری پێدرا و کەمەربەند و حەمایەڵە شیری زێڕین، بەشێك بوون لەو خەڵاتانە.

چەند ساڵێك بەو جۆرە ڕایبوارد. بەڵام پیاوی وەك محەمەدی کە سەری بۆ عاسمان نەدەچەماند، نەیدەتوانی لالایی لە بەر میری میرانی بەغدا بکات و زمان لووسی و کلکەسوتە و خۆهێنانە پێش، زۆر لەو بەدوور بوو. میری میران لە سەر ئەو سەربەرزیەی خۆشی‌نەدەویست و بەگەکانی‌تری عوسمانیش هەر سەبارەت بەو ئاکارە پیاوانەیەی بە تاوانباریان دەزانی و لە هەموو لایەکەوە لێی کەوتنە دوزمانی و درۆیان بە دەمەوە هەڵدەبەست و کارێکیان کرد کە بە دزیەوە فەرمانێکی سوڵتانیان خستە دەست کە هەر کاتێ بۆیان لوا محەمەدی بگرن و بیخەنە بەند و پێوەندێ.

محەمەدی هەستی بەو کەین و بەینە کردبوو، خۆی دوورە پەرێز دەگرت و هەلی بۆ هەڵنەدەخستن کە بەردەستی بکەن. تەنانەت ڕۆژێك یەك لە بەگلەربەگەکانی عوسمانی -کە خۆی بە گاشەخۆر دەزانی- سەرەڕێی لە محەمەدی گرت و نیازی گرتنی دەدڵ گرتبوو. بەڵام محەمەدی لەو کەسانە نەبوو کە ئەم جۆرە قەلە و قوتانە بەنی بابدەن و بە بەگلەرێك و دوان و سیان و دەیانیش بگیرێ. بەگلەری چەنبەری لەو ڕێ‌گرتنەی، لە هەناسەی سارد و خوێنی گەرمی خۆی بەولاوە چی دەسگیر نەبوو. لەو ڕۆژوە محەمەدی پتر لە پێشوو خۆپارێزی دەکرد و ئاگای لە خۆی دەبوو. توخنی بەغدا نەدەکەوت و تەنیا داهاتی ئەو موڵکانەی وەردەگرت کە دوورە بەغدا بوون و لە موڵکی تایبەتی شاهانە بۆی دیاری کرابوون.

شاوێردی و جیهانگیری کوڕیشی -کە بە ناوی بارمتەی دڵسۆزیەوە لە بەغدا گل درابوونەوە- ڕۆژێك کە دەیانزانی والی لە بەغدا دەرچووە و بە ناوی گەشت و ڕاوەوە چۆتە چوڵ و دەشتەوە، بە هەلیان زانی و بە جووتەسوارە لە شار دەرچوون و ئەسپیان تاودان و بە جۆرێکیان داژۆت کە بای شەماڵ و خەیاڵی تورکانیشیان پێ ڕانەدەگەیشت و خۆیان گەیاندەوە لوڕستان.

لەو سەروبەندانەشدا سوڵتان محەمەد کوڕی شاتۆماسب[1] ناردبوویە سەر کیژی محەممەدی کە بۆ هەمزەمیرزای کوڕی خۆی بخوازی و نیازیشی لەم خزمایەتیە نێوان خۆشبوونی محەممەدی و ئێران بوو. ئەمیرمحەممەدی بەو خزمایەتیە ملی داو کچی خۆی کردەبووکی شای ئێران و دیسان دۆستایەتی دەگەڵ قزڵباشان دامەزراندەوە. تا ژیا هەر بە سەربەرزی و ئازایی ژیا و کە مردیش بە ئازادی مرد.

## شاوێردی کوڕی محەممەدی[2]

لە پاش نەمانی میرمحەممەدی -لە سەر پەسندی ڕیشسپی و کەیخودایانی لوڕستان- شاوێردی لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی ڕۆنیشت و لە دیوانی شاسوڵتان محەممەدی سەفەویشەوە فەرمانی فەرمانڕەوایی بۆ دەرچوو.

کاتێ کە هەوساری کاروباری فەرمانڕەوایی ئێران کەوتە ناو لەپی بە هێزی شاعەبباسەوە[3]

---

١- سوڵتان محەممەدی خودابەندەکوڕی شاتۆماسبی سەفەوی، ساڵی ٩٨٥.ك (١٥٧٧.ز) لە جێگەی شائیسماعیلی دووەم -کە برای بووە- کراوەتە شا و هەتا ساڵی ٩٩٥.ك (١٥٨٧.ز) پادشا بووە. جەمیل

٢- فەرمانڕەوایەکی زۆر بە مشوور بووە و کاروباری وڵاتی زۆر بە ڕێکوپێکی بەڕێوە بردووە و سنووری قەڵەمڕەوی خۆی گوشاد کردۆتەوە و لەشکری زۆری پێکەوە ناوە و چەك و جبەخانەی فرەی وە سەر یەك ناوە و گەنجینەی لە دراو ئاخناوە و ئەوەندەبە دادگەری و دڵسۆزی دەگەڵ ژێردەستانی خۆیدا ڕەفتاری کردووە کە هەموو کەس خۆشی ویستووە و لە فەرمانی دەرنەچوون. ساڵی ٩٩٧.ك (١٥٨٨.ز) سەنانپاشای چغالەزادەی تورك، بە لەشکری بەغدا، نەهاوەندی گرت و خەڵکی ئەو ناوەی هەموو ئاوارە کرد و قەڵایەکیشی تێدا بنیات نا و بەو هێرشەی قورقومازخانی حاکمی هەمەدانی خستە تەنگانەوە. گەلێك لە سەردارە کوردەکانیش بە تایبەتی کوردی شارەزووری کەوتنە گەل. چغالەزادەپەلی هاویشتە عەلی شوکور و شارەزوورییەکانی ناردەسەر هەمەدان. شاوێردیخان بە هێزی خۆیەوە هاتە هاواری قورقورمازخان. لە پاشان ئامۆژگاری قورقورمازی کرد کە بەو لەشکرە کەمەیەوە بە گژ سەنان پاشادا نەچێتەوە باشترە. قورقوماز ئەم ئامۆژگاریەی بە خەیانەت زانی و قسەکەی بە دەم دادایەوە؛ شاوێردی تۆرا و بە لەشکرەوە هاتەوە لوڕستان و دەستیکرد بە دابەستنی سنوور و قەڵاکانی و ئەو هۆزە کوردانەش کە ئاوارە ببوون پەنای دان و لە خۆی کۆ کردنەوە و سەربەخۆیی لوڕستانی ڕاگەیاند و دەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیش خۆی کردەدۆست.

لە پاشان کە عوسمانی و ئێرانی پێك هاتنەوە، شاوێردی ساڵی ١٠٠٠.ك (١٥٩١.ز) خۆی کردەوە بە دۆستی ئێران و بوو بە خزمی شاعەبباس. جەمیل

٣- شاعەبباسی یەکەم کوڕی سوڵتانمحەممەد خودابەندەی سەفەوی، لە ساڵی ٩٩٥.ك (١٥٨٧.ز) و هەتا ساڵی ١٠٣٧.ك (١٦٢٨.ز) پادشایەتی کردووە.جەمیل

ویستی پتر لە پێشوو پایەی دۆستایەتی دەگەڵ فەرمانڕەوایانی لوڕستاندا پتەو بکا. لە پێشدا خوشکە گەورەی شاوێردی -کە بێوەژنی هەمزە میرزای برای بوو- لە خۆی مارە کرد.

دۆتـمامێکی خۆشی -کە نەوەی بارام میرزا بوو- لە شاوێردی مارە کرد و بەو خزمایەتییە ئەوەندە لێك نزیك ببوونەوە وەك دەڵێن موویان دەبەرەوە نەدەچوو.[1]

ئەم دۆستایەتی و نێوان خۆشیە هەروەك خۆی ما هەتا وەختێك کە شاعەبباس ئەغوەرلوو بەگی بەیاتی ناردەسەر هەمەدان و کردیە گزیری خۆی لەو ناوەدا. ئەغوەر بەگ و شاوێردی دوژمنی لە مێژینەی یەکتر و وەك کێرد و پەنیر وابوون. لور و بەیات هەر لە کۆنەوە خوێنەخوێی یەکتر بوون و هەمیشە لێك دەخەفتان و لە بەهانە دەگەڕان.

شاوێردی و ئەغوەرلوو لە سەر مەڵبەندی برووجرد کردیانە کێشە و دەستیان لێك دایە چەك و هۆزەکانی لور و بەیات لە نزیك برووجردەوە تێك بەربوون و هەرا قەوما. ئەغوەرلوو بەگ و زۆربەی پیاوە سەرناسەکانی بەیات و گەلێك لە شەڕکەرەکانیان لەو شەڕەدا کوژران. لەشکرچی لوڕستانیەکان ڕژانە ناو ماڵ و منداڵی بەیاتەوە و دەستیان کرد بە تاڵان و شڕەخۆری و لە سیر هەتا پیوازیان بۆ نەهێشتن و وەك پەلکی سیریان لێ کردن.

شاقولی بەگ برای ئەغوەرلوو بەگ بە هەر ئاوایەك بوو خۆی گەیاندەلای شاعەبباس و نسووك و بەدی کارەساتەکەی بۆ گێڕاوە و چۆن برا و خزمەکانی کوژراون و چۆن ماڵیان بە تاڵان براوە، هەمووی لە بەردەم دانا. شاعەبباس بە بیستنی ئەو دەنگوباسە تەمێکی بە سەردا هات و گڕی گرت و لە ڕکان هەروا ئاورینگی دێنان و هەر ئەو ڕۆژە خۆی لێ ساز کرد و بەرەو لوڕستان هێرشی هێنا.[2]

شاوێردی کە زانی وا شاعەبباس هەر خۆی هاتووە و زانی بەربەرەکانی شای پێ ناکرێ

---

١- دەڵێن شاعەبباس هەر بۆیە خوێ کردۆتە خزمی شاوێردی کە فریوی بدا و لە خۆی دڕدۆنگ نەکا و بتوانێ کێسی لێ بێنێ و لە بنەی بهێنێ و هەر وا لەوە دەگەڕا کە بەهانەیەکی بۆ هەڵکەوێ. بۆ ئەو مەبەستەشی ئەغوەرلوو سوڵتانی بەیاتی تورکمانی حاکمی ئیسفەهانی ناردەبرووجرد کە پیتاکی بۆ کۆ بکاتەوە. ئیتر دەگەڵ شاوێردی خاندا بوو بە شەڕیان و ئەغورەلوو دەگەڵ چەند میرێکی تورکمان سەریان تێدا چوو. جەمیل

٢- گوایە شاعەبباس لەو سەردەمەدا بۆ شەڕی ئۆزبەکان بەرەو خوراسان دەچوو؛ کە ئەم خەبەرەی بیست، بەرەو لوڕستان گەڕایەوە. جەمیل

و کەڵلەی پێ لە کەڵلەی شاعەباس نادرێ، دەگەڵ چەند کەسێك لە دەستە و بەستەی خۆیدا بە ماڵ و منداڵەوە باری کرد و بە هەزار کوێرەوەری لە چەمی سەمیرە پەڕیەوە و خۆی گەیاندەچیای کلاو. ئیتر خەلکەکەی‌تری لوڕستان، ماڵ و منداڵ و وردەو یەخسیریان لەم بەری چەم قەتیس ما.[1] لەشکری شاعەبباس بە سەری دادان و گەلێکی شپرزە کردن و زۆر پیاوی لێ کوشتن و هەرچی سامان و دارایی هەیانبوو هەمووی قزڵباشان بە تالانیان برد و نانی شەویان پێ نەهێشتن.

شاعەبباس مەهدی‌قولی سوڵتانی شاملووی کوڕەزای ئەغزەوار سوڵتانی لە سەر خۆڕرەمابادی پاتەختی لوڕستان دانا و کردی بە میری میرانی ئەو سنوورانە و چەند کەسێك لە سەرکردەکانی قزڵباشیشی لە کن بە جێهێشت کە هاریکار و پارێزگاری بن. ئەوسا بە سەرکەوتوویی گەڕایەوە پایتەخت.[2]

لە دوای ئەوە کە شاعەبباس لە ئارادا نەما و گەڕایەوە قەزوێن، شاوێردی وەگورد کەوتەوە و کۆمەڵێکی لە پیاوە بە کارەکانی کورد و گۆران لە دەوری خۆی کۆ کردەوە و رووی کردەوە لوڕستان بۆ دەرپەڕاندنی مەهدی‌سوڵتان.

زۆر بێباکانە و بە لەخۆبووردوویی لە چەمی سەمیرە پەڕیەوە و لە پشت خوڕرەمابادەوە خۆی بە لەشکری مەهدی‌قولیدا دا. شەڕێکی زۆر گەرم و گوڕ و بە خوێن و

---

١- حوسێن حوزنی لە کتێبی *لوڕستان*دا دەڵێ: شاوێردی بە لەشکرەوە کشایەوە و خۆی گەیاندەچیای گورکوە کە لە سنووری نێوان بەغدا و لوڕستانە و بیست فرسەخ لە سەدمەرەوە دوورە. شاعەبباس بە لەشکرەوە بۆی چووە؛ ئەویش کە زانیویە دەستی لێ هەڵناگرن رووی کردۆتە بەغدایە و شاعەبباس گەڕاوەتەوە. جەمیل

هەروەها حوزنی لەو کتێبەیدا دەڵێ: گەلێك لە کاربەدەستانی لوڕستان کە یەك لەوان ئەمیر قەیسەرخان بێنەل و سەرۆکی هۆزێکی دوو هەزار ماڵی بوو، لە شاوێردی هەڵگەڕانەوە و چوونە لای شای ئێران. جەمیل

٢- شاعەبباس وڵاتی لوڕستانی بچووکی کردەدوو کەرتەوە: کەرتێکی دایە مەهدی‌قولی ناوبراو، کەرتەکەی‌تریشی دایە دەست سوڵتانحوسێنی کوڕی شاروستەم و هەموو سەرەکهۆزەکانی لوڕی بچووکی بانگ کرد و خەڵاتی کردن و رایسپاردن کە لە فەرمانی سوڵتانحوسێن دەرنەچن و هەزار سەریشی مەڕ بە دیاری دابە سوڵتانحوسێن و لە دوای ئەوەش کە هۆزی قەرەئالووسی لە لوڕستان گوێزتەوە و ناردیە عەلی‌شوکور، بۆ خۆی رۆژی دەی موحەڕەمی ساڵی ١٠٠٢.ك (١٥٩٣.ز) گەڕایەوە بۆ قەزوێن. جەمیل

خوڕ لەو ناوەدا ڕوویدا؛ بەڵام لە ئەنجامدا لە پاش کوشت و کوشتارێکی دژوار و بێژمار، لەشکری شاوێردی خۆی نەگرت و ڕای کرد و هەر کەسە لەو ڕۆژدا، ببووە دزی گای خۆی و وەك ئاردی ناو دڕکانیان لێهات. شاوێردی لە پاش ئەو تێشکانەی، ڕووی کردەبەغدا و هانای بردەبەر عوسمانیەکان و لەوێ گیرسایەوە.[1]

شاعەبباس کە بەمەی زانی بەراوردی کرد و لێکی دایەوە، وای بە باش زانی بە هەر نرخێك بێ لە دەمی عوسمانیانی بپچڕێتەوە و نەبێتە داردەستی دوژمنانی.

فەرمانی شاهانەی دەرکرد کە خوڕڕەماباد و لوڕستان بدرێتەوە دەست شاوێردی و لە جێگەی باب و باپیرانی خۆی فەرمانڕەوایی بکا. کەمبەرە شیری زێڕین و گەلێك خەڵاتی شایانی بۆ نارد و لە ناو هەواڵانیدا سەرفرازی کرد.[2] ئێستا کە مێژوو ١٠٠٥.ك

١- شاعەبباس دوای ئەوە کە شاوێردی لە لوڕستان ئاوارە کرد، پەژیوان بۆوە. حەزی نەدەکرد شاوێردی بێتە دۆستی عوسمانیان؛ چونکە دەیزانی ئەگەر ئەو سەردارە نامدارە و ئەو پاڵەوانە قارەمانە دوژمنی ئێران بێ، ژیان بە خەڵکی خۆزستان و فارس و عەلیشوکور و لوڕستان تاڵدەکا و بە تاڵان و چەتەیی لە بنەیان دێنێ. لەوانەشە ڕۆژێك لە ڕۆژان دەوڵەتیعوسمانی لەشکری بداتێ و بینێرێتە سەرئێران. لەبەرئەوە هەر بیریدەکردەوە چۆنی بێنێتەوە سەروڵاتی خۆی. لە دواییدا ئیعتمادودەوڵە فەرهادخانی بە ناوی پشکنینەوە ناردەلوڕستان و ڕاشیسپارد کە زۆر پەلە بکا و تەقەلا بدا کە شاوێردی ئاشت کاتەوە. ئیعتمادودەوڵە فەرهادخان پیاوی ناردەلای شاوێردی و وتووێژیان لە ناودا هاتووچوو. دوایی ژوانیان لە گۆڕستانێك کرد و هەردووك لا سوێندیان بۆ یەکتر خوارد و پەیمانی ئاشت بوونەوەیان بەست. ئەمە لە ساڵی ١٠٠٣.ك (١٥٩٤.ز) دابوو؛ ئیتر شاوێردی هاتەوە خوڕڕەمابادی پاتەختی و فەرمانڕەوایی پێشووی گرتەوە دەست و شاعەبباس خەڵاتی کرد و ئەویش هەزار زێڕی بەخششدا بە پیاوەکانی ئیعتمادودەوڵە و هەروەها بە لەشکرەوە ڕەگەڵی کەوت و چوونە سەر خۆزستان کە شۆڕشی تێدا هەڵگیرسا بوو. جەمیل

٢- شەرەفخان هەر هەتا ساڵی هەزاروپێنجی نووسیوە؛ بەڵام لە دوای ئەوە لە ساڵی ١٠٠٦.ك (١٥٩٧.ز)دا شاعەبباس دەشاوێردی هەڵپێچا و دەیەویست لە ناوی بەری و تۆڵەی لێ بکاتەوە. بەو نیازەوە و بە لەشکرێکی زۆرەوە ڕووی کردەئیسفەهان و لە ڕێگەدا پای دایەوە سەر لوڕستان و لە نەکاو بە سەر شاوێردیدا دا. شاوێردی کە زانی دەگەڵیان دەر نابا. لە بەریان هەڵات و خۆی گەیاندەسنووری عیراق و لەوێشەوە چوو خۆی لە قەڵای چەنگلەدا قایم کرد. شاعەبباس بە سەرکردایەتی ئەڵاوێردیخان، لەشکری ناردەسەر و ئابلۆقەی قەڵاکەیان داو لە پاش چەند شەڕ و پێکا هاتنێك شاوێردی بە دیل گیرا و بردیانە سەدمەرە بۆ لای شاعەبباس. کاتێ گەیشتە بەردەمی شا، دەستی کرد بە جوێن پێدانی و ئەگەرچی شا بە نیاز نەبوو بیکوژێ، بەڵام ڕقی هەستا و فەرمانیداکوشتیان. ئەمجار شاعەبباس ڕووی لە حوسێنخان سەلویزی نا کە بە سەر لوڕستان ڕابگا. حوسێنخان لە بەر←

(١٥٩٧.ز)یە شاوێردی ماوە و زۆر بە کامرانی فەرمانڕەوای لوڕستانە.

---

←خاتری ماڵەمیران قبووڵی نەکرد. شاعەبباس بەوە زۆر تووڕە بوو؛ فەرمانیدا هەرچی کەس و کاری شاوێردی بوو، هەر لە کۆرپەی ساواوە تا پیر و پەك کەوتەی نێرومێ، هەموویان کوشتن و ناسەواری بڕینەوە و بەو کارە نامەردانەیەی، پەڵەیەکی وا ڕەشی لە مێژوودا خستە سەر خۆی کە تووێڵی مرۆڤایەتی خوەدانی پێدەدا. لە پاش ئەوە کاروباری لوڕستانی دایە دەست سوڵتان حوسێنەوە کە ئەویش کچەزای شاوێردیخان و لە هۆزێکی لوڕی لای پشتکۆ بوو.

ئەمینزەکی دەڵێ: ئەگەرچی ئەو میرحوسێنە ماوەیەکیش بە سەر لوڕستان ڕاگەیشتووە؛ بەڵام کاتێ نادرشا تۆماسبقولی بۆتە شا، سەدمەرە و هێزماس و پشتکۆی داوە بە هۆزی ئینانلوو. بەمە پەردەبسە سەر فەرمانڕەوایی لوڕستانی گچکەدا کشاوە؛ بەڵام ئەوە و نەتەوەی شاوێردی میرنشینیەکی پچکۆڵەیان لە پشتکۆ هەر لە دەست داما و فەرمانڕەواکانی -کە بە والی ناو دەبران- بە زنجیرە ئەمانەبوون:

١- حوسێنخان ٢- ئیسماعیلخان ٣- ئەسەدخان ٤- حەسەنخان ٥- کەلبعەلیخان ٦- عەلیخان ٧- حەیدرعەلیخان ٨- حوسێنقولیخان ٩- غوڵامڕەزاخان. لە ڕۆژگاری ئەم غوڵامڕەزاخانەدا ڕەزاشای پەهلەوی لە ساڵی ١٣٤٦.ك (١٩٢٨.ز) دامیرنشینیە سەربەخۆکەی لە بەین برد و حاکمێکی سوپایی بە سەرەوە دانا.

مستر ئەدموندس ئەم غوڵامڕەزاخانەی بە والیەتی دیوە و لە بەر کتێبێکەوە کە والی داینا‌وە مەقالێکی ڕاگوێزتووە و نووسیویە: «ئەوانەی لوڕستانیان لە ژێر حوکمدا بووە ئەمانەن: حوسێنی یەکەم، شاوێردی، مەنسوور، حوسێنی دووەم، عەلیمەردان، مەنوچیهر، شاوێردی دووەم، ئیسماعیل، محەمەد، ئەسەدوڵا، محەمەدحوسێن، محەمەدحەسەن، حەیدەر، حوسێنقولی، غوڵامڕەزاخان.» سێیەکانی پێشوو لە خوڕڕەماباد لە گۆڕستانی ئیمامزادەنێژراون؛ حوسێنی دووەم چونکە هۆزی قەرەئالووسی ڕێ نەدا لە زەهاو بپەڕنەوە و بچنە لای عوسمانی، شا کردی بە والی. عەلیمەردان دوای ئەوەی کە چاوی شاوێردی برای خۆی کوڵی، نادرشا ناردیە ئاستانە و کە لەوێوە دەگەڕاوە، لە دەوری کەرکووك مرد و لە گۆڕستانی ئیمام زەینەلعابدین نێژرا. [گۆڕی زەیدی کوڕی عەلی لە گوندی ئیمام و باکووری ڕۆژهەڵاتی تاوغە] ئیسماعیل هەشت ساڵی حاکمەتی کرد و دراوێکی زۆری لە ئیسفەهان وەسەر یەك نا. محەمەدحەسەنخان، ئاغامحەمەدخانی قاجار کردیە والی لوڕستان و ساڵی ١٠٥٥.ك (١٨٤٩.ز) یان وەك ئەمینزەکی دەڵێ ١٢٥٦.ك (١٨٤٠.ز) مردووە و ٩٠ ساڵی تەمەن بووە و کراویشە والی پشتکۆ؛ چونکە لوڕستان لە نێوان کوڕەکانیدا -عەلی و ئەحمەد و حەیدەر- بەشکراوە و عەلی لە ساڵی ١٢٥٨.ك (١٨٤١.ز)دا حاکمێکی ناودار بووە و تەنانەت شێخی هۆزی بەنیلامی عەرەبیش سەرانەیان داوەتێ. لە پاشان حوسێنقولیخان لە ڕۆژگاری ناسرەدینشای قاجاردا کراوەتە والی و زۆری خزمەتی دەوڵەتی ئێران کردووە. دوای ئەوە کە غوڵامڕەزاخان بۆتە والی و خزمەتکاری ئێرانیش بووە، والیەتیەکە هەڵوەشاوە و خراوەتە سەر ئێران. جەمیل

# بەندی پێنجەم

# پادشایانی میسر و شام

## کە بە بنەماڵەی ئەییوبی بەناوبانگن

چیـرۆك بێژانی دەمڕاس و دیرۆكزانانی دوورناس و مێژوونووسانی تەردەست و مێژووناسانی پیتۆڵ و لە سەر هەست، بۆ باسی ئەم مەبەستەمان بەم جۆرە دەست پێ دەکەن و دەڵێـن:

باپیـرانی پادشایانی میسر و شام بە بنە و بنەچەکە دەگەنەوە سەر شادی کـوڕی مـەروان[1] و لـە هۆزی کوردەکانی ڕەوەندە[2]ن و لە مەڵبەندی ئازربایـجان، لە گوندی دویـن[3] دەژیان. گوندی دوین ئێستا وێرانە و لە شوێن ئەو گوندێك بە ناوی «چغور سەعد»ەوە ئاوەدان کراوەتەوە.

لە ڕۆژگاری دەسەڵاتداری سوڵتان مەسعوودی سەلـجۆقیدا، یـەکێك لـە کاربەدەسـتانی سـوڵتان پاراستنی قەڵای تکریتی بە شادی -باپیـرە گەورەی ئەییوبییەکان- ئەسپاردووە و بەو هۆیەوە شادی لە

---

١- لە بنەماڵەیێکی گەورە و سەرەکهۆز بووە، لە گوندی ئەجدنکانی نزیك بە دوین ژیاوە. بـە ڕەگـەز دەچێتەوە سـەر پادشایانی شەددادی کـورد. هاوچـەرخی ئەمیـرفەزلونی سـێهەم بـووە. کـاتێ ئەمیـرقرتی تورکمـان وڵاتەکـەی بـۆ سەلـجۆقیان لێ داگیـر کردوون، شادی لە نیشتمانی خۆی ئاوارە بووە.

٢- لە کتێبی *اخبارالدول*دا دەڵێ: لە هۆزی حەمیدی کوردە؛ بەڵام ڕەوندە، ڕواندا، ڕەوندی یـان ڕەوادی تیـرەیەکن لـە هۆزی هەزەبانی، هەزانی یان خێزانی؛ کوردن کە لە نێوان هەولێر و ئازربایـجان دەژیان و هۆیەیان لە لای ئشنە (ئاران) بوو. جەمیل

٣- مێژوونووسان لە سەر ئەو ناوە کێشەیانە؛ هێندێك دەڵێن: لە نێوان هەولێر و ڕەواندزە و نزیکی گوندی دێرحـەریرە؛ کە سەر وەختێك پاتەختی فەرمانڕەوایی سۆران بووە. زانای گەورەی کورد مەلامـحەممەد کوڕی حاجیھەزارمێردی. لـە ئیبـنو خەلەکانی کوردەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویە: «دوین دال بۆر و واو ژێر. شارۆکێکە لە نزیك هـەولێر و زۆربـەی کاولگەیە و ئەمڕۆ ئەو دەوروبەرە بە وڵاتی سۆران ناسراوە». هێندێکیش گوتوویانـە لـە ئازربایـجانە و کەوتۆتـە لای سنووری ئاران (یەریڤان) و گورجستان. شەرەفخان خۆی لای وایە و گـەلێك لـە مێژووناسـانی ئێـستاش وەك دوکتـۆر ئەحـمەدبیلی و ئەمیـنزەکی بەگ هەر لە سەر ئەو بڕوایەن؛ بەڵام قازیمەحیەدین لای وایە بدوین بیتوێنی ئێستایە کە لە لای کۆیسنجەقە. جەمیل

تکریت گیرساوەتەوە و هەر لەوێدا ماوەتەوە، هەتا ڕۆژی تیینداری ژیانی کەوتۆتە خۆرنشینی مەرگەوە و شادی لە کەس‌وکاری بووە بەشین.[1]

لە پاش نەمانی شادی، کوڕی گەورەی -کە ناوی نەجمەدین ئەییوب بوو-[2] لە سەر کاری بابی دامەزرا و ئەرکی قەڵاداری کەوتە سەر شانی. نەجمەدین ئەییوب برایەکی لە خۆی گچکەتری هەبوو ناوی ئەسەدەدین شێرکۆ بوو.[3] لەو سەروبەندانەدا کە نەجمەدین ببووە دژداری تکریت، ڕۆژێك لە ڕۆژان نەجمەدین و شێرکۆ پێکەوە بە ناو شاری تکریتدا دەگەڕان؛ لە نەکاو ژنێك بە زیرژن و گریان و هاوار، هاواری بۆ هێنان و دەست و دامێنیان بوو، کە بیکەن لە ڕاهی خودادا کابرایەك چاوی بڕیوەتە نامووسم و ئێوە نەمپارێزن ئاورووم دەبا! وا خۆم هاویشتە داڵدەو پەسیوی ئێوەوە.

ئەسەدەدین‌شێرکۆ بە بێ‌ڕامان و سێ‌ودوو لێ کردن، ڕای‌کردەسەر کابرای بێ ئابڕووی ئابڕووبەر و ئەو نێزەی لە دەست دەرێنا کە گەفی پێ لە ژنەکە دەکرد و هەر بە نێزەکەی خۆی برینێکی وا حەستەمی لێ کرد کە بە بێ لینگەفرتە و نقەکردن، هەر دوو جاران دەمی پێك دادا و مرد.

نەجمەدین وەك هەموو فەرمانداریێکی خۆ نەبوێر و ڕێ‌وشوێن‌زان، شێرکۆی برای خۆی کۆت و زنجیر کرد و خستیە زیندان و کارەساتەکەشی چۆن دیبو، ئاوای دەنامەیەکدا نووسی و بۆ نایبی سوڵتان مەسعوودی سەلجۆقی نارد و چاوەنۆڕی فەرمانی بەغدا بوو.

نایبی سوڵتان مەسعوود لە وڵامی نامەی نەجمەدین‌دا نووسیبووی: ئەو کابرایەی کە برای تۆ کوشتوویە، دۆستێکی زۆر نزیك و خۆشەویستی من بوو؛ زۆری بۆ بە پەرۆشم. لە لایەکی‌تریشەوە

---

١- ئەمیرجەمالەدین بەهرووز کۆنە کۆیلەی شادی بووە. کە شادی ئاوارە کراوە، بەهرووز لە لای مەلیکشای سەلجۆقی دامەزراوە و یاریدەی لەلەی شازادانی کردووە. کاتێ لەلە مردووە، بەهرووز جێگەی گرتۆتەوە. وریایی زۆری لە خۆی نیشان داوە و لە ئەنجامدا کراوەتە والی بەغدایە. ئەوسا ناردوویە بە شوێن شادی کۆنە خاوەنیدا و قەڵای تکریتی داوەتە دەست. لە پاش مەرگی شادی، نەجمەدین ئەییوب و شێرکۆ بوونە دژداری تکریت؛ کە شارێکی بچووکە و لە لای ڕۆژاوای دەجلەیە و سەر بە سامرایە. جەمیل

٢- نەجمەدین لە گوندی ئەجدنکان هاتە دنیاوە و ساڵی ٥٦٨.ك لە میسر دنیای بەجێ هێشت. جەمیل

٣- ئەبولحەرب شێرکۆ کراوە بە سەرکردەی لەشکری نورەدین زەنگی و ساڵی ٥٥٥.ك ئەمیرحەج بووە و نارداویشەتە میسر بۆ یاریدەی خەلیفە عازەدوبیلای فاتمی و سێ جار دەگز فەرەنگان ڕاچووە و کراوەتە وەزیری خەلیفە و لە بیستودووەمی جیمادی دووەمی ساڵی ٥٦٤.ك دامردووە و لە مەدینە نێژراوە. جەمیل

هەواڵ و هۆگری تۆشم. زۆر دەترسم ڕۆژێك تووشم ببێ بە تووشی شێرکۆوە و خوێنم هەڵچی و خۆم بۆ ڕانەگیرێ و لە تۆڵەی دۆستی لە دەست چووما، شیری لێ بکێشم و لێمان ببێتە کێشە و دیسان خوێن بێتە سەرخوێن. من وای بە باش دەزانم تا تەمی ماتەمی ئەوم لە سەر دەڕەوێ، ئێوە لەو مەڵبەندەبارکەن؛ با چاومان بە یەکتر نەکەوێ.[1] نەجمەدین لە وەرامەوە زانی کە تازە لە تکریت مانەوە تامی نەماوە. دەگەڵ شێرکۆی برایدا نێوماڵ و کەل و پەلی خۆیان پێچایەوە و باریان کرد و ڕوویان کردەمووسڵ و چوونە لای عیمادەدین زەنگی؛ کە فەرمانڕەوای مووسڵ بوو[2]. عیمادەدین زۆری بەخێر هێنان و گەلێکی ڕێز لێ نان و زۆر بە ڕووی خۆشەوە لە لای خۆی گل دانەوە و کردنیە باوەڕپێکراوی خۆی و لە سەر خواست و ئاواتی خۆیان دایمەزراندن.

کاتێ کە شاری بەعلەبەك کەوتە دەست عیمادەدینەوە، بە نەجمەدینی ئەسپارد کە بە سەر کاروباری ڕابگا و کارگوزاری ئەوبێ.

نەجمەدین کەڵەپیاوێك بوو لە پیاوە هەڵبژاردەکانی جیهان؛ بەمشوور و کارزان و ئازا و پاڵەوان و لەسەرخۆ و پشوودرێژ و بەرچاوفرەوان و دەستودڵپاك و ئاکارچاك و لە خواترس و پارێزگار و لاگری بێچارە و هەژاران و ئاگری سەرگیانی دوژمن و بەدکاران و جێگەی شانازی دۆست و یاران؛ لە هەر کوێیەك و لە هەر جێیەك ماوەیەك ماوەتەوە، بە دادگەری و هونەروەری دەنگی داوەتەوە.

لەو سەرویەندەدا کە بە سەر بەعلەبەك ڕاگەیشتووە، خانەقایەکی بۆ سۆفیەکان دروست کردووە کە بە نەجمییە ناوی ڕۆیشتووە.

لە پاش مەرگی خوالێخۆشبوو عیمادەدین زەنگی، نەجمەدین و ئەسەدەدین شێرکۆ چوونە لای

---

١- مامۆستامحەمەد کورد عەلی لە کتێبی *القدیم والحدیث*ەدا دەڵێ: کابرای پەلاماری ژنەکەی دابوو، لە ئەفسەرانی پارێزگاری قەڵا و مەسیحیش بوو. لەو شەوەدا کە نەجمەدین دەبوو تکریت بەجێ بێڵێ، سەلاحەدین لە دایك بوو، باوکی پێوقەدەمی بە شووم زانیوە. نووسەرێکی بەردەستی، خاوی کردۆتەوە و گوتوویە: ئەم منداڵە گوناهی چیە کە خۆی لێ بە خاوەن ناکەی؟ چووزانی لە دواڕۆژدا نابێتە پادشایەکی بەناوبانگ؟ جەمیل جورجی زەیدان دەڵێ: میرزاکە مەسیحی بوو؛ ئەگەر ئەو نەبا، نەجمەدین سەلاحەدینی ساوای دەخنکاند. هەژار

٢- عیمادەدین زەنگی کوڕی ئاقسونقور، بە سەر بەغدا ڕاگەیشتووە و ساڵی ٥٢١.ك (١١٢٧.ز) بۆتە فەرمانڕەوای مووسل و ساڵی ٥٤٠.ك (١١٥٥.ز)- کە ئابڵۆقەی قەڵای جەعبەری داوە- کوژراوە.

نوورەدین مەحموود[1] کە پادشای شام بوو. نوورەدین بەهاتنی کوڕانی شادی،شادوشاگەشکەبوو؛ زۆری بەخێراتن کردن و گەلێکی بەرێزگرتن. شێرکۆی کردەسەرداری لەشکر و شاری حیمسیشی پێ سپارد.[2]

عازدی ئیسماعیلی والی میسر[3] -کە لە چەنگ فەرەنگان وە تەنگ هاتبوو- هانای بردەبەر نورەدین مەحموود کە بە هاواریەوە بچێ. نورەدین مەحموود سێ جاران شێرکۆی بە لەشکری گرانی خۆیەوە ناردەمیسر و یاریدەی عازدی دا. لە جاری سێهەمیندا -لە سەر خواستی عازد- شێرکۆ، شاپووری وەزیری عازدی کوشت و لە جێگەی ئەو کرا بە وەزیر.[4] بەڵام هێشتا گوڵێکی لە گوڵزاری وەزارەت نەچنیبوو کە شەختەی سەختی مەرگی لە پڕ، بەرگ و پەلکی گوڵی ژیانی پەرپەرِ کرد و هەڵیوەراند و کۆچی بێوادەی ئەو ئازا و ئازادە- وەك دڕکەزی- چەقیە ناو جەرگی هەموو میسری و شاسیەکەوە؛ لە دوای تەنیا ٦٥ ڕۆژ وەزیرایەتی کردن، ڕۆژی دووشەمە، دووەمی مانگی جیمادی یەکەمی ساڵی ٦٥٤.ك (١١٦٩.ز) گیانی پاکی بە خودای تاك سپارد و لە پاش ئەو سەلاحەدینی برازای کرا بە جێنشینی.

---

١- نوورەدین مەحموود کوڕی عیمادەدین زەنگی ساڵی ٥١١.ك (١١١٧.ز) لە حەلەب هاتۆتە دنیاوە و ساڵی ٥٤٠.ك (١١٥٥.ز) بۆتە فەرمانڕەوا؛ پادشایەکی دادگەر بووە و لە ڕێی ئیسلامدا زۆری شەڕی فەرەنگان کردووە. قەڵا و وارشی زۆری لە دەوری زۆر شاران دروست کردووە و گەلێك فێرگەی ئایینی بنیات ناون؛ بیست و هەشت ساڵ بە سەربەخۆیی پادشایەتی کردووە و ساڵی ٥٦٩.ك (١١٧٣.ز) لە شام مردووە و هەر لەوێش نێژراوە. جەمیل

٢- نەجمەدین و شێرکۆ ئاشنایەتی پێشوویان دەگەڵ نوورەدین هەبووە؛ ساڵی ٥٢٦.ك (١١٣٢.ز) ئەتابیك نوورەدین لە باشووری تکریت دەگەڵ سەلجۆقیان بە شەڕ هات و زۆر خراپ شکا و خۆی گەیاندەتکریت. نەجمەدین میوانداری کرد و بە کەڵەك و بەلەم لە دەجلەی دەرباز کرد. جەمیل

٣- والی بووە یان خەلیفە؟ عازدوبیلا یازدەمین خەلیفەی فاتمی عوبەیدییە و ناوی عەبدوڵا کوڕی یوسف کوڕی حافیز بووە. ساڵی ٥٥٥.ك (١١٦٠.ز) بە لاوەتی کراوە بە خەلیفە و ساڵی ٥٦٧.ك (١١٧١.ز) مردووە. جەمیل
شەرەفخان هەر خۆی بە ناوی خەلیفە عازد ناوی بردووە. بڕوانە چاپە فارسیەکەی میسر، ڕووپەڕ ٨٦. هەژار

٤- شاپوور (شاور) لە پەیسەری ئەسەدەدین شێرکۆ و هەواڵانی دەگەڕا و لێیان دەخەفتا. نیازی وابوو کە بانگێشتنێکیان بکا و لە ماڵە خۆیدا هەمووان بکوژێ. ئەو پیلانە پێ زاندرا و ڕۆژێك لە سویاگەدا سەلاحەدین گرتی و باڵ بەستە ناردی بۆ خەلیفە کە فەرمانی لە سەر چیە؟ خەلیفە بۆی ناردەوە کە سەری ببڕن و سەرەکەی بە دیاری بۆ بنێرنەوە. ئابەم جۆرە ئەو وەزیرە خاینەی دەیەویست وڵاتەکەی بدا بە فەرەنگان، سەری تێدا چوو. جەمیل

## سەلاحەدین یووسف کوڕی نەجمەدین ئەییوب

سەلاحەدین لاوێکی ژیهاتی و ژیر و کارامە و پیاوێکی زیت و زۆرزان و بە زیپك و دەستگەرم بووە. لە ماوەیەکی زۆر کەمدا زۆر خۆی ڕەپێش خست و هەموو کاروباری میسری خستە ناو چمك و ژێر چۆکی خۆیەوە و کارێکی کرد کە هیچ کەسێك لە میسردا هێچ کارە نەبێ، خۆی نەبێ.

لە لایەن خەلیفە عازدەوە نازناوی مەلیك ناسری پێدراو و لەو ساوە بە مەلیك ناسر سەلاحەدین ناو براو.

سەلاحەدین لە دوای ئەوە کە زۆر باش لە میسردا خۆی داکوتا و هەموو کاروباری ڕووبەڕا کردن، پیاوی بە نامەوە ناردەشام و وەلامی بۆ نوورەدین بە ڕێ کرد و تیا درکاندی: گەورەم خۆت ئاگاداری کە چەندێکە لە دیداری ئێوە بەش براوم و چاوم بە کەسوکار و خزمانم نەکەوتووە. بە تایبەتی زۆرم وەڕەزی باوکم کردووە و زۆری بۆ بە تاسەم. ئەگەر ئەو چاکەیەشم دەربارە بکەی و ڕێگەی بابم بدەی بێتە لام و بە دیداری شابم، هەرگیز لە سوپاسگوزاریت ڕزگاریم نایە.

نوورەدین ئاواتەکەی پێك هێنا و نەجمەدین، بەرەو فرزەندی جگەرگۆشەی -کە دەمێك بوو بۆی بە پەرۆشەوە بوو- بەرەو میسر چوو.

ڕۆژی بیستوچوارەمی ڕەجەبە مانگی سالی ٥٦٥.ك (١١٦٩.ز) نەجمەدین گەییشتە میسر و خەلیفە عازد -هەر خودی خۆی- تا دەرەوەی پاتەخت بە پیریەوە هات و زۆر بە ڕێز و حورمەتەوە پێشوازی لێکرد.

نەجمەدین ئەییوب کە مینا یاقوب پێغەمبەر، لە سوێی ئازیزی لە بەردلان و جگەرگۆشەی پالەوانی، جگەربرژاو و چرژاو و لە تاوی دوورە دیدەیی یۆسفی میسری جوانی، تانە لە چاو و بێ‌تین و تاو بوو؛ هەموو ئاواتی هەر ئەوەندەبوو جارێك لە کەنارێکەوە هەوالێکی بژنەوێ یان لەباتی دەنگ و باسی، بۆی کراسی، وەبەر بێقل کەوێ. ئەوا خوا کارێکی وای کردووە کە دووبەدوو، ڕووبەڕوو دەبنەوە و هەمبەر بە یەك خۆ دەنوێنن و تێر و پڕ دەبەژن و بالای یەك ڕادەمێنن و دەس دەملی یەکتر وەردێنن و تەمی سەردەمی تووشی جودایی دەڕەوێنن و دێو و خێوی حەستەمی ڕۆژانی لێك بڕان و چاوەنۆڕی دەتۆرێنن و دەتارێنن. لەو تووشی یەکتر هاتنەوەدا، فرمێسکی شادی هەلدەوەرین و پەلك و بەرگی چرۆی داری پەژارە و خەمباری - وەك گەلاڕێزانی ساردەپاییز- دادەورین.

باب و کوڕ پێك شاد و شوکور بوونەوە و لە ناو چەپڵەڕێزان و گوڵبارانی حەشاماتدا بە دڵی خۆش و چاوی ڕوونەوە بەرەو ماڵ بوون و بۆ ناو شار چوونەوە.

سەلاحەدین لە بەرانبەر ئەو سەروەرە خاوەن ناوەی باویدا، هەر دەبوو بە تنۆکە ئاوێك و بە چاوێکی ئەوەندەبەڕێزەوە سەیری دەکرد کە هەموو کەس سەیر دەما.

هەر کە نەجمەدین تۆزی ڕێگەی تەکاند و شەکەتی ڕەواند و پشووی داو حەسایەوە، سەلاحەدین کەوتە خاك و پایەوە و لە بەری پاڕایەوە کە وەزیرایەتیەکە خۆی بیکا و ئەمیش وەك بەندەیەکی ئالقە بە گوێ فەرمانبەرێکی بە گوێ و گوێ لە مست و ڕاست و درووست، لە بەر دەستیدا ڕاوەستێ و بە ڕاوێژ و فەرمانی ئەو دانیشێ و هەستێ و نۆکەرێکی کەمبەر بەستەی بێ. بەڵام نەجمەدینی وا پسپۆر و دوربناس -کە دەیزانی نرخی کوڕەکەی چەندەو چەند هێژا و بە جەوهەر و هونەروەر و مەرد و ڕەندەو چاوی تێوە بوو کە چۆن ئەستێرەی بە گرشەی شکۆ و سەربلندی، لە ئاسۆی هات و کامڕانیدا دەدرەوشێتەوە و سات بە سات پتر دەگەشێتەوە- باش تێ گەیبوو کاڵای خونکاری هەر بە باڵای ئەو براوە و لە کەسیتر ناوەشێتەوە؛ بە هیچ ئاوایەك ملی نەدا جێگەی بگرێتەوە و بۆی لە خودا پاڕاوە کە هەر باڵادەست و کامڕەوا بێ. لە سەرەتاکانی مانگی محەڕەمی ساڵی ٥٦٧.ك (١١٧١.ز) دا، خەلیفە عازد بە نەخۆشی لە سەر جێگا کەوت و پتر لە دەڕۆژی نەخایاند کە چاوی لە دنیای ڕوون نوقاند و لە مەڵبەندی ڕابردوواندا لە ناو نوێنی گڵکۆدا بۆ هەمیشە لێی خەوت.[1]

سەلاحەدین بوو بە یەکەمین کەلەپوورگری خەلیفەی خوالێخۆشبوو. هەر کە خەلیفە سەری ئاوا

---

١- خاوەنی *أخبارالدول* لە ڕووپەڕی ٩٩ی کتێبەکەیدا دەڵێ: «سەلاحەدین کە بوو بە وەزیر، عازدی گرت و لە کۆشکێکدا خستیە ژێر چاوەدێرییەوە هەتا مرد»؛ بەڵام من ئەمە بە ڕاست نازانم؛ چونکە سەلاحەدینێکی دەگەڵ خاچپەرستەکانی قەستەسەری ئەوندەباش ڕەفتار بکا بۆ تیماری بریندارییان بژیشك بنێری و بە بەفراو تونیایەتیان بشکێنێ، دەگەڵ نان بدەی خۆی -ئەگەر ئەمەشم ڕاست بێ! کە لە دوای مامی کردی بە وەزیر- بۆ گەیشتن بە کورسی پادشایەتیەکی کە درەنگ یا زوو هەر هی خۆیەتی، چۆن ئەو ڕەفتارە ناهەموارە دەکا؟ سەرەڕای ئەوەش زۆربەی مێژووناسان پێچەوانەی ئەوەی دەگێڕنەوە. جورجی زەیدان دەڵێ: «عازد پیلانی دژی سەلاحەدین ڕێك دەخست و شێخ سولەیمانی گزیکاریش -کە ئەبولحەسەنیان پێ دەگوت و بە تەمای جێنشینی و خواستنی ئەمیرە سیتەلمەلیك خوشکی عازید بوو- لەو پیلانەدا یاریدەی عازیدی دەکرد. بەڵام چونکە سیتەلمەلیك خۆشی نەدەویست و بە گیان و دڵ ئەڤینداری عیمادەدینی هاونشینی سەلاحەدین بوو، مەرگیش کە بۆ عازید لە کەمیندا بوو،پیلانیان تێکدا. جەمیل



بوو، سەلاحەدین خۆی گەیاندەسەر گەنجینەی گەواهیرات و کۆ-کۆ و لودە-لۆدەزێر و زێو وەسەر یەك نرابوون و هەڵدرابوونەوە. چەند یەغدان و سندوق و تێر و جەواڵ، لە خشڵ و خەملی دوڕ و یاقووت و زمڕووت و لاڵ، قەڵاپەچن و دارماڵ بوون؛ هیچ لێی ڕانەوەستا، سووکە دەستێکی پێدا هێنا و ڕایماڵی.

ئەو هەموو دراوە -لەسکە دراوە، لە زێر و زێوان- کە دەژمارە و پێوان نەدەهاتن و بە ساڵ و زەمانان کۆمەڵی ئیسماعیلی بەو نیازە کە ڕۆژێك دێت و دراو بۆ ڕۆژی وا بە کاریان دێت، قۆشە-قۆشە و چکە-چکە بە گردەوەکۆیی وەسەر یەکیان نابوو، لە خەزێنەی خەلیفەکەی خۆیان دانابوو، هەمووی مابوو؛ بە خڕوپڕی و سووك و هاسان کەوتە دەس گەڕناسانی کورد.

یافیعی لە تاریخەکەیدا دەڵێ: هێندێك لەو شتانەی کە دەگەنجینەی عازیددا بووە و دەست سەلاحەدین کەوتووە، دار عەسایەك لە زمڕووتی ڕووت و سەدهەزار بەرگ کتێبی دەستنووسی زۆر هێژا و خۆشخەت بووە.[1]

ئیتر لە پاش مەرگی عازید ناوەکەشی لە ئاسۆ ئاوا بوو؛ کاروباری دنیاداری لە میسردا بۆ سەلاحەدین یەکلا بۆوە.

سەلاحەدین ئەو جار دەستی کرد بە ڕێك و پێك کردنی دارایی و داهاتی میسر و لەشکری زۆر و تێری ساز کرد و ئەوەندەش بە دادگەری و دڵسۆزی ڕەفتاری دەگەڵ ژێردەستان و بێدەستان دەکرد کە دڵی زۆربەی زۆری خەڵکی میسری بە لای خۆیدا هێنا و لە هەموو گۆشە و کەناران و گوند و شاراندا، باس هەر باسی پیاوەتی و کارچاکی سەلاحەدین بوو.

کە سەلاحەدین لە میسردا بوو بەو دەسەڵاتدارە، چاوچنۆك و چرووك و قریۆکە پیاوان، لە لای نوورەدین بۆیان تێ چاند و پێیان ڕاگەیاند کە سەلاحەدین وەك پادشالە خۆی دەڕوانێ و خۆی بە پیاوی

---

١- یافیعی لە تاریخەکەیدا (٣-٤٤٥) دەڵێ: کاتێ سەلاحەدین دەستی بەسەر کۆشکی نشیمەنی عازیددا گرت و ماڵ و سامانەکەی خستە دەست خۆیەوە، هەرچی ویستی لێی هەڵبژارد و بە ئارەزووی لێشی بەخشی و لێشی فرۆشت. گەواهێرات و نەغدینەی ئەوەندە بەنرخی هەبوون کە گەلێك ساڵان خەریکی کۆکردنەوەیان ببوون، وێنەیان لە خەزێنەی هیچ پادشایەکدا نەبووە. لەمانە چەڵاکێکی زمرووت بوو کە قامیش و نیوێك درێژایی بوو. ئەسپی لەیاقووتی هەبوو. گەلێك شتی تریش. هەر کتێبی بژاردە و خۆشخەتی سەدهەزار بەرگ تێیدا بوو. جەمیل



تۆ نازانیێ. نوورەدین دڵی لە سەلاحەدین کرمێ ببوو؛ لێ بڕابوو کە بۆ خۆی بچێتە میسر و یەکێکیتر لە جێگەی سەلاحەدین بکاتە وەزیر و ئەوی لە سەر کار لابەرێ. سەلاحەدین کاتێ بەم کەین و بەینەی زانیەوە، کۆڕێکی پێك هێنا و باوکی و خاڵی و خزم و کەسی خۆی کۆکردەوە و مەبەستەکەی خستە گۆڕێ و داوای کرد کە لە هەموو سەرێکەوە لێی بتۆژنەوە و بیر و بڕوایان چییە دەری بڕن.

تەقیەدین -کە برازایەکی سەلاحەدین بوو- لە ناو کۆڕەکەدا هەستا و گوتی ئەگەر نوورەدین هەر پێی داگرت و هاتە میسر، بە لەشکرەوە پێشی لێ بگرین و بە گژیدا بچین. ئێمە هەتا دەسمان چەك بگرێ و هەتا ڕەگی تەڕمان دەلەشدا مابێ، نابێ میسر لە دەست خۆمان بدەین.

نەجمەدین کە لای سەرووی هەموانەوە ڕۆنیشتبوو، وتارەکەی نیوەچڵ بە تەقیەدین بڕی و گەلێکی جوێن پێدا و دەری کردەدەرەوە. ئەمجار ڕووی کردەسەلاحەدین و پێی گوت: کوڕی خۆم! من باوکتم و شەهابەدینیش خاڵتە؛ ئێمە تۆمان لە هەموو کەس خۆشتر دەوێ. ئەگەر ئێستا ئێمە هەردووکمان چاومان بە نوورەدین زەنگی بکەوێ، دەکەوینە خاك و پایەوە و دەستەونەزەر بە نۆکەری لە بەر دەسیدا دەوەستین. ئەگەر فەرمانی کوشتنمان بدا، بە بێگومان لە تەهی دڵمانەوە ملی بۆ کەچ دەکەین و دەستی وەبەر ناهێنین. جا کە ئێمە باوك و خاڵت بین و وابین، کاربەدەستان و سەردارانی چەکدارانت دەبێ چۆن بن؟ ئەگەر بە ڕاستی و بە وردی بیر بکەینەوە، ئەم وڵاتە پارچەیەکە لە زەوی و زاری نوورەدین مەحموود و ئێمەش هەموو نانخۆر و کۆیلەی ئەوین. ئەگەر ئارەزووی دەرکردنمان بکا، ناچارین بڕۆین و ئەگەر فەرمانی سزا دانمان بدا، سەر بە فەرمانین. ئەگەر بە قسەی بابی خۆت دەکەی، وەرە و وەك پێت دەڵێم بە نامەیەك بۆ نوورەدین مەحموود بنووسە: گەورەم! وەك من گوێ بیستبووم گوایە دڵی پڕ بەزەیی و پیرۆزت هاتۆتە سەر ئەو نیازە کە لەشکری نەبەز و هەمیشە سەرکەوتووەکەی خۆتان بنێرنە میسر؛ بۆ ڕزگار کردنی. وەك من بیری لێ دەکەمەوە لام وایە هیچ ئەمەی پێ ناوی و بۆ منیش لە مردن گرانترە کە ئێوە تۆزی ڕێگاتان لێ بنیشێ و خودا بەو ڕۆژە نەکا لە ڕێگەدا ئێوە شەکەت و ماندوو بن.

من تا ئێستا هەرگیز لە کۆیلەیی و نۆکەری ئێوە سەرپێچیم نەکردووە و ناشیکەم. هەتا دەمرم و بگرە دوای مردنیش من خۆم و گیانم بە پاسەوانی پێچکی تەختی فەرمانڕەوایی ئێوە دەزانم.

تـــا تـۆم ناسیوە من خۆم فڕێ دا          هەرچی بیفەرمووی سەرم لە ڕێدا

ئەگەر خودا نەخواستە لە منی کۆیلەی ئاڵقە بە گوێوە ئاکارێك سەری هەڵدابێ، یان کـارێکی وا ڕووی دابێ کە بە هۆیەوە تۆز و گەردێك لە دڵی ڕۆشنی ئێوە نیشتبێ و من خۆم پێم نەزانیبێ، دیسان پێویست بەوە ناکا ڕەنـجی سەفەرت بدەمە بەر و باری گوناهم لە سەر خۆم سەنگینتـر بکـەم. لـەوێوە نۆکەرێکی بەردەستی خۆتان بنێرن، با لێرەوە بە دەستی خۆی زنـجیـر بـخاتە گەردنـمەوە و ڕەکێـشم کا هەتا دەمهێنێتە بەر ئاستانەی دەرگانەی خانەدانی سایەچەورت.

بـــەندەی ســـەرکز و شکستە باڵم          خۆڵی بەر دەرگات بە چەم دەماڵم

سەلاحەدین لە ئامۆژگاری بابی دەرنەچوو؛ نامە نووسرا و بـە ڕێ کـرا. کـۆڕ بـڵاوەی کـرد و لـە بێگانە هەڵوەژێرا. نەجـمەدین و سەلاحەدین دوویەدوو مانەوە. باوك ڕووی کردەکـوڕی خـۆی و گـوتی: کوڕم! تۆ هێشتا لاوی و سەرت گەرمە و زوو هەڵدەچی! هێمان سارد و گەرمی ژیان، قاڵی نەکردویت و لە کڵی دەرنەخستویت و لە بەراورد کردنی سوود و زیانتدا پوخت و پاراو نەبوویت. دەبێ ئەوەندەبزانی هەر وەك گەف و هەڕەشەی نوورەدین لە شامەوە بە تۆ گەیشتووە، هەرا و گوڕەشەی تۆش بە نوورەدین دەگاتەوە. ئەوی سرتەی خەڵکت بۆ دێنێ، لای خـەڵکیش بـۆت تـێ دەچـێنێ. سـبەی ڕۆژ نـوورەدین دەیزانیەوە کە تۆ چنگت بە سەر میسردا گرتووە و ناتەوێ بەشی ئەوی لێ بـدەی؛ هەرچـی لـە هێـز و توانایدا بوایە و دەستی پێ ڕاگەیبایە، دەیهێنا کایەوە و لەشکری شام و مووسڵی لێ دەنگ دەدایـن و دەهاتە سەرمان بۆ شەڕمان و سا بە هەر نرخێك بۆی بکرایە و بە هەر جۆرێك بۆی بلوایـە، ئەوەنـدەی زیان پێدەگەیاندین، ئەگەر بۆشی دەر نەکرابایـــن هێـز و گـوڕی زۆر لـێ هەڵدەقرچـاندین. بـەڵام وەك دەڵێن: مار بە فیتوی نەرم لە کون دێتە دەر؛ ئەم باریك ڕستنەی ئێستامان ئەو گشتەکە گـشتە وەهـا خاو دەکاتەوە کە باو ناخواتەوە و ئاو بە ئاگردا دەکرێ و کێشە دادەمرکێتەوە.

کوڕم! ئێمە لە باتی ئەوە کە شەڕی نوورەدین بکەیـن، زۆر ئـەرکی گرینـگتـــرمان لـە پێـشە و دەبێ بەرەو پێشی ببەیـن و ئەنـجامی بدەیـن و دواڕۆژی خۆمان قایم کەین.[1]

---

[1]- جورجی زەیدان دەڵێ: نەجـمەدین پێی گوت: بە خودا ئەگەر نوورەدین داوای قامیشە شەکرێکی میسر بکا، دەگەڵی بە شەڕ دێم و خۆمی دەگەڵ دەگۆڕمەوە. هەژار

لە ڕاستیشدا هەر وەك نەجمەدین بەراوەردی کردبوو، ڕاست هاتەوە. کاتێ نامەی سەلاحەدین و باس و خواستی ناو کۆڕ و گفت و لفتی نەجمەدین گەیشتەوە نوورەدین، پشووی هاتەوە سەرخۆ و ژەنگی دڵتەنگی مشت و ماڵ کرا و وەرامی نامەی سەلاحەدینی بە ڕووخۆشی و پڕ لە دڵخۆشیدانەوە نووسیەوە و تیا درکاندی کە: «جگە لە تۆ کەس لە سەر میسر نابی و تۆ دەستی ڕاست و دڵسۆزی بە ڕاستی منی و لەوە بەو لاوە کەس ڕای ناکەوێ بەدگۆیی تۆم لە لا بکا و ڕێگە نادەم لە گوڵ کاڵتــرت پێ بڵێن.»

ساڵی ٥٦٨.ك (١١٧٢.ز) نەجمەدین ئەییوب ڕۆژێك لە سەر ئەسپ هەڵدێرا و چەند ڕۆژێـك لـە ناو نوێن و باندا بە نەخۆشی مایەوە؛ ئەوسا گیانی بێ تاوانی بە بینایی چاوان سپارد.

کوڕی پایەبەرز و خاوەن شکۆی، لە بەڕێکردنی تەرمەکەیدا، داربەستی خستە سەرشانی خـۆی و لە شوێنێکدا کە شایانی ئەو باوکە بێ وێنەیە بوو، بە خاکی سپارد و پرسە و سەرەخۆشی شاهانەی بۆ دانا.

نەجمەدین ئەییوب شەش کوڕی لە پاش بەجێ مـا: سـەلاحەدین یوسف،سـەیفەدین مـحەمەد ئەبوبەکر، شەمسەدەوڵە تورانشا[1] ، سەیفەلئیسلام توغرولتەگیـن،شەهەنشاه، تاجەلـملوك بوری.[2]

نورەدین مەحمود ساڵی ٥٦٩.ك (١١٧٣.ز) سەرزەمیـــنی بـەجێهێشت و بـە مردنـی ئـەو سەلاحەدین بە بێ لەمپەر و بەرگر پادشایەتی میسری بۆ ڕەخسا و هیچ کۆسپی لەو بارەوە لە سەر ڕێ نەما و هـەر بەوەندەشـەوە نەوەسـتا؛ دوای ماوەیـەکی کـەمیش شامیـشی خستە ژێـر قەڵـەمڕەوی فەرمانڕەوایی خۆیەوە و ئاڵای دەوڵەتی ئەییووبی بە سەر وڵاتی شامیشدا شەکایەوە و هەناسـەسـارد و بێدەرەتان و شەکەتی ئەرکی ژیانی، لە ژێر سایەدا حەسایەوە.

---

١- مەلیك موعەززەم شەمسەدەوڵە تورانشا. لە زۆربەی شەڕەکانی دەگەڵ خاچپەرستاندا لـە سـەرداره هـەرەئازاکانی لەشکر بوو. موئتەمەنەلـخەلافە جەوهەر کە بە لەشکری سوودانەوە شۆڕشی دەکرد، توورانشا دەردەستی کـرد و سـاڵی ٥٦٧ سوودانی گرت و ساڵی ٥٦٩.ك دەستی بە سەر یەمەندا کێشا. ماوەیەك لە شام لە باتی سەلاحەدین حوکمی کرد و بە سەر بەعلەبەکیش ڕاگەیشتووە. یەمەن و بەعلەبەکی دایەوە بە سەلاحەدین و بە سەر ئەسکەندەرییە ڕادەگەیشت و ساڵی ٥٦٧ هەر لەوێ مردووە. جەمیل

٢- زانایەکی بەرز و شاعیرێکی توانا بووە. ساڵی ٥٥٦.ك هاتۆتە دنیاوەوە دەگەڵ کـاکی دەوری حەلـەبی داوە و زۆر ئازایانە دەگۆ دوژمن ڕاچووە و لە شەڕدا بریندار بووە و برینەکەی وەبنی داوە و ساڵی ٥٧٩.ك پێی مردووە. جەمیل

سەلاحەدین کەسی بێ کەسان و فریارەسی بێدەسان بوو. بەدکار نەویست و هەژار خۆشەویست بوو. ڕووی لە هەر لایەك بکردایە، ئاهۆی پیسی و بێفەڕی و نەگریسی لێ دەتاراند و هەر شوێنێك سایەی ئەوی پێدا ڕاببردایە، پیت و بەرەوی بەرپێژەوی بە سەر دانیشتووانیدا دەباراند.

لە دوای شامیش زۆری نەخایاند کە شاری قودس و خەلیلەرەحمانیشی لە فەرەنگان پاکردەوە و خوار و خیچی خاچی ڕاست و یەکلا کردەوە.

## تەڕابولس و یەمەن

لە لایەکیتریشەوە سەلاحەدین بەهائەدین قەراقوشی برازای خۆی[1] بە لەشکرەوە بەرەو خۆرنشین بەرێ کرد و ئەویش خاچپەرستەکانی لە تەرابولسی غەرب وەدەر نا؛ کە دەمێك بوو چەپاویان دەکرد.

تیرێژی ئەستێرەی بەختی سەلاحەدین سات بە سات پتر و زۆرتر سەرزەمینی دەتەنیەوە و سروەی ئازادی لە سایەی ئەو خانەدانەدا، دەم بە دەم خۆشتر دەشەنیەوە. هێشتا هەواڵی گرتنی تەرابولس کۆن نەببوو، کە مزگێنی هات وا توورانشاش یەمەنی گرت و ئەو لە دین دەرچووەی کە بە زۆر دولینگەی بە سەر یەمەندا بەردابۆوە و ناوی عەبدولنەبی بوو، لە شەرگەدا بە دەستی پیاوەکانی توورانشابە کوشت چوو.[2]

وەك باسمان کرد زۆربەی زۆری وڵاتی شام -بە دەمشقی پاتەختەوە- کەوتە ژێر دەستی سەلاحەدین .مەلیك ساڵح ئیسماعیل کوڕی نورەدین مەحموودیش فەرمانڕەوایەتی حەلەبی بە

---

١- *قاموس‌الاعلامی* تورکی دەڵێ: قەراقوش کۆیلەی سەلاحەدین بووە و برازای نیە. ناوی بەهائەدین‌عەبدولا بووە و نەبووسەعیدیشیان پێ گوتووە. سوڵتان‌سەلاحەدین زۆری خۆش ویستووە؛ ئەگەر خۆی لە ماڵ نەبووبێ ئەوی لە جێگەی خۆی داناوە. کاتێ خاچپەرستان لە عەکا بە دیلیان گرت، سوڵتان بە دەهەزار زێری لێ کڕینەوە. ماوەیەك بە سەر شامیش ڕاگەیشت. پیاوێکی زۆر پیاو و خێرەومەند بووە؛ شوورەی قاهیرە و دژی جەبەل و پردی سەرەڕێی ئەهرامی جیزە و گەلێك تەکیە و میوانخانەی دروست کردوون. ساڵی ٥٩٧.ك (١٢٠٠.ز) مردووە. جەمیل

٢- عەبدولنەبی کوڕی مەهدی، بە ملهوڕی یەمەنی گرت و پیاوێکی زۆردار و خوێنمژ بوو. گومبەزێکی لە سەر گۆڕی باوکی کردبوو. خەڵکی ناچار کردبوو کە لە باتی کابە لە دەوری ئەو گومبەزەدا سووڕ بخۆن. تورانشا گەیشتە سەری و کوشتی و تاڵانی کرد و گۆڕی بابی هەڵوەشاند و زێڕەکەی تواندەوە و بە جێگەی خۆی گەیاند. جەمیل

دەستەوە مابوو؛ لەوێ دامەزرابوو.[1]

سەلاحەدین ساڵی ٥٧٢.ك (١١٧٦.ز) فەرمانیدا دیوارێك بە درێژایی بیستونۆهەزاروسێسەد گەز لە ڕووکاری بیابانەوە بە هەر چواردەوری قاهیرەدا بکێشرێ. لە هەموولایەکەوە وەستا و فەعلەیان لێ کۆکردەوە و دەست بە کار کرا و هیچ وەخت کار ڕانەگیرا و پشوی تێ نەکەوت و وچانی لێ نەدرا و هەتا دواڕۆژەکانی ژیانی سوڵتانیش ئەو قوڕەکاریە دوایی هەر پێ نەهاتبوو.

## شەڕی ڕەملە

ساڵی ٥٧٣.ك (١٢٧٧.ز) سەلاحەدین بە لەشکری زۆرەوە هێرشی بردەسەر شاری عەسقەلان و قەڵاکانی دەور و بەری و تاڵان و ماڵێکی زۆری لە خاچپەرستەکان گرت. نیازی وابوو ڕەملەش بگرێ. ئەو لە ڕێگەی ڕەملەدا بوو، لە پرونەکاو لەشکرێکی گەورە و گران و لە ژمار بەدەری خاچپەرستان، وەك لێشاو بەوناوە وەربوون و لەشکری سەلاحەدینیان دەناوە خۆ گرت و دەرەتانیان بۆ نەهێشت و بوو بە کوشتوکوشتارێك لەو ڕۆژەدا باب ئاوڕی وە سەر کوڕی خۆی نەدەداوە. لە بەر تۆزی سواران، ڕۆژی ڕووناك و تاووساو، ببووە شەوەزنگێکی ئەنگوست لە چاو. دەم و دووخی شیران وەك ڕاخوشینی ئەستێران دەبریسکانەوە. لیزمەی بارانی تیران وەك تەرزەی خاکەلێوە لەو نێوە، کەیکەم ئیسەی کەم دای دابوو. لە هەر چوار کەنارانەوە، لە سۆنگەی خوێن بارانەوە، جۆی خوێن جۆخینی جەندەکی کوژراوانی گرتبووە بەر خۆی و ڕایدابوو. هەر گۆشتی تەڕ بوو بە دەم دەبانانەوە زوێڵ دەبوون و هەروا گیان بوون و بە دەم هەنیسکانەوە دەردەچوون. هەتا ڕمبی حەیزەرانی هەژدەقەفی بەگەل دەلەرین، سەری سواران لە دەشتی شەڕگەی بەریندا، وەك سێوی باوەرێن دادەوەرین.

هەر چەندەسوارچاکانی فەڕەنگ یەکجار زۆر و زۆر ئازا و لە شەڕدا نەهەنگ و خاوەن زۆریش بوون؛ بەڵام لەشکری پەروەردەی دەستی سەلاحەدین کە ترسان و هەڵاتنیان بەوپەڕی شوورەیی و نەنگ دەزانی، کۆی کەمی خۆیان وەبەر چاو نەدا و لە هەموو لایەکەوە هەر گوڕە و هەرا بوو. ڕۆژ ڕۆژی

---

١- ساڵی ٥٦٩.ك کە نوورەدین مرد، ئیسماعیل دەساڵانە بوو؛ سەلاحەدین وڵاتی شامی لێ داگیر کرد و تەنیا حەڵەبی بە دەستەوە مابوو. چەند ساڵێك حوکمی ئەوێی کرد و ساڵی ٥٧٧.ك (١١٨١.ز) مرد. جەمیل

کوڕانە و شەڕ شەڕی فەڕەنگ و کوردانە؛ پیاو لاشەی لە ناو گۆڕ بێ، نەك بەمێنی و سەرشۆڕ بێ.
کەس لەو هەنگامەیەدا خۆی نەوەشارد و لە جەنگ خۆی نەبوارد.

لەشکری سەلاحەدینی قارەمان هەتا شیری بڕی و تا هێزی تێدا ما، لە شەڕدا ما و لە شەڕ، دانەما و دوژمنی خۆی زۆر شپرێو کرد؛ بەڵام لەو زۆرانی کەم دەگەڵ زۆرەدا، زۆری زیان پێ گەیشت و بەشی هەرەزۆری بەسەربەرزی چوون. برازازای سەلاحەدین کە ناوی تەقیەدین و تەمەنی لە بیست بەهاری تێ نەپەڕاندبوو لەو شەڕەدا خونچەی ژینی پەرپەڕ کرا و لە سەر رووپەڕی سیایی ریزی مەردەنەمرەکاندا جێی خۆی کردەوە.[1] تەنانەت سەلاحەدین خۆشی زۆر جاران لەو شەڕەدا کەوتە تەنگ و چەڵەمەوە و درایە بەر گەمارۆ و خرایە شوێنی بەرتەنگ و مەودا کەمەوە و بە هەزار ناریعەلی و بە زەبری شیر و بە نووکی خەنجەر، لەمپەری پەڕاند و ریزی دڕاند و رێی بۆ خۆی کردووە و بە لەشکر شکاوی خۆی گەیاندەوە میسر.

خاچپەرستەکان لە دوای ئەو سەرکەوتنەیان لەشکریان بردەسەر حەما و لە دەوری قەڵاکەیدا چوار مانگ مانەوە.

لە بڕانەوەی ساڵی ٥٧٣.ك (١١٧٧.ز)دا قەڵای حەڵەب بە بێ شەڕ و لە ڕێی ئاشتیەوە کەوتە دەست سەلاحەدین و ئەویش فەرمانڕەوایی حەڵەبی بە مەلیك زاهیری کوڕی خۆی سپارد.

## هێرشەکەی سەر شام

خاچپەرستەکان ساڵی ٥٧٤.ك (١١٧٨.ز) بە نیازی داگیر کردنی شامەوە هێرشیان هێنا و لەو دەمەدا فەڕروخ شا[2]ی برازای سەلاحەدین -لە باتی مامی- بە سەر شام ڕادەگەیشت؛ خۆی لێ ساز دان

---

١- ڕەنگە نیازی مەلیكمەنسوورمحەمەد کوڕی مەلیكموزەففەر تەقیەدینعومەر کوڕی نووروودەوڵە شەهەنشاه بووبێ. زانای بەناوبانگ ئەمیرعیسای هەکاریش لەو شەڕەدا بە دیل گیرا؛ سوڵتان بە دراوێکی زۆری کڕیەوە. جەمیل

٢- ئەمیرعیزەدین فەڕوخشا کوڕی نوورەدەوڵە شەهەنشا. فەڕەنگ لە ژێر سەرکردایەتی بلدوینشای چوارەمدا بوون؛ کە حاکمی ڕەملە بوو. فەڕوخشا وەخت بوو بلدوین بە دیل بگرێ، بەڵام هەمفری ناوێك -کە لە سوارچاکان (شەڤالیە)ی بەناوبانگی خاچپەرستان بوو- خۆی دەبەر گێڕا و ڕزگاری کرد و لە سەر ئەو خۆ دەبەر گێڕانە، بریندار کرا و هەر بەو برینەش مرد. نابێ ئەوەمان لە بیر بچێ کە شەڕی مرجعیون بە دوای ئەو شەڕەدا بە ماوەیەك ڕوویدا و ←

و ڕێبازی لێبڕینەوە. دەڵێن: نانێکی خواردووە بەو ڕۆنەوە، هاتووە بەو پێ و شۆنەوە. فەڕەنگ لایان وابوو لە هەموو هەوران هەر دەباری و جاریٚ سەرکەوتوون تازە دانابەزنەوە؛ بەڵام کە فەڕوخ شاخۆی دەرخست، بۆی دەرخستن کە بە تاقەگوڵێك بەهار دانایە و ئەو کوردەی ئەوان نەیانناسیوە بە تێشکانێك ورەیان بەرنەدایە و هەرگیز ترسیان بە دڵدا تێنەپەڕیوە. دوو لەشکر پێك وەربوون و دەگژ یەك ڕاچوون و هەنگامەیەکی زۆر بەسام ڕوویدا. ئەو ڕۆژە لەشکری ژێر سەرکردەیی فەڕوخی کورد، کارێکی بە فەڕەنگان کرد با بە دەواری شڕی ناکا. هەر خاچ بوو دەسینگی فەڕەنگاندا دادەپاچان و خوار دەبوونەوە و هەر خاچپەرست بوون بە سەر قەڵپووزی زیندا لار دەبوونەوە و بەرەو بەهەزار بەهەزاری مەرگ گلار دەبوونەوە. فەڕوخ تۆڵەی ڕەملەی دەقات لێ ساندن و زۆر پیسی شکاندن و تێی گەیاندن کە خەونی بەراوەژوویان دیوە؛ تەنانەت سەرکردەکەشیانی لە کۆڵ دنیایە کردەوە.

هەر لە ساڵی ٥٧٤.ك (١١٨٧.ز)دا شەهابەدین لالۆی سەلاحەدین -کە فەرمانڕەوای حەما بوو- ڕۆژی لە سەر زەوی نەمابوو؛ دنیای ڕوونی بەجیٚهێشت و مەلیك موزەفەر تەقیەدین کوڕی شەهەنشاکوڕی نەجمەدین لە جێگەی ئەو کرا بە فەرمانڕەوای حەما و تا ساڵی ٥٧٧.ك (١١٨١.ز) فەرمانڕەوایی کرد و ئەویش ڕووی کردەبارەگای خودا و دنیای بیٚ تانوپۆی بەخۆی ڕەوا نەدی.

ساڵی ٥٧٦.ك (١١٨٠.ز) شەمسودەولە توورانشاکوڕی نەجمەدین، ئەو ئازا و فیلەتەنەی بە زەبری شیر هەموو شار و گوند و چیا و چیمەن و دەشت و بەندەنی یەمەنی سەند و چووبووە ئەسکەندەرییە، گێژاوی مەرگ وەك گێژی ئەسکەندەر دەناو خۆی گرت و ڕوو بە نەمان ڕۆی هێشت. تەرمەکەیان هێنایەوە شام و لە فێرگەیێکی بنیاتی خوشکیدا نێژرا. لە پاش نەمانی توورانشاسەیفەلئیسلام تغتەگین توغرولتەگینی برای کرا بە جێنشینی و بوو بە فەرمانڕەوای یەمەن.

### شەڕی تەبەریا (طبريه)، کە بە شەڕی حوتتین بەناوبانگە

ساڵی ٥٨٣.ك (١١٨٧.ز) ڕۆژێکی هەینی، لە ڕۆژەکانی مانگی مەولوود، لەشکری سەلاحەدین و

---

← حاکمی تەراِبولس و بلدوینی حاکمی ڕەملە و هوج خاوەنی تەبەریە و گەلێك لە خاچپەرستانی گەورەیتر بە دیل گیران. بلدوین بە ٢٥٠ هەزار زێر و بە ئازاد کردنی هەزار دیلی موسوڵمان خۆی کڕیەوە. جەمیل

لەشکری خاچپەرستان، لە دەشتی تەبەریا گەیشتنە یەك و بەرانبەر بەیەك وێستان.

ئەوە ئەو ڕۆژە بوو کە سوڵتانسەلاحەدین بۆی دەگەڕا و پاڵەوانە داخ لـە دڵـەکانی مەگیـرانیان پێوە دەکرد.[1] هەمبوو بە دڵ لێ بڕابوون کە ژەنگی جەنگی ڕەملە بە یەکجارەکی لە مێشکی فەڕەنگان بکرێنن و وایان لە بەر یەك هەڵدرێنن کە لە مێژووی تازە و کەونیـشیاندا گرینگتـرین بەسـەرهات و

١- لە ئەنـجامی شەڕی ڕەملەوە -جگە لە حاکمی تەڕابولس و ئەنتاکیە- بلاوین و هەموو سەردارانیتری خاچپەرست، پەیـمانی شەڕ وەستاندنیان دەگەڵ سەلاحەدین بەست و ماوەیەکی زۆر دنیا ئارام و هێمن بوو. بەڵام لەو ساڵەدا هێندێك لـە فـەرمانڕەوایانی خاچپەرسـت پەیـمانەکەیان شـکاند و ئـەرنات حـاکمی کـەرەك ڕێـی بـە کـاروانێکی بازرگانـە موسوڵمانەکان گرت و تالانی کردن و ژن و پیاوەکانی بە دیل گرتن و جنێوی بە ئـایینی ئیسلام دا. سـوڵتان کـە ئـەم هەواڵە ناخۆشـەی بیـستەوە، لەشـکری بـرد و لـە بنکـەی سـەلامە نزیـك بـە گونـدی بەسـرێ، لەشـکربەزی کـرد و ئەوەندەڕاوەستا تا کاروانی حاجیان دەرباز بوون و لەشکری میسریشی بۆ هات. ئەوسا گوێزایەوە تەلعەشتەر و کۆڕێکی لە سەرلەشکرانی خۆی پێك هێنا و پلانی شەڕیان دارێژت و بڕیاریان داکە بۆ هەتا هەتایە فەرەنگان تەنبێ بکەن.

ڕۆژی پێنجشەمە ١٦ی ڕەبیعیدووەمی ساڵی ٥٨٣.ك (١١٨٧.ز) ڕیزەکانی لەشکری ڕانا و مایـەوە هـەتا بـۆ بـەیانی نوێژی هەینی کرا و ئەوسا لەشکری دەنگ داو لە لای باشووری زێباری تەبەریەوە، لە ڕوویـاری ئـوردون پەڕیـەوە و بـە دزیەوە ناردی کە بچنە سفوریا و بە وردی مەکۆی دوژمنی بۆ هەڵێنن.

بەر لە هەموو شتێك گردی کەفەرسەبتی لێ گرتن و ڕێی هاتوچۆی لێ برین. کۆمەڵێك پیـاوی زۆر ئـازا و بـەکاری لـە ڕووکاری دوژمن دامەزراند و خۆشی بە لەشکرێکی هێرش بەرەوە پەلاماری تەبەریەی داو زۆر زوو بەردەستی کرد. بەڵام قەڵاکە خۆی نەدا بە دەستەوە و ژن و منداڵ و دەست و پێوەند و گەلێك پیاوەکانی ڕیامۆند -کە لەو قەڵایـەدا قـەتیس مابوون- هاواریان بۆ جۆی شای خاوەنی سفوریە نارد.

خاچپەرستان کۆڕی جەنگیان پێك هێنا و بە گەل بڕیاریان داکە بەرەنگاری سەلاحەدین بن. لە بەرەبەیانێکدا بـە پانـەوە هێرشیان هێنا و نیازیان وابوو ڕێ لە سوڵتان ببـڕن و لە لەشـکرەکەی خـۆی دابـبـڕن و نەشـهێڵن دەسـتیان بـە ئـاوی خواردنەوە ڕابگا؛ بەڵام سوڵتان دەستی خۆی ڕەپێش خست و هەموو ڕێـسی لـێ کردنـەوە بـە خـوری و ناچـاری کـردن پاشەکشە بکەن و بچنەوە سوپاگە. ڕۆژی دوایی کە دەبووە بیست و شەشەمی مـانگ، لەشـکری سـوڵتان هەڵیکوتایـە سەریان و لە بەر یەکیان هەڵوەشاندن و ڕاویان نان و جۆی شا و ڕینۆلدئەرناتی برای -کە حاکمی کەرەك بـوون- دەگـەڵ گەلێك لە خاچپەرستانیتر بە دیل گیـران و لە پاش براندەوەی شەڕەکە، سـوڵتان ڕووی کردەخێـوەتی خۆیـەوە و دەگـەڵ ڕاوێژکەر و سەردارانی لەشکردا بە گەل سوژدەی سوپاسگوزاریان بـۆ خـودا بـرد کـە بـە سـەر کافرانیـدا زاڵ کـردوون. ئەمـجار فەرمانیدا پادشا دیلەکانیان بۆ برد؛ لە لای خۆی دانان و بەفراویان بـۆ هێنـان و دەسـتی کـرد بـە سـەرکۆنە کردنی خاوەنی کەرەك کە ئەو کەریەتیەی بۆ کردووە؟ کاروانی موسوڵمانی ڕووت کردووە و ناوی پێغەمبەری بـە خـراپ بردووە؟ لە سەر سوێندێکی کە خواردبووی بە دەستی خۆی ملی ڕینۆلـدی پەڕانـد؛ بـەڵام جـۆی شـای زۆر لاوانـدەوە و بەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە دەگەڵ گیـراوەکانیتردا ناردیە دیمشق. جەمیل

نەهاتیان بێ.

لێك مۆڕبوونەوەی دووربەدوور زۆری نەخایاند؛ خێوی خوێنخوازی ڕووبەندی لە سەر چارەی دزێوی لادا و بە چڕنووکی تیژ و نینۆکی درێژی پڕ قرێژی، لە شەپیلك و لاڕانی شۆڕەسوارانی شەڕانی ڕەبادا و لە پڕ دوو لەشکر وەکوو دوو دەریای لە گۆشت و ئاسن، بە یەکا هاتن و پێکیان دادا. گوڕە و هەوهەوی سواران و کۆڕە و حیلەی کەحێلان و هابگرەی شیروەشێنان و دەبمرەی نێزەداران و ئاخ و نالەی برینداران لەو دەشتەدا مەحشەرێکی وای بەرپا کردبوو ساوای بەر مەمکانی دەکردەپیر و زۆرهانێك. عیزراییل هەر چنگ و پلێکی ببووە هەزار پەل و بە تەرزێك لە گیانکێشان کەوتبووە پەلەوە، نەیدەپەرژا سەری خۆی بوخرێنێ و بە هیچ لایەکدا لا بکاتەوە.

ئەسپی دووبادی عەرەبی‌نەژاد، خاك و خۆڵی بۆ سمکۆڵی وە بەر نەدەهات و لە خوێناودا وە مەلە کەوتبوو. لە بەر پاکۆی لاشە و گیشەی جەندەك و گالێش و تەرمەکی تەرمان، نە بۆی دەلوا بۆ پێش بڕوا و نە لۆی دەکرا باو بخواتەوە. هەر سوارێك لە سەر ئەسپی بپەڕیبا و مەلەی نەزانیبا، تازە لە گۆمی خوێندا دەرنەدەهاتەوە. لەشکری خاچپەرستان شکان؛ بەڵام چۆن شکانێك؟ ئەوی بە بیری خۆی ڕێگەی هەڵاتنی بۆ خۆی دەدۆزیەوە و بە خەیاڵ بۆی دەردەچوو، وای سەر لێ شێوابوو کە بە سەر دەچوو، بەرەو دوژمن ڕای دەکرد و نووکی خەنجەری مووکار و شیری جەوهەرداری کورد هەر لە ڕێوە دەیقۆزیەوە. ئەو لەشکرە گەورە و گرانەی فەرەنگ لەو ڕۆژەدا، لە هەشتێك مشتێك و لە دیوارێك خشتێکی مابوو. شکستەی شەل وکوت و شکستیان بە خوێن و خورەوە و لەشی پڕ لە برینەوە، ملیان لەو دەشتە بەرینە نابوو. هەموو زەندەقی چووبوو؛ هیچی زراوی پێ نەمابوو. تەنانەت سوپاسالاری هەرەگەورەشیان، نەشیا دەربازبێ و بە دیل گیرا و زنجیری خرایە پا و پیلەوە.

**هەلە و هەلکەوتووە**

سەلاحەدین نەیهێشت دوژمن پشوو بدا و برینی خۆی بلێسێتەوە و گۆشتەزون بێنێتەوە. وای بە باش زانی هەتا گەرمەبرینیان سارد نەبۆتەوە و بە خۆدا نەهاتوونەوە، باشتریان سەر و گوێلاك بوکتێتەوە. هەڵیکوتایە سەر بازێڕی عەکا و لەنەکاو ئابلۆقەی داو لە خاچپەرستانی پاك کردەوە و چوارهەزار موسوڵمان -کە دیلی دەستی فەرەنگ بوون- بە دەستی سەلاحەدین ئازاد کران.

ئەو سەرڕەوی هەڵیگرتبوویە، خاوی نەکردەوە و بە پانەوە هێرشی بردەسەر شارەکانی نابلوس و

حەیفا و قیساریە و ناسرە و عەسقەلان و گەلێك قەڵا و دژ و ئاوی و بەژ و دەشت و تەلانی‌تریشی لێ‌گرتن و ئەوسا فەرمانی دەرکرد کە چونکە لەشکر لەو ماوە زۆرەدا هەر لە شەڕدا و شەکەت بووە، با وچان بدا و ماندووی بحەسێتەوە و خۆ بگرێتەوە و وەگورد بێتەوە. شەڕی لەوەدوامان شەڕی بەرانانە و ئامانج و مەبەست ڕووگەی پیرۆزی خاچپەرست و موسوڵمانانە.

## گرتنی قودس

لە پاش ماوەیەك وچان و سانەوە، شەپووری ئامادەبوون لێدرا و لەشکری سەلاحەدین بەرەو دەوروبەری شاری قودس کەوتەڕێ و گەیشتەجێ. سەر لە هەوەڵەوە لە لای خۆرنشینی شارەوە لەشکربەزی کرد. دوای چەند ڕۆژێك پلانی گۆڕی و بنکەی بردەلای خۆرهەڵاتی شارەوە و لەوێوە پەلاماری شار درا و شەڕی مان و نەمان دامەزرا. شاری قودس شێست هەزار خاچپەرستی تێدابوو؛ هەمووی بە گیان و دڵ لێ بڕابوو هەتا شیری ببڕێ و تا هێزی تێدا مابێ، شەڕی ڕووگەپارێزی بکا. زۆر چالاکانە چاکی مەردانەیان لێ بەلادا کرد و قۆڵیان لێ هەڵماڵی و ملیان نا لە پتەو کردنی سەنگەر و دابەستنی چەپەر و شانیان دایە بەر بۆچین و مۆرەی دیواران و سەنگچن و هەڵنانی حەشار و پیواران و دڵیان دایە سەر سەریەخت کردن و شار بەدەستەوە نەدان.

سەلاحەدینیش بڕیاری دابوو بە هەر نرخێکی لە سەر تەواو بێ، ئەو کارە گرینگە تەواو کا و کاری شەڕی خاچپەرستان بە یەکجاری یەکلا و یەکچاو بکاتەوە و قودسیان لێ بستێنی و موسولمانی لێ دابمەزرێنێ. لە هەر چوارلاوە بەرەقانی قەڵاگر و مەنجەنیقی ئاگرپژێنی خستەکار و بەربووە کوچك پێدادان و بەردەباران و سووتمان نانەوە. دەمبەدەم و سات بەسات ئاڵقەی لە شار تەنگ دەکردەوە و هێچکی لە فەرەنگ دەکێشاو هێزی بەربەرەکانی لێ هەڵدەقرچاندن و وای دەماڵی کولێ کردن، کە ئاواتەخوازی مردن بن. ڕێگەی پشوودانی لێ بڕیبوون؛ هەرکێ سەرێکی هێنابا دەرێ، نەیدەبردەوە و کێ بەقەد بەرگە نوشتەیەکی دیار با، تیری ساردەکەوان ساردی دەکردەوە.

ئەم دەورەدانە فرەی نەخایاند و ڕۆژی هەینی بیستوحەوتەمی ڕەجەبە مانگی ساڵی ٥٨١.ك (١١٨٧.ز) خاچپەرستان توانای بەربەرەکانێ کردنیان بڕا و داوایان لە سەلاحەدین کرد کە لە خوێنیان

خۆش بێ و بە دیلیان نەگرێ، شار دەدەن بە دەستەوە. سەلاحەدین بەڵێنی پێدان و دەرگای شاری قودس کرایەوە و موسوڵمان بە شاگەشکەیی بە نێو قودس وەربوون و بەرلە هەموو شتێك چوون ئەو خاچە زەبەلاحەیان ورد و خاش کرد کە لە سەر گومبەزی بەردی سەخرەتوڵڵا قوتیانەوە کردبوو.

هەر ئەو ڕۆژە سەلاحەدین و هەواڵانی نوێژی هەینیان لە مزگەوتی بەیتولموقەددەسدا بەجێ هێنا و دەنگی سوپاس و شادومانی گەورە و گچکەی موسوڵمانان -لەو ڕۆژە مێژوویینەدا- گوێی فریشتەی عاسمانی[1] دەزرینگاندەوە. ئاوا ماڵ بە ماڵخۆ گەیشتەوە و شاری قودس، کە لە ساڵی ٤٧٢.ك ڕا تا ئەو ڕۆژە دەبەردەستیان دابوو، سەلاحەدین بۆ موسوڵمانانی ساندەوە.[2]

ئەمجار سەلاحەدین و خاچپەرستان لە سەر ئەوە پێك هاتن کە هەر پیاوێك لە خاچپەرستەکان بیست دینار و بۆ هەر ژنێك دینارێك لە زێڕی سکەی شاری سوور سەرانە بدەن و ئازاد بن. هەر کەسیش ئەو دراوەی بۆ هەڵنەسووڕا، بە بارمتە بمێنێتەوە تا دەیدا یان بۆی دەدرێ. لە کۆ کردنەوەی ئەو سەرانەیە دراوێکی لە ئەندازە بەدەر کۆ کرایەوە و هەمووشی هەر لەوێ بە سەر لەشکرچی و مەلا و فەقێ و دەروێش و سۆفیاندا بەشرایەوە.

## قەڵای سەور

لە پاش گرتنی قودس، سەلاحەدین لەشکری بردەسەر قەڵای سەور و دەوری دا. قەڵا زۆر دژوار و حەستەم بوو؛ هەروا بە سووك و هاسانی نەدەگیرا و پشووی درێژی دەویست. زستانێکی زۆر سەخت بە سەردا هات و لەشکر خۆی لە سەرمان لە دەرەوە پێ نەدەگیرا. بەند و بەستەڵەك پیاوەکانی

---

١- قازیحەڵەب (مەحیەدین) لە قەسیدەیەکدا -کە بۆ سوڵتانی نووسیبوو- پێشبینی گرتنی قودسی تێدا کردبوو؛ گوتبوی:

سەفەر حەڵەبتان ئەستاند بە شیرێ    مانگی ڕەجەبیش قودس دەگیرێ

پێشبینیەکەی وە ڕاست گەڕا؛ سوڵتان ناردی هێنایان و خودبەی هەینی بەوی خوێند و لە سەرەتاکەیدا گوتی:

ئەم دینە کە پێغەمبەری عارەب بوو خودانی    کورد هات و لە دەست دوژمنەدینانی دەرانی    جەمیل

٢- زێرنۆف پرسەکی لە پەنا تاریخەکە داناوە؛ چونکە خاچپەرستان ساڵی ٤٨٢.ك (١٠٨٩.ز) قودسیان گرتووە و سەلاحەدین ساڵی ٥٨٣.ك (١١٨٧.ز) دەری کردوون. جەمیل

کەسیـرە کردبوو؛ لە بنەوە کەوتبوونە پرتەوە. لە سەر ئامۆژگاری ئامۆژگـاران، سـولتان دەسـتی لـەو قەلایە هەلگرت و لەوێوە بە هێرشێکی گورج و گۆلانەوە لە نەکاو پەلاماری شاری تەرسووسـی داو لـە ماوەیەکی زۆر کەمدا گرتی و مالێکی زۆری لە خاچپەرستان دەسکەوت و لە پـاش تـالان، شـارەکەی سووتاند و بەرەو مەلبەندەکانی تری خاچپەرستانی بزووت و وەك بزووت بە پووشـەوە بنێـی، شـار لـە دوای شار و قەلا لە دوای قەلا دەکەوتنە دەست سەلاحەدین و لە هەموو لایەکەوە فەرەنگی ڕاو دەنـان تا گەیشتە قەلای بەرزیە.

## قەلای بەرزیە[1]

ئەو قەلایە بۆ سەختی و هەلەمووتی و ڕژدی ناویـانگی دەرکردبـوو؛ بـەرزایی دەگـەل دیوارەکـانی لـە پێنسەدوحەفتا گەز پتر بوو. بەلام لێبـڕانی سەخت و پتەوی سەلاحەدین، زۆر لـەوە پتـەوتر بـوو کـە قەلایەکی بەردینە خۆی لە بەر بگرێ. دەستی لێ هەلنەگرت هەتا قەلای بەرزیەش لە سەربەرزی کەوت و ملی بۆ سەلاحەدین چەماند و ئەوێشی لە دوژمن داتەکاند.

ئەمجار هێرشی بردەسەر ئەنتاکیا. خاچپەرستانی ئەوێ لە ڕێگەی ئاشتیەوە دەگەلی پێك هاتن و هەرچی دیلی موسولمانیان لە لا بوو هەموویان ئازاد کردن.

### بە سەرکردنەوە

لە پاش گەڕانەوە لە ئەنتاکیا، سولتان لە سەر بانگهێشتـنی مەلیکزاهیـرشای کوڕی چـووە حەلـەب. مەلیکزاهیـر پێشوازیەکی شایانی شانی میوانی مەزنی خۆی کرد و لە خۆشیان شاگەشکە ببوو.

سولتان بۆ ماوەی سێ ڕۆژان لە میوانداری ڕۆلەی شیـرینی مایەوە و لەوێوە چـوو بـۆ سـەردانی تەقیەدینی برازی و ڕووی کردەشاری حەمایە. ماوەیەکیش لە لای ئەو مایەوە و زۆری دلی تەقیـەدینی دایـەوە و لاواندیـەوە و ناوچـەی جەبەلـە[2] و چـەند شـوێنێکی‌تریـشی پـێ بەخـشی و خـستنیە ژێـر

---

١- بەرزیە شارێکە لە ولاتی شام. خاوەنی قەلا و ژن و منالی بە دیل گیـران. کـچێکی حاکمـەکـە تـازەبووك بـوو؛ زاواکەی لە جەنگەی شەڕدا لێ هەلبـڕابوو؛ سولتان فەرمانی دابە شوێن زاوادا گـەڕان، تـا پەیـدایان کـردەوە و دایـەوە دەست بووکێ. جەمیل

٢- لەو دوو نوسخەدا لە جیاتی جەبەلە، حەلـەب نووسـراوە. ڕەنگـە دەوروبـەری حەلـەبی نیـاز بـووبێ. عـەونی ⟵

فەرمانیەوە.

لەوە دوا سەلاحەدین گەڕایەوە بۆ دیمەشق و چەند ڕۆژێکیش لەوێدا حەسایەوە و ئەمجار هێرشێکی بردەسەر شاری سەفەد[1] و ئەوێشی بە بێ شەڕ و خوێنڕێژی دەسکەوت و لە سۆنگەی گرتنی سەفەدەوە، کەرەك و کەوکەب[2]یش -کە سەر بەوێ بوون- کەوتنە سەر قەڵەمڕەوی سەلاحەدینەوە. لەوێشەوە هاتە شاری قودس و نوێژی جێژنی قوربانی لە «بیت المقدس»دا کرد و پاشان چووە عەسقەلان و مەلیك عادڵی برای لەوێ لابرد و ناردیە سەر قەڵای کەرەك و ئەمجار هاتە عەکا و فەرمانیدا شوورە کاول کراوەکەی نوێ بکرێتەوە و کۆنە و ڕزیو و بنخزیوی لێ دوور بخرێتەوە و عەکا بە وارشێکی قایم و پتەو دەورە بدرێتەوە.

## قەڵای شقیف[3]

لە پاش ئەو گەشت و گوزارە، سوڵتان هەر خۆی بە لەشکرێکەوە ڕکێفی هێنایە و چووە جەستەی قەڵای شقیف؛ کە قەڵایەکی زۆر ڕژد و سەخت و ڕەوەزێکی ماە و حەستەم بوو. دەوری لێدا و گێچەڵی تێهاڵاند.

خاوەنی قەڵاکە خاچپەرستێکی زۆر پیتۆڵ و لە بنەوەبڕ بوو. دەیزانی ئەوە سەلاحەدینە و دیارە، تا دژەکەی نەستێنێ وازی لێناهێنی و ئەویش ئەوەندەی بە بەرەوە نیە کە بتوانی هەتا سەر بەربەرەکانی سوڵتانی پێ بکرێ. ڕۆژێك هەر بە تاکەسوارە لە قەڵاکەی دەرکەوت و خۆی گەیاندەسەلاحەدین و گوتی واخۆم هاویشتە پەنای تۆوە و خۆم و ماڵ و خێزانم بە پیاوەتی تۆ دەسپێرم. سوڵتان زۆر بە ڕووخۆشی بە خێری هێنا و لە وەرامدا گوتی: هەرچی تۆ ئارەزووتە بڵێ تا

---

← ڕۆژبەیانی لە ناو کەوانەدا نووسیویە «نواخته حلب» وادیارە نواختەی بە نەواحی یان نواختە حەلەبی بە یەك ناو زانیبێ بەڵام فارسییەکە دەڵێ:

«سلطان برادرزاده را نواخته، جبله و یك دو قصبه دیگر را اضافهٔالکای او نموده» نواختن: لاواندنەوەیە. واتا «برازای لاواندەوە و جەبەلە و یەك دو شارۆکەی‌تری خستەسەر مەڵبەندەکەی». هەژار

1- شارێك بوو بە سەر چیایەکی بەرزەوە و دژەکەی دەیڕوانیە دەریاچەی تەبەریا. جەمیل

2- دژێکی سەخت بوو؛ لە سەر چیای ڕووکاری تەبەریا و بە سەر دۆڵی ئوردوندا زاڵ بوو. جەمیل

3- شقیف لە سووریا، لە کەناری دەریا و سی‌کیلۆمیتری سەوورە و ناوی قەڵایەکە و فەرەنگ ناویان نابوو «بوفور».

بۆت بکەم. کابرای خاچپەرست -کە زمانی عەرەبیشی زۆر باش دەزانی- عەرزی کرد من خۆم هاویشتۆتە خاك و پای تۆوە، دەزانم مەردایەتی تۆ لە هەموو نیاز و ئاواتێکی ئێمەی تێپەڕاندووە و ئاشکرایە کە تۆ لە بەڵێنی خۆت پاشگەز نابییەوە. من هەر ئەوەندەم دەوێ خۆم و ماڵ و خێزانم لە دیمشق دابمەزرێنی و بژیوێکی وامان بۆ دەبەرچاو بگری کە نەمر و نەژی پێی بژین و سەری خۆمان ڕاگرین. ئەگەر ئەو ئاواتەم بێتە دی ئەوا منیش بە خۆشی خۆم لە تەهی دڵەوە قەڵا بۆ پیاوەکانی سوڵتان جێ دێڵم و بە شانازییەوە هەتا دەمرم نانخۆری سوڵتانم.

سوڵتان بەو قسانە گەردی لە سەر دڵ نەما و دەگەڵی ڕێك کەوت و بڕیار درا کابرا بچێتەوە کارسازی خۆی بکا و ئەوسا بە ماڵ و منداڵەوە بەرەو شام بارکا. سوڵتانیش -وەك پەیمانی دابوو- لەشکری لە دەوری قەڵا دوور خستەوە و لە دوورەوە چاوەنۆڕ بوون کەنگێ قەیران بە سەر دەچی و کابرا لە قەڵا دەردەچێ، ئەو سایە بچنە ناویەوە. ڕۆژ هاتن و شەوگار چوون، کابرای تاین نەهاتە دەر و بەڵێنی نەبردەسەر و هەرچی گوتبووی هەمووی بە درۆ دەرچوو. ئەو ڕێویبازی و فەندەڵ فێڵەی هەر بۆیە کرد کە لەشکری سوڵتان هیچ نەبێ بۆ ماوەیەك سەر و دڵی بەردەن و ڕێی دەستی ببێ دیوارە ڕووخاوان چاکاتەوە و کەل و قوژبنان داداتەوە و بورجان گورج کاتەوە و دانەوێڵە و تێشووی زۆر وەسەر یەك نێ و چەکی لە کارکەوتوو نوێ کاتەوە و کەللە لە کەللەی دوژمن بداتەوە.

سەلاحەدین هەستی کرد کە دەستی بە زاخەدا کراوە و بە زمانێکی لووس و دوو قسەی خۆش، فریو دراوە. زۆری لە بەر گران هات و فەرمانی بە لەشکری گرانی داکە هەتا قەڵای شقیف دەگەڵ زەوی ڕێك نەخرێ نابێ وازی لێ بێنرێ. دەوری قەڵا درایەوە و سەر لە نوێ مەنجەنیقی ئاگرپژێن و کەرستەی قەڵاڕمین دامەزرایەوە. بەڵام هێشتا کڵی شەڕی بە گوڕوتاو بە تەواوی نێڵ نەدرابوو، نامە و ڕاسپاردەبە هەڵەداوان گەینە سەلاحەدین و خەبەریان دایە وا لەشکرێکی زۆر و زەبەندەی خاچپەرستان کە سەروبنی دیار نیە و کاری هەزار و دەهەزار و سەدهەزاریش نیە و بەدەر لە هەژمارن و خوا نەبێ کەس نازانێ چەندن و چەند تەیارن و چییان پێیە، گەیشتوونەتە سەر بەندەرگەی عەکا و دەوری قەڵاکەیان داوە و زۆریان زۆری بۆ مەلیك عادل و دانیشتووانی شار هێناوە و کار گەیشتۆتە ئاڵۆزی و کزی و تەنگایەکەوە کە مەلیك عادل بە ناچاری ملی داوە شاری عەکا بە هەموو چەك و جبەخانە و گەمیە و کەڵەك و بارەبەرانەوە بخاتە دەست فەرەنگانەوە و سەرباریش دووسەدهەزار

دیناریان کاڵەدرانە بۆ ببژێری و سەد دیلی خاچپەرستی گەورەشیان دەگەڵ پێنج سەد دیلی ڕەمەکی سەر بەوان ئازاد بکا و بەوانی بسپێری و ئەوانیش پیاوەتی بکەن ڕێگەی موسوڵمانەکانی شارەکە بدەن، لە شار دەرکەون و لە ڕێگە خۆیان تێ نەگەیەنن و ئەوسا شارەکەش ببێتە مۆڵگەی فەرەنگان[1].

سەلاحەدین لە بیستنی ئەم کارەساتە دڵتەزێنە گەلێك تەزووی سارد و گەرمی بە لەشدا هاتن و دەماری ڕێك هاتن و لە حیرسان گرژ بوو. هەرگیز چاوەنۆڕی ئەو ڕۆژی نەدەکرد کە بنەماڵەی ئەییوبی بەو جۆرە سەرشۆڕییە مل بدەن و سەر بۆ دوژمن دانەوێنن. لە عەیبەتان ژانی دەدڵ وێستا و لێ بڕا کە ئەم پەرۆشینە لە شان بکاتەوە.

پسپۆڕانی لە شەڕزان و ڕاوێژکەرانی زۆرزانی کۆ کردەوە و کۆڕیان بەست و مەبەستەکەی خستە

---

١- بۆ ئەو هێرشە هەموو ئەورووپا هرووژا و لە بۆرەپیاگەوە هەتا کەشە و پادشا، لە خەزای خاچپەرستیدا بەشدار بوون. سەرکردەکانی شەڕ ڕیچاردشێردڵ پادشای ئینگلیز و فیلیپئاگستۆس پادشای فەرانسە و فریدریکباربارۆس پادشای ئەڵمان بوون. خوا وای کرد ڕۆژی چواری جیمادی دووەمی ساڵی ٥٨٦.ك (دەی حوزەیرانی ١١٩٠.ز) فریدریك لە چۆمی سالفدا خنکا و لەشکرەکەی بڵاوەی کرد. ڕیچارد و فیلیپ شەڕی زۆریان کرد و زۆریان ئازاری موسوڵمانان دا. بێ تاوان و بە تاوانیان هەر دەکوشت و تەر و وشکیان پێکەوە دەسووتاند. دوایی ئەو دوانەش لە نێوان خۆیاندا تێك چوون. فیلیپ ڕۆژی حەوتەمی ڕەجەبی ساڵی ٥٨٧.ك (تەموزی ١١٩١.ز) بە تووڕەیی فەلەستینی بەجێ هێشت و کۆناردی لە جێگەی خۆی کردەسەرکردەی لەشکرەکەی. ڕیچارد نزیکەی مانگێك لە عەکادا مایەوە و بەرەو یافای ئاژۆت. لەشکری سوڵتان ڕێگەی لێ گرت و زۆری شپرز کرد و دەیافای پەستاوت و لەوێدا خۆی قایم کرد. سوڵتان لە یافاش تەنگی پێ هەڵچنی و جارێك لە شەڕێکدا هێندەی نەمابوو ڕیچاردی بگرن، گیلیۆم ناوێك هاواری کرد: من ڕیچاردم. ئەویان کوشت و ڕیچارد بە پەلەپرووزە دەرباز بوو.
ڕیچارد کە دەیزانی سەلاحەدین بە هیچ جۆرێك وەرە بەر نادا و دەستیشی لێ بەر نادا، چاری ناچار دەگەڵی کەوتە وتووێژی ئاشتی و لە سەر ئەوە پێك هاتن کە ڕیچارد خوشکی خۆی بدا بە مەلیکعادل و کەنار دەریا بۆ بووك و زاوا بێ و قودسیش لە ژێر فەرمانی ئەو دوانەدا بێ کە نوێنەری خاچپەرست و موسوڵمانانن و زیارەتی «بیتالمقدس» بۆ ئیسلام و مەسیحی، وەك یەك و ئازاد بێ.
ئەمینزەکی دەڵێ: بڕیارەکەی پێشوو وابووە مەلیکعادل هەزار و شەشسەد کەس لە فەرەنگە یەخسیرەکان بەر بدا و دووسەد هەزار دیناریش بدا و ئەوانیش لێ بگەڕێن موسوڵمانان لە عەکا دەرکەون. بەڵام خاچ پەرستەکان پەیمانی خۆیان شکاند و قەڵت و بڕیان خستە موسوڵمانەکانەوە. دەڵێن: هەر ڕیچارد شێردڵ ڕۆژی ٢٣ی ڕەجەبی ساڵی ٥٨٧.ك (١٢ی حوزەیرانی ١١٩١.ز) دووهەزار و حەوسەد موسوڵمانی کوشتووە. هەر لە شاری عەکا ٦٠ هەزار موسوڵمان کوژراوە. جەمیل

بەر دەستەوە. بیر و بڕوای هەموویان ئەوە بوو قەڵای شقیف واز لێ بێنن و هەرچی زووە فریای عەکایە بکەون. سەلاحەدین فەرمانی دابە مەلیکئەفزەڵی کوڕی –کە لە باتی بابی بە سەر دیمشق رادەگەیشت- بچێ و عەسقەلان وێران کا؛ چونکە دەترسا خاچپەرست دەستیان بگاتە عەسقەلان و پووڕ و تالانی بکەن و ئەوەندەیان لێ دەسکەوێ کە بۆ گرتنی شاری قودس خۆی پێ سازدەن.

مەلیك ئەفزەڵ بە خەڵکی عەسقەلانی ڕاگەیاند کە شڕ و شاتاڵ و سڕ و سیپاڵیان بپێچنەوە و عەسقەلان بەجێ بێڵن و ڕوو بکەنە ناوچەیترەوە. خەڵکی عەسقەلانی کڵۆڵ و چارەڕەش دەستەپاچە ببوون و سەرە و دەریان دەرنەدەکرد کە چ بکەن و ڕوو بکەنە کوێ؟ دەستیان کرد بە هەڕاج کردنی ئەو کەل و پەلانەی کە بۆیان وەدەر نەدەخرا. نرخی هەموو شت لە دەوە ببووە یەك و هێشتا کڕیاریشی نەبوو. لە تاریخی *مرأةالجنان* دادەڵێ: «عەسقەلانیەك دوازدەمریشکی دەدا بە درهەمێك». ئیتر بەو پێیە لێکی دەرەوە و بیری لێ بکەرەوە.

پوختەی مەبەست حەشامات و ئاپۆرەی زۆر -لە بۆرە پیاگ و لەشکری- بەربوونە خاپوور کردنی شار و لە ڕۆژی بیستەمی مانگی شابانەوە هەتا ڕۆژی نیەتی ڕەمەزان، داریان بە سەر بەردەوە نەهێشت و داروپەردوویان بە سەر یەکدا داو سەرەڕای کاول کردنی، ئاگریشیان پێوەنا و لە خۆڵەمێش و مشکی بەولاوە -لە شوێنەواری ئەو شارە بەخت وەرگەڕاوەی تەخت کراوە- شتێك نەمابوو کە پێی بڵێن شت.

هەر لە سەر ئەو پلانە، شاری لودد و قەڵای ڕەملەشی بە مەرەدی عەسقەلان برد و بە سووتاوی و کاول کراوی بەجێهێشتن.

بە لەشکرەوە بەرەو عەکا دەچوو، نامەیێکی لە مەلیك عادڵەوە بۆ هات بۆی نووسیبوو خاچپەرستان ئێستا خاوتر قسە دەکەن و هاتوونەتە سەر ئەوە ناوچەی کەنار دەریا بدرێ بەوان و ئەوانیش دەست لە شەڕ و خوێنڕێژی بەر بدەن و ببنە دۆستی یەکجاریمان. تۆ فەرمانت لە سەر چییە؟ سەلاحەدین بەوە ڕازی بوو. مەلیك عادلی سپارد کە دەگەڵیان ڕێك بکەوێ. ئیتر هیم و بناخەی ئاشتی و شەڕ بەربەست کردن لە نێواندا دامەزرا و پەیماننامە نووسرا و بە سوێند و بەڵێنی پیاوانەش دابەسترا. هاتووچۆی بازرگانی برەوی سەند و هەر دوولا بۆ سارد و سەودا و کاڵا بە کاڵا دەچوونە ناو

یەکتـر و دنیایەکی کڕ و ئارام هاتە ڕوو.[1]

سوڵتان ئەوسا مەلیك ئەفزەڵی کوڕی بە لەشکرەوە ناردەوە شام؛ کە پشوو بدەن و بـحەسێنەوە. بۆخۆشی چووە شاری قودسی و ماوەیەك لەوێ مایەوە و بەرەو دیـمشقی پاتەختی گەڕایەوە.

لە ڕۆژی بیستوحەوتەمی شەشەکانی ساڵی ٥٨٨.ك (١١٩٢.ز) گەیشتەوە دیـمشق و هـەر کـە خەبەری هاتنەوەی بڵاو بۆوە، هەموو خەڵکی شام بە ژن و منداڵ و پیـر و کاڵـەوە، کـەس نـەمابوو نەچێ بە پێشوازی ئەو خۆشەویستەوە و هەموو کەس لەو ڕۆژەدا گەشە لە چاو و بزە لە سـەر لێـوان و مزگێنیان بە یەکتـر دەدا و بە شانازی هەرەبـەرزیان دەزانـی کـە چـاویان بـە دیـداری ئـەو نەبـەرد و مەردەبە ناوودەنگە ڕوون دەبێتەوە.

## کۆچی یەکجاری

ساڵی دوایی کە دەبووە سـاڵی ٥٨٩.ك (فیبـرایر١١٩٣.ز) ڕۆژی هـەینی پـازدەی سـەفەرە مـانگ، سوڵتان سەلاحەدین بۆ پێشوازی حەجاجان -کە لە مەکە دەگەڕانەوە- لە شار دەرکەوت. لە گەڕانەوەدا تایەکی زۆر گرانی هاتێ. ئیتـر بەو تایـە کـەوت و بـەری نـەدا و زۆریـشی مـەودا نـەدا و لـە پـاش دوازدەڕۆژ، واتا ڕۆژی یەکشەممە بیستوحـەوتی سـەفەری سـاڵی ٥٨٩.ك (٤ی‌مـارس١١٩٣.ز) ئـەو خوداپەرستە خۆشەویستە، بەهەشتی بەرینی لە سـەرزەمینی بەرتـەنگ بـە باشتـر زانـی و جیهـانی بەرچاوتەنگی بەرەڵدا کرد و خێوەتی سەربەرزی لە بەر بارەگای یەزدانی دڵاوادا بەرپا کرد.

لە ڕۆژی مەرگی سەلاحەدین ئەیوبیدا وا بیـر دەکرایەوە کە هەرچی خۆشی و شادیە سوڵتان لـە پێش خۆیدا بە پێشباری بەڕێ کردووە؛ یان هەمووی بە شوێن کۆچباری ئەو نـازدارەدا بـاری کـردووە. حەشاماتی شام و حەول و حەوشی، هەرچی لەو کارەساتە بە ئاگا بوون، بە خڕی و بە پانەوە جـمابوون و تێکڕا گەورە و گچکە و پیـر و منـاڵ و ژن و پیـاو و لاو و کـاڵ و شارسـتانی و دەشـتەکی و دارا و هەژار و خانەدان و ڕەمەکی و کاسبکار و جووتیار، قوڕبەشان و سەربەهەش و جەرگڕەش و دڵ بریان و چاو بەگریان بوون. جۆی فرمێسکی سوێر و سوور لە چاوانەوە سەری کردبوو. ئەو ئاپۆرەی لـە ناشـتنا

---

١- ئەو پەیـمانی دۆستایەتیە ڕۆژی ٢٢ی شابانی ساڵی ٥٨٨.ك (٢ی سپتامبـری ١١٩٢.ز) ئیمزا کراوە.



بەشدار بوون و ئازیەتبار بوون، لە ئەندازە بەدەر بوون و لە شیــن و شـەپۆرگێڕان و لـە خۆدانـدا، لـە ئەندازەیان بردەدەر. خۆنەخوازە کە داربەستی تەرمی پیـرۆزی دەرکەوت، دەنگی گریان و هاوار و ڕۆڕۆ و شلپەی دەستی لە خۆدەران و کوتەی لاقی لە پێش تەرما سەماکەران، گای ژێرزەمینی سڵ دەکـرد و دڵی فریشتەکانی عاسـمانی سەرشینی دادەچڵەکاند و دادەخورپاند و رایدەتڵەکاندن. تـەرمی پیـرۆزی لە نزیك مزگەوتی ئەمەوی لە شاری دیـمشقدا بە خاك سپێرا و لەشی کەوتە بن گڵ؛ بەڵام هـەتا دنیـا دنیایە، سەلاحەدین نەمردووە و نامری و ناوی ئەو مەردەلە سەر زاری خەڵکی هـەموو دنیـا، هـەموو زەمانان بە هەموو زمانان، هەر دەمێنی و لە ناو ناچێ.

وا لە دنیـا بژی ئەگـەر بـمری    هەرچی ناوت بزانێ بۆت بگری<br>
پیاوی ئـازا نەمان سـەری نادا    ناوی چاك هەر دەژی لە دنیادا

## ئاکارەکانی

سوڵتان سەلاحەدین هەر چەندی خوا حەزکا پادشایەکی دادگەر و بەلەنگازپەروەر و بەدەستوداڵ و ئازاد و ئازا و سەنگیـن و گران و ڕەزاسووك و خوێنشیـرین و ڕووخـۆش و دەم بـە پێکەنیـن بـوو. پیـاوی دەست ڕەنگیـن و هونەروەری زۆر لە لا هێژا بوو. دۆستی هەرە نزیکی پیاوی خوێنـدەوار و زانـا بـوو. ڕێزی لە بوێژ و نووسەران دەنا و بۆ شیـریـنکار و بەجەوهەران سەروەر و پشت و پـەنا بـوو. هـۆزان و پیتۆڵ و هونەرمەندی لە خۆی خڕ دەکردنەوە؛ کەمایەسی و کەم و کوڕی ژیانی بۆ پـڕ دەکردنـەوە. لـە هیچ چاکەیەك خۆی نەدەبوارد؛ با زۆریشی تێ چووبا. دەسەر هیچ خراپەیەکەوە نەدەچوو؛ بـا زۆریـشی پێ چووبا. لە ڕۆژگاری ئەودا کەس نەیدەوێرا بە خەیاڵیش خراپە بکا. هیچ دەستدارێك بەتیتوش دەس نەدەکەوت کە لە سەر بێزۆران بادی هەوابێ. یان بیـری زۆرکاری بە دڵـدا بـێ. لـە ودم و پـیتی ئـەو سەرداره سەرزەمینی میسر گەیشتە چڵەپۆپەی گەشەداری و ببووە نـموونەی ئارامی و خێر و خۆشی و هەرزانی. هێندێك لەو شوێنەوارە بەهرەدارانەی کە لێی بەجێ ماون و هەر ماون ئەمانەن:

١ و ٢- مەدرەسەی قەڕافەی گەورە و مەدرەسەی قەڕافەی گچکە. کە لە نزیك گۆڕی پیـرۆزی ئیمام شافعیـن.

٣- مەدرەسەی قاهیـرەی موعیززی. نزیك بەو زیارەتگایەیە کـە دەڵـێن ئیمـام حوسـێنی تێـدا نێژراوە.

٤- مەدرەسەی حەنەفـییان. کە لە جێی کۆشکی عەبباس کوڕی سەلاردا دروست کراوە.

٥- مەدرەسەی شافعیان کە لە میسر بە ناوی «زیـن‌التجار» بەناوبانگە.

٦- مەدرەسەی مالکیان لە قاهیـرەی موعیززی.

٧- نەخۆشخانەیەك لە ناو کۆشکی خۆیدا.

٨- مەدرەسە و خانەقایەك لە قودسی خەلیل (شاری خەلیل).

٩- خانەقایـەك لـە جێگـای کۆشـکی «سعیدالـسعدا»[1]. کـە یـەکێك بـووە لـە خەلیفـە ئیسماعیلییەکان[2].

بەخشندەیی و دڵاوایی سوڵتان بێ وێنە بووە؛ ماڵی دنیا و خۆڵی دەم ڕێگـای بـە چـاوێك سـەیر کردووە. تەنانەت کە لە پاش مردنی سەری نەغدینەکەی خۆیان داوە، تەنیا چلوحەوت درهەمی مـاڵی دنیا لە پاش بەجێ ماوە.

## ئەبولفەتح عوسـمان کوڕی سەلاحەدین

سوڵتان سەلاحەدین هەر بە زیندی سەر میسری دابوو بە عوسـمانی کوڕە گەورەی کە نازناوی مـەلیك عەزیز بوو.[3] کاتێ وەڵامی مەرگی کتوپڕی جەرگبـڕی ئەو شیـری میسری و شێری مەیدانە گەیشتەوە عەزیزی میسر، بە کۆسکەوتەیی و پەژاری کەوتە ماتەمداری و ئازیەتبارییەوە و لە میسریشدا پرسەی

---

١- سعیدالسعدا نازناوی پیاوێکی خەلیفە موستەنسەروبیلای فاتـمی بووە و ناوی پێشووی قەنبەر بووە. جەمیل

٢- ئەو خەلیفانەن کە لە مەغریب و میسر حوکمیان کردووە و لەو شیعانە بوون کە ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری سادق بە ئیمامی خۆیان دەزانن. لە ساڵی ٢٩٧.ك ڕا تا ٥٦٧.ك خەلیفایەتیان کردووە. عەونی

لە مێژووەکانیتردا نووسراوە کە هەر لە قاهیـرەدا جگە لە دوو نەخۆشخانە، کۆشکی خەلیفەشی کردووە بە نەخۆشخانە و ئەنوای غەریبانیشی بنیات ناوە. جگە لەوەش گەلێك پرد و ئاوبارە و شوورە دیواری لە شاران کردووە و ڕێگەی زۆری خۆش کردوون و زەوی کشت و کاڵی چاك و زیاد کردووە و باج و گومرگی گرانی لە سـەر خـەڵك لابـردووە. درۆشـمی ئاڵاکەشی پارچەیەکی زەرد بووە و سیسارگێکی سووری لە سەر نەخش کراوە. جەمیل

٣- هێندێك لە مێژووناسان لایان وایە مەلیك ئەفزەڵ کوڕەگەورەی بووە. عەونی و جەمیل

بۆ دانا.

لە پاش هەڵگیرانی خوانی سەرەخۆشی، سەرداران و ئەمیرانی میسر بوونە سوێندخۆری و پەیمانی سەروەریان بۆ مۆر کرد. ئەویش کەوتە خۆی و خۆی تەیار کرد و کاروباری میسری لێك و لە بار کرد و ئەوسا دەگەڵ مەلیك عادڵی مامیدا کاکە و برالەی خۆیان کرد و بە جووتە لەشکریان ئاژۆت و چوونە سەر شام و گەڕیان دەمەلیك ئەفزەڵ هاڵاند. برایەك لە لایەك و برا و مامێك لە لایەکیترەوە لەشکریان بەگژ یەکدا کرد و مەلیك ئەفزەڵ دوو جاران لەشکری هێرشبەرانی بە پاشدا کشاندەوە و سەری سێ جارە زۆر بە توندی دەوری درا و مەودای لێ بەرتەسك کرا و برِستیان لێ بڕی و دەرۆستیان نەهات و لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٥٩٢.ك (١١٩٦.ز)دا مەلیك ئەفزەڵ دیمشقی بۆ بە جێ هێشتن. عوسمان فەرمانی فەرمانڕەوایی دیمشقی دابە عادڵ و بەرەو میسر گەڕایەوە.[١]

ساڵی ٥٩٣.ك (١١٩٧.ز) سەیفەلئیسلام توغتەگین (توغرولتەگین) کوڕی نەجمەدین ئەییوب -کە پادشای یەمەن بوو- کۆچی دوایی کرد و کوڕەکەی کە ناوی فەتحەدین ئیسماعیل و نازناوی مەلیك موعیز بوو جێگەی گرتەوە.

ساڵی ٥٩٥.ك (١١٩٨.ز) مەلیك عەزیز عوسمان کوڕی سەلاحەدین -کە پادشای میسر بوو- لە دوای شەش ساڵ پادشایەتی کردن چاوی لە دنیا پۆشی و لەو دنیا کەوتە خۆشیەوە.

مەلیك عەزیز پیاوێکی ژیر و وریا و وشیار بووە و لە شەڕمێونی و هێمنیدا ناودار و لە پشوودرێژی و سەرەخۆییدا تای نەبووە. زۆریش دەستوداوێنپاك و دڵچاك و بەخشندەبووە.

---

١- ئەمینزەکی لە *تاریخی دوەل و ئەماراتی کوردی*دا، ج٢، ل٢٢٦ دەڵێ: مەلیك عادل و کۆمەڵێك لە ئەمیرانی ئەییووبی ڕازی نەبوون کە مەلیك عەزیز پەلاماری مەلیك ئەفزەڵ بدا و بوونە ناوبژیکەر و لە هێرشی یەکەمدا گێڕایانەوە دواوە. ساڵی دوایی دیسان هێرشی هێنایەوە سەر وڵاتی شام و زۆر هاتە ناوەوە. مەلیك عادل لاگیری لە ئەفزەڵ دەکرد و دنەی لەشکری عەزیزی دەدا کە لێی هەڵگەڕێنەوە تا نەتوانێ بەشی براکەی داگیر بکا؛ بۆ جاری دووەمیش پێکی هێنانەوە.

ئەمینزەکی هەر لەو کتێبەیدا دەڵێ: مەلیك عادل کە زانی شەڕی ئەو دوو برایە کۆتایی نایە و لەو سۆنگەیەشدا لەشکری موسوڵمان تێ دەچێ و فەرەنگیش گوێیان لە کڵاو دەرپەڕاندووە و نینۆك لێك دخشێنن و لەوانەیە هەر ئەوان بەهرەی لێ ببینن، دەشیەویست بۆ خۆی خەز و بەزەکەی بەرێ، وازی لە ئەفزەڵ هێنا و دەگەڵ عەزیز ڕێك کەوت و بە جووتە هاتنە سەر شام و ئەفزەڵیان دەرکرد و قەڵای سەرخەدیان دایە و بۆ خۆی بوو بە پادشای وڵاتی سووریا. جەمیل



لە پاش نەمانی مەلیك عەزیز، بەرەی ئەییوبی لە سەر جێنشینی ببوونە دوو دەستە: دەستەیەکیان گەرەکیان بوو ئەبوو مەنسوور عەلی کوڕی عەزیز بکەنە جێنشینی باوکی[1]؛ دەستەکەیتر ناردیان بە شوێن مەلیك ئەفزەڵ کوڕی سەلاحەدیندا و کردیانە پادشای میسر.

## مەلیك ئەفزەڵ کوڕی سەلاحەدین

هەر وەك لەوە پێش باسمان کرد، هەتا سەلاحەددین مابوو مەلیك ئەفزەڵ بە سەر دیمەشق ڕادەگەیشت و کە ئەویش نەما عەزیز عوسمانی -برای ئەفزەڵ- دەگەڵ مەلیك عادڵی مامیدا، سێجار لەشکریان هێنا سەر شام و ئەفزەڵیان دەرکرد و قەڵای سەرخەد[2]یان دایە و ئەفزەڵ لەو قەڵایەدا دەژیا. تا مەلیك عەزیز لە میسر مرد؛ ئەوسا لە دوویان نارد و بۆ ماوەیەکی کەم لەسەر میسر پادشایەتی کرد. کە مەلیك عادڵ بەم کارەی زانی، بە لەشکری گەورە و گرانیەوە هاتە میسر و بە زۆری زۆرداری دیسان مەلیك ئەفزەڵی لە سەر تەختی پادشایی داگرت[3] و قەڵای شمیشاتی[4] پێ سپارد. مەلیك ئەفزەڵ هەتا مرد هەر لەو قەڵایەدا ڕایبوارد و لە ساڵی ٦٢٢.ك (١٢٢٥.ز) بەر بەزەیی خوا کەوت.

---

١- مەلیك مەنسوور عەلی کوڕی مەلیك عەزیز عوسمان کوڕی سەلاحەدین یووسف. عەونی

٢- قەڵایەکی کەونارایە لە شام و لە نێوان حوران و جەبەلدروزە و ئێستا گوندێکە شوێنەواری کۆنی لێیە. عەونی

٣- ئەمینزەکی دەڵێ: کاتێ مەلیك ئەفزەڵ کرا بە پادشای میسر و سەرپەرشتی مەلیك مەنسووری برازای، لێبڕا کە تۆڵە لە مەلیك عادڵ بکاتەوە؛ ناردیە لای مەلیك زاهیری برای -کە پادشای حەڵەب بوو- دژی مامی یاریدەی بدا و بۆ خۆشی خەریکی خۆسازکردن بوو کە بچێتە جەستەی مامی. مەلیك عادڵ بەو کەین و بەینەی زانی و لە بنەوە نێوانی ئەفزەل و سەردارانی تێکدا و بە لەشکرێکی زۆریشەوە هاتە سەر میسر و ساڵی ٥٩٦.ك (١١٩٩.ز) ئەفزەل و مەلیك مەنسووری دەرکردن و میسریشی خستە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیەوە. جەمیل

٤- شمیشات کەونە قەڵایەکە لە سەر چەمی فوڕات لە کوردستانی باکووری و لە باشووری قەڵای مەنسوورە. ئەتڵەسی عوسمانی بە سامسادی نووسیوە. عەونی

ئەمینزەکی دەڵێ: ئەگەر لە میسریان دەرکرد، ناردیانەوە قەڵای سەرخەد و ماوەیەکی تێدا مایەوە. مەلیك زاهیری برای لەشکری حەڵەبی هێنا کە شام بگرێ؛ وریایی مەلیك عادل نێوانی دوو برالەی تێکدا و مەلیك زاهیر هاتەوە حەڵەب و مەلیك ئەفزەڵ بە ناهومێدی هاتەوە قەڵای سەرخەد. لە پاشان عادڵ بەزەی پێدا هات و قەڵاکانی نەجم و سروج و حەمسادی دایە. جەمیل

تاریخی یافعی دەڵێ[1] مەلیك ئەفزەڵ لە زانست و وێژەوانیدا زۆر سەرکەوتوو بووە. زۆری فەرمایشی پێغەمبەر لە بەر بوون. خەتخۆشێکی دەسڕەنگین و لە زەبر بووە. دڵی بە زانا و هونەرمەندان کراوەتەوە و زۆری لە خۆی نزیك کردوونەوە و گەلێکی لە لا بەرێز بوون. لە کاری ناڕەوا زۆر بە قێز و بێز و تووڕە بووە. خۆی بە کەسی بێکەسان دەژمارد و لەگەڵ گەلدا بێدریغ بووە. بە کورتی، زۆر لاوێکی پێکەوتە و ئاکارچاك و هونەروەر و بە جەوهەر و لە پیاوەتیدا گوڵی سەر چڵ بووە. لە بوێژیشدا دەستی باڵای هەبووە. بۆ نموونە مەلیك عەزیزی برای -وەك زانیمان- ناوی عوسمان و مەلیك عادڵی مامی بە ئەبووبەکریش ناو براوە؛ بۆ خۆشی ناوی عەلی بووە. ئەبووبەکر و عوسمان ڕێك کەوتون و هاتوونە سەر عەلی و لە شامیان دەرکردووە لەو بارەوە نامەیەکی بۆ ناسر[2]ی خەلیفەی عەبباسی نووسیوە و ئەو شێعرانەی تێدا گونجاندووە (ئەمە کوردیەکەیانە):

دنەی ئەبووبەکریدا عوسمان و دەس لە دەسا
بەشی ڕەوای عەلی بێچارەیان وەبەر پێدا
گەورەم دەزانی کەوا باوك بە زیندی سەری
بە ناوی جێگری خۆی بۆ منی قەڵەم لێدا
کە ئەو نەما لە سەرم دەس کرا بە سەرپێچی
لە خێچ و خواری، کەسێك ڕاستی ناچێ بە گوێدا
منیش بە دەردی عەلی ڕووت کرام بە دەست عوسمان
ئەبووبەکر کە نەبێ کێ دەوێرێ خۆم لێدا؟!

ناسرەدینەڵڵای خەلیفەی بەغدایەش لە وەرامی مەلیك ئەفزەڵدا سێ بەیتی نامەی خۆیدا

---

١- یافعیعەبدوڵڵا کوڕی ئەسعەد بە قوتبی مەککە و میوانی مەدینە ناسراوە؛ چونکە زۆریان تێدا ماوەتەوە. ساڵی ٧٥٥ك مردووە. زۆری کتێب داناون «*مراة الجنان فی الحوادث الزمان*» کە لە حەیدەرابادی دەکن چاپکراوە لە هەمووان بەناوبانگترە. جەمیل

٢- خەلیفە ناسرەدینەڵڵا ئەحمەد کوڕی موستەئزی، سی و چوارەمین خەلیفەی عەبباسی لە ساڵی ٥٧٥ك یەوە تا ساڵی ٦٢١ حوکمی کردووە و لە پاش ئەو زاهیر بینەمریلای کوڕی بۆتە خەلیفە. عەونی

گونجاندووە، دەڵێ:

ئەگەرچی دەردەدڵیش زۆر هەبوو لە نامەکەتا هونەر دەباری بەڕێژە و لە تۆی پەیامەکەتا
عەلی کە مافی وە بنلیچ درا بە زۆرداری کەسێکی وا نەبوو ئەو دەم بگا بە هاواری
بەڵام ئەتۆ وەکوو ئەو نیت و ئێمە هاناتین دەبم بە یاریدەرت خۆش بە هەربینا هاتین

نەسروڵڵا کوڕی ئەبولکەرەم زیائەدین محەمەد، کوڕی عەبدولکەریم شەیبانی جزیری وەزیری مەلیك ئەفزەڵ بووە؛ کە ئەویش دەگەڵ عیزەدین عەلی[1] و مەجدەدین ئەبوسەعادەتی برای[2] بە ئیبنوئەسیر ناوبانگیان ڕۆیشتووە. ئەو ئیبنوئەسیرەی کە وەزیری مەلیك ئەفزەڵ بووە لە هەموو زانایانی زەمانی خۆی بەناوبانگتر بووە و کەس نەیتوانیوە لە زاناییدا لە بەری بکۆخی و لە بەرانبەریدا بڵێ ئەزم. لە هونەری نامەنووسی و وتار ڕازاندنەوە و وردەکاری پسپۆڕانەدا هەر خۆی تاکەسوارەی مەیدان بووە. لە جزیرەی ئیبنوعومەر لە دایك بووە[3] و لەوێش پێگەیشتووە و دەڵێن زۆر

---

١- عیزەدین‌عەلی: ئەبولحەسەن عێزەدین عەلی کوڕی ئەبولکەرەمی‌جزیری برای ئەبولسەعادت مەجدەدین موبارەك کوڕی ئەبولکەرەمی جزیری، کە بە ئیبنوئەسیر بەناوبانگە و لە جزیرەی ئیبنوعومەر (ابن عمر) ساڵی ٥٥٥.ك (١١٦٠.ز) هاتۆتە دنیاوە و کتێبی *النهاية في غريب الاحاديث* و *الكامل في التاريخ* و *أسدالغابة في معرفة الصحابة* ئەو دایناون. عەونی

٢- ئەبوسەعادەت مەجدەدین مبارەك ئەبولکەرەمی جزیری -کە بە ئیبنوئەسیر بەناوبانگە- ساڵی ٥٤٤.ك (١١٤٩.ز) لە جزیرەی ئیبنوعومەر هاتۆتە دنیا و لەوێ گەورە بووە و چووەتە مووسڵ و لە لای محەمەد سەعید کوڕی مبارەکی خوێندووە و گوێی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر گرتووە و بۆتە دۆستی ئەمیر موجاهێدەدین قایماز و دوای ئەویش هەمدەمی ئەمیر نوورەدین ئەرسەلانی کوڕی بووە؛ شەپلە لێی داوە و گردەنشین بووە. ئەمیر و ئەجیمزادەکان دەهاتنە ماڵی پرسیان پێ دەکرد. میوانگەیەکی لە دەوری شار دروست کردبوو؛ ساڵی ٦٠٦.ك کە مرد، لەوێدا نێژرا. *جامع الأصول* و *النهاية في غريب الاحاديث* و *الانصاف في تفسير القرآن* و *البديع في فن الكتابة* و *ديوان الرسائل* و *كتاب الشافي* و *المصطفا* و *المختار في الادعية و الافكار* و گەلێك شتی‌تریشی داناوە.جەمیل وادیارە عەونی و ڕۆژبەیانی لە سەر خاوەنی *النهاية في غريب الاحاديث* پێك نەهاتوون. هەژار

٣- جزیرەی ئیبنوعومەر، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ئاوەدانی کردۆتەوە و بۆیە بە جزیرەی عومەری ناونراوە.عەونی منیش دەڵێم عەبدولعەزیز عومەری کوردی خەلکی بەرقەعید -کە سەر بە مووسڵە- دروستی کردووە. مێژوونووسی گەورە ئەبولفیداش لە مێژووە هێژاکەیدا، ج٣، ل١٣٩ قسەی من دەکا. لە ناوەکەشی دیارە ئیبنوعومەر نەبوو. هێندێکی‌تر کە نووسیویانە عومەر کوڕی حەسەنی تەغلەبی دروستی کردووە، لە ڕەگەزپەرستیەوە بووە و لە ←

بە منداڵی هەموو قورئانی لەبەر کردووە. ئەوەندەبیرتیژ و لەسەرزەین بووە هەموو کەسی ناسیاوی سەری لێ سووڕ ماوە؛ هێشتا تازەلاوێك بووە هەموو دیوانی شێعری موتەنەبی (متنبی) و بوحتوری (بحتری) وەك ئاو لەبەر بووە.

تاریخی یافعی لە ئیبنوخەلەکان (ابن‌خلکان)[1]ەوە دەگێڕێتەوە کە ئەم ئیبنوئەسیرە کاتێ خوێندنی تەواو کرد و پێگەیشت، لە دیوانی سوڵتان سەلاحەدینی ئەییوبی دامەزرا و سوڵتان زۆری خۆش دەویست و هەر ئەویش کردی بە وەزیری مەلیك ئەفزەلی کوڕی خۆی. ئیبنوئەسیر لە کار و باری خۆیدا زۆر سەربەست و کارامە بوو؛ وەزیرایەتی حکوومەتی دیمشقی بەڕێوە برد هەتا مەلیك ئەفزەڵیان لە شام دەرکرد. ئیبنوئەسیری وەزیر زۆر ئەترسا کەتنێکی پێ بکەن و گەڕێکی تێ هاڵێنن؛ لە شاری دیمشقدا خۆی حەشار داو کەس نەیدەدیت و لە ئەنجامدا یەکێك لە پەردەدارانی مەلیك ئەفزەڵ خستیە ناو سندوقێکەوە گاڵەی داو لە وشتری بارکرد و بردیە میسر. لە میسریش ببووە نایب و وەزیری کوڕی عەزیز[2].

کاتێ مەلیك عادڵ میسری داگیر کرد، ئیبنوئەسیر دیسان توانی خۆی ڕزگار بکا و بەر چەنگی عادڵ نەکەوێ؛ لە میسرەوە خۆی گەیاندەحەڵەب و ماوەیەك لە لای مەلیك زاهێر مایەوە و لەوێشەوە چووە مووسڵ. سەردەمێك لە سنجاریش ڕایبوارد و دوبارە گەڕایەوە مووسڵ. ئیتر هەتا مرد لە مووسڵ بوو. ئەو کتێبانەی کە دایناون و لەوانەوە زانیاری ئەو پیاوەمان بۆ دەردەکەوێ، یەکیان *المثل السائرة* کە دەربارەی نووسەر و شاعێرەوە دانراوە. ئەوەندەی ئامۆژگاری بە نرخ و هێژا تێدا گونجاندووە کە هەموو نووسەر و شاعیرێك زۆری پێداویستی پێیان دەبێ. دوو کتێبی‌تریشی بە ناوی *الوشی للرقوم فی حل المنظوم و المعانی المخترعة فی صناعة الانشاء* نووسیوە. ساڵی ٦٣٧.ك

---

⟵ ڕاست نووسینی بە دوورە. جەمیل

١- ئیبنوخەلەکان، ئەبولعەبباس شەمسەدین ئەحمەد کوڕی ئیبراهیم لە زانا گەورەکان و مێژوونووسەر بەناوبانگەکان بووە. ساڵی ٦٠٨.ك لە شاری هەولێر لە دایك بووە و ساڵی ٦٧١.ك لە دیمشق مردووە. زۆر کتێبی هێژای داناون؛ *وفیات الاعیان و انباء و ابناء والزمانی* مێژوویێکی لە هەمووان بەناوبانگترە. عەونی

خەلەکان لە دۆڵی خەلەکانە و گوندێکی گەورەیە و لە کۆیسنجەقەوە نزیکە. جەمیل

٢- ئەبوومەنسوور عەلی کوڕی مەلیك عەزیز عوسمان. هەژار

(١٢٣٩.ز) شیرازەی ژیانی هەڵوەشاو بەرگی مەرگی پۆشی و لە سەر تاقچەی نەمان لە ڕیزی ڕابردوواندا جێگەی بۆ دیاری کرا. دوو برای لە خۆی گەورەتری هەبووە ناویان عیزەدین عەلی و مەجدەدین ئەبولسەعادت بووە.

## مەلیك عادڵ کوڕی نەجمەدین ئەییوب

یافعی لە تاریخەکەی خۆیدا دەڵێ: مەلیك عادڵ زۆر پیاوێکی کارزان و بە زیپك و زاکون و بەمشوور بووە؛ زۆری خەمخۆری لە بێزۆران کردووە. تەنانەت ژیری و بەبیری بە ئەندازەیەك بووە کە سوڵتان سەلاحەدین بۆ هەموو کاری دژواری پرسووراى پێ کردووە و گرێ پووچکەی کاری ئاڵۆزاوی بە ئامۆژگاری ئەو ڕەها کردووە. هەروەها زۆر دیندار و پارێزگار و لە خواترسیش بووە؛ ڕۆژووی زۆری گرتووە و لە نوێژ و شەونوێژان زۆر خێرا بووە. لە سەردەمی پادشایەتی سوڵتان سەلاحەدیندا لە وڵاتی شام بە سەر عەکا[1] و کەرەك[2] ڕاگەیشتووە.

لە پاش مردنی مەلیك عەزیزی برازای، دەستی بە سەر میسر و شامدا گرت و ئەبوومەنسوور عەلی کوڕی مەلیك عەزیزی ناردەشاری ڕوها[3] و کاروباری ئەوێی پێ سپارد و مەلیك کامل

---

١- عەکا شارێکە لە سەر کەناری دەریای‌سپی ناوەڕاست هەڵکەوتووە و قەڵایەکی کەونارای هەیە کە لە زەمانی خاچپەرستان و لە هێرشی ناپلئۆن و شەڕەکانی ئیبراهیم پاشای میسریدا -ئەو قەڵایە- دەورێکی گەورەی مێژوویی هەبووە. لە دوارۆژیشدا دەوری زۆر گەورەتری دەبێ. زۆر فەرموودەی پێغەمبەر و مژدەی گەورەی دەربارە هەیە. یەکیان ئەو حەدیسە بەناوبانگەیە کە فرموویە: «خۆشی لەو کەسەی عەکای دیت» و فەرمودەدەربارەی «عَیْـنُ‌الْبَقَر» و شتی دیشەوە هەیە کە لێرەدا ناگونجێن. لە کتێبی *یواقیت و الجواهر*دا دەڵێ: حەوت وەزیری مەهدی لە مێرگی عەکا دادەبەزن، هەموویان بە عەرەبی داخێون؛ هتد. عەونی

ئەو حەدیسانە بە زمان پێغەمبەرەوە هەڵبەستراون؛ بڕوانە کۆتایی *سفرالسعادە*ی خاوەنی قاموس.جەمیل

عەکا شاری پیرۆزی بەهاییانە و بۆ ئەوان وەك مەککەی موسوڵمانان وایە. هەژار

٢- قەڵایەك بەو ناوە لە دۆڵی کەرەکدایە. ئاوەڕۆی کەرەك دەڕژێتە دەریاچەی لووت، کە لە ڕۆژهەڵاتی ئۆردۆنە و گەلێکیش شوێنەواری کۆنە قەڵایانی زەمانی خاچپەرستان و هیتری تێدایە. عەونی

٣- شارێکە ئێستا ناوی ئورفایە، ١٩٠ کیلۆمیتر لە دیاربەکری پاتەختی کوردستانی تورکیاوە دوورە و لە باکووری جزیرەیە و لە ڕۆژهەڵاتی فوڕاتە؛ شارێکی کەونارایە و شوێنەواری کلدانیانی زۆر تێدایە. عەونی

محەمەدی کوڕی خۆشی بە سەر میسرەوە دانا؛ کە لەباتی خۆی ئەو پێ ڕابگا. مەلیك موعەزەمی کوڕیشی لە دیمشقدا کردەهەمەکارە و مەلیك ئەشرەف -کە سێهەمین کوڕی بوو- جزیرەی پێ سپارد و مەلیك ئەوحەد ئەییوبی کوڕی چوارەمینی کردەفەرمانڕەوای ئەخلات[1]. ئەوسا بۆ خۆی هات و لە سەر تەختی پادشایەتی میسر پاڵی دایەوە و سێبەری ئاڵای بەرزەباڵی، سەری لە گونبەزی بەرزی کادزی عاسمان دەساوی.

**بەکوشتچوونی موعیز**

لە سەرەتاکانی ساڵی ٥٩٨.ك(١٢٠٢.ز)دا، مانگی ڕەجەب، مەلیك موعیز ئیسماعیل کوڕی سەیفەلئیسلام توغتەگین کوڕی نەجمەدین ئەییوب، -کە پادشای یەمەن بوو- لە شاری زوبەید[2] بە دەستی سەردارانی لەشکری خۆی کوژرا. بۆیەشیان کوشت چونکە ئەو موعیزە پیاوێکی داوێنپیس و هەمیشە سەرخۆش و بێفەر و بەگەڕ بووە. دەستدرێژی بۆ ماڵ و ناموسی ژێردەستانی خۆی کردووە.

هەر ئەو موعیزە لە لای شەرم بووە بڵێ کوردم؛ گوتوویە من لە تۆوی ئەمەویەکانم. لە پاش نەمانی ئەو، مەلیك ناسری کوڕی -کە هێشتا زۆر منداڵ بوو- کرا بە جێنشینی.

یەك لەو زانا بەناوبانگەی کە لەو سەردەمەدا ژیاون ئەبولغەنایم موسلیم کوڕی مەحموودی شیرازیە کە کتێبی *عجایب الاسفار و غرائب الاخبار*ی بە ناوی ئەو مەلیك موعیزەوە داناوە.

**مردنی ئەییوب**

مەلیك ئەوحەد ئەییوب کوڕی مەلیك عادڵ -کە فەرمانڕەوای ئەخلات بوو- پیاوێکی زۆر ناپیاو و تووش و چەموش و تووڕە و تۆسن و نەگونجاو بوو؛ ساڵی ٦٠٩.ك (١٢١٢.ز) خوای چارەساز، لە کۆڵ کلۆڵ و بێچارانی کردەوە و بۆ خۆی بردەوە. ئەخلاتیش خرایە سەر جزیرە و درایە دەست مەلیك ئەشرەف.

---

١- ئەخلات شار و قەڵایەکی قایمە لە وڵاتی بدلیس و باکووری ڕۆژاوای دەریاچەی وانە، لە کوردستانی باکووری و دانیشتوانی لە چوارهەزار تێناپەڕن. عەونی

٢- شارێ بەوناوە لە یەمەنە،کەوتۆتە باشووری ڕۆژهەڵاتی بەندەری حودەیدە و گەلێك زانای گەورە لەو زوبەیدەوە پەیدا بوون. عەونی

## مەسعوود

ساڵی ٦١٢ی.ک (١٢١٥.ز) مەلیک عادڵ نەوەیەکی خۆی بە ناوی مەسعوود کوڕی مەلیک کامیل ناردەیەمەن کە لەوێ پادشایەتی بکا. کاتێ مەسعوود گەیشتە سنووری یەمەن، هەموو کەیخودا و پیاوماقوڵانی یەمەن هاتنە پێشوازی و بە خۆشی و شادییەوە لە سەر تەختی یەمەنیان دانا.

ساڵی ٦١٥.ک (١٢١٨.ز) مەلیک عادڵ دڵی لە ئاو و گڵی جیهان گۆڕی و باروبنەی یەکجاری بەرەو گۆڕ تێک نا و بۆ هەمیشە چاوی لێک نا.

پازدەکوڕی لە پاش بەجێ مان؛ پێنج لەوانە لە ڕووی ئەم جیهانەدا ئەستێرەی هاتیان لە عاسمانی کامەرانیدا درەوشایەوە و لە سەر تەختی پادشایەتی پاڵیاندایەوە. ئەو پێنجانە کامیل و موعەززەم و ئەشرەف و ساڵح و شەهابەدین غازی بوون.

## مەلیک ئەشرەفمووسا کوڕی مەلیک عادڵ

مەلیک ئەشرەف -کە بە منداڵی ناوی مووسا بووە- لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی بابیدا ڕوها (ئورفا)ی دراوەتێ و حەرانیشی بۆ خراوەتە سەر و کە مەلیک ئەوحەدیش مردووە، ئەخلاتیش بەو گەیشتووە.

مەلیک موعەززەم شەرەفەدین عیسا، کوڕی مەلیک عادڵ -کە پاشای دیمشق بوو- ساڵی ٦٢٥.ک (١٢٢٧.ز) لە دنیا کۆچی کرد. داودی کوڕی -کە نازناوی مەلیک ناسر بوو- جێگەی گرتەوە و بوو بە پادشای شام. ساڵی ٦٢٦.ک (٢٢٨.ز) مەلیک کامیل کوڕی مەلیک عادڵ لە میسرەوە لەشکری هێنا سەر دیمشق کە داگیری بکات. مەلیک ئەشرەفیش دەگەڵ مەلیک کامیلی برایدا پێک هاتن کە بۆ داگیرکردنی دیمشق هاوکاری بکەن. مەلێک ناسرداود -کە جێنشینی باوکی خۆی بوو- بەربەرەکانی مامەکانی بۆ نەکرا و لە ڕووی ناچارییەوە داوای پێک هاتن و شەڕ داکوژانی کرد. لە پاش وتووێژ و نامە و ڕاسپاردەگۆڕینەوەی زۆر، بڕیار لە سەر ئەوە درا مەلیک ناسر دیمشق بەجێ بێڵێ و لە باتیان قەڵای شوبەک[1] و نابلس و کەرەک وەرگرێ. مەلیک ئەشرەف دیمشقی دەس کەوی و حەڕران

---

١- ئێستا کاولە قەڵایەکە لە نێوان عەمان و دەریای سوور دایە و سەر بە ئوردونە. عەونی



و ئورفە و ڕەققە[1] و ڕەئسولعەین[2] ببنە بەشی مەلیك كامیل. لە پاش ئەو بەشینەوەیە، مەلیك كامیل هاتەوە میسر.

مەلیك ئەشرەف لە دیمشقدا لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی جێگیر بوو؛ لە ڕاستیدا خێر و بێرێك بوو خودای گەورە بۆ داماوان و لێقەوماوانی ناردبوو. تا خوا حەز كا دلۆڤان و دڵنەرم و بەكار و كارزان و خوێنگەرم و بەمشوور و ڕێكوپێك و بەداهودەستوور و دەستپاك و ئاكارچاك و لە بەدفەڕی بە دوور بوو. هەموو خەڵكی شام شەو و ڕۆژ بۆی دەست وەدوعا بوون، كە ئەو پادشاخاوەن داد و ئەو بەهرەی خودادادەیان لێ نەستێنێ. سەرداران و سەربازانی لەشكری، ئەو ساتەیان لە خودا دەویست كە فەرمانیان بۆ دەركا و خوێنی خۆیانی بۆ بەخت كەن و كۆسپی سەر ڕێگەی تەخت كەن. خوێندەواری زۆر خۆشدەویست و پەرەی زۆری بە خوێندن دا. گەلێك فێرگە و زانكۆی گرینگ و پڕبایەخی بنیات نان و مامۆستای هێژای بەسەرەوە دانان. زانكۆیەكی بە ناوی دارالحدیث بۆ زانای بەناوودەنگ شێخ ئەبووعەمر[3] -كە بە ئیبنوسەلاحی شارەزووری بەناوبانگە- كردووە؛ كە دەرسی فەرموودەكانی پێغەمبەری تێدا بڵێتەوە.

مەلیك ئەشرەف ساڵی٥٧٠.ك (١١٧٤.ز) هاتۆتە دنیاوە[4] و ساڵی ٦٣٥.ك (١٢٣٧.ز) لە تەختایی گۆڕدا جێگەی گرت و گیانی پاكی بە خودای تاك سپارد. سەركردەكانی سوپایی و كاربەدەستانی سەراوپەردەی شایی و هەموو گەورەپیاوانی شار و زانا و پێشەوایانی ئایینی، لە ناشتنی تەرمەكەیدا بەشدار بوون و لە قەڵای دیمشقدا ئەسپاردەی گڵیان كرد و لە پاش ماوەیەك تەرمی پیرۆزی گوێزرایەوە بۆ ناو كۆشكێكی خۆی كە لە نزیك مزگەوتی گەورەی باژێڕدا دروستی كردبوو؛ لەوێ وەشێرایەوە.

---

١- شارێكە لە سووریا لە سەر چەمی فوراتە و كەوتۆتە نێوان حەڵەب و دێرزۆر. عەونی

٢- شارێكە لە جزیرە و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئورفایە. عەونی

٣- ئەبووعەمرعوسمان كوڕی عەبدوڕڕەحمان لە زانا بەناوبانگەكانی شافیعیە. ساڵی ٥٧٧.ك لە شارەزوور هاتۆتە دنیاوە و ساڵی ٦٤٣.ك مردووە. زۆر كتێبی بەنرخی لە زمان و ئەدەبدا نووسیوە. عەونی

٤- *مشاهیر الاكرادی* ئەمینزەكی دەڵێ: ساڵی ٥٧٨.ك (١١٨٢.ز) لە دایك بووە. جەمیل

## مەلیك كامیل‌مـحەمەد كوڕی مەلیك عادل[1]

مەلیك كامیل پادشایەك بوو لە ڕۆژگاری خۆیدا لە هەموو پادشایان ناوبـەدەرەوەتر و لـە دنیـاداری و چاكەكاری و بەگۆداچـوونی زۆرداریـدا، لـە هـەموو خونكـاران لـە سـەرەوەتر بـوو. مـەرد و ڕەنـد و خێرەومەند و چاوتێر و دلاوا بوو. ژیر و وریا، پیتۆل و زۆرزان و دانا بوو. لە مەیدانی شەڕدا لـە ڕووی هەزار سوار ڕووی وەرنەدەگەڕا و بۆ دینداری و خوداپەرستیش ناوبانگی بە دنیادا دەگەڕا.

ئەوەندەی لە ڕاست دوژمنان ئازا و بەزراو بوو، سەد ئەوەندەلە خودا دەترسا و لە فەرمانی بە مـوو لای نەدەدا. لە ناوی شەو پارێزی دەكرد و لە ناڕەوا بێزی دەهاتەوە. هـەموو شـەوانی هـەینی پیـر و پیاوچاكی لە خۆ كۆ دەكرنەوە و بە باسی خواناسی و پرس و ڕای خواپەرستانە ڕایدەبوارد.

لە ڕۆژگاری پادشایەتی خۆیدا حەدیسگەیەكی خۆشنوما و بـەرفرەوانی لـە قاهیـرەی «مُعـزّز»ی دروست كردووە و گومبەزێكی زۆر بەرز و تەرزیشی بە سەر گلكۆی ئیمام شافعیەوە بەرز كردۆتەوە.

مەلیك كامیل لە ڕۆژگاری باوكیدا ببووە دەستی ڕاستی بابی و سەرە و بەرە پێدانی دیوانی میـسر بەو سپێرا بوو. لە پاش ئەوە كە سالّی ٦١٥.ك (١٢١٨.ز)[2] باوكی كۆچی دوایی كرد، مەلیك كامیـل جێگەی گرتەوە و زۆر زوو هێزوپێزێكی وای پەیدا كرد كـە تـوانی لـە ماوەیـەكی زۆر كەمـدا خـاكی حیجاز و یەمەن و شامیش بـخاتە ژێر سێبەری ئالای خۆیەوە و بەو هۆیەوە، لە هەموو مزگەوتـەكانی هەموو ئـەو مەڵبەندەئیـسلامیانەدا خودبـەی هـەینی و جێـژنان بـەنـاوی ئـەو پادشـاخاوەن شـكۆیە دەخوێنرایەوە و لە سەر بەرزەكی مزگەوتان وایان پیّ هەڵـدەگوت: خـاوەنی مەككـە بـە عوبەیـدەوە و یەمەن بە زوبەیدەوە و میسر بە سەعیدەوە، سەرداری شام بە پاڵەوانیەوە و جزیرە بـە منالانیـەوە؛ بـۆ هەردووك ڕووگە سوڵتانە و خاوەنی هەردووك نیشانە. خزمەتكاری هەردووك شـوێنە پیـرۆزەكانە. بـۆ دین یاریدەر و یاری جێنشینی پێغەمبەر (مەلیك كامیل) خوا ڕاوەستاوی كات؛ ئامیـن.

مەلیك كامیل ئێوارەی ڕۆژی چوارشەمـمە بیستویەكەمی ڕەجـەبی سـالّی ٦٣٥.ك (٨ی مـارس

---

١- مەلیك كامیل‌ئەبولـمەعالی ناسرەدین‌مـحەمەد، كوڕی مەلیك عادل‌سەیفەدین ئەبوبەكرمـحەمەد، كوڕی ئەمیـر نەجمەدین‌ئەیوب، مانگی مەولوودی سالّی ٥٦٧.ك (١١٨٠.ز) هاتە دنیاوە و لە شەڕی خاچپەرسـتاندا ئەوەنـدەئازا و بەكار بووە كە ڕیكاردوسی پادشای ئینگلیس نازناوی شێڤالیەی داوەتیّ. جەمیل

٢- لە چاپەكەی ڕووسیادا وا نووسراوە بەڵام لە دوو نوسخەی خەتی‌تردا شەشسەد و پێنجە. عەونی

١٢٣٨.ز) لە قەڵای دیمشقدا دەستی لە ژیان بەردا و زۆر بە ڕووسووری، ڕووی کردەبارەگای خودای خۆی. واتا لە تەمەنی چلساڵیدا جوانەمەرگ بوو.

### باسێك دەربارەی مەرگ و نەمانی پادشایانی میسر و شام

یافعی لە تاریخەکەی خۆیدا دەڵێ: مەلیك مەسعوود یووسف کوڕی مەلیك کامیل کە ساڵی ٦١٢.ك (١٢١٥.ز) لە سەر فەرمانی باپیری لەشکری بردەسەر یەمەن و پادشایەتی یەمەنی دەسکەوت، ئەوسا نیازی خاکی حیجازی کەوتە سەر و ئازانە و بازانە گوڕی بەستەوە و بازێکی سەربازانەی داو هەردەی پیرۆزی حیجازیشی وەك دڵخوازی خۆی خستە دەستەوە. ئەو مەلیك مەسعوودەساڵی ٦٢٦.ك (١٢٢٩.ز) لە مەککەی پیرۆز کۆچی دوایی کرد و لە پێچی ماڵاواییدا ڕایسپارد کەوا کفنودفنی لە ماڵ و دراوی خۆی بۆ نەکەن و تەرمەکەی بدرێتە دەست شێخ سدیق[1] -کە پیر و پیاوچاکێکی بەناوودەنگی ئەو ڕۆژگارە بوو- تا پیری ناوبراو لە جاوی بێخەوش و ڕەوا، کراسی قیامەتی بۆ ببڕێ و وەك هەموو مردووی هەژار و بێ پەنا، بێ هەرا و هوریا و زەنا و بێئەوە هیچ ڕێزی لێ بنرێ، ئاوێتەی ژێر توێی خاك و گڵ بکرێ و لە سەر کێلی گۆڕەکەی بنووسن: «ئەمە گلکۆی هەژاری چاو لە دەستی خودای پەروەردگار، یوسف کوڕی محەمەد کوڕی ئەبووبەکر کوڕی ئەییوبە». شێخ سدێق لە باتی کفن باڵاپۆش و فۆتەیەکی خۆی تێوە پێچا کە زۆری حەج پێوە کردبوون و لە گۆڕستانی ڕەمەکی موسوڵمانانەدا بە خاکی سپارد.

مەلیك کامیل لە مەرگی ئەو جوانەمەرگە ئازیزە، کزەی لە جەرگەوە هات و تەمی خەمی پەژارەی جگەرگۆشەی ئاوارەی، دووری تەنی و دوبارە لە شامدا پرسەی بۆ دانایەوە و شین و شەپۆڕ نوێ کرایەوە.

ساڵی ٦٣٢.ك (١٢٣٤.ز) سەرکردەی لەشکری مەلیك کامیل (سەواب خادم) -کە لە ئازایەتیدا ببووە نموونەی هەڵکەوتوویی و نەبەردی لە دنیادا و هەموو میرخاس و گەڕناسێك ئیرەی پێ دەبرد- دنیای بەجێهێشت و مرد. ئەو سەوابە سەد پیاوی وای پێگەیاندن کە زۆر لەوانە لە دواڕۆژدا بە

---

١- شێخ سدیق کوڕی بەدری، کوردی هەولێری لە مەککە دەژیا. جەمیل

پلەوپایەی زۆر بەرزوبالا گەیشتن.

هەر لە ساڵی ٦٣٢.ك (١٢٣٤.ز)دا مەلیك زاهیر کوڕی سوڵتان سەلاحەدین -کە ناوی داود بوو، نازناوی ئەبووسولەیمانیشیان بۆ خستبووە سەر- لە قەڵای بیرە[1]ی پاتەختیەوە گوێزرایەوە بۆ گۆڕستان و برازایەکی خۆی -کە ناوی مەلیك عەزیز کوڕی مەلیك زاهیر بوو- کرا بە جێنشینی.

ساڵی ٦٣٣.ك (١٢٣٥.ز) مەلیك موحسین کوڕی سەلاحەدین پەردەی لای ژیانی دادایەوە و بەرەو نەبوونی بادایەوە. ئەو مەلیك موحسینە زانایەکی هەڵکەوتوو بووە و بە تایبەتی لەمەڕ فەرمایشاتی پێغەمبەری خواوە وەك دەریایەکی بێپەی وا بووە و لە هەموو ڕێوشوێنی ئایینیدا زۆر شارەزا بووە؛ دوورە دنیا و لە خوا نزیك و بێ فیز و ئارام و پارێزگار و بێئازار بووە.

ساڵی ٦٣٥.ك (١٢٣٧.ز) مەلیکئەشرەفی پادشای شام، ڕۆژی لە سەر دنیا نەما و چووە بەر بارەگای بەزەوی خودا و مەلیك سالحئیسماعیلی برای کرا بە جێنشین و لە سەر تەختی دیمشقی بە چوارمشقی دانیشت.

مەلیك کامیل کوڕی مەلیك عادڵ لە میسرەوە بە لەشکرەوە و هاتە ویزەی ئەو مەلیك سالحە و شاری دیمشقی دەورەدا. مەلیك سالح لە شاردا سەنگەربەندی کرد و ماتەی هەڵگرت و ماوەیەکیش بەربەرەکانی هێرشبەرەکانی کرد؛ بەڵام لە ئەنجامدا ناچار بوو لە پاش وتووێژێکی ڕواڵەتی و بە مەرجی کەم و زیانی زۆر، مل بدا و وڵاتی خۆی بە کامیل بدا و مەلیك کامیلی مام بوو بە پادشای شام و وەك دەپێشداشی لێ دواین، پادشایەکی زۆر کامرەوا و بەدادودەستوور و بەمشوور بوو؛ بەڵام هەر لە پاش دوو مانگ پادشایەتی شام کردن، مردن هاتە جەستەی و دەوری شاری لەشی گرت و لە پاش بیماریەکی کەم و ئازاریکی زۆر و گیانی پاك و بێتاوانی کردەمیوانی مەڵبەندی نەماوان.

تا دوو ڕۆژان وایان نەکرد ئەو باس و خواسە بڵاو بێتەوە. سێهەم ڕۆژی پێمردنی -کە هەینی بوو- بەر لەوە مەلا بچێتە سەر مینبەر کابرایەك سەر کەوت و بە قەو گوتی: خوایە بەزەت بە مەلیك کامیلدا بێتەوە و سایەی مەلیك عادڵمان لە سەر نەڕەوێتەوە. حەشاماتەکە بە بیستنی ئەم خەبەرە دڵتەزێنە تێکڕا دایانە قوڵپی گریان و بوو بە شین و شەپۆر و لەخۆدان. مەلیك عادڵی جێنشین -کە

---

١- قەڵای بیرەجەگ لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات و ڕۆژاوای شاری ئورفایە. عەونی

لە میسر بوو- هێشتا منداڵ بوو؛ کاروباری دنیاداری پێ هەڵنەدەسووڕا. سەردارانی لەشکر و کاربەدەستانی وڵات وایان بە پەسند زانی کە موزەففەرەدین مەلیک جەوادیونسی برازای مەلیک کامیل بکرێتە سەرپەرشت و بە ناوی مەلیک عادڵەوە فەرمانڕەوایی دیمشق بەڕێوەبەرێ. ئەوسا گۆڕی مەلیک کامیلیان لە پەنا مزگەوتی گەورەوە هەڵکەند و تەرمەکەیان لە قەڵاوە گوێزتەوە و ئەو گۆڕەیان بۆ کردەماڵی یەکجاری.

## پادشاکانی دیکەی ئەو خانەدانەو باسی بڕانەوەیان

یافعی لە تاریخەکەیدا دەڵێ: مەلیک کامیل مرد و مەلیک عادڵی کوڕی لە میسر کرا بە جێنشین و مەلیک جەواد بە ناوی ئەو، بوو بە فەرمانڕەوای دیمشق. ساڵی ٦٣٧.ک (١٢٣٩.ز) پیاوە گەورەکانی میسر هاتبوونە سەر ئەو بیروباوەڕە کە مەلیک عادڵی وا منداڵ بۆ پادشادەست نادا و باش ئەوەیە مەلیک ساڵحئەییوبی برای لەبری ئەو پادشابێ.

ڕۆژێك پەلاماری کۆشکیان داو مەلیک عادڵیان خستە ناو کەژاوە و لە بنکەی فەرمانڕەوایەتیان وەردەرنا. چەکدارێکی زۆر دەوری کەژاوەیان گرت و بردیانە قەڵا و خستیانە زیندانەوە. ئیتر مەلیک ساڵح هیچ لەمپەر و تەگەرەی لەبەر نەما و بەبێ دڵەتەپێ، لە سەر تەختی پادشایەتی جێگیر بوو.

مەلیک ساڵح سەروبەری تەواوی بە کاروباری میسردا. پادشایەکی دادپەروەر و مشوورخۆر بوو. بۆ ئاسوودەیی ژێردەستانی، خۆی زۆر ماندوو دەکرد و بۆ بەختەوەر کردنی کلۆڵان، تەمەنی خۆی بەخت دەکرد. لە هەموو ئاقارێکی میسردا مزگەوت و پەرسگەی بنیات نان و میسری -سەر لەبەر- زۆر ئاوەدان کردەوە.

ئەوسا بە نیازی شام ساندنەوە -بە لەشکری گرانەوە- کەوتە ڕێ و هات و جەوادی لە سەر دیمشق بەرکەنار کرد و لە باتی ئەسکەندریەی پێ سپارد کە پێی ڕابگا. مەلیک ساڵح بۆ ئەوە لە بەرچاوی خەڵك مەلیک جەواد بشکێنێ، خۆی کە سوار بوو سەرپۆشی زینی ئەسپی خۆی پێ هەڵگرت و چەند هەنگاوێك بە پیادەیی وەپێش خۆی دا. بەڵام لە دوایییدا لەو سووکایەتی بەسەر هێنانەی زۆر پەژیوان و شەرمەزار بوو.

مەلیك سالح دوای ئەوەی دیمشقیشی بە یەکجاری بوویە، ڕووی کردەمەڵبەندی غەور و لەوێوە ناردیە شوێن مەلیك سالحئیسماعیل[1]ی مامی -کە فەرمانڕەوای بەعلەبەك بوو- کە بێتە لای و بچێتە بەر فەرمانیەوە. مەلیك سالحئیسماعیل ئامادەنەبوو سەر وەبەر باری برازاکەی خۆی بێنی و بۆ بەربەرەکانی کردنی داوای لە موجاهید[2]ی فەرمانڕەوای حمیس کرد کە دژی ئەو برازایەی کۆمەگی پێ بکا. موجاهید بە دەنگیەوە هات و لەشکری بۆ نارد و ئەویش کە خۆی بە ساز و تەیاری دیت، لەشکری خۆی بە کوێرەڕێیەکی وادا هێنا کە هەتا لەشکر بە ناو شاری شام وەرنەبوون، کەس پێی نەزانی و کاتێ پێیان زانی کار لە کار ترازا و مام، پرزەی برازای بڕی و زۆربەی سەرباز و سەردارانی سوپای شام لە پادشای خۆیان تەکینەوە و تەکیان دابە تەك مەلیك سالح ئیسماعیلەوە و سالح ئەییوبیان فرۆشت و دڵی سالح ئیسماعیلیان پێ کڕی.

سالح ئەییوب دەیەویست خۆ وشێرێ، بەڵام هێندێك لە پیاوانی مەلیك ناسری خاوەنی کەرەك -کە بۆ کۆمەگی سالح ئیسماعیل هاتبوون- تووشیان بوو بە تووشیەوە و گرتیان و باڵ بەستە بردیان و کردیانە دیاری دەستی خۆیان و بۆ پادشای خۆیان برد. مەلیك ناسر مەلیك سالح ئەییوبی لە قەڵای کەرەکدا خستە گرتووخانەوە[3].

کاتێ مەلیك عادڵی کوڕی مەلیك کامیل زانیەوە کە سالح ئەییوبی برای ئەوەی دەگەڵ کراوە و لە دیمشق وەدەر نراوە، هەلی بە دەرفەت زانی و توانی خۆی لە بەندی میسر ڕزگار بکا و تەختی پادشایەتی میسری وەگیر خۆی خستەوە و پیاویشی ناردەلای مەلیك ناسر و ڕایسپارد کە ئەگەر بێ و سالح ئەییوبی برام بداتە دەست، سەد دیناری خوێنبەها بۆ دەنێرم.[4] مەلیك ناسر بەو پێشنیارە زۆر تووڕە بوو؛ مەلیك سالح ئەییوبی لە بەند ڕزگار کرد و پەیمانیشی دەگەڵ بەست کە بە لەشکری خۆی

---

١- هەر ئەو مەلیك سالح ئیسماعیلی کوڕی مەلیك عادلەیە کە مەلیك کامیل کوڕی عادل لە دیمشقی دەرکرد و براش بوون. مەلیك سالح ئەیوب کوڕی مەلیك کامیل کوڕی عادل برازای سالح ئیسماعیل بوو، کە فەرمانڕەوای بەعلبەك بووە.

٢- موجاهیدشێرکۆ کوڕی ئەسەدەدینشێرکۆ.

٣- مەلیك ناسرداود کوڕی مەلیك موعززەم شەرەفەدین عیسا کوڕی مەلیك عادل کوڕی نەجمەدین ئەیوب. جەمیل

٤- ڕەنگە هەزارێك لەو ناوەدا پەڕیبێ و سەد نەبووبێ و سەدهەزار بووبێ. جەمیل

میسری بۆ بستێنێتەوە و بە گەورەی خۆشی بزانێ.

مەلیك سالّح ئەییوب بە مەلیك ناسر و لەشکریەوە ڕوویان کردەمیسر و هەر ئەوەندەلە سنوورەوە چوونە ژوورەوە، هەموو ئەمیرانی بەرەی کامیلی ئەییوبی میسر -کە عادلّیان دەدزا و سالّحیان دەویست- گوز و گومبەت هەلّیانکوتایە سەر مەلیك عادلّی پادشایان و دەست و لاقیان بەست و لە گۆشەی زیندانیان توند کردەوە و ڕێگەیان بۆ مەلیك سالّح کردەوە و چوون بە پیریەوە و بۆ سەر تەختی پادشایەتی میسریان بردەوە و ئەوسا مەلیك ناسر هاتەوە بۆ قەلّای کەرەك.

سالّی ٦٣٨.ك (١٢٤٠.ز) مەلیك ئیسماعیلی پادشای دیمشق -سا بە هەر نیازێك بووە- قەلّای شقیفی بۆ خاچپەرستان چۆلّ کردووە. لە سەر ئەم کارە ناڕەوایەی، دوو زانای هەرە گەورەی شام (عیززەدین عەبدوسەلام[١] و ئەبوعەمر ئیبنولحاجب[٢]) زۆر بە توندی بەرپەرچیان دایەوە و تووڕەیی خۆیان ئاشکرا کرد. مەلیك سالّح ئیسماعیل لەو بەگژ داچوونەیان زۆری ڕك هەستا و عیززەدینی لە ئیمام جومعەیی خست و دەگەلّ ئیبنوحاجبدا گرتنی و هەردووکی خستە زیندانەوە.

---

١- عیززەدین کوڕی عەبدوسەلامی دیمشقی -کە نازناوی سولّتانی زانایانی دراوەتێ- لە شاگردانی ئامێدی کورد و ئیمامجومعەی دیمشق بووە. کە ئەو کارەساتەی بەسەر هاتووە، لە دواییدا ڕای کردووە و چۆتە میسر و سولّتانی میسر زۆری قەدر گرتووە و کردوویەتە دادپرس و ئیمامجومعەی مزگەوتی عەتیق و لە قاهیرەشدا لە مەدرەسەی سالّحیە دەرسی گوتۆتەوە و لە ڕۆژی دەیەمی جیمادی یەکەمی سالّی ٦٦٠.ك (١٢٦١.ز)، کۆچی دوایی کردووە.

٢- شێخ جەمالەدین ئەبوعەمر عوسمان کوڕی ئەبوبەکر کوڕی یونس کوردی شارەزووری، لە ڕێزمانزانە بەناوبانگەکانی زمانی عەرەبی بووە. سالّی٥٧٠.ك (١١٧٤.ز) لە ئەرستا لە مەلّبەندی سەعیدی میسر لە دایك بووە و لەوێ خوێندنی تەواو کردووە و لە فێرگەی فازلیەدا لە قاهیرە کراوەتە فێرکار و دەرسی گوتۆتەوە و ڕوویان لێ ناوە کە بیکەنە قازی؛حەزی لێ نەکردووە و لە ترسی قازیەتی، لە میسر ڕای کردووە و پەنای بە دیمشق بردووە. دەپێشدا لەسەر شۆپی شافعی ڕۆیشتووە و لە شام ڕچەی مالکی ڕەچاو کردووە و لە مزگەوتی گەورەی دیمشقدا کراوەتە مامۆستا و گەلێك کتێبی زۆر هێژای داناون و لەوانە ئامیلکەیەکە بۆ برەو پێدانی مەزهەبی مالکی، *شافیە* لە سەرف و *کافیە* لە نەحودا بە شەرحەوە ئەو نووسیونی و *شرح المفصل* و *مختصر المنتهی* لە اصولی فقه و گەلێك شتی‌تریش هەر بەرهەمی ئەوە. لە پاشان کەوتە ئەسکەندەریەوە و ڕۆژی پێنجشەممە بیستوشەشی شەشەکانی سالّی ٦٤٦.ك (١٢٤٨.ز)، لە تەمەنی ٤٦ سالّیدا مردووە و لە دەری بابولبەحر لە گۆڕستانی سالّح کوڕی ئەبووشامە نێژراوە.

باوکی ئیبنوحاجب بەرلەوە بێتە میسر، پەردەداری ئەمیر عیزەدین سەلاحی کورد بووە و لە شاری سند (زاخۆ) لە لای ئامێدیەوە ژیاوە و لەبەر ئەو پەردەداریەی باوکی ناوی ئیبنوحاجبی بەسەردا براوە. جەمیل

ساڵی ٦٤١.ك (١٢٤٣.ز) ئەو مەلیك جەوادە-كە لە پاش مەرگی مەلیك كامیل چەند رۆژێك فەرمانڕەوای دیمشق بوو- لە دنیا دەرچوو.

ساڵی ٦٤٥.ك (١٢٤٧.ز) مەلیك عادڵ كوڕی مەلیك كامیل لە زینداندا مەرگی فریاكەوت و ڕزگاری كرد[1]. كوڕێكی لە پاش بەجێ‌ما ناوی «مەلیك موغیس عومەر» بوو؛ كە بابەكەی مرد، ئەویشیان خستە زیندانەوە. لە سەر ئەو كارە چەند جارێك شەڕ و كێشە لە نێوان مەلیك ساڵح ئیسماعیلی پادشای دیمشق و مەلیك ساڵح ئەییوبی میسر و مەلیك ناسری كەرەكدا ڕوویدا و بەشی زۆریش هەر مەلیك ساڵح ئیسماعیل تێدەشكا. سەرەڕای ئەوەیش قاتی و گرانی و پەتای چاوقووڵكە بە شامیان وەربوون و زۆریان قڕ كردن و هێز و پێزێكیان پێوە نەهێشتن.

ساڵی ٦٤٧.ك (١٢٤٩.ز) مەلیك ساڵح ئەییوبی پادشای میسر لە شاری میسر وشكاوی ژیانی هات. قەتایا ناو -كە كوێلەی مەلیك ساڵحی خوالێخۆشبوو بوو- دەگەڵ سەرداران و ئەمیرانی میسردا بڕیاریاندا كە هەتا جێنشینی بۆ دادەنێن باسی مەرگی مەلیك ساڵح لە لای كەس نەدركێنن.

مەلیك ساڵح كوڕێكی بوو بە ناوی مەلیك موعەززەم[2] و لەو سەردەمەدا لە وڵاتی شام دەژیا. هەتا پیاویان نارد و مەلیك موعەززەمیان پەیدا كرد و هێنایانەوە میسر، سێ مانگی پێچوو؛ بەڵام هێشتا كەس بە مەرگی مەلیك ساڵحی نەزانیبوو، كە جێنشین پەیدا بوو. ئەوسا نەمانی پادشای پێشوو ڕاگەیەندرا و پادشای نوێی لە جێگە داندرا و مینبەر و زێڕ و زێوی دراو بە ناوی مەلیك موعەززەم ڕازێنرایەوە.

ساڵی ٦٤٧.ك (١٢٥٠.ز) لەشكرێكی زۆر گران و پڕچەكی خاچپەرستان هێرشیان هێنایە سەر میسر[3]. مەلیك موعەززەم بۆیان دەركەوت و لە شاری مەنسوورە پێشایی ئەو لێشاوەی گرت و بەرەنگاریان بوو. شەڕ و كوشتارێك كرا كە هەتا دنیا دنیایە و زەوی لە سەرپەرشتی گایە لە هەموو

---

١- لە ڕووپەڕ ١٦٩ی *اخبارالدول* دادەڵێ: مەلیك ساڵح [نەجمەدین ] ئەییوب نیازی وابوو بەرەو شام بچێ. دەترسا لەو بەینەدا عادلی برای، گێچەڵێك بكا. ویستی بینێرێتە قەڵای شوبەك؛ بەڵام عادل ملی ندا كە دەركەوێ. ساڵح هێندێك كۆیلەی خۆی ناردن لە زینداندا خنكاندیان و بڵاویان كردەوە كە بە مردنی خۆی مردووە. جەمیل

٢- مەلیك موعەزەم، تورانشایان پێ گوتووە. جەمیل

٣- سانتلویس (سانلویی) ئیمپراتووری فەڕانسە سوپاسالاری ئەو هێرشە بووە. جەمیل



کۆڕ و دیوەخانان، خۆشخوانان بە بەیت و چیرۆکوانان بە داستانی بگێڕنەوە. لەو ڕۆژەدا خوڕینی خونکاران و گوڕینی سەرداران و هەڕەشەی چەکداران و خرمەی سواران و گرمەی تەپڵ و دەوالان و شەقەی شووران و ورەقەی مەتالان و تەقەی تەوران و کۆڕەکۆڕی کەحێلان و زۆڕەزۆڕی زامداران و بۆڕەبۆڕی ترسەنۆك و بێباران، دەنگی هەوری بەهارانی وەبن خۆ دەدا. سنگ و بەری نەیاران بە دەردی کۆتەرەداران چوویوون؛ کە شۆڕەسوورانی کوردی ئەیبووبی، ڕمی حەیزەرانی سەر بە جۆلانی خۆیان پێی دەئەزموون و نێزەیان بێبەزەیی وەك جلیتی ڕۆژی شایی بە سەردا دەکوتان.

لەشکری مەلیك موعەززەمی ئەییووبی لەو شەڕی فەرەنگەدا نموونەی گەڕناسی و نەبەردی بێوێنەی بە خەڵکی جیهان ڕاگەیاند و لەو جەنگەدا لەشکری خاچپەرستانی وا شکاند و ئابڕووی وا تکاند کە هیچ ئافەریدەیەك لە دنیادا خۆزگەی پێ نەخوازێ. لە کۆڕی شەڕ و لە شەڕگەدا حەوت هەزار کەلەشی خاچپەرستان لە گۆڕێ بەجێمان و پاشان ئەو لاشانە گەنین و بوونە بژیوی خەرتەل و دالاشان. پادشای گەورەی خاچپەرستان دیل کرا و دەست و قاچی بەسترا و پەسترایە گۆشەی بەندیخانەوە و لەوێشدا بە کۆت و پێوەند ئەتەك درا[1].

مەلیك موعەززەم لە پاش ئەو سەرکەوتنە فیز و هەوای پەیدا کردبوو؛ ڕەفتاری دەگەڵ کۆیلەکانی بابیدا زۆر خراپ ببوو. ئەوەندەی زۆر بۆ هێنان کە ئەوانیش لە دژی ئەو یەکتریان گرت و لە نەکاو ڕۆژێك لێی ڕاپەڕین و گرتیان و کوشتیان و عیززەدین تورکمانی[2] -کە یەکێك بوو لە خۆیان- کردیانە سەرداری خۆیان و لە مەنسوورەوە بە لەشکرەوە هاتن و قاهیرەی «مُعزّز»یان دەست بەسەردا گرت. پادشادیلەکەی خاچپەرستانیش پێنجسەدهەزار دینار و شاری دمیاتی دانێ و خۆی لێ کڕینەوە و ڕزگار کرا[3].

---

١- زیانی سەلیبیان لەو شەڕەدا سەدهەزار کوژراو بوو. جەمیل

٢- مەلیك موعیز، عیزەدین ئایبەگ (ئاغابەگ)، مێردی شەجەرەتوددوڕی ئەییوبی، لە ساڵی ٦٥٣.ك (١٢٥٥.ز)دا خۆی کردەپادشای میسر و حەوت ساڵان حوکمێکی سەربەخۆی کرد و میراتگرانی لە دوای ئەو بە چینی کۆیلە (تەبەقەی مەمالیك) ناو براون. جەمیل

٣- ئەمینزەکیدەڵێ: سانلویی بە هەشتسەدهەزار دینار خۆی کڕیوەتەوە و شاری دمیاتیشی داوەتەوە بە موسوڵمانان. جەمیل

هەر لەو ساڵەدا مەلیك ناسر -حاكمی كەرەك- لەشكری بردەسەر دیمەشق و زۆر بە هاسانی گرتی. ئەوسا زۆر باش بە خۆدا هات و لەشكرێكی ساز و پڕچەكی سازدا و ڕووی كردەمیسر و هاتە گیانی كۆیلەكان؛ بۆ لە میسر وەدەرنانیان. لەشكری میسر بە سەركردەیی كۆیلەكان لە عەبباسیە هاتنە بەرابی و شەڕێكی زۆر خەست و خوێناوی لەو ناوەدا قەوما. لە ئەنجامدا لەشكری میسر شكا و لەشكری ناسر بە سەركەوتوویی هاتە ناو شاری قاهیرە و ئاڵای دەوڵەتی ئەییوبی دیسان لە سەر میسر شەكایەوە و لە سەر بەرزەكی مزگەوتان، خودبە بە ناوی مەلیك ناسر خوێندرایەوە.

عیززەدین توركمانی و قەتایا دەگەڵ سێسەد كۆیلەی هەڵبژاردەو زۆر ئازا لە كۆیلەكانی مەلیك سالح، لە دەست ناسر هەڵاتن و بەرەو شام ڕۆیشتن. لە ڕێگەدا تووشی كاروانێكی سوپایی مەلیك ناسر هاتن؛ كە چەك و جبەخانە و گەنجینە و تەپڵ و ئاڵا و كەلوپەلی‌تریان بۆ میسر دەهێنا. عیززەدین و قەتایا بەو سێسەد كەسەوە بەسەر كاروانیان دادا و هەر ئەوەندەی بڵێی یەك و دوو لە بەریەكیان هەڵوەشاندن و شیر و ڕمبیان تێنان. شەمسەدین لۆلۆ -كە سەرقافڵە بوو- كەوتە بەردەستیان و وەك مەڕی ئاوەكی گۆش تا بە گۆش سەریان بڕی. تەپڵی مەلیك ناسریان ورد و خاش كرد و گەنج و داراییەكەیان هەموو بە تاڵان برد. لەوێشەوە هێرشیان بردەسەر غەززە و گرتیان و كوڕی سەلاحەدین‌ئەییوبی و مەلیك ئەشرەف‌مووسا كوڕی عادل[1] فەرمانڕەوای حەمیس و مەلیك سالح‌ئیسماعیل -كە لە پێشدا هێندێكی دەربارە دواوین- دەگەڵ گەلێك لە سەرناسان و ئەمیرانی ئەییووبیان بە دیل گرتن و هەموویان یەكجێ كوشتن و ئاسەواریان بڕینەوە.

كاتێ هەواڵ و باسی ئەو كارەساتە جەرگبڕە بە مەلیك ناسر گەیشتەوە، زانی كار لە كار ترازاوە و تازە مانەوەی لە میسردا هیچ تامی تێدا نەماوە. ناچار بە یەكجاری سێ بەردەی ئاپە مشت بووكی پادشایەتی بە تەختوتاجی میسر و تەڵاقێكی وایدا بە هێچ شێخ و مەلایەك چیا نەبێتەوە و میسری بەجێهێشت و سەری خۆی هەڵگرت و بەرەو شام قاچاندی.[2]

---

١- زێرنۆف پرسەك(؟)ی لە سەر داناوە. ڕەنگە لە بەر هەڵەی ناوەكە بێ؛ چونكە مووسا كوڕی عادل هەرگیزحیمسی بە دەستەوە نەبووە. تەنیا بە سەر میسر ڕاگەیشتووە و ئەمەش زۆر لە دوای ئەوە بووە و ڕاستەكەی ئەشرەف موزەفەرەدین مووسا كوڕی مەنسوورە كە لە نێوان ساڵانی٦٤٤.ك (١٢٤٥.ز)و٦٦١.ك(١٢٦٢.ز)پادشای حیمسێ بووە.

٢- لە *تاریخی دوەل و ئیماراتی كوردی*دا دەڵێ: ساڵی ٦٥٢.ك (١٢٥٤.ز) خەلیفەی بەغدا دەستی تێخست و ←



ساڵی ٦٤٩.ك(١٢٥١.ز) تەواشی -کە لە لایەن مەلیك ناسرەوە دژداری کەرەك بووە- هەستا سەربەخۆ مەلیك موغیسعومەر کوڕی مەلیك عادڵ کوڕی مەلیك کامیلی لە بەندیخانە دەرێنا و کردیە فەرمانڕەوای کەرەك. دەڵێن دەستی هەنگویناوی بسخەیە زاری سپڵەوە دەیگەزێ؛ ئەویش پارسەنگی چاکەی نان بدەی خۆی ئاوا خراپە دایەوە.

ساڵی ٦٥١.ك (١٢٥٣.ز) مەلیك سەلاحەدین کوڕی مەلیك زاهیر کوڕی سەلاحەدین کوڕی نەجمەدینئەییووب، ڕۆژی لە سەر دنیا نەما و پەنای بە گۆڕستان برد.

ساڵی٦٥٢.ك[1] (١٢٥٤.ز) ئەمیران و کەیخودایانی میسر، عیززەدینتورکمانیان کردەپادشای خۆیان و نازناوی مەلیك موعیززیان دایە. ئەو موعیززە -وەك گوتمان- لە کۆیلەکانی مەلیك ساڵح بوو. ئیتر لەو ڕۆژەوە پادشایەتی میسر کەوتە دەست کۆیلانەوە و خانەدانی ئەییووبی سێبەری لە سەر میسر ڕەوی و بۆ یەکجاری ناویان لە ڕووپەڕی پادشایەتی میسر کوژایەوە. جا چونکە هێندێك لەو کۆیلانەی بەرەی ئەییووبیان، دەگەڵ پادشایانی عوسمانیدا هاوچەرخ بوون، لە بڕانەوەدا -کە باسی ئەو پادشاخاوەن شکۆیانە دەکەم- بەرەبەرە ئەگەر خوا حەز کا، لەوانیشەوە دەدوێم.

مەلیك ناسرداود کوڕی موعەززەم کوڕی عادڵ، لە ترسی عیززەدینتورکمانی ئۆقرە و ئامانی لێ هەڵگیرابوو. بە دەربەدەری و خاکەسەری هەر ڕۆژە لە جێیەك و هەر شەوە لە دێیەك ڕایدەبوارد. ساڵی ٦٥٦.ك (١٢٥٨.ز) بە هەناسە ساردی سەری نایەوە و لە گۆڕی تەنگەبەردا بە بێترس حەسایەوە.

ئەو مەلیك ناسرە زیرەك و خۆشمرخ بووە. ماوەیەك دەرسی خوێندووە و لای مۆئەیەدیتووسی گوێی بۆ حەدیس ڕاداشتووە. شێعری زۆر باش دەهۆندەوە و مانای زۆر تەڕوناسکی بە بیر و مێشکدا تێدەپەڕی.

ساڵی ٦٦٢.ك (١٢٦٥.ز) کۆیلەکانی میسر هاتنە سەر کەرەك و دەوریاندا. مەلیك موغیس کوڕی عادڵ سەنگەربەندی خۆی کرد و ماوەیەك شەڕی کرد. بەڵام دوژمن برستی لێ بڕی و مەلیك

---

← ناسر و عیززەدینی ئاشت کردەوە. جەمیل

١- ئەمینزەکی دەڵێ: ساڵی ٦٥٣ك بووە. جەمیل

موغیس بە هێرشکەرانی گوت: ئەگەر نەمکوژن خۆمتان بە دەستەوە دەدەم. بەڵێنیان پێدا و هاتە دەر و ناردیانە لای پادشای میسر و ئیتر سەری تێدا چوو. لە پاش مەلیك موغیس، تازە لە نەتەوەی نەجمەدین‌ئەییووب کەس سەری بە پادشایی نەگەیشتەوە.

خودا بە نیازی خۆی دەکا و چۆنی دەکا و چۆنی گەرەك بێ، فەرمانی ڕەوایە.

# ڕووپەڕی دووەم

فەرمانڕەوایانی سەربڵند و پایەبەرزی کوردستان، کە هەر چەندەخۆشیان بە پادشا ناو نەناوە و دەریان نەبڕیوە کە کوردستانی بەردەستیان دەوڵەتێکی سەربەخۆیە؛ بەڵام زۆر بە سەربەستی ژیاون و زۆریان -زۆرجار- خودبەیان بە ناو خوێندراوە و بەر و پشتی دراویان وێنەی خۆیانی لێدراوە.

باسی ئەوانە لە پێنج بەنداندا کراوە.

## بەندی یەکەم
## فەرمانڕەوایانی ئەردەڵان

بەئاگایان لە کەونە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایانی کوردستان و شوێنهەلگرانی شوێنەواری ئەتابیکانی لوڕستان، بنچینەی فەرمانڕەوایی ئەردەڵانی دەگێڕنەوە سەر ڕەسەنی خونکارانی دیاربەکر؛ کە ئەوانیش لە نەتەوەی ئەحمەدی کوڕی مەڕوانن[1]؛ کە لەوە پێش لەویش دواین و دەتوانن بۆی بڕوانن.[2]

---

١- لە دوو نوسخەی دەسنووسدا بابەك کوڕی ساسان. عەونی

٢- حکوومەتی دۆستەکی کوردی مەڕوانی لە ئاخر و ئۆخری چەرخی پێنجەمدا بڕاوەتەوە. وەك دەڵێن: بابەئەردەڵان لە وەچی ئەوانە و هیچ دوور نیە کە بابەئەردەڵانی سەر بە مەڕوانیان لە ترسی دەسدرێژی ئیبنوجەهیری وەزیری بەغدایە، سەری خۆی هەڵگرتبێ و کەوتبێتە ناو گۆرانانەوە و لەوێ گیرسابێتەوە و هەڵیدابێتەوە.

مستەرڕیچ دەڵێ: ئەو بابەئەردەڵانە هەر خۆی گۆرانە و لە تیرەی مامۆیی‌یەکانەوە بە هێزی هۆزەکەی، دەسەڵاتی دەست خستووە و ئەمیرایەتی کردووە. ←



بابەئەردەڵان ناوە بۆ پیاوێك كە چەند سەردەم و تاوێك لە ناو هۆزەكانی گۆراندا ژیانی ڕابواردووە؛ لە بەرەودوای دەسەڵاتی چەنگیزیەكاندا دەستی بە سەر شارەزووردا گرتووە و ئەمیرایەتی لێ دامەزراندووە. ئەوسا ناوی بابەئەردەڵانی گۆڕیوە و كردوویە بە قوبادی كوڕی فەیرووزی ساسانی.[1]

بە گفتی حەمدوڵلامستەوفی[2] شارەزوور، واتا شاری هێزوزۆر[3] و هەمیشە فەرمانڕەواكانی كورد بوون و هەر كەسێ كە خاوەن زۆر بوویێ، بێ زۆری پێش خۆی ڕەپێچەك داوە و ڕاوی ناوە و لە جێگاكەی دامەزراوە. ئەویش هەر ئەوەندەی توانیوە بمێنێ تا بە توانایی ماوە و هەرگا داویەتە باری كزی و زەبوونی و بەرەو نەبوونی خزیوە، یەكی زۆرداری بۆ ڕەخسیوە و پرزەی لێ بڕیوە و میرایەتیەكەی گۆڕیوە.

بابەئەردەڵان لەو خاوەن زۆرانە بووە كە زۆریان نەبردووە و بە سەربەستی فەرمانڕەوایی مەڵبەندی شارەزووری كردووە و پیاوێكی ورد و كارزان و بەدەستوبرد بووە و لە ماوەیەكی كەمدا زۆری پەل هاویشتووە و برەوی بە قەڵەمڕەوی خۆی داوە و زۆری پان و پۆر و هەراو كردۆتەوە و هەتا ژیاوە هەر بە خونكاری و سەرداری ماوە و ئەوسا پێمێبردی خودا سەری داوە و دەگەڵ كفنپۆشان بەرەو شاری خامۆشانی ناردووە و هەڵوەدای بیابانی نەمانی كردووە.

---

← ئیسماعیل كوڕی مەلا محەمەدحوسێن، نووسەری *تاریخی ئەردەڵان* دەڵێ: بابەئەردەڵان لە جێی خۆی پەڕیوە بووە و لە مەڵبەندی پاڵەنگان دابەزیوە و لە دواڕۆژدا -لە سۆنگەی مەئمون بەگی كوڕی مونزیری نەوەیەوە- ناوی مامۆییان بەسەردا براوە. جەمیل

١- ڕەنگە لێرەدا كورتەی هێنابێ. ڕاستەكە ئەوەیە ڕایگەیاندووە كە لە وەچەی قوباد كوڕی فەیروزی ساسانیە؛ چونكە ئاشكرایە قوباد بابی نۆشیرەوانی پادشای بەناوبانگی ئێرانەوە بەر لە پێغەمبەر ژیاوە و ساڵی ٥٠٢.ز لە كوردستاندا شەڕی دەگەڵ ڕومانان كردووە. جا كە ئەردەڵانی دەڵێن لە ڕۆژگاری عەباسیشدا حكومەتیان هەر بووە و زۆر لە مێژینەن و پاشماوەی دەوڵەتی ساسانین، نیازیان ئەو مەبەستەیە. جەمیل

٢- حەمدوڵلا مستەوفی قەزوینی خاوەنی مێژووی *نزهةالقلوب و تاریخ گزیده*-كە بە فارسی نووسیوین- ساڵی ٧٤٠.ك (١٢٣٩.ز) مردووە. جەمیل

٣- ئیبنوخەلەكان دەڵێ: زوور كوڕی زەحاك درووستی كردووە. هێندێك مێژوونووس لایان وایە قوباد كوڕی فەیروزی ساسانی بنیاتی ناوە. هەیشە دەڵێن: ناوی سیازوور بووە و ئەو ناوە لە نامەیەكدا كە قەیسەر بۆ كۆڕی پیرانی ڕۆمای ناردووە، بە سیازوور نووسراوە. جەمیل

کاتێ بابانەردەڵان سەرزەمینی بەجێ هێشتووە، کلۆڵی[1] کوڕی لە جێگە دانیشتووە و ئەویش پاش ماوەیەك بەرەو گۆڕخانە لێ نیشتوە و بۆ مەرگستان ڕۆیشتووە. لە دوای ئەوەی کلۆڵیش بە کلۆڵی چۆغەی بێ گرۆڵی ژیانی بە شرۆڵی کەوتە بن گڵەوە، نەوە و نەوەچرکانی -کە بە شوێن یەکدا شوێنی باب و کاڵیان ڕەچاو کردووە- ئەمانەن:

١- خدر کوڕی کلۆڵ ٢- ئەلیاس کوڕی خدر ٣- خدر کوڕی ئەلیاس ٤- حەسەن کوڕی خدر ٥- بابلۆ کوڕی حەسەن[2] ٦- مونزیر کوڕی بابلۆ.[3]

چونکە چۆنیەتی بەسەرهاتی ئەم فەرمانڕەوا ڕابردووانەم باش بۆ دەبناوان نەکرا و لێم ڕوون نەبوو چۆن بوون و چۆن چوون، ناچار چاوم لە ڕاست باسی بەسەرهاتیان نووقاند و هەر ناوەکانیانم ڕاگەیاند. وا لێ براوم هەر دەربارەی ئەو پیاوانەوە بدوێم کە ناویان لە ڕۆژگاراندا کەوتۆتە سەر دەم و زارانەوە و باسی ڕاستی ڕووداوی ژیانیانم لە ئاگادارانی وردەکارەوە بیستووە و بەراوردم کردوون و لە کەوم داون و ئەوی بێ‌زیوان و دارووجان بوون و چروك و قرپۆکیان تێنەچوون -بە دانستە- هەر ئەوانەم هەڵبژاردوون و بە مێژووەکەم سپاردوون. تەنانەت ئەوانەی کە باسم کردوون، هێندێکیان هەر خۆم دیتومن و دواندومن. پەیمانم دەگەڵ بنووسی زمان لووسم بەستووە کە هەر مەبەستی بێگری و لە بار بنویسم و لە وشەی بێ گەشە و سیس، بەبێز و خۆپارێز بم. هەر کەسیش بە دوای ڕاستدا هەڵوەدا بێ، هەرگیز زیانی تووش نابێ.

---

١- میجرلونگریك دەڵێ: کلۆڵ وڵاتی خۆی زیاد کرد و هەولێری گرت و باجی لە دەوروبەری دەستاند. جەمیل

٢- لە تاریخی ئەردەڵاندا بە ناوی باڵوڵ کوڕی مونزیر نووسراوە. جەمیل

٣- *تاریخ الدول و الامارات الکردیه* ج٢، ل٢٧٦ و القرون‌الاربعه‌الاخیره فی‌العراق ڕووپەڕ ٧و٨ دەڵێن: حکوومەتی بابانەردەڵان لە ڕۆژگاری خدری کوڕی کلۆڵ و ئەلیاس کوڕی خدردا زۆر بێ‌کێشە و هەرا مابوو؛ بەڵام حکوومەتی جەلایریەکان لە ڕۆژگاری ئەلیاس کوڕی خدردا دەستی بەسەر بەشی زۆری باکووری ڕۆژئاوای وڵاتی شارەزووردا گرت و ئەگەر وریایی ئەمیر حەسەن کوڕی خدر بەگ نەبوایە، هەموو وڵاتەکە دەکەوتە دەستیانەوە.

لە سەرەتای چەرخی پازدەهەمی زایینی (قەرنی نۆهەمی کۆچی)دا مەئموون بەگ کوڕی مونزیر بەگ کوڕی حەسەن بەگ هاتە سەر کار و ملی نا لە بەربەرەکانێ و بە گۆدا چوونی جەلایریان و زۆر چالاکانە هەرچی گرتبوویان لێی ساندنەوە و قەڵەمڕەوی خۆی گوشاد کردەوە و بۆ جاری دووەم زابی گەورە کرایەوە بە سنووری باکووری وڵاتەکەی و بە هێزێکی زۆر گەورەش ڕەواندزی دابەستبوو. جەمیل

## مەئموون بەگ

کوڕی مونزیر کوڕی بابلۆ کوڕی حەسەن کوڕی خدر کوڕی ئەلیاس کوڕی خدر کوڕی کلۆڵ کوڕی بابائەردەڵان.

مەئموون لەپاش مردنی باوکی، بوو بە فەرمانڕەوای سەربەخۆی شارەزوور و ماوەیەکی دوورودرێژ، زۆر بە باڵادەستی و سەربەستی ژیاوە و کە عەمری خوای بەجێ هێناوە، سێ کوڕی لەپاش بەجێ ماون: بێگە بەگ، سورخاب بەگ، محەمەد بەگ.[1]

## بێگە بەگ

لە پاش مردنی مەئموون بەگ، بێگە بەگ جێگەی گرتەوە. بەڵام چونکە مەئموون بەگ هەر لە ڕۆژگاری ژیانیدا وڵاتەکەی بە سەر کوڕەکانیدا بەش کردبوو، هەر ناوچەکانی زەڵم[2]، تەغەسوو[3]،

---

١- ئەمین‌زەکی لە *تاریخی سولەیمانی و دەوروبەریدا* دەڵێ: مەئمون بەگ لە ساڵی ٨٦٢.ك (١٤٥٧.ز) داتا ساڵی ٩٠٠.ك (١٤٩٤.ز) واتا نزیکەی سی‌وهەشت ساڵ حوکمی کردووە و بە هۆی پسپۆڕی لەمەڕ پێ ڕاگەیشتنەوە، زۆری بەرەو پێداوە و دەوڵەتۆکەکانی هاوساشی، وەك میرنشینەکانی درنە و پێنجوێن -کە لای ئێرانن- و میرنشینەکانی کۆیسنجەق و حەریر و ڕەواندز-کە لەناو دوزێ دان- و میرنشینی عەقرە و عیمادیە و دهۆك و دەوروبەریانی خستە سەر دەوڵەتی خۆیەوە و لەوساوە تا ئەمڕۆش -لە هاوسایەتی عیراقدا- دەوڵەتی وا بەهێز دانەمەزراوە.

لە *تاریخی ئەردەڵان*دا دەڵێ: مەئمون بەگ بەزیندی سەر وڵاتەکەی لە ناو کوڕەکانی دابەش کرد؛ زەڵم و نەوسود و هاوار و دەدان و گوڵعەنبەری دابە بێگە بەگ. دەشتی مەریوان و تەنوورە و کلوکلاش و دەنشکاش بوونە بەشی سورخاب بەگ. سروچك و قەرەداغ و شاربازێر و میهر و سەرپەرشتی کاروباری هۆزەکانی تا عیمادیەی بە محەمەد بەگ ئەسپارد. جەمیل

٢- ئەمین‌زەکی لە *تاریخی سولەیمانی و دەوروبەری*دا، لە باسی تاریخی سنە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: قەڵای زەڵم (ژەڵم) ساڵی ٥٦٤.ك (١١٦٨.ز) بە فەرمانی بابائەردەڵان دروست کراوە و لە شیوی ژەڵم دایە و نۆ کیلۆمیتر لە ناوچەی خورماڵ (خولمار: گوڵعەنبەر) دوورە و ئێستا ناوی قەڵای خانئەحمەدخانە.

ژەڵم بە توێژێکی سووری لیچق دەڵێن کە لەسەر ناوی ڕاوەستاودا دەوەستێ. جەمیل

٣- ڕەنگە نەوسوود بێ کە گوندێکە لە هەورامان و سەر بە هەڵەبجەیە. جەمیل

شمیران[1]، هاوار[2]، سێمان[3]، ڕاودان[4] و گوڵعەنبەر[5]، وەبەر بێگە بەگ کەوتبوون و ئەوی دەماشەوە - وەك لەوە پاشەوە لێی دەدوێم- ببووە بەش براکانی دیکە.

بێگە بەگ چلودوو ساڵی تەواو فەرمانڕەوا بووە. کاتێ ماڵاوایی لە ژیان کردووە و بەرەو مەڵبەندی نەمان چووە، دوو کوڕی لەپاش بەجێ ماوە: ئیسماعیل و مەئموون.

## مەئموون بەگ کوڕی بێگە بەگ[6]

بوو بە جێنشینی باوکی و فەرمانڕەوایی شارەزووری گرتە دەست و ساڵێکی بە سەردا تێپەڕیبوو، سوڵتان سولەیمانی عوسمانی،[7] سوڵتانحوسێن بەگی فەرمانڕەوای عیمادیەی دەگەڵ هێندێك ئاغاوەتی کوردی دیکە ناردەسەر و لە قەڵای زەڵمدا دەورەیان دا. زۆریان کرد و کۆشا، بە شەڕ بۆیان نەگیرا و سوڵتان حوسێن بە ناوی پێکهاتن و ئاشت بوونەوە هاتە پێش و مەئموون بەگی لە قەڵا دەرخست و ناردیە ئاستانە و لەوێ خستیانە بەندیخانەوە.[8] کاتێ سورخابی مامی بەو گیرانەی

---

١- مەڵبەندێکی پڕکەژ و کۆیە و لە باشووری هەڵەبجە و سەرچەمی سیروانە و ئێستاش شوێنەواری قەڵاکەی دیارە و لەو جێگەیە کە چەمی تانجەرۆ و زەڵم دەڕژێنە سیروانەوە. جەمیل

٢- گوندێکە لای هەڵەبجەیە و کاکەیی لێ دەژین. جەمیل

٣- ڕەنگە شێخان بێ لە نزیك نەوسوودەو گۆڕی پیرۆزی سوڵتان ئیسحاقی پیری کاکەیی لێیە. جەمیل

٤- لە تاریخی ئەردەڵاندا «دران» نووسراوە. جەمیل

٥- شارۆکەیەك بووە هەژدەکیلۆمیتر لە هەڵەبجە دوور و ئێستا هەر شوێنەواری ماوە و گوندی خوڵمار لە جێی ئەوێ ئاوەدان کراوەتەوە. جەمیل

٦- لە *تاریخی سولەیمانی*دا ئەمینزەکی لە (گلشنخلفا) دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کاتێ سوڵتان سولەیمانی قانوونی چنگی خستە شارەزوورەوە، بێگە بەگ دیدەنی لێکرد و مەئموونی کوڕی بە بارمتەی دۆستایەتی لە لا دانا و سوڵتان مەئموونی بە والی بەغدا سپارد و هەر ماوەیەك بۆ لایەکیان دەنارد و لە دواییدا کردبوویانە کاربەدەستی حیللە.جەمیل

٧- سولەیمانقانونی کوڕی سوڵتان سەلیم، دەیەم ئیمپەراتۆری عوسمانی، لە ساڵی ٩٢٦.ك دابۆتە سوڵتان و گەلێك جێگای لە ئاسیا و ئەورووپا گرت.

زولفەقارخانی کەڵهوڕ بە ناوی ئەو سولەیمانە بەغدای گرت و ماوەیەکی دەدەستدا مایەوە. جەمیل

٨- ئەمینزەکی دەڵێ: مەئمون بەگ سەر بە سەفەویەکان بوو؛ قەڵەمڕەوی فەرمانی خۆی گوشاد کردەوە و گەیشتە سەر زێی بچووك و هەورامان و شارەزوور و قەرەداغ و دەشتی گەرمیانی داگرت. عوسمانی لێی ترسان و ←

زانی، کێسی لێ هانی و لوی و مشیلە و میهران و تەنوورە و کەولۆس و نشکاش -کە بەشی برازاکەی بوو- داگیـری کردن و خستنیە سەر قەڵەمڕەوی خۆیـەوە و پەناشـی بردەبـەر شاتۆماسـبی سـەفەوی. سوڵتان کە زانی مەئموون بەگ بێتاوانە و بە خۆڕایی گیـراوە، ئازادی کرد و مەڵبەنـدی حیللـەی لـە نزیك بەغدایە پێ سپارد؛ کە داهاتی بـخوا و کەس خۆی تێنەگەیەنێ.[1]

ئێستا کە ساڵی ١٠٠٥.ك یە، حیللە بە دەست مەئموون بەگەوەیە و ماوەیەکە لەوێدا زۆر بە خۆشگوزەرانی و بە بێ نیگەرانی ڕایدەبوێری و حکوومەت دەکا. هەروەها لە دیوانی عوسـمانیەوە سنجەقی سروچکیشیان دابە ئیسماعیل بەگی برای مەئموون بەگ و ماوەیەك بە سەری ڕاگەیشت و لە پاشان بەرەو ئەو دنیا بارووبنەی تێك نا.

## سورخاب کوڕی مەئموون بەگ

وەك باسـمان کرد لە پاش گیـرانی مەئموون بەگی برازای، وڵاتەکەی ئەویشی وەبەر خـۆی داو خستیە سەر قەڵەمڕەوی خۆیەوە. سەرەڕای ئەوەش بەشی مـحەمەد بەگی برا بـچکۆلەشی کردەمـاڵی خـۆی و بەو هۆیەوە لە شارەزوور و زەڵمدا بوو بە فەرمانڕەوای سەربەخۆ.[2]

---

← لەشکری ئینکچاریان هێنا کەرکوك. ساڵی ٩٤٥.ك (١٥٣٨.ز) لەشکریان لێ کۆ کردەوە و زۆربەشی کورد بوون و بە سەرکردایەتی حوسێن پاشای ئامێدی کورد، ناردیانە سەر مەئمون بەگ و پەلاماری شارەزوور و مـەریوان و سـنەیان دا. مەئمون شەڕی دەگەڵ کردن بەڵام دەرۆستیان نەهات و کشایەوە بۆ قەڵای زەڵم و لەوێ دەورەیان داو هێنایانـە دەر و ناردیانە ئاستانە و لەشکری عوسـمانی بەربوونە تاڵان و بڕۆ و ماڵ وێران کردنی خـەڵك. لـە دوایـیـدا حوسـێن پاشـای ئامێدی قەڵای گوڵعەنبەری دروست کرد؛ ئەو قەڵایەی کە سی ساڵ لەوەبەریش هـەر هـەبووە و لـە جێگـەی خورمـاڵی ئێستا بووە. جەمیل

١- بێگومان ئەوە ئەو حیللەیە نیە کە نزیکی بەغدایە و ئیبسنویەتوتە دەڵـێ دیومـە و نیـوەی دانیـشتووانی کـوردن؛ چونکە حیللە و سروچك (بەرزنـجە) هیچ فریان بە سەر یەکەوە نیە و دووریش نیە ئەوە هەڵەبـجە بێ و ناوی گۆڕابێ و ئەو دەمە سەر بە لیوای بەغدا بووبێ. جەمیل

٢- دوای ئەوەی کە خۆی کردووە بە هاوپەیـمانی شاتۆماسب و ئەم کارانەی کرد، سوڵتان سولەیـمانی قانونی زۆری ڕق لێ هەستا و لە داخی ئەو مەئمون بەگی ئازاد کرد و سنجەقی حیللەی دایە و سـمایلی براشی ناردەسەر سروچـك -کـە کێشەی تێ هاڵێنن و بنکۆڵی بکەن- بەڵام ئەوان چیان بۆ دەگەڵ نەکرا. جەمیل

ساڵی ٩٥٦.ك(١٥٤٩.ز) ئەلقاس میرزا[1] برای شاتۆماسب -بە هەوای پادشایەتی ئێران- پەنای بە سوڵتان سولەیمانێ برد. لە پاش ماوەیەك بە هۆی چەند کەمایەسیەکەوە کە لێی ڕوودابوو، لە سوڵتان ترسا بوو.[2] پەنای بە سورخاب بەگ برد، کەلە لای شای برای تکای بۆ بکا و لێی ببوری و وەك پێشوو وڵاتی شیروانی بداتێ و کاری بە سەر کاریەوە نەبێ. سورخاب بەگ بۆ ئەو کەیخودایەتی کردنە هاتە لای شاتۆماسب. شاتەمەی بە سەرکەوتنێکی زۆر گرینگ زانی و شانیعمەتوڵڵای قەهستانی دەگەڵ سورخاب نارد کە بچن و ئەلقاس میرزای بۆ بێننەوە. شانیعمەتوڵڵا و چەند پیاوماقووڵێك هاتن ئەلقاسیان بردەوە لای شاو شاش دەست بەجێ فەرمانیدا ئەلقاسیان کۆت و پێوەند کرد و لە قەڵای قەهقەهەدا بەندیان کرد و دوای ساڵێك لە سەربانی قەڵاوە هەڵیان داشت و لە کۆڵ دنیایان کردەوە.

لە بەرانبەر ئەو خزمەتە باشەی سورخابدا، لە لایەن شاوە ساڵانەی هەزار تمەن[3] بەرات بۆ بڕایەوە و هەتا ما هەموو ساڵ وەریدەگرت و بشبووە دۆستێکی زۆر نزیکی شاو زۆر خۆشەویست و لەڕوو بوو.[4] سورخاب زۆری تەمەن ڕابواردووە و ماوەی شەستوحەوت ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە. لە دوای

---

١- ئەلقاسمیرزا کوڕە چکۆلەی شا ئیسماعیلی دامەزرێنەری دەوڵەتی سەفەوی ئێرانە؛ شا تۆماسبی براگەورەی شیروانی پێ سپاردبوو. لە کاتێکدا کە شەڕی گورجی و ئێرانیان بوو، لە شا هەڵگەڕایەوە و سەربەخۆیی ڕاگەیاند؛ بەڵام شا بە لەشکری زۆرەوە هاتە سەری و ڕاوی ناو چووە داغستان و لە بەندەری کەفەوە بە سواری کەشتی چووە ئاستانە و پەنای بە سوڵتان برد کە کۆمەگی بکا و تەختی ئێرانی بۆ بستێنێ. جەمیل

٢- *أخبارالدول* دەڵێ: قاسپ میرزا(!) هەڵاتە ئاستانە. سوڵتان قەدری گرت و دیاری بە نرخی زۆر دایە و بەڵێنی پێدا کە ئێرانی بۆ لە شا تۆماسب بستێنێتەوە و بیکاتە شا. لەشکریشی بۆ نارد و زۆری لە ئێران گرت و کردیە حاکمی تەورێز. بەڵام ئەو خەیانەتی بە سوڵتان کرد و گوێی بە فەرمانی نەدەدا. سوڵتان بانگی کردەئاستانە، جوابی نەدایەوە و لێی هەڵگەڕایەوە. سوڵتان لەشکری لێ کرد؛ ئەو لەبەری هەڵات و کەوتە وڵاتی کوردانەوە. لەوێدا ماوەیەك مایەوە هەتا براکەی گرتی و زۆر بێبەزەییانە کوشتی.

ئەمینزەکی لە *تاریخ عالم آرای عباسی* دەگێڕێتەوە کە لە ساڵی ٩٤٨دا ئەلقاسمیرزا کەوتە دەست چەکداری کوردەوە و بردیانە لای سورخاب بەگ و ئەویش دایەوە بە خۆیان و نەیدەویست قزڵباشان وڵاتەکەی لێ داگیر کەن. جەمیل

٣- لە *تاریخی ئەردەڵاندا* دەهەزار تمەن. جەمیل

٤- ئەمینزەکی لە هەردووك تاریخەکانیدا زۆری لە سەر ڕۆیشتووە؛ پوختەکەی ئەمەیە: کاتێ ئەستەنبوڵ ←

ئەوەش کە مووچەی ژیانی لە لای خوداوە بڕاوە و لە قەڵای هەزار بە هەزاری مەرگەوە هەڵئێراوە، یازدەکوڕی لەپاش بەجێ ماوە:

١- حەسەن ٢- ئەسکەندەر ٣- سوڵتانعەلی ٤- یەعقوب ٥- بەهرام ٦- بسات ٧- زولفەقار ٨- ئەسڵەمیش ٩- شاسوار ١٠- سارۆ ١١- قاسم.

## محەمەد بەگ کوڕی مەئموون بەگ

لە پاش نەمانی بابی -وەك بۆی دیاری کرابوو- بە سەر سروچك[1]، قەرەداغ[2]، شاربازێر[3]، ئالان[4] و دمهران[5]دا ڕادەگەیشت؛ چاوی لەوە بوو هەموو وڵاتی ئەردەڵانی دەست کەوێ. لە سەر ئەو نیازە خۆی هاویشتە بنباڵی سوڵتان سولەیمانی عوسمانی و داوای یاریدەدانی لێکرد. سوڵتان سولەیمان، ڕوستەم پاشای گەورەوەزیر و عوسمان پاشای میری میرانی بەغدای دەگەڵ چەند میرە کوردێکدا بە لەشکرەوە ڕەگەڵ خست، کە خاکی ئەردەڵان داگیر بکەن.[6]

---

← کارەساتی شارەزوور و گیرانی ئەلقاس میرزای زانیەوە، لە عەلی پاشای والی بەغدا تووڕە بوو؛ چونکە ئەرکی خۆی بەڕێوە نەبردووە، دەریان کرد و لە باتیان محەمەد پاشای بەلتەچی ساڵی ٩٥٦.ك (١٥٤٩.ز) کرا بە والی بەغدا و بە سەرکردایەتی میری میرانی حەلەب، عوسمان پاشا لەشکرێکی یەکجار زۆری ناردەسەر شارەزوور و دەوری قەڵای زەڵمیان گرت، کە سورخابی تێدا بوو. دەورەدان دووری کێشا؛ بەڵام عوسمان چی بۆ دەگەڵ نەکرا. ئەوسا بەلتەچی بۆ خۆی هات و بەکر بەگ و وەلی بەگ -کە دوو ئەمیری کورد بوون- کردنیە ناوبژیکەر کە وا بکەن خۆ بداتەوە دەست عوسمانیان.

*القرون الاربعە الاخیرە فی العراق*یش هەر شتێکی وا دەڵێ؛ بەڵام دوکتور فریج دەڵێ: سورخاب لە پاش ماوەیەك لە ژێر چاوەدێری ئێران دەرچووە و حاکمی سەربەخۆ بووە و بە زانایی خۆی ئاژاوەی بنبڕ کردووە. جەمیل

١- سروچك لە شاربازێڕی سەر بە سولەیمانیە و کەونە قەڵایەکی زۆر بەرزە و لە نزیك گوندی بەرزنجە بووە و شوێنەوارەکەی ماوە. جەمیل

٢- مەڵبەندێکە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی سولەیمانی. جەمیل

٣- مەڵبەندێکە لە ڕۆژهەڵاتی سولەیمانی و قەڵاچوالانی پاتەختی بابان لەوێیە و ئێستا گوندێکە.جەمیل

٤- ئالان ئەو مەڵبەندەیە کە لە لای پشدەرە؛ یان قەڵایەکی کەونی لای خانەقینە کە ئێستا لەبەین چووە.جەمیل

٥- ئەمینزەکی لای وایە دلجوران بووە؛ من بە مەریوانی دەزانم. جەمیل

٦- *تاریخی ئەردەڵان* دەڵێ: سورخاب بەگ لێ نەگەڕا محەمەد بەگ بەشەکەی خۆی پێ بگا و لێی داگیر کرد؛ ←

لەشکر هاتە سەر شارەزوور و دەوری قەڵای زەڵمیان دا؛ کە لە هەموو قەڵاکانی ئەو ناوە دژوار و هەڵەموت و سەخت و پتەوترە و لە قوچی و بەرزیدا شەڕەقۆچ دەگەڵ گومبەزی کاکێشانی عاسمانی شیندا دەکا. دەورەدانەکە دوو ساڵی ڕەبەقی خایاند و لە شەڕێکدا گوللەیەك بەر محەمەد بەگ کەوت و لە ژێر گڵدا بۆی خەوت و پەکی کەوت. لە پاشان هیمدادی شاتۆماسپ بۆ دەورەدراوان هات و عوسمان پاشا[1] لە بەریان کشاوە و دەشتی شارەزووری گرتە بەر و زۆری دەسەرەوە نەچوو، عیزرایلی گەیشتە سەر و داری ژیانی وشك و بێبەر کرد و بینەقاقەی ڕێك کوشی و بەری نەدا هەتا خۆڵی شارەزووری وەسەر کرد.

لەو دەرفەتەشدا ئەوانەی ئەو دوو ساڵە لە قەڵادا قوڵاغەیان دابوو، هەلیان بۆ هەڵکەوت و دەرکەوتن و هەر یەکە بە لایەکدا بۆی دەرچوون و قەڵایان چۆڵ کرد.[2] ساڵی ٩٦٩.ك (١٥٦١.ز) محەمەد پاشاخۆی کوتایە قەڵای چۆڵەوە و کردیە بنکە و لەوە بەو لاوە بەدەمی گەرم و زمانی نەرم و

---

← لە بەر ئەوە محەمەد بەگ پەنای بە ئاستانە برد و سوڵتان سولەیمان، ڕوستەم پاشا و هێندێك ئەمیسرە کوردی دەگەڵ نارد و هاتنە شارەزوور و ماوەی دوو ساڵان لە دەوری قەڵای زەڵم هەڵخولان؛ تەنانەت کەلێنێکیشیان بۆ تێ نەخرا. بەڵام ئەمینزەکی دەڵێ: لە پاش ئەوە کە سورخاب بەگ خۆی کردەدۆستی ئێران و مەئموون بەگ بەردرا و سنجەقی حیللەی درایە، محەمەد بەگ سەری هەڵدا و هێندێك جێگەی وەبەر خۆدان و داوای لە سوڵتان کرد بە کەلەپوورگری وڵاتی ئەردەڵانی بناسێ و دانی پێدا بنێ. ئەواویش گوێی بۆ فەرمانی سوڵتان شل نەدەکرد؛ ئەم لەشکرەیان ناردەسەر.

*تاریخی ئەردەڵان* دەڵێ: محەمەد بەگ دەگەڵ عوسمانیاندا بوو. لە شەڕا کوژرا و هێزەکانی ئێرانیش بە سەرکردایەتی حوسێنلالا هاتنە یاریدەی دەورەدراوان و سوپای عوسمانی بە ناچاری کشایەوە و لە داخی ئەو ژێرکەوتنە، عوسمان پاشا وەزگی داو ئاوێتەی ئاو و گڵی شارەزوور بوو. جەمیل

لە قسەکانی شەرەفخانەوە -کە محەمەد بەگ پەنای بە ترکان بردووە و کۆمەگیان کردووە- وا دەردەکەوێ تاریخی ئەردەڵان ڕاست بکا. هەژار

١- ئەمینزەکی دەڵێ: ئەوەی کە دەستی لە گرتنی قەڵا هەڵگرت و هاتە شارەزوور و لەوێ مرد، ڕوستەم پاشا بوو. جەمیل

٢- *تاریخی ئەردەڵان* دەڵێ: ئەوانە لە ناو قەڵاکەدا بوون، کاتێ زانیان عوسمانی بن کەوتوون و پاشەکشە دەکەن، بۆ تاڵان و بڕۆ هاتنە دەرەوە و محەمەد پاشا هەلی لە دەرکەوتنیان دەسکەوت و خۆی خزاندەجێگاکەیانەوە و داگیری کرد. جەمیل

لەبارزانی، توانی هەموو دژ و چەپەر و سەنگەرەکانی ئەو ناوە بخاتە ژێر چەپۆکی خۆیەوە و لەوساوە شارەزوور وەسەر قەڵەمڕەوی عوسمانی خرا.[1]

## سوڵتان عەلی کوڕی سورخاب

کە سورخاب بەگ نەما، سوڵتان عەلی کوڕی بوو بە فەرمانڕەوای وڵاتی ئەردەڵان. لە پاش سێ ساڵ دەسەڵاتداری[2]، سوڵتانی مەرگ بە سەری دادا و بەرەو گۆڕستانی ڕادا و دو نێرینەی سەروپێچکە و منداڵی لەپاش خۆی لە دنیادا بەجێهێشت: تەیموورخان و هەڵۆخان؛ ئەوانەش سەریان بە کوێ گەیشت و چیان بەسەر هات لە داهاتوودا باسی دەکرێ.[3]

## بسات بەگ کوڕی سورخاب بەگ

لە پاش مردنی سوڵتان عەلی، بسات بەگی برای بە سەر خاکی ئەردەڵان ڕادەگەیشت و توانی زۆری سەر و سامان پێ بدا؛ بەڵام کوڕانی سوڵتان عەلی -کە خوشکەزای مونتە شاسوڵتانی ئیستاجلوو بوون- بۆ ساندنەوەی دەسەڵاتی باوکیان پەنایان بە شائیسماعیلسەفەوی دووەم برد.

لە پاش مردنی شائیسماعیل، تەیموورخان کوڕەگەورەی سوڵتان عەلی لە وڵاتی بەردەستی بسات بەگدا ملی‌نا لە چەتەیی و ئاژاوە نانەوە و دوژمنایەتی سەختیان کەوتە نێوانەوە و هەروا دەهات و دوژمنایەتی گەرمتر دەبوو؛ بەڵام بسات بەگ دەبەر دەستی مەرگدا سارد کرایەوە.

---

١- ئەمین‌زەکی دەڵێ: شارەزوور ساڵی ٩٦١.ک (١٥٥٣.ز) کەوتۆتە سەر وڵاتی عوسمانی. ڕەنگە نیازی ئەوجارە بێ کە هێشتا سورخاب نەیساندبۆوە. جەمیل

٢- *تاریخی ئەردەڵان* دەڵێ: سێ ساڵان خەبات و بەربەرەکانی کرد، تا توانی حوکم بگرێتە دەست و هەر دەو ساڵەدا عەمری خوای کردووە. ئەمین‌زەکیش لای وایە ساڵێك فەرمانڕەوا بووە. جەمیل

٣- *تاریخی ئەردەڵان* لە دوای سوڵتان عەلی باسی بارامی برای دەکا و دەڵێ: باوکی بەزیندی سەر عیمادیەی دابوویە و هەتا ئێستاش نەوەکانی، حاکمی ڕەواندز و کۆیسنجەق و حەریر و جێگەی‌ترن.

مستەرلونگریك لە ڕووپەڕ ٤٨ی کتێبەکەیدا باسی دەکا و دەڵێ: سورخاب بارامی کوڕی کردەحاکمی ڕەواندز و میرایەتیەکی تیا دامەزراند، سێسەد ساڵی درێژە کێشا.

## تەیموورخان کوڕی سوڵتان عەلی

کاتێ مردن بساتی کردەپەندی پساتێ، تەیموورخان بوو بە فەرمانڕەوای سەرزەمینی ئەردەڵان.[1]

ساڵی ٩٨٦.ك (١٥٨٠.ز) پەنای بردەبەر سوڵتان مرادی عوسمانی و ئەویش لە داهاتی زەویە تایبەتیەکانی شارەزوورێ، ساڵانە سەدهەزار ئاغچەی بۆ بڕایەوە و خستیە ڕیزی میسری میرانە گەورەکانەوە و پاشای وەپاش ناوەکەی خراو بوو بە تیموورخان پاشاو هەر چوار کوڕیشی بە خەڵاتی سوڵتان سەرئەفراز کران. سنە و حەسەناباد و قەڵای قزڵجە[2] بۆ سوڵتان عەلی و قەرەداغ درا بە بداغ و مەریوان بۆ مراد و شاربازێر بۆ برای بە تەمەن بەرەژێر[3] و دینەوەر -کە بە سەر ئێرانەوە بوو- ئەویش خرایە سەر بەشی تەیموورخان پاشاوە.

لە سەرەنجامدا بەفوو تێکردنی شەیتان و دنەدانی لەخۆبایی بوون، هەوای پادشایەتی و سەربەخۆیی لە کەللەی دابوو. جارێك دەبووە ڕۆمی و بە تورکی دەیگوت: برای خۆمی و جارێك خۆی دەکردەقزڵباش و لە عەجەمان دەبوو بە قارداش و هەر ڕۆژە لە سەر نیازێك و هەر دەمە سازی بە ئاوازێك دەنگی دەدایەوە. لەبەر بە فیزی و بزۆزی، لە ڕێگە دەرچووبوو؛ دەر و دراوسێی خۆی هەموو ڕەنجاندبوون و کێشەی پێ دەفرۆشتن و گەڕی تێدەهاڵاندن. تاڵانی ئەمی دەکرد و بە ڕەشەدزی ماڵی ئەویتری دەبرد و دەستی درێژ دەکرد و پێی ڕادەکێشاهەتا بە دەست و پێوە بە تەڵەوە بوو. پەلاماری کوڕی عومەر بەگی کەلهوڕی داو تاڵانی کرد[4]. شاوێردی مەزنی لوڕستان[1]، بە هانای کوڕی عومەر بەگەوە هات و بە جووتە، ڕێگەیان لە

---

١- ئەمینزەکی دەڵێ: تەیموورخان حەجمینی لە بساتی مامی هەلگرتبوو؛ عوسمانیەکانیش یاریدەیان دەکرد و توانی مامی دەرکا و لە جێی دانیشێ. کەوابێ تەیموور بەرلە مردنی بسات بەگ هاتۆتە سەر حوکم. جەمیل

٢- قزڵجە ئێستا گوندێکە سەر بە پێنجوین، لە کوردستانی عیراق. خانەدانی بەناوبانگی زانایانی قزڵجی بەو ناوەن. لە هەموان بەناوبانگتر مەلا عەلی قزڵجی بوو کە گەلێك کتێبی نووسیون و بە تایبەتی لە مەنتقدا. ئێستاش مەلا محەمەدی قزڵجی هەیە، خاوەنی *التعریف بمساجد السلیمانیە*. هەژار

*تاریخی ئەردەڵان* دەڵێ: قەڵای زەڵمیش هەر بە ماڵە تەیموور دراوە. ئەو خەڵات و بەراتە ساڵی ٩٨٨ك بووە. جەمیل

٣- ئەمینزەکی دەڵێ: ناوی بەدرخان بووە. خاوەنی *تاریخی ئەردەڵان* بە عەلەمەدینی ناو دەبا و دەڵێ: تەیموورخان دینەوەر و کرماشان و سنقور و زەڕڕینکەمەری -کە ئێستا ناوی گەڕووسە- بۆ خۆی هێشتنەوە.جەمیل

٤- ڕەنگە قوباد بەگ کوڕی عومەر بەگی حاکمی دەرەتەنگ بێ کە لە وڵاتی خۆیدا بە سەربەخۆیی تەواو دەژیا و هاوچاخی شەرەفخان بووە؛ کەچی ئیسماعیلی کوڕی مەلا حەمەحوسێن خاوەنی *تاریخی ئەردەڵان* و ←



تەیموورخان گرت و لە کاتێکدا کە تالآن و ماڵی ولآتی کەلهوڕانی دابووە پێش خۆی و بە خاترجەمی بەرەو ماڵ دەگەڕاوە، لە خەسر بۆسەیان بۆ دانا و دەستەویەخە لێی بلند بوون و لە نەکاو، ئامبازی خۆی و پیاوەکانی بوون و دەگژیان ڕاچوون و هەتا بە خۆیان زانی، کەوڵیان بردنە دەباغ و شەق و پەقیان کردن و تەیموورخانیان بە دیل گرت و دەگەڵ ماڵە تالآنیەکەی خۆیان و تالآنی پیاوانی تەیمووردا هێنایانەوە و ماوەیەك لەلای خۆیان بە دەست بەسەری گلیان دایەوە و لەوەدوا بەرهەڵدایان کرد. پەندیان لەو ئامۆژگاریە بەنرخە وەرنەگرت کە گوتوویانە:

پیسی گەر گەرای داخست لە دڵدا　　ناچێ تا نەتبا بە ناخی گڵدا

تەیموورخان لە سەر ئەو پەت پەتێنەشڕا -کە پێی‌کرا- وازی لە بزۆزی هەر نەهێنا و ئەوجار شالآوی بردەسەر زەرڕین‌کەمەر؛ کە دەوڵەتیاری سیامەنسووری بە فەرمانی شای ئێران کرابووە فەرمانڕەوای ئەو ناوە. دەوڵەتیار بەرەنگاری بۆوە و سەرێك پێکدا هاتن و تەیموورخان ئەو جاریشی بە لادا نەهات و لە شەڕدا بە لادا هات و کەلاکی لە شەڕگەدا تخیڵ بوو. کوژرانی تەیموورخان لە ساڵی ٩٩٨.ك (١٤٩١.ز) دابووە.

## هەڵۆخان کوڕی سوڵتان عەلی کوڕی سورخاب بەگ

لە پاش کوژرانی تەیموورخان، هەڵۆخانی برای بوو بە جێنشین و مەزنایەتی لوڕستانی خستە ناو دەستانیەوە. گوێ بە فەرمانی سوڵتان مرادخانی عوسمانی بوو. دڵی قزڵباشەکانی ئێرانیشی لە خۆی نەدەڕەنجاند و خۆی دەگەڵ هەموو لایەکدا گونجاند و کارێکی وای کرد وەك دەڵێن: نە شیش بسووتێ نە کەباب.

لە سایەی ئەو زیرەکی و وریاییەوە، توانیویە بە سەربەستی و بێبەرهەڵست، حوکماتی خۆی بەڕێوە بەرێ. ئێستاش کە ساڵی ١٠٠٥.ك (١٥٩٦.ز) یە هەروا بە کامڕەوایی دەژی و بە دڵنیایی ڕای دەبوێرێ.

---

← ئەمیرزەکی بەگ، کوڕیان بۆ نەنووسیوە. جەمیل

١- شاوێردی‌خان کوڕی محەمەدی سەرداری لوڕی بچووك و ئەویشە کە شاعەبباس ولآتەکەی لێ سەند. جەمیل

# بەندی دووەم

## فەرمانڕەوایانی هەکاری (شەنبۆ)

لـە لای گفـت و لفـت خۆشـانی دەم و پـل ڕەوانـی پیتـۆڵ و زۆرزانـی دیـرۆك بێـژ و مێژوونووسـان و مێژووناسانی ژیر و دانا و بەبیـروراوێژ، بێگرێ و پێچ و پەنایـە و شـتێکی زۆر ئاشـکرایە کـە بـنج و مۆری خونکارانی هەکاری، دەگەڵ ڕیشە و شادەماری شەنگەداری خانەدانی خەلیفانی عەبباسیدا لێـك هاڵاوە و تێك هاڵاوە و سـەری بەنـد و بنـاوانی نـەماوانیان سەرچـاوێکە و کانیاوێکـە و ئاوبارەکـەی جۆبارەکەی لە یەك دەراو هەڵبەسراوە و لە یەك شێلەگەوە بەردراون و لە ئاژنکردندا، لێك هەڵبـڕاون. بەڵام جێگەی ئاخ و داخە -لەو چاخەدا و لـە دواییـشا- مێژوونووسـانی کارامـە ئـەرکی خۆیـان بـە ئەنـجام نەگەیاندووە و هێندەدەخۆ نەنووساون، دانەدانەی گەوهەرانی ئەو ملوانە -یەك لە دوای یـەك- بهۆننەوە و ڕێزگەی کتێب بەو لیزگەیە بەهاداره برازێننەوە؛ هەتا خەڵك بیخوێننەوە. هـەر ئەوەنـدەیان نووسیوە کە ئەمانیش وەچی وانن. ئیتر نەیاندرکاندووە پەل و لکی زۆر بە کەلکی کامە خەلفە نەمامن و ئەو خەلیفەی ئەمانی لێ کەوتۆتەوە، کێهەیانە.[1] ئاڵا بەڕن و باڵا زراوەکەی منیش دەخۆی ڕانـەدیت و بە خۆی ڕەوا نەدیت لە دەراوی لێڵاو و شلوێوە پاراو ببێ و شتی تەواو دەبنە نەکراو، لـە بەردەسـتی

---

۱- عەبباسیەکان بە هێزی کۆمەڵی نهێنی و لە سایەی ئازایەتی ئەبوموسلیمی خوراسانی، بوونە پادشای هەموو وڵاتی ئیسلام. بەرێ پاتەختیان کوفە و دوایە بەغدا بوو. یەکەمیان عەبـدوڵڵا کـوڕی مـحەمەدعەبباسی سـەفاحە؛ ساڵی ۱۳۲ك(۷۵۰.ز) هاتە سەر حوکم و ٦٥٦.ك (۱۲٥۸.ز) بـە کـوژرانی موستەعـسەم دوابـڕاو بـوون. واتـا ٥٤٤ سـاڵ خەلیفایەتیان کردووە. جەمیل

«ئەو حەساوە- وەك لەبەرچاوە- بەساڵی هەتاوی ئەبێتە ٥٠٨ و بەساڵی مانگی ئەکاتە ٥٢٤ ساڵ. ماجد »

ئەبوموسلیمی خوراسانی کورد بووە. ئەبوجەعفەر مەنسوور خەلیفـەی عەبباسـی لـە دیوەخـانی خۆیدا کوشـتوویە. ئەبوودولامەی شاعیری خەلیفە بەمردنی خۆش بووە و فری هاویشتۆتێ و دەڵێ:

أبا مـجرم مـا غيـر الله نعمـــة علي عـبــده حتي يغيرها العبـد

أفـي دولـة المنصور حاولت غدره ألا ان اهــل الغـدر آبائك الكـرد

کوردیەکەی ئەمەیە: باوکی گوناهکار خوا لە بەندە ناگۆڕێ تا بەندە لە خۆی نەگۆڕێ. تۆ لای مەنسوور بووی و تەمای غەدرت هەبوو؛ بەڵێ دەزانین باوکە کوردەکانیشت هەر ئەهلی غەدر بوون! هەژار

وریا و پیتۆڵانی دوارۆژ دابنێ.

ئەوی لە هەموو کەس ڕوونە و بێ چەند و چوونە، ئەو هۆزە بەودم و پیرۆزە لە ناو فەرمانڕەوایانی کوردستان و لە چاو هەموو کاربەدەستان، بە ئاکاری تەرز و کرداری بەرز و بە خوێنشیرینی و گران و سەنگینی، جێگەی باڵایان گرتووە و ناوبانگیان دەرکردووە. پاکی دەست و داوێنیان و ڕەوشت و خوّی خاوێنیان، لە سەر هەموو دەم و زارانە. دایم و دەرهەم خونکارانی شکۆدار و دنیادارانی دەسبەکار، ڕێزیان گرتوون و هۆگریان بوون و هیچ نەیار و بەدکارێك هەتا سەر دەگەڵی دەرنەبردوون. ئەگەر جارێك لە ڕۆژگارێکدا دەسەڵاتدار و زۆردارێك، زۆری بردبن و دەستی هاویشتبێتە وڵاتەکەیان و لێی داگیر کردبن، زۆر کەمی پێ چووە کە زۆر پەژیوان بۆتەوە و قسەی خۆی خواردۆتەوە و ماڵی بە ماڵخۆ ئەسپاردۆتەوە.

لەمەڕ ئەو مەبەستەوە، مەولانا شەرەفەدین عەلییەزدی لە تاریخی *زەفەرنامە*دا دەڵێ: ئەمیرتەیمووری کورەکانی ساڵی ٧٨٩ لە پاش گرتنی قەڵای بایەزید، ڕووی کردەوان و وستان. عیززەدین شێر -کە فەرمانڕەوای هەکاری بوو- لە قەڵای واندا قایمەکاری خۆی کرد و لێ بڕا هەتا شیری دەبڕی و هێزی بڕ دەکا، بەگژ داگیرکەردا بچێتەوە و لە هێز و گوردی ئەمیرتەیموور سڵ نەکا و نەکشێتەوە. ئەمیرتەیموور بە لەشکری گران و زۆرییەوە، دەوری قەڵای وانی داو شەڕ دامەزرا و جار لە جار ئاڵقەی ئابلۆقە لە سەرنشینانی قەڵا تەنگ هەڵاتەوە و دەمەگازیان لێ وێك هاتەوە و بۆیان دەرکەوت کە ئەو بەڵایە لەو قەڵایە واز ناهێنێ و ئەو هەزارەزیلە بەوان لەبنە نایە و لە بنەیان دێنی و هاتە بیریان کە گوتوویانە:

کێ بە فوو دیویە نەرم کرێ ئاسن؟ کوتك و سندان و کوورە دەیناسن!

عیززەدینشێر -کە خۆی بە شێرەکوللە دەزانی- لە پاش دوو ڕۆژ بەربەرەکانێ، سەربەخۆ لە قەڵا هاتە دەر و بە سەرشۆڕی سەری خستە سەر خاکوپای تەیموورەوە و پاڕایەوە کە لێی ببوورێ؛ بەڵام ناسرەدین ناوێك -کە لە خزمانی عیززەدینشێر بوو- بە لایەوە شوورەیی بوو بۆ کەوچکە خوێنێك بپاڕێتەوە و دەپیاوەتی خۆی ڕانەدیت کە سەر بۆ داگیرکەر بچەمێنێ. گورجێ لە پاش دەرچوونی عیززەدین، دەرگای قەڵای گاڵە دایەوە و سەر لە نوێ ئاشی شەڕی نایەوە و بیستوحەوت ڕۆژان ژانی

بە دوژمن کرد و تا هێز و توانای بەربەرەکانی کردنی وشکاوی هات، دەستی هەڵنەگرت. لەشکری تەیموور ڕژانە قەڵاوە و تیخی جەوهەردار و خەنجەری مووکاریان لێ وەکار خستن و لە کاریان خستن و برستیان لێ برین و هەست و خوستیان پێ نەهێشتن.

زانایەك لە مەڕ گرتنی قەڵای وانەوە ئەوسا ئەم دوو شیعرەی گوتووە:

شایەك کە بە زەبری شیری ئێرانی گرت — چەند بەگلەر و میر وپادشاو خانی گرت

پرسیم لە قەڵەم دەگەڵ قەڵای وان چی کرد — نووسی کە «بە لادزی و گزی وانی گرت»[1]

ئەمیرتەیموور ئەوەندەلەو قەڵایە داغدار ببوو، چاوی پێ هەڵنەدەهات؛ دەستووری بە ئەمیر«یادگاراندخودی» داکە قەڵاکە وێران و خاپوور بکا و داری بەسەر بەردەوە نەهێڵێ و جێگاکەشی بکێڵێ. بەڵام قەڵا دژێکی کۆنە ئیجادی ڕۆژگاری دەسەڵاتی شەددادی کوڕی عاد بوو. ئەو گابەردەسەخت و زلانەی کە چینی دیواریان پێ هەڵچنابوو، ئەو وەستاکاری و کارامەییە کە لە چینەدانان و مۆرەی دیوارانیدا دەکار کرابوو، وێنەی لە سەرزەوین نەدیتراوە و نەشبیسراوە. زۆری دەگەڵ ماندوو بوون کەمیان دەس کەوت هەر ڕەنجێکی دایان هەر ڕەنجبەخەسار بوون و هەر کۆششێکیان کرد، بابەکۆش مانەوە و سەریان لە بەردی ڕەق داو شاخیان تێدا شکا و بۆ دەرمانیش تیزماڵکێکیان بۆ هەڵنەکرێنرا و هەر چۆنێك بوو بە چنگەکرکێ تۆزێکیان ڕوشاند و پیچەکیان لەسەر مۆرە تازە ئیجادەکانی هەڵوەشاند و دەستیان لێ هەڵگرت و قەڵا بە سەربەرزی مایەوە و جوابی تەیمووری نەدایەوە.

تەیموور لەشکرێ بەرەو سەڵماس و خۆی تاژۆت. کاتێ خێوەت و بارەگای ڕەنگیسن و

---

[1] - دوو بەیتە فارسییەکە ئاوان:

شاهی کە بەتیغ ملك ایران بگرفت — ماه علمش سرحد کیوان بگرفت

تاریخ گرفتن حصار وان را — گر پرسندت بگو کە «کیوان بگرفت»

«کیوان بگرفت» بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە ٧٨٩. مامۆستا ڕۆژبەیانی لە تەرجەمە عەرەبییەکەدا «هم اولاء فتحوا حصن وان»ی بۆ دیوەتەوە؛ بەڵام ئەمە بە ئەبجەد ٧٨٤ دەگرێتەوە و دەریناهێنێ. من لام وایە «هؤلاء هم فتحوا حصن وان» بووە و لە چاپکردندا تێکچووە.

«بە لادزی و گزی وانی گرت» دیسان بە ئەبجەد ٧٨٩ دێتەوە. هەژار

سەراوپەردەی گوشاد و بەرینی خانی تەتەر لەسەر ئەو هەردەبەرپا کرا و لەبەر لووتکە و قوتکەی ئەستوندەك و چەلاکی کۆن و چادری شاهانەی گەورەی گەوران تاوڵەبۆری هەوران وەلا درا، ئەمیرتەیموورعیززەدینی لە دیواندا ڕێدا و ئاوری بە خێری وێدا و بە ڕووخۆشی فەرمان و نیشانی فەرمانڕەوایی پێدا و مۆری سووری تەیمووری بۆ پێوە نا و ناردیەوە سەر وڵاتی خۆی.

ساڵی ٨٢٤.ك(١٤٢١و٢٢.ز) مەلیك محەمەد کوڕی مەلیك عیززەدین دەگەڵ ئەمیر شەمسەدینەدا بەختیان هێنای و دیدەنی شاڕۆخ میرزایان بۆ ڕەخسا. شاڕۆخ میرزا زۆری بەخێرهێنان و گەلێکی ڕوو پێدان و دڵخۆشیدانەوە و لە کار و باری پێچانەوە و بەسەری کردنەوە و فەرمانی حوکمی بۆ نوێ کردنەوە و بە ڕێزلێنانەوە لە لای خۆی گلیدانەوە. بەر لەوەی شەڕی نێوان شاڕۆخ میرزا و کوڕانی قەرایووسفی تورکمان[1] لە لای ئالشکورد ڕوو بدا، ئیزنیدان و هاتنەوە ماڵ خۆیان.

هەروەها لە پادشایانی خانەدانی چەنگیزیشەوە بە خەتی ئیغوری[2] و بە مۆری ئەو خونکارانە، فەرمانێك نووسراوە دەڵێ: هەمیشە پادشایانی خاوەن شکۆ دەربارەی ئەو بنەماڵە چاکەیان کردووە و درێغییان نەبووە و وڵاتی خۆیان بە مولکایەتی بە خۆیان بەخشیون. نووسەری ئەم مێژووە بۆ خۆی چاوی بەو فەرمانە کەوتووە.

ئەو پیاوانە کە لەو خانەدانەدا بە پلەوپایە گەیشتوون -ئەگەر خوا یار بێ- لەمە بەولاوە بە درێژی باسیان دەکرێ.

---

١- قەرایووسف بە ڕەسەن لەو تەتارانەیە کە هاتوونەتە ئێران و سەر هۆزی قەرەقۆینلووی تورکمان و میری بەشێك لە ئازربایجان بوو. لە زەمانی تەیمووریلەنگدا دەگەڵ سوڵتان ئەحمەدی جەلایری پەنایان بە سوڵتان بایەزیدی عوسمانی برد. کە ئەویش کوژرا، چوونە لای زاهیر بەرقووقی پادشای میسر. کە تەیموور مرد، هاتنەوە بۆ تەورێز و هاوپەیمانی ئەحمەدی جەلایری بوون. لە پاشان بوو بە شەڕیان و قەرایووسف، سوڵتان ئەحمەدی بە دیل گرت و ناچاری کرد کە وەسیەتێك بنووسێ، ئازربایجان بدرێ بە پیربداغ و والیەتی بەغدا بۆ شامحەممەد بێ؛ کە هەردووکیان کوڕی قەرایوسف بوون. دوای نووسینی وەسیەتەکە -هەر لە ناڕەوا- کوشتی.

جا چونکە شامحەممەد وێنەی مەڕێکی ڕەشی بە ئاڵاوە بوو، بە دەوڵەتی قەرەقۆینلوو (مەڕەڕەشانی) ناوی دەرکرد، کە حوکمی گەیشتە لای دیاربەکریش. جەمیل

٢- جۆرە خەتێکە تەتار لە ئەلفبای نەستووریەکانیانەوە وەرگرتووە؛ کە لە چەرخی پێنجەمی میلادەوە باو بووە. جەمیل

## ئەسەدەدین کوڕی گولاوی کوڕی عیمادەدین

نووسەری پیتی پەڕەکانی ئەم مێژووە، لە پیاوانی دوورەدرۆ و ڕاست و ڕەوانی بیستووە، کە جارێك لە جاران لە ڕۆژگارانی پێشوودا -بە هۆی چەپگەڕانی چەرخی ناهەموار و سوور و خولی دنیای بێبارەوە- یەکێك لە بەچکە شێرانی پادشاکانی هەکاری، لە ولات ئاوارە بووە و سەری خۆی هەلگرتووە و کەوتۆتە میسر و سەرگەردان و کەساس و کەسنەناس و بێکەس، پەنای بە پادشای چەرکەس بردووە.[1] بەلام دەلێن «شێر لە هەرکوێیە پەنجەی خۆی پێیە» لە چەند شەڕ و شۆڕێکدا کە لە نێوان چەرکەسان و دیندوژمن و خوانەناساندا قەوماوە، شێر دەکالان نەوەستاوە و کوڕی کوردی ئازا، جەوهەری خۆی نیشانداوە و لە گیانبازی و ئەرکی سەربازیدا هۆی داوەتەوە و دەرگای پایە و مایەی بەروودا کراوەتەوە و ئاوڕی وێ دراوەتەوە.

دەلێن جارێك لە مەیدانی مەردی و نەبردیدا دەستێکی پەڕیوە. پادشای چەرکەس دەستی زێڕی بۆ کڕیوە و زەند و مەچەکی پۆلاییینی بە ئەفسوون و جادووی خوای شەڕ، وەزێڕ گەڕاوە و باسکی گەنم ڕەنگ، زەرد هەلگەڕاوە. لەو ساوە ناوی ئەسەدەدین چەنگ زێڕی بەسەردا بڕاوە.

کاتێ کە حەسەن بەگی ئاققۆینلوو (مەڕەسپییانی)[2]، لە ئێران ببووە پادشا، نیهادی دەربارەی کورد زۆر خراپ بوو؛ دەیەویست کوردستانیان لە بەر دەستان دەرێنی و خۆی بە سەردا بسەپێنێ. بۆ ئەو مەبەستە دوو کەس لە دەستە و بەستەکانی خۆی -کە سۆفی خەلیل و عەرەب شابەگ بوون- بە لەشکرەوە ناردەسەر مەلبەندی هەکاری. سۆفی خەلیل ماوەیەك مایەوە و پلانی هێرشی دادەنا و لە دەرفەت دەگەڕا هەتا لە ڕۆژێکی چوارشەممەدا فەرمانی هێرش بردنی داو هەلیانکوتایە سەر ولاتی

---

١- پادشایانی چەرکەس لە بەرەی ئەو کۆیلانەن کە لە سالی ٧٨٤.ك (١٣٨٢.ز) تا ٩٢٢.ك (١٥١٦.ز) واتا ١٣٨ سال پادشایەتی میسریان کردووە. یەکەمیان مەلیك زاهێر سەیفەدین برقوق، کۆیلەی ئەمیر یەلبغای عومەری بووە؛ کە یەلبغاش لە پێشدا یەکێك بووە لە کۆیلەکانی مەلیك سالحی‌ئەییووبی و حوکمی میسریان لە دەست ئەییووبییان دەرێناوە. جەمیل

٢- ئوزون‌حەسەن (حەسەنەدرێژ) کوڕی عەلی بەگ، کوڕی قەرە ئەیلولعوسمان، میری هۆزی ئاققۆینلوو (مەڕەسپییانی) تەتەر و لە سەردارانی لەشکری تەیموورلەنگ بووە. دەولەتی مەڕەسپییانی لە سەر دار و پەردووی دولەتی مەڕەڕەشیان (قەرەقۆینلوو) دامەزراندووە و پاتەختی لە دیاربەکرەوە بردۆتە تەورێز و سالی ٨٨٣.ك (١٤٩٧.ز) مردووە. درۆشمی ئالاکەی شکلی مەڕێکی سپی بووە. جەمیل



هەکاری. میرعیززەدینشێری میری هەکاری لای وابوو ڕۆژی چوارشەممە نابێ پیاو شەڕ بکا؛ دوژمنیش ئەوا هاتە بەرەوە. سەرکردەو پیاوماقووڵانی هەکاری دەست و داوێنی بوون و بە دەوریاندا هەڵخوێند کە هاواری سەروماڵمانە و نامووس و ئابڕوومان دەکەوێتە بەر چنگی دوژمن؛ فەرمان بدەبا پارێزگاری ماڵ و منداڵ و نامووس و ژیانی خۆمان بکەین. بەڵام چ دەکەی؟ عیززەدین شێرە هەر بە ڕەوتێك فێرە و ئەویش سوێسکەییە! چوارشەممە بەد ودمە و شەڕ ناکەم و ناشیەڵم کەس لە چوارشەممەدا بەگژ دوژمندا بچێ و هەرچی دەبێ، بەلا ببێ! هەرچی کردیان و کڕاندیان ئێستا و ئێستاش دەستی لە چوارشەممەی خۆی هەر بەر نەدا.[1]

سۆفی خەلیل و عەرەب شابەگ گەینە سەری و سەریان بڕی و دەخوێنی خۆیان گەوزاند و هۆزی هەکاریان بەزاند و چوارشەممەیان لە بیر بردنەوە و خانەدانی میریان لێ کۆر کردنەوە.[2]

چوارشەممە بۆ ئاققۆینلوو بەودم بوو. لە چوارشەممەدا ولاتەکەیان گرت و دایانە دەست هۆزی دونبولی، کە بە گزیری عەجەمان پێ ڕابگەن. ئیتر ماوەیەکی زۆر و زەوەندەهۆزی دونبولی ببوونە قوڵەچۆماغی تورکمان و بۆ ئەوان و بە ناوی ئەوان بەروبوومی ولاتی هەکارییان دەخوارد.

هێندێك لە مەسیحیەکانی ناوچەی دز، لە ولاتی هەکاری، کە بە ئاسۆری ناو دەبرێن -وەك پیشەی هەمیشەیانە- بۆ سارد و سەودا بەرەو شام و میسر چووبوون؛ ناویانگی ئەسەدەدین چنگزێڕیان بەرگوێ کەوتبوو؛ زانیبووشیان کە لە ماڵە میرانی هەکاریە. هومێدێکیان لەوە پەیداکرد و گوتیان ئەگەر ئەوەمان بۆ بێتەوە، ولاتی خۆمان دەست دەکەوێتەوە و هەموو لایەك لە سایەی ئازادیدا دەحەسێتەوە. دەناو خۆیاندا پێك هاتن و ئەسەدەدینیان لە نیاز خەبەردار کرد و دەردی بێکەسییان بۆ شی کردەوە. چنگزێڕ بە دەنگیانەوە هات و بە شارەزایی ئاسۆریەکان، خۆی گەیاندەوە ولاتی هەکاری. بە نهێنی و نەناسیاوی لە ناو ئاسۆریەکاندا دەژیا و چاوی بڕیبووە دەرفەتێك کە بتوانێ زەبری خۆی تێدا بوەشێنی و دوژمن لە نیشتمانەکەی خۆی دەرپەڕێنێ.

---

١- ئێستاش لەو ناوە چوارشەممە و بە تایبەتی ئاخر چوارشەممەی مانگی سەفەر، بێ ودمە و هێندێك لایان وایە زەردەشت لەو ڕۆژەدا مردووە. جەمیل

٢- ساڵی ٨٧٥.ك (١٤٧٠.ز) ئەو هەرایە ڕووی داوە. جەمیل

مەکۆی دونبولّیەکانی کاربەدەست دژێك بوو لە ناوچەی دزدا و چوار دەورەی ئاسۆری بوون. لە سەریان بوو هەموو ڕۆژی شەموان کە لە کاروباری خۆیان دەبوونەوە، بێگاری قەلاّ بکەن و تێشووی حەوتوویێك لە نان و پێخۆر و تفاق و ئالیك و دار و ئاورد، بۆ دژداران بەرن و تا شەمۆی دیکە ئازادبن و هەر کە شەمۆ نویّ بۆوە، بێگاریش نویّ بێتەوە.

شەمۆیەك لەو شەمۆیانە ئەسەدی چنگزێڕ و چەند پیاوێکی زۆربوێر و چاونەترسی هۆزەکەی، جلکی ئاسۆریەکانیان دەبەر کرد و چەك و پێداویستی جەنگیان کردەناوئاخنی کۆلّەدار و تێلەکە گیا و کۆلّەباریان لە خۆ شەتەك داو دژی دز بگرە و هاتم! کاتیّ دەرگایان بۆ کرایەوە و هەموو چوونە ژوورەوە، وزاقیان بەست و کەوان و تیر و نێزە و شیریان لە ناو کۆلّە پووشکە و گیاوشکە دەرخست و بەر بوونە گیانی داگیرکەران؛ «چت خواردووە ترش و چەوەندەر؟» ئاشێکیان بۆ نانەوە، هەرچی خۆی نەدەبوارد، دەمەولەجیّ دەکرا بە ئارد. هەروا سەر بوو دەپەڕان و هەر ورگ بوو دەدڕان و هەر تیر بوو جەرگی کون دەکرد و هەر دونبولّی بوو ڕای دەکرد و خۆی ون دەکرد. ئەو ڕۆژە ئەوەی بە سەر دونبولّی هات، تازە نابێتەوە و هەرگیز لە بیر ناچێتەوە.

پوختەکەی ئەمەیە: ئەو پالّەوانە دلّێرانە و ئەو کارامە شێردڕانە، «هەر هێندەی فوو لە دۆ کەی» قەلاّی دزیان لە ناحەزیان پاکردەوە و حیسابی کۆنیان یەکلا کردەوە و پارسەنگیشیان بۆ خستنە سەر و سلاّویشیان بۆ دانەوە. ڕۆژی شەمۆ تۆلّەی چوارشەمۆی کردەوە و فەڕ و ودمی ئەم، بیّفەڕی و شوومی ئەوی ڕامالّی و لەو شەمۆ پیرۆزەدا ئالاّی فەرمانڕەوایانی هەباسنەژاد دووبارە لە سەر بڕۆپەی بەرزی قەلاّی دزدا شەکایەوە و سایەی ئالاّی فەرمانڕەوایانی کوردی سەربەخۆ، مۆردەی ئازادی دایەوە و هەموو داغ لەدلّێکی لەبەر حەسایەوە. ئەو جلکە ڕەشەی کە بۆ ئازیەتباری لە ڕۆژانی بێکەسی و هەژاریدا دەبەر دەکرا، کرا بە ئالاّی هەکاری و ڕۆژگاری عەبباسیانی دەهێنایەوە بەرچاو.

زمانی زەمانە لەو سەرویەندانەدا ئەو شێعرە خۆشانەی دەخوێندەوە:

شەمە شەماسی دێرەکەی ڕەبەنان  خۆی وەدەر خست لە بن چلّووی دەوەنان
دوژمنی هەلّوەژارد و کەوتە بەزم  گوتی کیّ پێم دەوێریّ بێژیّ ئەزم

جا چونکە سەربەستی ولاّتی هەکاری بە ڕۆژی شەمۆ دامەزرایەوە، هەکاریش بە شەمۆ دەلّێن

شەنبۆ، ئەو تیرە فەرمانڕەوایە بە شەنبۆ بەناویانگن.

ئەسەدەدین زۆر ئازا ژیا و بە ئازادی ڕایبوارد و لە ئەنجامدا وەك هەموو گیانلەبەرێك گیانی پاکی بە خودای تاك ئەسپارد.

داری ژینی هەر کەسێك هەر چەندەبەرزیش بێتەوە

تەوری پێمیردی خودا کۆلك و ڕەگی دەبڕێتەوە

## مەلیك عیززەدینشێر کوڕی ئەسەدەدینچنگزێڕ

لە پاش مەرگی بابی بوو بە فەرمانڕەوای مەڵبەندی هەکاری و لە دنیاداری و شیرینئاکاریدا پیاوێکی بژاردەو ژێهاتی بوو. لە پاش ماوەیەك ئەویش لە ئاسۆی ژیان ئاوا بووە و مەزنایەتی بە زاهیدی کوڕی سپاردووە.

## زاهید بەگ کوڕی عیززەدینشێر

فەرمانڕەوای سەربەخۆی وڵاتی هەکاری بووە. نزیکەی شێست ساڵ حوکمی کردووە. هاموشۆی لای شائیسماعیلی سەفەوی کردووە و ئەوەندەیان نێوان خۆش بووە وەك دەڵێن «موویان دەبەرەوە نەچووە». شائیسماعیل پێی کوتووە مامە؛ فەرمانیشی بۆ دەرکردبوو کە وڵاتی هەکاری بۆ خۆی بێت.

زاهید دوو کوڕی بەختەوەری هەبووە بەناوی مەلیك بەگ و سەیدمحەمەد بەگ. هەر بە زیندی، سەر مەڵبەندی هەکاری لە ناودا بەش کردوون.

## مەلیك بەگ کوڕی زاهید بەگ

لە پاش بابی فەرمانڕەوای قەڵای بای بوو. پیاوێکی ڕاست و دروست و دڵنەرم و دادگەر بوو؛ کە مرد حەوت کوڕی لەپاش بەجێ مان:

زەینەڵ بەگ، بایەندوڕ بەگ، بداغ بەگ، بایەزید بەگ، حوسێن بەگ، بەهائەدین بەگ، ڕوستەم بەگ.

ڕوستەم بەگ هەر لە زەمانی بابییەوە بە سەر ناوچەی کواش و قەڵای ئاختەمار ڕادەگەیشت؛ لە شەڕێکدا کە دەگەل ڕۆژەکیانیان کرد کوژرا.

زەینەلّ بەگ دژی بابی خۆی دخەبتی و دەگەڵ مەحموود ئاغای سلبی -کە دژداری قەڵای بابی بوو- ڕێککەوت و چەند کەسێکی بەدەست و زلیتریشی ڕەگەڵ خۆی خست و کێشەی دەبابی خۆی هاڵاند.

باوك و کوڕ بەرەنگاری یەك بوون و لە پاش شەڕێکی زۆر بەسام و خوێناوی، باوك بە دیل گیرا. زەینەلّ ویستی بیکوژێ؛ لە پاشان نەیکوشت و بڕیاری داهەردووك چاوی باوکی خۆی بکوڵێ. بەڵام هێشتا ئەو نامەردیەشی لە دەست نەهاتبوو کە حوسێن بەگی برای دەفریای باوکی کەوت و ڕفاندی و گەیاندیە لای سەیدمحەمەد بەگ -کە لەو دەمەدا بەسەر وستان ڕادەگەیشت- لەوێش گیر نەبوو ڕووی کردەبدلیس و پەنای بە میرشەرەف بەگ برد. میرشەرەف بەگ زۆری قەدر گرت و قەت وای نەدەکرد گەردێك لە دڵی میوانی خۆشەویستی بنیشێ.

زنیەلّ بەگ -کە کوڕە گەورەی مەلیك بەگ بوو- لە دوای ئەوە کە سەیدمحەمەد بەگی مامی کوژرا، دەستی بە سەر هەموو وڵاتی هەکاریدا گرت و بوو بە فەرمانڕەوای سەربەخۆی ئەو مەڵبەندە. لە دواییدا بە دوورودرێژی باسی بەسەرهاتی سەیدمحەمەد بەگیش دەکەین.

کوڕەکانی دیکەی مەلیك بەگیش، بایەندوڕ بەگیان سەری خۆی هەڵگرت و خۆی هاویشتە پەنای شاتۆماسبەوە؛ بەڵام شاتەوەندەی ڕووی خۆش نیشان نەدا کە دڵی ئاو بخواتەوە. بە ناهومێدی بەرەو وڵات هاتەوە و لە شاری وان بەرەو نەمان گلار بۆوە و سێ کوڕیشی لە پاش بەجێ مان: زاهید بەگ، محەمەد بەگ، حاجی بەگ.

بداغ بەگ چووبووە حەج؛ لە ڕێ مرد و نەگەڕایەوە. ئەویش دوو نێرینەی لە پاش مان: میرعەزیز و سوڵتان حوسێن.

بایز بەگ لە شاری دیاربەکر لە لای کاربەدەستانی عوسمانی دامەزرابوو. کاتێ لەشکر بە سەرکرادیەتی مستەفا پاشای‌سەردار دەچووە شەڕی شیروان، بایز بەگیش ڕەگەڵ کەوتبوو. لە شەڕەکەی چلدر، قزلّباشان بە دیلیان گرت و بردیانە قەزوێن و شاسوڵتان حوسێن فەرمانیدا دایانە دەست زاهید بەگی برازای خۆی و ئەویش کوشتی.

حوسێن بەگ جاروبارە بە سەر ناوچەی ئالّباق ڕادەگەیشت؛ هەتا مەرگی گەیشتە سەر و لە

تەنگەبەری گۆڕیچەی توند کرد.

بەهائەدین کوڕی مەلیك بەگ –خوا یار بێ- دەگەڵ بەسەرهاتی زەینەڵ بەگدا باسی ئەویش دەکەم.

## سەیدمحەمەد بەگ

### کوڕی زاهید بەگ کوڕی عیززەدینشێر

سەیدمحەمەد بەگ و زەینەڵ بەگی برازای هەمیشە نێوانیان ناخۆش و پێکەوە مشت و مڕیان بوو. مام لە دژی برازای دەگەڵ هۆزی پنیانشی ڕێك کەوت و بە هەر دووکلا بوونە هێزێکی گەورە و هێرشیان کردەسەر زەینەڵ و دەسەڵاتداری وڵاتی هەکاری، هەمووی دەست سەیدمحەمەد بەگ کەوت. زەینەڵ جێگەی پێ لێژ بوو؛ جێ نەما تێیدا بسرەوێ و ناچار لە وڵات هەڵات و خۆی گەیاندەئامێدی و پەنای بە سوڵتان حوسێنی فەرمانڕەوای ئامێدی برد. سوڵتانحوسێن بەگ تکانامەی بۆ نووسی و ڕەوانەی لای سوڵتان سولەیمانی عوسمانی کرد.[1]

لەو دەمەدا ڕوستەم پاشاوەزیر بوو؛ زۆری بە خێر هێنا و گەلێکی بەڕێز گرت. بەڵام تێیگەیاند کە ئێمە دەزانین تۆ زۆر لێکراوی و بەشخوراوی و لە دەست ئامۆزا و کەسی خۆت ڕاتکردووە و چوویتە ئازربایجان و پەنات بە شاتۆماسب بردووە. ئەویش داڵدەی داوی و ماوەیەکیش لەوێ ماوی. جا لەبەر ئەوە ئێمە ناتوانین لێت دوودڵ نەبین و تۆزێکت لێ نیگەرانین. ئەگەر دەتەوێ ئێمە دڵنیا کەیت، دەبێ خۆت یەکلا کەیتەوە و بچی ماڵ و خێزانت لە وڵاتی بەردەستی قزڵباشان دەرێنی و بیانهێنیە وڵاتی عوسمانی؛ ئەوسا دڕدۆنگیمان بەرانبەرت نامێنی و پەنات دەدەین و فەرمانی فەرمانڕەوایی هەکاریشت بۆ دەر دەکەین.

زەینەڵ بەگ ئەمەی بە مژدەیەکی خۆش زانی، بە نیازی چوونە ئێران و هێنانی ماڵ و خێزانی، لە ئەستەمبووڵەوە بەرەو مەڵبەندی هەکاری کەوتە ڕێ. لە کاتێکدا گەیشتبووە وڵاتی بۆتان، بەدر بەگ فەرمانڕەوای بۆتان بەو هاتنەی زانی؛ لە بەر خۆی لێکی دایەوە و وای بە باش زانی بەردێك بگرێتە دوو چێشکەوە: لە لایەکەوە دوژمنایەتی دێرینی دەگەڵ هەکاریان هەبوو، بە خوێنی زەینەڵ بەگ

---

١– سوڵتان سولەیمانی قانوونی ساڵی ٩٢٦.ك (١٥٢٠.ز) بۆتە پادشا و تا ٩٧٤.ك (١٥٦٦.ز) حوکمی کردووە.

تۆڵەیەك دەسێنرێتەوە، لە لایەكی‌تریش زۆر دۆستی سەیدمحەممەدە، ئەگەر زەینەڵ بەگی بۆ بکوژێ و ئەو بەڵایەی لە کۆڵ کاتەوە، دۆستایەتی خۆشتر دەبێ و دەیکاتە چاوبەرەژێری چاکەی خۆی و تازە لە بیری ناچێتەوە. چەند پیاوێکی زۆر ئازا و کەڕناسی بۆتانی ناردەسەر رێگە و کەمینیان بۆ دانا و زەینەڵ بەگ و پیاوەکانی وە بەر هاتن و دەگژ یەك ڕاچوون و زەینەڵ بەگ و پیاوەکانی هەر چەندەهێندێکیشیان دەستەوەکەری کرد، بەڵام ئەوان زۆریان بردن و هەموو گیران و کوژران. پیاوی بەدر بەگ -سەری زەینەڵ بەگ نەبێ- سەری هەموانیان بڕی و بە دیاری و بەڵگە بۆ میری خۆیان بردن و لاشەکانیان لە شەڕگە بەجێهێشت.

بەدر بەگ کە لە سەرەکانی ڕوانی، سەری زەینەڵ بەگی دەناو سەراندا نەدیت؛ کە لە پیاوەکانی پرسی، گوتیان زەینەڵ بەگ پیاوێکی گەورە بوو؛ شەرمەمان کرد سەری ببڕین؛ ئەگینا بە مردوویی بەجێمان هێشتووە.

ئەو دەنگوباسە دەشاری جزیرێ گەڕاو خانمی خێزانی بەدر بەگ بیستیەوە و بە مێردەکەی خۆی گوت کە زەینەڵ بەگ پیاوێکی خانەدان و جێ گەورە بووە و ئەگەر هەر کوشتووشتە وا جوانترە تەرمەکەی بێتەوە شار و لە سەر ڕێوشوێنی ئایینی ئیسلامەتی بیشۆین و بە خاکی بسپێرین و بۆمە کەمایەسیە لاشی لەو دەشتە بکەوی و خۆی تێ‌نەگەیەنین.

لەسەر داخوازی خاتوون، چەند پیاوێك چوون کە تەرمەکەی بێنن؛ کاتێ گەیشتنە سەر لاشەی گوژاوان، دیتیان زەینەڵ بەگ هێشتا دڵی لە کار نەکەوتووە و ئاهێکی تێدا ماوە. بە نیوەگیانی هێنایانەوە ئاوەدانی. خێزانی بەدر بەگ زۆر بە میهرەبانی بۆی وەخۆ کەوت و چەند بژیشك و حەتاری لە جزیرێدا هەبوون، هەمووی لێ کۆکردەوە و دەرمان و هەتوان و خۆراك و هەرچی پێداویستی چارەی نەخۆشێك بێ هەمووی لە دراوی تایبەتی خۆی دا.

بەدر بەگ هەر لە سەر ئەوە سوور بوو کە بیکوژێ و لە کۆڵ دنیای کاتەوە؛ بەڵام پاڕانەوە و ئامۆژگاری و فرمێسك و هەنیسکی خانمی دڵنەرم، ئاگری ڕکی لە سینەی مێردەکەیدا کوژاندەوە و لە سایەی پیاوەتی ئەو شێرەژنەوە زەینەڵ بەگ ژیانی دووبارەی بە سەر گرتەوە و زۆر زوو هاتەوە سەردەقی پێشووی و هەر لە سەر داوای خێزانی بەدر بەگ، بەو پەڕی ڕێز و حورمەتەوە بەرەو هەکاری



بەرێ کرا. باسی سەرئەنجامی کاری زەینەل بەگ و ژیانی کوڕانیشی لەو زووانەدا دەخەمە بەر چاو.

سەیدمحەممەد بەگ -وەك لێ دواین- ولاتی هەکاریانی بە خرۆپڕی کەوتە بەردەست و بێ بەرهەڵست فەرمانڕەوا بوو. ئەسکەندەر پاشامیری میرانی وان، نێوانی دەگەڵ تێك چووبوو؛ هەر ساتە پلارێکی تێدەگرت و هەر تاوە بەهانەیێکی پێدەگرت و بە هەموو زمانان لە لای سوڵتان دووزمانی لێدەکرد و بۆی تێدەچاند. لە ئەنجامدا توانی فەرمانی سوڵتان بخاتە دەست کە فەرمانداری مەڵبەندی هەکاری لە سەیدمحەممەد بسەنرێ و بە زەینەل بەگ بدرێ. ئەسکەندەریش بۆی هەبێ لە کوێ تووشی سەیدمحەممەد دەبێ، ماوەی پێ نەدا و بیکوژێ.

بە شوێن ئەو فەرماندەرێنانەدا ئەسکەندەر پاشاناردیە شوێن سەیدمحەممەد بەگ کە بێتە دیوانی وانێ. سەیدمحەممەد دەیزانی لە ژێر کاسەدا نیوکاسە هەیە و ڕێگەی وانێ تۆزێك بڤەیە و تەڵەی بۆ نراوەتەوە و پەتی بۆ هەڵخراوە، کۆمەڵێکی زۆری لە پیاوی هەرە بەکار و ئازا دەگەڵ خۆیدا برد و لە دەری شاری وانەوە وڵامی بۆ ئەسکەندەر نارد کە عەرزی پاشابکەن شارەکە ئازاری چاوقوولکەی تێدا و ناوێرم توخنی کەوم و خۆی لە دووری شار کوێم بۆ دادەنێ، بێت و چاومان پێك دەکەوێ. ئەسکەندەر پاشاچاری ناچار بۆی لە شار دەرکەوت و هەر چاوی بەو تەنتەنە و سەنسەنەیە کەوت هەستی کرد کە ئەو چەرمەچەقاڵتەیە بەو ناجورێ و گەرای گەڕی ئەو جارەشی ناگورێ، نەیوێرا فزەی لە بەر بکا و بەرێی کردەوە. سەیدمحەممەد بەگ هاتەوە وستان و پشتێندی خاترجەمی لێ کردەوە و پیاوەکانی بڵاوە پێ کردن. بەڵام کە ئەو خەوت، دوژمن چاوی نەقووچاندبوو. هەر کە زانی سەیدمحەممەد بەگ بە ئارخەیانی پاڵیداوەتەوە و کەسی وای لە دەورە نەماوەتەوە، هەڵی لەدەس نەدا و سەرکردەی کۆیلەکانی وانی بە دەستە سوارێکەوە نارد و ڕایسپارد کە بە سەیدمحەممەد بڵێ دەنگوباسی زۆر ناخۆش لە سەر سنوورانەوە هاتووە و گۆیا ئەو قزڵباشە کڵاوسوورانە هرووژمیان بە دەستەوەیە؛ بە هەڵەداوان بێتە وان تا پێکەوە باری کارەکە لەبەر چاو ڕانێین و پلانی بۆ دانێین. تێشی گەیاندن ئەگەر دنیا بوو خۆی گرت و پرتاندی، ئەوا بە زۆریش بێ ڕەپێچەکی دەن و بۆم بێنن.

سەیدمحەممەد زۆری برۆبەهانە داتاشی و گەلێکی قوونەجوولە کرد؛ بەڵام مینگە و فینگە دادی نەدا و بە زۆرەملی پێش خۆیان داو بردیان و پاشاش دەست بەجێ فەرمانی داو لە کونەڕەشی زینداییان

پەستاوت. لەو گەرم و گوڕی بگرە و بەردەیەدا، یاقووب بەگ کوڕی سەیدمحەمەد بەگ ڕای کرد و خۆی دەرباز کرد. حەسەن بەگی مەحموودی -کە ماکی گەر و سەرەسۆدرەکە ئەو بوو- بە فەرمانی ئەسکەندەر پاشاچەند کۆیلەیەکی برد و کەوتە شوێن یاقووب بەگ کە بیگرێتەوە؛ یاقووببەگ زانی لە بەریان دەرناچێ، خۆی هاویشتە ماڵی شاقولی بلیلان و لای وابوو هۆزی پنیانشی پەنای دەدەن و دەیپارێزن و دەیکەنەوە بە حاکمی هەکاری. شاقولی ئەگەرچی نمەکخوردەی باوکی یاقوویش بوو بەڵام نمەکدانی شکاند و زۆر نامەردانە بزووتەوە. شاقولی و حەسەن بەگ ئاشنا بوون؛ حەسەن بەگیش بە ئاواتەوە بوو تۆوی سەیدمحەمەد لە سەر زەمین نەمێنێ. شاقولی قۆڵی یاقووبی بەست و دایە دەست حەسەن بەگ و ئەسکەندەر پاشاش باب و کوڕی هەر لەجێ کوشتن. ئەوسا زەینەڵ بەگی کردەوە دەسەڵاتداری وڵاتی هەکاری.

یاقووب بەگ سێ کوڕی هەبوون: ئولامە، سوڵتانئەحمەد، میرزا.

ئولامە بەگ ئەگەرچی دەوڵاتی هەکاریدا بەشی نەدرابوو، بەڵام لە دیوانی سوڵتان مرادەوە ناوچەی خۆی پێ سپێرابوو. لە پاشان ئەویشی لێ سێنرایەوە و دەگەڵ عومەری کوڕی هاتنە ئەستەمبوڵ و لەوێشەوە چوونە ناو گۆڕی کور و قووڵەوە.

## زەینەڵ بەگ کوڕی مەلیک بەگ

لە پێشوودا لێ دواین کە زەینەڵ بەگ هەڵێك دژی بابی دەجووڵاوە و چەلێك بەگژ سەیدمحەمەدی مامیدا دەچوو. ئەوەشی لە بۆتان بە سەر هات کە بەسەرهاتەکەمان گێڕایەوە. جا کە لە سایەی پیاوەتی ژنی بەدر بەگ لە مردن خەلەست و گوڕی بەستەوە و گەیشتەوە هەکاری، بۆ ئامادەکردنی کار و باری خۆی کەوتبووە جم و جووڵ و نیازی بوو بچێتە ئەستەمبووڵ؛ لە نەکاو بیستی کەوا ڕوستەم پاشای وەزیر -کە جێ هانای ئەو بوو- لە سەر کار لابراوە. تەواوێك ناهومێد بوو. سەفەری ئەستەمبووڵی چوو، نەشیدەزانی چ بکا؛ لەو بارەوە تووشی سەرگەردانی ببوو. لە پاش لێکدانەوەیەکی زۆر، هاتە سەر ئەو بیرە کە گیر نەبێ و بچێتە ئێران و پەنا بە شاتۆماسب بەرێ؛ بەڵام وەك تێ گرتبوو وا دەرنەچوو. شای ئێران سەیدمحەمەدی بەو نەدا و ڕووێکی خۆشی نیشان نەدا. ماوەیەك

بێدەرەتان خولایەوە و کەس ئاوڕی وێ نەدایەوە. بەڵام لە پڕ دەرووی ڕوونی بەڕوودا کرایەوە و لە ناو قزلباشاندا خەبەر بلاو بۆوە کە ڕوستەم پاشاگەڕاوەتەوە سەر کورسی وەزارەت. ئەم خەبەرە زەینەڵ بەگی بووژاندەوە و بلێسەی دلساردی کوژاندەوە و بە بێ خۆ گرتن و وەستان، ڕووی کردەئاستانەی سوڵتان و لاشیپانەی دەرگای ماچ کرد و خۆی گەیاندەلای ڕوستەم پاشا؛ کە جێگەی هانا و هاوارانی بوو. بەڵام ئەو جاریش تیری سەری کرد و نەیپێکا. ڕوستەم پاشاحاشای لە دۆستایەتی کۆن کرد و بە مۆنیکەوە دواندی و بە گیمرەگیرِ لە باتی وڵاتی هەکاری، ناوچەی بوسەنەی لە وڵاتی ڕۆمئیلی پێ سپارد، کە بە دەرامەتەکەی بژی. ئیتر ناچار لە بوسەنە مایەوە تا چەند شتێکی گرینگ لەو ماوەدا هاتە کایەوە.

یەك لەوانە کوژرانی سەیدمحەمەد بوو لە لایەن میری میرانی وانەوە و بەهانەکەش ئەوە بوو کە لە پاش گیرانی قەڵای وان، سەیدمحەمەد لە نێوان شازادەسوڵتان مستەفا[1] و شاتۆماسبدا نامەی ئاڵوگۆڕ کردوون و قسەی بۆ یەکتر هێناون و بردوون و چەند بوختانێکی‌تریشیان بۆ هەڵبەست و کوشتیان؛ دووەمینیان لە کار بەرکەنار کردنەوەی ڕوستەم پاشابوو.

ئەسکەندەر پاشاتکای بۆ زەینەڵ بەگ کرد و لە ڕۆم ئیلیەوە گوێزایانەوە بۆ وان و کردیان بە جاسووس و زوانگیری خۆیان و بۆ ئێرانیان نارد. جارێك لەو جارانە کە زەینەڵ لە ئێران بوو، لە لای سلماس تووشی بایەندورِ بەگی برای خۆی هات؛ کە ئەویش کارەکەی زەینەڵی بۆ ئێرانیان دەکرد و بەرەو خاکی عوسمانی دەهات. دوو برای جاسوسی دوو دوژمن بەگژ یەکدا چوون و بایەندورِ شکا و زەینەڵ چەند پیاوێکی لێ بە دیل گرت و بە دیاری بۆ وانی هێنانەوە. بەو دیاری هاوردنەی پاروی دەرۆنێ کەوت. ئەسکەندەر پاشاله بەر سوڵتان پاڕاوە کە پاداشتی زەینەڵ بەگ بە وڵاتی هەکاری بداتەوە و سەیدمحەمەدیشی بە کوشتن لە کۆڵ بکاتەوە.سوڵتان هەموو داخوازیەکانی بۆ پێك هێنا.

---

١- چیرۆکی سوڵتان مستەفا ئاوا بووە: دایکی سوڵتان سەلیم کە ژنی سوڵتان سولەیمان بوو، ڕەقیبی بۆ کوڕی خۆی نەدەویست؛ بۆ سوڵتان مستەفای تێچاندبوو کە پیلان دژی بابی دەڕێژێ و دەیەوێ بیکوژێ و هەر ئەویش شا تۆماسبی هەڵناوە هێرش بێنێتەوە سەر عوسمانی. دەگەڵ ڕوستەم پاشاشدا یەکبوون. ژن و ڕوستەم، سولەیمانیان وا لە هەساندا کوڕەکەی خۆی بکوژێ. سوڵتان چووە قوونیە بۆ سەردانی کوڕ. کوڕیش کە ئاگای لە هیچ نەبوو، هاتە پێشوازی باوکی و هەر گەیشتە ناو خێوەت، وەبەر شیرانیاندا و فەراقی ڕەشیان لێ بری. جەمیل

زەینەڵ بەگ کراوە بە فەرمانڕەوای وڵاتی هەکاری و چل ساڵان ئەو مەزنایەتیەی هەر بە دەستەوە بوو. جار و بارەیەك بەهانەدینی برای لە جێگەی ئەو دەکرا بە کوێخای وڵات؛ لە پاشان ئەویش هەر بە دەستی زەینەڵ بەگ و سەیدی خانی کوڕی، کوژرا و شرت و گوم کرا. زەینەڵ بەگ بێبەرهەڵست مایەوە و لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی هەکاری پاڵی دایەوە.

زەینەڵ بەگ چوار کوڕی هەبوون: زاهید بەگ، سەیدیخان، زەکەریا بەگ و برایم بەگ.

زاهید بەگ سەرچەوتی دەگەڵ باوکی دەکرد و لە ڕوی هەڵدەگەڕایەوە؛ لە ئەنجامدا بۆ جێگاکەی پێشووی باوکیان هەڵداشت و لە بوسەنەیان قایم کرد.

زەینەڵ بەگ فەرمانی جێنشینی خۆی بۆ سەیدی بەگی کوڕی لە سوڵتان ساندبوو؛ بەڵام سەیدی بەگ هەر بە لاوی لە سەر ئەسپ گلا و جوانەمەرگ بوو. ئەوجار فەرمانی جێنشینی بە ناوی زەکەریا بەگ کرا و ڕاشیسپارد کە لە پاش مەرگی ناوچەی ئالباق بەشی برایم بەگی چوارەمین کوڕی بێ.

ساڵی ۹۹۲.ك (۱۵۸۵.ز) سوڵتان مراد[1] فەرمانی بە عوسمان پاشای گەورەوەزیردا کە ئازربایجان بگرێ و بە زەینەڵ بەگیشیان ڕاگەیاند کە هێرش بەرێتە سەر وڵاتی قزڵباشان و لە کوشتن و تاڵان درێغی نەکا.

لەو سەروبەندەشدا شاسوڵتان محەمەد و هەمزە میرزای کوڕی لە تەورێز بوون؛ خەبەریان بۆ هات کە زەینەڵ بەگ گەیشتۆتە مەرەند. هێزێکی زۆری تورکمان بە فەرمانی شای ئێران بەرەو زەینەڵ بەگ بەڕێ کران. زەینەڵ بەگ و هەواڵانی تازە لە تاڵانی وڵاتەکانی کرکر و زنوز و مەرەند بەرەو دوا دەگەڕانەوە و زەینەڵ بەگ دەگەڵ چەند کەسێکدا لە نزیك کاروانسەرای ئەلکی خەریك بوون نوێژی ئێوارەیان دەکرد؛ تورکمان بە سەریان دادان و ملیان دەبەر ملی یەك نا و زەینەڵ بەگ و هەواڵانی کوژران و برایم بەگی کوڕیشی بە دیل گیرا.

هێندێك ماڵە سەید و خەڵکی دیکەی مەرەند، تەرمی زەینەڵ بەگیان شاردەوە و دوایی کە عوسمانی تەورێزیان گرت، لاشەکەیان لە مەرەندەوە بردەوە جۆڵەمێرگ و لە مزگەوتێکدا -کە هەر زەینەڵ بەگ دروستی کردبوو- نێژرا. سوڵتان مراد فەرمانی فەرمانڕەوایی هەکاری بۆ زەکەریا بەگ

---

۱- سوڵتان مرادی سێهەم لە ساڵی ۹۸۲.ك (۱۵۷٤.ز) ڕا تا ۱۰۰۳.ك (۱۵۹٤.ز) حوکمی کردووە. جەمیل

تازە کردەوە و برایم بەگیشیان بە دراوێکی زۆر لە قزلباشان کڕیەوە و ناردیانە سەر ناوچەی ئالباق.

## زەکەریا بەگ کوڕی زەینەل بەگ

دوو ساڵ بوو زەکەریا بەگ سەرداری مەڵبەندی هەکاری بوو. لەو کاتەدا کە جەعفەرپاشای وەزیر، بە سەر کاروباری وڵاتی وان و ئازربایجان ڕادەگەیشت، دووزمانان دنەیان داکە بڵێ بە پێی ڕی و شوێنی ئیسلام، دەبێ وڵاتی هەکاری ببێتە بەشی زاهید بەگ کوڕەگەورە و لە زەکەریا بستێندرێتەوە. لەو بارەوە نامەی بۆ سوڵتان نووسی و فەرمانی بۆ دەرکرد و زاهید بەگ هاتەوە سەر وڵاتی هەکاری. خەڵکی وڵاتەکە حەزیان لە زاهید بەگ نەدەکرد و فەرمانیان نەبرد؛ لێی ڕاپەڕین و دەگەڵی بە شەڕ هاتن و زاهید و کوڕێکی لەو شەڕەدا کوژران.

جەعفەر پاشاکە ئەمەی زانیەوە، فەرمانی سوڵتانی بۆ مەلیك بەگ کوڕی زاهید بەگ لە سوڵتان وەرگرت؛ کە ببێتە جێنشینی بابی. لەشکرێکی زۆریشی لە وان و تەورێزەوە ڕەگەڵ خست و چوونە جەستەی زەکەریا بەگ، کە دەری کەن و مەلیك بەگی لە جێگە دانێن. زەکەریا نەیتوانی خۆیان لە بەر بگرێ و هەڵات و پەنای بە سەیدی خانی فەرمانڕەوای ئامێدی برد.

سەیدی خان وای بە باش زانی کە سوڵتانی عوسمانی لە بنج و بناوانی کارەکە ئاگادار بکات. سەنان پاشای وەزیریش خۆی کردەهاریکار و سەر لە نوێ فەرمانێك لە سوڵتانەوە دەرچوو کە زەکەریا بەگ بکرێتەوە مەزنی وڵاتی هەکاری و بەو مەرجە لە جێگەی جاران دابمەزرێتەوە کە هەموو ساڵێ سەد هەزار فلوری بە ناوی دیاریەوە بۆ سوڵتانی عوسمانی بنێرێ.

مەلیك بەگیان بۆ زەکەریا بەگ دەرکرد و ئەویش لەسەر داوای حکومەت هاتە ئەستەمبوڵ و نیازیشی وابوو بە هەر نرخێك بێ ئەو مەزنایەتیە بەلای خۆیدا بچەرخێنێتەوە؛ بەڵام ئازاری چاوقوڵکە فریای کەوت و بارگەی پێ لە گۆڕستان خست.

لە سەرەتای ساڵی ١٠٠٥.ك (١٥٩٦.ز) دائەبوبەکراغای کوێخای زەکەریا بەگ -کە پیاوێکی ڕاست و دروست و سەرناس و کەیخودا بوو- لە ئەنجامی دووزمانی کردنی فەخرەدین ناوێکدا کوژرا. ئەو فەخرەدینەش چەند ساڵێك بوو کاروباری زەکەریا بەگی لە پاتەختی دەوڵەتدا ڕادەپەڕاند.

چیرۆکی بە کوشتدانی ئەبوویەکراغاش ئاوا بوو:

منداڵانی شاقولی بلیلان، بە هۆی سەیفەدینی برازایانەوە، ناوچەی خۆیان لە دیوانی عوسمانیەوە درابوویە و دەستەبەری چەند مەرجێك ببوون. فەخرەدین بەرهەڵستی ئەو کوڕانەی شاقولی کرد و لە لایەن دیوانی سوڵتان محەمەدخانی خەزاکەرەوە[1]، ناوچەی خۆی بۆ حەسەن بەگی کوڕی سەیدیخان بەگی برازای زەکەریا بەگ وەرگرت. ئەو کردەوەی ئەو فەخرەدینە بوو بە هۆی دوژمنی و کینەی نێوان ئەو دوو بنەماڵە کە لە سایەی کەیخودایەتی ئەبوویەکراغادا زۆریان نێوان خۆش بوو. ئیتر لەو ڕۆژەوە لێك دەخەفتان و سێبەری یەکتریان بە تیر دەنگاوت.

برایم بەگ کوڕی زەینەڵ بەگ چەند جارێك لەشکری بردەسەر خۆی کە داگیری بکات و سەیفەدین بەگژیدا دەهاتەوە و ئاوا گەلێك خوێنڕێژی کەوتە نێوان و زۆر کەس لە هەر دوولا بە کوشت چوون. برایم بەگ هاواری بۆ زەکەریا بەگ دەنارد کە لەو شەڕانەدا کۆمەگی پێ بکا؛ بەڵام ئەبوویەکراغا لاگری شەڕ و ئاژاوەنانەوە نەبوو؛ نەیدەویست دوژمن و خوێنەخوێ بۆ ئاغای پەیدا بن. ئەوانیش دەستیان بە ڕووی برایمەوە نەدەنا؛ بەڵام هیمدادی زۆر کەم و ڕواڵەتییان بۆ دەنارد.

سەنان پاشاکرابووە میری میرانی وان. زەکەریا بەگ ئەبوویەکراغای بە دیاری و پێشکێشەوە ناردەبەخێرهێنانی سەنان پاشا. فەخرەدینی ناوبراو بە هەلی زانی کە بەڵایەك بەسەر ئەو پیاوە باشە بێنێ؛ دەگەڵ حەسەن بەگی کوڕی سەیدیخاندا ڕێك کەوتن و بە شوێن ئەبوویەکراغادا چوونە وان. هەر دووکیان دەیانزانی کە سەنان پاشاکابرایەکی زۆر چاوچنۆك و پووڵپەرست و خوێڕییە؛ چوونە لای و لە زمان زەکەریا بەگەوە پێیان گوت: بەگ دەڵێ بۆیە ئەبوویەکراغا بە دیارییەوە بۆ ناردووە کە لێی بێزارم و دەمەوێ لە چنگی ڕزگار بم. ئەگەر پاشائەو کابرایەم لە کۆڵ کاتەوە من سێ خەروار زێڕی بە دیاری بۆ دەنێرم. سەنان پاشاکە ناوی زێڕی بیست، وەخت بوو لە خۆشیان زیرە بکا. هەر ئەبوویەکراغا هات گرتی و بەبێ

---

[1] سوڵتان محەمەدی سێهەم لە ١٠٠٣وە تا ١٠١٤.ك حوکمی کردووە. جەمیل

هیچ پرسوڕا کوشتی.

ئێستا کە ساڵی ١٠٠٥.ك (١٥٩٦.ز)یە زەکەریا بەگ لە جۆڵەمێرگی بنکەی خانەدان، فەرماندارە و برایم بەگیش بە سەر داهاتی ئاڵباق ڕادەگا. بە هومێدم لە کرداری چاکدا سەرکەوتوو بن.[1]

١- ئەمین‌زەکی لە هێندێك مێژووانی دەگێڕێتەوە کە حکومەتی هەکاری هەتا ساڵی ١٢٦٤.ك (١٨٤٥.ز) هەر ماوە و تا ساڵی ١٠٤٩.ك (١٦٣٩.ز) میر عیمادەدین ناوێکی لە سەر بووە و بە دوای ئەویشدا چەند ئەمیرێك هاتوون و نورەڵلا بەگی حاکمی بۆتان دوامین میری ئەو بنەماڵە بووە و لە ئەولیا چەلەبی دەگێڕێتەوە کە هەکاری میرنشینێکی زۆر بەهێز بووە و هەمیشە دەهەزار چەکداری ئامادەی هەبووە و دەشیتوانی لە وەختی شەڕدا لەشکرێکی پەنجاهەزار نەفەری ساز بکا. ئیتر شتێکی‌تری وامان دەسگیر نەبوو کە بەسەرهاتیان تا ئەم دەمانە بێنێ. جەمیل

# بەندی سێهەم

## فەرمانڕەوایانی ئامێدی ( عیمادیە )

### کە بە بادینانی بەناوبانگن

خۆشبێژانی دیوەخانی دەنگ و باسان و چیرۆکبێژی بەسەرهاتی مێرخاسان، بۆمان باس دەکەن کە بنەچەکەی فەرمانڕەوایانی ئامێدی بە گەورەیی و سەرناسی دەگاتەوە سەر بنەماڵەی پادشاکانی عەبباسی؛ بەڵام وردەکاران و زانیارانی لێزان، دان بەو مەبەستە دانانێن و لایان وایە هەڵبەستەیە و تەنیا پیاوێك لە باپیرانی ئەو میرانە -کە ئازا و گەڕناس بووە- ناوی هەباس بووە. ئەوانەش خۆیان بەو هەباسەوە ناساندووە و ناوەکەیان بەخۆوە نووساندووە. ئەوانە لە ڕۆژی خۆیدا لە وڵاتی شەمزینانەوە بەرەو ئامێدی هاتوون و بەرلەوەش کە ئەو کۆچ و بارە بکەن، قەڵای تارونیان بە دەستەوە بووە کە سەر بە شەمزینانە. ئەو کەسەش کە دەپێشدا ماڵە خۆی لە شەمزینانەوە هێناوەتە ئەو ناوە، ناوی بەهائەدین بووە. بەو هۆیەوە ئەو بنەماڵەی کە لەو کەوتۆتەوە، بە بادینان ناویان ڕۆیشتووە. ئەوەی کە هیچ گومانی تێدا نەبێ ئەوەیە کە نزیکەی چوارسەد ساڵە ئەو بنەماڵە لە ئامێدی فەرمانڕەوا و دەسەڵاتدارن.

قەڵای ئامێدی قەڵایەکی تازە ئیجادەو عیمادەدین زەنگی -کە لە سەر مووسڵ و شنگال والی بووە- درووستی کردووە. قەڵا و شار لە سەر بەردێکی جەغزی و پان بنیات نراوە و لە هێندێك جێگاوە ئەو کەفرە گەورە بەرزی سەد گەز و لە برێ لاوە پەنجا هەتا شێست و لە جێ جێش بیست گەزێك لە تەختی عەرزەوە بەرزە. دوو چاڵاو لە ناو قەڵادا لێ دراون، ناوی مەدرەسە و گەرماو و جەماوەری ناو دژەکە دابین دەکەن و خەڵکی شاریش بە مەشکە و کوندەو بارەبەران لە هەندەران ئاو دەکێشن و دەیبەنە سەرەوە.

زمانی دانیشتووانی ئامێدی و ئاکاریان عارەبی و کوردی تێکەڵاوە و هەموو خەڵکەکەی بە تێکڕایی لە خواترس و خێرەومەند و چاکەکار و دەست بڵاوە. فەرمانڕەوایانی ئامێدی مزگەوت و

مەدرەسەیان زۆر بینات ناوە و مەلای زۆر زانا و بەناوبانگیان بە سەرەوە داناون و بە ڕێبەری و ئامۆژگاری بەهرەی زۆریان بە خەڵك گەیاندووە.

هۆزە گرینگەکانی لای ئامێدی یەکەم مزووری[1] و دووەم زێبارین. زێ ناوی چەمێکە لەو ناوە و چونکە ئەو هۆزە لە سەر کەناری ئەو ڕووبارەن، بە زێباری ناو براون. هەر ئەو چۆمە، چەمە شێتەشی پێ دەڵێن. چونکە ئەوەندەخور و بە تەوژمە، ئەو ناوەی بەسەردا براوە.

هۆزێکی دیکە لە ئامێدی ناوی ڕادکانیە کە ئێستا کوردەکان ڕێکانی پێ دەڵێن و هۆزەکان پەروەری[2] و مەحەل[3] و سیابروی و تیلی و بوهلی[4]ش هەر لەوێ نیشتەجێن. بوهل بە شێوەی ئەو وڵاتە بە شیوو گەلی دەڵێن.

یەك لە قەڵا بەناوبانگەکانی ئامێدی قەڵای ئاکرەیە کە شارۆکەیەکی بە لاوەیە و هەزارودووسەد ماڵێکی موسوڵمان و جووی لێیە. قەڵاکانیتریشی قەڵای دهۆك و قەڵای دێرن کە میرزادەکانی ئامێدی بە سەریان ڕادەگەن. قەڵای بوشریش هەیە بە دەست هۆزی ڕادکانیەوەیە و قەڵادەو شووش و عیمرانی و بازیران[5]یش قەڵان و بە دەست زێباریانەوەن.

ناوچەی زاخۆش هەر سەر بە ئامێدیە و دوو هۆزی کوردی لێ هەن: سندی و سلێمانی[6] و خەڵك بە زاخۆ دەڵێن وڵاتی سندیەکان. زۆربەی زانایان و هۆزانانی کوردستان لەوێوە پەیدا بوون. لە ڕۆژگاری پێشیندا زاخۆ سەر بە ئامێدی نەبووە و حاکمی سەربەخۆی هەبووە. لە دواییدا -کە مەزنەکانی زاخۆ بێ هێز و کەنەفت ببوون- فەرمانڕەوایانی ئامێدی لە دەستیان دەرێناون و خستوویانەتە سەر وڵاتی

---

١- ئەمینزەکی دەڵێ: هۆزی مزووری لە بنەچەکەی مەیسوورین کە لە ڕۆژگاری پاشا سناخریبی ئاشووریدا لەو ناوچە دەژیان. جەمیل

٢- ئێستا بە ناوی بەرواری دەناسرێن. هەژار

٣- مەحلمی هۆزێکن عەرەبی و کوردی تێکەڵ داخێون. هەژار

٤- وێدەچێ هۆزی بۆلی لەوانەبن. هەژار

٥- زۆر وێ دەچێ ئەمە بارزان بێ و دەنووسیندا تێك چوو بێ. هەژار

٦- ئێستا بەناوی «سلێڤانی» بەناوبانگە. هەژار



خۆیانەوە. ئێستاش یەکێك لە بنیچەی ئەو کۆنە کاربەدەستانەی زاخۆ، هەر ماوە و یوسف بەگی ناوە و لە لای حاکمانی جزیرە دامەزراوە.

هێندێك لەوانەی کە لە بنەچەکەی بەهائەدین، بەسەر ئامێدی ڕاگەیشتوون، هەر ناویان بۆ ئێمە نەزانراوە و ئەوانەش کە دیارین و ئاشکرایە -بە یاری خودا- بە شوێن یەکدا دەیاننووسین:

### ئەمیرزەینەدین

لە ڕۆژگاری دنیاداری وخونکاری خاوەن شکۆ، ئەمیرتەیمووری کورەکانی و لە دەورانی شارۆخ سوڵتانی کوڕە گەورەیدا، فەرمانڕەوای ئامێدی ئەمیرزەینەدین بووە و بە سەربەرزی و شانازی و بە کامەرانی و خۆشگوزەرانی ڕاییواردووە و کاتێ ئەو پایەباڵایەی دۆست لاوێنەوەی دوژمن تاوێنەوە، ڕووی کردۆتە باغ و باغاتی بەهەشتەوە، سەیفەدینی کوڕی جێگەی گرتۆتەوە.

### ئەمیرسەیفەدین

لە پاش مەرگی میرزەینەدین، میرسەیفەدینی کوڕی بوو بە جێنشین، سایەی دادی ئەو دادەگەرە، هەموو کەسی گرتەوە و بەهرەی دەهندەیی ئەو دلۆڤانە، هەموو ژان و کوڵ و کۆڤانی لە بیر هەژاران بردەوە. کە ئەویش بەرەو سەراوپەردەی نەمان لای کردەوە، دوو کوڕی بە یادگار لە سەر شانۆی ڕۆژگار بەجێ هێشتن: حەسەن و بایرك.

### حەسەن کوڕی سەیفەدین

حەسەن کرا بە جێنشینی میرسێوەدین و لە زەمانی فەرمانڕەوایی ئەودا، پادشایانی ئاققۆینلوو (مەڕەسپییانی) لەشکرێکیان بە سەرکردایەتی سولەیمان بەگ بیژەن ئوغلوو نارد کە ئامێدی داگیر بکا. سولەیمان هات و توانی قەڵای ئاکری و قەڵای شووش بگرێ؛ بەڵام هەرچی کرد و کۆشی، هێچی دەگەڵ قەڵای ئامێدی بۆ نەکرا و بە ناهومێدی دەستی لێ هەڵگرت. لە دوای ئەوە کە ئاققۆینلووەکان لە ئارادا نەمان و ڕوو بە نەمان گلار بوونەوە و سەفەوی جێگایان گرت، میرحەسەن چووە لای

شائیسماعیل و گەلێکی ڕێز و پایە بۆ پەیدا بوو.[1]

قەلای دهۆکی لە هۆزی داسنی ساند و خستیە سەر مەلبەندەکەی خۆی. ناوچەی سندیشی لە سندی سەند و فەرمانڕەوایی سەربەخۆی پێشووی لێ ڕیشەکەن کردن. کەوشەنی ولاتەکەی زۆر بەولاوە برد و سەرزەمینی قەڵەمڕەوی گوشاد و هەراو کردەوە. کە خودای بێهاوتا ئەویشی لە سەر زەوی هەلکەند و بۆ مەلبەندی نەمانی بردەوە[2]، حەوت نێرینەی لەسەر دنیا مان: سولتانحوسێن، سەیدیقاسم، مرادخان، سولەیمان، پیربداغ، میرزامحەممەد و خانئەحمەد.

سولتانحوسێن جێگەی باوکی گرتەوە و بەم زووانە باسی خۆی و کوڕانی دەکەم. سەیدیقاسم کوڕێکی ماوە ناوی عەلیخانە. مرادخان نێرینەی لە پاش بەجێ نەماوە. سولەیمان کوڕێکی بە ناوی شاڕوستەم لێ کەوتەوە. پیربداغ کوڕێکی هەبوو. میرزامحەممەد کوڕێکی بە ناوی سولتانمەحموود لە پاش بەجێ ما. خانئەحمەد کوڕێکی ماوە ناوی شایووسفە. بایرك کوڕی میرسەیفەدین کوڕێکی شێتۆکەی هەبوو کە قوباد بەگ، کوڕی سولتانحوسێن، لە سۆنگەی ئەودا بەکوشت چوو.

## سولتان حوسێن

کوڕە گەورەی میرحەسەن و هەلبژاردەی بنەماڵەی هەباس، لە پاش مەرگی بابی بوو بە جێنشین و بە فەرمان و نیشانی جێبەرزی سولتان سولەیمان خان سەرفراز کرا و بەو هۆیەوە پیرۆزبایی فەرمانڕەوایی لێکرا.

ئەو ڕێز و قەدرەی لە سولتانی عوسمانییەوە لەو نراوە، کەس لە کاربەدەستانی کوردستان وای بە خۆیەوە نەدیوە. پایەی لە دیوانی دەوڵەتی عوسمانیدا گەیشتۆتە ڕادەیەك، هەر کەس لە پیاوماقوولانی کوردستان کاریان بکەوتایە دیوانەوە، دەبوایە بەرپرسی ئەو بکەن یان بیکەنە تکاکاری خۆیان و ئەوسا بۆیان هەلدەسووڕا. دەیتوانی بێ پەردەو لەمپەر هەرچی شارەزووی با، ڕوویەڕوو بە سولتانی ڕابگەیەنی و بۆ هەرچی ڕووی لێ نابا، سولتان دڵی نەدەشکاند و بۆی پێك دێنا.

سولتان حوسێن زۆر دیندار و پارێزگار و زانا و زانادۆست و چاکەخواز و گەلخۆشەویست بوو.

---

١- ئەم چوونە لە ساڵی ٩٠٦.ك (١٥٠٠.ز) دابووە. جەمیل

٢- ساڵی ٩٤٠.ك (١٥٣٣.ز) مردووە. جەمیل

سوپایی و ڕەشایی و گەورە و بچووك لە سایەی دادگەری ئەودا حەسابوونەوە. بیمار و دەردەدار و دارا و نەدار، لە خزمەت کردنی ئەودا ملەیان دەکرد و خۆیان بە قوربان دەکرد. هەموو شەوەکی و ئێواران بۆرەپیاگ و هەژاران بە نزا و لالآنەوە لە بەر خوا دەپاڕانەوە کە سایەی ئەو فەرمانڕەوا سایەچەمورەیان لە سەر کەم نەکاتەوە. ماوەی سی سالّی ڕەبەق زۆر بە کامڕەوایی فەرمانڕەوایی ئامێدی کرد و هومێدی ئاواتخوازانی پێك هێنا و سالّی نۆسەدو...[1] کە بارگەی بەرەو بەهەشت لێنا[2]. پێنج کوڕی لە پاش بەجێ مان: قوباد بەگ، بەیرام بەگ، ڕوستەم بەگ، خان ئیسماعیل و سولّتان ئەبووسەعید.

## قوباد بەگ کوڕی سولّتانحوسێن بەگ

لە سەر فەرمانی سولّتان سەلیمخان[3] قوباد لەجێ سولّتان حوسێن دانرا؛ پیاوێکی سەرسۆفیلکە و ئامالّ دەروێش هەلکەوتبوو؛ کابرایەکی بێ ئازار و دلّنەرم بوو. شەوگاری بە نوێژ و شەونوێژان ڕۆژ دەکردەوە و ڕۆژگاری بە ڕاووشکار بەسەر دەبرد. ئەوی ئەو سەری لێ دەرنەدەچوو دنیاداری و مشوورخۆری بوو. بۆ گوناهێکی پچووك سزای زۆر زلی دادەنا؛ کەچی لە تاوانی زۆر گەورە چاوی دەپۆشی و سزای کەم و بچووکیشی پێ ڕەوا نەدەدیت. ئیتر وای لە خۆی کرد هەموو کەسی دەوروبەری لە بەری وەڕەز بوون و خۆیان لێ تەکاندەوە. خەلّکەکە بە دلّ بەیرام بەگیان دەویست و ویستیان ئەوە بوو بچنە ژێر

---

١- لە نوسخەکەی چاپی ڕووسیەشدا دوای نۆسەدەکە سپی ماوەتەوە. مردنی -وەك لە سەر دەرانەی گومبەزەکەی نووسراوە- سالّی ٩٨٤.ك (١٥٧٦.ز) بووە. جەمیل

چونکە قوباد بەگ هەر لە پاش بابی سالّی ٩٧٤.ك (١٥٦٦.ز) بە فەرمانی سولّتان سەلیم بۆتە حاکم، کەوابێ سولّتان حوسێن لە ٩٧٤ دامردووە. عەونی

٢- سولّتان حوسێن حاکمێکی زیرەك و زۆر ئازا و بەجەرگ بووە. زۆری برەو سەندووە و چوار سالآنیش مووسلی لە بەر دەستدا بووە. زۆری خزمەت بە دەولّەتی عوسمانی کردووە و لە پێناوی عوسمانیاندا زۆری کورد فەوتاندووە و سالّی ٩٤٤.ك هێرشی بۆ بردوونە سەر شارەزوور و دەگەلّ تورکان گرتوویە و بۆتە هۆی لەناو چوونی دەولّەتی ئەردەلآن. سالّی ٩٦٠.ك بۆ عوسمانیان شەڕی ئێرانی کردووە و تەورێز و کوردستانی ئازربایجانی بۆ گرتوون و پیاوی خۆی تێ بەرداون و بە ئارەزووی خۆیان ملیان لە تالآن و برۆ ناوە. جەمیل

٣- سولّتان سەلیم کوڕی سولّتان سولەیمانی قانوونی لە ٩٧٤.ك (١٥٦٦.ز)ڕا، تا برانەوەی سالّی ٩٨٢.ك (١٥٧٤.ز) حوکمی کردووە. جەمیل

دەستی ئەو. بەیرام نەیتوانی بەربەرەکانیٚ قوباد بکا و ڕووی کردەقەزوێن و بە دیدەنی شائیسماعیلی دووەم بەختەوەر و بە بەڵێن و لاواندنەوەی شاهانە سەرفراز کرا.

هۆزی مزووری -کە زۆر لایەنگیری بەیرام بەگ بوون- لە بەر فەرمانی قوباد چوونە دەریٚ و شۆڕشیان کرد و لە سەر کاریان لابرد و سولەیمان کوڕی بایرکی ئامۆزازای قوبادیان -هەر بۆ گاڵتە- لە جێگەی ئەو کردەمەزنی خۆیان.

زەینەڵ بەگ فەرمانڕەوای هەکاری -کە زۆر لە قوباد بەگ دڵپڕ بوو- پیاوی خۆی ناردەئێران و بایرام بەگی لە زیندانی شاسوڵتان محەمەد ڕزگار کرد و هێنایەوە لای خۆی. قوباد بە هاتنەوەی بایرام زۆری ترس ڕێنیشت و حوکمی ئامێدی بەجیٚ هێشت و بەرەو مووسڵ و شنگال ڕای کرد.

بایرام بەگ بە نیازی مەزنایەتی ئامێدی کەوتە ڕیٚ. سەرداری بەناوبانگ فەرهاد پاشای وەزیری عوسمانی کە بەم کەینوبەینەی زانی، مەڵبەندی زاخۆی بە فەرمانێك بە بایرام بەگ سپارد. قوباد بەگ لەو ترس و لەرزەدا لە مووسڵەوە هاتە دیاربەکر و لەوێشەوە خۆی گەیاندەئەستەنبوڵ؛ چاوی بە سیاوش پاشای گەورە وەزیر کەوت و گلی و گازنی خۆی لە لا کرد. سیاوەش پاشافەرمانی فەرمانڕەوایی ئامێدی بۆ نویٚ کردەوە و بەرەو ئامێدیٚ بەڕیٚ کردەوە.

لە ڕێی گەڕانەوەی، کە گەیشتە قەڵای دهۆك، وای بە باش زانی ماوەیەك لەوێدا بمێنێتەوە و ئاژاوەچی و بەدفەڕان دەگیر بخا و تۆڵەی خۆیان لیٚ بستێنێتەوە و کەنگیٚ نەیاری لە سەر ڕێگە لابردن، ئەوسا بە ئارخەیانی بچێتە ئامێدی و بە یەکجاری پاڵ داتەوە و بحەسێتەوە.

سولەیمان کوڕی بایرك -کە باسمان لێوە کرد- دەگەڵ میرمەلیکی مزووری، کاکە و برالەی خۆیان کرد و کۆمەڵێك دز و پیاوکوژ و شەڕفرۆشیان لە خۆ کۆ کردەوە و هاتنە دەورەی قەڵای دهۆك و گەڕیان دەقوباد بەگ هاڵاند. لە بنەوە دەگەڵ دژدارانداپێك هاتن کە دژی قوباد بن و لیٚ گەڕێن بەربادی کەن. بە دزی دەرگای دژیان بۆ کراوە و پیاوکوژ ڕژانە ناو قەڵاوە و دەستیان بە قەڵاچو کردن کرد. قوباد بەگ و کوڕێکی و کۆمەڵێکی زۆر لە هاودەستانی لەو شاڵاوەدا کوژران و شڕەخۆر بە قەڵا وەربوون و هەرچی لە بەرد نەرمتر و لە بەفر گەرمتر بوو بردیان.[1]

---

١- ئەم ڕووداوە ساڵی ٩٨٤.ك (١٥٧٦.ز) ڕووی داوە. جەمیل

بایرام بەگ وەختێ بەو کارەساتەی زانی، بە هەڵەداوان لە زاخۆ دەرکەوت و هاتەوە ئامێدی و ناو هۆز و خزمانی. سولەیمان بەگ و میرمەلیکی مزووری وایان دانا کە بایرام بەگ بە سەر وڵاتەکە ڕابگات و ئەویش نەیدەویست لە بیر و بڕوای هۆز و تیرەکان سەرپێچی بکا؛ خۆش و ناخۆش ملی داو هاتەوە سەر کورسی فەرمانڕەوایی.

سەیدیخان و سوڵتان ئەبووسەعیدخان کوڕانی قوباد بەگ بە گریان و قوڕپێوان ڕێ دەشت و کێوانیان دایە بەر و خۆیان گەیاندەبەر بارەگای سوڵتان مرادخان.

## بەیرام بەگ کوڕی سوڵتان حوسێن بەگ[1]

دەپێشدا نووکی خامە ئەمەی بۆ خستینە ناو نامە کە: بایرام بەگ لە ترسی قوباد بەگی برای، نەیکرا لە ئامێدی بژی و خۆی هاویشتە بەر پەسیوی شائیسماعیلی سەفەوی و زۆری پایە و مایە دەسکەوت.

لە پاش مەرگی شائیسماعیل، شاسوڵتان محەمەدی برای -کە کرابووە شا- بەیرام بەگی دەدزا و حەزی لە چارەی نەدەکرد و زۆر بە دەرد و سزا هەڵیداشتە ناو قەڵای «ئەڵەمووت» و لە گۆشەی زیندانی توند کرد. زەینەڵ بەگ فەرمانڕەوای هەکاری، خۆی کردەتکاکاری و پاش کۆشش و تەقالای زۆر، توانی ئەمیرخانی والی تەورێز ڕاست بکا و دەگەڵی پێك هات کە پێنج هەزار فلووری بە ناوی دیاری و پێشکەش وەرگرێ و دەگەڵ شاسوڵتان محەمەد پێکەوە بەشی کەن و بایرام بەگی ناو قەڵای ئەڵەمووتی بۆ بەردەن و بینێرنە لای ئەو.

بە پێی بڕیارەکە سەودا سەری گرت و زەینەڵ بەگ دراوی خستە ناو مشتی پیاوی ئەمیرخان و ئەوانیش پەلی بایرام بەگیان گرت و دەناو لەپی زەینەڵ بەگیان نا و هێنایەوە و هەر وەك لەمەوبەر گوتمان، بەیرام بەگ کرایەوە بە فەرمانڕەوای ئامێدی و ئەوەندەسەردارێکی بەهرەدار و پیاوچاك و دڵپاك و گەڵدۆست و پێ بەودم و سایەچەور و هونەروەر بوو کە بە خەیاڵی کەسدا نایە. ناوبانگی پیاوەتی و لە گەڵ نزیکی و خوێنشیرینی ئەو دنیادارە بەختیارە بە هەموو لایەکیدا تەنیەوە و

---

١- لە ژمارە ٥٧١٩ی *جریدةالاخباری* بەغدا لە مەقالێکدا نووسراوە: ئەو بایرام بەگە ساڵی ٩٥٤.ك (١٥٣٨.ز) لە دایك بووە و شەش ساڵ حاکم بووە و ساڵی ٩٩٤.ك (١٥٨٦.ز) کوژراوە.

گەیشتەوە بەر گوێی عوسمان پاشای گەورە وەزیری عوسمانی و سەرداری لەشکری سەر عەجەم و ئەویش دەم و دەست لە قەستموونیەوە فەرمانی فەرمانڕەوایی ئامێدی بە مۆرکراوی بۆ نارد. لەو لاشەوە سەیدی‌خان کوڕی قوباد بەگ، دادی خۆی بردەلای سولتان مراد و نووك و بەدی بەسەرهاتی لە بەردەم دانا کە چۆن ئەو هۆز و تیرانە لە باوکی ڕاپەڕیون و چۆنیان سەری باب و برای بڕیوە و چۆنیان ماڵ و ناو ماڵ دزەیوە و سەرباریش بەیرام بەگیان بە سەر ئامێدیەوە داناوە.

سولتان مراد دڵی دایەوە و فەرمانی ئامێدی بدرێتەوە بە سەیدی‌خان و بە فەرهاد پاشای سپارد کە دەبێ یاغی و ئاژاوەخوازان سەرکوت بکا و بەیرام بەگیش بکوژێ.

فەرهاد پاشابۆ ئەوە کە بایرام بەگێ قوشقی نەکا و بێ قرە و فرە دەگیر کەوێ، بۆ چێشتەخۆری نامەیەکی بۆ نارد و زۆری بە بەژن و باڵای هەڵگوت و پێی ڕاگەیاند کە ویستمان پترت بلاوێنینەوە؛ جا چونکە بە فەرمانی پیرۆزی شاهانە دەبێ ئامێدی بۆ سەیدی‌خان بێ، ئەوا ئێمە ناوچەی حەسەنکێفمان بۆ خستیە سەر زاخۆ، کە تۆی پێ ڕابگەی و تۆڵەی ئامێدیمان بۆ کردوویەوە. ئەمساڵیش دەگەڵ سوپای بێ‌هاوتای عوسمانیدا دەچیە سەر گورجستان و ئەگەر گورج‌وگۆڵ بی و بتوانی لەو شەڕەدا ناودەرکەی و خزمەت بە پادشابکەی، لە گەڕانەوەدا دڵسۆزی و نۆکەری تۆ بە خزمەت سولتان دەگەیەنین و ئەگەر خوا حەزکا فەرمانڕەوایی ئامێدیشت بۆ وەردەگرینەوە.

بایرام بەگی گێلۆکە و بەستەزمان، بەم چاپ و چووپانە فریوی خوارد و دەستی لە فەرمانڕەوایی هەشت مانگەی ئامێدی بەردا و دوو دەستەکی نایە ناو پەنجەی پۆلایینی سەیدی‌خانەوە و ڕکێفی هێنایە و چووە حەسەنکێف و لەوێشەوە خۆی کردەپێشمەرگەی لەشکری بێ‌سەروبنی سەرداری سەرکەوتووی عوسمانی و ڕووی کردەگورجستان.

کاتێ کە لە گورجستانیش گەڕایەوە -هەر لە ڕێدا- سەرداری ناوبراو پاداشتی دایەوە و لە قەڵای ئەرزەڕۆمدا لە گۆشەی زیندانی ڕەشدا جێگەی بۆ کردەوە! ئیتر چی بە سەرهات، دوایی دەیزانین.

## سەیدی خان کوڕی قوباد بەگ

سولتان مراد هەر لەو کاتەدا کە فەرمانی ئامێدی بۆ سەیدی‌خان دەرکرد، ولامیشی بۆ میری میرانی بەغدا و شارەزوور و هەموو خاوەن دەسەلاتانی کوردستان نارد کە ئەگەر دنیابوو بایرام بەگ

سەری بۆ فەرمانم نەچەماند و بە ئەنجامی نەگەیاند و ئامێدی نەدا بە دەستەوە، ئەوا هەمووتان گەلەکۆمەگی لێ بکەن و بچنە ویزەیی و بە زۆرەملێ دەریپەڕێنن و سەیدیخانی لە جێ دانێن.

کاتێ سەیدیخان گەیشتە مووسڵ، بایرام بەگ ئامێدی بەجێ هێشت و لە ناوەڕاستەکانی مانگی قوربانی ساڵی٩٣٣.ك (١٥٨٥.ز)دا سەیدیخان بە کۆمەگی خاڵی -کە سولەیمان بەگی میری سۆران بوو- هاتەوە سەر ئامێدی و جێگەی باوکی خۆی گرتەوە.

فەرهاد پاشاکە لە سەفەری گورجستان گەڕایەوە و بارام بەگی گرت، ناردی بە شوێن سەیدیخاندا و هێنایە ئەرزەڕۆم و دراوێکی یەکجار زۆری بە ناوی بەخشش لێ وەرگرت و دنەی داکە داوای خوێنی بابی لە بایرام بەگ بکا.

داواکە خرایە بەردەمی شەرعەوە و خوێنی قوباد بەگ بە سەر بایرام بەگ داسەپێنرا و درایە دەست برازای باو کوژراوی و ئەویش ساڵی ٩٩٤.ك (١٥٨٥.ز) مامی لە تۆڵەی بابیدا کوشتەوە.

وا ئێستا بۆتە یازدەساڵ کە سەیدیخان فەرمانڕەوای ئامێدییە و بگرە و بەردە و گیروداری ئەو ناوە هەر بە ویە و کەس ناتوانێ پەل ببزێوێ و کەس زات ناکا بلێ لەل.

ئەگەرچی هەتا ماوەیەك هۆزی مزوری زیری و زوریان دەکرد و ئاژاوەیان دەنایەوە، بەڵام زۆر زوو لە دەمیدانەوە و هێندێکی لێ کوشتن و ئەویتری ڕام کردن و ئاوری سەرپێچی دامرکاند.

لە ڕاستیدا سەیدیخان لاوێکە بەکار و هەڵکەوتە و ئازا و بە دەست و دڵ و لەشکر و خەڵك و خوا خۆشیان دەوێ و لە سایەی ئەودا کەوتوونە خۆشی و شادیەوە. هومێد وایە لە کاری چاکدا هەر سەرکەوتوو بێ.[1]

---

١- ئەمینزەکی لەتاریخی *دوەل و ئەماراتی کوردی*دا درێژە بەو باسە دەدا و دەڵێ: وادیارە لەپاش سەیدیخان یوسفخان بۆتە فەرمانڕەوای ئامێدی و مەلیك ئەحمەد پاشای والی دیاربەکر هێرشی بردۆتە سەر و ساڵی ١٠٤٨.ك (١٦٢٨.ز) گرتوویە و لە دیاربەکر خستوویەتە زیندانەوە و سەرانەیەکی زۆری لێساندووە و بەریداوە. لە پاش ئەویش کوڕەکەی بۆتە میر و زۆر دەسەڵاتدار بۆوە و ساڵی ١٠٧١.ك (١٦٦٠.ز) دەهەزار سوار و دەهەزار پیادەی شەڕی هەبووە.

ساڵی ١١١٢.ك (١٧٠١.ز) قوبادپاشا میری ئامێدی بووە. بۆ دامرکاندنی شۆڕشی مونتەفیك -لە باشووری عیراق- دەگەڵ لەشکری مووسل و دیاربەکردا هاتووە.

ساڵی ١١٣٨.ك (١٧٢٦.ز) بارام پاشای گەورە کوڕی زوبێر پاشا کوڕی قوباد پاشا کوڕی ئەمیر سەعیدخان ←

← کوڕی سوڵتان حوسێن، بە سەر ئامێدی ڕاگەیشتووە؛ کە ساڵی ١١٠٧.ك (١٦٩٩.ز) لە دایك بووە و ساڵی ١١٣٨.ك (١٧٢٦.ز) بۆتە میر و گەشەی زۆریشی بە وڵاتەکەی داوە.
لە پاش مەرگی ئەویش، سمایل پاشای کوڕی بۆتە جێگری و ماوەیەکی زۆر لە سەر حوکم بووە. زۆر جار دەگەڵ براکانی پێك هەڵپڕژاون؛ کە لێرەدا باسی ناکرێ. ساڵی ١٢١٣.ك (١٧٩٦.ز) مردووە و مرادخانی کوڕی بۆتە جێنشین و ئەویش دەگەڵ محەمەدتەیار و قوباد بەگی برای خۆیدا -کە حاکمی زاخۆ بوو- ساڵی ١٢١٤.ك (١٧٩٩.ز) بەشەڕ هات و والی مووسڵ ناوبژی کردن.
ساڵی ١٢١٥.ك (١٨٠٠.ز) لەشکری عوسمانی چووە سەر ئامێدی و قەڵای ئاکرێیان لە ئامێدی دابڕی و دایان بە قوبادبەگ و لە ئەنجامدا هەر قوبادبەگ ساڵی ١٢١٨.ك (١٨٠٣.ز) ئامێدی گرت و ساڵی ١٢١٩.ك (١٨٠٤.ز) هۆزی مزووری چوونە سەر قوبادپاشا و گرتیان و خستیانە گرتووخانەوە.
ساڵی ١٢٢٠.ك (١٨٠٥.ز) عەلی پاشای والی بەغدا لەشکرێکی زۆری میرانی سۆران و بابانی ناردەسەر ئامێدی و کوردەکان لە ڕێگە لە ناو خۆیاندا تێکچوون. عەلی پاشا محەمەد پاشای جەلیلی والی مووسڵی کردەسەرپشك کە حوکمی ئامێدی بە کێ دەدا، بدا؛ ئەویش دای بە عادلپاشا و خەڵاتیشی کرد. کە عادلیش ساڵی ١٢٢٣.ك (١٨٠٨.م) مرد، زوبێر پاشای برای کرا بە کاربەدەست و ماوەیەکی زۆر دەگەڵ والی مووسڵدا شەڕ و هەرای بوو.
کە محەمەد پاشای کۆرە میری سۆران هێرشی بردەسەر ئامێدی، سەعید پاشای پێ ڕادەگەیشت. دوای نەمانی محەمەد پاشا، سمایل پاشای مەزنی پێشووی عەقرە هاتەوە ئامێدی و محەمەد پاشا بەیرەقداری والی مووسڵی خستە تەنگانەوە. محەمەد پاشای گەورە وەزیر لەشکری هێنایە سەر و بەردەستیکرد و خستیە بەندیخانەی بەغداوە؛ کە تا ساڵی ١٢٦٩.ك (١٨٣٤.ز) هەرما و لە زینداندا مرد. هێندێك دەڵێن لە بەغدا دەسبەسەر بووەو عەلیڕەزا پاشای والی، چاوێری کردووە و کەریەلاشی پێ سپاردووە و لەوێش لابراوە و هاتۆتەوە بەغدا و لە مزگەوتی شێخ عومەری سوهرەوەردیدا مەدرەسەیەکی گەورەی درووست کردووە و ساڵی ١٢٩٢.ك (١٨٧١.ز) هەر لە بەغدا مردووە.
تاریخی مووسڵ دەڵێ: نووسەرێك تاریخی بادینانی نووسیوە و لە گوندی زیراوی لای ئامێدیە. جەمیل

# بەندی چوارەم

## فەرمانڕەوایانی جزیرە

### کە ئەویش دەکرێن بە سێ بەشەوە

لە وتاری هێژا و بایی‌دار و بەنرخ و سەنگینی باوەڕ پێکراوانەوە و لە ڕووپەڕە نووسراوی ڕەنگینی کۆنە پیاوانەوە وامان بۆ دەرکەوتووە کە زنجیرەی بنەچەکەی فەرمانڕەوایانی جزیرە سەری ئەو سەری بە خالیدی کوڕی وەلیدی هەوالّی پێغەمبەرەوە گیرە.[1]

یەکەم سەروەرێکی کە لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی جزیرە ڕۆنیشتووە، ناوی سولەیمانی کوڕی خالید بووە. سەردەمایەك ئەو خانەدانە خودان پایە و مایە، دابوویانە سەر ڕچەی ئایینی یەزیدیەکان و پشتیان بە ڕەوشتی ئەوانەوە دابوو؛ لە گومڕاییدا دەسووڕانەوە. بەڵام لە ئەنجامدا خودای بەندەپەروەر بوو بە ڕێبەریان و خستنیە سەر شەقامی ئیسلامی ڕاست و بوونە سونی‌مەزهەب و مزگەوت و مەدرەسەی زۆریان ئاوەدان کردەوە و گەلێك گوندی ئاوا و قەوغا و زەوی و زاری بەپیت و ڕێژەویان بۆ مانەوە و پاراستنی ئەو خانەی خودا و فێرگانە دەقەبەڵ کردووە و وەقفنامەیان بۆ نووساوە.

هۆزی بوختی (بۆتی) کە هۆزەکەی ئەوانە و لە مەڵبەندی بۆتانە، بۆ نەترسی و ئازایی و مەردی و نەبەردی ناو بە دەرەوەن و گەورە و گچکە و نەناس و سەرناسیان ڕەشید و دەسکەرەوەن و لە مەیدانداری و چاپكسواریدا لە هەموو کوردستاندا، هەر ئەوان زۆر لە سەرەوەن. چەکی شەڕیان لە لا

---

١- ئەم چیرۆکە درۆیە و چی بەسەر چیەوە نیە. خالیدی کوڕی وەلید نەك هەر کوڕی نەبووە، تەنانەت میراتگریشی نەبووە. ئەگەر مردووە هەر مولکێکی لە مەدینەدا بوویەتی، عەبدوڵلای کوڕی سەلمەی کوڕی عەبدوڵلا دەستی بەسەردا گرتووە. ئەو جار خالیدی وەلید هەرگیز ڕێی نەکەوتۆتە کوردستان؛ هەر هەتا عیراق هاتووە و لە عیراقەوە گەڕاوەتەوە شام. من لام وایە ئەو هۆزەی کە ئەمەیان بۆ خۆیان هەڵبەستووە، پاشماوەی خالدی (هالدی یان کالدی) بن کە لە باپیرانی کەونارای کورد بوون. بەوەشدا دەردەکەوێ کە هەتا ئەم دواییانەش هەر لە سەر ئایینی یەزیدی (یەزدانی) مابوون. وێش دەچێ سەرۆك هۆزێکی پێشوویان ناوی خالید بووبێ. خالیدی کوڕی وەلیدیان پێ ئازا بووە و لایان وابووە ئەگەر بلێن سەربەوین دەبنە نەجیمزادە. جەمیل

نوشتەی سەردڵە و ئەسپی ڕەسەن و کارامەیان بە لاوە گوڵی سەرچڵە و شیـــری جەوهـەردار و دەبـانی ئاودار و ئەسپی بەکاریان پێ لە نان و ئاو و بەرگ باشتـرە. یەك دەنگن و یەك ڕەنگن و لە ڕۆژی هەرا و جەنگدا هەموو شان بە شانی یەك دەوەستــن و بۆ یەك ئامانج ڕیز دەبەستــن و هەر ئەو هۆیەشە کە بە دوژمنانی خۆیان دەوەستــن و ڕێگەی سەرکەوتنیان لێ دەبەستــن و لە ناو کوردستـاندا ناویـان لـە سەرووی ناوانەوەیە.

شاری جزیر شارێکی کەونارایە. ساڵی حەڤدەهەمی کۆچی، لە ڕۆژگـاری خوالێخۆشـبوو عومـەری خەلیفەدا، ئەبوومووسای ئەشعەری و سەعدعەیاز -کوڕی عوســمان- بە بێشەڕ، ئەو شارەیان گرتــووە و سەرانەیان لە خەڵکەکەی ساندووە[1]. هێندێك لە هۆزەکانی عارەبی بەنیتەغلەب -کە لە دەوروبـەری جزیر بوون- سەریان بۆ سەرانە نەنەواند و ماڵی خۆیان ڕفاند و خۆیان گەیاندەشام و پەنایان بـە وڵاتـی ڕۆم برد و لەوێوە پەیامیان نارد کە ئەگەر ناوی سەرانە بگۆڕن و پێی بڵێن یارمەتی و کۆمەگانە، ئـەوا دێنەوە و چیتان دەوێ دەیدەین! ئیمـام عومـەر کـە ئەمـەی بیسـتەوە فـەرمووی: یارمـەتیش هـەر سەرانەکەیە؛ ئەوان بیدەن و بەهەر ناوێك دەیدەن لێیان وەردەگرین. واتا: چ سەر لە بەرد و چ بـەرد لـە سەر!

قەڵای جزیرە کردەوەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزە؛ کە هەشتەمیــــن خەلیفـەی ئەمەویـە و لـە دادگەری و گەلپەروەری و دڵۆڤانیدا بە عومەری دووەمیــن ناسراوە.

لە ڕۆژگاری دەسەڵاتداری ئەمەویەکاندا نزیکەی سەد ساڵ لە سەر بەرزەکی مزگـەوتان و لـە پـێش هەموو نوێژاندا، پێش نوێژ و خودبـەیـێژان نـاو و نـاتۆرەی زۆر ناشیـــرینان لـە ئیمـام عـەلی کـوڕی ئەبووتالب دەنا و ناوی حەسەن و حوسێنی خۆشەویستی خوایـان بـە خراپـە دەبـرد و جـوێن و پـلاری ناشایستیان تێدەگرتن. عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە ڕۆژگاری فەرمانداری خۆیـدا ئـەو جنێودانـەی بەربەست کرد و خەڵکی لەو گوناه و تاوانە ڕزگار کرد.

---

١- لە نوسخەکانی بەردەستماندا وا نووسراوە و لە مێژووی عەرەبانیشدا «عەیاز کوڕی غەنـەم» نووسـراوە؛ کـەوابـێ، ڕەنگە نووسرابێ: بە سەعی (کۆششی) عەیاز کوڕی غەنەم. فەرەجوڵڵا زەکی

قەڵا و شاری جزیر لە کەناری ڕووباری شەتولعەرەب[1] هەڵکەوتووە و لە کاتی لەهی هاتنـدا، ئـاوی ڕووبار دەبێتە دووپاژ و قەڵا و شار دەگرێتە هامێزی خۆیـەوە. بەنـدێکی زۆر گـەورە لـە لای ژووررووی قەڵاوە بە قسل و بەرد هەڵبەسراوە؛ بۆ ئەوە ئەگەر لەهی گـوڕ بـسێنێ و زۆری بـێنێ، زیـان بـە قـەڵا نەگەیەنێ. لە هەموو لاوە پرد لە سەر بەندەکە کراوە و خەڵکی پێدا دەپەڕنەوە و بـەوە بۆتـە دوڕگـە و پێی دەڵێن: جزیری عومەرییە.

لە شاری جزیر و دەوروبەریدا، گەلێك دژی دژوار و ناوچەی هەوا خۆش و سازگار هەیە کە ئێمە لەم نامەیەدا هەر ناوی چاردەقەڵا و ناوچە وە بیـر دێنیـن؛ بۆ ئەوە خوێندەواری بـەڕێز لـە درێـژدادڕینمان وەڕێز و بەبێز نەبن. ئەمەش بەڕێز ناوی قەڵا و ناوچەکانە:

١- ناوچەی گورکێل، کە لە سەر چـیای جوودیـە و دەڵـێن گەمیەکـەی نـووح پێغەمبـەر- دروود لەویش و لە پێغەمبەری خۆشـمان بێ- بە سەریەوە نیشتۆتەوە. لەو ناوچەیەدا حـەوت تیـرە دەژیـن: الف) شەهریوەری ب) شـەهریلی ج) گورکێـل د) ئەسـتوری؛ ئـەم چـوار تیـرە شـیعە مەزهـەبن. ه) نیویدکاون و) شوورش ز) هیودڵ؛ ئەم سێ تیـرەش یەزیدین.

٢-قەڵا و ناوچەی برکە، هۆزی برکەی لێیە و ناوی خۆیانیان لێ ناوە.

٣- دژ و ناوچەی ئاروخ، بە دەست هۆزی ئاروخـەوە و قەڵاکـەی لـە قـەڵا هـەرە هەڵەموتـەکانی کوردستانە.

٤- ناوچە و دژی پروز، سەر بە هۆزی پروزە و ئەوانیش سێ لکیان لێ بۆتەوە. الف) جاستولان ب) بەزم ج) کرافان.

٥- دژ و ناوچەی بادان، کە بە دەست هۆزی گارسیەوەیە.

٦- ناوچەی تەنزی، قەڵاکەی بە ناوی کەلـهۆك ناو دەبرێ و ئەویش هەر هی هۆزی گارسیە.

٧- ناوچەی فنیك، چوار هۆزی لێ دەژین؛ لە باسی فنیکدا دێمەوە سەری.

٨- ناوچەی تور.

٩- ناوچەی هەیتم، زۆربەی دانیشتووەکانی ئەرمەن و عیسایین و زۆربـەی دەرامـەتی حاکمـانی

---

١- ڕووباری جزیر لە پەنای دجلەیە. هەژار

جزیر لەوێ پەیدا دەکرێ. تیـرەی جلەکی لەوێ نیشتەجێن.

١٠- ناوچەی شاخ، خەڵکی ئەوێش زۆربەیان ئەرمەن و فەلەن و هۆزی شیلدیش لـەوێن. شـاخ بـە هەناری چاك بەناوبانگە.

١١- قەڵای ئەشاتل.

١٢- قەڵای ئەرمشات، بە دەست هۆزی براسییەوە و ئەو هۆزە لە هۆزە هەرە بە هێزەکانی بۆتانـە و لە پیاوی چەکدار و لە سامان و داراییدا کەسیان ناگاتێ.

١٣- قەڵای کیوەر -کە قەمیزیشی پێ دەڵێن- هۆزی گارسی و قورشی پێ ڕادەگەن.

١٤- قەڵای دیردە، لـە ناوچـەی تـەنزی هەڵکـەوتووە و هێنـدێکیش عـارەبی بـە دەورەوە هـەن؛ ئەوانیش طهری و سفان و بـنیعبـادەن. زۆربـەی ئەرمەنـەکانی ئـەو نـاوەش بـە عـارەبی داخێـون.

هۆزەکانیتری بۆتانیش ئەمانەن:

١-دونبوڵی ٢- نوکی ٣- مەحـموودی ٤- شێخ بزنـی ٥- ماسـکی ٦- ڕەشـکی ٧- مـخنـەهران ٨- پەیکان ٩- بلان ١٠- بلاستوران ١١- شێرۆیان ١٢- دوتوران.

ئەوی ڕاست بێ ئەمەیە کە هۆزی دونبوڵی و مەحـموودی زۆر لە مێژینەوە لە جزیر پەرپوە بـوون و هەر وەك دەپێشدا پێڕستم بۆ داناون. ئەگەر خوا یاربێ لـە ڕووپـەڕی سـێهەمدا سـەریان دەدەمـەوە و باشتـریان شی دەکەمەوە.

وا ئێستاش دەست دەکەم بە گێڕانەوەی سەربهوردی فەرمانڕەوایانی کوردی جزیر و لە خوا دەخوازم نیازم ڕەواکا.

## سولەیـمان کوڕی خالید

وەك لە پێشدا لێی دواین، یەکەم کەسێکی لەو خانەدانە فـەرمانڕەوایی جزیـری کـردووە سولەیـمانی کوڕی خالید بووە. ماوەیەك ژیانی بە کامەرانی ڕابواردووە و کاتێ ماڵاوایی لـە جیهـانی بـێبەیـمان کردووە، سێ کوڕی بەجێ هێشتووە کە هەرسێکیان شیـرین کور و هەڵبژاردەبوون و ناویان حاجیبەدر و میـرعەبدولعەزیز و میـرئەبداڵ بووە.

میرعەبدولعەزیز لە ناو برایانیدا وەك مانگی چاردەلە ناو ئەستێراندا درەوشاوەتەوە و هەموو بە جەوهەرێك لە حاند ئەو کشاوەتەوە و گەورەیی هەر لە خۆی وەشاوەتەوە و سەرزەوی بە ڕوخساری ئەو گەشاوەتەوە.

ئەستێرەی بەختی دەدرەوشایەوە هەر کارێ دەیکرد هۆی دەدایەوە

بەم پێودانە لە پاش نەمانی میرسلێمان، میرعەبدولعەزیز کرا بە فەرمانڕەوا و ئەویش حاجیبەدری برای ناردەسەر ناوچەی گورکێل و ناوچەی فنیکیشی بە میرنەبداڵ ئەسپارد.

هەرسێك برا پێکەوە شانیان دابەر و سەر و بەریان بە وڵاتدا و ڕۆژگاریان بە خۆشی بەسەر دەبرد و لە گفتی یەك دەرنەدەچوون و لە برایەتی باشدا کارامە بوون و بەسەر نەدەچوون.

## لکی یەکەم

# فەرمانڕەوایانی عەزیزان

میرعەبدولعەزیز سەردەمێك بە حاکمی گوزەراندی و پێمیردی خودای لێ بوو بە میوان و بانگی کردەسەر خوانی کۆچکردوانی جیهانی گوزەران و دەستی پێ لە دنیای پەست بەردا و بردیە مەڵبەندی هەرمان و هەستیەوە. دوو کوڕی بە یادگار لە ڕۆژگاردا بەجێ هێشت: سەیفەدین و ئەمیرمەجدەدین.

### میرسەیفەدین کوڕی عەبدولعەزیز

میرسەیفەدین لە جێی باوکی کرا بە جێنشین. تەواو دایە سەر شۆپی ئەو باوە هێژایە و هەموو ئاکاری بەهرەداری ئەوی ڕەچاو کرد؛ دڵی خەڵك و یاریدەی خوای بۆ خۆی کێشاو دڵی کەسی لێ نەیشاو کوڵ و کەسەری لە دڵ و سەری کلۆل و سەرکزان تەرت و توناو بڵاو کرد. کاتێکیش کە بارگەی بەرەو نەمان تێك نا و دەستی مەرگ بەرگی کتێبی ژیانی لێك نا، براکەی جێی گرتەوە.

### ئەمیرمەجدەدین کوڕی عەبدولعەزیز

لە جێی برا چاکەکەی کرا بە فەرمانڕەوا و ئەویش وەك دەڵێن: «شەندەلە مەندەکەمتر نیە» لە پاکی و چاکی و مشوورخۆریدا لە باوك و برای خۆی تێپەڕاند. بۆتانی وا گەشە پێدا کە تەوس و توانجی دەبەهەشت دەگرت. دێرزەمانێك بە کامەرانی فەرمانڕەوایی کرد و ڕۆژی تەمەن و ژینی کەوتە خۆرنشینی مەرگەوە و لە ئاسۆی دنیای بێ پۆ ئاوا بوو.

### ئەمیرعیسا کوڕی مەجدەدین

شوێنی بابی خۆی گرتەوە و بۆ هەمیشە ئەم شێعرەی کردەسەرمەشقی ژیان کە دەڵێ:

تا هەتا سەربڵند و سەروەر بە     ڕاست و دڵپاك و دادپەروەر بە

دەرگای تەبایی و خێرخوایی و دڵنیایی و پاکڕەوشتی -لە سەر گازی پشت- بە رووی خەڵکدا کردەوە. بۆ چاری دەردەداران و بە سەر کردنەوەی هەژاران، گرۆی لە هەموو سەرداران بردەوە.

لە هەموو تەمەنیدا کەسی بە خۆڕایی دڵمەند نەکرد و قەت هیچ بێسووچ و تاوانێکی تۆزکاڵە تاوێکیش بەند نەکرد.

کاتێ بڵێسەی ژیانی میرعیساش لە ئاییسان کەوت و ئاووگڵ کوژاندیەوە، بەری ئەو شەنگەدارە:

## میربەدرەدین کوڕی میرعیسا

ئەو مانگی چاردەیە -کە ئەسپاردەی پیاوچاکان بوو- بە تیشکی خۆی دڵی ژێردەستانی ڕۆشن کردەوە. هەورێکی مانگی نیسانی بەزەیی هەڵگربوو. بە لووزەو بەخت و هاتی بۆ لێویەباران دادەباراند. دەستی بەخشندەی ئەو هەتوانێك بوو برینی دڵی دڵ بریندارانی سارێژ دەکرد و توێژی پێ دێنانەوە. فرمێسکی لە چاوی گریاوی بێباو و دەربەدەران دەسڕیەوە. دەستی دەستدرێژان و باڵی هەنگاوهاوێژانی ناڕەوا و بێفەڕی دەبڕیەوە.

کاتێ چاوی تێری لە دنیای چاونەزێر پۆشی، ڕۆڵەی شیرینی میرئەبداڵ بوو بە جێنشینی.

## میرئەبداڵ کوڕی میربەدر

دایە سەر شوێنی باب و باپیرانی و هەرگیز بە موو لای نەدا و بە لای هیچ ناڕەوایەکدا لای نەکردەوە و قەوینتی و ڕاسپێری خانەدانی گەورەی لە بیر نەبردەوە.

کاتێ ئەویش ئاڵای فەرمانڕەوایی لە مەڵبەندی نەماندا چەقاند و بەهەشتی بۆ خۆی ستاند:

## میرعیززەدین کوڕی میرئەبداڵ

فەرمانڕەوایی بۆتانی گرتە دەست و لە ڕۆژگاری ئەودا مانگۆکی ئاڵای ئەمیرتەیمووری کورەکان تیرێژی جیهانگیری بە سەر زەویدا پەخشان کرد. وەك مەولانا شەرەفەدین عەلی یەزدی لە *تاریخی زەفەرنامە*دا نووسیویە: پادشای خاوەنشکۆی بێسنوور، ئەمیرتەیمووری کورەکان ساڵی ٧٩٦ك (١٣٩٣و٩٤ز) لە دوای ئەمە کە بەغدای ئارامی داگیر کرد و قەڵای تکریتی کاول کرد و هەموو



ناوچە و مەڵبەند و دژەکانی لەو ناوە خستە ژێر چۆکەوە، رووی کردەماردین. لە چەملیك -کە حەوت فرسەخی دەگەڵ ماردین مەودایە- ئەمیرعیززەدین حاکمی جزیرە هاتە خزمەتی و بە رایەخ ڕاموسانی تەیموور سەرفراز کرا و پێشکەش و دیاری شایانی شانی تەیمووری هێنابوو؛ لە بەر چاوی ڕانا و تەیموور بە چاوی بەزە و خۆشەویستی لێی ڕوانی و دەستەبەریش بوو کە ئازووقە و تفاق بۆ لەشکر بنێری و ئەوسا بۆ وڵاتی خۆی گەڕایەوە.

سوڵتان عیسا کاربەدەستی ماردین هێندێك ڕەفتاری وەها نالەباری دەربارەی چەکدارانی ئەمیرتەیموور کردبوو کە زۆر ناپەسندن و ناکرێ لێرەدا باسی بکرێ. ئەمیرتەیموور نیازی وابوو دەوری قەڵای ماردین بگرێ؛ بەڵام لە بەر زۆری لەشکر و کەم لەوەڕی ئەسپان، وای بە باش زانی جارێ واز لەو بێنێ. ڕۆژی سێشەممە هەشتی مانگی ڕەبیعی دووەمی ئەو ساڵە لە ماردین گەڕایەوە و رووی کردەمووسڵ و لەوێوە خاوەن شکۆی دڵگوشاد پیاوی خۆی هێندێك ساز کردن کە دیاری و شتومەکی نایاب و گرانبایی بۆ خان و شازادەکان بەرنە سوڵتانیە. کوردێك کە ناوی شێخ و لە هۆزی بوختی بوو، کاتێ خۆی لە چەملیك دەگەڵ میرعیززەدیندا بە رایەخ ڕامووسان سەربەرز کرابوو؛ لە لاواندنەوەی شاهانەیشی بەش درابوو؛ تا ئەو ساتە دەناو لەشکری دنیاگردا بوو. ئیزنی خواست کە دەگەڵ کاروانەکەدا بڕوا و بچێتەوە ماڵی خۆی. ئیزنی وەرگرت و ڕەگەڵ کاروان کەوت و کاتێ گەیشتە دەوروبەری جزیرێ، شێخ لە ڕاستەڕێ لایدا و دیاریەکانی برد و خۆی کوتا شاری جزیرەوە و پەنای بە میرعیززەدین برد.

ئەمیرعیززەدین پەیمانێکی کە دەگەڵ پادشای خاوەن شکۆدا بەستبووی شکاندی و دەگەڵ ئەو بەخت وەرگەڕاوەدا بەختی خۆی تێکەڵ کرد و خۆی کردەشەریکەدز. پایەبەرزی خاونشکۆ بۆ بەڵگە پێ نەهێشتن دوو جارانی ناردەلای میرعیززەدین کە شێخم بۆ بگرە و بینێرە لام؛ ئەوسا لە گوناهی تۆ دەبوورم. ئەگینا هەرچی قەڵا و ناوچە و دارونەدارت هەیە لە ژێر سمی ئەسپاندا تارومار دەبێ. میرعیززەدین زۆری دەسەختی قەڵاکەی ڕادەدی و بە تایبەتی کە دەیزانی ئاوی ڕووباریشی لە بەردەست دایە، گوێی نەدا فەرمانی تەیموور و شێخی بە دەستەوە نەدا.

ئەمیرتەیموور ڕۆژی دووشەممە سێزدەی جیمادی یەکەمی ئەو ساڵە، گرانباری بەجێ هێشت و

هێرشی لە نەکاوی بۆ کرد و هەر لەو شەوەدا هەموو لەشکرەکەی لە دەجلە پەڕاندەوە و دەبەیاندا لەشکری هەمیشە سەرکەوتوو وەك بەڵای لە نەکاو و لافاوی بە شاڵاو دەوری جزیریدا و ڕژانە ناوەوە و هیچ سەعاتێکی نەبرد قەڵا و شاکەوتە دەست لەشکر و دەس کرا بە تاڵان و کوشتن و خوێن ڕشتن و وێران و کاول کردن و وردەو یەخسیر بردن.

لە جەنگەی پشێوێنیدا سەربازێکی تەیمووری، عیززەدینی دەست کەوت؛ بەڵام نەیناسی و بە لێدان و کوتان زۆری شت لێ ساند و بەرهەڵدای کرد. میرعیززەدین بە هەزار گیرە و نیرە و دەردیسەری و لە پاش سووکایەتی بەسەر هاتنی زۆر، نیوەگیانێکی لە مەیدان دەرکرد و بەر کوشتن نەکەوت.

دەربارەی ئەو کارەساتە خەڵکی جزیر شتێکیتر دەگێڕنەوە و دەڵێن ئەمیرتەیموور دەپێشدا زۆری ئەمیرعیززەدین خۆش ویستووە و تەنانەت شەترنجیشی دەگەڵ لەییستووە و گەلێکی وەبەر دڵ کەوتووە و هۆگری بووە. ڕووی لێناوە کە بۆ سەفەری شامیش دەگەڵی بێ[1]. بەڵام چونکە هەموو ساڵێك پادشایانی شام دراوی زۆریان بۆ ئەمیرعیززەدین بڕیوەتەوە، خۆی لەو سەفەری عەرەبستانە بواردووە و ئەمیرتەیموور لە سەر ئەوە لێی تووڕە بووە؛ فەرمانی تاڵان و کاول کردنی جزیر و بۆتانی دەرکردووە.

ئەمیرعیززەدین لە ناو هۆزی ئەروخیدا ماتەی هەڵگرتبوو زۆر بە پەرێشانی و شپرزەیی ڕایدەبوارد و بە ڕووتی و کەساسی سەری نایەوە.

## میرئەبداڵ کوڕی میرعیززەدین

لە پاش بابی هاتە سەر حوکم و سەرپەرستی هۆز و تیرەکانی دەکرد و زۆری پێ نەچوو کە مردن هێرشی لە نەکاوی کردەسەر و لە دنیایەی بردەدەر.

---

١- ئەمیر تەیموور ساڵی ٨٠٣.ك (١٤٠٠.ز) بەرەو شام چووە. جەمیل

## میرئیبراهیم کوڕی میرئەبداڵ

لە جێی میرئەبداڵ کرا بە فەرمانڕەوا و ماوەیەك دنیاداری کرد و خوا چیدی پێ ڕەوا نەدی و دایە دەست مەرگ و لە تەختی گۆڕدا جێگەی بۆ کرایەوە. ئەویش سێ کوڕی لە جێگە مایەوە: میرشەرەف، میربەدر، کەکمحەمەد.

## میرشەرەف

هێندێکی مەزنایەتی کرد و بەرەو مەڵبەندی نەمان ڕێی داگرت و براکەی جێگەی گرتەوە.

## میربەدر

ماوەیەکی زۆر سەرداری کرد و ئەوسا ڕووی لە دنیا وەرگێڕا و کۆچی یەکجاری کرد و سێ کوڕی لە پاش بەجێمان: میرشەرەف، میرمحەمەد، شاعەلی بەگ.

## کەك محەمەد کوڕی میرئیبراهیم

لە پاش نەمانی براکانی فەرمانی جزیر کەوتە بەردەستی ئەو و هەر لە ڕۆژگاری ئەویشدا حەسەن بەگ ئاققۆینلوو (مەڕەسپیانی) هێرشی هێنایە سەر وڵاتی بۆتان و داگیری کرد و هەمووی وێران و خاپوور کرد و زۆربەی پیاوە گەورەکانی بۆتانی لە ناو برد.

کەك محەمەد دەگەڵ میرمحەمەد و شاعەلی برازایدا بەدیل گیران و کۆت و پێوەندیان خرایە پێ و پیلەوە و بردیاننە عیراق. وڵاتەکە بە خڕوپڕی کەوتە دەست ئاققۆینلووی تورکمان و ئەوانیش دایانە دەست چەلەبی ناوێك کە بۆ ئەوانی بە سەر ڕابگات. ئێستاش وەچی ئەو کابرایە لە ناو تورکماندا بە چەلەبیلوو ناو دەبرێن.

چەلەبی پیاوێکی لێزان و بە مشوور بوو. سەهەندەو زەرندەیەك بوو کەس نەیدەتوانی سەر بزێوی بکا و پشێوێنی بنێتەوە. جزیر هەر دەبەر دەستی چەلەبیدا بوو هەتا ئەو سەردەمە کە ئەمیرشەرەف کوڕی میربەدر وڵاتەکەی لە ژێر چنگاڵی ئاققۆینلووەکان ڕزگار کرد.

## میرشەرەف کوڕی میربەدر

لەو دەمانەدا کە کەك محەمەدی مامی و میرمحەمەد و شاعەلی برای لە لای ئاققۆینلووانەوە بەدیل گران، میرشەرەف خۆی ڕزگار کرد و بە نهێنی دەژیا؛ تا ئەو کاتە کە ڕۆژی بەختی ئاققۆینلوو کەوتە زەردەپەڕی نەهات و شەوەکی کامەرانی ئەو تورکمانانە شەوەزەنگی چارەڕەشی بە سەر داهات. وەك گوتوویانە:

یەك کەساس و هەناسەسارد دەمرێ        یەك بە شادی دەچێت و جێیدەگرێ

کەمکەم پەڵە هەوری چلکنی زۆرداری تورکمانی دوژمن، بەری عاسمانی کوردستانی بەردەدا و بەرەو نەمان دەڕەوی و کەویەبەفری داگیرکەری بێ بەزەوی، بە هەڵمی ئاه و نزوولەی هەناسەساردان دەتوایەوە و بە زەویدا دەچۆڕایەوە و ئەستێرەی هاتی میرشەرەفیش ڕۆژبەڕۆژ بە خۆدا دەهات و دەمبەدەم تیشکی دەنگاوت و گاوبەگاو تریفەدارتر لە ئاسۆی ژیاندا دەدرەوشایەوە.

ئەوانەی کە لە چنگاڵی مەرگ قوتار ببوون و لە بۆتان بە تای گیان ڕزگار ببوون، لە دەوری میرشەرەف کۆ ببوونەوە و بە هومێدی ئەو ڕۆژە دەژیان کە هەلێکیان بۆ بڕەخسێتەوە و داگیرکەر لە کوردستان دەربکرێتەوە و ئەو تەمی نەگبەتە بڕەوێتەوە.

لە پاش سی ساڵ ناهومێدی و دەستە و ئەژنۆیی و گردەنشینی، دەرفەت هاتەوە و ڕۆژی کورد هەڵاتەوە، کە مەیدانی مەردان گەرم کاتەوە.

میری جوانمێر وشێر، لە لان هاتەدەر و خاوی خۆی دەرکرد و تاویدا دوژمن و بە خەنجەری زگدڕ و شیری سەربڕ، کەوتە گیانی دوژمنانی کوردستان و پێی دادان و ملی بادان و لە بەرخۆی ڕادان و ئاسەواری نەیاری بڕیەوە و پەڵەی نەنگی دیلی بە خوێنی داگیرکەر سڕیەوە و ئابڕووی خۆی و هۆزەکەی کڕیەوە و زۆر بە شانازی و سەربڵندی هاتەوە سەر تەختی جزیر و فەرمانڕەوایی باب و باپیرانی سەندەوە. هەر لەو سەروبەندەشدا کەكمحەمەد و شاعەلی و میرمحەمەدی مام و برای، لە بەندی تورکمانان خۆیان ڕزگار کرد و هاتنەوە جزیر و بوونە پشتیوانی میرشەرەفی پاڵەوان.

لەو سەردەمانەدا کە شائیسماعیلی سەفەوی سەری هەڵدا و هەردووك عیراق و ئازربایجانی لە چنگ تورکمانان دەرهێنا و پادشایەتی ئێرانی بۆ چەسپا، بە هەوای زەمینگیری بەوەندەوە گیر نەبوو؛



پێوە چوو، دیاربەکر و مووسڵ و شەنگالیشی گرت و ئەوسا لەشکری گرانی ئێرانی بەخڕی ناردەسەر جزیر و دەگژ میرشەرەفی ڕاکرد. میرشەرەف لەو کێوانە نەبوو بە ڕەشەبا لەجێ هەڵکەنێ. زەبرێکی لە عەجەمدا، گێژ و وڕی کرد و بە سەرسوڕماوی لە بەری هەڵات و جارێك و چەند جارێکی دیکەش ئاسۆیان پەڕاند و گەڕیان تێ هاڵاندەوە و هەموو جاریش لە پێشوو پیستر دەیدڕاندن و دەیشکاندن؛ تەنانەت هەڵێك لە تەنیا شەڕێکدا کە لە بەر میرشەرەف بەزین، هەزاروحەوسەد قزڵباش لە خوێنی خۆیاندا گەوزین و یەکجار زۆریشیان لێ بە دیل گیرا.

جارێکیتر خانمحەمەد ئیستاجلوو، میری میرانی دیاربەکر و قەرەخانی برای، لەشکری قزڵباشیان دەنگ داو هاتنە جەنگی میرشەرەف. ئەو جارەش بە دەردی پێشوو چوون و زۆر شپرزە بوون و بە سەری شکاو و هیچی نەماوەوە بە پەلەپرووزە خۆیان دوور خستەوە و برینی خۆیان دەلستەوە!

شائەم جار تەواو غەزری بوو؛ هەمیسان بۆ جاری سێهەمین لەشکری زۆر و زەبەندەو هەموو پیاوی دەسکەرەوە و هەڵبژاردەی پاسەوانانی تایبەتی شایی و چەکداری نامداریتریش کۆ کرانەوە و بە سەرکردایەتی یەکانەی قزڵباشان یەکان بەگتکلووی سەرەك پاسدەری شا، لە هەمەدانەوە بەرەو جزیر هات و پێی سپێرا کەدەبێ بەبێ سەری میرشەرەف نەگەڕێتەوە.

لەو شەڕەشدا خودای بانی سەر دەهانای میرشەرەف هات و وەك خۆی فەرموویە: «چەند کۆمەڵی کەم بە خواستی خودا بە سەر کۆمەڵی زۆردا زاڵ بوون!»

یان وەك گوتوویانە:

خـوا هـاریکاریێ، ئەوانەی پیاون　　با کەمیش بوون، زۆریان ڕاوناون

پاڵەوانانی کوردی بۆتانی -کە وەك پڵنگی زامدار و ورچی برچی و شێری نێری ناوشکێر و لێرەواران، تامەزرۆی هارینی ئێسکی نەیاران و تینووی خوێنی نالەبارانن و لە جەنگدا وەستان و بەدەستەوەدان نازانن- زۆر گورج و گۆڵانە دەوری میری خۆیان گرت. سەر لە سەر دەست و دەست لە بان دەبان و گوێ لە سەر هەست و مەستی مەیدانی مەیدان، زۆر بە گوڕ و تین و دڵ پڕ لە کین، بوونە پەرژینی ئاسنین و لە بەر دوژمن بوونە لەمپەر و بەرانبەری وەستان و ڕێزیان بەست.

قزڵباشیش لەولاوە ڕووبەڕوویان بزووتن و تێـك هەڵـەنگووتن و هـەوڵ هەڵمـەتی بـوێرانی کوردسـتان کارێکی پێکردن بە داستان بگەڕێتەوە. هێند بە دەست و برد وزاقیان بەست و دەستی خۆیان وەشـاند، قزڵباشیان شاش کرد و تاساندیان و بۆیان نەکرا بێنە دەست و سەرکەوتنیان لە دەسـت داو شکـستیان دەست کەوت.

بە هەر لایەکدا لات دەکردەوە هەر لاوی کـوردی شیــرین کـردەوە بـوو دەیگوڕانـد و دەیدڕانـد و نەیدەدۆڕاند و هەر قزڵباش بوو دەیهەڕاند و دەیبۆڕاند و بە ڕووت کـراوی و بـە لەشـی خوێنـاوی لـەو شەڕگە پان و بەرینەدا، یەك بە مەیدان تـخێڵ ببوو. هێشتا جەهەندەمی شەڕ تەواو نێڵ نەدرابوو کـە قزڵباشە ماوەکان بە پاشدا کشانەوە و لە جیاتی جزیر قووتدان، خوێن ڕشانەوە.

ئیتـر هەر ئەو شکانە بوو کە پێی شکان و تازە ببـڕای- ببـڕای هـەتا سـێبەری میــرشەرەف لـە سەر دنیا مابوو، عەجەمی قزڵباش ڕووی نەکردەوە جزیر و دەمی بۆ ئەو بقەیە نـەبرد و بـە خـەیاڵیش ئارەزووی گرتنی جزیری نەکرد.[1] ئەمیــرشەرەف ئەمــجار بە دڵنیایی لـە سـەر کورسـی فـەرمانڕەوایی جێی گرت و هـەتا مـا هـەر بـە سـەربەرزی و ئـازایی ژیـا و لـە ئەنـجامدا بارگـە و بنـەی بـەرێ کردەناوجەرگەی سەرخۆشانی شاری خامۆشان و لە بەهەشتی خودا، لە نهۆمی پیـاوی مـەرد و ئـازادا جێگەی بۆ کرایەوە.

## شاعەلی بەگ کوڕی میربەدر

کە میــرشەرەف لە سەر دنیا نەما، هۆز و تیـرەکانی بۆتانی شـاعەلی بـەگیان بـە پەسـند زانـی کـە فەرمانڕەوایان بێ. ئەویش قەڵا و ناوچەی فنیکی بە میـرمـحەمەدی بـرای ئەسـپارد کـە بـە سـەری ڕابگا.

لە کاتێکدا کە پیاوە گەورەکانی کوردستان خۆیان لە دەسك نابوو کە بە تێکڕایی بـچنە تـەوریز و خۆیە و خۆیان بکەنە دۆستی شای ئێران و بچنە ڕیزی کاربەدەستانیەوە؛ شاعەلی بەگیش بە بـێ ئـەوە بیـری لێ بکاتەوە و لێکی داتەوە و بێنێتەوە بەرچاوی کە بۆتانی چیان بە سەر لەشکری ئێران هـانیوە و چ دەردێکیان لە دەست برا و خزمی ئەو دیوە و چەندیان خـوێن لـە سـەریەتی، هـەر بـە دەبدەبـە و

---

١- ئەم هێرشانە لە سالی ٩٠٨ هەتا ٩١٧.ك (١٥٠٣ هەتا ١٥١١.ز) دابوون. جەمیل

تەنتەنەی ئاغایانی کوردستان و بە زرم و کوت و زەنا-زەنای بەردەست و کوێخایان، بای ڕەگوێ کەوتن و هەموو ڕابردووی لە بیـر بردەوە و ڕەگەڵ کەوت و وێڕای دوازدەکەس لە سەرناسانی کوردستان، ڕووی کردەبارەگای شائیسماعیلی سەفەوی و بە دەستی خۆی، خۆی بە داوێوە کرد.

ئەگەر شاعەلی چاوی نوقاندبوون و خۆی نەدەدی، شائیسماعیل چاوی لێك نەنابوو؛ نـووك و بـەدی کارەساتی لە بیـر مابوو. ئەو برینی بۆتانی لە قزڵباشیان کردبوو ببووە تێراوێ ڕەشە و کێم و زووخاوی دەدەلاند. برای میرشەرەف بە پێی خۆی هاتووە دەڵێ تۆڵەم لێ بکەنەوە؛ چۆنی دەسەرەوە دەچێ؟

هێشتا میر و بەگلەری کوردان تەواو ڕۆژباش و سـڵاویان وشـکاوی نـەهاتبوو کـە قزڵبـاش تێیـان وەرووکان و لە جیاتی خەڵات و نیشان، بە کۆت و زنـجیـــریان ڕازاندنـەوە و لـە زینـدانی تاریکیانـدا ڕازاندن.

لە پاش ماوەیەك زیندان کێشان، هەر یەکە بە جۆرێك لە زیندان بەردران و شـاعەلیش وەك ئـەوان ڕزگار کرا و بەرەو جزیر گەڕایەوە[1]. ئەو ماوەی کە ئـەو لـە زیندانـدا چـلەی دەکێـشا، شائیـسماعیل جزیری دابووە دەست ئولان بەگ برای خان مـحەمەدی ئیستاجلووی والی دیاربەکر. شاعەلی بـەگ بـە یارمەتی هۆزە نەبەزەکەی خۆی پەلاماری سەر ئولان بەگی داو ڕاوی نا و جزیری ساندەوە.

لە پاش ئەوە شاعەلی دەگەڵ میـرشەرەفخانی بـدلیس بـوو بـە هاوپەیـمان و هـەر دوولا وایـان بەباشزانی کە سەر وە بەر باری سوڵتان سەلیمی عوسـمانی[2] بێنن و ئیتـر دان بە قزڵباشاندا نەهێنن.

وەختێ خۆیان کردەدۆستی عوسـمانی، هانی سوڵتان سـەلیمیاندا کـە دیاربـەکر و ئازربایـجان و ئەرمەنستان لە قزڵباشان بستێنێ.

شاعەلی دوای ئەوە کە چەندێك فەرمانڕەوایی کرد، لە دنیا ماڵاوایی کـرد و بـە ڕەحـــمەت چـوو. چوار کوڕی بوو: بەدر بەگ، ناسر بەگ، کەك مـحەمەد، میـرمـحەمەد.

بەدر بەگ جێنشینی باوکی بوو، کوڕانی ناسر بەگ و کەك مـحەمەد -کـە ڕۆژگارێـك لـە جزیـردا

---

١- لە پاش شەڕی چاڵدیران -کە ساڵی ٩٢٠.ك (١٥١٤.ز) لە نێوان ئێران و عوسـمانیدا ڕوویـدا و ئێـران تـێ شـکا- شاعەلی پاش سێ ساڵ زیندان کێشان بەردراوە. جەمیل

٢- سوڵتان سەلیمی یەکەم کوڕی سوڵتان بایەزیدی دووەم، باوکی دەرکراوە و ساڵی٩١٨.ك (١٥١٢.ز) کراوەتە پادشا. جەمیل

سەردار بوون- لە نۆرەی خۆیاندا باسیان دەکرێ لە میرمحەمەدیشەوە سلێمان بەگ بەجێ ماوە؛ کوڕێکی زۆر ئازێ و ڕەشیدەو ئێستاش هەرماوە.

## بەدر بەگ کوڕی شاعەلی بەگ

لە پاش نەمانی باوی لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی جزیرێ جێگیر بوو. لە سایەی دادگەری و هونەروەری خۆیەوە بۆتانی ئاوەدان و خودان پیت و برەو کرد و هیمی سەرداری و دنیاداری خۆی قایم و پتەو کرد و نزیکەی حەفتا ساڵ بە سەربەستی و بێ بەرهەڵست بە مەزنایەتی گوزەراند و کار و باری ڕاپەڕاند. لە هەموو دەورانی پادشایەتی سوڵتان سولەیمانخاندا -هەر لە سەرەتایەوە تا بڕایەوە- خزمەتکاری دڵسۆزی دیوان و هەمیشە و دایم گوێ بە فەرمان بوو. بۆ سەفەری وان و تەورێز و گرتنی بەغدا و عیراقی عەرەب، دەگەڵ خۆیدا بردووە و هیچ کاتێك لە خۆی هەڵنەواردوە. بەو لە سوڵتان نزیکیە هەوایەکی لێ پەیدا ببوو، لای وا بوو نازی بە سەر دیوانی عوسمانیەوە هەیە و هەرچی بیکا لێی ناپرسنەوە. دوو کاری زۆر نالەباری کرد کە هەم سوڵتان و هەم ڕوستەم پاشای وەزیریشی لێ ڕەنجان. یەکەم کاری نابەجێی ئەوە بوو خونکاران و سەردارانی کوردستان -کە شەڕی ئێرانیان بۆ عوسمانیان کردبوو- گەڕابوونەوە؛ دەبوایە بچن دەستی سوڵتان ماچ کەن و ئیزنی چوونەوە ماڵی لێ بخوازن. جا چونکە لە کۆڕەکەدا سوڵتان حوسێنی حاکمی ئامێدی وەلای سەرووی بەدر بەگ خرابوو، لە سەر ئەوە بەدر بەگ تۆرا و دەستی سوڵتانی ماچ نەکرد و بە بێ ئیزنخوازی، لە بەغدا دەرکەوت و هاتەوە جزیر.

کردەوە بێجێکەی دیکەشی ئەوە بوو زەینەڵ بەگی هەکاری بە هاریکاری ڕوستەم پاشای وەزیر، بۆ وەرگرتنەوی وڵاتی خۆی لە ئاستانەوە بەرەو ماڵ دەهاتەوە. بەدر بەگ هێندێك پیاوکوژی خوێنمژی ناردەسەر ڕێ و ڕێگەی لێ گرت و وەك لەمەوبەر باسمان کرد پیاوەکانی کوشت و زەینەڵ بەگ خۆشی زۆر بە برینداری لە دەشتی شەڕگەدا بەجێ ما. لەوساوە ڕوستەم پاشاچارەی بەدر بەگی دەدزا و بە دزیەوە خەریکی بنکۆڵ کردنی بوو. جا کە جاری دووەم ڕوستەم پاشاکرایەوە بە وەزیر، تەگبیری لە هەڵداشتنی بەدر بەگ کردەوە. ناسر بەگی برای دنەدا کە داوای مەزنایەتی جزیر بۆ خۆی بکا و بۆ ئەو

مەبەستە خۆی بگەیەنێتە ئاستانە.

ناسر بەگ –لەسەر هاندان و ناو تێدانی ڕوستەم پاشا- خۆی گەیاندەبارەگای شاهانە و وەزیریش لە ژێرەوە کارێکی وای کرد کە سوڵتان بە لای ناسر بەگدا بێ و فەرمانی بۆ دەرچوو کە فەرمانڕەوایی جزیر بە ناسر بەگ ڕەوایە و کار و باری بۆتان لە دەست ئەوایە.

کە ناسر بەگ بە فەرمانەوە بەرەو ماڵ دەهات، بەدر بەگ لە دەستانی هەڵات و ڕووی کردەژەنگار (شنگال). لە پاش دوو ساڵ بەدر بەگ پەنای بە سەردەرانەی شاهانە بردەوە و ناوچەکانی تور و هەیتمیان لە جزیر جوێ کردەوە و سەر لە نوێ فەرمانڕەوایی جزیریان بۆ بەدر بەگ نوێ کردەوە. ئیتر هەتا لە سەر دنیا ژیا بە هۆی فەرمانی خاوەن شکۆوە لە سەر جزیر دامەزرا و لانەبرا[1].

بەدر بەگ لە ناو کۆر و کۆمەڵدا بە ئاشکرا بەنگی دەکێشا. بەنگ کێشانەکە گەیبووە ڕادەیەك ڕۆژانە بایی پێنجسەد درەم بەنگ دەکڕا و دەکرا بە دووکەل و بە هەوا دەچوو. هەر خودی خۆی تەنیا لە شەو و ڕۆژێکدا بایی سەد دەرەمی دووکەڵی بەنگ هەڵدەمژی و کیسەدارەکەی خۆی ڕاسپاردبوو کە نرخی بەنگی میرهەر لە دراوی حەڵاڵ و ڕەوا بدا و زێڕێکی کە بۆنی ناڕەوا و حەرامی لێبێ بۆ بەنگی بەگ ناشێ!

وەکی دیش پیاوێکی زۆر دیندار و بە ئاکار و دڵپاك و چاك بووە؛ نوێژ و ڕۆژووی نەدەچوون؛ دەگەڵ مەلا و زانا و پیر و پیاوچاکاندا چاکەی دەکرد و ئەوەندەی هۆزان و خوێندەواری گەورە لە دەورەی خۆی کۆ کردۆتەوە کە هەرگیز جزیر ئەوەی بە خۆیەوە نەدیوە، بۆ نموونە مەولانا محەمەد بەرقەلعی و مەولانا ئەبووبەکر و مەولانا حەسەن سورچی و مەولانا سەیدعەلی و مەولانا زەینەدینبەبی -کە ئەمەیان لە زانستەکانی ڕواڵەت و نهێنیدا سەردەستەی مەلایان و پێشەنگی خواپەرستان بووە- هەروەها گەلێك زانای ئەوتۆ کە ناوبانگیان ڕۆیشتووە و نووسراویان دەستا و دەست دەکا، هەمووی لەو کاتەدا لە جزیر و لە لای بەدر بەگ حاوانەوە. دەڵێن جارێك مەولانا ئەبووبەکر دڵی لە بەدر بەگ ڕەنجاوە و لێبڕاوە کە لە جزیر بڕوا. بەدر بەگ دەگەڵ کەیخودا و ڕیشسپیانی جزیر خۆیان هاویشتۆتە ماڵیەوە و دڵی داوەتەوە و گەلێکی خەڵات و بەخشش پێداوە تا گەڕاوەتەوە.

---

١- ئەمینزەکی لە *ناودارانی کورد*دا دەڵێ: لە دوای ئەو گەڕانەوەی، هەر تەنیا ساڵێك ژیاوە. جەمیل

کاتێ ناسر بەگی برای عەمری خوای کرد، بەشەکەی ئەویش -کە ناوچەی تور و هەیتم بوو- هەر هاتەوە سەر بەشی بەدر بەگ و تێکەڵاو کرایەوە.

بەدر بەگ زۆر ژیاوە؛ لە نەوەد دوور کەوتۆتەوە و لە سەد نزیك بۆتەوە. لە دوارۆژەکانی ژیانیدا پیری وای دەورە لێدابوو هۆش و گۆشێکی بۆ نەمابوو. کاری لە ئاوەز بەدووری دەکردن. لە باوەڕ پێکراوانەوە بیسراوە کە جارێك کابرایەك گازندەی لە لا کردووە، گوتوویە قەسابی شار دژمانی پێداوم. لە جزیر بە گازر دەڵێن قەسار. ئەویش ناردوویە گازریان هێناوە و تێر و پڕیان کوتاوە و لە پاش ئەوەی زۆر باش شل و کوت کراوە، کابرا هاواری کردووە میرم من قەساب نیم، قەسارم. بۆ دەتەوێ قەزای بۆزە لە گۆزە بکەوێ. بەدر بەگ لە وەرامدا فەرموویە قەساب و قەسار هەر یەکن ناوەکانتان وێك دەچن و تۆڵەی ئەو هەڵەیەش هاسانە!

بەدر بەگ کە مانگی ژیانی لە ئاسۆی نەماندا ئاوابوو، کوڕێکی لە پاش بەجێ مابوو بە ناوی میرمحەمەد[1].

## میرمحەمەد کوڕی بەدر بەگ

لە دەورانی ژیانی بابیدا بە سەر کاروباری وڵاتەکە ڕادەگەیشت و هەمەکارە هەر خۆی بوو. لە دراو کۆکردنەوەدا چاوچنۆك و قیرسیچمەیەك بوو، تەکی نابێتەوە. وەك دەڵێنساڵانە دوازدەهەزار مەڕی زاوە؛ کە هەر ساڵە لە بەروبوویان دراوێکی زۆری وەسەر یەك ناوە. سەدهەزار سەرەمریشکی بە دۆخە بە سەر گوندیاندا بڕیوە[2] و بۆی بڕیونەوە کە هەر ساڵە دەبێ دەمبڕ لە هەر مریشکێك ئەوەندەهێلکە بۆ میربە دیاری بێنن و دیارە دەبێ مامرەکەش نەمرێ! بە کورتی ئەو پیاوە لە دراو هەڵکڕاندندا ئەوەندەبڵیمەت ڕسکاوە کە لە دنیادا وێنەی کەم دیتراوە.

لە پاش مردنی، بەدر بەگ بوو بە فەرمانڕەوای سەربەخۆی جزیر و بۆتان و حەوت ساڵ بێ دەردیسەر فەرمانڕەوایی کرد. ساڵی ٩٨٦ك (١٧٥٨ز) کە بە فەرمانی سوڵتان مراد لەشکری

---

١- ناودارانی کوردی ئەمینزەکی دەڵێ: بەدر بەگ ٩٥ ساڵ ژیاوە. جەمیل

٢- فارسیەکە دەڵێ: «صدهزار قطعه مرغ»؛ ڕۆژبەیانی دەڵێ: سەد هەزار پۆلە باڵندەی کەوی، بەڵام قطعه بۆ باڵندە، وەك وشەی نەفەر، سەر، دانە بۆ مرۆڤ و ئاژەڵ و وردە وایە. «مرغ» مریشکە. «یك قطعه مرغ» واتا تاکەیەك مریشك. هەژار

عوسمانی بە سەرکردایەتی لەلەقەرا مستەفا پاشای دووەم وەزیر بۆ سەر شیروان و گورجستان بەرێ کرا، میرمحەمەدیش ڕەگەڵ لەشکری دنیاگری موسوڵمانان خرا.

کاتێ عەسکەری مەحشەر بەرپاکەری عوسمانی لە سنووری گورجستان چوونە ژوورەوە، محەمەدخان توقماق نەوەی قازوقهەمزەی ئیستاجلوو، میری میرانی چغورسەعد و ئیمامقولی سولتانی قاجار، میری‌میرانی قەراباغ و گەنجەی ئاران، بە دەهەزار سواری ئازا و بەکاری قزلباشەوە لە جێگایەك -کە ناوی چلدرە- سەری ڕێگایان لە مستەفا پاشاو هەزارە زیلەی لەشکرەکەی گرت. بە هەڵکەوت لەو ڕۆژەشدا دەروێش پاشا -کە بەگلەر بەگی دیاربەکر بوو- کوردەکانی دەبەر دەستابوو؛ کرابووە سەرکردەی دیدەوانەکانی پێشەنگی لەشکری ئیسلام و پێشڕەوی دەکرد و دەراوی تاقی دەکردەوە.

دەم دەمی زەردەپەڕ بوو، نیسێ شۆڕ ببوون. لەو جێیەدا کە پێی دەڵێن چلدر -لە دامێنی چیادا- گوز و گومبەت تووشیان بوو بە تووشی سوپای ئێرانەوە و لووت و بزووت تێك هەڵەنگووتن. ئیتر کوڕە کوڕەی لە خۆیایی و پشت ئەستور لە ئازایی، خۆیان لێکیان نەدایەوە کە دوژمن چەندەو چۆنە و سواری سەری خۆیان بوون و هەڵیان کردنێ و بەو بادی هەوا بوونە تێشکان.

| | |
|---|---|
| مەڵێ دوژمنم هیچە، خۆت هەرچی هەی | لە خۆیایی بوونت بگاتێ، هەڵەی |
| وەکوو تۆ دەنازی بە ئازایەتی | دەبێ بیریەری دوژمنیش لایەتی |
| مەڵێ پەنجە ئاسنم و ناشکێتەوە | کە پۆڵاش بە ئاگر دەتاوێتەوە |

لەشکری قزلباشان تەنیا دووهەزار سواریان وەك پێشڕەوی لەشکر نیشانی عوسمانیان دابوو. پاڵەوانە زۆر ئازا و ڕەشیدەکان و گورگە بالان دیدەکانیان لەودیوی کەژەکەوە حاشار دابوو. کاتێ سەیری ئەم لەشکرە کەمەیان کرد، شەڕەکەیان بە گەمەزانی و ئازاو نەبەردانی کوردان وەك پلنگی ناو ماهـ و زەردان گوڕیان بەست و دەست لەسەر خەنجەر خۆیان دەپاڵ هاویشتن و تێیان بەر بوون و هەر هێندەی فوو لە قەنەی کەی بە دەیان و سەتان لاشی قزلباشی بێسەر و سەری مێشك پژاویان بە گۆڕێ وەر کرد و وەك تۆوی هەرزن پەرژ و بلاویان کردن. ئەوان خەریکی ئەو بگرە و بەردە و بڕین و درینە بوون، کە لەپرونەکاو شەش‌هەزار سواری زۆر بە کاری لەکلێ دەرهاتووی هەنگامە دیتووی



قزلْباش -وەك كێوی ئاگرپژ و حەزیای خوێنمژ- هەڵچوون و خوشیـــن و لـە چەشنی لافـاوی كەنـداو كەندی بە تەوژمی بەهاران، لە لاملەی كەلەوە سەربەرەوخوار بوونەوە و كوردەكانیان دەناو خۆ گـرت و كڵی شەڕ نێڵ درا. نەعرەتەی سواران و حیلەی ئەسپان و زرمەی لێدان و خرمەی سـمان و زیڕەی زوڕنا و قیـڕەی كەڕەنا و تەپەی دەهۆڵ و شـەقەی ئـاوزەنگی و هاشـەی تیـران و كرپـەی شیـران، گـوێی عاسـمانی دەزرینگاندەوە و ئەو دیـمەنە زەندەقبەرە، دێو و درنـجیشی لە خۆ دەپرینگاندەوە.

چۆڕاوگەی شۆڕاوگەی خوێنی كەڵەپیاوان لە شەڕگەی بەرفراواندا شەپۆلی دەدا و كـاوان هەڵدەپـژا. لەبەر تۆزی سورخوون و بۆزی بەر ئاوزەنگی خورت و ڕواڵان و دەخاك وخۆڵ گەوزینی بە خوێن شەلاَلاَن و لە بەر سێبەری ئالاَ و مەتالاَن، ڕۆژی زەردەپەڕی زەرد و بێڕەنگ وەك شەوەزەنگی لێهات.

| | |
|---|---|
| گوڕیـنی سواران و ورشـــەی دەبـــان | گور و شێری لە ژیـــان دەكردن نەبـــان |
| بریقەی دەمی شیـری تینوو بە خوێن | بزەی مەرگ و دەیپرسی زیندوو لەكوێن؟ |
| بە شیـر و بە نێزە لە شەڕگەی بەرین | وەكووو تەرزەبـــارانی سـەر داوەریــــن |
| فرشتــەی مـرن گیانی هێند بردبوون | سەوە و تێـسر و توربێـنی پڕ كـردبـوون |

میرمـحەمەد و ساروخان بەگی مـەزنی حـەزۆ، دەگـەڵ دومـان بـەگی زەرقـی و میرمـحەمەدی فنیكی، لەو شەڕەدا كوژران. لە پاشانیش هەر لەشكری قزلْباشان شكا و لەو هەنگامـە بـە سامەدا، سێهەزار هەتا چوارهەزار كەس لە هەردووك لا لە مەیدانی شەڕدا گیانیان دۆڕاند و سەریان نەبردەوە.

هەر لەو جێیە كە مـحەمەد بەگی لێ كوژرا، پڕ و پڕێـسكەكانیان پـشكنی، دووسـەدهەزار زێـڕی سووری لە سكەدراوی عوسـمانی پێبوو؛ ئەوە جگە لە پارچەی نایاب و كەلوپەلی جوان و گەواهێربەند و ئەسپاباتی زۆر و زەبەند بوو. گەنـجینە ودارایییەكی كە مـحەمەد بەگ بوویەتی، لەو زەمانەدا هـیچ فەرمانڕەوایەكی كوردستان نەیبووە. چوار كچی لە پاش بەجێ ماوە دەگەڵ كوڕێكی پێنج سـالاَنە كـە ناوی سوڵتان مـحەمەد بووە.

## سوڵتان مـحەمەد كوڕی ئەمیرمـحەمەد

كە ئەمیرمـحەمەد كوژرا، سوڵتان مـحەمەد زۆر منداڵ بوو. لە كوردستاندا باوە منداڵ بە ناو بـاوكی

ئەماو ناو دەنێن. جا ڕەنگە ئەویش ناوێکی دی لێ نرابێ و کە بابی کوژراوە ناوەکەی ئەویان لێ ناوە. وێشدەچێ هەر لە سەرەتاوە ناوی سوڵتان محەمەدی لێنرابێ و بە سوڵتان لە میرجیا کرابێتەوە؛ ئەمە خوا دەیزانێ.

دایکی سوڵتان محەمەد کچی مەلیك محەمەدی کوڕی مەلیك خەلیلی فەرمانڕەوای حەسەنکێف بووە. شۆڕەژنێك بووە لە پیاوان بە داب و دەستوورتر و بە مشوورتر بووە. کەلەپوورێکی لە ئەندازە بە دەریشی لە باوکی کوڕیەوە بۆ بەجێ ماوە[1]. هەموو کار و باری سەرداری و ماڵداری وەك گوڵ بەڕێوە دەبرد و چاوەدێری کوڕی خۆی دەکرد. هەر کەسێ بەر گومان بووە کە لەو خانەدانەدا خۆی بە شت دەزانی و بەرەوژوور دەڕوانێ، بە داوی دیاری و دراو، چاوی دادروون و دەمکوتی کردوون و سەربزێوی لە بیر بردوونەوە! کیژەکانی خۆی دابە میرناسر و میرشەرەفی کوڕانی خانئەبداڵ و ئەرکی دژواری فەرمانداری خستە سەر شانی زاواکانی و بە هۆی ئەو خزمە بەهێزانە، لە هەموو لەمپەر و کۆسپی سەر ڕێبازی دەرباز بوو. بە کورتی ئەو ژنە ئازا و مەردە، سەر و بەرێکی بە ولاتەکەدا کە هەر باسی ناکرێ.

لە دەرفەتێکدا کوڕەکەی خۆی هەڵگرت و بردیە ئەستەنبوڵ و ڕووی کردەبارەگای سوڵتان مرادخان و دیاری و پێشکێشی زۆر و زەوەندیشی بۆ سوڵتان و وەزیر و کوێخا و گزیر و سووریاش و سەرکارانی بردن و سمێڵی چەور کردن و کارێکی وای کرد کە سوڵتان خەڵاتی کرد و فەرمانی سەرداری جزیری بۆ سوڵتان محەمەد تازە کردەوە و ئەوسا خاترخوازی کرد و گەڕایەوە.

پێنج ساڵ بە سەر ماوەی دەسەڵاتی سوڵتان محەمەددا تێدەپەڕی، کە ئەو شاژنە کەوتە زەردەپەڕی ژیان و گیانی دلۆڤانی بەرەو بەهەشت فڕی و سوڵتان محەمەدیش لە پاش دایکی زۆری نەبرد و لە ساڵی ٩٩١.ك (١٥٨٢.ز) داپەلەوەری گیانی پاکی لە ڕکەی کەلاکی خاکی دەرکەوت و بەرەو داکی دڵسۆز و چاکی بۆ بەهەشتی بەرین سەرکەوت. دەشڵێن نەیار و ناکۆکی چاوچنۆك و ترسنۆك هەبوون کە ژیانی خۆیان لە نەمانی ئەودا دیوە و ژەهریان بۆ دەخۆراك گووشیوە و بە

---

١- لە فارسیەکەدا «از پدر و پسر» نووسراوە؛ ڕەنگە واوەکە ئاوەکی بێ. ڕاستەکەی «پدرِ پسر» بووە؛ واتا باوکی کوڕ. جەمیل

دەرماندای مردووە. ئیتر ڕەچەڵەکی بەدر بەگ لە بەر و سێبەر کەوت و تازە وەچی تازەی لێ دەرنەکەوتەوە.

## ناسر بەگ کوڕی شاعەلی بەگ

لەو ڕۆژگارەدا کە سوڵتان سولەیمان پادشایەتی دەکرد و ڕوستەم پاشای بە گەورەوەزیر دانابوو، دەروێش مەحموودی کەڵەچێری هەمدەمی هەمیشەی سوڵتان و ڕاوێژکەری کاروباری ئاسەفی بەرخیای دووەم (ڕوستەم پاشا) بوو. ئەو دەروێش مەحموودەبە ڕەسەن لە هۆزی ڕۆژەکییە و لە شاگردانی مەولانائیدریسە و هونەری نامە ڕەنگاندن و شێعر هۆندنەوە لەویەوە فێر بووە و ماوەیەك میرزای دیوانی شەرەف بەگی بدلیسی بووە. لە پاش بە کوشت چوونی شەرەف بەگ کەوتە وڵاتی ڕۆمەوە و کرا بە فێرکاری کیژی سوڵتان سولەیمان، کە ژنی ڕوستەم پاشابوو. لەو سایەوە بە پایەیەك گەیشت کە پلەی وەزارت و بریکاری میرشەرەف بەگیش بەو درابوو. وردەوردەبەرزتر بۆوە، هەتا وای لێهات کە ڕاپەڕاندنی کاروباری هەموو سەرداران و فەرمانداڕانی کوردستان دەهاتە بەر دەستی ئەوولە سۆنگەی ئەو پلە گرینگەیەوە، ڕوستەم پاشاش تەواو چووبووە بنج و بناوانی هەموو ڕووداوانی کوردستانەوە و لەوبارەوە پسپۆڕیەکی تەواوی پەیدا کردبوو.

ئەو پێشەکیەم بۆیە لێرەدا گونجاند چونکە لە پێشدا باسمان کرد کە ڕوستەم پاشادنەی ناسر بەگی دادژی بەدر بەگی برای بێ و داوای جزیری لێ بکا. ناسریش بە دەنگیەوە هات و ڕووی کردەئاستانە و فەرمانی سوڵتانی وەرگرت و بەدر بەگی لە جزیرێ دەر کرد.

دوای ئەوە کە دوو ساڵی جزیر خوارد، بەدر بەگ پەنای بە بارەگای پڕشکۆی شاهانە برد و جزیری ساندەوە و ناوچەی هەیتم و تووری لێ دابڕا و درا بە ناسر بەگ. ناسر بەگیش لە پاش ماوەیەك مرد و هەمیسان ئەو بەشەش دەگەڵ جزیر لێك درایەوە. جا هێندێك کەس لایان وایە کە ئەو بەزم و هەرا و گۆڵمەزانە و هێندێکی دیش لە ئاڵ و گۆڕ کردن و جێ پێگۆڕینی فەرمانداڕانی کوردستان، فیتی دەروێش مەحموودی کەڵەچێری بووە.

پوختەی وتار، کاتێ ناسر بەگ دنیای بەجێ هێشت. خان ئەبداڵی کوڕی ناسر بەگ لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی سوڵتان سەلیمخان و لە دەورانی وەزیرایەتی محەمەد پاشای گەورەوەزیردا بە نیازی وەرگرتنەوەی ناوچەکانی تور و هەیتم ڕەوانەی ئاستانە بوو. هەوای فەرمانڕەواییشی چووبووە کەللەوە،



دەیەویست داوای جێگای بەدر بەگیش بکا و خۆی بکاتە فەرمانڕەوای جزیر.

محەمەد پاشای وەزیر لە لایەکەوە دۆستی نزیکی بەدر بەگ بوو، لە لایەکی تریشەوە بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت نەیدەویست کە خانەدانی جزیری لە بەر یەك هەڵوەشێ؛ بڕیاریدا هێندێك گوێی خان ئەبدال ڕاکێشێ و سزای بدا و تۆزێکی بیراز بکا و دەستی لەو خەیاڵە خاوە پێ هەڵگرێ. محەمەداغای چاوەشباشی دەگەڵ چەند جەندرمەیك بە شوێن خان ئەبدالدا نارد کە بۆی بێنن. ئەو ڕۆژە خان ئەبدال دەگەڵ دەستەیەك لە میرزادەکانی بۆتانی و چەند پیاوێکی خۆیدا لە شاری ئەدرنە بوون و لە کاتێکدا کە خەریك بوون لە مزگەوت نوێژی ئێوارە بکەن، چاوەشباشی و جەندرمەکانی فەرمانی گەورەوەزیریان پێ ڕاگەیاند و تێیانگەیاند کە دەبێ ڕەگەڵمان کەوی و بتبەینە دیوان.

ئەو کوردانەی دەگەڵ خان ئەبدال بوون دڵیان کەوتە خرت و پرتەوە، کە دەبێ بەو درەنگ وەختیە و لەو تەنگی نوێژی شێوانەدا بۆچیان بێ و دیارە دەیانەوێ بێبەختی دەگەڵ بکەن و لەوانەیە بەو شەوە شرت و گومی کەن. هەر لەسەر ئەو گومانە، کوردێك کە ناوی شێخی شێخان بوو بە بێ هیچ ڕامان و دامان، هەڵیکێشاخەنجەر و هەتا هێزی دەگرێ دایوەشاندەناوشانی چاوەشباشی و نووکی خەنجەر لە سینگیەوە دیوەودەر بوو. جەندرمە هەر یەکە بە لایەکدا هەڵاتن و هاواریان بۆ وەزیر برد و ئەوی ئەو کوردەکردبووی بۆیان گێڕایەوە.

خان ئەبدال و هەواڵانی کە ئەو کارەساتەیان دیت، پەشۆکان و بە سەرگەردانی و سەراسیمەیی بە ناو شاری ئەدرنەدا بڵاو بوونەوە و هەر یەکە خۆی دەقوژنێنێك پەستاوت و چەند کەسێکیان لە شار دەرچوون و ملیان لەو دەشتە نا.

جارچی لە کووچە و کۆڵانەکانی ئەدرنەدا جاڕیان کێشا، کە بە فەرمانی سوڵتان و وەزیر دەبێ هەموو خەڵکی شار وێکەون و ئەوانە بەردەست بکەن و پەنایان نەدەن. خەڵکی شارەکە بە تێکڕایی بەر بوونە ماڵ پشکنین و کوردەکانیان ناچار کرد کە خۆ بە دەستەوە بدەن. هەموویان هێنانە دیوان و دەست بەجێ فەرمانی خواکردی شاهانە بە کوشتنی ئەو کوردانە درا و خانئەبدال و نزیکەی سەد کەس لە پیاوە سەرناسەکانی بۆتانی هەر ئەو شەوە لە سەریان درا. دار و نەداریشی خەزێنەداری ئیسلام سیایی بۆ گرت و خرایە پاڵ خەزێنەی دارماڵەوە.

خان ئەبدال حەوت کوڕی پاکڕەوشتی لە پاش بەجێ مان: میرناسر، میرشەرەف،

میرمحەمەد، شاعەلی، میرسەیفەدین، میرعیززەدین و میرئەبدالٚ.

میرناسر کوڕی خان ئەبدالٚ -کە کیژی میرمحەمەدی بەدر بەگی دەپاڵدا بوو- لە باتی سولٚتان محەمەدی ژنبرای کە هێشتا منداڵ بوو، ڕەگەڵ لەشکری عوسمانی کەوت و چووە یەریوان و لە گەڕانەوەدا فەرهاد پاشالە قەلاّی قارس بیستی کە سولٚتان محەمەد مردووە. بیر و بڕوای پیرۆزی سەردار هاتە سەر ئەوە کە لە خزمانی سولٚتان محەمەد ئەوانەی دەگەڵ لەشکری هەمیشە سەرکەوتوودا چوونەتە یەریوانێ، یەکیان بکاتە کەلەپوورگر و بە سەر جزیر و بۆتانیەوە دانێ. کەیخودا و پیاوەگەورەکانی بۆتانی سەبارەت بەو مەبەستە هاتنە لای نووسەری ئەم پیتانە و ڕوویان لە منی هەژار نا کە بە سەردار ڕابگەیەنم ناسر بەگیان بۆ بکاتە فەرمانڕەوا. سەرداریش پەسندی کرد و بەڵێنی داکە فەرمانڕەوایی جزیر بە ناسر بەگ ڕەوا ببینێ. بەلاّم میرعەزیز کوڕی کەك محەمەد باڵیچاوشی ڕاسپاردبووە لای سەردار کە سولٚتان محەمەد سەدهەزار لیرەی عوسمانی و ماڵ و شتومەکی لە ئەندازە بەدەری لە پاش بەجێ ماوە و جگە لە دوو خوشك کەسی کەلەپوورگری تری لە پاش بەجێ نەماوە. ئەگەر مەزنایەتی جزیر بدەن بە من ئامادەم سەدهەزار فلوری سکەی شاهانە لە ماڵی سولٚتان محەمەد و دوازدەهەزار فلوری لە کیسەی خۆم بخەمە ناو خەزێنەی سولٚتانەوە.

سەرداری بەداموەدەستوور ئەم پێشنیارەی بە سەرکەوتنێکی گەورە دانا. ڕۆژی دووەم کە دەبوایە میرناسر بۆ دەست ڕامووسان بچێ، میرعەزیزیشیان بانگ کردەدیوان و سەردار ڕووی دەبۆتانیان کرد و لێی پرسین میرناسر و میرعەزیز کامیان بە خزمایەتی لە سولٚتان محەمەدی خوالێخۆشبوو نزیکترن؟ کەیخودایانی بۆتانی گوتیان میرعەزیز بە یەك پشت نزیکترە. سەردار فەرمووی کەوابێ فەرمانڕەوایی جزیر بە خزمی نزیکتر دەگا و دەبێ بەو بدرێ. دووبارە گەورەپیاوانی جزیر هەڵگەڕانەوە و گوتیان ئەگەرچی میرعەزیز خزمی نزیکترە و ئەگەر مەزنایەتیەکە میراتی بێ بە میرعەزیز دەگا، بەلاّم هەموو تیرە و هۆز و پیاوماقوولاّنی بۆتان بە تێکڕایی میرناسریان گەرەکە و بۆ سەرو بەر پێدان و ئاوەدان کردنەوە و پاراستنی ولاّت ئەو لە مەزنەکانی پێشووشمان زۆر باشترە.

سەردار گوتی جا باواشبێ، من مەزنایەتی جزیرم داوە بە میرعەزیز. یەك لەسەرناسانی بۆتی بەر پەرچی دایەوە و گوتی فەرمانی سولٚتان سولەیمانە هەر کەسێکی هۆز و تیرەکانی خۆجێ بە مەزنی خۆیانی هەڵبژێرن، هەر ئەوە و دەبێ بە ئارەزووی خۆیان بێ؛ ئێمە هیچمان میرعەزیزمان ناوێ.

سەردار بەو قسانە شلەژا و بانگی میرغەزبی کرد و لەو ڕۆژەدا -کە پێنجشەممە و بیست و نۆیەمی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزی ساڵی ٩٩١.ك (١٥٨٣.ز) بوو- لە بەر دەرکی خێوەتی دیوەخان، میرناسریان سەرژێ کرد. ئیتر بوو بە شین و شەپۆر و گریان و لە خۆدانێك هەرمەگین خوا بزانێ. لافاوی فرمێسك لە چاوی پیر و لاوەوە سەری کرد. کوشتنی ئەو بێتاوانە تاوانێك بوو دڵی بەردیشی ڕێك دەکوشی. گەورە و گچکە لە تاوانی، سەریان بە هەنسکانەوە هەڵدەکەندرا و ئاه و نزوولەی هەناسەساردان، کەفری دەتاواندەوە و هەموو کەس ببووە شینگێڕ و ئەو بێگوناهە جوانەمەرگەی دەلاواندەوە.

| | |
|---|---|
| سەری کردبوو خوێن لە چاوانەوە | دڵی دار و بەردیش دەتاوانەوە |
| لە دەرد و کەسەر گوڵ یەخەی دادڕی | فڕی بولبول و قەل لە باغا قڕی |

لە پاشان فەرمانڕەوایی جزیری دابە میرعەزیز و بە خەڵاتی سوڵتانی و بە لاواندنەوەی شاهانەی سەرفراز و خەنی کرد و باڵیچاوەشی دەگەڵ نارد کە جزیری بۆ وەرگرێ و بیداتێ.

میرشەرەف و براکانی لە ناوچەی تەنزیدا بوونە گۆشەنشین و ئەگەر خودای گەورە هاریکار بێ، بەم زووانە قەڵەمە کروج و بێ زوانەکەم بەسەرهاتی ئەوانیش دەنووسێ.

## میرعەزیز کوڕی کەك محەمەد

لە دوای ئەوە کە بە کۆمەگ و یاریدەدانی فەرهاد پاشای وەزیر کرا بە مەزن و کاربەدەستی جزیر و ساڵێك و چوارمانگی لەو گزیریەدا ڕابوارد، عوسمان پاشای گەورەوەزیر لە سەر کاری لا برد و مەزنایەتی جزیری دابە میرمحەمەدی کوڕی خان ئەبداڵ.

میرعەزیزی دەرکرا و بۆ شەڕی تەورێز ڕەگەڵ لەشکری سەرکەوتووی ئیسلام کەوت و چەندی پێ سپێرابا ئەوەندی خزمەتی پادشای عوسمانی دەکرد و گوێ بە فەرمان بوو. لە پاشان ماڵی خۆی بار کرد و لە جزیر دەرکەوت و کەوتە شنگالەوە و لەوێی ڕادەبوارد. کە عوسمان پاشالە تەورێز مرد و جارێکیتر فەرهاد پاشای سەردار بەرەو ئێران بەڕێ کرا، میرعەزیز لە ئەرزەڕۆمێ خۆی گەیاندێ و دیسان بازاڕ دامەزراوە.

فەرهاد پاشا بۆی دانابوو ئەگەر سی گوندی فەلەنشینی بۆتانێ بخاتە سەر مولکی تایبەتی سوڵتان و ساڵانەش بەرانبەر بە شێستهەزار زێڕی سکە لەو گوندانە بە خەزێنەی دارماڵی شاهانە بگا، ئەوا دەیکاتەوە بە میر. میرعەزیزیش بۆ ئەو مەرجە ملی چەماند و پێك هاتن.

میرمحەمەد کە بە سارد و سەودایەکەی پاشای زانی، بە هەڵەداوان هاتە ئەستەنبوڵ و بە هومێد بوو چارەیەك بدۆزێتەوە.

کاتێ کە هەوساری کار و باری وەزارەت کەوتە ناو لەپی بە هێزی سەنان پاشا، لە سەر داوای میرعەزیز -کە دەترسا تووشی گێرە و قەرقەشی کەن- میرمحەمەدی بەشخوازیان بەرەو ڕۆمئیلی هەڵداشت و لە کۆڵ میرعەزیزیان وەکرد.

میرشەرەف دەگەڵ برایان -کە خزابوونە ناوچەی تەنزی و ژیانێکی نەقڕ نەپریان دەگوزەراند- میرعەزیزی سەرەسۆدرە، گەڕی دەوانیش هاڵاند و ناوچەی تەنزی لێ بڕین و دای بە حاجی بەگی کوڕی خۆی. قرمی خۆشی خۆش کردبوو کە منداڵانی خان ئەبداڵ بە یەکجاری لە ناو بەرێ. ئیتر بێترس و دڵ خورتی و بێ بەرهەڵست و تەگەرە، دولینگانەی بەسەر ملی جزیریاندا بەردایەوە؛ بەڵام وەك پێشینە دەڵێن: «بەرخ هەر بن سەوە نابێ، ڕۆژێك دێ شاخی پەیدا بێ»، کوڕەکانی خانئەبداڵێ وردەوردەپێگەیشتن. ئەمامی ساوا بوونە دار و تازەلاوی بەژن زراو. هەموو بوونە کەڵەپیاوی بەدەست و مەچەك و بەشان و باهۆ و تێکسمڕاو و پتەو و چوست و چالاك و بێباك و بە دەردی کابرا گوتەنی «کەریان بە پلار داویشت و گنجیان لە توێڵ نەدەنیشت».

هەموو خەڵکی بۆتانێ زۆر لە میرعەزیزی کورسیکڕ دڵپڕ بوون؛ بەڵام زۆریان پێ نەدەشکا. کە دیتیان کوڕگەل گەورە بوون و بۆ سەرداری گەل دەست دەدەن، هێز و گوڕیان لە دڵ گەڕا و گەلێك هومێدیان پێیان بوو کە خوا بە هۆی ئەوانەوە دەرووی ڕوونیان لێ بکاتەوە.

میرشەرەف کە سوور دەیزانی هەموو جزیری و بۆتانی بە دڵ و گیان دەگەڵ ئەون و دژی میری بە زۆرەکی داسەپاون و چاوەچاون هەر ئەستی و بەردێك لێك بدرێ و قاوە و پووشووی شۆڕشێکیان بۆ هەڵگرسێ، ئیتر سوتمان و دووکەڵ و چرە چەمان لەوان دەبێ، بە خۆی و بە برایانەوە لە میرعەزیزێ ڕاپەڕی و هەموو خەڵکەکەی بۆتانیش وێکڕا دەگەڵیان هرووژا و بوونە خوێنگر و خوێن

ئەستێن؛ هاتنە سەر خوێنکڕ و خۆفرۆش و داوای خوێنی میرناسر و ڕزگاری خۆیـان لێـدەکرد. هـەموو لایان لە میـرعەزیز زەوت کرد و ئەوی بە دەستیەوە مابوو تەنیا قەڵا و شارەکە بوو.

لە هەر کوێ دەست و پێوەندی میـرعەزیزیان بدیتایە، ئەگەر نەشیان کوشتبایە خۆزگەی بە مردنێ دەخواست. میــرعەزیز لـە ترسـان حەجـمینی نـەما. قـەڵا و شـاری بـۆ حـاجی بـەگی فرزەنـدی و میرهاوەندەبرازاکەی بەجێ هێشت کە پارێزگاری وڵات بن و لەبۆ خۆشی -بە هومێدی هانا و هیمدادی سوڵتانی- ڕەوانەی بەر بارەگاهی جیهانپەنای پادشایی بوو.

میرشەرەف و زۆربەی زۆری هۆز و تیـرانی بۆتـانی -کـە ببوونـە دار و دەسـتەی- دەوری قـەڵای جزیریان دا. حاجی بەگ بە پەنایەکدا خۆی کووزوو کرد؛ فیسمالکی دایە و بەرەو دیاربـەکر پـەل بـوو. بەو هەوایە کە بەڵکوو ئیبـراهیم پاشای میـری میـرانی دیاربەکر دەهانا و هاواریەوە بێ؛ بەڵام مەرگ فریای کەوت و هەر لە دیاربەکر مرد و ئاواتی هیمدادی پاشای دەگەڵ خۆ بردەگۆڕەوە.

دژدارانی قەڵا چل ڕۆژ بە شپرزەیی و پەرێشانی لە بەیان هەتا هەنگۆرێ، چاوەچاو و دەست لە بـان چاو، بەرەو ئاستانەیان ڕوانی؛ چاویان خێل بوو؛ میرعەزیز هەر نەهاتەوە و هاتنی هیمدای ڕۆمیان بـوو بە هات-هاتەکەی ڕۆمێ! ناچار چاریان لەوەدا دی ئەوی سەری بـۆ دەردەچـێ، تـا زووە سـەری خـۆی هەڵگرێ و کەوڵی لە دەباغ ڕزگار کا. میـرهاوەند ماڵ و خێزانـی میــرعەزیزی بـە چـەند پاسـدارێك سپارد و دەهەندە-هەندی نیوەشەوێدا -دەگەڵ چەند زەلامێکی خۆیدا- دەروازەی قەڵای کـردەوە و لـە سووچێکەوە قاچاندی.

میــرسەیفەدین -کە برایەکی میـرشەرەف بوو- هەستی پێکرد؛ کەوتە شوێنی و ڕێی دەرچوونی لێ بڕیەوە و دەگژ یەکتـری ڕاچوون و میـرهاوەند میـرسەیفەدینی کوشت و خۆی دەرباز کرد.

میــرشەرەف و میـرعیززەدین خۆیان گەیاندەقەڵایە، دار و نەدار و بوود و نـەبوودی میــرعەزیز و عەزیزانی تالان کرا. ژن و منداڵ و خێزان و وردەو یەخسیـری دیل کران و درانە دەست کـوردی بۆتـان. کەنیزەك و سەماکەر و بەزمگێڕیان بە سەر دۆستاندا دابەش کرد و ئەوانیش دەکاریان هێنان. کـوڕێکی پچووکی میـرعەزیزیش لەو ناوەدا بێسەروشوێن شرت و گوم بوو.

کاتێ دەنگ و باسی ئەو کارەساتە دەئاستانە گەڕا و بە گوێی پیـرۆزی هەرەبەرز گەیشت، فـەرمان

بۆ هەموو ئاغا و بەگلەری کوردستان دەرچوو کە دەژێر سەرکردایەتی حوسێن پاشای میــری میــرانی مووسڵدا میــرعەزیزێ بەرنەوە سەر جزیرێ و بۆتانی لە دەستی ناحەزان بۆ بستێننەوە و میــرشەرەف و برایانی -کە بە زۆری زۆرەملی، جزیریان زەوت کردووە- تۆڵەیان لێ بکرێتەوە و سزایەکی وایان بــدرێ کە هەموو سەربزێوی‌تر یەکجاری چاوترسێن ببــن.

حوسێن پاشا لە سەر فەرمانی سوڵتانی، دەگەڵ ئەمیرمــحەمەدی مــەزنی حــەزۆ، لەشکریان لــە مووسڵەوە هێنا و زستانی ساڵی ۹۹۹.ك (۱۵۹۰.ز) هاتنە سەر شاری جزیرێ.

میــرشەرەف و برایانی کە بە هاتنی وانیان زانی، قەڵا و شاری جزیرێیان بەجێ هێــشت و چــوونەوە ناوچەی تەنزی و لەوێشەوە بە دزیەوە پیلی منداڵ و خێزانی خۆیان گرت و ڕوویــان کــردەلای خێــزان و مەکس.

حوسێن پاشامیــرعەزیزی بۆ ناو قەڵایە گوێزتەوە و بەرەو دوا گەڕایەوە.

میــرشەرەف و براکانی کاتێ ئەمەیان بیستەوە: کە پاشــاو لەشــکری پاشــالەو ئاقارانــە نــەماون و دەوری میــرعەزیز چۆڵ بووە، دیسان هاتنەوە ویزەی و دەوری قەڵایان دایەوە و تەنگەیان لێ کێــشایەوە و هێچکیان لێ وێك هێنایەوە.

میــرعەزیز تێگەیشتبوو میــرشەرەف خواردنی ئەو نیە و ئەو بەڵایە بەڵایەکە هەر دەبێ لــە بــەری ڕاکەن. خۆی و هاوەندی برازای وەکوو چواله لە کونێکەوە بۆی دەرچوون و لــە شــاری جزیــر تــرازان و تفەدەستی خۆیان کرد و جوچك هەڵێ هەڵۆ هات! وا هەڵاتن کەروێشکی سیخوار لە پشتیان مەودایەك وەپشت خۆ دەدا.

میــرشەرەفیش دەم لە سەر پشت کەوتە دوویان و ڕێزە ڕاوی لێ دابەشیــــن و میرهاوەنــدی وە بــەر هات و کوشتی و لە پاش چەند ڕۆژێك، کە لەشی بــێ گیــانی میــرعەزیزیــشیان لــە دەشــت و بیابــان دیتەوە.

بە چی دڵخۆش بیــن لەم جیهانەدا　　پــشتی کێی گرت و ملی با نــەدا

زۆر شێــو بۆ گۆوەند وە سەر نراوە　　لــە سەر شیــنگێڕان دابەش کراوە

## میرمحەمەد کوڕی خان ئەبدال

وەك گوتمان ساڵی ٩٩١.ك (١٥٨٣.ز) فەرهاد پاشای گەورەوەزیر، میرناسری برای میرشەرەفی کوشت و مەزنایەتی جزیر و بۆتانی دابە میرعەزیز و باڵی چاوەشیشی نارد کە بچێ دارایی سوڵتان محەمەد سیایی بگری و جێبەجێی کا! میرمحەمەدی برای میرناسرە کوژراوەکە، ژن و منداڵی میرناسری برد و ڕووی کردەدەرگای عەرشاسایی پادشایی کە دادی خۆی لە لا بکا. وا ڕوویدا لەو سەروبەندەدا لە سۆنگەی درێغی کردن و کەمتەرخەمی، فەرهاد پاشالە سەرداری لەشکری سەر ئێران خرا و عوسمان پاشالە جیاتی ئەو کرا بە سەردار لەشکر و ئەویش میرعەزیزی لێخست و مەزنایەتی جزیزی دابە میرمحەمەد. کە عوسمان پاشای ڕەحمەتی لە تەوریز عەمری خوای کرد و فەرهاد پاشاکرایەوە بە سەرداری بەری عەجەم، ئەو باسەشمان گێڕایەوە کە میرعەزیز لە ئەرزەڕۆم چاوی پێ کەوت و سەودای لێکرد و میرایەتی جزیری بە سی گوندی ئەرمەنی‌نشین لێ کڕی و مەرجیش وابوو ساڵانە شێست هەزار فلوریان لێ پەیدا بێ و بکرێتە ناو خەزێنەکەی لپاولپ و دارماڵەوە. ئەوسا میرمحەمەدی فرۆشراو، ڕووی کردەدەرگای شاهەنشای خاوەن شکۆو.

لە سەر فیتی فەرهاد پاشالە باتی ئەوە جزیری خۆی بدەنەوە، ناردیانە وڵاتی «بدون»[1] و کارێکیشیان بۆ دۆزییەوە کە هەتا دەمرێ لەوێ بێ.

میرشەرەف و براکانی بۆ سەفەری گورجستانێ لە بەر ئاوزەنگی و مامزەی بە زەبر و زەنگی سەرداری لە جەنگان سەرکەوتوودا بوون. لە دوای ئەوەی کە سەرداری هەرە بەکاری میرخاسان لە خەزای خودانەناسان دەگەڕاوە، میرشەرەف و براکانی لە ناچاری چوونە مەڵبەندی تەنزی و خزینە ناو سووچێکەوە. بەڵام میرعەزیزی تاین ئەوەشی پێ ڕەوا نەدین. هەر بە فەرمانی پادشایی ئەوێشی بە ناوی سنجەق خستە سەر ناوی حاجی بەگی کوڕی. لەو ڕۆژەوەش کە هێنابوویانە جزیر، هەموو بیری دابووە سەر وەی کە کوڕانی خانئەبداڵێ لە بنە بێنی و کەسیان لە دنیا نەمێنێ. بەڵام خەون بەراوەژوو وەڕاست گەڕان؛ وەك زانیمان میرعەزیز و میرهاوەندی برازای و حاجی بەگی کوڕی خۆی و زار و زیچی

---

١- مامۆستا زێرنۆف لە سەر «بدون» پرسەکی داناوە؛ وادیارە «بوسونە»یە و بە هەڵە نووسراوە. چونکە لە ڕووپەڕ ١٨٣ی فارسیەکەی چاپی میسردا دەڵێ: لای «ڕۆمئیلی»؛ لە ڕووپەڕ ١٨٦ ڕەوانەی «بدون» کرا؛ لە ڕووپەڕ ١٨٧ ناردیان لە بوسنەوە هێنایانەوە. بڕوانە چاپەکەی محەمەد عەلی عەونی. هەژار

نێر و مێویان لە بنە هاتن و دوابڕاو بوون و میرشەرەفیش بە جەوهەر و هونەری خۆی ملکی جزیری ساندەوە و خۆی تێدا دامەزراندەوە و ناوچە و قەڵاکانی‌تری بۆتانی بە برایان ئەسپارد.

لە کاتێدا ئەم دەنگ و باسی بۆتانە ڕووی کردەکۆنەبەختی ئاستانە و گوێچکەی پێچکەی تەختی پیرۆزی سوڵتانی زرینکاند و دڵی سەرداران و سەرکارانی مەزنی داخورپاند، دەنگی پیاوانیان داو بە هەڵەداوان ناردیاننە بوسەنە و بەلەز و پەلە، لە پەلی محەمەد بەگی نەوین و ڕەپێچەکیان‌داو گورج هێنایانەوە ئەستەمبووڵی مۆڵگەی خەلیفایەتی و لەسەر تکای برایم پاشای وەزیر، جزیریان پێبەخشی.

فەرمانیش بە محەمەد پاشابوسنەوی، میری میرانی دیاربەکر درا کە میرەکانی کوردستانیش دەگەڵ خۆی بەرێ و جزیرێ لە برایانی بستێننەوە و محەمەد بەگی بە سەردا بسەپێنن.

کاتێ محەمەد پاشاو میرانی دیاربەکر چوونە سەر جزیر و بۆتان. میرشەرەف بێ شەڕ وەرا وڵاتەکەی بۆ میرمحەمەدی برای بەجێ هێشت و دەگەڵ براکانی دیکەی ڕوویان کردەوە مەڵبەندی تەنزی و کروشمەیان کرد.

لە پاش چەند ڕۆژێك کەیخودا و ڕیش‌چەرموانی بۆتانی خۆیان خستە نێوانەوە و میرشەرەفیان هێنا جزیر و دەگەڵ میرمحەمەدی برایدا پێکیان هێناوە و بڕیار درا ناوچەی شاخ و چەند مووچە و مەزرا و ئاوەدانی‌تر -کە نزیك بە نیوەی وڵاتی بۆتانی دەگرتەوە- بدرێ بە میرشەرەف و براکانی دیکەی و بە داهاتەکەی بژین. شاری جزیر و ناوچەکانی‌تر کە دەمێننەوە، بۆ میرمحەمەد بن و میرمحەمەدیش دەستەبەر بێ ئەو سەدوپەنجا هەزار فلوریەی کە بەڵێنی داوە ساڵانە بیخاتە گیرفانی سوڵتان و وەزیرەوە، هەر لە بەریکی خۆی بیدا.

هەردووکلا ملیان بۆ ئەو بڕیارە شل کرد و برایەتیان خۆی توند کرد.

ماوەیەك بە سەر ئەو ئاشتبوونەوەدا ڕابرد. پیاوماقووڵانی بۆتانی دڵیان دەگەڵ میرشەرەف بوو. میرمحەمەدیش دەیزانی کە لە ناو هۆزەکەی خۆیدا ڕەزاگران و خوێنتاڵە و بۆی دەرکەوت کە ئەو سەدوپەنجا هەزار فلوریەی دەبێ بیدا، بۆی لەو خەڵکە ناسێندرێ و لە ئەنجامدا هەر ملی خۆی دەگرێتەوە. ئیتر لە ترسی نابووت بوون، وازی لە مەزناهی هێنا و شاری جزیری بەجێ هێشت. کاتێ کە پیاوە تەرزەکان و وەزیرە پایەبەرزەکان و کۆڵەکە بەختەکانی پادشای بەهەشتی (مرادخان) جەوهەر و هونەری میرشەرەفیان بۆ دەرکەوت،. مەزنایەتی جزیریان بە بەخشش دایە و فەرمانی

میرایەتیەکەی بۆ نووسرا و نیشانی فەرمانڕەوایی بۆ بەڕێ کرا.

میرمحەممەد کە ئەم هەواڵەی بیستەوە، ڕایکرد و پەنای بە محەممەد بەگی فەرمانڕەوای حەزۆ برد. ژنی میرمحەممەد خوشکی محەممەد بەگی حەزۆ بوو. ماڵ و منداڵی لە حەزۆ بەجێ هێشت و تکانامەی میرمحەممەدی دەتەنکەی باخەڵ ڕاکرد و ڕەوانەی دەرگای سوڵتان بوو. لە سایەی بەزەیی بێ بڕانەوەی پادشایی، سنجەقی حەسەنکێفی بە بەخشش درایە. لە دوایەش چونکە بۆ شەڕی دیندوژمنە لامەزەبەکان و لە دەورەدانی قەڵای ئەکریدا میرمحەممەدیش وەك سەرکەوتن و دنیاگرتن، دەبەر ڕکێفی پیرۆزی شاهانەی سوڵتان محەممەدخانی خەزاکەر دابوو -هەمیشە پایەدار بێ- پاداشتی داوەتەوە و فەرمانی فەرمانڕەوایی جزیری لە دیوانەوە بە ناو نووسراوە و هەردی بۆتان بەو دراوە؛ بەڵام لە ترسی میرشەرەف ناوێرێ هەر بە لاشیدا بچێ.

## میرشەرەف کوڕی خان ئەبداڵ

میرشەرەف هەڵبژاردەو دیاردەی ئەو خانەدانە سایەچەورەیە و هەتا خوا حەزکا دڵاوا و مەرد و ڕەند و سەربڵند و باڵادەست و گەورەیە. لە مەیدانی مەرداندا بە کاشۆی پیاوەتی گوێ بردۆتەوە و مایەی وەج و پایەی هەمووی بۆ خۆی گرتۆتەوە. مەچەکی بوێری لە جەنگەی دوژمن هەڵوەژێری دا، داد ئەدا و دەستی بگاتە دەسکی خەنجەرێ، هەزار سەری لە چاوتروکانێکدا بەرباد ئەدا.

لە کاتی بەخششی، حاتەم چرووکە، ڕژدەکرالّ  لە جەنگ و سەنگی ئەوا گاڵتەجاڕە ڕوستەمی زاڵ

چ لەشکری و چ بۆرەپیاو، چ ڕەمەکی و چ خاوەن ناو، هەر کەس لە جزیردا دێتە بەرچاو، چاوبەرەژێری خێروبێری ئەو میرە دادپەروەرەیە و بەهرەمەندی چاکەی ئەوسەروەرە بەختەوەرەیە. ئاشنا وبێگانە لە ئاکاری پیاوانەی دڵخۆش و شادن و لە غەم ئازادن وگەورە وگچکەی بۆتانی دایم وەدەرهەم دەستەودۆعا و دەمبە نزا لەبەر خوا دەرپاڕێنەوە کە ئەو میرە ژیر و بە بیرەیان ڕاوەستاو کا.

ئاگری زۆری بە ئاوی تیغی تیژ کووژاندەوە  سیس و شەمزاوی بە سروەی پیاوەتی بووژاندەوە

چارەڕەش بە دڵی بەزام و چاوی خوێن دابێژەوە  بەر بزێکی ئەو کەوێ ژینی بە پیت و ڕێژەوە

لە پاش ئەو بەسەرهاتانەی کە لە نێوان میرعەزیز و میرهاوەند و میرشەرەفدا ڕوویدا و بە درێژی لێی دواین، هەوساری کاروباری جزیرێ کەوتە ناو لەپی میرشەرەف و لە پارێزگاری بێهێزان و

پێچارانی کاری بێچاراندا، کارێکی وای کردووە کە لەوە چاتر بە خەیاڵی خەیاڵیشدا نایە و نایەتە بەر بیری بیریشەوە.

لە مەڕ میرمحەمەدیشەوە دواین کە وەزیری ڕۆژگار لە بوسەنەوە هێنایەوە و جزیری دایە و ئەویش لە دەستی نەهات ئەرکی فەرمانڕەوایی پێك بێنی و سەرلەنوێ وازی لێهێنا و دیسان لە دیوانی سوڵتانەوە مەزنایەتی جزیر درایەوە بە میرشەرەف و فەرمانەکەیان بۆ ناردەبۆتان.

میرشەرەف ماوەیەك بێکێشە و هەرا مایەوە. بەڵام میرعیززەدینی برای هەرای نایەوە. هەوای گەورەیی لە کەللەی داو شەیتان بە ئاقڵی پێکەنی و کەلکەلەی خۆپەرەستی لە مێشکیدا جۆڵاتەنەی تەنی و چەورە و لات و لووت و پیاوکوژ و بێیاری لەخۆ کۆ کردنەوە و هەر ڕۆژە لە لایەکەوە شاڵاوی بۆ سەر ماڵان دەبرد و ماڵی بێچارانی تاڵان دەکرد.

میرشەرەف لە بزۆزی و ناهەنجاری برای زۆر جاڕز ببوو؛ پێشی زەوت نەدەکرا. وەك دەڵێن «چاری ددانی بە ئازار هەر کێشانە»، ئێشانی برای لە داو و دەرمان دەرچوو؛ دەبوایە گازی تێ بخا. ڕۆژێك پیاوی ناردن گازی بکەنە جزیرێ و هەردووك چاویان پێك بکەوی و بزانێ ئەو چی لەم دەوێ تا بۆی بکا!

چەند نۆکەری ڕاز هەڵگر و باوەڕ پێکراوی ڕاسپاردن کە لەسەرهەستوووشیار بن هەرگا میرعیززەدین هەنگاوی بەرەو دیوان نا، بیکەن بە میوانی گۆڕستان. میرعیززەدین ئەو قاچی نایە ژوورەوە تازە بەرزی نەکردەوە و پیاوانی میرژیانیان لە بیر بردەوە و بە دووخ و دەمی خەنجەریان کەللەی سەریان لە خەیاڵی پووچ ڤاڵا کرد.

ئیتر لەو ساوە میرشەرەف لە جزیرێ فەرمانڕەوای سەربەخۆیە و بە ئازادی و کامەرانی مەزنی و سەرداری خۆی دەکا و ئەوپەڕی گەشە و برەوی بە وڵاتی بۆتانێ داوە و لە خودا هومێدەوارم کە هەمیشە سەرکەوتوو بێ.[1]

---

١- شەرەفخان باسەکەی تا ١٠٠٥.ك (١٥٩٦.ز) هێناوە؛ بەڵام ئەو میرنشینە هەتا دەورانی بەدرخان پاشا هەرما. بەدرخان پاشا ساڵی ١٢٢٧.ك (١٨١٢.ز) لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا فەرمانڕەوایی جزیری دەسکەوت و کەوتە سەر ئەو نیازە کە دەستی تورکان لە سەر وڵاتەکەی ببڕێ و دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە کوردستاندا دابمەزرێنێ. پێوە بچێ تا هەموو کوردستان لە دەست تورکان دەردێنی و دەیخاتە سەر ئەو دەوڵەتی کوردستانە. دەستی کرد بە ←

← یەکخستنەوەی میر و مەزنەکانی کوردستان و بۆ ئەو مەبەستەش کاربەدەستە کوردەکانی وان و هەکاری و خێزان و مووش و هێندێك لە شێخە بەناوبانگەکان هاوکاریان دەگەڵ کرد.
میـر بەدرخان کەوتە خۆ و کارخانەی تفەنگ و فیشەکی لە شاری جزیر دامەزراند و پێوە بوو لە هەموو بارێکەوە خۆی بۆ ئەو پرۆژەیە ئامادەبکا. لەو سەروبەندەدا فەلەکانی وڵاتی بۆتان لێی هەڵگەڕانـەوە و بـاجی سـاڵانەیان نـەدا. میـر لەشکرێکی دەهەزار کەسی بردەسەریان کە بیانـخاتەوە ژێر فەرمان. کاروباری میـر لـە دەوڵـەتی عوسـمانی خـۆش نەدەهات و ترسی لێ پەیدا ببوو. نوێنەری ناردنە لای کە هەوڵی یەکخستنەوەی کوردان نەدا و یەکیـەتی نەتەوایـەتیان وەبەر نەخا. باری دنیاش گۆڕا؛ ئورووپا لە سەر فەلەکان وەجـواب هـات و تورکیـان تێگەیانـد کـە دەبـێ ئـەو فەلانـە بپارێزێ. ئەستەمبووڵ ئەو هەلەی بە دەرفەت زانی و قرمی خۆش کرد کە ئەو میـرنشینە لە ناو هـەڵگرێ. بـە حـافیز پاشای موشیـری ئەنادۆڵی سپارد کە بە هەر چۆنێك بێ بەدرخانێ بێنێتە ئاستانە؛ بەڵام حافیز پاشا هیچی بـۆ دەگـەڵ نەکرا. دەوڵەت لەشکرێکی زۆری ناردەگژ بەدرخان؛ لەشکرەکە شکا و زۆر بە شپرزەیی بەرەو دوا گەڕایـەوە. هـەنگاوی دووەمی میـر لە وەرامدا ئەوە بوو سکەی بە ناوی خۆی لێدا و قەڵەمڕەوی گوشاد کردەوە و وان و سـابلاخ و ڕەوانـدز و مووسڵیشی وەبەر خۆ داو قەڵاکانی سنجار و ویـرانشـار و سـیورەکیشی گـرتن و دەسـەڵاتی گەیشتە دەوری قـەڵای دیاربەکر. لە دوای ئەوەش کە لە دەوری مووسڵ ئاژاوەیان نایەوە و سەرکوتی کردن، شاری شنۆ و ورمێشی گرت.
لەم بەینەدا حکوومەتی عوسـمانی لەشکرێکی یـەکجار زۆری بـە سـەرکردایەتی عوسـمان پاشا ناردەسـەر میـر و لەشکری هەردوکلا لە نزیك ورمێ گەیشتنە یەك و لە جەنگەی شەڕدا میـر عیززەدین شێر -کە بەڕێوەبـەری لەشـکری بەدرخان و خزمیشی بوو- بە هەموو چەك و سیلاح و پیاوی خۆیەوە لە بۆتان خۆیان هاویشتە بەر ئـاڵای دوژمـن و لـە میـر هەڵگەڕانەوە و یاریدەی تورکانیان داو جزیر گیـرا. بەدرخان کە ئەمەی زانی هێندێك لە لەشکرەکەی لە بەرانبـەر عوسـمان پاشادا ڕاگرت و بە بەشە لەشکرەکەیترەوە بەرەو جزیری پایتەختی هاتەوە و شەڕی تورك و عیـززەدین شـێری کرد و جزیری لێ ساندنەوە.
پوختەکەی ئەمەیە: خەیانەتی عیززەدین برستی بەدرخانی بڕی و عوسـمان پاشا لەشکرەکەی شکاند و میـر بە ناچـاری جزیری بەجێ هێشت و لە قەڵای ئاروخدا خۆی قایم کرد و تورك و عیززەدین دەوریان داو هەشت مانگی شەڕ کرد و لـە پاشان بژیو و جبەخانە نەما و ناچار بوون کە لە دژ دەرکەون و زۆر ئازایانە خۆیان دەناو دوژمن هـەڵکرد و تـا توانیـان شەڕیان کرد و لە ئەنـجامدا شکان و میـر بەدرخان و دوو کوڕی بە دیـل گیـران. لـەو سـاڵەدا ۱۲۶۳.ك (۱۸٤۸.ز) حکوومەتی عوسـمانی بۆ ئەو سەرکەوتنەی میداڵێکی بە ناوی میداڵی جەنگی کوردستان داڕژت!
ساڵی ۱۲۹٤.ك (۱۸۷۷.ز) کە تورك و ڕووس بە شەڕ دەهاتن، حکوومەتی عوسمانی، عوسـمان پاشا و حوسێن کەنعان پاشای کوڕانی میـر بەدرخانی ڕاسپارد کە بۆ ئەو شەڕە، خەزاچی کوردان زۆر کۆ بکەنەوە و بە ناوی شەڕی ئایینەوە بە گژ ڕووسیدا کەن. ئەوانیش ئەمەیان بە هەل زانی و دەگەڵ هێندێك کاربەدەست و ئەفسەران ڕێك کـەوتن کـە شۆڕشـی بابی گەورەیان هەڵگیـرسێننەوە و بە ئەنـجامی بگەیەنن.
سـاڵی ۱۲۹۷.ك (۱۸۷۹.ز) بـۆ دامەزرانـدنی کوردسـتانی ئـازاد خۆیـان گەیانـدەوە جزیـر و سـەربەخۆیی ←

← میرنشینەکەی لە مێژینەی خۆیان ڕاگەیاند. دەوڵەتی عوسمانی چەند جارێك لەشکری بردنە سەر و هەموو جاریش دەشکا. جۆلەمێرگ و زاخۆ و ئامێدی و ماردین و مدیات و نوسەیبین هاتە بەر حوکمیان و برای گەورە (عوسمان پاشا) تاجی فەرمانڕەوایی لە سەر نا و لە سەر مینبەران خودبەی بە ناو خوێندرایەوە.
تێشکانی جار لە دواجاری لەشکری عوسمانی و خۆ قایم کردن و برە و پەیدا کردنی حوکمی ئەمیر عوسمان پاشا لە کوردستاندا وایان لە سوڵتان عەبدولحەمید کرد کە بەرانبەر بە کورد و کوردستان خۆی نەرمتر نیشان بدا و بە تایبەتی دەگەڵ بەدرخانیان چاکەی بکا. هەر بەدر خانیەکی سەر بەو ماڵە گیرابوو بەریدان و پیاوی تایبەتی ناردەلای ئەمیر عوسمان و داوای لێکرد کە بە ئاشتی پێك بێن و چیدی خوێنی موسوڵمانان نەڕژێ!
ئەو خزمانەی بەدرخانیان کە لە ئەستەمبوڵێ دەژیان، میر عوسمانیان هەڵنا کە بکەوێتە وتووێژ. دەگەڵ تورکان دایانمەرزاندەگفتوگۆ و ماوەیەك ئاوا ڕابرا. هەرچی عوسمان پاشا دەیگوت، تورك زۆر بە نەرمی و خۆشی وەرامیان لێ وەدەگەڕاند و سەرزارەکی داوای کوردیان بە شتێکی ڕەوا دەزانی. لە ڕاستیشدا ئەو نەرمیە هەمووی گزی و دەسبڕین بوو.
کاریان گەیاندەئەو بارە کە میر عوسمان و میر حوسێنی برای زۆر باش بۆیان هەڵخەڵەتان و پشتێندی خاترجەمییان لێ کردەوە و کە دەچوونە کۆ بوونەوە بۆ وتووێژ، ئاگاداری خۆ نەبوون و دوژمنیان بە دۆست دەزانی. ڕۆژێك تورك دیتیان هەلە؛ لە نەکاو هەردووکیان گرتن و بردیانن بۆ ئاستانە و لە بنی زیندانیان توند کردن. لە پاش ماوەیەك بەریان دان؛ بەڵام بەو مەرجە کە هەرگیز لە ئەستەنبوڵ دەر نەکەون.
ساڵی ١٣٠٦.ك (١٨٨٩.ز) ئەمین‌عالی بەگ و مەدحەت بەگ -کوڕانی بەدرخان بەگی گەورە- دەچوونە ئاستانە و بە هەلیان زانی لایاندا تەڕابزون و لەوێوە نامەیان بۆ سەرۆك و سەردارانی کوردستان نووسی و بڕیار درا کە هێزێکی زۆری کوردان بێتە جویزلك -کە لە نزیك تەڕابزونە- لەوێ چاویان بەو دوو میرانە بکەوێ. هێز هات و میرەکانیان دیت؛ بەڵام حکومەت زانیبووی؛ کار قایمی خۆی کردبوو. هێزێکی زۆر گەورەی تورك ڕێگە و بانی لێ بەستبوون کە نەگەنەوە کوردستان. لە باشووری شاری بایبورد لە دوو لاوە لەشکری تورك دەورەی دان و شەڕی گەرم و گران قەوما و لەشکری کەمی میرەکان شکا و ناچار بوون دایانە چیا و خۆیان گەیاندەچیای ئەرغەنی و مەعدەن. هێزی تورك دوایان کەوت و لە ناو چیاش زۆریان شەڕ کرد و لە ئەنجامدا بە ناچاری خۆیان دایە دەست تورکەوە.
خولاسەی تاریخی کورد و کوردستانی ئەمین‌زەکی، تەرجەمەی محەممەدعەلی‌عەونی، چاپی بەغدا، ڕووپەڕ ٢٣٦ تا ٢٣٨. هەژار

## لکی دووەم

# فەرمانڕەوایانی گۆڕکێل

لە پێشدا گوتمان نەتەوەی سولەیمانی کوڕی خالید، وڵاتی جزیریان لە ناو خۆدا بەش کرد و ناوچەی گۆڕکێل وەبەر میرحاجی بەدر کەوت. فەرمانڕەوایانی گۆڕکێل هەموویان لەو حاجی‌بەدرەوە کەوتوونەوە. گۆڕکێل دەپێشدا ناوی جوردقیل بووە؛ لە پاشان لەبەر زۆر لێ‌دوان سواوە و گۆڕکێلی بەسەردا براوە.[1]

چیای جوودی کە گەمیەکەی نووح پێغەمبەر- درودی زۆر لە سەر ئەو و پێغەمبەری خۆمان- بە سەریەوە نیشتۆتەوە، لەو مەڵبەندەهەڵکەوتووە.

ناوچەی گۆڕکێل سەد گوندێکی فەلە و موسوڵمان نشینی لێیە. زۆزان و هاوینەواری زۆر سازگار و بە چێنکە و زەنوێر و زۆر گەرمەسێری بژوێن و بە پووش و پاریشی هەیە. گەلێك هۆز و تیرە و خێڵی کوردی کۆچەر، بۆ لەوەڕانی ئاژەڵیان -لە هەموو کژێکی ساڵدا- ڕووی تێ دەکەن.

کاتێ حاجی بەدر مرد و دەربەدەری ئەو دنیا بوو، لە نەوەی ئەو حاجی محەمەد کوڕی شەمسەدین ناوێك شوێنەکەی ئەوی گرتەوە و کاتێ ئەویش بە ڕەوەندی بەرەو مەڵبەندی نەمان چوو، میرشەمسەدینی کوڕی ئەو لە جێ هەوارەکەی هەڵدا و ئەو کەلێنەی پڕ کردەوە و کاتێ خودای گەورە و گران ئەویشی بۆ خۆی بردەوە، سێ کوڕی لە رووی ڕۆژگاردا بە یادگار بەجێ هێشتن: میربەدر، میرحاجی‌محەمەد، میرسەیدئەحمەد. هەر سێك برا بە شوێن یەکدا مەزنایەتی ناوچەکەی خۆیان کردووە؛ بەڵام چونکە من دەربارەی دوانی پێشوو تێشووی سەرگوروشتەم نەبوو، لە نووسینی ئەم مێژووە، دوو میرە بەرپیوارەکانم هەڵبواردووە و هەر لە میرسەید ئەحمەدەوە دەستم پێکرد.

---

١- دەپێشدا ناوی گوردکێل بووە؛ عەرەب گوردی کردۆتە جورد و کێلی کردۆتە قیل. لە پاشان کوردەکان بۆیان وەك خۆی لێ نەهاتۆتەوە. هەژار

## میرسەیدئەحمەد کوڕی میرشەمسەدین

لە ئەندازە بەدەر بوێر و نەترس و بێباك و سامناك بووە؛ لە مەیدانی هەرا و هەنگامەدا دەسگەرم و بەدەستوبرد و چوست و زەبر بەدەستێك بوو هەڵبژاردەزەبر و زۆری زراوی دوژمنی دەبرد.

جا لەو سەروبەندانەدا کە مەزنەکانی کوردستان سەریان وەبەر باری سوڵتان سەلیم خانێ هێنا، سەیدئەحمەد ببووە هەمدەمی سوڵتان و قسەی خۆش و حەنەکی زۆر پڕ لە کەنی بۆ دەکرد و چیرۆکی سەیر و سەمەرەی بۆ دەگێڕاوە و ببووە هۆگر و خەمڕەوێنی.

پاش مەرگی سوڵتان سەلیمیش دەگەڵ سوڵتان سولەیماندا هەر بەو ئاوایە ڕایبوارد و هەمیشە هەر خۆشەویست و نزیکی پادشایان بوو. وەختێك مووسڵ و سنجاریشیان بۆ خستۆتە سەر گۆڕکێل و کەوتوونە ژێر فەرمانیەوە.

دەڵێن ئەو جارە کە سوڵتان سولەیمان‌خان لە ئارامگەی بەغداوە دەگەڕاوە، میرسەیدئەحمەد خۆی نایە ناو تابووتێکەوە و لە سەر ڕێبازی سوڵتانیان لە گەز دابوو. پادشاپرسیاری فەرموو گەلۆ ئەو داربەستەی کێیە؟ گوتیان: تەرمی میرسەیدئەحمەدی تێدایە و عەرزت دەکا سنجەقی مووسڵیێ بۆ من وەك گیانی شیرینم وایە و پادشاش بە ناموی دایە و لەو سایەوە گیان لە لەشمدا نەماوە. پادشائەمەی لێ خۆش هات و فەرمانیدا مووسڵیان خستەوە سەر گۆڕکێل و گیانی تازە و مایەی ژیانی بێ‌ئەندازەی بۆ گەڕاوە.

میرسەیدئەحمەد زۆر ژیاوە و لە لای هەموو سوڵتانەکانی هاوچەرخی، ڕێزی زۆری لێ‌گیراوە.

قەڵای گۆڕکێل لە دژە هەرە هەڵەمووت و ڕژدەکانی کوردستانە کە سولەیمان بەگ بێژەن‌ئوغلی دەوری قەڵای ئامێدی دا و زستانی سەختی دوچار بوو؛ هاتە گەرمەسێری بشێری، عیززەدین شێری هەکاری خۆی لە قەڵای بای قایم کرد و ئیتر قەڵاکان و ناوچەکانی ئەم ناوانە هەموو کەوتنە دەست پیاوانی ئاقۆینلوو. میرسەیدئەحمەد وڵامی بۆ سولەیمان بەگ نارد، گوتی تا قەڵاکانی ئامێدی و بای و سۆی -کە نزیك بدلیسە- لە دەست ئێمەدایە، هیچ ترسێکمان لێتان نیە و دیمەنی خێوەتەکانتان سەرپاك لە بەرچاوی کوردان وەك شیاکە

گامێش دەنوێنن.

میرسەیدئەحمەد -کە ئەمیری ناوچەی گورکێل و مووسڵ بوو- عەمری خودای بەجێ هێنا و برازای جێگەی گرتەوە.

## میرشەمسەدین کوڕی میربەدر

کرا بە جێنشینی میرسەیدئەحمەدی مامی و ئەویش سێ ساڵان فەرمانڕەوایی گوڕکێلی کرد و ماڵاوایی لە ژیان کرد و سێ برای هەبوون: میرئیبراهیم، میرعومەر، میرحاجیمحەمەد.

## میرئیبراهیم کوڕی میربەدر

لەوان سەروبەندانەدا کە بەدر بەگی جزیرێ دەگەڵ ناسر بەگی برای لە سەر مەزنایەتی جزیر بە کێشە و هەرا هاتبوون، میرئیبراهیم -برادەری ناسر بەگ- سەبارەت بەو ئاشنایەتیە لاگری لە ناسر بەگ کرد و چووە شاری وان و نامەی لە فەرهاد پاشاوەرگرت کە ناسر بەگی پێ سەر خا و نامەی لە تەنکەی باخەڵ نا و ڕووی کردەلای ئاستانەی سوڵتان سولەیمانخانەوە.

هەر لەو سەروبەندانەشدا شاتۆماسب بە لەشکری یەکجار زۆر و لە هەژمار بەدەری -کە زۆر لە دڵۆپە بارانی پەڵە و لە پەلکی داران پتر بوو- دەوروبەری شاری وان و هەرێم و مەڵبەندەکانی سەریەوانی دابووە بەر و دەرەتانیان لە زیندەوەران بریبوو. جا هەر وەکوو گوتوویانە:

هێرش بردن و دەس لە گیان شردن　　هەواڵن دەگەڵ خۆ ڕزگار کردن

کاتێ زانی تووش بە تووشی قزڵباشە و لێدەرچوونی زۆر چەتوونە، لێکیداوە کە هەر چونێك بێ سەر دەرکا و نیازی لێگرت کە پێدزەیەکی بکا و بە دزیەوە خۆی بخزێنێتە بدلیسێ. بەڵام ڕێسەکەی هەڵوەشاو لە نێوانی بارگیری و ناوچەی ئەرجیش لووت و بزووت دەقزڵباشان هەڵەنگووت و نەشیدەکرا بەرەو دواوە بابداتەوە، لە ناچاری دەسکردنەوە و هێرش بردن و دەس لە گیان و سەر شردن و دەس بۆ دەسکی شیر بردنی هاتە بیر و شیری کێشاو ئازا خۆی دەناو هەڵکردن و دڕی پێدان و زۆر مەردانە خۆی گەیاندەناو قەڵاکەی ئەرجیشەوە.

شاتۆماسب هەر خودی خۆی سەرداری لەشکری کرد و دەوری قەلاّی ئەرجیشی داو دەس کرا بە شەڕ و لێکدان و تێکدان. نزیکەی چوار مانگی خایاند قەلاّکە بۆ شانەگیرا؛ بەلاّم ئەوانەی ناو قەلاّ لە تەنگانەی بێبژیوی، زۆر شپرزە و شپرێو ببوون. وایان بە لاوە پەسند بوو کە ئامان لە شاب خوازن و ئەویش لە خوێنیان خۆش ببێ و ئەمانیش بە خۆشی خۆیان، خۆیان و قەلاّی بدەنێ.

میرئیبراهیم و ئەو بۆتانیەی دەگەلّی بوون، ملیان نەدا و دەستیان نەدا کە خۆ بۆ شای سەرشۆڕ کەن و دەس لە هەرا و شەڕ هەلگرن. خۆجێیەکانی ناو قەلاّ بە نهێنی دەگەلّ دوژمندا ڕێک کەوتن و دەجەنگەی نیوەشەوێکدا دەرگای قەلاّیان کردەوە و پێنجسەد هەتا شەشسەد چەکدار لە قزلّباشی زۆر بەکار و کارامەیان ڕژاندەناو قەلاّکەوە و لە بەرەبەری بەیاندا خۆیان و قزلّباشەکان بە تفەنگ و تیر و شیرەوە شیشانە گیانی بۆتانی. میرئیبراهیم لەو پشێوی بگرە و بەردەی خافلگیریەدا، تیرێکی پێمیردی خودای لە نەکاوێکا بەرکەوت و ڕوو بە نەمان وەڕێ کەوت. دیسان برازایەکیشی برینی حەستەمی لێ بوون، دەگەلّ پەنجا شێست کەسێکتر لە بۆتانیەکاندا گرا و برانە پێش شاتۆماسب. شافەرمانی داهەموویان بە زیندوویی کەولّ کردن و بەو ئێش و دەرد و ژانەوە تلانەوە؛ بەلاّم هێندەنەمانەوە و مردن دەفریایان کەوت.

## میرئەحمەد کوڕی میرئیبراهیم

لە پاش کوژرانی بابەکەی لە سەر فەرمانی سولّتان سولەیمانخان، گۆڕکێلی بە مەزنایەتی درایە و سێ سالاّنی پێ ڕاگەیشت. کوڕێکی گەلێک بێفەر و جووتمۆر و ناجۆری هەبوو؛ ناویشی میرمحەمەد بوو. لەو ڕۆژ و ڕۆژگارەدا کە میرعەزیز گەڕی دەکوڕانی خان ئەبدالّ هالاّندبوو، میرئەحمەد یاریدەی بەرەی خان ئەبدالّی دەکرد. کوڕەکەشی لە ئینکەبەری بابی خۆی، خۆی دابووە لای میرعەزیز و هەر بە فیتی میرعەزیزیش باوکی خۆی لە سەر کار لاگرت و بۆ خۆی جێگەکەی گرتەوە.

میرئەحمەدی وەدەرنراو، لە دەست کوڕی ناڕسەنی، ڕووی کردەبارەگای سولّتان مرادخان کە دادی خۆی لە لا بکا؛ لە ڕێگەدا پەیکی مردن تووشی هات و لە دنیای ڕوونی بردەدەر.

## میرمحەمەد کوڕی میرئەحمەد

لە پاش باوی لادراوی، ماوەیەك خۆی بە مەزنایەتی دیتەوە؛ بەڵام زەلامێکی کەللەکلۆری گێژ و گەلۆر و بێهۆش و گۆش بوو. ئەگەر لە ڕیزی پیاواندا بەرەو پاشت وەخوێندایە، هەمیشە یەکەم دەردەچوو. بە شەش تەقەڵ و مانگەشەو بەری لە دنیا گرتبوو نەشیدەزانی چ باسە چەند ڕۆژێك لە سۆنگەی یاری و هاریکاری میرعەزیزەوە خۆی ڕانا؛ بەڵام دوایی سەری دۆڕاند.

پسمامانی (میرعومەر و میرمحەمەد و میرمەحموود)، ڕۆژێك سواری سەری بوون و میرمحەمەد توون بە توون چوو.

## میرئەحمەد کوڕی میرمحەمەد

ئەو کاتەی بابەکەیان کوشت گچکۆکە و منداڵۆکە بوو. ئێستاکێ کە مێژووی کۆچی سێهەم ڕۆژی ڕەمەزانی ساڵی ١٠٠٥.ك (١٥٩٧.ز)یە لە ژێر سایەی چاوەدێری و یاریکاری میرشەرەف کوڕی خان ئەبداڵ بە سەر گوڕکێلی ڕادەگا.

## لكی سێهەم

# فەرمانڕەوایانی فنیك

دانیشتووانی ناوچەی فنیكێ چوار هۆزن: بەجنویی، شوقاقی، میـران، كۆینە. فـەرمانڕەواكانی فنیـك دەچنەوە سەر میرئەبدالێ كوڕی سولەیـمان كوڕی خالید.

وەك باسـمان كرد سولەیـمانی كوڕی خالید لە جزیرێ كۆچی دوایـی كـرد و كوڕەكـانی وڵاتەكـەی بابی خۆیان لە ناو خۆیاندا دابـەش كـرد. ناوچـەی فنیـك وەبـەر میرئەبـدالێ كـەوت. ماویـەكی زۆر میرئەبدالێ بە سەر ئەوێ ڕاگەیشتووە و كە مردووە نەوە و نەتەوە و وەچی ئەو، مەزنایەتی ناوچـەكەیان بە دەست بووە. لە دواییدا توركمانی ئاققۆینلوو لـە بـەر دەسـتیان دەرێنـاون و دەسـتیان بـە سـەردا گرتووە. لەو ڕۆژەوە نالەباری و تێكەڵ پێكەڵی و ئاڵۆزی و بێسەرە و بەرەبی بێداد، هەموو ناوچـەكەی داگرت و مەودای نزیكەی سەدساڵێك لە ژێر چەكمەی توركمانی ئاققۆینلوودا ناڵاندی.

لە پاش ئەوەی كە دەوڵەتی ئاققۆینلوو گلۆڵـەی لـێ كەوتـە لێـژی، دووبـارە وڵاتـی خۆیـان دەس كەوتەوە و ئیتـر لەوساوە كەسیتر بە نیازی دەست درێژكردن، پەلی بۆ درێژ نەكردوون. تەنیا جارێك لە سەردەمی مەزنایەتی شاعەلی بەگ -كە فەرمانڕەوای جزیر بوو- دەستی بە سەر فنیك داگـرت و دای بە میرمـحەمەدی برای؛ بەڵام دیسان هەر بە یارمەتی خودی فەرمانڕەوایانی جزیر، ناوچەكە دراوەتەوە دەست خاوەنانی پێشووی و هەتا ئەمڕۆ كە مێژوو ١٠٠٥.ك (١٥٩٦و٩٧.ز)یە، دەبەر دەستی خۆیـان دایە.

# بەندی پێنجەم

# فەرمانڕەوایانی حەسەنکێف

## کە بە ملکان[1] بەناوبانگن

جیـــهان بی‌بی‌جـان خانـمی جـــادووە　　یەکێ سەر دەخا و دەستەیەك ون بووە

لە یـەك باز دەدات و یەکێ ساز دەدا　　لە هــــەر کـاتە سازێـکی ئـاواز دەدا

وتاردابێژی دانستەپێژی خۆشوێژی گەوهەرڕێژ و هەقایەتخوانی بەسەروزوانی دەمڕاست و بەڕاوێـژ، وایان لە گێژەو داوە و دانبژێریان کردووە و پوختەکەیان ڕاناوە کە لە دوای ئەوەی گەردوونی چـەپگەرد و ڕۆژگـاری دڵبـەرد، ڕووی لـە بنەماڵـەی پادشـایانی ئـەییوبی وەرگێـڕا و ڕووپـەڕی کامـەرانی لـێ هەڵگێڕانەوە وساڵی ٦٢٢.ك (١٢٦٣و٦٤.ز) بۆ خەڵکی کوردەواری بوو بە قەڵەمنداری خاکەسـاری و لەو ساڵە تووش و شوومەدا ئەو خانەدانە ئاوەدان و بەبەروبوومە بوو بە هێلانەی کوندەبوومـە و ڕۆژی سەروەختی تەخت و بەختەوەرییان مژوتەمی ماتەمیـن دایگرت و لە پـشت کـەژی دژدامانـدا پـەنای گرت و شێرایەوە و ئەستوندەکی کۆن و تاولی خونکاران و سەردارانی میسر و شامێ، لە بەر تـەوژمی ڕەشەبای چارەڕەشی چەمایەوە و کەچایەوە و چی لە جێگە نەمایەوە و بنـەوباریان بـە یـەکجاری لـەو ناوەدا پێچرایەوە، یەك لە پاشماوەی خانەدان، تا ماوەیەك بە نهێنی لە شاری حەمادا ژیـاوە و لـەوە پێوە ڕووی کردۆتە قەڵای مـاردین و بۆتـە میـوانی دژدرا و گـەلێکی ڕێـز لێگیــراوە و بـە ئـاوات و ئارەزووی دڵ لە لای خاوەن قەڵای مەرد و ڕەند و ئاکارپەسند دامەزراوە و بە پیاوەتی باربووی میوانی کردووە و قەڵا و مەڵبەندی ساوەری پێ بەخشیوە. تا ماوەیەك لە ساوەرێ ڕایبواردووە و لـەوێش دڵـی

---

١- ئەمیــنزەکی دەڵێ: مەلیکانن واتا پادشایان. بەڵام من لام وایە لە مەلکاتیەوە هاتووە کە یەکێکە لە سێ مەزهەبی فەلەکان؛ مەلکاتی، یاقووبی و نەستۆری؛ کە سەر بە قددیس ئەنتۆنیۆسن. هێندێك لـە کوردەمەسـیحیەکان بـە نـاوی مەزەبەکانیانەوە ناو براون. کۆمەڵێك لە مێژوونووسان لایان وایە نەستۆریەکانی لای مووسـڵ -کـە ئێـستا بـە خۆیـان دەڵێن ئاشۆری- و فەلە یاقووبییەکان -کە سەردەمێك جوزقانیان پێ دەگوتن- بە ڕەسەن کوردن. جەمیل

هەڵقەندراوە و بەجێی هێشتووە و ڕووی کردۆتە ڕأس‌الغول (سەردێوەزمە) کە ئێستا بە حەسەنکێف دەناسرێ.

ئاووهەوای سازگاری حەسەنکێفی پێ کەوتووە و زۆری وەبەر دڵ کەوتووە و لەوێ پاڵی داوەتەوە و یەکجاری حەساوەتەوە و بۆ خۆی ژنی لێ هێناوە و خێزانی پێکەوە ناوە. سەرەڕای خزمایەتیشی، بناغەی دۆستایەتیشی دەگەڵ خەڵکا داڕژتووە و ڕۆژبەڕۆژ لای خۆجێییەکان خۆشەویستی پەرەی گرتووە تا سەرئەنجام وای بە سەر هاتووە پیر و لاو و ژن و پیاو و دارا و نەداری ئەو ناوە بە دڵ و داو ڕێزیان لێناوە و تەواو دڵیان کەوتۆتە سەری و چی گوتووە لێیان بیستووە و بۆ مەزنی خۆیان ویستووە. بە دەستی گەل کردوویانە بە مشوورخۆری خۆیان و بۆیان پەنجە مۆر کردووە. قەڵا و سەنگەر و چەپەریان هەڵناونەوە و داداونەوە و تازەمیریان لێ داناوە.

دژدار و سەرداری ماردین دابوویە کزی و کەنەفتی و دژ و شوورەقەڵاکانی ڕوویان کردبووە وێرانی و زگیان دابوو و هەرەسیان هێنابوو؛ لە دەسکاری و هەڵنانەوەی قەڵای حەسەنکێف زۆر ترسا. پیاوێکی ناردەلای میری حەسەنکێفێ کە بێ و چاوی پێ بکەوێ. میرئامادەنەبوو بچێ و ئیتر ئەو خۆ بواردنە بوو بە ئامیانی دڕدۆنگی و سەری کێشایە هەرا و جەنگ.

لەشکری ماردین دەنگ دراو بۆ گرتنی قەڵای حەستەمی حەسەنکێف، ڕووی کردەناوچەی ڕاس‌الغول. دژداری قەڵای بەربەڵا، وەك شێر لە مەیداندا چەقی و وەك پڵنگی چنگ خوێناوی بەرەنگاری نەیاری بوو؛ ناچاری کرد بە شکاوی و هێزنەماوی بە پاشدا بگەڕێتەوە و ئیتر تازە جارێکی‌تر ئاسۆ نەپەڕێنێتەوە.

لەو ڕۆژەوە دووبارە هەیڤکی بەختی دەوڵەتی بەرەی ئەییووبی گەشاوە و ئاڵای هات و بەختەوەریان لە سەر ناوچەی حەسەنکێفێ شەکاوە و بە ماوەیەکی فریەکەم، زۆری سنوور و کەوشەنی دەوروبەری خۆی پەڕاند و حوکماتی خۆی لێ دامەزراند.

لە دیوان و فەرمانان و لە دەسنووسی ڕابردوواندا، حەسەنکێف بە سینیش نووسراوە و سەبارەت بەو مەبەستەوە لە باوەڕ پێکراوانەوە شتێکمان بە دەستەوەیە؛ گوایە: جارێك عارەبە سوارێك حەسەن ناو لە شەڕێکدا فەرمانداری ئەو قەڵایە گرتوویەسی و خراوەتە زیندانەوە و ماوەیەکی تێدا ماوە و

هەرچی هەوڵیان دەگەڵ داوە هیچ ڕازی نەدرکاندوون و زمانی خۆی گری داوە و بەهرەی بە دیلگر نەداوە. دژدار هەڕەشەی لێ دەکات ئەگەر هەر قرِوقپ بکا لە سەر دنیایە نامێنی و ئەو لاساری و سەرسەختیەی وای لێ دەکا بیفەوتێنێ.

حەسەن کە زانی دەکوژرێ وڵامی بۆ دژداری نارد: کە بوخچەی مەرگم تێك ناوە و هومێدم لە ژیان براوە. تکام وایە دوا ئاواتم بۆ پێك بێنن؛ لێم گەڕێن تاوێك ماینەکەم دەناو قەڵادا تاو دەم و چاوتان بە سەر و سواریم و جوانی و لەباری ماینەکەم بکەوێ؛ ئیتر ئەوسا لە خوێنی من گەردنتان خۆش و ئازاد بی و خۆشم بە دڵخۆشی دەمرم. خێوی قەڵا ئاواتەکەی بۆ پێك هێنا و ماینەکەی خۆیان بۆ هێنا و گوتیان فەرموو سوار بە! حەسەن کەوتە سەر دەست و پای میر وخۆی هاویشتە سەر خوانی زین و ماینی تاینی سمکۆدکی کللکسەگلاوی حدودی گوێبەلی کەفەڵپانی، دەمەیدانێدا هێنا و برد. بەڵام ماین چ ماین؟

| | |
|---|---|
| بە لەش نەرم و دەم گەرم و ئاودەس بڵاو | ڕەوان و بە لەنجە وەکوو بلقی ئاو |
| لە بەر خۆشبەزی و سووکی وەختی ڕەوی | بە ناڵ و سمان نەیدەرووشاند زەوی |
| وەکوو دەنکە بارانی نەورۆز بە تاو | لە کێو پێوی تیژتر لە تیشکی هەتاو |
| گەڕی زۆر بەگوڕتر لە بیر و خەیاڵ | لە لات وابوو تووکی هەموو بوونە باڵ |
| بە نەرمێکەوە کەوتبا کایەوە | شنەش تۆزی پای پێ نەدەشکایەوە |
| وەکوو بەختی کوردی هەژار مۆن و سڵ | کەسی پێ نەگیبوو، وەك ئاواتی دڵ |

حەسەنی چاپكسوار لە بەردەمی دژداردا جارێك بە ڕەوت و هەڵێك بە نەرمەغار، سوارچاکی خۆی و لە باری ماینە بەکارەکەی ڕانا و لەپڕ ئاوزەنگی لێ تەقاند و هەی لێکرد. ماین لە بانی قەڵاوە پەڕی و لە بەرزایی پتر لە سەدوپەنجا گەزی بەننایی، خۆی هەڵداشتە ناو زێوەکە لەوێوە تێدەپەڕی. سوار هیچ لە سەری نەپەڕی؛ بەڵام ماین بەو تەوژمە، لە نێرینەی چەمدا پسا.

سوار وازی لە ماین هێنا و هەر بە مەلە ملی لێنا و لەو ئاوە خوڕ و بە گوڕ و نەهەنگ فڕێنە، پەڕیەوە و خۆی ڕزگار کرد. کاتێ حەسەن لە بەرچاوی خاوەن قەڵا و خەڵکی ون بوو، هەموو تێکڕا بە سەرسامی لێکیان پرسی: حەسەن کیف؟ واتا حەسەن چۆن؟ جا وەك دەڵێن: هەر لەو ساوە لە سۆنگەی

ئەم عاجباتیەوە ناوی نراوە حەسەن‌کیف. قسەیەکی سەیرە گەر درۆ نەبێ!

هێندێکیش دەڵێن کێفا کوڕی تۆڵۆن ئەو قەڵایەی بنیات ناوە و حصن‌کێفای پێ گوتراوە؛ کە حصن بە عەرەبی قەڵایە. ئەمەش خوا دەیزانێ.[1]

هۆز و تیرە گرینکەکانی ناوچەی حەسەنکێفیێ سێزدەن:

١- ئاشیتی ٢- محەلمی ٣- میهرانی ٤- بەجنەوی ٥- شقاقی ٦- ئەستورکی ٧-کوردلی‌مەزن ٨-کوردلی‌گچکە ٩- ڕەشان ١٠- کیشکی ١١- جلەکی ١٢- خەندەکی ١٣- سوهانی و بیدیان.

ئەو شوێنە گرینگانەی کە بە سەر حەسەنکێفەوەن، شاری ئەسعرد و ناوچەی بشێری و توور و ئەرزەنن؛ کە ئەرزەن بە دەست مەزنی حەزۆوەیە و دوازدەهەزار فەلەی باج و پیتاکدەری لێیە.

لەو ڕۆژەوە کە خاوەنی قەڵا دەگەڵ میری ماردینیێدا کێشە و هەرای لێ پەیدا بوو، هەتا ئەو ڕۆژەی پێسیری ژیانی لە بەرچنگوڕکی مەرگدا بزگوڕ بە بزگوڕ هەڵتلیشا، هەر فەرمانڕەوای سەربەخۆی ناوچە و قەڵا و میری هۆز و تیرەکان بوو. لە دوای ئەویش -وەکوو دەماودەم هاتووە- گوایە:

## مەلیك سولەیمان

کە ناوی یەکێك لە کوڕانی بووە، بۆتە جێنشینی و ماوەیەکی زۆر بە فەرمانڕەوایی ماوەتەوە و تا دواییەکەی دەوڵەتی چەنگیزیەکان، واتا هەتا ساڵی ٧٣٦.ك (١٣٣٥و٣٦.ز) وڵاتی حەسەنکێفی هەر بەدەستەوە بوو. لەدوای ئەوەش کە سولەیمان پەیمانی دەگەڵ ژیان هەڵوەشاند و مەرگ بۆخۆی ڕفاند:

## مەلیك محەمەد

کە ڕۆڵەی مەلیك سولەیمان بوو، کرا بە جێگر. پیاوێکی لێزان و مشوورخۆر و دادگەر بووە. لە سەرداری و دنیاداری و چاوەدێری، دەست و پێوەند و ڕەعیەت و ژێردەستانی خۆیدا، لە ناو فەرمانڕەوا

---

[1] ١- کێف: کێو. هیچ دوور نیە هەسان‌کێو بێ. هەسان بەردێکی سەختە و تیخی پێ تیژ دەکەن. کەهفی عەرەبی -کە بە ئەشکەوت دەڵێن- هەر کێفە کوردیەکەیە. هەژار

پایەبەرزەکانیشدا وێنەی نەبووە. هەرگیز پادشاو خاوەن دەسەڵاتەکانی ئێرانی لە خۆی سڵ نەدەکرد و دڵی گشتانی ڕادەگرت. هەتا دوایی پادشای مەرگ بە سەریا داو بەرەو دنیای نەمانی برد. ئەوسا:

## مەلیك عادل کوڕی مەلیك محەمەد

لە سەر ئەسپاردەی مەلیك محەمەد کرا بە فەرمانڕەوای وڵاتی حەسەنکێف و بەوپەڕی دڵسۆزی و دادگەری دەگەڵ خەلکدا ڕەفتاری دەکرد و وڵاتەکەی لە ئاوەدانیدا کردەوێنەی بەهەشت و لە پایەبەرزی و شان و شکۆدا زۆری لە باب و باپیرانی خۆی تێپەڕاند. تا لە ساڵی ٧٨١.ك (١٣٧٩.ز)دا ڕەشەبای مەرگ پەلکی لکی ژیانی هەڵوەراند و دایوەراندەناو چاڵەوە.

## مەلیك ئەشرەف کوڕی مەلیك عادل

کراوە بە جێنشینی مەلیك عادل و هاوچەرخی ئەمیرتەیمووری کورەکانی بووە. مەولانا شەرەفەدین عەلی‌یەزدی خاوەنی *ظفرنامە* دەڵێ: «ساڵی ٧٩٦.ك (١٣٩٣و٣٩٤.ز) ئەمیرتەیمووری بەدابوەدەستوور لە دوای ئەوە کە بەغدای گرت و قەڵای تکریتی خستە بەر دەست، لەوێڕا ڕووی کردەماردین. کاتێ گەیشتە شاری ڕوحا، سەرداری حەسەنکێف لەوێ بە ڕامووسانی ڕایەخی ژێر ئەمیرسەرفراز کرا و توێڵی بێچارەیی و سەرکزی بە زەمینی بەندەیەتی‌دا ساوی و دڵسۆزی خۆی لە خزمەتکاریدا پێك هێنا و لە ڕووی خۆش و چاکە دەربارە کردنی شاهانەوە بەشی درا و گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی.»

لە پاش ئەوەش ماوەیەکی زۆر ما و ئەوسا تەیموور لەنگی مەرگ بە سەری کردەوە و خوای گەورە بۆ خۆی بردەوە.

## مەلیك خەلیل

کوڕی مەلیك ئەشرەف کە نازناوی مەلیك کامیل بوو، لە دوای کۆچی باوی هەموو هۆز و تیرەکانی حەسەنکێف بە تێکڕایی کردیانە سەرداری خۆیان. ساڵی ٨٢٤.ك (١٤٢١و٢٢.ز) شاڕۆخ میرزا کوڕی ئەمیرتەیمووری کورەکانی -کە بۆ شەڕی کوڕەکانی قەرەیووسفی تورکمانی دەهات- گەیشتە کەوشەنی وان و وستان. مەلیك خەلیل پێشوازی شایانی کرد و بە سەردەرانە ماچ کردنی شاڕۆخی

سەربەرز و بەختەوەر کرا و لەو کاتەشدا کە میرزا شارۆخ لە سنووری ئەلشگردێ مەزنەکانی کوردستانی وەك میرشەمسەدینی بدلیس و مەلیك محەمەدی هەکاری و کوڕی سولتان سولەیمانی خیزانی بەرێ دەکرد، مەلیك خەلیلیش دەگەڵ وان گەڕاوە بۆ وڵاتی خۆی و هەتا ژیا هەر بە ئاسوودەیی و کامەرانی ڕاییوارد و لەشکر و بەردەستانی لە چاکەی زۆر بەهرەدار و دڵخۆش دەکرد. ساڵی ٨٦٢.ك(١٤٥٧.ز) فریشتەی گیانکێشان ناوی لە سیایی خەڵکی دنیا ڕەشکردەوە و بەرەو بەهەشتی بەرینی بەڕێکرد.

## مەلیك خەلەف

کوڕی مەلیك سولەیمان بوو. دەبووە برازای مەلیك خەلیل و بە خەلەف چاوسوور ناسراوە. لە پاش نەمانی مامەکەی کرا بە سەرداری حەسەنکێف و مەزنی هۆز و تیرەکانی ئەو ناوە بوو. لە شەڕ و هەرایەکدا کە لە نێوان وان و بۆتانیاندا قەوما، خەلەف ئازایەتی و نەبەردیەکی وەهای نواند کە ئیتر لە ناو خەڵکدا بە خەڵەف جووت شیر ناوبانگی ڕۆیشت.

لەو سەروبەندانەدا کە حەسەن بەگی بایەندوری ئاققۆینلوو خۆی لە گرتنی کوردستان خۆش کرد، لەشکرێکی تورکمانی ناردەجەستەی حەسەنکێف و گرتنی قەڵای پێ سپاردن. لەشکر دەورەی قەڵاکەی دا؛ بەڵام هەرچی تەقەلای داو کرد و کۆشاچی بۆ دەگەڵ خەلەف نەکرا. کاتێ بە شەڕی ڕووبەڕوو بەهرەیەکیان دەس نەکەوت، کەوتنە باری گەڕوگزی و بە دزیەوە ئامۆزایەکی مەلیك خەلەفیان فریو داکە ئەگەر مەلیك خەلەفمان بۆ بکوژی تۆ دەکەینە میری وڵات.

ئیتر هەتیو گرێی ناموس و پیاوەتی، بۆ بێگانەی نامۆ شل کرد و دوژمن لە خشتەیان برد و بە خەیاڵی پڕ و پووچی شوێن کڵاوی قوچ کەتبوو؛ لێی دەخەفتا هەتا ڕۆژێك لە گەرماودا کێس و دەرفەتی لێ هێنا و کوشتی و کۆلکەی خانەدانی گەورە، بە دەسکەتەوری خۆماڵی برایەوە و کەوتە چنگ تورکمانەوە. ئەو کابرای ناموسفرۆشیش چی پێ نەبڕا و هەر پەشیمانی بۆ ماوە! گوتوویانە «هەر کەس بکا بێگانەپەرستی، ئاخری هەر دێنێ نوشوستی» خاپینۆکان خاپاندیان و بە ئاوەزی پێکەنین و خۆیان بە خۆی ماڵوێران کرد.

| | |
|---|---|
| تۆوی ئەمەگ ئەگەر لەزەویشدا هەبووبێ زوو | باراتی لێ نەباری، نەگوورا، سەوز نەبوو |
| ناوی وەفا لە ناوی جنۆکە و پەری دەچێ | هەر بیستمان دەڵێن هەس و کەس نەیدی ڕووبەڕوو |

## مەلیک خەلیل کوڕی مەلیک سولەیمان

لە ڕۆژگاری تورکماناندا بە نهێنی لە شاری حەما دەژیا. کاتێك کە دەرهەم بەرهەمی کەوتە بەرەی تورکمانی ئاققۆینلوو، مەلیك خەلیل بە یارمەتی میرشامحەمەدی شێرۆیی لە شاری حەما دەرکەوت. مەلیکیانی حەسەنکێفی، هەمیشە وەزیری خۆیان لەو شێرۆییانە هەڵدەبژارد. هۆزەکانی لای حەسەنکێف لە مەلیکیان کۆ بوونەوە و چەکیان هەڵگرت و چوونە سەر شاری ئەسعرد و بە زەبری شیر، ئاققۆینلوویان دەرپەڕاند و لەوێوە هاتنە سەر قەڵای حەسەنکێف و گەلێك پیاوانە ئەویشیان لە دوژمنان پاکردەوە و مەلیك خەلیل بوو بە پادشای سەربەخۆ. لە ڕاستیشدا لەو چاخەدا کەس لە مەزنانی کوردستان بە پلەوپایە و شکۆ و مایەی ئەو سەردارە نەگەیشتووە و زۆریش پادشایانە ژیاوە.

خوشکی گەورەی شائیسماعیلی سەفەوی -کاتێ کە لەبەر دەستدرێژی سوڵتان یەعقووب ڕەوی و زێد و نیشتمانی خوی بەجێهێشت و بە نیازی زیارەتی کابە، هاتە دیاربەکر- کە گەیشتە حەسەنکێف، مەلیك خەلیل لە خۆی مارەی کرد و لە ڕۆژی شیرینی خواردن و زەماوەندا بەزمێکی ئەوتۆ بەرپا بوو، کە وێنەی لە ڕووی دنیادا نەدەبینرێ و نەدیتراوە. کەیخودا و کاربەدەستان و گەورەپیاوانی کوردستان تەنانەت خەڵکی ڕەمەکیش لەو ئاهەنگە شاهانەیە کۆ بوونەوە.

بە هەر لایەکدا لات دەکردەوە دیلان و سەما و گۆوەندی ڕواڵ و کیژ و لاوان بوو. نازداری باوان و بەریەدراوان و بەڵەکچاوان و بەلەکخر و جەرگبڕان، دەست لە دەستی تازەلاوان و شیرینکوڕاندا هەڵیان دەخڕاندەوە و خەمی دڵیان دەپەڕاند.

لە دیوانی میر ومەزنان، مەیگێڕانی لووس و سادەبە قومقومۆکی بادەوە سووڕیان دەدا و بە ڕەوتی بەلەنجەولاریان و بزەی لێوی شەکرباریان پەردەی شەرمیان لە ڕووی شەرمنان دادەدڕاند و تەنانەت دڵی زۆرهانی پەك کەوتەشیان بە ناز دەفڕاند.

چاوئەندازی بەژنوباڵای نۆنەمامان و تاڵی مەی و تاڵی کوڵمی گوڵندامان، پیری لە ژیان زویریشیان تەڕ دەکردەوە و پتر لە لاوی چاردەساڵ، بە تاسەوە دڵ و چاویان دەلەوەڕاند.

گۆرانیبێژانی خۆشدەنگ و لەبەروەگێڕانی خۆشڕەنگ، لەو ناو بەزم و ئاهەنگەدا کەوتبوونە گاڵـە و ئەوی دەیانگوت نەیاندەگوتەوە. چووزەلە و بلوور و ساز و سەمتوور بە سەد ئاواز و هەزار جـۆر لـە کۆڕدا دەنگی دەداوە. خۆشخوانی خۆ وێژ بەو هۆیە ئەم شێعرەیان خوێندەوە:

بەزمیشاهانەیە ئەیدڵ! هەلە خۆت سەرخۆش کە　　چاوی مەست هۆش دەرفێنن وەرە خۆ بێهوش کە

جوانترین گـوڵ لە گوڵستـانی عەجـەم میـوانە　　دیـاری شایـانە لەمـەولا گـوڵـی کوردستـانە

تەختـی بەڵکیسە حەسەنکێف و خەلیـلسێمانە　　پـڕکە پێـوانەکـە مەیگێـڕ! هەڕەتی پەیـمانە

لە دوای ئەوە بە ماوەیەك کە تەخت و بەختی ئاققۆینلووان وەرگەڕا و ڕۆژی هاتی شائیسماعیل لە ژێر هەوری کەساسیەوە هاتە دەرێ، میر ومەزنانی کوردستان بە ئاواتی سەردەرانە ڕاموسانی بارەگاکەی، ڕوویان کردەشاری تەورێز. شاهەر کە چاوی پێ کەوتن بێ چاك و چۆنی و چەند و چوون، مەلیك خەلیلیش و هەموو میرەکوردەکانی گرت و دانیە دەست زینەڵ بەگی شاملوو. ئەویش جێگەی لە لاگۆشەی زیندانانادا بۆ چاك کردن.

مەلیك خەلیلی زاواشی وەکوو جاوی جوو هەڵپێچا کە هەر ئێستاکە خوشکی خـۆم بـە منالـەوە دەوێتەوە. مەلیك خەلیلی زاوای شـا، ژنـی و کوڕێـك و سـێ کـچی بـۆ هێنانـەوە تـەورێزێ، وەسـەر خەزووری کردنەوە. ماوەی سێ ساڵ مەلیك خەلیل لە گرتووخانە خزێنرا و لەو ماوەشدا وڵاتەکـەی بـە دەست قزڵباشەوە بوو. لە شەڕەکەی چاڵدێراندا مەلیك خەلیل دەرفەتێکی لە بۆ ڕەخسا و دەگەڵ باشـی بیوکبایکیدا ڕێك کـەوتن و پاسـدارانی زینـدانی کوشـت و لـە تـەورێزەوە ڕایکـرد و ڕوویکردەئـالی دیاربەکر. کاتێ گەیشتە نزیك وان، چەکداری هۆزی مەحـموودی سەری ڕێگەیان لێ گرت و خۆیان لـێ سازدا بیگرن. مەلیك خەلیل زۆر مەردانە هاتە دەست و خۆی لە دەستیان ڕزگار کرد و لە ڕێـی گـەڵی بدلیسەوە بەرەو حەسەنکێف هاتەوە. بەڵام باشی بیوکی هاوڕێی، لە شـەڕی مەحـموودیەکاندا سـەری تێدا چوو.

وەختێ لە بەندیـخانە بـوو، هـۆزی شێرۆیی و زەرقیـەکان و هـۆز و تیـرەکانی ناوچـەکانی لای حەسەنکێف، مەلیك سولەیـمانی کوڕی مەلیك خەلیلیان کردبووە مەزنی خۆیان؛ بەڵام هۆزی ڕەشـان، کاروباری ناوچەی خۆیان دابووە دەست کوڕەمـامێکی مـەلیك خـەلیل و هـەر لـەو ماوەشـدا بۆتـانی

لەشکریان بردبووە سەر شاری ئەسعرد کە لە چنگی قزلّباشانی ڕزگار کەن. لەپڕ دەنگ و باس داکەوت کە مەلیك خەلیل هاتەوە. کوڕانی مەلیك خەلیلیٚ هاتنەوە خزمەت باوکیان و لەشکری هۆزی بۆتانیش لە دەوری ئەسعرد وەکشیـن.

مەلیك خەلیل پاش چەند ڕۆژێك قەلات و شاری ئەسعردی لـە قزلّباشـان سـاندەوە. قزلّباشـان لـە وەختی خۆی قەلاّ و ناوچەی حەسەنکێفیان بە یارمـەتی هـۆزی بەجنـەوی گرتبـوو. هـەر بەوانیـشیان سپاردبوو کە بۆیانی بپارێزن. ئەو بەجنەویانە زۆر جاران لە لایەن قزلّباشەوە خزمەتیان پـیٚ سپێراوە و بۆ عەجەم فریو دراون. جا کـە هـەوالّی هاتنـەوەی مـەلیك خـەلیلیٚ داکـەوت، بەجنەویـەکان خۆیـان گەیاندەناوچەی توور لە بۆتانیٚ کە بژیو و جبەخانە کۆ بکەنەوە و بـخزێنەوە ناو قەلاّوە و هەروا هاسان دەست مەلیك خەلیل نەکەویٚ.

مەلیك خەلیل بە پلانی ئەو بەجنەویانەی دەزانی و کێس و دەرفەتی لیٚ هانی و لەشکری خۆی کـۆ کردەوە و لە پڕ بە سەری دادان و ئەوانیش -کە خافلّگیـر بوون- بڕیاریانْدا ئەگەر ئەمانیان پیٚ بدری و نەکوژرێن، قەلاّ بە دەستەوە بدەن. مەلیك خەلیل چاوی لە کوشـتنیان پۆشـی و ئـەوانیش بـە خۆشـی خۆیان قەلاّیان دایەوە دەستی. دەگەلّ حوسێن بەگی مەزنی بەجنەویشدا ئاشت بوونـەوە و لـە جیـاتی خوێنی باب و برای -کە لە دوایی باسیان دەکەین- گوندی بالّی بە موڵکایەتی پیٚدرا.

باوەر پێکراوان وادەگێڕنەوە کە بەجن و بەخت هەردووکیان کوڕی حاکمێکی جزیری عومەرییە بوون و لە سەر مەزنایەتی، ئەو دوو برایە هەرایان لیٚ پەیدا بووە و مەزنایەتی جزیر بـەر بـەخت کـەوتووە و بەجنیش هاتۆتە لای حەسەنکێف و بنەماڵەی مەلیکانیش حەسەنکێفیان لەو بەجنانە زەوت کردووە.

ئیواش هەبوون گوتوویانە: هەموو کوردی کوردستانیٚ لە ڕەگەزی بەجن و بەختـن. ئەمـەش هـەر خودا دەیزانیٚ لەو کاتەدا کە میرشەرەف کوڕی میربەدر فەرمانڕەوای جزیر بوو، هـۆزی بەجنـەوی -بـە هۆی دوژمنایەتی کۆنەوە- گەر و گێچەلّیان تیٚ دەهالاّند. میرشەرەف ویـستی تۆلّـەیان لـیٚ بکاتـەوە؛ ناردیە لای مەلیك خەلیلیٚ کە دەبـیٚ تـەنبێیان بکـا. مـەلیك خـەلیل، میرمـــحەمەدی بەجنـەوی و پازدەکەس لە کـور و دەسـت و پێوەنـدانی بـۆ خـاتری میرشـەرەف کوشتـــن. حوسـێن بـەگی کـوڕی میرمـحەمەد بە هەلاّتن ڕزگاری هات و مالّ و دارایی هۆزەکەی هـەمووی وەبـەر تـالاّن کـەوت. جـا ئێستاکانیٚ وەك دەلّێن: لە بەر ئەو خوێنەخۆێیە بووە کە حوسێن بەگ دەگەلّ قزلّباشان ڕێك کـەوتووە و

مەلیك خەلیلیش بۆ کوژانەوەی ئەو خوێنەیە کە گوندی بالّی داوە بە حوسێن بەگ و دەگەڵی ئاشتەوە بووگە.

مەلیك خەلیل لە دوای ئەوە کە هۆزی بەجنەوی قەلاّی حەسەنکێفیان دایەوە، ماوەیەك لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی بە کامەرانی پاڵیدایەوە و ئەوسا پادشای مەرگی لیّ بوو بە میوان و ناردیە دیوانی ڕازپۆشانی شاری خامۆشان و لە گۆشەی گۆڕی تەنگەبەردا جێی بۆ چاکرا. چوارکوڕی بە یادگار بەجیّ هێشتن: مەلیك سولەیمان، مەلیك عەلی، مەلیك محەمەد، مەلیك حوسێن.

## مەلیك حوسێن کوڕی مەلیك خەلیل

مەلیك حوسێن لاوێك بوو سەربەرز و بەدەمار و بەخشندەو خاوەن بەزەیی. دەگەڵ هەموو ئاکاری جوان و لەباریدا جوان چاکێك بوو نەبکەی نەبخۆی تماشای سای گەردنی کەی. هەمووخەڵکی ئەو ناوە شەو و ڕۆژ پەسنی لاوەتی و پیاوەتی ئەو کوڕەیان دەدا. هێشتا بلووغی نەببوو، بە مەزنیان هەڵبژارد و کار و باری وڵاتەکەیان پیّ سپارد.

جوانی کە لە ڕووتە تیشکی دڵتە ڕوناهی خودایە ئاو و گڵتە

بەڵام کە لە جێگەی باوکی جیّگیر بوو، لە براکانی خۆی دڵگیر بوو. مەلیك محەمەد و مەلیك عەلی گرتن و مەلیك سولەیمانی برای‌تری لە ناوچەی ئەرزەن ڕای کرد و خۆی گەیاندەلای خوسرەو پاشای میری میرانی دیاربەکر و داوای جێگەی مەلیك حوسێنی بۆ خۆی کرد.

خوسرەوپاشا بەو ناوەوە کە نایەویّ برا پێکەوە کێشەیان بیّ و ئاشتیان دەکەمەوە، ناردی مەلیك حوسێن و براکانی هێنانە دیوانی دیاربەکر و مەلیك حوسێنی کوشت و مەزنایەتی حەسەنکێفی دا بە مەلیك سولەیمان.

## مەلیك سولەیمان کوڕی مەلیك خەلیل

شارەزایانی دین و ڕێبوارانی شارێی ئایین بە تێکڕایی فەرموویانە کە شایانی گەورەیی ئەو کەسەیە هەمیشە بەو فەرموودەڕەفتار بکا: «چاکە بکە وەك خوا چاکەی دەگەڵ کردی» و گەورە و گچکە لە چاکە و بەزەی بەهرەوەر بن و بەرانبەر بە فەرموودەی «خزم لە خەڵکی‌تر لە پێشترن» ئەوانەی کە

خزمایەتی لە بیر ناکەن و لە چاوەدێریان دریغیان نیە، زۆر زوو خەڵك ئێرەییان پێ دەبا.

دوو یار گەرەکە وەك برینگ وابن  دوژمن ببڕن و بۆ یەك تەبا بن

نیاز لەو پێشەکیە ئەوەیە کە مەلیك سولەیمان بە فەرمانی خواکردی سولتان سولەیمانخانی خەزاکەر و بە یاریدەدانی باشی خوسرەوپاشای میری میران و والی وڵاتی دیاربەکر، کرا بە میری حەسەنکێف و کاتێ هاتەوە پاتەختی خۆی، دەگەڵ مەلیك محەمەد و مەلیك عەلی برای‌دا کێشە و هەرایان لێ پەیدا بوو.

مەلیك عەلی خۆی لەبەر نەگرت و پەنای بە شەرەفخانی فەرمانڕەوای بدلیس برد. هەموو هۆز و تیرەکانی حەسەنکێف بە هۆی بە کوشت دانی مەلیك حوسێنەوە کینەی زۆریان لە مەلیك سولەیمان دەدڵ گرتبوو. کەس خۆشی نەدەویست و ببوونە بەرهەڵستی. مەلیك سولەیمان ژیانی پێ تاڵ ببوو؛ لە ترسان خەو و خۆراکی لێ هەڵگیرا بوو. خۆی گەیاندەدیاربەکر و کلیلی قەڵاکانی لە بەردەم خوسرەو پاشادانا و بە خۆشی خۆی وازی لەو مەزنایەتیە هێنا و داوای لە پاشاکرد کە لە باتی حەسەنکێف جێگایەکی‌تری پێ ببەخشن. خوسرەو پاشائەم هەواڵەی بە پێچکی تەختی هەرەبەرزی سولتان ڕاگەیاند و لە بەزەیی شاهانەوە ڕوحا(ئورفا) و حەوسەدهەزار ئاقچەی بە ناوی والیەتیەوە لە باتی حەسەنکێف درایە. سێسەدهەزار ئاقچەش بە ناوی زەعامەت درا بە مەلیك محەمەدی برای و دووسەدهەزار ئاقچە لە داهاتی ئورفا بە مەلیك عەلی بەخشرا.

ماوەیەك مەلیك سولەیمان بە سەر ئورفە ڕاگەیشت و لە دواییدا گیانی دەبەر چەنگی مەرگدا لە فڕە کەوت و لە ژێر توێی ئاخدا لێی خەوت.

## مەلیك محەمەد کوڕی مەلیك خەلیل

لە پاش مردنی براکەی سنجەقی ڕەهایان لێ ساندەوە و لە دیوانی سولتانەوە، عەربگیری بە ناوی میرنشین پێ سپێرا و لە پاشان بدلیسیان بە سنجەق دایە و لەوێش نەوەندەی هەڵنەکرد؛ بۆ خۆی وازوازی و هێندەیشیان گۆڕ بەگۆڕ پێکردبوو، تەواو لە گیان و ژیان بێزار ببوو. سەریشی لە گزیرایەتی و باجگیری دیوان دەر نەدەچوو. جا دەڵێن «پیاوکە ناچار بوو خزمی دوور و وامی کۆن ڕەچاو دەکا!»



ئەویش لە زوویکەوە دۆستایەتی دەگەڵ بەدر بەگی فەرمانڕەوای جزیردا هەبوون، کچی خۆشی دابوو بە میرمحەمەد بەگی کوڕی و لە مێژیشەوە هەر هاوسای یەکتری بوون. چووە جزیر و بوو بە گۆشەگیر و هەتا ڕۆژی لە سەر زەوی مابوو، لەوێ نەبزووت و دوایی ڕۆژێک دەپێمیردی خودا هەڵەنگووت و دنیای پڕئاژاوە و هەرای، بە یازدەکوڕەوە بەجێ هێشت:

مەلیک خەڵەف، مەلیک سوڵتانحوسێن، مەلیک ئەشرەف، مەلیک عەلی،مەلیک سولەیمان، مەلیک خەلیل، مەلیک زاهێر، مەلیک عادڵ،مەلیک مەحموود، مەلیک حەسەن، مەلیک ئەحمەد.

مەلیک خەڵەف لە هەرەتی لاوەتی و جەنگەی بەهاری ژیانیدا جوانەمەرگ بوو؛ کوڕێکی هەیە ناوی مەلیک هەمزەیە. مەلیک سولەیمان و مەلیک زاهیر و مەلیک حەسەن هەر سێکیان بە گەنجی مردن. مەلیک سوڵتان حوسێن داوای سنجەقی بابی کرد و لە دیوانی سوڵتان سەلیمخانەوە دایانێ. براکانیتریش بوونە پیاوی میرەکانی کوردستان و لەو ناوەدا دێن و دەچن.

## مەلیک سوڵتان حوسێن کوڕی مەلیک محەمەد

سنجەقی باوکی پێ درا و ئەویش چەند جارێك ئاڵوگۆڕی پێ کرا و بە دەردی بابی، وەڕەز بوو؛ دەستی لەو ئەرکە گرانە هەڵگرت و ئێستا کە ساڵی ١٠٠٥.ك (١٥٩٦.ز)یە لە کوردستان ڕایدەبوێری و کەم تا کورتێك بەهرەی مەوقووفەجاتی باب و باپیرانی پێدەگا. چونکە نەجیبزادیە، هومێد دەکەم خودای گەورە و گران ئاوڕی وە سەر بداتەوە و بە پلە و پایەی باب و باپیرە گەورەکانی شاد کاتەوە.

# ڕووپەڕی سێهەم

# فەرمانڕەواکانی دیکەی کوردستان

ئەویش سێ بەشن

## بەشی یەکەم

بە نۆ بەند باس دەکرێن

### بەندی یەکەم

### فەرمانڕەوایانی چەمشکەزەك

ئەویش سێ دەستەن

زیت و وریاکانی سەرگوروشتەزانی کارامە و ئاگاداری ڕووداوانی دیوانی مێژوو، بە گفت و نامە پێیان ڕاگەیاندووین کە فەرمانڕەوایانی چەمشکەزەك خۆیان لایان وایە بە بنەچەکە دەچنەوە سەر خەلیفەکانی عەبباسی و باپیریان ناوی مەلکیش بووە؛ بەڵام هێندێك لە گەورەپیاوان وای دەبناوان دەکەنەوە کە ئەمیرسلیق کوڕی عەلی کوڕی قاسم لە وەچی پادشایانی سەلجووقیە و لە ڕۆژگاری ئەلپ ئەرسەلان[1]ی سەلجووقیدا خاوەنی ئەرزەڕۆم و دەوروبەری بووە و لە ساڵی ٥٦٦.ك (١١٦١.ز)دا دەگەڵ فەرمانڕەوایانی گورجستاندا شەڕێکی زۆر بە سامیان کردووە و دەگەڵ زۆر لە سەرناسانی

---

١- زێرنۆف پرسەکی لە سەر داناوە. چونکە ئەلپ ئەرسەلان ساڵی ٤٥٣ حوکمی خوراسانی کردووە. وادیارە قلیچئەرسەلان بێ کە ساڵی ٥٥٥ بۆتە پادشای وڵاتی ڕۆم و لە ٥٧٠ مردووە. جەمیل

لەشکرەکەی بە دەست گورجیان بە دیل چوون؛ بەڵام خوشکەکەی -کە ژنی پادشای ئەرمەن بوو- دیاری و پیشکێشی زۆری بۆ گورجستان نارد و برای لە زیندان دەرێنا.

لە پاش مەرگی سلیق، مەلیك محەمەدی کوڕی بۆتە جێنشینی و کاتێ ئەویش چاوی لە دنیا پۆشیوە، میرنشینەکە دراوەتە دەست نەوەی ئەو[1] و کە ئەوەش مردووە مەلیکشاکوڕی محەمەد لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی جێگیر بووە و هەوای سەربەخۆیی و پادشایەتی لە کەللەی داوە و بەو نیازەوە ڕاپەڕیوە و لە ئەنجامدا ساڵی ٥٩٨.ك (١٢٠١.ز) سولەیمانی کوڕی قلیچئەرسەلان برستی بڕیوە و گرتوویە و کوشتوویە و لەو ساوە ئەرزەڕۆم کەوتۆتە بەردەستی سەلجۆقیەکانی ڕۆمەوە.

وێدەچێ کە فەرمانڕەوایانی چەمشکەزەك وەچەی ئەو مەلیکشایە بن و ناوی مەلیکشالە دەمی کورداندا سوابێ و کرابێ بە مەلکیش. ناوی فەرمانڕەواکانیشیان هەروا دەگەیەنێ کە بنیچە تورك بن؛ چونکە هیچ وەك ناوی عەرەب و کوردان ناچن.[2]

هەروەها دەڵێن مەلکیش ناوێك لە نەوەکانی مەلکیشی پێشوو، حەشاماتێکی زۆری ڕەگەڵ خۆی خستووە و هێرشی بردووە و سیودوو قەڵا و شازدەناوچەی داگیر کردووە؛ کە ئێستا بە دەست هۆزەکانی چەمشکەزەکە و ناوی مەلکیشیان بە سەردا سەپاوە.

مەلکیشیەکان سێ تیرەن و بە زۆری قەوغایی و حەشامات و دارایی، سەرتۆپی هۆزەکانی کوردستانن. نزیکەی هەزار ماڵێکیان خزمەتی پادشای ئێران و هێندێکیشیان لە ڕیزی پیاوماقووڵانی لای پادشابوون. چەمشکەزەك هەمیشە فەرمانڕەوای سەربەخۆ و خۆماڵیان بە سەرەوە بووە. بەرفرەوانی وڵاتەکەیان و زۆری حەشامەتەکەیان لە ڕادەیەك دایە کە هەموو کەسێك و تەنانەت پادشایانی زەمان، لە دەفتەر و پسوولەکانی دیواندا بە وڵاتەکەیان دەڵێن «کوردستان».

لەو ساوە کە مەلکیش سیودوو دژ و شازدەناوچەی خستە دەستەوە -وەك باسکرا- کوڕ و نەوەکانی مەزنایەتی ئەو ناوەیان بە باڵا بڕاوە. تەنانەت پادشایانی خاوەن شکۆی وەك چەنگیزخان و

---

١- جاقدش نووسراوە. محەممەدعەلی عەونی دەڵێ لە دوو نوسخە حەفیدش نەوەی نووسراوە. بەڵام ڕەنگە حافدش نووسرابێ حافدش و جاقدش لێك دەگۆڕێن. هەژار

٢- ئەمینزەکی بە مەلیکشایی نووسیوە و ئێستاش لە ناو کوردا هۆزی مەلیکشایی هەن. جەمیل

ئەمیرتەیمووری کورەکان و شاهرۆخ میرزا و قەرایووسفی تورکمانیش دەستیان بۆ نەبردوون و لێیان زەوت نەکردوون و هەروا ماونەتەوە؛ هەتا ئەو ڕۆژگارەی کە شێخ ئەمیرکوڕی یەلمان فەرمانڕەوایی چەمشکەزەکی کەوتە دەست.

کاتێ پادشایەتی ئێران کەوتە بەر چەنگی حەسەن بەگی بایەندوری و ئەویش بە دڵ لێی بڕا کە هەموو خانەدانەکانی کوردستان لە ناو بەرێ و بە تایبەتی ئاسەواری ئەوانە ببڕێتەوە کە دەگەڵ بەرەی پادشایانی قەرەقۆینلوودا دۆستایەتی و هاوکاریان کردووە و بەر لە هەمووان چاوی بڕیە چەمشکەزەك. هۆزی خەربەندەلوو -کە لە هۆزە هەرە بە هێزەکانی سەر بە ئاقۆینلوو بوو- پێی سپێرا کە ولاتی چەمشکەزەك بگرێ و خاکی بە توورەکان بکێشێ. ئەو هۆزە هاتن ولاتی چەمشکەزەکیان بە ملهوڕی لە دەست میرشێخ حەسەن دەرێنا.

لەو دەمەدا شێخ حەسەن منداڵێك بوو؛ بەڵام کاتێ پێ گەیشت و زۆر ئازا و دلاواش بار هاتبوو، شەو و ڕۆژ هەر دەبیری ئەوەدا بوو کە نیشتمانەکەی لە چنگ داگیرکەران ڕزگار بکا و لە سەر ئەو نیازە بە خۆدا هات و کۆمەڵێکی لە پاڵەوانانی دەسکەرەوە و ناوبەدەرەوە لە دەوری خۆی کۆ کردەوە و دەست لە دەست و قەوەت لە خوا، بە سەر هۆزی خەربەندەلووی دادا و زێدی خۆشەویستی لە دوژمنان پاکردەوە و کاری تورکمانی یەكلا کردەوە. کاتێ ئەویش گیانی بەر تالانی مەرگ کەوت، کوڕەکەی:

## زۆراب بەگ

کرا بە جێنشینی و ئەویش زۆری بە مردن نەشکا و لەشکری ژیانی شکا و لە بەین چوو. کوڕە گەورەکەی:

## حاجی ڕوستەم بەگ

جێگەی گرتەوە. هەر لەو سەروبەندەشدا شائیسماعیلی سەفەوی هاتە سەر تەختی ئێران و لەشکرێکی قزڵباشی بە سەرکردایەتی نوورعەلی خەلیفە ناو، ناردەسەر ولاتی چەمشکەزەك. حاجیڕوستەم بەگ هیچ دەستەوەکەری نەکرد و بە بێشەڕوشوڕ ولاتەکەی دایە دەست نوورعەلی خەلیفە و ڕووی کردەبارەگای شائیسماعیل. وەختێ پیتی لاشیپانە ڕاموسانی پێ گەیشت و بە خەلاتی شاهانە سەرفراز

کرا، پارچە زەمینێکیان لە عیراق -لەبری چەمشکەزەك- پێ بەخشی.

نوورعەلی خەلیفە ملی لە نامەردی و دڵبەردی و خوێنڕێژی نا و قەڵت وبڕی خستە ناو چەمشکەزەکەوە و گەلێك لە میرزادەو گەورەپیاوانی هۆزەکەی کوشتن. ئیتر کارێکی وای کرد کە پیر و هەرزەکار و گەورە و بچووکی وڵات لە دەستی وەزاڵە هاتن و کێردیان بە ئێسقان گەیشت. هەر کەس لە بەر خۆیەوە دەستی بۆ چەك برد و بەرەنگاری زۆردار وێستان و بە هەڵەداوان بە شوێن حاجی ڕوستەمیاندا، ناردەلای عیراق و ئیسفەهان کە بێتەوە. لەو دەمەشدا شائیسماعیل بە لەشکری عیراق و فارس و ئازربایجانەوە بۆ شەڕی سوڵتان سەلیم بەرەو چاڵدیران دەچوو؛ حاجی ڕوستەم دەگەڵ لەشکرەکەدا بوو.

دوای ئەوە کە شاشکا و سوڵتان سەلیمخان بە نیازی گرتنی تەورێز هەوساری بڕیاری وەرگێڕا، حاجی ڕوستەم لە شوێنێك بە ناوی یام -کە سەر بە مەرەندە- بە ڕکێف ماچ کردنی سوڵتان، خۆی بەختەوەر کرد و هەر ئەو ڕۆژە بە فەرمانی خواکردی سوڵتانی، حاجی ڕوستەم و نەوەی و چلکەس لە ئاغایان و سەرناسانی مەلکیشی لەو جێیە لە سەریان درا.

بە قسەی خەڵك گوایە کوشتنەکەی بۆیە بووە چونکە ساڵی ٨٧٨.ك (١٤٧٣.ز) کە سوڵتان محەمەدخان والی ڕۆم چووبوو قەڵای کەماخ بگرێ، حەسەن بەگی بایەندوری بە گژیدا هاتووە و محەمەد خان شکاندوویە و دژداری کەماخ ویستوویە قەڵاکە بدا بە پیاوەکانی سوڵتان محەمەد؛ حاجیڕوستەم بەگ نەیهێشتووە. لە پاشان بە ماوەیەك قەڵاکەی داوەتە دەست پیاوی شائیسماعیل سەفەوی. فەرخشاد بەگی بایەندوری ئەو کەین و بەینەی بە پێچکی تەختی خەلافەتی سوڵتان گەیاند و گوتی حاجیڕوستەم بەگ خاوەخاوی کرد و نەیهێشت قەڵای کەماخ وەگیر باپیری پایەبەرزتان بکەوێ؛ کەچی زۆر بە سووك و هاسانی دایە دەست پیاوەکانی شائیسماعیل. لەو ڕۆژەوە ئەوە ببووە گرێ لە دڵی سوڵتاندا و بە خوێنی حاجیڕوستەم بەگ و ئەو چلویەك کوردە، خەشی خۆی ڕشت. بەڵێ:

کێ لە ڕووی شاهان وەرگەڕێتەوە     تۆڵەی زۆر سەختی لێ دەکرێتەوە

پیرحوسێن بەگ کوڕی حاجیڕوستەم بەگ لە عیراق بیستیەوە کە بابی کوژراوە، سەری خۆی هەڵگرت و بە نیازی ئەوە کە بچێتە میسر و پەنا بە پادشایانی چەرکەس بەرێ، ملی ڕێی گرت.



لە ڕێدا لای داشاری مەلاتیە و بوو بە میوانی مەمای بەگ؛ کە لە لایەن چەرکەسەکانەوە بەو شارە ڕادەگەیشت. بەسەرهاتی خۆی و خانەدانەکەی بۆ مەمای بەگ گێڕاوە و دەربارەی چوونە میسریش پرسی پێکرد و وەك خوا فەرموویە: «لە کاردا پرسیان پێ بکە» لێی داوا کرد کە ئامۆژگاری بکا و چی بە باش دەزانێ وەپێشی کەوێ. مەمای بەگ پیرەپیاوێکی ساردوگەرم چێشتووی لە دنیا گەیشتووی لە کڵ دەرهاتوو بوو. زمانی زەمانە لە پەسنی ئەودا دەیگوت:

هەموو گەنجی زانستی کۆکردەوە لە مەیدانی ئەزموون گرۆی بردەوە

مامە پیرە سەرێکی باش بۆی ڕاما و لە وەراما پێی گوت: کوڕی من! ئەمڕۆ پایە و مایەی شکۆ و سەروەری پادشایانی بەرەی عوسمانی لە سەرووی هەموو بەرزانەوەیە. ئاوازەی زەنگی دنیاداری و سەرداری ئەوان لە دنیادا دەنگی داوەتەوە. لەو لاشەوە چەرکەسەکان بوونە هەرکەس- هەرکەس و لەبەر بێدادی، تووشی نامرادی بوون و گلۆڵەیان کەوتۆتە لێژی و کەس چاکەیان نابێژێ. بەو زووانە سلار دەبنەوە و گلار دەبنەوە و لە بیر دەچنەوە و وڵاتیان بە خەڵات بۆ خەڵکیتر دەچێ. وا بە باش دەزانم هەر خۆت باوێژیە بەر سایەی سوڵتان سەلیم خانەوە و جڵەوت بەرەو ڕۆم بادەیەوە.

## پیرحوسێن بەگ کوڕی حاجیڕوستەم بەگ

پیرحوسێن پەندی مامی پیری بە دڵەوە نووسا. دەیزانی بە دڵسۆزی ئامۆژگاری کردووە و لە نیازی چاکە بەدەر مەبەستێکی نەبووە.

پەندێك لە کەسێ کە دوورەگەردە دەرمانی دڵانە، چاری دەردە

پای لێبڕانی خستە ناو ئاوزەنگی گوێ نەدانەوە و بەرانبەر بەو فەرموودەی «ئەگەر بڕیارت داپشت بە خوا بەستە»، پشت بە خوا ڕووی کردەلای دوژمنی بابەکوشتەی و زۆر بێباکانە خۆی هاویشتە ئاستانەی عەرشاسایی سوڵتان سەلیمخانەوە و لە ئاماسیە بە ودمی ڕایەخ ڕامووسی گەیشت.

سوڵتانی عوسمانی لە ئازایەتی و بەجەرگی ئەو خۆرتە سەری سووڕ ما؛ هەیاران! من باوك و کوڕ و چل کەسم لە ناودارانی مەلکیش سەر بڕیوە؛ ئەم کوڕە چۆنی دەخۆ ڕادیوە، بێت و ڕووبەڕووم

بوەستێت و وەك نە بای دیبی و نە بۆران، بە بێ ڕەنگ گۆڕان و دڵەتەپێ هاتووە و دەڵێ پەنام هێناوە.

ئیتر سوڵتان سەلیم ئەو شێعرەی هاتەوە بیر کە دەڵێ:

بە ئازایەتی هەر کوڕێك هەڵکەوێ     ئەگەر دوژمنیشت بێ خۆشت دەوێ

پیرحوسێنی لاوی لاواندەوە و چلورە و بەستەڵەکی ناهومێدی تاواندەوە و لە ناو هاوساڵان و هاومالانی خۆیدا ڕاینا و لە لای سەرووی ئەوانەوە داینا و فەرمانیشی بۆ محەمەدپاشابیغلووی میری میرانی مەرعیش دەرکرد کە ڕەگەڵ پیرحوسێنێ کەوێ و وڵاتی چەمشکەزەکی بۆ لە قزڵباشان بسێننەوە و بە میرایەتی میراتی باب و باپیرانی دایمەزرێننەوە. بەڵام پیرحوسێن لە سەر ئەوەیش ڕانەوەستا کە لەشکری محەمەد پاشای بگاتێ هەر قەوم و قیلەی خۆی کۆ کردەوە و هێرشی بردەسەر نوورعەلی خەلیفە. نوورعەلیش بە لەشکرەوە هاتە پێشی و لە تاکرییلاغیدا تووشی یەك هاتن و پێکداهاتن. کوڕە کوردی بە گوڕی دڵپڕی تینوو بە خوێنی داگیرکەران، وەك بەرانی شەڕانی هەڵیان کردەعەجەمە سەرسووری ئێرانی و کۆڕی شەڕیان لێ گەرم کردن و سەری ڕەقیان نەرم کردن و شەرگەیان لێ پڕ تەرم کردن و ئەو باز و سەقرانە هەر قزڵباشێکیان وە بەر دەهات لووری دەبوونێ و تێی ڕۆ دەهاتن و چەرمیان بە بەرەوە نەدەهێشت و زۆری نەخایاند سەری نوورعەلی خەلیفەی بێ شەرمەشوورە- بە کلاوی سوورەوە- بە سەرنێزەی کوردێکەوە قیت هەڵتروشکا و چاوی پیس و سیسی بڕیبووە جوری سەربڕان و زگدڕانی هاودەمە عەجەمەکانی خزمی و لە لاك و لاشی قزڵباشی نزمی هەڵدەڕوانی.

پیرحوسێن بەگ گوڵزاری کوردەواری لە بەشەکەی خۆیدا بژارکرد و دوژمنی هەڵوەژارد و تاوانی ڕۆژانی داگیرکرانی دەقات پێ بژاردەوە و کلاوی فەرمانڕەوایی بە لاتیلاگی سەریەوە ناو سی ساڵی تەواو بە کامەرانی ڕاببوارد و ئەوسا گیانی بە بینایی چاوان سپارد.

شازدەکوڕی هەبوون: خالید بەگ، محەمەدی بەگ، ڕوستەم بەگ، یوسف بەگ، پیلەتەن بەگ، کەیقوباد بەگ، بەهلول بەگ، موحسین بەگ، یاقووب بەگ، فەڕۆخشاد بەگ، عەلی بەگ، گوڵاوی بەگ، کەیخوسرەو بەگ، کەیکاوس بەگ، پەرویز بەگ، یەلمان بەگ.

لە پاش مردنی باو، برایان تەباییان لە بیر برد و بەو ئامۆژگاریەیان نەکرد کە گوتوویانە:

یەك موو دەپسێ، بەڵام بە دەستە　　بیهۆنەوە فیـــلی پێوە بەستـــە

تەنیا لە سەر ئەوە پێك هاتبوون کە هەرگیز پێك نەیەن و لە بەر یەك بڵاو بوون و هـەر کەسـە لـە بەر خۆیەوە ڕووی کردەئاستانەی سوڵتان سولەیـمان و پێشنیاریان کرد کـە لـە وڵاتـی چەمـشکەزەکدا هەرچی تۆزێك بە کار دێ، وەك سەرانە و باجی فەلەکان و پووشانەی ئاژەڵ و چەند گوند و ناوچـەیەکی وا کە دەشێن بکەونە سەر بەشەمولکی پادشایی، ئەوە هەمووی بۆ سوڵتان بێ و ئـەوی بـە ئـەیاغیش دەمێنێتەوە بکرێتە دوو سنجەق و چاردەزەعامەت و تیمار. لە سەر داخوازی خۆیان فەرمانی پیـرۆزی سوڵتانیش دەرچوو کە ئاواتیان پێـك بێـنن و هەرچـی لـە بەشـی سـوڵتان دەمێنێتـەوە -وەك خۆیـان ویستوویانە- پارچە- پارچە بکرێ و بە ناویاندا بەش بکرێ. مەرجیش ئەوە بێ کەسـیان بەشـی خـۆی نەدا بە بێگانە و هەر لە ناو تۆرەمەی پیـرحوسێندا دەستاودەست بکـا و ناشـبێ تـازە هـەرگیز هـیچ کامێك لەو خانەدانە داوای هیچ شتیتر لە دەوڵەت بکا.

باسی ئەو چواردەبرایە و ناوچەکانی بەردەستیان، بەم جۆرەیە:

## دەستەی یەکەم
## فەرمانڕەوایانی مجەنکورد

ناوچەی مجەنکورد لە سەر فەرمانی سوڵتان سولەیمانخان بە سنجەق درا بە محەمەدی بەگ، کوڕەگەورەی پیرحوسێن بەگ. ساڵێك مەزنایەتی کرد و مرد و چوار نێرینەی هەبوون زۆر منداڵ بوون؛ کاروباریان بۆ هەڵنەدەسووڕا. لە دیوانی پادشاوە، سنجەقەکە درا بە فەڕۆخشاد بەگی برای. لە پاش چەند ساڵێك براکانی -کە ئێرەیان پێ دەبرد- بۆیان تێچاند کە لە داهاتی پادشای دزیوە و ئەمە گەیشتەوە بەر پێچکی تەختی پڕ لە دادی سوڵتانی و بە فەرمانی سوڵتان لە سەریاندا. ئەویش دوو کوڕی لە پاش مان. خەلیل بەگ و حوسێن بەگ.

لە سنجەقی مجەنکورد زەعامەتێك جوێ کرایەوە و درا بەو دوو کوڕانە و سنجەقەکەش درا بە قاسم بەگی برای سەنان پاشای هەرنەهووتی، میری میرانی ئەرزەڕۆم.

چوار کوڕەکانی محەمەد بەگیشیان دامەزراندن و بژیوێکیان بۆ دیاری کردن. لە دواییدا ڕوستەم بەگی پەرتك بە تکاکاری خۆی گەیاندەلای سوڵتان سولەیمانخان و پێی گوت: ئەگەر فەڕۆخشاد بەگ کاری ناشایستی کردووە بە سزای خۆی گەیشتووە. ئەو منداڵە سەروپێچکانە گوناهیان چ بوو؟ ئێستا پاڕانەوەم لە دەرگانەی پیرۆزت ئەوەیە وەك خۆت مەرجت داناوە کە نابێ ئەو وڵاتە بدرێ بە بێگانە، با مجەنکورد بدرێ بە پیلەتەنی کوڕی محەمەد بەگ. لەو دەمەشدا پیلەتن دەگەڵ سەردار مستەفا پادشاچوویبووە سەفەری شیروان. سوڵتان لە سەر تکای ڕوستەم بەگ مجەنکوردی دایەوە و فەرمانی بۆ دەرکرد.

کە لە سەفەرەکە گەڕایەوە، ئیزنی هاتنەوەی خواست و بەرەو مجەنکورد دەهات، گەیشتبووە ناوچەی تورجان، پێمیردی خوای گەیشتە سەر و گیانی دەتووری ڕابردووان هاویشت و نەیهێشت میرایەتی بە خۆیەوە ببینێ. ئەویش چوار کوڕی هەبوون: عەلی بەگ، جیهانگیر، عوسمان، کەڵەحەمەد بەگ.

لە سەر فەرمانی بەرزی سوڵتانی خاوەن شکۆ (مرادخان) مستەفاپاشای سەردار، سنجەقی

مـجەنکوردی دابە عەلی بەگی کوڕە گەورەی. براکانی دیکەش هەر یەکە مووچەیەکیان بـۆ بڕایـەوە و کارێکیان بۆ دۆزرایەوە.

عەلی بەگ چەند ڕۆژێك بە سەر مـجەنکوردیّ ڕاگەیشت و مردنی پـێ گەیـشت و دنیـای پـڕ لـە گیـرە و نیـرەی پێ بەجێ هێشت. سێ کوڕی بوون: حەیدەر بەگ، ئەڵلاوێردی، پیلەتەن.

لە دیوانی سوڵتان مرادخانەوە حەیدەر بەگی کوڕە گەورەی بۆ سەر سنجەقەکە دیاری کرا؛ بەڵام بەر لەوە تامی بکا، مەرگی بە دیاری بۆ هات و بە گۆڕیچەیان ئەسپارد.

سنجەقی مـجەنکورد بە میـرات بە ئـەڵلاوێردی بـڕا و ئێـستا کـە سـاڵی (١٠٠٥ك)یـە و ڕۆژی دووشەمـــە و هەژدەی مانگی ڕەمەزانە، سنجەقی مـجەنکوردی بە دەستەوەیە.

## دەستەی دووەم

# فەرمانڕەوایانی پەرتك

وەك باسمان کرد لە پاش پیرحوسێن بەگ وڵاتی چەمشکەزەك دەناو کوڕەکانیدا دابەشکرا. ناوچەی پەرتك لەو بەشبەشەدا بەر ڕوستەم بەگی کوڕی دووەمی پیرحوسێن کەوت. ماوەیەك لە سەر فەرمانی دیوان بە سەری ڕاگەیشت و ڕوستەمی مەرگی تووش هات و کەمەندی لێ هاڵاند و لە گۆڕستانی توند کرد و سێ کوڕی لە پاش بەجێ ما: بایسنقوڕ، محەمەدی، عەلی.

باوك بایسنقوڕی کردبووە جێنشین و لە پاش مردنی جێگەی گرتەوە و لە ڕاستیشدا گەورەیی هەر لەو دەوەشێتەوە. کردار باشە، ئاکار جوانە، بە قورساغ و سەنگین و گرانە؛ دەگەڵ ورد و درشت و گەورە و گچکەدا سازاوە و سەرداری بەو ڕازاوەتەوە.

لە مشوورخۆریدا بێهاوتایە و لە ئازاییدا کەس دەرۆستی نایە. لە بەخشیندا حاتەم تۆزی ناشکێنێ و لە مەیداندا ئەسفەندیار دەشکێنێ. بە زانست و کردەوە لە هونەری مۆسیقادا زۆر لە سەرە و گەلێکی ئاهەنگ و هەوای خۆش و شێعری باش لەبەرە.

پێشەنگ و ڕاوێژکەری ئامۆزایانی و هۆزەکانی چەمشکەزەکە و هەموویان بە دڵ هەر ئەویان گەرەکە و هەرگیز لە فەرمانی دەرناچن. بە هومێدم وەك باب و باپیرە گەورەکانی حکوومەتی گەورەتر دامەزرێنی و هەرگیز بۆ هیچ ئاواتێك دانەمێنێ.

## دەستەی سێهەم

# فەرمانڕەوایانی سوقمان

وەك لە پێشدا گوتمان، لە زەمانی سوڵتان سولەیمانخانی خەزاکەردا وڵاتی چەمشکەزەك کرایە دوو سنجەق و چاردەزەعامەت. شارۆکەی چەمشکەزەك و ناوچەی سوقمان کەوتبوونە سەر موڵکی تایبەتی شاهانەوە. کەیخوسرەو بەگ و کەیکاوس بەگ و پەرویز بەگ، کوڕانی پیرحوسێن بەگ -کە هەر سێك لە دایکێك بوون و لە پاش بابیان سەروپێچکە بوون- شتێکی کەمیان بۆ دیاری کرابوو. کاتێ پێگەیشتن و بوونە پیاو، هەر سێکیان بۆ بەشی ڕەوای خۆیان ڕوویان کردەئەستەمبوڵ.

بەچکەشێر چنجوڕك و کەڵپی دەرکەوت، دەرچوو لە لان

ڕۆیی ئەو ڕۆژەی ددانی لێ دەسوون ورچی تەلان

دادی خۆیان بە -هۆی وەزیرە گەورەکان- بە گوێی پەردەدارانی سەردەرانەی خەلافەت ڕازێنەوە ڕاگەیاند و ئەوانیش بە دانیشتوانی لەمپەری دستوور پتەویان گەیاند. لە دەریای بێ کەناری بەزەیی پادشاهانە و چاکەی بێ سنووری سوڵتانانەوە، ناوچەی سوقمان -کە ببووە موڵکی تایبەتی پیرۆزی پادشا- بە ناوی سنجەق بە کەیخوسرەو بەگ بەخشرا و بە مۆری ودم زۆری پادشایانەش نەخشی بۆ لێدرا و براکانیشی هەر یەکی زەعامەتێکیان پێدرا.

کەیخوسرەو بەگ ماوەیەك بە کامەرانی گوزەرانی کرد و لە پاش ئەوە، گیانی بەهەشتخوازی، ئاوازی نیازی خۆی بە هۆی فرشتەکانی سەر شانیەوە بە ئاسمان گەیاند و عاسمانشینانیش بە عیزرایلیان ڕاگەیاند و ئەویش لە کەیخوسرەو بەگی ئەستاند و بۆ بەهەشتی ڕەتاند.

بە ڕەگ کوتان و بڵندی مەنازە! بای مردن     لە تۆ بەرزتری هەڵکەند، کە هاتە هەڵکردن

سێ کوڕی لە پاش بەجێ مان: ساڵح بەگ، قاسم بەگ، عومەر بەگ.

ساڵح بەگ کرا بە جێنشینی باوك. قاسمیان پیاوێکی شێتۆکە و گەللایی بوو؛ سەری لە کاروباری دنیایی دەرنەدەچوو؛ ژیانێکی دەروێشی ڕەچاو کرد و بە گۆشەنشینی دەژیا.

عومەر بەگ ڕكونی و خۆپەرست بوو؛ چاوی بڕیبووە جێگای برای و لێی دەخەفتا. ڕۆژێك هەلی دەست خست و هەڵیکوتا سەر و کوشتی و لە جێگەی ئەو خۆی کردەمەزنی وڵات. بەوەندەشەوە نەوەستا؛ مرخی لە براژنە بێوەژنەکەشی خۆش کرد کە بیخوازێ و دارایی و کەلەپووری برا کوژراوەکەشی دەست کەوێ؛ ناردیە خوازبێنی. ژنە دەیزانی پرسەگورگانەی پێ دەکەن؛ دەنا خۆشی‌یێ و ناخۆشی‌یێ هەر داگیر دەکرێ. ملی داو لە ژێریشەوە کەوتە سەر ئەو بیرە کە تۆڵەی خوێنی مێردی خۆی لەو دامێن‌تەڕ و سەروشك و نامەردەبکاتەوە. ئەو شێرەژنە پلانی خۆی لە لای هێندێك لە نۆکەرانی ڕازپۆش و ئەمەگداری ساڵح بەگ درکاند و ئەوانیش بە گیان و دڵ ئامادەی یاریدەدانی بوون. بڕیار وا درا شەوی بووکێنی، ئەوانە لە سەر هەست بن؛ هەر کاتێ زاوا دەچێتە پەردەوە، لێی ڕاپەڕن و کاری ببینن.

شەوی بووك گوێزانەوە، عومەری زاوا بە هەزار نیاز و نازەوە و بە فیز و شانازی و لووتبەرزیەوە، ڕووی کردەپەردەی بووکی تازەوە. کوڕگەلی بەهێزوگور و شێردڕ، لە بۆسە دەرپەڕین و بەر خەنجەریان داو کاسەڵکەی سەری گلاویان لە خەیاڵ پلاو بەتاڵ کرد و خەنجەریان بە خوێنی پیسی مشت و ماڵ کرد و هەقی تاوانەکەیان نایە مشتەوە و کە خوێنی برای ڕشتبوو، خوێنیان ڕشتەوە.

ساڵح بەگ سێ کوڕی لە پاش بەجێ مابوون: کەیخوسرەو بەگ، مەحموود بەگ، محەمەد بەگ. ئەو شاژنە بە نامووس و خاوەن ئابڕووە، کەیخوسرەو بەگی کوڕەگەورەی خۆی هەڵگرت و ڕەوانەی ئاستانەی سوڵتان مرادخان بوو. ئەو کارەساتەی بە سەری هاتبوو -بە هۆی وەزیرە گەورەکانەوە- بە جێگەی ڕانانی پەردەی بارەگای عەرشاسایی سوڵتان گەیاند. لە بەزیی بێ کەمایەسی پادشاهانەوە سنجەقی باوك درا بە کوڕ و نیشانەی پادشاشی پێ بەخشرا و بە ئارەزووی دڵ گەڕایەوە.

ئێستا کە ساڵی ١٠٠٥.ك یە، کەیخوسرەو بەگ بە بێ‌کێشە و دەردەسەری سەرداری ناوچەی سوقمانە.

بەسەرهاتی کوڕەکانی دیکەی پیرحوسێن بەگیش بەم جۆرەی خوارەوەیە:

یەکەم یوسف بەگ؛ لە بەش بەشێنەکەدا ساڵانە حەفتا هەزار ئاقچەی بۆ بڕایەوە. کە مرد چونکە نێرینەی لێ نەکەوتەوە، ئەو دراوە بە زولفەقار و مستەفا و زۆرابی ئیبنولقاس دەگەیشت؛ کە هەر

سێکیان کوڕی محەممەد بەگ بوون.

دووەم موحسین بەگ؛ حەفتاهەزار ئاقچەی بۆ بڕابۆوە و لە پاش خۆی کوڕەکانی -کە برایم و جەعفەر و شێخ حەسەن و مراد بەگ و ئەیبە سوڵتان بوون- لە ناو خۆیاندا بەشیان دەکرد.

سێهەم یاقووب بەگ؛ چلهەزار ئاقچەی بەرات بوو. لەپاش خۆی سێ کوڕەکانی -کە فەڕوخ و دوندار و بابڕ بەگ بوون- وەریان دەگرت.

چوارەم کەیقوباد بەگ؛ ساڵانە پەنجاهەزار ئاقچەیان بۆ بڕیەوە؛ بەڵام ئەو حیزەبخۆیی و سەرشۆڕیەی بە دڵ نەبوو؛ وڵات و دراوی بۆ برایانی بەجێ هێشت و خۆی گەیاندەیەمەن. لەوێش زۆری خزمەت بە دەوڵەت کرد. بە هیوای مەزنایەتی وڵاتی چەمشکەزەك، هاتەوە ئەستەنبووڵ و لەوێ خوا بۆ خۆی بردەوە. چوار کوڕی هەبوون حوسێن بەگ و مەسیح و زاهید و ئیسلام بەگ.

پێنجەم کەیکاوس بەگ؛ بە مووچەیەکی زۆرکەم داسەکنابوو. کە مرد، دەیاندا بە مەنسوور بەگی کوڕی.

شەشەم پەروێز بەگ؛ زەعامەتەکەی لە پاش مردنی درا بە حەیدەر بەگی کوڕی.

حەوتەم بالوڵ بەگ؛ چلهەزار ئاقچەی جیرە بوو. دوای خۆی درا بە محەممەد بەگی کوڕی و کە ئەویش نەما، کوڕەکانی -ئەلوەند و ئەروەج و ئەحمەد- لە خۆیان بەش دەکرد.

هەشتەم گوڵاوی بەگ؛ بەشەکەی چلهەزار ئاقچە بوو. دەگەڵ مستەفا پاشای سەردار چووە شیروانات و لە شەڕەکەی چاڵدیراندا، دەگەڵ زۆر لە پیاوەگەورەکانی کوردستاندا ئەویش سەری تێدا چوو. پشکی ئەو، محەممەد بەگی کوڕی وەری دەگرت. کە ئەویش مرد، درا بە عەلیخانی کوڕەزای.

نۆیەم یەلمان بەگ؛ بە بیستهەزار ئاقچە ڕازی کراوە و خوا تەمەنی زۆری پێداوە و ئێستا کە (١٠٠٥.ك)یە، هەر ماوە.

# بەندی دووەم

## فەرمانڕەوایانی مەرداسی

### ئەویش دەبنە سێ دەستە

کۆنە پیاوانی پسپۆر و لێزانـی ڕاسـت و چـەوتی ڕووداوان، بـە بـنج و بنـاوانی ڕابردووانـی خانەدانـە ئاوەدانەکاندا ڕۆیشتوون و بۆیان ڕوون بۆتەوە کە ڕەگەزی سـەرۆکەکـانی هـۆزی گـەڕناس و سەرناسـی مەرداسی، بە زنـجیرەی کوڕانی ئیمام هەباسی مـامی پێغەمبـەری خـواوە لکـاوە و چۆڕچـۆڕەی ئـەم پاشاوە لەو سەرچاوە بەهەشتیەوە داتکاوە.

یەکەم هەڵکەوتەیان پیـرمەنسوور کوڕی سەیدحەسەنەشەلە بووە. پیاوێکی دوورەدنیا و خواپەرست و خۆپـارێز بـووە و جـار و بـارە -بـە گوێـچکەی دڵـی- ڕازی نادیـاری و بـەرپیواری بیـستووە. ڕەسەنامەیێکیان بە دەسـتەوەیە بـە حەڤدەپـشت دەیانباتـەوە سـەر عـەلی کـوڕی عەبـدوڵڵا کـوڕی عەبباسی خوالێخۆشبوو.

پیـرمەنسوور دەپێشدا لە لای هەکاری دەژیا؛ لەوێوە باری کرد و هاتە ئەگیل لـە دەوروبـەری دژی ئەگیلدا، لە گوندی پیـران گیـرساوە؛ دەروێش دانێکی بنیات ناو دەسـتی کـرد بـە دەروێـش گـرتن و شێخایەتی کردن.

شەو و ڕۆژ لە سەر دووگرد لا نەدەکەوت؛ کەمی دەخوارد و کەمتـر دەخەوت و دنەی خەڵکی دەدا کە لە گوناه دوور و لە خوا نزیك بن. تا وای لێهات هەموو خەڵکی وڵاتەکەی کەمەندگیـری پیـرکرد و بوونە تۆبەکار و خزمەتکاری.

کاتێ پیـرمەنسووری پیـرۆز دنیای بێپیـری دایە پشتەوە و چوو بە لای حۆریـەکانی بەهەشـتەوە، پیـرمووسای جگەرگۆشەی، شوێنەواری لە بیـر نەبردەوە؛ خانەقایەکی سۆفـی بەندیشی لە گوندەکـەدا ئیجادکرد و نامەخوا خواپەرستی دووچەندانی زیاد کرد. ئەوەندەی بە پـرچ و ڕیـش لـێ هـاڵان کـەڵی کۆتانیشی بە موو دەبەستەوە. زۆربەی هەرەزۆری هۆز و تیـرەکانی مەرداسی دەستیان گلاو کرد و بـە

پیری دەستگیری خۆیان ناسی.

ناوبانگی پیاوچاکی و دەست و داوێنپاکی ئەو پیاوە بێفیز و خاکیە، کەژ و چیا و دەشتەکانی، کاکی بە کاکی داگرت و لە هەموو لایەکەوە هەروا بۆرەپیاو و خاوەن ناو و نێر و مێ بوون وەك شارەمێروو ڕچەیان دەبەست و دەهاتن و تۆبەیان لە سەر دەستی دەکرد و نوشتەیان بە موفەڕك دەبرد.

کاتێ پیرمووساش ئاهۆی مەرگی پێوە نووسا و تیسرێژی ودمی لەو دنیای نەمردا چرووسایەوە، کوڕی وەك دوڕی -کە ناوی پیربەدر بوو- بەو پەڕی ڕێز و قەدرەوە لە سەر کەوڵ و پۆستی خودادۆستی جێگیر بوو.

پیربەدر لە باب و باپیرانی خۆشی تێپەڕاند و سەرەوبەرەی زۆری بەو پیشە بەهرەدارەی خۆیدا و بیری لێکردەوە کە دەروێشدانەکەی بکا بە دیوەخانی سەرداری و سۆفی بەندەکەی جێگەی گیروبەندی خونکاری بێ و واز لەمانیش نەهێنێ و مەزنایەتی دووسەرە دامەزرێنێ.

دەروێش و دێوانەی دەنگدان و سۆفی و موریدی بۆ جەنگ سازدان و بە زۆری زۆرداری دژداری ئەگیلی دەرپەڕاند و لە گۆشەگیریەوە بوو بە قەلاگیر و بەرماڵی شەوبێداری لە سەر تەختی خونکاری ڕاخست و کەوڵ و پۆستی دەروێشی لە سەر قالی و لاکێشی قەلای ئەگیل داخست. دژی ئەگیل دژێکی فریە سەخت و دژوارە؛ بە لاشاخێکی ڕژد و هەزار بە هەزارەوە هەڵخراوەتەوە. ئەو لاشاخە ئەوەندەخوار بۆتەوە پیاو لە تێهەڵڕوانینی زەندەقی دەچێ و هێندەبەسامە ئەوی تماشای بکا مچوڕکی بە لەشدا دێت.

دەماودەم دەگێڕنەوە و دەڵێن جارێك پیرێکی سەر بەرماڵ بە لای ئەو قەدپاڵەدا ڕابردووە و بە زمانی تورکی دەو چیایەی ڕاخوڕیوە و لە توانای خوداوە ئەو لاشاخە بەرەو پیرە تورکە چەمیوەتەوە و تازە خۆی بە ڕاستی نەدیوەتەوە. ئەمەش خودا دەیزانێ. ئەو هۆزەی کە لە ناو دژ و وڵاتەکەدا دەژین بە مەرداسی ناودەبرێن.

مەرداس کوڕی ئیدریس کوڕی ئەسیر کوڕی ئەسر کوڕی جەمیل، مەزنی هۆزی بەنی کلاب[1] بووە و لە پێشدا لە دەوروبەری حەڵەب ژیاون؛ کە ئەوسا حەڵەب دەبەر دەستی پادشایانی ئیسماعیلی

---

١- واتا: بەرەی سەگەل.

میسردا بووه. ئەمیرانی میسر خۆبەخۆ بە شەڕ هاتوون و دانیشتووانی ولاتیش تێوە گلاون و تووشی گێرە و قەرقەش کراون. سالح کوری مەرداس کوری ئیدریس، کێسی لەو دووبەرەکایەتیە هێناوە و دەوری قەلای داوە و تەنگی بە دژداران هەلچنیوە و قەلاکەی گرتووە. کە ئەو دەنگ و باسە گەیشتەوە میسر، زاهید کوری حاکم٢ی ئیسماعیلی لەشکری ناردەسەر و لە سالی٤٢٠.ک (١٠٢٩.ز)دا خۆی و کورەکەیان کوشت. ئیتر هۆزەکانی ئاوارە بوون و لە لای ئەگیل گیرسانەوە.

پوختەی وتار، پیر بەدر کە بە یاریدەو کۆمەگی هۆزی مەرداسی، قەلا و مەلبەندی ئەگیلی خستە ژێر چۆکی خۆیەوە، ماوەیەك فەرمانرەوایی کرد و چیدی نەیدایە سەرشۆیی باب و باپیرانی.

یەك لە پادشایانی سەلجۆقی[1] چاوی بڕیە وەلاتەکەی و قەلاکەی لە دەست دەرهێنا و بە ناچاری هەلات و لە مەبەستی دواییدا ڕوونی دەکەینەوە کە چی بەسەرهات.

---

١- رەنگە تەتش کوری ئەلپئەرسەلان بێت کە لە سالی ٤٧٨ را تا برانەوەی ٤٨٨ پادشایەتی کردووە. جەمیل

## دەستەی یەکەم

# فەرمانڕەوایانی ئەگیل

## کە بە بڵدوقانی بەناوبانگن

نووسەری ئەم ڕووپەڕانە لە باوەڕ پێکراوانیەوە بیستووە کە ناوی بڵدوقانی چۆن پەیدا بووە: دوای ئەوە پیر بەدر لە بەر دوژمن هەڵاتووە، پەنای بە میافارقین بردووە و لە لای میرحوسامەدین حاواوەتەوە و لە دواییدا شەڕێك لە نێوان حوسامەدین و میرنارتقدا[1] ڕووی داوە، پیر بەدر لەو شەڕەدا کوژراوە.

پوختەی مەبەست ئەوەیە میرئەرتق بە فەرمانی ئەلپئەرسەلان هاتە سەر میافارقین و دەوری قەڵای داو دژدارانی خستە تەنگانەوە و لە جەنگەی تیرەبارانێکدا، پەیکانێك میرحوسامەدینی پێکا و تێکیەوە گلاند و گیانی لێ‌ساند.

بە کوژرانی سەردار، دژداران خۆیان بێ‌سەر دیتەوە و بێ‌سەرە و بەرەیی ڕووی تێکردن و دێوەزمەی دڵساردی خۆی لێکردن و ڕۆژبەڕۆژ لە کزی و کەنەفتیاندا و ئەمیرئەرتەق لە نیوەشەوێکدا هێرشێکی توند و تیژی بردنی و خۆی دەنا و ڕاکردن و مردن وەبرە و کەوت و بە شیر و نێزە دەناویان کەوت و قەڵت و بڕی تێخستن و کەسیان نەخەلستن و پیر بەدریش یەك لەو سەرپەڕاوانە بوو.

لە بنەماڵەی پیرانی مەرداسی، تەنیا پیرەکی ئاوسی پیر بەدر لە کوشتن خەلەست و بە دزیەوە خزیە قوژبنێکەوە و خۆی لە دژمن دزیەوە. ئیتر هەموو هومێد و هیوای هۆزی مەرداسی ئەو گەرایە بوو کە لەو زگەدا گۆڕا بوو. گەورە و گچکەیان دەست بە دوعا و دەم بە نزا بوون کە خودا نێرینەیان بۆ بنێری و دوارۆژیان بەو بسپێری و بێ‌سەر و سەروەر نەمێننەوە.

هەموو ڕۆژێ دوو جاران، بوومەلێڵەی بەیانی و سەرلەنگۆرەی ئێواران، ڕیش‌چەرمووانی مەرداسی

---

[1] ١- میر ئارتق لە لایەن ئەلپ ئەرسەلانی سەلجوقیەوە بە سەر ماردین و دیاریەکر ڕادەگەیشت. نەوەی ئەو ئارتقە لە دواییدا هەتا حەڵەب و بەغدایان لە بەردەستا بووە و حەوت کەس لەو ماڵە سەریان بە پادشایەتی گەیشتووە. مێژوونوسان ئەوانیشیان هەر لە ڕەسەنی سەلجووقی حیساب کردووە. دوامین کەسیان مەلیك ناسرە کە لە ڕۆژگاری ئاق‌قۆینلوودا بە دەستی حەسەن بەگی بایەندوری بەکوشت چووە و بە نەمانی ناسر، دەوڵەتی ئارتق لە بەین چووە.

لە دەوری کولێتی ژن بیەکە کۆ دەبوون و باس و خواسی پیرە عەزیزەکەیان لێ دەپرسی؛ تا ڕۆژێك کە قەیران بەسەر چوو، ژن ژانی هاتی و کەوتە زەیستانیەوە.

حەشاماتێکی زۆر لە دەوری کۆخەکە ئاپۆرەیان داو بە تاسەوە دڵ لە مست و لەسەر هەست وێستابوون و گوێقولاغی موژدەیەکی خۆش بوون. یەکێ کەلە هەمووان پاپاتر و کورخواتربوو گوری بەستە ژوورەوە و بە مزگێنی کوڕەوە هاتە دەر و بۆ ئەوە هەموو کەس تێنەگا کە چی دەباران دایە، بە تورکی گوتی بولدوق واتا: پەیدامان کرد.

ئیتر لە خۆشی ئەو مژدەخۆشەوە، ناوی بوڵدوقیان دابە میری دوارۆژ و هەرچی لەویش کەوتوونەوە بە بوڵدوقانی ناسراون.

| | |
|---|---|
| یەکێ ڕیشسپی بۆی دەگێڕامەوە | کە ساڵێك لە ساڵان لە لای شامەوە |
| ژنێك زگپر و بێکەس و بێپەسیو | پەنای بردە وێرانەیەك بێ بژیو |
| کوڕی هانی، بێچارە سەیری نەکرد | لە تاوی کوڕی مرد و زۆری نەبرد |
| ئیتر نەیدەزانی خودا ڕۆژی خۆی | چەنێ گەورەیی و ڕۆزی داناوە بۆی |
| ئەوەند گەوهەر و گەنجی دینێتە چەنگ | کە دەرچێ لە پێوان و هەژمار و سەنگ |

کە ئەمیربوڵدوق هاتە دنیاوە، دایك لە سەر زەیستانی مرد و دنیای بەجێ هێشت. هۆزی مەرداسی کوڕیان برد و زۆر بە دڵ و داو بەخێویان کرد. کوڕێك ڕۆژەی دوو ڕۆژە بوو. وەك نۆنەمامێکی شۆخ و شەنگ و چەلەنگ هەلێدا و پێگەیشت و داوی خاوی هەرەتی شلکی گشت کردەوە و بوو بە لاوێك وە بەر هەموو دڵ و چاوێك دەکەوت و لە گشت کردەوەدا پیاوی تەواو بوو. هۆزی مەرداسی بە دەستیگەل دەستیان گرت و لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی ئەگیلیان ڕۆنیشاند و بە ئاواتی دێرینی خۆیان گەیشتن.

ئەمیربوڵدوق لە دادگەریدا دادی سەروری داو ڕایەخی دڵنیایی لە ژێر هەموو ژێر دەستانیدا ڕاخست و دەرگای ترس و ناهەمواری بە حەوگۆڵە و کلیلان داخست. چاکەی هۆزی ئەمەگداری، گوێل بە بار و لاوێچ بە تەغار دایەوە و هەمووی لە ژێر سایەی ئەو خونکارەدا حەسایەوە.

تا چەند ساڵێك بە شانازی و سەرفرازی فەرمانڕەوایی کرد و ئەوسا ماڵاوایی لە ژیان خواست و

ڕاستەڕێی مەرگی گرتە بەر و لاشی لە باوەشی دایکی خاکا خەوت و گیانی پاکی بەرەو بەهەشتێ سەرکەوت. ئەوسا فرزەندی دڵبەندی:

## میرئیبراهیم کوڕی میربوڵدوق

کرا بە جێنشین و ئەویش وەك باوکە هێژاکەی دەرگای چاکەی بە ڕووی خەڵکدا کردەوە و لە داد و بەخشندەییدا گرۆی لە زۆران بردەوە. بەڵام هێمان جێگەی خۆی تەواو گەرم دانەهێنا بوو کە سێ بەردەی نایە مست بووکی ناو پەردەی دنیاداریەوە و کۆچی یەکجاری کرد.

## میرمحەمەد کوڕی ئیبراهیم

لە شوێن باوکی کرا بە میر وئەویش زۆر بە سەرداری نەمایەوە و بە سەر دارەبازی مەرگەوە نیشتەوە و سێ شیرین کوڕی لە جێگەی خۆی هێشتەوە: ئەمیرعیسا و ئەمیرتەیموورتاش و ئەمیرحوسێن.

میرعیسا لە پاش بابی کرا بە فەرمانڕەوای ئەگیل. تەیموورتاش لە ڕۆژگاری باوکیدا بە سەر قەڵا و ناوچەی باغن ڕادەگەیشت. میرەکانی پالەو لە ئەمیرتەیموورتاشەوە کەوەتوونەوە؛ کە لە لیزگەی لکی دووەمدا ئەوانیش دەهۆنینەوە.

میرحوسێن بە زیندی سەری باوی قەڵای بردنج و ناوچەی چەرموگی بە دەستەوە بوو. هێندێك لایان وایە میرحوسێن خزمی میرمحەمەدەو کوڕی نیە و لە بەر خزمایەتی، ئەو مولکانەی دابوویە. خوا حەز کا لە لکی سێهەمدا دەربارەی میرحوسێن و کوڕانیشیەوە دەدوێم.

## میرعیسا کوڕی میرمحەمەد

لە جێی بابی کرا بە میری ئەگیل. دەگەڵ براکانیدا زۆر یەکدڵ و تەبا بوون و ڕەشایی و سوپایی لە ڕۆژگاری ئەودا لەوپەڕی خۆشگوزەرانیدا بوون. لە دوای ئەوە کە سوپای مەرگ بە سەری دادا و لە ڕەشایی گۆڕیچەدا جێی بۆ کرایەوە. کوڕەکەی:

## دەوڵەتشابەگ

بە دەوڵەتی بابی شابوو. ماوەیەك بە شادی ڕایبوارد و شای مردن بە سەری کردەوە و بۆ دەوڵەتی خۆی بردەوە و میرعیسای کوڕی جێگەی گرتەوە.

## میرعیسا

بۆ چاکە و مەردایەتی، چاکی مەردانەی بە لادا کرد و لە ڕۆژگاری ئەودا ئاوەدانی و خۆشی هەمووانی، بە سەر ئەو وڵاتەدا باڵی کێشاو کە ئەویش سێبەری لە سەر زەوی نەما دوو کوڕی لە پاش بەجیّ مان: ئەسفەندیار و شامحەمەد.

## شامحەمەد بەگ کوڕی میرعیسا

بەڕێهاتوویی کرایە جێنشینی باوکی و زۆری نەبرد کۆچی دوایی کرد و پێنج کوڕی لە دوا مان: قاسم بەگ، عیسا بەگ، مەنسوور بەگ، ئیسفەهان بەگ، میران بەگ.

## قاسم بەگ

پیاوێکی ژیر و پیتۆڵ و توند و تۆڵ و مەرد و ڕەند و هونەرمەند بوو. بۆ مشوورخۆری و ئاوەز زۆری شۆڕەسواری مەیدان بووە و لە هەموو لایەکەوە دەستنیشان کراوە. لە ڕۆژگاری پادشایانی ئاققۆینلوودا زۆر لەڕوو بووە. بەخێو کردنی کوڕە پادشایەکی پیّ سپێراوە و لەو ساوە ناوی لەلەقاسمی بە سەردا براوە.[1]

سالّی ٩١٣.ك (١٥٠٧.ز) کە شائیسماعیلی سەفەوی دیاربەکری گرت، لەلە قاسم لایی کرد و نەهاتە لای. شابەوە زۆر قوشقی ببوو؛ لەشکرێکی بە سەرکردایەتی خانمحەمەدی ئیستاجلوو ناردەسەر ئەگیل و گرتیان و لەلە قاسمیان لیّ دەریەڕاند و کابرایەکی قزلّباشیان لە سەر کردەگزیر و سوورباش، کە ناوی مەنسوور بەگ بوو.

ئەگیل حەوساڵ بە دەست قزلّباشەوە بوو. لە دوای شەڕی چالّدیران -بە کۆمەگی سوڵتان سەلیمخان- لەلە قاسم ئەگیلی ساندەوە و خۆی لیّ دامەزراندەوە. دەشڵێن لە وەختێکدا کە دیاربەکر بە دەست قەرەخانەوە بووە[2]، لەلە قاسم بە فێڵێك دەستی بڕیوە و دیاربەکری لە دەست قزلّباش درهێناوە

---

١- ناوی نەهێناوە بەڵام دەبیّ یاقووب کوڕی حەسەنیدرێژ بیّ. جەمیل

٢- قەرەخان برای محەمەدخان ئیستاجلوو، لە ئەمیرەکانی قزلّباش بووە. جەمیل

و داویەتە دەست محەمەد پاشای میری میرانی دیاربەکر.[1]

لە لای عوسمانیانیش لەلەقاسم زۆر لەپێش بووە. زۆر بە خۆشی ژیانی ڕابواردووە و کە گیانی بە خوا سپاردووە، هیچ نێرینەی لە پاش بەجێ نەماوە و مەزنایەتیەکە بە مراد بەگی برازای دراوە.

## مراد بەگ کوڕی عیسا بەگ

بە ڕاسپێری مامی و بە فەرمانی سوڵتان سولەیمانخان، کرا بە فەرمانڕەوای ئەگیل. مراد بەگ پیاوێکی بەدەستودڵ و خواپەرست و گەلدۆست بووە. مردن و پرسینەوەی لە بیر نەکردووە و دڵی هەموو کەسی ڕاگرتووە. گومبەزێکی تەرز و بەرزی بە سەر گۆڕخانەی قاسم بەگی مامیەوە هەڵخستەوە. غەوارەخانەیەکی بۆ ئاوارە و بێچاران لە نزیك گۆڕخانەکە بنیات ناوە؛ هەر ڕێبوارەکی هەژار بەوێدا ڕابواردووە، لایداوە و نان و شێو و نوێن و ڕایەخیان داوە و بە خێری مامی تێروپڕی خواردووەو شەوی تێدا ڕابواردووە. ئەو میوانخانەی هەژارانە، قۆناغێك لە شار دوورە و بە خانی شەڕبەتێن مەنشوورە.

چەند ساڵێك ئاوا بە پاك و خاوێنی، چاك و داوێنی لە چاکە هەڵکرد و بەریك و بەرۆکی لە پیاوێنی و پاکداوێنی ئاخنی و ئەوسا لە ئاوارەخانەی دوو دەرگانەی ئەم جیهانە بۆپەیمانە دەرکەوت و لە میوانگەی ناو بەهەشتی بەریندا بە ئاوات گەیشت. دوو کوڕی لە پاش بەجێمان: عەلی خان و قاسم بەگ. هەردووك برا یەك لە دو یەك کرانە میر؛ بەڵام هیچیان تەواو تامی مەزنایەتیان نەچێشت و لە تەمەنی گوڵدا چوونە بن گڵەوە و دنیای پیریان بە جوانی بەجێ هێشت.

قاسم بەگ دوو کوڕی بوون: جەعفەر بەگ، غەزەنفەر بەگ.

## جەعفەر بەگ

هەر بە سەری شلکی سایەی باوکی لە سەر ڕەوی و سێوی بوو. بە فەرمانی سوڵتان سەلیم خان کردیانە میری ئەگیل. ئێستا کە تاریخ ١٠٠٥ی کۆچیە، جەعفەر بەگ ماوە و ماوەی بیست و پێنج ساڵە بە سەر ئەگیل ڕادەگا.

---

١- محەمەد پاشا بیقلوو (سمێڵفش) لە زەمانی سوڵتان سەلیمی یەکەمدا میری میرانی دیاربەکر بووە. جەمیل

## دەستەی دووەم

# فەرمانڕەوایانی پالەو

وەك دەگەڵ باس و بەسەرهاتی ئەگیلدا ڕابورد و بە وەستایی لیزگە مرواریەکەمان بە شوێن یەکدا پێوە کرد، فەرمانڕەوایانی پالەوە لەو ئەمیرتەیموورتاشەوە هاتوون کە ئەویش کوڕی میرمحەمەد کوڕی میرئیبراهیم کوڕی میربوڵدوق بوو.

میرتەیموورتاش لە ئاکاری باشدا بێهاوتا و لە زاناییدا زۆر بەر چاو و زۆر بەدڵ و بەرچاوفرەوان بووە و لە بەجەرگیدا ناوی لە سەرووی ناوانەوە نووسراوە و لە دلاوایی و کاری پیاوانەدا لە پێش زۆربەی کەڵەپیاواندا باسی کراوە. لەو ساوە کە باوکی لە بەهەشتی بەریندا حەساوە و ئەم ئەسپی تۆسنی سەرداری لە ژێر ڕکێفی خۆیدا دیوە، تا ئەو کاتەی کە چاوی لە دنیا پۆشیوە، هەرگیز گەردی نەخستە سەر دڵی هەژارێك و بارێکی نەپەڕاندەسەر لێوی هیچ داماو و پەژارێك.

کاتێ چرای ژیانی لە سەر دەلاقەی جیهان بە بای مەرگ کوژاوە، تاقە کوڕێکی لە پاش بەجێ ما ناوی هەمزە بوو. هەمزەش ماوەیەك مەزنایەتی کردووە؛ کە مردووە چوار کوڕی هەبووە: حوسێن، یەغمور، عەلی و ڕوستەم.

### حوسێن بەگ کوڕی میرهەمزە

لە جێگەی باوکی کرا بە فەرمانڕەوا و لەو سەردەمانەشدا -ڕۆژگاری ئاققۆینلوو بوو- هەرا و ئاژاوە کەوتە وڵاتی دیاربەکرەوە.

حوسێن بەگ بە نیازی گرتنی قەڵای ئەرغەنی، هێرشی بردەسەر تورکمانان و لە شەڕدا کوژرا. ئەم لاوە کە هێشتە لە بادەی کامەرانی چەند چۆڕێکی فڕ نەکردبوو، مەیگێڕی مەرگ پیاڵەی بۆ پڕ کرد و بەو پەیمانە سڕی کرد و گیانی شڕ کرد. چونکە نێرینەی لێ نەکەوتەوە، جەمشیدی برازای جێی گرتەوە.

## جەمشید بەگ کوڕی ڕوستەم بەگ

لە ڕۆژگاری فەرمانداری حوسێن بەگدا جەمشید بەگ ببووە پیاوی خالید بەگی پازۆکی. ڕۆژێك لە جەنگەی ڕاووشکاردا، بازی خالید بەگ لە پڕ لە دەستی بازەوان فڕی و بەرەژوور چوو؛ هەر چوو لە تەشقی عاسماندا لە بەرچاو ون بوو. هەموو کەس لای وابوو تازە ئەو بازە واز لەو بازرەبوونە نانێ و ناگەڕێتەوە و لە سەر دوندی ئەستێران نەبێ نانیشێتەوە. بە سەرسووڕماوی لەو بەرزەفڕەیان دەڕوانی و هەر هێندەیان زانی باز بە تەقڵە و قەڵەمباز سەرەو نشێو هاتەوە بەرچاو و زۆر بە گوڕوتاو خۆی لوور کرد و سەری جەمشید بەگی کردەلیس و بە سەریەوە نیشتەوە.

خالید بەگ و هەوالانی -کە لەو ڕووداوە سەمەرەیان دەڕوانی- ئەوەیان بۆ جەمشید بەگ بە نیشانەی ودم زانی و هەر واش دەرچوو:

پلاری دەسی کوێرە هات و نەهات وەدی هات ئەوی گاڵتەیەك بوو لە لات

زۆری پێ نەچوو مامی مرد و فەرمانڕەوایی پالەوی دەست کەوت.

جەمشید بەگ پیاوێکی دنیادیتە و بە گەرم و ساردی ژیان ئامێتە و خاوەن ئەزموون و بەرچاو ڕوون بوو. کاتێ کە گەورەپیاوان و خاوەن ناوانی کوردستان هەستان و چوونە ژێر سایەی ئاستانەی سوڵتان سەلیم خانەوە، ئەویش وێڕای ئەوان قوڵقەی کۆیلەیی سوڵتانی ناویراوی بە گوێچکانەوە کرد و کۆڵوانەی فەرمانبەری بە شانەوە گرت.

بە کۆمەگی سوڵتان و بە زۆری بازوانی خۆی، هێرشی بردەسەر عەرەبشای تورکمان، کە لە لایەن ئێرانەوە بە گزیری لە سەر پالەو دانرابوو؛ پارێزگاری ئەوێی پێ سپێرابوو. چەند جارێك زۆر مەردانە دەگژ قزڵباشان ڕاچوو؛ دەستی لێ هەڵنەگرتن هەتا لە پالەوی دەرکردن و زێدی باب و باپیرانی خۆی ساندەوە و حوکمی لێ دامەزراندەوە.

چیرۆکێکی سەیر لەو ڕۆژگارەوە دەگێڕنەوە. گوایە لە شەڕێکی نێوان کورد و تورکماندا پیاوێکی جەمشید بەگ شیرێکی وەبەر سەری دەکەوێ، لایەکی قاپێلکەسەری دەپەڕێ، نیوەی مێشکی بێ سەرپۆش دەمێنێتەوە. برینپێچان تەڵەزمە کوولەکەیەکی بە لاسەریەوە دەنووسێنن و بە هەتوان و شەڵتە پنجی دەکەنەوە و لە پاش ماوەیەك کەللە و کوولەکە بەسەر یەکدا جۆش دەخۆن و درز نامێنێ

و گۆشتەزون دێنێ و پێستی بەسەر دەکشێتەوە و بە کەللەی ئێسکی کوولەکەبەندەوە ئەوەندەژیاوە کە چەند منداڵێکی دیکەشی بەرهەم هێناوە. ئەم چیرۆکە ئەگەرچی نەدەشیا لێرەدا بنووسرێ، بەڵام باوی مێژوونووسانی دەسترەنگین وایە؛ ئەگەر تووشی ڕووداوی سەرسووڕێن بن، بە سەریدا باز نادەن. منیش دامە سەر ڕچەی ئەوان و چاوم لەوان کرد.

جەمشید بەگ بە زیرەکی خۆی توانییە میر ووەزیرەکانی عوسمانی بە لای خۆدا بێنێ و خۆی دەگەڵ کاربەدەستە بەرزەکانی وڵاتدا زۆر ڕێك خستبوو؛ دۆستایەتی دەگەڵ بەستبوون. وای لە خۆی کردبوو کە پادشاهانی خاوەن شکۆ و سوڵتانانی پایەبڵند بە دڵ و گیان هۆگری ببوون و بڕوای خۆیان خستبووە سەر و بە دڵسۆزی هەرەڕاستیان دەزانی.

سوڵتان سولەیمانی خەزاکەر چەند جارێك کە بۆ گرتنی ئێران بە کوردستاندا ڕادەبرد، بۆ هەمدەمی و ڕاوێژکەری سوڵتانی -زیاد لە هەموو کوردان- هەر جەمشید بەگی پەسند دەکرد و دەگەڵ خۆی دەبرد.

هەرچی دەکەی و دەڵێی پەسندە　　شاکار و کرت دەلال و ڕندە

هەر وەك سەدەفی ڕواڵەتت کڕ　　قاپێلکی دڵ و دەروون لە دوڕ پڕ

هەرچی لە دەمی جەمشید بەگ دەرچووبا بە دڵی سوڵتانەوە دەنووسا و هەرچی بە دڵ بە شاواتی بخواستایە لە دەمی پادشاوە بە فەرمان دەردەکەوت. بەو دەسەڵات و شیرین بوونەشی، خۆی لە لای خەڵك و خوا خۆشەویست کردبوو؛ خێرخواز و دەست و دڵواز و زۆریش حەنەکبێژ و جەفەنگباز بوو. دەوڵەت و داهاتیشی دەژمار نەدەهات. لەو ڕۆژگارەدا ئەو نەغدینە و ماڵ و پاتاڵ و ئاژاڵە کە جەمشید بەگ بوویە هیچ حاکمە کوردێك نەیبووە.

دەڵێن هەموو ساڵێ سێ هەزار تەگە و خەرتی سێ ساڵەی دێنا و هەر یەکە ناڵە ئەسپێك یان ناڵە ئێسترێکی دەمل دەکردن و بۆ بازاڕی حەڵەبی دەبردن و لە بەرچاوی کڕیارانی ڕادەنان و بە ناڵەوە دەیفرۆشتن کە هەر ناڵەکان سەنگی چلخەڵواری وشتری دەبوون.[1] ساڵانە دەهەزار مەڕی سەر کاسەی

---

١- خروار بە فارسی و خەڵوار بە کوردی سێسەد کیلۆیە. جا بەو پێیە یان دەبێ چلەکە چوار بێ یان سێهەزارەکە سێهەزار بێ؛ دەنا دەرینایەنێ! هەژار



دەبوو؛ بەو پێیەش ماڵی بەرجووت و ڕەشەوڵاغ و بەرزەپێ لێك دەرەوە! کە دەبێ چەندی بووبێ؟

قەڵا و فێرگەیێکی ئایینی لە پالەو دروست کردووە و لە سەرچاوەییێکی زۆر دوورەدەستەوە ئاوی بۆ قـەڵا و شـارەکە بـردووە. لـە شـوێنێکدا کـە نـاوی دەمرقـاپوو (دەرگائاسـنە)یـە، کاروانسـەرا و میوانـخانەیێکی زۆر گوشاد و بەرفرەهی درووست کـردووە؛ کـە هاتوچـۆکەران لـە زسـتان و هاویـنـدا بەهرەی لیٚ دەبینن.

تەمەنی لە سەتی تیٚ پەڕاند و شێست ساڵان فەرمانڕەوایەتی کرد.

لە سوڵتان سولەیـمانخانی خەزاکەرەوە فەرمانێك دەرچووە کە دەبێ پالەو هەتا هەتایـە، سـەدەلە دوای سەدەو بەرەباب بە شوێن بەرەبابدا بە دەست کوڕ و نەتەوەی جەمشید بەگـەوە بێـت و هەرکـەس ئەم فەرمانە پێك نەهێنیٚ بەر لەعنەتی خوا کەویٚ.

هەر بە زیندی سەری خۆی حوسێنجانی کوڕی کردبووە جێنشیـن. لـە ئەنـجامدا لـە کەپرۆکـەی ناهەمواری مایەی شەکەتی و ڕەنج بەخەساری دنیا، گوێزتیەوە خانووی یەکجاری و کەوتە بەر بـەزەیی پەروەردگاریەوە.

| | |
|---|---|
| چلـۆن دڵ بە ژینی جیـهان خۆش دەکەی؟ | چلـۆن بیـری مـردن فەرامـۆش دەکـەی؟ |
| جیـهان چەشـنـی کاروانسەرای دوودەری | لە یەك دەچیە ژوور، دەچیە دەر لەو سەری |
| گوڵـی گـەش هەتـا پەلك و پەڕ دەردەکا | دەبیـنی کـە زەردە و خـەزەڵـوەر دەکـا |

جەمشید بەگ پێنج کوڕی لە پاش بەجیٚ مـان: حوسـێنجـان، حەسـەن، هـەمزە، تەیـموورتاش، دەوڵەتشا.

حوسێن و حەسەن سەریان بە فەرمانڕەوایی گەیشت و لە دوایە باسـیان دەکـریٚ. هـەمزە بـەگ لـە خرتوپرت (متفرقات)ی دەرگای پادشادا، بە مووچەی سـاڵانەی دەهـەزار ئاقـچە، پلـەی زەعامـەتی پێدرابوو؛ بەڵام چونکە دڵی باوکی ڕەنـجاند، ناوی لە خانـەدان سـڕایەوە و دەرکـرا. لـە پـاش مردنـی هەمزە، ڕوستەم بەگی کوڕی لە لایەن مستەفا پاشای سەردارەوە بەڵێنی وەرگـرت کـە ئەگـەر دەگـەڵ عوسـمان پاشادا بچێتە پاراستنی شیـروان، فەرمانڕەوایی پالەوی دەداتیٚ؛ بەڵام لە شـەڕی شـەماخیٚدا -کە دەگەڵ ئەرەسخان کرا- بە دەستی قزڵباشان کوژرا و نەگەڕاوە.

تەیموورتاش -کە چوارەمین کوڕی جەمشید بەگ بوو- لە زەمانی باییدا بە سەر خەرپووت ڕادەگەیشت و هەر زۆر زوو مرد و دوو کوڕی هەبوون بە ناوی ئەڵڵاوێردی و ئەسیل.

دەوڵەتشای کوڕی پێنجەمی هەر لە ڕۆژگاری باوکیدا ساڵێ چلهەزار ئاقچەی مووچە بۆ بڕابۆوە و لە خرت و پرتی پادشاییدا (متفرقگی) بە زەعامەت [!] دامەزرابوو. ئەویش لەو زووانەدا مرد و دوو کوڕی بەجێهێشتن: یوسف و ئەحمەد.

## حوسێنجان بەگ کوڕی جەمشید بەگ

جەمشید بەگ هەر بە زیندی سەری سەروەری وڵاتی پالەوی دابووە دەست حوسێنجان و فەرمانی بەرزی سوڵتان سولەیمان خانیشی بۆ وەرگرتبوو کە جێنشین بێ. لە پاش مەرگی جەمشید بەگ، حوسێنجان بە سەربەخۆیی لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی پالەو پاڵی داوە و لەوە بەولاوە لەو ناوەدا کەس نەیتوانی بڵێ ئەزم.

مەزنێکی دڵودەروونپاك و بۆ هەموو کەس چاك و بۆ بێچاران بە تایبەتی باب و كاك بوو. ئاشنا و بێگانە خۆشیان دەویست و قسەیان لێ دەبیست. ئاوازەی چاکە و پیاوەتی هەر بە کوردستانەوە نەوێستا؛ عیراق و حیجازیشی تەنیەوە و لە بەخشندەییدا حاتەم ورکەنانی لەبەر خوانی ئەو دەچنیەوە. دوای ئەوەی بەرگ و باری قیامەتی ساز داو ڕووی کردەبارەگای خوای بێ نیاز، دوو کوڕی هەبوون: مەحموود و حەسەن بەگ.

مەحموود شێتوپەتیارە بوو؛ بە کاری دنیاداری نەدەهات؛ هۆزەکانی پالەو ئەویان هەڵبوارد و مەزنایەتیەکەیان بە حەسەن بەگ ئەسپارد.

## حەسەن بەگ کوڕی جەمشید بەگ

لەسەر هەڵبژێرانی لە لایەن هۆز و خزمانیەوە و بە پێی فەرمانی سوڵتان مرادخان، کرا بە فەرمانڕەوا و سێساڵان زۆر بە لێزانی و دڵسۆزی فەرمانڕەوایی پالەوی کرد و ساڵی ٩٨٦ك (١٥٧٨ز) -لەو دەمانەدا کە مستەفا پاشای سەردار لە شیروانەوە دەگەڕاوە- حەسەن بەگ مرد و دوو کوڕی لە پاش بەجێ مان: سولەیمان و موزەففەر بەگ.

## سولەیمان بەگ کوڕی حەسەن بەگ

مستەفا پاشای سەردار، سولەیمانی کردەسەرداری پالەو. محەمەد پاشای گەورەوەزیریش لەسەر چەند مەرجێك دەگەڵ یوسف بەگ کوڕی دەوڵەتشای جەمشید بەگدا ڕێك کەوت و لە ئاستانەی بەخت هێلانەی سوڵتان مرادخانەوە فەرمانی پالەوی بۆ ساند. چەندساڵێك لە ناو ئەو دوو خزمانەدا شەڕ و هەرا بوو. لە هەردووك لاوە گەلێك لاو کوژران و خوێنێکی بێداد ڕژا.

خەڵکی پالەو لاگیری سولەیمان بەگ بوون و یوسفیان بە دزێو دەزانی؛ ئەگەرچی یوسف لەو شیرینکوڕانە بوو دەبوو بیبژێری. لاوێکی زانا و ڕووناکبیر و بە ڕاوتەگبیر و هێمن و لەسەرخۆ و نەرم و نیان و مەند و مەرد و ڕەند بوو. بەڵام دەڵێی چی؟

جیهان ڕووی لە خوێڕی وکەر وناکەسە  که تۆ تێدەگەی، ئەم گوناهەت بەسە

زۆری ئەولاوئەملا کرد و بە ناچاری لە دەرکی نامەردانی داو دەستیان بە سنگیەوە نا و چونکە شتێکی وای نەبوو چاوی چاوچنۆکان پڕ بکا، لە دەرك و دیوانان ڕێگەی نەدەدرا؛ لە داخان دایە باری باریکی و ڕۆژی ژیانی تاریکی بە سەردا هات و بە مردن لە نەهات ڕزگاری بوو.

لە پاش مردنی یوسف-هەر بە هەمان مەرجی پێشوو- بەڵێنی پالەویان بە ئەحمەدبەگی برای دا. ماوەیەکی زۆریش ئەحمەد بەگ بەربەرەکانی سولەیمانی کرد و لە ناو دۆستانی ئەو دوو دوژمنانەدا شەڕ و کوشتاری زۆر قەوما؛ بەڵام زیرەکی و کۆشایی کە بەخت و هاتی دەگەڵ نەبوو، بەهرەیەك نادا:

زۆر هەیە زۆر گێلە ستێرەی گەشە  هەیشە گەلێك زیرەکە بەختی ڕەشە
کوێرە لە تاریکیە هات و نەهات  کۆش و لەپی پڕ لە گوژاڵك و نەبات
نسایەتە بەر چاویەوە میر ونەوێر  زۆری فسۆس گوێچ دەرفێنن لە شێر

ئەحمەد بەگ زۆری کرد و کۆشی، بەخت ڕووی خۆی لێ داپۆشی و لە ئەنجامدا بە هومێدی ئاوڕوێدانەوەی سوڵتانەوە ڕووی کردەئەستەنبووڵ و هەر لەوان ڕۆژانەشدا نەخۆشی ڕشانەوەی تووش هات و تووشی گۆڕستانی کرد. ئیتر مەزنایەتی پالەو -بەبێ بەرهەڵست- بۆ سولەیمان مایەوە.

## دەستەی سێهەم
# فەرمانڕەوایانی چەرموگ

گوتمان میرمحەممەد قەڵای بردنج و ناوچەی چەرموگی دابە میرحوسێن و هێندێك بە کوڕی میرمحەممەدی دەزانن و بڕێکیش هەر بە خزمی دادەنێن.

میرحوسێن سەردەمێك مەزنایەتی چەرموگی کردووە و مردووە و کوڕەکەی جێی گرتووە.

## میرسەیفەدین

بۆتە جێنشینی میرحوسێن و کە ئەویش لە دنیا کۆچی کردووە و لە بەهەشت نیشتەجێ بووە:

## شایوسف

بە میراتی شابووە و ئەویش ماوەیەك مەزنی چەرموگ بووە و مردن بەریینگی گرتووە.

## وڵات بەگ

وڵاتەکەی دەست کەوتووە؛ کە ئەویش بەرەو مەڵبەندی مردووان باری کردووە:

## شاعەلی بەگ

قۆڵی لە سەرداری هەڵماڵیوە؛ لە پاش ماوەیەك ئەویش بەرگی ژیانی داماڵیوە و لە دنیا نەدیو بووە،

## ئەسفەندیار بەگ

ئەسپی لە مەیدانی مەزنایەتیدا تاو داوە و کاتێ ڕوستەمی مەرگ تیری لە چاو داوە و لە ئارادا نەماوە،

## بایەندورِ بەگ

باوی بووە و جیٚنشینی باوی بووە و کە دەستی مەرگ خاوی کردۆتەوە و مەزنایـەتی جـیٚ هیٚـشتووە، فەرمانڕەوایی چەرموگ بە مـحەمەد بەگ گەیشتووە.

## مـحەمەد بەگ

کە ناوی مەزنایەتی لیٚ نراوە، لەو دەمەدا چەرموگ لە لایەن قزلّباشانەوە داگیـر کـراوە. مـحەمەد بەگ قزلّباشی لیٚ دەرپەڕاندن و مەزنایەتی باب و باپیـرانی وەگیـر خۆی هیٚناوە.

لە پاش گیـرانی دیاربەکر، لە لایەن سولّتان سەلیمخانی خەزاکەرەوە فەرمانی پیـرۆزی بۆ دەرچـوو کە ناوچەی چەرموگ بۆ ئەو خانەدانە بیٚ؛ بەلاّم مەرجیش ئەوەیە داهاتی فەلەکانی ئەو ناوە دەبـیٚ بـە دیوانی دیاربەکر بگات و هەموو سالیٚ دەیـخەنە ناو خەزیٚنەی دیاربەکرەوە.

ئیٚستا مەزنایەتی چەرموگ وا بە دەست مـحەمەد بەگەوە.

# بەندی سێهەم

## فەرمانڕەوایانی ساسۆن

### کە لە پاشان بە ناوی حەزۆ ناسراون

چیرۆکوانی وتارزانی ئاستانی ڕاستان و پێشەنگان و ئالاّ بە دەستانی داستانی زۆر بە داب و دەستوور، لە سەر ئەو مەبەستە سوورن کە ڕەگەزی کۆنی فەرمانڕەوایانی ساسۆن و پادشایانی ساسانی، هەر لە یەك تۆ گووراون و هەر لە بنجێك ڕواون و پاراوی یەك دەراون. هیچ گومان و سۆشی نیە خانەدانی ساسۆنی و میرەکانی بدلیسی، پشتی پێشوویان کیسرا بوون و لە یەك هێشوو چنابوون و لە دوارۆژدا لێك جیا بوونەوە. ئەو دوو ماڵە لە دوو برا کەوتوونەوە: عیززەدین و زیائەدین.

ئەو دوو برایە لە پاتەختی ئەرمەنەوە -کە ئەوساکە ئەخلات بووە- دەرچوون و هاتوونە بدلیس و قەڵای ساسۆنیان لە «تاویت» ناوێکی گورجی گرتووە و عیززەدینی بە سەر ڕاگەیشتووە.

درێژەی ئەم باس و خواسە لە بەسەرهاتی فەرمانڕەوایانی بدلیسدا دەخەینە بەر چاو.

چونکە کورد بە عیززەدین دەڵێن عیززین، ئەو فەرمانڕەوایانە بە عیززانی ناسراون[1] بە شوێن ئەو بارەبارەدا گەلێك لە هۆزی ڕۆژەکی چوون و لەو ناوە مانەوە و هۆزی نیشتەجێی کەوناراش چوارن: ١- شێرۆیی[2] ٢- بابوسی ٣- سوسانی ٤- تەموقی. کاتێکیش ناوچەی ئەرزەن[3]یان گرت، هۆزەکانی خالدی و دێرمغاری و عەزیزان و هی‌تریش هاتنە ژێر فەرمانیانەوە.

فەرمانڕەوایانی ساسۆن دەناو پیاوە مەزنەکانی کوردستاندا بە بەخشندەیی و سەربەرزی بەناویانگن و لە ڕۆژی هەرا و هەنگامەشدا ناو هەر ناوی خۆیانە و هەمیشە دەگەڵ خونکار و دەسەڵاتدارە زۆر زەلامەکاندا بە دۆستایەتیان ڕابواردووە. پادشایانی ئاققۆینلووی تورکمانی و قزلباش و

---

١- لە نوسخەیەکدا عیززدین نووسراوە. عەونی

٢- لە نوسخەیەکی دەستنووسدا شیرویێی. عەونی

٣- شارێکی زل و قایم بوو لە باکووری ڕۆژاوای وان. جەمیل

عوسمانی -کە هێرشیان بۆ کوردستان کردووە- دەستیان بۆ مەزنەکانی ساسۆن نەبردووە و بە خۆڕێکخستن و نەرمونیانی لە دەستیان خەلستوون و بگرە زۆریش ڕێزیان لێگرتوون.

یەکەم کەسێکی لەو فەرمانداارانە ناوی بە کاری کەوتۆتە سەردەم و زارانەوە، میرنەبوویەکرە؛ کە دوو کوڕی زۆر بە کردەوە و ئاکارچاکی بووە و ناویان: خدر بەگ و عەلی بەگ بووە.

## خدر بەگ کوڕی میرنەبوویەکر

لە پاش مەرگی میرنەبوویەکر، خدر کرا بە جێنشین و کاتێ کە پەلکی سەوزی ژیانی بە سۆزەی شەختەی مەرگ زەرد هەلگەڕا و سەرچاوەی زیندەگانی وشکاوی هات -چونکە هیچ نێرینەی نەبوون- برای کرایە جێگری.

## عەلی بەگ کوڕی میرنەبوویەکر

لە پاش نەمانی خدر بەگ بە قۆڵ لە سەرکێشانی هۆز و تیرەکانی ئەو ناوچە و مەڵبەندانە، جێگەی باپیری گرتەوە. عەلی بەگ پیاوێکی بادەنۆش و دڵتەر و سەرخۆش و تەرپۆش بوو؛ هۆشوبیری هەر لە دەوری بەڵەکچاوان و بەژنزراوان خولیدەخوارد و دڵ و دینی بە بادەو مەیگێڕی سادەئەسپاردبوو؛ هەمیشە دەدڵی خۆیدا بە زەمزەمە دەیگوت:

ڕەزان پاراوکە هەوری خاکەلێوە! چت لە دەریایە؟ دڵۆپێك مەی هەزار خەڵوار و بار مرواری هێژایە

کوولەکەی بادەی ئاڵ ببووە کوولەکەی گیان و کۆڵەکەی ژیانی و ماچێکی دیم و ڕووئاڵانی، لە گەنجی ئاروون و قاروونان بە چاکتر دەزانی. کۆڕی قسەی خۆش و بە پێکەنین و بزە و چزەی کەبابی مەزەی بەلاوە لە دیتنی مزگەوت و بیستن لە مەلای مێزەر بەسەر پێ خۆشتر بوو.

لەو کاتەدا کە میر ومەزنەکانی کوردستانی -بۆ خۆ نزیك کردنەوە- چوونە لای شائیسماعیل و زۆربەیانی گرت و وڵاتەکەیانی داگیرکرد، شاعەلی بەگی بەدڵەوە نووسابوو. ئەوی عەلی بەگ ڕەچاوی کردبوو هەر ئەوەش ڕەفتاری شابوو. بەو هۆیەوە لە چنگ گیرۆدەبوون خۆی ڕەها کرد و تەنانەت بووش بە هاونشین و هاوپیاڵەی شا. شەو و ڕۆژ لە ژووری تایبەتیدا دەگەڵ شا و شایانی بەردەمی شادا مەست و پیاڵە بە دەست نۆشانۆشی بوو؛ بە سەرخۆشی ڕایدەبوارد.



عەلی بەگ دەگەڵ شەرەف بەگی بدلیسدا زۆر ئاشنا بووە و شەرەف بەگ کچی ئەوی هـانیوە و بـە چاوی باب و فرزەندی لە شەرەف بەگی ڕوانیوە.

عەلی بەگ هەر لە تەورێز بادەی مەرگی لە دەست فریشتەی خوا فڕ کـردووە و کـە مـردووە سـێ کوڕی هەبوو: مـحەمەد بەگ، خدر بەگ، شاوەلی بەگ.

## خدر بەگ کوڕی عەلی بەگ

کە عەلی بەگ لە تەورێز بوو، مـحەمەد بەگی کوڕی دەگەڵ بـوو. هـۆز و خزمـان -کـە بـە مردنیـان زانـی- بـە تێکڕایـی خـدر بـەگیان بەگـەورە هەڵبـژارد و مەزنایـەتی ساسـۆنیان پـێ سـپارد؛ بـەڵام شائیسماعیل فەرمانی ساسۆنی بۆ مـحەمەد بەگ دەرکرد. سەرئەنـجامی بەسەرهاتی ئـەو دوو برایـە لە داهاتوودا دێ. شاوەلی بەگیان هێشتا بابی مابوو بە جوانەمەرگی کۆچـی لـە دنیـا کـرد و ئێـستا کوڕێکی ماوە ناوی دیادینە.

## مـحەمەد بەگ کوڕی عەلی بەگ

کە زانی هۆزەکانی ساسۆن خدر بەگیان بە گەورە داناوە، چاری هەر لەوەدا دی کـە بـە خـۆی و چـەند کەسێك لە دەست و پێوەندانەوە پەنای بردەبەر سوڵتان سەلیمخان. لە کاتێکـا کـە سـوڵتان بـە نیـازی گـرتنی قـاهیرەی میـسر کەوتـە ڕێ، مـــحەمەد بـەگیش وێـڕای بـەخت و هـات، دەبـەر ئـاوزەنگی دوژمنڕەتێنی سوڵتاندا بوو.

لە شەڕی چەرکەساندا زۆری گیانبازی کرد و تەنانـەت ئـەو ڕۆژە کـە چـەرکەس شـکان و لاشـەی کوژراوان بەسەر دەکرانەوە، کە لەشی مـحەمەد بەگیان بە زامداری و کەلەلایی و بگرە بـێگیـان یـان نیوەگیان دەناو کوژراواندا دیتەوە، وەزیران و سەرداران ئـەم ڕووداوەیـان گەیاندەسـوڵتان و فەرمانیـدا بژیشك و لوقمانیان لێ کۆکردەوە و پێداویستی دەرمانیشی لە خەزێنەی دارماڵ درا. وەزیرانی پایەبەرز گوتیان ئاواتت چیە بیدرکێنە تا بۆتی پێك بێنین؟ ئەویش دڵخوازی ئەوە بوو کـە والیـەتی ساسـۆنی بدەنێ و ئەرزەنیشی بۆ بـخەنە سەر؛ کە لە سەر ئەرزەن دەمێك بوو دەگەڵ میـرانی حەسـەنکێف هـەر



هەرا و مشتومڕیان بوو. وەزیرانی پایەبڵند هەموو دڵخوازیان پێك هێنا و فەرمانی بێلام و جوومی بۆ دەرکرا. خدر بەگ هەر بە خۆشی خۆی دەستی لە ساسۆنێ بەردا و کارێکی لە ولاتی حەزۆ پێ سپێرا و ماوەیەك لەوێ مایەوە ئەوسا لە ژێر نوێنی خاکا حەسایەوە.

خدر بەگ چوار کوڕی لە پاش مان: سولتان مەحموود، ئەحمەد، یەعقووب، محەممەد.

سولتان محەممەد بە مردنی خۆی مرد و یاقووب بەگ ساڵی ۹۹۲.ك (۱۵۸٤.ز) نزیك بە کلیسای موخران -کە لە نزیك تفلیسە- لە شەڕی قزڵباش و سماعونی گورجیدا شکا و لە گەڕانەوەدا لە دەربەندی تومانس کوژرا.

بەڵێ محەممەد بەگ بوو بە فەرمانڕەوای سەربەخۆی ساسۆن؛ بەلام مەلیك خەلیل -فەرمانڕەوای حەسەنکێفێ- ناوچەی ئەرزەنی نەدایە و قەلاکەی دەسکاری و قایم کرد و دژداری لێ دانان کە بیپارێزن.

محەممەد بەگ بە یارمەتی شەرەفخانی بدلیس و شاعەلی بەگی والی جزیرێ، لەشکری بردەسەر و قەلای ئەرزەنی خاپوور کرد و مرۆڤی مەلیك خەلیلی لە ئەرزەنێ دوور خستنەوە. پاش حەڤدەساڵ فەرمانداری کردن، فەرمانی مردنی بۆ هات و قەلای ژینی ویران کرا و لە بن توێی ئاخدا دامەزرا.

شەش کوڕی بوون: سولەیمان بەگ، بەهائەدین بەگ، سارۆخان، خانبوداغ بەگ، حوسێن بەگ و عەلی بەگ. سێ کوڕی- یەك لە دوو یەك- مەزنایەتیان کرد و لە حوسێن بەگ حەسەن بەگ ناوێك مابوو. لە پاش کوژرانی سارۆخان -کە محەممەدی کوڕیان کردبووە جێنشینی- ئەو حەسەنە بەریینگی محەممەد بەگی گرت و هەر کەسە بۆ لای خۆی ڕاکێشاو محەممەد بەگ هاواری بۆ فەرهاد پاشای سەردار نارد و ئەویش حەسەن بەگی گرت و دایە دەست محەممەد بەگ و ئەویش بە سێ کوڕانەوە لە ناوی برد.

بوداغ بەگ مرادخان ناوێکی لە پاش بەجێ ما و لە سەفەری گورجستان بێسەروشوێن چوو. مرادیش دوو کوڕی ماوە بە ناوی بەهائەدین و بوداغ. عەلی بەگ هەر لە ڕۆژگاری بابیدا مرد و کەسی لە پاش بەجێ نەما.

## سولەیمان بەگ

### کوڕی محەمەد بەگ کوڕی عەلی بەگ

ساڵی ٩٢٧.ك (١٥٣٠و٣١.ز) لەسەر فەرمانی بەرزی سوڵتان سولەیمانخان، کرا بە جێنشینی بابی و فەرمانڕەوایی ساسۆنی درایە. ناوچەی ئەرزەنیش کرا بە مووچەی بەهائەدین بەگی برای.

سولەیمان بەگ زۆر بەوەج و سەنگین و گران و خۆگر و ئاکار ڕەنگین بوو؛ لافی پادشایانی لێدەدا. بەوپەڕی سەربەرزی و چاوتێریەوە ژیاوە و هەرگیز سەری بۆ هیچ ئافەریدەیەك نەچەماندووە و لە دەهندەیی و نان بدەییدا لە هەموو کەسی تێپەڕاندووە.

کاتێ کە سوڵتان سولەیمانخان بەغدا و بدلیسی گرت و لە دەربەندی کیغندورەوە تێپەڕی و خێوەتی عاسمان ڕووشێن و بارەگای زەوی لەرزێنی لە دەشتی ئەرزەندا لێدا و لە سامی ئەو سامدارە، باڵدار باڵی دەوەراند و ناڵدار ناڵی دەپەڕاند و کەژ و کۆ -لە ترسانی- سەریان دەبەرخۆ نابوون و ئەستێرەی عاسمانان بە سەرسامیەوە تێوە ڕامابوون، سولەیمان بەگ هەر مووشی لێ نەبزووتن و گنج مانابێ نەیهاتی و مینا تۆڵا پۆڵایەك لە ساسۆن ما و تەکانی نەخوارد و ئازووقە و بژیوی لەشکری نارد و بەخێر هێنانی بە ڕاسپاردن ڕاسپارد و خۆی نەهاتە سەردەرانە ڕامووسان و بە دەست و پەلدا نووسان. تەنانەت نەیهێشت کە شەمسەدین بەگیش ڕوو بکاتە مەلاتیا.

سولەیمان بەگ پیاوێکی تەڕ و دڵ بە دنیا خۆش و خۆشگوزەران بوو؛ هەر بە زیندی سەری -بەر لەوە سەری ئاوابێ- بەهەشتی خۆی ساز دابوو. هەموو دەم و ژەمێکی دەگەڵ بادەی پیر و سادەی جواندا ڕادەبوارد و لە هەموو سات و کاتاندا کولمەسۆر و مل بە مۆری وەك فریشتە و پەری و هۆری دەوریان دابوو. لێوی شیرین و ئاڵی دەمژی ومەی دێرین و تاڵی فڕ دەکرد. تاوێك بێیار و خەمڕەوێنی شۆخ و شەنگ و دەلال و چەلەنگی بەسەر نەدەبرد و گاوێك دوور لە دەنگی قاقا و ساز و سەمتوور و دەف و بلوور هەڵی نەدەکرد. هەروا بەکامەرانی ڕایبوارد تا لە ئەنجامدا بە نەخۆشی خوروێلکە فەرەنگی، دنیای بەرچاو تەنگی بەجێ هێشت و کەسیشی بۆ جێنشین لە پاش خۆی بەجێ نەهێشت.

بڕوانێ لە ژین و سەرئەنجامەکەی　　سەرەوژێری کردن جەم و جامەکەی

بەهاری ژیان پاییزی مەرگی هەس　　هەتا سەر خودایە دەمێنێت و بەس

## بەهائەدین کوڕی محەمەد بەگ

لە پاش مەرگی برای -بە فەرمانی بەرزە نیشانی سوڵتان سولەیمانخان- لە جێگەی سولەیمان بەگ لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی ساسۆن دامەزرا. فەرمانەکەی بە ناوی فەرمانڕەوای حەزۆ نووسراوە.

بەهائەدین پیاوێکی سەرسۆفیلکە و ئامالدێوانە بووە و زۆریش دڵاوا و دەست بڵاو و ئازا و نەترس بووە. لە ڕۆژگاری سولەیمان بەگدا چیان لە ئەرزەن نەدەدایە و لە باتیان سەدهەزار ئاقچە لە دەرامەتی ناوچەیەکیتر وەردەگرت. وڵاتی خۆی بەجێ هێشتبوو؛ پازدەساڵان جار بە سواری و جار بە پیادەیی، دەبەر ئاوزەنگی هەمیشە لە سەری سوڵتاندا لە ئەستەنبووڵ خەریکی ڕاووشکار دەبوو. سوڵتان سولەیمان ناوی لێ نابوو«دەلوو بەهائەدین»[1]. هەمیشە بەسەری دەکردەوە و بەخشش و خەڵاتی شاهانەی دەدایە. هێندێك جاران لە سوێرەك میرلیوا بووە و بە سەر جێگەیتریش ڕاگەیشتووە؛ بەڵام دەست بڵاویەکەی کاری لەوەیدا نەبووە. ئەگەر یەکێك کوڵپووشکەی بۆ هێنابێ، کۆشکی بە پاداش داوەتێ و لە بەرانبەر پشیلەیێکی پێشکەشی، وشتری لۆکی دەبەخشی. ئیتر چاوچنۆك و خوازەلۆك و نانی- نانی و چەورە و لات و زمان لووسان -کە ئاسیان چەندەساویلکە و لە باران خۆشبار هاتووە- دەوریان لێداو سەریان پێچا و هەر یەك بە جۆرێك دەیدۆشی و شتی لێ دەکێشایەوە. ساڵانە دۆڕی شێست هەتا حەفتا هەزار فلوری زێڕ هەر دەرامەتی حەزۆ بوو؛ بیست هەزاریشی لەم و لەو بەدەستەوا وەردەگرت و هێشتا بەرگەی نەدەگرت و لەشکری گەدا و دادۆشان هەروا لە زێدەبووندا بوون. کاتێ کە مرد سیهەزار فلوری وامی بێجێگەی بۆ میراتگران بەجێ هێشت.

تۆ کە بەخشندەی ببەخشە لە بوود     مەیکە بە کڵاوی ئەحمەد و مەحموود

پێنج کوڕی هەبوون بەڵام قەرزداری و نەداری بابیان لە پەروپۆی کردنەوە و لێشیان نەدەوەشاوە ببنە فەرمانڕەوا. بۆ چەند ڕۆژێك سولەیمان بەگی کوڕی ناوی حاکمی حەزۆی لێنرا. دوایی درا بە ساروخانی برای.

بەهائەدین پتر لە سی ساڵ مەزنایەتی حەزۆی کرد و کوڕەکانیشی نێرینەیان لێ نەکەوتەوە.

---

١- دەلوو بەهائەدین: بەهائەدینە شێتە.

## ساروخان بەگ کوڕی محەمەد بەگ

هەتا بەهائەدین بەگ لە سەر دنیا بوو، ساروخان بەگ لە حەزۆ ئاوارە و هەڵوەدا ببوو؛ بە دەربەدەری و خاکەسەری دەژیا. جار بە جارە بارگیری یان شیسروی یاخۆ کسان یان مووش یا سوێرەکی لە دیوانی پادشاوە بە زەعامەت پێدەدرا و مووچەی ئەوی لێدەدرا و زۆر جاریش بە بەرهەڵدایی دەسووڕایەوە و کەس ئاوڕی وێ نەدەدایەوە. جا وەك دەڵێن: «مەرگی کەر بۆ گورگ خەنەبەندانە»، لە پاش هەژدەساڵ بە کلۆڵی ژیان، کە بەهائەدین لە گڵدا خەوت، بەختی ساروخان لە خەو ڕاپەڕی و پەنای بە ئاستانەی سوڵتان سەلیمخان برد. خوالێخۆشبوی بەهەشتی محەمەد پاشای وەزیری زانا و بەڕاوتەگبیر، کە وەك شیسری جەوهەردار و زێڕی تەواو عەیار و چاوەدیری نەجیمزادە بێخودانەکان و لایەنگری کەونە خانەدانە ئاوەدانەکان بوو،

هەزار ئافەریم بۆ وەزیری وەها   گرێی کاری ئاڵۆزی کردن ڕەها

دەماودەم بیستبوویەوە کە بەهائەدین لە زەمانی ژیانیدا هەمیشە دەیگوت: کوڕەکانم بۆ ئەوە ناشێن کە فەرماندار بن و تێیان ڕانابینم کە بتوانن لە سەر کار بن؛ هەر چەندەحەسەن پاشای میری میرانی دیاربەکر -کە فرزەندی دڵبەندی خودی ئەو وەزیرە هونەرمەندەش بوو- لەبەر باوکی پایەبەرزی خۆی پاڕایەوە کە سولەیمان بەگی کوڕەگەورەی بەهائەدین بکرێتە جێنشین، ملی نەدا و گوێی پێ نەدا و شانی لێ هەڵتەکاند. فەرمانی حەزۆی بۆ ساروخان ساند و بە خەڵاتی شاهانەی لاواندەوە و لە سەر کورسی فەرمانڕەوایەتی دامەزراند. ماوەی پێنج ساڵ زۆر بە دادگەری و گەلپەروەری مەزنایەتی کرد و چونکە فێرە تریاككێشان ببوو، تووشی چەند نەخۆشیەکی دەبنەوەبڕ و حەستەم هاتبوو. ئەویشی لێ ببوونە سەرباری دەردی تریاك بەباکردنی.

لەو کاتەدا کە لەشکری هەمیشە لە سەری پادشاهی، بە سەرداری مستەفا پاشابەرەو شیسروان و گورجستان ڕەوانە کرابوو، ساروخان بەگیش ڕەگەڵ کەوت و لە شەڕی چاڵدیراندا ئەویش دەگەڵ لەشکری دیاربەکر و کوردستاندا پێشەنگی سوپای ئیسلام بوو؛ کە لە پرونەکاو لە گاوی ڕۆژپەڕدا قزلباشان وەك باشووی ئاکام لوریان بوونێ و تێیان ڕۆهاتن و چەرمیان کردن و لە ناویان بردن و ساروخانیش وێڕای ئەوان دەستەملانی مردن بوو. محەمەد بەگی کوڕی لەو دروچڕەدا خۆی کووزووو کرد و بە هەزار

پەلەپرووزە لە چنگ مردن خەلەست و کەولّی خۆی دەرباز کرد.

لە پاش پرسە و سەرەخۆشی و شکاندنی ئازیەتباری و ڕەشپۆشی، لە جێی باوکی دانرا. کوڕەکەی دیکەی -کە ناوی عەلی بەگ بوو- هێشتا هەر لاوێکی دەمڕووت بوو کە مردن کردیە قەرەبرووت و بە جوانەمەرگی سەری نایەوە.

## محەمەد بەگ کوڕی ساروخان بەگ

ساڵی ٩٨٦.ك (١٥٧٨.ز) کە باوکی کوژرا، تەمەنی هەژدەساڵان بوو. بە هیمدادی مستەفا پاشای سەردار کرا بە سەرداری مەڵبەندەکە و گیرویەندی دنیاداری و پارێزگاری کەوشەنان و ئاگاداری لەشکر و قۆشەنانی پێ سپێرا. لە ڕاستیشدا لاوێك بوو لاوچاك و پاكڕەوشت و قشت و ئاكارچاك. لاسا و پەیڕەوی ڕۆمیانی دەکرد و خۆی لە باری ئەوان هەڵدەخستەوە. بە گەورەیی هەوای فێر بوونی خوێندن و نووسینی کەوتە سەر و دەبەری ڕاچوو. سیوادی فارسی و خەتێکی شکستەی بۆ خۆی پێکەوەنا. جارجارە کە مەشقی لە بەر دەسنووسی میرزا چاکانی کارامە دەکرد، زووی هەڵدەگرتێ و زۆر جوانی دێناوە و لە ناو هونەراندا هەر ئەمەش فێر بووە.

لە پاڵ خۆیدا ئاواتی بەرزی هەبوو؛ بەڵام بە کردەوە چی وای بۆ نەکرا. ئەوی چاکی لێدەزانی هەر لاساکردنەوەی بەچکە ڕۆمیان بوو. لە جلکی ڕەنگاوڕەنگ و خواردنی گرانبایی و خواردنەوەی سەر و دڵخۆشکەردا کەس لە بازێرِیانیش بە قولەقاپەی ڕانەدەگەیشت و ڕۆمیش دەسکیان لە دوو نەدەکرد.

لە پاشان وازی لەو وازوازیەش هێنا و ساڵی ١٠٠١.ك (١٥٩٣.ز) بە نیازی حیجاز باری سەفەری لێنا و چەند چۆڵ و بیابانی بڕی و بە چەند کەل و کەژ و دەشت و بەژاندا تێپەڕی و خۆی گەیاندەبەستی پیرۆزی مەککە و چاوی بەو کابەیە ڕوون کردەوە؛ کە جێی لە دەورگەڕانی «پیاوانێ کە سارد و سەودا و بازرگانی خوایان لە بیر ناباتەوە» و بە فەرمانی «ڕوو بکە مزگەوتی بەستەوە» پشتەماڵی بەست و چووە ئەو شوێنە کە «هەر کەسی بچێ ترسی نامێنێ» و بانگەوازی «کێ لە دەستی دێ دەبێ سەر لە ماڵی خودا بدا»ی بە دڵ ژنەوت و لە سەر سپاردەی «لە ئەرك پێك هێناندا یادی یەزدان زۆر بکەن» دەمی لە نزا نەسرەوت و ڕەگەڵ کاروانی: «هەموو بەرەو ئێمە دێنەوە.» کەوت کە ئەوەش ئەوپەڕی بەختیاریە.

بەڵام زۆری خۆ بە کاروباری سەرداریەوە ماندوو نەدەکرد و ئەرکی فەرمانداری -وەك پێویستە- بەڕێوە نەدەبرد. هەوساری کارداری دابووە دەست شەمسەدین کوڕی فەریدوونئاغا و کردبوویە هەمەکارەی خۆی و ئەویش بە ئارەزووی خۆی دەبزووتەوە و دەستی میری لە تەختە بەستبوو. بە بێپرسی شەمسەدینێ نەیدەتوانی پەنجە دەئاوێ ڕابکا یان دەست بۆ پووشکەیەك بەرێ. لە هەستان و ڕۆنیشتن و سەردان و بە خەڵك گەیشتنیشدا، دەبوایە پرسی بەو کوێخا سەهندەیەی بکردایە.

خزم و دۆستە دڵسۆزەکانی محەمەد بەگ -کە ڕکیان لێ هەڵدەگرت و سەربزێویان دەنواند- هەمووی لە وڵات وەدەرنان؛ تەنانەت نیازیشی وابوو ئاغاکەی خۆی بکوژێ. کاتێ کە حەسەنخان و غازانخانی کوڕی حەسەنخانی پسمامی کوژران، کچی حەسەنخان و خوشکەکەی خۆی -کە ژنی غازانخان بوو- لە شەمسەدینی کوێخای مارە کردن. مێشکی محەمەد بەگی بە جۆرێك لە بادی هەوایی دەماندبوو، کەڵلەی پێ لە کەڵلەی فەرمانڕەوا پایەبەرزەکان دەدا. لەشکری بردەسەر جزیر و نیازی وابوو کە شەرەف بەگ دەرکا و میرمحەمەدی برای لە جێگە دابنێ. هەمیشەش دەگەڵ هۆزی ڕۆژەکی و زەرقی و سلێمانیدا -کە هاوسای بوون- شەڕوکێشە و هەرای بوو.

ساڵی ١٠٠٤.ك (١٥٩٥و٩٦.ز) لە پاش هەژدەساڵ مەزنایەتی کردن، کوێخای مردن بە سەری کردەوە و خوا بۆ خۆی بردەوە و چ منداڵیشی نەبوون.

### ئەحمەد بەگ کوڕی خدر بەگ و محەمەد بەگی برای

دوای ئەوە کە محەمەد بەگی ساروخان بەگ فیزخانەی جیهانی بەجێ هێشت و بەرەو گۆڕیان ڕۆهێشت، شەمسەدینی کوێخا -کە خۆی کردبووە شێرەکوللە و کەوچك بەدەستی گەل- ئەحمەد بەگی کردەمەزنی حەزۆ و هۆز و تیرەکانیش بە دەستی گەل ملیانداو دایاننا و بە هۆی مراد پاشای میری میرانی دیاربەکرەوە، ڕووداوەکەیان بە بەر گوێچکی پێچکی تەختی بەبەختی سوڵتان ڕاگەیاند.

محەمەد بەگ کوڕی خدر بەگ لە ڕۆژگاری محەمەد بەگدا لە دەست دەسەڵاتی شەمسەدین وڵاتی جێهێشت و لە لای میری بۆتان دەژیا. لەو کاتەدا کە محەمەد بەگ مرد، ئەو لە شاری

ئەسعرد بوو. کاتێ کە زانیەوە ئەحمەد بەگی برای کراوەتە میری حەزۆ، دەگەڵ بەهائەدین بەگی کوڕی مرادخان -کە ئەویش نزیکەی دوو ساڵ بوو وێڕای شامراد و حوسێنئاغای سۆسانی و بارامئاغا و هێندێك ئاغایترا، لە چنگ شەمسەدین ئاوارە ببوون و لە بدلیس و شیروانیان ڕادەبوارد- بە تێکرایی بەرەو حەزۆ هاتن. لەو گەلەکۆمەگیە شەمسەدین زۆری ترس ڕێنیشت و چووە بنکلێشەی ئەحمەدبەگەوە و هێنایە سەر ئەو بڕوایە کە هەرچۆنێك بێ محەممەد بەگی برای خۆی بکوژێ. محەممەد بەگ هەستی بەو کەین و بەینە کرد و خۆی نەخستە داوی کوێخاوە و لە ڕێوە بای داوە و دەگەڵ ئاغاکانی سۆسانیدا خۆی گەیاندەقەڵای ساسۆن.

پیاوماقووڵانی ئەو ناوە -کە لەبەر دەست و دەمی پیسی شەمسەدین وەتەنگ هاتبوون- لە دژی ئەو دەگەڵ دوژمنی پێك هاتن و زۆر بە ڕووخۆشی پێشوازیان لێکرد و دەرگای قەڵایان بەڕوودا کردەوە. ئەو قەڵایەش لەو هەڵەمووتانەیە کە خەرتەل تا بەسەریا خولدەخوا دەبێ هەزارجار تل بدا و ڕەشەبا لە پێ هەڵگەڕانیدا شەکەت و فل دەبێ.

دەبوو پاسدەر لە سەر سەربانەکانی پشتی دانوێنێ

دەترسا گومبەزی عاسمانی شین شانی بڕووشێنێ

بە شوێن ئەو ڕووداوانەدا شەمسەدین بنێشتی لێ پووچەڵ بوو؛ مەنجەڵی نامەردی هاتە کوڵ و هەڵچوو؛ پەلاماری ئەحمەد بەگی دەستکردی خۆیدا و کراسی سەرداری -کە خۆی بۆی بڕیبوو- لە بەر دادڕی و کۆت و زنجیری خستە پا و دەستەوە و وەك دیلێك لە گۆشەی زیندانی بەستەوە و بەهائەدین بەگی لە جێگەی ئەو قوت کردەوە. سێ-چوار هەزار پیادەو سواری بۆتانی و شیروانی و زەرقی لە خۆی هاڵاند و بە نیازی تاڵان و گرتنی قەڵای ساسۆن و محەممەد بەگ و پیاوەکانی، بە هەڵەداوان خۆی گەیاندەئەو ناوە و لە ڕۆژاوای قەڵاوە لەشکریەزی کرد و ئاگری شەڕ و هەرا هەڵگیرسا.

محەممەد بەگ و یارانی تووشی پەرێشانی هاتن و لە ڕووی ناچاریەوە ڕۆژی سێشەمۆی چاردەی مانگی شابانی ساڵی ١٠٠٤.ك (١٥٩٦.ز) پیاوێکی ناردەلای فەرمانڕەوای بدلیس و داوای کۆمەگی لێکرد. ئەویش بە دەنگیەوە هات و دوسێ هەزار پیادەو سواری ڕۆژەکی لە دوو لاوە بە هاوارەوە نارد.



شەمسەدین کە بەمەی زانی، خۆی لە سەرگەردانیدا دیتەوە و هەر هێندەی بۆ کرا لە نیوەشەوێکدا تفەدەستی لێکرد و خۆی کوشی و بەرەو حەزۆ کشایەوە و هەر ئاوڕیشی نەدایەوە. محەمەد بەگ و ئاغایانی ڕۆژەکی -کە عەلائەدینئاغای بلبّاسی و ئەلوەنداغای قەوالیسی بوون- دەگەڵ هۆزەکانی مودەکی و زێدانیشدا کەوتنە شوێنی. لەشکری شەمسەدین کە گەیشتنەوە حەزۆ، هەموو لە ترسان بڵاوەیان کرد و سەری کوێخا بێ کڵاو مایەوە و جێگەی پێ لێژ ببوو. چاری ناچار پیلی ماڵ و منداڵی خۆی گرت و دەگەڵ میرشامحەمەدی شێروییدا ڕوویان کردەلای زەینەڵ بەگی شێرویی، کە دەبووە خەزووری کیژی شەمسەدین و پەنای بردەبەر خزمی خۆی. حوسێنئاغای کوڕیشی ڕاسپارد کە بچێتە قەڵا و لە زینداندا ئەحمەد بەگ بکوژێ و بەهائەدین بەگ دەگەڵ خۆیدا بێنی و لە ڕێگە بگەنە وان.

بەهائەدین بەگ -کە لە قەڵاکەدا بوو- بیستیەوە کەوا شەمسەدین بەرەو شێروان هەڵاتووە و لەشکری محەمەد بەگ و ڕۆژەکیانیش بەرەو حەزۆ هاتووە؛ ئەحمەد بەگی لە زیندان ڕەها کرد و کاتێ کە حوسێن بەگ پای نایە ناو قەڵاوە، ئەوان گرتیان و خستیانە ناو زیندانەوە و جێگەی ئەحمەد بەگیان پێ پڕ کردەوە.

شەمسەدین کە بەو بەڵایەی زانیەوە، لە ئەژنۆ و ڕانی خۆی داو بە شین و گابۆر و قوڕپێوان هەڵات و دایە کێوان. ئەحمەد بەگ و بەهائەدین بەگ -وەك براگچکەی بەرفەرمان- بە پیرمحەمەد بەگەوە هاتن و قەڵایان دایە دەست و کردیانە مەزنی وڵات و مووچەیەکیش کە هەر لە مێژەوە بۆ کوڕەمیران دیار کرابوو، بەوان درا و دامەزران و محەمەد بەگ داوای فەرمانڕەواییەکەی -کە پیاوماقووڵان و حاکمە گەورەکانی کوردستان قۆڵیان بۆ لە سەر کێشابوو- بە پێچکی تەختی خەلیفایەتی سوڵتانی هەرە زل و بە شکۆ و شان، سوڵتان محەمەدخان گەیاند. بە یاریدەی پیاوانەی وەزیری گەورە (برایم پاشای گەورەوەزیر) وڵاتی حەزۆیان پێ بەخشی و فەرمانەکە بە نیشانی سوڵتانی نەخشی و بە لاوانەوەی پادشاو خەڵاتی گرانبەها و هێژا، سەرفرازی ناو هەواڵانی کرا.

هێشتا ماوەی سێ ساڵ بە سەر فەرمانڕەواییەکەیدا ڕانەبردبوو، شەمسەدینی دڵ بەرك و کینە، گڕی ئاژاوەی دەهەناوان هەڵگرا و لێ بڕا کەتنێك بنێتەوە. خۆی گەیاندەجزیر و پەنای بە میرشەرەفی جزیر برد و داوای لێکرد کە تکای بۆ لە محەمەد بەگ بکا و حوسێنئاغای کوڕی لە گرتووخانە

ڕزگار بکەن. بەر لەوە پیاوی میرشەرەف بە تکانامەوە بگاتە حەزۆ، حوسێنئاغا کوژرا. میرشەرەف لەسەر ئەو کارە دڵی لە محەممەد بەگ ڕەنجا. ئەمجار شەمسەدین بە بەرگوێیدادا کە هۆز و هێزەکانی حەزۆ لە میری خۆیان وەڕەزن و نامە و پیاویان ناردۆتە لای شەمسەدین کوێخا کە دەستی خۆی تێخا و هەر کەسیان لە بەچکە میرەکانی حەزۆ بۆ دیاری بکا، بە محەممەد بەگی دەگۆڕنەوە. میرشەرەف بە چاپ و چووپ و شات و شووتی ئەو دووزمانە جانانەیە فریوی خوارد و نزیکەی پێنجهەزار کەسی لە بۆتانی و شێریی و زەرقی و کوردی دیکە کۆ کردەوە و لاشی وابوو کە بەرلەوە بگاتە ئەسعرد، میرزادەو هۆز و تیرەکانی حەزۆ دێنە پێشواز و بەر فەرمانیەوە و هەرچی ئەو بڵێ لە گفتی دەرناچن. بەڵام پێچەوانەی خەیاڵاتی ئەو، عەززانیەکان یەکپا ڕاوەستان و دەستیان لە میری خۆیان هەڵنەگرت و لێبڕان هەتا ڕەگی تەڕیان تێدا مابێ، لاگیری محەممەد بەگ بن و بۆ هەموو پێهاتێك چاوەنۆڕ و ئامادەی هەموو کارەساتێك بوون.

هێندێك لە میر ومەزنان هاتنە بەریوانی و میرشەرەفیان لە چوونی حەزۆ گیر داو لەسەر ئەم وتووێژە میرشەرەف لە ئەسعردەوە بەرەو بدلیسی باداوە و نیازی کرد کە شەمسەدینی دەگەڵ چەند پیاوماقوولێکدا بنێرێتە حەزۆ و بیکاتەوە کوێخا و کاربەدەستی محەممەد بەگ. لە پاش لێدوان و سەروبەر کردنی کارەکە، خانئەبداڵی برای میرشەرەف و خەڵەف بەگی برای منی هەژاریان بە چەند سەرناسێکی بۆتانی و ڕۆژەکیەوە دەگەڵ شەمسەدین نارد و دایانمەزراندەوە.

لە پاش ماوەیەك کە بۆتانیەکان گەڕانەوە، شەمسەدینی کوێخا دیسان وەك جاران هەڵی تۆزاند و گەڕی دەگەورەپیاوانی حەزۆ هاڵاند. فەلە و موسوڵمانەکانی ئەو شارۆکەیە کە زانیان تۆیەی گورگ مەرگە و چاریتری نیە، بە دەستی گەل لێی ڕاپەڕین و لێبڕان لە کۆڵ دنیای کەنەوە. خەڵەف بەگ و هێندێکیتر توانیان بە هەزار قیسرە و گوێ پچڕکێ لە چنگ دوژمنانی قەستەسەری ڕزگار کەن. میرشەرەف لە بیستنی ئەم خەبەرە هومێدی پێ نەما و گەڕاوە جزیرێ. ئیتر لەو ڕۆژەوە -کە بیستەمی مانگی ناو جێژنانیساڵی ١٠٠٤ك (١٥٩٦ز) بوو- گڕی ئاژاوە دامرکا و هەرا و کێشە، بێدەنگەی لێ کرا.

عەلی پاشای میری میرانی مووسڵێ -دۆستی لە مێژینەی برایم پاشای گەورەوەزیر- دەپێشدا لە

ئاستانە بوو؛ کاتێ خەبەر و باسی محەممەد بەگ بە بەرگوێی وەزیری ڕووناکبیری خاوەن تەگبیر گەیشت، ئەو عەلی پاشایە کە پیاوێکی زۆر پووڵەکی و چرووك و ڕژد و پووك بوو، بەو هەوایە کە دراو و مایەی زۆر لە محەممەد بەگ وەردەگرێ، ئەویش بەشی خۆی تێخست و لاگیری لێکرد. بە شوێن ئەوەدا بۆ وەرگرتنی بەش و پڕکردنی گیرفانی، هاتە سەردانی و بوو بە میوانی. محەممەد بەگ هیچ درێغی دەگەڵ نەکرد و ئەوەندی لە دەستی هات ڕێزی لێ گرت و دراوێکی زۆری دایە؛ بەڵام ئەو خەیاڵ پلاوەی کە دڵە گڵاوەکەی عەلی پاشامەگیرانی پێدەکرد، بە هیچ کابانێك لێ نەدەنرا و بە هیچ دەم و ددانێك نەدەخورا. وەك ئەو بۆ خۆی تێی گرتبوو بە سەتی وەك محەممەد بەگیش نەدەدرا. چاوچنۆکی و خوازەڵۆکی ئەو کابرایە لە جەهەندەم تینداردتر و بە جۆشتر بوو؛ هەر چەندی تێت بڕژتایە نەیدەگوت بەس و لە پەستا گڕ خۆشتر دەبوو؛ هەر دەیگوت بێنە و نیەی نەدەزانی:

شەرم و شوورە و پیاوەتی لای ئەو دراو و پارە بوو

ترسی خوا و مەردایەتی لای ئەو دراو و پارە بوو

بۆ دراو کۆ کردنەوە و خواردن لە حەزیا و دێو دەچوو

بۆ لە باش بیر کردنەوە خوێڕی و قزەو بێکارە بوو

بە دڵڕەنجاوی لە حەزۆ دەرکەوت و چووە مووسڵ و لە پاش شەش مانگ لە سەر کار لابرا و هاتە جزیر و شەمسەدینی بردەلای خۆی و دژی محەممەد بەگ پیلانیان ڕێك خست. فەرمانێکی بە درۆیان ساز داو ڕوونووسی فەرمانەکەیان ناردەحەزۆ و دایان بە ئەحمەد بەگ کەوا تۆ کراویە میری حەزۆ و گیرمەبە و وەرە جزیرێ. ئەحمەد بەگی گێل و بەستەزمان فریوی خوارد و دەگەڵ چەند پیاوێکی خۆیدا لە حەزۆ هەڵات و هاتە جزیر. شەمسەدین و عەلی پاشاپێشوازییان کرد و بە قەدر و حورمەت هێنایانە لای شەرەف بەگ و فەرمانێکی‌تری دەسکردی خۆشیان نیشاندا کە لەسەر عەلی پاشاو میرشەرەف پێویستە یاریدەی ئەحمەد بەگ بدەن و بیکەنە مەزنی حەزۆ. میرشەرەفیش سابوونی لە بەر پێی درا و بە دەردی ئەحمەد بەگ برا و بەو ساختەکاریە فریوی خوارد و لە برانەوی مانگی شابانی ساڵی ١٠٠٤دا لەشکرێکی زۆری دەگەڵ عەلی پاشاو ئەحمەد بەگ و شەمسەدین و شاعەلی

بەگی برای خۆیدا بەرەو حەزۆ نارد.

خەڵکی حەزۆ کە بەو باس و خواسەیان زانی، پیاوماقووڵانی سۆسانی و خالدی و چەند کەیخودایەك بیریان هاتە سەر ئەوە کەوا محەمەد بەگ لە سەر حوکم لادراوە و ئەحمەد بەگیش دەیەوێ بە هێزی باسکی بێگانان بێتەوە سەرمان. وا باشە ئێمە لە ناو خۆماندا مەزنێك هەڵبژێرین و کاروباری وڵاتی پێ بسپێرین. ئەوسا ئەگەر ئەحمەد بەگ و شەمسەدین زانیان ئێمە مەزنی خۆمان هەیە و ئەوانمان ناوێ، لەوانەیە بەرەو دوا بگەڕێنەوە و وازمان لێ بێنن. لەسەر ئەو بیروڕایە، بەهائەدین بەگی کوڕی مرادخانیان بە گەورەی خۆیان هەڵبژارد و نیازیشیان وابوو محەمەد بەگ بکوژن. هەتیو مەتیوی هەرزەکار و بێئاکار، دەستیان دایە چەکوچوونە جەستەی محەمەد بەگ. ئەویش وەك گوتوویانە «ناچاری سەرت بە ماڵی دوژمندا دەکا» زۆر بە نەرمی هاتە پێش و گوتی چونکە هۆز و خزمان لە ڕەوشت و ئاکاری من خۆشیان نایە، وا من بە دڵ و دەروون دەست لە مەزنایەتی هەڵدەگرم و بەهائەدینم بە گەورەی خۆم قبوڵ کرد و پەیمانی بەرفەرمانی دەدەمێ. ئەوسا پسوولە و فەرمانەکانی پادشای ماچ کردن و لە بەردەمی بەهائەدینی دانان.

شەمسەدین کە ئەم خەبەرەی بیست، نامەیەکی پڕ لە گەفوهەڕەشەی بۆ بەهائەدین نووسی کە محەمەد بەگ کوڕی منی کوشتووە؛ ئەگەر بۆم بگری و ڕایگری هەتا من دەتگەمێ، ئەوا مەزنایەتی حەزۆت دەدەمێ؛ ئەگینا گلەی خۆت لە ملی خۆتە.

محەمەد بەگ کە بە ناوەڕۆکی نامەی زانی ڕایسپاردەلای بەهائەدین کە زۆر شەرمەزنەنگە تۆ من بگری و بە سووکایەتی بمدەیە دەست شەمسەدین و لە تۆڵەی کوڕیدا بمکوژێ؛ من ئامۆزای خۆتم؛ ئەگەر دەزانی شیاوی کوشتنم، بۆ خۆت لە گەردنم دە. بە هەر فێڵ و تەڵەکەیەك بوو خۆی لە دەست ئەو نەزانە بێویژدانە ڕزگار کرد و پەنای بە هۆزی خالدی برد. بە کۆمەگی محەمەدئاغای خالدی ئابەکی، لەوێوە ڕووی کردەقەڵای ساسۆن و بە یاریدەی خەڵکی ناوچەکە خۆی لە قەڵاکە داگرت و لێی دامەزرا.

شەمسەدین و عەلی پاشاو گەورەپیاوانی بۆتانی، ناوی مەزنایەتیان لە ئەحمەد بەگ نا و بە سەد تەنتەنە و سەنسەنە بەرەو حەزۆ هاتن. بەهائەدین بەگ نزیکەی هەزار سوار و پیادەی لەشکر سازداو بە نیازی ڕێ پێنەدانی هێرشبەران، خۆی لە دەسك نا. هێندێك کەسی لە هۆزی خالدی ناردنە گوێ چەم کە پاسەوان بن و لاشی وابوو چونکە چەمەکە بوار نادا، بۆتانی ناتانن بپەڕنەوە؛ خۆیشی سەری پردی لێ گرتن.

لە بوولێڵەی بەیاندا، بۆتانی هەر بە سواری، خۆیان ڕە زگ چەم نا و ئەسپەکانیان بە مەلە پەڕینەوە و چەند پیاوێکیان لە پاسەوانە خالدیەکان کوشتن و ئەوانیتر هەڵاتن و هەواڵیان بۆ بەهائەدین برد.

بەهائەدین کە زانی کار لە کار ترازاوە و دەستەوەکەری بۆ ناکرێ، ڕکێفی هێنایە و بەرەو سۆسانی ڕاکرد و ماڵ و منداڵی لە ناو سۆسانیان بەجێ هێشت و بەرەو ساسۆن هات و نیازی وابوو لە قەڵاکەیدا خۆ داگرێ. کاتێ نزیك کەوتەوە بیستی کەوا دوو ڕۆژ لەمەوبەر محەممەد بەگ دەگەڵ ساسۆنیەکاندا ڕێك کەوتووە و چووەتە ناو قەڵاوە و دەرگاشی زۆر قایم داخراوە؛ ناچار دەگەڵ شامرادئاغای سۆسانی و چەند پیاوێکدا، ڕۆژی دووشەممە بیست و پێنجەمی مانگی ڕۆژوانی ئەو ساڵە هاتە بدلیس و یازدەڕۆژان لەوێ مایەوە و ڕۆژی دوازدەمین هەر چەندی دۆست و برادەران بە بەریان هەڵخوێند کە بمێنێتەوە، بەهرەی نەدا و گوتی هەر دەڕۆم. درۆیەکی بیستبوو کە گوایە خەڵکی حەزۆ بە کۆمەگی محەممەد بەگی زەرقی، ئەحمەد بەگ و شەمسەدینیان دەرکردووە و چاوەنۆڕی ئەوەن کە بچێتەوە و بیکەنەوە گەورە. لە قەڵای بدلیسەوە کە وەڕێکەوت، گەیشتە سەر پردی خاتوون؛ پیاوێکی تووش هات بە هەڵەداوان لە ساسۆنەوە دەهات و هەواڵی دایە کە شەوی هەینی شەشی شەشەکانێ محەممەدئاغای ئابەکی شەمسەدینی لە ناو قەڵادا کوشتووە. ئەحمەد بەگیش لە مەزنایەتی خراوە و خەڵکی حەزۆ هەموو پیاوەکانی عەلی پاشایان وەك پەلکی سیر لێ کردوون و بە دەردی سوورەساقەیان بردوون و ڕووت و قووت دەناو خانووەکانی شەمسەدیندا قەتیس ماون و پیاویشیان بە دووی محەممەد بەگدا نارد و هێنایانەوە و ئێستا بە

فەرمانڕەوایی پاڵی داوەتەوە.

بەهائەدین بە یەکجاری نەترەی بەردا و بە ناهومێدی ڕووی کردە دەرزینێ و چەند ڕۆژێکی دەگەڵ محەمەد بەگی زەرقی گوزەراند و لەسەر ئامۆژگاری ئەو بەرەو جزیر تێی تەقاند و خۆی هاویشتە بەر پەسیوی میرشەرەف و ئەویش مووچەیەکی لە داهاتی سنجاقی ئەسعرد بۆ بڕیەوە؛ کە ئەو مووچەیەی دەپێشدا دەدا بە محەمەد بەگی کوڕی خۆی. ئەحمەد بەگ لە حەزۆ کوژرا و ئێستا لە ناوچەی حەزۆدا محەمەد بەگ فەرمانڕەوای سەربەخۆیە.

# بەندی چوارەم

## فەرمانڕەوایانی خێزان

### ئەویش دەبنە سێ دەستە

ئەو گوڵچنانەی لە باخچەی ڕەنگاورەنگی پڕ بۆنوبەرامەی مێژوودا گوڵبژێرن و ئەو کارامانەی لە ناو مێرگ و میرخوزاری بەسەرهاتی ڕابردوواندا ئاودێرن، بنووسیان گوڵاوی داداوە و گوێچکەی مەیان وا ئاو داوە کە فەرمانڕەوایانی خێزان لە ناوچەی بلیجانەوە هاتوون؛ کە سەر بە مەڵبەندی خەنسە. وادیارە باب و باپیرانیان جێ گەورە و خانەدان بوون و هاتوونەتە بلیجان و قەڵاکەیان لە دەستدا بووە. ماوەیەك کە لەوێ ماونەوە، لە وەچەی ئەوان سێ برای زۆر ئازا بە ناوی: دل و بل و بلیج پەیدابوون و بەرەو خێزان بزوتوون و بە زۆرداری گرتوویانە و بە سێ پشکیان بەشکردووە: خێزان بۆ برای گەورە بووە و نێونجی مەکسی بردووە و ئەسپایرد بەر گچکەکەیان کەوتووە. هەر سێکیان، هەر کەس لە جێگای خۆی مەزنێك بووە.

باسی بەسەرهاتی تۆرەمەی ئەو برایانە- وەك دەماودەم هاتووە و چۆن حوکمیان لەو مەڵبەندە کردووە- بە یاری خودای پەروەردگار لە لکی یەکەم و دووەم و سێهەمدا بە نووکی بنووسمی دادێنم و لە سەرکاغەزیان دەچەسپێنم.

## دەستەی یەکەم

## لە فەرمانڕەوایانی خێزان و هۆی ئەو ناوەیان

چیرۆکێکی زۆر بڵاوە و دەماودەم وا ڕاگوێزراوە کە لە سەرەتاوە ناوی خێزان، سەحەرخیزان[1] بووە. چونکە خەڵکی ئەو ناوچەیە لە چاو خەڵکی‌تری کوردستان زووتر لە خەو هەستاون و بۆ نوێژ و پاڕانەوە لە بەر بارەگای خودا وێستاون و گەورە و گچکە و پیر و بەچکەیان سەریان بچێ نوێژیان ناچێ، سپێدەی بەیان و گزنگ لە سەران و جەنگەی نیوڕۆیان و دانی ئێواران و بە درێژایی شەوگاران، لەبەر نوێژان نەسرەوتوون و نەخەوتوون و ناوی سەحەرخیزان تەواو پڕ بە پێستیانە. ئەم ناوە لە ناو کوردانـدا هێندەی هاتوچۆ پێکراوە، سوواوە و سەحەری لێکەوتووە و خێزانەکە بێ‌هەواڵ ماوەتەوە. کورد هەر پیشەیەتی لە ناوان دادەبڕێ: بە شەمسەدین دەڵێن شەمۆ و عیزەدینیش بویتە عەزۆ؛ جەمشید ناوی جەمۆیە و ئەبداڵ بە ئەبدۆ بانگ دەکەن.

هێندێکیش دەڵێن ئەوی قەڵاکەی بنیات ناوە چۆتە زیارەتی ماڵی خودا و کاتێ لە حەج گەڕاوەتەوە دژداران دەرکەیان لێ گاڵە داوە و ڕێگەی چوونەژووریان نەداوە و ئەویش ڕکی هەستاوە و گوتوویە: خیزانی هیچ‌وپوچ[2] و سەری خۆی هەڵگرتووە و ڕۆیشتووە.

زۆربەی فەرمانڕەواکانی ئەو ناوچەیە بەو ناوەوە ناسراون. شاری خێزان شارێکی تازەئیجادەو لە ڕۆژگاری ئیسلامیدا بنیات نراوە. خەڵکی ئەوێ دەڵێن: خاوەنی مەراغەی لای تەورێز ئەو شارەی درووست کردووە و نووسەری ئەم ڕووپەڕانە گەلێکی کتێب بۆ پشکنیوە و پادشایەکی وای بە بەرچاودا تێنەپەڕیوە، خێزان دەسکردی وی بێ؛ وێدەچێ ئەو کارە کاری وەزیرێك یان ئەمیرێك بووبێ.

---

١- سحرخیز: شەوەکی بێدار؛ سحرخیزان: ئەوانەی بەیانیان زوو لە خەو هەڵدەستن.

٢- ڕستەی «سحرخیزان» و «خیزانی بی‌اعتبار» فارسین؛ ناشێ ببنە ناوی کوردان. من لام وایە هەر «خێزانە» کە بە ئاوەدانی ماڵ دەڵێن. جەمیل

«سحرخیزان» فارسیە؛ بەڵام «خێزان» وەك جنێو، یان ئاوەدانی ماڵ، کوردین و دەفارسیدا نین. خیزی بێ ئیعتبار جنێوێکی کوردانەیە. هەژار

هەڵیش‌دەگرێ ئەو کاتە کە هولاکۆخان دەسکاری شاری مەراغەی کردووە و بۆ خۆی لەوێ دانیشتووە و خواجەنەسیری تووسی هەمەکارەی بووە، قەڵا و شارەکە کاری ئەو بێ و دەگەڵ یەکێک لە پیاوەگەورەکان یان وەزیرەکانی ئیسلامدا پێکەوە هاوکارییان کردبێ. مزگەوتی گەورەی ئەو شارە هەر کاری بنیاتنەری قەڵاکەیەتی؛ چەند کۆڵەکەیەکی تێدایە، خەڵکی وڵاتەکە نازانن چ دارێکن. هێندێک دەڵێن ئەو دارەیە کە تورک «ئیتبورنی» و کوردان شیلانی پێ دەڵێن[1]. خەڵکەکە بڕوایان وایە کە زۆر لە پیاوچاکان هاتوونە ئەو مزگەوتە و لە ودەی ئەوانەوە هەر کەس لەوێدا بپاڕێتەوە، نزای دەستەولەجێ ڕەوایە. ژووری قەڵا وەك ڕوانگەی ئەستێرەناسان هەڵخراوەتەوە؛ بە خشتی سوور و قسڵاو دارڕژاوە. باغاتی زۆر و هەموو جۆرە میوە و ترێ و کشمیشی لای تەورێز و عەجەمستانیشی لێ هەیە و ئەگەر بەو هۆیەوە بنیاتی ئەو شارە بدەنە پاڵ خواجە نەسیرەوە، لە ئاوەز بە دوور نیە و خواش دەیزانێ. بەڵام ئاو و هەوای خێزان زۆر ناسازگارە؛ پایزان هەموو کەس لەوێ تووشی لەرزوتا ئەوێ و لام وایە ئەو ناسازگاریە تاوانی داری فنق بێ کە زۆری لێ هەیە.

هۆزی وڵاتی خێزان بە نەمیران بەناوبانگن. هۆی ئەو ناوەش ئەمەیە هەرکەس لەو هۆزە بمردایە، مەزنی وڵات مووچە و ئازووقەی ئەوی بە میراتگرانی دەدا و گەورە و چووکی وەك یەك تەماشادەکردن و کابرا وەك نەمردبا وابوو.

فەرمانڕەوایانی خێزان هەمیشە دەگەڵ زۆرداره زلەکاندا نەرم خۆیان نیشان داوە و دەگەڵیان ڕێك کەوتوون و ئەوانیش خاتریان گرتوون. چەند جارێك پادشایان کە دەستیان بە سەر کوردستاندا گرتووە و خاوەنە کوردەکانیان لێ دەرکردووە، خۆیان دەو بنەماڵە نەگەیاندووە و بێ‌ترس و زیان ماونەوە.

مەولانا عەبدولڕەزاقی سەمەرقەندی لە کتێبی *مطلع‌السعدین*دا دەڵێ: ساڵی ٨٢٤.ك (١٤٢١.ز) کاتێ میرزا شاهڕوخی کوڕی ئەمیرتەیمووری کورەکانی بۆ سەرکوتانی کوڕانی قەرەیووسفی تورکمانی گەیشتە کەوشەنی ئازربایجان، کوڕی میرسولەیمانی خێزانی دەگەڵ شەمسەدینی بدلیسی هاتن بە پیریەوە و بە ئاوڕ وێدانەوەی شاهانە و لاواندنەوەی خاوەن شکۆیانە، سەرفراز کران.

---

١- «شیلان» پنچکە؛ قەت هێندەئەستوور نابێ دەسکە تەوریشی لێ پێك بێ، چجای کۆڵەکەی مزگەوت. وادیارە ئەو خەڵکە هەر وەك داری کۆڵەکەیان نەزانیوە شیلانیشیان نەناسیوە. هەژار

لە پاش میرسولەیمان و کوڕەکەی -وەك دەماودەم هاتووە- میرمەلیك ماوەیەك مەزنایەتی تێدا کردووە و کە ئەویش کۆچی لە سەر سەرزەمین کردووە و لە گۆڕستان خەوتووە:

## میرداود کوڕی میرمەلیك

سی‌ونۆ ساڵان بە بێ‌کێشە و دەردەسەری، سەرداری سەربەخۆی خێزان بووە. شەو و ڕۆژی بە خواردنەوەی مەی و بادەو بە هامدەمی نۆنەمامی جوان و سادە ڕابواردووە. فێرگەیێکی لە خێزاندا بنیات ناوە کە بە فێرگەی داوودیەوە ناو براوە؛ هەتا ئێستاش زانا و هۆزان لەو جێگەدا دەس‌بەکار و لەو فێرگەیەدا فێرکارن.

ئەو میرداودە سێ کوڕی بووە: سوڵتان ئەحمەد، میرسولەیمان بەگ، حەسەن بەگ.

## سوڵتان ئەحمەد کوڕی میرداود

لە پاش نەمانی بابی، مەزنایەتی خێزانی گرتە چنگ و زۆر بە زیتی و لێزانی گەلێك سەروسامانی بە ناوچەی بەرفەرمانی داو هۆزەکانی نەمیری و دانیشتووانی ئەو ناوە لە دڵسۆزی و لە ژێری میری خۆیان هەموو شاد و دڵخۆش بوون. لەو چاخەدا کە میران و سەردارانی کوردستان دەگەڵ سوڵتان سولەیمان‌خاندا ڕوویان کردە ئارامیگەی بەغدایە، سوڵتان ئەحمەد زۆر خزمەتی زۆر گرینگی بۆ سوڵتان کرد و لەو ناوەدا ناوی دەرکرد. لە پاداشتا فەرمان درا کە نازناوی جەنابیان بۆ ئیجاد بێ و خانەدانیان لە ناو فەرمانننامەکاندا وێژەی حاکمیان بۆ بەکار بێ و خێزانیشیان بە مولکایەتی بدرێتێ و بە نەفرین و تووك لە داگیرکەران بەربەست بکرێ و لەو ساوە بە حاکمانی خێزان ناوبراون.

هەر چەندەهەر زۆر لە مێژینەوە خانەدانی خێزان و بنەماڵەی شەرەفخان خۆشەویستی یەکتر و زۆر نێوان خۆش بوون، بەڵام لەو ساوە کە ئۆلمە پێی نایە رۆمەوە، چەند شتێکی وا رووی داوە کە نێوانیانی تێك داوە و لێکی کردن بە دوژمن و لە باسی بەسەرهاتی شەرەفخاندا ڕوون دەکرێتەوە.

سوڵتانئەحمەد بەگ و ئۆلمە پێکەوە ڕێك کەوتبوون خانەدانی شەرەفخانی لە ناو بەرن. شەرەفخانیش لە تۆڵەدا لەشکری کرد و هێرشی بردەسەر خێزان و نیازی وابوو کە خێزان و

سولتانەکەی بەردەست بکا. لە هەر دووکلا کوشتارێکی بێداد کرا و ناوبژیکەر هاتنە بەر و شەرەفخانیان گەڕاندەوە.

سولتان ئەحمەد پیاوی ناردەدیاربەکر و تۆڵمەی هاندا کە بێتە سەر شەرەفخان و دەگژی ڕاچێ. تۆڵمە هات و بە لەشکری دیاربەکرەوە چووە خێزان و بە ڕابەری سولتان ئەحمەد لە خێزانڕا هاتە تاتیك و لەوێشەوە هاتە سەر بدلیس. لەو شەڕەدا میرشەرەفخان کوژرا و لە پاش ئەویش سولتان ئەحمەد هێندەنەژیا و سەرزەمینی بەجێ هێشت و لە ناو گۆڕدا نیشتەجێ بوو.

بـە دڵ گـەر چاوێ بخشێنی لـە مەڵبـەندی کفنپۆشـان

سـەری دڵ سـووڕدەمێنێ، هێنـدەسـەیرە شاری خامۆشان

دڵیپـڕ ئـارەزووی شاهـان ژەمێکی سـووکـەڵـەی مارە

لـە دەم مێروولـەیـەکـدا خاکی لاکی مـەزن و خوونکـارە

ئـەوی نـازی دەکـرد و دەنـگـی دابـوو ساز و ئـاوازی

دەگـەڵ گـازنـدەکـەر تۆزن لـە خۆڵدا بـێ جیـاوازی

پێنج کوڕی لە پاش بەجێمان: میرمحەمەد، یوسف بەگ، مەلیك خەلیل، مەلیك خان، خان مەحموود.

### میرمحەمەد کوڕی سولتان ئەحمەد

لە پاش مەرگی سولتان ئەحمەد، لەسەر فەرمانی -ناکرێ نەزانی- سولتان سولەیمانخان، مەڵبەندی خێزان کرا بە دوو بەش: بەشێکی درا بە میرمحەمەد و بەشەکەیتری بۆ مەلیك خەلیل. هەر تەنیا ساڵێك میرمحەمەدیش بە سەرداری ژیا و مەرگی کتوپڕ، تەمەنی بڕی و سێ کوڕی لە پاش بەجێمان: سولتان مستەفا، داود بەگ، زەینەڵ بەگ.

لە پاش مەرگی ئەو، مەلیك خەلیلی برای بەشەکەی ویشی خستە سەر بەشی خۆی و دیوانی سولتانیش بەوە ڕازی بوو. بەڵام سولتان مستەفا بە کۆمەگی بەهائەدین بەگی حەزۆ -کە خاڵۆی بوو- ڕووی کردەئاستانە و بەشەبابی بۆ خۆی نەستاندەوە؛ شەش ساڵان مەزنایەتی کرد. ڕۆژێك چوویـووە ڕاو نەگەڕایەوە و کە لە دوای گەڕان کەلاکەکەیان لە لێڕەواردا دۆزیەوە و هەر چەندی لەو کارەساتەیان

تۆزیەوە، ئێستاش نەیانزانی بۆ کوژراوە و کێ کوشتوویە. داودبەگی بـرای جێگـەی گرتـەوە و ئـەویش دوای ساڵێك سەرزەوی جێ هێشت.

لە پاش داود بەگ، زەینەڵ بەگی برای چووە ئاستانەی سوڵتان سەلیمخان و دوو بەشەی خێزانی بـە چەشنی پێشوو کردەوە یەك و بە ناوی نووسرا؛ بەڵام بەرلەوەی لە مەزنایەتی چێژێك بچێژێ و ئارەزووی پێك بێ، مەیگێڕی مردن ژەهراوی مەرگی بە گەروودا کرد و لە ڕێی ئەستەنبووڵ -زۆر بـە ناکـامی- هەموو ئاواتی ئاوێتەی گڵ بوون.

## مەلیك خەلیل کوڕی سوڵتان ئەحـمەد

هەر وەك لەمەوبەر تۆزێکی لێدواین، هەتا براکە و برازاکانی لە ئارادا بوون، جارجـارە نیـوە و جـاری واش هەبوو هەموو خێزانی دەبەر دەستدا بـوو. لـە پـاش نـەمانی برازاکـانی -لـە ڕۆژگـاری سـوڵتان سەلیمخاندا- بە کۆمەگ کردن و یاریدەدانی ڕاوێژکەری بەرز و ژیر (مـــحەمەد پاشـای گـەورەوەزیـر) هەردووك پارچەی خێزانی کردەپشکی خۆی. بیستودوو ساڵێك بێ بەرهەڵست و بـێ چـەت تێکـەوتن مەزنایەتی کرد. بەڵام پیاوێکی دەستەوستان بوو؛ پێ نەدەوەستا ئەرکی گرانـی فـەرمانڕەوایی بـەڕێوە بەرێ و هەست و نستی خۆی نابووە ژێردەستی ئەبداڵئاغاوە کە ئەو ئەبداڵە سەر بە کۆمـاری بلیلانـی بوو. ئەم لە جیاتی ئەو کاروبارەکەی جێبەجێ دەکرد و مەلیك خـەلیلیش لـەو سـەرداریەدا بـە نـاو و نانێك قنیاتی دەکرد. هاتیشی وابوو (خوا وای دابوویە) چی ئاوات بوایـە بـۆی پێـك دەهـات و هـیچ دانەدەما.

ساڵی ٩٩١.ك (١٥٨٣.ز) بە نەخۆشی فـێ -کە زۆر لەمێژ بوو پێی دوچار ببـوو- کۆچـی دوایـی کرد و کوڕێکی چکۆڵەی لە پاش بەجێ ما ناوی حەسەن بەگ بوو.

## میرمەحـمود کوڕی سوڵتان ئەحـمەد[1]

هۆز و تیـرەکانی ئەمیـری لـە جێگـەی مـەلیك خـەلیلی برایـان دانـا و فـەرمانی پیـــرۆزی سـوڵتان

---

١- لە باسی سوڵتان ئەحـمەددا کوڕی پێنجەمی ناوی خانمەحـموودەو لێرەدا بە میـر مەحـموودی هێناوە. هەژار

مرادخانیشی بۆ هات و دەستی بە کار کرد. لە ڕاستیشدا پیاوێکی بەکار و مشوورخۆر و لێزان بوو؛ ئەوەندەی سەرە و بەرە بەو مەڵبەندەدا و ئەوەندی وە برەو خست کە هەر باسی ناکرێ.

ساڵی ۹۹۲.ك (۱۵۸٤.ز) کە عوسمان پاشای وەزیر بە لەشکری جیهانگیرەوە بۆ گرتن و بەرپێ دانی تەورێز بزووتبوو، میرمەحموودیش ڕەگەڵ کەوتبوو. ڕۆژێك کە سەنانپاشای وەزیر لە سەعدابادی تەورێز دەگەڵ قزڵباشان تێك هاڵقا و ئاوقای یەکتری بوون و هەواڵەکانی هەڵاتن، میرمەحموود و چەند سەرناسێکی خێزانی لە مەیدانی شەڕدا بە شەهیدی بەختەوەر بوون.

دوو کوڕی بە ناوی سوڵتان ئەحمەد و میرمەحموود لە پاش بەجێ مان و میرمەحموود هەر زۆر بە منداڵی جوانەمەرگ بوو.

## میرحەسەن کوڕی مەلیك خەلیل

لە پاش بە کوشت چوونی میرمەحموودی مامی -هەر چەندەزۆریش منداڵ بوو- هۆز و تیرەکانی ئەمیری کردیان بە میری خۆیان و بەرانبەر بە فەرمانی سوڵتان مرادخان فەرمانڕەوایی خێزانی کەوتە دەست.

یوسف بەگ کوڕی سوڵتان ئەحمەد -کە دەبووە مامی- بە نیازی مەزنایەتی خێزان، ڕووی کردەئاستانەی کونەبەختی سوڵتان مرادخان و لە بەزەیی بێ بڕانەوەی شاهانەوە سەرداری خێزانی درایە و کاتێك لە ئاستانەوە گەڕیاوە و هاتەوە خێزان، لە تیرە و هۆزەکانی ئەمیری کەس ئاوڕێکی بە خێری لێ نەدایەوە و سەرینی ناهومێدی نایەوە و بە دڵساردی ڕووی کردە تەورێز و خۆی خستە سەر خاك و پای جەعفەر پاشای وەزیرەوە. جەعفەر پاشاپیاوی خۆی دەگەڵ ناردن کە خێزانی بۆ بگرن و بیدەنێ؛ بەڵام خەڵکی ناوچەکە فەرمانی پاشاشیان بە پاشدا گێڕاوە و جوابیان نەداوە.

چەند جارێکیتریش لە دەرکانیداو هاوار و دادی بۆ ئەو و ئەم برد تا لە ئەنجامدا کەیخودا و خێرخوایان کەوتنە نێوان و ناوچەی ئەمیرانیان بە ناوی سنجەق دایە و خێزان و دەوروبەریشی بۆ میرحەسەن مایەوە.

ماوەیەکی کەم ئاوا ڕابرا؛ بەڵام بە دنەدانی کەتنگێڕان یا خۆ بە ئارەزووی جوانەمەرگ بوون! یوسف بەگ هەوای هەموو خێزانی کەوتەوە سەر و سەری لە شەڕ دەخورا. میرحەسەن دەستە و

بەستەی خۆی لێ کۆ کردەوە و هۆزی شیـروانیش هاتنە هیمدادی و پەلاماری یوسف بەگی دا.

یوسف بەگ لە گوندی ئاز -کە لە ناوچەی نەمیـرانە- سەنگەربەندی خۆی کرد و لە بەریان وێستا. کاتێ شەڕەکە گـەرم بـوو، هەواڵـەکانی بڵاوەیـان لـێ کـرد و یوسـف بـەگ خـۆی لـە نـاو ڕەهەنـدی ئاودەستێکدا وەشارد و زۆر بە پیسی لە ناو پیساییدا کوژرا و کەسیش نەیزانی کێ کوشـتوویە. بـەڵام بۆگەنی کارەساتەکە، سەر و مێـشکی میرحەسـەنی بـاش ئـاخنی. کاربەدەسـتانی عوسـمانی -کـە گێچەڵیان دەکرد- گەڕیان تێهاڵاند و شەڕیان پێفرۆشت و ئەوی پێی بڵێن شت و لە بەرد نەرمتـر بێ، هەمووی بە بەرتیل داو تەنانەت چەند پارچە زەمینێکی زۆر باشی لە وڵاتـی خێـزان هـەبوون، دەگـەڵ هەموو ئەو موڵك و ماڵەی لە باب و باپیـرانەوە بۆی مابۆوە، هەمووی کردەگیـرفانی کاربەدەسـتانی عوسـمانیەوە و ئێستاش کە لە سەر ساجی عەلیان داناوە و قۆشەی سووتاوی نەماوە، گیـرە و هەرا و گزی و بەهانە هەر ماوە.

سەرەڕای ئەوەش حاجی بەگی ئامۆزای[1] -کە کچەزای حەسەن بەگی مەحـموودیە- بە گژی داهات و داوای ناوچەی نەمیـرانی لێدەکرد و لە پاش هەرا و کێشەی زۆر، بڕیـار درا کـە ناوچـەی مـەروانان بـخوا و دەگەڵ میـرحەسەن بژی و پێکەوە بە سەر وڵاتەکە ڕابگـەن و ئێـستا نێوانیـان خـۆش بـووە و کاروباری خێزان زۆر بە باشی ڕووبەڕا دەبێ.

---

١- لە دوو دەسنووسدا حاجی بەگ کوڕی داود بەگی ئامۆزای. عەونی

## دەستەی دووەم
# فەرمانڕەوایانی مەکس

لە دەلاندنی زمانی تەڕ و پاراوی دادراوی بنووسی بێگرێ و ڕەوانەوە و لە درکەی نرکەی پاڵەی بەهێزی ناوپەرێزی ئەم پاڵەوانستانەوە وامان بۆ دەرکەوت کە فەرمانڕەوایانی پێشووی خێزان و مەکس و ئەسپایرد، سێ برا بوون و لە بلیجانەوە هەڵوەدا بوون و هاتوون وڵاتی ئەمیرانیان داگرتووە و لە خۆیان بەش کردووە و هەرکەسە بەشی خۆی بردووە و حوکمی لێکردووە. هەیشە دەڵێن ئامۆزا بوون و پێکەوە تەبا بوون و دەگۆ سەلجۆقیان ڕاچوون و وڵاتەکەیان لێگرتوون. هەر چۆنێك بێت یەکەم کەسێك کە لە مەکس بۆتە ئەمیر وناوی لە بیر خەڵك ماوە، میرئەبداڵە. میرئەبداڵیش دوو کوڕی بووە بە ناوی ئەحمەد بەگ و حەسەن بەگ.

### ئەحمەد بەگ کوڕی میرئەبدال

کاتێ میرئەبدال نەماوە، ئەویان لە جێگە داناوە. زەینەل بەگی هەکاری -کە چاری نەویستووە و ویستوویە ئازاری بدا- حەسەنی برای لە دەسك ناوە و کردوویەتە ژاردەستی خۆی و بردوویەتە بەر ئاستانەی سوڵتان سولەیمانی خەزاکەر و ناوچە و قەڵای کارکاری لە وڵاتەکەی میرئەحمەدی پێ دابڕیوە و بە ناوی سنجاق بە حەسەن بەگی بەخشیوە. فەرمانی کاریگەری بۆ دەرچووە کە هەردووك برا هەتا ژیاون پێکەوە فەرمانڕەوای ئەو ناوە بن. سی ساڵ بە جووت حوکمیان کرد و ئەوسا ئەحمەد بەگیان مرد و دوو کوڕی لە پاش مان: ئەبدال بەگ و میرعیمادەدین.

### ئەبدال بەگ کوڕی میرئەحمەد

لە پاش نەمانی بابی -بەرانبەر بە فەرمانی هەمیشە پێك هاتووی سوڵتان سولەیمانخان- مەکسی خرا بەر فەرمانەوە. هەر لەو سەرویەندانەشدا حەسەن بەگی مامی فەرمانی مەرگی بۆ هات و لە گۆڕستان دامەزرا.



ئەبدال بەگ -کە کیژی زەینەل بەگی هەکاری دەباخەڵدا بوو- بە کۆمەگی خەزووری کارکاری وەك ڕۆژگاری باپیرانی، خستەوە سەر مەکس و لەوبارەوە نیشانی بەزەیی نیشاندەری سوڵتان سەلیمخانی وەرگرت. لە دواییدا ڕوستەم بەگی میرحەسەنیش -بە یاریدەی هۆزی مەحموودی- سەرلەنوێ ناوچەی کارکاری دابڕییەوە و خستیەوە بەردەستی خۆی. لەسەر ئەوە شەڕ و هەرای زۆر و زەوەند لە نێوانی ئامۆزایاندا پەیدا بوو.

لە سەرەتای ساڵی ١٠٠٥.ك (١٥٩٦.ز)دا، شەوێك دۆزی شێو و خەوتنان، ئەبدال بەگ بە نیازی دەسبەئاو گەیاندن هاتبووە سەر لێواری قۆنگرەی قەڵا و لەسەرخۆشیان هەڵخلیسکا و مەستانە کەوتە خوارەوە و تازە ئەغیاری نەدیەوە.

دوو کوڕی هەبوون: میرئەحمەد و محەمەد. لەسەر قۆڵ لەسەر کێشانی هۆزەکان و خزمانی، میرئەحمەد کرا بە جێنشین.

## ڕوستەم بەگ کوڕی حەسەن بەگ

هەر وەك لێی دواین، لە داخی ئامۆزایانی، کیژی حەسەن بەگی مەحموودی خواست و بە کۆمەگی مەحموودیان و ئاوڕوێدانی مستەفا پاشای سەردار، ناوچەی کارکاری کردەپاری خۆی.

لە پاش ماوەیەك لە ژیان تەکیەوە و تەکی دابە گۆڕی تەنگەوە و حەسەن بەگی کوڕی جێگەی گرتەوە. جا کە ئەبدال بەگ لە بەرزیەوە هەڵدێرا و لە دنیا هەڵوەژێرا، حەسەن بەگ بۆ گرتنی مەکس یاریدەی لە سەنان پاشای میری میرانی وان خواست و ئەویش نزیکەی سێسەد سوار و پیادەی دەگەڵ نارد و میرئەحمەدیش بە هۆز و خزمانی خۆیەوە لە قەڵا دەرکەوت و هاتە بەرابی حەسەن بەگ و پێکوەربوون و تێکبەربوون و لەو ناوەدا حەسەن بەگ وەبەر هات و ماوەی ژیانی بەسەر چوو. میرئەحمەد هەر خۆی ما و بوو بە فەرمانڕەوای سەربەخۆی مەکس و ئێستا دەستەڵاتداری بێ بەرهەڵستە.

## دەستەی سێهەم

# فەرمانڕەوایانی ئەسپایرد

وەك زانیمان ئەسپایردیەکانیش هەر خزمی میرەکانی خێزان بوون. کاتێ کە کاربەدەستانی کوردستان خۆیان خستە ژێر ئاڵای عوسمانیانەوە، محەممەد بەگ بە سەر ئەسپایرد ڕادەگەیشت. کە دنیای بەجێ هێشت، دوو کوڕی لە پاش بەجێمان: سوڵتان ئیبراهیم و میرشەرەف.

## سوڵتان ئیبراهیم کوڕی محەممەد بەگ

بەرانبەر بە فەرمانی سوڵتان سولەیمانخانی خەزاکەر، کرا بە جێنشینی باوکی و میرایەتی ئەسپایردی کەوتە دەست. ماوەیەك بە سەرداری ڕاییوارد و لە پاشان کە قزڵباشان هاتنە دەوری قەڵای وانێ، ئەویش دەگەڵ فەرهاد پاشای میری میرانی وان، شەڕی قزڵباشانی کرد و بە دەستی وان کوژرا و دوو کوڕی لە پاش مان: محەممەد بەگ و حەسەن بەگ.

## محەممەد بەگ کوڕی سوڵتان ئیبراهیم

لە پاش کوژرانی باوی -بە گوێرەی فەرمانی سوڵتان- فەرمانڕەوایەتی ئەسپایردیان پێ ئەسپارد. ئەویش چوار کوڕی بوون: ئەییووب بەگ و خالید بەگ و ئوەیس بەگ.[1] هەر بە زیندی سەر وەسیەتی بۆ ئەییووب بەگ کردبوو. لە پاش مردنی کرا بە جێنشینی و ئێستا کە ساڵی هەزار و پێنجی کۆچیە وا نزیکەی بیست ساڵە وڵاتەکەی بە دەستەوەیە و لە بەخۆوە بژیوی و دراو هەڵکڕاندن و زانیاری دنیاداریدا، جێ ئێرەیی هەواڵانیەتی.

---

١- لە فارسیەکەی چاپی میسردا ناوی کوڕی چوارەم نیە؛ بەڵام لە تەرجەمە عەرەبیەکەی محەممەدعەلی عەونیدا، ڕووپەڕی ٢١٣، چوارەمیان سوڵتان ئیبراهیم بەگە. هەژار

## میرشەرەف کوڕی محەممەد بەگ

لەو کاتە کە سولتان ئیبراهیمی برای کرا بە مەزنی وڵاتی ئەسپایرد، میرشەرەف پەنای بە دەرگای سولەیمان برد و لە سۆنگەی فەرمانی بەرزەنیشانی سولتانەوە ناوچەی ئاغاکیسی -لە قەڵەمڕەوی برای- بۆ دابڕا و بە ناوی سنجەقەوە بە سەری ڕادەگەیشت و لە پاش ماوەیەك لەوێش دابڕا و بەرەو ئەو دنیا باری کرد و بەهائەدین و ئۆرکەمزی لە پاش بەجێ مان؛ بەڵام هەردووك زۆر منداڵ بوون و گزیرایەتی ئاغاکیسیان پێ جێبەجێ نەدەکرا و لە دیوانەوە لێیان بڕا و درا بە میسرە عوسمانیەکان. ئۆرکەمزیان میرمنداڵە بوو کە تووشی نەخۆشی فێداری و دوچاری بیماری شێتی و پەتیاری بوو. بەهائەدین کوردستانی بەجێ هێشت و لە عەربسان گیرسایەوە و لە لای بەسرا و ئەحەساوە[1] چوویەوە ڕیزی نۆکەرانی پادشاوە.

---

١- الاحساء: مەڵبەندێکە لە باکووری بەحرەین و لە کەناری ڕۆژاوای خەلیجی بەسرەیە و دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی جزیرەی عەرەب. جەمیل

## بەندی پێنجەم

## فەرمانڕەوایانی کلیس

با ئەوانەی ڕێپێوەری سەر و بەری بەرەی باشی هاشمیانن و ناسێنەری وەچ و بەری لك و پۆپی گەش و زۆپی شەنگەداری بژ و چرۆ پەرێشانی قورەیشانن، باش بیزانن کە ئەوانەی لە سەر کلیس حوکمڕانن، پێیان وایە لە ڕیشاژۆی فرزەندانی ئیمامهەباس -خوالێی خۆش بێ- ڕوواونەوە و بنجی خۆیان سەر بەو تیرە و زنجیرەیە حەساو دەکەن.

هێندێك کەسیش -کە باشتری لێدەزانن- لایان وایە کە ئەوانە دەگەڵ بەرەی بنەماڵەی ماڵە میرانی هەکاری و ئامێدیدا ئامۆزان و بەڵگەی ڕاستیشیان ئەمەیە کە دەپێشدا سێ برا بوون؛ شەمسەدین و بەهائەدین و مونتەشا. هەکاریەکان -کە لە شەمسن- ناوی شەمۆیان لێ نراوە و ئامێدیەکان لەبەر ناوی بەهائەدین بوونە بهدین و فەرمانڕەوایانی کلیس -کە تۆرەمەی مونتەشابوون- بە ناوی مەند ناونراون.

هەر چۆنێك بووبێ ئەو مەندە-کە ڕەسەنی ئەو میرانەی پێوە بەندە- پیاوێ بەدەسوبرد بووە و کۆمەڵە کوردێکی ئازای لە دەوری خۆی کۆ کردووە و بەرەو میسر و وڵاتی شام ڕۆیشتووە و لە لای پادشایانی بەرەی ئەییووبی دامەزراوە. ئەو پادشادادگەرانەش ناوچەی قەسیریان لە نزیك وڵاتی ئەنتاکیەوە پێ سپاردووە؛ کە خۆی و دەست و پێوەندەکانی تیا بحاوێنەوە.

ئەو کوردەیەزیدیانەش کە لە ناوچەی قەسیسر دەژیان، هەموو هاتنە ژێر سێبەری پارێزگاری مەندەوە و مەند ڕۆژبەرۆژ برەوی دەسەند و مەردی و ڕەندی و سەربڵندی و قووڵ و مەندی مەند، لە لای هەموو کەسی جوان و پەسەند کرد و زۆر پێ نەچوو کوردەکانی جوم و کلیسیشی کەمەندکێشی ئاکاری خۆی کرد و سەر لە بەریان، سەریان وەبەر باری ئەو لاوە ڕند و لەوەندە هێنا. پادشایانی میسر و شامیش لە کرداری دڵشاد بوون و کوردەکانی دەوری شام و لای حەڵەبیان گش بەو سپارد و بەو خەڵاتە شایانەیان بە دڵخوازیان گەیاند و سەرفرازیان کرد و لەوساوە مەند بوو بە میری خاوەندگیر و

## لکی دووەم[1]

## کرنی

ئەوانە لە نەوە و نەوەچرکی میرمحەمەدی کوڕی میرحەسەن کەوتوونەوە؛ کە باوك وڵاتەکەی لە ناو کوڕاندا بەش کرد و قەڵای شەبستانی بەو میرمحەمەدەدابوو. وا ئێستاش زەینەڵ بەگ کوڕی سولەیمان بەگ لە دیوانی پادشاوە قەڵا و مەزرای شەبستانی بە زەعامەت پێدراوە و بە سەری ڕادەگا.

هێندێك جاریش میرحەسەنی مەلیك سولەیمان، کە پسمامیەتی -وەك لە باسی بە کوشت چوونی ئەبداڵ بەگدا لێی دواین- بە سەر کفرادا دەستی ڕۆیشتووە.

دەڕاستیدا زەینەڵ بەگ لاوێکی دووربین و کارزانە و هەر لە ئێستاوە زەعامەتەکەی خۆی خستۆتە سەر ناوی کوڕەکەی و ئاغاکیسی بە زەعامەت لە دیوانی سوڵتان محەمەدخانەوە بۆ خۆی وەرگرتووە؛ برایەکیشی هەیە ناوی ئەبدالە.

---

١- دانەر لە سەرەتای بەندی شەشەمدا، شیروانیان دەکاتە سێ لك؛ کەچی بۆ کرنی و ئێرون، یەکەم و دووەمی داناوە؛ کە دەبێ دووەم و سێهەم بن. هەژار

## لکی سێهەم

## ئێرون

میرمەلیک، کوڕی میرحەسەن، کوڕی شەمسەدین، کوڕی میرحەسەن، ئێرونی بـە نـاوی زەعامـەت بـە دەستەوەیە و زانیشمان کە میرحەسەنی هەوەڵیٚ ئێرونی بۆ شەمسەدینی باپیـری ئەو میرحەسەنە جـویٚ کردبۆوە.

میرمەلیک لاوێکە -بۆ ئازایەتی و دلآوایی- لە کوردستاندا ناوبانگی دەرکردووە و بۆ دینداری و لە خوا ترسیش لە ئەندازەی دەربردووە.

# بەندی حەوتەم

# فەرمانڕەوایانی زەرقی

## ئەویش چوار دەستەن

مەلەوانانی سەر ڕووباری دوورەبواری کەفچڕێنی کەڵرفـێنی بـە تـەوژم و ڕژد و تیـژ و پـڕ لـە کێـژی مێژووی کەون، بنی گۆمیـان پـشکنیوە و بـۆ بنیـچەی قـومـپـووی کـومـپـووی خانـەدانی میــرەکانی کوردستانیان لێ ڕوانیوە و لە ناو زیخ و چەوو قومی تەختاییدا، سەر ڕەسەنی بنەماڵەی زەرقیـەکانیان دیوەتەوە و دەریان خستووە کە عارەبە و شامی بووە.

شێخ حەسەن ناو کوڕی سەید عەبدولڕەحـمانێك، ئـەو وڵاتـە بـە ڕێـژەوەی جێهێـشتووە و -کـاری خوایە- ئاوارەیی تووش کردووە و بەرەو مەڵبەندی ماردین هاتووە و کوردستانی بەدڵ بووە. ملـی لـە خوداپەرستی ناوە و ڕۆژووی گرتووە و چلەی کێشاوە و نوێژی درێژی کردوون و سوژدەی بە بینی بردوون و هەمیشە جلیشی سەرتاپا شیـن بووە و لەبەر ئەوە خەڵك ناوی شێخی ئەزرەقی (شێخە شینە)یان بـە سەردا بڕیوە. عەرەب بە چاوشینان دەڵێن ئەزرەق. هیچ دوور نیە ئەو شێخە چاوی شیـن بـووبێ. هـەر چۆنێك بێت نەخوێندەواران هێندەیان جووە تا «ئە»یەکەی لێ کەوتەوە و زەرقیکی ڕووت ماوەتەوە.[1]

---

١- ئەمیـنزەکی بە زراکی (زریکی) ناوی بردووە. ڕەنگە لە لاتینی وەرگرتبێ. من لام وایە ئەو نـاوە لـە ئەزرەقیـەوە هاتبێ. نافع کوڕی ئەزرەقی حەنەفـی -کە ئەبووڕاشدیان پێ دەگوت و لە خاریـجیان بـوو- مـەزەبێکی ئیجـاد کـرد و دەپێشدا کەم بوون؛ دوایە وایان لێهات ئەهواز و زۆر لە ئێرانیان تا کرمان گرت. بە فەرمانی عەبدوڵلا کوڕی زوبـەیر -گزیری بەسرا- عەبدوڵلا کوڕی حەرس خوزاعی، بە گژیاندا هـات و لـە بـەریان شکا. چـەند جـارێکیتـریش هاتنـە سـەریان، دەرۆستیان نەهـاتن. دوایی موهەللـەب کـوڕی ئەبـووسوفرە -میـری خوراسـان- بـڵاوی کـردن و نـافع و جێنشینەکەشی کوشتـن و دەستی هەر لێ هەڵنەگرتن؛ تەنانەت لە ڕۆژگاری عەبدولـمەلیك کوڕی مەڕوان و حەججاجی گزیری عیراقیشدا، هەر دەگژیان ڕادەچوو. ئەزرەقیەکان «قەطەری» کوڕی فوجائەیان کردەپێشەوا و لەپاشان لەناو خـۆدا بوویە کێشەیان. عبدربە گەورە، بە حەوتهەزار کەسەوە و عـبدربە گچکە، بە چوارهەزارەوە بەجێیان هێـشت و ڕوویـان کردەدەوروبەری کرمان و قەتەری لە فارسدا مایەوە و موهەللەب زۆری برد و بەرەو کرمان ڕاوی نا. جەمیل

وێشدەچێ ناوی زەرقی لە زەرگەوە هاتبێ و کابرا شێخ بووە و زەرگی وەشاندووە. هەژار

ئەوەندەدوورەدنیا و خواخواز و نوێژ و ڕۆژوو پاك بووە، زۆربەی پیاوماقوولانی ماردین بوونەتە دەروێشی و پادشای ئەو سەردەمە لێی ترساوە و لە قەڵای ماردیندا خستوویەتە گرتووخانەوە. لە پاش چەند ڕۆژێك شێخ بە پادشای نواندووە و دڵ و هۆشی لێ ساندووە و کەمەندکێشی کردووە و پادشاجەزمی لێ هاتووە و بۆتە دەروێش و شێخی لە بەندیخانە دەرێناوە و دەستی دەبەژنی وەرێناوە و داوای بوردنی کردووە و شێخ بەخشیویە و ئەویش بۆ دڵنەوازی کیژی خۆی بە شێخ بەخشیوە. ئیتر لەو ساوە هەموو خەڵکی ئەو ناوە بوونە خاکی بەری پێی شێخەشینە و هەر مەبینە چەندیان بڕوا پێ‌هێنا و چتۆ ڕێزیان لێ دەنا!؟

لە پاش ئەوەی کە پادشازەرگی مەرگی پێداکرا و شین و شیوەن وەلابرا، شێخەشینە جێی گرتەوە و کرا بە جێنشین و مەڵبەند و ناوچەکانی دەوروبەری بە سەر کوڕەکانیدا بەشینەوە.

## دەستەی یەکەم
# فەرمانڕەوایانی دەرزینی

لە کوڕانی شێخ حەسەنی زەرقی، ئەوی هاتۆتە دەرزینی، ناوی هابیل بووە و کوڕی هابیلیش قابیل بووە. لەو سەردەمانەدا کە قەڵای دەرزینی لە دەست دین‌دوژمنانی دڵ کوێردا بوو، کلیسایەکی گەلەك مەزنی بە ناوی دیرزیر[1] تێدا بوو. جا کە هابیل و قابیل ڕزگاریان کردووە و بۆ خۆیان دەستیان بە سەردا گرتووە، ئەو ناوە لەبەر زۆر دەکارهێنانی، لە ناو دەم و زاراندا سواوەو کراوە بە دەرزینی. ئەوانەی میری دەرزین بوونە و مێژوویان ئاشکرا و ڕوونە، بە شوێن یەکدا ناونووس دەکرێن.

### میرهەمزە
### کوڕی میرخەلیل کوڕی میرغازی

میرهەمزە ماوەیەك لەسەر فەرمانی شائیسماعیلی سەفەوی بە سەر دەرزینێ ڕادەگەیشت. کاتێ کە ئەو نەما، محەممەد بەگی کوڕی دەگەڵ میر ومەزنەکانی کوردستاندا هاتە بەر فەرمانی دەرك و دیوانی وێنە عاسمانی سوڵتان سەلیمخان و بە خشل و زیوەری جیهان جوانکەری تاوڕی شاهانە سەرفراز کرا و بە هەستی تەرز و بەزەیی بەرزی سوڵتانانە، کاری ساز درا و دەرزینی درایە.

لە دەرباری ڕۆژگاردا چوار کوڕی بە یادگار بەجێ هێشت: عەلی بەگ، شاقولی بەگ، یەعقووب بەگ و جیهانشابەگ.

### عەلی بەگ کوڕی محەممەد بەگ

لە پاش مەرگی بابی، براکانی کەوتنە بەربەرەکانی کردنی و لە سەر مەزنایەتی گەڕیان تێهاڵاند و شەڕیان پێ فرۆشت. لە ئەنجامدا بە هێزی دەست و بازوو زۆری، ئەوانی برد و خپی کردن و حەوساڵان بە بێ بەرهەڵست فەرمانڕەوایەتی کرد و کە ئەویش مرد براکەی:

---

١- لە دەستنووسێکدا «دردیز» و لە یەکی ترا «دیرزینر» نووسراوە.عەونی ڕەنگە «دێرزێر» بێ. هەژار

## شاقولی بەگ کوڕی محەمەد بەگ

ساڵی ٩٤١ك (١٥٣٤ز) لەسەر فەرمانی لە بان سەرانی سوڵتان سولەیمانخان کرا بە فەرمانڕەوای دەرزینی و بوو بە جێنشینی برای. هەشت ساڵان بە مەزنایەتی مایەوە. جارێکیان لە ئاستانەوە دەگەڕایەوە؛ لە شارۆکەی بولی، ناسر بەگی زەرقی گردکانی -کە لە زووێکەوە دوژمنایەتیان هەبوو- تووشی هات و خۆی و چەند پیاوێکی کوشت.

## یاقووب بەگ کوڕی محەمەد بەگ

لە پاش کوژرانی شاقولی بەگی برای، کرا بە کاربەدەستی هەموو وڵاتی سەر بە زەرقی. یاقووب بەگ زانا و خوێندەوارێکی لە زەبر بووە و سەرسۆفیلکە و دەروێشانەش هەڵکەوتووە و هاموشۆی پیاوانی خودا و هەژارانی زۆر کردووە. شێعری دەروێشانەی دەهۆندەوە و زۆربەی شێعرەکانیشی بە زمانی کوردی گوتوون و دیوانی شێعری بە کوردی هەیە. بۆ ڕەوشت پاکی و ڕەفتار چاکی و بۆ سەرداری و دنیاداریش، لە ڕۆژگاری خۆیدا بێوێنە و تاك بووە.

دوای بیستوپێنج ساڵ گەورەیی کردن، خۆی لەو ئەرکە گرانە نەبان کرد و دومانبەگی کوڕی خۆی لە شوێن خۆی دانا. دوو ساڵ بە سەردا تێپەڕیبوو، دومان بەگیش دەگەڵ میر ومەزنە کوردەکانیتردا چووبووە شیروان و لە شەڕی چاڵدیراندا قزڵباشان کوشتیان. لە پاش جوانەمەرگ بوونی دومان بەگ، یەعقووب بەگ تەنیا ساڵێك ژیا و سەفەری مەرگی هاتە بەر و نەمان نەیهێشت چیدی لە دومان بچی و ناردیە لای دومانی کوڕی. دومان بەگ دوو کوڕی لە دوو مان: محەمەد بەگ و عەلی بەگ.

## محەمەد بەگی کوڕی دومان بەگ

ساڵی ٩٨٦ك (١٥٧٨ز) -کە دومان بەگ کوژرا- یەعقووب بەگ، محەمەد بەگی پازدەساڵانەی نەوەی لە جێی بابەکەی دانا. دەگەڵ ئەو تەمەنکەمیەشی، ئەوەندەی بە لەباری سەرداری دەکرد و هێندەی لە باری دەزانی کە لە کردەی زۆرکردەو پیرانیش تێپەڕیبوو، بە جۆرێك سەرویەری بە مەڵبەندەکە داو دەوڵەمەندی کرد و بە ئەندازەیەك ڕێز و پایەی بەرەو خۆی برد کە باب و باپیرانیشی هەرگیز ئەوەیان بە خۆیانەوە نەدیبوو.

محەممەد بەگی گردکی هەر لە کۆنەوە دوژمنایەتی دەگەڵ ئەو بنەماڵەدا هەبوو؛ بۆرەخزمێکی شەمسەدین کەدخودای حەزوەییش بوو. شەمسەدین دنەیدا کە تۆڵەی کۆن لە محەممەد بەگی تازەمیربستێنێتەوە. دەمی فیز و هەوا دەماندی و پفی کرد و شەیتانی شەڕ دەدمی تفی و لە خشتەی برد و دەم و لەوسی کەدخودا بوو بە ئەستێ و بەرد پریشکی پەڕاند و بە مێشکی وشکی گەیاند و ئاگری ڕك و کینی هەلکرد و دەمحەممەد بەگی دەرزینی بەردا و چەندین گوند و مەزرای لەو ناوەدا تالان کرد و سووتاند و زیانی زۆری پێگەیاند.

محەممەد بەگی دەرزینی هێندێك ئامۆزا و پیاوی دڵسۆزی خۆی ناردن و ڕایسپاردن کە ئاگاداری سنووران و پارێزگاری وڵات بن و دەست وەبەر دەستدرێژکەران بهێنن.

محەممەد بەگی گردکی لە هێرشەکەی پێشوویەوە چێشتە ببوو، لای وابوو ژاژی بۆ ڕۆ کراوە؛ نەیدەزانی تەڵەی بۆ نراوەتەوە. دیسان خۆی لێ گیف کردن و بە گەف و هەڕەشەوە هەڵەشەبوو هاتەوە جەستەی دەرزینیەکان. بەڵام وەك دەڵێن: «دایکی دز جارێك سنگ دەخوا و جارێك سنگ دەکوتێ»، پیاوەکانی محەممەدی دومان بەگ بەر سینگەیان لێ بریەوە و قەڵت و بڕیان وە خۆی و پیاوەکانی خست و بڕستیان بڕی و لە شەڕدا مەزنی هێرشبەر چەند تیغ و تیرێکی بەرکەوت و بریندار کرا و کەلاکی لەو گۆڕە کەوت و بە نیوەگیانی لە مەیدانیان ڕاگوێزت و گەیاندیانە قەڵای گردکان و لە پاش ڕۆژێك ئەو نیوەگیانەشی لە دەمی برینانەوە هاتە دەر و بەر تالانی عیزرایل کەوت.

محەممەد بەگی دومان بەگ دەیزانی هێندێك لە ئاغاکانی بەردەستی خۆی لە بنەوە دەگەڵ دوژمنیدا ڕێك بوون؛ گرتنی و کوشتنی و ماڵ و داراییشی بە تالان بردن.

ئێستا کە ساڵی ١٠٠٥.ك یە، بە سەربەخۆیی و بێ بەرهەڵست فەرمانڕەوای وڵاتەکەیەتی. لەم بەینانەدا بە هەوای کۆمەگی میرشەرەفی جزیر ویستی محەممەد بەگی کوڕی خدر بەگی خزمی خۆی لە حەزۆ دەر بکا و بەهائەدین بەگی مرادخانی لە جێ دانێ؛ بەڵام ئەو گاشە گرانەی نەتوانی و کەوتە بەر تیر و توانج و تیز پێ کردنی هەواڵانی. چونکە جوانکەیە، لە خوا دەخوازم کە ڕێگەی ڕاستی نیشان داو فێری پیاوەتی و ئەمەگداری بکا.

ئەی دڵ گومان نەبەی کە ئەمەگ بێتە ڕێت چجار یان هەر نەهاتە سەر زەوی یان بوو بە بەفری پار

## دەستەی دووەم
# فەرمانڕەوایانی گردکان

لەمەوبەر قەڵشتی قەڵەم دەڵاندی و خشپە و جیسڕەکەی گەیاندی کە هابیلی شێخەشینە (شێخ ئەزرەقی)، دیرزیری وەگیر خۆ خست. کوڕی کە ناوی قابیل بوو چووبووە زگ کچە کاولیەك و زگی پڕ کرد و بیژۆیێکی لێ ببوو.[1] بۆ ئەوەی هابیل پێ نەزانی و ئەو شوورەییە شرت و گوم کا، کوڕە چکۆڵە زۆڵەکەی ناردەگردکان. فەرمانڕەوایانی گردکان ئەوە و نەتیژەی ئەو پیژەن و ئامۆزای میرەکانی دەرزینین.

میرناسری گردکانی و خاوەنەکانی دەرزینی، لەسەر گوندێك کە لە دژی دوو ناوچەیە و سەرسنوورە (تم و تم و هەرو) هەر هەر کێشە و هەرایان بووە و کامیان زۆری بەسەر ئەویتردا شکاوە، مناری وەبەر خۆ داوە و چەند جار دەستاودەستی کردووە؛ تا سەرئەنجام شاقولی بەگی میری دەرزین چۆتە دیوانی سولەیمانخان و فەرمانی ڕەنگینی وەرگرتووە و مناری وەسەر دەرزینی خستووە. ناسر بەگ کە ئەمەی بیستووە، ڕك و کینەی لە سینەدا هەڵگڕاوە و لێ بڕاوە کە تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوە و بە نۆرەی خۆی ئەویش دەربی لێ بداتەوە. دەستە و بەستەی کۆ کردنەوە و وەشوێن خۆی دان و شوێنی شاقولی هەڵگرت و نیازی وابوو لە هەر شوێنێك تووشی یەك بن کاری دەگەڵ یەکلا بکا و بیبڕێتەوە و ئەو فەرمانەی کە هێناویە بە خوێن و خوڕ بسڕێتەوە. شاقولی بەگ دەگەڵ هێندێك لە نۆکەران —کە لە پاتەختەوە دەگەڕانەوە- وەبەر بۆسەی ناسر هاتن و لە پاش شەڕ و پێکهەڵپڕژان، هەموو کوژران. ئەمیرلیوای شاری بولی کە بەم ڕێگریەی زانیەوە، گرد و وردی خەڵکی شاری گەلەجاڕ داو پەلاماری ناسر بەگیان داو خۆی و سی کەس لە نۆکەرانیان دەردەست کردن و باڵ بەستە هێنایاننەوە. دەنگ و باس بە پێچکی تەختی خەلیفە گەیشتەوە و لە کۆشکی شکۆدارەوە فەرمانی بێ چەند و چوون بۆ بە

---

[1] - کاولی یان کاوڵی: تیرەیەکی هەرجایی و بێ نیشتمانن و لە بەر چاوی مەردم سووکن.

درداکردنی ناسر بەگ و هەواڵانی دەرچوو. هەر سێ و یەك نەفەریان بە داری دەم ڕێگەوە هەڵاوەسین و هەموو لە ڕێ لاداوێکیان پێ چاوترسێن کرد.

دەتەوێ بێدەس و هەژار تێر بن؟ دەس درێژان هەژار و بێ نان کە!

دەتەوێ ئاوەدان بێ مەڵبەندت؟ کێ دز و چەوتەماڵی وێران کە!

## محەممەد بەگ کوڕی ناسر بەگ

لە پاش کوژرانی بابی گردکانی درایە. فەرموودەی پێغەمەری خودایە کە «خۆشەویستی و نەویستی دەبنە کەلەپوور». ئەویش لە ڕکەبەری دەرزینیان خۆی دەگەڵ شەمسەدین کەدخودای حەزوەیی و زەینەڵ بەگی شێروەیی ڕێك خست و دژی محەممەد بەگی دەرزینی دەخەبتی. وەك لەوەپێش لێی دواین، لە دواییدا ئەویش لەو ڕێگەدا سەری تێدا چوو؛ پیاوەکانی محەممەدی دومان بەگ کوشتیان.

## ناسر بەگ کوڕی محەممەد بەگ

ئەگەرچی منداڵیش بوو بە کۆمەگی شەمسەدین کەدخودا لە جێی باوکی دانرا و گوندی منار و هێندێك ماڵ و دراویشی لەباتی خوێنی بابی و نۆکەرە کوژراوەکانی پێدرا و فەرمانڕەوای حەزۆ و زەینەڵ بەگی شێرۆیی بوونە هۆی ئاشتبوونەوەیان و بڕیار درا مەحموود بەگی زەرقی -کە کوێخای محەممەد بەگی دەرزینی و هەوێنی کوژرانی محەممەد بەگی گردکانی بوو- لە دەرزینی نەمێنی و محەممەد بەگ دەستی بە ڕووی ئەو میرانەوە نەنا و مەحموود بەگی پاڵ پێوە نا و ئەویش پەنای بە بدلیس برد.

لە پاش چەند ڕۆژێك بە فیتی شەمسەدین کەدخودا، نۆکەرانی مەحموود بەگ ئاغای خۆیان کوشت و بەرەو حەزۆ هەڵاتن. خوێنی مەحموود بەگ ئاگری ڕکی ناسریەگی بە یەکجارەکی کوژاندەوە و نێوان ناخۆشی لە نێواندا نەما.

ناسر بەگ هێشتا منداڵ بوو گاڵتە و گەپی منداڵانەی لێ خۆش دەهات و ڕۆژگاری خۆی بە هەرزەکاری و گەمە و گەپەوە دەگوزەراند. حەسەن ناوێك نۆکەری بوو، نازناوی چەنبەری لێ نرابوو؛

پیاوێکی گاڵتەجار و حەنەکچی بوو. چەنبەر ببووە خەمڕەوێنی و ناسر بەگ زۆر هۆگری ببوو. ڕۆژێک چەنبەر لە تەزیوی بەنگ‌کێشاندا لە جەنگەی ڕاو و شکاردا هەر بە گاڵتە، خەنجەرێکی داهێنایە و سەری کرد و سینەی ئاغای وەبەرهات و نووکی خەنجەر سینگی سمی و بە دیواودەری لە پشتیەوە سەری هەڵدا و ناسر بەگ خەڵتانی خوێن بوو؛ دەستە و لە جێ هەر لەو جێیە مرد. خزم و کەس و دەسە و بەسەی ناسر بەگی کە لەوێ بوون، ئەمەیان دی داورووکان و بە پێلاقە و بە چەپۆکان بەری بوونی و چەنبەریان لە چەرخی چەنبەر داو هەست و خوستیان لێ بری و جەفەنگ و خەیاڵی بەنگیان لە سەر دەر کرد و سەنگەساریان کرد.

کابرایەک هەبوو میرخەلیلیان پێ دەگوت. لە ڕۆژگاری ناسری باپیری ئەم ناسرەدا کوێخای گردکان بوو. لە پاش خنکانی ناسر بەگ بە سەر وڵاتەکە ڕادەگەیشت. کاتێ کە محەممەد بەگ هاتە سەر کار، میرخەلیل باری کرد و لە کن ئاغایانی کورد نۆکەری دەکرد و لە پاشان لەبەر پیری و زەبوونی بە گردەنشینی هاتەوە گردکان و لە لای میرناسری چکۆڵە پەنانشین بوو. ڕۆژی کارەساتەکە دووزمان و شۆفاران میرخەلیلی بەستەزمانیان تێوە داو گوتیان بە فیتی ئەو چەنبەر ئەو خەنجەرەی وەشاندووە. خەڵکەکە هاروژان و ئەو پیاوە بێتاوانەشیان کوشت.

میرناسر دوو کوڕی سەروپێچکەی لە پاش بەجێ مان: میرمحەممەد و میرئەبووبەکر. ئێستا بەرامبەر بە فەرمانی سوڵتانی، میرمحەممەد لە جێی بابی فەرمانڕەوای گردکانە.

## دەستەی سێهەم

# فەرمانڕەوایانی عیتاق[1]

خانەدانی ئەحمەد بەگ کوڕی میرمحەمەدی زەرقی، لە بنەماڵە بەناوبانگەکانی کوردستانە و ئەحمەد بەگ هاوزەمانی شائیسماعیلی سەفەوی بووە. ئەو سەردەمە کە ئەو شایە دیاربەکر و کوردستانی داگیر کرد، عیتاقی لە ئەحمەد بەگ ساند و بە هۆزی قاجاری سپارد.[2] هۆزی زەرقیش لە زێد پەڕەوازە بوون و بە وڵاتاندا بڵاو بوونەوە. دوای ئەوە کە خانمحەمەدی ئیستاجلوو کوژرا و شائیسماعیل لە چاڵدیران شکا، لە هەموو لایەکەوە کوردەکان وەخۆ کەوتن کە مەڵبەندەکانی خۆیان بستێننەوە.

کوردەکانی عیتاق زستانی ئەو ساڵە خۆیان خزاندبووە ناو وێرانەکانی قەڵای مەڵخەوە. قاجارەکان -کە لە ناو قەڵای عیتاقدا بوون- ویستیان لەو کاولە قەڵایەشیان وەدەر نێن. زەرقیەکان زۆریان لە بەر پاڕانەوە کە زستانە و دەرەتان نیە و هۆزی مەرداسی دوژمنمانن و دەترسین ئەگەر بەجێمان بزانن، بێنە سەرمان؛ دەرنەچین و لە سەرمان کەسیرە ببین و وردەو یەخسیرمان بەرن. ئەگەر هەتا بەهار لێیان گەڕێن و دەریان نەپەڕێنن، ئەوسا بۆ خۆیان باردەکەن و سوپاسگوزاریش دەبن. قاجاری دڕدار بەزەیی پێدا هاتن و وازی لێهێنان.

زەرقیەکان کە زانیان تازە قزڵباش نایەنەوە سەریان و دەستیان لێ بەرداون، بۆ گرتنەوەی قەڵای خۆیان، خۆیان ساز کرد و نەردیوانێکی لە دار و پەتیان لێك داو لە شەوێکی تۆف و تووشی زستاندا ڕازەوانانی کورد ئەو سەری گوریسیان دەلێواری بورجان ترینجاند و دڵاوەرانی زەرقی بە پەیژەدا چوونە

---

١- لە کۆنە کتێبەکانی ئیسلامیدا، قەڵای «هیتاخ» بەناوبانگە؛ ئێستا ناوی لیجەیە و لە ئەستانی دیاربەکرە و سەربە تورکە. عەونی

٢- قاجار هۆزێکی زلی تورکمانە و خەڵکی ڕەی و ئوستراباد و تەبەرستانی باکووری ئێرانن و ماوەیەکیش شایەتی ئێرانیان کرد. جەمیل

بان و لە سەر بانڕا دەست لە بان خەنجەر بۆ عەجەمان چوونە خوار و تێیان بەربوون و قەڵت و بڕێکیان تێخستن کە نەبێتەوە. قزلباشی خەواڵوو هێشتا چاویان هەڵ نەگلۆفیبوو سەریان بڕا و تاقیان لێ بڕا و سەرەکانیان بە بەنەوە کردن و وەک کوولەکە سەراوی بە دیواری قەڵادا شۆڕیان کردنەوە و کەلاکیان گۆڕ کردن و ماڵ و منداڵیشیان لە قەڵا وەدەر نان. پیاویان نارد و ئەحمەد بەگیان هێنایەوە و مەزنایەتیان پێ دایەوە و فەرمانی سوڵتان سەلیمخانیش میرایەتیەکەی داکوتا و ماوەیەک بە سەرداری مایەوە و بە پلەی تەمەندا سەر کەوت و لە سەربانی قەڵای ژیانەوە داکەوت و لە ژێر ئاخدا خەوت و سێ کوڕی لە پاش مان: شاهم بەگ، یوسف بەگ، مەحموود بەگ.

لە پاش بابیان هیچیان سەریان بۆ یەکتر نەچەماند و لە سەر مەزنایەتی کردن پێک هەڵپڕژان و خەڵکیان لە خۆ تێکەیاند و لە ئەنجامدا هەرسێک چوونە ئاستانەی بەختخانەی سوڵتان سولەیمانخانی خەزاکەر، کە ئەو بۆیان پێ ڕابگا. میرزایەکیان لە دیوانی پادشاوە دەگەڵ ناردن، وڵاتەکەی لێ بەش کردن و بەشێکی باشیشی کردەپشکی تایبەتی سوڵتان.

زێڕیان دزیبوو سێ دزی بێ‌فەڕ　　لەسەر بەش کردن لێیان بوو بە شەڕ

ئەوان خەریکی مشت و مڕ کردن　　یەکی لاپرەسەن هات و لێی بردن

## شاهم بەگ کوڕی ئەحمەد بەگ

فەرمانی پیرۆز بۆ میری میرانی دیاربەکر هاتبوو کە میرزایەکی شارەزا بچێتە ناوچەی عیتاق و بەشی برایان تاق کاتەوە. میرزاش چەند گوند و مەزرایەکی بۆ مەحموود بەگ بە زەعامەت دیاری کرد کە ساڵانە بەر و بوومیان بە شێست هەزار ئاقچە بگا و یوسف بەگیش بە زەعامەت سەد و دەهەزار ئاقچەی بۆ جێکراوە و پارچە زەویەکانی دەوری ڕەبت و میافارقین و گوندی جەسقە و سەرانەی فەلەکان بوونە بەشی سوڵتان و دووسەد هەزار ئاقچەش هەر بە سنجاق بۆ شاهم بەگ بڕایەوە.

دوای ئەوە کە مەحموود بەگیش مرد بەشەکەی ئەویان بە ناوی ئالیکانە بە قوباد بەگی ڕەمەزانلوو بەخشی و لە ڕۆژگاری وەزیرەتی ڕوستەم پاشادا شاهم بەگیان کردەخاین و بە فەرمانی سوڵتان لە سەریان دا. ناوچەی عیتاق نزیکەی بیست ساڵ لە دەست میرانی زەرقی دەرکەوت و

میرانی عوسمانی دەیانخوارد.

## یوسف بەگ کوڕی ئەحمەد بەگ

لە سەروبەندی هەرای ئەلقاس‌میرزادا، کە پادشای سولەیمان پایە هەر بە خودی خۆی بەرەو ئازەربایجان دەچوو، سنجاقی عیتاقی بە یوسف بەگ بەخشی و خستیە سەر زەعامەتەکەی و مەرجیشی بۆ داندرا کە قەلاکەی وێران بکا.

یوسف بەگ چەند سالێك بە سەر عیتاق ڕاگەیشت و خۆش دەژیا و کاتێ ڕۆژی لە سەر دنیا بڕیا، سەر لە نوێ عیتاق درا بە کابرایەکی عوسمانی کە ناوی ئەحمەد بەگی حاجی‌حوسێن بوو.

یوسف بەگ، حەسەن بەگ ناوێکی لە پاش بەجێ ما.

## حەسەن بەگ کوڕی یوسف بەگ

لە پاش مردنی بابەکەی ولاتەکە دوو سالان بە دەست بێگانەکانەوە بوو. کاتێ هەوساری خونکاری و دنیاداری و زنجیری گیسر و بەند و زەمینگیری هاتە ناو لەپ و دەستانی سولتان سەلیم‌خانەوە، حەسەن بەگ بۆ دادخوازی ڕووی کردەکابەی نیازان و سەردەرانەی کارسازان، کە ئاستانەی سولتان بوو. بە یاریکاری و هیمدادی محەممەد پاشای گەورەوەزیر، بەر بەزەیی بەرێزەوی سولتان کەوت و عیتاقی بە سنجاق پێ بەخشرا و بیست سالّ میری و گزیری کرد.

هەتا بلێی پولەکی بوو؛ لە قەمچیشی باش دەزانی. گردەوەکۆیی بەو دەکرا لە وزەی دێویشدا نەبوو. کەس وانەبوو؛ قۆشە- قۆشە و پارە- پارەی سەر یەك دەنا و زارکی کیسەی لێ وێك دەنا و لەو کون، لەو کاژێڕ، لەو پەنا دەیشاردەوە. هەموو ژیانی وا بە سیسی و چیڕکیسەیی و دراو زۆری و ئاننەخۆری بەسەربرد و بە زگی نێز و لەسوێی ژەمێ خۆش و چەور، کامی کرد و تامی نەکرد و مرد.

| | |
|---|---|
| کێ زۆر چنۆك و پیسە، بە ڕژدی بیبەزێنە | زێڕ بساخنە قولینچکان وەك مشکی سەر خەزێنە |
| ئەو ڕۆژی دەچیە بن گلّ، هەزار گرێ لە سەردلّ | مشکان لە مێشکی وشکەت بازباز و گەزگەزێنە |
| کۆت کردەوە بە بێ‌هۆ، ویستت نەخۆی دەبیخۆ! | ئەو بازە سلّ بەزێنە، ئەو گازە دلّتەزێنە |

کە چنگ و پلی لە دنیا شل کرد و چوار پەلی ڕاکێشا، جگە لە گەنجینەکەی، دوو گەنجی بە ناوی یوسف و وەلی لەپاش بەجێ ما.

لەسەر فەرمانی بەڕێز و جوانی سوڵتان مرادخانی خوالێخۆشبوو، جێگەی حەسەن درا بە یوسف بەگ؛ بەڵام هێشتا لە تەمەنی گوڵدا و هیچ گوڵی نەکردبوو کە تەزووی ساردی پایزی مەرگی بەسەردا هات و گوڵی ژیانی پەرپەڕ کرد و هەڵیپڕیواند و بۆ گۆڕستانی شاند.

## وەلی بەگ

میراتەکە بۆ ئەو مایەوە؛ بەڵام جیهانشابەگ کوڕی زۆراب بەگ -کە دوورە پسمامێکی بوو- گەڕی تێهاڵاند و دەستەبەر بوو کە ئەگەر عیتاقی بدەنێ هەر ساڵێ بیست هەزار فلوری بە خەزێنەی دیاربەکر بدا. لە بارەگای پادشای گەردوون کەمەرەوە، بازی بەزەیی بە سەرەوە نیشتەوە و عیتاقیان بە سنجاق دایە، وەلی بەگ بەو دراوە بۆ خۆی هەڵیگرتەوە و جیهانشا لەو سەودایە هەڵی‌نەگرتەوە. لە پاشانیش کە برایم پاشای نەگریس و بێ‌فەڕ دژی دەوڵەت ڕاپەڕی و گەڕی دەوڵاتی ڕەبیعە [مووسڵ] هاڵاند و شەڕی بۆ دیاربەکر و کوردستان[1] بە دیاری هێنا، لە بەرانبەر چل هەزار فلوریدا -کە ساڵانە بە دیوانی دیاربەکر بگا- عیتاقی دابە زولفەقار بەگی کوڕی شاهم بەگ.

کاتێ لەسەر فەرمانی پادشایی، برایم پاشالە والیەتی دیاربەکر بەرکەنار کرا و بردیانە ئەستەنبووڵ و لە یەددی‌قەڵە [حەوقەلا]دا خرایە گرتووخانەوە و کاتێ کە پادشای خاوەن شکۆوشان سوڵتان محەممەدخان -هەر پایەدار بێ- هاتە سەر تەختی هۆگرەبەخت و لە سەر کورسی کیسرا و قەیسەران، چوار میتردەکی دادا، ملی ئەو حەجاجە دومینەی بادا و کردیە پەندی پساتی و بۆ ترسانی بەدکارانی ناهەنجار لە مەیدانی ئەستەمبووڵدا بەداردا کرا.

پیاوی بێ‌فەڕ سەری با هەر شۆڕ بێ زەوی پێ پیس دەبێ با جێی گۆڕ بێ

وەلی بەگ وەك پێشوو بە بێ‌مەرج و پێودان و دوور لە کێشەی دووزمانان، مەزنایەتی عیتاقی کردەوە هی خۆی و ئێستا ئەو ناوچەیە لە دەست ئەو دایە.

---

[1]- نیازی لە کوردستان مەڵبەندی چەمشکەزەکە؛ کە ئێستا لیوای دەرسیم و دەوروبەریەتی. جەمیل

## دەستەی چوارەم
# فەرمانڕەوایانی تەرجیل

شوێنی پێشووی زەرقیەکان تەرجیل و عیتاقە. تەرجیل لە نزیك دیاربەکرە و دوو قەڵای هەیە قەڵای تەرجیل و قەڵای دارعین[1] و دەرزینی و گردکانیش لکی ئەوانن. هەوەڵین حاکمی زەرقی سەیدحەسەن کوڕی سەید عەبدولڕەحمان، کوڕی سەید ئەحمەد، کوڕی سفیل، کوڕی سەید قاسم، کوڕی سەیدعەلی، کوڕی سەید تاهیر، کوڕی سەید جەعفەری کوژراو، کوڕی سەید یەحیا ئەقتەع، کوڕی سەید ئیسماعیلی گەورە، کوڕی سەید جەعفەر، کوڕی ئیمام محەمەد باقر، کوڕی ئیمام زەینەلعابدین، کوڕی ئیمام حوسێن، کوڕی ئیمام مورتەزاعەلی خوا لێی ڕازیبووە.

گوتمان سەیدحەسەن لە ئالی شامەوە کەوتۆتە ماردین و لە ناوچەی عیتاق نیشتەجێ بووە و لە گۆشەیەکدا کروشمەی کردووە و پیاوێکی لە گوناه دوور و لە خوا نزیك و خۆپارێز و لە خۆشی جیهان دوورەپەرێز و لە ژیانی نەرم و نیان بە قێز و بێز بووە و کەمی خواردووە و زبری پۆشیوە و گەل و حەشامات بە دڵ و داو بڕوایان پێ هانیوە و بە شێخیان زانیوە. دەڵێن چاوی شین بووە؛ دەشڵێن شینی دەبەر کردووە و بە شێخحەسەنی شین ناویان بردووە.

لەو سەروبەندانەدا ئەمیرێکی پایەبەرزی سەر بە سەلجووقیان -کە ناوی ئەمیرئەرتق کوڕی ئەکسەب بووە- پێ ڕاگەیشتنی دیاربەکر و ماردین و خەرپووت[2]و مجەنکورد و حەسەنکێفی پێ سپێرابوو. کچێکی یەکجار جوان و هێژای هەبووە ماخولیایی تووش بووە و لە ئەنجامدا شێت بووە. هەر چەندی بژیشکانی کارامە دەرمانیان کردووە بەهرەی نەداوە و ڕۆژبەڕۆژ دینتر بووە. ئەمیرئەرتق هاواری بۆ شێخحەسەنی ئەزرەقی ناردووە، کە نزایەك دەربارەی کیژەکەی بکا. شێخ هێندێکی بە سەر ئاودا ورتاند و بە سەر کچەیدا پرژاند و لە ودمی پیرۆزی شێخەوە، خوای گەورە کیژی میری

---

[1]- داراچن. عەونی

[2]- لە دوو دەستنووسدا لە جیاتی خەرپووت جزیرە نووسراوە. عەونی

چاکردەوە. ئەمیرئەرتق کیژەکەی بە شێخ پێشکێش کرد؛ شێخ نەیویست و لە سەیدحەسەنی کوڕی مارە کرد و هەر وەك لەمەوبەر لە سەرەتای باسی دەرزینیدا گوتمان، ناوچەی تەرجیلی پێ بەخشیوە[1] و ماوەیەکی زۆر تەرجیل و عیتاق بە دەست سەید حەسەنەوە بووە و بە میرات بە ئەحمەدی سەیدحەسەن و سولەیمانی کوڕی قاسم و یوسف و حوسێن گەیشتووە و کە ئەویش مردووە، عومەری حەسەنبەگ جێگەی گرتووە.[2]

## عومەر بەگ کوڕی حەسەن بەگ

بووە بە جێنشینی بابی و چۆتە لای ئوزون‌حەسەن بایەندوری[3] و زۆری ڕێز لێناوە و کچی عومەریشی لە خۆ مارە کردووە و ناوچەکانی میهرانی و نەوشادی خستۆتە سەر تەرجیل و عیتاق و پێی بەخشیوە. حەسەن بەگ کوڕێکی لە کیژی عومەربەگ بووە و ئەو کاتە کە هێندێك ولاّتی لە کوردستان گرتووە، میرایەتی عیتاق و تەرجیلی داوە بەو کوڕە و بە بدلیس ڕاگەیشتنیشی بە عومەر بەگ ئەسپاردووە.

## بداغ بەگ کوڕی عومەر بەگ

کە بابی مرد، ئوزون‌حەسەن ولاّتی بدلیسی نایە بەردەست و کاتێ یەعقووب بەگی کوڕی حەسەن بەگ لە سەر تەختی پادشایەتی ئێران دانیشت، سالی ٨٨٨.ك (١٤٨٣.ز) تەرجیل و عیتاقی وەك پێشوو دایە بداغ بەگ و چەند سالێك لەوێ فەرمانڕەوایی کرد و لە گۆڕستاندا حەسایەوە.[4]

---

١- لە سەرەتای باسی زەرقیدا کچ شێت نەبوو؛ میر پادشا بوو؛ ناوی سەیدحەسەن کوڕی شێخ‌حەسەن نەهاتووە. بۆ دەرزینیش هەر هابیلە و حەسەن نیە؛ لە ڕەسەننامەکەشدا دوو حەسەن نین. لێرەشدا گوتی: تەرجیل و عیتاق بۆ سەیدحەسەن بووە. وادیارە سەیدحەسەنی کوڕ زیادە. هەژار

٢- دەبێ حوسێنی دوای یوسف حەسەن بووبێ و عومەری بووبێتە جێنشین. هەژار

٣- حەسەنی درێژ لە دیاربەکر و ئازربایجاندا دەولەتی ئاق‌قۆینلووی دامەزراندووە. عەونی

٤- بداغ بەگ سالی ٩١١.ك (١٥٠٥.ز) مردووە. عەونی

### ئەحمەد بەگ کوڕی بداغ بەگ

جێگەی بابی گرتەوە و دوو ساڵان مەزنایەتی کرد و ساڵی ٩١٣.ك (١٥٠٧.ز) کە شائیسماعیلی سەفەوی دیاربەکری گرت، قزڵباشان شەهیدیان کرد.

### عەلی بەگ کوڕی بداغ بەگ

لە جێی برای مەزنایەتی دەکرد و بیست ساڵان بە میرایەتی مایەوە و ئەوسا مرد.

### شەمسی بەگ

دوای ئەوەی کە میر ومەزنەکانی کوردستان لە باری ناڵەباری قزڵباشان وەڕەز ببوون، هەموو هاتنە بەر فەرمانی ئاستانی سوڵتان سەلیمخانی خوالێبوردوو. بەڵێنی تەرجیلی پێ درا و لەو کاتەدا کە فەرمانی هەرە کاریگەر بۆ ڕزگاری دیاربەکر دەکار کرا، ئەوساش تەرجیل ئازاد کرا و دەبەردەس شەمسی بەگ نرا. کاتێ ئەویش بەرەو گلکۆ بەر و بوخچەی کۆکردەوە، کوڕەکەی جێگەی گرتەوە.

### حەیدەر بەگ کوڕی شەمسی بەگ

سەبارەت بە فەرمانی تەرز و جوانی سوڵتان سولەیمانخانی خەزاکەر، میرایەتی میراتی بەو گەیشت و لەجێی بابی خۆی دانیشت. لەو کاتەدا کە مستەفاپاشای سەردار بە لەشکری هەمیشە لە سەرەوە بەرەو شیروان و گورجستانی ئاژۆت، لە شەڕەکەی چاڵدیراندا حەیدەر دەگەڵ گەلێك لە میرە کوردەکان بەر پەلی قزڵباشان کەوت و کوژرا و نەگەڕاوە.

### بداغ بەگ کوڕی حەیدەر بەگ

لە لایەن مستەفا پاشای لالە سەردارەوە میرایەتی درایەوە و پازدەساڵ مەزنایەتی کرد و ئیمجا بەر پەلی مەرگ کەوت و لە چاڵی دەخمەدا لێی خەوت و تازە هەڵنەستایەوە.

## حوسێن بەگ کوڕی بداغ بەگ

کرا بە جێنشینی باوکی و ماوەی هەشت مانگان باوی بوو. ئەوسا مەرگ ماوەی نەدا و جێگەی لە ناو گوڕپیچەدا بۆ دیاری کرد.

## ئیسماعیل بەگ کوڕی بداغ بەگ

لە پاش برای کرا بە میر وچوار سالانی سەرداری کرد و لە پاشان مرد.

## عومەر بەگ کوڕی حەیدەر بەگ

لە دیوانی پادشایی جەمئاسایی سولتان مرادخانەوە فەرمانی هەمیشە بەکاری بۆ دەرچوو کە فەرمانڕەوای تەرجیل بێ. عومەر بەگ لاوێکە لەوەند و مەرد و ڕەند و خۆڕێکخەر. زۆر دەگەڵ ڕۆمیان تێکەڵاوە و زۆربەی وەخت و کات و ساتی بە هاودەمی میسری میرانی دیاربەکر دەباتە سەر و کوردەکانی دیاربەکر هەرگا کاریان لە دیوان بێ، دەچنە لای و کاروباریان بۆ پێك دێنێ.

# بەندی هەشتەم

# فەرمانڕەوایانی سوێدی

زێڕینگەرانی وەستا و لێزانی خشڵسازدانی بووکی چیرۆکان، کەوهەرناسانی ڕاستەبازاڕی گەوهەرستانی پیرەدیرۆکان کە ڕەنجیان کێشاوە و سەرنجیان داوە و کونجی کەنجینەی دەنگ و باسانیان کۆڵیوەتەوە، لە دوڕ هەمووان‌دا دوڕی نەپەنی کەونە ڕەسەنی سوێدیەکانیان دۆزیوەتەوە و لە ڕشتەی گشتی گەشتی مێژوودا -بە گشتی- وایان هۆنیوەتەوە کە سەرچاوەی دووری ڕەگەزی بنەماڵەی میرانی سوێدی، دەگەڵ دەراوی بەرەی بەرمەکیان لێکدەداتەوە و تێکدەکاتەوە. هۆزەکانیشیان وەچەی «أسوَد» (ڕەش)ن؛ کە لە وەختێکدا کوێلەی یارێکی پێغەمبەر -درودی خودای لە سەر بێ- بووە. هێندێکیش دەڵێن ژێگەی سوێدیان گوندی سوێدە؛ کە دوو قۆناغ ڕێی مەدینەی ڕوونە و بە لای شامدایە. خوا زاناترە.[1]

بەڵام بەرمەکی[2] ڕگەزی خۆیان بە کیسراکانی فارس دەگەیەننەوە و زۆر لە مێژەوە لە بەلخ دەژیان و ئاگرپەرست بوون؛ هەتا لە نەکاو سروەی بەزەی خوا ئەنگوتووە و بەر تیشکی پەخشان و بێبڕانەوەی کەوتوون و لە گاوری و ئاوری دۆژەهی تەکاندوونەوە و بە دڵی خەمین و دیدەی نمینەوە لە دینی پێشوو پۆشمان بوون و هامێزیان بەهێز دەموسوڵمانی وەرێناوە و گەندەڵەداری بێ باوەڕییان لە بن و

---

١- ئەوی بە ئەقڵەوە دەنووسێ هەر ئەمەیە کە ئەم کوردەسوێدیانە لە قەڵای «سوێدا»وە هاتوون کە ئێستا سیورەکە و دەنێوان دیاربەکر و ئۆرفا دایە. عەونی

٢- لە تورکستانەوە ڕەگەڵ لەشکری دژی ئەمەویان کەوتوون و هاتوونە عیراق و بۆ دامەزرانی دەوڵەتی عەبباسی زۆر تێکۆشاون. چواریان زۆر بەناوبانگن: ١- خالید کە دەگەڵ ئەبوموسلیمدا هاتۆتە عیراق و بۆتە وەزیری عەبباسی خوێنڕێژ. ٢- یەحیا کوڕی خالید کە ئەبووجەعفەری مەنسوور، ئازربایجانی پێسپارد و مەهدی کردیە وەزیر. ٣- فەزڵ کوڕی یەحیا کە لە زەمانی هاروونەڕەشیدا وەزیر بوو ٤- جەعفەر کوڕی یەحیا کە وزیری هاروونەڕەشید و هەمەکارەشی بوو. لە ڕۆژگاری جەعفەردا فەرمانی بەرمەکی قڕان دەرچووە. جەمیل

ڕیشە دەرێناوە.

ڕوونە چاوێ ئاوی بۆ تۆ تێ‌تزا       کامڕەوایە دڵ کە بۆ تۆ هەڵکزا

جەعفەری باوکی خالیدی بەرمەکی لە ڕۆژگای عەبدولمەلیک کوڕی مەڕوان یان لە زەمانی سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیکدا بە دارایی و سامانی زۆرەوە هاتۆتە دمشقی پاتەخت و کە پادشابە هاتنی زانیوە، لێی گێڕاوەتەوە و هێناویەتە کۆڕی دیوەخان و هەر بە هاتنی، ڕەنگی شاگۆڕاوە و دەنگی پیاوانی لێداوە و لە دیوانیان وەدەر ناوە. کاتێ هاونشینان هۆی ئەو ڕەنگ گۆڕان و دەنگ گۆڕانەیان پرسیوە، لە پەرسڤدا فەرموویە: من دوو مووروروم بە زەندمەوە بەستۆتەوە، دژی ژەهرن. ئەگەر ژەهریان تخون کەوێ دەبزوونەوە. ئەو کابرایە ژەهری پێیە و کە هاتە ژوور، مووروو جوولان و پێم زانی و لە میوانخانەی خۆم ڕانی. کاتێ لە جەعفەریان پرسی گوتی: بەڵێ ژەهرم پێیە و دەناو نقێمی هەنگولیسك دایە و هەرگا بکەومە تەنگانەی وا کە دەرنەچم و سەرەودەرەی لێ دەرنەکەم، ئەو ژەهرەی پێمە «بَرمَکَم» (هەڵی دەمژم) و خۆ دەکوژم. لەو ڕۆژەوە وێژەی بەرمەك بوو بە باو و بە نازناو بە سەریاندا برا.[1]

بێباکی جەعفەر لە مەرگ و بەجەرگیەکەی، زۆر لە سولەیمان خۆش هاتن و زۆر بە ڕووی خۆشەوە دواندی و کردی بە هاونشینی خۆی و ڕۆژ بە ڕۆژ پتری ڕێز دەگرت هەتا کردیە وەزیرێکی پایەبەرز.

ژیان هەنگوینە، ژەهری تێکەڵاوە       دڵی پێ خۆش بکەی، بیرت بڵاوە

مەترسە! بەرگی مەرگی بۆ دەبەرکە       بە مەردی بمرە، ناوی چاکە دەرکە

---

١- نیزامەلمولك ئەم چیرۆکەی شاوا بۆ ئەلپئەرسەلانی سەلجووقی گێڕاوەتەوە: گوایە سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیکی ئەمەوی زۆر خۆهەڵکێش بووە و ڕۆژێك بە بافیش گوتوویە: «دێوی لێ دەرکەی، چم لە سولەیمان پێغەمبەری هاوناوم کەمترە؟» پەردەدارێك لە وەراما گوتوویە: «گەورەم وەزیرێکی وەك ئاسەفی بەرخیات پێدەوێ». سولەیمان گوتی: «ڕاستە، بەڵام لە کوێ بێنم؟» کابرا گوتی: «جەعفەری بەرمەکی لە بەلخە و ساسانی هەر ئەوانیان دەکردە وەزیر و زۆر تیرەیەکی ژیرن». ناردیان هێنایان و لە دەری شارەوە پێشوازی لێ کرا و برایە خزمەت خەلیفە و دەست بەجێ گرتیان و خستیانە زیندان... تا چیرۆك دەبڕێتەوە. جەمیل

لەوە بە دواش ڕۆژگارێك خالیـد كـوڕی ئـەو جەعفـەرە و كـوڕی خالیـد وەنـاو جەعفـەر(؟)[1] لای ئەبوولعەبباسی سەففاح[2] و براكەی ئەبووجەعفەر دەوانیقی[3]، وەزیرایەتیان كردووە.

هەروەها لە سەردەمی خەلیفەگەری هاروونەڕەشیدیشدا، یەحیا كوڕی جەعفـەر لـە سـەر كورسـی وزارەت دانرا و ئەو پلە و پایەی بەو درا و ئەو ڕێزە و قەدرەی لەو نرا، هەتا ئەو ڕۆژە هیچ كەس شـتی وای بە چاو نەدیوە. خۆ نەخوازا كوڕەكانی ئەو یەحیایە (فەزل و جەعفەر و مووسا) لەم دنیایـەدا ئـەو پایە و مایە و ئەو بەخت و هاتەی بۆ ئەوان ڕەخسا، بۆ هیچ وەزیرێك لە ناو ئیسلامدا وا نەڕەخسیووە؛ خاكیان لە مشتدا دەبوو بە زێڕ و زێڕیان وەكووو خۆڵ بە تێر و جۆرك و خەرار بەخـشیووە. هـەر چـەند بزووتوون و هەر چەند سرەوتوون، بێ پشوو سـەركەوتوون و لـە هـەموو لاوە هـەر خێـر و بێریـان بـۆ داباریوە.

كە نەهاتیش هات، قۆرتی دژوارن. واهێرش دێنێ كێـو لـە بـن دێـنێ، شـاخ پـەڕرە دەكـا، كـەڵ هەڵدەدێرێ، حەزیا دەپسێنێ. ئەو بەرمەكیانەش لە سەرئەنـجامدا هەوێنی شیـری بەختیان هەڵگەڕا و پێچكە و ڕەوارەی چەسپان و ڕەختەی تەختیان و وەرگەڕا و نەهاتی چنگڕەش پێسیـری گرتن و جـاران كە شیـری مووكاری میسری لە ڕاست تاڵێك مووی ئەوانـدا كـول بـوو، ئـەوجار -كـە بـەلـەز بـەرەو هەڵدێران سەرەوژێر دەبوون- دەمی دووزمانـان كـاری لێكـردن؛ چپەی ناكەسـان لـە مێـشك و دڵـی هاروونەڕەشید بوون بە چێوەسان و تیژیان كرد و هانیان داو فەرمانی بەرمـەكی ڕاونیـان پـێ دەركـرد. جەعفەری وەزیر دەگەڵ هەزاران لە بەرمەكی‌تر بە داردا كـرا و یـەحیا و فەزلیـشیان خـستە زینـدان و

---

١- ئەو پرسە مامۆستا زیرنۆف دایناوە؛ چونكە جەعفەر كوڕی یەحیا كوڕی خالیدە. مامۆستا دەسەر هەڵەوە نەچووە. جەمیل

٢- عەبدوڵا كوڕی مـحەممەد، كـوڕی عـەبباس، كـوڕی عەبدولـموتەلیب، سـاڵی ١٣٢.ك (٧٥٠.ز) بوەتـە خەلیفـە. پیاوێكی بەخشندەو سەنگیـن و دڵڕەش و دەسروەشێن و خوێنرێژ بووە؛ ساڵی ١٣٦.ك (٧٥٤.ز) مردووە. جەمیل

٣- ئەبووجەعفەر مەنسوور ساڵی ١٣٦.ك (٧٥٤.ز) چەند ڕۆژێك بەر لە مەرگی برای، كرا بـە خەلیفـە. پیـاوێكی بـە برشت و سەنگیـن و تێگەیشتوو بوو؛ بەڵام زۆر دەستڕژد بووە و لەو چرووكیەی ناوی «دەوانیقی» (دانگی) بـە سـەردا براوە. ساڵی ١٥٨.ك (٧٧٥.ز) مردووە. جەمیل

دانگ شەشیەكی مسقاڵی زێڕ و زێوە. مسقاڵ چوار گرەم و نیوە. خەلیفە لە دانگێكیشی پرسیوەتەوە! دانق هەر دانگی كوردیە. هەژار

دەوێدا مردن.

خۆشی و ناخۆشی نامێنن بۆ کەس هەرچی دێتە دی، بڕانەوەی هەس

ماڵ و دارایییش -کە بێهەژمار و دوور لە پێوان بوو- هەمووی خڕ و پڕ بە سەر کۆی خەزنەی تـژە و دارماڵی دەوڵەتدا کرا.

پوختەی ئەمەیە: هاروون وای هاڕین کە هەتا ئێستاش کۆڕ و دیوەخـان بـە دەنـگ و باسـی ئـەو خانەوادەخانە بەربادە شەو ڕادەبوێرن و منداڵ و پیـران -بۆ پەندی دنیا- گوێی لێ دەدێرن.

هەر کەس بیەوێ زۆرتر دەربارەی ئەوکارەساتەی بەرمەکی دیتیان بکۆڵێتەوە، دەبێ وێکـەوێ ئـەو نووسراوانەی کە بۆ ئەم باسە تەرخان کراون بـخوێنێتەوە. ئـەم کتێبـەی مـن ئـەو توانـەی نـەبوو کـە سەرلەبەری تێدا جێ وەکەم؛ هەر وا بە کورتی و سەرچڵ لێی دوام. بەڵام من بـۆ خـۆم زۆرم ڕوانیـوە و پەڕە کتێبم زۆر پشکنیوە؛ تاوێستا هیـچم لـە چارەنووسـی مووسـای بەرمـەکی نەخوێندۆتـەوە و بـە بەرچاومدا تێنەپەڕیوە. گەلۆ! چی لێ هات؟ دوور نیە کاتێ هارونەڕەشـید بـاب و براکـانی دەردەسـت کردبێ، ئەو ڕایکردبێ و خۆی گەیاندبێتە ناو چیاکانی کوردستانەوە و بۆ شـوێنەونی نـاوی گـۆڕیبێ و لەو ناوە ژیابێ. چونکە چیرۆکێك دەمـاودەم هـاتووە و بـڵاو بۆتـەوە و وادەگێڕنـەوە کـە سێ کـوڕە بەرمەکی لە ڕۆژگاری عەبباسیانەوە لە لای بەغداوە پەڕەوازە بوون و لە کوردستاندا گیـرساونەتەوە و لە چیای شەفتالوو -کە سەربە کنجە- لە ناوچەیەکدا بە ناوی خانچۆك نیشتەجێ بوون و برا گەورەکە، بە نوێژ کردن و ڕۆژوو گرتن و خواپەرستیەوە خۆی خەریك کردووە و لە لاکی گەنی دنیای بێبنیـاد زۆر تەریك بووە؛ لەو دۆڵ و شیوە بەزەیی خودا سەری لێداوە و دۆز و ئاواتی بۆ پێك هێنـاوە و داوای هـەر چیەکی لە خوا کردووە پێی ڕەوا دیوە.

دەڵێن ڕۆژێکی براگچکەکە -بۆ پێداویستێك- لـە کـەل کـل بـووە. خـەڵکی ئـەو نـاوەش نـانی ڕۆژانەی شێخ و دۆسـتانی شێخیان هێنـاوە و شـێخ و یـاران و بـرای ناونـجی نانیـان خـواردووە و بەشە نانەکەی بـرا گـچکەشیان جوێ کردۆتـەوە. کـاتێ کـە بـرای بـچووك هاتـەوە و بەشـە ژەمـی ویست، برای ناونـجی گوتی تـۆ ڕۆیـی و هـەر نەهاتیـەوە و درەنگـت پـێچوو، منـیش پـێم وابـوو نانـت خـواردووە، بەشـەنانی تـۆش هـەر مـن خواردوومـە. بـرا گـەورە -کـە لـەو دەسدرێـژی و



خۆرایی برای زۆر تووڕە ببوو- تووك و نەفرینی خراپی لێ کرد؛ گوتی: تۆیەکی بە بەشەکەی خۆت دانەسەکناوی و پاری براشت دەورگت خزاند، لە خوا دەخوازم جێی ئەو پاروانەت پارەپارە بێ. شێخ هێشتا تەواو پاڕانەوەکەی لە دەم نەبڕابوو، ورگ و ڕیخۆڵەی برای پاروودز هەلا-هەلا بوو؛ هیچ کەس بە دەنگی نەگەیشتە سەر. ئیتر لەوساوە بڕوا و باوەڕی خەڵکی ئەو ناوە و ئەو دەوروبەرە بەرانبەر بە شێخ، لە یەك بوو بە سەت. هۆزی سوێدی لێی پاڕانەوە کە بچتە ناویان و دڵی نەشکاندن و دەگەڵ براکەیتردا -کە ناوی ئەمیرشەهاب بوو- کەژیان جێهێشت و هاتنە ئاوایی و ئاوایی خانچووك، بوو بە هی شێخ و قەڵا و دژێکی ڕژد و پتەوی لێ دروست کرد و بشبووە ڕابەر و پیر و پێشەوای سوێدیەکان و لە دواجاریشدا کە بە یەکجاری لە ژین تەکیەوە و تەکیدا بە لای گۆڕستانەوە، زارۆی نێرینەی بۆ جێنشینی لێ بەجێ نەما و میرشەهابی برای کار و بارەکەی ئەوی گرتە دەست و لەجێی براکەی کرا بە سەردار و لە وەچەی ئەویش ئەوانەی کە لەو ناوچە و مەڵبەندە فەرمانڕەوا بوون، بە یاری خودا یەك بە دوو یەکا باسیان دەکەم و ناویان دەنووسم.

### میرجەلال کوڕی میرشەهاب

لە پاش نەمانی شەهابی بابی، بۆ مەزنایەتی جێگەی گرتەوە و تا دێرزەمانێ گەورەیی کرد و سەرئەنجام ئەویش پێمیێردی خودای گەیشتە سەر و گیانی برد و مرد.

### میرمحەمەد کوڕی میرجەلال

لە جێی باوکەکەی کرا بە میر ولە پاش چەند ساڵێك فەرمانڕەوایی و بەجێ هێنانی ئەرکی گرانی کار ڕاپەڕاندن و گەورەیی کردن، بۆ یانەی مردن خۆی لە دەسك نا و کۆچی دوایی کرد.

### میرفەخرەدین کوڕی میرمحەمەد

لە شوێنی بابی بوو بە جێنشین و زۆریش پیاوێکی دڵ و دەروون پاك و دادگەر و چاکەکاربوو.

وڵاتەکەی خۆی زۆر وە برەو خست و ئاواتری کرد و لە پاش ماوەیەك، کونجی خەمانی خەمخانەی ژیانی دایە دواوە و بەرەو ژیانی هەمیشە خۆشی بەهەشتی خودا، کۆچ و باری کرد.

### میرحەسەن کوڕی میرفەخرەدین

لە شوێن باب و باپیرانی بۆ مەزنایەتی ڕۆنیشت؛ بەڵام نەیدابووە سەر شوێپی ئەوان. دژ و ڕکوونی و زماندرێژ و جنێوفرۆش و دەست و دڵڕەش و تووش و خوێنڕێژ بوو. خوا کوێری کرد و بە گردەنشینی هەڵیپەسارد و فەرمانڕەواییەکەی بە میرفەخرەدینی کوڕە گەورەکەی ئەسپارد.

### میرفەخرەدین کوڕی میرحەسەن

بە دەستێکی زۆر بە هێز هەوساری فەرمانڕەوایی گرت و تووشی و چەمووشی پێ نەهێشت و بە ئارامی ڕامی کرد و لە سەر پشتی تەختی سەرداری و دنیاداری -قۆز و لەبار- خۆی ڕانا.

برایەکی هەبوو بە ناوی میرمحەمەد؛ جوانچاك و شۆخ و لەوەندێك بوو نە بکەی نە بخۆی، تماشای سای گەردنی کەی. سەرەڕای شەنگ و چەلەنگیشی، هەتا خوا حەزکا وریا و زرینگ و مەرد و ڕەند و بەخشندەو سەربڵند و ئازا و بە جەرگ و دڵپتەو بوو. جا هەر وەك گوتوویانە:

شاردنەوەی جوانی بە کەس ناچتە سەرێ      دەقوتووی خەی لە دەرز دێتە دەرێ

وەك دانە مرواری تاقانە لە دوڕدانەی قاپێلکی خان چۆك دەرکەوت و بە شوێن بەختی خۆیدا هەڵیگرتە ڕەوت و بە نیازی خۆڕانان لە دەرك و دیوانان، بۆ لای دیاربەکر و بە هەوای ئوزونحەسەن دیتن وەڕێ کەوت و لەو ئاواتەشیدا سەرکەوت و بە ڕاموسانی لاشیپانەی بارەگای ئەو پادشاپایەبەرزە، سەربەرز کرا و ئاوڕی بە خێری شاهانەی بەرکەوت و چاکەی زۆری دەگەڵ کرا و فەرمانی مەزنایەتی خانچۆك و جبقجور[1]ی پێدرا و بەرێ کرایەوە.

هاتەوە جەستەی برای و کێشە و هەرای بۆ نایەوە و کار گەیشتە شیرکێشان و تیروکەوان و خوێن

---

١- محەمەدعەلی عەونی لە تەرجەمە عەرەبیەکەی چاپی قاهیرەدا رووپەڕ٢٥١ «چباقچور» و «چبقجور»ی نووسیوە. هەژار



کەوتە نێوان و دوای پێك هەڵپرژان و خوێنرژانی زۆر، میرمحەمەد لە زۆر کەوت و کەوتە گۆر و بە کوژرانی، پەریشانی باری کرد و گڕی ئاژاوە کوژراوە و میرفەخرەدین -بێ بەرهەڵست- مەزنایەتی بۆ مایەوە و لە پاش چەند ساڵێك ئەویش بەرەو نەمان بای دایەوە و چونکە کەسێکی وای نەبوو کەلەبەری پڕکاتەوە، کوڕی برا کوژراوەکەی جێی گرتەوە.

## ئەبدال بەگ کوڕی میرمحەمەد

کرا بە جێنشینی مامی و کاروباری وڵاتەکەی ڕادەپەڕاند. لە سەردەمی مەزنایەتی ئەودا، لەشکری قزڵباشان بە سەرکردایەتی ئیقوت ئۆغلی -گزیری جبقجور- بۆ گرتنی خانچۆك پەلاماری ئەبداڵ بەگی دا. ئەبداڵ بەگ ڕوانی وا ڕێوی بە پێی خۆی بەرەو تەڵە دێ، بەرەگەی لێ گرتن و سەنگەری دابەستن و لە کەمیندا چاوەنۆڕی دەکردن و دەستە و یەخە لێیان ڕاپەڕی و لە شەڕگەدا بوو بە چڕین و گوڕین و دڕین. شەڕێکی زۆر لە هێز و گوڕ و پڕ لە خوێن و خوڕ لە ناو قزڵباش و کوڕە کوردانـدا ڕووی داو زۆر لاوی شیرین لاو و زۆر پیاوی خاوەن ناو لەو ناوە لە خوێندا گەوزین. بەڵام کوڕە کورد -کە هەتا شەڕیان لێ گەرمتر بێ، دڵگەرمتر دەبن و بەزین نازانن- خوێن بەری چاوی گرتن و حیرس گرتنی و دەست لە سەر دەستووی خەنجەران، ئەستۆ و سینەی قزڵباشیان دایە بەر و وەك پاڵەی چاك بکەوێتە سەر بەری ڕوێنە، بەریان لێ گرتن و بەربوونە دروونەوەی گیانی کڵاوسووران و کەڵەشیان لە گیشەدا. ئیقوتئۆغلی لەو هەنگامە بەسامەدا نەترەی نەما و ورەی بەردا و بە لایەکدا خۆی دەربازکرد و قاچاندی و قزڵباشیش -کە لە پاشی نەدەژیان و ڕۆژی عەجەمقڕانیان دی- هەرچی تینی تێدا مابوو، لاسای سەرداری بێزراوی کردەوە و هەرکەسە لە بەر خۆیەوە ڕێی دەرەتانی بەدی کرد و سەڵتەسوارە و بە سووکباری بۆی دەرچوون و کەوڵی خۆیان ڕزگار کرد. گرانباریشیان هەرچی بوو کەم و زۆری لە خێوەت و ئەسپاباتی هەموو جۆرە و هەمە ڕەنگە و لە ئازووخە و تۆشەی جەنگ و ئەسپ و ئێستر و بارەبەر -سەروبەری- بەر کورد کەوت و بوو بە تاڵان.

ئەبداڵ بەگ دوای ئەو سەرکەوتنە چەندساڵان ما و زۆر بە شادی و ئازادی ژیا و لە ئەنجامدا -کە گیانی ئەمری ڕووی کردەمەڵبەندی هەرمانەوە- دوو کوڕی لە پاش بەجێ مان: سویحان بەگ و سوڵتان ئەحمەد.

## سوبحان بەگ کوڕی ئەبداڵ بەگ

کرا بە جێنشینی بابی و دەگەڵ سوڵتان ئەحمەدی برایدا بە تەبایی فەرمانڕەوایی وڵاتیان دەکرد و لە بەرانبەر نەیار و بەدکاراندا -وەك دوو دیواری لە پۆڵا و ئاسن- پشتیان پێکەوە دابوون و وێستا بوون.

دوو برا کە لە پشتی یەکترینە　　خوای گەورە هەواڵی سێهەمینە

چونکە برایەتیان خۆش و پێکەوە دڵپاك و چاك بوون و بە دڵسۆزی هاوکاری یەکتریان دەکرد، بەختیش چاکی بۆ هێنان و هەر لە خوداوە بە سەریاندا دەڕژا. دوای ئەوەی کە خالید بەگە شەلەی پازۆکی مرد، ناوچەی کنجیشیان دەست بەسەردا گرت. لە ئەنجامی شەڕەکەی چالدێراندا -کە دیاربەکر دەست سوڵتان سەلیمخان کەوت- ناوچەی جبقجوریان لە دەست ئیقوت ئۆغلی دەرێنا و مەنسوور بەگی پازۆکیشیان لە سەر ئاغچەقەڵا دەرکرد؛ کە بە ناوی شائیسماعیلەوە بە سەری رادەگەیشت. هەروەها بە هێزی بازووی خۆیان ناوچەکانی زاك و مەنشکوردیان لە قزلباش پاکردەوە و قادربەگی قزلباشیان ڕاو نا و قەڵەمڕەوی خۆیان زۆر لە پێشوو پتر هەراو و بەرین کردەوە.

لە پاشان ئەو دوو برایە وڵاتەکەیان لە ناو خۆیاندا بەش کرد. جبقجور و دەوروبەری بەر سوبحان بەگ کەوت و قەڵاکانی دیش بوونە پشکی سوڵتان ئەحمەد.

چەندساڵێك ئاوا ڕابرا لە دوا جاردا دووزمان و کەتنگێڕان برایان لە یەکتر کردن و تێکیان بەردان. سوڵتان ئەحمەد بوختانی وای بۆ برای هەڵبەست کە بە فەرمانی سوڵتان سولەیمانخان کوشتیان و جبقجوریشیان بە میرێکی عوسمانی بەخشی.

سوبحان بەگ کوڕێکی بە ناوی مەقسوود بەگ لە پاش بەجێ ما.

## سوڵتان ئەحمەد کوڕی ئەبداڵ بەگ

لە دوای بە کوشت دانی برای، لە دنیادا زۆر مایەوە و پتر لە پەنجاساڵ مەزنایەتی کرد و دنیای خوارد و مەرگی لێ بوو بە میوان و بۆ دیوانی خودای نارد.

زۆر هاتن و تاوێ مانەوە و ڕابردن　　دەستاری مەرگ بە نۆرە وردی کردن

دەرگایەکی تەنگ بەرەو ژیانت دێنێ　　سەدرای بەرەڵا هەیە بەرەو ڕووی مردن

سوڵتان ئەحمەد دوو کوڕی لە پاش مان: مراد بەگ و محەمەد بەگ.

## مەقسوود بەگ کوڕی سویحان بەگ

لە پاش کوژرانی بابی، دەگەڵ ئاوزەنگی بە زەبر و زەنگی سولتان سولەیمانخاندا چووبووە شەڕی نەخچەوان. لە شوێنێکدا کە ئارپەچای پێ دەڵێن و سەر بە نەخچەوانە، لە مەودای پاسەوانیدا تووشی قزلباشان هات و زۆر مەردانە هاتە دەست و بە نەبەردی ناوی دەرکرد. کاتێ پەسنی دلاوەری بە بیسەری پایەبەرز و شکۆداری شاهانە گەیشت، سنجەقی جبقجوری بە دەستووری پێشین پێ بەخشی و فەرمانی پیرۆزیشی بۆ دەرچوو کە مولکایەتی بێ و بۆ کوڕانی بە کەلەپوور بمێنێتەوە.

لەو سەردەماندا کە ئەسکەندەر پاشای چەرکەس میری میرانی دیاربەکر بوو، مەقسوود بەگ وەك هەموو کوردێکی سەرڕەق بەو گیانبازی و خزمەتەی کە بۆ سولتانی کردبوو، لە خۆ بایی ببوو؛ خۆی دەگەڵ پاشادا ڕێك نەخست و دڵی خۆش نەدەکرد. پاشا ناوچەی جبقجوری لێساند و دای بە میرێکی عوسمانی. ئەویش دایە سەر ڕێی ئاستانەی بەخت هێلانەی سولەیمان و حەوساڵی ڕەبەق لە ئەستەمبووڵدا خولی خوارد و دەرکاودەرکی کرد؛ بەڵام هەموو وەزیرە گەورەکان لەبەر دڵی ئەسکەندەر پاشا، حاشایان لێکرد و داد و بێدادەکەیان بە پێچکی تەختی خاوەن بەختی پادشایەتی نەگەیاند و هەر خۆشیان تێنەگەیاند؛ هەتا خودای دادگەر مەرگی بۆ شیاند و لە دەست زۆردارانی ئەستاند.

## مراد بەگ کوڕی سولتان ئەحمەد بەگ

لە پاش نەمانی سولتان ئەحمەد بەگ، ئەسکەندەر پاشای میری میرانی دیاربەکر، میراتەکەی بە کوڕانیدا بەخشیەوە. خانچۆك و ئاغچەقەلای دابە محەمەد بەگ. جگە لە جبقجور -کە درابووە عوسمانیان- ناوچەکانیتری دابە مراد بەگ و بۆشی دانان کە پێکەوە بە سەر کار و باری وڵاتەکە ڕابگەن. مراد بەگ دوای شازدەساڵ مەزنایەتی، بەشی خۆی بە سولەیمانی کوڕی ئەسپارد و لە پاش چەند ساڵێك ژیان، خۆی لێ بوارد و مەرگ لە دووی نارد و بردی.

جگە لە سولەیمان بەگ، عەلی خان و ئولوخان و مستەفا بەگیشی هەبوون. لە وەختی گرتنی تەورێزدا مستەفا بەگ دەگەڵ میرەکوردەکاندا، قزلباشان لە سەعدابادی لای تەورێز کوشتیان. عەلیخانیش هەر لەو شەڕەدا بە دیل گیرا و دەگەڵ مراد پاشای میری میرانی قەرامانـدا، دوو

سالآن لە قەلآی قەهقەهە بە کۆت و زنـجیـرەوە گوزەراندی. لە پاشان دەگەڵ پاشا بەرەڵا کرا و پێکەوە هاتنەوە ڕۆمیێ و بە کۆمەگی مراد پاشاو لـە بـەزەیی بـەرزی شـاهانەوە، بەگلـەر بـەگی دیاربـەکر، سنجەقی جبقجوری بە ناوی مولکایەتی پێ بەخشی. ئولوخـانی براشـی دەگـەڵ پیـاوە کاربەدەسـت و گەورەکانی دیاربەکر دایە و بە ئاسوودەیی دەژی.

میرمـحەمەدی مەزنی خانچۆك ئاغچەقەلآی بە دەستەوە بـوو. بـەلآم زۆر باشـی پارێزگـاری لـێ نەدەکرد. لەسەر ئەوە فەرهاد پاشای سەردار، سنجەقی ئەویشی هەر بـە سولەیـمان بـەگ بەخـشی و چەند سالێك مـحەمەد و سولەیـمان لەسەر ئەوە کێشە و هەرایان بوو؛ هەتا مەرگ هاتـە بـەریوانی و مـحەمەد بەگی برد و شەڕەکە داکوژا.

## سولەیـمان بەگ کوڕی مراد بەگ

بێ ڕووبینی و دەروایسی و بێ سرتەی بەر پەنا و پەسیو، لاوێکە لە ناو لاواندا بژاردەو زۆریش خواردەو دەستبلاوە و هەتا بلێی ئازایە و تا خوا حەز دەکا پیاوە. لە سەرەتای لاوەتیدا لەلای میـری میـرانی دیاربەکر و بەغدا ژیاوە. لە چنگ ئاوارەیی دەردی چێشتووە و ڕەنـــجی زۆر و ئـەرکی گـران لـە دڵـی ئەودا یادی تاڵی جێ هێشتووە. لە هونـەری سـوپاییدا ڕۆمیانەیـە و لـە سوارچـاکیدا تاقانەیـە و لـە کوردستان بەناوبانگە.

کەس هێـندەزیت و زیـرەك و پیتـۆڵ و ژیـر نیە     تـای ئەو، جیهانە کەونە کەسی‌کەی لە بیـر نیە

بەلآم بە داخەوە چونکە ناوی خۆی بیستۆتەوە، تۆزێك لووتی بەرزە و فیزێکی ڕێ نیشتووە و لە بەفیـرۆدان و تەخشان پەخشان کردنی دراودا، تەواوێك بێ‌پەروایە.

ئـازا نی هەتـا بەخـۆ نەوەستیت مـاوە     تا بەرزی بە لای خۆتەوە، پەستیت ماوە
بایی کە موسوڵمانی؟ لە بوت ڕزگـاری؟     بـەو فیزە کە لاتە، بوتپەرستیت مـاوە

هەر زۆر لە زووەوە باب و باپیـرانی لە کنج ژیاون؛ کە زۆر شوێنێکی سـەخت و چـڕە و لـە بنـاری چیایەکە چەمی فوراتی بەبەردا دێ و لە هەر دوو لاوە لە دوژمنان پارێزراوە. بەلآم بەرزەفڕی و بەرچاو گوشادی سولەیـمان بەو تۆزەوە نەوەستا و لە کونـجی لانەی تەنگی کنجدا هـەڵی‌نـەکرد. لـە دەشـتی

مەنشکوردی بەرپاندا شارێکی بنیات ناوە و مزگەوتێکی بەرزیشی دەبەرچاو گرتووە؛ بەڵام سەری نەگرتووە و چەند ساڵێکە بەو شارەوە و بەو کارەوە خەریکە.

لە سەردەمەکانی گرتنی ئێران و شیروان و ئازربایجاندا، زۆری خزمەتی گەورە کردووە؛ بە تایبەتی لەو کاتەدا کە دووسێ هەزار سەربازی چغرسەعد -بە سەرکردایەتی نیاز بەگی پازۆکی- هێرشیان هێنا سەر قەرایازی و هۆزی باولی‌یان تالان کرد، سولەیمان بەگ براکانی و چەند ئاغایەکی ڕەگەڵ خۆ خست و کەوتە شوێنیان و بە گژیاندا هات و خوێنیانی ڕشت و ماڵ و ئەسپاب و ئاژەڵ و پاتاڵی تالانی بە زۆر لێ‌ساندنەوە و بە خاوەنیانی گەیاندەوە. بە هۆی مستەفا پاشای سەردارەوە لاوانەوەی شاهانەی پێ برا.

لەوساوە کە بابی بە زیندی سەر کردیە جێنشینی خۆی، تا ئەمڕۆ کە مێژوو سەرەتای مانگی ناوجێژنانی ساڵی هەزار و پەنجە، مەزنی وڵاتی کنجە و مەزنایەتیش هەر لە خۆی دەوەشێتەوە. یاخوا لە کاری قەنجدا هەر سەرکەوتوو بێ.

# بەندی نۆهەم

# فەرمانڕەوایانی سلێمانی

### ئەویش دوو لکی لێ دەبێتەوە

رووداوگێڕەوەی بەدەم ودوودی قۆز و بە نموودی ناو کۆز و کۆڕی هونەرپەروەران و دەمڕاست و کارای دیاردەو بژاردەی کەڵەنووسەران -کە سەرگوروشتەی وردەو درشتەی چەند پشتاوپشتی خۆی و هەندەرانیان لە بەرە- ریشەی ڕەگەزی سولەیمانیانیان تۆمار کردووە و بردوویانەتە سەر مەروانیحیمار [کەر] کە دوامین پادشای ئەمەوی بووە.[1] دەڵێن بۆیە مەروان دەگەڵ کەردا پیلۆز کراوە، بە منداڵی ڕۆژێك لە فێرگە هاتۆتەوە و قامکی خستۆتە ناو ئاڵقەی دەرگاوە و دەوێدا قەتیس ماوە و پەنەماوە و بریەندیان هێناوە و ئاڵقەکەیان بڕیوە و ڕزگاریان کردووە. کەچی بە دەردی خۆیەوە دانەسەکناوە ڕۆژێکیتریش هەمان تاس و هەمان حەمام تلی دەگەوی دەرگا گیراندۆتەوە و هاواری لێ هەستاوە. باوکی بە تووڕەییەوە پێی فەرمووە: بە خوا مەروان زۆرم پێ کەری. ئیتر لەو ڕۆژەوە ناوی کەری بە بۆقی ملیەوە نووساوە. هێندێکیش لایان وایە چونکە عەرەبان بە ساڵی سەدەمینی چەرخ دەڵێن ساڵی کەر و چونکوو سەرەتای پادشایەتی مەعاویەی کوڕی ئەبووسفیان تا پادشایەتی ئەو مەروانە سەدساڵیان نێوان بووە، کەری سەد ساڵە وە شوێن مەروان خراوە.

مەروانە کەرە، کوڕی محەمەد، کوڕی حەکەم، کوڕی ئەبوولعاس، کوڕی ئومەییە، کوڕی عەبدیشەمس، کوڕی عەبدولمەنافە. حەکەم ڕۆژی یەکەمی گرتنی مەککە موسوڵمان بووە.

مەروانەکەرە لە سەرەتاکانی ساڵی ۱۲۷.ك (۷٤٤.ز) دابۆتە پادشاو چۆتە سەر تەخت و لە دوای پێنج ساڵان ئەبولعەبباسی سەفاحی لێ ڕاپەڕیوە و پرزەی بڕیوە و دەرییەڕاندووە و پەڕیوە بووە و بەرەو میسر چووە و ساڵح و ئەبووعەونی عەبباسی وە شوێن خراوە و ڕۆژی بیست و هەشتەمی مانگی

---

۱- چاردەهەمین پادشای ئەمەویە و بەویش دوابڕاو بوون.

قوربانی ساڵی ۱۳۲.ک (۷٤۹.ز) لە گوندی بوسیری لای میسر تووشی هاتوون و کوشتوویانە. دوو کوڕی بە ناوی عەبدوڵڵا و عوبەیدیللا لە پاش بەجێماوە. عەبدوڵڵا کەوتۆتە حەبەشەوە و عوبەیدیلاّ بە نهێنی لە فەلەستین دەژیا. زەمانی هارونەڕەشید پێیان زانی و گزیری سەر فەلەستین گرتی و ناردیە بەغدا و خرا زیندانەوە و هەموو دەورانی هارون لە گرتووخانەدا گوزەراندی و لە ئەنجامدا لەبەر پیری و کوێری لە بەندیخانە دەرکەوت. وێدەچێ سولەیمانیەکان وەچەی ئەو بن. بەڵام وەك ناوی سولەیمانیان لە سەرە، دەشێ ڕاستەوخۆ سەر بە سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك، کوڕی مەروان بن، خوا دەزانێ چۆنە.

کەونەپیاوان و باوەڕپێکراوانی ئەو هۆزە -کە شڕە و شاتاڵی چەند ساڵەی خۆیان دزیوە- وەیان دزیوەتەوە کە لە شاڵاوی عەبباسیەکاندا، مەروانیەکان وا تاساون، پاش قوڵپ بوونەوە نەپەرژاون خۆ خڕ کەنەوە و لە بڵاوەکردندا سێ نەفەر لە کوڕانی مەروانەکەرە، کۆمەڵێکیان وەدوو خۆ داوە و لە فەلەستینەوە دەلینگی خۆیان وەرێناوە و لە مەڵبەندی قوڵپ[1] گیرساونەوە و لە دۆڵێکدا -کە دەرەی خۆخی پێ دەڵێن و سەر بە ناوچەی غەزالیە- نیشتەجێ بوون. بەرەبەرە و بەرودوای یەك تیرە و هۆزی ئەو ناوچانە -کە قەوغاتر لە هەموانیان هۆزەکانی بانۆکی بوون- لە دەورەیان کۆ بوونەوە و بە یاری وان قەڵاکانی قوڵپ و جسقە[2] و تاش و حسولی و مفارقین [میافارقین] و موچە و مەزرا و کێلگە و بەیارەکانی ئەو ناوچانەیان تا سەر ڕووباری دیاربەکر، خستە دەست و هەروەها قەڵا و دژ و زەوی و زاری بێدیان و کاروکان و دلکلوقیا و ڕبات و جریس و ئیدنیك و سلیك و کنجیان لە ژێرچنگی گورجستانی و ئەرمەنیەکانی دیندوژمن هێنا دەر و ئەوسا هەرکێ بەرەی مەروانی خۆش ویستووە و لە سەروان ئاوارە بووە، لە شام و میسریشەوە بەر بەوان هاتن و لێیان هاڵان و لە ژێر ئاڵایاندا خۆیان گرتەوە.

ئەو هۆزانەی مەروانەکانیان وەخۆ گرتبوو، هۆزەکانی بانۆکی و هوێدی و دلخێران و بوجیان و زیلان و بسیان و زکزیان و بەرازین و هێندێك لەوانە سوننی مەزەبن و لە سەر شوێی شافیعی خوالێخۆشبوو دەڕۆن و بڕێکیشیان لە سەر ئۆلی یەزیدیانن. میرەکانیان -بە تێکڕایی- بە باوەڕ و لە

---

۱- لە کوردستانی ناوەندیە و لای دیاربەکرە. عەونی

۲- لە دەستنووسێکدا حبقە نووسراوە. عەونی

خواترس و نوێژڕەوان و ئاکارجوان و لە پەیڕەوانی فەرموودەکانی پێغەمبەری سەروەرن، درروودی خودای لە سەر بێ. زۆریان دوورەدنیا و شێخی سەر بەرماڵ لێ هەڵکەوتووە. سەد خێڵێک لەوانە کۆچەر و ئاژەڵ بەخێوکەرن و زۆزانیان کوێستانی بدلیس و چیای شەرەفەدین و ئاڵەتاقە. پایزانیش لە سەرەتای فەروەردین[1]دا بەرەو گەرمەسێر دێنەوە. پووشانەشیان لە سێسەد سەر سەرێکە و بە فەرمانڕەوای بدلیس دەگا.

پوختەی مەبەست: ئەو هۆزانە کە بە سەرداری مەڕوان[2]، گەلێك قەڵا و ناوچەیان گرت و ماوەیەك لە ژێر سەرکردایەتی ئەودا بوون، کە مەڕوان لە دنیا دەرچوو، بەهائەدینی کوڕی بوو بە جێنشینی. ئەویش زۆری پێ نەچووە گیانی دەرچووە و میرعیززەدین و میرجەلالەدینی لە پاش بەجێ ماون. میرعیززەدین بۆتە سەردار و کە ئەویش لە سەر ترۆپکی داری ژیانەوە کەوتووە و سلار بۆتەوە -چونکە میربرایمی کوڕی منداڵ بووە و کەلکی مەزنایەتی نەبووە- لە سەر پەسندی سەرکۆمارەکان، جەلالەدینی برای جێی گرتۆتەوە و هەتا ئەویش مرد میربرایم کوڕی عیززەدین ڕەسیدەببوو؛ بە مەزن هەڵبژێرا. ئەویش سەردەمایەك مایەوە و بەرەو نەمان بای دایەوە و میردیادین و میرشێخ ئەحمەدی لێ بەجێ ما. لەسەر ئەسپاردەی باوك، میردیادین بوو بە جێنشین و هەشتا ساڵ ژیا و زۆر بە کامڕەوایی فەرمانڕەوایی کرد. لە دوای ئەوە کە شائیسماعیلی سەفەوی دیاربەکری گرت، خانمحەمەدی ئیستاجلووی لەبری خۆی بەسەرەوە دانابوو کە ئاگای لێ بێ. محەمەدخان خۆی دەگەڵ میردیادیندا ڕێك خست و بیگیسی[3] خانمی کچی لێ خواست و بە خزمایەتی میردیادین و بە هاریکاری سولەیمانیەکان، خۆی زۆر بەهێز کرد و کاروباری باش دەڕۆیی. بۆ نموونە: جارێك عەلائەدەوڵەی زولقەدر -کە میری میرانی مەرعش بوو- بە نیازی داگیر کردنی دیاربەکر، سارۆقیلانی برازای خۆی ناردەسەر محەمەدخان و شەڕێکی زۆر گرانیان لە ناودا قەوما.

---

١- فەروەردین، خاکەلێوەی بەهارە و مانگەکانی پاییز مێهر(ڕەزبەر)، ئابان (گەڵاڕێزان) و ئازەر (سەرماوەز)ن.

٢- دەپێشدا بەرەی مەروانی گوتووە و ناوی حاکمێکی ناو مەڕوان نەهاتووە. هەژار

٣- لە دەستنووسێکدا بیکسی‌یە؛ وادیارە بێکەس خانم بووبێ. عەونی وێشدەچێ بەلکیس یان بێگیسی (بێ‌کەزی) بێ. هەژار

دەهـۆڵ مات و کڕ بوون لە بەر تێك خوڕین　　مـەگـیـرانـی شـیـرانـە بـۆ زگ دڕیـن
لـە هـەر لاوە لاشـەی کـوژاو سـەربـڕاو　　لـە هـەر شـوێـنـێ خوێن هەڵدەپڕژا بە تاو

کوڕە کوڕەی سولەیمانی -یان دیوانی سولەیمانی- لەو لێکدانەدا دادیان کرد و هەر نەیارێ هاتە بەریان، بەریادیان کرد و یادی جەنگی حەوتخوانی مازندەرانی ڕوستەمی دەستان و دێوگورانی سامی نەریمان، لەبەر هالاوی ئەو شەڕە گەرم و گوڕەیان توانەوە و هەر بە ئەفسانە مانەوە.

ئەو کوردەگورد و نەبەردانە بە هۆی باهۆی هەمبەرتەزێن و چوستی و داهۆی دوژمـن‌بـەزێن و بـە دەبانی تازەساو و شیری بە ژەهر ئاودراویان، دڕیان بە لەشکری دژدا و پلانی ساروقپلانیان هەڵوەشاند و گەلەکۆمەیان تێك گلاند و لە بەر یەکیان هەڵتەکاند و لە ژیانیان داتەکاندن و سەرکردەش سەری دەر نەکرد و لە مەیداندا لە گەزیاندا و سەریان بڕی و زگیان دڕی و بیری شەڕیان لـە مێشك و دڵـی سڕیەوە. خان‌محەمەد شاگەشکە بوو؛ زۆری چاکە دەگەڵ میر وهۆزی سولەیمانی کرد و شانازی پێوە دەکردن. میردیاین کە مەیدانی ژین و ژانی ئەم جیهانەی بەجێ هێشت، هێچ نێرینەی جێ نەهێشتن. شێخ‌ئەحمەدی برای نۆ کوڕی بوون: شاوەلەد بەگ، بەهلول بەگ، عومەرشابەگ، سۆسەن، وەلیخان، ئەلوەند، خەلیل، ئەحمەد و جیهانگیر. مەزنایەتیەکە بۆ ئەوان مایەوە.

## لکی یەکەم

# فەرمانڕەوایانی قوڵب و باتمان

خودانی ئەم ڕووپەڕانە چەند جارانی لە پیاوی باوەڕ پێکراو بیستووە کە میردیادین زۆر پیر و زەبوون ببوو؛ فرزەندێکی واشی نەبوو کاروباری دنیاداری بۆ هەڵسووڕێنی و چاوچنۆکان وەپرینگێنێ. برازای بەربینگیان گرتووە و قرمی خۆیان خۆش کردووە کە لە سەرداری دەری‌کەن. میردیادین هانای وەبەر محەمەدخانی ئیستاجلوو هێناوە و ئەویش لەشکری بۆ ناردووە و مام و برازا پێک وەربوون و تێک بەربوون و هەنگامە قەوماوە. لەو شەڕە بەسامەدا، عومەرشابەگ و سۆسەن و جیهانگیر بەگ کوژراون و شاوەلەد بەگی براگەورە -کە هەوێنی پشێوێنی بوو- وەک چوالوو خۆی کووزوو کرد و زوو دەرباز بوو؛ خۆی گەیاندەئالی شام و لای شاکانی چەرکەس دامەزرا. کە قزلباش پاش شەڕەکەی چاڵدیران کەوتبوونە کلکەلەقی و دەستیان لە کوردستاندا شل ببوو، عەلی فێری ناوێک -کە پیاوێکی سەرناسی هۆزی بسیان و سەرکردەی ئاغاکان بوو- قەڵای میافارقینی گرت و پیاوی ناردەشام و لە شاوەلەد بەگی گێڕاوە کە گیر نەبی و بێتەوە. شاوەلەد بەگ بە هەڵەداوان بەرەو ماڵی باوان هاتەوە و بە کۆمەگی عەلی فێری و بە پەسندی هۆزەکانی، مەزنایەتی گرتە دەست.

لەو هەلەدا کە دەوڵەتی هەڵپشکوتووی عوسمانی دیاربەکر و کوردستانی وەبەرخۆدان، مەزنی ساسۆن -کە دژایەتی کۆنیان دەگەڵ سولەیمانیەکاندا هەبوو- تیرەی خالیدیان دنە داکە لە میافارقین خۆ داگرن و لەو چاوەش و جەندرمانەی کە ئەرکیان لە کوردستانە و بە کاروانەڕێدا دێن و دەچن، چەند کەسێکیان لێ بکوژن تا بەو فێڵە شاوەلەدبەگی تێوەدەن.

خالیدی ئەرکی خۆیان ئەنجام داو کارەساتەکەشیان دایە پاڵ شاوەلەد بەگ، میری میرانی دیاربەکر. ئەو خەبەرەی بە پێچکی تەختی شکۆدار و بەرزی سوڵتان ڕاگەیاند و فەرمانی دەستبەجێ ڕەوای پادشابە لەسەردانی شاوەلەد بەگ درا. میری میران ناردی و بردیە دیوان و شاوەلەد بەگ کە

بە کرۆکی کارەکەی زانی، بە هەزار ناری عەلی توانی خۆی ڕزگار کا و لە دەستیان ڕاکا و خۆ بگەیەنێتە قەڵای قولپ.

وڵاتەکەیان کردەموڵکی تایبەتی سوڵتان و گزیریان بە سەرەوە دانان و شاوەلەد بەگیش بە قەڵای قولپ و زەویەکانی دەوروبەری دەژیا و سێزدەساڵان هەروای ڕابوارد، هەتا مەرگ لە دوای نارد و لە دەست میر وبەگلەران و بوختانکەرانی ڕزگار کرد و بە خاکی سپارد.

شەش کوڕی لە پاش بەجێ مان: عەلی بەگ، میردیادین، وەلیخان بەگ، جیهانگیر بەگ، میریوسف و میرسولەیمان.

## عەلی بەگ کوڕی شاوەلەد بەگ

لە پاش بابی ماوەی چل ساڵان قەڵا و ناوچەی قولپی لە دەستدا بوو. هەموو کەس خۆشی دەویست و ئاکار و ڕەفتاری هەموو پەسند بوون. کاتێ لە دنیا کۆچی کرد، دوو کوڕی بە ناوی سوڵتانحوسێن بەگ و وەلیخان بەگ لە پاش مان.

## سوڵتانحوسێن بەگ کوڕی عەلی بەگ

ساڵی ۹۸۰.ك (۱۵۷۲.ز) لە سەر فەرمانی لەبەر دڵانی سوڵتانسەلیم خان بوو بە جێگری بابی. ساڵی ۹۹۳.ك (۱۵۸۵.ز) کە سوڵتان مرادی خوابەخشیو لەشکری شکاننەدیوی بە سەرداری عوسمان پاشای گەورەوەزیر ناردەسەر ئازربایجان، سوڵتانحوسێن بەگ لە سەعدابادی نزیک بە تەورێز، قزلباشان شەهیدیان کرد. شەش کوڕی بێ باب مانەوە: قلیج بەگ، سەیدئەحمەد، زەینەڵ بەگ، زاهید بەگ، حەیدەر بەگ و قاسم.

سەیدئەحمەد کاتێ بابیان کوشت، قزلباشان گرتیان و زنجیریان کرد و دوو ساڵان لە قەڵای قەهقەهەدا بەندیان کرد و لە دواییدا بە کۆمەکی هێندێك ئاغایان بەردرا و هاتەوە وڵات. لە دیوانی سوڵتان مرادەوە مەزنایەتی بە زەینەڵ بەگ درابوو. قلیج بەگ -کە بە تەمەن لەو زیاتر و بە ئاوەز لەو کەمتر بوو- بە کۆمەگی محەممەد بەگی حەزۆ میرایەتی خستە سەر ناوی خۆی و لەسەر مەزنایەتی دەگەڵ زەینەڵ بەگدا کردیە هەرا و دوژمنایەتی و هەڵسور و داسوڕێکی بێسوودی کرد و

هەر لەو سەروبەندانەدا -لەسەر تووشی و بەدفەڕی خۆی- بە دەستی خزم و هۆزەکانی بەکوشت چوو.

## سەیدئەحمەد بەگ کوڕی سولتانحوسێن

کە قزلباشان بەرەلایان کرد، لە ئەرزەرۆمێ چاوی بە فەرهاد پاشای سەردار کەوت و بەڵگەی دڵسۆزی و گیانبازی خۆی خستە بەر چاو و خزمەتەکانی لە بەردەمی دیوان دانا. لە بەزەیی بێبڕانەوەی پادشاوە، سەرداری بەکار و لەبار، فەرمانی قولپ و باتمانی پێ بەخشی.

زۆری نەبرد کە هۆزی بسیان، بەهلول بەگی خاڵیان کوشت و ئەوسا بێبەرهەڵست بوو بە فەرمانڕەوای سەربەخۆی ئەوێ. بەڵام لە پاش چەند ساڵێك، میری میرانی دیاربەکری لە خۆی ڕەنجاند و لە ئاستانەی پادشاوە میرایەتی قولپ درا بە کابرایەکی عوسمانی ئەویش بە دەرکراوی - بە نیازی دادخوازی- ڕووی کردەئاستانەی سولتان و ساڵی ١٠٠٣.ك (١٥٩٤.ز) گەیشتە ئاستانەی گۆڕستانی ئەستەمبوڵ. سەرلەنوێ قولپیان دایەوە بە زەینەڵ بەگی برای و ئێستا کە مێژووی کۆچی هەزار و پێنجە بەسەر قولپ ڕادەگا.

## لکی دووەم
# فەرمانڕەوایانی میافارقین

ئەو میرانەش هەر دەچنەوە سەر میرشێخئەحمەد کوڕی میرعیززەدین و دەگەڵ میرەکانی قولپدا پسمامن. یەکەم فەرمانڕەوایان بەهلول بەگ، کوڕی ئەلوەند بەگ، کوڕی شێخئەحمەدە. بەهلول بەگ پیاوێکی دەسکەرەوە و کارامە و دلاوا بووە. دەپێشدا خۆی و عومەرشابەگی برای لە لای ئەسکەندەر پاشای میری میرانی دیاربەکر بوون. ئەسکەندەر پاشالەسەر فەرمانی کاریگەر هێرشی بردەسەر جوازر[1] و قەلایەکی تێدا ئیجاد کرد و ناوی لێنا ئەسکەندەریە و بەهلول بەگی کردەدژدار و ناوچەکەی بە سنجەق پێ بەخشی؛ زۆری خزمەت بە دەوڵەت کرد و جەوهەری لە خۆ نیشان داو میری میرانی دیاربەکر و میر ومەزنانی کوردستان بۆی تێکەوتن و بۆی وێکەوتن و تکانامەیان بۆ نووسی کە بەشێکی لە میراتی باب و کالان بدرێتەوە و ڕەوانەی ئاستانەی پیرۆزە هێلانە و بارەگای شاهانەی سوڵتان سەلیمخان کرد. لە ئاوڕ وێدانەوەی بێکەمایەسی پادشاهانەوە، ناوچەی میافارقین و هەرچی سەربەوێیە لە قولپ جوێ کرایەوە و بە ناوی مولکایەتی تەرخانەوە پێیان بەخشی. هەروەها بە فەرمانی بەرز دەرچوو، باج و پیتاکی هۆزەکانی بسیان و بوجیان و زیلان -کە وەختی خۆی لە شاوەلەد بەگ سێنرابوون و وەسەر مولکی تایبەتی سوڵتان خرابوون- بەهلوول بەگ کۆی بکاتەوە و ساڵ بە ساڵ بیخاتە ناو خەزێنەی دیاربەکرەوە. چەند ساڵێك بەو ئاوایە گوزەرا؛ کۆچ و کۆچبار بەرەو وڵاتی عەجەم دەستی پێ کرد. هۆزەکانی سولەیمانی لە چنگ زۆرکاری و نالەباری دەسەڵاتداران وڵاتیان جێ دەهێشت و دەچوونە ئەو مەڵبەندانە کە قزڵباشیان لێ دەرکرابوو. بە پاسەوان دادەمەزران و دەکرانە ئالای بێگی و سنجەق و زەعامەتیان دەدانێ؛ هەر ئەوەندەکە لە پارێزبەرانی بپارێزن. هۆزەکانی بەر پەلی بەهلوول بەگیش کە هەستیان بەم باس و خواسە کرد، گوێیان لە کلاو دەرپەڕاند و قوشقی و

---

[1] - لە دەستنووسێکدا «جواز» نووسراوە. ڕەنگە قەلای عادل جەواز بێ. عەونی

کوڕڕەگوێ ببوون و خۆیان لە پیتاك دەبوارد و کلکیان پێ هەڵدەپەسارد. تەنانەت کابرایەکی بسیانی - کە ناوی شاسوار بوو- خۆی کردەمیرلیوای قەڵای بایەزید و هەزار ماڵێکی سلێمانی[1] و کوردیتری لە خۆ کۆ کردەوە و لاقیان چەقاند کە بە ئامان و زامان پوولەسووتاوێك چیە پیتاك نادەین. بەهلوول بەگ حوکمی وەرگرت کە بچێ ئەو باجانە کۆ کاتەوە و ماڵ و ماڵاتەکانیش بۆ میافارقین بێنێتەوە. لەو چوونەیدا تووشی شەڕهات و دەگەڵ شاسواردا ملیان دەبەر ملی یەك نا و لە شەڕدا بەهلوول بەگی کلۆڵ شەهید کرا و پێنج کوڕی لە پاش بەجێ مان: میرخان، عومەر بەگ، مەحموود بەگ، محەمەد و عوسمان.

## میرخان کوڕی بەهلوول بەگ

لە پاش کوژرانی بابی، کارەکەی ئەویان پێ سپارد. چەند ساڵێك بە سەردا ڕابرد؛ هۆزەکانی بەردەستی کاری زۆر ناشایستیان دەکرد و خەڵك لە دەستدرێژی و زۆرکاریان وەزاڵە هاتبوون. دادیان لە دەست بردەبەر بارەگای پادشای دادپەنا و فەرمانی کوژرانی میرخان و تیرەکانی بسیان و بوجیان و هەموو خراپەکارێکی سەریەوان، بۆ محەمەد پاشای میری میرانی دیاربەکر هات. محەمەد پاشامیرخانی هێنا دیوانی دیاربەکر و بە فەرمانی سوڵتان کوشتی.

## عومەر بەگ کوڕی بەهلوول بەگ

لە پاش کوشتنی برای، میافارقینیان بەو سپارد. دەبوایە ساڵێ چوار خەروار[2] زێڕ بۆ خەزێنەی دیاربەکر کۆ کاتەوە. ئەرکی خۆی بە ئەنجام نەگەیاند و ئەو دراوەی بۆ هەڵنەسووڕا. لەسەر پێشنیاری میری میرانی دیاربەکر و دەفتەردارەکەی، میرایەتی کوردەکان و پێ ڕاگەیشتنی میافارقین لە دیوانی پادشای دەوڵەتپەنای بە شەوکەت و شان، سوڵتانمحەمەد خانەوە، بە برایم بەگ ئاقساق[3] کوڕی جیهانگیر درا. عومەر بەگ دەپێشدا پەنای بە فەرمانڕەوای بدلیس برد و خەریك بوو دراوەکەی دەوڵەت پەیدا کا؛ بەڵام شتێکی وای بە دەمەوە نەچوو. ئەمجار گەلێکی خۆڕی و تۆڕی لە خۆ هاڵاند

---

١- لە دوو دەستنووسدا بسیانی لە باتی سولەیمانی نووسراوە و بسیانیەکە ڕاستە. عەونی

٢- محەمەدعەلی عەونی ئەم خەروارەی بە کیسە مانا کردووە. هەژار

٣- لە دوو دەستنووسدا ئاقسماق. عەونی

و لە ناوچەکانی مووش و خەنس و مەلازگردا خۆی کردەچەتە و ڕێگری دەکرد. لە نێوان حەزۆ و باتماندا چەند جارێك کاروان و هاتوچۆکەری ڕووت کردوون و چەند موسوڵمانێکیشی کوشتوون.

عەلی بەگ میرلیوای خەنس و محەمەد بەگی مەزنی حەزۆ چوونە سەری و برازایەکی و هێندێك لە هاوکارانیان کوشت و هەرچی بوویان بە تاڵانیان هێنا و بۆ خۆشی بە هەزار جیرەبابە و چەرمەسەریێ خۆی دەرباز کرد.

ئەگەرچی ناوی میرایەتی لە سەرە، بەڵام دز و سیرمەخۆرە و ناتوانیێ لە هیچ کویێ بحاوێتەوە.

## بەشی دووەم لە رووبەری سێهەم

### ئەویش دوازدەبەندە[1]

# بەندی یەکەم

# فەرمانڕەوایانی سۆران

نێچیـروانی لەبارزان و ڕازەوانی ڕازی بەرز و بێ پێپیلکەی تیـشەشاخی لـووس و هەڵـچووی مێـژووی دوور و بێسنووری کوردەواری، بە لەباری بۆمان چوونە دوڕ پنچك و ناودەوەن و بە بەندەنان هەڵگەڕاون و ورد گەڕاون و چەند بەرداوبەردیان کردووە و زەرد و هەردیان پـشکنیوە و زۆر و زەوەنـدیان نۆڕیـوە و گەلێك قۆناغیان گۆڕیوە و لە لای زۆران لایان داوە و بەرەو سۆران ڕوویان ناوە و ڕەسەنیان خستۆتە داو و تاوایان لە بەر ڕاناوین کە زنـجیـرەی بنەچەکەی خانەدانی میـری سـۆران، دەگاتـە سـەر کـەلۆس[2] ناوێك کە عـەرەبی بەغدا بـووە! لـە گـەڕدانی گێژوگـەڕی گـەردوونی چـەپگەردەوە وڵاتـی خـۆی جـێ هێشتووە و گەردی دەردی لێ نیشتووە و ئاوارە بوونی چێـشتووە و بـەرەو ئـەوان(؟)[3] -کـە سـەر بـە

---

١- لە دوو دسنووسدا ١٠ بەندەو بەندی ١١ و ١٢ نیە. عەونی

٢- دەبێ کەلۆس نازناوی میـرێکی دەدانکەلی ماڵەمیـرانی لە مێژینەی ڕەواندز بووبێ. ئیـسماعیلی مەلاحوسـێن لـە *تاریـخی ئەردەڵان*دا دەڵێ: سورخاب بەگی ئەردەڵان بارامی کوڕی خـۆی بـە سـەر ئامێدیـەوە دانـابوو؛ کـە ئێـستاش نەوەکانی فەرمانڕەوای ڕەواندز و کۆ و حەریرێن. کتێبی *الاربعة قرون الأخیـرة للعراق* لە پەراوێزی ڕووپـەڕ ٤٨دا دەڵـێ: «سورخاب کوڕی خۆی کردەحاکمی ڕەواندز و ئەو بنەماڵە سێسەد ساڵ هەر مان».

٣- ئەوان، لە وڵاتی سۆران نیە. هەر ڕەوانە گۆڕاوە و «ئە» لە جێی «ر» داندراوە. «دز» قەلایە. ڕەواندز: قەڵای ڕەوان. ڕەواندز ناوێکی تازەیە و تەمەنی ناگەڕێتەوە بۆ پێش هەزاری کۆچی. ڕەوان ڕەنگە لە ڕاوەندەوە هـاتبێ بـە نـاوی ئـەو شارەوە کە ڕاوەندی گەورە بنیاتی ناوە و بە گفتی *معجم‌البلدان* بـە ئەیالـەتی مووسـڵ ناسـراوە. ئەوسـا دەبێتـە ←



ناوچەی سۆرانە- ڕۆیشتووە و لە گوندی هەودیان[1] دانیشتووە و بۆتە شوانی گوندیەکان و ددانی پێشەوەی نەبوون و بەو بۆنەوە چونکە بە زاراوەی ئەوان بە پیاوی کەل دەڵێن کەلۆس، ناوی پێشووی لادراوە و هەر بە کەلۆس ناو براوە. کەلۆسی شوان سێ کوڕی بوون: عیسا و ئیبراهیم و شێخ وەیس[2].
عیسا کوڕێکی هێژا و هەلکەوتە و بەرچاوتێر و نێرەپیاو و دلاوا و مەشرەفخۆش بووە؛ هەر چیەکی لە شەرتە شوانیەکەی دەست کەوتووە، دەرخواردی کوڕوکاڵی هەرزەکار و دەمڕووتی گوندی داوە و بە جوانمێری، چاوبەرەژێری کردوون و هۆگری بوون و لە فەرمانی دەرنەچوون.

هەر لەو سەروبەندانەشدا دوژمنێکی زۆر زەرندە ڕووی کردۆتە ئەو مەڵبەندەو فەرمانڕەوای وڵاتەکە خۆی بۆ شەڕی ئەو ساز داوە.

میرمنداڵە و کوڕوکاڵی دەوری عیسا -هەر بۆ گاڵتە- ناوی میریان لە عیسا ناوە و کەوتوونە شوێنی و ڕوویان کردۆتە لای باڵەکان[3] خەلکی ئەوێش سەر و سیمای میرعیسایان بەسام دیوە و زۆریان بە دڵەوە نووساوە و بە مەرد و ڕەندیان ناسیوە و ئەوانیش بڕیاریان داوە کە ئیتر لەمە بە دواوە میرعیسا میری ڕاستی بێ و لە ڕاست فەرمانی مل کەچ بن و چی گوت لە گفتی دەرنەچن.

بەم جۆرە خەلکێکی زۆری پێوە هەڵنیشت و هێز و پێزێکی بێدادی پەیدا کرد و ڕەوانەی قەلای ئەوان[ڕەوان] بوون و دەوریان لێدا. دەوروبەری دژەکە لە کەژەکە، کەڤر و بەری سۆری زۆر بوون. عیسا و دەوروبەرەکانی لە ناو ئەو بەردەسوورانە دامەزرابوون و هێند چاوسوور و غللور و لەسەر شەڕکردن سوور بوون، ئەترەی دژدارانیان برد و بە کۆمەڵی بەردەسۆران ناویان دەرکرد. بەردەسۆران لە ناو دەماندا زۆر بووە و وردە وردە بەردەکە هاوێژراوە و بێژەی سۆران تاق بۆتەوە و بەو ماڵەمیرە

---

← قەلای ڕاوەند. عەونی

وێشدەچێ دزی ڕەوان بێ. ڕۆ، چۆمە و دز، دژە. واتا قەلای چۆمان. هەژار

١- گوندێکە لە دەکیلۆمیتری باکووری ڕۆژاوای ڕەواندز و بە قەد کێوی باڵەکیانەوەیە و لە پێشدا ناوی هەفتخوان بووە و خاوەنی *الاعشي* لە *مسالك الابصار*ەوە بە ناوی خەفتیانی ڕاگوێزتووە. جەمیل

٢- ئەمینزەکی و حوسێنحوزنی بە «شێخ ئیدریس»یان نووسیوە. جەمیل

٣- گوندێکی قەوغایە و نزیکەی ٧ کیلۆمیتری باکووری ڕەواندز و لە سەر لکێکی زێی گەورە هەلکەوتووە. هۆزی گەورەی باڵەکی -کە ٦٠ گوندێکیان داگرتووە- ئەو ناوەیان وەرگرتووە. جەمیل

سەرکردەیەکی لەشکری گەزنەفۆن ناوی «بالك» بووە. هەژار

گوتراوە.[1]

سەرئەنجام عیسا قەلاّی گرت و وەك عیسای مریەم، بە هالاّوی بە ودمی دەمی، تەمی ماتەمی لە بەر خەمباران ڕەواند و دەرد و ستەمی لە سەر تاراندن. ئەستێرەی بەختی لە ئاسۆی هاتدا تیشکی دایەوە و دەم لە شوێن دەم و کات لەجەم کاتا دەگەشایەوە. بە مشوورخۆری و زانایی زۆری، ماوەیەکی زۆر بە کامەرانی و خۆشگوزەرانی، چاوێری و شوانی گەلی دڵسۆزی کرد و کە ڕۆژی بڕا و گۆچانی ئاکامی لە گەردن هالاّ و لە سەر تەختی ڕەوانەوە هاتە سەر تەختەی داربەست و ڕەوانەی گۆڕستان کرا، زۆر ناوی چاکە و تاکە کوڕێکی لە پاش بەجێ ما.

## شاعەلی بەگ

لە پاش بابی کرا بە میر ولە سەر تەختی فەرمانڕەوایی جێگیر بوو. کاتێ کە مەرگ هاتە سەردانی و لە ژیانی زویرکرد، چوار کوڕی بەناوی عیسا و میربداغ و میرحوسێن و میرسەیدی[2] لە پاش بەجێمان.

باوك هەر بە زیندی سەری ولاّتەکەی لە ناو کوڕەکانی دابەش کرد؛ تا لە دوای ئەو پیلە بە یەکتری نەگرن. ناوچەی حەریری -کە پاتەخت بوو- بە میرعیسا بەخشی[3] و لە دەورانی دەستەلاّتیدا

---

١- وشەی «سنگ سرخ» لام وا نیە بەردی سوور بێ. ناوی ولاّتی سۆران لە کتێبی *مسالك‌الابصار*دا هاتووە؛ کە دوو سەدە بەرلەو ڕۆژگارە نووسراوە. پێم وایە سنگ سوورە و لە سۆنگەی سینەبەندی سوورەوە ئەو ناوە ڕسکابێ. فریدریك میللنگن سەدەیەك لەمەوبەر بە کوردستاندا گەڕاوە و سەفەرنامەیەکی بە ناوی *ژیانی سەرەتایی ناو کوردان* نووسیوە. دەوێدا دەڵێ: کورد ڕەنگی سووری گەلێك خۆش دەوێ. هەتا کوردێك دەبینم باسەکەی ناو کتێبی گەزەنەفۆنی سەرکردەی یۆنانیم بیر دەخاتەوە کە پەسنی جلکە سوورەکانیان دەدا... هتد. وا دیارە سنگی کورد لە کن فارسان بۆتە سەنگ. جەمیل

٢- ئەمین زەکی دەڵێ: لە کتێبی *کورد/ردا* میرعەلی نووسراوە. حوسێن حوزنی دەڵێ: ناوی میرسەیدی عەلی بووە و ڕنگە ئەمە ڕاست بێ. جەمیل

٣- ئەمین زەکی و حوسێن‌حوزنی دەڵێن: «شاعەلی بەگ دەگەڵیدا چۆتە حەریر»؛ بەلاّم باسی بەشی سێ کوڕەکانی‌تریان نەکردووە. زۆر وێدەچی میربداغ لە بالەکیان و میرحوسێن لە ڕەواندز و میرسەیدی عەلی لە شەقلاوە دامەزرێنرابن.

دەگەڵ پیـریداغی فەرمانڕەوای باباندا بوو بە شەڕیان و لە مەیداندا کوژرا.[1]

## پیـریداغ[2] کوڕی شاعەلی بەگ

لە پاش بابی بە سەر بەشەکەی خۆی ڕادەگەیشت و سۆماقلق[3] (سۆما)شی لە هۆزی نیلخاسی[4] سەر بە قزڵباش ڕزگار کرد و خستیە بەر دەستی خۆیەوە و چەند ساڵێك فەرمانڕەوایی تێدا کرد و ئەمجار ماڵاوایی لە ژیان کرد و دوو کوڕی لە پاش بەجێ مان: میرسەیفەدین و میرحوسێن.

## میرسەیفەدین

بوو بە جێنشینی بابی. بەڵام زۆری نەخایاند کە پێمێردی خودا بەرەو گۆڕستانی شاند و شوێنەکەی بۆ برای بەجێ ما.[5]

## میرحوسێن

لە جێگەی میرسەیفەدینی برای کرا بە میر وهێشتا دەستەجلکی لە میرایەتی‌دا نەدڕیبو کە خوا ڕۆزی لە سەر دنیا بڕی و ئەویش حەوت کوڕی هەبوون، گەورەکەیان ناوی میرسەیفەدین بوو؛ ئەو لە جێگەی بابی کرا بە جێنشین و سۆماشی وەك باب و باپیرانی خستە بەرچنگەوە.[6]

## میرسەیدی کوڕی شاعەلی بەگ

ئەگەرچی کوڕی گچکەی شاعەلی بەگ بوو، بەڵام بە پایە و ناوبانگ زۆر گەورە بوو. بۆ نان بدەیی و

---

١- حوسێن حوزنیش هەروا دەڵێ؛بەڵام ئەمین زەکی دەڵێ میریداغی برای کوشتویە. پێم وایە بەهەڵە چووە.جەمیل

٢- لە دوو دەستنووسدا میریداغە.عەونی  دانەر لە باسی شاعەلی بەگیشدا میریداغی گوتووە. هەژار

٣- لە دوو دەستنووسدا سوماقلو. عەونی حوسێن حوزنی بە سۆمای نووسیوە؛ ڕەنگە سیماقولی بێ کەگوندێکە سەربەکۆیە. جەمیل سۆما ناوچەیەکی بەرفرەوانە و لەکوردستانی بەردەستی ئێرانە و سەر بە ئەستانی ورمێیە.هەژار

٤- ڕەنگە لە هۆزەکانی قزڵباش بووبێ، پیـریداغ ڕاوی نان و دەورمێی پەستاوتن. جەمیل

٥- حوزنی دەڵێ: لە پاش مەرگی سەیفەدین، هۆزی نیلخاس سۆمایان گرتەوە. جەمیل

٦- حوسێن حوزنی دەڵێ: کە سۆمای لە نیلخاسان ساندەوە، دوایی نیلخاسانیشی بڕاندەوە. جەمیل

بەخشین، وەك دەریای بێ کەنار وابوو. ئاوازەی دڵاوایی بە دنیادا گەڕابوو؛ لە مەیدانی مەرداندا، لە ڕوی هێرشبەراندا، بەرانبەر بە هەزاران بوو؛ کوتاڵی مەردازایی بە بەژنی ئەو بڕابوو. لە پاش ئەمانی بابی لە شەقاباد[1] دادەنیشت. تۆڵەی کوژرانی میرعیسای برای لە پیربداغی بابان ساندەوە و بە گژیدا هات و پیربداغی کوشت و داخی خۆی پێ ڕشت و ناوچەی براشی دەگەڵ بەشی خۆی تێکەڵ کردەوە و لە سەر مەڵبەندی سۆران و ناوچەکانی سەربەوێ، زۆر بە سەربەستی و ئازاد و ئازا فەرمانڕەوایی دەکرد و لە سەرئەنجامدا کە لە بەر مەرگ بەزی و خزیە گۆڕی بەرتەنگەوە، سێ کوڕی بە ناوی میرسەیفەدین و میرعیززەدین شێر و سولەیمان لە دوو بەجێ مان.[2] میرسەیفەدین لە هەرەتی جوانی و جەنگەی بەهاری ژیانیدا لە سەر ئەسپ پەڕی و پەڕیوەی ئەو دنیا بوو.[3]

## میرعیززەدین شێر

میری هەولێرێ بوو.ساڵی ٩٤١ك (١٥٣٤ز) کە سوڵتان سولەیمانخان ئارامیگەی بەغدای گرت، زستانەکەی لە هەولێر گوزەراند[4]. لەو بەینەدا عیززەدین شێر هێندێك کاری ناڕەوای دەربارەی

---

١- شەقلاوە کەونە و *مسالك الابصار* باسی دەکا. ڕەنگە ناوەکە لە شەقل (دار) و (ئاو) پەیدا بوویێ؛ کە دەڵێن شاقولیاوایە بە لامەوە دوورە؛ چونکە شاقولی بەگ لە دواییدا لەسەری بووە. جەمیل

٢- حوزنی موکوریانی دەڵێ: میرسەیدی دەوری قەڵای هەولێری داو قزلباش چیرقەڵاییان کرد و بەدەستیانەوە نەدەدا، دەورەدان شەش مانگی خایاند. میر لە خوار قەڵاوە مزگەوتێکی گەورەی دروست کرد و گەلێکی کورد هێنان و فەرمانی داکە خانوان دروست کەن. بەم کارە شارۆکەیەك بەرهەم هات.

٣- حوزنی دەڵێ: سێ مانگ میربووە؛ لە سەر سواریەوە هەڵدێراوە و دەستە و لەجێ مردووە. جەمیل

٤- حوسێن حوزنی دەڵێ: سوڵتان سولەیمانی قانونی لە سەفەری تەورێزی تێشکابوو. خۆی لە سەرمای زستانی تەورێز دزیەوە؛ هاتە گەرمیان و لە هەولێر دابەزی. عیززەدین پێشوازی شایانی لێکرد و هەموو زستانەکە میوانداری زۆرباشی لێکرد؛ بەڵام سوڵتان سولەیمان چونکە زۆر خوێڕی و نامەرد بوو، سزای سنماری داوە. سەرۆك هۆزی دنە دەدان لە میر هەڵگەڕێنەوە و پیاوەکانی خۆی فێر دەکرد ئاژاوە بنێنەوە و بەم ئاوایە پلانی بۆ ڕێکخست و لە شەوێکدا بردیە مۆڵگەی شاهانە و بە نهێنی خنکاندیان. ئەمجار بە شیر بەربوونە دۆستانی و گەلێك سەرکۆمار و سەرناسی شار و مەلای مەزنیان کوشت. گەنجینەی میریشی تاڵان کرد و هەرچی بەر پەلی کەوت بردی. جەمیل



نۆکەرانی ئاستانەی بەرزی سولتان کرد و بۆ کوشتنی فەرمانی بێوچان درا و کوشتیان![1]

هەولێریش درا بە حوسێن بەگی داسنی، کە لە ماڵە میرەکانی یەزیدی بوو. لە پاش کوژرانی عیززەدین شێر، سولەیمانی براشی خێر و خۆشی لە دنیا نەدی و لە پاش ماوەیەکی کەم ڕێی نەمانی بەدی کرد و بوو بە گۆڕنشین و سێ کوڕی بە ناوی قولی بەگ و میرعیسا و میرسەیفەدین لە سەرزەمین بەجێ هێشت. سولتان سولەیمانخان هەموو وڵاتی سۆرانی وەسەر هەولێر خست و کردیە بەخشش بۆ حوسێن بەگی داسنی. ئیتر حوکمداری سۆران بە یەکجارەکی لە دەست خاوەنانی هاتە دەر و بیانی پێ ڕادەگەیشت!

## میرسەیفەدین

## کوڕی میرحوسێن کوڕی پیربداغ

وەك لەمەوبەر کەلەبەری تەرەزنی قەڵەمەکەمان دەڵاندی، میرسەیفەدین سوماقلۆ[سۆما]ی وەکوو باب و کاڵان لە دەستا بوو. لەوان سەردەماندا کە هەموو خاکی سۆران لە لایەن پادشاهی خەزاکەرەوە بە حوسێن بەگی داسنی بەخشرا[2]، چەند جارێك لە نێوان میرسەیفەدین و حوسێن بەگدا شەڕ و لێکدان ڕوی داو لە ئەنجامدا سەیفەدین خۆی لە بەر یەزیدیەکان نەگرت[3] و پەنای بە بێگە بەگی حاکمی ئەردەڵان برد. بێگە بەگ لە ترسی تووڕە بوون و ڕوو

---

١- حوزنی دەڵێ: میر عیززەدین کوڕی ڕاوێژکەرانی لە مەلاچاکەکان پێك هێنابوو؛ بە بێ پرسی ئەوان هیچ کاری ئەنجام نەدەدا. زۆریشی ئاسەواری باش بەجێ هێشت. بۆ نموونە: گومبەزی یوونس پێغەمبەری لە مووسڵ نوێ کردەوە و زۆری دووکان و زەویوزاری دەم دەجلە دەقەبەڵ کرد. لە ڕۆژهەڵاتی هەولێر دوو مزگەوت و میوانخانەیەکی دروست کرد و مەوقووفەی زۆری بۆ بڕینەوە. شاری کەرکووکی قەوغاتر کرد و دەشتەکیەکانی لە شار دادەمەزراندن؛ سێ مزگەوت و فێرگەیەکی زانستی لێ بنیات نا. مەدرەسەی سۆرانی -کە لە کەرکووکە- لەوانەیە هی ئەوبێ. جەمیل

٢- حوسێن حوزنی دەڵێ: کە سولتان سولەیمان هەولێری دابە حوسێن بەگی یەزیدی، خەڵك پێیان خۆش نەبوو؛ چونکە لە زێد و دینیان بێگانە بوو. سەرەڕای ئەوەش زۆر زاڵم بوو. تێکڕا گلێنامەیەکیان نووسی و بە چەند پیاوێکی گەورەدا بۆیان نارد. دوو لەوانە: مەولانا شێخ شەرەفەدینی نەخشبەندی و مەولانا سەیفەدینی سوهرەوەردی بوون؛ کە ئەوانە شێخی تەریقەت بوون. هەروەها چوار مەلای گەورەشیان دەگەڵ بوو. فەرمانیدا هەموویان کوشتن! جەمیل

٣- حوزنی دەڵێ: هۆی شەڕەکە ئەوە بوو: خەڵکی سۆران لە چنگ کابرای یەزیدی وەزاڵە هاتبوون. دەستەودامێنی ←

لێوەرگێڕانی سوڵتان، نە ڕووی پێدا و نە یاریدەیدا. میرسەیفەدین بە دڵساردی گەڕاوە و هاتەوە سۆران و کۆمەڵێکی لە خەڵکی ئەو ناوە لە خۆ هاڵاند و هەڵیکوتا سەر دوژمن و دژی هەولێری داگیر کرد.

پەڕاندنی ئەو لەمپەرە و سەرکەوتنی واسەمەرە، هومێدی وەبرەو خستەوە و هەموو هۆز و تیرەی سۆران بە تێکڕایی بووژانەوە و هرووژان و هاتنە بەر ئاڵای میری خۆیانەوە. چۆن سەردەمێك ئەبوموسلیم لە ژێر درۆشمی عەبباسیان خزمی یەزیدی قڕ کردن، میرسەیفەدین هەر بەو نیازە بەرەو یەزیدیەکان بزووت. حوسێن بەگ بە لەشکری یەزیدیەوە پێشی پێ گرت و شەڕێکی زۆر خەست و خوێناوی لە ناو سۆرانی و یەزیدی ڕووی داو ئەمجارە یەزیدی شکان و لەو شەڕەدا پێنسەد پیاوی سەرناسی داسنی کوژرا و بەرەی حوسێن سەرکەوت! تاڵان و ماڵ و شمەکی زۆر و زەوەند وەگیر لاوانی سۆرانی و وەچەنگ میرسەیفەدین کەوت و میرسەیفەدین بۆوە بە میری سەربەخۆی سۆران. میرحوسێنی داسنی چەند جارێکیتر شەل و شکستە و گەجەر گوجەری یەزیدیانی کۆ کردەوە و شەڕی خۆدڕێنی نایەوە و هەموو جاریش لەشکرەکەی دەشکایەوە و جار لە جار پتر دەپووچایەوە و سەرکەوتن چووبووە لای سەیفەدین و داسی داسنیان نەیدەبڕی. حوسێن بەگی داسنی کە تێگەیشت ئاسنی سارد کوتانە و تەنگانەی بێدەرەتانە، بە بۆڕدراوی و سەرشۆڕی بەرەو پاش گەڕایەوە. کاتێ باس‌وخواسی ئەو شکان و ڕاونانە گەیشتە ئاستانە و بوو بە مقۆمقۆ، ناردیان حوسێن بەگیان بردەئەستەنبووڵ و فەرمانی لە سەردانی لە سوڵتانەوە بۆ دەرچوو؛ بە هەزار ئەشکنجە و ئازاردانەوە کوشتیان.

| | |
|---|---|
| کەسێ هاوکاری زۆرداران بوو پیشەی | دەسی زۆردار بە بیور دای لە ڕیشەی |
| کە تاژی ڕاوی پێ نەکرا و شەکەت بوو | لە لای ڕاوکەر لە ژێردارا سەکەت بوو |
| کەوێك هاوخوێنی خۆی بێنێتە سەر داو | نە دوورە خێوی، خۆی لێنێ بە شۆرباو |

⟵ میر بوون کە ئەو دۆڵپایەیان لە کۆڵ کاتەوە. هێرشی بردەسەر و لە دەشتی حەریر پێکدا هاتن و لەشکری حوسێن بەگ هەڵات و دایە چیا و چووە ناو قەڵای حەریرەوە و ناردی کە لەشکری بۆبێ. بە فەرمانی سوڵتان لەشکری مووسڵی بۆ هات و بە گژ یەکدا هاتنەوە و ئەوجار میرسەیفەدین شکا. جەمیل

سوڵتانی خەزاکەر فەرمانی بە سوڵتان حوسێنی فەرمانڕەوای ئامێدی داکە هەموو میرەکانی کوردستان دەگەڵ خۆ بەرێ و بچنە سەر میرسەیفەدین و خاکی سۆرانی لە دەست دەرێنن. بەڵام ئەو هەزار زیلەش هەرچی کردیان و کڕاندیان و مڕیان و مڕاندیان، چیان بۆ دەگەڵ نەکرا و بە ئاوات نەگەیشتن و بە بۆڕاوی و دۆڕاوی گەڕانەوە. ئیتر لەو ساوە میری سۆران حەساوە و بێ ترس و پرس و بە کامرانی و ئازاد و سەربەخۆ گوزەرانی دەکرد و فەرمانی بە سەر هەموو وڵاتی سۆراندا دەڕۆیی. بەڵام وەك گوتوویانە:

| | |
|---|---|
| بەڵای عاسمان کە ویستی پێت بوەستێ | دەپێشدا چاو و گوێ و زارت دەبەستێ |
| کە قۆرتی ڕێت نەدی و چاکەت نەبیسی | گلار بووی و لە ناو چاڵدا قەتیسی |
| هەتا بزوا زوانت بۆ زیانە | بەڵای بێ ئاوەزی ئاهۆی ژیانە |

ئەویش خوا لێی گۆڕی و کەوتە ناو تۆڕەوە و یوسف بەگی برادۆست -کە نازناوی غازیقڕان بوو[1]- هەڵیفریواند و درۆی بۆ هەڵپریواندن کە ئەگەر دەگەڵ ئەودا بچێتە لای سوڵتانی خەزاکەر و پەنای پێ بەرێ و ئەویشی تکاکار بێ، هەرچی ئاواتیەتی بۆی دەچێتە سەرێ و لە دەریای بێبنی بەزەی شاهانەوە هەموو گوناهی هەڵدەوەرێ و لێی دەبوورێ و بە دەستووری باب و باپیرانی وڵاتی سۆرانی دەگەڵ خەڵاتی زۆر پێ دەبەخشن و توورە و نیشانی بە سنگەوە دەنەخشن.[2] میری وەدوی خۆیدا و دەگیری خست و تەواو پای نەخستبووە ناو ئاستانەوە میرغەزەبی بە پیرەوە هاتن و خستیان و بەستیان و دەستیان لێ هەڵنەگرت هەتا هەست و خوستیان لێ بڕی.

---

١- غازی قڕان کوڕی سوڵتان ئەحمەد و نەوەی میرەکانی حەسنەوییە بووە، کە هاتوون و لەو وڵاتە بوونە میر. جەمیل

٢- حوسێن حوزنی دەڵێ: بەوە فریو درا کە بچێ و پەیماننامە دەگەڵ سوڵتان ببەستێ و تیا بڕیار بدرێ کە: میر خۆ دەسنووری عوسمانی نەگەیەنێ و خەڵکیشی لێ هان نەدا و بازرگانییان لە ناودا بێ و دەوڵەتی عوسمانی سەربەخۆیی سۆران بە ڕەسمی بناسێ و سوڵتان میرەکوردەکانی بۆ بنێرێ و دەگۆ ئێران ڕاچێ و تاونباران بدەنەوە بە یەکتر و سەفیران ئاڵ و گۆڕ بکەن و تا دەساڵ ئەم پەیمانە دەگەڕدا بێ. هەروەها باسی زۆر فێڵ و فەرەجی تریش دەکا کە بۆ چاو بەستنی خراوەتە گەڕەوە. جەمیل

میرسەیفەدین ڕۆژی چواری مانگی قوربانی ساڵی ٩٦٦.ك (١٥٥٨.ز) کوژراوە. جەمیل

## قولی بەگ

### کوڕی سولەیمان بەگ کوڕی میرسەیدی

لەو ڕۆژگارەدا کە وڵاتی سۆران بە دەست داسنیەکانەوە بوو، قولی بەگ چەند جارێکیان بە گژدا هات و هەموو جاریش لە بەریان دەشکا و هێزی پێ نەشکان و لە چاری ناچارەوە خۆی لە کوردستان شاوارە کرد و ڕووی کردەدەرگانەی شاتۆماسب و پەنای بە ئێران برد.

سەبارەت بە دژمنی و کینەی کۆن و لە مێژینەی هەواخوایانی حوسێن و ئاشنایانی یەزیدی، داسنیەکان موسوڵمانی سۆرانیان دەگیرهێنان و ملیان لێنان و دەمیان تێنان و کارێکی وایان دەگەڵ کردن کە هەموو کەس بە چاکەوە یادی حەجاجی یوسفی دەکردەوە و زوڵمی بێدادی سەعدی کوڕی زیادیان لە بیر بردەوە.[1] کوردی سۆران کێردیان گەیشتە ئێسکان و لە گیان و ژیان وەڕەز ببوون؛ پیاویان ناردەعەجەمستان و بە تکا و نزا و داوێنبادان قولی بەگیان هێنایەوە.[2]

ئەوسا ناردیانە ئاستانە و داوای پلەی باب و باپیرانی لە سوڵتان کرد. سوڵتان سولەیمانخانی خەزاکەر بڕوای بە قولیبەگ نەبوو؛ دڵی ئاوی نەخواردەوە کە بۆی بکا و بۆ ناوچەی خۆشی نەناردەوە؛ سەماواتی[3] سەر بە بەسرای بە سنجەق پێ بەخشی.

لە پاش نەهێشتنی میرسەیفەدین و کوشتنی حوسێن بەگی داسنی و ڕووداوانی ئەو ڕووداوانەی کە لێی دواین، لەسەر تکای سوڵتان حوسێن بەگی فەرمانڕەوای ئامێدی، لە سەماواتی بەسرەوە ڕایانگوێزت و لە مەڵبەندی سۆراندا ناوچەی حەریریان دایە[4] و بیست ساڵێك لەوێندەرێ ما و

---

١- سەعد کوڕی زیاد سەرکردەیەکی لەشکری یەزیدی کوڕی مەعاویە بوو کە شەڕی ئیمام حوسێنی کرد. جەمیل

٢- حوسێن حوزنی بە جۆرێکیتری دەگێڕێتەوە و دەڵێ: میرقولی بەگ وەختی خۆی چووبوە ئێران. عوسمانی ناردیان هێنایانەوە و چوارجاران لەشکریان دایە و لە مووسڵەوە ناردیانە سەر میرسەیفەدین و دەرۆستی نەهات و کە زانیان چی بۆ ناکرێ، ناردیانە سەماوە. دوای ئەوەی میرسەیفەدین حوسێن بەگی داسنی و هێزی هیمدادی تورکانیشی شکاند، میرقولی بەگ هەر نەهاتەوە کوردستان. جەمیل

٣- سەماوە ئێستا لە سەر ئەستانی دیوانیەیە و لە باشووری عیراقە. جەمیل

٤- حوزنی دەڵێ: ساڵی ٩٦٧ك (١٥٥٩ز) سەرەك هۆزەکانی سۆران و میرەکانی کوردستان و دەوڵەتی ئێران -کە دەیانزانی سوڵتان سەری قاڵە- ڕێگەی ڕاکردنیان بۆ میرقولی بەگ خۆش کرد و لە سەماوەڕا هەڵات و ڕۆژی ٦ی مانگی مەولوود هاتەوە حەریر و زۆری خەڵك پێوە هەڵنیشت و بە کۆمەگی گەورەپیاوان قەڵاکەی قایم دابەستەوە ←

مەزنایەتی کرد و لە ئەنجامدا پۆشاکی حەریری بە جاوی بێشۆ وەگۆڕی و سەنیری خاکی وەبن سەردا و لەسەر بەردی گۆڕیچە، بۆ یەکجاری دەخەو ڕاچوو. دوو کوڕی بوون: بداغ بەگ و سولەیمان بەگ.

## بداغ بەگ

### کوڕی قولی بەگ کوڕی سولەیمان بەگ

لە پاش نەمانی بابی، ئاڵای فەرمانڕەوایی لە سەر سەقاباد |شەقلاوە| شەکاوە؛ بەڵام بە فیت و هۆی بەدگۆیان و لە ڕایەڵی بێ پۆیانەوە، کری سفتی برایەتی دوو براله هەڵوەشاو خۆشەویستی و هێمنی، بوو بە کێشە و دوژمنی و پرتەوبۆڵەی سەر زوان بوو بە تیری ناو کەوان و شیریان لە ڕوی یەکدی کێشاو ڕمبیان بۆ یەکتر هەژاند و میربداغ بەرکەی پەیاغی سولەیمانی نەکرت؛ مەیدانی بۆ چۆڵ کرد و پەنای بە سوڵتانحوسێن بەگی فەرمانڕەوای ئامێدی برد و چاونۆڕ بوو کە دەرووێکی لێ بکرێتەوە و کۆمەگ و یاریدەی بکرێ و بێتەوە سەر جێوڕێی خۆی، کەچی ئەوەشی بۆ نەلوا؛ مردن بەربینگی لێ گرت و عیزرایل پەلپی پێ گرت و نەیانهێشت و لە عەقرەی سەر بە ئامێدی دەناخی هەردیان ڕاکرد و گلەوگازنی بردەلای خودا.[1]

---

← و کردیە پاتەختی میرایەتی و زۆریش میرێکی گەلدۆست و دادگەر بووە و وڵاتەکەی گەشە پێداوە و قەڵەمڕەوی خۆی زیاد کردووە و هتد. جەمیل

١- ئەمین زەکی دەڵێ: میربداغ بە بێ کێشە و دەردەسەری، دووساڵانی مەزنایەتی کرد؛ هتد. حوسێن حوزنیش هەر لای وایە و دەشڵێ: برای شەڕی پێ فرۆشت؛ مەلا و کەیخودای ناردنە لای کە پێکیان بێنن؛ بەڵام برا ملی نەدا و گێچەڵ بەری دەرگای پێگرت. سولەیمان بەگ لە برادۆستەوە و میربداغ لە شەقلاوە ڕاهاتن و لە دەشتی حەریر، لە نزیک باتاس تووشی یەك بوون و هەردووك لەشکر پێك وەر بوون. لە شەوەکیەوە تا ئێوارە لێکیان داو هەر دوو لا زۆریان زیانی ماڵی و گیانی لێکەوت. لە ئەنجامدا پیاوەکانی میربداغ لەو تەکینەوە و چوونە لای دوژمنی و کاتێ زانی بەنی برای پێ با نادرێ، ناردیە لای کە هەرچی گرتوویە بۆ خۆی و شەقلاوە و حەریر و هەولێرم لێ نەستێنێ. لە پاش چوار مانگ وەرام هاتەوە کە واناکەم. ئەویش ئەوجار لە ناچاری هەڵات و هتد. هەروەها دەڵێ : ساڵێ ٩٨٥.ك (١٥٧٧.ز) مرد و لە ئامێدی نێژرا.

ئەمین زەکی لایەنگیری دانەرە و دەڵێ: هێزی بادینانی دەگەڵ خۆی هێنا، بەڵام نەگەیشتەوە و لە عەقرە مرد. ناوەکەشی لە *مشاهیر الاکراد*دا بە بداغ کوڕی قولی بەگ، کوڕی میرسەیفەدین نووسیوە و بە لامەوە ڕاست نیە. جەمیل
←

## میرسولەیمان بەگ کوڕی قولی بەگ

لە پاش مەرگی باب و برا، سولەیمان بەگ بوو بە فەرمانڕەوای سەربەخۆی هەموو وڵاتی سۆران. زۆر پیاوێکی بەهونەر و دادگەر و هەژارپەروەر بووە؛ لە هۆش و بیروڕا و تەگبیر و مشۆرخۆری و وەج و سەنگ و کارامەیی و زەبر و زەنگدا، لە ناو هەموو سەرداران و سەروەرانی کوردستاندا زەق و زۆپتر دیاری داوە و بە تلی نیشان دراوە و نموونە و بە ناوودەنگ بووە.

بنەماڵەی میری سۆران هەر لە مێژڕا دوژمنی هۆزی زەرزا بوون[1] و گەلێك جاران وێك کەوتبوون و لێکیان دابوو؛ هەمیشەش لێکتر دەخەفتان. جا کە دەوران ئەو دەورەی داو گەورەیی دەست سولەیمان کەوت، وەك سولەیمانی پێغەمبەر هەر کە خودای گەورە فەرموویە «سولەیمان لەشکری خۆی لە ساندا»، نزیکەی سێزدەهەزار پیادەو سواری دێو ئاکاری کوردی کۆ کردەوە و هێرشی بردەسەر زەرزا. ئەو دێوانە لەو کێوانەوە بە تەندوورە لوور بوونەوە و هاتنە جەستەی زەرزایان و هەتا ئەوان بە خۆیان زانی، هیچ دەرفەتیان بۆ نەما و میرلیوا و سێسەدوپەنجا کەسیان لە سەرناسان و ئاغایانی زەرزا کوشت و وردەو یەخسیریان بە تاڵان هێنان و هاتنەوە بۆ وڵاتی سۆران[2]. چەند زەرزای شل و

---

← دانەر نەیگوتوە هیمدادی هێنا! دەڵێ چاوەنۆڕی کۆمەگ بوو.هەژار

١- هۆزێکە لە کوردستانی بەردەستی ئێران و لە دۆڵی گادەر، لە دەشتی شنۆ نیشتەجێن. جەمیل

٢- حوزنیموکوریانی دەڵێ: زەرزا ئاشنای سەفەویان بوون. سولەیمان بەگ دوو ساڵ بوو میریەتی دەکرد کە ئێرانی زەرزایان لێ ڕاست کردەوە و دەگژی ڕاچوون. لە پاشانیش عوسمانیەکان کە هەستیان کرد هۆزی زەرزا بۆ پواز باشن و بۆ دەکار هێنان دەست دەدەن، سوڵتان پیاوی ناردەلایان و زۆری دڵخۆشی دانەوە و ڕووی لە ئێران بادانەوە و پارەوە چەروەی کردەهی خۆی و ئەوسا هەمووی بەتەیاری پڕچەك کردن و دەسولەیمان بەگی بەردان. سولەیمان بەگ بۆ ئەو شەڕە چاردەهەزار کەسی چەکداری ئامادەکرد و ڕوو بە لەشکری زەرزا هات و لە گوندی سیدەکان تووشیان بوو. لەو دەمەدا کە شەڕکەران چاوەنۆڕی فەرمانێ بوون، سولەیمان بەگ بە وتارێك تێی گەیاندن کە زەرزا چن و کێن و ئامانجیان لەو شەڕە چیە؛ چۆن بۆنە قوڵەچۆماغی دوژمنانی گەلی کورد و جار دەچنە لای عەجەمان و دەگەڵ هۆزی مەحموودیان هێرش دەبەنە سەر ورمێ و تاڵان و وێرانی دەکەن و هەلێك یار و هاریکاری یوسف غازی قرانن، تا بتوانێ میرسەیفەدین لە ناو بەرێ. ئیستاش خۆیان بە عوسمانیان فرۆشتووە و هاتوون کوردی بۆ بکوژن و ئاسەوارمان ببڕنەوە. جا لە چاوی منووکەوێ دەست هەڵێنن؛ ورەیان لێ بتارێنن؛ کەس بەزەیی بە زەرزادا نەیەتەوە. ڕۆژ ڕۆژی کەڵەپیاوانە و ترس و قزەیی تاوانە و مردن بۆ تەپ و خاوانە. ئەوسا فەرمانی هێرشی داو شاڵا و برایە سەر زەرزا و شەڕگە، چیای سیدەکان بوو. بە شیر و تیر بەربوونە یەك و شەڕێك لەو ناوەدا ڕوی دا، باب ئاگای لە کوڕ ←

کوت کراو -کە لە بەردەمی شیـران بە بەرماو مابوونەوە- بەرەو ئەستەمبوولْ خوشیـن و بەشیـن و گابۆڕەوە ڕوویان کردەئاستانەی سوڵتان مرادخان و داد و بێدادی خۆیان کرد. پادشای خوالێخۆشبوو بە دڵ لێ بڕا کە سولەیـمانی بە پەندێك بەرێ، سەری هەموو سەرەڕەقێکی پێوە نەرم کا؛ کەچی هەر لـەو گەرماوگەرمیەدا سولەیـمان بەگ پەلاماری هەردی ئێرانی داو هێندێك لە وڵاتی قزڵباشانی تالان کـرد و زۆریشی لێ بە دیل گرتن و دیلەکان و ماڵ و سـامانی زۆری بەرتالانیشی بـە دیـاری بـۆ سـوڵتانی خوابەخشیو نارد و بەو شیـرینیە خەستە، پیلوی پیلە دۆزینەوەی سوڵتان پێکەوە نووسان و چـاوی لـە ڕاست گوناهی سولەیـمان بەگ نوقاند و وەبەر بەخشیـن و چاوپۆشێنی پادشاهانە کەوت![1]

قوباد بەگ ناوێك بە سەر سنجەقی تەرەك[2] ڕادەگەیشت و پسمامی میـرسولەیـمان بەگ بوو. ئـەو

---

→ نەمابوو. دوو ڕۆژ لە بەرەبەیانڕا تا زەردەپەڕی هەنگۆرێ شیـروەشان و خوێن ڕژان و مژی پژان و کوشت و کوشـتار بوو. زەرزا تەواو شپرزە کران و لە مەیدانی شەڕ دەرکران و ڕاونران و بەرەو شنۆ هەڵاتن. لەو شەڕەدا ئەمیـرلیوا -کـە تورکێکی عوسـمانی بوو- دەگەڵ پێنجسەد کەس لە زەرزا بە دیل گیـران.

میـرسولەیـمان دوای ئەو شەڕە، لەشکری خۆی بڵاو نەکرد و مانگێکی پـشوو پێـدان و پاشـان لەپڕونـەکاو، بەپاتـەوە هێرشی بردەسەر هۆزی ئیلخاسی قزڵباش و زۆربەی زۆری پیاوەکانی دەردەست کردن و لە ناوی بردن و ئیتـر تـازە لـە سندوس و نەغەدەدا کەس نەما خۆی لە قەرە بدا یا خۆ بێفەرمانی بکا. ئەو شوێنانەی کە گرتیشنی پیـاوی خـۆی لـە سەر دانابوون.

حوزنی پێدا دەڕوا و دەڵێ: سوڵتان مرادخانی سێهەم کاتێ دیتی کە بە زەرزا چی بۆ دەگەڵ میـرسولەیـمان بەگی نەکرا، ئەوجار ناردی قوباد بەگی کاربەدەستی تەرگەوەڕی بۆ شەڕی سولەیـمان بەگ ڕاست کرد و لە هەمبەر ئامۆزایدا ڕاستی کردەوە و بەزەبری زێڕ، پسمامەتی و هاوسایەتی لە بیـر بردەوە.

قوباد بەگ چوارهەزار شەڕکەری هەبوو؛ چاوەنۆڕ بوو لە ئەرزەڕۆمەوە هیمدادی تورکانی بۆبێ. سولەیـمان بەگ بەمـەی زانی و هەلی لە دەست نەدا و نەیهێشت دەسەریەوە بچێ و لە پڕ بە سـەری دادا و ڕۆژێـك هـەتا ئێـوارێ دوو لەشـکر شیشانە یەك بە شیـران و قوباد داوای شەڕ وێستانی کرد و سولەیـمان بەگ گوێی نەدایە و گوتی: دەبێ بـە بـێ مـەرج خۆیم بدا بە دەستەوە. قوباد بە شەو تێی تەقاند و سولەیـمان بەگ کەوتە شوێنی تا دەقەڵای مەرگەوەڕی پەسـتاوتەوە. لەو شەڕەدا لە هەردووك لا چوارسەد کەسێك بە لادا هات. قوباد بەگ دوای ئەم شـکانە هەژدەکەسـی لـە سەرناسـانی دەوروبەری خستە تەك خۆی و چوونە وان و بەسەرهاتیان لە بەردەمی والی دانا. ئەویش لە سـۆنگەی شـکان و جـەنگ دۆڕاندن، قوباد و چەند کەسێکی کوشت و ئەوانیتری لە سووچی زیندان توند کرد.جەمیل

١- تاڕووتی، مەڵێ وام کرد یان وامە    چێشکەم بۆبگرە، پێت دەڵێم مامە!  هەژار

٢- تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ: نەهۆ لە سەر کوردستانی بەردەستی ئێرانن و لە نزیك سنووری ئێستای تورکیا و عیراقن ←

کابرایە چەند کارێکی ناشایستی کردن و تەنانەت هەوای فەرمانڕەوایی سۆران لە مێشکیدا تریتانەی دەکرد و دوژمنایەتی میرسولەیمانی لە چیکلدانی دڵی خزاند و کینەی ئەوی لە سینەدا کەوی ببو؛ چینە و پیێپرژەی لێدەکرد. سولەیمان بەگ لێی دەخەفتا هەتا ساڵی٩٩٤.ک (١٥٨٥.ز) لە نەکاوا هەڵیکوتا سەر پسمامی بێئارامی و ئەو و چاردەخزم و پیاوی زۆر نزیکی وێکڕا کوشتن و داخی دڵی خۆی پێ ڕشتن. ئیتر لەو ساوە دنیا حەساوە و کێ دەیوێرا شان لە شانی میرسولەیمان دا؟ بە سەربەستی و بێ بەرهەڵست ببووە میرێکی سەربەخۆ و لەو ناوەدا خاوەن پایە و خێوی شکۆ هەر بۆ خۆی بوو. بەرز و نزم و نامۆ و خزم و دوور و نزیك سەری لە بەر نزم دەکرد و میر ومەزنانی کوردستان هەموو بە دڵ لێی دەترسان و دەستەونەزەر لەبەر دەستی دەوێستان و لە ڕاستەوی، ڕام و کەوی و لە ژێر پەنجەی زبری ئەودا، نەرم وەك مێوەڕۆن وابوون. ئەگەرچی نەخوێندواریش بوو، خوێندەواری خۆش دەویستن و دەیدواندن و لێی دەبیستن و ببووە پەیڕەوی پیران و زۆربەی دەمی بە نوێژان و زوانودەمی بە نزاوە سەرگەرم بوو. دوا سەرئەنجام جیهانی دوا پووچ و تاڵی بە قاقڕ و کڕاڵ زانی و بە هەشتیلەی گیانی پاکی، بەزەی خودای بەرز و تاکی لێ بوو بە باڵ و ڕکەی خاکی دایە دواوە و بەرەو پەریاوای لای خودا، لە شەقەی شاباڵانی داو بەهەشتی پەروەردگاری کردەهێلانەی یەکجاری[1] و عەلی بەگی بە یادگار لێ بەجێ ما.

## عەلی بەگ کوڕی سولەیمان بەگ

لە دوای ئەوەی کە بابی لە ئارادا نەما، بە فەرمانی لەبانسەرانی سوڵتانی خوالێخۆشبوی

---

⟵ و لە ڕۆژاوای شنۆ و داوێنی چیای دالانپەردا هەڵکەوتوون. هەژار

١- حوسێن حوزنی دەڵێ: هەتا ساڵی ٩٩٨.ك (١٥٨٩.ز) حوکمی کردووە و ئەوسا عەلی بەگی کوڕی لە جێی خۆی داناوە و ساڵی ٩٩٩.ك (١٥٩٠.ز) مردووە و زۆریشی ئاسەواری باش لە پاش بەجێ ماوە. مزگەوتی گەورەی حەریر و ئەو قەڵایەی کە ئێستەش لە کن ئەشکەوتی خرواتان شوێنەواری ماوە، کردەوەی ئەون. خانزادەخاتوونی بەناوبانگ کە «قەراڵیچەی سۆران» یان پێ گوتوە، خوشکی بووە و کاروباری ناوخۆی ڕاپەڕاندووە و لە زۆر کاراندا میر پرسی پێ کردووە. خوشکە پەروینی وێژەوانیش لە چیرۆکێکدا کە دەربارەی خانزادەی سۆرانی نووسیوە و لە رووپەڕ ٩٠-٩٣ی ژمارە ٧و٨ی گۆڤاری گەلاوێژی ساڵی ١٩٤٢دا چاپکراوە، خانزادی بە خوشکی میرسولەیمان داناوە. بەڵام ئەمین زەکی لە *مشاهیرالاکراد*دا دەڵێ: ژنی بووە و کچی حەسەن بەگە. جەمیل

بەهەشتەلان[1]، کرا بە میری وڵاتی سۆران و ئێستا کە مێژووی کۆچی هەزارو پێنجە، میرنشینی سەربەخۆی باب و باپیرانی لە دەستدایە[2].

١- نیازی لە مرادخانی سێهەمە.

٢- شەرەفخان هەتا ئێرەی هێناوە و ئێمە لە سەر ژیننامەی بنەماڵەی سۆران دەڕۆین:

عەلی بەگ لە ڕۆژگاری بابیدا بە سەر جۆڵەمێرگ ڕادەگەیشت؛ کاتێ کە بوو بە میری سۆران، پاتەختی بردە حەریر. ساڵی ١٠١٠.ک (١٦٠١.ز) پردێکی بەرینی بەردینی لەو دواوانی باڵەکیان و ڕەواندز، لە سەر زێ هەڵبەست و ڕێگەی گەلی بۆ کاروانەڕێ خۆش کرد و لەو ساوە بە گەلیعەلیبەگ ناسراوە؛ هەروەها قەڵا و سەنگەری لە زارگەڵیدا درووست کردن. عەلی بەگ پیاوێکی هێدی و هێمن و دوورەشەڕ بووە. بەڵام بابانەکان گەڕیان تێدەهاڵاند و تووشی شەڕیان دەکرد. ئێوانی دەگەڵ تورك و ئێرانیان خۆش بوو؛ دەگەڵ میر حەیدەری کوڕی میرەپاشای میری موکوریانیشدا دۆست بوو. کە میرحەیدەر و جەعفەر پاشای عوسمانی شەڕیان بوو، عەلی بەگ لە سەر میر حەیدەری کردەوە. جارجار بە ماڵەوە دەچووە دوین و چەلی واش هەبوو لە خەڵیفانی دۆڵی ئاڵانە دادەنیشت. قەڵاکانی سەردەریا و سرێشمە و قەڵای کلاسووی چیای حەریریش هەر ئەو کردوونی. زۆری حەز لە خوێندەواران دەکرد؛ شێخ حەیدەری ماوەرانی بەناوبانگ و سەرۆکی زانایانی ئەو ڕۆژگارە، ئەو چاوەدێری کردووە. عەلی بەگ ساڵی ١٠٤٤.ک (١٦٣٤.ز) عەمری خوای کردووە و دوو کوڕی هەبووە: ئوغوز بەگ و میرە بەگ. ئوغوز بەگ بۆتە جێنشین.

**میر ئوغوز بەگی گەورە کوڕی عەلی بەگ**

لە پاش نەمانی بابی هاتە سەر حوکم و نیازی لێ گرت کە میرنشینەکەی هەراوتر بکاتەوە. سەردەمایەك بوو هۆزێکی بێگانە، ڕەواندزی لێ ساندبوون. نامەی بۆ ماقووڵانی شار و سەرناسانی هەرسێك گەڕەکەکانی نارد و ئەوانیش وەرامیان بۆ نووسیەوە کە با بێ و هێرش بێنێ و ئێمەش بە هەموو توانا کۆمەگی دەکەین. بە دووسەد پیاوی زۆرئازا و بەکارەوە هێرشی بردەسەر نەیارانی و ڕەواندزی لێسـاندن و ساڵی ١٠٥٣.ک (١٦٤٥.ز) حوکماتی خۆی بردەئەوێ و ساڵی ١١٠٧.ک (١٦٩٥.ز) مردووە.

ئەمین زەکی دەڵێ میر ئوغوزخان لە پاش بابی ساڵی ١٠٢١ك ڕەواندزی کردەپاتەختی خۆی و سیدەکان و هاودیان و دەشتەدیانیشی وەبەرخۆدا و هۆزە فەلەکانیشی هێنانە بەرفەرمان.

**میرە بەگ**

ئەمین زەکی لە *تاریخ نعیمای* ڕاگوێزتووە دەڵێ: میرە بەگی سۆرانی بۆتە جێنشینی برای و ساڵی١٠٢٩.ک (١٦١٩.ز) چاوی بە خوسرەوپاشا کەوتووە و لە ڕۆژگاری ئەودا خانئەحمەدخانی ئەردەڵان وڵاتی سۆرانی داگیر کردووە. گومان لەوەدا نیە کە ئەو میرەبەگ(میران بەگ)،، برای ئوغوز بەگی گەورە بووە. بە داخەوە حوزنی باسی میران بەگی نەکردووە.

**میر ئەحمەد کوڕی ئوغوز بەگ**

کە باوکی مرد [دەبوایە بڵێ: کە مامی مرد. هەژار] لە جێگەی ئەو چووە سەر تەخت و بانگەوازیان کرد و ←

→ هەموو کەسیان کۆ کردەوە و نان و خوانی بۆ ڕازاندنەوە. لەوە بەدوا کەوتە هەراو کردنی میـرنشینەکەی و دەرگەڵە و باڵەکان و وەرتی و سیدەکانی وەبەرخۆ داو زۆر دەگەڵ ژێردەستانی خۆیدا باش و دادگەر و دڵاوا بوو. ساڵی ١١٧٠.ك (١٧٥٦.ز) ڕۆژێك لە ڕاوێ، بە ئازاری دڵەکپێ مرد.

## میـر ئوغوز بەگی پچووك کوڕی میـرئەحمەد

بوو بە جێنشینی بابی و پیاوێکی ئاوەدانکەرەوە و چاندن دۆست و کاسبکار و داروودرەخت پەروەر بووە؛ ڕەزی بە خـەڵك ناشتووە و دەسگیـرۆیی وەرزێرانی کردووە و زۆریش دووره شەڕ و بێ ئازار بووە و ساڵی ١١٨٢.ك (١٧٦٨.ز) مـردووە و شەش کوڕی لە پاش بەجێ ماوە: مستەفا بەگ، تەمەر خان، یەحیا بەگ، بایز بەگ، ئەحـــمەد بـەگ. هـەتا مـابوو مستەفا بەگ جێنشیـن و هەڵسوڕێنی کاروباری ڕەواندزی پاتەخت بوو. تەمەر (تەیـموور) بە سەر هاودیان و یەحیا بـە سەر سیدەکان و باییز بەگ بە سەر باپشتیان ڕادەگەیشتـن حەسەن و ئەحـمەدیش یاریدەی مستەفا بەگیان دەدا.

## میـرمستەفا بەگ کوڕی ئوغوز بەگ

لە پاش بابی بوو بە جێنشیـن و براکانی بە زەبری زۆر هێنانە بەرفەرمانەوە و لە ڕانیە و کۆیسنجەق و زینوێ شێخی و سیدەکان و برادۆست و حەریر و هەودیانی دامەزراندن. بەڵام برا دانەمەزران و لە پەستا کەتنیان دەگێڕا و نیازیان وابوو بنکۆڵی کەن. هەموو جارێ دەچووە سەریان و سەری دەکوتان و تا ماوەیەك دایدەمرکاندنەوە. ئاوا ڕابـرا، هـەتا سـاڵی ١١٩٨.ك (١٧٨٤.ز) براکانی لە دژی ئەو دەگەڵ بابـان بوونـە دۆسـت و دنـەیاندان کـە بێنـە سـەر مـستەفا بـەگ و وڵاتەکەی لێ داگیـرکەن. بابانیەکان لەو شەڕەبرایە بەهرەیان برد و لەشکریان کرد و ڕانیە و کۆ و حـەریریان لـە سـۆران دابڕی و خستیانە ژێر دەستی خۆیان. لەولاشەوە تەیـمورخان بەگ هەودیان و شەمزینانی کردەشی خـۆی و تـا سـنووری زەرزا و موکوریان چوو. بایز بەگیش دەشتەکانی ڕەواندز و ناوچەی ڕۆسـت و جێگـەیـتری وەبـەرخۆ دا؛ تـەنیا شـاری ڕەواندز و دەوروبەری و سەرچیا و دۆڵی گەوران و جۆڵەمێرگ بۆ مستەفا بەگ مایەوە. لەشـکری بابانـەکانیش هـەروا بەرەو پێش دەهات و گەیشتە دەورەی دۆڵی گەوران و گەینە نزیك گوندی ئەران کە لە پێشودا شار بووە. میـر مستەفا کاتێ زانی دەرۆست نایە، خۆی گەیاندە میـرسولەیـمان پاشای بابان و دەگەڵی ڕێك کەوت و بابانەکان کشانەوە.

ئەمیـن زەکی دەڵێ: میـرە بابانەکە مەحـموودپاشا بووە و میـرمستەفا دەگەڵی پێك هاتووە و فاتـمەخانـمی کـچی لە حوسێن بەگی کوڕی مەحـموود پاشا مارە کردووە.

میـرمستەفا لەوە بە دوا هاتەوە سەر کاروباری دنیاداری خۆی؛ بەڵام تا سەر لێی نەگەڕان. تەیـمورخان و یـەحیا بـەگ دەستیان داوە نامەکاری و دنەی پاشای بابانیان داکە بێتەوە و مەڵبەندی سۆران داگیـر کا.

سولەیـمان پاشای بابانی ساڵی ١٧٨٧.ك (١٢٠١.ز) بە لەشکری زۆرەوە لە ڕێی بالیسان و ئاکۆوە بۆی هـات. میـر مستەفا سپیلکی لێگرت و بە گۆیاندا هات و بەرەو پاشی گێڕانـەوە و چـەند پیـاوێکی هەڵبـژاردەی نـاردە دەربەنـدی مێگری بێجان، بۆسەیان بۆ بابانەکان نایەوە. لەشکرەکە پێشایی گەیشتبووە کونەفیچ و دوایـیەکەی هاتە نـاو دەربەنـد؛ پاڵەوانانی سۆرانی لێیان ڕاپەڕین و زۆریان شپرزە و بێ سەروبەر کردن و هەموو گرانبار و ئازووقەیان بـە تـاڵان بـردن و تازە بیـرای بیـرای بابانەکان بێتەوە سەری!

سێ ساڵیتریش مستەفا بەگ میـرایەتی کرد و برایانی سـتۆکورکیان بـەر نـەدەدا و ئاسایـشتیان لـێ هـەڵگرت؛ ←

→ تا وای‌لیهات لە میـــرایەتی وەڕەز بـوو. سـالّی ١٢٢٣.ك (١٨٠٨.ز) یان بـە گفـتی ئەمیـــن زەکـی ١٢٢٥.ك (١٨١٠.ز)، میـر مـحەمەد بەگی کوڕی -کە بە پاشای کۆرە بەناوبانگـە- لـە جێگـەی خـۆی دانـا و لـە دوایەشـدا چاوەکانی کول ببوون و ماوەیەك هەر دەرمانی دەکرد هەتا عەمری خودای بەجێ هێنا. دوکتۆر رووس لە ١٩ی مـایۆی سالّی ١٨٣٣ بۆ چاری چاوی چۆتە لای.

مستەفا بەگ چوار کوڕی بووە: مـحەمەد بەگ، ڕەسووڵ بەگ، سولەیـمان بەگ و ئەحـمەد بەگ. ئەمیـن زەکـی دەڵـێ پێنج بوون و پێنجەمیان تەیـموورخان بووە.

**میـرمـحەمەد ( پاشای کۆرە )**

سـالّی ١١٨٩.ك (١٧٧٥.ز) یـان بـە گفـتی ئەمیـــن زەکـی ١١٩٨.ك (١٧٨٤.ز) لـە ڕەوانـدز لـە دایـك بـووە؛ بـووك شـازەمانی داکـی زۆر ژنێکـی کەیـــخوداژن و تێگەیـشتی بـووە. میـــر مـــحەمەد لـە گونـدی دێلـزێ لـە ناوچـەی بالّـەك لـە لای مـەلا ئەحـــمەدی ئیبـــنوئادەمی خوێنـدووە و لـە پاشـان خـەجیجی کـچی بـایز بـەگی مامی خۆی خواستووە و جۆلـە مێـرگ و دۆڵـی گـەوەران و دۆڵـی هـەرووتیان و سەرچیا و سرێـشمە و بیاویـان پـێ سپاردوە کـە بـە سـەری ڕابگـا. سـالّی ١٢٢٣ یـان ٢٥، بـابی (میـــر مـستەفا بـەگ) ئـەو و ڕەسـووڵ بـەگ و سولەیـــمان بـەگ و ئەحـــمەد بـەگی بـرای بـانگ کردونـە لای خـۆی و لـە لای هـەمووان کردوویـە بـە جێنـشینی خۆی و بۆ خۆی دەستی لە کار کێشاوەتەوە.

مـحەمەد پاشا کـە بوەتـە میـر، نـەرمۆشلی و خاوەخـاوی نـەزانیوە؛ هـەر کـەس سـەری بزاوتبـا بزوتـی دەچـاو ڕادەکـرد. تەیـــموورخـان و یـەحیا بـەگی مـامی گـرتن و هەڵیواسیـــن. ئەوسـا پـەڕی هەڵاویـشت و کەوتـە بیـــری ناو دەرکردن. پـەلاماری هـەولێری داو هـەتا سـەر زێـی گـچکە، گرتـی و کەوشـەنی نێـوانی وڵاتـی سـۆران و بابـان و پـردێ و کۆیـە و ڕانیەشـی گـرت و سـالّی ١٢٤٩.ك (١٨٣٢.ز) لەشـکرێکی یـەکجار زۆری بردەســەر ئـاکرێ و ئامێدی و سەعید پاشای میـــری بادینـانی بـە دیـل گـرت و هـەڵیکوتا سـەر بەعـشیقا و میـــری یەزیـدیانی گـرت و لە ڕەواندز بەندی‌کردو لەپاش دووساڵ کوشتی. بەرەو جزیرەشی تاژۆت، ماردین و نوسەیبینی داگیـر کرد.

عوســـمانی زۆر ترسـیان ڕێنیـشت و لـە دژی دەسـتیان بـە کـار کـرد. سـولّتانمەحـمودی عوسـمانی لەشـکرێکی بـە لێشاوی بـە سـەرکردایەتی مـــحەمەد ڕەشـید پاشـای سـەدریئـەعزەم ناردەشـەڕی و فـەرمانیش بـۆ عـەلیڕەزا پاشای والی مووسڵ دەرچوو کە لە لایـەکی تـرەوە بـە لەشـکرەوە بـۆی بـچێ. میـر مـــحەمەد پاشـای کـۆرە زانـی کە لە دەشتدا شەڕی ئەو لەشکرە زۆرەی بـۆ نـاکرێ، بـەرەو ڕەوانـدز هاتـەوە و لـە قـالاّ قایـــمەکانی خۆیـدا، خـۆی قـایم کـرد و گـەلیعـەلیبەگیشی لـە دوژمـن گـرت. لەشـکری مـــحەمەد پاشـا لـە دەشـتەدیان بـوو؛ عـەلیڕەزا پاشای تورکیش لە حـەریر لەشـکریەزی کـرد. سـەدریئـەعزەم ناردیـە لای و ئامۆژگـاری کـرد کـە شـەڕی خەلیفـەی موسوڵمانان نەکا. مەلاشی بە هەموو لایەکدا نـاردن کـە فتواکـەی مـەلای خـەتێ بـە نـاو لەشـکری میـــردا بـلاو بکەنەوە. ئەو فتوایەی کە گوتبـووی: هـەر کـەس لـە فـەرمانی خەلیفـە دەرچـێ تـەلاّقی دەکـەوێ و خـوێن و مـاڵی بۆ موسوڵمانان حەلاّلـە. لـە پاشـان بـۆی دانـا کـە ئەگـەر خـۆی بـدا بـە دەسـتەوە، زیـانی پـێ ناگـا. خـۆی دایـە دەسـت سـەدریئـەعزەم و بردیـە ئاسـتانە و سـالّی ١٢٥٣.ك (١٨٣٧.ز) لـە تـەرابزون کـوژرا. ←

← میٚجەر فریدریك میلنگن باسی ئەو خۆ بە دەستەوە دانە -لە ڕەسووڵ پاشای برای میرەوە- بە جۆرێکیتر دەگێڕێتەوە کە بۆ ئەم پەراوێزە نابێ. کێ دەیەوێ زۆرتری لێ بزانێ، با لە کتێبی *میرانی سۆران* و *تاریخ الدول و الامارات الکردیە* و *مشاهیرالکرد و کوردستان* و *ژیانی سەرەتایی ناو کوردان* و هتد بڕوانێ.

تا ئێرە پەراوێزی مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی بوو؛ بەڵام چونکە *تاریخی کورد و کوردستانی* ئەمین زەکی بەگ لە هێندێك شوێن پێچەوانە و هێندێك جاریش پتری نووسیوە، من ئەویشم وەرگێڕایە سەر کوردی. ئەو دەڵێ: مستەفا بەگ ساڵی ١٢٤١.ك (١٨٢٦.ز) مرد و محەمەد بەگی کوڕی -کە لە دوایی بە میری گەورە ناوی دەرکرد و بە سەربەستی دەستی بە کار کرد- زۆر زیرەك و بە بڕشت و زیت و کڕ و دەبنەوەبڕ بوو؛ هەرچی نیازی بوایە دەیکرد. بەر لە هەر شت میرنشینی شیروان و برادۆستی ڕامالی و ساڵی ١٢٤٦.ك (١٨٣٠.ز) سەربەخۆیی ڕاگەیاند و سورچیایەتی و خۆشناوەتیشی گرت و هاتە سەر هەولێر و ئالقەی لێ وێك هێنا و گرتی و ئالتوون کۆپریشی بەر خۆ داو قەڵەمڕەوی زۆر ڕێك خستن و پیاوی خۆی لە سەر دانان. کۆ و ڕانیەشی لە بابان گرت و سنووری تا زێی بچووك هات.

عەلیڕەزا پاشای والی بەغدا کە زانی بە شەڕ پێی ناوەستێ، خۆی کردە دۆستی و لە ناچاری حکومەتی میری بە ڕەسمیەت ناسی و پلەی پاشاییشی دایە. ساڵی ١٢٤٧.ك (١٨٣١.ز) هێرشی بردە سەر یەزیدیان. هۆش ئەوە بوو میری ئەوان عەلیئاغای باڵتەیی کوشتبوو. مەلایەحیای مزووری -برازای عەلیاغا بوو- هاتە لای میر و گازندەی خوێنی مسامی کرد. میر لەشکری بۆ کرد و چووە سەر یەزیدیان و یەکجار زۆری لێ کوشتن و ئەوی ماشن خۆیان لە چیای جودی و تورعابدین و سنجاردا شاردەوە؛ هێندێکیشیان بەرەو مووسڵ هەڵاتن. والی مووسڵ لە ترسی میر، پردی بڕی و پەنابەران لەو بەرەوە مانەوە و پیاوانی میر هاتنە گیانیان و لە تلقویونجقدا چەند ڕۆژێك دەوریان دان و توانیان هەموویان بکوژن. لە پاش ساڵێك میر چووە سەر جزیرەی ئیبنوعومەر و وێرانی کرد و دەوری قەڵای ئاروخی داو شەڕێکی زۆر خوێناوی کرد و بای دایەوە سەر یەزیدیان و فەرمانی قەڵاچۆی دان و زۆریەی کوشتن. لە پاش ساڵێك چووە سەر ئاکرێ و سمایل پاشای لێ دەرکرد و ئەوجار ڕووی کردە زێبار، کە بەردەستی سەعید پاشای ئامێدی بوو. سەعید پاشاشی زۆر پیس شکاند و لە وڵاتی دەرپەڕاند و مووساپاشای خزمی و دوژمنی لە جێی ئەو دامەزراند.

پاش گرتنی ئامێدی و دهۆك، زاخۆشی گرت. ئەو جار کەوتە ڕێك خستنی وڵاتەکەی. قانوونی قورئان بوو؛ بێ پرسی مەلایان پەنجەی دەشاو ڕانەدەکرد. کارو باریشی -وەك میجەرلونگریك دەڵێ- لە هەموو کەس ڕێکتر بوو. لە زاخۆوە چووە جزیرە و حەسەنکێف و ماڵە بەدرخانی شپرزە کرد و قەڵای ماردین و نووسەیبینیش کەوتنە بەر مەترسیەوە.

چاخێ لەو لایانە گەڕاوە، بیستی کەوا خەڵکی ئامێدی مووسا پاشاکەی ئەویان ڕاونەوە و سەعید ←



← پاشایان هێناوەتەوە. لەشکری بە کن مووسڵدا هێنا؛ بەڵام خۆی دەمووسڵ نەگەیاند. دەورەی ئامێدی داو لە پاش سێ مانگ گرتی و سەعید پاشای دەردەست کرد و خەڵکێکی زۆریشی لێ کوشتن و ئەوسا ڕەسووڵ بەگی برای خۆی لە سەر دانان و ئامێدی خستە سەر ڕەواندز.

لەو ماوەدا محەمەد پاشای والی مووسڵ -کە دەیدی میر سەری قاڵە و ڕەواندز بەتاڵە- ویستی بیگرێ. ڕەشید بەگی بریکاری بە لەشکرێکەوە نارد و ڕەشید بەگ ناچار کرا بداتە چیا و والی مووسڵ چی بۆ نەکرا.

هەر لەو سەروبەندانەدا حکوومەتی عوسمانی بە ڕەشید پاشای والی سیواسی -کە پێشوو سەدریئەعزەم بوو- ئەسپارد کە وڵاتی بۆ ئارام کاتەوە. والی بەغدا و «متصرفی» مووسڵیش دەنگ دران کە یاریدەی بکەن. ڕەشید پاشا بۆ شەڕی میر خۆی تەیار کرد و بە ڕێی جزیرە و زاخۆوە هاتە مووسڵ و لەوێش لەشکری ئینجەبیراقدارئوغلی ڕەگەڵ کەوت و پێکەوە بەرەو ڕەواندز چوون و لەشکری بەغداش گەیشتێ و لە دەشتی حەریر هەڵیاندا. کوڕی (؟) محەمەد پاشا گەلیعەلیبەگی گرتبوو. تورک وزەی هێرشیان نەبوو؛ ناچار ڕەشید پاشا نامەی بۆ میر نووسی و داوای ئاشتی لێ کرد و بەڵێنی بەهێزی پێدا کە دەیبەخشن و با چیدی خوێن نەڕژێ و بچێتە لای سوڵتان و دەیکاتەوە میر. ئەویش چووە سوپاگەی عوسمانی و دەغالەتی کرد. دەڵێن ڕۆژێکی هەینی مەلایەکی کوردی بەناوبانگ لە خودبەدا گوتی: دروست نیە شەڕی خەلیفەی موسوڵمانان بکرێ و هتد. ئەمە زۆری کار کردەسەر شەڕکەران و محەمەد پاشای ناچار کرد کە سەر وەبەر باری خەلیفە بێنێ، ئەوەك زیان بە دیانەتی بگا!

نووسراوێك لە یاداشتەکانی ئەسعەدئەفەندی خەیلانی حاجیعومەر ئەفەندیزادەوە دەگێڕێتەوە کە باپیری ئەو بنەماڵە ناوی خەتیئەفەندی بووە. قسەی لە سەر میر ڕۆیشتووە و ئەو ئامۆژگاری کردووە کە سەر وەبەر باری تورکان بێنێ و هەر ئەویش سەعات شەشی شەوێ دەگەڵ خۆی بردووە و داویەتە دەست سەدریئەعزەم. ڕەشید پاشا بە ڕێزگرتن ڕەوانەی ئاستانەی کرد و بەخشیان و ناردیانەوە بەرەو وڵات؛ بەڵام گەردوون کاری خۆی کرد. ڕەشیدپاشای والی لەو بەینە مرد و بەڵێن هیچی لێ شین نەبوو. عەلیڕەزا پاشای والی بەغدا زۆری ڕەشید پاشا دەدزا و بە خوێنی میریش تینی بوو. پیاوی ناردەلای سوڵتان و وای تێگەیاند ئەگەر میر محەمەد بچێتەوە ڕەواندز ئاگری ئاژاوە هەڵدەکا و بە هیچ دانامرکێ. فەرمان دەرچوو کە بکوژرێ. میر لە ئاستانە دەرچووبوو بەرەو سیواس دەهات کە بێتەوە بۆ کوردستان، فەرمانیان ناردەسیواس -کە میر لەوێ میوان بوو- دەست بەجێ کوشتیان.

*تاریخی کورد و کوردستان*، جزمی یەکەم، تەرجەمەی عەرەبی محەمەد عەلی عەونی، چاپی بەغدا، ۱۹۶۱، ڕووپەڕ ۲۲۸ هەتا ۲۳۳. هەژار

**میر ئەحمەد کوڕی مستەفا بەگ**

لە زەمانی باییدا بە سەر هێندێك جێگە ڕادەگیشت. کاتێ میرمحەمەد هاتە سەر حوکم و قەڵەمڕەوی خۆی گوشاد کردەوە، کردیە والی هەولێر. ساڵی ۱۲۵۰ک (۱۸۳۳ز) کە دوکتۆر رووس بۆ چاری چاوی بابی هاتووە، چاوی پێ کەوتوە و میوانی بووە. کە میر محەمەد نەما، ئەو کرا بە میری سۆران. ←

← بەڵام لە دوو ساڵ پتر نەمایەوە و بە فیتی ئامۆزایانی بە کوشت چوو.

### سولەیمان بەگ کوڕی مستەفا بەگ

ڕۆژگاری بابی هێندێك شوێنی بە دەستەوە بوو؛ کە میر محەممەدیش هاتە سەرکار لێی نەستاندەوە؛ بەڵام لە پاشان ئەویش و تەیموری براشی گرتن و کۆت و زنجیری کردن و لە قەڵایەکی پێنج سەعاتە ڕێ لە ڕەواندزەوە دوور، خستنیە زیندانەوە. لە پاش کوژرانی میر ئەحمەدی برای، کرا بە میر و لە شەش مانگ پتر نەمایەوە و لەبەر دەستەوستانی دەرکرا.

### ڕەسووڵ پاشا کوڕی مستەفا بەگ

دەورانی بابی هەر جارە بە سەر جێیەك ڕادەگەیشت، کە میر محەممەد حوکمی سۆرانی گرتە دەست، کردیە سەرداری لەشکر و دوایەش ئامێدی پێ سپارد. لە پاش نەمانی میر محەممەد و دوو برا جێنشینەکانی -لە سەر داوا و تکای خەڵکی ڕەواندز- حکومەت لە ئامێدیەوە هێنایەوە ڕەواندز و چوار ساڵانی میرەتی کرد. لە ئەنجامدا خۆی لە باج و دەرامەتی دەوڵەت بوارد و عوسمانی لەشکریان ناردەسەر و لە حەریر و خەلیفان بە گژیاندا هات و خۆی نەگرت و هاتەوە ڕەواندز و لەوێش تەنگیان پێ هەڵچنی و رایکرد و چووە شنۆیە و پێنج ساڵ لە وێندەرێ ما و ئەوسا دەگەڵ عوسمانیان ڕێك کەوتەوە و هاتەوە؛ بەڵام لەو بەینەدا میرایەتی سۆران پەردەی داگیرکەرانی بەسەردا درا و خرایە ژێر دەستی فەرمانبەرانی تورك و تازە سەری هەڵنەدایەوە.

ڕەسووڵ پاشا لە پاشانیش زۆر ژیا؛ کرا بە «متصرفی» بەغدا و کردیانە والی وان و مستەرمیلنگنی گەڕیدە، لەوێ چاوی پێکەوتووە. دوایی کراوەتە والی ئەرزەڕۆم و ساڵی ۱۳۰۱.ك (۱۸۸٤.ز) لەوێ مردووە و پێنج کوڕی بووە: ئەسعەد و فەتاح و ڕەشید و بارام و ئیحسان. ئەسعەد بەگ ساڵی ۱۲۷۵.ك (۱۸٥۹.ز) لە دەجلەدا خنکاوە. ئەوانیتریش کاروباری دیوانیان پێ سپێرا و کەسێك دەیەوێ زیاتری لێ بزانێ، با لەو پەراوێزە بڕوانێ کە حوزنی موکوریانی بۆ کتێبەکەی فریدریك میلنگنی نووسیوە و لە گۆڤاری *گەلاوێژ* و *دەنگی گێتی تازە*دا چاپکراوە. جەمیل

دەمەوپاییزی ساڵی ۱۹۷۱.ز نووسەری هێژا، مامۆستا محەممەد مەولوود(مەم)، لە هەولێر دەربارەی زنجیرەی بنەماڵەی سۆران مەعلوماتی بە نرخی دامێ؛ کە ئەویش بە یارمەتی مامۆستا نوورەدین بەهائەدین، ئەندامی دادگای تەمیزی عیراقی کۆ کردۆتەوە؛ وا لە ژێرەوە نووسیومن. هەژار

## بنج و بناوانی میرانی سۆران

یەکەم میر کەلۆس بووە. سێ کوڕی هەبووە بە ناوی میر عیسا شێخ وەیس و ئیبراهیم. لە وەچەی شێخ وەیس و ئیبراهیم شتێك نازانین؛ بەڵام میر عیسا شاعەلی بەگی بووە. ئەویش سێ کوڕی لێ کەوتۆتەوە: میر بداغ، میر حوسێن و میر سەیدی. میر بداغ دوو کوڕی بوون: میر حوسێن و میر سەیفەدین. میر سەیفەدین بێکوڕ بووە. میرحوسێن کوڕێکی بووە بە ناوی میر سەیفەدین و ئەویش ←

← بە گەنجی مردووە و بەرەی میر بداغ براوەتەوە.

میر عیسا و میر حوسێنیش بێ کوڕ بوون؛ بەڵام برای چوارەم میر سەیدی سێ کوڕی بووە بە ناوی میر سولەیمان، میر سەیفەدین و میر عیزەدینشێر. سەیفەدین وەجاخکوێر بووە، میر عیزەدین خان شاوەلی هەبووە و ئەویش بێ کوڕ مردووە. میر سولەیمان سێ کوڕی بووە: شاقولی بەگ، میر عیسا و میر سەیفەدین. نازانین میر عیسا و میر سەیفەدین چیان بووە؛ بەڵام شاقولی بەگ میر بداغ و میرسولەیمان بەگی لێ کەوتۆتەوە. ئەو میر سولەیمانە قارەمانی داستانی خانزاد و لەشکرییە. شاقولی بەگ شەقڵاوەی ئاوەدان کردۆتەوە[؟]. میر سولەیمان بە گزیکاری والی بەغدا لە ناو براوە و خانزادەخاتوونی بەناوبانگ بۆتە حوکمڕانی سۆران کە پاتەختی حەریر بووە. تا ئێستاش شوێنەواری کۆشکی فەرمانداری خانزادەخاتوون لە حەریر هەر ماوە. لە زەمانی ئەو شاژنەدا شەقڵاوە زۆری گەشە کردووە و هاوینەهەواری قەراڵیچەی کوردەواری بووە. لە سەر لوتکەی چیای سەفین گۆڕەپانێک بە ناوی خانزاد هەیە؛ وەك دەڵێن هاوینان لەوێ هەڵداوە. خەڵکی ناوچەی حەریر خانزادی بە خوشکی میر سولەیمان دەزانن؛ کەچی هێندێك مێژوونووس لایان وایە کچی بووە. سولەیمان بەگ کوڕێکی بە ناوی عەلی بەگ هەبووە ڕێگای گەلی ئەو خۆشی کردووە و بە ناوی ئەوە. عەلی بەگ، میر ئۆغزی لێ کەوتۆتەوە؛ ئەویش دوو کوڕی بە ناوی میر ئەحمەد و میر عیزەدینشێر بووە. میر ئەحمەد وەجاخکوێر و میر عێزەدین کوڕێکی بە ناوی خاناودەل لە پاش بەجێ ماوە. ئەویش سوڵتان مەحموود و ئەویش ئەحمەد بەگی بەجێ هێشتووە. ئەحمەد بەگ، مەحموود بەگ و ئەمیش میر ئۆغزی لە پاش بەجێ ماوە؛ کە دەبێتە بابی مستەفا بەگ و باپیری میر محەمەد پاشای کوێرە. میر ئۆغز بەگ شەش کوڕی بووە: میر حەسەن، میر ئەحمەد، یەحیا بەگ، بایز بەگ، تەمەرخان بەگ و میرمستەفا بەگ.

لە نەوەکانی میر حەسەن و یەحیا بەگ و تەمەرخان بەگ ئاگادار نین؛ بەڵام ئەحمەد بەگ عەبدوڵڵا بەگی بووە. ئەویش دوو کوڕی بە ناوی عەلی بەگ سلاحشوور و حەمەد بەگ هەبووە. عەلی بەگی سلاحشوور کوڕێکی بە ناوی سولەیمان بەگ سلاحشوور بووە؛ کە دەبێتە بابی ئەو عەلی حەیدەر سولەیمانەی وەزیر و سەفیری حکوومەتی عیراقە و برای شەمسەدین بەگە کە ئەویش ئێستا لە هەولێر دەژی و هەروەها براسێهەمیان بورهان بەگە و ئێستا لە بەغدا لە ئەمانەی عاسمە، حاکمە. ئەم سێ برایەش زۆریان لێ کەوتوونەوە.

حەمەد بەگ باوکی مەلاعەزیزی گوندی فەقیانە؛ کە ئەویش دوو کوڕی بوون: کاکیلئاغا و عەبدوڵڵا بەگ؛ کە ئێستاش عەبدوڵڵا بەگ ماوە.

بایز بەگی ئۆغز بەگ کوڕێکی بە ناوی بەکر بەگ بووە و ئەویش چوار کوڕی بوون: سالح بەگ، عەبدوڵڵا پاشا، حەمەد بەگ و عەلی بەگ. سالح بەگ سێ کوڕی بووە: عەلی بەگ، سدێق بەگ و خورشید بەگ. نەوەی ئەوانە لە ناوچەی حەریر و هەولێرن. عەلی بەگ دوو کوڕی ماون؛ ناویان برایم بەگ و سالح بەگە. خورشید بەگ باوکی نووری بەگ و قاسم بەگ و برایم بەگە؛ کە هەرسێك ماون و قاسم لە دارایی هەولێر فەرمانبەرە. دوو کوڕی سدێق بەگیش ←

→ ماون؛ ناویان حوسێن بەگ و ئەنوەر بەگە. عەبدوڵڵا پاشا بابی سەعید بەگە؛ ئەمیش بابی سمایل بەگی ڕەواندزە، کە ئەندامی کۆڕی دامەزرێنەری عیراق بوو؛ ساڵی ١٩٣٢ز کوژرا و لەعلی‌خانی دایکی ژنێکی بەناوبانگ بوو لەم دواییانەدا مرد.

حەمەد بەگ دوو کوڕی بوون: مەجید بەگ، شێخ سولەیمان بەگ. مەجید بەگ دوو کوڕی ماون: شێخ سولەیمان کە ئێستا لە هەولێر «ملاحیظ» حدودەو عەبدوڵڵا فەرمانبەری دائیرەی توتنە. عەلی بەگ کوڕێکی بە ناوی حوسێن بەگ هەبوو دەگەڵ مەلامستەفای بارزانیدا چووە ڕووسیا و لەوێ مرد و بێ‌منداڵیش بوو. میرمستەفا بەگ کوڕی میرئۆغز بەگ چوار کوڕی بوون: میر سولەیمان، میرمستەفا بەگ، میر ئەحمەد و ڕەسووڵ پاشا. میر سولەیمان باوکی میرانی یەحیا بەگە کە ئەویش پێنج کوڕی بووە: حەمەد بەگ، سولەیمان بەگ، خورشید بەگ، تەقیەدین و وەسمان بەگ. حەمەد بەگیان دوو کوڕی بووە: مەجید بەگ و شێخە بەگ. مەجید بەگیش کوڕێکی بە ناوی حەمەد بەگ هەبووە. سولەیمان بەگ باوکی عەلی بەگە کە ئەویش دوو کوڕی بە ناو حەسەن و حوسێن هەبووە. خورشید بەگ سێ کوڕی بووە: سدیق بەگ، میرزۆ، حاجی‌سەعید بەگ. سدیق بەگ دوو کوڕی ماون؛ ناویان حاجی‌شەهاب و حاجی‌پاشایە. میرزۆ ئەسعەد و تەوفیق ناوی بەجێ هێشتووە. حاجی‌سەعید بەگ لە گوندی ئالانە دادەنیشی و دوو کوڕی هەن: ئیسماعیل و محەمەد.

تەقیەدین بەگ سولەیمان بەگی بووە کە ئەویش کوڕێکی بە ناوی تەقیەدین بووە و باوکی سولەیمان بەگ بووە. وەسمان بەگ تەنیا کوڕێکی بە ناوی میر مەلا هەبووە.

کوڕی دووەمی میر مستەفا، ئەمیر مەنسوور محەمەد بەگ بووە؛ کە بە پاشاکۆرە یان میری گەورە بەناوبانگە و هیچ منداڵی نەبوون. سێهەمیان میرئەحمەد بەگی لاڵ بووە. ئەویش کەسی لە پاش بەجێ نەماوە.

چوارەمیان ڕسووڵ بەگە و پاشاشی پێ گوتراوە. پێنج کوڕی هەبووە: ١- ئەسعەد بەگ، باوکی عەبدوڵڵا موخلیس بەگ باوکی زیائەدین بەگ و یەحیا بەگە. ئەمەیان لەم ساڵانەی دواییدا بێ فرزەند مرد و سەردەمێك لە ناوچەی هەولێر قایمقام بوو. ٢- فەتاح بەگ دوو کوڕی بوو: خورشید بەگ و تەوفیق بەگ. ئەمەش بێ جێنشین مرد. ٣- ڕەشید بەگ دوو کوڕی هەبوو: عەبدوڵڵا ئەدیب بەگ و عوسمان بەگ. عەبدوڵڵائەدیب کوڕێکی لە تورکیا ماوە عوسمانیش زەکی هەیە، کە لە تورکیا دەژی. ٤- بارام بەگ. ٥- ئیحسان بەگ. ئەم دووانەش هەر لە تورکیا بوون و کوڕیشیان نەبوون. (لێرەدا مەعلووماتی مەم کۆتایی دێت).

# بەندی دووەم
# فەرمانڕەوایانی بابان

ئەو هۆنەرانەی بۆ وردەکاری زۆر ئاگادار و دەرەبەند بەکارن، تا و بەند و داوی ئاوریشمی خاوی کەونە رووداوی پیرەبابانیان بە دەمی گشت و سەری ئەنگوشتیان خستۆتە باو و زۆر لێك و لەبار، گشتیان کردووە و دوڕ و یاقوت و لاڵ و زمڕوت و چەور و شیرین و کوژەکەی شین و پیرۆزە و شەوە و سەنگی پازار و دانەمرواری وشەی پڕ گەشەی ناو کوردەواریان پێ هۆندۆتەوە و سینگ و بەرۆکی پاڵەواننامەی ماڵەبابانی مەرد و نەبەردی نەتەوەی کوردیان بەو گەردنبەندە خوشیك و ڕندە ڕازاندۆتەوە؛ کە لێی دەڕوانین زۆر باش دەزانین ئەو بنەماڵە لە کوردستاندا لە چاو هەموو کەس بە هێزی قەوغا و بەهێز و توانا و دەستەڵاتداری، بە ناوودەنگ بوون و کەسی هاوچەرخیان هاوسەنگیان نەبووە. بەڵام لە دوای وەی کە فەرمانداری ئەو خانەدانە بسە پیربداغی بەبەیی[1] و برای گەیشت[2] ئەوانیش فرزەندی نێرینەیان بەجێ نەهێشتن، فەرمانڕەوایی لە ناو ئەواندا کۆتایی هات و دەست و پێوەندیان بوونە جێگر و ناوی بابانیان بۆ خۆ گرتەوە.

### میربداغ کوڕی ئەبدال بەگ

بۆ دلاوایی، حاتەمی‌تایی دەسکی لە دوو نەدەکرد و لە ئازایەتیدا ڕوستەم دەگەڵی دەرنەدەبرد. لە مەیدانی مەردیدا هەمیشە گۆی نەبەردی لە بەر هەواڵان دەفڕاند و لە پێشەبڕکەی پیاوەتیدا هەموو چاو لەدوێکی دەوەستاند. ئەنجامی کاری گەیشتە بارێ کە هەوای دەرکەوتن و سەرکەوتنی کەوتە

---

١- دانەر وەك مێژوونووسانی‌تر جارێك پیر بداغ و جارێك میر بداغی نووسیوە. جەمیل

٢- ئەمین زەکی دەڵێ برازای. جەمیل

دانەر هەر خۆی لە ڕووپەڕ ٣٦٥ چاپە فارسیەکەی میسردا دەڵێ: برازاکەی بداغ کوڕی ڕوستەم. هەژار

سەر و زۆریش سەرکەوت. مەڵبەندی لارجان[1]ی لە زەرزا ساند و سیوی[2] لە سۆران جودا کردەوە و سندوسی لە قزڵباش پاکردەوە و قەڵای‌ماران[3]ی -وەك جارانی پێشوو- ساز دایەوە و بە میرلیوای خۆی سپارد و هۆزەکانی موکری و بانەی -بە خواهێشت و بە زۆری- خستە بەر فەرمانەوە و شارباژێری لە دەست ئەردەڵان دەرێنا و خستیە سەر وڵاتی خۆیەوە و هەر مەڵبەندێ کە سەندبووی، کوێخا و گزیری سەربەخۆی لێ دانان و تەپڵ و ئاڵای دادگەری و سەربەخۆیی، ئاوازەی داو شەکایەوە و کەرکوکی سەر بە بەغداشی کردەباجدەری بابان و پاسەوانی لە سەر دانان. لە دەورانی فەرمانی خۆیدا شتی وا سەیری داهێناوە کە بۆ هیچ فەرمانڕەوایەکی کورد نەڕەخساوە. بۆ نموونە کیژی میر وئاغایانی بەردەستی خۆی بۆ خۆی دەخواست و پێداویستی باوی ڕۆژی، بۆ گوێزتنەوە و بەزم و ئاهەنگ بەجێ دێنا و ڕۆژی بووکێ و شەوی پەردوو -بە بێ‌ئەوە کەس بزانێ- کچیان بە جیازی سازەوە بۆ ئاغایەك -کە داخواز بوو- دەگوازتەوە.

برای کە ناوی ڕوستەم بوو، لێی دەخەفتا کە بیکوژێ؛ پیاوێکی دڵسۆزی بداغ کەین و بەینەکەی تێگەیاند. کاتێ کە دەچووە سەر زەرزا، ڕوستەم بەگ و هاودەستانی -کە دەستیان دەو کارەدا بوو- فەرمانیدا خرمچون گیران و کوژران.

بە نیازی داگیرکردنی وڵاتی سۆران لەشکری بردەسەر میرسەیدی کوڕی شاعەلی بەگ و لە جێگەی خۆی وەدەرنا و میرسەیدی ڕووی کردەناو کۆسار و لێڕەواران و چاوەنۆڕی هەلێك بوو کە تۆڵەی خۆ هەلێنی. پیربداغ بە شوێن ئەو سەرکەوتنەدا زۆری بارەکەللەی کەوتبوو؛ کەمتر خۆی دەپاراست. ڕۆژێك دەگەڵ چەند پیاوێکی خۆیدا بە نیازی ڕاووشکار چووبووە حەزوییان[4]. بە هەلکەوت میرسەیدی لەوێ بوو. وەك بەڵای لە نەکاو لە حەشارگە هاتە دەر و تاوی دانێ و میربداغ و هەواڵانی دانە بەر و کەسیان سەری دەرنەکرد و جوقەواری لێ برین:

---

١- لارجان نیە و لاجانە.

٢- دەبێ سیومیل یان زێوە بێ.

٣- لە نێوان مهاباد و بۆکاندا-لە نزیك خانەقای شێخی بورهان- کێوێکی سەخت و بەردەلان، وەناو «قەلات ماران» هەیە. هەژار

٤- دەبێ گوندی عازەبان بێ کە لە شارباژێرە. هەژار

| | |
|---|---|
| گـريـمان ئـەوەند هەڵـكشای بووی بە شا | وەكووو تۆ نەبوو كەس لـە بـەهرە و بەشا |
| هەمـوو دەفر و ئيـرباڕەكەت زێـڕ و زێـو | ئەگـەر ڕێ دەكەی دەچيە سەر پشتی دێو |
| لە گـەنج و لە گەوهەر هەزار كۆت هەبوو | هـەزاران هـەزار ئـاژەڵـی دۆت هـەبـوو |
| بە تاو جووت گـەڕانـتە و بە بارانە ئـاش | وەڕەز بووی لە بەر بـەرگ و خۆراكی باش |
| لـە دنـــيـا نيـــازت چبـێ، وا دەكـەی | لـە بـەر چنـگی مـردن چلـۆن ڕادەكەی؟ |

شـايەران و خۆشـبێژانی كوردسـتان دەربـارەی دڵاوايـی و ئـازايی ئـەو ميــرەوە بـەيتی زۆريـان هەڵبەستوون و پەسنيان داوە و پێيان هەڵگوتووە و لە كۆڕ و ديوەخاناندا دەنگخۆشـان بـە ئاهەنگـەوە دەيـخوێننەوە.

چونكە نێرينەی لێ نەكەوتەوە، فەرمانڕەواييەكە بۆ برازاكەی -كە بـداغی كـوڕی ڕوسـتەم بـوو-مايەوە. بەڵام نەيتوانی كەلەبەری مامی پڕكاتەوە و لە بەر دەستەوستانی، ئاغا و نۆكەرانی بەردەستی لە فەرمانی دەرچوونە دەر و لە پاش دوو ساڵ مەزنايەتی كردنی پڕ لە كەمايەسی، لـە داخـان وەزگـی داو وەچەی بابان كەسيان لە ئارادا نەما و نۆكەران جێيان گرتنەوە.

يەكەم كەسێ كە پاش چوونی خانەدانی بابانەكان حوكمی بۆ خۆی گرتۆتەوە پيـرنەزەر بووە.

## پيرنەزەر كوڕی بەيرام

پياوێك بووە دەستودڵگوشاد و سەربەست و ئازاد و بەزاكون و داد و هەموو ژێردەستانی لـە دەسـت و پێوەندانيەوە هەتا سوپايی و ڕەشايی و بۆرەپياو و بەناو و بێ‌ناو، لە دڵ و هەنا و خۆشـيان ويـستووە و سەركەوتنی ئەويان لە خوا ويستووە. بە هێزی هۆز و بازو، ناوچەی كفری لە بەغدای ئارامگە دابڕيـوە و خستوويەتە سەر مەڵبەندی بابان. كە پيـرنەزەر مرد، وڵاتی بابان كرا بە دوو بەش.

## سولەيـمان و ميـربرايم

هەردوكيان پەروەردەی دەستی ميــرداغ بـوون و لـە ڕۆژگـاری فـەرمانڕەوايی خـۆی، كردبـوونی بـە ميـرسنجەق. لە پاش نەمانی پيـرنەزەر ئەو دوانە پێك هاتن و وڵاتی بابانيان لە ناو خۆدا بەش كرد و

ماوەیەکی زۆر پێکەوە نێوان خۆش و دۆستی گیانی بوون. لە ئەنجامدا دوو زمان و کەتن‌گێڕان خۆیان دەناو خزاندن و لە یەکتریان ترازاندن و دۆستایەتی بوو بە دوژمنی و بە گژ یەکدا هاتن. سولەیمان برایمی کوشت و بەشە ولاتەکەی ئەویشی وەسەر بەشی خۆی خست. پازدەسالان مەزنایەتی ولاتی بابانی کرد و بەشە ژیانی لێ سێندرا و ڕەوانەی مەڵبەندی نەمان کرا و چوار کوڕی بەجێ هێشتن: حوسێن و ڕوستەم و محەممەد و سولەیمان.

## حاجی شێخ

لە دوای مەرگی پیرنەزەر، نۆسالان بەسەر نیوەی ولاتی بابان ڕاگەیشت و سولەیمان کوشتی و سێ کوڕی مان: حاجی شێخ و میرە و میرسولەیمان. حاجی شێخ لە پاش کوژرانی بابی، زێد و هەمەدەمی بەجێ هێشتن و ڕووی کردەولاتی عەجەم و چووە لای شاتۆماسب؛ بەلام زۆری ڕووی خۆش لە شا نەدی و بە ناهومێدی گەڕایەوە و لە ناوچەی نەڵێن و دبالە[1] پیاوی میرعیززەدینی برای میرسولەیمانی کوشت و دەستی بەسەر ئەو ناوچەیە داگرت. لە پاش نەمانی میرسولەیمان هەموو ولاتی بابانی خستە ژێر دەست و بوو بە فەرمانڕەوای سەربەخۆ. کاری ناشایستی دەربارەی شاتۆماسب دەکرد و ئەویش سێ جاران لەشکری ناردەسەر و هەرسێك جاریش قزلباش بە پاشدا دەگەڕانەوە و لەبەر حاجی شێخ دەشکان. لەو شەڕانەشدا -جگە لە چەند فەقێ و مەلایەك كە بۆ خەزای قزلباش کوشتن تیر و کەوانیان هەڵدەگرت و ڕەگەڵی دەکەوتن- هیچ میر ودەسەلاتدارێکی کوردستان نەدەچووە کۆمەگی.

سالی ٩٤١.ك (١٥٣٣.ز) کە سولتان سولەیمانخانی خەزاکەر بەغدای ئارامگای گرت و زستانی لەوێدا ڕابوارد، حاجی شێخ بە نیازی سەردەرانە ڕامووسانی سولتان، بەرەو بەغدا دەچوو. کاتێ گەیشتە ناوچەی مەرگە، مەرگەییەکان خۆیان لێ خۆش کرد کە لە کۆڵ دنیای کەنەوە. لە وەختێکا کە میرشێخ چوویووە ڕاو و دەگەڵ چەند کەسێکدا خەریکی نوێژ کردن

[1] - دو نەڵێن لە کوردستانی بەردستی ئێران هەن. بەلام «دبالە» نەبیسراوە. هەژار

بوو، کوردی دێوناکار بە شیری جەوهەردارەوە وەك ڕەشەبا هەڵیانکردێ و گڕی چرای ژیانیان کوژاندەوە و کردیانە خۆڵەمێشی بابردەو میرەی براشی هەر لەو شەڕەدا پەڕە کرا و سەری تێداچوو[1]؛ براکەیتریشی -کە ناوی سولەیمان بوو- تووشی دێوی مەرگ هات و لە مەیدانی ژیان دەرچوو.

حاجی شێخ دوو کوڕی لە پاش بە جێمان بە ناوی بداغ و سارم. کاتێ دەنگ و باسی هێرشی بلجەمەرگەییان و مەرگی بێوادەی میرشێخ، وەبەر گوێیەکانی بە شەوکەت و شانی سوڵتان کەوت، لە بەزەیی بێ بڕانەوەی شاهانەوە وڵاتی بابان درا بە بداغی کوڕی.

## بداغ کوڕی حاجی شێخ

بوو بە جێنشینی بابی و ماوەی شازدەساڵان بەو پەڕی دڵسۆزیەوە فەرمانداری کرد و لە ئەنجامدا بە دنەدانی هێندێك لە گەورەپیاوان، حوسێنبەگی کوڕی میرسولەیمان بەربینگی گرت و داوای مەزنایەتی وڵاتی بابانی دەکرد و لە لایەن پادشای سولەیمان پایەوە پێی درا و سوڵتان حوسێنی فەرمانڕەوای ئامێدی دەگەڵ خۆیدا هێنا کە وڵاتەکەی بۆ بستێنێت. بداغ لە وزەیدا نەبوو دەگژیان ڕاچێ و ڕایکرد و پەنای بە سەردەرانەی شاتۆماسب برد. شەش مانگێك لەوێ مایەوە و ڕوستەمپاشای سەدریئەعزەم دڵخۆشی دایەوە و بەڵێنی دایە کە وڵاتی بابانی بۆ وەرگرێتەوە و لە وڵاتی عەجەمی پچڕیەوە و هێنایە ئەستەمبوڵ و لە سایەی هەستی بەرزی سوڵتانەوە دیسان بابانی پێ بەخشرایەوە و بە لاواندنەوەی دوور لە هەژماری پادشاهانەش سەرفەراز کرا و لە ناو هەواڵانیدا شانازی بەخۆ دەکرد؛ ئەوسا بەرەو وڵات گەڕایەوە. کاتێ گەیشتبووە ئەو جێگەی ڕابیەبولاق[2]ی پێ دەڵێن، حوسێن بەگ کوڕی میرسولەیمان بە هەشت هەزار سوارە و پیادەوە ڕێگەی لێ گرت و بە گژ یەکدا چوون. هێشتا شەڕەکە وا گەرم نەببوو کە مووی تێدا هەڵپرووزێ و هیچ کەس دەخوێندا بگەوزێ، کە حوسێن بەگ ورەی بەردا و مەیدانی نەبەردی بەجێهێشت و ڕووی کردەئاستانەی سولەیمان و بە هۆی

---

١- لە کوردەواریدا بەیتێك بە ناوی بەیتی کاکەشێخ و کاکەمیر هەیە کە ئەو کارەساتە دەگێڕێتەوە و زۆریش بەرزە. هێمن

٢- دەبێ ڕانیە نەبێ؟ هەژار

میـرەگەورەکانەوە، بە پایە و ڕێزی ئاڵقەڕێز ماچ کردنی دەرگا سەرفەراز کـرا و فـەرمانی بـێ پـێچ و پەنای پادشای بۆ دەرچوو کە نیوەی وڵاتی بابانی هەبێ و دەبێ دەگەڵ بداغ بەگ پێکەوە پێ ڕابگـەن و هیچیان لەو فەرمانە سەرچەوتی نەکەن.

حوسێن بەگ بە هەڵەداوان بەرەو وڵاتی بابان هاتەوە و دیسان کاریان کەوتەوە بـەردەمی شیـــران و تێك‌گیـران و حوسێن بەگ و ڕوستەم بەگی بـرای کرانـە تـۆزی بـەر بـا و کـاتێ ئـەو دەنـگ و باسـە دەبارەگای سوڵتاندا دەنگی دایەوە، بلێسەی ڕکی سولەیـمانی سەری لە دەمیەوە دەرانی و فـەرمانی‌دا کە هەموو کوردەکانی هاوسای بابان بچنە سەر بداغ و بداغ کە زانی بەربەرەکانێ بۆ ناکرێ، پەنای بـە سوڵتان حوسێنی فەرمانڕەوای ئامێدی برد و ئەویش ڕاسـتی ڕووداوی بـە پێـچکی تـەختی عاســمان ئاسایی گەیاند و تکانامەی ڕەگەڵ خست کە گوناهەکانی بە ئاوی بەخـشیـن و چاوپۆشی پادشاهانە بشۆرێتەوە و وڵاتی باب و باپیـرانی پێ بدرێتەوە.

سوڵتانی هەڵەپۆش لە سـەر تکـای فـەرمانڕەوای ئامێـدی لـە سـووچ و تـاوانی خـۆش بـوو؛ لـە بـاتی وڵاتـی بابـان ناوچـەی عینتـابی پـێ بەخـشی و بەشـی بـداغ بـەگیان بـە بـولی بـەگ ناوێـك ئەسپارد.

لــەو ســەردەمانەدا کــە شــازادەپایەبەرزەکان ســوڵتانسـەلیم و ســوڵتانبایەزیـد لــە قونیــە قونەشـەڕیان کەوتـە نێـوان و پێـك هـەڵپرژان، بـداغ بـەگ لـە سـەر بایەزیـدی کـردەوە و چـووبووە شـاری کوتاهیـە. سـوڵتان سولەیــمان مـەرجی بـۆ سـوڵتان بایەزیـد دانـا کـە دەبـێ سـەری بـداغ بەگم بە بڕاوی بـۆ بنێرێتـە ئاسـتانە؛ ئەوسـا لێـی خـۆش دەبـم؛ چـونکە بـداغ دوژمـنی خانەدانـە. سوڵتان بایەزید فەرمانی پیـرۆزی لـە بـانی سەر دانـا و سـەری بـداغ بـەگی بـڕی و بـە دیـاری بـۆ بارەگای هەرەبەرزی نارد.

بـداغ بــەگ چــوار کــوڕی هــەبوون: حـاجی‌شێخ و حوســێن بــەگ و مــحەممەد بــەگ و میرسـەیفەدین. حـاجی‌شـێخ دەگـەڵ سـوڵتان بایەزیـد چـووە ئێـران و کـاتێ گیــرا -بـە فـەرمانی شاتۆماسـب- حـاجی‌شـێخیش وێـڕای ئاغـا و میــرەکوردەکانی کلکـە و پلکـەی سـوڵتان، لــە سـەری درا و میرسـەیفەدینیش مـردن مـەودای نـەدا و مــحەممەد بـەگیش سـنجەقی کەسـتانەیان

دایە و ئێستا لە سەریەتی.

## میرحوسێن کوڕی سولەیمان

لە پاش بابی -چونکە حاجی شێخی کوڕی برایم ناوچەی بابانی بۆ خۆی داگیر کردبوو- ئەو نەیتوانی بەربەرەکانی بکا و ڕایکرد و ڕووی کردەبارەگای شاتۆماسب و داوای هیمداد و کۆمەگی لێکرد. شاش چراغ سولتانی ئیستاجلووی والی دینەوەری ڕەگەڵ خست و هەتا قەراغ سنوور هاتن و چیان بۆ نەکرا و بە بێ دەماغی گەڕانەوە. ئەو جارە شا گۆکجەسولتانی قاجاری والی هەمەدانی نارد. لەو جارەشا گۆکجەی قاجار هەروا کلکی پێ هەڵپەسارد و پەروایەکی پێ نەفەرموو؛ بە دەم لە پووشی گەڕاوە. جاری سێهەم عەبدوللاخان ئیستاجلووی میری میران و سوپاسالاری ڕاسپارد کە ولاتی بابان بگرێ، ئەویش لەشکرێکی دوور لە هەژمار و وەك لافاوی بەهارانی ڕەگەڵ خۆ خست و پەلاماری ولاتی بابانی دا.

میرحوسێن -کە پێشەنگ و چاوساغی لەشکر بوو- بردنیە چیای گەلالە و دەناو دارستانێکی ترینجاندن کە تولەماران لەبەر داران ڕێی هاتوچۆیان لێ بڕابوو. باوکی منی هەژاریش بە پیادەو سوارانی خۆیەوە تەشریفی لەوێ بوو. حاجی شێخ لێیان ڕاپەڕی و ملی لە دڕین و بڕین نا و دەرەتانی لێ بڕین و لەشکری قزلباش وەك بەچکە دەلەك لە ناو کلۆرەداراندا عاسیە ببوون کەس نەیدەزانی لە کوێڕا بۆی دێن و بە کوێیدا هەڵێ و کەنگێ کەولی دەچێتە سەر دەباغ! لەو شەڕەدا نزیکەی دوو-سێ هەزار قزلباش سلار بۆنەوە و سی کەسێك لە پیاوانی هەڵبژاردەی بابی بەندەش لەو گیرەوبەندەدا جەندەکیان کەوت و ئەو سەرکردەو پیاوماقوولانەی کە لەبەر کوشتار مابوونەوە و لە چنگ مردن ڕزگار ببوون، وەك سلقی ڕووت، بە بێ بەرگ و سەری قوت و پای پێخاوس، هاتنەوە بەر بارەگای شا.

شاتۆماسب لەو ڕێبەریەی میرحوسێنێ زۆر تووڕە بوو؛ ئەو و محەمەد و ڕوستەمی برای هەرسێك توردانە ناو قەلایەکی ئێرانەوە و دەناو گرتووخانەی خستن. لە پاش هێندێك

بەریدان و هەرسێك برا هەر ڕزگار بوون، بە بێ چەند و چوون، تفەدەستی خۆیان کرد و لە ئێرانەوە هەلاتن و بەرەو دەرگا و ئاستانەی کۆنەبەختی سولتان سولەیمان هاتن. لە بەزەیی و چاکەکاری بێدرێغی شاهانەوە، هەر کەس بە گوێرەی پایەی خۆی موچەیەکیان لە ولاتی ڕۆمئیلیدا بۆ بڕینەوە و ناردنیەوە.

لە پاش شەش ساڵ کە لە ڕۆمئێلیان ڕادەبوارد، لەسەر تکای حوسێن بەگی فەرمانڕەوای ئامێدی، لە ڕۆمئێلییان هێنانەوە و ولاتی بابانیان پێدانەوە. چ هەر وەك لەمەوبەر بە سەر نووکی قەڵەمەکەماندا ڕابرا و لە سەر کاغەز تۆمار کرا، میرحوسێن کوڕی سولەیمان بە دەست بداغی کوڕی حاجی شێخ کوژرا و خدر بەگی لە پاش بەجێ ما. ئەو خدر بەگە ماوەیەك ناوچەی مەرگەی بە دەستەوە بوو. لە دواییدا کە زەمانی خوالێخۆشبوو سولتان مرادخان، میرە بەگی موکوری لە قزلباش هەلگەڕاوە و هاتە بەر فەرمانی عوسمانی. ناوچەی مەرگەش لە خدر بەگ سێندرایەوە و درا بە یەکێك لە کوڕانی و لەسەر ئەمە بۆ ماوەیەك شەڕ و هەرا لە نێوانی خدر بەگ و میرە بەگدا دەگەڕا بوو. لەو بەینەدا خدر بەگ بەر مەرگ کەوت و داوی کێشە و هەرا پسا.

ئێستا هۆزی بابان بێ فەرمانڕەوا ماونەوە؛ بەڵام نزیکەی چوارهەزار چاپك سواری ئەسپ کەحێلی سەرتاپا پڕچەکیان هەیە و سەریش بۆ کەس نانەوێنن.

هێندێك دەڵێن هۆزەکانی ڕۆژەکی و هەکاری لە بابانەوە هاتوون. خەڵکی بابان زۆر دیندار و لە خواترس و پارێزگارن.و پیاوی زانایان زۆر لێ پەیدا دەبێ. هەر ئاغایەك لە ئاغایانی تیرەکان، ناوچەیەکی لە ناوچەکان گرتۆتەوە و ساڵانە چوار خەروار زێڕ لە ناوخۆدا کۆ دەکەن و دەیدن بە خەزینەی شارەزوور.

ولاتی بابان مولکی تایبەتی شاهانەیە و کوێخا و گزیرەکانی دەگەڵ خەڵکەکە زۆر بە نەرم و نیانی ڕەفتار دەکەن. هەر ساڵە ئەندازەیەك نەغدینەوماڵ بەوان دەگا و لەوە بەولا فلسێکی سوور بە میری میران و دەفتەرداران و کارگوزاران نادەن. تا ئیمڕۆ -کە مێژووی کۆچی هەزارویێنجە- باری ئەو ولاتە ئاوایە.[1]

---

١- ئەم بارە تا سەر وا نەبووە. لە برانەوەی چەرخی یازدەهەمی کۆچیدا، فەقێئەحمەد کە وەك ←

← دەڵێن کوڕی بابامیر، کوڕی بداغ بەگ، کوڕی میرە بەگ، کوڕی شێخحەیدەری موکری بووە، بناغەی فەرمانڕەوایی لەو مەڵبەندە دامەزراندۆتەوە و سولەیمان بەبەی کوڕی، کوشادتری کردۆتەوە و هەتا ساڵی ۱۱۱۱.ك (۱٦۹۹.ز) حوکمداری بووە و بانک کراوەتە ئاستانە و کراوەتە پاشا و کەرکووکی پێ سپێراوە. بەڵام دیسان تەیموور بەگی برای بە سەر وڵاتی بابان ڕاکەیشتووە و لەو ماوەیەشدا زۆری شپرزەیی دیتووە و ساڵی ۱۱۱٥.ك (۱۷۰۳.ز) مردووە و سێ کوڕی بووە: خانە بەگ، فەرهادبەگ و خالید بەگ. لە پاش مردنی، بەکر بەگی برای -کە بە بەکرەسوور ناسراوە- کراوە بە جێنشین؛ کەوشەنی وڵاتی هەراوتر کردەووە و تا سەر سیروان و لەولاشەوە تاسەر زێی کۆیەی برد و بەکرەجۆی سولەیمانی و کوندی بەکراوای لای هەڵەبجە بە ناوی ئەون. لە پاش ئەو ماوەیەك شارەزوور بە دەست عوسمانیانەوە بووە و ساڵی ۱۱۲۹.ك (۱۷۱۷.ز) دراوەتە دەست کابرایەکی غەوارەوە. بەڵام خانە پاشا تێکۆشاوە و ساڵی ۱۱۳٤.ك (۱۷۲۱.ز) میرایەتی بابانی خستۆتەوە دەست و دوای ئەو خالید بەگی برای و کە ئەویش نەما سەلیمپاشای کوڕی بەکر بەگ، ساڵی ۱۱٥٦.ك (۱۷٤۳.ز) هاتە سەر حوکم و دوای ئەو سولەیمانپاشا هات و پاش ئەو ئەحمەدپاشای برای جێگەی گرتەوە و دوایە محەمەدپاشای برای لێ ڕاست بۆوە و بە نۆرە پێ ڕاگەیشتوون. ئەمجار مەحموودپاشای برایان هاتۆتە رووی کار و دوای ئەو برایم پاشای کوڕی ئەحمەدپاشا بۆتە سەردار و هەر ئەویشە کە ساڵی۱۱۹۹.ك (۱۷۸٤.ز) شاری سولەیمانیەی بنیات ناوە و پاتەختی لە قەڵاچوالانەوە بۆ ئەوێ هێناوە. ساڵی ۱۲۰۲.ك (۱۷۸۸.ز) عوسمانپاشا کوڕی مەحموودپاشا هاتۆتە سەر کار و ساڵی ۱۲۰٤.ك (۱۷۹۰.ز) ئاوڕەحمانپاشا سەری هەڵداوە و دەگەڵ دوو میرەکانی پێشوودا کێشەی کردووە و هەر کەسە ماوەیەك میر بووە. ساڵی ۱۲۲۸.ك (۱۸۱۳.ز) مەحموودپاشا کوڕی ئاوڕەحمانپاشا هاتووە و لە پاش چوار ساڵ لادراوە و عەبدوڵڵاپاشای لەجێ دانراوە و دوای ئەو سولەیمان پاشا کوڕی ئاوڕەحمانپاشا و پاش ئەو ساڵی ۱۲٥٤.ك (۱۸۳۸.ز) ئەحمەدپاشا بۆتە حوکمدار و وڵاتی بە تەرزی تازەبابەت ڕێك خستووە و سوپای تەکووزی پێکەوە ناوە. ساڵی ۱۲٦۳.ك (۱۸٤۷.ز) عەبدوڵڵاپاشای برای بۆتە میر و ساڵی ۱۲٦۷.ك (۱۸٥۱.ز) ئەو میرنشینە هەڵوەشێنراوە و عەبدوڵڵاپاشا کراوەتە قایمەقامی سولەیمانیە. ئیتر پەردەبە سەر ئەو میرنشینەدا درایەوە؛ هەتا ساڵی ۱۳٤۱.ك (۱۹۲۳.ز) کە شێخمەحموودی حەفیدزادەی بەرزنجی بانگەوازی پادشایەتی کرد و سەربەخۆیی کوردستانی ڕاگەیاند. بەڵام ئەویش لە دوو ساڵ و چەند مانگێکی تێنەپەڕاند.

ئەوی گەرەکیە پتری لێ بزانێ با بڕوانێتە *تاریخ سولیمانیه* و *من عمان الی عمادیه*. جەمیل

## بەندی سێهەم

# فەرمانڕەوایانی موکری

ئەوانەی لە پیتۆڵی و لە بلەبانیدا دەستی باڵایان هەیە و لە حەکایەتخوانی و سەرگوروشتەزانیدا تەپڵ و ئاڵایان هەیە و کاڵای دوانی بەرەوانی بە باڵایان براوە و لە مەکر و درۆ بە دوورن، دەڵێن: فەرمانڕەوایانی موکری بەرێ خەڵکی شارەزوورن و هێندێك دەڵێن: سەر بە تیرەی بابانین و وەك دەماودەم زانیومانە، کابرایەك بە ناو سەیفەدین سەرزنجیرەی سەردارانی موکری بووە و زۆر بەمەکر و داهۆ بووە و بە مەکری ناوی دەرچووە و دەشکرێ مەکرۆی پێ بڵێن. خوا دەزانێ.[1]

### میرسەیفەدین موکری

لە دەورەی دەڵ و بەڵ بوون و ڕۆژگاری سەرنخوون بوونی تەخت و بەختی پادشاکانی تورکومانی[2]، میرسەیفەدین سەری هەڵدا و کوردی زۆری لە بابانی و شوێنی دیکەی کوردستاندا لە دەوری خۆی کۆ کردەوە و پەلاماری تورکەگەلی چابقلوی داو دریاسی لە چنگ دەرێنان و هەر بەوەندەش دانەسەکنا، ناوچەکانی دۆڵباریك و ئەختاچی و ئێلتمور و سلدوزیشی ڕزگار کردن و دەسەر دریاسی خستنەوە.[3]

هێزوتوان و زەبروزەنگی میرسەیفەدین بە جۆرێك بوو کە هێچ کەسێك نەیدەتوانی لە هەمبەری سەرهەڵێنێ و خوار ڕامێنێ. جا ئەوانەی کە لە دەورەی ئەو هاڵاون و هەر کوردێ کە سەر بەو بووە، ناویان بە موکری دەرچووە. کاتێ کە مەرگ سەری داوە و دەسەڵاتی لێ براوە، دوو کوڕی لە پاش بەجێ ماوە: سارم و باباعومەر.

---

١- ئەمە ڕاست نیە و ناوی موکری زۆر لە مێژینەترە و ڕەنگە لە «مغرێ»وە هاتبێ؛ واتا ڕێگەی موغان. جەمیل

٢- پادشایانی قەرەقۆینلوو و ئاققۆینلووی نیازە. جەمیل

٣- ئەو ناوانە لە ناو کوردی موکوریاندا ئێستا ئاوان: دریاز، یەختەچی، یەڵتەمر، سندوس. هەژار



**سارم کوڕی سەیفەدین موکری**

بوو بە جێنشینی بابی و لە ڕۆژکاری ئەودا شائیسماعیلی سەفەوی بۆ ناوبڕکردنی ئەوان و داگیر کردنی موکوریان، چەند جارێکی لەشکر نارد و هەموو جاریش لە پاش شەڕ و کوشتاری زۆر، قزڵباشەکان تێدەشکان و بەرەو پاش دەکەڕانەوە. ساڵی٩١٢.ك (١٥٠٦.ز) شائیسماعیل زستان هاتبووە شاری خۆی و لە خۆیەڕا هۆزی شاملوی بە سەرداری عەبدی بەگی بابی دوورمیشخان و سارۆعەلی مۆردار ناردەشەڕی سارم بەگی. هەردوك سەردار بە لەشکری دوور لە هەژمارەوە هاتنە جەستەی سارم بەگ. شەڕێکی زۆر خەست و خوێناوی کەوتە نێوان و قزڵباشێکی زۆر و زەوەند و هەردووك سەرداریان لە مەیداندا سلار بوونەوە و سارم بەگ ئەو جاریش هەڵیبڕین و دەکونێی کردنەوە.

لە پاش ئەوە سارم بەگیش -وێڕای سەردار و میرانی کوردستان- خۆی هاویشتە ژێر فەرمانی ئاستانەی سوڵتانی بە شەوکەت و شان و کیسرانیشان، سوڵتان سەلیمخان و خۆی لە پێدا هەڵڕووسکان و تێهەڵپێچانی قزڵباشان ئاسوودەکرد.

لە کاتێکدا کە سوڵتانی دادەوان (سوڵتان سولەیمانخان) لە سەر تەختی پڕ بەروبۆمی قەیسەرانی ڕۆم، تەخت ڕۆنیشت و سانەوەی فەرموو، سارم بۆ ودم و پیرۆزی ڕامووسانی لاشیپانە، بەرەو دەرگای جیهانپەنا ڕەوانە بوو؛ بە لاواندنەوەی شاهانە خوێندرایەوە و ئەو وڵات و ناوچانەی کە لە باوکیەوە بۆی مابوونەوە، بە مووچە و موڵکایەتی پێ بەخشرا. مۆری قەدر و حورمەت زۆری سوڵتانی بۆ بە پسوولەوە نرا و ئیجازەی هاتنەوەی درا و گەڕایەوە. زۆری نەبرد کە شای مەرگ تێی هەڵپێچا و دەرگای ژیانی لێ دادرا و خەڵاتی بە بەردا کرا و بەرەو نەمان ڕەوانە بوو. کە مرد سێ فرزەندی هەبوون: قاسم، برایم، حاجیعومەر. بەڵام هەر سێکیان لە هەرەتی نەمامیدا بە ناکامی چوونە ژێر خاك. لە پسمامان سێ کوڕ مابوون کە ئەوانیش شێخحەیدەر و میرنەزەر و میرخدر بوون. ئەو سێ برایە هەر سێ کوڕی ڕوستەم کوڕی بابا عومەر کوڕی سەیفەدین بوون.

لە پاش مەرگی کوڕانی سارم، ئەو سێیانە وڵاتەکەیان کردەسێ بەش و هەر یەکەیان بەسەر بەشێك ڕادەگەیشت. ناوچەکانی دریاس و دۆڵباریك و سڵدوز و ئەختاچی وەبەر شێخحەیدەری براگەورە کەوت.

ئێلتمور ببووه پشکی میرنەزەر و ناوچەی محەمەدشا[1] درابووه میرخدر. هەرسێك برا بە یەکەوە تەکیان بە تەك شاتۆماسبەوە داو کەڵەوەی بەرەی عوسمانییانیان لە ملی خۆ دارنی. ساڵی ٩٤٨ك (١٥٤١ز) کە ئەلقاس‌میرزا ئاژاوەکەی نایەوە، سوڵتان سولەیمان‌خان لە ناو حاکمانی کوردستاندا سوڵتان حوسێن بەگی ئامێدی و زەینەڵ بەگی هەکاری و میرەکانی برادۆستی ناردەسەر فەرمانڕەوایانی موکری و شەڕی زۆر بەساميان لە ناودا قەوما و هەرسێك برا لەو شەڕی کورد بە کوردەدا کوژران.

شێخ‌حەیدەر دوو کوڕی هەبوون: میرە و حوسێن. میرنەزەر کوڕێکی بوو بە ناوی بەیرام. میرخدر دوو کوڕی لە پاش بەجێ مان بە ناوی ئولوغ بەگ و میرحەسەن؛ بەڵام هەموویان سەروپێچکە و منداڵۆکە بوون و بۆ ئەوە نەدەشیان کە ئیش و کار راپەڕێنن.

## میرە بەگ

### کوڕی حاجی‌عومەر، کوڕی سارم، کوڕی سەیفەدین

کە خەبەری بە کوشت چوونی شێخ‌حەیدەر بەر بیسەری بەختەوەری سوڵتان سولەیمان‌خان کەوت، لە سەر تکای میر وبەگلەری کوردستان، لە دیوانی سوڵتانی سولەیمان ئاساییەوە، فەرمانڕەوایی موکوریان درا بە میرە بەگ و نزیکەی سی ساڵان لە سەر ‌دریاس و هۆزی موکری مەزنایەتی کرد و لە فەرمانبەرداریدا زۆر پایەدار و لە خزمەتکاریدا یەکجار بەکار بوو؛ تا لە ئەنجامدا فەرمانی گەڕانەوەی بۆ مەڵبەندی نەمان بۆ هات و دەخەڵاتەوە پێچرا. کاتێ مرد کوڕێکی بە ناوی مستەفا بەجێ هێشت.

## میرە بەگ کوڕی شێخ حەیدەر

لە پاش مەرگی مامی، خۆی کردە دۆستی شاتۆماسب و لە دیوانی شاوە مەزنایەتی وڵاتی موکری درایە وکاتێ شاتۆماسبیش لە سەر دنیا نەما میرە بەگ بۆ دیدەنی شائیسماعیل ڕووی کردەقەزوێن و بە ڕایەخ ڕامووسانی سەرفراز کرا و بریکارانی شا ئەوپەڕی ڕێزیان لێ نا و زۆر بە شادی بەڕێ کرایەوە.

---

١- محەمەدشە: ناوچەیەکە بە سەر سندووسە. هەژار



چاخێ هەوساری فەرمانداری دەوڵەتی سەفەوی کەوتە نێو لەپی شاسوڵتان محەمەد و سەرلەبەری کاروباری دنیاداری ئەو زنجیرە، دەگیر داوی قزڵباشان کەوت و گێرە و کێشە و نێرە و بەرهەڵدایی و هەرکەس هەرکەس، هەموو سەرزەمینی ئێرانی گرتەوە، میرە بەگ جێی پێ لێژ کرا و نەیدەتوانی هەروا هەڵکا و بە ناچاری دەگەڵ گەلێك لە میران و فەرمانداران کوردستان و لوڕستان و ئەردەڵاندا -ساڵی ۹۹۱.ك (۱۵۸۲.ز) لە سۆنگەی ڕابەری محەمەد پاشای میری میرانی واندا- هاتە بەر فەرمانی ئاستانەی پیرۆز هێلانەی سوڵتان مرادخان و لە ئاوڕوێدانی بێ بنەبانی سوڵتانەوە، والیەتی وڵاتی بابانیشی بۆ خرایە سەر کەلەپووری باب و باپیرانەوە. سنجەقی مووسڵیشی بە بەخشش درایە و هەروەها هەولێر و هێندێك لە وڵاتی سەر بە مەراغە و تەورێزیش درا بە کوڕەکانی و لە چلەی زستاندا دەگەڵ محەمەد پاشای والی واندا لەبەری ورمێوە هێرشی بردەسەر بەکتاش قولی بەگی ئیستاجلوو؛ کە حاکمی مەراغە بوو.

قولی لەو قولیانە نەبوو کە بتوانێ شەڕیان بکا؛ وڵاتی بۆ بەجێ هێشتن و ماڵ و سامانی بەکتاش قولی و دارایی و شڕەی دانیشتووانی مەراغە -هەمووی- بە تاڵان بڕا و یەکپارچە گەسکی لێدرا. ڕەوەی شاتۆماسب -کە زۆر لە مێژ بوو لە ناوچەی قەراجیق دەلەوەڕا و هەمووی ئەسپی ڕەسەن و هەڵبژاردەو حدوودی گوێ بەل و چوارپەل قەڵەمی بوون و لە هیچ دەور و زەماناندا لە دەرکی هیچ پادشایەکدا شتی وا هێژا هێشتا نەدیترا بوون- وەبەر هەڵمەتی سوارانی هێرشبەر هاتن و ڕەپێچەکیان دان و بۆ وانیان هێنان.

| | |
|---|---|
| هەزار ئەسپی ڕەسەن گشتی حدوودە | لە ڕووی وان ڕەخشی ڕوستەم بێ نموودە |
| لە ڕەوتا ئاوی لافاون، شەماڵن | لە غاردا هەر پەلێکیان جووتە باڵن |
| ئەگەر سمکۆڵ دەکەن لەو چۆڵ و دەشتە | دەلەرزێ گایەکەی هەردی لە پشتە |

محەمەدپاشای میری میرانی وان کە لەو هێرشەی سەر مەراغەی بە سەرکەوتوویی گەڕاوە، کوڕی میرە بەگی دەگەڵ خۆدا بردەئەرزەڕۆمێ و چوونە لای سەرداری شیرین ئاکار (فەرهادپاشا) تا پێکەوە نۆکەرچاکی و دڵسۆزی و پاکی میرە بەگێ، بە بەر گوێچکی پێچکی تەختی خودان بەخت بگەیەنن. هەر گەیشتنە ئەرزەڕۆمێ والی و پاشالێك کۆم بوون و نامەیەکیان بە جووت نووسی و بە

زمان لووسی، تیر و پڕیان بە میرە بەگدا هەڵگوت و ڕەوانەی سەردەرانەی هەرەبەرزیان کرد. کاتێ ڕاستی ڕووداوەکە وەبەر دوو گوێی خاوەن شکۆی سوڵتان کەوت، لە بەزەیی بێبڕانەوەی پادشایانە، نازناوی پاشای پێدرا و لە ناو ڕیزی پاشایانی بەر دیوانی عوسمانیدا بە ڕێز و حورمەت ڕێدرا و مەراغەشی بە پێ و شوێنی بەگلەر بەگی پێ سپێرا. مەرجیشی بۆ دیاری کرا کە خۆی دەبێ ئەو وڵاتە لە دەست قزڵباش دەربێنێ و ئەوسا بە سەری ڕا بگا.

حەسەنی کوڕی خدر بەگ[1] -کە ئامۆزای میرە بەگ بوو- ماوەیەك بەر لە میرە بەگ بە ماچ کردنی لاشیپانەی دەرگای بەرزی سوڵتان بەختەوەر ببوو؛ ناوچەی دریاسیان بە بەخشش دابوویە و بە سەری ڕادەگەیشت. کە میرە بەگ کرا بە پاشاو هاتەوە، ئەو حەسەن بەگە نیازی نەبوو کە دریاسی بداتەوە و لە قەڵادا خۆی قایم کرد. میرەپاشا دەوریلێدا و زۆری خستە تەنگانەوە و زۆر نەمابوو قەڵا بگرێ و نەیاران قەڵاچۆ بکا، ئولوغ بەگی برای حەسەن بەگ بە دەسکیسی دۆستانی خۆی لە قەڵاوە خۆی دزیەوە و بە دزیەوە خۆی گەیاندەئەرزەڕۆم و داد و هاواری گەیاندەفەرهادپاشای سەردار و لەوێش لە ترسی میرە بەگ ئۆقرەی نەگرت و گیر نەبوو، بەرەو ئێران بای دایەوە و پەنای بە شاسوڵتان محەمەد برد و بریکارانی شاش زۆریان بەرێز گرت و مەڵبەندی دەخوارقانی[2] لای مەراغەیان پێ سپارد.

میرەپاشا لە حوسێنی برای خۆی دڕدۆنگ ببوو لای وابوو دەگەڵ ئامۆزاکانیدا دەست و دەمیان کردۆتە یەك و نیازیان وایە لە ناوی بەرن؛ گرتی و کوشتی و گەورە و چووکەی دوژمنانی هەموو لە سەر ڕێ لابرد و سەربەخۆیی بێلەمپەر و دەسەڵاتی لە ڕادەبەدەری بەرهەم هێنا. چەند ساڵێك ئاوا ڕابرا. لە دواجاردا شاری تەورێزی پاتەختیش کەوتە بەردەستی عوسمانی و جەعفەرپاشای وەزیری بەسەرەوە دانرا. جا چونکە هەر زۆر لە مێژەوە مەراغە لەسەر تەورێز بوو، جەعفەرپاشانەوەی دەویست میرە پاشاش -کە سەرداری مەراغەیە- سەربەوی بێ و لە بەرانبەر فەرمایشتی خێوی تەورێز سەرنەوی بێ.

---

١- ئەمین زەکی و حوزنی بە حوسێن بەگیان نووسیوە. جەمیل

٢- شارۆکێکە لە نێوان مەراغە و تەورێز، بە قەیسی باش بە ناوبانگە و ئێستا ناوی ئازەرشەهرە. هەژار

میرەپاشا -کە نازناوی میری میرانی پێدرابوو- داوای پاشای دایە دواوە و ئاوڕێکی وای وێ نەداوە کە پاشای تورک دابین کا. لەسەر ئەمە جەعفەرپاشالێی غەزری بوو؛ دەستی کرد بە نامەکاری و ناکاری میرەپاشای بە نالەباری بە پایەی تەختی هەرەبەرز دەگەیاند و لە سایەی ئەو گەندەکاریەوە فەرمانڕەوایی وڵاتی بابان و مووسڵ و هەولێریان لێ ساندەوە و ئەنجام گەیشتە ڕادەیەك کە ناردیە لای میرەپاشاو فەرمووی مەراغە سەر بە تەورێزە و ئەگەر نەیێتە ڕێزەی مولکی تایبەتی شاهانەوە، داهاتی تەورێز بەشی خۆی ناکا. مەراغەساڵێ پازدەخەروار زێڕ لە بەروبۆمی ناوچەکە بۆ سەر خەزێنەی دارماڵی دەوڵەت دەنێرێ و پێویستە ئەو زێڕ و دراوە، لەوە بەو لاوە بێتە تەورێز و لە مووچە و ئازووقەی سوپای تەورێزی بەخت کەین.

میرەبەگ بە ناچاری دەستەبەر بوو کە هەموو ساڵێك دراوێکی یەکجار زۆر بە خەزێنەی تەورێز بگەیەنێ. دوو-سێ ساڵێکیش ئاوای گوزەراند؛ بەڵام جەعفەرپاشابەوەشی لێخە نەبۆوە؛ لە کاتێکدا کە دەفتەری بۆ تەورێز دەگرتەوە و چاوی بە تەرزی چاوەدێریەکیدا دەخشاندەوە، مەراغەی خستە سەر تەورێز و کابرایەکی وەك دەستەبەر بە میرسنجەق لە سەر دانا و بۆشی دانا کە هەر ساڵە پازدەخەروار زێڕی پیتاك کۆکاتەوە. لە پاش ساڵێك دانیشتوانی لای مەراغە بڵاو بوون و مەراغە بوو بە وێرانە و فلسێکی سوور بە بەریکی میرسنجەقی دەستەبەری نەگەیشت و ئەوی چووە سەر خەزێنەی ئیسلامیشەوە، لە تاکە خەروارێکی تێنەپەڕاند. میرەپاشا ڕووت و نەدار و بێبژیو کەوتە دەشت و بە ئاواتەوە بوو بچێتەوە سەر شوێنی کەون و ئەو پاشایەتیەی دەخەونیش نەیە.

لەو ڕۆژگارەدا کە مەراغە و دەوروبەری، میرەپاشای بە سەرەوە بوو، شێخ حەیدەری کوڕەگەورەی بە فەرمانی بێ چەندوچوونی سوڵتان مرادخان قەڵای ساروقورغانی سەر بە مەراغەی بنیات نایەوە. ئەو قەڵایە ڕۆژگارێك بەر غەزەبی ئەمیرتەیمووری کورەکانی کەوتبوو؛ بە جارێك تێکوپێسك درابوو. ساڵی ١٠٠٢ك (١٥٩٣و٩٤ز) کە خدرپاشای میری میرانی بەغدا کرا بە والی تەورێزێ، کاربەدەستانی مەراغە پێیان گوت مەراغە ئەگەر وێرانە تاوانی ئەو قەڵایەیە کە شێخحەیدەر ئاوەدانی کردۆتەوە. کەتن گێڕان کاری خۆیان کرد؛ خدر پاشا تەپەکڵاوێکی تەریب دۆزی لە گزی و گەڕ بۆ شێخ حەیدەر دۆزیەوە؛ ناوچەکەی قەڵاکەی تێدا بە سنجاق دای بە هۆزی مەحموودی و شەڕ و هەرای بۆ

نایەوە.

لەو شەڕەدا هەمزە و قوباد -کە برازای مەنسوور بەگ بوون- دەگەڵ کوڕێك لە کوڕانی زەینەڵ بەگدا -کە سەرکردەی هۆزی مەحموودی بوو- وێڕای گەلێك لە پیاوانیان بە دەستی موکوری کوژران. ساڵی ۱۰۰۳.ك (۱۵۹٤و۹٥.ز) هۆزی مەحموودی و عیوەز بەگ، کوڕی حەسەن بەگ -کە میرلیوای ماکۆ بوو- خدرپاشایان لە شێخحەیدەر هان داو ڕەگەڵ خۆیان خست و بە نیازی تۆڵە ساندن و قەڵا ڕماندن هاتنە سەری. شێخ حەیدەر زۆری کرد و کۆشی کە دڵی پاشابێنێتە جێ و جەنگ نەقەومێ؛ زۆر پاڕاوە کە ئامادەم هەر مەحموودیەکی کوژراوە خوێنی بدەم؛ بەڵام ئەوان جار لە دواجار تیژتر دەبوون و دنەی پاشایان لێدەدا کە نابێ دەستی لێ بەردا و دەبێ قەڵای دەورە بدرێ و چۆن خرابە وای لێ بکرێ.

شێخحەیدەر کە زانی نەرم و نیانی دادی نادا و وەرامی سندان هەر قوززەڵقورتە و ژیانی حیزانە لە ژێر مردنەوەیە، مەچەکی مەردانەی هەڵماڵی و خۆی بۆ شەڕیان لە دەسك نا و کۆمەڵێك لە پاڵەوانانی کوردی لە بەرانبەر لەشکری پاشاڕاگرت و دەستیان بۆ باڵچوغەی شیر و گیرەی کەوان برد و دەبەر یەك ڕاچوون.

| | |
|---|---|
| پلوسك بوو بۆ خوێن دەم و دوخی شیر | مەتاڵ بوونە ژوشك لەبەر دڕکی تیر |
| ڕم و نێزە ئیسکبڕ و ڕەگ پسێن | ئەسپ یاڵ و بڕیان دەرەنگا بە خوێن |
| کەوان داسی مردن بوو بێ سێ و دوو | لەش و گیانی پێش خۆ دەدا و دەیدروو |
| دەمی خەنجەری تازە ساوی کوڕان | سەر و ورگی زۆر پێ پەڕان و دڕان |

عیوەز بەگ -وێڕای زۆران- لە مەیدانی شەڕدا یەك بە مەیدان تێخێڵ کرا و دەخوێنی خۆی گەوزی. میرەپاشافریا کەوت و دەستی وەبەر دەستی کوڕی هێنا و نەیهێشت داخی دڵی پێ بڕێژێ. خدر پاشاش نەوەستانی لە داوەستان پێ باشتر بوو؛ هەر ئەو ڕۆژە لە دەوری قەڵا لا کەوت.

میرەپاشاچوار کوڕی بووە: بداغ بەگ، قاسم، شێخحەیدەر و حوسێن. لەو کاتەدا کە بەر فەرمانی سوڵتان مرادخان بوون، هەر یەکە سنجەقێکی درابوویە. بداغ مرد؛ قاسم بەگ بە

دەستی حوسێنی براگچکەی بە کوشت چوو؛ شێخ حەیدەر حوسێنی لە تۆڵەی برایدا کوشت.

ئێستا لە کورانی میرە بەگ هەر شێخحەیدەر ماوە و جگە لە ناوچە و قەڵاکانی پێشوویان -کە بە دەست باب و کوڕەوەیە- قەڵای تەرەقە و ناوچەی ئاجری و ناوچەی ساروقورغان و ناوچەی دوئاب و ناوچەی لیلان و قەڵای ساروقورغانیشیان دەبەردەست دایە[1].

بەسەرهاتی ئەو بنەماڵە وەکوو هەیە هەتا ئێستا کە ئەم نوسخە پەرێشانە دێتە نووسین لە رووپەڕانم چەسپاندوون. بۆ ئاییندەش چی ڕوو دەدا، پەروەردگار ئاگادارە.[2]

---

١- ئەو شوێنانە -یەك لە دووی یەك- ئێستا لە موکوریان ئاوا ناو دەبرێن: تەرەغە، قاجر، قۆڕغان، مياندواو، لەيلان. بە هەلکەوت، هەژاری وەرگێڕی شەرەفنامە، خەلکی گوندی تەرەغەیە. هەژار

٢- حوسێنحوزنی دەڵێ: میرە بەگ دوو کوڕیتریشی هەبوون: ئەمیرخان و ئاودال بەگ. ئەمیرخان هەتا هەرای موکوری قڕان، بە سەر گەرمرود ڕادەگەیشت. شاعەبباس ئەسفەندیار بەگی تورکومانی بە لەشکرێکی زۆرەوە ناردەسەر و هێرشێکی لە ئەکاوی بۆ کرا و لە ماڵەخۆیدا کوژرا. ئاودالیان بەریەرەکانی قوبادخانی دەکرد و دەرەتانی بۆ نەما و پەنای بە ئەمیرخانی یەکدەست، فەرمانڕەوای بەناوبانگی برادۆست برد و هەر دەگەڵ ویش لە ماڵی ئەلیاس خەلیفەدا کوژرا.

شێخ حەیدەر دەگەڵ جەعفەرپاشادا لەشکریان لێك کرد و بەگژ یەکدا هاتن و شێخحەیدەر خۆی هاویشتە بن باڵی شاعەبباسەوە، زۆری ڕێز لێگیرا و لە گوناهی بابیشی خۆش بوو. مەراغە و ناوچەکانی سەر بە مەراغەی دایە و شێخحەیدەر زۆر بە دڵسوزی خزمەتی شای دەکرد و دەگەڵیا چووە ئازربایجان و بە هێزی موکوریانەوە بۆی بە گژ عوسمانیاندا هات و تەوریز و نەخچەوان و چغرسەعد و یەریڤانی لێ گرتن و سوپای عوسمانی شڕ کرد و لە ئەنجامدا لە هێرشێکیدا لە خوار قەڵای یەریڤان کوژرا.

قوبادخان -ئەگەرچی منداڵیش بوو- شاعەبباس لە جێگەی شێخحەیدەری باوکی دانا و دایك و گەورە پیاوانی موکری بۆ کردەسەرپەرشت و کاتێ پێگەیشت و بوو بە پیاو، حوکمی گرتە دەستە خۆی و ملی لە هەراو کردنەوەی قەڵەمڕەوەکەی نا و شاعەبباس لەو پەرەهاویشتنەی ترسی ڕێ نیشت و خستبوویە ژێر چاوەدێری و لێی بە گومان بوو. ساڵی ١٠١٧.ك (١٦٠٨.ز) کە هێرش برایە سەر قەڵای دمدم، فەرمانی پێدا کە دەگەڵ ئێعتمادوددەولەدا شەڕی ئەمیرخانی یەکدەست بکەن. قوبادخان بە دەنگیەوە نەچوو. شا ئەمەی لێ دەدڵ گرت و دەری نەبڕی و بۆ هەلێکیتری هەڵگرت. لە مانگی مەولوودی ساڵی ١٠١٨.ك (١٦٠٩.ز)دا کە شاعەبباس لە چیای قەرەباغ لەشکربەزی کردبوو، قوبادخان لای وابوو تووشی کێشەیەك دەکرێ و تۆڵەی نافەرمانیەکەی لێ دەکرێتەوە؛ وای بە باش زانی بۆ خۆی بچێتە لای شا. دەگەڵ چەند کەسێك لە دۆستان و دەست و پێوەندانیدا دیدەنی شای کرد و ئەویش زۆری ڕێز لێ نا و هیچی بە ڕوودا نەداوە و زۆریشی دڵخۆشی داوە. ئەمەشی لە پیاوەتییەوە نەبوو لە دوو شت دەترسا: کوردەکان ←

← سونني مەزەب بوون و لەوانە بوو عوسمانی سوننی، لە دژی دەوڵەتی شیعە مەزەبیان دەکار بێنێ. لە لایەکی تریشەوە دەترسا کە کوردەکان یەك بگرن و شۆڕشێك هەلگرسێنن. دواجار شاعەبباس بە لەشکرەوە هاتە ناو چیاکانی کوردستان و لە لای مەراغە و لە نزیك قەڵای گادۆڵ هەڵیدا؛ کە ئەو قەڵایە پاتەختی میرنشینی موکری بوو.

قوبادخان بە خۆی و کۆمەڵێکی زۆر لە ناودارانی هۆزی موکوریەوە چوونە بەخێرهێنانی و بوونە میوانی. بە فەرمانی شا بانگیسان کردنە جێیەکی دیاریکراو و یەکیەك دەیانبردنە ژوورەوە و دەیانکوشتن و نەیاندەهێشت بە یەکتر بزانن. بەو جۆرە تاقیان لێ بڕین و ئەوجار هێرش کرایە سەر قەڵای گادۆڵ و خافلگیریان کرد و هەرچی تێیدا بوون کوژران و ئەوسا قزلباش کەوتنە ناو دێهات و ئاوایانەوە و ژن و منداڵ و پیسر و پەك کەوتەشیان دەکوشت و گەلێکیشیان خەلك بە دیل گرت و هێنایان و لە بن دار و قامچیدا کوشتیانن. کاتێ کە شاعەبباس ئەو کەتنەی بە بنەماڵەی میرانی موکری کرد، ساڵی ١٠١٩.ك (١٦١٠.ز) موکوریانی دادەست شێر بەگ ناوێك.

شێر بەگ خزمایەتی دەگەڵ میرانی موکوریدا هەبوو [وێدەچێ شێر بەگی کوڕی ناسر بەگ بێ کە لە بنەماڵەی میرانی تەرگەوڕ بووە و لە دواییدا باسی دەکرێ] چونکە زۆری خزمەتی شا کردبوو، لە کوژران خەلستبوو. زۆر بە کارامەیی و مشوورخۆری کاروباری موکوریانی هەلدەسووڕاند و بە یارمەتی مەقسوود بەگی برای و گەورەپیاوانی وڵاتەکە پازدەساڵان بە بێ خاوە خاوی، هەر خەریك بوو تا موکوریانی تەواو ئاوەدان کردەوە و گەشەی زۆری بە کشت و کاڵ و حاڵ و باڵی خەلکەکەی داو ئەوسا کەوتە لەشکر پێکەوە نان و هەر کوردێکی کە لە سەفەوی داخدار بوو لە ژێر ئاڵای کۆ بوونەوە و ساڵی ١٠٣٤.ك (١٦٢٤.ز) هێرشی بردەسەر مەراغە و شیشایە گیانی قزلباشان و شیری تینان و تۆڵەی گەلە قڕ تێخراوەکەی خۆی کردەوە و بەڕیەی خۆی بۆ پێوانەوە و سەری بڕین و زگی دڕین و ماڵوێرانی کردن و تاڵانی هێنان. شا کە بەو بەڵایەی زانی، خمی لێ شێوا و زەمان بەگی هەمەکارەی بە پێنجهەزار شەڕکەرەوە بەرەو شێر بەگ بەڕێکرد و فەرمانی بە لەشکری فارس و هێزەکانی ئیمام قولیخانیشدا کە بچنە هیمدادی زەمان بەگ و شەڕی شێر بەگ بکەن. بەڵام ئەو لەشکرانەش چیان بۆ دەگەڵ نەکرا و بە بۆراوی و دۆڕاوی گەڕانەوە.

لەو سەردەمانەشدا حافیزئەحمەد پاشای گەورە وەزیری عوسمانی لەشکری هێنابووە سەر سنووری ئێران و لە دیاربەکر دابەزیبوو؛ پشێوێنی کەوتبووە ئێرانەوە. شا نەیویست کە شێر بەگ بە دوژمن بمێنێتەوە. بە ئەسپاردەیەکی خۆیدا ستورکێکی بۆ نارد و ڕاشیسپارد کە پێی بڵێ ئەگەرچی بێتەمەکیشت کردووە، گەردنت ئازا بێ. ئیتر شا چووە لای بەغدا و شابەندەرخانی میری میرانی ئازربایجانی ناردەگورجستان و لەوێ کوژرا و شۆڕشی گورجیان هەر مایەوە و سەری شاعەبباسی قاڵ کرد. بەم جۆرە شێربەگ وڵاتی موکوری لە چنگ قزلباشان ڕزگار کرد و شاری سابلاغ (مهاباد)ی کردەپاتەختی خۆی. بەڵام نازانین ئەنجامی ئەو فەرمانڕەوایە بە کوێ گەیشت.

نابێ ئەوەندەشمان لە بیر بچێ کە کۆمەڵی نهێنی ژ.ك لە جەنگی دووەمی جیهانی، هەلی دەست خست و بە یارمەتی یەکیەتی سوڤێت -کە هاتبووە ئێرانەوە- کۆماری کوردستانی پێك هێنا و پاتەختی ←

 

→ سابلاغ (مهاباد) و سەرکۆماری قازی‌محەمەد بوو. کۆمارەکە تا دوای شەڕ ما و زۆریشی خوێندەواری و ڕۆشنبیری لە وڵاتەکەدا بڵاو کردەوە. دوای تەواو بوونی شەڕ و کشانەوەی هاوپەیمانان لە ئێران، دەوڵەتی ئێران بە هەموو توانا، بۆ لە ناوبردنی تێکۆشا و لەشکری کردەسەر و ماوەیەکی زۆر دەگژ یەك ڕاچوون و چونکە کۆمارێکی تازە و خۆنەگرتوو بوو نەیتوانی هەتا سەر خۆ بگرێ و هێندێکیش لە سەرکردەو سەرۆك هۆزەکان خەیانەتیان پێکرد و لە ناویان برد و ئەو دەستەی لە سەر حوکم بوون گیران و لە سێداره دران و ئەم کۆمارە نیشتمانیەش لە ئارادا نەما. جەمیل

ئەو حوکماتە لە موکوریان کە شێر بەگ دایمەزراندەوە، پتر لە دوو سەدەی خایاند. لە دەوری پاشای کۆرەدا ئەولاخانی میری موکری بە سەربەستی تەواو ژیاوە.

ئەوی شایانی لێدوانە، پیری ژیر و ئاگاداری موکوریانی وەك لە باوك و باپیرانی خۆیانەوە دەگێڕنەوە: بداغسولتان بە یەکەمین میر دەزانن کە لە دریازی گوێزتەوە و گوندی سابلاغی کردەشار و پاتەختی خاکی موکوریان. چونکە مزگەوتی گەورەی شار کە مزگەوتی سووری ناوە و ئاسەواری هەرە کەونارای سابلاغە، کردەوەی بداغسولتانە و تەتەڵەیەکی بەردینی دەسەر دەروازەی گیراوە و مێژووی ساڵی دروست بوونی بە دەسخەتی سوهراب بەگی فرزەندی بداغسولتانە و ١٠٨٩ی کۆچە.

لەوەڕا وا دەردەکەوێ شێر بەگ لە دوای وەی کە ساڵی ١٠٣٤.ك سەربەخۆیی خاکی موکوری ڕاگەیاند، زۆر نەژیابێ. یا خۆ لە بەر گەڕوگەفی قزلباش و خۆ سازدان بۆ بە گژدا چوونیان، نەیپەرژابی و نەیکرابێ ئاوڕ وەسەر ئاوەدانی وڵاتەکە و گەشە و پێش کەوتنی بدات. بداغسولتانی جێگری و شاسولەیمانی سەفەوی ناشنایەتیان زۆر خۆش بووە و بێ ترسی ئاژاوە ژیاوە و بە ئارخەیانی و دڵسۆزی سەروسامان و ڕمێنی بە وڵات و دانیشتووان داوە و خۆی هێند خۆشەویست کردووە کە خەڵکی دیار و ڕەمەکیش، ناوی ئەویان کردۆتە نووشتەی سەر دڵ و لە خۆشیانی، شێر بەگیشیان لە بیر چووە. لە دوای ئەویش وەچ و بەژی ئەو شالکەش شانازیان پێوە کردووە و خۆیان بەو ناوە ڕاناوە. گۆڕخانەی بداغسولتان و هێندێك لە هۆز و خزمانی بە گومبەزان بەناوبانگ و لە باشووری شارەکەیە و نەزەرگەیەکی پیرۆزە و بۆ نیازانی دەچنە سەرێ.

پردی سووریش کە لە سەر چەمی سابلاغە، هەر بنیاتی ئەو میرەیە. بۆ خۆم لە تافی لاویمدا دراوێکی مسینم دیت لێی نەخشابوو ضَرب في ساوجبلاغ، واتا: لە سابلاغ لە سکە دراوە. مێژووەکەشی وەك لە بیرمە ١١١٤ بوو.

ئێستاش کە دوامین سێیەکی بیستەم سەدەی میلادیە، وەچ و نەوەی بداغسولتان فرەیە ماون و گەلێك لەوان خاوەن ناون. ماڵە «إعظام الملك» لای بۆکان و خانانی چۆمی مەجیدخان و هۆزی ئاوداری بەگزادەی فەیزوڵلا بەگی و شێر بەگی، ڕیشاژۆی ئەو شەنگە دارەن.

جیا لەوەش لە زەمانی ناسرەدین‌شای قاجاردا، عەزیزخان سەرداری موکری سوپاسالاری ئێران و والی ئازربایجان بوو. حوکمێکی وێنە سەربەخۆی لە موکوریان لە دەستدا بوو. دوای ئەو سەیفەدین‌خانی موکوری کوڕی، ببووە ←



← سەرداری ناوچەکە و دوا بە دوای ئەو حەمەحوسێن‌خان لە جێی ئەو بوەتە سەردار و وێڕای حەمەخانی‌یانە و سەیفەدین‌خانی سەقزی، ویستوویانە کوردستان بکەنە دەوڵەت. بە ڕێبەری شێخ بابای شێخی غەوسابات دەگەڵ ڕووسیا ڕێك کەوتوون کە ئەوان دژی تورکان بن و ڕووسیاش پاش تورك ڕاونان، بە ئاواتیان بگەیەنێ. عوسمانی پێیان زانیوە و فەریق ناوێك سەرکردەی لەشکری تورك، ساڵی ١٣٢٥.ك گرتوونی و لە سەر فتوای مەلا و شێخان خنکاندوونی.

تاقانەی حەمەحوسێن‌خان -کە عەلی‌خانی سەردار بوو- کەلێنی پڕ نەکردەوە و بە دەستەوستانی ژیا و بە هەناسە ساردی مرد و ماڵی سەردار دوابڕاو بوون.

هەر لە دەوری قاجاراندا هەمزاغای مەنگوڕ سەردەمێك و قادراغای دێبۆکری سەرێك، لە موکوریان سەر وەبەر باری کەس نەبوون و ئێران پێیان نەوێراوە.

مەبەستم لەو تۆزە دوانە کاڵ و کرچ و سەرچڵانە، هەر ئەوە بوو کە بیزانین هەتا دەورانی ڕەزاشا خاکی موکوریان بۆ ئێران وەك ماری بێ ئیجازە بووە و تا سەر، سەری بۆ داگیرکەر شۆڕ نەکردووە. وەك دەشزانین لە پاش ڕەزاشاکەی پێشووش، ئاڵای کۆماری کوردستان لە موکوریان شەکایەوە و لە بەر پاشەکشەی دۆست و گەلەکۆمەی دوژمنانی ئازادی کورد، کۆمارەکە لە ناو برا و خێوی ئەم ڕەشکە و پێشکانەش دەربەدەری ئەو تێشکانەس.

ئەگەر تەمەن مەودا بدا و هەودای ژیان ئاڵۆزاو و پس- پس نەبێ و خوداش بە دەسمەوە بێنێ، سەر لەو مێژووە پڕ شانازیە دەدەمەوە و بزگوڕان تێك دەخەمەوە و بە درێژی شی دەکەمەوە.

شاعیری بەناوبانگی کورد کاك هێمنی موکوریانی دەڵێ: لاوێکی زۆر زانا و ژیری مهابادی وە ناو ئەمیری حەسەنپوور چەند ساڵێکە خەریکی مێژووی موکوریە و زۆریشی ئیش لێ کردووە و ئێستا لە ئەمریکا دەژی. بەو مژدەیە زۆر دڵخۆشم و بە پەرۆشم کە بەرهەمەکەی ببینم. هەژار

## بەندی چوارەم

## فەرمانڕەوایانی برادۆست

### کە دەبنە دوو دەستە

هێندێ کەس هەروا دەزانن کە میـرەکانی برادۆست بە بنەچەکە گۆرانن. بەڵام زۆر ڕاست و ڕەوانە کـە بەرەبابی ئەوانە ڕاست و ڕەوان دەچتەوە سەر هیلال، کوڕی بەدر، کوڕی حەسنەوییە، کـە فـەرمانڕەوای دینەوەر و شارەزوور بووە.

هیلال لە شەڕێکدا کە دەگەڵ شەمسودەوڵەی دەیلەمی والی هەمەدانی کـرد، کـوژرا. سـێ کـوڕی بوون. ئەو سێ برایە لە پاش بابیان، یەکیان لە جێی بابی دانیشت و بوو بـە فـەرمانڕەوای شـارەزوور. یەکێ‌تریان بە سەر هۆزی ئاکۆ ڕادەگەیشت و برای سێهەم پەڕەوازەی لای ورمێ بوو؛ بـوو بـە خـاوەنی ناوچەی خانئەلماسی سەر بە ورمێ. هەر سێك بـرا وردە-وردەگەشـەیان کـرد و برەویـان سـەند و لـە ئەنـجامدا هەموو سەریان بە میـرەتی گەیشتووە. بڕوای مەردمی برادۆست وایـە کـە سـەردارەکانیان نەوە و نەتیژەی بیلالن؛ بەڵام لێم ڕوونە وا نیە و هەر هیلالەکە ڕاستتـرە.

سەرتۆپی ئەو بنەماڵە و شالکی ئەو خانەدانە، غازی قڕانی کوڕی سوڵتان ئەحـمەدە؛ کە بەرلەوەی میـرەکانی کوردستان پەنا بەرنە بەر ئاستانەی شائیسماعیل، هێرشـێکی بردەسـەر ورمـێ و کەوتـە گیانی قزڵباش و هەزار کەسێکی لێ کوشتـن. دوایەش کە وێڕای میر ومەزنانی کوردستان، بـە پـیتی ڕایەخ ڕاموسانی شائیسماعیل گەیشت، شا زۆری دەگەڵ ڕووخۆش بوو؛ یـەکجار زۆری بـەخێر هێنـا و ناوی غازی قڕانی لێنا و ناوچەکانی تەرگەوەڕ و سۆما و دۆڵ و هەموو قەڵا و زەوی و زاری دەوروبـەری قەڵاکانی پێ بەخشی و فەرمانی والیەتیشی بۆ مـۆر کـرد. لـە دواییـشدا دەگـەڵ پیـاوە گـەورەکانی کوردستاندا لاشیپانەی بەرزی دەرگای سوڵتانسەلیمخانی ماچ کرد.

رۆژگارێك كە سوڵتانسولەیمانخانی خەزاکەر بە نیازی گرتنی وڵاتی عەجەم هەوساری بڕیاری بەرەو تەورێز و ئازربایجان وەرگەڕاند، بۆ هەمدەمی و ڕاوێژکاری، لەو سەفەرەی، غازی قڕانی هەڵبژارد. گفت و بیر و تەگبیری ئەم، دەربارەی وڵاتی عەجەم زۆر لەجێ و بە ڕێوجێ بوون؛ بەر دڵی پادشاکەوت و لە پاداشدا هێندێك لە وڵاتی هەولێر و بەغدا و دیاربەکری وەك سنجەق، جیا کردەوە و بەوی بەخشی و بە لاواندنەوەی شاهانە سەرفراز و خۆشبەختی کرد و دێرزەمانێ غازی قڕان زۆر بە شادی و کامەرانی حوکمڕانی کرد و زۆریش ژیا. کاتێ کە سەردەرانەی گۆڕی تەنگی پێ ماچ کرا[۱]، دوو کوڕی لە جێگە مانەوە: شامحەمەد بەگ و عەلی بەگ.

---

۱- دۆستی زۆر نزیکی میرسەیفەدینی سۆرانی بوو. هەر ئەویش هەڵیفریواند و بردیە ئەستەمبووڵ و بە کوشتنی دا. جەمیل

دانەر لە پێشەکیەکەیدا دەڵێ حاکمانی برادۆست دوو لکن: لکی یەکەم میرانی وەشنی، دووەم میرانی سۆما. کەچی لە ناوەرۆکدا لکی یەکەم میرانی سۆما و لکی دووەم میرانی تەرگەوەڕ و قەلعەداودە؛ کە دەپێشدا نەهاتوون و ناوی وەشنیش سەری نەدراوەتەوە. بڕوانە ڕوویەڕ ۱٦و۳۸٤و۳۸٦، فارسیەکەی چاپی قاهیرە. هەژار

## دەستەی یەکەم

## فەرمانڕەوایانی سۆما

### شامـحەمەد بەگ کوڕی غازی قڕان

لە پاش نەمانی بابی، فەرمانڕەوایی دەست کەوت و چەند ساڵێك ژیانی ڕابوارد و ئەوسا لە ژێر خاکـدا خەوت و چوار کوڕی لە پاش بەجێ مان: بداغ بەگ، حەسەن، ئەسکەندەر و زەینەڵ. کـوڕە گەورەکـەی جێگەی گرتەوە.

### بداغ بەگ کوڕی شامـحەمەد بەگ

لە دوای باوکی خوالێخۆشبووی لەسـەر فـەرمانی چـارە و دەرمـانی سـوڵتان سـەلیم‌خـان، گەردانـەی مەزنایەتی بە ستۆدا کرا و کاتێ کە ئەویش لە دنیای بێ‌فەڕ بۆ ئـەولای بـێ‌گـەڕ پاڵەسـتۆ درا، چـوار کوڕی هەبوون: ئەولیا بەگ، شامـحەمەد بەگ، شاقولی بەگ و سەیدی. ئەو کوڕانە زۆر منـداڵ بـوون؛ بۆ فەرمانڕەوا نەدەشیان. لەبەر ئەوە مەزنایەتی بۆ حەسەن بەگی برای مایەوە.

### حەسەن بەگ کوڕی شامـحەمەد بەگ

لە پاش برای بە فەرمانی سوڵتان، میـرنشینیەکەی برادۆستی پێ بەخشرا. زۆر بزۆز و نەگونـجاو بوو؛ خزم و هۆزی خۆی ڕەنـجاندن و میـری هاوسای وەڕەز کردن. خزمانی گلی نامەیان نووسی و بە زەینەڵ بەگدا ناردیانە ئاستانە و فەرمانی پیـرۆز بۆ حوسێن پاشای میـری میـرانی وان هات کە لە کاروبـاری حەسەن بەگ بکۆڵێتەوە. لەسەر فەرمانی هەر ڕەوا و ڕەوان، حەسەن بەگیان کێشایە پای دیـوانی وان و دوای تۆژینەوە و لێ پرسینەوە، پەتیان خستە مل و بە داری ناوحەساری سـەرایانەوە هەڵواسـی و لـە پاش جەزرەبە دان و خنکانی، فەرمانی مەزنایەتی برادۆست بۆ عەلی بەگ دەرچوو.

## عەلی بەگ کوڕی غازیقران

لەسەر پەسندی حوسێنپاشا، لە ئاستانەی بەرزی سوڵتان سەلیمخانەوە عەلی بەگ بە فەرمانڕەوا داندرا. چەند ساڵێك بوو مەزنایەتی دەکرد، هۆزی برادۆست ڕوویان لێ وەرگێڕا و حەزیان دەکرد ئەولیا بەگیان بە سەر ڕابگا. ئەولیا بەگ ڕەوانەی ئاستانەی سوڵتانی خوالێخوشبوو بوو، داوای جێگەی عەلی بەگی کرد.

لەو کاتەوە کە خوسرەوپاشا ورمێی گرتبوو، دابوویە دەست ئەسکندەر بەگی شامحەمەد. برادۆستیان لە عەلی ساند و ئەسکندەریان لە ورمێ دەرکرد و عەلیبەگیان لەجێ دانا. ئەسکندەر بەگ لە دوای ئەوەی لە سەر ورمێ وەلا برا، فەرمانبەری نایە لاوە و گۆشەگیری پەسند کرد و خەریکی نوێژ و ڕۆژوان بوو. عەلی بەگیش لە دوای ساڵێك کە ورمێی خوارد، پێمیردی خودا لە دوی نارد و بە دووگەزە خاکی ئەسپارد؛ هیچ نێرینەشی لێ نەکەوتەوە.

## ئەولیا بەگ

کوڕی بداغ بەگ، کوڕی شامحەمەد بەگ

ئەگەر بابی مرد گچکە بوو، لە بەر ئەوە مەزنایەتی بنەماڵە تا چەند ساڵێك کەوتە دەستی پسمامانی. بەڵام کاتێ کە پێگەیی، ژیانی منالی دادواوە و سیایی کالّی کوژاوە؛ بە خودا هات و بووژاوە. سەر و سیمای مەردانەی و کروکاری پیاوانەی، دڵی خەلکی بۆ خۆی کێشاو هۆز و خزم و کەس -سەر لەبەر- پەنا و هانایان بردەبەر بارەگای دنیا پەسیوی سوڵتانی خودا بەخشیو و لالانەوە و پاڕانەوە کە ئەولیا بێتە سەریان و سەرداری هەر بەو ڕەوایە و کەسیتر بە کاریان نایە. سوڵتان نیازی ڕەوا کردن و ساڵی ٩٨٥.ك (١٥٧٧.ز) عەلی بەگ لە میرایەتی خرا و مەزنایەتیەکە بەو درا.

ئێستا کە مێژووی کۆچی ساڵی هەزاروپێنجە، میرایەتی سۆمایە دەبەر دەستی ئەو دایە.

## دەستەی دووەم

# فەرمانڕەوایانی تەرگەوەڕ و قەڵای داود

### ناسر بەگ

### کوڕی شێر بەگ کوڕی شێخ‌حەسەن بەگ

سوڵتان ئەحمەد ناوێک -کە دەبێتە باپیرە گەورەی مەزنەکانی مەرگەوەڕ- لە زەمانی خۆیدا مەرگەوەڕی لە برادۆست دابڕیوە و خۆی بە سەری ڕاگەیشتووە و دەستا و دەست هاتووە هەتا بە ناسر بەگ گەیشتووە. دەوەختێکدا کە من بە نووسینی ئەم چەند ڕووپەڕە بێ سەرەوبەرانەوە خەریکم، هەر ناسر بەگ فەرمانڕەوای مەرگەوەڕە. پیاوێکی زۆر بوێر و سەرگەرم و بە خۆوە ژیوە و دنیای زۆر دیوە و تەمەنی لە هەشتا تێپەڕیوە. لەسەر کێشەی کەوشەن و سنوور، هەرای دەگەڵ هۆزی دێری بەرپا کرد. ئەوانیش سەر بە زەینەڵ بەگی هەکاری بوون و دەگژ یەك ڕاچوون و سەد کەسێك لەو ناوەدا کوژرا.

سەروەختێك وڵاتەکەی بەجێ هێشت و خۆی گەیاندە شاتۆماسب. زەینەڵ بەگی هەکاری بە نەیاری ناسر بەگ، شێر بەگی کوڕی لێ هانداو سۆمای بۆ لە مەرگەوەڕ جیا کردەوە و بە ناوی سنجاق بە سەریەوە دانا. شێر بەگ چونکە بێ دڵی بابی خۆی کرد، بەهرەیێکی لە ژیان نەبرد و بە نەخۆشی چاوقووڵکە مرد.

لە پاش شێر بەگ فەرمانڕەوایی مەرگەوەڕ کەوتە دەستی زەینەدین بەگ، کە پسمامێکی شێر بەگ بوو. ئەویش لە جەنگی قزڵباش لە سەعدابادی لای تەورێز -وێڕای میر وبەگلەرانی کوردستان- لە مەیدانی شەڕدا کوژرا و ناوچەی مەرگەوەڕ دووبارە وەدەست ناسر بەگ کەوتەوە.

پیاوێك بە ناوی خدر بەگ خۆی لە ناسر بەگ خۆش کرد و پەنای بە سوڵتانی ڕەحمەتی برد و مەرگەوەڕی بە سنجەق ئەستاند. ناسر بەگ دەسەریەوە نەچوو؛ لە تۆڵەدا گیانی

شیرینی لێ ئەستاند! پاش خدر درا بە یوسف بەگ. دوای یوسف کەوتە دەست شامحەمەد بەگ. ئەوجار دایان بە حوسێن بەگی شێخ حەسەن بەگ و ئێستا بۆتەوە هی ناسر بەگ.

ناسربەگ بابی هەشت کوڕ بوو: شێربەگ، یوسفبەگ، قەرەخان، ساروخان، شامحەمەد، تەیموورخان، حوسێنی و حەیدەر. وەك باسمانکرد شێربەگ بە چاوقوولکە مرد. یوسف و تەیموورخان خدر کوشتنی. سارۆخانیش بە دەستی حوسێنی برای بە کوشت چوو[1].

---

[1]- نازانین چارەنووسی ئەو میرنشینیە پاش ناسر بەگ چی لێ هاتووە؛ بەلام ئەوەی ئەمین زەکی و حوسێنحوزنی لەو بارەوە نووسیویانە پوختەی دەکەینەوە و دەیخەینە بەر چاو:

**ئەمیرخانی یەکدەست**

ئەمیر (قەرەتاج؟) کە یەکدەستیان پێ گوتووە زۆر دۆستی شاتۆماسب بووە و ورمێ و شنۆی پێ سپاردووە. لە دوای ئەوەی کە میرەکانی کوردستان پەنایان بە عوسمانی برد، ورمێ و شنۆ دران بە شامحەمەد بەگی برادۆست. ئەمیرخان سەری بۆ نەچەماند و چووە ژێر دالدەی میرعومەر بەگی سۆران و لە شەڕێکدا کە بۆ ئەوی دەکرد، دەستێکی پەڕی.

ڕۆژگاری شاتۆماسب میری سۆران عومەرناویان نەبووە؛ عومەر بەگی دەرەتەنگ و باباعومەری کوڕی سەیفەدین مکری هەن کە ژیننامەشیان نازانین. هەروەها ناوی میرقەرەتاجمان بە بەر چاودا نەهات. زۆر وێدەچێ قەرەخان کوڕی ناسر بەگ بێ و لە نووسیندا بۆ قەرەتاج وەرچەرخابێ. حوزنی لە سەری دەڕوا و ئەمین زەکیش هەر لای وایە کە لە دوای ئەوەی شاعەبباس هاتە سەر تەخت و ئازربایجانی لە عوسمانی ساندەوە، ئەمیرخان چووە لای و شا زۆری ڕێز لێنا و دەستێکی زێڕی بۆ دروست کرد و نازناوی چنگزێڕی دایە و قەلای مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ و شنۆ و ورمێ و سەرۆکایەتی هۆزی برادۆستی خەلات کرد و بەرێ کردەوە.

ئەمیرخان قەلای ورمێی پەسند نەکرد و لای وابوو لە بەر هێرشی نەیاراندا خۆ ناگرێ؛ بنیاتی قەلای دمدمی داڕشت کە سێ فرسەخ لە ورمێوە دوورە. یەکجار پتەوی دامەزراند و چەند قەلایچەشی دەناودا دروست کردن و عەنباری ئازووقە و عەنباراو و پاسگەی دیدەوانانی ساز کرد و دژێکی بۆ پاراستنی ناوەکەو ئەندەروونێکی زۆر قایمی بۆ خۆی و ماڵ و منداڵی لێ هەلخستەوە. هەر لەو ڕۆژەوە کە دەستی بە داڕژتنی هیمی قەلا کرد، ئەمیرە شیعە مەزەبەکان کەوتنە بەربەرەکانی و لای شا بۆیان تێدەچاند و تەنانەت پیربداغ بەگی فەرمانڕەوای ئازەربایجانیش کلکی تێخست و دنەی شای داکە نەهێڵی پرۆژەی قەلا سەر بگرێ؛ بەلام ئەمیرخان گوێی بە دوو زمانی سۆزمانان نەدا و فەرمانیشی پشت گوێ خستن و ڕانەوەستا تا قەلای سەرگرت.

هەر لەو سەروبەندەشدا نزیکەی بیست هەزار کەسێك لە جەلالیان لە بەر قویوچی مرادپاشای ←



← عوسمانی ڕەوین و پەنایان بە ئێران هێنا. شا فەرمانی داکە دەهەزاریان بچنە برادۆست و حەسەنخانی ئیستاجلووی والی هەمەدانی بە لەشکرێکەوە دەگەڵ ناردن و ڕایسپاردەلای ئەمیرخان کە دەبێ ئەو جەلالییانە لە لای خۆی جێ بکاتەوە. ئەمیرخان لە ترسی ئەوە کە نەوەك هۆزەکەی خۆی بکەونە تەنگانەوە، سەرپێچی لەو فەرمانە کرد و دەگەڵ قزلباشەکانی شادا بە شەڕ هات و زۆریشی زیان پێ گەیاندن. شا کە زانی ئەمیرخانی لێ یاغی بووە، لەشکرێکی زۆری کۆ کردەوە و لە ٢٦ی شابانی ساڵی ١٠١٧.ك (٥ی دیسامبری ١٦٠٨.ز) بە سەرکردایەتی ئیعتمادوددەولەی وەزیر ناردیە سەر ئەمیرخان.
چەند نامەیەك لە ناودا ئاڵ و گۆڕی کرد و داوای لێ کرا کە بێتەوە بەر فەرمان و قەلا چۆڵ کا. بەلام خان چونکە زۆری دەقەلاکەی خۆی ڕادەدی، گوێی بە گەف و هەڕەشە نەدا و لە قەلادا حاسیە بوو. لەشکری ئێران دەوری داو ماوەی چوار مانگ شەڕیان دەگەڵ کرد و زۆریان خوێن بەخت کرد و چیان بۆ دەگەڵخان نەکرا. لە ئەنجامدا سەرچاوەی ئاوی قەلایان دۆزیەوە و ئاویان لێ بڕی و دەوروەدراوان بیست و یەك ڕۆژ ئازاری تونیەتیان کێشا و بە گەناوانیان ڕادەبوارد. بەلام عاسمان کۆمەگی کرد و بارانەیەکی بە خوڕەم باری و عەنباراوی پڕ کردنەوە. سەرکردەی لەشکری ئێران کە زانی بە ئاو بڕین چی بۆ نەکرا، فەرمانی پەلاماردانی داو گوتی کەس نابێ تا نەمرێ دەست لە هەلمەت بردن هەلگرێ. لەو هێرشە هەموانیەدا یەکجار زۆریان کەلاك داو خوشین هەتا گەینە بن دیواران و لە ناو دژداران و هێرش بەراندا شەڕی زۆر گران و بە سام قەوما و چەند مانگێك هەر لێکیان داو خوێنی یەکتریان ڕژاند و ئاخری قزلباش توانیان بورجێك لە قەلا بگرن. ئەو بورجە قەرەبەگ و پیاوەکانی پاسداری بوون؛ هەموویان کوژران. بە گرتنی ئەو بورجە قزلباش گورج بوونەوە و دژداران توزێك دژدامان. پاش ماوەیەك ئەو قۆنگرەش کە پیربداغ دژداری بوو، کوڕی ئەمیرخانیش دەگەڵ پارێزگارانیدا بوو، کەوتە دەست قزلباشەوە. کەم کەم هێزیخان کەم دەبوو؛ گوللە تۆپ و بەرە تفەنگ -کەی کەم ئێستەی کەم- بە سەر کوردانەدا دەباری و لە لایەکیشەوە زۆر لە پیاوەکانیخان کە تالانی قزلباشیان دەست کەوتبوو، بەو دەسکەوتەوە ڕۆیبوون و نەگەڕابوونەوە. لەو دەمەشدا ئیعتمادوددەولەی سوپاسالاری هێرشبەران مردبوو، محەممەد بەگی بێگدلی هاتبووە شوێنەکەی.خان دەیزانی هەتا سەر خۆی بۆ ناگیرێ، نامەی بۆ بێگدلی نووسی و پێی ڕاگەیاند کە ئەگەر بەلێنم بدەنێ نەمکوژن هەتا چاوم بە شا دەکەوێ، قەلاتان بۆ بە جێ دێلم. بێگدلی ئەمەی پێ خۆشبوو. خان هات و بوو بە میوانی و لە ناو خێوەتی بێگدلیدا پەزیرایی لێ کرا.
حەسەنخانی ئیستاجلوو زۆری ڕك لەخان هەلگرتبوو؛ کاتێ بە هاتنی زانی، بە محەممەد بەگی بێگدلی گوت تۆ میرخان و پیاوەکانیت لە یەك جێگەدا داناون چۆن ناترسی؟ باشتر وایە لە ناو سوپاگەدا بلاویان کەی. بێگدلی لە سەر قسەی ئەو، پیاوەکانی بە ناو خێوەتاندا دابەش کردن و ئەمیرخان و چەند هەوالێکی لە خەیمەی خۆیدا هێشتنەوە.خان ئاودالی موکری و پیاوەکانی وەبەر خێوەتی ئەلیاس خەلیفە کەوتن و هێشتاش بۆ خۆی لە سەنگەرێ دەر نەچووبوو. کاتێ کە هاتەوە و دیتی، واخان ئەبدال و پیاوانی هەر ←

---

→ بە چەکەوە ماونەوە؛ دەشیەویست لە ناویان بەرێ. دەنۆکەری خۆی ڕاخوڕی کە بۆ هێندەگێژ و وێژن؟ چۆن ئەو میوانە بەڕێزانە لە ماڵی من هەر بە چەکەوە دانیشتن و ماندوویان نەحەسێتەوە. وەرن ئەو چەکانەیان لێ وەرگرن.خان ئاودال زانی بە دڵپیسی وا دەڵێ و شتێکی دەبن سەردا هەیە. ئامادەنەبوو نە خۆی و نە پیاوەکانی چەك دانێن؛ بەڵام ئەلیاس خەلیفە دەستی بەر نەدا و هەر سوور بوو کە چەکیان لێ وەرگرێ. خان ئاودال لێی ڕاپەڕی و بە شیر لەت و پەتی کرد و پیاوەکانیشیان هەموو کوشت و بەو هەرایە قزلباش هاروژان و دارژانە سەر شەڕکەرانی موکری و برادۆست و سوپاگە بوو بە شەڕگە و هەر دوك لا شیشانە گیانی یەکتری و هەموو پیاوەکانی موکری و برادۆست لە شەڕدا کوژران و ئەو پاڵەوانە بێ هاوتایەش دوایی بە ژیانی هات. جەمیل

ئەمین زەکی لە ڕووپەڕ ۱۸۸ *تاریخ کورد و کوردستان*، تەرجەمە عەرەبیەکەی محەمەدعەلی عەونی، چاپی بەغدادا دەڵێ: ئەمیرخان دەگەڵ عومەر بەگی سۆران بە شەڕ هات و دەستی پەڕی. ئەمە پێچەوانەی پەراوێزەکەی پێشووە کە گوتی شەڕی بۆ عومەر بەگ دەکرد و دەستێکی دۆڕاند. هەژار

## ئولوغ بەگ

ڕەنگە کوڕی میرخدر، کوڕی ڕوستەم، کوڕی باباعومەر، کوڕی سەیفەدین موکری بووبێ

لە پاش ئەو کارەساتە جەرگبڕە کە بوو بە لەککەیەك بە سەر ناوچاوانی مێژووی جیهانەوە، ئەمیر قوبادخانی بێگدلی برای محەمەدخانی بێگدلی سوپاسالاری عەجەم، بەسەر قەڵای دمدم ڕادەگەیشت. حەوت ساڵانی خەڵکی ئەو ناوچانە بە جۆرێك چەوساندەوە کە لە پەڕ و پۆی کردنەوە. لەم بەینەشدا هۆزەکانی برادۆست بووژابوونەوە و بە بیری تۆڵە و ڕزگار بوونەوە دەژیان. پەریزادخاتوونی ژنی ئەمیرخانی لەپزێڕین، لەم ماوەیەدا هەر لە دمدم بە نهێنی دەژیا و کارەکەری ماڵانی دەکرد و چاوەنۆڕی هەلێك بوو کە تۆڵەی بۆ بسەنرێتەوە.

ئولوغ بەگ لە میرانی برادۆست و خزمی نزیکی خانی لەپ زێڕینیش بوو. لەوساوە پەرەوازە ببوو، دوور لەو ناوە دەژیا. پەریزاد خاتوون لە پەستا نامەی بۆ دەنارد و دنەی دەدا کە دەستێك لە قزلباشان بوەشێنێ. ئولوغ بەگ خۆی لە دەوری قەڵا داگرت و لە دەرفەتێك دەگەڕا. ڕۆژێك قوباد بە نیازی ڕاو لە دژ دەرکەوت و ئولوغ خۆی دەناو پاشماوەی دەژداران هەڵکرد و دەستی کرد بە قەڵت و بڕیان و دوابڕاوی کردن. قوبادخان کە ئەمەی زانی بە هەڵەداوان هاواری بۆ ئەمیرئاغا سوڵتانی مەراغە نارد و ئەویش پیربداغی حاکمی تەورێز و شێرسوڵتانی فەرمانڕەوای موکوریانی بە هیمدادەوە نارد و دەوری قەڵایان داو ئولوغ بەگ کەوتە خۆ کە دەگۆیان ڕاچێتەوە؛ بەڵام بەختی چەوتی هێنا و لە کاتێکدا کە جبەخانەی بە سەر پیاوانیدا دەبەشیەوە، ئاگر بەر بووە باڕوتەوە و عەنباری فیشەك تەقیەوە و گڕ دەسەر و چاوی هاڵا و خۆی و زۆربەی پیاوەکانی بە سووتان شپرزە بوون و سووتمانەکە پرزەی بڕین و چاری ناچار بە نیوەشەو بە برینەوە لە قەڵایە هاتنە دەر و بە هەڵاتن چارەسەری خۆیان کرد. ئیتر پارێزگارێك بۆ دژ نەما. جەمیل

# بەندی پێنجەم
# فەرمانڕەوایانی مەحموودی

ئەو کرکارانەی تیسکی پەستواوی کولکەی مێژوویان ڕێك پشکنیوە و بەشی کراوی بە سەر ددانەی شەی لێکدانەوەی وردیان داداوە و چەند کەلووی خاویان بە لوولدراوی لێ هەڵپێچاوە و بە سەر نەتەرەی بنووسی لووسیان کرژیان باداوە و گرمۆڵە و گلوویان لێ قرتاندووە و گرێ و گرفنچکیان لێ ڕەهاندووە و بە گلۆڵە و لوولە هەڵیانماڵیوە و ماشەری ژینی پێشینیانیان لێ هەڵوێزنیوە، سەرەتای داوی تێك ئاڵۆزاوی ڕەسەنی کۆنی ئەو بنەماڵەیان پەیدا کردووە و یەکلا کردووە و دەڵێن: فەرماندارانی هۆزی مەحموودی، سەری ئەو سەریان بە پادشایانی مەڕوانی دەگات و هێندیکیش ئێژن: دەگەڵ میرانی جزیر پسمامن.

سەروەختێك بووە لە ڕۆژگاری تورکمانانی قەرەقۆینلوو، شێخمەحموود ناوێکیان لە شامەوە یان لە جزیرەوە -بە هۆز و خزمانیەوە- هاتۆتە ئازربایجان و قەرەیوسفی تورکمانی لە قەڵای ئاشووت دایمەزراندوون و شێخمەحموودیشی دەنێو پیاوانی بەردەستی خۆیدا جێ کردۆتەوە. شێخ زۆر پیاوێکی بەجەرگ و ئازا و چاونەترساو بووە؛ لە زۆر شەڕاندا ناوی دەرکرد و سەرکردە گەلێك پتری خۆشویست و ناوچەی ئاشووت و ناوچەی خۆشابی بە میرایەتی پێ سپارد و نازناوی مەحموودی لە هۆزەکە نا. کە ئەویش نەما، مەزنایەتیەکە هەر لە جێ خۆی ما و کوڕ، کەلەپووری بابی دەسکەوت.

### میرحوسێن بەگ کوڕی شێخ مەحموود

لە شوێنی بابی بوو بە جێنشین و لە ڕۆژگاری دەسەڵاتداری ئاققۆینلوودا بەختی هێنای و ناوچەی ئەڵباقیان بۆ لە هەکاریان ساند و دەگەڵ ناوچەی خۆی تێکەڵ کردەوە. تورکمان زۆر جار کۆمەگیان دایە و عیززەدین شێریان بە هۆی ئەو شکاند و وڵاتی شەنبۆشی دەست بەسەردا گرت. عیززەدینشێر



هانای بردەبەر میـری بدلیسیٚ کە فریای کەویٚ و هۆزی مەحـموودی لە کۆڵ کاتەوە. میـری بدلیسیش لەشکری زۆری بە سەرکردەیی شێخ ئەمیـری بلْباسی بۆ هێمـدادی نـارد. میــرحوسێنیمەحــموودی ئاگای لە مەحــموودی بیـٚزەواد نـەبوو، بـە ئـارەزوو لـە سـەر گـویٚ چـەمی خۆشـاب -کـە چـەمی میـرئەحـمەدی ناوە- بەو پەڕی غلوری و سەربەستیەوە ڕایدەبوارد. شێخ ئەمیر وعیززەدین لـە پـڕ بـە سەریاندادا و خافلگیـریان کرد و لەو دەم ڕووبارە شەڕێك قەوما کـە بـە داسـتانی بگێڕنـەوە. چـرە و گوڕەی گوردی کوردان، گەردوونی سەرگەردان دەکرد. لە هەموو لاوە هەر خوێن بوو فیچقەی دەکـرد و هەر سوار بوو سەرەنگرێی دەبرد و هەر شیـر بوو بریقەی دەهات و هەر تیـر بـوو کارەسـاتی دەگێـڕا. تیـرێك میـرحوسێنی پێکا و تێکیگلاند و بەرەو نەمانی ڕەتاند و کوڕێکی بە نـاوی میــرحامید لـە پاش بەجیٚ ما.

## میــرحامید کوڕی میــرحوسێن

لە پاش کوژرانی بابی جێگەی گرتەوە و ئەویش هەر بەو جۆرە زۆر ساڵان خۆی کردەپیاوی قزڵباشـان و لە ریزی پیاوە گەورەکانیان بوو. کاتیٚ کە لەشکری مەرگ بە سەریدا داو بە تیـری گیانکێشانی پێکـا و لە رووکاری ڕۆژگاری تەرە کرد، سیٚ کوڕی بەجیٚ هێشتـن: میـرشەمسەدین، عیوەز بـەگ و میـرە بەگ.

## عیوەز بەگ کوڕی میــرحامید

لە پاش بابی کرا بە میرلیوای خۆشاب و بە سەر هۆزی مەحـموودیش ڕادەگەیـشت؛ بـە گـژ ئۆرکـەمز سوڵتاندا هات، کە بە فەرمانی شائیسماعیل کاروباری وان و وستانی بەڕێوە دەبرد. ئۆرکەمز گرتـی و لە قەڵای واندا بەندی کرد. لە گرتووخانەوە پیاوی ناردەلای شەرەفخانی فەرمانڕەوای بـدلیس و لێـی پاڕایەوە کە لەو بەندەی ڕزگار کا. شەرەفخان نامە و پیاوی ناردەلای ئۆرکەمز و داوای بەردانی عیوەز بەگی کرد؛ ئۆرکەمز بەری نەدا. شەرەفخان هەر خۆی چووە وان و لە سەر چـۆمی خرکـوم ڕۆنیـشت و داوای ئازاد کردنی کرد؛ ئۆرکەمز دیاربوو خاوە خاوی دەکرد. شەرەفخان لە داخان فەرمانی تالانی وان و وستانی بە پیاوەکانی خۆی دا. ئۆرکەمز خـمی لیٚ شێوا و لە ڕووی ناچاریەوە عیوەز بـەگی بـەردا و ناردیە لای شەرەفخان. ئیتـر عیوەز بەگ لە پاش ئەوە بۆ ماوەیەك ببـووە بەردەسـتی شائۆماسـب و



ڕەگەڵ میرەکانی قزڵباش خرابوو. ئەوسا ناوچەی ئەڵباقیش خرایە سەر خۆشاب و چەند ساڵێك عیوەز بەگ بە بریکاری قزڵباشان بە سەری ڕادەگەیشت و کاتێ کە سوڵتانی مەرگ لە قەڵای گۆڕستاندا بەندی بێبڕانەوەی بۆ بڕیەوە، پێنج کوڕی لە پاش مان: حوسێنقولی بەگ، شاعەلی بەگ، هەمزە، حەسەن و بداغ.

## حوسێنقولی بەگ کوڕی عیوەز بەگ

لە دوای ئەوە کە سوڵتان سولەیمان خانی خەزاکەر وڵاتی بدلیسی داگیر کرد، ناوچەی کارجیکانی بۆ ماوەیەك بە سنجەق دایە و لەدوایە لێی سێندرایەوە و بە دەرکراوی چووە دیاربەکر و لەوێش نەژیا و گۆڕێکی کووڕی بۆ دیاری کرا و کوڕێکی بە ناوی بایەندوڕ بەگ لە دوو ما.

## بایەندوڕ بەگ کوڕی حوسێنقولی بەگ

لەو ڕۆژەوە کە خۆیە گیراوە -لە لایەن سوڵتانی ڕەحمەتیەوە- قەڵای نوانی سەربەخۆیەی پێ دراوە و بە سنجەق بە سەری ڕادەگا.

## شاعەلی بەگ کوڕی عیوەز بەگ

لە بریکاری شاتۆماسب بۆ ماوەیەك مەزنایەتی مەحموودیانی لە دەستا بوو. حوسێن بەگی کوڕی میرە بەگ -کە میرلیوای ئالباق بوو- کوشتی و کوڕێکی بە ناوی خالید بەگ ماوە و ئێستا ناوچەی جورسی بە سنجەق دەبەر دەستدایە.

## هەمزە بەگ کوڕی عیوەز بەگ

لە پاش کوژرانی برای -لەسەر فەرمانی شاتۆماسب- خۆی و هۆزەکەی بوونە هاریکاری دەلوپیری ناوێکی قزڵباش؛ کە کرابووە میری مەحموودیەکان. لە ئەنجامدا هۆزی مەحموودی دەلوپیریان بە گیر هێنا و بەر شیریان داو هەستیان لێ بڕی و هەمزە بەگیان کردەمەزن. شاتۆماسب ناردیە سەری و بە زۆر گرتی و دەسووچی زیندانی خزاند و لە پاش سەردەمێك بەری داو دەگەڵ هێندێك لە ئاغایانی مەحموودی کردنیە پیاو و بەردەستی حاجی بەگی دونبولی.

لە ئەنجامدا هەر حاجی بەگ ئەو و ئاغا مەحموودیەکانی لە خۆیە کوشت.

## خانمحەمەد

لە پاش لەناوچوونی هەمزە، فەرمانڕەوایی مەحموودی لە دیوانی شاوە بە خانمحەمەد، کوڕی شەمسەدین، کوڕی میرحامید درا. دوای چەند ڕۆژێك شاعەلی سولتان حوسێنی فەرمانڕەوای وان، محەمەدخانی گرت و لە قەلای واندا پێوەندی کرد و سەرۆکایەتی هۆزی مەحموودی لە دیوانی شاوە بە هۆزی دونبولی درا و هەموو دونبولیەکان -جگە لە تیرەی ماملەشان- کە چەند کەسێکی کەمیان دەقەلای ئاغچەقەلادا بوون و هەروەها جگە لە هێندێك کەسیتر، کە دەقەلای خۆشاب خزا بوون- هەموویان هاتنە بەر فەرمانی حاجی بەگەوە.

خانمحەمەد هەر چۆنێك بوو خۆی لە زیندان ڕزگار کرد و خۆی گەیاندەئاغچەقەلا و گەیشتە پال مام ڕەشیەکان. مەحموودی کە پێیان زانی، کۆمەلێکیان ڕایان کرد و ئەوانیش چوونە لای خانمحەمەدی ئاغایان. چەند لاوێکی زۆر چالاك و بێباك دەگەل خانمحەمەد خۆیان بۆ گیانی حاجی بەگ دەدەسك نا و لە شەوێکدا لە پرونەکاو هەلیانکوتا سەر قەلای ئاشووت؛ کە حاجی بەگی تێدابوو. خوت و خافل خۆیان تێکرد و بە شیر و تیر تێیان بەربوون و دونبولی زۆریان لێ کوژرا و حاجی بەگ بریندار کرا و بە هەزار کێشە و گیرە خۆی لە دەستیان دەرباز کرد و بە زامداری لە ناو قەلا خۆی شاردەوە.

خانمحەمەد پیاوی نارده دیاربەکر و ڕایسپاردە ڕوستەم پاشای میری میران و پێی ڕاگەیاند کە ئامادەم سەر وەبەر باری بارەگای سولتان سولەیمانخانی خەزاکەر بێنم.

شاتۆماسب کە وایزانی، فەرمانێکی بۆ خانمحەمەد نووسی کە سەرۆکی هۆزەکەی بێ و بۆی نارد. لە دواییشدا فەرمانداری هۆزی مەحموودی لە لایەن دیوانی شاتۆماسبەوە درا بە حەسەن بەگ و خانمحەمەد بە خۆشی خۆی دەستی لەو مەزنایەتییە هەلگرت و بە ئاغچە قەلای دەساچاند و ڕۆژانەش سەد ئاغچەیتری لە دیوانی عوسمانیەوە بۆ بڕابۆوە و لە خەزێنەی دیاربەکر دەیاندایە و ڕەگەل تیپی ڕەمەکی (متفرقە) خرا بوو. لە سەر سنوورەکانی نزیك بە قزلباش زۆر ئازایانە خزمەتی عوسمانیانی کرد و زۆریش لە سەر دنیا ژیا. سێ کوڕیشی بوون: مەلیك خەلیل، میرشەمسەدین و

سەیدمحەمەد.

سەیدمحەمەد هەر لە ڕۆژگاری بابیدا مرد و پاش نەمانی خانمحەمەدیش کوڕەکانی لە سەر دژی ئاغچەقەلا دەگژ یەکتری ڕاچوون و شەمسەدین مەلیکخەلیلی کوشت و ئێستا هەر خۆی جێنشینی بابە و ئاغچەقەلای لە دەستدایە و لە ڕاستیشازۆر لاوێکی ڕێکوپێك و پیاوێکی فرە هێژایە.

## میرە بەگ کوڕی میرحامید

لە پاش نەمانی عیوەز بەگی برای، لە دیوانی قزلباشەوە کرا بە فەرمانڕەوای مەحموودی. لەو دەمەدا کە میرشەرەفخانی بدلیس و ئۆلەمەتکلوو شەڕیان بوو، میرە بەگ لە جەنگەی جەنگدا لە شەرەفخان هەلگەڕاوە و خۆی گەیاندەسوپای ئۆلەمە. پاش ماوەیەك لە لای ئۆلەمەش بوو بە دۆلمەی هەلوەشاو و هاتە بەرچاو کە ڕاست ناکا و چی وای دەباراندا نیە. کە دی خەنەی ڕەنگی نەما، بەرەو ئێرانی باداوە و لەلای شاتۆماسب گیرساوە.

سولتان سولەیمانخانی خەزاکەر بەو ئاکارانەی زانیبوو. کاتێ لە گەرمەسێری بەغداوە بۆ گرتنی تەورێز دەچوو، میرەبەگیش لەو سایەدا بۆ ژێر سایەی عوسمانیانی با دابۆوە. سولتانی هەموو دنیایە چاوەشێکی لە چاوەشانی بارەگا ناردەشوێنی. دەڵێن خاین ترسەنۆکە. ئەویش ترسا و چاوەشەکەی سولتانی کوشت و کوردەکانی بەر دەستی خۆی بۆ هەرا و شەڕ ئامادەکرد. خوێنی چاوەش بوو بە خوێنی سیاوەش و هۆردوی سەر لە بەر شلەژاند و لە هەموو لاوە هێرشیان بۆ کرد و پیاوەکانیان کوشت و خۆشیان گرت و دەگەڵ چەند هاوکارێکیدا هێنایانە بەر دیوان و هەر دەم و دەست میرغەزەبان خوستیان لێ بڕی و بە سزای ڕەوایان گەیاند.

دوو کوڕی چووکی لە پاش مان: مەنسوور بەگ و زەینەل بەگ.

## مەنسوور و زەینەل

دوای ئەوەی کە لە خەم ڕەخسین، لەو ساڵەدا کە سولتان سولەیمانخانی خەزاکەر سەفەری نەخچەوانی دەکرد، ئەو دوو برایە بە یەکەوە چوونە بارەگای شاتۆماسب و شاش ناوچەی سەکمەنئابادی سەر بە خۆی بە ناوی سنجەق دابە مەنسوور؛ کە هەتا ژیاوە لێی نەسێننەوە. زەینەل

بەگیشی لە ڕیزی پاسدارانی پایەبەرزدا دامەزراند.

لەو سەردەمەدا کە شائیسماعیلی دووەم هاتە سەر تەختی ئێران، مەنسوور بەگ چووە خزمەتی و ئاوڕی بە خێری شاهانەی بەرکەوت و گەلێکی ڕێز لێ گیرا.

لە پاش مەرگی شائیسماعیل -کە هێمنی ناو دوو دەوڵەت جێگەی خۆی بە دوژمنی داو ئاشنایەتی نێو پادشایان وەشێرا و هەرایان لێ پەیدا بۆوە- خوسرەوپاشای میری میرانی وان بەڵێنی بە مەنسوور بەگ داکە سنجاقی بارگیری بە مولکایەتی بداتێ و هێنایەوە لای عوسمانی و ناوچەی مووشیشیان بە ناوی ئالیکانەوە بۆ خستە سەر بارگیری. زەینەڵ بەگیش زەعامەتیان بۆ بڕیەوە و کاتێ مردیش دوو کوڕی بوون: هەمزە بەگ و قوباد بەگ.

## هەمزە بەگ کوڕی زەینەڵ بەگ

ساڵی ١٠٠٢.ك (١٥٩٣و٩٤.ز) لە سەر پەسندی جەعفەرپاشا، ناوچەی سندووسی سەر بە مەراغەی درایە دەست. ماڵ و ماڵات و خێڵ و خێڵاتی مەحموودیان چوونە سندووس و هەر وەك لە باسی موکریدا نووسراوە، دەگەڵ شێخ حەیدەر بە شەڕ هاتن و هەمزە و قوباد بەگی برای و سەد کەسێك لە مەحموودیان و دۆستانیان بە کوشت چوون و دار و نەداریشیان وەبەر تاڵانی موکری کەوت.

## حەسەن بەگ

## کوڕی عیوەز بەگ، کوڕی میرحامید

هۆزی مەحموودی کە ئێزدی بوون، ئەو حەسەن بەگە یەکەم میرێکە ژنۆلابەرێ پۆشمان بووە و بڕاست و ژدڵ بسڵمان بووە و لە نوێژ و ڕۆژی و حەج و زەکاتدان، گەلێك چێ بووە و کوڕەکانی خۆی فێری قورعان خوێندن و ئەرکی دین بەجێهێنان و پەیڕەوی کردنی پێغەمبەر کردووە؛ فێرگەی ئایینی و مزگەوتی زۆری لە وڵاتی خۆیدا درووست کردوون. هەر وەك لەمەوبەر گوتمان کاتێ کە خانمحەمەد کوڕی میرشەمسەدین کرا بە فەرمانڕەوای مەحموودی، حەسەن بەگ ڕای‌کرد و ڕووی کردە دەرگای شاتۆماسب. شا بە چاوی پڕ لە بەزەوە لێی ڕوانی و فەرمانڕەوایی مەحموودی و قەڵای

خۆشابی خەڵات کرد و ڕەوانەی کردەوە.

کاتێ هاتەوە، خانمحەمەدخان -وەك بەختی بە کار- بە پیریەوە چوو؛ هەر بە خۆشی خۆی مەزنایەتیەکەی بۆی بەجێ هێشت و چووە ئاغچەقەلاّ؛ کە هەر جێ و شوێنی لە مێژیان بووە و لەو قەلاّیەدا نیشتەجێ بووە. حەسەن بەگیش هیچ دەستدرێژی بۆ نەدەکرد.

لەو سەردەمایەدا کە سوڵتان سولەیمانی خەزاکەر بە نیازی ئێران داگیرکردن دەچووە ئازربایجان، حەسەن بەگ لە رووی ناچاری و بە ئەستۆلاری ڕەوانەی ئاستانەی سولەیمان بوو. هەر وەك خۆیان هێشتەوە و میرایەتی خۆشاب و مەحموودییان پێ بەخشی. ئیتر لەو رۆژەوە زۆر بە پاکی و دڵسۆزی خزمەتی پادشای دەکرد. کاتێ کە ئەسکەندەرپاشای میری میرانی وان لەشکری بردەسەر حاجی بەگی دونبولی و لە خۆیە کوشتی، حەسەن بەگ لە شەڕەکەدا گالەی کرد و بە ئازایەتی تۆڵەی دڕدۆنگی چەند ساڵەی کردەوە. ئەسکەندەرپاشاهەر چۆنی دیبوو ئاوای بە پێچکەی تەختی خەلافەت گەیاند. سوڵتانی دۆست لاوێنەوەی دوژمن تاوێنەوە، شیری زێڕین و ئەشتی زۆر هێژای بە خەڵات دایە و لە ناو هاوسایە و هەواڵانیدا سەرفرازی کرد. ساڵانە هەمبەر بە دووسەد هەزار ئاقچەی عوسمانیشی -لە بەر و بوومی زەمینەکانی تایبەتی شاهانەی سەر بە دیاربەکر، بە ناوی ئالیکانە- بۆ بڕایەوە. سەرەڕای ئەوەش فەرمانێك دەرچوو کە تا سیهەزار سەر ئاژەڵی خێلاتی هۆزی مەحموودی -کە دەچنە زۆزان و دێنەوە گەرمیان- پوشانە و سەرانە نەدەن. لە راستیدا ئەویش هەتا خوا حەزکا لە خزمەتی دەوڵەتدا سەرڕاست بوو؛ لە فیداکاری و خزمەت گوزاریدا هیچ درێغی نەبوو. خۆ نەخوازا لەو دەورانەدا کە سوڵتان مرادخانی خوالێخۆشبوو بە نیازی ئێران گرتن لەشکری ناردەسەر قزلباشان، ئیتر ئەو بەخت و خۆشیەی کە ڕووی کردەحەسەن بەگ و هۆزی مەحموودی، لە هیچ دەورێکدا هیچ میرێکی کورد ئەمەی بە خۆیەوە نەدیوە.

ئەوسا کە ئەسکەندەرپاشا لە وان بوو، پەلپی بە سوڵتانئەحمەدی فەرمانڕەوای خێزان گرت کە نابێ لە دیوانی واندا لە لای سەرووی دانیشێ؛ فەرمانی پیرۆزی لە سوڵتان سولەیمانخان ساند کە جگە لە زەینەڵ بەگی هەکاری، کەس ڕێی ناکەوێ وەلای سەرووی کەوێ. پەنجاساڵ بە سەربەخۆیی میرایەتی کرد و ساڵی ۹۹۳.ك (۱۵۸۵.ز) لە وەختی تەورێز گرتندا -کە شەڕی قزلباشانی دەکرد-

لە سەعداباد کوژرا. لە پاش سالێ کە عەسکەری هەمیشە لەسەر بە سەرداری فەرهادپاشای وەزیر بۆ هیمدادی جەعفەرپاشای میری میرانی تەوریز ڕۆیشت، پێشەی لەشیان کۆ کردەوە و هێنایانەوە خۆشاب و لە فێرگەیەکدا کە خۆی بنیاتی نابوو بە خاکیان سپارد.

سێ کوڕی لە پاش مان: عیوەز، شێر بەگ و شێخی بەگ.

## عیوەز بەگ کوڕی حەسەن بەگ

هەر لە ڕۆژگاری بابیدا -لەسەر بەڵێنی عوسمانیان- ناوچەی ماکۆی سەر بە نەخچەوانی لە چنگ قزڵباشان ڕزگار کرد و قەڵایەکی تێدا دروست کرد و بە موڵکایەتی درا بە خۆی. بیست ساڵانی بە سەر ڕاگەیشت؛ لە ئاخر و ئۆخری ساڵی ۱۰۰۲.ك (۱۵۹۳و۹٤.ز) بە هەوای داوای تۆڵەی خوێنی هەمزە بەگ و قوباد بەگی ئامۆزای، وێڕای خدرپاشای میری میرانی تەوریز، چووە سەر شێخحەیدەر و هەر وەك لێی دواین، شێخحەیدەر ئەویش و گەلێکیتریشی لە مەحموودیەکان کوشتن و خوێنی لە دەوری قەڵا ڕشتن.

## مستەفا بەگ کوڕی عیوەز بەگ

لە پاش کوژرانی بابی، لە بەزەیی دوورەبەستێنی پادشای دنیا ئەستێن، سولتانمحەمەدخانەوە، سنجەقی ماکۆی -هەر بەو دەستوورەی کە درابووە بابی- پێ بەخشرا و ئێستاکێ بە دەستیەوەیەتی.

## عەلی بەگ کوڕی عیوەز بەگ

ناوچەی ئوردوبادی نەخچەوان بۆ ماوەیەك بە دەستیەوە بووە. زۆربەی پسمامان و ئاغایانی مەحموودی لە سایەی سەری حەسەن بەگەوە زۆر خۆشیان بۆ هاتبوو. گوندی قەوغا و بەرێژەو و مووچە و مەزرای بە برەوی ئازربایجان و ئەرمەنستانیان -کە لە دەست قزڵباشان دەرێنابوو- کامی هەرە باش بوو، بەو بنەماڵە و ئەو هۆزە سپێرابوو.

پیاو لە ڕاست لا نەدا، حەسەن بەگ پیاوێکی مەرد و ڕەند و کارپەسەند و هۆزپەروەر و دادگەر

بوو. وریایەك بوو كەس لە دنیا تای نەدەكرد. لەو ڕۆژەوە كە هاتبووە بەر فەرمانی عوسمانی تا ئەو ڕۆژەی كە تێیدا مرد، هەر كارێ كە بۆ دەوڵەتی كرد: شەڕ و هەرا، ئازایەتی، چەبەهرەی بە دەوڵەت داوە، لە لایەن هۆزەكانیەوە، لە لایەن كوڕەكانیەوە، هەر خزمەتێك بەو سوڵتانانە كراوە، سەر لەبەر درشت و وردی لە دەفتەردا سیایی گرتبوو. بەرگێكیشی تێ گرتبوو. بە بەگلەر بەگ و دەفتەردارانی مۆر كردبوو. ئەوجار لەوان ترازابوو، لە وان بە قازیانەوە گەڕابوو؛ چووبووە لای هەموو میرە كوردەكان، ئەشەدەمبیللای پێ كێشابوون و بۆیان لە دەفتەر نووسیبوو، ئەوجار چووبووە لای سەردارانی پایەبەرز و دەرەجەدارانی جێگەورە و ئەوانیشی ساز دابوو؛ مۆری خۆیان بۆ پێوە نابوو. ئەوسا دەفتەری بە تەیاری ناردە بارەگای سوڵتان مرادخانی ڕەحمەتی و بە تووڕەی شاهانەشی خەملاند. ئیتر خوا بتحەسێنێتەوە، هەر جارێكی هەر كارێكی بە دیوان با، دەفتەرەبۆری دەبن‌كەوشێ دەنا و بێ بەرگر و پێچ و پەنا، ڕاست بۆ دیوانی بەرزی سوڵتانی مل لێدەنا و دەفتەری لێك دەكردەوە و كردەوەی وە بیر دێناوە. دەفتەر ببووە عاسای مووسا و هێز نەبوو خۆی لە بەر بگرێ.

حەسەن بەگ هەر بە زیندی سەری كە ماكۆی بۆ عیوەز بەگ ساند، شێر بەگی كوڕی دووەمی كردەمیری مەحموودی و خۆشاییشی دایە.

## شێر بەگ كوڕی حەسەن بەگ

پیاوێكی سەرسۆفیلكەیە و دەروێشانە هەڵكەوتووە. زۆرتری كات و ساتی بە هاونشینی مەلا و خوێندەوارانەوە ڕادەبوێرێ و خزمەتی پیر و پیاوچاكان دەكا و سەری لە ماڵی خوداش داوە. خۆراك و پۆشاكی زۆر دەدا بە دەروێش و عەبداڵ و هەژاران و هۆز و خزمانیشی زۆریان خۆش‌دەوێ و بە ئاكاری دڵخۆشن. ئێستا ئەوە دوازدەساڵە كە مەزنایەتی خۆشاب و پێشەوایەتی میرەكان و تیرەكانی مەحموودی دەبەر دەستی ئەودایە.[1]

---

١- ئەمین زەكی دەڵێ ئەو میرنشینیە لە پێشدا ببووە دوو جون و لە چەرخی دەی كۆچیدا سێ بەش بوو؛ هەتا ناوەڕاستەكانی دەورانی عوسمانیش هەر مابوون. لە ئەولیا چەلەبیەوە دەگێڕێتەوە كە: ئەم ئەمارەتە لە سەد تیرەی زۆر بە هێز پێك هاتووە و لە دەمی هێمنایەتیدا شەش هەزار چەكداری هەیە. لە هامریش دەگێڕێتەوە كە: ساڵی ١٠٤٩.ك (١٦٣٩.ز) عەلیپاشای حاكمی ئاشووت (ئاشیت) میریان بووە و قەرەمستەفاپاشای سەرەك ←




→ وەزیری عوسمانی لە ناوی بردووە. بە داخەوە نازانین شێخی بەگی کوڕی حەسەن بەگ چی بە سەر هات. وێدەچێ لە شەڕی قەڵای دمدم کوژرابێ. جەمیل

# بەندی شەشەم

## فەرمانڕەوایانی دونبوڵی[1]

ئاش وەستایانی ئاسیاوی ڕووداوی بێوەستان، لە کۆرەگە و پەڕە و تۆپ و تەنبوورەی سەربهوردی دوورەوە پێدا هاتوون، تەوەرە و شیش و بستە و گردەڵە و مورووی سەرگوروشتەیان دابەستووە و لە داشکستانی داستانی کەوناراوە -بە تێبینی و بە سەنگینی- سەنگ ئاسیاوی دۆز و ئاوەزیان وەسەر خستووە. بە فرکەی ئاوی دۆڵی بنووس، زەنبوورەی نووکی لەبار دادراویان وەگەڕ خستووە و وێژەی بێژراو و گێژە و کراوی بێ گورگە و زیوانی هۆڕی زمهەڕی ئاشێرەکانی خەت و دێڕانیان لە سەر بانیژەی تژەی مژیەوە بە کەویژەدا لووزەو پێداوە و بە دەم چەقەنەی زمان و داندا بە ڕیز خزاوە و لە گەروولەوە خولی پێدراوە و لە سەر پەڕانی بست و گوێڵپانی بیراز کراوی لە وازەداری پێ لێ داخرا و لێیان کردووە و مزە و تۆزاشی وشەگەل باشی بە پێز و پشتیان لە زۆرباراشان جیا کردۆتەوە و بە کاسەی پەلك و پسوولەی کەپوولە وەریانگێڕاوە و ئەوهایان لە هێڵەگ داوە کە: میرەکانی هۆزی دونبوڵی باپیری زوویان عارەبی شام بووە و هێندێکیش دەڵێن لە بنیچەدا خەڵکی جزیرن و کەوتوونە ئازربایجانەوە و هەمووش لایان وایە ئاوی عیسا بووە.[2] پادشایانی ڕابردو سەگمەنئابادی لای خۆیان

---

١- *قاموس المحیط*، ج٣، ل٣٧٧ دەڵێ: دونبوڵ لە سەر کێشی قونفود، هۆزێکی کوردی لای مووسڵن. ئەحمەد کوڕی ئەمیر و عەلی کوڕی ئەبوبەکر -کە هەردوکیان حەدیسەوان بوون- سەر بە هۆزی دونبوڵین. جەمیل

٢- ڕەنگە میرعیسای کوڕی میریەحیای نیاز بێ کە بە سەلاحەدینی کورد بە ناوبانگ بووە و لە چاخی خۆیدا سەدهەزار ماڵی لە کوردی یەزیدی بەرەو ئازربایجان و قەهستان (کۆهستان) هێناوە. ئەمین زەکی لە کتێبی *آثارالشیعة الامامیە*وە دەگێڕێتەوە کە بنکەی هەوەڵی، شاری تەوریز بووە و ماوەیەکیش بوەتە وەزیری هارونەڕەشید. لە *ریاض الخلد*ی تاریخی دونبوڵیانیشەوە -کە عەبدولڕەزاق کوڕی نەجەفقولی داینـاوە- ڕادەگوێزی و دەڵێ: یەکەم میری دونبوڵی تاهیر، کوڕی میرعیسا، کوڕی میرمووسای حاکمی شامە؛ کە وەك دەڵێن ئەو مووسایە کوڕی یەحیای بەرمەکی وەزیری هارونەڕەشید بووە. زۆر وێدەچێ ئەمە ڕاست بێ چونکە مووسای کوڕی یەحیای ←

بە ئاورگانە داوەتێ.[1] ماوەیەك لەوێ ژیاوە و بەرە- بەرە هۆز و تیـرەی لێ هاڵاوە و هەڵیداوە.

دونبوڵیەکان لە بەرێدا سەر لە بەریان یەزیدی بوون. لە دواییدا میـرەکانی عیسابەگی و هێنـدێك هۆزی نزیك بە وان، لەو ئۆلە پاشگەز بوونەوە و خۆیان کردەسوننی مەزەب؛ بەڵام هێشتا زۆریان مـاون

---

← بەرمەکی لە هەراکەدا ناوی نیە و نازاندرێ چی بەسەر هات. دەبێ ئەو میـر عیسایەی ناو شەرەفنامە، ئەوەی ئەو عیسای مووسایە بێ، نەك هەر خۆی بێ؟ چونکە مەودایان زۆر لێك دوورە.

ئەمیـن زەکی دەڵێ: ئەو هۆزە زۆر تیـرەی لێ بوونەوە و لە هەمووان بەناوتر بەرەی یەحیا و بـەرەی شەمـسەکی -کـە دەچنەوە سەر شەمسولـمەلیك جەعفەر و بەرەی عیسابەگلووی سەر بە میـرعیسا و بەگزادەی بـەرەی میـرفەرەیدون و ئەییوبخانی و هیتـریش، لە ڕۆژگارانی بەرێدا لە لایەن پادشایانی وەك مەئموون و تەیموورلەنگ و سوڵتان سەلیمەوە بەرەو کاشان و خوراسان و خبوشان و شیـروان و گەنـجە و قەرەباغ و قەرەجەداغ و شوێنیتر ڕاونراون و دوور خراونەتەوە و ئەم هەموو لکانەیان لێ بۆتەوە.

وا ئێمە بە سـەر چڵی ژیننامـەی چـوار میـری بـەر لـە میرعیسـا، لـە ئەمیـن زەکیـەوە دەگێڕینـەوە. ئـەو لـە *مشاهیـرالاکراد*دا دەڵێ: میـرمـحەمەد -یان ئەحـمەد- چوارەمیـن میـری ئەو بنەماڵە، حاکمی شام بووە و لە پاشان لە وڵاتـی هـەکاری چـەند قەڵایـەکی گرتـووە و سـاڵی ۳۸۷.ك (۹۹۷.ز) لـە قـەڵای بـە ناوبـانگی بـایدا مـردووە. میـرسولەیـمانی کوڕی بۆتە جێنشینی و شێخی سەر بەرماڵیش بـووە و کوردەکـانی نـاو کوردسـتان و ئازربایـجان و شامی کردوونە مریدی خۆی و قەڵای زۆر و دام و دەزگای زۆر گرینگی ئیـجاد کردوون و لە هەمووان ناودارتریان سەرای سولەیـمانیەیە، کە لە چیای سنـجاری کردووە. فێرگە و تەکیەی زۆریشی بۆ پەیڕەوانی دامەزراندووە و چەند کتێبیشی داناون و ساڵی ٤١٠.ك (۱۰۱۹.ز) مردووە و میـرجەعفەری دووەم -کە کوڕی بوو- جێی گرتۆتەوە و کـانی زێـڕی لـە چیای ژەنگار پەیدا کردووە و ساڵی ٤٤١.ك (۱۰٤۹.ز) مردووە.

بەڵام ئاخۆ جەعفەری یەکەم کێ بووە؟ ئەمیـن زەکی دەڵێ: دەبێ جەعفەری بەرمەکی بەناوبانگ بێ. من پـێم وا نیـە؛ چونکە نێوانیان زۆر بووە. وادەزانـم میـرجەعفەری کـوڕی ئـەو میـرحەسەنەیە کـە پیـاوێکی زۆر بـەهێز بـووە و لـە خەلیفەموعتەسەمی عەبباسی یاغی بووە و دوو جارانی بەگژدا چووە و جاری پێشوو لە چیای داسنیانیان شـکاندووە و جاری دووەم بە سەرکردەیی ئیتاخ لەشکری زۆری ناردۆتە سەر و دەورەیـان داوە و نزیـك بـووە بـە دیلـی بگـرن، خـۆی دەرماندەو کردووە و پێ مردووە و مردنەکەشی ساڵی ۲۲٦.ك (۸٤۱.ز) بووە. بڕوانە ۱/۱٦۸ مشاهیـرالاکراد. بۆیەش ئەمە بە دوور نازانـم چونکە ئەو ئەمیـرە لە چیای داسنیان بووە. کەوابێ یەزیدیە و دونبوڵیش یەزیدین.

سێهەمیان میـریەحیایە کە ئەمیـن زەکی دەڵێ: سیهەزار ماڵی فەلە دەبەر دەستدا بووە و هەزار و دووسەد تەکیەی لە ناو چیاکانی کوردستان و قەهستاندا دروست کردووە و ساڵی ٤٧٧.ك (۱۰۸٤.ز) مردووە.

بەڵام سەیرە ئەمیـن زەکی دەڵێ: شەرەفـخان وا دەڵێ و شەرەفنامەش باسی چمیـر یەحیایانی نەکردووە. جەمیل

۱- ئەو پادشا ڕابردووە دەبێ سەلاحەدین ئەییووبی بووبێ. شازادە نادرمیـرزای قاجار -کە باسی دونبـوڵی دەکـا- لـە ابوالفیدا دەگێڕێتەوە و دەڵێ: دونبوڵیەکان پیاوی سەلاحەدین بوون و شەڕیان لە سەر دەکرد. جەمیل

کە دەست لە یەزید بەر نادەن و وازیان لێ نیە لێی لادەن!

لە مەڕ ڕەسەنی دونبوڵی ئەوی لە هەمووان ڕاستتر بێ ئەوەیە کە: ئەو هۆزانە ڕۆژگارێک لە لای بۆختی[بۆتان]ەوە هاتوون و کورد دونبوڵی بوختیان پێ دەڵێن.[1]

## شێخئەحمەد

لە دەورانی تورکمانی ئاققۆینلوو، شێخئەحمەد بەگ لە کوڕانی عیسا بەگ، قەڵای بای و هێندێک وڵاتی هەکاری لەو تورکمانانەوە پێدراوە و زۆریان لەلا خۆشەویست بووە.[2]

دێرزەمانێ دژداری بای و مەزنایەتی دەوروبەری هەر لە دەست دونبوڵیاندا بوو. شێخئەحمەد کە مرد، دوو کوڕی بوون: شێخئیبراهیم[3] و شێخبەهلوول.

## شێخبەهلوول

لە سەر سپاردەی بابەکە، شێخبەهلوول بوو بە جێنشین[4]. ئەویش ماوەیەك دنیای خوارد و کۆچباری

---

١- ئەمین زەکی دوو میری خستوونە نێوان میرعیسا و شێخ ئەحمەدەوە کە لێدوانیان بێ بەهرە نیە:
یەکەم: میرجەعفەر شەمسولمەلیك هاوچەرخی میرمەنووچێهری شیروان بووە؛ ساڵی ٥٣٥.ك (١١٤٠.ز) مردووە. شاعیری بەناوبانگ خاقانی شیروانی زۆری پێ هەڵگوتوە.
دووەم: ئەمیر بەگ هاوچەرخی سوڵتان سەنجەری سەلجووقیە کە سەنجەر لە ٥١١-٥٥٢.ك (١١١٧-١١٣١.ز)دا فەرمانڕەوا بووە. زۆریشی ئاوایی لە شاری خۆ بەجێ هێشتووە و ساڵی ٥٩٠.ك (١١٩٤.ز) مردووە. جەمیل

٢- ئەمین زەکی بە میرئەحمەدخان کوڕی ئەمیر بەگی ناو دەبا و دەڵێ: دارایی زۆر و ناوی چاکەی زۆرتری لە پاش بەجێ ما؛ حەزی لە زانست دەکرد و ئەدیبی زۆر خۆش دەویستن. مەولانا جەلالەدین ڕۆمی خاوەنی کتێبی بەناوبانگی مەسنەوی، لە لای ئەو بووە و لە هەموو کەسی لێ نزیکتر بووە. لە چیای سنجار لە گوندی بابا، عەمری خودای کردووە.

٣- لە تەورێز دەبوو؛ دەگەڵ چەنگیزخان دۆست بوو. وڵاتەکەی لە بەڵای مغولان پاراست. ساڵی ٦٩٢.ك (١٢٩٢.ز) مرد. ئەمین زەکی دەڵێ: کوڕێکی بە ناوی جەمشید بەگ هەبووە و بۆتە جێنشینی و لە چیای هەکاری دەگژ مغول ڕاچووە و ساڵی ٧٢٥.ك (١٤٢٢.ز) غازانخان لەشکری ناردۆتە سەر و لە چیای چلەخانە کوژراوە و لە گوندی سیابای نێژراوە.

٤- ئەمین زەکی دەڵێ: کوڕی جەمشید بەگە و میری تەورێز بووە و ساڵی ٧٦٠.ك (٣٥٩.ز) مردووە.

بۆ گۆڕستان نارد و حەوت کوڕی لە پاش بەجێ مان: جەمشید بەگ[1]، محەمەد بەگ، خالقوێردی بەگ، حاجی بەگ، ئەحمەد بەگ، ئیسماعیل بەگ و جەعفەر بەگ.

## حاجی بەگ کوڕی شێخبەهلوول بەگ[2]

جیا لە پەیوەندی دێرینی بە ماڵە سەفەویەوە، دڵسۆزی بە تینی دەربارەی شاتۆماسب کردەسەربار و لە دەرباردا وەك خۆشەویستێك ڕێدرا و شاری خۆی لە لای شاوە بۆ خرایە سەر سەگمەن ئاباد و دایانە دەستی و نازناوی سوڵتانی پێدرا و لەو ساوە بوو بە حاجیسوڵتان. دەبوایە سنووری وان و کەوشەنی ئێران -بە دونبوڵیان- لە ڕۆمیان بپارێزێ.

دونبوڵیەکانی حاجیسوڵتان -کە هەموو چۆڵپەرست و کێوی بوون- لە سەربزێوی سەریان دەخورا و هەرگیز شاری ئاوەدانیشیان دەخەونیش نەهاتبوو. وە ناو شاری خۆی سەربەخۆیان کەوتن و هەر کەسە خۆی بە گۆدەرز و گیو و سامی نەریمان نەدەدا و بە لووتبەرزیەوە بافیشیان دەکرد کە ئێمە بووینە لەمپەر و لە بەر عەسکەری ڕۆمەوە ڕاگیراوین و خوێن بەهامان، شا خۆی، شاری خۆی پێداوین.

بە فیز و بایی بوونەوە بەرێوە دەچوون و بە تیز و پلارانەوە ئاوڕیشی مەردم دەبوون و بە دەردی کاورا کوردەکە، لە تووشیەوە تووشی کەر و تۆشە خۆشەی ناو بار دەبوون. وەکی مامۆستا فەرموویە:[3]

| | |
|---|---|
| کوردێ کەری ون ببوو لە کابە | قیڕاندی لە عارەبان کە یابە! |
| ئەو چۆڵە جەهەندەمە لە بەر ئاو | ڕەملە، گرەبایە، وشکە، بێ ئاو |
| بە پیادەیی فێر نەبووم وەك ئێوە | چۆن بێ کەرەشین بڕۆم بەرێوە؟ |
| توورە و بەرك و لە سەر بەهانەم | بەم خوایە کەوا منی لە خانەم |

---

١- شازادەنادرمیرزا لە کتێبی *عالمآرای عباسی* دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەم جەمشید سوڵتانە حاکمی مەرەند بوو؛ بە پێنجسەد کەسەوە دەگژ لەشکری سەنانپاشای چغالەزادەڕاچوو؛ لە بەری شکا و هەڵات.

٢- ئەمین زەکی دەڵێ: لە ڕۆژگاری ئەو میرەدا دونبوڵیەکان بوونە پەیرەوی شێخسەفیەدینی ئەردەوێلی و ئەو میرە ساڵی ٨٢٢.ك (١٤١٩.ز) مردووە.

٣- مامۆستاکە «نظامی گنجوی»ە و هەڵبەستەکە دە «*لەیلی و مەجنوون*» دایە و بەو بەیتە دەست پێدەکا:

کُردي خرکي به کعبه گُم کرد　　　در کعبه دويد و اُشتُلم کرد

| | |
|---|---|
| کێ بێتە بەرم، دزی کەرم بێ | گش گیانی ئەشێ وەدار نەرم بێ |
| ئەو لەم گەفەدا بوو کەر پەیا بوو | خەنیا کە بە چاری یاری شابوو |
| دەیگوت هەرەشەم فرە وەکار بوو | ئەینا وەخودا نە کەر نە بار بوو |

گوایە چەند کەسێك لە جەزایەرچی دونبولیان دەچنە دووکانی شیرینی فرۆشێك و تا گنجیان لێ دەبرێ هەلوا دەخۆن و کاتێ مر دەبن، لێی دەدەن برۆن. کابرای دوکاندار دەڵێ: کاکە دراوەکەی نادەن؟ لێی مۆر دەبنەوە و دەڵێن: ئەوە تۆ دەڵێی چی؟ شاخۆی شاری خۆی بە هەلواوە بە ئێمە بەخشیوە! جا ئەمە لە ناو تورکاندا بۆتە باو، دەڵێن: «شهر بزم حلوا بزم» واتا: شار شاری خۆم، هەلوای دەخۆم.

دیسان هەر لەوانی دەگێرنەوە کە هێندێك لەموسولمانەکانیان رۆژێکی هەینی دەچن گوێ لەخودبە بگرن؛ خودبەخوێن لە سەر رێ و شوێنی شیعەگەری بە ناوی دوازدەئیمامەکاندا دێتە خوارێ. کە ناوی ئیمام جەعفەری سادق دێنێ، دونبولیەکان توورە دەبن و بە یەکتر دەڵێن ئەم پێشنوێژە چەند نەزان و گێژە! ناوی حاجی بەگ و براکانیتری لە بیر کرد و هەر ناوی جەعفەری برا گچکەی برد. ئەو پێشنوێژەی بە سەر ناوی حاجی بەگ و برایانیدا باز بدا بۆ ئەوە ناشێ نوێژی لە پاشەوە بکرێ! زۆر شتی دیش بە گاڵتەوە لە دونبولیان دەگێرنەوە کە خۆی لێ لادەم باشترە.

پوختەی وتار، حاجیسولتان ماوەیەکی کەم و هندك کوێخایەتی شاری خۆی کرد. دوژمنایەتی زۆر کەونی دەگەڵ هۆزی مەحموودی بوو؛ چەند جار لەشکری لێ کردن و هەر وەك لەمەوبەر باسمان کرد، هیچ جارانیش چی بۆ نەکرا. لە ئەنجامدا حەسەن بەگ و خانمحەمەدی مەحموودی ئەسکەندەرپاشای میری میرانی وانیان لێ هان داو لە پرونەکاو هێرشێکی بردەسەر شاری خۆیە و حاجیسولتان بەگ و گەلێك لە هۆزی دونبولی خافلگیر کران و کوژران. حاجیسولتان کورێکی منداڵی بە ناوی حاجی بەگ لە پاش بەجێ ما.

## ئەحمەد بەگ کوڕی بەهلوول بەگ

دەپێشدا شاتۆماسب ناوچەی سەگمەنابادی پێ سپارد؛ بەلام دونبولیەکان لە پاش نەمانی حاجی بەگ، خمیان لێ شێوا و رایەڵ و پۆیان تێك هالابوو. هەلێك یاری شای ئیران و چەلێك هاوکاری رۆمیان

بوون. ڕێیەکی وایان هەڵنەبژارد هەتا سەر، لە سەری بڕۆن. بەو وازوازی و بازبازێنە شاتۆماسبیان سڵ کرد و زۆری ڕك لێ دەدڵ گرتن. لەو چاخ و سەروبەندەدا کە سوڵتان سولەیمانخانی خەزاکەر لە نەخچەوان گەڕایەوە، شاتۆماسب هەرسێك برا، ئەحمەد بەگ و ئیسماعیل بەگ و جەعفەر بەگی دەگەڵ هێندێك قزڵباشان ناردە مەڵبەندی ئەردەهان و قزڵباشی تێگەیاندن کە فلانە ڕۆژ هەر دونبوڵیەکی دەگەڵتانە لە سەری دەن و منیش لێرە لەو ڕۆژەدا هەر دونبوڵیەکی لە بارەگای بەرزی شاهی پاسەوانە، بە شیر شەق و پەقیان دەکەم. ڕۆژی ژوانی دونبوڵی قڕان، قزڵباشان لە ئەردەهان هەرسێ برا و چوارسەد پیاوی هەڵبژاردەی دونبوڵیانیان کردەکەلاك و شاتۆماسبیش لە لای خۆی، بیست سی کەسێك پاسەوانی ڕەگەز دونبوڵی خنکاندن. مەنسوور بەگی محەممەد بەگ لە ئەردەهانەوە ڕایکرد و خۆی گەیاندە ئاستانەی سوڵتانی خەزاکەر و وەبەر بەزەیی سوڵتان و ئاوڕوێدانی شاهانە کەوت.

## مەنسوور بەگ

## کوڕی محەممەد بەگ، کوڕی بەهلوول بەگ[1]

لە چاوەدێری کەس نەبوێری پادشاهانەوە، ناوچەی قتوردەرەسی[2] دۆڵی کۆتۆڵی بە سنجەق پێ بەخشرا. هەر دونبوڵیەکیش کە بەرێکەوت لە دەمی شیر ترازابوو، وە ڕێکەوتن و لە ژێر ئاڵای میری ماویان کۆ بوونەوە. هەتا ژیا مەزنایەتی کوتۆڵی کرد و کاتێ مرد، دوو کوڕی لە پاش بەجێ مان: وەلی بەگ و قلیج بەگ.

## وەلی بەگ کوڕی مەنسوور بەگ

جێگەی مەنسوور بەگیان دایە و لە ڕاستیدا پیاوێکە لە مەیدانی نەبەردیدا تاکەسوارە و بۆ ئاکاری

---

١- ئەمین زەکی دەڵێ: کوڕی بەهلوولە و ئەوەی نیە و ساڵی ٧٦٠.ك (١٣٥٩.ز) بۆتە میر و ساڵی ٧٩٥.ك (١٣٩٣.ز) مردووە و کوڕێکی بە ناوی میرمەحموود بووە و سوڵتانبایەزیدی عوسمانی زۆری خۆش ویستووە. شارۆکەی مەحموودی سەر بە وان، بنیاتی ئەوە و ساڵی ٨٢٠.ك (١٤٢٧.ز) هەر لەوێ مردووە. جەمیل

٢- کۆتۆڵ لە ئازربایجانە و لە سەر چەمی کۆتۆڵە و چل کیلۆمیتری باکووری خۆرنشینی خۆیە. جەمیل

مەردانە، بە سەربەرزی لە هەموو کەسەوە دیارە و شایانی هەموو پلە و پایەی بەرزە و هەتا دڵ دەخوازێ ئاکارتەرزە. وا ئێستە کە مێژوو هەزارویێنجە، ناوچەی کوتۆڵ و مەڵبەندی ئەبقای بە ناوی ئاگردانانەوە دەبەر دەستی ئەو دایە و لەوە تا ئەخچەوانیش گراوە، ناوچەی ئوجوق بە قلیج بەگی برای دراوە و بێ لەمپەر و بەرگر بە سەری ڕا دەگا.

## حاجی بەگ ڕۆڵەی حاجی بەگ

ئەمەنی دوو مانگان بووە کە بابی کوژراوە و وەك لە ناو کورداندا باوە، کوڕ بە ناوی باوی نەماو ناونراوە. شاتۆماسب بژیوێکی لە خەزێنە بۆ بڕیەوە. کاتێ زل بوو هاتە کایە و پلەی بەرزی پاسداشتنی شای درایە. لە هەرای سوڵتان بایەزید، ناوچەی ئەبقایان پێ سپارد و هێندێك دونبوڵی بلاوی لە دەورە هالا و دامەزرا و نزیکەی بیست ساڵ لەوێ ما. پاش نەمانی شائیسماعیلی دوەمین -کە ڕۆژگاری شاسوڵتان محەمەد بوو- لە هەلێکدا کە مستەفاپاشای سەردار لە کەناری چەمی قەنع دابەزیبوو، ئەمیرخان لە نیوەشەوێکدا هێرشی هێنا سەر عەسکەری ئیسلامەتی و حاجی بەگ و چەندەمیرێکی قزڵباشان لە ناو چەمی کوڕدا خنکاند. سەگمەناباد کە وەختی خۆی -هەتا لاگری ڕۆمێ بوون- لە دەرگای سوڵتانی بەهەشتیەوە بە نەزەر بەگ و کوڕانی حاجی بەگ درابوو، ئێستاش بە دەست زارۆی حاجی بەگەوەیە و کوڕی گەورەش دیسان ناوی حاجی بەگە.

## سوڵتانعەلی بەگ

### کوڕی جەمشید بەگ، کوڕی بەهلول بەگ

ئەو چاخە کە شاتۆماسب دڵی لە دونبوڵیان گۆڕا و فەرمانی دا کە لە ژیانیان داچوڕێنن (ڕۆژی ژوانی دونبوڵی قڕانەکە) سوڵتانعەلی بەگ -کە لە پاسداوە پایەبەرز و نازدارەکانی شابوو- ناردرابووە ئیسفەهان کە باج بۆ شاکۆ کاتەوە. سەد تمەنێکی دەست و پا کردبوو، کە بیستیەوە مام و برا و خزمەکانی -لە شاوە- لە شیش دراون و هەموو قەلاچۆ کراون. بە پەلەپەل سەدتمەنەی لە تەنکەی باخەڵی نا و خۆی لە پەل-پەل بوون ڕزگار کرد و هاتەوە ناو هۆزی دونبوڵی و بە نهێنی لەوێ دەژیا. کاتێ ڕەقی شانیشتەوە و لە گوناهی دونبوڵیان خۆش بوو، سوڵتانعەلی سەد تمەنی باجانەکەی

هێنایەوە و وەك نۆکەرێکی زۆر دڵسۆز هاتەوە بەر بارەگای شاو ئاوڕی بەخێری وێدرا و بە لاواندنەوەی شایانە و خەڵاتی شایان، دیسان سەرفراز کرا و هەر وەك پێشوو کرایەوە بە پاسداری پایەدار و کاتێکیش کە شاسوڵتان محەمەد بیستی حاجی بەگ لە ئارادا نەماوە، سوڵتانعەلی بەگی کردە مەزنی دونبوڵیان و نیوەی ناوچەی ئەبقای خستە سەر سولەیمانسەرا و پێی بەخشی.

چەند ساڵێك لەو ناوەدا مەزنایەتی کرد؛ بەڵام چونکە مەڵبەندەکە لە سۆنگەی هەرا و بەڵاوە، وێران و بێخێر ببوو، بژیوی ئەوی نەدەدا و لە شروردا زۆر بە ڕووتی و ناگوزوری دەیگوزەراند و بۆ ئەوەش کە هەر سەری پێ ڕاگرن، لە داهاتی باجی دۆڵی ئەلکیس و شرور -کە سەر بە نەخچەوانە- ساڵانە کۆمەگ بژیویان بۆ بڕیبۆوە و دراوێکیان پێ دەگەیاند. لەئاکامدا مەرگ کۆمەگی پێکرد و ژیانی لە شرور بڕیەوە و سێ کوڕی لە دوو مان: نەزەر بەگ، قلیچ بەگ و حەسەن بەگ.

## نەزەر بەگ کوڕی سوڵتانعەلی

لە دیوانی شاسوڵتان محەمەدەوە فەرمانڕوایی دونبوڵی پێدرا و کرا بە جێنشینی بابەکەی. لە پاش ئەوەی کە عوسمانی چنگیان بە سەر یەریواندا گرت و دەبەر چەنگی سەنان پاشای وەزیریان نا، نەزەر بەگ و هێندێکیتر لە ڕۆملویی و چەمشکەزەك و ئەڵباوتی و سەعدلوێی -کە خەڵکی لای چغرسەعد بوون و لە ڕیزی قزڵباشاندا سەرکردەو پلەدار بوون- وازیان لە ئێران هێنا و پێیان پێوەنا و ڕوویان کردەدەرگای گەردوون پەنای عوسمانی و بەرابەری سەنان پاشای چیغالئوغلی لە ئەرزەڕۆم بە دیتنی فەرهادپاشای سەردار سەرفراز و لە بەزەیی پایەبەرزی سوڵتانەوە، ناوچەکانی چالدیران و سولەیمانسەرا و سەگمەنابادیان -وەك پێشوو- بە نەزەر و قلیچ بەگی برای بەخشی. سەگمەناباد لە پێشوودا شاتۆماسب و لە دوایەش سوڵتانی بەهەشتی خستبوویانە سەر بارگیری و درابووە دەست مەنسوور بەگی مەحموودی. مەنسوور بەگ ئەوێی نەدەدا بە نەزەر بەگ و ئەفرەی دەدا. جاری دووەم فەرهادپاشای سەردار فەرمانی بەرز و جوانی سوڵتانی بۆ وەرگرت.

نەزەر بەگ کە هەر ڕۆژی بەرێ، کاتێ دەهاتە بەر فەرمانی ئاستانەی پاشاوە، دەربارەی سەگمەنابادەوە -کە هەر زۆر لە مێژینەوە دونبوڵی بە سەر ڕاگەیون- دەگەڵ سەنانپاشارێك

کـەوتبوون و سـەرباریش فـەرمانی بـەرزی سـوڵتانی لـەو بـارەوە وەرگرتبـوو، ویـستی بـە زۆری بـازووی خـۆی فەرمانەکـە بـخاتە کـار و مەحـموودیەکان ناچـار بکـا بێنـە بـەربار، دژایـەتی کەونارایان -کە وەك سـکڵی ژێـر کـا مـابوو- بـە فـووی شـەڕانی و شـەڕخوازان گەشـایەوە و گـڕ و بڵێـسەی ئـاژاوە لـە هـەر دووك لاوە گرشـەی کـرد و لـە هـەر دوو لا لەشـکریان لێـك کـرد و ڕم و شیـریان لێکتـر کێـشاو کێـشەو هـەرا دەسـتی پێکـرد و پێکـداهاتن. نـەزەر بـەگ و حوسـێن بەگی[1] برای و هەشتا پیاوی سەرناسی دونبوڵی لەو شەڕە وە بن گڵ خزان.

## قلیج بەگ کوڕی سوڵتانعەلی بەگ

لە پاش کوژرانی برایانی، دەگەڵ خزم و کەیـخودایانی هۆزی دونبوڵیدا ڕوویان کردەئـەرزەڕۆم و چـوونە خزمـەت فەرهادپاشـای سـەردار و هاواریـان بـۆ بـرد و سـەرداریش مەنسوور بـەگ و سەرناسـانی مەحـموودی -کە لە شەڕدا دەستیان هەبوو- هەمووی هێنانە دیوان و نووسەری ئەم ڕووپەڕانـەش لـەو کۆڕەدا جێ درابوو.

دەس کرا بە تۆژینەوە و دەرچوو کە ماکی ئاژاوە دوو فەرمانی دژی یەك بوون کە سەردار دەمشتی هەر دوو لای نابوون و دەستی لە پشتی هەر دوو دژدا بوو.

| | |
|---|---|
| دزەکەم پـاسەوانـەکـەی خـۆم بـوو | بواری شاندام کە تێ کەتـم، گۆم بوو |
| ئەوی پێم وابوو حاجی شێمـحەمەدە | لـە بنەوە نـاوی خواجە شـالۆم بـوو |

سەرەنـجامی کار سەرداری دادکردار ورتـەی لـە دەم نەهاتـە دەر و بـە دادرەسـێنی ڕەوای وە بـن پاڵدێمی کەوای داو بەرانبەر بە فەرموودەی: ئاشتی تازە ئاژینەوە؛ باشتـر وایە ئاشـت بینـەوە. خـۆی کردەبەریوان و لە خوێنخوایی پەژیوان کردنەوە و پێکی هێنان و بڕیـاری بـۆ دان کـە مەنـسوور بـەگ سەگمەناباد بەجێ بێڵێ و حاجی بـەگی ئـەوەی حـاجی بـەگی هـەوەڵێی پـێ ڕابگـا و قلـیج بـەگیش چاڵدیرانی پێ بسپێرن و هەموو لایەك خۆ لە شەڕ و دوژمنایەتی ببوێرن. دونبوڵیەکان چاری ناچار بەو

---

١- دەپێشدا بە حەسەن ناو برا. هەژار

کوێخایەتیە گورگانەی کە لە پرسەگورگانەیەك زیاتر نەبوو، ڕازی بوون و گەڕانەوە.[1]

---

١- شەرەفنامە باسی ئەو بنەماڵەی تا ئێرە هێناوە. ئەمیــن زەکی لە *تاریخ جهان‌نمای* تورکی وەرگرتووە، دەڵێ: ئەم ئەمیرە هەموو کوردستان و ئازربایجان و ئەرمەنستان و مەڵبەندی هەکاری دەژێر فەرماندا بووە و پاتەختیشی خۆی بووە؛ ئەمیرفەرەیدونیشیان پێ گوتووە. ساڵی ٨٦٠.ك (١٤٥٦.ز) مردووە. ئەمە دەگەڵ شەرەفنامەدا یەکتر ناگرنەوە و مێژووەکەیان نزیکەی چەرخ و نیمێکی نێوانە. جەمیل
لە *تاریخی دول و ئەماراتی کوردی* و *مشاهیرالکرد و کردستانی* ئەمین زەکی و لە *تاریخی دونبولی*، نووسینی شازادەنادرمیرزای قاجار و لە کتێبی *ناودارانی کوردی* حوسێن‌حوزنی موکوریانیدا باس لە چەند دونبولیەکەوە کراوە کە گێڕانەوەیان بێ بەهرە نیە.

### میربەهلوول کوڕی میرفەرەیدوون

جگە لە وڵاتی دونبولی، تەبەرستان و داغستانیشی هەبووە و خۆی کردۆتە پەیڕەوی شێخ‌حەیدەری سەفەوی و ساڵی ٨٨٠.ك (١٤٧٥.ز) کە شێخ حەیدەر و شاخەلیلی ئاققۆینلوو بە شەڕ هاتن، ئەو لەو شەڕەدا کوژرا.

### میررۆستەم کوڕی بەهلوول

لە تەمەنی یازدەساڵان کرا بە جێنشینی بابی و شاوێردیشیان پێ‌دەگوت. ساڵی ٨٩٨.ك (١٤٨٩.ز) کە شێخ‌حەیدەر پەلاماری داغستانی داو شکاش، ڕوستەم لە چۆمێکدا خنکا.

### میر بەهرووز کوڕی ڕوستەم

دێر زەمانێك میر بووە و نازناوی سولەیمان خەلیفەشی هەبووە. ساڵی ٩٤٥.ك (١٥٣٩.ز) کە شاتۆماسب و سولەیمانی قانوونی لێکیان دا، بەهرووز دەگەڵ شای ئێران بوو. ساڵی ٩٨٥.ك (١٥٧٧.ز) مردووە.

### ئەییووبخان

نەوەی بەهرووزە و کوڕی سولەیمان‌خانە. پاش باپیری بوو بە مەزنی دونبولیان و هەڵیشیدا. شا نازناوی بەگلەر بەگی دایە و پاشان کردیە سوپاسالار؛ چونکە زۆری بە ئازا دیت. ساڵی ٩٤٤.ك (١٥٨٥.ز) مرد.

### شابەندەرخان کوڕی ئەییووب

ئەویش ماوەیەك مەزنایەتی کردووە و لە پاشان مردووە.

### بەهرووزخان کوڕی شابەندەر

زۆر لە شاعەبباس نزیك بوو؛ سولەیمان‌خانی دووەمیشیان پێ‌دەگوت. کە سوڵتان مراد هاتە سەر ئازربایجان، دەگەڵ لەشکری شاسەفیدا بوو. دوایەش کە ئەحمەدپاشای والی بەغدا پەلاماری ئێرانی دا، ئەو ئازا و چاونەترساوە لە چیای هەکاری دژی فەرهادپاشا شەڕی دەکرد. ساڵی ١٠١٤.ك (١٦٠٥.ز) مرد.
دوور نیە سولەیمان خانی دونبولی کە خاوەنی چورس و سەلماس بووە و محەمەدپاشای کوڕی زاڵ ←

→ پاشای حاکمی ئەرجیش و عادلجەوازی بە دیل گرتووە، ئەو بەهرووزە بێ.

**عەلیخان کوڕی بەهرووز**

نازناوی سەفی قولیخان بووە. کە سوڵتان مراد هاتە ئازربایجان، ئەو دەگەڵ شاسەفی بە گژیدا چووە. کە فەرهاد پاشا بۆ کوردستان هات، عەلیخان زۆر ئازایانە لە چیای هەکاری بەرەنگاری بوو، کە ئەحمەد پاشای والی بەغدایە بەرەو ئازربایجان دەهات پەیمانی دۆستانەی دەگەڵ بەست و کێشەیان نەما و هەتا مرد ئازربایجان و ئەرمەنستانی دەبەر دەستا بوو.

**مورتەزا قولیخان کوڕی عەلیخان**

شاعەبباسی دووەم بە یارمەتی ئەو چووبووە سەر تەخت. جا لە بەر ئەوە زۆری خۆش دەویست. بەڵام لە دوایی غیاس بەگ دەرماندۆوی کرد و مراندی.

**غیاس بەگ کوڕی عەلیخان**

لە شوێن برای بوو بە میر و شاعەبباسی دووەم زۆری ڕێز لێدەنا؛ ناردیە سەر قەندەهارێ. بەڵام بە شکاوی گەڕاوە و زیانی زۆر بە ئێران گەیشت و لە رووی نەهات بێتە لای شا. بەڵام شا هێندێك گوندی لای کاشانی دایە و دەگەڵ خزمانی چوونە وێندەرێ و هۆزی زەڕرابی لەوان کەوتوونەوە و فەتحعلیخان مەلیکوشوعەرای دەورەی قاجار و مەحموودی کوڕی لەو بنەماڵەن.

**شابازخان** کوڕی مورتەزا قولیخان، کوڕی ئەییووب، کوڕی سولەیمان خان

ساڵی ۱۱۲۲ك (۱۷۱۰ز) بوو بە میری دونبولیان؛ بەڵام لە ڕۆژگاری شاسولەیمان و شاسوڵتان حوسێندا، خۆی کردەگۆشەنشین و شێخایەتی دەکرد. ساڵی ۱۱٤٤ك (۱۷۳۱ز) کە عەبدوللا پاشای عوسمانی هاتە سەر خۆی، خۆی دەقەلا پەستاوت و ماوەیەك هەروا ما و ناچار خۆی بە دەستەوە داو دەگەڵ سیوهەشت خزمی کوژران.

**میرئەحمەدخان کوڕی مورتەزاقولیخان**

نادرشا کردیە میری دونبولی و بانگی کردەلای خۆی و بە تەگبیری شا بە سەد هەزار ماڵەوە هات و حوکمی خۆی بە سەر خۆیە و مەرەند و چەمی ئاراز و تەورێز و سەڵماس و قەرجەداغدا سەپاند و خودادادخانی لە تەورێز وەدەرنا و ئەحمەدخانی برازای بە دیل گرت و شاری خۆی زۆر ئاوەدان کردەوە و گومبەزی پیرۆزی عەسکەری و دیوانی حوکمات و چەند مزگەوت و باغچەی گشتی دوور لە شار و شارێی پان و درەختکاری و دوو کارێزی نزیك ڕێگا، کاری ئەون.

پیاوێکی ئازا بووە و دوژمن خۆی لە بەر نەگرتووە و دەگەڵ خزمانیدا زۆری چاکە کردووە. دەورانێکی زۆر حوکمی کردووە و لە ئەنجامدا برازاکانی لێ دەخەفتان؛ ڕۆژی چوارشەمە ١٤ی مەولوودی ساڵی ١٢٠٢ك (١٧٨٩ز) بە ناوی بانگێشتن، خۆی و سێ کوڕی چوونە ماڵی یەك لەوانە و زۆر لە هەواڵی پیلان گێڕان هاتبوونە پێشوازی. لە هەیوانێکدا ڕۆنیشتبوو کە زانی دەداو کەوتووە، لە کۆشکەوە خۆی ←

→ هەڵداشت و کەوتنە شوێنی و دیتیانەوە و بە چەند گوللەیەك کوشتیان و لە مزگەوتێکی دەسکردی خۆیدا ناشتیان. هەر ئەو ڕۆژە کەڵبالی‌خانی کوڕە گەورەشیان لە هەیوانی ماڵەکە کوشت و حوسێن‌خانی کوڕیان گرت و بە تەما بوون جەعفەر قولی‌خانی براشیان دەست کەوێ؛ بەڵام ئەو هەڵات و نەگیرا.

میرئەحمەدخان هەموو ساڵێ هەزار تمەنی باج بە کەریم‌خانی زەند دەدا.

## حوسێن‌قولی‌خان کوڕی میرئەحمەد

ئامۆزاکانی گرتبوویان. جەعفەری برای خۆی گەیاندەناو هۆزەکان و لە بیست ڕۆژدا لەشکری زۆری پێکەوە نا و هاتەوە سەر پسمامان. خەڵکی خۆیە کە زانیان ئەو هێزی زۆرە و ئامۆزاکانیشیان دەدزا، بەر لە لەشکر ئەوان ڕاپەڕین و هەموو ئامۆزاکانیان بە ماڵ و منداڵەوە لە ناو برد. جەعفەرقولی حوسێن‌قولی‌خانی لە بەند دەرخست و کردیە جێنشینی بابی و کەریم‌خانی زەندیش پەسندی کرد.

ساڵی ١٢٠٥.ك (١٧٩١.ز) کە ئاقامحەمەدی‌قاجار هاتە ئازربایجان، حوسێن‌قولی‌خانی ڕەگەڵ خۆی خست. بەڵام چونکە لێی دەترسا، ماڵ و منداڵی بە بارمتە بردەقەزوێن. لە پاشان تەورێز و خۆی نایە بەردەست.

ساڵی ١٢١٣.ك (١٧٩٨.ز) کە فەتحعەلیشا پەلاماری ورمێ‌دا، حوسێن قولی‌خان بانگێشتنی کرد و نان و خوانێکی ڕازاندەوە کە وێنەی نەبینراوە. هەر ئەو ساڵە دەگەڵ جەعفەرقولی‌خانی برای بوو بە شەڕیان و جەعفەرقولی شکا و دایە چیای هەکاری.

حوسێن‌قولی زانا بووە و لە بژیشکی و هەندەسە و ئەستێرەناسیش سەری دەرچووە؛ گەشەی زۆری بە وڵات داوە. ساڵی ١٢١٣.ك (١٧٩٨.ز) مردووە و فەتحقولی‌خانی شاعیر شەپۆرنامەیەکی زۆر بەرزی بۆ داناوە.

## جەعفەرقولی‌خان کوڕی میرئەحمەد

گوتمان: دوای هەڵاتن هاتەوە خۆی و تۆڵەی باب و برای کردەوە و حوسێنی برای کردەمیر. مانگی مەولوودی ساڵی ١٢١٢.ك (١٧٩٧.ز) فەتحعەلیشا کردیە والی تەورێز و خۆی؛ بەڵام ئەو شای بەجێ نەهێشت. ساڵی دوایە کرا بە حاکمی ئازربایجان و لە تارانەوە هات. سادقخانی میری هۆزی شکاك لە ترسانی، سەراب و سەردەرۆ و گەرمروودی بەجێهێشت و ڕووی کردەلای شیروان؛ بەڵام کاتێ هاتە تەورێز، پیاوماقوولی کۆ کردنەوە و زۆری دڵخۆشی دانەوە و نامەی بۆ سادقخان نووسی و هێنایەوە و هەر دوولا دژی قاجاران پەیمانێکیان پێکەوە بەست. محەمەدقولی‌خانی ئەفشاریش سوێندخۆریان بوو. ئەمیرحوسێنی ئەفشاری برازای، ڕاستی لێ گوتن و فەتحعەلیشا لەشکری ناردەسەر و هێزەکانی لێ بڵاو کرد. ئەمجار ساڵی ١٢١٣.ك (١٧٩٨.ز) شکاك و دونبولی و هێندێك یەزیدی ڕەگەڵ خۆ خستن و بە گژ حوسێن‌قولی‌خانی برایدا هات و دەرۆستیشی نەهات. هەر ئەو زستانە براکەی مرد و بە لەشکرەوە هاتەوە خۆی و پێشوازی کرا و زۆری دڵخۆشی خەڵکەکە دایەوە و خەڵاتی زۆرانی کرد و لە سەر تەختی میریەتی ڕۆنیشت. نامەی بۆ فەتحعەلی شا نووسی کە قۆڵی بۆ لە سەر بکێشێ. ئەویش مەرجی بۆ دانا کە ←

← یەك لە كوڕانی بە بارمتە لە تاران دانێ. كوڕێكی خۆی نارد كە بچێ و لە ڕێگەدا تووشی عەبباس‌میرزا هات، كە كرابووە بریكاری شا و بە لەشكری زۆرەوە دەهاتە تەوریز تا بیكاتە بنكەی خۆی. عەبباس‌میرزا كوڕەكەی زۆر بە قەدرەوە بەرەو تاران بەڕێكرد؛ پیاوی خۆشی ڕەگەڵ خستن. دوایە نامەی بۆ جەعفەرقولی‌خان نارد كە بێ و لە تەوریز بیبینێ. جەعفەرقولی لای وابوو داوە و بۆی نراوەتەوە؛ نەهات و خۆی بۆ شەڕ ساز كرد. برایەكی كردەحاكمی خۆیە و بۆ خۆی بە لەشكرەوە هات و بە ناو هۆزەكانی شكاك و یەزیدی و سپیكیدا گەڕا و پازدەهەزار كەسێكی لە دەوری خۆی هالاند و بەرەو عەبباس‌میرزا بزووت. لەو دەمەشدا عەبباس‌میرزا چووبووە سەر قەلای هود، كەخانئەبدال‌خان لە لایەن جەعفەرقولی‌خانەوە دژداری بوو. قەلای هود خۆی لە بەر نەگرت و خانئەبدال ڕای‌كرد و ڕووی كردەخۆیە. قەلای هود تالان كرا و خەلكەكەی قەلاچۆ كران. جەعفەرقولی‌خان ئاوی زۆری خستە سەر دەشتی سەلماس و حەوتەم ڕۆژی مانگی مەولوود دەگەڵ دوژمن ڕووبەڕوو بوو. لەشكری دوژمن دوو چەندانی لەشكری ئەو بوو. زۆریشی زیان لێدان؛ بەلام تا سەر خۆی لە بەر نەگرتن و ڕایكرد و خۆی لە قەلای ماكۆ قایم كرد. عەبباس‌میرزا چووە سەر خۆیە و خاپووری كرد و زۆری كوشتن و لە دواییشدا پیرقولی‌خانی قاجاری بە سەرەوە دانا و هاتەوە تەوریز.

جەعفەرقولی‌خان دەگەڵ دەولەتی ڕووسدا ڕێك كەوت و هێزیان دایە كە ولاتی خۆی لە داگیركەر وەرگرێتەوە. سەرەتای سالی ۱۲۲۰.ك (۱۷۹۵.ز) عەبباس‌میرزا كە زانیبووی دەولەتی ڕووس كۆمەگی دەكا، هەموو میرەكانی بەردەستی خۆی لێ دەنگدا كە لە پڕ هێرشی بۆ بەرن. بەلام جەعفەرقولی‌خان بێ‌خەبەر نەبوو؛ زۆر باشی خۆ لێ ساز دابوون. هەتا سالی ۱۲۲۸.ك (۱۸۱۳.ز) شەڕ لە نێوانیدا هەر بەردەوام بوو.

لەو سالەدا جەعفەر قولی‌خان بۆ كۆمەگی مستەفاخانی تالشی چووە شیروان. لە ناوچەی شەكی لەشكرێكی قاجاریانی وەبەرهات و زۆری شپرزە كردن. عەبباس‌میرزا كە ئەمەی زانی، پیرقولی‌خانی قاجاری بە لەشكرێكی زۆرەوە ناردەسەر ڕێی. بەلام ئەوانیشی هەلالاداد كرد و زۆربەی زۆری لە ناو بردن. هەرچی لە كوژرانیش خەلەست، بەرەو ئەردەوێل قاچاندیان. عەبباس‌میرزا ئەمجار هەر خۆی لەشكری هێنا و ڕووی كردە شەكی. جەعفەرقولی‌خان لەو دەمەدا لە ئاق‌ئۆغلان هەلێدابوو؛ كە زانی لەشكر هاتووە، نیوەشەوێك لە نەخافل بە سەریدا دان و كردنیە ئاردی ناودڕكان. عەبباس‌میرزا لە ئەسپ گلا و چەند برینێكی هەلگرت و تاقەسوارە خۆی دەرباز كرد. هەرچی هەبوو لە گرانبار و جبەخانە و ئابدارخانە، هەمووی وەگیر كوردان كەوت. سوپای ڕووسیش ڕیلدز و قەرەباغیان داگیر كرد.

سالی ۱۲۳۰.ك (۱۸۱۵.ز) جەعفەرقولی‌خان كە شەكی و خۆی گرتبوو، كوڕی خۆی لە سەر دانان و هاتەوە ماكۆ و لەوێ مرد.

**نەجەفقولی‌خان كوڕی شاباز‌خان**

نادر شا كردبوویە یەك لە سەركردەكانی لەشكری و والی تەوریزیش. شاعیر و نووسەر بووە. ←

← ساڵی ١١٩٦.ك (١٧٨٢.ز) مردووە.

شازادەنادرمیرزای قاجار دەڵێ: کوڕی مورتەزاقولیخان و برای ئەحمەدخانی ناو براوە و پیاوێکی نەبەرد و بە زیپک و ئاوەدانی دۆست بووە. شوورەی تەوریز ئەو کردوویە و گەلێك دام و دەزگای گەورە و دیوانی حوکمات -کە ئێستا دەفتەرخانەی شاهی پێ دەڵێن- کاری ئەون و میری میرانی تەوریز و دەورویەری بووە. ئەو جێیانەی کە بەرانبەر بە فەرمانێکی کەریمخانیزەند بە دەستیەوە بووە و ساڵی ١١٧٧.ك (١٧٦٤.ز) مانگی قوربان دەفەرماننامەکەدا نووسراوە، ئەوانەن: ئەتراب و ئالان و براغوش و ئەرونەق و میهرانروود و سەردسەحرا و موسنعان و ویدهر و حاکمرووود و برووجرد و دەخوارقان و رووددقسات و بدوستان و ئوجان و دەورویەری و گەرمروود و سەراب و هەشتروود و مەرەند و گرگر و زنووز. دەشڵێ: دەبێ بنکەی فەرمانڕەواییەکەی تەوریز بێ و کاروباری هۆزەکانی شکاك و هیتریش و خێڵەکانی تورکمانیش ڕاپەڕێنی و ساڵانە دەمبڕ حەوسەد تمەن -بەدرە لە دراوی تەوریز- بە دەرباری بەرز بگەیەنێ.

ئەو میرە کوڕی زۆر بوون؛ بەناوبانگیان خودادادخان، ئاقامحەممەدخان و عەبدولڕەزاق بەگە.

**ئەمیرخودادادخان کوڕی نەجەفقولی**

کە باوکی مرد، ئەمیرئەحمەدخان کردیە جێنشین. بەڵام زۆر لە سەر حوکم نەما؛ چونکە لە ئەمیرئەحمەدخانی مامی یاغی بوو. ئەویش چل هەزار چەکداری هێنا سەر و لە چیای سورخاب لەشکریەزی کرد. خودادادخان لە قەڵای تەوریزدا خۆی داگرت و دەهەزار کەسی دژی مامی هەبوو. میرئەحمەدخان دەوری تەوریزی بەرنەدا هەتا گرتی و بردیە خۆیە و پاشان بەرهەڵدای کرد و پەیمانی دۆستایەتیان بەست.

**عەبدولڕەزاق بەگ کوڕی نەجەفقولی**

دۆستی هەرە نزیکی عەبباسمیرزا بووە و لە شاعیرە ناودارەکانیەتی و نازناوی مەفتوون بووە و چەند کتێبی داناون کە لەوانە: *مآثرسلطانی در حالات سلاطین قاجار از بدو تأسیس تا سنه ۱۲۴۱*، کە بە فارسیە و لە تاران چاپ کراوە. هەروەها دەسنووسێکی بە ناوی *تاریخ دنابله* هەیە و لە کتێبخانەی شاهانەدا لە تاران نوسخەیێکی هەڵگیراوە. چەند شتیتریشی نووسیون. ساڵی ١٢٤٣.ك (١٨٢٧.ز) مردووە.

**بەهائەدینمحەممەدئاقا**

کوڕی عەبدولڕەزاق بەگ، زانایەکی لە زەبر و شاعیرێکی داهێنەر بووە. لە دوارۆژەکانیدا حاکمی تەوریز بوو. دیوانی شێعری زۆر تەڕ و ناسکی هەیە و کوڕێکی بە ناوی کوچكخان لە پاش بەجێ ماوە.

**فەتحعەلی کوڕی خودادادخان**

ڕەنگە هەوبێ کە سەر بە هۆزی زەڕڕابی دونبولیە و ئەمیروششوعەرای دەرباری قاجار بووە.

**شابازخان کوڕی مورتەزا قولیخان**

میری میرانی شیراز بوو. ساڵی ١١٢٥.ك (١٧١٣.ز) کرایە ئەمیری هەموو کوردەکانی ←



---

← ئازربایـجان و لە دژی کەریمخـانیزەنـد، بـوو بـە هـەواڵی فـەتحعـەلی ئەفـشار و لـە شیــراز گیــرا و دوایـە کەریمخان بەریدا و کچەکەشی بۆ ئەبولفـەتحخـانی کـوڕیخـۆی هێنـا. مـن لام وایـە هـەر ئـەو شـابازەیە کـە خـۆی کردەشێخ. هەژار

**مەحموودخان کوڕی شاباز**

ببووە میــری میــرانی ئیـسفەهان. شـاعرێك بـوو ملـەی دەگـەڵ ئـەنوەری بـەناوبانگ دەکـرد. هێنـدێك زانـست و هونەری تریشی دەزانیـن. ساڵی ۱۲٦۰.ك (۱۸٤٤.ز) مرد.

**شابازخان کوڕی مەحموود**

لە ڕۆژگاری ناسرەدینشادا میـرلیوا بوو. پاشان کرا بە میـری میـرانی ئیسفەهان.

**محەمەدسادقخان کوڕی حوسێنقولی**

میـری میـرانی ئازربایـجان بوو. کە فەتحعەلی شا مرد، وازی لە حوکم هێنا.

**ئیسماعیلخان کوڕی جەعفەرقولیخان**

باوکی لە سـەر شـەکی دانـابوو. کـە ئـەو مـرد، خەڵکەکـە لێـی ڕاپـەڕین و لـە فـەرمانی دەرچـوون. سـوپای ڕووس کۆمەگی کرد و شۆڕشگێران بڵاو بوون و خەڵکەکەش کڕ بوون و بە سەریانەوە مایەوە.

**ئەمیـرئەرسەلان کوڕی ئەمیـرئەحمەدخان**

لـە پـاش مـەرگی جەعفـەرقولی بـرای، پـەنای بـە عـەبباسمیــرزا بـرد. سـاڵی ۱۱٤۳.ك (۱۷۳۰.ز) سـوپای ڕووس ئازربایـجانی گرت و عـەبباسمیــرزا قـەدەرێك لـە خۆیـە ماتـەی هـەڵگرت و لەوێـشی هەڵنـەکرد و قـەڵای بـەو ئەسـپارد و بـۆ خـۆی هاتـە سـندووس و سـاینقـەڵا. ئەمیــرئەرسەلان دەگـەڵ بسکاویـچی سـەرکردەی ڕووس پێك هات و خۆیەی دانێ و بـۆ خۆشـی لـە بـاتی ڕووس بـە سـەری ڕادەگەیـشت. کـاتێ ئێـران و ڕووس پێـك هـاتن، خۆیە هاتەوە بەر حوکمی ئێران و ئەوی هەر لە سەر بوو هەتا مرد.

**سولەیمانخان کوڕی ئەرسەلان**

کە باوکی هاتـە بـەر فـەرمانی ئێـران، ئـەویش هاتـە نـاو ڕیـزی میــرانی سـەر بـە دەوڵـەت و خـۆی خۆشەویـست کـرد و سـاڵی ۱۲٦۲.ك (۱۸۲٦.ز) کردیانـە کاربەدەسـتی بەسـتام و شـاهڕوود و سـاڵی ۱۲٦٦.ك (۱۸۳۰.ز) لە وڵاتی خوراسان بە سەر شاری توربەت ڕادەگەیشت. جەمیل

# بەندی دەیەم[1]

## فەرمانڕەوایانی کەڵهوڕ

### ئەویش سێ لکی لێ دەبێتەوە

قسەقوت و نەقاڵان و عەوداڵان و سەرقاڵانی هەڵوەدای شوێن شوێنەواری کوردەواری، وەچە و تۆمی سام و زاڵ و ڕوستەمی بە گورز و گۆپاڵیان -کە هور- هور بە بیر دۆزیوە و سەر بهوردی کەڵهوڕانیان

---

١- لە بەندی شەشەوە هاتۆتە سەر بەندی دەیەم. بەندی حەوتەم و هەشتەم و نۆیەمی هەڵبواردووە؛ کە دەبوایە باسی زەرزا و ئەستونی و داسنی بوایە. ئیتر شەرەفخان خۆی لێ بواردوون، یان لە ناو دەستنووس دەرچوون، بۆ ئێمە بەرپیوارە. بەڵام هەر دەستنووسێك کە دەستکەوتووە، ئەو سێ بەندەی تێدا نەبووە. ئێمەش جارێ دەربارەی زەرزا و ئەستونیەوە شتێکی وا نازانین کە شیاوی باس بێ؛ بەڵام لە مەڕ داسنیانەوە کەم تا کورتێکمان هەڵکڕاندووە و لە کتێبەکانی *تاریخی‌سۆران* و *تاریخ الدول والامارات الکردیە* و *الیزیدیون فی حاضرهم و ماضیهم* ئەوەندەمان دەسکەوتووە کە دەڵێن: هۆزی داسنی (یەزیدی) بەرفەرمانی پێشەوا ئاییینیەکانیان بوون و هەوەڵیان شێخ‌عەدیە و دوای ئەو، شێخ‌حەسەنی کوڕیەتی؛ کە بەدرەدین‌لۆلۆی خاوەنی مووسڵی لێ ترساوە و گرتوویە و لە قەڵای مووسڵدا بە ژێ کەوان خنکاندوویە. لە ڕۆژگاری تەیموورلەنگدا میر عیزەدینی‌بۆتانی هێرشی بۆ بردوون و لە ڕۆژگاری سوڵتان‌قانسوەی غوری چەرکەسیدا، شێخ عیزەدینی‌یەزیدی سەرەڕای یەزیدیان میری کوردەکانی نێوان حەڵەب و حەما بووە و لە زەمانی سوڵتان‌سەلیمی عوسمانیدا لە سەر کار لابراوە، دوای ئەوەش کە سوڵتان‌سولەیمانی قانوونی -بە گزیکاری- عیزەدین‌شێری میری هەولێری لە ناو بردووە، حوسێن بەگی داسنی بە سەر هەولێرەوە داناوە و سەیفەدینی برای عیزەدین دەگۆی ڕاچووە و دەرپەڕاندووە و ئەمو خۆی کوتاوەتە ئاستانە و لە پاداشتی هەڵاتنەکەی، تورکان خنکاندوویانە. لە دوای ئەوەش یەزیدی هاتوونەوە هەولێر و ئەمیرقولی بەرەنگاریان بووە و کوشتاری زۆر لە هەر دوولا کراوە. ئیتر تا زەمانی میری ڕەواندز باسیان نیە. ئەو پەلاماری دان و سەردارەکەی گرتن و لە ڕەواندز بەندی کرد و زۆریشی لێ کوشتن و تاڵانی زۆریشی هێنان.

ساڵی ١٣٠٨.ك (١٨٩٠.ز) یەزیدی لە دەوڵەتی عوسمانی هەڵگەڕانەوە و کوشتارێکی بێدادیان لێ کرا و زیارەتەکانیان لێ داگیر کرا و کرانە فێرگەی موسوڵمانان و پاشان وازیان لێ هێنان.

ساڵی ١٣٥٤.ك (١٩٣٥.ز) لە دژی سەربازگری، دەگژ حوکومەتی عیراق ڕاچوون و سەرکوتیان کردن. جەمیل



بە بەر مێشکا تێپەڕیوە- لایان وایە تیرەیەکن لە تۆرەمەی گۆدەرزی[1] گیو[2]؛ کە ئەو گیوە لە ڕۆژگاری پادشایانی کەیانیدا بە سەر بابل[3] ڕادەگەیشت؛ کە ئێستا پێی دەڵێن کوفە[!] گیو کوڕێکی بوو ناوی ڕەهام بوو. لە سەر فەرمانی بەهمەنیکەیانی[4]، لەشکری بردەسەر شام و قودس و میسر و ملی لە وێرانکاری و کوشتار و زۆرداری نا و هێندەی بەنیئیسرائیل کوشت کە بە خوێنیان ئاشی گێڕا. مێژووناسان ناویان ناوە بەختونەسر و لە پاش ئەوە کە ڕێڕەوی خۆی تەخت کرد، چووە سەر تەخت و لەو ڕۆژەوە ئەو مەڵبەندەبە دەست بەرەی نەوەی ئەوە و ئەو هۆزی لەوان کەوتەوە، ئێستا بە گۆران ناسراون.[5]

---

١- دوو پادشای ئەشکانی و دوو پاڵەوانی ئێرانی ناویان گۆدەرز بووە: ١- شاپوور، کە پیاوێکی بەدفەڕ بووە و کلیسا و پەرستگای خاپوور کردوون و یەسوع پێغەمبەر لە ڕۆژگاری ئەودا هاتۆتە سەر دنیا ٢- گۆدەرز کوڕی ئێرانشا ٣- گۆدەرز کوڕی قارون، کوڕی کاوەی ئاسنگەری بەناوبانگ. ٤- گۆدەرز کوڕی گەشواد، کوڕی گیو؛ کە ئەو گیوە وەزیری کەیکاوس بووە و ڕەنگە شەرەفخان ئەمەیانی نیاز بێ. ئەو گۆدەرزە دوو کوڕی بە ناوی گیو و ڕەهام هەبووە. کەوابێ گۆدەرزی گەشوادەنە گۆدەرزی گیوە.

٢- سەرکردەیەکی بەناوبانگی کەیکاوسە و خزمی ڕوستەم و باوکی بیژەنە و ڕەهام برای بووە و پیاوێکیتریش بە ناوی گیو، فەرمانڕەوای خاوەرزەمین و پاڵەوانی خوسرەوی کوڕی سیاوش بووە.

٣- پاتەختی کلدانیانە و دەڵێن ئەوسا ملیۆن و نیوێك خەڵکی تیا ژیاوە و گەورەترین شاری دنیا بووە. کوفە دوور لەوێ دامەزراوە و ئێستاش بابل هەر بابلە و کوفە لە بابل جیاوازە و دوو کیلۆمیتری نەجەفە.

٤- بەهمەن ئەسفەندیاری کەیانی، نازناوی ئەردەشیر بووە. کتێبی *اخبارالدول* ڕوویەڕ ٣٥٠ دەڵێ: بەهراسب (بیوراسپ) ڕەهای ناردوە؛ بەڵام ڕاست نیە؛ چونکە بیوراسپ زەحاکە. *مروج‌الذهب* و *برهان‌قاطع* دەڵێن: لوهراسب نەوەی کەیقوباد ناردوویە. جەمیل

٥- نازانم بۆچی یەك لە چوار لکی کورد ناوی کەلهوڕی لێنراوە؛ بەڵام خویایە کە ئەو تیرە سەر بە کلاهوری پاڵەوانی فەرمانڕەوای پێشووی مازەندەرانن و کەیکاوس ویستی بیخاتە ژێر فەرمانەوە و بە ڕوستەمی زاڵدا نامەی بۆ نارد و فەرمانڕەواکە زۆر درشتی جواب داوە و هەڕەشەی کرد. بەڵام کلاهوری وای کرد کە دانەوێنی و گوتی: ئێمە دەرۆستی ڕوستەم و پاڵەوانەکانی نایەین. شانامە لە چەند جێگەیەکدا ناوی ئەو کلاهورەی هێناوە؛ وەك دەڵێ:

| | | |
|---|---|---|
| | کلاهور کە لافاوە بۆ لەمپەران | هەموو نازی هەر بەو بوو مازەندەران |
| یان دەڵێ: | کلاهور پەیا بوو وەکوو شێری نێر | سەری دالە سەرداری ئازا و دلێر |
| یان: | کە پەنجەی دەپەنجەی کلاهور پەڕاند | هەموو ناخونی وەك خەزەڵ هەڵوەراند |

←

← وێشدەچێ لە ناوی «کەڵوەران» وەرگیرابێ، کە بە کەڵەگا دەڵێن. کەڵوڕ و گۆران یەك تیرە نین؛ بە بەرەباب لێك جیان؛ بەڵام پێکەوە دەژین. جەمیل

*خلاصه تاریخ کرد و کردستان*ی ئەمین زەکی، تەرجەمەی عەونی، چاپی بەغدا، ڕووپەڕ ٣٩١، لە پەراوێزەکەدا لە ڕاونسون دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کالا و کەڵهوڕ لێك نزیکن. کەڵهوڕ خۆیان زۆر بە ڕەگدار دەزانن و لایان وایە وەچی ڕەهامن؛ کە ئەویش بەختونەسری بەناوبانگ و داگیرکەری دەوڵەتی جوولەکەیە. لە ڕاستیشدا ناوی جوولەکانە لە ناو کەڵهوڕاندا زۆرە و دووریش نیە تابیینی جوولەکەشیان هێندێك دەناو خزابێ. هەژار

## لکی یەکەم
# فەرمانڕەوایانی پلنگان[1]

لە ناو ئەوانەدا چوار پیاو بوونە خاوەن ناو و لە لای مەردم ناسراون:

### غەیبوللا بەگ

پیاوێکی خواپەرست و کارپەسەند و هونەرمەند بوو. پاشماوەی ئەو قەلا و ناوچەکانی دێودز و نەودز و دزمان و کواە کوور و موور و کەلانە و نشوور و مراویدیمەن‌یان بە دەستەوەیە و خۆشی هەر لە پێشوودا هاتە بەر فەرمانی شاتۆماسب و لە پاشانیش لە سەر فەرمانی مردن، مرد.

### محەمەد کوڕی غەیبوللا بەگ

بوو بە جێ‌نشینی بابی و دیوانی شاتۆماسبیش قۆڵی بۆ لە سەر کێشا. پیاوێکی دادگەر و هونەروەر و بەختەوەر و مەرد و ڕەند و خێرەومەند و زاناپەروەر بووە و فێرگە و نوێژگەی لە پلنگان دروست کرد و شاتۆماسب کیژی لێ خواست و خزمایەتی دەگەڵ داخست. چەند ساڵێك بە سەربەخۆیی فەرمانڕەوای ناوچەکە بوو. چوار کوڕی بوون: میرئەسکەندەر، میرسولەیمان، سوڵتان‌موزەففەر و جەمشید بەگ. بە زیندی سەر وڵاتەکەی لە ناو کوڕانی‌دا بەش‌کرد. ئەسکەندەری بۆ جێنشینی ناودێر کرد و لە پاشان مرد.

### ئەسکەندەر بەگ

کە باوکی نەما، چووە قەزوێن و شاتۆماسب پەیمانی بۆ نوێ‌کردەوە. لە ڕۆژگاری شائیسماعیلیش هاتە لای شاو ئەویش زۆری دەستی قەدریٚ لێنا و لە بەزەیی بێ‌بڕانەوەی شاهانەوە کرایەوە فەرمانڕەوای پلنگان و بە دڵخۆشی و کامڕەوایی گەڕایەوە. بیست ساڵ بە مەزنایەتی ڕایبوراد و لە ئەنجامدا پەنجەی پلنگی مردنی دەکرکراگەی گەردنی هالا و ڕێکی کوشی و ناوی ژیانی پێ هێق

---

١- پالەنگان بنگەی وڵاتی کەلهوڕە و سەر بە سنەیە.

کرد و بۆ تاریکستانی گۆڕی نارد.

لـە مردن بەهرە نـادا خۆ بواردن　　　مرۆخۆرێکە تێر نابێ لە خواردن

هەر کە ئەمیـرئەسکەندەر سەری ئاوا بوو، سولاغحوسێنتکلـو -کـە بـە بریکـاری شائیـسماعیل فەرمانڕەوای دینەوەر بوو- دەرفەتی لەو مەرگە هێنا و هاتە سەر قەڵای پلنگان و ئەو قەڵایەی -کە بۆ ڕژدی و هەڵەمووتی لە هیچ هەردان وێنـەی نـەبووە- بـە زۆری زۆرداری گرتـی و جێـی ئەسـکەندەری گرتەوە.

سوڵتانحوسێن برای سولاغ -کە زۆر لە کاکی دەترسا- خۆی لە بەر چـنگی دزیـەوە و بـە دزیـەوە چووە شارەزوور و لە لای مەحـموودپاشای کـوڕی شەمـسیپاشـاخۆی دامەزرانـد. لـە پـاش مـەرگی شائیسماعیل -کە قزڵباش لێیان شێوا و دنیا ببووە هەرچی و پەرچی و هەر یەکەی لە ئاوازێك و هـەر سەرەی سازێکی دەژەند- سولاغحوسێن -کە نانــخۆری لـە مێژینـەی خانـەدانی وەلـیخـانیتکلـوی هەمەدان بوو- نانی خوارد، نانێینی دڕاند و لە فەرمانی وەلیخانی سەرپێچی کرد و ئەویش سزای ئەو بێنـمەکیەی نایە مشت و گرتی و کوشتی. لەشکرەکەی شارەزووریش کێس و هەلیان لـە دەس نـەدا و پلنگانیان لە بەر چەنگی بەرەی تکلویی دەرێنا و بنەماڵەی میـرەکانیش تا ئەوسا کەسـیان نـەمابوو؛ ئێستاکێ ناوچەی پلنگان لە دیوانی عوسـمانیەوە بە بێگانە دەسپێردرێ.

## لکی دووەم

# فەرمانڕەوایانی دەرەتەنگ

لە ڕۆژگاری پێشیندا[1] بە ناوچەی حلوان دەناسرا. فەرمانداریێکی دەرەتەنگ -کە نووسەری ئەم پەڕانە بیستوویەتی زۆراب بەگە- پیاوێکی ئازا و دلێر و دەستودڵاواز و جوامێر وسەرگەرم و بەزییەك و نێر بووە. ناوچە و قەڵای پاوە و باسکە و ئالانی و قەڵای زنجیر و ڕوانسەر و دوان و زرمانێکی بە دەستەوە بووە و کە مردووە عومەری کوڕی جێی گرتووە.

### عومەر بەگ

دەپێشدا تووش و چەمووش و دەست درێژکەر و خوێنڕێژ و بادەخۆرەوە و زۆردار بوو. لە دواییدا بەزەی خودا دەستی گرت و دەستی پێ لە گوناهان هەڵگرت؛ ئەو جار ببووە پارێزگارێك نوێژی لە سەر داوێن دەکرا. لەو کاتەدا کە سوڵتان سولەیمانخانی خەزاکەر دەستی بە سەر ئارامگەی بەغدادا گرت، عومەر بەگ هاتە بەر فەرمان و بەر بەزەوی بەڕێژەوی پادشاهانە کەوت و فەرمانی فەرمانداریەکەی لە دیوانی سوڵتانەوە بۆ نووسرا. لەو دەمەوە کە هاتە ناو ڕیز و کۆڕی نۆکەرانی هەرەبەرزی پادشاهی، هەرگیز لە ڕێی بەندەییدا -سەری موویەك- کلانەبووە و بۆ خزمەتێ کەس وانەبووە. زۆریش ژیا؛ لە ئەنجامدا لە دەریای بێ بنی مەرگا بەر شەپۆلی نەمان کەوت.

| | |
|---|---|
| وای دانێ کە زۆر زەلام و بەرزی | زۆرزان و زرینگ و ڕێك و تەرزی |
| مردن کە گەڕی دەپیساوی هاڵا | نازانێ بلند و کورتە باڵا |

---

1- لە دەسنووسێکدا لە باتی ڕۆژگاری پێشین، نووسراوە: ڕۆژگاری کیسراکان. عەونی

## قوباد بەگ

چ بۆ بوێری و ئازایی، چ بۆ دەست و دڵاوایی و چ بۆ قشتی و خوێن شیـرینی، گوڵی سەرتۆپی لاوانە و بژاردەی خاوەن ناوانە. جگە لە ناوچەی دەرەتەنگ -کە بەرانبەر بەو زۆرە، تەنگە- هەر لـە کەوشـەنی دێنەوەر بگرە هەتا بەغدای هێمناییگە، دەبەر فەرمانی ئـەو دایـە. لەمـەڕ وڵـسات و پاتـاڵ و دراوی نەغدینە و ماڵ و هاوکار و یار و هەواڵەوە، لەو ناوە تاکی بێتایە.

## لكى سێهەم

# فەرمانڕەوایانی ماهیدەشت

لە سەردەمی نووسینی ئەم نوسخە پەرێشانەدا، کەسێکی وام دەست نەکەوت کە شارەزای ماهیدەشت و ئاگای لە سەرگوروشتەی بێ. بەڵام کەمکەم لە دەماودەمم بیستووە کە بنکەی ئەو خانەدانە لە مێژەوە ماهیدەشت و تیلاوەره[1]. زوربەی هۆز و تیرەکانیان خێڵەکین و خاوەن مەڕ و ئاژەڵدارن. لە بەرێدا وڵاتەکە دەبەر دەستی دوو برادا بوو: شاباز و مەنسوور. ساڵی ١٠٠٢.ك (١٥٩٢.ز) مەنسوور شابازی کوشت و هەموو هۆز و خێڵەکانی کوردەکانی ماهیدەشتی خستە ژێر دەست و ئێستا هەر خۆی لەو ناوەدا فەرمانڕەوای سەربەخۆیە.

شاباز کوڕێکی لە پاش بەجێما بە ناوی ئەلقاس؛ جارجار بە گژ مامیدا دێ. هەموو ساڵێ چل هەزار سەر ئاژەڵ لە میری ماهیدەشتەوە دەبێ بە دیوانی بەغدا بگا و مەنسوور پێی دەستەبەر بووە. دەگەڵ میر وگزیرانی سەر بە بەرەی عوسمانی و نەخوازە میری میرانی بەغدایە، تا بڵێی نەرم و نیان و بەرفەرمانە و وەکی دیش زۆر سەرگەرم و ئازایە و لە دەوڵەت و سامانیشدا لە وڵاتی خۆی یەکەم کەسە.[2]

---

١- ئەمین زەکی «بیلاوەر»ی نووسیوە. جەمیل

٢- خان هەتا ئێرەی هێناوە. ئەمین زەکیش زیادی نەبووە بیخاتە سەر. بەڵام لە *تاریخی‌کوردستان* دالە ڕاولینسون دەگێڕێتەوە کە: هۆزی کەڵهوڕ زۆر کەوناران؛ لە بیست هەزار ماڵ زیاترن. نیوەیان دەناو ئێراندا بڵاو بوون و نیمەکەی‌تر لە چیای زاگرۆس -کە زێدی پێشوویانە- دەژین. ئەوانەش دوو بەرەن: یەکەمیان شابازی، کە بەرەی شابازن و هەشت هەزار ماڵێك دەبن و لە کرماشان و ماهیدەشت و مەندەلین. دووەم مەنسووری، دوو هەزار ماڵ دەبن و لە گەیلان دەژین. ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە هێندێك لە میرەمەزنەکانی کەڵهوڕ، کە لە قەڵەمی شەرەف‌خان کەوتووە ئەوانەن:

**ئیبراهیم‌سولتان‌خان**

شائیسماعیلی سەفەوی کە بەغدای گرت؛ دایە دەست ئیبراهیم سولتان‌خان، کە ئەمیرێکی کەڵهوڕ بوو. ساڵی ٩٣٠یان ٩٣٤ك (١٥٢٣-١٥٢٧.ز) کە بە سەردان چووبووە ماهیدەشت- زولفەقارخانی برازای بە سەری دادا و ←



---

→ کوشتی و بەغدای لێ ساند.

**زولفەقارخان کوڕی ئەخوەتخان**

سەرەکی هۆزێکی کەڵهوڕ بوو، بە ناوی هۆزی مووسڵوو؛ میری هێندێك لە لوڕستانیش بوو. دژی برایم سوڵتانخانی مامی ڕاپەڕی؛ کە بۆ شاتۆماسب بە سەر بەغدا ڕادەگەیشت و کوشتی و لە جێی دانیشت و زۆربەی شارەکانی عیراقی خستە دەست خۆی و ئەوسا لە ترسی سەفەویان، خۆی دەگەڵ عوسمانی ڕێك خست و دەگەڵ سوڵتان سولەیمانی قانونیدا باڵوێزیان ئاڵ و گۆڕ کردن. شاتۆماسب ساڵی ٩٣٦.ك (١٥٢٩.ز) یان ٩٤٠.ك (١٥٣٣.ز) لەشکری هێنا سەر و دەوری بەغدای تەنی و زولفەقارخان زۆر ئازایانە بەرەنگاری بوو، نەیهێشت زەفەری پێ بەرێ. شا کە زانی لە مەیدان چی بۆ دەگەڵ ناکرێ، کەوتە گزی و بە دزی عەلی بەگ و ئەحمەد بەگی برای فریو داو ئەوان بۆیان کوشت. جەمیل

# بەندی یازدەمین

# فەرمانڕەوایانی بانە

ئەو یـاوەران و یارانـەی دەسـت و مەچـەك لـە بارانـەی تـۆز و گـەردیان لـە بـەژن و ڕووی مێـژووی پێشوو تەکاندووە و کیمخـوا و خـارا و شـاڵ و واڵای زەرد و سـووریان بـە بـەر باڵایـدا کـردووە و بـە دانستە خـاڵ و میلیـان دانەدانـە بـە دەم شـانەدا هێنـاوە و لـە پرچـی ئاوریـشمی و لـوولی، چەند پەلکەیان هۆندۆتەوە، لەمـەڕ بـانووی ئـاوداوێنی ئاریـەباوە -کـە لـە بـەر نـاز بانـەی نـاوە- وایـان بـۆ گێڕاوینـەوە: بانـە نـاوی مەڵبەندێکـە سـەرەك هـۆز و میــرەکانی بـە بانـەیی بـەناوبانگن. دوو قەڵا و ناوچەی تێدایە: ناوچـەی بانـە و قـەڵای پیـرۆز یەکێکیانـە و ئـەویتـر قـەڵای شـیوەیە؛ کـە لـە نێـوان ئـەردەڵان و خـاکی بابـان و موکوریـان هەڵکـەوتووە. میـرەکانیان پێیـان ئێـژن ئەختیارودین؛ گوایە هـەر بـە خۆشـی خۆیـان دەسـتیان لـە گـاوری بـەرداوە و بـە بـێ ئـەوەی هـیچ خونکارێـك لـە پادشـایانی موسـوڵمان فـەرمانیان بـە سـەردا بـدا، هاتوونـە سـەر دیـنی ئیـسلام و ئەو نازناوەیان لێ ناون. خوداش پتـری ئاگا لێیە.

### میـرزا بەگ کوڕی میـرمـحەمەد

وەك دەماودەم هاتووە و مەردم بیستوویانە، یەکەمیـن میــرێکی لـەو میــرانە نـاوی بـڵاو بۆتـەوە، میـرزا بەگ بووە. ماوەیەك بوو فەرمانڕەوای بانە بوو. کیژی بێگە بەگی فەرمانڕەوای ئەردەڵانی هێنـا و بوو بە فەرمانداریکی سەربەخۆ. لـە سـەر ئـەو کیـژەی بێگـە بـەگ -کـە میــرزا بـەگ بـۆ خـۆی خواستبوو- سوڵتان عەلی بەگی غنلیج کەڵەوەکێشی دەگەڵ دەکرد و کێشەیان لـە نێـوان تونـد بـوو. سوڵتان عەلی میـرزا بەگی لە ناوچەی بانە وەدەر نا و قاتنمش بەگی برای خۆی لە جێ دانـا. میـرزا بەگ پەنای بە بێگە بەگ برد و بە کۆمەگی ئەو قاتنمشی ڕاو نا و خۆی کردەوە بە فەرمانڕەوای بانە و



لە دوای ئەوە میـرزای مەرگ، لە ناو سیایی مردوانیدا ناونووس کرد.

پێنج کوڕی بە یادگار بەجێ هێشت: بداغ بەگ، سولەیـمان بـەگ، غـازیخـان، میـرمـحەمەد و ئەغوەرلوو.

## بداغ بەگ کوڕی میـرزا بەگ

لە پاش نەمانی بابی، بوو بە فەرمانڕەوای بانە و دوای ئەوە کە چەند ساڵێك مەزنایەتی بە دەست بوو، میـرمـحەمەد و ئەغوەرلووی برای -کە لە دایکێکی دیکە بوون- گەڕیان تـێ هاڵانـد و لـە وڵاتیـان وەدەر نا و ئەویش پەنای بە ئاستانەی شاتۆماسب برد و شاکۆمەگی کرد و نیازی وابـوو بـە هیمـدادی شاوە بەرەو بانە بێتەوە و تۆڵە بستێنێتەوە؛ بەڵام شای مەرگ مۆڵەتی نەدا و تەقڵەکوت هەڕرای کردێ و هەر لە شاری قەزوێنێ لە ناو گڵکۆدا خپی کرد.

## سولەیـمان بەگ کوڕی میـرزا بەگ

لە دوای برا گۆڕ غەریبەکەی، لە دیوانی شاتۆماسبەوە میـرایەتی بانەی بە میـرات درایـە و بـولقلی بەگی ئایدین ئاغای زولقەدری والی مەراغەی ڕەگەڵ خرا کە پشتی بگرێ و لە سەر بانەی دانێتەوە. بە هیمدادی بولقلی بەگ و بەرانبەر بە فەرمانەکە، بۆوە بە سەرداری بانـە و بیـست سـاڵێك مەزنایـەتی کرد. چونکە پیاوێکی دیندار بوو، کاروباری دنیاداری بە ئەرکێکی دژوار زانی؛ بەدر بەگی برازای خۆی لە جێگەی خۆی کردەمیر وکیژی خۆشی لێ مارە کرد و ملی لە خواپەرستی نا و دوو جار سەری ماڵی خودا و مەدینەی نێژگەی پێغەمبەری دا- خوا لە پیرۆزیان کەم نەکا- جاری دووەم نەهاتەوە و لە سەر چاکی هەرە چاك و ئارامگەی فرە ڕووناکی چاکتـرین مرۆی سەر زەمیـن -گـەلێك دروود و ئافـەرینی خودا بۆ خۆی و خزم و یارانی- کروشـمەی کرد و لە مەدینەی بەرۆشنی نیشتەجێ بوو.

## بەندی دوازدەمین

# فەرمانڕەوایانی گەڵباخی[1]

گوڵ چینانی ناو باغانی بە پەرژینی کوت کراوی ڕێکخراوی بەسەرهاتان و ڕووداوان -کە ڕۆژی خۆی باغەوانی پیرەمامیان، نۆنەمامیان لێ ناشتووە و بە سەلیقە بە تاماوی لیقەی دەواتیسان داشتووە- دەڵێن میرانی گەڵباخی یەکەم سەرناسیان هەباسە و باسەکەش وادەست پێ دەکا: هەباساغا ناو لە گەورەکانی خێڵی ئیستاجلوە و لە هۆزی خۆی بە هۆی ڕووداوێك ئاوارە بووە و لای بێگە بەگی میری ئەردەڵان گیرساوەتەوە و پەنای دراوە. زۆر زووی توانیوە خۆ خۆشەویست کا. پیاوێکی ئازا و زیت و

---

١- لە پێشەکی شەرەفنامەدا -کە سیایی سەربەندەکان نووسراوە- دەڵێ: بەشی دووەم لە ڕووپەڕی سێهەم بە دوازدەبەند کۆتا دەبێ. بەندی یازدەبەر «بانە» کەوتووە. «تەرزا» کە دەبوو دوازدەهەم بێ، لادراوە. تەنانەت ڕستی: «بەندیدوازدەهەم» نەنووسراوە. مامۆستا عەلیعەونی لە پاش بەندی یازدە-کە باسی بانەیە- دیسان هەر نووسیویە: بەندی یازدەهەم: گەڵباغی. لە داوێنی ڕووپەڕی ٤١٦ی چاپەکەی میسردا نووسیویە: «ئەم بەندەم لە ناوەرۆکی نوسخە جیاوازەکانەوە وەرگرت کە لە کۆتایی چاپ کراوەکەی زێرنوف دایە. دیارە هێشتا شەرەفخانیش نیە؛ چونکە نەیخستۆتە ناو فیهرستەکەوە.» ئەوی سەرنجی ڕاکێشام، ناڕێکی و ناکۆکی وشە و ڕستەکان بوو؛ کە دەگەڵ فارسیەکەی شەرەفخاندا عاسمان و ڕێسمان بوون. دەردەکەوێ کابرایەکی فارسینەزان نووسیویە و ئاخنیویەتە ناو بەرگە شەرەفنامەیەکەوە. جگە لەوە کە سەر و گوێی فارسیەکەی تێك کردۆتەوە و زۆر ڕستەشی هەر مانا نادەن، لە باسی حوسێن بەگ ناوێکدا کە کەوتۆتە ڕووپەڕ ٤٢٣ی چاپەکەی میسرەوە، دەڵێ: ئێستا کە ساڵی ١٠٩٢ه[!] لای هەڵۆخانی ئەردەڵانە. مامۆستا ڕۆژبەیانی ئەوەکەی عەلیعەونی وەرگێڕاوە؛ بەڵام کە زانیویە هەڵۆخان هاوچەرخی شەرەفخانە، تاریخەکەی کردۆتە ١٠٠٢. لەمەش ورد نەبۆتەوە کە هەموو ئێستا کانی شەرەفخان بۆ ساڵی هەزار و پێنجە؛ کە کتێبەکەی تێدا نووسیوەتەوە.

من ئەم بەندەبە نووسراوی شەرەفخان نازانم و ناشمەوێ لە ناو بچێ. وەك پەراوێزێك یان سەربارێك ڕەگەڵم خست و خواخێری نووسەری بنووسێ. هەژار

ئەوی شایانی باسە، کیژی هێژا و کوردناسی سوڤیاتی، ژ. ڤاسیلیڤا -کە شەرەفنامەی کردۆتە ڕووسی- لە سەر ئەم باسە ڕەخنەی لە مامۆستا عەونی گرتووە و لە ڕووپەڕ ١٥ی پێشەکیەکەی خۆیدا دەڵێ: ئەو نووسینە هیچ لە کردەی شەرەفخان ناکا و هەڵەی ڕێزمانیشی زۆر تێدایە. کەمال مەزهەر

ژێهاتی و زۆر دەسکەرەوە و چاونەترساو و شیـرین ئاکار و خزمەتگوزار و مەردانە بـووە. بێگـە بـەگ زۆری پەسند کردووە و کیژی ئەلیاس ئاغای ڕەنگەڕێـژانی بـۆ خواسـتووە و کـانی و بەرکانیـەکی لـە مەریوانێ بە خەڵات داوەتێ و دایـمەزراندووە. هەباس‌ئاغا لە زەویەکەیـدا بـاغی ناشـتووە و زۆریـش پیاوێکی دڵاوا بووە؛ ڕێبوار و ئاسیار کێ ڕابردبا، بە زمانی تورکی -کە زمانی خۆی بوو- بـانگی لـێ دەکرد: کاکە! گێل باغە. واتا: وەرە باغ. کوردی ئەو ناوە زمانی تورکیان زۆر پێ سەیر بـوو؛ هـەر لـە بەر ئەوەش ناویان لێ ناوە عەبباساغای گەڵباغی[1].

پوختەی مەبەست: ئەم کابرایە لای بێگە بەگی شارەزوور -کە لە قەڵای زەڵم دادەنیشت و خـاوەنی دوازدەهەزار سواری یەدەکدار بوو- دامەزرا و لە سایەی ئازایەتی و بەکاری خۆیەوە زۆری خـۆ ڕەپـێش خست و زۆری چاکە دەربارەی کرا و پلەی مۆرداری میـری پێدرا. ئەوسا ناردی لە ناو هۆزەکەی خۆیدا دووخوشکی هەبوون هێنانیە جەم خۆ و دانی بە خزمە ڕەنگەڕێژیەکانی و چەند لاوێکیان لێ کەوتەوە و پتـر لە پێشوو ڕەگی داکوتا.

نەیاران و بەدکاران -کە ئێرەیان پێ دەبرد- دوو زمانیان لە لای بێگە بـەگ کـرد، کـە هەباسـاغا نیازی وایە بتفەوتێنێ. هەباس کـە بـەو کـەین و بەینـەی زانـی، ڕۆژێـك بـە نوێـژی نیـوەڕۆ خـۆی و یارەڵڵاغای خوارزای -کە لە هۆزی ڕەنگەڕێژی بوو- پیلی مـاڵ و منـداڵیان گـرت و لـە شـاری زەڵـم دەرکەوتن. بێگە بەگ کە باش دەیزانی ئەو جووتە چەند ئازا و دێون، کەسی نەناردەبەراییی و وازی لـێ هێنان. ئەو دووە هاتنە بیلاوەر و نیشتەجێ بوون. وردە-وردەدەگەڵ هۆز و تیـرەکانی لەك و مـادکی و سولەیـمانی و کەڵهوڕدا دۆستایەتیان داخست و خزمایەتیان دەگەڵ کردن.

لەو کاتەیدا شاتۆماسب دەچووە سەر وڵاتی ئوزبەگ و لە کن تـورکنج دابـەزیبوو، خـاڵ و خـوارزا چوونە لای شاو بۆ ئەو شەڕەی ڕەگەڵ کەوتن و لە مەیداندا بـۆ مەردایـەتی دادیـان داو لـە سـوپاگەی سەرکەوتواندا ناویان لە سەرووی ناوان بوو. پادشای ئوزبەگیان بە دیل گرت و دەگەڵ چەند دیلێکی‌تردا هێنایانە بەر سێبەری تەختی خەلیفایەتیەوە و شازۆری ئافەریم دانێ و بە پـاداش سـەربەرزی کـردن و

---

[1]- ئەمیـن زەکی دەڵێ: «شارۆکەی سەرچاوەی لە مەریوان دراوەتـێ و عـەبباس‌ئاغـای گـەڵباغی دامەزرێنـەری ئـەو میـرنشینەیە». من لام وایە ناوی باوکی گوڵاویاغا (گوڵابیاغا) بووە؛ بۆیە بووەتە گەڵباغی. جەمیل

فەرمانی فەرمانڕەوایی بیلاوەر و دوازدەئۆیماق[؟]ی بۆ نووسین.

چەند ساڵێك مەزنایەتی بیلاوەر و ئەو ئۆیماقانەیان کرد و خەڵکێکی زۆر لە هۆزەکانی سولەیمانی و بادکی و کەڵهوڕ و وەرمەزیار هاتنە لایان و تێکڕایان بە ناوی هۆزی گەڵباغی ناودێر بوون. چەند جارێك لە ناو ئەوان و محەممەد بەگی گۆراندا چەند شەڕ و هەرایەك ڕوویدا؛ لە ئەنجامدا ئاشت بوونەوە و محەممەد بەگ کیژی خۆی دابە محەممەد قولی کوڕی یارەڵڵاغا و بوونە خزم. ئەمجار شەختەی مەرگ پارێزێکی بردەباغی ژینی هەباسی گەڵباغی و بەرگ و باری لێ هەڵوەراند.

| | |
|---|---|
| جیهان چون جامە، مەی ناکامە، دەوران | لە پەستا تێدەکا بۆ چووك و گەوران |
| بە خۆشی خۆت نیە و نۆشین بە زۆرە | دەبێ وەیخۆی سەریشت بەریە هەوران |

یارەڵڵاغا کە لە ڕۆژگاری هەباساغا هۆز و ناوچەکانی سەرپەرشتی دەکرد، لە پاش مردنی خاڵی، هەموو کار و باری مەزنایەتیەکەی دایە دەست عەلیاغای خاڵۆزای و گۆیا بەهانەی دەست لە کار کێشانەوەی ئەوە بووە گوتوویە من خێزانبارم و پڕکارم و قەرزدارم؛ هەر هێندەم بۆ دەکرێ بە کاروباری خۆم ڕابگەم و ناپەرژێمە دنیاداری. ئەو ئەرکەی بە تۆ دەسپێرم و خۆم لە گیرودار دەبوێرم؛ چاوەدێریشت لێدەکەم. یارەڵڵا زۆر دەوڵەمەند و ئاژەڵدارێکی قورس بووە. دەڵێن لە ناو ڕەوەی ئەودا سێسەد ئێستری تۆڕ هەبووە.

لە پاش دامەزراندنی عەلیش، دیاری و پێشکەشێکی زۆری بە نامەوە بۆ بێگە بەگ بەڕێ کرد و باسی مەرگی هەباساغای پێ ڕاگەیاند و ئەوەشی وەبیر هێناوە کە هەر وەکوو هەباساغا پلەی مۆرداری تۆی هەبووە، کوڕیشی هەر بەندەی تۆیە و پێم خۆشە سەرفرازی کەی و ئەگەر لە ژێر سایەی تۆبێ، بۆمە جێگەی شانازیە. بێگە بەگ تکای یارەڵڵاغای گرت و ناوی میرێك لە میرانی بەردەستی خۆی لە عەلیاغای گەڵباغی ناو پێداویستی میرایەتیش هەرچی پێویستە پێی بەخشی. عەلی بەگ بە ئارخەیانی لە مەڵبەندی ژێردەستیدا فەرمانڕەوایی خۆی دەکرد.

لە وەختێکدا کە سەنان پاشالەشکری بەرەو ئەهاوەندێ هێنا و ناوچەکانی دەوروبەری داگیر کردن، عەلی بەگی گەڵباغی -کە عالی گەڵباغیشیان پێدەگوت- هاتە بەر فەرمانی عوسمانی و

سەنانپاشاناردیە سەر کرند و شێخان و نامەشی دەربارە نووسی و یارەڵڵاغا نامەی بردەئەستەمبووڵ و گەیاندیە دەرباری سوڵتان و لە دیوانی عوسمانیەوە ناوچەکانی کرند و شێخان و چکران و قەڵای تفاب و خورخورە و تیرەزەند و قەڵاتەپە و چەند شوێنێکی‌تریش، بە سنجەق درا بە عەلی و ئەرکەلە و ڕەنگەڕێژان و سەهبانانیش بە تیمار دران بە یارەڵڵاغا.

## عەلی گەڵباغی

رووداو گێرەوەی زیت و خۆش ئاخێو و ئەندازەگری ڕاست و درووس پێو، مێژووی پێشوویان هەڵسەنگاندووە کە چاپی و لاریان لێ پەڕاندووە و پوختە و پتەویان ڕاگەیاندووە و لە باسی عەلی‌گەڵباغی‌دا گوتوویانە: پیاوێکی زۆر خاوەن دەست و بە دەست و پێوەند و دەوڵەمەند بووە. هەموو ساڵ زۆری پێشکەش و دیاری بۆ بێگە بەگی ئەردەڵانی ناردووە و بێگە بەگیش زۆری خاتر گرتووە.

مەڕوماڵات و چادر و چیغی میر وولسات و ئاژەڵی خێلانی گەڵباغی -لە پاش خاکەلێوەی بەهاران- دەچوونە بانەمەڕان و هەواریان لە زۆزانی کرند بوو. دەبوایە بە ناو زەهاودا تێپەڕن و پایزانیش -کە خێڵ بەرەو ژێر دەبوونەوە- ڕێبازیان بە ناو پووش و پاوانی زەهاودا دەهات. فەرمانێکی سوڵتانیان بە دەستەوە بوو کە هیچ‌کەس ناتوانێ پووشانە و سەرانەو مەڕانەیان لێ وەرگرێ یان بەرگرییان لێ بکا. قوباد بەگی زەهاو -کە زۆر زیانبار دەبوو- ناچار بەرەنگاریان دەبوو؛ ڕێگەی کوێستانی لێ دەبەستن. هەموو ساڵێ دوو جاران پایزان و بەهاران زەهاوی و گەڵباغی لێک وەخۆ دەکەوتن و دەبووە هەرا و شەڕەپەیاغ.

عەلی بەگ بەهاری ژیانی کەوتە بەر پایزی مەرگ و لە خێڵی زیندووان بەجێ ما و لە گۆڕستان هەڵیدا. دوو کوڕی لە پاش بەجێ مان: حەیدەر بەگ و کچ بەگ.

## حەیدەر بەگ

جێگەی بابی گرتەوە؛ هەر لەو ساڵەشدا یارەڵڵاغا -کە تیماری سەربەخۆی بە دەستەوە بوو- لە پاش



سەدساڵ تەمەن، تیماری لێ بوو بە بیماری و بە ناچاری دنیای پڕ لە ئازاری وەلا نا. سێ کوڕ و پێنجسەد ماڵە بۆرەپیاگی لە پاش بەجێ مان. ناوی کوڕەکان: محەمەدقولی و ئەسەد و شاوەیس بوو.

## حەیدەر و محەمەدقولی

کە یارەڵڵاغا بە شوێن عەلیبەگدا مرد، محەمەدقولی کوڕی یارەڵڵاغا خۆی گەیاندەئەستەمبوڵ و فەرمانی هێنا کە حەیدەر لە جێی عەلی بەگ بێ و محەمەدقۆلیش بە سەر بەشی بابی خۆی ڕا بگا. سەرەڕای ئەوەش عوسمانی چونکە محەمەدقولیان بە دەست پاك دەزانی، سێ جاران باجانەیان پێدا ناردە ئاستانە و ئەرکی خۆی زۆر بە باشی ئەنجام دەدا.

حەیدەر بەگ کوڕێکی هەبوو ناوی سورخاب بەگ بوو. دوو خاڵی ئەو سورخابە -کە یەکیان ناوی موحێبەدین بوو- لە وەختێکدا لە بەر نەگونجاوی خۆیان، لە وڵات ئاوارە ببوون و لە ئەستەمبوڵ دەژیان.[1] چەند جارێك حەیدەر بەگ ڕایسپاردبوو کە موحێبەدین بەرێتەوە، بەڵام ئەو سوێندی خواردبوو کە هەرگیز نایەتەوە. جارێکیتر سورخابی خوارزای زۆری ڕوو لێنا و موحێبەدین دڵی نەشکاند و هاتەوە و لە تۆڵەی تۆبە شکاندنەکەشیدا سێ ڕۆژان بە ڕۆژوو بوو. کاتێ ئەم خەبەرە بە حەیدەر بەگ گەیشت، سورخابی بانگ کرد و گوتی ئەو ناڕاستە سوێندی خۆی بە هیچ نەگرتووە؛ گەرەکمە هەر ئێستە بچی و بیکوژی. سورخاب سوار بوو بە پیر خاڵیەوە چوو، لە نیوەی ڕێ تووشی بوو. تیرێکی ژەهراوی لە سینگی دا، لە مۆغەرەی پشتیەوە سەری کرد و خاڵی خەڵتانی خوێن کرد و پەلەقاژەی لێ بڕی. ئێستاش ئەو جێیە لە ناو گەڵباغیاندا «موحیبکوژە»ی پێ دەڵێن. لە پاش کوژرانی ئەو، دوژمنایەتی زۆر سەخت کەوتە نێوان خزم و تیرەی هەر دوو لاوە. حەیدەر بەگ و سورخاب بەگ[2] لەشکریان لە عێلی کج بەگ کرد و سورخاب هەر بە دەستی خۆی حەوت کەسی لە خاڵوانی خۆی کوشت. لە ئەنجامدا هێندێك تفەنگچی عێلەکە هەردوکیان بە گوللە کوشتن و هاتیشن خێڵی

---

١- ئەم باسی حەیدەر و محەمەدقولیە تا سوێند شکانەکە لە ڕووپەڕ ٤٢١ فارسیەکەی چاپی قاهیرە دایە و زۆر پچرپچر و پەرت و پەرێشان و تێك چرژاوە هەر ئەوەندەم لێ هەڵکڕاند. هەژار

٢- لە فارسیەکەدا سغاب نووسراوە کە دیاریشە سورخابە.

حەیدەر بەگیان ساف لە ساف تالآن کرد. لە پاش ئەوان، حوسێن بەگ[1] بەشی حەیدەر بەگی لە دیوانی سولتانەوە بە سنجەقی بۆ خۆی ئەستاند و دەگەڵ مرادخانی برایدا دووبەدوو بە سەری ڕادەگەیشتن. حوسێن بەگ، «بەگم»ی کیژی عێل بەگی کەڵهوڕی ژن بوو. ژنە -وەك لە ناو کەڵهوڕاندا باوە- هەر خۆی هەمە کارە بوو؛ حوسێن بەگی میردی هەڵپەساردبوو، چەند کەسێکی ڕاسپارد مرادخانیان بۆ کوشت. کوڕانی مرادخان -کە حوسێن بەگ و سوبحان ویردی بوون- بە ڕابەری خزمانیان خۆیان گەیاندەبەغدایە و لە لای بەگلەربەگی شکاتیان کرد. ئەویش فەرمانی بۆ قوباد بەگی درنە نارد کە خوێنی بابیان بۆ بسێنێ. قوباد هەلی بە دەرفەت زانی و دەشەوێکدا ئەخافڵ بە سەر حوسێن بەگی دادا و حوسێن بەگ و دەستەو بەستەی ڕایانکرد و لە سیروان چوون بەو بەرەوە و پەنایان بە هەڵۆخانی ئەردەڵان برد و ئێستاش کە ساڵی ١٠٩٢ە[2] هەر لە لای فەرمانڕەوای ئەردەڵانن. خوا دەیزانێ.[3]

---

١- هیچ دەرناکەوێ ئەو حوسێن بەگە چە کەس بووە؟!

٢- ئاوا نووسراوە. وەك لەمەوبەریش گوتمان ڕۆژبەیانی دەستکاری کردووە و کردوویەتە ١٠٠٢. لام وایە هیچیان خۆی نیە؛ بڕوانە پەراوێزی سەربەندەکە. هەژار

٣- ئەمین زەکی دەڵێ: هۆزی گەڵباخی سێهەزار و پێنجسەدماڵێك دەبن و لە بان هۆبەتوو و ساراڵ و قەرەدەوار نیشتەجێن کە سەر بە ئەستانی سنەن. جەمیل

ناوی ئەو هۆزە -لەسەر زاری خۆیان و جیرانەکانیان- «گەڵواخی»یە. وەك دەڵێن: «گەلی یاخی»یان پیان گوتوون؛ کە بۆتە گەڵباخی و ئەمجار گەڵواخی. ئەو خێڵە ئێستاکە زوربەیان وان لە ناوچەی ساراڵ کە دەکەوێتە باکووری سنە ونزیك بە دیواندەرەوە و لە سێ تایفەی گاملێ، مراوگوڕانی و چۆخەڕەشی پێك هاتوون و دەوری سی ئاوادییەکن. جیرانەکانیشیان قاڵقاڵی وخوڕخوڕە و تیلەکۆیین. لە هەوەتووشدا دو تایفەی کاکسەوەنی و قەمەری، گەڵواخین. ماجد

## بەشی سێهەم لە ڕووپەڕی سێهەم

# فەرمانڕەوایانی کوردی ئێران

### ئەویش دەبنە چوار دەستە

زانا و هۆزانان -وەك پاڵەی قۆچاغ- پاڵەوانانە هاتوونە دەست و لە تەختە و پەڵەی نوخشەی ڕەسیوی داسووپەڕیوی مێژووی ڕوودانی بە پشت و دانی گوڵگوڵ داوێستاو و بە گێژ لێك هاڵا و زەند و مەچەكیان لێ هەڵماڵیوە و شاقەلی شۆڕیان هەڵازنیوە و داسی بنووسیان بە سان ساویوە و بە تووژی و کرژی ملیان لێناوە و بەر خۆیانداوە و گەوزیان لێداوە و گەوز بوونە قول و قول بوونە مەلۆ و لە پەرێزی پاك، باغە بەسراوە و لە گرشە دراوە و بەخێشکی زانست، کێشە کراوە و لە سەر جێخونی ڕووپەل ڕاخراوە و گێرەی جەنجەڕی وردەوە بوونیان لە سەر گێڕاوە و خۆیانی کاودان کۆما کراوە و بەشەنی ئەزموون هەڵاوێژراوە و کوێزر کوتراوە و چی چەت و چێوە، لە کەو دراوە و هەڵاوێراوە و کە زانیویانە کا چوو، ما دانی، خەرمانی مێژووی پاکژ و پوختی شەقلێ کراویان -بۆ چاوەنۆڕی ئاهەنگ و بەزمی ڕۆژی سوورانە- لە بەر ڕاناوین. ولۆ خویانە کە سەردارانی کوردانی ئێران[1] دەبن بە سێ کوت: سیامەنسووری، چکنی و زەنگنە.

وەك دەماودەم دەگێڕنەوە، ئەو کوردانە لە سێ براوە -کە وەختی خۆی- لە مەڵبەندی لوڕستانڕا یان لە وڵاتی گۆرانڕا لە زێد پەڕەوازە بوون و بەرەو عەجەمسان هاتوون و بە ئاواتی پلە و پایە هاتوونە ژێر سای شای ئێران و بە نیازی خۆ گەیشتوون و هەرسێك برا کراونە میسر. ئەو هۆزانەش -کە لە دەورەی ئەو سێ برایە کۆ بوونەوە- هەر کامێك بەرەی کام میسرە، ناوی بۆ خۆی گرتۆتەوە و بەو نازناوەوە ناسراوە. هۆز و تیرەیتری کوردیش -کە لە ئێران بەر فەرمان و هاریکاری شا و دیوان-

---

١- لە سیایی فیهرستەکەدا دەڵێ: فەرمانڕەوایانی کوردی ئێران کە «گۆران»یان پێدەڵێن. جەمیل

ئاوایان سیایی گیراوە: لەك، زەند، ڕۆژبەهان[1] متیلج، حەسیری، شارەزووری، وەرمەزیار، کەلانی، ئەمینلو، مەملویی، کج، کوڕانی، زکتی، کەڵەگیر، پازۆکی، وەهی، چەمشکەزەك، عەرەبگیرلو و هیتریش. چوار لەوانە -کە پازۆکی و چەمشکەزەك و وەهی و عەرەبگیرلوون- هەر زۆر لە مێژینەوە میر ومیرزادەی خۆیان بە سەریان ڕاگەیشتوون؛ میرایەتی لە ناویاندا بە میرات هاتووە. بیستوچوار هۆزیتری کوردیش لە قەرەباغی ئێراندا نیشتەجێن و بە ئیگرمیدورت (بیستوچوار) بەناوبانگن. لە ڕۆژگاری شاتۆماسب ئەحمەد بەگی پرتاڵ ئۆغلی کرا بە میری ئەوانە و بڕیاردرا کە هەمیشە ــ چ لە سەفەر یان لە ماڵ بێ- دەبێ بەرانبەر بە سیهەزار شەڕکەر و پاسداری هەبێ.

لە خوراسانیش کورد هەن و بە ناوی گێل ناسراون و لە ڕۆژگاری شاتۆماسب، شەمسەدین بەگێك میریان بوو. کوردی پێ نەزانراویش لە خاکی ئێراندا زۆرن؛ کە لێرەدا درێژەدان دەبێتە مایەی سەرەگێژە و بە ناچاری خۆم لێ بواردن. سوپاس بۆ خودای بەندەناس.

---

١- لەك: هۆزێکی گەورەن و لە ئێراندا بڵاون، زۆربەیان لە لەکستان دەژین کە لە باشووری ئێران و باکووری لوڕستانە. زەند هۆزێکی لە مێژینەی کوردەبە سەرداری کەریمخانی زەند بوونە دەسەڵاتداری هەموو ئێران و حوکمیان لە ساڵی: ١١٦٧.ك (١٧٥٣.ز) را تا ١٢٠٢.ك (١٧٨٧.ز) هەر ما و فەرمانڕەوای بەناوبانگیان کەریمخان و لوتفعەلیخان و سادقخانی زەند بووە. پاش هەڵوەشانی حوکمیان، لە بەر یەك هەڵوەشاون و هێندێك لەوانە ئێستا لە زەنلەئاوا (زەند ئاوا)ی لای قەرەتەپەی کوردستانی عیراق دەژین. ڕوزبەهان: ڕەنگە بە ناوی ڕوزبەهی وەزیری بەهرامی گۆڕەوە ناو نرابن و ئەمڕۆ بە ڕۆژبەیانی دەناسرێن. زەمانی شاتۆماسب میرسەبری روزبەهانی میری ئەم هۆزە بووە و ناوی لە قاموسالاعلامی شەمسەدین سامیدا هاتووە. جەمیل

## دەستەی یەکەم

# فەرمانڕەوایانی سیامەنسووری

### خەلیل بەگ

سالّی ٩٦٠.ك (١٥٥٢-٥٣.ز) کوڕە میرێکی سیامەنسووری -کە ناوی خەلیل بەگ بوو- شاتۆماسب بردیە جەم خۆ و بۆ سەرڕاستی لە ڕاست کاروباری دنیاداری پەروەراندی و بەگی بۆ بە خان گۆڕیەوە و کردی بە میری میرانی هەموو کوردەکانی ئێران. بلّ ژ هۆزی سیامەنسوور بیستوچوار تیرە و هۆزی کوردیتریش -کە هەر بەرەی میری خۆیان بە جیا هەبوون- بەرانبەر بە فەرمانی شا، هەموو هاتنە بەرفەرمانی و سولّتانیە و زەنجان و ئەبهەر و زەڕرینکەمەر و چەند مەلّبەند و ناوچەیتری ئازربایجان و عیراق پێ خەلاّت کرا؛ فەرمانیشی بۆ دەرکرا کە گەرەکە سێ هەزار سواری کورد ساز بدا و لە نێوانی قەزوێن و تەورێز دامەزرێن و پاسداری ڕێ و بانان بن و نەهێلّن دز و پیاو خراپ ڕێ بگرن یان لە ڕێ دەرچن.

دوو- سێ سالّ ئاوا گوزەرا. کوردی دەستپیس و شڕەخۆر، زۆربەی زۆریان چوونە لای خان و ڕاست و ڕەوان پێچەوانەی فەرمانی شا دەبزووتنەوە؛ چەتەیی و ڕێبڕیان دەکرد و کاروانیان ڕووت دەکردنەوە و بە خانیش زەوت نەدەبوون و لە ئەنجامدا کۆ بوونەوەی ئەو کوردانە لەو هەردانە ببووە مایەی پەرێشانی و ئازاردانی هەموو ڕێوینگ و ڕێبواران و شاتۆماسب خواخوای بوو وەك خۆی لێ بێتەوە. خەلیلخانی لەوێ هەلّداشت و ناوچەیەکی لە خوار عیراقێ پێ بەخشی و ناردیە سنووری خوراسان و کاتێ بەختی خواری هێنا و دز و چەتە نانیان بڕا، هەموو هەر یەك بە لایەکدا بلاّو بوون و ئەویش هەتا لە دنیا ژیا، هەر لە کەوشەنی خوراسان دەگەلّ هۆزی سیامەنسوور، کاروباریان پاسداری بوو. کاتێ کە کاروانی ژیانی تووشی ڕێگری مەرگ هات، کوڕێکی بە ناو دەولّەتیار بە یادگار لێ بەجێما.

## دەوڵەتیار کوڕی خەلیلخان

بە فەرمانی شاسوڵتان محەمەد، دولەتیاری میرمنداڵ لە جێگەی بابی دانرا و نازناوی خانی پێدرا و بوو بە دەوڵەتیارخان. لەو سەردەمانەدا کە وڵاتی ئازربایجان دەبەردەستی عوسمانیاندا بوو، دەوڵەتیارخانیان ناردەسەر سنووری ئازربایجان کە ئاگادار بێ. ناوچەی کرشب و زەڕرینکەمەر و سجاس و زەنجان و سورلق و قیدار و شەبستان و ئەنگوران و قانجوغەی سەرێ و قانجوغەی خوارویان پێ سپارد. ئەو مەڵبەندانە لە بەر شەڕ و شۆڕ و هەڵات هەڵات و کێشە و ئاژاوە بە سمی ئەسپی قزڵباشان و لە تەق و ڕەوی کوردان، دەبەر پێیاندا چووبوون و هەموو وێران و خاپوور بوون. دەوڵەتیار دەبوو بە فەرمانی شابە سەر ڕابگا و ڕێکیان کاتەوە و ئاوەدانییان تێ بخاتەوە. ئەویش ناوچەی کرشی کردەبنکەی خۆی و دژێکی زۆر پتەوی لێ دروست کرد و شارۆکێکی بە دەورەوە بنیات نا. دێوی بابی بوون دەکەللەی دەمی و قەڵای حەستەمی بیری پێ گۆڕی و نۆکەری کردنی پێ سەرشۆڕی بوو؛ لەبەر فەرمانی شاوەدەر کەوت.

سوڵتان محەمەد ویستی تەمبێی کا. دەوڵەتیارخان کە زانی خۆی لێ ساز دەدەن، ئەویش وەخۆ کەوت و لە دۆژی ئەنگوران و شەبستاندا، هیمی قەڵایەك گەلەك مەزنی داڕشت. لەسەر فەرمانی شاسوڵتان محەمەد شەش هەزار سوار بە سەرداری مورشید قولیخانی شاملوو هاتنە سەر دەوڵەتیارخان و دەوری قەڵایان دا. شەوێك لە شەوان دەوڵەتیارخان و کۆمەڵێك کوردی نەبەرد و ئازای یار و هاوکاری، لە قەڵا دەرچوون و وەك بەڵای عاسمان خۆیان پێدادان و بەربوونە گیانی قزڵباشەکان. وەك گورگی برسی خۆ باوێژێتە ناو کۆزی کاران، کارێکیان بە قزڵباش کرد و کارەساتێکیان بە سەر هێنان و دابڕێکیان وێ خستن و قڕانێکیان تێ خستن، هەر مەگەر قزڵباش باش بزانن کە چۆن ئاشێکیان بۆ نانەوە و چەند لاشیان لێ گلدانەوە. قزڵباش بە ورەنەماوی و بێزراوی و شپرزەکراوی و سەر لێ شێواوی، ڕێی هەڵاتنیان گرتە بەر و دەوڵەتیارخان کەوتە سەریان و ڕاوەدووی نان و زۆربەی زۆریان بە دەمی شیران لەت کران و زۆریان پێیان لەبەز دەچوو، دەگیران و دەبوورانەوە. دایکە پیرەی دەوڵەتیارخان -لەو ناو شەڕ و هەنگامەدا- سواری ئەسپی بێزین ببوو، وەشوێن ڕاکردووان دەکەوت و هەرای دەکرد: «هەی بەنەقارە! هەی بەنەقارە!» واتا تەپڵ و کەرەنایان لە مل داڕنن. ملوانە و نەقارەی حەوت میرلیوایان وە دەست دەوڵەتیارخان کەوت و هێنانیەوە ناو قەڵایە. قەلەوقوتە

و گەجەرگوجەری شڕ و شەپڕێوی پاشماوەی شیر و خەنجەری کوردان -کە دەرباز ببوون- لە ڕوویان نەهات بگەڕێنەوە مۆڵگەی پێشوویان و لە ترسی شاعەباس[1] بەرەو پاتەخت نەگەڕانەوە و لە ڕووی ناچاری چوونە گەیلان و خۆیان حاشاردا. خانئەحمەدخانی والی گەیلانێ پەسیوی دانێ و بژیو و نانی بۆ دابین کردن و لە پاش چەن ڕۆژێك بە فەرمانی شالە جەلەی دان و بردنیە قەزوێن و لە سەر گوناهی لە شەڕ هەڵاتن -دەگەڵ کۆمەڵێك لە تاوانباران- بەداردا کران.

بەو سەرکەوتنە گرینکە، دەوڵەتیارخان لە خۆ دەرچوو؛ شەیتانی شەڕ قانەقدی داو وازی بە ئاوەزی دەکرد و ڕۆژبەرۆژ لە ڕێی دەردەبرد؛ تا وای لێهات کە پەردەی شوورەیی دڕی و پای لە بێشەرمی هەڵبڕی و گوڕی بەستە سەر عیراق و ویستی ناوچەکانی سوڵتانییە و ئەبهەریش هەر بخاتە ژێر دەستی خۆی. بەڵام تا سەر بۆی نەچووە سەر؛ شاعەبباس لەشکری زۆری هۆزی شاملووی بە سەرداری مەهدی قولیخانی نەوەی ئوغزیوارخان ناردەسەری و بۆ کلۆڵی لەو دەمەدا هۆز و تیرەی سەر بە دەوڵەتیارخان و پیاوە شەڕانیەکانی لێ دوور بوون. چەند کەسێکی کەمی دەگەڵدا بوو؛ قەڵاش هێشتا سەر و بەری نەگیرابوو؛ بورج و ڕوانگەی دیدەوانی لێ نەکرابوو. لە قەڵادا خۆی مەڵاس داو شاملوو دەوری قەڵایان گرت و وڵامیان بۆ شاعەبباس نارد. شا زۆر بەلەز بەرەو شەڕگە کەوتە ڕێگە. دەوڵەتیارخان لە هاتنی خودی پادشازۆر سەرسام بوو. بە خۆشی خۆی لە قەڵاکەی هاتە دەر و بە سەرشۆڕی و پاڕانەوە ڕێسمەی دەرگانەکەی ماچ کرد. لەسەر فەرمانی شاعەبباس سێسەد کەسێك لە ئاغایان و سەرناسانی خزم و کەسی دەوڵەتیارخان خرانە کۆت و بەندەوە و زنجیر کران و ژن و ماڵ و وردەو منداڵیان بە تالان بران و پاش چەند ڕۆژێك دەوڵەتیارخان بە دارێکدا هەڵواسرا و لە دنیای پڕ لە فیزەوە بەرەو دنیای خۆشیان ڕۆیی.

باوەڕت بێ بە گفتی دوژمنی خۆت | پەتی خنکان دەخەیتە گەردنی خۆت
کلکی مارت پەڕاند و بوویتە برای | خۆت بە خۆتی دەکەی کە پێوەی دای[2]

---

١- باسی لەشکری شاسوڵتان محەممەدەو لە پڕ ناوی شاعەبباس دێ! دیارە ئەوەندەماوە بووە کە شای پێشوو نەماوە و شاعەبباس پەیدا بووە؛ بەڵام دانەر نێوانی بە باسەکە نەداوە. هەژار

٢- حوسێنحوزنی لە *تاریخ عالم‌آرای عباسی* دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەمیر دەوڵەتیارخان لە میرە ←

← بەناوبانگەکانی شاتۆماسبی سەفەوی بوو. لە لای هەمزەمیرزای سەفەویش زۆر لە پێش و خۆشەویست و نیاز ڕەوا بوو. کاتێ هۆزەکانی تکلوی تورکمانی لە شا هەڵگەڕانەوە، زۆری یاریدەی شا داو لە پاداشتا کرا بە یەکێك لە سەردارە پایەبەرزەکانی تایبەتی شاهانە و تا ساڵی ٩٩٣.ك (١٥٨٤.ز) هەر بەو پایەوە مایەوە. کە شاسوڵتان محەممەدی خودابەندەی سەفەوی لە تەورێزەوە ڕووی کردەمەڵبەندی سوڵتانیە و لەوێی هەڵدا، کردیە میری سیامەنسووریان و لە شەڕی خۆیەخۆی نێوان شازادانیش بەشدار بوو. بە لەشکری خۆی زۆری تۆماسب‌میرزای برد کە دەهەزار تورکمانی دەگەڵدا بووە و بەو ئازایەتیە لای شای سەرخستووە و دەگەڵیشی چۆتە ساین‌قەڵایە و شەڕکۆتایی هاتووە.

هەروەها حوزنی دەڵێ: دەوڵەتیارخان -وەك هەموو میرە کوردەکانی ئێران- دەیزانی شا زۆر بێ‌هێزە؛ قەڵای خۆی پتەو کردن و ناوچەی گوشاد دەکردەوە و قەڵای سجاسی دروست کرد و چی پێویستی بوو تێی خزاند. ساڵی ٩٩٥.ك (١٥٨٧.ز) کە شاعەباس هاتە سەر تەخت، مورشیدقولی تورکمانی دووزمانی لە دەوڵەتیار کرد. شا هێشتا خۆی نەگرتبوو بۆیە خۆی تێنەگەیاند. ساڵی ٩٩٨.ك (١٥٩٠.ز) لەشکرێکی بە سەرکردایەتی حوسێن‌قولی‌سوڵتانی سیامەنسووری ناردەسەر و دەوڵەتیار بە گژیدا هات و لەشکری شا شکا و شاعەبباس هیچ ڕێی بۆ نەمان، ڕێگەی گزی و فزی نەبێ؛ بەڵام بەویش چی بۆ نەکرا.

ساڵی ١٠٠٠.ك (١٥٩١.ز) شاعەبباس زۆر بە هێز ببوو. لە قەزوێنەوە لە دەوڵەتیاری گێڕاوە کە با چاوی پێ بکەوی و پەیمانی دۆستانە ببەستن. دەوڵەتیار لە وەرامی شادا هەڵیکوتا سەر زەنجان و سوڵتانیە و ئەبهەر و تارم و هەمووی داگیر کردن. شاعەبباس لەشکرێکی یەکجار زۆری لێ کۆ کردەوە و بە سەرداری مەهدی‌قولی‌خانی شاملووی تورکمانی، ناردیە سەری و دەوڵەتیارخان ئەو لەشکرە زۆرەی لە ناو برد و بڵاوی کرد و ئێرانی زۆر زیانبار کرد. بەڵام شا دەستی لێ هەڵنەگرت لە پێشوو پتر لەشکری تەیار کرد و بە سەرکردەیی حوسێن‌قولی‌خانی قۆرووچی بە گژ دەوڵەتیاریدا کرد و ئەویش لەوی پێشووی خراپتر بەسەر هات. ئەمجار شا حوسێن‌خانی شاملووی حاکمی قومی بە لەشکرەوە نارد و ئەو لە هەمووان تەختتر پشتی وە عەرزێ کەوت و ئەو لەشکرەش بووە بەفری پار.

شا هۆزی-هۆزی هاتەوە سەر گزیەبۆزی و زانی ئەگەر بە شەڕ نابێ، با بە گەڕ بێ. نامەی بۆ دەوڵەتیار نووسی و نیوە هەڕەشە و زۆر بە زمان لووسی و دڵخۆشی دانەوە و گلە و سکاڵای دۆستانە بوو؛ داوای لێکرد کە ببنەوە دۆستی گیانی و شەڕ بە دەلاقە هەڵپەسێرن. دەوڵەتیارخان لە وەرامدا داوای کرد کە لە جێیەك چاوی بە شا بکەوێ و شا بە ناوی ڕاوەوە هاتە دیدەنی و هێزێکی زۆریشی دەگەڵ خۆ هێنا و لە نزیك قەڵای ئەو لەشکریەزی کرد. دەوڵەتیار چووە دیداری و شا پێشوازییەکی گەرمی لێکرد و دەستی نایە ناو دەستی و بردیە ناو خێوەتی خۆی و هەملی لێ هێنا و خرمچون گرتیان و خستیانە ناو کۆت و زنجیران و دانیشتووانی قەڵاشیان بە شیران لە بنە هێنان و دەوڵەتیاریان بە دیلی هێنا قەزوێن و لە مەیدانی سەعداباد -کە هەر بۆ لێ‌هەڵواسینی کوردان تەرخان کرابوو- بە داردا کرا. دوایی هۆزی سیامەنسووری درانە دەست میرحوسێن‌قولی خانی سیامەنسووری؛ کە لەوەبەر پاسەوانی شا بوو؛ زۆریش بەڕێز و پایە بوو. هەر ئەویش ساڵی ٩٩٩.ك (١٥٤٩.ز) قەڵای ئیستەخر و چەند شوێنێکی بۆ شاعەبباس گرت و بەوە زۆری خزمەت پێکرد.

## دەستەی دووەم

# فەرمانڕەوایانی چکنی[1]

ئەو هۆزە لە ناو کوردی ئێراندا لە هەموو هۆزان ئازاترە و لە بە سامی و سەربەرزیدا لە گشتان دەست باڵاترە. لە پاش ئەوەی کە بێسەر و سەردار و بێ داژدار مانەوە و لە میر ومیرزادەکانیان کەسیان لە ئارادا نەما[2]، وەك کەرکەمەڕی دوورەشوان، پەرژ و بڵاو بوونەوە و هەر پارچەیەی لە شوێنێکدا گیرسانەوە و هێندێك چووبوونە عیراق و برێك بە ناو ئازربایجاندا خولیاندەخوارد و ڕێگرییان کردە کردەوە و هیچ کەسیشیان هەڵنەدەبوارد. بازرگان و سەوداگەر و چەرچی و کاروانی لە هەموو لای ئێرانەوە، بە داد و قوڕ پێوانەوە هاواریان بۆ شائتۆماسب نارد و دادیان لە دەست چنگنیان کرد. شافەرمانێکی وای دەرکرد کە لەشکری و خەلکیتریش لە هەر جێیەك چنگنی ببینێ بیکوژێ و ماڵی بەرێ و ئەبێ لە هەموو لایەکەوە لە ئێرانیان دەرخەنە دەرەوە و بۆ کوێ دەچن بچن. پێنجسەد کەسێك لەو چنگنیانە بە نیازی چوونی هیندستان ڕوو بە خوراسان ڕێکەوتن.

قوزاقخانی تکلوو -کە حاکمی هیراتێ بوو- لە شائتۆماسب دەترسا و لای وابوو پێیەوە دەدا. لەو چنگنیانەی گێڕایەوە و لە لای خۆی دایمەزراندن و زۆری چاوێری لێکردن.

کە مەعسووم بەگی سەفەوی کاری قوزاقخانی یەکجاری یەکلا کردەوە، چنگنیەکان ڕوویان کردەغورجستان[3] و لەوێ مەکۆی خۆیان دانا. شای ئێران کە ئەمەی زانی و دەشیزانی چەند ئازان و هەموو کەس لێیان دەترسێ، میرزادەیەکی چنگنی بە ناوی بداغ دۆزیەوە و کردیە پاسداری شاهانە و پایەی میرایەتی دایە و ناردیەوە ناو چنگنیان و ناوچەیێکی لە خوراسانێ پێ بەخشین، کە پێی بژین

---

١- چگنی: چنگنی.

٢- ساڵی ٩٥٥.ك (١٥٤٩.ز) عەلیسولتانی چنگنی میری ئەو هۆزە بووە و قەڵای وان و سنوورەکانی لە دژی عوسمانی پاراستووە و تەنانەت کە سولتان سولەیمان هاتووە، بەو میرە نەوەستاوە و پاشەکشەی لەبەر کردووە. جەمیل

٣- مەڵبەندێکە لە نێوان کابل و هیراتە و لە ئەفغانستانی ئێستایە. جەمیل

و هەموویان باش بووژانەوە.

ساڵی ۱۰۰۱.ك (۱۵۹۲.ز) عەبدولـمۆمن‌خان، کوڕی عەبدوڵڵاخانی ئۆزبەگ، بـۆ گـرتنی قـەڵای قۆچان بە سوپایەکی سی‌هەزار کەسیەوە هاتە سەر بداغ‌خان و دەوری لێدا؛ شـاعەبباس بـە هاواریـەوە چوو. عەبدولـمۆمن‌خان وازی لە قەڵاکە هێنا و شا، بداغ‌خانی بە لاواندنەوەی شـاهانە سـەرفراز و بـێ نیاز کرد و پێنج کوڕی بۆ کردەمیر وخۆیشی کردەمیـری میـران و گەڕاوە عـێراق و ئێـستا لـە ڕێـزی میـرە گەورەکانی شاعەبباسە.[1]

---

۱- حوزنی موکوریانی دەڵێ: ئەم بداغ‌خانە میـرێکی بەناوبانگ بووە. لە پاش مەرگی ئیسـماعیل‌میـرزای سـەفەوی و هاتنە سەر تەختی مـحەمەدی‌خودابەندە، «خەیرەنسا بەگم»ی دایکی شاعەبباس، خوراسانی بە بداغ‌خان سپارد کە بـە سەری ڕابگا و لە تەتەر و ئۆزبەکانی بپارێزێ. بداغ هێزێك گەورەی لە هۆزی چـنگنی پێکـەوە نـاو چـووە خوراسـان و خستیە ژێر پەنـجەی خۆیەوە ساڵی ۹۹۷.ك (۱۵۸۹.ز) شاعەباس کردیە لەلـەی شازادەسـوڵتان حوسـێن و مەڵبەنـدی مەشهەدی لە خوراسان پێ بەخشی و خەبوشان و دەورویەریشی دابە کوڕەکانی؛ کە حەسەن سوڵتان و حوسێن سوڵتانیان لە هەموان بەناوبانگترن.

نوورمـحەمەد خانی نەتەوەی چەنگیز و عەبدولـمۆمن‌خانی ئوزبەگ هاتنـە سـەری و شـەڕی زۆر خوێناویـان لـە نـاودا قەوما و کوردەکان توانیان هێرش‌بەران بە پاشدا بگێڕنەوە و سنووری ئێرانیان زۆر باش پاراست. کە ئێران و عوسـمانی بوو بە شەڕیان، شاعەبباس حەسەن‌عەلی‌خانی کوڕی بداغ‌خانی کردەوالی هەمەدان؛ کـە سـنووری بپـارێزێ. تـا سـاڵی ۱۰۰۵.ك (۱۵۹۵.ز) لە هەمەدان مایـەوە. سـاڵی ۱۰۰۶.ك (۱۵۹۶.ز) لەشـکری ئوزبـەکان هاتـە سـەر دامغـان و بەستام. حەسەن‌عەلی‌خانی چنگنی بە گژیاندا هات و شەڕی پاڵەوانانەی کرد و دەگەڵ میـرزاعەلی دەبیـری لە مەیدانی شەڕدا کوژرا. دوای ئەو بەستام درایە دەست عەلی‌سوڵتانی برای ناوـنجی.

ساڵی ۱۰۰۷.ك (۱۵۹۷.ز) بداغ‌خان هێرشی بردەسەر مەروشاهجان و ماورائونەهر و پەلاماری تورکمـان و ئۆزبـەکانی داو بەرەو باغباد و بوخارای ڕەتاندن و نیسا و ئەبیوەردی گرت و شاهجانی هێنا بەرفەرمان.

ساڵی ۱۰۱۱.ك (۱۶۰۱.ز) مەزنایەتی قەڵای ماروچاق درا بە یوسفـعەلی‌خانی کـوڕی بـداغ‌خـان و مەڵبەنـدێکی زۆر هەراویش بە بایرام‌عەلی سوڵتانی کوڕی بداغ‌خان سپێرا و دەگەڵ یووسفـعەلیدا بە هاوبەشی بە سـەر بەشـی هـەردوولا ڕادەگەیشتـن.

ڕووپەڕ ۲۰۷ی کتێبەکەی ڕەشیدیاسـمی -کە نـاوی کـوردە- دەڵێ: «عاشـوورخانی چـنگنی لـە میـرە گـەورەکانی شاعەبباس بوو؛ بە سەر مەروشاهجان ڕادەگەیشت.» ئێستا بە تەواوی نازانیـن ئەو هۆزە لە کـوێ دەژیـن. بـەڵام سـێ هەزار ماڵێکی ڕەوەندیان زستان لە لای هەڵەبـجەن و هاوین لە مەراغە دەژین و ڕەنگە ئەوانی‌تر لـە ئەفغانـستان بـن. جەمیل

## دەستەی سێهەم
# فەرمانڕەوایانی زەنگەنە

لە ڕۆژگاری دەسەڵاتداری شائیسماعیلی سەفەویدا زۆریان گەشە کرد و پلە و پایە و سایە و مایەی فرەیان بۆ پەیدا بوو. لەوانە بوون کە نزیکان ئێرەیان پێ دەبردن. بەڵام کە میرەکانیان لە ناو چوون، ئەوانیش بڵاو بوون و بوونە خزمەتکاری قزڵباشان و لە عیراق و خوراسان دامەزران و هێندێکیشیان ڕەگەڵ پاسدارانی پایەبەرزی شا خران.[1]

---

١- لە سەر میرەکانی پێشوویانەوە شتێکمان چنگ نەکەوت. بەڵام نووسەری *تاریخی ئەردەڵان* دەڵێ: «عەلیبالیخان میری زەنگنە لە میرە هەرە نزیکەکانی لای شاعەباسی سەفەوی بوو.» ڕەشیداغای زەنگنەش لە کتێبەکەی خۆیدا کە هێشتا چاپ نەکراوە، دەڵێ: «لە چەرخی دوازدەهەمی کۆچیدا میرسمایل، میری زەنگنە بوو کە لە پاشان بۆ عوسمانیان ببووە گزیری کەرکووک.» هەتا میر بوو لە زنوراوای نزیک قەیتولی سەر بە سەنگاو بوو -کە ئێستا وێرانەیە- قەڵاکەشی ناوی قولەیخورمادار بوو. مەلا و فەقێ و شاعیری خۆش دەویستن؛ کاروانەڕێی ناو دەربەندی باسرە و ڕۆخانەی خۆشکرد و لە پاش ئەو، ئەلقاسی کوڕی ببووە سەرکۆماری زەنگنە و پاش ئەویش ئەحمەد بەگ و محەمەداغای کوڕی پێ ڕادەگەیشتن. ئەحمەد، محەمەدی وەدەرنا و ئەویش پەنای بە ئێران برد و جوانڕۆیان پێ سپارد. محەمەدئاغا بە قەسیدەیەک، گلە لە برای دەکا و قەسیدەکەش ساڵی ١٩٤٥.ز لە *دەنگی گێتی تازە*، ژ١، بەرگی٥دا چاپکراوە. لەوێدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| ئەمەز چێش باچۆم زویان بەستانەن | وەرنە تەرک زێد چەتەور شاسانەن |
| ئاو عەواسان، سەدای ڕۆڵەڕۆ | خەیلێ خاسترەن جە بوزورگی تۆ |

ئەحمەد بەگ پەلی هاویشت و زەنگنە و گێڵ و هەمەوەندی خستە ژێر دەست و لە دەربەندەوە پەلاماری شارەزووری داو ساڵی ١١٣٣.ک (١٧٢٠.ز) خانەپاشا بەرەو پاشی گێڕایەوە. ئەحمەد بەگ ڕەشید و بەهێز و دادگەر و زانا و دڵاوا بووە؛ چەند قەڵا و پەنا و کۆشکی هاوینەی دروست کردوون و ئێستا ڕماون و نەماون و شوێنەواریان لە نزیک قەیتۆڵەوە ماوە. سولەیمان بەگ، کوڕی مستەفا بەگ، کوڕی میرسمایل -کە نازناوی شێعری «زەبوونی» بووە و لە پسمامانی ئەحمەد بەگە- ڕۆژێک چۆتە چیای خوڕنوزان کە لای گوندی کانیقادر و لە ناوچەی گێڵ دایە و شوێنەواری کۆشک و قەڵای ئەحمەد بەگی دیوە؛ قەسیدەکی پێ هەڵگوتووە کە لە ژ٥، بەرگی٥ی *دەنگی گێتی تازە*دا چاپکراوە. ←

چوو لە کیفی نیشتەجێ بوو. ئەو خەبەرە لە ئەستەنبووڵ بە بیسەری خاوەن شکۆی سوڵتان سولەیمان‌خان گەیشت، فەرمانی لە بان سەرانی بە مۆر نەخشاند کە درزی داود[1] گیسر نەبێ و سەری وەیس و هاوکارانی و دەست و پێوەند و خزمان و ژن و منداڵی بە براوی بنێرێتە ئاستانەی کونە بەخت!

بە پێی فەرمان، درزی گەییە کیفی و سەری وەیس بەگ و وەلەد بەگی برای و خالید و ئەلوەندی کوڕی بڕی و بە دیاری بۆ ئاستانەی نارد و دوو کوڕی منداڵۆکەی وەیس: قلیج بەگ و زولفەقار بەگ وەبەر سەر بڕان نەکەوتن و بردیاننە لای ئەحمەد بەگی زەرقی؛ کە میری عیتاق بوو. میری زەرقی پەنای دان و بۆشیان لە بەر سەردەرانەی بەرزی بەختەوەرگای دەرگای پادشا پاڕایەوە و بژیوێکیان بۆ بڕینەوە. لە پاش ئەوەی پێ‌گەیشتن و بوونە پیاو، دەگەڵ خزم و هۆزی خۆیان باریان لێنا و چوونە پەنای شاتۆماسب و داڵدەی دان.

## قلیج بەگ کوڕی وەیس بەگ

هەرکە گەیشتە لای شاتۆماسب کردیە میری پازۆکیان و ناوچەی زکمی سەر بە وڵاتی گەنجەی دایە؛ نۆ ساڵانی لەوێ ڕابوارد. لەو کاتەدا کە شالە گورجستان دەگەڕاوە، دەرزی مەرگی دەدڵ ڕاچوو. کوڕێکی مناڵی جێهێشت کە ناوی وەیس بوو.

## زولفەقار بەگ کوڕی وەیس بەگ

لە جێی برای کرا بە مەزنی پازۆکی و شاتۆماسب دەیپەروەراند؛ بەڵام زۆر لە جیهانێدا نەما. تەمەنی هەر لە تەمەنی گوڵدا بوو، کە گڕەی مەرگی لێ هەڵکرد و لك و پۆپی تێك کردەوە و پەڕ بە پەڕی هەڵپڕووزاند و دەژێر خاکی ڕەشی خزاند.

| | |
|---|---|
| گەشە مێلاقە بۆچی جەرگی ڕەشە؟ | بۆ وەنەوشە هەمیشە سەر بە هەشە؟ |
| تێدەگەن هەرچی جوانە کەم تەمەنە | شینە بۆ زۆر نەمانەوەی چەمەنە |

١- ئەمین زەکی بە داود درزی ناو دەبا و دەڵێ لە هۆزی «دورزی» بووە کە لە سووریا دەژین. جەمیل



چونکە نێرینەی لێ نەکەوتەوە، مەزنایەتی پازۆکی بۆ وەیس بەگی برازای ما و یادگاربەگیان بۆ کردەلەلە و دایکی وەیس بەگ لە یادگار بەگ ترسی پەیدا بوو مەبادا کوڕەکەی شتێکی بە سەر بێ، وەیسی هەڵگرت و هاتە قەزوێن و بردیە ماڵی شاتۆماسب.

## یادگار بەگ

### کوڕی مەنسوور، کوڕی زەینەڵ، کوڕیشوکور، کوڕیحوسێن عەلی بەگ

لە دوای ئەوە دایکی وەیس کوڕەکەی خۆی لە مەزنایەتی پازۆکی دوور خستەوە، سەرناسان و کەیخوایانی پازۆکی قۆڵیان بۆ یادگار بەگ کێشاو بە فەرمانی شاهی مەزنایەتی پازۆکیان و میرایەتی ئەلشگوردی درایە دەست. یادگار بەگ پیاوێکی زۆر بیچم خول و دێوانانە هەڵکەوتبوو؛ هەمیشە دەگەڵ هەوالی دڵ ساویلکە و شێت و وێت و بێ پەرواادا زۆر بە گەلۆری ڕایدەبوارد. بۆ خواپەرستیش خۆی نەبوو؛ زۆری گوێ بە دین نەدەدا. مەلا و کاڵ خۆشیان نەدەویست و جوێن و نەفرینیان بۆ دەنارد. لە سەر ئەوەشڕا تا بلێی ئازا و مەرد و نانبدەبوو. لە سایەی مەزنایەتیەکەی پازۆکی زۆر بووژانەوە؛ دەوڵەت و داهاتیان زۆر بوو. نزیکەی دوو هەزار ماڵێك کوردی لاوە هاتنە بەر پێی و گوند و مەزرای ئەلشگوردیان هەموو ئاوەدان کردەوە و کێڵایان و بەروبووی داو بە گەل خۆیان بە هۆزی پازۆکی دەزانی.

پازدەساڵ مەزنایەتی کرد و خوا لە کۆڵ بۆڵەی مەلایانی کردەوە و بۆ خۆی بردەوە.

## نیاز بەگ کوڕی یادگار بەگ

بە فەرمانی شاتۆماسب مەزنایەتی پازۆکیان و میرایەتی ئەلشگوردی پێ سپێرا. بەڵام ئەو بۆ لە دین لادان و گوێ بە فەرمانی خوانەدان، زۆر لە بابی خۆی تێپەڕاند. کاربەدەستی سنووری ڕۆم -بۆ تەوس و تەشەر و پلار- وڵامیان بۆ شای ئێران نارد کە بەرگی نوێی لێ موبارەك؛ ئەگەر ئاکار و کرداری قزڵباشیش هەر وەك ڕەفتاری پازۆکیان و خەنسلوویی و چەمشکەزەگ بێ، با لە کوولەکەی تەرپێشدا



نەڵێن ئێمە موسوڵمانیـــن. شاتۆماسـب بـەو سـەرکۆنەیە شـڵەژا و هێنـدێکی خەنـسلوو کوشتـــن و مەقسوود بەگی خەنسلووی لە قەڵای ئەڵەمووت بەند کرد و کاربەدەستانی سنووری هەموو لە سەر کار لابردن و نیاز بەگیش وەبەر کەوت؛ لە مەزنایەتیان دەرکرد و وەیس بەگیان -کە نازنـاوی قلـیج بـەگ بوو- لە جێگەی ئەوا کردە میر و تا شاتۆماسب زیندوو بوو، نیاز بەگ بە نیاز نەگەیشت و بـە هـیچ کارەیی دەخولاوە.

لە دوای مەرگی شاتۆماسب، شاسولتان مـحەمەد، پازۆکی کردنە دووپشك: ئەوانەی شوکور بەگی بوون بە نیاز بەگی ئەسپاردن و بوونە بەردەستی ئەمیـرخان؛ بەرەبابی خالید بـەگیش -کـە هاتبوونە لای قلیج بەگ- توقماقخان سەرکردەیان بوو. ئەلشگوردیش وەك هۆزەکە ببووە دوو کەرت.

نیاز بەگ لەو سەر سنووره زۆری ئازایەتی نواند و لەو کاتەدا کە ئەمیـرخان شەڕی لەلەپاشای کرد و شکا، نیاز بەگ لە شیـروانێ لە چەمی قەنعدا -کە لکێکی ڕووباری کوڕە- خنکا.

وەیس بەگ -کە ناوی قلیج بەگیشیٚ لیٚ نرابوو- وەگ لێی دواین، لـە دوای ئـەوە کـە دایکـی لـە ترسی کوشتـن ڕفاندی و گەیاندیە بەر داڵدەی شاوە و لە قەزوێنێدا گیـرساوە، چونکە لە شـار گـەورە ببوو، زمانزان و وریا و دریا بار هاتبوو؛ لە ناو دۆسـت و هەواڵانـدا دەستنیـشان بـوو. شاتۆماسـب خستیە ڕیزی پاسدارانی پایەبەرز و نزیك بیست ساڵ ئەو کارەی کرد. لە پاش ئەوەی نیـاز بـەگیان لـە سەر زمانشڕی و گوناهباری لە مەزنایەتی وەدەرنا، ئەویان لە جێگەی ئەم دانا.

قلیج بەگ زۆر مشورخۆر بوو؛ بە لێزانی و ڕێك و پێکی کاروباری ڕادەپەڕاند. جوێندان بە ئیمامی سوننی و قسەی سووك و کفر کردنی لە ناو پازۆکیان هەڵگرت و ئیسلامانە دەبزووتەوە و ئەوەنـدی لـە وزەیدابوو، برەوی بە ئایین دەدا و دڵی سونیانی ڕادەگرت. کاتیٚ کە شاتۆماسـب مـرد -وەك دەزانیـــن پەیـمان و سوێندی پادشایان بنیان شڕە و هەڵدەوەشیـن- ئەلشگورد وەك دەوری پێشوو تووشی وێـران بوون هاتەوە و کوندەبـەبۆی کـاول دۆسـتیش شـوێنی هێلانـەی بـۆ نـەما. هـۆز و ئـاپۆرەی پـازۆکی وڵاتەکەیان جێهێشت و هەڵوەدای شوێن چارەنووس بوون.

ئەمیـرخان یاریدەیێکی دان؛ میـریەتیەکەی کردەدوو بەش؛ قلیج بەگی لە نەخـچەوان دامەزرانـد و موچەیەکی بۆ بڕیەوە و دەگەڵ توقماقخان پێکەوە لـە چغرسـەعد ڕایـاندەبـوارد. لـەو کەوشـەنە زۆر

خزمەتی زۆر گرینگی ئەنجام دەدان.

ساڵی ٩٩٣.ك (١٥٨٥.ز) کە عوسمانپاشادەچووە سەر تەوریز، لەو ڕۆژەڕا کە عەسکەری دنیاگری ئیسلامەتی لە دەوری حەرامیبلاغی لەشکربەزی فەرمووبوو، توقماقخان و عەلی قولیخانی قلیجئوغلی و ئەسماخانی شاملوو و کەورەکانیتری قزلباش لە شوێنێك بە ناوی ئیبنە دەگەڵ سەنانپاشا چیغالئوغلیدا -کە پێشەنگی لەشکری هەمیشە لە سەر بوو- دەستەویەخە تێك هالان و خوێن و کیان بە تالان دەچوون و مەیدان ببووە کۆمی خوێنێ و کێ دەیوێرا ملی لێنێ و لێی وەپەڕێ و کەڵەکی کەلەشی وەرنەکەڕێ؟

لەو شەڕەدا قۆیوچی بەگ کوڕی شاقولی بلیلان سەری قلیج بەکی بڕی و هێنایە پێش عوسمانپاشاو نافەریمی پادشاهانەیان پێگەیاند.

قلیج بەگ کوڕێکی بە ناوی ئیمامقولی بەگ لە پاش بەجێ ما. دەپێشدا دەبووە پیاوی سەرکردەکانی قزلباش و بە تایبەتی خزمەتکاری زولفەقارخانی قەرامانلووی حاکمی ئەردەویلێ دەکرد. لە دواییدا شاعەبباس بە پلەی پاسداری سەرفرازی کرد.

هێندێك لە پازۆکیان دەگەڵ میرەکانی دونبولی لە نەخچەوان هاتنە بەر فەرمانی ئاستانەی سولتانەوە و لە لایەن فەرهاد پاشاوە درانە دەست ئیبراهیم بەگ ئوقچیئۆغلی و هێندێکیش لە ناوچەی ئەلشگوردیان دەبەر دەست نا و پاش دووساڵان وەدەریان نا.[1]

---

١- ئەمین زەکی دەڵێ: هۆزێکی گەورە بە ناوی پازۆکی لە ئەستانی تاران دەژین و هێندێکیشیان لە باشووری ئێرانن و پێنج هەزار ماڵێکیان لە نزیك مەریوانن. جەمیل

# ڕووپەڕی چوارەم

# فەرمانڕەوایانی بدلیس

### کە دەبنە باب و باپیرانی نووسەری ئەم ڕووپەڕانە

**سەرەتا**

**شار و قەڵای بدلیس کێ بنیاتی ناوە و بۆ ئەو ناوەی لێ نراوە؟**

وتـــار! چـۆن پەیـا بـووی و لە کوێـوە دێی؟ — چ جێت دیـــاری نەکراوە هێنـدەش بە جێی!

نەدیوی و لـە تـۆران هەمـوو نەخش و ڕەنگ — کری تۆن هـــەرا و بـەزم و ئـاهەنگ و جەنگ

لـــە تـــۆرا پـلـــەی پـــیـــاوەتی دەرکـــەوت — لـە هـانـدانـی تـــۆ بـوو مـرۆ سـەر کـەوت

نەشـەی دڵـتـەڕانـــی و گــەشـەی دڵبـــەران — لە تـۆن نـرخی تـاجـی سـەری ســەروەران

ئـەوەی تـــۆوی کـارێـــك بـــچێـنێ ئـەتۆی — ئـەگــەر یـادگـارێـك بـمـێـنـێ ئـەتـۆی

وەستاکارانی شیـرینکار و پەل بەنەخش و نیگارانی حەوش و بان و دیوارانی باڵەخانـە و تـەلارانی کۆشك و سەرسەرا و دوودەری و شانشینی دیوەخانی مەکۆ و کۆڕی چیرۆکوانانی پێشینان، لـە سـەر ڕووپەڕی کاغەزی مینامەڕمەڕی بێ دەغەز، بۆ وتاری وەك پازاری هێژا و نازاری هەڵسەنگاوی لێـك و لووس و لەبار کراو و لە چەرخ و مشت و ماڵ دراو، خشتی قشتی خەت و خاڵی ورد و درشـتیان -بـۆ نـموودی پڕ لە سوود و چاوئەندازی دڵنەوازی بە دڵخوازی هونەرمەنـدان- پـاڵ یـەك داوە و کـۆنگرە و بورجی تەرز و بەرز و پتەو و گورجی دژی ڕژدی سەربەهوردی کەونارایان بۆ هاوردوینە ئاراوە و لە سـەر

قەڵای بدلیسەوە بە نووسین وایان ڕاناوە کە قەڵای بدلیس شوێنەواری ئەسکەندەری یۆنانییە. حەمدوڵڵا مستەوفی قەزوێنی نووسەر و دانەری *زینتالقلوب* دەڵێ: «سەرچاوەی ڕۆخانەی دەجلە لە قەڵاکەی ئەسکەندەری جووت قۆچەوە سەر هەڵدەدا و لە لای میافارقینەوە ئاوەکانی چیاکانی کوردستانی تێکەڵ دەبن.»[1]

نووسەرانی تورک و فارس هێندێك جاران «بدلیس» یان بە پیتی «ت» نووسیوە، بەڵام هەر «دال»ەکە ڕاستە؛ بۆ چی؟ چونکە ئەوی زۆر لە باوە و لە زمان زانای بە ئاگاوە دەگێڕنەوە، ناوی یەکێك لە پیاوانی ئەسکەندەرە کە قەڵا و بازێڕی بدلیس ئەو پیاوە بنیاتی ناوە. لە لایەکیتریشەوە خودانی *لوغەتیقاموس*[2] لە مەڕ ئەو ناوە دەنووسێ: «بدلیس بە جێگەیەك دەڵێن ئاوو هەوای سازگار بێ.»

هێندێك دەڵێن شاری بدلیس سەر بە ئازربایجانە و بڕێکیدیش وادەزانن بەشێك لە ئەرمەنستانە؛ بەڵام ئەوی بێگومانە و جێگەی باوەڕی مەزنانە، لە سەر ئیقلیمی چوارەمە.

**پوختەی مەبەست:**

ئەوی کە زۆر سەرنجی پیاو ڕادەکێشێ و لە بەر گوێ سەمەرە و سەیرە و هەواڵنووسانی پێشینە و شوێنەوار ناسانانی دێرینە لە سەردەمی قەڵەمەوە خستوویانەتە سەر ڕووپەڕ: لە ڕۆژ و ڕۆژگارێکدا کە ئەسکەندەر لە بابل و عیراقی عەرەبانەوە بەرەو ڕۆم وەڕێ کەوتبوو، ڕێبازی کەوتە کەناری ڕووباری «شط العرب» و ئاوەکەی وەبەر دڵ کەوت و فەرمانی دالێزان و پسپۆڕانی ئاو بە لێواری ئەو چۆمەدا پێ هەڵکشێن و وێکەون هەر ئاوێك کە پاڕێ زێیە، بیدەنە بەر ئەزموونەوە و بە چاوی زیت و ڕوونەوە لێی بڕوانن و بیچێژن و پوخت و پەزی پێ بپێژن و سەنگی کەن و بیکەڵێنن و بیپاڵێون و دایدەڵێنن و ژنان مەشکەی پێ بژێنن هەتا باش ڕوون دەبێتەوە کام ئاوی کانی و دەراوان -لە چاوپڕایی سەرچاوان- سووك و ڕەوانتر و سارد و تەزی و بەتامترە، دیاری کەن و بەرهەمی ئەو تۆژینەوە و دۆزینەوەم بۆ بێننەوە. بە ئاوەزانی لە ئاوزان، لە دواوانەوە بەڕێ بوون و بەرەو بناوان پێداچون و هەموو تەرزە ئاویان

---

١- قەڵای «ذوالقرنین» لە سەر ترۆپکی چیای ئەرغەنیە. گۆڕی «ذوالکفل» پێغەمبەریش ها لەوێ. عەونی

٢- محەمەدەدین کوڕی یەعقووبی فەیروزابادی، کە خاوەنی *قاموسی* بەناوبانگە. جەمیل

ئەزموون؛ تا گەینە سەر ئەو ڕێژگەیەی چەمی بدلیس دەگەڵ دەجلە تێکەڵ دەکا. کە دەیدەنە بەرهەڵسەنگان، لە هاوسەنگان گەلێك سڤکتر دێتەوە؛ کە لاوێچی لێ پڕ دەکەن و چەند قومێکی لێ فڕدەکەن، دڵیان فێنك دەبێتەوە و ماندوویيان دەحەسێتەوە. ئاوە و ئاو پێ هەڵدەچن تا دەگەنە ئەو بەستۆڕەی کە چەمی کسور و ڕەبات لەوێ باوەش پێکدا دەکەن. ئەو دوو ئاوەش هەمبەر بە یەکتر ڕادەنێن، لایان ئاشکرا و سوور دەبێ ئاوی ڕەبات لە چاو کسور وەك سواڵەت و بلوور وانە و کسور گرۆی بردۆتەوە. بەو دەم چەمەش هەڵدەگەڕێن تا دەگەنە بناوانی کە لە سەر چەشمێك هەڵدەقولێ:

| | |
|---|---|
| لە لای ئەو ئاوە ڕوونی چاوی قرژاڵ | دەکەوتە بەرپلار و تەوس و تیتاڵ |
| لە شەودا ڕەنگی ئەستێرەی دەنەخشاند | لە ڕێی ڕۆژێکەوە ئاروی دەقەڵشاند |
| سەهۆڵ لە گرێوە ساردی دابەزیبوو | تەماشات کردبا چاوت تەزی بوو |
| ڕەشی زەنگی لەوێدا خۆی بشوتبا | دەبا کافوور و بەفرت پێ بگوتبا |
| لە ئاوا تاوی ئەسکەندەر گرەویەر | لە مرواری چەوی ئاوی بەرەویەر |
| لە ڕوویا ئارەقی سەر کوڵمی یاران | لە شەرمان خۆ وەدەر ناخەن چجاران |
| خدر لەو ئاوە لاوێچێکی نۆشی | بە بێ پیربوون دەژی تاسەر، بە خۆشی |

مژدەبە ئەسکەندەر درا کە ئەو ئاوەی تۆ ئەو ماوەی چەندین ساڵە لە تاریکی بۆی دەگەڕای، لە کوردستانی ڕووناکدا بە ڕۆژی ڕوون دۆزرایەوە. بە بێ هیچ وچان و پشوو بە چوار ناڵە ئەسپی ئاژۆت و خۆی گەیاندەکانی و ئاوی پەسند کراو. دەورێکی لە سەر چاوەدا و بە دەورەی کانیدا ڕوانی؛ چۆن دیمەنێك و چۆن چیمەنێك؟! ئەوەندی چاو هەتەر دەکا، هەموو میرگ و میرغوزارە؛ پاك چیمەن و لالەزارە؛ چێنکەیە و شینکەی نزارە و چەند جۆبار و چەند ڕووبارى بە ئاودا دێن. بۆ هەر لا لای دەکردەوە گەشکە دەبوو، گشتی سەوزەی تازە ڕواوی گەش و شەق و بەرەونەقە لە دەم دەرا و کەم کەم سەری دەرێناوە؛ وەك منداڵی ساوای نازدار لە باوەش و کۆش و بەری گیای هەراشدا لە ئامۆ خۆی پەنا داوە. سوێسن و بەیبون و هەلاڵە و بیزا و هەلز و دۆری و ژاڵە و بەڕەزا و چنوور و مەندێ و بێژان و گیابەند و خاوە، لێك هاڵاون و سەریان بە یەکەوە ناوە. چیا و کەژی بەرز و سەرکەش قیتوقۆز لە هەر



چوار دەورە وەکووو خدری زیندەی پیرۆزی بەودم و پیت و جێگەورە، سەرتاپا کەسکیان پۆشیوە. گوڵ و دەوەنی داوێن و تیسوێ و کیفاری تەلانان، تورت و شلك و شەمەندن و هێندەبە گەشە و لە شۆقن، سوێندێ بخۆ ئاوی ژینی ناو ئەفسانەیان نۆشیوە.

| | |
|---|---|
| هەموو جێ پەنجەیەك لەو میرگ و دەشتە | بە ڕەنگ و بۆ هەزار هێندەی بەهەشتە |
| هەزار گوڵ هەر گوڵەی بۆنێك و ڕەنگێك | هەزار مەل هەر مەلەی ئاواز و دەنگێك |
| چڵان سروە بە سرتە دەیدواندن | بە نەرمی ڕایدەژاندن بۆ نواندن |
| تکەی شەونم لە سەر پەلکی گوڵاڵان | وەکووو خوەدان لە سەر گۆنای ڕواڵان |
| لە دەم چەم داری میوە و داری بیێ‌بەر | دەیانڕازاندەوە دوو بەر بە سێبەر |
| هەور تا ڕێی دەکەوتە لێڕەواری | لە جێی باران گوڵاوی لێ دەباری |

ئەسکەندەر باوەڕی نەبوو کە هەرگیز دیدەی ڕۆژگار لەو شوێنە جوانتری دیبێ و لەوە خۆشتر بە سەر بیری خەیاڵاوی و بە بەردەم گوێی خەیاڵیشدا تێپەڕیبێ. بە دڵێك نا بە هەزار دڵ شێت و شەیدای ئەو جوانیە بوو. ئاواتی بوو شانەبوایە و بۆی بلوایە هەتا مردن هەر لەو مەڵبەندەبمێنێ و لەو دیمەنەوە ڕامێنێ و چاوانی لێ نەتروکێنێ.

بارونەی شایان هانی و لە گۆڕایی دەوری کانی خێوەت و خەرگا هەڵدرا و بار و ئابدارخانە خرا و بارەگای کۆڕی خۆنکاری لە لای سەرووی سەرچاوەوە بەرپا کرا و دەس کرا بە بەزم و ئاهەنگ و بەزمگەر بە تار و کەمانچە و بلوێر و دەف و چەنگ و ساز و سەمتوور، کۆڕی بەزمیان گەرم کرد و سترانوانانی خۆشخوانی خۆشدەنگ و خۆشڕەنگ و لەبار، بە گۆرانی و پەستەی دڵ و سەروپێ بزوێنیان، سەماکەریان لە فیز و ناز نەرم کردن و باڵابەرز و بەژنتەرز و قەدزراو و بەڵەکچاو و کەفەڵخڕ و مەچەکپڕ و شۆخ و شەنگ و ڕند و چەلەنگ و جگەربڕ، بە دەم سووڕدان و لەرە و سەماوە، دڵی شکاویان زاخاو دەدا و مەیگێڕانی لووس و سادە، بەزەرك و کۆجیلەی بادەوە، کۆڕی گەرمی مەینۆشانیان ئەخستە سەر جۆش و تێڕوانینی شەکرەسێوان و ماچ و مووچ لە کوڵم و لێوان، دڵی پیرانیان دەشێواند و دار و بەرد سەرخۆش ببوون و کەلەلا لە سەر هۆش چووبوون.

لە سۆنگەی ئازارێکەوە کە ئەسکەندەر تووشی ببوو، دوو پێشە -وەکووو شاخەگا- لە لاجانگیەوە

دەرچووبوون، بژیشك و لوقمانان گەڕا؛ دەرمان و هەتوانی زۆر و جۆر بەجۆری دەكار كردن؛ بەهرەی نەدا و دوو شاخە نەڕەوانەوە و هێندەلەو سەرە مانەوە تا خۆیان كردەنازناو و گوێ بە گوێی ناوی دەهاتن. ئاو و هەوای ئەو هەوارە سازگارەی زۆر پێكەوت. لەو ڕۆژەوە كە هاتەوێ، خۆی قەوی و شاخلاواز دەبوون و بەرەبەرە پووچانەوە و ڕەوانەوە و پاش سەردەمانێك هەر نەمان و لە سەر زمانی زەمانە، وەكوو ناوی بێ‌نیشان مان. گۆڕەپانێك كە لە دەوری كانیەكەیە، ئێستاش ناوی گۆڕەپانی ئەسكەندەرە.

نیازی كرد كە یادگارێك بۆ شوێنەوار لەو ئاقارە بەجێ بێڵێ؛ بدلیس ناوی پیاوی ڕاسپارد كە لەو ناوە شار و قەڵایەك دروست كا، لە قایمی و پتەویدا بە جۆرێك بێ ئەگەر زۆردارانی وەك خۆم بێنە سەری، سەر بۆ هیچ كەس نەچەمێنێ و كەس زەفەری پێ نەهێنێ.

بدلیس بە فەرمانی خونكار -بێ خۆگرتن- وەكار كەوت و دوو فرسەخ دوور لەو سەرچاوە و لە نێوانی دوڕوانی كسور و ڕەبات، قەڵا و شارێكی بنیات ناو لە ماوەیەكی هندكدا ئەركی سەرشانی ئەنجامدا و لە قەڵا پاڵی دایەوە.

ئەسكەندەر كە لە لای ئێران بەرەودوا دەگەڕایەوە، سەری لە بدلیس دایەوە. بدلیس قەڵای لێ دابەست و دەرگای شاری لێ داخست و نافەرمانی خۆی ڕاگەیاند و دەشای گەیاند كە منیش بۆ خۆم شتێكم و هەر كەس ئاسۆگ بپەڕێنێ، سێبەری بە تیر ئەپێكم.

ئەسكەندەر لەو بابی بوون و یاخی بوونەی هەموو مووی لەشی گرژ بوون. فەرمانی بە لەشكری داشاڵا و بەرنە سەر ئەو شارە و خاپووری كەن و داری لە سەر بەرد نەمێنێ و ئەو ناكەس و بێ‌ئەمەگ و پێنەزانەشم بۆ بگرن تا دەخوێنی بیگەوزێنم و بزانێ ئەسكەندەر كێیە و جێی بدلیسی نۆكەر كوێیە؟ بەڵام هەیهاتە؛ دژ و شاری، شوورەقایم و دژوارێك بوون قۆچی ئاسنی دێوی دەشكاند. هەر چەندی كردیان و كڕاندیان و خۆیان لە دار و بەرداندا نە خشتێكیان پێ ڕووخێنرا و نە شوورەیان پێ ڕوشێنرا و قەڵای بەڵا بە فیزەوە تیزی بە ئەسكەندەر دەكرد، كە نەیتوانی تیزمالكی لێ هەلكڕێنێ. ناچار دەسبەرداری بوون و شاریان بۆ كابرا جێ هێشت و بەجێیان هێشت.

قۆناغە ڕێیەك دوور لەوێ ئەسكەندەر لەشكریەزی كرد و فەرمانی حەسانەوەی دا. بدلیسی نۆكەر

پەیدا بوو! شمشیر و کفن بە گەردن و کلیلی شار بە دەستەوە و بە سەرشۆڕی و لارەملی کەوتە سەر خاك و پای. گوتی: من نافەرمانیم نەکردی؛ تۆ چۆنت پێ فەرمووم وام کرد. تۆ قەڵایەکت لە من ویست هیچ کەس وێنەی نەدیتبێ و نەبیستبێ و بە خونکار و زۆردارانی وەکوو خۆشت داگیر نەکرێ و پاروێکی هێند دڕکاوی بێ بە پۆلاخۆرانیش نەخورێ. من شانازی بە خۆم دەکەم کە توانیومە ئەرکی سەرشان بەجێ بێنم و ئەمەگداری خۆم بنوێنم. قەڵاکە بە خۆت نەگیرا؛ واتا لە مەحەك دراوە و چی تۆ فەرمووتە کراوە. ئێستاش ئەوا من و کفن و ئەوەش شیری سەربڕینم. مەرگ و ژینم بەدەس خۆتە و بەخشینیش لە تۆڵە خۆشترە. ئەسکەندەر دڵی هاتە جێ و زۆری ئافەرین لێ کرد و لاواندیەوە و قەڵای بە ناوی ئەو ناو نا و شارەکەشی بە خۆی بەخشی و ئەخشی هێنای و خوا دای و ئەگەر خوا دای، پالەوەدە.

نومای قەڵای شاری بدلیس سێ گۆشەیە. چونکە سێ گۆشەش بێ‌فەڕە؛ بۆیە وا سەر بە گێچەڵە و گەڕ و گۆنگەڵی تووش دەبن. پیرەپیاوی باوەڕپێکراو دەگێڕنەوە کە لە ڕۆژگارێکی دووردا، هێندەی مار لێ پەیدا بووە، دژداران لە ناو قەڵادا حەجمینیان زۆر دژوار بووە و تێکۆشاون چاری بکەن. لە ئەنجامدا جادوگەران تەلیسمێکیان لە دەرگاکەی هەڵکەندووە کە ماران توخنی ناکەون و خەڵکی قەڵا ناترسێنن. ئەو تەلیسمە ئێستاش ماوە؛ زەلامێك بە مارێکەوە -کە دەناو قۆڵی گرتووە- لە بەردێك هەڵکەندراوە و دەدیوارەکە گیراوە و ناوی تەلیسمی دەرگایە.

شاری بدلیس دەربەندێکە لە نێوان ئازربایجان و دیاربەکر و ڕەبیعە و ئەرمەنستاندا. ئەگەر حاجی تورکستانی و هیندوستانی، یان ئێرانی لە عیراق و خوراسانڕا بەرەو مەکە و مەدینە بێن -خوا لە گەورەییان کەم نەکا- دنیاگەڕانی جەددەیی و زەنگباری و بازرگانی خەتا و خوتەن[1] و ڕووس و سقلاب و بولغاری و سەوداگەرانی عەرەب و عەجەمی بە وردەواڵەر و کاروانچی و هاتوچۆکەران، لە هەندەران وەڕێکەون و بیانەوێ بە بدلیسدا بێن، کونەبەردێکیان وەبەردێ؛ گەرەك بەڕەهۆڵە بەردا تێپەڕن و ڕێی‌تریان نیە. بەردەکونە لە باکووری شارەوەیە و فرسەخێك لە بدلیس دوورە. گراوێکیشی لێ هەیە لە

١- خەتا نیە و خیتایە و ناوچەیەکە لە چین و نیبنویەتووتە دیویە و لە خانبالغی پاتەختی ژیاوە. ئێستا مەنگۆلیای ناوەوەی پێ دەڵێن. خوتان لە تورکستانی چینە و لە وڵاتی سینکیانگ دایە. جەمیل



شاخەکەوە دادەرژێ و وردە-وردەدەبێتە بەرد و دەرگای کون تەنگ دەکاتەوە و جاری واش هەیە دەیگرێ. خاتوونێکی زۆر خێرەومەند -کە لەو ڕۆژگارەدا ژیاوە- ڕێی لەو بەردەدابڕیوە و ئەو کونەی هەراو کردووە و ئێستا کاروان بە هاسانی دەرباز دەبن و هێندەی پیاوچاک پێدا هاتوون، شوێنێکی پاك و پیرۆزە. هەر ئەو خاتوونە کارچاکە مزگەوت و پردێکی دیشی لە ناو شاردا بنیات ناوە پرد و مزگەوتی خاتوونیان ناو نراوە.

واقدی[1] لە نوفل کوڕی عەبدوڵلاوە دەگێڕێتەوە کە لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی عومەری کوڕی خەتابدا - خوای لێ خۆشبێ- ساڵی ٢٧.ك (٦٤٨.ز)[2] ، عەیازی کوڕی غەنەمی ناردەسەر دیاربەکر و ئەرمەن. لەو دەمەدا سەروەند کوڕی یونس بەتاریقە، بە سەر بدلیس ڕادەگەیشت. مووش و ساسۆن بە دەست سەناسەری کافرەوە بوون. پێشەوا و سەرداری ئەوان، یوستینوسی فەرمانڕەوای ئەخلاتێ بوو؛ کە تاڕوون ناوی کیژی خۆی بۆ جێنشین دیاری کردبوو.

کتێبی *فتوح البلاد*[3] دەڵێ: باوکی تاڕوون نیازی وابوو کە کیژەکەی بداتە بوغوز کوڕی سەروەند؛ کە ئامۆزای خۆی و فەرمانڕەوای بدلیس بوو. کیژەکەش دڵی چووبووە سەر مووشی کوڕی سەناسەری؛ کە لاوێکی زۆر جوان چاك و خوێنشیرین و لە بەرچاو بوو. لەو جەنگەدا کە فەرمانڕەوا کافرەکان دەهاوار و هانای مریەمی[4] کوڕی دارابی فەرمانڕەوای ئامێد هاتن، تاڕوون لە باتی بابی هات. لەوێ چاوی بە مووش کەوت و هەر بە جارێك هۆش و دڵ و دینی دۆڕاند و دوامین تنۆکی شەرمنی و ناز و فیزی مێوینەیی لە ڕاست ئەو لاوە داچۆڕاند و لە جیژواندا پەیمانیان داکە یان دەبێ بۆ یەکتر بن، یان ئاوێتەی ئاو و گڵ بن. پلانی ڕەوینیان دانا و بە نهێنی لە ناو سوپاگە دەرچوون و ئاگری دڵ گەیاندنیە لای عەیازی کوڕی غەنەم و لە سەر ئایینی دڵداران بە ئیسلام سەرفراز کران و ئەویندار لێك گرێ دران و گرێی دڵیان ڕەواندەوە. پاش ماوەیەك تاڕوونی بووك، دەگەڵ عەیاز و یارانی کەین و بەینی

---

١- عەبدوڵا کوڕی عومەری واقدی دانەری *فتوح الشام* لە رووپەڕ ٦١و١١٧، جزمی یەکەمدا ئەو باسە دەکا. جەمیل

٢- ٢٧ هەڵەیە و دەبێ ١٧ بێ؛ چونکە عومەر ساڵی ٢٣ مردووە و عەیازیش ساڵی ١٨ هاتۆتە جزیر گرتن. جەمیل

٣- نیازی «*فتوح البلدان*»ی ئەحمەد، کوڕی یەحیا، کوڕی جابری بلازەرییە و ئەو باسە لە رووپەڕی ٢٠٢-٢١٠ دایە. جەمیل

٤- بەو مریەمەدا ڕەنگە نێر نەبووبێ. جەمیل

خۆیان کرد و کیژ وەك ڕاکردووی دەس دوژمن هاتەوە ماڵی باوانی و تاوانی خستە سەر مووش و لە هەلێکدا کێسی لە باوکی خۆی هێنا و کوشتی و ئەخلاتی -بە بێشەڕ و شۆڕ- خستە دەستی موسوڵمانان. سەروەندی مەزنی بدلیسیش یوقەنناى ناردەلای عەیاز و سەدهەزار دینار دراو و هەزار تۆپ کووتاڵی جوان و پارچەی نایابی فەرەنگی و پێنجسەد سەر ئەسپی عەرەبی و سەد ئەسپی سواری خۆماڵی -بە ناوی پێشکەشی و دیاری- پێشکەش بە عەیازێ کرد و لە ڕێی ئاشتیەوە پێك هاتن.

دانیشتوانی شاری بدلیس زۆربەی زۆریان ئەرمەنیین و موسوڵمانەکانی ئەوێ لە سەر ڕچەی شافعیین و هێندێکی زۆر هندك نەبێ کە لە ڕۆژگاری پێشوودا، چونکە ژێردەستەی تورکان بوون، بۆ مەزهەبیش لاسای تورکیان کردۆتەوە و پەیڕەوی ئەبووحەنیفەن و بە خۆیان دەڵێن حەنەفی. خوا لە هەر دووکیان ڕازی بێ. تێکڕای خەڵکی وڵاتەکە لە نوێژ و ڕۆژوان زۆر خێران و خێران دەکەن و دڵاوان و ڕێبواردۆست و میوانپەرست و مەردانە و سەربەرز و ئازان. هەر گوندێکی موسوڵمانان- با هەر دوو-سێ ماڵێکیش بێ- مزگەوتێکی لێ چێ کراوە و بانگدەری بۆ ڕاگیراوە و پێشنوێژیان بۆخۆ هێناوە و لە ڕاستەڕێی دینداریدا بێدرێغن و ئەرکی ئایین بە سەرڕاستی بەجێ دێنن.

شاری بدلیس زانای گەورەی لێ هەڵکەوتون. یەك لەوانە مەولای گەورە و بەناوبانگ و لە زانستاندا شەشدانگ و لە خودا بە ترس‌وبیم، مەولانا عەبدولڕەحیمی بدلیسی‌یە؛ کە پەراوێزی زۆر بەڕێزی لە سەر *مطالع*[1] نووسیوە؛ کە باس لە «منطق»و«معانی» دەکا و لای مەلایان زۆر بە برەوە. هەروەها مەولانا محەمەد بەرقەلعی کە شەرع و حەدیسی وەك ئاو لە بەرە و بۆ «نحو» زانین یەکجار لە سەرە و کەنارەی لە سەر *هیندی* و *خەبیسی* بە ناوی ئەمیرشەرەفی بدلیسی نووسیوە، پەروەردەی شاری بدلیسە.

سەردەستەی خوداخواهان و ڕێشاندەری گومڕاهان و پەنادەری بێپەناهان و هەمیشە لای خوداگر شێخ عەمماری یاسر[2]، کە پیری دەستگیری شێخ نەجمەدینی گەورە[3] و موریدی شێخ ئەبوونەجیبی

---

١- *مطلع الانوار*ی قازی سراجەدین کوڕی ئەبوبەکری خەڵکی ورمێیە؛ کە ساڵی ٦٨٩.ك مردووە. جەمیل

٢- لە زانا گەورەکانە و پیری بەر ماڵیش بووە. ساڵی ٥٨٢.ك (١١٨٦.ز) مردووە. جەمیل

٣- نەجمەدین ئەحمەد، کوڕی عومەر خەیوقی. نازناوی طامتالکبری (بەڵای گەورە) بووە. سەر تەریقەی کوبرەوییە لە میسر. زیارەتی شێخ ڕۆزبەهانی گەورەی کردووە و کچەکەشی هێناوە. تەفسیرێکی قورئانی بە ناوی ←

سوهرەوەردی بووە -خودا ڕەوانیان شادکا- بدلیسیە.[1] زانا و دانای هونەروەر و خوداپەرەستی بەختەوەر و بەوەج و گران و سەنگین، مەولاناحوسامەدین[2]. -کە پەروەردەی نازەنینی دەستی عەمماری یاسرە- بە دەروێشی و چلەکێشی پێگەیشت و لە ڕازی دەروون تێگەیشت و هەر لە باری سۆفیانەوە، تەفسیرەکە گەلەك هێژا، بۆ قورعانا پیرۆز نویسی و ئەویش هەر بدلیسی بووە.

مەولانا ئیدریسی بدلیسی زانا، کوڕی ئەو مەولانا حوسامەدینەیە کە لە پێشدا دێرزەمانێ لای شاهانی ئاققۆینلوو میرزا بووە؛ لە پاشان بە هەمنشینی سولتان سەلیمخان سەرفەراز کرا.[3]

---

← *بحرالحقائق و المعاني في تفسير السبع المثاني* لە یازدەبەرگدا نووسیوە و لە ١٠ی جیمادی یەکەمی سالی ٦١٨.ك (١٢٢١.ز) مردووە. جەمیل

١- شێخ زیائەدین ئەبوونەجیب عەبدولقادر سوهرەوەردی، سالی ٤٩٠.ك لە گوندی سوهرەوەرد هاتۆتە دنیا و بۆ خوێندن چۆتە بەغدا و لای عەلی کوڕی نیهانی و ئەسعەد کوڕی موهەننای خوێندووە و تەکیەیەکی بۆ لە لای ڕۆژاوای دەجلەوە دروست کراوە و سالی ٥٤٥.ك (١١٥٠.ز) بۆتە فێرکاری فێرگەی نیزامیە و سالی ٥٦٣.ك (١١٦٧.ز) مردووە و لە کەنار چۆم لە فێرگەکەیدا نێژراوە. جەمیل

٢- حوسامەدینعەلی لە تەریقەی نووربەخشیدا خەلیفە بووە. نووربەخش باپیری سەیدی بەرزنجەیە. شەرحێکی باشی لە *اصطلاحات صوفیە*ی عەبدولڕەزاق کاشانی کردووە. تەفسیرێکی بە دوو بەرگ هەیە بە ناوی *اشارة منزل الکتاب*؛ دەسنووسێکی لە کتێبخانەی سولتانسەلیم لە ئاستانە هەیە. شەرحێکی بە فارسیشی لە سەر *گلشن راز* هەیە. سالی ٧٠٠.ك (١٣٠١.ز) مردووە. جەمیل

٣- ئەو مەولانائیدریسە خوێندنی لە ئێران تەواو کردووە و بۆتە میرزای بەردەستی سولتان یەعقووبی کوڕی حەسەنەدرێژی ئاققۆینلوو. لە پاشان کرا بە وەزیر و لەو بەینەدا سەری لە سولتان بایەزیدی دووەم داو کتێبی هەشتبەهەشتی بۆ دانا. دوایە ببووە نووسەری شائیسماعیلی سەفەوی و لە ئەنجامدا کە زانی عوسمانی زۆر لە پێشن، هاتە لایان و سولتانسەلیم کردیە قازی عەسکەر و دلخۆشی کوردانی دایەوە کە بێنە بەر ئالای عوسمانی و ولاتی خۆشیان هەر بە چنگ بێ. سالی ٩٢٦.ك (١٥٢٠.ز) مرد و لە گۆڕستانی ئەبووئەییوبی ئەنساری نێژرا. نازناوی شێعری ئەمیرەك بوو؛ دوو کوڕی بە ناوی ئەبولفەزل محەممەد و مستەفاعەلی هەبوون کە ئەمەیان بژیشك بوو. مزگەوتی «زێنەبخاتوون»ی ئاستانە، زێنەبی ژنی مەلائیدریس دروستی کردووە. جەمیل

ئەمین زەکی لە *خولاسەی تاریخی کورد و کوردستان*دا، وەرگەڕاوی عەرەبی محەممەدعەلی عەونی، چاپی بەغدای سالی ١٩٦١، لە لاپەڕ ١٦٤- ١٧٧، باسی ئەو مەلائیدریسە دەکا و دەلێ: شائیسماعیلی سەفەوی نیازی وابوو حکوومەتە کوردەکان و میرنشینەکان لە بەین بەری و قزلباشی شێعەیان لە جێ دانێ. لە سایەی مەلائیدریسی زاناوە، سیاسەتی عوسمانی لە مەڕ کوردانەوە دژی سیاسەتی عەجەم بوو. ئەوان کوردیان دلخۆش دەکرد و دۆستایەتیان دەگەل دەکردن و هەر بە هۆی ئەو سیاسەتە نەرمەشەوە هەرچی نیازیان بوو دەستیان کەوت. کە سولتانسەلیم ←

→ لە ئاماسیەوە شەڕی ئێرانی دەکرد، چەند جارێك شێخ حەکیمەدین ئیدریسی بدلیسی ناردەکوردستان کە چاوی بە میر و سەرەك هۆزەکان بکەوێ و لە ڕووی شیعە و شائیسماعیلیان ڕاست کاتەوە. شێخ ئەو ئەرکەی زۆر زانایانە ئەنجام داو ساڵی ٩٢٠.ك (١٥١٤.ز) کە عەجەم لە چالدیران شکان، هەموو کوردەکان دەگژ ئێران ڕاچوون. دیاربەکر شۆڕشی کرد و محەمەدخان ئێستاجلوویان وەدەرنا و هاتنە بەر فەرمانی عوسمانی. شەرەف بەگی بدلیس، خالید بەگی برای ڕاونا -کە گزیری عەجەمان بوو- ئاڵای عوسمانی لە سەر قەڵای خۆی چەقاند.

مەلیكخەلیلی خاوەنی حەسەنکێف و سعرد -کە لە وەچی بنەماڵەی ئەییوبی بوو- سەروەختێك شای ئێران گرتی و قەرەخانی ناردەسەر جێگاکەی و قەرەخان سعردی گرت و حەسەنکێفی بۆ نەگیرا. لەم هەلەدا وڵاتەکەی خۆی ساندەوە. محەمەد بەگی ساسۆن تیپی سوارەی عەجەمی لە ئەرزەن دەرکرد. سەیدئەحمەدی زەرقی بە کۆمەگی دیاربەکریان ئاتاق و میافارقینی گرتەوە. قاسم بەگ ئەگیلی ساندەوە. جەمشید بەگی مەرداسی پالۆی لە عەجەم داگیر کرد.

عەونی دەڵێ: بەدر بەگی بوختی سوپای ئێرانی لە جزیر دەرکرد. سەید بەگ کوڕی شاعەلی -کە میری سۆران بوو- ئێرانیەکانی لە کەرکوك و هەولێر دەرکرد. کە سوڵتانسەلیم دەچووە سەر ئێران، شازدەمیرە کوردی دەگەڵ چوون. سوڵتان، مەلائیدریسی کردەدەسکیس کە کوردەکانی نێوان مەلاتیە و گۆلی ورمێی بۆ تاو بکا. سۆلتان سەلیم تەورێزی گرت و پاش ماوەیەك بەجێی هێشت. شائیسماعیل کەوتە خۆ خڕکردنەوە و بە سەرکردایەتی قەرەخان لەشکری ناردەسەر دیاربەکر و لە ڕێگەی چیاقچورەوە ڕۆیشت و قزلباشی قەلاکانی ماردین و ڕەهاشی ڕەگەڵ کەوتن و دەوری دیاربەکریان دا. خەلکی دیاربەکر دەگژیان ڕاچوون و هاواریشیان بۆ سوڵتان نارد. سوڵتان لە ئاماسیەوە حاجی یەکتای بە هێزێکەوە بۆ ناردن و دریان بە قزلباش داو خۆیان گەیاندەهیمدادخوازان. شائیسماعیل زۆری لەشکر بۆ یارمەتی قەرەخان نارد و گەیشتبووە نزیك ئەرجیش و لێرەواریش زۆر چوغور بوو. مەلائیدریس کوردەکانی بدلیس و خیزان و مەکس و ساسۆنی وەدوو خۆ داو لەنەکاو بە سەری دادان و شکاندنی و جووقەواری لێ بڕین. قزلباش ساڵ و نیوێك دەوری دیاربەکریان بەر نەدا. خەلکەکەی زۆر شپرزە بوون؛ پازدەهەزار کەسیان لێ مرد. بەڵام ئەو کلۆلانەی چاردەساڵ پالەوانانە، بە گژ دوژمناندا دەچوون؛ وازیان لە شەڕ هەر نەهێنا. لە حەسەنکێف نامەی سوڵتان بە مەلائیدریسێ گەیشت کەوا محەمەدپاشا بیقلی بە هێزەوە بۆ هیمدادی دیاربەکر بەڕێکرا. مەلا نامەی بە کۆترێکی نامەبەردا ناردەدیاربەکر. خەلکی دیاربەکر بەو موژدەیە بووژانەوە و ئاهێکیان تێگەڕایەوە. محەمەدبیقلی هاتە حەسەنکێف و چاوی بە مەلا کەوت. قاسم بەگ و جەمشید بەگ و حوسێن بەگ، دەهەزارکوردی چەکداریان هەبوو؛ هاتبوونە لای مەلائیدریس. مەلا و پاشا -بە لەشکری کورد و تورکەوە- پەلاماری قورد بەگی قزلباشیان داو قڕانیان دەلەشکری خست و ڕوویان کردەدیاربەکر. قەرەخان ترسا و وازی لە دیاربەکر هێنا و هاتە ماردین و مەلا و پاشا -بە بێ کوشتار- چوونە دیاربەکر. مەلائیدریس نامەی بۆ ماردینیان نووسی و زۆری ئایەت بۆ تێخستن و لە قزلباشانی هاندان. سەیدعەلی ناو بە بریکاری هاتە لای مەلا و تێگەیەنرا کە کاتی شەڕ دەرگای شارێ بکەنەوە و قزلباشانیش هان بدەن کە خۆیان بە دەستەوە دەن.

قەرەخان چووبووە سنجارێ؛ لەشکری مەلا و عوسمانی بە هاسانی دەیانتوانی بچنە شاری ماردینەوە. بەڵام ←

← قزلباشی دژدار شەڕیان کرد و قەڵاکەش ئەوەندەسەختە کە بە تەیموورلەنگیش نەگرا. کێشەی ماردین کۆتا نەبیو، شادی پاشا و محەمەدبیقلی کێشەیان لە ناو پەیدا بوو. شادی تۆرا و چووە ئانادۆڵ. مەلائیدریس هیمدادی لە سوڵتانی خواست. ساڵی ٩٢٢.ك (١٥١٦.ز) لەشکرێکی بیست هەزار کەسی بە سەرکردایەتی خوسرەوپاشای بۆ هات. قەرەخانیقزلباش لەم بەینەدا شەشسەد پاسەوانی شاهی -بە سەرکردەیی حاکمی هەمەدان و گوڵشەهر- ناردەسنجار و لە ڕێگە تووشی مەواهب چەلەبی کوڕی مەلائیدریس و میریجزیر هاتن و دوای سووکە شەڕێك ئەبولمەواهب هەڵات و بەو ڕێگەدا هات کە عەجەمەکانی لێوە هاتبوون. ماردین و حەسەنکێف هەر بە دەست قزلباشەوە بوون. لەشکری خوسرەوپاشا هاتە پاڵ لەشکری محەمەدپاشا و مەلائیدریس وای پێ باش بوو کە دەست بەجێ بە پانەوە هێرش بەرن. محەمەدپاشا بە قسەی نەکرد و حوسێن بەگی میر خەرپوتی بە چوار هەزار کەسەوە بە پێشەنگ بەڕێکرد کە دەراو تاقی کەنەوە. ئەو پێشڕەوە تووشی داوی قزلباش بوون و سێ هەزاریان لێ کوژرا و هەزارەکەیتریش خۆزگەیان بە مردن دەخواست. دوای ئەوە لەشکری تورك و عەجەم لە کۆنە قۆچ حەسار گەینە یەك، خوسرەوپاشا بە شەش هەزارەوە ڕاستەی لەشکر بوو. چۆپەی لەشکریش چوار هەزار کورد بوو کە سەر بە مەلیكخەلیل و محەمەد بەگی ساسۆن و میرانی شیروان و قاسم بەگی ئەگیل و شەرەف بەگی بدلیس و داود بەگی ئەمیران و ئەحمەد بەگی زەرقی، میری ئاتاغ و شاوەلەد بەگی سلێمانی بوون و مەلائیدریس سەرداری هەمووان بوو. شەڕێکی زۆر بە سام قەوما. لە جەنگەی شەڕدا گوللەیەك بەر قەرەخان کەوت و کوشتی و عەجەم ورەی بەردا و مەیدانیان چۆڵ کرد. مەلائیدریس و کوردەکانی ڕاوەدوویان نان و دەماردینیان پەستاوتن. دەسکەوتی ئەو شەڕە ئەرغەنی و سنجار و تەلەعفەر و چەرمك و سوێرەك و بیرەجەك و ناو شاری ماردین بوو؛ کە گیر عوسمانی کەوتن. بەڵام سولەیمانخانی برای قەرەخان قەڵای ماردینی چۆڵ نەکرد و خوسرەوپاشا ساڵێکی بە دەورەدا هەڵخولا چی بۆ دەگەڵ نەکرا.

سوڵتان سەلیم دوای گرتنی حەڵەب و شام، محەمەدبیقلی بە لەشکرەوە بۆ خوسرەوپاشا نارد و قەڵای ماردینیان بەر تۆپ داو قەڵاکانی حەسەنکێف و ڕەها و ڕەققە و مووشیش بەر چەنگی عوسمانی کەوتن و تەنانەت هۆزە ڕەوەندەکانی ڕۆشنی و حەریری و سنجاری و ئیستاجلی و جزیری و هۆزی موالی عەرەبیش هەموو دەغالەتیان بە عوسمانی کرد.

پوختەکەی ئەمەیە لە سایەی وریایی مەلائیدریس و ئازایی محەمەدپاشاوە، عوسمانی هەموو کوردستانی گرت.

مەلا ئیدریس -کەدەیزانی لەو چەند ساڵەدا کوردستان چەند شپرزە بووە- بۆ سوڵتانی پێشنیار کرد کە یارییەدی کوردەکان بدرێ و دڵیان بە عوسمانی خۆش کرێ و زۆر باشی دەزانی کە کوردستان لە بارێکی تایبەتی دایە و میر و ئاغاکان شەڕی یەکتر دەکەن و بە هەوای ئازادی و سەربەستین و ئەو داوای سەربەخۆیی کردنەیان سەر دەکێشێتە شیرکێشان و ئەگەر تەنیا ئیدارەیەك بۆ هەمووان دابمەزرێ و هەموو کوردستان دابگرێ، سەر ناگرێ. مەلائیدریس - بەو هەموو زیرەکی و زیتیەی خۆی- زۆر بە زەحمەت توانیبووی هەموو کوردان بکاتە پیاوی عوسمانی و نەیدەویست ڕەنج بە خەسار بێ. بیری لەوە کردبوو کە ئیدارەی کوردان وەك وڵاتیتری عوسمانی نەبێ و هێندێك لە دۆز و ئاواتی کوردەکان نزیك بێتەوە. هەرچی ئەو پێشنیاری کرد خاوەن شکۆ (سوڵتان سەلیم) پێ ڕازی بوو. زۆری بڕوا بە مەلا هەبوو؛ گەلێك فەرمانی سپی بۆ ناردووە و مۆری پێوەناوە و گوتوویە مەلائیدریس بۆ خۆی چۆنی دەوێ، پڕی ←

← کاتەوە. حەڤدەئالاّ و پێنجسەد خەلاّتی بۆ نارد کە لە ناو میرەکانی کوردستانێدا بەشی کا. بیست و پێنج هەزار دۆکەی زێڕیشی بۆ خودی جەنابی مەلائیدریس نارد. عەلیعەونی دەڵێ ئەو دراوەش هەر بۆ میرەکان بوو.

لە سەر پلانی مەلائیدریس، دیاربەکر کرا بە نۆزدەسنجەق؛ یازدەیان تورکی بە سەر ڕادەگەیشت و وەك ئەنادۆڵ وابوون. هەشتەکەیتر کە سەمغان و قولب و مەهرانیە و تەرجیل و ئاتاغ و پەرتك و چەرمك و چیاقچور بوون، بە دەست کوردانەوە بوو؛ بە میرات بۆ کوڕیان دەمایەوە. سەرەڕای ئەوەش پێنج حکوومەت لە لیوای دیاربەکر دامەزران کە ڕاستەوخۆ سەر بە سوڵتان بوون. ئەویش ئەگیل و پالۆ و جزیر و حەزۆ و گەنج بوون. کتێبی *جیهاننوما* دەڵێ: بە حکوومتی خاپوور و ئاڵشگوردەوە، حەوت حکوومەت بوون. سەرۆکی ئەو حکوومەتانە پلەی میرمیرانیان هەبوو. لە کاروباری ناوخۆدا دەسەلاّتدار بوون.

لیوای وانیش کرا بە سیوحەوت سنجەق و چوار حکوومەت؛ کە سوڵتان بۆ خۆی پێ ڕادەگەیشت. ئەوانەش: ١- حکوومەتی هەکاری؛ کە هەمیشە دەهەزار چەکدار و بۆ شەڕیش پەنجا هەزاری بوو. ٢- حکوومەتی بدلیس؛ ئەویش لە هەکاری بێهێزتر نەبوو. ٣- حکوومەتی مەحموودی لە ڕۆژهەلاّتی وان؛ سەدوبیست هۆزی کوردی لێ بوو؛ شەش هەزار چەکداری هەمیشەیی هەبوو. ٤- حکوومەتی پنیانش هاوسای مەحموودی و بە قەد ئەوانیش بەهێز بوو. ئەولیاچەلەبی لە بەرگی ٤، ل ١٧٨دا جگە لەمانە باسی پێنج حکوومەتی کوردیتر دەکا کە زەمانی ئەو سەر بە تەوریز بوون. ئەوانەش کۆتۆل و پیرەدۆزی و دمدمی و جۆلانی و دونبولیین.

گومان لەوەدا نیە ئەو دابەش کردنەی کە مەلائیدریسی بلمیەت بە بیریدا هات، تەواو دەگەڵ باری کوردەواری ئەو ڕۆژەدا ڕێك دەهاتەوە. کوردستانی وا سەخت و گەردنکەش کە خەلکەکەی هەمیشە بە ئاواتی سەربەستی شۆڕش دەکەن و خۆ بە کوشت دەدەن، کەس تا ئێستا نەیتوانیوە و کەسیش ناتوانێ وەك مەلائیدریس کەوی و دەستەمۆی بکا. پێش زەمانی سوڵتان سەلیم چل و شەش میرنشینی کورد هەبووە کە لە سایەی پێشنیاری مەلائیدریسەوە زۆربەیان لە ناو چوون. دوای ئەوە کە مەلائیدریس بە شیرینکاری خۆی کوردستانی وا لێ کرد، هەر بە دەستی خۆی تەپڵ و ئاڵای بە ناوی سوڵتانەوە بە سەرمیرەکاندا بەشیەوە. مەلیكخەلیلی یادگاری بەرەی سەلاحەدینی ئەیبوبیش لەو دەهۆڵ و ئاڵا پیرۆزانەی پێ برا. مەلائیدریس ببووە دەرزی بەر کۆڕەی سوڵتان و لە ئەندازەبەدەر خۆشەویست ببوو. کە سوڵتان لە ئێران دەهاتەوە و کە دەچووە میسریش، مەلای هەر دەگەڵ بوو.

کوردستانی وا سەخت و بەهێز -بە خوێن ڕشتنێکی زۆر کەم و بە بێ شەڕی گران و بە خۆشی و ڕەزامەندی کوردان- سەر بۆ حوکمی عوسمانی بچەمێنێ؟! ئەمە لە مێژوودا وێنەی نەبووە. کوردستان هەرگیز بۆ هیچ داگیرکەرێك تەواو نەهاتۆتە بەر کەمەند. هەر لە زەمانی ئاشورەوە هەتا ئێستاش زۆر بە توند و تیژی دەگژ داگیرکەرانی ڕاچووە. ئاشوری، ئێرانی، پەرتی، ڕۆمانی و یونانی بۆ سەرکوت کردنی کوردان و داگیرکردنی کوردستان لەشکری زۆریان هێناوە؛ بەلاّم هیچیان وەك مەلائیدریسی بلیمەتیان پێ نەکراوە. ئەو پیاوە بە وریایی و سیاسەت زانی خۆی، کارێکی وای کرد عوسمانی بیگرنە ناو پەنجەی خۆیانەوە و ئەو بەهرە گەورەیان پێ بگەیەنێ.

فەرمانی سوڵتان سەلیم -کە بۆ مەلائیدریس نووسراوە- تورکیە کە لە *تاج التواریخی* خواجە سەعدەدین، ←

← بەرگی ٢، ل٣٢٢دا هەیە. عەلیعەونی کردوویەتە عەرەبی و دەگەڵ تورکیەکەدا لـە *خولاسـەی تاریـخی کـورد و کوردستانی ئەمیـن زەکی*دا خستوویەتە کەنارەی لاپەرِی١٧٢و١٧٣وە. من لە تورکیەکەیەوە وەرمگێرِا. هەژار

**فەرمانی بە شان و شکۆی شاهانە:**

سەرداری شتزانان! پێشەوای ئاکار جوانان! رِێبواری شارێی تەریقەت! شارەزای دەستووری شـەرِیعەت! کارامـەی گـرێ رەهانی! تیشکدەری ئاسۆی بێگومانی! نـموونەی یەکتاپەرست و خواخـوازان! مـەولانا حەکیمـەدینی چـازان! خـوا بـۆ کرداری چاکت بیڵێ.

بە گەیشتنی فەرمانی بەرز و پیـرۆزمان لێت روون بێ کە نامەکەت گەیشتە سەردەرانەی بەختەوەرمان و مـوژدەی پـێ داین کە بە بۆنەی ئێوە و لە سایەی دەسپاکی و خوداپەرستی و راستی و دروستیتانەوە، هەموو لیوای دیاربەکر گیـرا. منیش هەر وام دەتۆ رادەدیت؛ رووت سپی بێ. ئەگەر خوای گەورە حەز بکا دەبیە هۆی گرتنی هەموو لیواکانیتـریش. گش چاوەدێری بەرزی شاهانەمان رووی دەتۆیە و دەربارەت دەکرێ. دەگەڵ مووچەی تا دوای شەشـەکانی مـمبارەکدا، دوو هەزار فلوری و کەوڵێکی سـمۆر و یەکی وشەگ و دوو پارچە فاسۆن و دوو چۆغ و کورکێکی خوری ئاستـەرِ کەوڵـە سـمۆر و کورکێکی بەر کەوڵە و شەگ و شیـرێکی کالان زێرِ و کیمخایەکی فەرنگیمان بۆ ناردی. لە خـوا دەخـوازم بـە دڵخۆشی و لەشساغی وەریان بگری و لە خۆتیان بەخت کەی و بەرانبەر بە خزمەتکاری و دڵسۆزی و راستیت، شـیاوی ئاورِوێدانەوەی شاهانەی شکۆدارمان بی.

چونکە ئەو میـرانە لە دیاربەکرەوە هاتوون و دوای تۆ کەتوون، تۆ دەزانی چۆنن و کام نازناویان پێ رەوایـە و چـەندیان لێ دەوەشێتەوە و لە سنجەقان چیان پێ ببرِێ باشە و لەو دابەشەدا گەرەك هەر کەس بە پێـی خزمـەت و دڵسۆزیەوە لێی بروانن. ئەوا چەند فەرمانێکی سپیم بۆ ناردی و تورەی شاهانەی بە سەرەوەیە کە بدرێتە دەست.

جێ شانازی میـرەگەورەکان و پشتیوانی زل و مەزنەکان و جێ گەورە و لە پێش، پایەبەرز و بەرێز، لە خودای بێنیازەوە یاری دراو، میـری میـرانی دیاربەکر (مـحەمەد) هەمیشە بەختیار بێ.

پێویستە هەر پارچە هەرد و ئاوێك، هەر مووچە و دراوێك و هەر نازناوێك، بە میـرێك لـەو میـرانە دەدری، و هـەر فەرمانێك لە باتی سوڵتان دەنووسرێ، هەمووی لە دەفتەری تایبەتیدا بنووسری، و بۆ سـەردەرانەی پیـرۆزمانی بـەرێ بکەن؛ تا لێرە هەڵبگیـرێ و هیچ شتێك ون نەبێ.

بە درێژی باسی ئەو سنجەقانە بنووسن کە بەو میـرانە دەدرێن و بشنووسن چۆنتان داونی و چ نازناوتان بـۆ دیونـەوە و چەندتان بەخشش بۆ داناون. مەرج ئەومیە ئەم دابەشە لە ماکی کار زیان نەدا و لە ناویاندا نێوان تێك نـەدا. هـەروەها چەند کاغەزێکی سپیم بۆ ناردی، تورەی شەریفیان لە سەرە. بۆ ئەو میـرانەی بنێـرە کـە نیازمانـە بیانکێـشینە لای خۆمان. دەبێ نامەی لاواندنەوە بە رێك و پێکی بنووسرێ و دەگەڵ خەڵاتی شاهانە بۆیان بنێرە.

ئەو فەرمانە شاهانەش دەگەڵ ئەندازەی بەخشش و هۆی چاوەدێریەکە، لـە دەفتـەری تایبەتیـدا روونـووس بکـەن و بـۆ ئاستانەی منی بنێرن -کە پەنای جیهانە- تا هەموو شتێکمان لە بەر چاو بـێ. لـەو بابەتـەوە کاروبـاری شـاهانە بـە ئارەزووی من پێك هاتووە. خودای بەرز حەزکا، هەوساری بەزەییم بۆ ئەو لایە وەردەچەرخێ و پتـر چـاکەی شـاهانەیان پێ رەوا دەبینم.

←

بۆ میسرگرتن، دەژێر ئاوزەنگی بە زەبر و زەنگی شاهانەدا بووە. لەوێش هەڵبەستەی زۆر بە کاکڵی بە بەژن و باڵای سوڵتان هەڵگوتووە و لە قەسیدێکدا دەردەدڵ دەکا و ئەو چەند تاکانەم لێ هەڵبژاردوون:

تـا نـەزانیـن لە بـرەودایە، ئەمـن بێبـرەوم
ڕۆژ هـەتـا ڕۆژی کـەر و گا بـێ، لە تاریکەشەوم
هەر نەزانـە وەکوو بـسان بـانـکە لە بسان زێڕ و زێو
منی زاناش بە زگی بـرسـی لـە خەپلێك دەنەوم
ئەم و ئەو ڕۆژ و شەوی شـادییە، خـۆشی و بەزمە
دەم لە پووشم منی بێچارە، نـە ئـەمـم و نە ئەوم
وا گریـمان کە لـە لات تـەنبەڵ و بێکـارەم مـن
خـۆ لـە ڕێـی نۆکـەری تـۆدا دڵ و بـاوەڕ پتـەوم
زۆر کـەسـت بردەبـەرەوژوور و بە ریـکت پڕکـرد
من گلێشم نیـە ڕایـخـەم، سڕی سەر خێز و چەوم
خـزم و خێـزانی نـەدارم کـە لـە کـوردستانـن
هـەر کـەسە چاوی لە ڕێـگامە کـە فریای بکەوم
شوێنی تۆ کـەوتـم و لام وابـوو لە بیـرت نـاچم
ئێستە بۆ نانێ گـەرەك بـێـر و بـە وێـدا بـڕەوم

---

← وا ئێستاش کوڕی ئەردەوێڵی (ئیسماعیلی گومڕا)، حوسێن بەگ و بارام بەگ ناوی ناردۆتە خزمەت بەختیاریمان. بە زمان و بە نووسین هەموو جۆرە بەندەیی خۆی دەنوێنێ و دەپاڕێتەوە و بە زمانلووسی و ڕۆن تێدان دەیەوێ دەگەڵی ئاشت بم و گوتوویە: هەرچی من بمەوێ و ئارەزوو بکەم -بە بێ خۆ گرتن- دەیکا. بەلاّم بەڵێن و دڵسۆزی جێگەی باوەڕ نیە. لەبەر ئەوە هەر دوو ڕاسپاردەم گرتن و خستمە قەڵای دیمقوقە و پیاوەکانیشیانم هاویشتنە قەڵای «کلیدالبحر». لە سەر تۆش پێویستە دەربارەی ناوبراوی بارکەوتوو، زۆر باش بیر بکەیەوە و هەر ئێستا بیری لێ بکەوە؛ بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتی پایەدار و لە گەشەمان تێکۆشەر بە!

لە کۆتاییدا بە هومێدم کە زۆر ئاکاری باش و ئاسەواری جوان لە تۆ دیار بدا. ئەوەش بزانە پشتی خۆت بە تووڕەی پیرۆزمانەوە ببەستە. نێوەڕاستی شەشەکانی مبارەك، ساڵی ٩٢١، بارەگای خەلیفە، ئەدرنە.

گەر بزانی کە چەوزانم و خاوەن هونەرم

تێدەگەی چەندی کزم، هێندەبە زانین قەڵەوم

دەستی ئیدریسە بە داوێنتەوەیە و لێم روونە

نایەڵی چیدی لە سەرمان و لە برسان نەخەوم .

ژیننامەی هەشت پادشای عوسمانیانی، بە نزیکەی هەشتاهەزار شێعری جوان و تەڕ و لەبار هۆندۆتەوە؛ کە بە ڕاستی بۆ ڕەوانی دادی داوە و لە وێژەدا گۆی هونەری بردۆتەوە و ناوی ناوە هەشت بەهەشت. کە شائیسماعیل پەیدا بوو، شیعەگەری برەو پێدا. مەلائیدریس مێژووی ئەوسای بە ئەبجەدی بۆ ئیجاد کرد؛ پیتەکانی «مذهب ناحق» پڕ بە پێستی دەهاتەوە. شائیسماعیل کە ئەمەی بیست، مەولانا کەمالەدین تەبیبیشیرازی -کە هەمدەم و هەمنشینی هەمیشەی بوو- بان کردەکن خۆی و فەرمووی: نامە بۆ مەلا بنووسە و لێی بپرسە ئەم تاریخە کاری ئەوە یان نا؟ کەمالەدین نامەیەکی نەرم و خۆش و دۆستانەی بۆ مەلا نارد و ئەم پرسەشی تێدا گونجاند. مەلائیدریس لە وەرامدا نووسی: بەڵێ من گوتوومە؛ بەڵام ڕاستی ڕستەی عەرەبیە و نیازم «مذهبنا حق»[1] بووە. شائیسماعیل وەرامەکەی بە دڵ بووە و لە مەلای گێڕاوەتەوە کە بچتە لای و ببکاتە هاونشینی خۆی. مەلا نەچووە و لە وەرامدا قەسیدەیەکی بۆ ناردوە کە من چەند تاکە بەیتێکیان لێرەدا دەخەمە بەر چاو:

کە بەندەو نۆکەری خۆت باش بناسی باشترە میرم

لە مێژە نۆکەری ئەوخانەدانەن باب و باپیرم

دەزانی بابی بەندەباوە پیرەت درزی داداوە؟

خوداناسینی فێرکرد و لە ڕێگەی چەوتی لاداوە

منیش لای شاهی حەیدەر بووم و بۆ من تا بڵێی چابوو

نزیکی و هۆگریمان ڕاست وەکوو شیر و شەکر وابوو

---

١- مذهب ناحق: مەزەبی ناڕەوا. مذهبناحق: مەزەبی ئێمە ڕەوایە.هەژار

لە بارەی خۆم و خۆشت ڕاکە بۆ قورعان و سیپارە
لە هەر جێ ناوی ئیسماعیلە ئیدریسی لە لا دیارە

ئەبولفەزڵی کوڕیشی زۆر زانا و هونەرمەند بوو. لە زەمانی سوڵتان سولەیمانی بەهەشتەلاندا بە دەفتەرداری شاری ڕۆمئیلی سەرفیراز کرا. ماوەیەك لەوێ ژیانی دەرباز کرد.[1]

دوو کوڕی زۆر شایستەی هەبوون؛ بێ ئاگا لە چارەنووسیان لە غەلتەوە لە سەر کەشتی بەرەو ئەستەمبووڵ دەبنەوە و لە نەکاوا بای پێچەوانە هەڵدەکا و ڕایەڵ و پۆی هەودای هومێد تێکەڵ دەکا و دەریای خەمان پێلان دەدا و فرزەندی ئەو هونەرمەندەدەکەونە ناو گێژی بەڵا و گێژیان دەدا و بە ناکامی دەیانخاتە ناو هەناوی ئاکامەوە و نەهەنگی مەرگی مرۆخۆر، تێیان ڕۆدێ و بەرەو نەمانیان ڕۆ دەبا و لە ڕووی جیهانیان ڕادەدا.

کەڵەکە ژینی مرۆ، گێژی مەرگ بیڕفێنێ      خیگەدەردی و چەپەرو بێڵ وسەوڵ دەشکێنێ

ئەبولفەزڵئەفەندی دەفتەردار -لە تاو و سوێی جووتە کوڕەی جوانەمەرگی- وا شپرزە و پەرێشان بوو، داوەبەنی هەڵزناوی تەونی ئاواتی تەمەنی، دەڵەتەری سەردەفتەری دیوانی گیانکێشان هاڵا و هاڵاوی دڵی بە کوڵی، گوڵی ژیانی ژاکاند و پەنجەی ڕەشی ڕۆڵەمردن، پەڕ-پەڕ هەڵیپریواند و بەر شەپۆلی نەمانی دا. جیا لەوانیش فرزەندی نێرینەی نەبوو. بە مەرگی ئەو، ئاسەواری خانەدانیان بڕایەوە.

دیسانەکە لەو ماقوڵە بدلیسیانە -کە ناوبانگیان دەرکردووە- یەکیان شێخ ئەبووتاهیری کوردە، کە زانای زۆر بە ناو و دەنگ، مەولاناعەبدولڕەحمانجامی، لە کتێبی *نەفەحات*دا باسی دەکا و گۆڕی

---

۱- ماوەیەك لە مغنیسیا مامۆستا بوو. پاشان بوو بە قازی تەرابلوس؛ دوایە کرا بە دەفتەردار و سیوسێ ساڵ ئەو کارەی کرد و دوایی ژیانی لە ئاستانە دەیگوزەراند. زۆر زانا بووە و زۆر کتێبیشی نووسیون. *تفسیر حسین واعظ* و *زەخیرەی خوارەزمشای* وەرگێڕاون و کەنارەی بۆ *تاریخی ئیدریس بدلیسی* -کە باوکی بوو- نووسیوە. *قصص الانبیاء* و *تاریخی عوسمانی* ئەو دایناون. دیوانی بە فارسی و عەرەبی و تورکی هەیە. بە دیوانێك لاسای حافیزی شیرازی کردۆتەوە. مزگەوت و فێرگەیەکی لە گەڕەکی تۆپخانە کردووە و هەر بە ناوی خۆیەسی. ساڵی ۹۸۲.ك (۱۵۷۳.ز) مردووە.

بە ودم و پیـرۆزی، والە گەڕەکی کسورە؛ لە لای خۆرنشینی بدلیس.

شوکری شاعیـر، کە سەردەمێك لای میـرانی تورکمان و ڕۆژگارێك لای شەرەفخانی بدلیس بـوو، پاشان کەوتە ڕیزی هەمدەمانی سوڵتان سەلیمخان و ڕووداوی زەمانی ئەوی بە شێعر هۆنیوەتەوە و بـە ڕاستیش گاڵەی کردووە و بە *سەلیمنامەی* ناوناوە. لەتیفی ڕۆمی خاوەنی *تەزکەرەی شـوعەرای تـورکی* ناوی ئەویشی نووسیوە؛ منداڵی شاری بدلیسە.

مەبەست ئەوە کە: هەمیشە شاری بدلیس مەکۆی دانا و زانایان و بنکـەی بـە هـۆش و گۆشـان و پەروەرندەی خوێندن بووە. ئوستادی جێ بەرز و بەڕێز مەولانامووسا -کە ئێستا مامۆسـتای فێرگـەی شوکریەس- لە مەولانا شاحوسێنی باپیـری خۆی -کە زۆر ژیاوە و دوازدەپێپیلکەی دەساڵەی لە سـەر دنیاوە دواداوە؛ واتا: سەدوبیست ساڵ ماوە- چیـرۆکێ خۆشی بیستووە و بـۆ نووسـەری ئـەم پەڕانـەی گێڕایەوە کە: بارام بەگی زولقەدری لە بریکاری شائیسماعیل، پارێزگـاری عـەدلجـەواز و ئـەرجیش و بارگیـری پێ سپێرابوو. کارگوزارانی شەرەفخان لە ئەخلات و سەرکەوشەنان دامەزرا بـوون. ئـەو دوو هێزە تێك گیـران و هەرا قەوما. شەرەفخان لە بدلیسەوە شێخ ئەمیـری بلّباسی نارد کە سەرپەرشـتی شەڕ بکاً پێنجسەد فەقێ و مەلای بدلیس تیـروکەوانیان هەڵگرت و بۆخەزا ڕەگەڵی کەوتن؛ وێڕای ئـەو چوونە ئەرجیشێ.

ئاووهەوای سازگاری شاری بدلیس بە نووسیـن پەسنی نادرێ؛ شیبای نەرمی شەوگارانی و گەشـت و سەیرانی باغانی و جوانی دام و دەزگاکانی، لە وزەی لێدوان بەدەرە.

سەردەستەی بەرەی میـــرخاسان کـە خەلیفـەی شێخەلئیـسلام، مـەولانا عەبدولــخەللاق کـوڕی شێخحەسەن خێزانی، کە خەلیفەی شێخعەبدوڵڵای بەدەخشانی و گومبەزی پڕ لە ڕۆشناکی لـە نزیکـی گۆکمەیدانە و جێی ڕەوا بوونی نزایە و سەرزنـجیـــرەی تەریقـەتیان شـێخ ڕوکنـەدین عەلائودەولـەی سـمنانیە -ڕازی لای خودا پیـرۆز بـێ- لـە مرخـی گەوهەرباریـەوە، مرواری و دوڕ داوەریـوە و لـە پەسندی ئاووهەوای خۆش و نەرمی بدلیسێدا، ئەم چەند شێعرانەی نووسیوە:

ئـــەی دڵ وەرە تـــا مـــاوی ڕابـوێـرە لـە بـدلیـسا

تـــا ســـروەیـەکی لێ بـێ نـرخی نیـە فـووی عیسا

کوا خدری نەمر بابێ لەم ئاوە بکا چێژێ
چەندەی هەیە ئاوی ژین لێم روونە کە دەیرێژێ

باغاتی بەهەشت کوانێ؟ با دەرکەوێ خۆڕانێ
دەرویش وەرە ئەو ساکە و کولکەت لە گرەو دانێ

هۆری کە دەیانزانی لەگرە چ بەهەشتێکە؟
بێزیان بوو لە جێی خۆیان لایان وەبوو نەشتێکە

کەس لێرە بەرامەی خۆش ئافرۆشێ نرخ ناکا
سەد بۆنی بەهەشت بمژە هەر دەم لە هەوای پاکا

زریان کە دەغەزدار بوو سووڕایەوە چەند سالێك
بۆ تۆزی کە دەرمان بوو نەیدۆزیەوە تۆزکالێك

دار و دەوەنی پڕ گوڵ، باخ و ڕەزی پڕ میوە
دەشت و دەری ڕەنگیوە کێووکەژی خەملیوە

بدلیسە مەکۆی ڕازان بۆ دلبەر و چاوبازان
پێك هێنەرە بۆ نیازان جێ پەسنە لە لای چاران

کۆی زستان -لە بەر بەفر و مژ و بۆران- خەڵکی بدلیس سەغڵەت دەبن. بەڵام دیسان سەرما و سۆڵەی هێندەبە سۆزە و گەز نیە بیانئێشێنێ.

دارا و نەدار و ناونجی و نامۆ و غەوارە و شارەیی، ئاوردوویان لە سەر دارە. باری داری قەڵاشکەری -ئەوەندەی ئێستر هەڵدەگرێ- نرخی درهەمێکی زێوە کە دەکاتە دوازدەئاقچە. سووتەمەنی گەرماوانیش هەر ئێزنگە. هێندێك جاران لە ڕێبەندانی زستاندا، بەفر ڕێگایان هەڵدەنێ و ڕێگەی هاتوچوو دەبەستێ.

هەر لە زۆر لە مێژینەوە سوڵتانی دادگەر و خونکارانی خاوەنشکۆ -لە سۆنگەی شارێ پارێزی- موسوڵمان و کافرەکانی ئەم شارەیان بە فەرمانان لە باج و پیتاك لاداوە و نەفرین‌نامەشیان نووسیوە بۆ هەر کەسی دەستەڵاتدار، کە لە فەرمانەکان لادا.

فەرمانڕەوایانی بدلیس بەرەودوای یەك، مزگەوت و تەکیە و پشووگە و فێرگە و خانەقا و گەرماو و پردیان لێ کردووە. بیستویەك پردەبەردینە لە ناو شارەکەدا هەیە؛ مەردم لێیان دەپەڕنەوە. شازدەگەڕەگ و هەشت گەرماو[1] و چوار مزگەوتی گەورەی هەیە. مزگەوتێکیان لە پێشوودا کلیسای هەرمەنیان بووە؛ ئەو کاتەی لەشکری ئیسلام ئەم ولاتەیان گرتووە، کردویانەتە مزگەوت و قزلمەسجیدی پێ دەڵێن. یەکێتریان سەلجووقیەکان کردوویانە و مێژووی دروست کرانەکەی بە خەتی کوفی نووسراوە و ناوی مزگەوتەکۆنەیە. یەکێکیتر میرشەمسەدین وێڕای کاژێرە دەروێشێك لە تەنیشتی گۆکمەیداندا چێ کریە و ناوی لێ ناوە شەمسیە. نوێژگەی چوارەم شەرەفخانی باوەپیرەی منی هەژار دەگەڵ فێرگە و دەروێش دانیێك لە تاخاماردین کردوویە و ناوی ناوە شەرەفییە. مزگەوتەکان پێشنوێژ و بانگدەریان هەیە و مووچەشیان خەیلێ فرەیە. لەو ڕۆژەوە کە ڕێ و شوێنی ئیسلامەتی پەیدا بووە هەتا ئێستا، بڕوات وابێ جارێك نەبووە نوێژی هەینی و نوێژی بە گەل لە شاری بدلیس نەکرابێ.

منی هەژار پێنج فێرگەم لێ بنیاد ناوە: خەتیبییە، حاجی بەگییە، شوکرییە، ئیدریسییە، ئیخلاسییە؛ لای خانەقاکەی شەمسییەن. ساڵی نۆسەدونەوەتونۆ سەرم گرتوون و ئێستاکە پڕن لە فەقێ، هۆزانانی هەڵبژاردەو مەلا چاکانی دیاردە -بۆ فێرکاری- لە فێرگەکان دامەزراون. مەولانا خدریبەبی[2] -کە بۆ ڕێ و شوێنی شافعی و مانا کردنی قورعان و فەرموودەکانی پێغەمبەر زانایەکی بێوێنەیە و دەڵێن هەر کەس لای خوێندبێ خوا تاواتی پێك هێناوە- دەرسبێژی شەرەفییەیە. بەڕێز شەمسەدین مەولانامحەمەدی شەڕانشی -کە بۆ گوتنەوەی مانای قورعان و باسی عاسمان و «مەنطق» و «کلام» زۆر کارامەیە و بە ئاکارتەرزی لە کوردستاندا و لە لای مەلایان زۆر جێگەبەرزە- مامۆستای فێرگەی ئیخلاسییەیە. ئاییــنزان و مەلاچاك و خۆپارێز و ڕاست و پاك، مەولانا محەمەد زەرقی، سۆفی فێرگەی حاجیبەگییەی بە دەستەوەیە و دەرسی تێدا دەڵێتەوە. مەولانا عەبدوللای ڕەشك -کە زۆر زانا و بە هونەرە- بە فەرمانی ئاستانە، خۆی کردۆتە هەمەکارەی ئیدریسییە و قۆڵی

---

١- لە دەستنووسێکدا بیست گەرماو. عەونی

٢- لە دەستنووسێکدا خدر خێزانی. عەونی

بۆ لەسەر کێشراوە.

مەردمی‌تری شارەکە -لە پیشەوەر و کاسبکار- هەشتسەد دوکانێکیان هەیە. لە ناوشاردا شوێنی بەهرەدەر زۆر هەیە. بە تایبەتی بلیمەتی دادگەر و دادیار و خێرەوەمەند و چاکەکار و باربۆکاری داماوان و پەسیوی لێقەوماوان و دڵسۆزی خوێندەواران و هەڵبژاردەی سەرداران و خۆشەویستی خونکاران و جێ باوڕی سوڵتانان، خوسرەوپاشاکۆنە میری میرانی وان -بەر بارانی بە ڕێژەوی چاکە و بەزەوی خوا کەوێ- دوو گەرماوی لە مەڕ مەڕ و دوخان و سەد دووکانێکی دوودەروازە و دووهەلاڵخانە و ئیدیشی درووست کردوون و دەقەبەڵی دەروێشدانی «ڕەهوا»ی کردوون و جگە لەوە کە سوود و بەهرەیان زۆرە، شارەکەشیان جوان کردووە. وردەکاری وێژەوان و ڕاوێژ و گفتولفت جوان و پیتۆڵ و دەم و پل ڕەوان و شارەزا لە هونەرمەندی، محەمەدجان ئەفەندی کە بە ڕەگەز قازی‌زادەو نەجیمزادەی ئەم ناوەیە و باب و کالانی تم و تم پلە و پایەی بەرزیان بووە، بۆ مێژووی ئەو کردەوانە ڕستی «بنای‌خسروانە»ی هاتۆتە بیر[١].

سەرباری ئەم کارەچاکەش دوو پرۆژەی زۆر گرینگی خستە کار و بە ماوەیەکی پرهندك، سەرلەبەری گەیاندنێ و هەموو کەس ئافەرینی کرد. یەکەمیان ئاوایی ڕەهوا لە نێوان گوندی تاتوان و شاری بدلیس هەڵکەوتووە. دوو کاروانسەرای هەراو و دەروێشدانێکی بڵند و گەرماوێکی بە دیمەن و مزگەوتێکی لە گیان خۆش و دەدوکانی شتفرۆشان لە ئاواییەکەدا هەیە. بە مەودای دوازدەهەزار گەز ئاوەکانیەکی هێناوە و سی ماڵ فەلە و موسڵمانی لە دەوروبەر دامەزراندوون و ئەو زەویانەی کە پادشای خوالێخۆشبوو سوڵتانمرادخان بە بەخشش دابوونی، بە خوسرەوپاشادەقەبەڵی ڕەهوای کردووە و دەرامەتی بۆ ڕێبواران و میوانان دەدرێ بە شۆربا و چرا و نان، میر وسەرناس، رووت و کەساس، تورك و تاجیك، عەرب، عەجەم، بەندەو ئازاد و کەس‌نەناس، هەر کەسێك شەو بگاتە وێ -بە پێی پلەی- بەخێو دەکرێ. شوێنێکی زۆر کوێستانیشە؛ گەرچی لە نێوان بازێر و تاتوانێدا گوندی زۆر و کاروانسەرای زەوەند هەیە، بەڵام بە هۆی بەفری فرە و سەرمای زۆری -کە ساڵێك لە ناو ساڵاندا هەر جارێ بەفر باریوە، خەڵکی بدلیس پێواویانە، هەموو چەلان، لە سەرانسەری زستاندا، لە شێست بست

---

١- «بنای خسروانە» بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە ٩٨٥. هەژار

کەمتری نەبووە- هەموو کۆیکی زستانەی، چەند ڕێونگ و بازرگانێك لەو ڕێیە سەرما بردوونی. لە پادشایانی پێشین و فەرمانڕەوایانی گەورە بە تایبەتی باب و کالی پایەبەرزی ئەم هەژارە، چەند جارێك لێی وەخۆ کەوتوون کە ئەم ئاوەدانیە ساز کەن. ئێستاش شوێنەواری دیوارانیان لە پێیەك بلندتر ماوە. بەلام بە هۆی دنیا شێوان، ئەوانیش لێیان شێواوە و بە سەرنەگرتوویی ماوە.

ئارەزوو زۆرە و ڕای ژیان سەختە ئاخۆ بۆ کێ بێ ئەم تەخت و بەختە؟

وا ئێستا بیست سال زیاترە کە لە سایەی کار باشی ئەو پاشاخوالێخۆشبووە، هیچ گیاندارێك لە ڕەهوایە بە سەرمایە نەمردووە. حاجی و ڕێبوار و بازرگان -بە بێترس و دلەتەپێ- تێدەپەڕن.

دووەمین: لە شاری وانیش مزگەوتێکی تەرز و بەرز و فێرگەیەك و نێژگەیەك و گۆشەیەکی دەروێشانی خۆش و جوانی بنیاد ناوە. قورعانخوێنی خۆشئاواز و خەلکدوێنی سەربەرزەك و بانگدەری سەلا و بانگڕەوان و زارا و شیرین و ئاهەنگزان و مجێوری ژیکەلە و ڕووخۆش، لەو نوێژگەیە دامەزراون و هەر کەس بە گوێرەی ئەرکی خۆی، مووچەی بۆ دیاری کراوە. دوا بە دوای هەر پێنج نوێژەکان، بۆ شاد بوونی گیانی پاکی بە گەل فاتیحا دەخوێنن.

شەوانی هەینی و دووشەموان خەتمی قورعانی لێ دەکرێ و بە بێ گومان گیانی پاکی ئەو گەورەیە ودم و پیتەکەی وەردەگرێ.

سێهەمینیان:[1] نووسەری ئەم ڕووپەڕانە و ئاپۆرەی هۆزی ڕۆژەکی -کە ماوەیەك سەرگەردانی بیابانی پەشیمانی و نوقمی دەریای گومڕایی بووین و چلوچوار سال لە دەس بەدکار ملك و مال و زێد و هەوالمان جێهێشت و کەوتینە ناو قزلباشان و بە بیستنی قسەی سووکی ناکەسبەچە و بەدناکاران گرفتار بووین- خوسرەوپاشابووە ڕێبەر و ڕێشاندەرمان و لە ئازارمان بوو بە دەرمان و زۆری ئەرك و ئازار کێشاتا لە درووجاری دەرکێشاین و پێشمان کەوت و هێنباینیەوە ناو باخچەی بێ چقلی ئیسلام و گەیشتمەوە نیشتمانی خۆشەویست و شوێنی باب و باپیرانم.

---

١- دەپێشدا گوتی دوو کاری زۆر گرینگی کردووە، وا سێهەمیشی خستە سەر! جەمیل

## پوختەی وتار

منی هەژار وێڕای نزیك بە هەزار کەس ژن و پیاو و زورهان و لاو، گەلێك ساڵان لە بەر خودا پاڕاینەوە بمانباتەوە ناو ئیسلام. خودا نزای ڕەوا کردین و خوسرەوپاشابوو بە سەبەب. کۆششیّ ئەو پیاوە کردی و تەقەلای ئەو پاشایە دای، لە ئەندازە چوو‌بووە دەریّ. کاری ئەو بوو کە پادشای خوالێخۆشبوو لە ئەخچەوان ناردیە شوێنم و دەگەڵ ئەو هەزارە زیلەی بە تاسوخ و پەرەوازە، هاوردینیەوە ناو مەڵبەندەکانی ئیسلام و چاومان بە زێد ڕۆشن بۆوە و بەختەوەر و سەرفراز بووین. سوپاس بۆ خوا.

## ئەخلات

ناوچەکانی دەوروبەری بدلیسیش هەر یەکجار خۆشن. ناوچەی ئەخلات -کە شارەکەی شوێنەواری کەونارایە و لە ڕۆژگاری نۆشیروانیدا جاماسب[1]ی مامی لە سەر بوو، لە دواییشدا پایتەختی پادشایانی ئەرمەن بووە- هەوای لە ئەندازە بەدەر خۆشە. باغات و ڕەزی بێدادەو هەموو جۆرە میوەی هەیە و تەنانەت شێلانە و سێوی لە دنیادا بێوێنەیە. زۆر سێوی لە کێشانەدا بەرانبەر بە سەد درەمە! سێوی ئەخلات لای ئەرمەن و ئازربایجان بەناوبانگە. هەرمێی زۆر باشیشی هەیە.

مزگەوت و فێرگە و خانەقا و تەکیە و دەروێشدانی زۆرن و فرەش زانای بەناوبانگ و چاك و پیری لێ هەڵکەوتوون. یەك لەوانە سەیدحوسێنی ئەخلاتی[2]یە؛ کە هەم شێخ و هەم مەلا بووە و لە جەفری‌جامیع[3] زانیدا لە دنیا ناوبانگی هەبووە. بە زەبری جەفر زانیویە کە چەنگیزخان پەیدا دەبیّ و ئێران و توران تێك دەدا و هەر پێشەکی -بەر لەوە بێن- دوازدەهەزار ماڵی خزم و دۆست و پەیڕوانی شوێن خۆی داوە و نیشتمانیان جیّ هێشتووە و چوونەتە میسر و تا چەنگی چەنگیزی مەرگ بەرگی ژینی لیّ دادڕی، هەر لەویّ بوو. ئێستاش گومبەزی پیرۆزی لەویّ جێگەی نیازانە و لە میسر

---

١- کوڕی فەیرووز، کوڕی یەزدیگوردە. فەیرووز بیستەمین پادشای ساسانیە. جەمیل

٢- ڕەنگە نیازی حوسێن، کوڕی یوسف، کوڕی عەلی خەلاتی بەناوبانگ بیّ کە ساڵی ٧٩٥.ك (١٣٩٤.ز) هاتۆتە دنیا و لە تەورێز وستانی خوێندووە و لە جزیر بۆتە قازی و فێرکار و چووەتە قاهیرە و شام و حەج و لە مەککە ماوەتەوە و ساڵی ٨٥٩.ك (١٤٦٤.ز) لەویّ مردووە. جەمیل[؟!] چەنگیز ساڵی ١٢٢٧.ز مردووە. هەژار

٣- پیتزانیشی پیّ دەڵێن؛ گۆیا هەموو نهێنیەکی دواڕۆژی پیّ دەزانن. جەمیل

گەڕەکێك هەیە، تاخی ئەخلاتیانی ناوە.

یەکی‌تریان مەولانا مەحیەدینی ئەخلاتی‌یە. کە بۆ ژمارە و پێوان و زانستی لە مەڕ عاسمانان، زۆر کارامە و زانا بووە. کاتێ کە نەسیرەدین محەمەدی توسی بە فەرمانی هەلاکۆخان لە مەراغەی لای تەورێزێ ڕوانگەی دادەمەزراند و خەریك بوو زیج[4]ی دەنووسی، مەولانای بردەلای خۆی و وێڕای ئەو و موئەیدەدین عەروزی و نەجمەدین دەبیرانی قەزوینی، ئەو ئەرکەیان ئەنجام داوە.

لە ڕۆژگاری ئیسلامێدا ئەخلات زۆر بەریەلاّ بووە و زۆر جاران کاول کراوە. سالّی ٦٢٦.ك (١٢٢٩.ز) سولّتان جەلالەدین خوارەزمشابە زۆری زۆرداری لە بەر چنگ و پلی سەلجووقیانی هێنا دەر و کوشتاری زۆری تێدا کرد. ئەو جار مغولی هاتنە سەر و وێرانکاری لە ئەندازە بەدەر بووە. سالّی ٦٤٤.ك (١٢٤٦.ز) بوومەلەرزەێکی وای تووش بوو، زۆربەی زۆری خانووەکانی هەڕفاندن. سالّی ٩٥٥.ك (١٥٤٨.ز) چلەی زستان، شاتۆماسب دەوری قەلاّی ئەخلاتی داو لە بەر چەنگی پیاوەکانی سولّتان سولەیمان‌خانی دەرێنا و فەرمانی دابە سەعاتێك قەلاّکەیان دەگەلّ زەوی ڕێك کردەوە. لە پاشانیش سولّتان‌سولەیمان‌خانی‌خەزاکەر خۆی دەشار و دژی پێشوو نەگەیاند و لە سەر ڕۆخی دەریاچەکە، قەلاّ و شوورەکەی دامەزراند و لە سایەی ئەم ئالّ و گۆڕە، کۆنەشار تەواو وێران بوو؛ شاری تازەش ئاوا نەبوو.

جیهان کۆخێکە وێرانە لە سەر ڕێبازی لافاوا
بە دەستی گۆج و چەنگێ خاك و خۆلّ، چاوای دەکەی ئاوا؟

ئێستاش هەرگا شوێنەواری شاری وێران دەدەنەوە، خانی و خان و گەرماوی لە بەرد تاشراو و مەرمەڕ تێدا دەکار کراو، دەردەکەون.

### مووش

ئەویش هەر سەر بە بدلیسە. شارێکی زۆر کەونارایە و ئاسەواری وارش و قەلاّی لە مێژینەی ئێستەش ماوە. لە ڕۆژگاری دەستەلاّتی باب و کالّی ئەم هەژارە سەرگەردانە، قەلاّی مووش مەودای فرسەخێك

٤- ئەو جەدوەلەیە کە ئەستێرەناسان دەکاری دێنن. جەمیل

لە باکووری شارەکەوە لە سەر کەژێك هەڵکەوتبوو. گەلێك ساڵان ئاوەدان بوو. پاشان سوڵتانیخەزاکەر خۆی لێ کردەوێرانکەر و لە کەرستەی دار و پەردوی، لە سەر گردێك نیوەی دژێکی کەونارای ساز کردەوە و پەنجا کەسێکی دژدار و تۆپچی و کەلوپەلی پێداویستی بۆ دیاری کرد.

ئەرمەنی بە مژ دەڵێن «مووش». لە بەر مژ و دومانی زۆر، دار و باری گەشە ناکا؛ بەڵام لە دەوری شارەکە هێندێك ڕەزی هەنگوور هەیە. ڕەزەکانیان لە سەر تەپك و لە قەدی کێوان ناشتووە. مێوی ئەوێ ئەگەر لە بەرزایی نەبێ و ئەگەر بەعەرزدا ڕانەکشێ، بەری نابێ. تەنانەت ناشێ ئەو مێوە بخرێنە سەر سندەگلێش.

دانەوێڵەی هەمەجۆرە و هەرزنیشی بێداد دەبێ. دەشتی باش و لەوەڕگەی بژوێنی زۆرە. دەشتەکیەکانی وێندەرێ گا و گامێش و پەزی فرە بەخێو دەکەن. ئەوان جووت بە کۆتان دەکەن؛ بەڵام لەبری جۆتەگایەك بیستوچوار لینگەی تێدەکەن. تورك بە دەشتی مووش دەڵێن: مووشئەواسی. مەودای تێکڕای ڕاستاییەکەی دەدوازدەفرسەخ درێژە و لە چوار تا پێنج فرسەخ پانە و تژی لە گوڵ و ڕێحانە.

دەوری دەشتەکە کێواتە و کێوەکانیشی جەنگەڵی پڕ و چوغر و تژی بەفر و سەوز و شینن. چاوە و کانی و ڕووباری زۆر ڕوون و تەزی و بەتەوژم لە بەرزایی کەژانەوە سەربەرەژێر فڕکەیانە و لە دەشت یەکتسر دەگرنەوە. چەمی فورات لە باکووری ئەو دەشتەوە سەر هەڵدەدا و سێیەکی دەشتەکە دەبڕێ و بەرەو باشووڕ تێدەپەڕێ. چەمی ناوداری قەرەسوو جواناوی چیای نەمروودەو لە خاوەری مووشەوە دێ و بە ناوەندی ئەو دەشتە وەك بەهەشتەدا چەندی خوا حەز کا مشەیە. بازی چەرموگ -کە باڵدارێکی نایابە- لە لێرەواری وێ هەیە و داری لاویش بازی سپی بە سەرەوە.

| | |
|---|---|
| هەموو وەرزی سەوزە و هەموودەم بەهار | بەهەشتێکە دەورەی چڕ و لێرەوار |
| چلۆی هەر یەکەی بەرگ و سازێك لە بەر | هەموو پیرەدارێکی بازێك لە سەر |
| لەرینی نەمامان بە سەد نازەوە | بەزمگێڕە باڵدار بەسەد سازەوە |
| لەبەر ئاوی کانیاوی کەوسەر بەزیو | بە زستانێ گەرمە و بە هاوین تەزیو |
| بە هەر لایەکا لا دەکەی هەر گوڵە | لە چاو هێزی بینین و فێنکی دڵە |

لەو میرگ و میرخوزارەدا نزیکەی سەد ماڵ هەرمەنی لە دەوری یەك کۆ بوونەوە و لەولا و لەم‌لای دەشتەکەشدا گوندی موسوڵمانان هەنە.

حەمدوڵلامستەوفی گوتەنی: لە زەمانی پادشایانی چەنگیزیدا پیتاکی مووش سیٚ چەل بیست و نۆ هەزار و پێنج‌سەد زێڕ بووە. کاتیٚ سوڵتان سولەیمان‌خانی خەزاکەر ناوچەی بدلیسی ڕزگار کرد و چاوی پێدا خشاندەوە، جیا لە داهاتی ئەوقاف و زەوی و زاری هومایونی، داهاتی عوسمانی لە مووش بە سەرانەی چوارهەزار کافریشەوە -کە لە سەر پێودانی پێشوو هەر کەس دەبوو حەفتا ئاقچە سەرانە بدا- تێکڕا دەکاتە پێنج‌سەد و سی و سیٚ‌هەزار و سێسەد و بیست و چوار ئاقچە. کە دوازدەئاقچەی عوسمانی مسقاڵێك زێوی بیٚ‌خەوشە.

دەڵێن بەر لە ئیسلامەتی -کە ئەرمەن دەستەڵاتدار بوون- فەرمانڕەوای ئەوساکەی مووش، ڕۆژێك لەشکری خۆی ڕانا. دەژێر سوارانی سوپادا شەش‌سەد ئەسپی هەبڵەقی دیت؛ هێشتا ئاخی هەڵکێشاوە و گوتوویەتی: «مووش سەرداری بە مشووری لە سەر نیە!»

## خەنس

ناوچەی بەناوبانگی بدلیس یەکێکی‌تریان خەنسە؛ کە هەوارگەی زەحف هەیە. زۆزانی هەرە گرینگی سوشەهری و بینگۆل و کوێستانی شەرەفدینە. لە ڕۆژگاری باب و کالّی نووسەری ئەم پەلکانەدا، ڕەوەند و خێلاتی کوردان دەهاتنە ئەو زۆزانانە و داهات و قازانجی زۆریان لەو ڕێگەوە پێدەگەیشت. دوو کانی لێن: یەکیان دەبێتە خوێی سپی و ئەوی‌تر ئەمەکی سوورە و داهاتی خوێی ئەو دوو جێیە هەموو ساڵێك خۆ لە دوازدەهەزار ئاقچە دەدا. بۆ خەرج و باجی دیوانیش بەرانبەر بە مووش دێتەوە. ئەگەرچی ئێستا وەرزێر و پالە و فەلەخوێی هەرمەنی لە جاری جاران کەمترن، بەلام گوند و مەزراکانی بە قەبەڵ چوون و تیمارن و هەر ئێستاکیٚ چوارسەد پارچە دەمبڕ بە دەست خەلکەوەیە. ئەسپی کەحێلی عارەبی لە مەلبەندی خەنس هەیە. داهاتی زەوی و زاریشی هەر تەنیا دانەوێڵەیە. شتی زۆر دیدەنی و سەیری زرێباری بولانقە؛ کە چوار دەورەی بە گومانم فرسەخێکە. هەمیشە ئاوی شلۆییە و قوڕاوێکی ئاماڵ سوورە و چەمێکیشی لەبەر دەڕوا هێند قوڕاوە کە هەرگیز ڕوون نابێتەوە.

گۆلێکی‌تر لە نێوانی ئەخلات و بولانق هەیە، دەریاچەی‌نازکی پێ دەڵێن. ئاوی بێ‌ئەندازە ڕوونـە و زۆریش خۆش و سازگارە. زستانان جۆرێك دەیبەستێ کـە چـوار مانگـان کـاروانی بـە سـەردا دەڕوا. نێزیکی نەورۆز -کە سەهۆڵ دێتە شکەستـن- قرچە و گرمـەی هـەتا سـێ فرسـەخ ڕێ دەچـێ. کـاتێ سەهۆڵ لەوێ نەما، نیشانەی هەوا خۆش بوونە. قوڕاوە سووری بەهاران ماسیەکی زۆر لەو گۆلەوە خۆ بە دەم سەرڕێژ دادەن و لە ناو جۆم و چۆمیلکەی گچکەدا، خۆ دەگرنەوە و ئاپۆرەی خەڵکی ناوچەکە بە گەل دەچنە ڕاوەماسی و هەتا هەیڤەك هەر کەس هەرچەندی بـخوازێ ماسـی هەیـە و پـەك ناکـەوێ. ماسیەکان زۆر گۆشتیان خۆشە؛ درێژیان لە نیوگەز پتـرە. سـەیر ئەوەیـە گـەرای نـاوزگی ماسـیەکان وەکووو ژەهرن! هەرچی لێی بـخوا پێی دەمرێ. چەند کەسێك لە بەرچاوی خۆم کەمێکیان لەو گەرایـە خوارد، شەو و ڕۆژێك بورانەوە و بە دەرمانان ڕشانەوە و ڕزگـاریان بوو. هێندێك کارگوزاری دیوان لـێ بڕابوون ئەو ماسیانە پاوان کـەن و بیانفرۆشـن. تـەنانەت لـە مـنی هـەژاریان بـە ئیجـار گـرت کـە قازانـجێك بۆ دەولەت بێ. بە هەڵکەوت ئەو چەند ساڵە ماسی لە گۆل دەرنەکەوتن و کابراش هیـچیان دەس نەکەوت.

لە باکووری شاری بدلیس و لە نێوانی مووش و ئەخلات، چیایەکی مەزن هەیە، کێـوی نـەمروودی پێ دەڵێن. وەك دەماودەم دەگێڕنەوە: نەمروود زستان لەوێ بووە و بۆ هەواریش هەر لەوێوە هەڵکشاوە و لە سەر ترۆپکی چیاکە دام و دەزگای پادشایانەی بنیاد ناوە. زۆربەی کاتی لەو کۆشکەدا ڕابواردووە. کاتێك خوا ڕووی لێ وەرگێڕا، کێوەکەی خستە لەرزەوە و تەپڵەسەری چیا ڕما و ڕۆچوو. لە شوێن قەڵا و سەرسەراکە، ئاوهەڵقولی.

چیای نەمروود لـە زەویـەوە بـەرزایی دووهـەزار گـەزە. ئـەو شـوێنەی کـە داتـەپاوە، ئەنـدازەی داخزینەکەی هەزار و پێنجسـەد گـەز دەبـێ و لـە ناوەنـدی چـیاکەدا لـە هـەر چـوار لاوە ڕۆچـووە و دەریاچەیەکی زۆر هەرا و لەو شوێنەدا پەیدا بووە کە چوار دەورەی پێـنجهـەزار گـەز بگـرە زیـاتریش مەودایەتی. هێند بەردەڵانێکی دڕ و هێند لێڕەوارێکی چڕە، تەنها دوو-سێ ڕێگە هەیە مەردم بتـوانن بیچنێ. وڵاخەڕێش هەر دوانن. ئـاوی گـۆل زۆر ڕوون و سـاردەو دەوراندەوری ئـەو گـۆلاوە دیـوارێکی بەردی ڕەشی وەك شانە هەنگوین کون‌کونە و لە هێندێك جێ ئەو کونانە پڕ بوونەوە و بەردەکەی پتـەو کردووە و سەنگی زۆرە. هێندێکیشی زۆر سووکەڵەن؛ وەك بەردەپێی خۆماڵی وان. تورکـان بـەو جـۆرە

بەردانە دەڵێن «دەوەگوێزی» (چاوە وشتر). قەراغی خۆڵی زۆر کەمە؛ بەڵام ئەگەر گڵ کەندی لێ بدۆزیەوە و بیدەیەوە، ئاوی گەرمی لێ دەردەچێ.

لە لای باکووری چیاکە -لە پشتەوە- ئاوێکی خەست و ڕەش هەیە. چەشنی ئەو گۆڕاسنانەیە کە لە کوورەی ئاسنگەران پەیدا دەبێ. لە سەنگینی و لە سەختیدا ئاسنیش وەپاش خۆ دەدا. ئەو ڕەشاوە کە هەڵدەچێ، کەمکەم بەرەوژێر دادەخزێ. منی هەژار وای بۆ دەچم کە ساڵ بە ساڵ دێتە سەری و دوو چەندانە دەبێتەوە. لە بەرزایی سی گەزەوە و بە گومانم لە درێژایی پێنجسەد هەتا شەشسەد گەزدا، لە چەند شوێنەوە دەردەچێ. ئەگەر کەسێك وای نیاز بێ کە پارچەیەکی یەك مەنی لەو ڕەشاوە جوێ کاتەوە، ئابۆی دەکرێ، لە شەکەتی خۆی فل دەبێ. دەستەڵات هەر لای خودایە.

## بڕی یەکەم

## هۆزی ڕۆژەکی و هۆی ئەم ناوەیان

کەحێل سوارانی سارای خۆشزوانــی و جلیـت بـازانی دەشـتی وێـژەوانی، بـە واژەی ڕاسـت و زاراوەی ڕەوانیان لە بارەی ڕۆژەکیەوە فەرموویانە: وشەی ڕووزەکی فارسیە و بە جیم و شینیش نووسراوە؛ بـەڵام بە بنچینە ئەم وشەیە «ڕۆژە» و «کی» یەکی بۆ یەکیەتی وەدوو خراوە؛ وەکوو پیاوەکی و شتیتریش. هێندێکی پیتۆڵ و زۆرزان دەڵێن کاف و یێ بە فارسی پاڵدێمی شـتی گـچکۆکەن و جیمەکـەش کـاری عەرەبە؛ لە هەر کوێ ژێیان بێتە بەر، جیمێکی لەجێ دادەنێن. کوردیش زۆر جار لە جێگەی ژێ شیـن دەبێژن[1]. جا وەك دەڵێن، وێژە ئەگەر بیست و چوارە، هـەر یـەك ودوانـی بـەکارە؛ بـا باسـی هۆزەکـە بکەین. گوایە ڕۆژێك لە ڕۆژاندا بیستوچوار تیسرەی سەرەکی لە بەرەبابی ڕۆژەکی لە نزیك تـاب -کـە سەر بە ناوچەی خوێتە- کۆ بوونەوە و بوونە دوو بەش. دوازدەیان یەکتـریان گرت و ناویان لـە خـۆ نـا بڵباسی. دوازدەهۆز و تیــرەکەیتـر بـە قەواڵیـسی ناسـراون. دەڵـێن قـەوالیس و بڵبـاس دوو هـۆزی بابانەکانن. ناوی بلبیس و قەوالیس لە دوو گوندانیش نریاوە کە هان لە ناو هەکاریدا.

**پوختەی وتار:** کاتێ لە تاب کۆ بوونەوە، زەویەکانی ئەو ناوەیان لـە نـاو خۆیانـدا بەشیەوە و بـە دڵسۆزی یەکتـریان گرت و مەزنێکیان بۆ خۆ هەڵبژارد و بوونە هێزێکی بە پێز و ملیان لە وڵات گرتن نا. ڕۆژەکی ڕەسەن ئەوەیە بەشی لە گوندی تاب هەبێ. ئەوی بەری نەکەوتبێ، پێی دەڵێن زڕەڕۆژەکی. ئەوسا کە بدلیس و حەزۆ لە دەست تاویت ناوێکدا بـوون -کـە نەتـەوەی شـایانی گورجـستان بـووە- ڕۆژەکی دەگژی ڕاچون و لە وڵاتیان تاراندووە. هێندێك دەڵێن حەزۆ لە گـورجی گیــراوە و بـدلیس لـە هۆزی گردکی. هێندێکیتر لایان وایە ناوچەی بدلیس لە ناو دەسی هـۆزی زوقەیـسی[2] دەرخـرا.کـامی

---

١- نیازی وایە کە ڕوزکی و ڕوجکی و ڕوشکی هیچیان ڕاست نیـن و هەر ڕۆژەکیە و وای بە سەر هاتووە! هەژار

٢- لە دەسنوسێکدا زوقەیشی نووسراوە. عەونی

ڕاستە و کام هەڵەیە، تۆباڵ وە ملی چیرۆکبێژان.

دوای گرتنی حەزۆ و بدلیس چەند ماوەیەك لە ژێر سایەی سەرکۆماری سەرداریاندا بە سەربەخۆیی و ئارامی ڕایانبوارد و کاتێ سەرۆك گیانی پاکی بە پێمیردی خودا ئەسپارد، نێرینەی لێ نەکەوتەوە و ڕۆژەکی بێ سەر مانەوە و هەر کەس بۆ لای خۆی ڕاکێشاو نێوان پسا و پێك وەربوون و تێك بەربوون و شێعری مەولانا هاتفی زۆر بەجێیە کە فەرموویە:

| | |
|---|---|
| گەر وڵات لێی نەمێنێ فریاڕەس | ماڵی وێرانە بێدەس و بێکەس |
| هێزی فەرمانڕەوا ئەگەر فەوتا | قەحبە دەڕشێتەوە لە مزگەوتا |

سەردەمێکیش وا ڕابرا. لە ئەنجامدا سەرەك هۆز و ڕاوێژکەران کۆ بوونەوە و بە دڵ لێ بڕان کە بۆ چاری ئەو بێباریە کارێك بکەن. تێکڕا وایان بە باش زانی عیزەدین و زیانەدین -کە هەردوکیان برا بوون و لە ڕەگەزدا دەچوونەوە سەر کیسڕایان و نیشتەجێ شاری ئەخلات بوون- بە میوانی بێننە ناوخۆ و لە ناو گەل و هۆزدا بژین و هەڵیان سەنگێنن و بیاندۆزن و هەرکێ لەوان بۆ فەرمانڕەوا دەست دەدا و حاکمەتی لێ دەوەشێتەوە، بیکەنە سەرداری خۆیان و خۆیان لەو هەر کەس هەرکەسی و ناباریە ڕزگار کەن و چیدی سەربزێوی نەبێ و پشێوێنی لە ناو لاچێ و ئارامی بێتەوە کایە و گەشە بە ناوچەکە بدرێ. گەورە و گچکەش سەر لە بەریان ئەم بیرەیان پەسند کرد و پەیمانیان داکە سەری موو لێی لانەدەن. هێندێك لە سەرناسانی هۆز چوونە ئەخلات و لە شازادانیان گێڕاوە و بەو پەڕی قەدر و ڕێزەوە هێنایاننە شاری بدلیس. کۆمەڵێکیان عیززەدینیان کردەفەرمانڕەوای بدلیس و دەستەیەکان زیانەدینیان بەدڵ بوو، دەگەڵ خۆیان بردەحەزۆ و کردیانە فەرمانڕەوای خۆ. خەڵکەکە بە گوێ لەمستی، هەموو هەست و نستی خۆیان دایە دەست ئەو دوو برایە و ئەوانیش زۆر بە لەباری بە کاروباریان دەچاران.

## پەسنی هۆزی ڕۆژەکی

لە ناو هەموو کوردستاندا و لە چاو هەموو تیرە و هۆزان -بۆ ئازایی و دلاوایی و مەردایەتی و بە نامووسی و ڕاستی و چاکی و شەرم بەخۆیی و دەست پاکی و ئاییندارى-

هۆزی رۆژەکی دیاردەو لە ناو کۆدا هەڵبژاردەن. دڵسۆزی گەورەی خۆیانن و هەتا بڵێی ئەمەگداران. هەر کاتێ فەرمانڕەوایان تووشی گیرە و قەرقەش دەبێ، ئەوسا بیانبینە چدەکەن؟! کەس ئاوڕ وەسەر خۆ نادا و لە پێناوی پارێزگاری و ئاسودەیی میری خۆیان، سەر و ماڵیان بەخت دەکەن. هەر جارێك وڵاتی بدلیس بێگانە زەوتی کردووە و میر ومەزنی رۆژەکیانی لە سەر فەرمان لابردووە؛ رۆژەکی واهاروژاون بێ ئەوەی کەس کۆمەکیان بێ؛ دەست لە دەست و قەوەت لە خوا هاناش دەست و ڕمی خۆیان؛ شیشاونە گیانی دوژمن و حەلوای شەقانیان پێ کردوون. لە ناو کوردان باوە دەڵێن بە هەژماری هەر بەردێکی دەدیواری قەڵای بدلیسێ گیراوە، ئەوەندەش سەری رۆژەکیان لە پێناویدا پەڕاوە. پادشایانی زل و زۆردار کە چاو دەبڕنە کوردستان و خۆ لە گرتنی خۆش دەکەن، بەر لە هەرکار پەلاماری سەرداری ناوچەی بدلیس و چەکداری رۆژەکی دەدەن. هەتا رۆژەکی بە هێز بن، کوردستان بەکەس ناگیرێ و هۆزەکانیتری کوردیش چاو لە رۆژەکی دەکەن و خۆ بە گژ دوژمندا دەدەن. کاتێ سوڵتانی خەزاکەر[1] وڵاتی بدلیسی گرت و شەمسەدین خانی سەرداری لێ وەدەر نا و بەرەو ئێران ئاوارە بوو، تا سێ ساڵان هۆزەکانی بایەکی و مودکی و زێدانی و بلباسی نەهاتنە بەر فەرمانەوە و سوڵتان هەموو میر ومەزنی زلی کوردستانی ناردنە سەرێ و ئەو کوردانە -وەك دێوەکانی کێوی قاف- پەلاماری رۆژەکیان داو نەشیانتوانی ڕامیان بکەن.

سوڵتانی سولەیمانپایە، کە زانی بە توند و تیژی چی بۆ ناکرێ و باریان نابا، بەهائەدین بەگی حەزۆی هێنا و کردیە دەسکیسی خۆی و خەڵکی دۆڵی کیفندور و تیرەکانی بایەکیانی بۆ ڕاست کرد و لەولاشەوە برایم بەگ و قاسم بەگی کوڕی شێخ میری بلباسی دڵخۆش کرد و مەلاسی کردن؛ ئەوسا توانی بدلیس بگرێ.

گەلێك جار وا هەڵدەکەوێ کوڕە میرانی کوردستان دێن و سەر لە بدلیس دەدەن و ماوەیەك دەیگوزەرێنن. بەلام هەرگیز ئاغازادەو کوڕە میرانی رۆژەکی بۆ رۆژەکیش

---

١- وادیارە نیازی سولتان سولەیمانی قانوونیە. عەونی

نەچوونە بەردەرکی ماڵی یەك لە میرانی کوردستان. لاوی کۆماری ڕۆژەکی لە ژیانی ئاوارەییشدا زۆر خۆڕاگر و بە پشوون؛ دڵسارد و ناهومێد نابن و کۆشش و خەبات دەکەن و ڕێگەی خۆیان دەکەنەوە و هونەر و جەوهەر دەنوێنن. بۆ نموونە دەروێش مەحموود کەڵەچێری -گەورەی تیرەی کەڵەچێریان- ولاتی خۆی بەجێهێشت و خۆی گەیاندەبەر بارەگای عەرشاسایی سولتانی سولەیمان پایە و لە سایەی وریا و دریایی و هونەرمەندی و مەردی و ڕەندی و پیتۆڵی و لەبلەبانی خۆی، خۆی دەگەڵ پادشارێك خست و ببووە هەمدەمی تایبەتی و دەفی دەکوێی سولتاندا بوو. هێندەی هەمووشت دەزانی، نیویان لێ نابوو هەمووشت. شاعیرێکی بێوێنە بوو؛ زۆر هەڵبەستەی بە فارسی و تورکی داناون. نووسەری ئەم پیتۆکانە تاك بەیتێکی لە شێعرەکانی لەبەرە، دەڵێ:

سەوزەی بە ئاوی ژینە لە بان لێوی ئاڵەوە          یان وردەبازی هەنگە بە هەنگوینی ئاڵەوە

قورئان خوێنێکی ئەوەندەلێزان و دەنگخۆش بوو کە نازناوی ئیدریسی دووەمی پێ وەرگرتبوو. ببووە کۆڕنشینی پادشاو پلە و پایەی کتێبداری دیوانی خۆی پێ بەخشیبوو. حەیدەر بەگی برازاشی بۆ ڕەشیدی و چاوەترسان، دەست نیشانی هەمووکەس بوو. لە دیوانی سولتانەوە سنجەقداری و هۆزی بەلکو (بەگلو)ی پێ سپێرا و هێندێکیش لە ولاتی پالۆی بە مولکایەتی درایە.

سەرناسێکیتری ڕۆژەکی، ئیبراهیم بەگی بلباسی، کوڕی قەلەندەر ئاغایە. دڵی لە خزمان ڕەنجاوە و ئاوارەی سیستان بووە. لەوێ خۆی کردۆتە پیاوی محەمەدخانی تورکمان؛ کە ئەوسا فەرمانڕەوا بوو. شێردەکالان نەوەستاوە و جەوهەری خۆی نیشان داوە و محەمەدخان کردوویەتە سنووورداری لای بلوجان. لەو کەوشەنە دەگەڵ بلوجان چەند جارێك بە شەڕ هاتووە؛ بەلام کوردەی دێوئاسایی لە ئازایی دروست بووە، چۆن بلووجی پێ دەوێرن؟ بەزاندوونی و شکاندوونی و کوشتارێکی وای لێ کردوون زۆربەی پیاوی کاری و ئازای بلووجانی لە ناو بردوون و ولاتی لێ داگیر کردوون و خەڵکی ناوچەکەی سەرانسەر هاتوونە

بەر فەرمانیەوە و خۆی بە سەردا سەپاندوون و بە مەزنایەتی ڕای‌بورادووە.

یەکی‌تر بەستام‌ئاغایە، ئەویش گەیوەتە قەندهار بۆتە پیاوی سولتان حوسێن میرزا و لە ماوەیەکی هندکدا زۆریان بەرەژوور بردووە و بۆتە ئەندامێکی کۆڕی بریکارانی میرزایی و کات و ساتی بە هەمدەمی حوسێن میرزا ڕابراوە.

ناوداریکی ڕۆژەکی دی، قاسم بەگی شاحوسێناغای مۆر هەلگرە. کاتێ کە دەگەڵ ڕۆژەکیان لە ئەخچەوان بەرەو بدلیس گەڕاینەوە، قاسم بەگ هەر لە جێی خۆی بوو. ئەو بەرانبەر بە بارەگای فرشتاوای مبارەك و بەرز و پیرۆز هێند بە ئەمەگ و دڵسۆز بوو، دانی بە جەرگی خۆیدا گرت و لە ڕێگەی ڕاستی لانەدا! چونکە ئەوسا پاسەوانی پایەبەرزی سولتانی بوو، لەبەر فەرمانی دەرنەچوو! بەڵام هێندێك کوردی عیراق -کە ڕکیان لە ڕۆژەکیان بوو- دەداو و دەلینگی بەربوون و لەسەر پلەی یووزباشیەتی ئەوەندەیان گەڕ تێ هاڵاند کە لە ئەندازە دەرچووبوو؛ تەمیان لێ نەڕەواندەوە هەتا هەموو پلە و پایە و سایە و مایەیان لێ ساند و بێکاریان کرد. قاسم بەگ وەك فەرموویانە: پشوو دەرگا دەکاتەوە؛ خۆی مات داو پیشی خواردەوە تا ئەو دەمەی کە بریکارانی خونکاری تێگەیشتن چماڵێکە و چەند نانخۆرێکی بە نمەکە. زۆر بەباشی هاتنە پێش و کردیانەوە بە یووزباشی و ئێستا کە تاریخی کۆچی ساڵی هەزار و پێنجەمە، ئەو فەرمانەی بە دەستەوە. پیاو ڕاست بڕوا، لاوێکی زۆر شایستەیە و زۆر مەرد و ئازا و میرخاسە. بە هومێدم هەر سەرکەوێ.

سەبارەت بەم ئاکارانەش ڕۆژەکی لە کوردستاندا لە هەموو هۆزەکانی‌تر لە سەرتر و ناودارترن. ئەو هۆزە بیست و چوار تیرەن؛ پێنج لەمانە -کە قیسانی و بایەکی و مۆدکی و زوقەیسی و زێدانیسن- کۆنە دانیشتووی بدلیسن. دەشیان -کە بەرەی بلباسن- کەلەچێری و خەربیلی و باڵەکی و خەیارتی و کۆڕی و بریشی و سەکری و گارسی و بێدوری و بەلاگەردین. ئەو نۆ هۆزەش -کە زەردووزی و ئەنداکی و پرتاقی و گردیکی و سوهرەوەردی و کاشاغی و خالدی و واستوکی و عەزیزانن- قەوالیسین.

## بڕی دووەم

## بنەچەکەی فەرمانڕەوایانی بدلیس

لە زۆرانڕا زانیومانە و لە مێژووانیشدا دیومانـە کـە ڕەگـەزی فـەرمانڕەوایانی بـدلیس دچـتەوە سـەر کیسرایەکان. هێندێ کەس بڕوایان وایە لە نەتەوەی نۆشیـروانن. بەڵام قسەی ڕاست ئەمەیە جاماسـبی کوڕی فەیرووز -کە پێنجەمیـن[؟] کیسرا بووە[1]- لە بریکاری کیسرا قوبـاد سەرپەرشـتی ناوچـەکانی ئەرمەنستان و شیـروان بوو. کە ئەو مرد سێ کوڕی لە پاش مان: نەرسـی[2] و سـورخاب[3] و بـەهوات[4]. نەرسی بوو بە جێنشیـن و نۆشیـروانیش بۆ دنیاداری پەروەرانـد و ڕۆژبـەڕۆژ بـەرەو پـێش دەچـوو؛ وا بەهێز بوو کە لەشکری وەدو خۆی داو هێرشی کردەسەر گەیلان و بـە زۆر دەسـتی بـە سـەردا گـرت و کیژی شاهێکی گەیلانی بۆ خۆی هێنا و ئەم ژنـەی کـوڕێکی هێنـا، نـاوی گەیلانـشای[؟] لـێ نـرا[5]. پادشایەکانی ڕوستەمدار لە نەوەی ئەو گەیلانـشایەن. سـورخاب پادشـای شیـروان بـووە و میـرانی شیـروان وەچەی ئەون. بەهوات لە ئەخلات نیشتەجێ بووە و بە هندك داهاتێـك ساچـاندوویەتی و بـۆ جیهانگیـری تێنەکۆشاوە و خۆی گۆشەگیـری لە لاسای باب و باپیـری پێ باشتـر بووە.

میـرانی بدلیس نەوەی بەهواتن و دەگەڵ شاهانی ڕوستەمدار و شیـروان پـسمامێ هـەڤن. هـەتا

---

١- ئەو پرسە کە دەست نیشانی زێرنۆفە و دیارە بە هەڵەی زانیوە چونکە فەیرووز کیسرای بیستەمە. جەمیل

٢- دو شازادەی نەرسی ناو هەبوون: ١- کوڕی گۆدەرز، کوڕی بلاسی ئەشکانی ٢- کوڕی بارامی ساسـانی. زۆر گـەڕام چیتـرم بەو ناوە دەست نەکەوت. جەمیل

٣- سێ سورخاب هەن: ١- سورخاب کوڕی یەزدگورد، مامی نۆشیـروان ٢- سورخاب کوڕی بـارام گـۆڕ ٣- سـورخاب کوڕی ڕوستەمی پاڵەوان، کە زۆرابیان پێ گوتووە. جەمیل

٤- زۆر گەڕام تووشی ئەو ناوە نەبووم؛ وێدەچێ بەهرام بووبی و وای بەسەر هاتبێ. جەمیل

٥- مروج‌الذهب، ڕووپەڕ ١١٠-١٢٠ دەڵێ: «پاداشی سەرپر گەیلان شابوو کە نەتـەوەی بـارامی گـۆڕ بـوو». زێرنـۆف پرسەکی لە سەر داناوە؛ دیارە بە هەڵەی زانیوە. جەمیل

ئەمڕۆ کە کلکەی مانگی قوربانی ساڵی هەزار و پێنجی کۆچە، وا بوو بە حەوسەد و شێست ساڵ، فەرمانڕەوایانی ناوچەی بدلیس و دەوروبەرەکەی و حەول و حەوشەکەی و بوود و نەبوودی، مشورخۆرانی ئەم خانەدانە سەرپەشتی بوون و لەو ماوەیەشدا بیخەیە سەریەك، سەدودەساڵێك لێیان سێنراوە و نامۆ و بیانی پێ ڕاگەیشتوون. ئەو بێگانانەش کە دەست درێژییان لەو ماڵە کرد و بە زۆر بدلیسیان لێ زەوت کردون، چوار چینە پادشان؛ کە لە جێی خۆیدا بە دوور و درێژی لە مەڕیان دەدوێم[1].

پوختەی مەبەست، وەك لەمەوبەر نووکی بنووسی خەمڕەوێن بۆی نەخشاندین:

عیززەدین لە ناوچەی بدلیس و زیائەدین لە حەزۆ، بوون بە سەرداری ڕۆژەکیان. ڕۆژگار دەهات و ڕادەبرد؛ خەڵکی بدلیس وردەوردە لە عیززەدین سارد بوونەوە و زیائەدینیان خۆش دەویست. زیائەدین هەستی پێکرد کە خەڵك لە برای دڕدۆنگن و ئەویشیان زۆر خۆش گەرەکە و بە ئاواتن کە خۆی بە سەریان ڕابگا. ڕۆژێك بۆ دیداری برای لە حەزۆڕا هاتە بدلیس و پێشوازی گەرمی لێ کرا و جووتەی برا پێك شاد بوون و دڵیان بە یەك گەشایەوە و ئیتر بوو بە بەزم و هەرا و ئاهەنگ و شایی و شایلۆغان. ئاووهەوای سازگاری شاری بدلیس زۆر بە زیائەدین کەوت و جگە لەوەش دەیدی کە وا گەورە و گچکە و بەرز و نزمی خەڵکی وڵات -بە دڵ و بەگیان- دەگەڵ ئەون، قرمی خۆی لە بدلیس خۆش کرد و بە دڵ لێڕا کە بۆ خۆی یەکلا کاتەوە. بە دزیەوە کەین و بەینی دەگەڵ دژدارانی قەڵا داخست؛ گوتی: کاتێ کە من دەڕۆم برام بۆ بەڕێ کردنم لە قەڵایە دەردەکەوێ، ئەوسا بە فێڵێك فەرەجێك بۆ قەڵا دەگەڕێمەوە. ڕۆژی سەفەر زیائەدین ماڵاوایی لە برای کرد و ڕوو بە حەزۆ ملی ڕێی گرت و براش بۆ بەڕێکردنی دەگەڵی چوو هەتا لە شار دوور کەوتنەوە. زیائەدین لە پڕێکدا ڕووی کردەعیززەدین و گوتی: ئەنگوستیلەم لە قەڵادا بەجێ ماوە و خۆشم نەبێ کەس نازانێ لە کام شوێنە. ئێوە تۆزێك لێرە گیر بن تا من بە لەز دەچمە قەڵا و ئەنگوستیلەکەم دێنمەوە. خۆ برا لە برا دڵپیس نابێ؛ عیززەدین لە دەشت مایەوە و بە

---

[1] - وا دەردەکەوێ لەم چوار دەوڵەتە: قەرەقۆینلوو، ئاققۆینلوو، سەفەوی و عوسمانی نیاز بێ. عەونی



ڕاوەوە خۆی خەریك كرد. زیائەدین دەرفەتی خۆی لێ هێنا و هاتە قەڵا و دەروازەی دژ دابەسترا و پەیامی بۆ براكەی خۆی نارد كە پێی بڵێن: تكا دەكەم وەك برای چاك و بە ناكار ئەو پیاوەتییەم دەگەڵ بكا و چەند ڕۆژێك بچێتە حەزۆ من لە بدلیس دەمێنمەوە ئاووهەوای شاری بدلیس لە لەش و بەندەنم خۆش دێ. تا عیززەدین بە خۆی زانی، كاری لە كار ترازابوو؛ لە لای برای شیرینییەوە، تاڵاوی بە دەمدا كرابوو.

هاتەوە بەر دەروازەی دژ و دەگەڵ برای بێبەزەیی گوتی و ڕستی و شێر و ڕێوی بۆ هێناوە، بەهرەی نەدا. تووڕەی ئاوی سارد بخۆوە! چاری ناچار زیان لە نیوەش وەگەڕێ هەر قازانجە. بە كلكی بارگینی دادا و حەزۆ و ساسۆن بگرە و هاتم! و خۆی لەو ناوچانە دامەزراند. فەرمانڕەوایانی حەزۆ كە بە خۆیان دەڵێن عەززان، نەتەوەی ئەو عێززەدینەن. فەرمانڕەوایانی بدلیس نەتەوەی زیائەدینن و ناویان كردوونە دیادین.

ئەو میرانەی بە سەر بدلیس ڕاگەیشتوون و ناویان لە تاریخدا هەیە و منی هەژار خوێندومنەوە، هەژدەكەسن. ماوەی حوكمیان لە چوار سەد و پەنجا ساڵ تۆزێك زیاترە و بە بێ ناوبڕ سەرداری ئەم مەڵبەندەبوون. ئەو میرەیان كە ئەتابیك ئاقسونقور[1] بدلیسی لە دەست دەرێنا، نەمزانی كامەیان بووە. كە ئەم پەڕانەشم نووسین، چەند تاریخێكم بۆ دۆزی، ناوی ئەوم نەدۆزییەوە. ڕاستی ڕووداوەكە وایە: ئەوسا كە قزڵ ئەرسەلان خاكی ئازربایجان و ئەرمەنستانی داگیر كرد، بدلیسیشی وەبەر خۆ دا. پاش زەمانی سەلجوقیانیش ئاخر و ئۆخری خوارەزمیان بوو كە سوڵتان جەلالەدینی كوڕی سوڵتان محەمەدی خوارەزمشاهاتە بدلیس، مەلیك ئەشرەف حوكمی دەكرد. دوای ئەشرەف مەلیك مەجدەدین بە دوای ئەودا عیززەدین و لە دوای ئەو میرئەبوبەكر، ئەوسا ئەمیرشێخ شەرەف و دواجار میرزیائەدین بووە؛ كە هاوچەرخی ئەمیرتەیموری كورەكان بووە و چاویان بە یەكتر كەوتووە و لەو دەمەوە هەتا ئێستا -كە فەرمانڕەوایی بدلیس بە كەلەپوور بۆ نووسەری ئەم پەڕانە ماوەتەوە- سەربە وردیان ڕێك و پێكە و خۆش و ناخۆش هەرچێكیان بە سەر هاتووە، لە شوێنی خۆی باسی دەكرێ.

هێندێك لە میرانی بدلیس بەر ئاوڕی پڕبەزەیی و خەنیكەری سوڵتانانی سەربڵند و میرخاس

---

١- ئەتابیكی مووسڵ بووە و ساڵی ٥٢١ دەوڵەتی ئەتابیكی دامەزراندووە. عەونی

پەسند کەوتوون و خۆیان لە ژێر چاوەدێری کەس نەبوێری سەروەرانی بەختەوەری خاوەن شکۆ و کامڕەوادا بە چاو دیوە و لە سایەیان پایە و ڕێز و هێز و پێزیان سەری لە عاسمان ساویوە. هێندێکیشیان بە ڕەشەبای ئامالّ گڕە و گڕی ئاگری تووڕەیی خاوەن ناوی وەك لافاوی بەستێن بڕی کەندالّ دڕی هەردەستێن وا خنکاون، وا سووتاون، بوونە لیتە و قەرەبرووت و ئاو ڕای داون و گێژەلّووکە لوولی داون.

جا ئێمە بۆ هەردووباران -کێهەیان ژینی خۆش بووە و کامەیان چارەڕەش بووە- دوورە پەرێز ناوەستین و دەست لە دەست و یاری لە خوا، بەرێزە ڕیزیان لێ دەگرین.

چیرۆك لێرە دەست پێ دەکا لە ڕۆژگارانی پێشیندا دنیاگرێك کە مرخی خۆی لەم کوردستانە خۆش کرد و کێشە و هەرای بۆ میرە کوردان نایەوە، سەلجوقی ئازربایجانێ بوون.

سولتان مەحموود، کوڕی سولتان محەمەدی کوڕی سولتان مەلیکشای سەلجوقی، ئەتابیك عیمادەدین ئاقسونقوری بە سەر بەشێك لە عیراقی عەرەبەوە دانابوو. کوێخایەتی ئازەربایجان و ئەرمەنیش بە ئەتابیك ئیلدگز سپێرا بوو؛ کە دەبێتە باپیری قزلّ ئەرسەلان. ئەم جووتە کارگوزارانە پاسداری سەر سنووران و پارێزگاری بەرژەوندی سەلجوقیان بوون و هەرکەس لە مەلّبەندی خۆیدا ئەرکی خۆی بەرێوە دەبرد.

سالّی٥١١.ك (١١١٧.ز)[١] کە خاوەنی مووسلّ نەما، ئەویشیان هەر خستە بەردەست عیمادەدینی زەنگیەوە. ڕۆژبەڕۆژ، هات ڕووی تێکرد و پلەی بەرەو ژوورتر دەچوو هەتا گەیشتە ئەو ڕادەکە لەشکری هێرش بەری بردەسەر شام و حەلّەب و لە ماوەیەکی زۆر کەمدا دەستی بە سەر ئەوێشدا گرت. سالّی٥٣٤.ك (١١٣٩.ز) کوردستان و دیاریەکری پەلاماردا؛ بدلیس و ئاشووت و ئاکرێ و شوێنەکانیتری گرتن و قەلّای ئاشووتی کاول کرد و قەلّایەکی بە ناوی خۆی لێ ئاوا کرد و عیمادیەی کردەپاتەخت. کوردستان و بەتایبەتی شار و قەلّای بدلیس، چل سالّ پتر لە بەردەستی سەلجوقیەکان زالّەی دەهات.

سالّی ٥٧٦.ك (١١٨٠.ز) کە سولتان سالحەدین، کوڕی نورەدین کوڕی [؟] سەیفەدین

---

١- ڕاستەکەی دەبێ: ٥٢١.ك (١١٢٧.ز) بێ. جەمیل

غازی ئەتابیکی[1] لە شەڕی میسریانی شکست خوارد، ئیتر لەو ڕۆژەوە ڕۆژی بەختیان کشایەوە و دایە زەردەپەڕی کزی و بازەبەران بەرەوکانی قوڕە ڕەشەی دۆژی دەریای شەپۆل دەری شەوی ڕەشی بەڵا و نەهاتی داکشی و کشی و ماتی بە سەردا هات. ئەوساکە هۆزی ڕۆژەکی -کە چەند ساڵ بوو ئەستێرەی بەخت و ئیقباڵیان ئاوا ببوو- ژینی تاڵیان تەمی ستەمی بێگانان دایپۆشیبوو، دەرەتانی لێ بڕیبوون و لە ترسی دەست وەشاندن و ئازاری ئاکار کێویان، وەك جانەوەرانی کێوی دابوویانە لێڕ و کێوان و چاوەنۆڕی دەرفەتێك بوون گۆپاڵیان لە خیز بێتە دەر. کە دیتیان هەلیان هاتەوە و ئەمجار نۆرە گورزی وانە، وەك شێر لە بێشە دەرچوون و دەگیانی دوژمنان بەربوون و هەڵیان کردەکلکە و پلکە و قەلە و قوتەی ئەتابیکان و بە خەنجەری جەوهەرداریان، کەژ و کۆی زێدی نازداریان لە بەدکاران و نەیاریان، بە یەکجارەکی هەڵوەژارد.

ئەو کابرایە[2] کە لە لایەن سەلجوقیەوە لە سەر بدلیس داندراوە، زۆر شوێنەواری بە بەهرەی وەك خانەقا و کاروانسەرا و مزگەوت و پرد، لە شاری بدلیس و ئەخلات بە یادگار لە پاش ماوە.

وەکوو دەڵێن: شاری بدلیس بەرفەرمانی ئەتابیك قزڵ ئەرسەلان بووە. هەر چۆنێك بێت گزیریەتی ئاقسونقوری[3][؟] لە سەر عیراقی عەرەب و کوێخایەتی ئیلدگزی لە وڵاتی

---

١- دەناو ئەو ناوەدا مامۆستا زێرنۆف پرسەکی داناوە و بە هەڵەی زانیوە. وا دیارە بۆیە بووە کە دانەر ناوی دوانی تێکەڵ کردووە؛ یەکیان مەلیك ساڵح ئیسماعیل کوڕی نوورەدین مەحموودی زەنگیە و ساڵی ٥٦٩.ك (١١٧٣.ز) دەساڵان بووە و کراوەتە پادشای شام. دوایە سەلاحەدین مولکی لێ هەڵقرچاندووە و هەر حەلەبێ ماوەتەوە و ساڵی ٥٧٠.ك (١١٧٤.ز) مردووە. دووەم سەیفەدینغازی، کوڕی قوتبەدین مەودود، لە ئەتابیکانی مووسڵە. ساڵی ٥٦٥.ك (١١٦٩.ز) کراوەتە حاکمی مووسڵ و تا ساڵی ٥٧٥.ك (١١٧٩.ز) حوکمی کردووە. جەمیل

٢- لە نوسخەی ماکدا جێ ناوی ئەو پیاوە بە سپی ماوەتەوە.

٣- زێرنوف ئەم پرسەکەی لێ کردووە، کە وەدیارە بە هەڵەی زانیوە؛ چونکە ئاقسونقور و ئیلدگز یەکتر ناگرنەوە. دوو ئاقسونقور هەبوون: یەکیان قەسیموددەولە ئەبووسەعیدحاجب. ساڵی ٤٧٨ بە سەر شام و حەلەبەوە دانراوە و ٤٨٧ کوژراوە. دووەمیان: قەسیموددەولە سەیفەدین ئەبووسەعید ئاقسونقوری بەرسقی بووە. ساڵی ٤٩٨ والی بەغدا و ٥٠٧ والی مووسڵ و شام بووە و ٥٢٠ کوژراوە. ئیلدگز لە ساڵی ٥٥٥ ڕا تا ٥٦٨ حوکمی کردووە. جەمیل

ئازربایسجان بەرانبەرن و دەوری حکومەت کردنیان لە یەك چاغ و مێژوودایە.[1] ئێستاش بەرەی سەڕاجیان -کە لە ناوچەی بدلیس دەژین- پاشماوەی سەلجوقیەکانن و سەلجوقیان بوەتە سەراجیان. بەرەبابی تاج ئەحمەد و قەراکوتە و قولی ئوزبەکان و هیتریش لەو تیرەیەن.

١- لە نوسخەی تردا نووسراوە: ئەو دەمەی ئاقسنقور گزیری عیراقی عەرب بوو، ئاران و ئازربایجان درابووە دەست ئیلدگزی باپیری قزل ئەرسەلان و دەورانی حوکمیان هەمبەرە و ڕۆژگاریان بەرانبەرە. عەونی

## بڕی سێههم

## فهرمانڕهوایانی بدلیس

### که لای پادشایان بهڕێز بوون

### مهلیك ئهشرهف

ئهو دهسته زانا و هۆزانهی که بۆ مێژووی تیره و هۆزهکانی کرمانج ڕووداوی ڕاستیان ئامانجه و بۆ تارانی ئهتارانی چهوتی و ههڵه و چهت و پهڵهی چهوت و خواری ههرزهکاران، چابوکانه هاتونه دهست و به چوستی گورپیان بهستوه و بهرگی هونهریان پۆشیوه و به یارمهتی شۆڕهسواری زۆر به کاری بنووسی سهرپل و پهنجه، ڕهنجیان داوه و تێکۆشاون و ڕووپهری پڕ له شانازی سهربهرزانی کوردستانیان پێ نهخشیوه، لێرهدا درکاندویانه: ئهو گهوههره یهکدانهیهی هیمدانهری خانهدانی مهزنهکانی بدلیس بووه، به مهلیك ئهشرهف ناسراوه و پادشایانی میسر و شامێ، زۆریان له لا بهڕێز بووه و چاوهدێریان لێ کردووه و هاوچهرخی مهلیك ئهشرهف[1] و به بریکاری ئهو سوڵتانه، بۆته سهرپهرشتی بدلیس.

ساڵی ٦٢٥.ك (١٢٢٧و٢٨.ز) سوڵتان جهلالهدین کوڕی سوڵتان محهمهد خوارهزمشا، له بهر چهنگی زهبر و زهنگی چهنگیزخانی خۆی نهگرت و دهستهڵاتداری ئێرانی بهجێهێشت و کهوته وڵاتی هێندهوه؛ کاتێ بیستی که چهنگیزخان له جهنگی مردندا شکا و به خاکی گۆڕهوه لکا، له ڕێی کیج و موکرانهوه گهیشتهوه ئیسفههانی پایتهخت و به نیازی گرتنهوهی ئێران، شێرانه هاته مهیدانێ. ههر وهك کرگاری ڕهوانی کهمال ئیسماعیل ئیسفههانی گوتهنی:

---

١- مهلیك ئهشرهف موزهففهرهدین ئهبولفهتح موسا، کوڕی مهلیكعادل سهیفهدین ئهبووبهکر محهمهد ـ برای سوڵتان سهلاحهدینی ئهییووبی ـ ساڵی ٥٧٨ك هاتۆته دنیاو ڕۆژی ٤ی محهڕڕهمی ٦٣٥ مردووه. دهگهڵ کهیقوبادپادشای ڕۆمدا دژی جهلالهدینمهلیكشا پێك هاتووه و به جووته له ٢٨ ڕهمهزانی ٦٢٧دا شکاندوویانه. جهمیل

| | |
|---|---|
| جـیـهـان پێت ئـاوەدان بـۆوە دووبارە | لــە دەردی دەردەداران بـویـە چارە |
| دەمــت ودمـی هەیە و پیـرۆزە دەستت | دڵـت ڕوونـاك و فـەرمـانـت لـە بـارە |
| کە دوژمن تیـن و زەبری تۆی گـەیشتیێ | لــە ئـارادا نـەمـا، وەك بـەفـری پـارە |
| لــە ڕوی کـافر کــە شیـری تۆ بریسکا | وەکووو باڵـدار دەکـەونــە بــەر شەوارە |
| مــوسوڵمانی بە دەستی تۆ گەشەی کرد | لـە تــۆڕا زەنگ و خـاچـن پـارە پـارە |
| لە ســایەی تـۆ هەموو کەس کامڕەوایە | ئـەوی لامـان نــەبـیێ دەرد و جـخـارە |
| وەکووو نۆحی و ڕەهات کـردین لە لافـاو | بـمیـنی و سـەر بــکێشی بـۆ هـەزارە |

وەك ئاگری بێئامان بەربووە سەر و سامانی تەتاری گەمار و بە ماوەیەکی زۆر کەم سەرپاکی ئـەو وڵاتەی لەو پیسانە پاك کردەوە. بەڵام لە دوای دوو ساڵان کە ئۆکتای قائان[1] زانـی لـە ئێرانـدا چڕوی داوە، سی هەزار مغولی وەك غوولی پیاوکوژ و خوێنمژی بە سەرکردایەتی بەهادوڕ و جرماغون نۆیان، بۆ شەڕی سوڵتان جەلالەدین ناردەئێران. سوڵتان مانەوەی بۆ نەما و بەر بە ئەرمەنستان و ئـاران ڕەوی و لە ڕێی خۆیدا تفلیسی گرت. کە لەو بارەوە کەمال ئیمساعیل دەڵێ:

| | |
|---|---|
| لە تفلیس تا عومان ئاژۆت بە سەرڕەو | وروهێڕ بوون مغول لەم سووکە غارە |

خاوەنی تاریـخی *روضة الصفا* دەڵێ: «سوڵتان لە عیراقـەوە پێـشان ڕووی کردەئـەخلات. مـەلیك ئەشرەف لە بدلیس بوو؛ مەلیك مەجدەدینی برای بە سەر ئـەخلات ڕادەگەیـشت. دانیـشتوانی شـاری ئەخلات مژ و تەم، مژی تێك دابوون. بە پتەوی شوورەی شار و بە قەڵای بەرز و دژوار و زۆری دژدار و چەکداران، وابایی بوون ئاوڕیان وە سوڵتان نەداوە و تەنانەت جوێنیشیان پێـدا. ئـەویش لەشـکری لـێ دەنگ دان و گەڕیان دەئەخلات هاڵاند و گڕی شەڕی لە چوار کەنار دەدار و دیوار هەڵگرا و دەرەتان لە ئاشتی برا.

دەوردانەکە زۆری برد و زۆربەی زۆری ئاپۆرەی شار لە برسان و لە ترسانیش لەرز و زەرد و زەبوون ببوون و بەری شاڵاویان نەدەگرت. پیاوانی سوڵتانی تووڕە، کەلێنیان دەشوورە کرد و خۆیان تورڕدایە ناو

---

١- کوڕی چەنگیزخان، ساڵی ٦٢٤ هاتە سەر حوکم و ساڵی ٦٣٩.ك (١٢٤٢.ز) مرد. جەمیل

شار و ملیان لە کوشت و کوشتار نا. دژێك لە ناوەندی شار بوو کۆیلەیەکی مەلیك ئەشرەف -کە عیززەدینیان پێ دەگوت- دژداری ئەو قەڵایە بوو. مەلیك مەجدەدین ڕایکرد و خۆی گەیاندەلای عیززەدین.

هێچك لە قەڵاش هاتە یەك؛ بێ بژێوی هێرشی هێنا؛ وره و توانا باری لێنا و چاری ناچار خەڵکی قەڵاش هاواری شەڕبەسیان کرد و مەلیك مەجدەدین دەرکەوت و هەر ئەو ڕۆژە خۆی گەیاندەلای سوڵتان و سوڵتان لە تاوانی خۆش بوو؛ زۆریشی دڵخۆشی داوە و بە چاکە سەرفرازی کرد. کە ڕووی خۆشی لە سوڵتان دیت، لە کوڕەکە هەستا سەرپێ و بۆ بەخشینی عیززەدینیش پاڕایەوە. سوڵتان لە وەرامدا فەرمووی: پیاوێك خۆی بە شابزانێ شایان نیە ڕاسپاردەی کۆیلەی خۆی بێ. عیززەدینیش لە پاش دو ڕۆژ -وێڕای هێندێك هەمکارانی- زرێیان وە ژێرخەفتان داو بە ناوی چوونە ژێر فەرمان، لە قەڵاکەوە دەرکەوتن و نیازیان وابوو کە بێنە ناو کۆڕی سوڵتان، دەستە و خەنجەر هەڵیکەنێ و لە پاڵەوە بیهەنجنن. هێندێك لە پیاوانی سوڵتان بەو کەین و بەینەیان زانی، تا چەکیان لێ نەکردەوە نەیانهێشت سوڵتان ببینێ. فەرماندرا عیززەدین و مەلیك مەجدەدینیش دەگەڵ زنجیر کران و بە جووت گران».

لەو بەینەدا کە ئەخلات دەورە درابوو، مەلیك ئەشرەف نامە و پیاوی بۆ لای پادشایانی شام نارد و داوای هیمدادی لێ کردن. لە جەنگەی گیراندا لەشکری میسر و شام گەیشت. مەلیك ئەشرەف بە سوپای کوردستانیەوە پێشوازیان چوو. لە دەشتی مووش گەینە یەك و تێکرا بۆ تەمێ کردنی سوڵتان جەلالەدین هاتن. لەشکری جەلالەدینیش لە دەشتی مووش پێشە و برەی لێ برینەوە و بۆ شەڕ کردن وەکوو دەڵێن: وەك تای تەوراس بە ئامادەیی هاتە پێش. هەر دو لەشکر پێکیان دادا و بە بێ ناوبڕ سێ شەووڕۆژ شەڕی زۆر خەست و حەستەم و پڕ لە مەترسی و خوێناوی لە ناو ئەو دڕانە قەوما. بە هەڵکەوت جەلالەدین ئەوسا کە تۆزێك نەخۆش بوو، لە سەر تەختی ڕەوانەوە لە شەڕکەرانی دەڕوانی. سەرئەنجام لەشکری سوڵتان هێزی نەما و شکا و هەڵات. بەڵام سامی جەلالەدین ئەوەندەلەو سەر خەڵکە بوو،

کەس نەوێرا شوێن شکستەکەی کەوێ. سولتان گەڕایەوە ئەخلات. هەر ئەو ڕۆژە دەنگ داکەوت سوپای مغول گەیشتوونەتە ئاران و قۆڵی سوپای بەهادور و جرماغون نویانیش کەوتوونە ڕێ و لە ئالی تەوریزەوە دێن. کە بیسەری بەرزی سولتان ئەم خەبەرە ناخۆشەی بیست، زۆر شلەژا و لە ناچاری باری کرداری خۆی گۆڕی؛ مەجدەدین و عێززەدینی لە زیندان بەرهەڵدا کردن و ڕای‌سپاردەمەلیك ئەشرەف کە دژایەتی نەمێنێ و کەس لە کەس تۆڵە نەستێنێ و ئاشت بینەوە و وەك دۆست پشتی یەکتر بگرین. مەلیك ئەشرەف زۆر بە نەرمی هاتە پێش و زۆر بە گەرمی دەستی دۆستایەتی گوشی و هەر بەمەشەوە نەوەستا، کیژی خۆی دابە سولتان و بوونە خزمیش. سولتان گوێزتیەوە بدلیس و لەشکرەکەی بڵاو کرد و خۆی لە ناو شاردا حەشار داو خۆی دایە سەر گەپ و گەمە و چەقەنە و بەزم و هەمهەمە و هەموو دەمان هەر خەریکی بادەخۆری و گەلۆری بوو.

مەلیك ئەشرەف ناوە-ناوە سەری دەدا و بە نەرمی سەرکۆنەی دەکرد و ئامۆژگارانە پێی دەگوت ئەم جۆرە خدەو ئاکارە لە سولتان ناوەشێتەوە و بە بیری من لە ناو شاردا نەمێنیەوە و لە شوێنێکی چەپەك بژی زۆر باشترە؛ خوا نەخواستە ئەگەر مغول پێت بزانن، دێنە سەرمان؛ دەترسم بەرپەلیان کەوی و تۆی نازەنین و خۆشەویست تووشی ئەشکنجە و ئازار بی و دۆست و یار و خزمانیشت لە سۆنگەی تۆ زیانبار بن. بەڵام پەندی کێی دادەدا؟ هێندەوەبەر هەڵخوێندنە و شێر و ڕێوی هێنانەوە، با دەیبرد و بە هیچ دەچوو؛ باش تەنانەت جارێك بە بەرگوێی دانەدا. پاش ملە بە مینگە دەیگوت: ئەرکم لە سەر مەلیك زۆرە و لە میوانداریم وەڕەزە و نیازی وایە لە بدلیسمان وەدەر بنێ و خۆ ڕزگارکا!

سەردەمایەك بە سەردا چوو؛ شەوێك لە پڕ ئیماس بەهادوری مغول بە سوپاوە گەیشتە بەر شوورەی بدلیس. ئەو شەوەش وەك هەموو شەوان سولتان سەرخۆش و کەلەلا لە مەستی لالاموی دەکرد. بە دەبەنگی لە سەر جێگا بێ‌جوڵە خۆی لە گەز دابوو. بە پەلە خەبەریان بۆ برد؛ بەڵام کردیان و کراندیان بێهۆش بێدار نەکرایەوە! ئافتاوەیەك ئاوی ساردیان بە سەردا کرد؛ ئەنجا تۆزێك ئەغیار بووە و لە کارەساتیان تێگەیاند. گوتیان ئەسپی زین کراویش

ئامادەنە. سولتان بە خێزانی خۆی گوت: بابت زۆری نسحەت کردم، من بەراوەژووم وەر دەگرت؛ من ئێستا دەڕۆم؛ تۆ دەگەڵم دێ یان نایەی؟ کیژی مەلیك لە تەهی دڵ خۆی لە سولتان هەڵناوارد و هەر ئەو شەوە بە نیوەشەو جووتە سوارە لە شاری بدلیس دەرکەوتن. کەس نەیزانی ئەو سولتانە چی بەسەر هات! بەڵام شێخ ڕوکنەدین عەلائودەولەی سمنانی -ڕازی لە لای خوا پیرۆزە- لە *ڕسالەی اقبالیە*دا فەرموویە: لە پیری خۆم (شێخ عەبدولڕەحمانی کسرفی)م بیستووە کە سولتان بۆتە ئەولیا و لە گوندێکی نزیك بەغدا بە پینەدۆزیەتی دەژیا؛ هەتا خوا بۆ خۆی بردەوە.

خاوەنی *تاریخ گزیدە* دەڵێ: کوردێك برای لە هەراکەی شاری ئەخلاتێ کوژرابوو، لە ڕێ تووشی سولتان هات و لە تۆڵەی برایدا کوشتی. خێوی *تذکرەدولتشاهی* دەڵێ: کوردان لە ڕێ تووشی بوون و بۆ خاتری ئەسپ و پۆشاکی کوشتیان و شەڕت و گومیان کرد. خوا دەزانێ!

مەلیك ئەشرەف بە بێ ئەوە کە سەر وەبەر باری هیچ پادشاو خونکارێك بێنێ، گەلێك ساڵی فەرمانڕەوایی کردووە و کاتێ لە سەر دنیای ڕوونیش کۆچی یەکجاری فەرمووە. -وەك باسمان کرد- مەلیك مەجدەدینی برای جێگەی ئەوی گرتۆتەوە و کە ئەویش بەرەو نەمان بوو، کوڕ و نەوە و نەتەوەیان بە مەزنایەتی هاتوون و تا زەمانی دنیاوانی خونکاری زۆر بە زەبر و زەنگ (تەیمور لەنگی کورەکانی) خوای لێ خۆش بێ، هیچکەس خۆی تێ نەگەیاندون و زیانی پێ نەگەیاندون.

## حاجی شەرەف کوڕی زیائەدین

بازرگانی سەودا خۆشی شارستانی مێژووزانی کوتاڵ و پارچەی نایابی قەنەوز و خامەك و خارا و تافتە و بافتە و خانم مەڕۆ و هەریر و تاگربارانە و ئەتلەسی و کیمخا و داوماسی و مەخمەری حەوڕەنگ و شێلە و هەوری و چیتی گوڵ باتمانی و کەتان و زەڕی و کرێشەی گوڵدار و ڕێڕێ و ساکاری سفت و بەرپان و جێ چاکیان، بە تۆپ لە بان چاوەی نەردەبەر چاوی کڕیاران داوە و بە باڵ و گەزیان پێواوە و قولانجیشیان لە دو داوە و دەمی خامەی تیژ کراویان بە ناو قەدانداا هێناوە و لە سەرخۆ دایان دڕیوە و کولۆنجە و کۆلوانە و سابە و

کراس و لەچك و دەسماڵیان بە بەژنی چیرۆك بڕیوە و کۆك و پۆشتە، ڕایان ناوە و باس و خواسمان -بە پەرداغی- بە بەرچاودا ڕابوریوەکە: خاکەلێوەی ساڵی ٧٩٦.ك (١٣٩٤.ز) فەروەردین مانگی جەلالی -کە ئەو ساڵەش ساڵی سەگ بوو- دنیاداری بە ناوودەنگ و خاوەن شکۆ (تەیموری لەنگ) پاش داگیر کردنی بەغدایە و گرتنی جزیر و مووسڵ و تکریت و ماردین و ئامێد، لە سیواسڕا بەرەو زۆزانی ئاڵەتاق وەڕێ کەوت و ڕۆژی شەممە پازدەهەمی ڕەجەبە مانگی ئەو ساڵە لە دەشتی مووش فەرمانی پشودانی داو چەند ڕۆژێك وچانی فەرمو. حاجی شەرەف -کە بە گفتی خاوەنەکەی *ظفرنامە*، لە مەڕ یەکڕەنگی و سەنگینی و دۆستایەتی و مەردایەتی لە سەرتاسەری کوردستان بێ هاوتا بوو؛ بۆ بەر فەرمانی خونکاریش، بێ دریغی و بە دڵسۆزی، هەمیشە دەس لە بان چاوە و دەستەونەزەر هەڵوێستا بوو- کلیلی قەڵای بدلیس و ئەخلات و مووش و دژیتریش -کە سەربەو بوون- وێڕای دیاری زۆر نایابی هەمە ڕەنگە و بە سەنگ سووك و نرخ گران و چەند ئەسپی عەرەبی نەژاد و ئێسستری شەش دانگ و دویاد و ڕەهوان، بە ناوی پێشکێش هێنانی و بە سەرپەنجە ڕامووسانی پیرۆز و بە پیت و جوانی سەرداری هەموو سەروەران، بەختەوەر بوو.

یەك لەو ئەسپە پێشکەشیانەی، کوێتێکی داوێن تاریك و سم کۆدك و جومگە پەیت و لە سەر لنگ و ناودەست بڵاو و سینەتەخت و قەد باریك و دوو ئەستوور و گوێ سەگلاوی و هەنیە ڕەق و لاجانگ لەڕوو دەم و چاو و لموزشووش و بەژن ڕێك و کلكگر و باڵا بەرز و دیمەن تەرز و قیت و قۆز و زیت و نێسکە و لەنجەکەر و شۆخ و شەنگ و بەراپەڕ و ڕەوتمەڕ و ئاسکەباز و نازەنین و بێ مانگری و جووتە و گاز و سەروەشێن و هۆگر و ڕام و دەستەمۆ و جڵەو خۆش و لە ڕمبازیدا ڕەوان و پشوودار و بێ هەژان و سرکی و نرکە و سەرسم دان بوو. هێندەجوان بوو دەتگوت بە قەڵەم کێشراوە. بە ئەمەنیش گەلێك جوان و جوانوێکی تازەگیراوی سێ ساڵان و پێکراو بوو؛ ددانی شیلەی پێ مابوون.گەلێك میر ویەگلەری دیش ئەسپیان بە پێشکێش هێنابوون. لە دەشتی مووش ملەکرا و بەرچاو دران.

هیچ کەحیلێك تۆزی نەشکاند و برەوی هەمووانی شکاند.

زریـانـــی بـــەزانـدبـوو لـە گـەڕدا دەیـکـردەمـــژ و دومـان لـە شەڕدا
کـلـکـی لـە زەوی بـە گـەرد و یـالّـی لـەو بـەرزیـە هـەوری ڕادەمـــالّـی
بەرتەنگ بوو زەوی لەویّ بە شەشدانـگ چوار نالّی پەڵەی دەخستە سەر مانـگ
لـە بـرووسکـە لە پێش لە ڕێگە پێـوان لای بـردبـــوو کات و سـات لـە نێـوان
رابـوردنـی هـێـند بە هەلّپ و زوو بوو سەد پیینە شەوی لـــە ڕۆژ درووو بـــوو

مەزنتـر سەرداری سەرزەوی، بە چاکە و بەزەوی، دەحـاجی شـەرەفی ڕوانـی و بـە سـەر و ڕوی پـڕ خۆشەوە دواندی و ئەوەندەی لیّ پێچایەوە و هێندەی دڵخۆشی دایەوە و لاواندیەوە، کە هامپا و دۆست و یارانیش ئێرەیان بە جێگەی دەبرد. سەرەڕای ئەو ڕێزگرتنەش جبـەی تـان تـالّی زێـڕین و حەمایەڵـە شیـری زێڕی خەلات کرد و سەرەڕای مەڵبەندی خۆشی، ناوچەی یاسیـن و ئۆنیك و مەلازگوردیشی پیّ بەخشی و فەرمانی مەزناهینامە و نەفرین‌نامە لە نافـەرمان، بـە مـۆری سـەربزێو خـۆری شـاهانەی تەیـمووری نەخشی و بە جارێك سەرفراز کرا.

ئایق سۆفی پادشازادێکی ئوزبەگ بوو؛ دژی سەرداری جیهانگیـر، دەدلّدا بیـری خرابـوو؛ لـە سـەر ئەو سوچەی گرابوو. ئەویش درایە دەست حاجی کە لە زیندانی بدلیسدا بەند و کۆت و پێوەندی کا.

ئەو فەرمانە بابیی‌دارە -وەك یادگاریّ پڕهێژا- هـەتا سـالّی ٩٤٠.ك (١٥٣٣.ز) هێـشتا مـابوو. ئەوسا کە شەرەفـخان نەما[1] و شەمسەدین خانی فرزەندی بەدلّمەندی دەگەڵ پیاوانی ڕۆژەکـی ئـاوارەی عەجەمستان بوو، نیشان و مۆری تەیـموری و فەرمانی شاهانی پێشووش، دێر و دەوێدا لە ناو چـوون. کـە شـەرەفـخـان دەخـەلاتان وەرپێـچرا و وەبـن خـاکی ڕەش ئێخـرا، ڕۆڵـەی دلّبەنـد و شیـرینی (میـرشەمسەدین) کە بە وەلی بەناوبانگە، بەجێنشینی داندرا.

---

١- دەپێشدا هەر ناوی حاجی‌شەرەف بوو؛ دوایی پێی دەڵێ: شەرەفـخان! هەژار

## میرشەمسەدین کوڕی میرحاجی شەرەفخان

تەونگەری کر و نەخشی تەشکەبەڕەی سەرگوروشتەی دوری سفت و ڕیزهور، لە سەرپەڕان لە هەنیشك و لەپەدەستی بەرچەنەیان، دارهەنەیان چەقاندووە و لە خەتۆکەی گشت و قشتیان، تای تانیان ڕایەڵ کردووە؛ ماشەری هەودای ڕووداویان هەڵۆێزنیوە؛ قانگڵەی مەبەستی زۆر جۆر و ڕەنگاوڕەنگیان لەو تەونە -کە مێژووی کەونە- هەڵواسیوە. واژەی وێژەی باو پێدراویان بە داوەپۆ تێوەداوە؛ گورد و شیش و هەپۆ و کەرکیتی بەند و بڕ و دێر و تیپی ڕێژەپیتی لە دەستان خۆش و لە باری داستانیان بە پەیتی لێ خستۆتە کار و ڕستەیان تێك پەستاوتووە و بە قەیچی و تۆرتۆ و برینگی ڕامان و ڕەخنەگرتن و لە سەردا پێداچوونەوە، برە و گرفنچك و زێدەو گلووی دزێوکەر و ناهەمواریان ڕێك و لووس و لێك کردووە و شەڕ و شوڕ و مەیدانداری پاڵەوانان لە چوار فەسڵەی زۆر ساڵاندا، وێنەی لێ کراوەتە وێنە و وەك ئاوێنەی جەمشیدی جەم، پیواران دێنێتە بەرچەم و ئێمە لە تێوەڕامانی گۆشەیەکی کەنارەکەی، وامان بەو ڕووداوە زانی کە: لە پاش ئەوەی قەرایوسف کوڕی قەرامحەمەد تورکمانی، لە بەر لێشاوی لەشکری ئارا و هەرد و بڕدگری ئەمیرتەیموری لەنگ بەزی و ڕایکرد و بە یلدرم بایزیدخان[1]ی والی ڕۆم پەناهەندەبوو، ئەمیرتەیمور پیاوی لە قەیسەر[2] ڕاسپارد قەرایوسفی پەنابەری بداتەوە و ئەم چەند شێعرەش خرانە ناو نامەکەوە و بە پیاوەکەدا بۆیان نارد.

ئەمن نامەوێ ڕۆمی ئارامگا   ڕمی کێو ڕمێنی منی پێ بگا

کوماخ[3]م دەیە و جەنگ مەکە و دەنگ مەکە   جیهانی گوشادیش لە خۆ تەنگ مەکە

---

١- سوڵتان بایەزیدخانی یەکەم، کوڕی سوڵتان مرادی یەکەم، ساڵی ٧٩١.ك (١٣٨٩.ز) هاتە سەر تەخت و زۆری دنیاگرت و تەیموری لەنگ شکاندی و گرتی و ساڵی ٨٠٥.ك (١٤٠٢.ز) لە بەندی تەیموردا مرد. جەمیل

٢- بۆیەی بە قەیسەر ناو بردووە چونکە ڕۆم و قەیسەر دەمێك ساڵان هاتوونە گوێوە و فێری بوون؛ ئەگینا سوڵتان بوو.

٣- المنجد دەڵێ: کوماخ شارێکی شوورەدارە و لە باشووری ئەنادۆلی تورکیایە و لە سەر ڕەخی چەپی چەمی فوراتییە و لە چەرخی ٧ی میلادی لە سەر وێ بێزەنتی و عەرەب شەڕیان بوو. ساڵی ١٥١٥.ز سوڵتانسەلیمی یەکەم (نۆهەم پادشای عوسمانی) داگیری کرد. هەژار



قەرای یوەسفی ناپەسند و کوڕی | کە ڕێگەی لە حاجیانی مەککەش بڕی
پەنات داوە کاتێ لە بەر من ڕەوی | گەمارە لە تۆ نایە توخنی کەوی
سزای هەر ئەمەس سەربەنیستی بکەن | بە خەنجەر سەری ژێکە پیستی بکەن

راسپاردەکەی ئەمیرتەیمور گەیشتە ڕۆم و نیاز و نامەی پادشاکەی لە بەر بیر و تێڕامێنی هەموو سەر هەر دەخەملێنی سولتان ڕانا. وەرامی نامەی نووساند و قەرایوسفی تێگەیاند کە لەو نزیکە نەمێنی و خۆ بخزێنێتە ژێر باڵی سولتان فەرڕوخ[1] والی میسر.

قەرا یوسف وێڕای سولتان ئەحمەد جەلایری حاکمی بەغدا -کە ئەویش پەنابەرێك بوو- چوونە میسر و لەو دەمەشدا والی میسر دەمی دڵی بۆ هەمخەمی و دۆستایەتی تەیمور دەبرد. گورجێ هەردوکیانی گرت و لە بورجێکی قەڵای میسردا بەندی کردن. کاتێ بیستی کە تەیمور مرد و بوو بە خۆراکی مار و موور، زنجیری لە مل داماڵین و هێنانیە دەر و هەر یەك پێنجسەد نۆکەریان گرت کە بژیویان لە سەر خەزێنەی میسر بوو. هاتنە ناو ڕیزی ئەمیران و خزمەتی پادشایان دەکرد و ئەسپ و چەکیش -چیان بویستایە- مشە بوو. بەڵام هەرچی بۆ نۆکەری لە سولتان ئەحمەدی هاڵان، هەمووی بەغدایی ئاوارە و مناڵ و کاڵی بێکارە و هەرچی و پەرچی و شاگرد چەرچی و کۆنە کەردار و چەورە و لات و لووتی شار بوون.

هینەکانی قەرایوسف تورکمانی، قەراقۆینلوی بە کار و لە کڵ دەرهاتوی ڕۆژگار و ساز و ئامادەو تەیار بوون. میسری لەو تورکمانانە و بەو زۆریە ترسیان ڕێنیشت و دەسولتان فەرڕوخیان گەیاند: پەنا بە خوا، ئەگەر بێتو قەرایوسف و تورکومانی ئاق قۆینلو وابمێنن، ئاژاوەیەك دەنێنەوە و هیچ دوور نیە کەتنێکی زۆر گەورە بکەن. لە ئەنجامی ڕاوێژکاری و سەروبن کردنی کارەکە، چارەکەیان وا دۆزیەوە ڕۆژی وازی گۆچانبازی، سولتان فەرڕوخ بە قەرایوسف بفەرموێ وێڕای دەست و پێوەندانی، وردەبەردووکەی مەیدانێ کۆ کەنەوە و کە ئەوان دادەنەونەوە، دەستەیەك چەکداری میسری -بە تیخی

---

[1]- دەبێ نیازی سولتان فەرەج کوڕی بەرقوق بێ. عەونی کە دووەم پادشای کۆیلە چەرکەسەکانی میسرە و ساڵی ٨٠١ بوو بە پادشا و لە سووریا دەگۆ تەیمووریلەنگ ڕاچوو؛ بەڵام پێی نەوەستا و ڕێك کەوتن. ساڵی ٨٠٨ لە پڕێك ون بوو؛ کەس نەیزانی چی بە سەر هات. جەمیل

جەوهەردارەوە- هەڵیان‌کەنێ و بێ‌سووچ و تاوان بیانکوژن.

قەرایوسف های لەو کەین و بەینە هەبوو؛ پیاوانی خۆی بە چەکداری و ئامادەیی هێنانە دورِ مەیدانەوە. سوڵتان لە سەر نیازی گۆرین، فەرمانی داقەرا یوسف و پیاوانی پەیابن و زیپك و چەوان خرِ کەنەوە. قەرا یوسف هەر بە سواری هاتە بەرانبەر سوڵتان و گوتی: گەورەم! هەتا ئێستا تۆ بە چاوی باوك و فرزەند لەم نۆکەرەی خۆت ڕوانیوە؛ ئێمەش بۆ تۆ نان خۆرێکی ڕاست و چاك و چاکە لە چاو و شیرپاك بووین. ئێستاش بە فیتی بەدکاران و لە تێ چاندنی شۆفاران، دەتەوێ خوێنمان برِێژی؟! هیچی من و هیچی تۆ؛ ئێمە ژینمان لێرە نەما. لە سەر سواریەوە بۆ کرِنوش بەرانبەر بە شاچەماوە و مامزەی گەیاندەتەڕادان و هەیدێی لە نۆکەران کرد و ئەسپیان بە تەقلەکوت ڕادان و گۆرِ و مەیدانیان بەجێهێشت و وەکوو دەڵێن تا گەیونە دیاریەکرێ، سەدوهەشتا جار لەشکریان هاتۆتە سەر ڕێ و هەموو جاریش هێند مەردانە و نەبەردانە هاتوونە دەست، دەستی دەستداریان شکاندوە و لەمپەریان بە زۆر پەڕاندوە و خۆیان گەیاندۆتە بدلیس و مەلیك شەمسەدینی حاکم پەنای داون و قەڵای ئۆنیك و پاسینی بە قەرایوسف بەخشیوە و کیژێکیشی لێ خواستوە.

قەرایوسف زستانی لەو ناوە ڕابوارد. تاوسانی ساڵی ٨٠٩.ك (١٤٠٧.ز) بە یاری مەلیك شەمسەدین، لە چغرسەعد دەگەڵ میرزا ئەبوبەکری کورِی میرزا میرانشاهی کورِی ئەمیرتەیمور ڕاچوو[1]. میرزا ئەبوبەکری ڕاو نا و چغرسەعد و ئەخچەوان و مەرەند و سروور و ماکۆی گرت و زستانی بردەمەرەندێ. تاوسانی ساڵی ٨٠٩.ك(١٤٠٧.ز) میرزا ئەبوبەکر دەگەڵ میرزا میرانشاهی باوکی -لە عیراق و خوراساندا- لەشکرێکی بێ ژماریان بۆ ئازربایجان هێنا و هاتنە ویزەی قەرایوسف و لە شێوی غازانی تەورێز بە شەرِ هاتن و لەشکری مغولان شکا و میرزامیرانشابە کوشت چوو؛ ئازربایجان -سەر لەبەر- وەگیر قەرایوسف کەوت. ئیتر لەو ساوە ڕۆژبەرۆژ پلەی بەختی باڵا دەچوو. دۆستایەتی و خزمایەتیشی دەگەڵ مەلیكشەمسەدیندا -دەم لە شوێن دەم- خۆشتر دەبوو؛ کە دەیدواند

---

١- ڕەنگە مەبەستی خەلیل کورِی ئەمیرشاه، کورِی تەیموور بێ. جەمیل

پێی دەگوت ڕۆڵەم. کە بووش بە شا، بەشەکانی سەر بە بدلیس و بدلیسیشی بە مولکایەتی پێ بەخشی و فەرمانەکانی کە دەربارەی میرشەمسەدین دەرکراوە -بێ دەستێدان- ڕای دەگوێزم.

## ڕونووسی فەرمان:

فرزەندانی زۆر خۆشەویست! خوای بەرز بە منتتان بێڵێ. سەردەستان و سەریەلان و سەرلقان و سەرهەنگان و سەرداران و ئەمیران و گزیران و سەروەران و کوێخایان و ئاغایان و مەلیکانی کوردستان و بۆرەپیاگ و دەشتەوان و بازرگان و سەرناسانی دانیشتوانی بدلیس و ئەخلات و مووش و خەنووس و دەوروبەریان و ئەوانەش کە سەریەوانن! با بزانن کە بێ هیچ ڕۆدەروایسی، دڵسۆزی بێ کەمایەسی و یەکڕەنگی بێ تلتە و خلتە و فیداکاری ڕیشەداری کوڕی گەورە و پایەبەرز و بە ئاوەز و چاکەحەز و دەفریاڕەسی بێدەسان و پێکهێنەری مەبەسانم، میری میرەکانی عەجەم (میرشەمسەدینی سەربڵند) لە ئەندازە بە دەر بووە. لە خودام دەوێ هەرگیز پایەی نەوی نەوێ و هەتا قیامەت سەلامەت بێ و چی ئاواتە دەستی کەوێ. ئێمەش لە لای خۆمانەوە بۆ پاداشتی شایانی ئەو، بە ئەرکی خۆمانمان زانی کە وەك ڕۆژانی ڕابراو جەنابی میری ناوبراو بە هەموو جۆر چاوەدێری و بە زەمین پێ بەخشینی زۆر، بیبەینە سەرووی ئامپایان. لەو بارەوە دڵی نەرمی پڕبەزەیی شاهانەمان -جارێ وەکوو دەم خۆشکەرە- ئەم فەرمانەمانی دەلاند:

مەزنایەتی و میرایەتی و دەستەلات و باج و پیتاکی دیوانی بدلیس و ئەخلات و خەنووس و مووش و دژ و قەڵاکانیتر و زیادەپارچەی سەرخراو و پاژە زەمینی لاوەیی دەپاڵ خزاو و ڕەپاڵ نراو -کە دەپێشداش هەرهی خۆی بوون- لە نوێ پێی دەبەخشینەوە و نابێ کەس بەشی تێدابێ و بەو هۆیەوە ئەم فەرمانە ڕەوانەمان -دەی خودا پیرۆزی کاتن- لە سەر هەموو هاوولاتیان پەخش کرا و بڕیاردرا کە میری دەست نیشان کراو ناوچە و مەڵبەند و پاوان و دەشت و کەژ و ئاوی و بەژێ کە بوویەتی، هی خۆیەتی و بە سەریانۆ هەمەکارەس و نابێ کەس -بە نیازی هاوبەش- هیچ کاتێ بە لایدا بچێ یان لە دەورەشی هەڵخولێ و کەس نەکا دەست و پێوەندی تووشی هەرا و کێشە بکا. هەرکێش بزانین نابارە و لیچی لەم فەرمانە خوارە، دەکێشرێتە پای قەنارە و سزای زۆر بێڕەزای دەدرێ. ئەرکی شانی

کارداران و سەرکار و کارگوزاران و ڕیش چەرموان و سەرناسـان و نیشتەجیٚ و دانیشتوانی بـدلیس و ئەخلات و مووش و خەنووس و شوێنەکان و گێلکەکان و پاسداران و دژدارانە، هەمیـشە زەلامـەکانی میـری پایـەداری کـوڕم بـە گـەورەی خۆیـان بـزانن و بـە ڕاسـپێری و ئامۆژگـاری و بەنـدی ڕەنـد و بەهرەمەندی ڕەفتار بکەن و مل بۆ دۆزی بـچەمێنن و خـاوی و خلیـسکی نـەنوێنن. هـەر تەگـەرە و گرێیەکیشیان دێتە بەر، پەنا بە پیاوی ئەو بەرن و هەر پسوولەی ئەو وەخـوێنن و بـە سەرشۆڕی ویـدا بڕۆن، تا سەر و ماڵ نەدۆڕێنن.

ئەو فەرمانە باوەڕنامە، دەی مانگی مەولوودی ساڵی هەشتسەد و بیست،نویـسەرا و بـە ئیمـزای بەرز و جیٚ گەورە ڕازێنراوە و خەملێندرا.

خاوەنی *مطلع السعدین* دەڵیٚ: ساڵی ٨٢٣.ك (١٤٢٠.ز) ڕۆژی هەژدەی مانگی قوربان -کـە چـل ڕۆژ بوو قەرایوسف لە سەر دنیایە نەمابوو- نامەیەکی زۆر دۆستانەی بـۆ شـاڕوخ میــرزا نووسـی و نۆکەرێکی باوەڕ پێکراو لە قەرەباغی ئاڕانیٚ، نامەکەی بە شاڕوخ گەیاند.

دەخاکەلێوەی بەهاردا میـرزا بۆ شەڕی کوڕانی قەرایوسفی تورکمان، لە گەرمەسێری قەرەباغ وەڕیٚ کــەوت و هاتــە ســنووری ئەرزنــجان. یــەکی جیمــادی یەکــەمی ســاڵی ٨٢٤.ك (١٤٢١.ز) میـرشەمسەدین والی بدلیس، دیاری و پیٚشکەشێکی زۆری -بـە غیاسـی قـازی مـحەمەد دا- بـۆ شاڕوخمیـرزا ناردبوو. لە شوێنێك بە ناوی کتمە دیاریەکان گەیشتنە میـــرزا و غیاسـی زۆر بـە خێـر هێنا و لە دیوانی بەرزی خۆیدا جێی نیشان داو دایءنیشاند و نیـاز ڕەوا بـەڕێی کـردەوە.کـە لەشـکری دنیاگری میـرزاشاڕوخ، لە لای ئەخلات لە مرگوا -کـە میـرگ و میـرخوزارێکی سـەوز و خـۆش و سازگارە- خێوەت و بارەگای هەڵدا، میرشەمسەدین و چەند کەسێك لە میـرەکانی کوردستان، چـوونە پیٚشوازی بەرێزی و یەکی جیمادی دووەمی ئەویٚ ساڵیٚ، بەڕاموسانی سەرپەنجەی بەرێزەوی سـەرفراز بوو؛ وەبەرئاوڕی خەفەتبـڕی شاهی کەوت و بە لاواندنەوەی شاهانە و خەڵات پەخشانی شایانی، شادی کرد و فەرمانی فەرمانڕەوایی بدلیسی بۆ نویٚ کردەوە.

نەڵێم چونکە کەسی خۆمە و نەڵێن باری وێژەوانی خۆی ڕادەنیٚ و بـە میـرشەمـسەدین هەڵـدەڵیٚ. ئەوی ڕاست بیٚ میـرشەمسەدین خواپەرستێکی بـە ڕاسـتی و دنیـادارێکی لیـزان و توانـا و بـەوەج و

زۆرزان بوو. دانیشتوانی وڵاتەکە زۆریان لەلا پیرۆز بووە و وێستاشیان زۆر بڕوا پێیە. گوایە لە ڕێ خواناسیدا لە حەوت ئاو پەڕیوەتەوە و پەردەی لە نێوان ڕاداوە و لە هێندێك نامە و نامیلکەی دەروێشانەدا نووسراوە: جانەوەر و مەلی کێوی دەستەمۆی بوون و لە کاتی دەسنوێژ هەڵگرتن، ئاوی دەستیان دەخواردەوە. کەشف و کەراماتیتریش زۆرن؛ بەڵام کە من باسیان بکەم، بەجۆرێکیتر بۆی دەچن. هەموو دەم و کات و ساتێ بە هەمدەمی و هەمنشینی چینی هەرە جێبڵندی مەلا و زانای بەجەوهەر و سۆفی و دەروێش و پیران بوو. بە میرشەمسەدینی مەزن بەناوبانگە و گش مەردمی ئەو ناوچانە، داوای هیمدادی پیرانە، لە گیانی پاکی ئەو دەکەن. لە دەورانی دەستەڵاتی تورکومانان سکە و خودبە بە ناوی خۆیەوە بووە. ئێستاش لە ناو کوردستاندا زێڕوزێوی مسقاڵی هەن؛ پێیان دەڵێن شەمسەدینی و کورد بۆ ودم هەڵیدەگرن و منی هەژاریش دیتوومە. سێ جۆرسکەی دیشم دیوە کە سێ فەرمانڕەوای بدلیس لێیان داوە. ئەو سێ میرەش: محەمەدکوڕی شەرەف و شەرەف کوڕی محەمەد و شەمسەدین کوڕ زیائەدین بوون.

لە ساڵی ٨١٠.ك (١٢٠٨.ز)دا میرشەمسەدین تەکیەیەك و نەخۆشخانە و میوانخانە و مزگەوتێکی لە گۆك مەیدان بنیاد ناوە و بە شەمسییە بەناوبانگن. گوندی ترمیتی لای مووش و کفوی سەر بە گورجیکان و گوندی کازوخ -لە نێوان ئەرجیش و عەدلجەوازن- دەگەڵ چوار پارچە زەمین و حەوت دووکان و کاروانسەرایەك و بیست خانوی هەرمەنیئشین لە بدلیس و دەوروبەری، لە مەوقوفەجاتی ماون و زۆریتریش بوون، فەوتاون. تەکیەکە هەر ئاوەدانە و نان و شیوی بێ بڕیوی تێدا دەدرێ. گوندی کازوخیش هەروەتر؛ نان و خوانی بۆ خۆماڵی و لاوەکیان هەر وەکوو یەکە و هەر کەس داواکا،دەیدەنێ.

لە ئەنجامدا میرشەمسەدین شەهید کرا. میرزا ئەسکەندەری کوڕی قەرایوسفی تورکومان -کە پیاوێکی زۆر نەزان و سەرشێت بووە- لە شاری ئەخلات کوشتوویە.

هێندێك دەڵێن هەر لە ئەخلاتێ نێژراوە؛ هێندێکیتر پێچەوانە دەڵێن جەنازەی پیرۆزی ڕاگوێزراوەتە بدلیس و لە بەرانبەر تەکیەکەیدا، لە ڕۆژهەڵاتی گۆك مەیدان ناشتوویانە.هۆی کارەساتیش -وەك دەڵێن- خێزانەکەی کە دەبووە خۆشکی ئەسکەندەر، چونکە کیژە تورکومان بوو،



ئەسپ سواری و تیرئەندازی و کاشۆبازی زۆر پێخۆش بوو. گاڤا لە بدلیسیش دەژیا؛ جاروبارە وازی لێبوو بە دەستووری ماڵەباوان ڕەفتار بکا. میری گەورە گەلێك جاران سەرکۆنەی دەکرد و دەیگوت: ئێمە کوردین و ئەوکارەی کە تۆ دەیکەی لە کوردان ناوەشێتەوە و داب و باوی تورکومانان، دەبێ لە بیرەخۆت بەریەوە. بەڵام ژن، ژن نەبوو؛ ژان بوو. ئەوەند چەقە سرۆ و سەهەندەو دەمگەرم و چەقاوەسووبوو نەبێتەوە.دەیشیراند و دەینیراند و یەکی بەهیچ نەدەکەوت و وازی لە کورێنی نەدێنا.

کار بە نەرمیوشلی نەیەت چاری تونـدوتیـژی دەبێـتـە سەریـاری

ڕۆژێکیان لە دوو ئەو شەڕە دندوکەدا -کە زۆر قەرەچەناغی کرد- میرکێردی گەیشتە ئێسکانی و بەهێز مستەکۆڵەیەکی بە دەم و لەوسی داکێشاو کەڵپە ددانێکی شکاند و خاتوو ڕکوومانی سەرەسۆدرە، هیچ سی و دوی لێ نەکرد و کەڵپە زەردی دەپرێسکەیەکەوە پێچا و بە گازندەنامێکەوە بۆ ئەسکەندەری برای نارد، کە ئەوساکە لە ئەرجیش بوو.

کاتێ کە ئەمیرشەمسەدین بۆ دیدەنی برای ژنی -کە دەلوشی بە نازناو بە سەردا بڕابوو- چووبووە ئەخلات، هەر چاویان بە یەکتر کەوت، دەلوونەسکەندەری بێفەڕ، بە بەهانەی کەڵپی خوشکی، گەڕی تێ هاڵاند و کوشتی؛ بەڵام بە بیر و باوەڕی نووسەری ئەم ڕووپەڕانە، ددانەکە بەهانە بووە و دۆستایەتی شاڕوخمیرزا ئەو کەتنەی کرد.

## میرشەرەف کوڕی میرشەمسەدین

عەودالی بە کەوڵ و پۆست و خەرگە و سەڵتە و تەیلەسان پۆش، متەشاو تەوەرزین بە دۆش، بەندی تۆربە و حەمایەل و شیر و تەزبێ و مت و مۆری درشت و هور لە ئەستۆدا و کلاڤەتا و دەرزیدان و ئەینوك و شانە و کلتوور لە ناو بەریك و باخەڵدا و کەشکوڵ و دەف و کوولەکە دەلاقوڵدا و گمگمۆکە و زەرکی ئاو و جامی چلکلیلی حەج و زەرکی بەزریزە و پلپلە لە شوتکدا، شەتەکدراو و عاسای سەر بە گۆ لە مشتا و تەپلەی لوا لەسەرپۆڕی پەریشانی بە زەمزەمەی دەروێشانە و یاهوو کێشان؛ ئەم بەیت و باوەی گێڕاوە. پاش نەمانی میرشەمسەدین، میرشەرەفیان لە جێ دانا؛ بەڵام پیاوێکی

دێوانە و ئامالّ شێت و کەللەیی بوو؛ هۆش و گۆشی دنیاداری لەلا نەبوو؛ گەمەی بەم ژیانە دەهات! خەوی شەوی لە تونخانەی گەرماوان بوو. قەفەزێکی بە بالای خۆی لە ئاسن دروست کردبوو، ڕۆژانە دەچووە ناویەوە و لاسای کەوی دەکردەوە و بە قاسپاندنەوە دەیگوت: جێی نێرەکە و ناوڕکەیە! فەرمانڕەوای ناوتون و تولّ هێندەنەژیا؛ تۆڕ و داوی ڕاوی مەرگی لە مل هالاّ و هەر بە لاوی توونی جیهانی جێهێشت و لە ناو ڕکەی گۆڕیچەدا لە فڕە و پەلەقاژە کەوت.

بڕوانە بە بیری خۆت چەند شاە و گەدا ڕۆیی   بێهودەلە ژینی خۆت مەڕوانە بە نامۆیی
لێکی مەدەوە هێندە، گۆشتن وەدەکا و لەڕ وا   گەللایی وەبەر خۆیدە! چۆن لیّی‌خوڕی وادەڕوا

لەم بەینەدا کە ئەم لە ناوڕکە و توندا ڕایدەبوارد و بە بەزم و ئەزمی جەزمەوە سەرگەرم بوو، شاهەخاتوونی خێزانی -کە شازادەی حەسەنکێف بوو- لە سەر پرس و ڕای مەلایان مارەی خۆی هەلّوەشاندەوە و شووی بە میرسەیدی ئەحمەد ناسرەدین کرد و لە پاش مردنی میرشەرەف -لە بەر ئەوەی میرشەمسەدینی جێنشین زۆر منداڵ بوو؛ بە کار و بار نەدەچارا- هەموو داهات و دارایی و مەزنایەتی وڵاتەکە کەوتە ناو لەپ و چنگوڕی شاهەخاتوون و میردەکەی. پیاو ماقولانی ڕۆژەکی ئەو دوانەیان وەك لاپرەسەنی خۆسەپێن سەیر دەکرد؛ کردیانە کەلّەوەکێشی و سەریان وەبەر بار نەهێنا و ملیان نەخستە بەر نیر و هەر کەس خۆی بە میردەزانی و هەر کەسێ لە بەرخۆیەوە دەستی بە سەر ناوچەیەکدا گرت. میرمحەمەد ناسرەدین، ئەخلاتی برد و عەبدولڕەحمان ئاغای قەوالیسی، چەقچوور و مووشی زەوت کرد و بەربەرەڵدایی بەربلاو کەوتە ناو ڕۆژەکیانەوە.

تاوێك دنیا بێ میرە   گزیر لە جێ وەزیرە
ئەگەر نەما پشیلە   مشکان تلیلیلیلە!

ئاوا دێوی سەربزێوی، بە ئەگریسی بدلیسی کردەجێ گەرا و چەشنی دۆڵپا دولینگانەی تێ وەرێنا. لەو بەینەدا شەمسەدین لە خەم ڕەخسیبوو. ڕۆژێك بە نیازی ڕاووشکار بە سواری لە شار دەردەچوو گەیشتە سەرپردی عەرەب و لەولاوەش عومەریادگاران -کە پیاوەکی بایەکی بوو- بە چەند بارەدارێکەوە لە کیفەندورەوە دەهات و لە سەرپردێ تووشی میرهات. خۆی گێل کرد و هەروەك

نەیناسیبێ و هیچ جاران میری نەدیبێ رووی وەرگێرا و هەی لە گوێدرێژەکان کرد و هەڵی پێچان و لەو ملەدا سەرە دارێك وە بەر کەشکئەژنۆی میرکەوت و ئێش و ئازاری پێ گەیاند. میربە سەریا گوڕاند وتی: کوێری! بۆ کەرەگەلت لانادەی؟

عومەر لە وەرامدا گوتی: من کوێر نیم؛ ئەو کەسە کوێرە کە خەنیمی خۆی ناناسێ و عەیب و عاری خۆی نابینێ. میرلێ ڕاسا کە بیکوژێ؛ بەڵام زوو دەستی سارد بۆوە و بەزەیی پێدا هاتەوە و وازی لێ هێنا و بەجێهێشت.

ترشە بەرسیلە لە دەم خۆش نیە، ڕاوەستە کەمێ سەردەمێ پێ بچێ لەو ترشیە شۆکت دەدەمێ

میرلە ڕێ بیری کردەوە، هەیاران! ئەو کابرا ڕووتە چۆن وێرای وا لە ڕووما هەڵگەڕێتەوە و ئەو تەوسە چ بوو دەمنی گرت؟ نابێ ئەو ماستە بێموو بێ؛ شتێك دەژێر لێفە دایە و من نازانم. ئێواری کە دەگەڕاوە تووشی عومەریادگار بوو، ئەویش باری خۆی فرۆشتبوو لە شار بەرەو ماڵ دەبۆوە. لێی پرسی وەرە پێم بڵێ تەچاڤا ئەو سخێف گۆتن و ئەو پلارەت بۆ لە من دا؟

عومەر زۆر شوورەیی گرتی و سەری داخست و پاڕاوە کە لە تاوانی ببورێ و بە تەریقی و شەرمەزاری گوتی: چ بکەم بە دەست خۆم نەبوو؛ ئەوەندەمن تۆم خۆش دەوێ و دڵسۆزی خانەدانی تۆم، مەگین خوا بۆ خۆی بزانێ. ئەگەر بە سووك باستان بکرێ و تەوس و تانووتان لێ بدرێ، چاوم بەر پێی خۆم نابینێ و بۆ خۆم نازانم دەڵێم چی. ئەگەر بە گرانی نەزانی و ئەگەر لێشم تووڕە نەبی، پێم خۆشە کوڵ و زووخاوی چەند ساڵەت لەلا هەڵڕێژم و چی لە دڵمایە پێت بێژم. چوونە سووچێکی دوورەچاو و نووك و بەدی کارەساتی دایکی و میرسەیدی ئەحمەدی بۆ گێڕاوە؛ چۆن بە زیندی سەری بابی، دایکی حاشای لێ کردووە و خۆی دەباوەش بێگانەیەك هاویشتووە و چۆن ئێستا بە مەرگی شادن و خەڵك و خواش لە پاش‌ملەدا چۆن گۆڕی مردوو دەشێلن و فلان و فیستان دەڵێن چی؟

میرشەمسەدین زانی عومەر زۆر دڵسۆز و ئەمەگدارە، لاواندیەوە و بۆ درکاندنی ئەم ڕازەی سوپاسی کرد و پێشی گوت: وەك لەم خەوەت ڕاپەڕاندم و دەدەردی خۆمت گەیاندم، دەرمان و چارەشت هەیە؟ خۆت دەزانی برینەکە وەبنی داوە و دەبێ بە نەشتەر هەڵدرێ. تۆ ئەو نەشتەرە وەبینە؛ تا منیش ئەم پەرۆشینە لە شانی خۆم بکەمەوە. عومەر ناوی چەند لاوێکی لە لا هەڵدا و گوتی: تۆ

خۆشت بیانبینە و دڵیان بە لای خۆتا بێنە؛ ئەوسا پێت دەڵێم چۆن دەکەین. میرشەمسەدین لە سەر پلانی یادگار هەر ڕۆژە یەك-دوو لاوێکی بە دزیەوە چاو پێدەکەوت و دەگەڵیاندا ڕێك دەکەوت و پەیمانی دەگەڵ دەبەستن.

میرسەیدئەحمەد[1] بە کەین و بەینەکەی زانی و بۆ ڕزگاری کەوڵ و گیانی، بێ ئاوڕدانەوە هەڵات و خۆی گەیاندەلای میرئەبدالی بۆتانی و پەنای پێ برد.

میرشەمسەدین هەر دەسبەجێ دایکی خۆی بە زوێڵ هەڵێنا و دوای عەریفی دایکی کەوت. میرئەبدال ئاگادار کرا کە لەشکری ڕۆژەکی دێ. ئەویش لەشکری بۆتانی کۆ کردەوە و خۆی بۆ شەڕێ ئامادەکرد. دوو لەشکر بەرانبەر وێستا و هاوێستا و ها تاوێکیتر پێك دادەن و شەڕ بقەومێ، میرشەمسەدین پیاوی ناردەلای میرئەبدال، میرسەیدئەحمەدی بداتێ. میرئەبدال وەرامی داوە: پیاو بە پیاو دەگۆڕینەوە. ئێمە خوێنی میرزادێکی بۆتانیمان لە سەر میرحەسەن شیروەییە و پەنای بە ئێوە هێناوە. میرحەسەنمان بدەنەوە و میرسەیدئەحمەدی بەرنەوە. پاش زۆر قسە بە زۆران دان و وتووێژ، بڕیار درا. چەند ئاغایەکی ڕۆژەکی بە بارمتە لە بۆتان بن تا میرحەسەن پەیدا دەکرێ و ئەویش ئێستا میرسەیدئەحمەد بداتە دەست میرشەمسەدین. ئاوا سەودایان سەری گرت. میرشەمسەدین وەناو کەوت، چەند ڕۆژەکی زۆر مەلەوان و کارامەی هەڵبژاردن و تێگەیاندن کە لەوێ بچنە خانووی وا لە ڕووبارەوە نزیك بێ. هەر گا قریوە و هەراتان لە ئێمەوە بەر گوێ کەوت، بزانن ئەوە نیشانەی پەلاماردانی شەومانە. چەك و ئەسپان بەجێ بێڵن و بە ڕووتی خۆ ڕەزگ چەم نێن و بە مەلە لێ بپەڕنەوە و وەرنەوە ناو سوپای خۆمان؛ چونکە هەرگیز ئامادەنیم میرحەسەنیان بدەمە دەست. لە سەر بڕیار چەند ئاغایەکی ڕۆژەکی ڕەوانەی لای میرئەبدال بوون و ئاشت بوونەوە و شەڕبەس کرا و میرسەیدئەحمەدیش ناردرا.

کاتێ خودای ڕۆژپەرستان مەودای هەنگڤاری بڕی و لە ئاسۆی زەردەپەڕەوە بەرەو بارەگای خۆرنشین نشێو بۆوە و لە سەر تەختی شەوەزەنگی شەوەڕەنگی ڕازا و بەکڕی دەخەو ڕاچوو، ئەستێرەی بزۆز بزۆزان و بەجریوەیان دەشەو بێدارانیان خوڕی: ڕابن! شەو

---

1- دەپێشدا میر سەیدیئەحمەدی پێ گوتووە و لێرەوە پێی دەڵێ میر سەیدئەحمەد. هەژار

قەڵای میــردانە، دەرفەتتانە.

پەردەی ڕەشی شەوکە سورِ دەپۆشێ          نازدار دەخەوێت و کورِ دەکۆشێ

میرشەمسەدین بێ خۆگرتن میرسەیدئەحــمەدی نانخۆری ناندێن درێنی گرت و بە سیــرمەی ڕاهێنا و فەرمانی شەوەیــخونی داو کەڵەکەڵەی دڵ پتــەوی لەشــکری هــۆزی ڕۆژەکــی، ئــەو شــەوە ڕۆژ ڕۆژی وانبوو؛ بە چرە و گورِ و هەرِەشــەوە، هەڵمــەتیان بــرد و خۆیــان گەیاندەســەر ڕەخــی چــەمی زەڵــم[1].

پاسدارانی بۆتانیەکان بە جارێك سەریان لێ شێوا و هەروا تێکەوە دەگلان و دەست و پێی خۆیان لێ ون بوو. ئاغای ڕۆژەکی بارمتەش، کێــسیان هــانی و بــە ســۆبایی لــە ئاوەکــە پەرِینــەوە و هاتنــەوە نــاو سوپاگەی خۆ.

شەوەکی سەرێ سپێدێ، دەبوومەلێڵەی بەیاندا -کە پێشرِەوی ســوپای خونکــاری خــاوەرێ تــەق و رەوی وەناو لەشکری قولان خست و شەوی شکاند و لە ترسی تیخی تیــرێژی بە ئاورینگ و پرشــەدەری خاوەن شکۆی ڕووناکایی، ئەستێرە بە تاق و وازی و بە ناسازی و ڕەنگ پەرِیوی، بەرەودوا پەرِیوە بوون و لە ئاسۆگەوە نەدیو بوون- لە هەر دوو ئالی چەمەوە لەشکری بۆتی و ڕۆژەکــی لێــك هــاروژان و بــۆ لێکدان بەرانبەر بە یەکتــر وێستان.

میرشەمسەدین ئەسپی ڕادا و تا دەنگرِەس نزیك کەوتەوە و بانگی میــرئەبدالی کرد و گوتی: مــن نۆکەری بێئەمەگ و سپڵە و پێنەزانی خۆم کوشت و پەڵەی خۆم بە خوێن سرِیەوە. دەگەڵ تۆ دوژمنــیم نیە و حەزیش ناکەم ببینە دوژمنی خوێنی. ئەگەر هەر وازیش نەهێنی ئەوە تۆ و ئەوە گۆومەیدان، تــا ڕەش و سپی دەرکەون. کە بۆتانی ئەمەیان بیست میرئەبدال بە دەنگیەوە هات و بە دەنگی قەو بانگی لێ کرد: میــری گەورەم! باو و کاڵی جێ بەرزی تۆ زۆر دەمێکە گەورە و ریــشسپــی تایەفــە و بــاب و باپیــرانی من بوون و هەمیشە نێوان خۆشبون و هەرگیز لێکتــر نەرِەنــجاون. مــن هــیچ کــاتێ ڕێــم ناکەوێ نێوانی وا خۆش بپسێنم و تۆوی دوژمنی بچێنم. خوانەخواستە من هێندەناشایستە بــم ئەو دام و دەستوورە تێك دەم. لە فەهێت و شەرمەزاریم ناشێ تازە سەر هەڵێنم و لە مــەرِ پیاوەتیــەوە بــدوێم.

---

١- چەمی جزیری بۆتان دەجلەیە؛ زەڵم لە شارەزوورە. وا دیارە لە دەسنووسدا ئەم هەڵە ڕووی دابێ. هەژار

میرسەیدئەحمەدی نۆکەرت کە پای بە ئەندازەی بەرەی خۆی ڕانەکێشابوو؛ تۆ پات پێ هەڵکێشایەوە و سزای کردەوەت دایەوە و دەستت خۆش بێ. ئێستاش میرم نەچووە بچێ؟ با ئەو دڵمەندیە نەمێنێ. بمانبەخشە و با دیسان وەك جاریجاران هێمی دۆستایەتی داخەین و هەر چی بووشە با بەردێکی لە سەر دانێین. میرشەمسەدین بەو قسانە کینەی لە سینەدا نەما و گەردی لە سەر دڵ سڕاوە و خۆی گەیاندەمیرئەبدال و هاتنە دەست و ڕووی یەکتر و لە تەهی دڵ ئاشت بوونەوە و میرشەمسەدین گەڕایەوە و لەو ڕۆژەوە ناویان نابوو ئەمیرشەمسەدینی دژوار.

میرشەمسەدین پێنج کوڕی بوون: سولتان ئەحمەد، سولتان مەحموود، زیائەدین، ئەمیرشەرەف، ئیبراهیم. سولتان مەحموود و زیائەدین سالی ۸۳۵.ك (۱٤۳۲.ز) بە فەتای چاوقووڵکە مردن؛ میرشەرەفیش لە هەرەتی لاوەتیدا و لە جەنگەی بەهاری ژینا، بەر گرەبای مەرگ کەوت. میرئیبراهیم بوو بە جێنشینی بابی و ماوەیەك فەرمانڕەوا بوو. کە ئەویش بوو بە گۆڕنشین، میرحاجیمحەمەدی کوڕی جێی گرتەوە و سالی ۸٤۷.ك (۱٤٤٤.ز) لە ناوەندی شاری بدلیس و لە سەر ڕەخی چەمی ڕەبات، فێرگە و مزگەوتێکی چێ کرد و لە سالێکدا سەریان گیرا. سالی ۸٦٥.ك (۱٤٦۱.ز) ڕەنجی ژیانی لە کۆڵ بۆوە و لای مزگەوتەکەوە نێژرا و دوو کوڕی لە پاش بەجێ مان: ئیبراهیم و میرشەمسەدین. ئیبراهیم بە ڕاسپێری باب، بە جێنشین دیاری کرا و ژینامەشی لەمەبەولا باسی دەکرێ.

## میرئیبراهیم کوڕی میرحاجیمحەمەد

وەرزێری چا و لە گەنجینەی ئاسەواری کوردەواری، گاسنی وەسەر دەندەخست و بەڕوولەی دەشیلە ڕاکرد و هەوجاڕی دالە بنەوەند و هێرتەی لە سەرمژانە بەست و کەڵی هێنانە بەر نیر و کەڵەوەی لە مل گرێ دان و پای لە سەر پاشدەندەدانا و دەستە کەوشەی لێ داگرت و بە هێڵ و کووز و هۆگانان کۆدەو بەیاری شێوبڕی و وەرد و سێ گاسنەی دایەوە و لە بەرهەمی تۆژینەوەی وا دەرکەوت کە هەر زۆر لە مێژینەوە بەرەی قەراقۆینلوان و خێڵەکانی ئاقۆینلو دوژمنی بابەکوشتە بوون و لە پەی سەری یەك دەخەفتان و وەك بەرانی ڕەش و

سپی ناوچیرۆکان، یەکتریان بەر قۆچان دەدا و هەمیشە و دایم شەڕیان بوو.

دەپێشدا ئەمەشمان زانی قەرایوسفی قەراقۆینلو، خزمی میرانی بدلیس و خۆی لە جێی بابیان دەزانی. کاتێ ئوزون حەسەن بەگ جیهانشای ئاققۆینلو، کوڕی قەرایوسفی کوشت، دیاربەکر و ئەرمەنستان و ئازربایجانی داگیر کرد و بە دڵ لێ بڕا ئاسەواری بنەماڵەی قەراقۆینلوی تورکمان ببڕێتەوە و خزم و دۆست و هەمکاریشیان بە یەکجاری لە ناو بەرێ. بەو مەبەستە بەرلە هەرشت لەشکرێکی بێ هەژماری بە سەرداری سولەیمان بەگ بیژەنئوغلی ناردە بدلیس تا میرەکانی بۆ بگرێ و مەڵبەندەکەش داگیر بکا. سولەیمان بەگ بەرەو کوردستان ڕەوان بوو؛ لەشکر گەیشتە بدلیس و تورکمانان لە ڕووکاری قەلاکەیدا چادریان هەڵدان. ئەو دەم فەرمانڕەوای بدلیس میرئیبراهیم، کوڕی حاجی‌محەمەد بوو. بورج و شوورەی دابەستن و دەروازەی لێ داخستن و ملی لە سەنگەربەندی نا. سولەیمان بەگ مەنجەنیق و بەرەقانی و کەرەستەی قەلاگرتنی هەمە جۆرەی خستەکار و سێ ساڵی ڕەبەق دەوری دا. هەموو ساڵێ کە خەزەڵی گەلاڕێزان بە ڕەنگ پەڕیوی و لەرزۆکی دادەوری و بە خشکە و بە خشپە و چرپە خەبەری شالاوی شەختەی بە گوێی زەویدا دەسرتاند و عاسمان لە ترسی سەرمایە، کەپەنکەبۆری هەورانی کونبڕ دەخۆوە دەپێچا و ڕەشەبای وەیشوومەی پاییز دەسکەنەی گژوگیای دەکرد و چل و گوڵی بە قاللۆری دەخڕ و بودڕان داخنی و داری بۆ ئاگر دەشکاندن، سولەیمان بەگ بێگومان بوو کە بەفری زستانی بدلیس لە باتی ئەو دەورە لە دژداران دەدا و دەرەتانیان بۆ ناهێڵێ؛ وازی لە بدلیس دەهێنا و ڕووی دەکردەگەرمەسێری ناوچەی ماردین و بشێری. خاکەلێوەی بەهارانیش کە لەشکری تین و تیشك بە سەرکردەیی با و باران دەهاتە جەستەی بۆران و باڕن و کرێوە و کەرەسیسە و گلێرکە و شەشپەڕ لە پرووشەکردن دەکەوتن و قەڵای کەوی دەورە دەدران و کلێلە هەرەسیان دێنا و ڕنوودەپسان و دادەڕمان و پادشای نەورۆز تاوڵی گوڵی لە دەشت و چیمەن هەڵدەدا، بیژەنئوغلی -لە چالاوی پڕ هالاوی گومڕاییەوە- ڕووی دەکردەوە بدلیس و دەهاتەوە شەڕەجەنگی ئەو ڕوستەم و گۆدەرزانە و دەوری قەلاکەی دەداوە و دەبووە گرمەی مەنجەنیق و زرمەی بەرد و هاشەی تیر و لە ژێر و ژوور هەر مێشك و خوێن بوون دەپژان و لە دار و دیوار دەپرژان.

| | |
|---|---|
| دوچین پاڵەوانی بە باهۆ و مەچەك | لە یەکدی هەموو دڵ پڕ و دەس بە چەك |



| | |
|---|---|
| ڕمێنی مەرگ بوو لە ژوور و لە ژێر | ژمارەی لە دەس چوویوو مردوو ژمێر |
| کە بەردێك دەباری لە بانی قەلاّ | لە گای ژێرزەمین دەبووە دەرد و بەلاّ |
| کە تیرێك لە ژێر ڕوو بە بالاّ دەچوو | دەجەرگ و دڵی کاکەشان ڕادەچوو |
| تفەنگ دڵڕەقە و دژ بە هێمنایەتی | دەگرمێنیٚ بە نیازی کوێخایەتی[1] |
| دەر و دار و دیواری دژ ڕەنگی گوڵ | شەلاّڵ بوون لە خوێنی لەش و جەرگ و دڵ |

ئەم شەڕە درێژەی کێشا؛ برسایەتی و بێ بژیوی و نەخۆشی زۆر هێزی بە دژداران نەهێشت و زۆربەی بە ناخدا ڕۆهێشتن. سەرەڕای تورکومانانیش پەتا و چاوقووڵکەش دەوری دان و یەك لە دوو یەك چنینیەوە و میربرایم و حەوت کەس نەبێ، زیندوو دەقەلاّدا نەمان.

لەو بەینەدا مەحموودئۆغلی کە شاعیر و پەسنددەری سولەیمان بێژەن ئۆغلی بوو، هەڵبەستێکی تورکی نووسی و ئەم تاك بەیتەی تێدا گونجاند و بۆ خزمەت حەسەن بەگی نارد.

چجار سەر بۆ سولەیمان نانەوێنن کوردی بدلیسیٚ
ڕەگەز کورد یاری ئاورگێکە ئاوری هەر بنابیسیٚ[2]

لە ئەنجامدا کە لە سۆنگەی ئەو شەڕەوە، هەر دوولا زۆر زیانبار بوون و تووشی زۆر دەرد و ئازار بوون. پێکهاتن پێشنیار کرا و پێکهێنەر بوونە ڕیشسپی و بڕیار درا سولەیمان بەگ ژیان و ئابڕووی میرئیبراهیم بپارێزێ و ئەویش قەلاّ و مەڵبەندەکە بەجێ بێڵێ. کاتێ وتووێژ سەری گرت، حەسەن بەگیان ئاگادار کرد و ئەنگوستیلەی بە نیشان نارد و پەیمانی ئاشتی بەسترا. میرئیبراهیم لە قەلاّیە هاتە دەر و چووە تەورێز بۆ لای حەسەن بەگ. سولەیمان بەگ دەستی بە سەر بدلیسدا گرت.

گوایە دوازدەماڵ ڕۆژەکی -کە یەك لەوان ماڵی شەمسعاقلان بووە- ڕەگەڵ میرئیبراهیم کەوتوون

---

١- زەمانی ئاققۆینلوو تفەنگ نەبوو؛ نازانم دانەر چۆنی ئەو شێعرە هێناوە؟ بەڵام وەرگێڕ دەسپاکی کردووە کە بێ دەسکاریٚ ڕایگوێزتووە. هێمن

٢- عەلیعەونی دەڵیٚ: نیازی وابووە کورد بۆ بنەماڵە نەبیٚ سەر ناچەمێنن. ڕۆژبەیانی دەڵیٚ: نیازی ئەو چیرۆکەیە کە بە ئەفسانە گوتراوە ئاگر خۆشکەرەکەی برایم پێغەمبەر کوردێك بووە بە ناوی هەبرین. دەشکریٚ یادی کۆنە کوردەئاگرپەرستەکانی کردبیٚ. هەژار

و چوونەتە ئازربایجان. کە میرگەیشتە تەوریزێ، لە سەر فەرمانی حەسەن بەگ لە شاری قوم موچەیەکیان بۆ بڕیەوە و بەرەو عیراقیان بەڕێکرد.

ئەوەندەی حەسەن بەگ مابوو زۆری چاوێری لێ دەکرا. لە ئەنجامدا کە حەسەن بەگ ئەنگوستیلەی مەرگی بۆ هات و تەلاّی جیهانی جێ هێشت و لە گۆڕستانیان دامەزراند و سەری هەودای کاروباری دنیاداری وەدەست یەعقووب بەگی کوڕی کەوت، بە تاوانی سەربزێوی ڕۆژەکیان و دانەمرکانیان لە بدلیس، فەرمانی داله شاری قوم میرئیبراهیمیان سەربڕی. میرئیبراهیم ژنی لە خانەدانێکی سەرناسی قومی هێنابوو لەو ژنەی سێ کوڕی هەبوون: حەسەنعەلی، حوسێنعەلی، شامحەمەد.

بیستونۆ ساڵ ناوچەی بدلیس لە دەست ئاققۆینلوودا بوو. هۆزی ڕۆژەکی بە یەکجارەکی لێیان قەومابوو. پیاوە سەرناس و ماقووڵەکانیان هەر کەس بۆ لایەك پەرەواز بوون و ئەوی مابووشن بوونە گۆشەگیر و لە ماڵی خۆیان دەرنەکەوتن و دەستیان بە کڵاوی خۆیان دادەگرت نەوەك با بیبا. تەنانەت پیاوی وەك محەمەدئاغای کەلهۆکی -کە هەڵبژاردەی ڕاوێژکەرانی لای خانەدانی زیائەدین و گەورە کەیخودای ناو ڕۆژەکیان بوو- لە ڕووی ناچاری ببووە نۆکەری تورکمانانی ئاققۆینلوان و لە عیراق دەژیا. زۆر جار وادەبوو دەچووە شاری قوم سەری لەو کوڕە میرانەی دەدا و بۆ خزمەتکاری و دڵخۆش کردنیان درێغی نەبوو. تۆمەز پیاوێکی زۆر جیهاندیدەو خاوەن ئەزموون و تێگەیشتوو بوو هەر هێدی هێدی باسی ڕۆژەکی و پیاوی زۆریان و لە خۆ بوردوویی و چاونەترسیان بە گوێ هەڵدێنان و بۆی دەکوتن کە چۆن خانەدانی وان لە کوردستاندا کەس تایان نیە و لە پایەبەرزی و ڕەگەزپاکیدا بێ بەرهەڵستن. جارجارەش خۆشی کەشی کۆان و تەرزی باغان و سەوزی چیمەن و دیمەنی جوانی ناوچەی بدلیسی بۆ باس دەکردن و مەبەستی خۆشی دەخستە سەری و لە بنەوە دەیگوت وەنەبێ قەلاّ و شوورەکان هێندەسەخت و دژوار بن بە کەس نەگیرێ. هۆزی ڕۆژەکی سەرداریان هەبێ، زۆر بە هاسانی بەردەستیان دەکەن. کە زانی کوڕگەل گوێی بۆ شل دەکەن، بە ڕاشکاوی لە لای درکاندن کە ئەگەر یەکێك لە ئێوەی ئازیز بێنە کوردستان، هەر بگاتە وێ، هەرچی ڕۆژەکیبن گەورە و گچکەیان شوێنی دەکەون و بە یاری خودا چی وای پێ

ناچیٚ قەڵاکان دەگرین و ئەوسا بە دڵی خۆش، خانەدانی سیس، گەش دەکەینەوە و بە ئاوات دەگەین. ئەوجار ما دایکێ چووە خزمەت ئەویش و بە زمانی خۆشی و نەرم و نیانی گرێی دڵی خۆی لە لا کردەوە و گوتی ئەزیەنی ئەگەر دڵت بێ و یەك لە کوڕەکانت ڕەگەڵ ئەم بەندەی دڵسۆزەی بخەی و من لە خزمەتیا بچمە کوردستان، بە دڵ و بە گیان نۆکەری دەکەم و هۆزی ڕۆژەکیش بۆ دەنگ دەدەم و دەتوانین بدلیس لە ژێر چنگاڵی تورکومانەکان بە زۆر دەرێنین و تۆڵەی چەند ساڵەی خۆمسان بستێنین و هۆزی ڕۆژەکیش -کە دەربەدەرن و زۆر خاکە سەرن- لە سایەی تۆوە دێنەوە ماڵ و سەر خاك و ئاویان و چاویان بە میریان ڕوون دەبێتەوە و ئەو چاکەت لە بیر کەس ناچێتەوە. هێندەی بۆ هەڵخوێند و دەسوێندانی گرت، دایکی بێچارە لە ڕووی ناچاری ڕازی بوو ڕۆڵەی لێ دوور کەونەوە. دوو جگەرگۆشەی کە حەسەنعەلی و حوسێنعەلی بوون دانە دەست ئاغا و محەمەدئاغاش هەردووك میرزادەی دەگەڵ خۆ هێنا و هاتە هەکاری و بوونە میوانی هۆزی ئاسوری -کە لە ناو خەلکی بە سەوەچنان ناوبانگیان هەیە- لای پیاوماقولی هۆزەکەی دانان و گوتی ئەوانە فرزەندی منن و پێویستە زۆر باش ئاگاتان لێ بن و تا من دێمەوە لە پارێزگاریان درێغی نەکەن. خۆشی بە تەنیا ڕووی کردەبدلیس کە هۆز و خزمان ئاگادار بکا و کۆیان کاتەوە و مژدەی هاتنەوەی میرزادەکانیان پێ ڕاگەیەنێ و خۆ ئامادەکەن تا لە ژێر سایەی شاباڵی واندا ولاتی خۆیان لە دەست داگیرکەر ڕزگار بکەن و ژیانی سەربەستی دامەزرێننەوە.

ئەو سەروبەندەش ئەو ئاسۆریانە کە ژێر فەرمانی عیززەدین شێری میری حەزۆ بوون، فەرمانی میریان خستە بەرپێوە و لەڕێ لایان داو هەرچی میرگوتی جوابیان نەداوە و هەرایان ناوە و میرعیززەدین شێر خۆی لێخۆش کردن تەمێیان بکا و لە پڕ لەشکری هێنانە سەر و شیشاجەستەیان.

ئەگەر ڕێگای هەلاتن بکرێ بەربەست      پشیلەش دێتە شەڕ وەك شێری سەرمەست

ئاسۆری کە دیتیان چاریان ناچارە و هات و هاواری سەر و ماڵیانە، زۆر نەبەردانە ڕووبەڕووی بوون و دەگژی ڕاچوون و دەستیان دانەنواند و پاڵەوانانە هاتنە مەیدانێ و هەنگامەیان کرد. هەردووك میرزادەش کە لەو شەڕەدا بۆ هاریکاری خانەخوێی خۆیان

هاوکاریان دەکرد، شەهید کران و سەریان تێدا چوو.

محەمەدئاغا لە لای خۆیەوە هۆزی ڕۆژەکی دەدەسلك نابوو، هەر چاوەنۆڕ بوون میرزادەبێن و پێشوازیان بچن و فەرمانیان دەنێ و هەڵکەنە دژ و دەگژیان ڕاچن و دژ و قەڵایان لە دەس دەرێنن و هەروەها مەزن و سەرۆکەکانی کوردستانیشی بۆ ئەو مەبەستە تێگەیاندبوو. گش چاوەنۆڕ بوون کە ئەمڕۆ و سبە میران بێنەوە و شۆڕش هەڵگیرسێ؛ کەچی لە نەکاو ئەو دەنگ و باسە جگەربڕژێن و هەناوسووتێنەی مەرگی ناکاوی ئەو جووتە لاوەی هێندەچاو لە دوو، کەوتە بەر گوێیان و گش‌کەس لە سوێیان و لە تاو و توێیان هۆشی لە دەس داو دەسی کلۆلیان وەبەر تویڵی ناهومێدی داو دڵسارد بوونەوە.

بوو بە شین و شەپۆڕ و گریان و قوڕپێوانێك، ڕۆژی حەشریش وانابێ. ڕۆژەکی بە دابی خۆیان بۆ شینگێڕی و ئازەیەتباری، خۆیان دەخۆڵ دەگەوزاند و کولاڤی ڕەشیان کردەبەر و پەلاس و کوێنەدەواریان بە سەر شان و پیلان دادا و پێسیری خۆیان دادڕی.

هەموو چاوێك لە تاوان خوێنی باراند      دڵان بۆ جێی کەسەر، خۆشیان دەتاراند

بەڵێ دنیا هەروا بووە؛ هەرواش ئەوێ. هەرچی لە ئاسۆ سەرکەوێ و تیشك بدا، ئاواش ئەوێ. کام دام و دەزگای پتەوە کە هەتا سەر هەر بمێنێ و بوومەلەرزەی دەستی گەردوون نەیلەرزێنێ و نەیرمێنێ؟

چمان دی و چەنێ بەژن و باڵا چەمان؟      گوڵی گەش وەرین و نەمامان نەمان!
لە باغی جیهان چی هەتا سەردەژی؟      مرۆ بۆ گڵی گۆڕە، دار بۆ ڕەژی

پاش ئەو بەڵای ناگەهانە، محەمەدئاغای کەلهۆکی کەوتە ناو شیوی شێوان و قەڵەمی دەست و پێی شکا و ڕایەڵ و پۆی بیر و هۆشی تێك ئاڵقان و ئاڵۆزان و دایە کێوان و دەستە و ئەژنۆ بە قوڕپێوان دەگۆشە و کەناران دەخزی و فرمێسکی هەڵدەوەراند و بە دەم قوڵپی گرینەوە و بە جەرگی پڕ برینەوە، لە بەرخۆیەوە دەیورتاند: گوڵ خونچەی گەشی باخی ئاواتم! هیوای داوڕۆژی کوردستانەکەم! شەختەی نەهاتی و چوون بەسەردا هات؟ مەرگی بێوادەچۆنی دینەوە؟ چز و هەڵوەرین؟ چۆنتان جێ



هێشتم؟ بەهاری ساوام خەزەڵوەری کرد و چومە پاییزی هەناسەساردی. هەزار ئاخ و داخ بۆ نۆنەمامی شەنگ و چەلەنگی باغی میرانم؛ کە جێ هومێدی کوردەواری بوون. کامە چاوپیس بوو کە بەژنوباڵای بە چاو هەنگاوتن؟ مەرگی لە نەکاو وا بە ناکامی هەڵی پەرتاوتن و بە تەوری ستەم بە لایدا هێنان! من لە دوای ئێوە ژینم بۆ چیە؟ ئێوە هومێد و ئاواتی من بوون؛ پیاوی ناهومێد داری بێبەرە و چاری بڕینە و بۆ ئاگر دەشێ.

ئەو خەریکی شین و شەپۆڕ و هەناسەی سارد هەڵکێشیان بوو، کەچی لە پڕ یەکێك لە دۆستانی لێ پەیدا بوو پێی ڕاگەیاند کە مزگێنیم بۆ هێناوی ئەوسا کە سولەیمان بەگی بێژەنئوغلی هێرشی کردبووە سەر بدلیس و ئابلۆقەی قەڵاکەی دابوو، برایەکەی ئیبراهیم بەگ میرشەمسەدین ڕۆژێك دەرفەتی هێناوە و لە قەڵایە دەرکەوتووە و ڕایکردووە و چۆتە بۆتان و خۆی کردۆتە پەنابەر و میرمحەمەدی ئاڕۆخی کیژی خۆی لێ مارە کرد و لەو کیژە کوڕێکی هەیە ناوی لێ ناوە شەرەف بەگ و ئێستا باوك و فرزەند هەر دوو ماون و لە ناو بۆتانیانن. محەمەدئاغا بەو موژدەتەمی خەمی لە سەر ڕەوی و ئاهێکی دەبەر گەڕاوە و تەواو بووژاوە و گەشاوە. بە لەز ڕووی کردەبۆتان و میرشەمسەدینی چاو پێکەوت و زۆریش وە بەردڵی کەوت و لە هەستان و ڕۆنیشتن و ئاخافتنی بۆی دەرکەوت زۆر پیاوێکی بە قیمەتە و ئەوی ئەو بە ئاواتیەوە بوو، هەوە. لە لای دانیشت بە هەنیسك و فرمێسکەوە هەرچی بەسەرهاتەکەی بوو سەرلەبەری بۆگێڕاوە و میرشەمسەدین کولیگری دەئەوکێ ما و لێی پرسی ئێستا چت دەوێ و بۆچی هاتووی؟ گوتی: ئەز غولامێ تەمە؛ ئاخر چارەمان هەر ئەتۆی. دەست لە دەست و قەوەت لە خوا ڕابە و لەگەڵما وەرەوە و سەرداری هۆزەکەت بکە با چیدی سەرگەردان نەبن و وەك پەزی بێ شوان نەمێنن. میرشەمسەدین دڵی نەشکاند و لە تەکیا هاتەوە وڵات و هەر دەگەڵ گەیشتنەوەیان، هەزار و پێنجسەد مەردئازا و کارامەی هۆزی ڕۆژەکی لە ژێر ئاڵای کۆ بوونەوە و بێ خۆگرتن دەورەی قەڵای بدلیسیان دا. لەو دەمەشدا ناوچەکانی بارگیری و عەدلجەواز و ئەرجیش، بە دەست هۆزی تورکمانی محەمەد شالوییەوە بوون. هەر کە زانیان میرشەمسەدین هاتۆتە سەر قەڵای بدلیس، بە لەشکرێکی زۆرەوە هاتنە یاریدەی دژداران. شەمسەدین پێشی لێگرتن و شەڕی تورکمان و کوردان لە دەشتی ڕەهوادا قەوما و هەر دوولا زۆر بە دلێری دەگژ یەکتری ڕاچوون و

کوردی نەبەرد و پاڵەوان لە عەگیدی و میرخاسێدا کارێکیان کرد کە مێژوو شانازی پێ بکا. بەڵام دیسان بێ‌ئەنجام بوو.

کە گەردوون چاکی لێ کردی بەلادا کەمەند و شیر و تیرت بەهرە نادا!

لەشکری ڕۆژەکی شکا؛ میرشەمسەدین بەر لەوە بە ئاوات بگا و قۆڵی دوژمن ببڕێتەوە، قەلی مەرگ لێی قراند و مەلی گیانی هەڵفڕاند و گوڵی تەمەنی بابردی و پەژارەی ئاکامی ناکام -چەشنی تیکان و دڕکەزی- بە برك و سی یاران و دۆستانی داچوو. مەحەمەدئاغا نەکوژرا؛ بەڵام سەدخۆزگەی بە کوژراو «ماوم بەڵام چمانێ؟ کەلێك خۆشترە نەمان[1].» کەوتەوە ناو نامرادی و خۆشی و شادی لێ تەرەبوو. خزا بن تەرەی دڵساردی و بە چاوی تەڕ و سوورەوە لە بەرەژووری دەڕوانی و بۆ گازندەی چارەڕەشی بەمجۆرە گەردوونی دەدواند:

کەنگێ لە خەوێ ڕادەپەڕێ بەختی ڕەشی من؟ تا کەنگێ کلۆڵی و کول و بێبەشیە بەشی من؟

وەك جاران بگرە زیاتریش سەری ئەژنۆی کردەسەرین و شین و گرینی نوێ بۆوە؛ بارانی ڕۆندکی سووری خوێناوکی لە برینان پڕژاند و کوتە جەرگی توێ- توێ بۆوە، نە هەوای سەربەستی مابوو، نە دەستی دەچووە هیچ کاران. تەنیا ئامەزرۆی مردن بوو! کەچی لە ناکاو وەك یەکێك لە عاسمانەوە بیدوێنێ و فرشتەیێکی بەهەشتی دەگوێی هۆشی بسرکێنێ:

سەرت هەڵبێنە ئاکەی سیس و سستی بە لاداکە بە گورجی چاکی چوستی
دەنك دەرزێ بمێنێ زۆر لە بن گڵ ئەشێ دەرچێ هەتا گوڵ بێ لە سەر چڵ
لە سەر خۆ لادەپەردەی ناهومێدی تەمەڵ بەختی لە کاردا بوو‌بێ کێ دی؟
بە دڵساردی مەویژە چی لە من دێ؟ لە خۆبوردوو بە! کێوت بۆ لە بن دێ

لەو دوژدامانە تێپەڕە! لەم خەوە چاوە هەڵگڵۆفە! ببزوو، ڕاپەڕە تەکانێك، بە تیری ساردەکەوانێك، کێلی ئامانجان بنگێوە! مامزەی شنگڵ لە خۆدانێك، لە تەڕادی ئەسپی ئاواتان ببزێوە! لە خەودان و

[1]- لەتە بەیتێکی هێمنی موکوریانیە. هەژار

ئارەقانیدا شتڵ کەو بە سەرڕە و هەرۆ عیراقیێ و میرشامحەمەدێکت ماوە سەرێکیش دەگەڵ وی بسوو! لە ئاسۆی ئەم خانەدانە، ئەویش ئەستێرێکی گەشە؛ مەهێڵە لە قوم بسمێنێ و لە دەریای دووریدا قوم بێ. بیخەوە ناو گەل و هۆز و کلیلی دڵخواز و دۆزت -لێت ڕوون بێ- لە دەست ئەو دایە. محەمەدئاغا کە لەپڕ ئەم بیرەی بە دڵدا ڕابرد، ترووسکێك لە درزێکەوە تاریکی لە بەر چاو ڕەواند و جێ باقە تیشکێکی شاندا کە سەر ڕۆچنەی ئاخ و پەکوان داپۆشیبوو. پێی دەرکێف ناو عیراق و قوم بگرە و هاتم! چووە خزمەت دایکی میرزادان و بە دەم کوڵی گریانەوە کارەساتی جەرگبڕی حەسەن و حوسێنی گێڕاوە؛ کە بە ڕاستی شینی شەهیدی کەربەلای دێناوە یاد. باسی بۆ کرد کە چۆن میرشەمسەدینیشی کوژرا و چۆن ڕۆژەکی بێ سەرکردەو سەردار ماوە و منیان ناردۆتە خزمەت تۆ میرشامحەمەدی بنێری و بە بەندەی خۆتی بسپێری و بیبەمەوە کوردستان و هەموو هانامان هەر بەوە.

دایکی کلۆڵ و بەستەزمان کۆنەبرینی کولانەوە؛ گەرمەشێنی لێ ژیانەوە و دەستی کرد بە بانگ و هاوار و سینگ کوتان و هەیرۆڵەڕۆ! ئیتر داوخوازی محەمەدئاغا و کوڕیتری دەگەڵ ناردن تازە نەدەکرا باس بکرێ. ژن لە تاو جەرگی بەو زگسووتانە کارێکی دەکرد هەر مەگەر دایکی دوو گۆڕ غەریبان بزانێ چۆنە! لە باتی وەرام، محەمەدئاغا چەند جوێنێکی خوارد و گوێچکەی باش ئاودا کە ئەو خەونانەی بەراوەژوون و بۆی نایەنە دی. محەمەدئاغا دەستبەردار نەبوو؛ داوێنی تکای لە دەست نەدەدا و بە کزی دەیگوت: ئەگەر بمکوژی و سیرمە- سیرمەم کەی تازە وەك هاتووم بە دەستی واڵا و بێ شامحەمەد ناگەڕێمەوە. خاتوونی بەڕێز! تۆ هەر بەزەیت بە خۆتا نەیە؛ سووکە ئاوڕێکیش وەسەر مە بدە. هۆزی ڕۆژەکی بە نێر و مێوە، گەورە و گچکەیان، منداڵ و لاویان، پیر و زورهانیان، بە دەربەدەری و هەناسەساردی و نێز و ئاوارە، لەودەر لەو کۆڵان، بێچارە و کلۆڵ دەسووڕێنەوە و گش کات و ساتێك دەستی نزایان بەرەو عاسمانە و لە دەرگای یەزدان دەپاڕێنەوە و هەر خواخوایانە شامحەمەدیان پێ ڕەوا بینێ و دڵ و دیدەیان پێ ڕوون بێتەوە. ئەگەر بەزەییت بە مندا نایە، بۆ ئەو بابە کوشتە و زگ سووتاوانەش سۆت نابێتەوە؟ ئیتر هەر چۆن بوو دایکی بێچارە لە ڕووی ناچاری ئەو تاقە کوڕەشی دابە محەمەدئاغا و ناردیە کوردستان. هێندێکیش دەڵێن بێپرسی دایك

محەمەدئاغا میرشامحەمەدی هەڵفریواند و دەگەڵ خۆی هێنا.

میرشامحەمەد لە ساڵی ٩٠٠ک (١٤٩٤و ٩٥ز)دا بە پێ و قەدەمی پیرۆزی بدلیسی بە سەر کردەوە و هۆزی ڕۆژەکی بە نیاز گەیشتن و دەهۆڵی دڕا و شایلۆغان کرا و گاوگەردوونیان دەپێشدا کرد و خێر و خێراتیان دەبەشینەوە و سوژدەی سوپاسیان بۆ خودا دەبرد.

دەست بەجێ کۆڕی پسپۆڕان گیرا و لەمەڕ گرتنی قەڵای بدلیسێ بە درێژی دوان. چون لایان وابوو کە ئەم چەند جارە بە ئاشکرایی دەورەیان داوە و هەر نەگیراوە و میرشەمسەدین و زۆر کوڕە ئاغای هۆزی ڕۆژەکێش لەو ڕێگەیەدا سەریان داناوە، بڕیاریان وادا باری شەڕەکە ئەمجار بگۆڕن و ئەمەش پلان بێ لە ناو دڵی ڕەشی شەودا کە گەردوون بۆ ئازیەتباری سەرتاپا ڕەشی پۆشیبێ و نەهەنگی دەریای تاریکی، ماندووی ڕۆژی هەڵلووشیبێ و جندۆکەی شۆفار و گوێگر، بە بەری عاسمان هەڵڕووسکابێ و دژداری تورکومانی چاو و دڵیان دەخەودابێ، ئەوسا ڕازەوانی چاژان کەمەندان باوێنە بورجان و گورجانە بە دژ هەڵگەڕێن و بیکەینە جەنگی تەن بە تەن. ئاوا نەبێ ئەستێرەی چارەڕەشیمان ئاوا نابێ. بەو ئاوایە پیاویان ناردەناو بایەکی و مۆدەکیان و ڕازەوانیان دۆزینەوە و هێنایاننە خزمەتی میرشامحەمەد و ئەویش زۆری دڵ دانەوە و بە بەڵێن دڵخۆشی کردن. ڕازەوان پەیمانیان دایە هەرگا فەرمانیان پێ بدا، ئەگەر لە جێی پەت و گوریس شادەماری خۆیان دابێ و بە پێپلکەی مەرگی ڕەشدا سەرکەوتبن، بە قەڵا هەڵدەگەڕێن و ئەوسا یان گیان دەدۆڕێنن یان دژداری تورکمانان دەخوێن و خوڕ دەگەوزێنن. ئەمجارە کەوتنە سەر بیری لێکدانی نەردیوانان و هۆنینەوەی کەمەندان و پەت و دار ئامادەکردن. جا وەك دەڵێن ئەگەر خودا کار ڕێك بێنێ، هۆیەکەشی دەڕەخسێنێ؛ خوا گەیاندی ئەبووبەکر ئاغای بایەکی -کە پیاوەکی دنیادیدەو زۆر کارامە و بە ئەزموون و دڵسۆز و دەبنەوەبڕ و کار قایم و دوورئەندێش بوو- هاتە خزمەت میرشامحەمەد و عەرزی کرد لەو ڕۆژەوە کە تورکمان بدلیسیان لێ داگیر کردووین کار و پیشەی شەووڕۆژم نەردیوان هۆنینەوە بووە. هەر دەمگوت ڕۆژێك هەر دەبێ سەردارمان پەیدا ببنەوە و دیسان بە سەرمان کەنەوە. ئەوسا با منیش ئەوەندەم لە دەست هاتبێ. ئێستەش هەتا دەڵێن بەسە پەت و دارم لێك هاڵاندوون و لە کووپاندا شاردومنەوە و کووپەشم وەبن گڵ داون و چاوەنۆڕی ئەمڕۆژە بووم. سوپاس بۆ خودا کە بە نیازی دڵ گەیشتم.

خودای گەورە! لە سەرمە هەر سوپاست کەم هەتا ماوم
بــە ئــاواتت گەیاندووم و ئەوی ویســتوومە پێت داوم

ئیتـر خوا بتحەسێنێتەوە! ئـەردیوانی ئەبوویـەکرئاغا خێـری خـوا بـوون و تێـری کارەکـەیان دەکـرد. میرشامـحەمەد هـەر شاگەشـکە بـوو؛ پـاش لاواندنـەوە و ئافـەرینی زۆر، دوو گونـدی مـولکی کـە خەزونگیـن و ئیکسور بوون و سەر بە ئاتوانن، کردنە خەڵاتی ئەبوویەکرئاغا.

کەرستە ساز بوون؛ نۆبەتی کارهات؛ دەهەندەهەندی نیوەشەوێکدا کە ئەگەر مانگیش هاتبا لە بەر تاری ئەنگوستەچاو بە دەستەکوتە دەڕۆیی و عاسـمان بۆ دیـتنی زەوی بـە هـەزاران چـاو دەیڕوانـی و دەریا و چیاشی نەدەدین، ڕازەوانان لە لای باکووری قەڵاوە -وەك پەلەپووشی گەردەلوول- بـە دیـواری بورجی ڕەشدا وەسەرکەوتن و ژووریکـی کـەس تێـدانایان لـە نـاو ژوورانـدا بـەدی کـرد و سـەرەپەتی پەیژەکانیان لە پەنـجەرانی گرێدا و هاتنەوە خوار. سا نۆرەی پاڵەوانان هات:

ئــەوەنـدی کەمـەند ڕوو بە بـاڵا دەچوو ستـێـرەش لـە تـرسی لـەڕێ لا دەچـوو
لە جێی نەردەوانـان لـە سەر پیل و شان لە دیـواری دژ ســەرکـەشان هەڵـکشان
کوڕی کـوردی شیشانە گیـانی نـەیـار پەلامـاری گـورگـانە بـۆ کـۆزی کـــار
کـری شیـر و خـەنـجەربڕینـە و بـریـن لـــە کـوردان گوڕینە و لە دوژمن گریـن

کوردی دلێر و مەرگکڕ و دوژمندڕ، دەستیان لە گیان و ژیان بەردا و داوێـنی هومێـدیان گـرت و وەسەر کەوتن. دژداران و پاسەوانانی تورکومان خاو-خاو لە ناو نوێن و باندا بە پرخەوە دەیانـمراند و کوڕەکوردیان گەینـە سـەرێ و زۆریـان هـەر بـە خـەوالوویی لـەو عاسـمانە بەرزەوە بـە جەهەنـدەم موشەرڕەت کرد و بە هەڵداشتـن هەپروون بە هەپروونیان کردن. هێنـدێکیش کـە لـە ژوورانـدا بـوون، دەرگەیان لـە سـەر گاڵـەدان و کۆمـەڵێك هـەرە بـەکار، خۆیـان دەپـاڵ حـاکمی قەڵاکـە هاویـشت و دەریانکیشاو ڕایانکێشاو سەکەتیان کرد و ئەو جار چوونە ویزەی دەست و پێوەندان و کـارداران و یـەك یەك پەتیان خستنە مل و کێشایاننە پای حەسابێ و قەت تاقێکیان لـێ نـەبواردن و خـڕ و پڕیـان بـە عیزرائیلی ئەسپاردن. ژن و منداڵەکانیـشیان لـە قـەڵا و وڵاتـیش دەرکـرد و گوڵـستانی نیـشتمان و

میـرخوزاری کوردستانیان لە گیا بۆگەنە بژار کرد و لە درِ و دالّیان پاکردەوە.

میرشامـحەمەد بە شادی فەرمانڕەوایی ڕۆژەکی گرتە دەست و لە جێی باب و باپیـرانی پایەبەرزی خۆی دامەزرا و ئەویش وەك ئەوانی پێـشوو تێـشوودەری هـەژاران و پـەنادەری بێـچاران و دادگـەر و گەلپەروەر بوو. بەڵام دەورانی فەرمانی، وەکوو -هەرەمەی لاوەتـی- زوو ڕابـرا و مـاوەی سـەروەری کردنی لە بەر کورتی وەك دەستی نەداران دەچوو. سێ سـاڵان سـەرداری کـرد و لـە سـەر داربەسـتیان بەرێکرد. لاوێکی زۆر هێژا بووە؛ زۆر ئازا و دلاوا بووە و بە سەربەرزی و ئاکارتەرزی ئێستاش هەر زۆر بەناوبانگە.

ساڵی ٩٠٣.ك (١٤٩٤.ز) عەمری خوای کرد و لـە گـۆڕەمەیـدان لـە لای گـۆڕی پـڕ لـە نـووری ئەمیرشەمسەدینی وەلی —خوا بیبەخشێ- ناشتوویانە. کوڕێکی تەمەن منداڵی لە پاش بەجێ مـابوو کە ناوی میرئیبراهیم بوو.

# بڕی چوارەم

## ماڵە میرانی بدلیسیّ چۆنیان بدلیس لە دەست داوە؟

### چوار هۆی هەبووە

**هۆی یەکەم:**

**کێشە و هەرای میرئیبراهیم و میرشەرەفی خوالێخۆشبوو**

| | |
|---|---|
| خـــودا گەر بـــۆ یـــەکی هێنـــایە پێشیّ | لـــە گـــشڵا هـــاتە پیـلی ڕادەکـێـشیّ |
| لـە سەر هەستە و بـــەری چاوانی ڕوونـــە | وشـــە و فـــەرمـــایشـی بیّ چەند و چوونـــە |
| هـــەچی دەیـلیّ و هـــەچی دەیـکا ڕەوایە | لـــە بـــەریا کامـــڕەوایـی وەك کـــەوایـــە |
| چ کـــەس بیّ و بەرهەڵستی بـیّ زەبـوونە | پەلە پیـــاڵـــەی ژیـــانی و سەرنـــخـوونـــە |
| لـــە هەمبـــەریا ئەگەر سەد شێری بێشەن | دەیانـــهاڕیّ مـــەواچـــۆ ئیـــنـــە چێشـــەن؟ |

چاپلەسوارانی قیت و قۆز و دڵسۆزی هۆز، بە خەفتان و کڵاوخوود و زریّ و قـەڵغان و تـەوەرزین و گورز و گۆپاڵ و کەمەند و تەرکەش و کەوان و نێزە و ڕمی هەژدەقەفـی حـەیزەران و شیـری میـسری جەوهەردار و خەنـجەری دمشام و دەبان و قەزیێن و تێخی قەرەخوراسانی دوخ و مەودا ڕێك و مووکـار و کالان زێڕ و دەسك ماهی و سیّگۆ لە سەر و بە کۆستەك ڕازانەوە، ڕاویان لە مێژوودا بەشی کارمامز و ئاسك و شوور و مەڕەسوور و کور و گێسك و نێڕی شاخی و کەڵەکێوی و قاز و قوورینگ و هەڵەتـانج و سوورەقانگ و چێرگ و پۆڕ و سوێسکە و بۆرچیـن و سەرسەوز و ڕەشیشە و سـی، دەنـگ و باسـیان هەڵستاندن و قەفانچەلەی ژێی دوباد و کرژو بە کێشیان کێشان و بە تیـری بە پەڕ و پەیکانیان پێکـان و ئاوقای ئالقە و گەوی کەمەندانیان کردن و بەرزەفڕیان نەوی کرد و کوڕ ڕەگوێیان کەوی کرد و لە نـاو بەندی ڕیز و پێتان لە خەتیان دان و شکارنامەی ئەم باسەیان بەم تەرحە نیشان ئێمە دا:

میرئیبـراهیم کە باوکی مرد -ئەگەرچی هێشتا منداڵ بوو- بە جێنشیـن ناودێر کرا و هەڵـسوڕانی

کاروباری دنیاداریش درایە دەستی بە هێزی عەبدولڕەحمانئاغای قەوالیسی و چەند ئاغایەکی ڕۆژەکیش لەو ئەرکە هاریکاری بوون. میرشەرەفیش کە زەمانی میرشامحەمەد لە ئەروخی بۆتانەوە هێنابوویان، لە سەر پەسندی ڕۆژەکیان، لە بریکاری میرئیبراهیم ناوچەی مووشی پێ سپێرا و ماوەیەك ئاوا ڕابرا. تا شێخ بلّباسی لە ڕکی عدبدولڕەحمانئاغا و بەرەبابی قەوالیسی، لە بدلیسێ باری کرد و ماڵەکەی خۆی بردەمووش و لە کن میرشەرەف دامەزرا. ئیتر ئەوسا زمانشڕ و کەتنگێڕ و چاوچنۆکان دەستیان خستێ و تەبایی ئامۆزایانیان کردەناکۆکی و دردۆنگی. میرئیبراهیم بە یارمەتی عەبدولڕەحمان قەوالیسی، پیلانێکیان بۆ میرشەرەف دەبەرچاو گرت. وایاندانا کارێك بکەن میرشەرەفێ بێننە بدلیس و سۆمای چاوی بۆ نەهێڵن و هەرتك گلێنەی هەلکۆڵن. سەیدی ئاغای قەوالیسی[1] -کە خەزنەداریان پێ دەگوت- بەو کاکە و برالەی زانی و زۆر بە هەلپە خۆی گەیاندەمیرشەرەف و دەنگ و باسی ڕاوەچاو و چاوەڕاوی بە گوێ گەیاند.

میرئیبراهیم نامێکی بە ئاب و تاب و گێلۆکە هەلّخەلّەتێنی -بە نۆکەرێکی ڕازدار دا- ناردەمووش و بۆ میرشەرەفی نووسیبوو: ئارەزووی دیداری ئێوە ئارامی لە من بریوە و زۆر دەمێکە تۆم نەدیوە و تکا دەکەم ئەگەر لێتان گران نەیە بۆ چەند ڕۆژێك بێنە بدلیس و بۆ ماوەیەك پێکەوە خۆشی ڕابوێرین. ئەم مابەینەش ئەگەر جار-جار دەردی دووری گەردێکی خستۆتە نێوان و تەنکە تەمێك دێتە بەرچەم، بە هەمدەمی بە ودمی تۆ ڕایمالێن و بیرەوێنین.

میرشەرەف کە سوور دەیزانی ئەم دانەخۆرە بۆ ڕاوە و داوی چاوی لە بەرچاو بوو، خاوەخاوی لە چووندا کرد و خۆی لە قەرەی تەپکەی نەدا. زۆر نامە ئاڵ و گۆڕ کران و وردەوردەبۆرەگلەیی ورد و نەرم بوونە قسەی زل و درشت و گەف و هەڕەشە لێك کران و میرئیبراهیم دەگەڵ هێندێك لە میرەکانی کوردستان لەشکری بردەسەر مووش و مووشەدەمەی شەڕی دەماند. لاگرانی میرشەرەفیش -کە سوار بەگی پازۆکی (لەلە) و میربلّباسی و سەیدی عەلیئاغای پرتاقی و جەلالئاغا و سەید خەزێنەداری برای و شێخی ئاغای جلەکی بوون- وێڕای دەست و پێوەندی میر، خۆیان بۆ ئەو شەڕە سازدا و خزانە قەلّای مووشەوە و سەنگەربەندی خۆیان کرد و وەك تای تەرداس ئامادەی بەربەرەکانی و خەبات بوون.

---

١- هەر جارێك «سەیدی» نووسیوە و دوایە دەیکاتە «سەید»ی ڕووت. هەژار

لە ئەنجامدا هەر دوو لەشکر پێك داهاتن.

| | |
|---|---|
| زرێپۆش و تیخانی هیندی بە چەنگ | دوو دەریا لە پۆلا و پڕاوپڕ نەهەنگ |
| بە یەکتر گەیین، بوو بە قیسرە و گوڕین | جەلێك سەر بڕینە و جەلێك زگ دڕین |
| لەبەر خوێن وخوڕ دەشتی شەڕ ببووە گۆم | لە تیران مەتاڵ بوونە تێژنگی دۆم |
| بە جۆرێك دەقەڵشی کڵاوخود بە شیر | وە بیریان دەهێناوە کێرد و پەنیر |
| دەهۆڵ کوت بوو پێمیردی مردن لەوێ | کەمی دیبوو شاوا هەلێك هەڵکەوێ |

چون لەشکری میرئیبراهیم گەلێك زۆر و لاگرانی میرشەرەفیێ زۆر کەمتر بوون، یەکەمین ڕۆژ سروەی باوخۆشی و سەرکەوتن ئاڵای بدلیسیانی شەکاند؛ بەڵام چونکوو پیاوماقووڵانی ڕۆژەکی دڵیان دەگەڵ میرشەرەف بوو، بە نهێنی نامە و پیاویان ناردەقەڵا و دڵسۆزی خۆیان نیشان دا. چولاقخالید، کوڕی سوارەبەگیپازۆکی -بە پێچەوانەی باوکەکەی- شەرکەری میرئیبراهیم بوو. ڕۆژێك شێخ میریبلباسی -کە لالۆی بوو- دەگەڵ سوارەبەگی باقی ڕایان ئەسپاردێ کە ئێمە دۆستی میرشەرەفین؛ زۆربەی سەرناسی ڕۆژەکیش دۆستی ئێمە پەسند دەکەن. تۆ چوویە لای میرئیبراهیم، پێمان ناڵێی بەهرەی چیە؟ بە باب و فرزەندایەتی ڕووت لێ دەنێین؛ تۆش وەرە ناو کوڕی ئێمە و بەرفەرمانی میرشەرەف بە و فەرمایشتی وەك ئاڵقەی کۆیلەی زێرخرید، دەگوێ بگرە.

خالید بەگ بە گوێی کردن و هەواڵی بۆ باب و خاڵ نارد وا شەوەکی میرئیبراهیم پەلاماری قەڵا دەدا، ئێوە دەرگا گاڵە مەدەن؛ خۆم و هەموو پیاوەکانم خۆمان دەخەینە ژوورەوە.

سۆزی کە پادشای ڕۆژهەڵات هێرشی بردەسەر قەڵای دێوی ڕەشی ئەستێرەگر و مەنجەنیقی ئاگرپژی تیشك و تینی لەسەر ئاسۆگان دامەزراند، تیری تیژی تیژپەڕ و نیشانپێکی دوورە هەڵەی لە دار و دیواران باراند و دەشت و کۆساری بەر خۆ داو خێوی شەوی تا ئەولای حەوکێوان تاراند. کوردی سەر و خەنجەر وەشێن و خوێن خۆرەوە و خوێن ڕژێنی ژێر فەرمانی میرئیبراهیم شاڵاویان بۆ قەڵا هێنا و لە جەنگەی هەڵمەت بردنا، خالید بەگی خاوەن بەڵێن دەرفەتێکی خستە دەست و لە لایێ فیسماڵکی دایە و خۆی ئاوێتە ناو قەڵایە. میرئیبراهیم کە ئەم بەڵایەی بەسەر هات، ڕەنگی بزڕکا و

شلەژا و ترسی هاتیْ کە هات ڕووی لیْ وەرگێڕابیْ و هەر بەوەندەش نەبڕێتەوە و هیتریشی بە دوودا بیْ، دەستی لە دەورەدان بەردا و بەرەو بدلیس گەڕایەوە.

میرشەرەف بە لەشکریەوە کەوتە شوێنی و دەورەی قەڵای بدلیسی دا. هەموو ڕۆژیْ دەستە-دەستە و کۆمەڵ -کۆمەڵ، لە ئاغایانی ڕۆژەکی میرئیبراهیمیان جیْدەهێشت و دەهاتنە خزمەت میرشەرەف. دەم لە شوێن دەم نیشانەی کزی و زەبوونی و گلان و سەرەونخوونی لە دژداران دەردەکەوت و ناهومێدیان بەردەکەوت. تا کار بە جێگایە گەیشت لە سەر بیری میرئیبراهیم و دنەی عەبدولڕەحماناغا، ڕیش چەرمگ و کەیخودایان ڕاسپاردەلای میرشەرەف و کەساسانە پاڕانەوە و گوتیان ئێمە کە پسمامیْ هەڤدوین ئەم وڵاتە بە کەلەپوور پشکی مەیە، میرشەرەف برای مەزن بیْ؟ بدلیس کە وار و بنگەهی لە مێژینەی خانەدانە، ئەخلاتیشی دەخەینە سەر، با بۆ ئەو بیْ؟ مووش و خەنووس دەمێننەوە ببنە پارا میرئیبراهیم و هەردوو پسمام لڤرپیوە بە هاوبەشی بەو مەڵبەندانە ڕابگەن و دنیاش پێنج و دوو ڕۆژێکە و دەبڕێتەوە؛ ئامۆزا بۆ ماڵی دنیا شیر لە ڕووی هەڤدو بکێشن و خونا یەك و دوو بڕێژن، کارەکە گەلەك نەقەنجە و ئاکارەکی پڕ گەمارە.

میرشەرەف و هەواڵانی ئەو ڕێویبازی و فێڵسازیەی ئەمان هێنایانە کایە، بە دەسکەوتیْ زلیان زانی و گوتیان بەو بەش بەشە ڕازین.

بڕیار درا میرئیبراهیم ئامادەبیْ و میرشەرەف بانگێشتن بکا و بچتە قەڵا و ئاشت بنەوە و پەیمانی دۆسی ببەسن و ببنە سوێندخۆری یەکتر و هەتا ماون بە بەشی خۆیان بساچێن و کەسیان چاوچنۆکی نەکا. میرئیبراهیم نان و خوانی بۆ میوانی ڕازاندەوە و میرشەرەف دەستە پیاوێکی لە هاودەستان و یارانی نزیك و تیراْدیوی خۆی دەگەڵ خۆدا بردەقەڵا و ئامۆزای هاتە پێشوازی و یەکتریان دەهەمبێز گرت و هاتنە سەر و ڕووی یەکتر و زۆریان چاك و خۆشی کرد و چوونە سەر خوان. بەزم و ئاهەنگ شاهانە بوو؛ مەیگێڕانی شل و مل و چاو بەکل و بەڵەك پڕ و سپی و سۆڵ و نەرم و نۆڵ و دەس بە خەنە و دەم بە خەنە و ڕووگەش و شاد -بە نازەوە- بادی زێڕینی پڕ بادەی یاقووتی و ئاڵیان دەگێڕا و بە دیمەنی خەمڕەوێن و بە نەرمەگەشتی کۆتری، برەوبەری هۆری و پەری نادیار و بە شەڕابی نیشەدەریان، ڕمێن بەری ئەو مەیە بوون کە لە بەهەشتی پاکاندا ڕووبارێکە.

سترانبێژی لە چەم زان و شایەر و سازندەی سازان، بە گەلێك ساز و ئاوازان حەیران و لاوکی کوردانە و شوور و ماهووری عەجەم و کوچەباغی و بەیاتی تورك و پەردەی مقامی حیجازیان لێدا و دەنگیان لێ هەڵبڕی و هەست و هۆشیان لە مەست و سەرخۆشان بڕی و تەنانەت هەیڤی عاسمانێ لە خۆشیانا خۆی دەبزاوت و ئەستێرە لەویەر لەویەران چاویان لە یەکتر دادەگرت.

| | |
|---|---|
| لـە هەر گۆشێکەوە مەیگێڕی چاومەست | لە بـادەی ئاڵ و تاڵ سینی لە سەر دەست |
| لە گش لایـەك گەواڵ و سـاز و سـەمتوور | لە هەر سـووچێك دەگاڵێـن تار و تەنبوور |
| لە کرنووش بـردنـا چەنـگیش بـە کۆمی | بە بلوێری دەگـوت ئـاوەدەنـگی خـۆمـی |
| بـە سترانبێـژ و شـۆخ و کـوڵـمە ئـاڵان | هـەزار دڵ پێـکـەوە دەبـران بـە تـاڵان |

لەو جەژنە پیرۆزە -خۆشە کە چاوباز بە دڵواز دەگەیین و ئاواتخوازان نیاز ڕەوا بوون و هەر کەس لە گەورە تا بچووك بووکی هیوای گرتە باوەش- میرزادان فەرمانیان فەرموو کـە ئاغایانی ڕۆژەکی هەر کەس وێڕای هەمبەزمی خۆی، بچێتە گۆشە و کەناران و لە نـەدیوو بـەرپیواران بـا بـە ڕاشکاوی ڕابوێرن! خۆشیان دەگەڵ چەند لاوێکدا بە تەنیا لە هۆدەکە مان. لەو دەمەدا لە پڕ شێخمیریبلباسی دەگەڵ چەند سەربزیوێکدا وە ژوور کەوتن. لە بان کورسی میرئیبراهیمی دابەزاند و پێی گوت:

| | |
|---|---|
| کـەی ڕەوایە لیسی بازان کوندەبوو بیگرێتەوە؟ | کوند دەگەڵ کوندان لە وێرانان دەبێ بوخلێتەوە |

دەستی میرشەرەفیشی گرت و لە سەر کورسی دانیشاند و ئەم شێعرەشی بۆ خوێندەوە.

| | |
|---|---|
| پیـرۆزە بووکی دەوڵـەتـێ بـگـرە دەبـاوەشـێ | با هەر کەسەی لە شوێنێ بنیشێ کە پێی دەشێ |

میـرزاچاکانی دیوانی یەزدان لە ژێر سەردێڕی «بەخشندەخوایە» گەواهینامەی شیاوی مـەزناهیان دامیرشەرەف و جاڕووکەشانی حەوش و بارەگای «بێگانەبەدەر» میـری بـەرێیان لـە پـا هـەتا مـل زنـجیـرپێچ کرد و ڕەپێچەکیاندا بۆ سووچی زیندان.

| | |
|---|---|
| کە نـزمـی و بـڵندی دەبـن جاروبار | خودایە و بەدەس خۆیەتی کـاروبـار |
| یەکێ تەختی خونکاری بۆ گۆڕ دەکا | یەکێکی بەرەو گۆڕ سەرەو شۆڕ دەکا |

هێژ کار نەگەییە بەردەمی شیر و ڕمبەڕمب و ڕمبان، دەستەوبەستەی میربرایم و عەبدولڕەحمان قەوالیسی -کە چەشنی کۆ لێك کۆ ببوون- لیسی خۆیان بەجێهێشت و وەك حەوبرالەیان لێهات و هەر کەسە ڕووی کردەلایەك.

میرئیبراهیم حەوسالان لە زینداندا ما. ئەو کاتەی میرشەرەف گیرا و خەبەر دەکوردستان گەڕا -کە ئەم باسەش لە دواییدا باسی دەکرێ و چۆن سەرکەوت و چۆن داکەوت و چی بە سەر هات، لە دوی دەدەین- ڕۆژەکی میرئیبراهیمیان لە گرتووخانە دەرێنا و کردیانەوە فەرمانڕەوا و گەنج و سامانی میرشەرەف ساف لە سافیێ تالان کرا و نیازیشی بوو کوڕەکەشی میرشەمسەدینی دوو سالان -کە لە کیژی عەلی بەگی ساسۆنی بوو- وێڕای دایکەکەی بیکوژێ؛ تا عیماداغای بایەکی خۆی گەیاندێ و لێی پاڕاوە کە دایك و کوڕ بدرێن بەم و لە تۆڵەی زیندیناغای مامی خۆیدا -کە میرشەرەف کوشتوویەتی- بیانکوژێت و بەو فێڵە ئەو بێسووچانەی لە مردنێ ڕزگار کرد و دەگەڵ دەست و پێوەنداندا باری کردن و هێنانیە دژی کیفەندور و پارێزگاری لێدەکردن.

**پوختەی وتار:**

کە میرشەرەف لە تەورێز خرایە بەندێ، بە فەرمانی شائیسماعیلی سەفەوی، چاپانسولتان ئیستاجلوو بە لەشکرێك دەورەی قەلای بدلیسی گرت و میرئیبراهیم دوو سالانی خۆ لەبەر گرت و لەوسا پێوە، بەرگەی قزلباشی نەگرت و سێ تەلاقەی نایە مستی بووکی سەرداری کردن و چووە ئەسعرد و لەوێش مردن پێسیری گرت.

ئەو بەینەی کە لە بەندا بوو، کەنیزێکی نێرینەیەکی بۆ دیبوو، سولتان مردایان ناونابوو. کە میرشەرەف گەڕایەوە، سولتان مراد هاتە لای و ئەویش گرتی و زۆر لە زینداندا مایەوە و هەر لە زندانیشدا ڕۆیشت. پاش هەلاتنی میرئیبراهیم، ڕۆژەکی هەتا شەش مانگان دژیان بۆ دژمن چۆڵ نەکرد و بە تەما بوون میرشەرەفیان بۆ بێتەوە؛ بەلام کە لەو ناهومێد بوون، سالی ٩١٣.ك (١٥٠٧.ز) چاری ناچار قەلایان دابە دەستەوە و چاپان سولتان، کورد بەگ شەرەفلوی ئیستاجلوی کردەفەرمانداری بدلیس و بۆ خۆی گەڕاوە تەورێزێ.

**هۆی دووەم:**

**دامەزرانەوەی میرشەرەف لە سەر بدلیس**

دڵڕوناك و ئاکارچاکی ئەم جیهانی ئاووخاکە لێیان ڕوونە هەر کەس دەگەڵ خوای خۆی پاك بێ و پەنا و هانا و هیوای تەنیا بە یەزدانی بەرز و تاك بێ و لەو پێوە ڕووی دەکەس نەبێ و بە کەسی‌تر دەربەس نەبێ و خۆ لە نارەوایان لادا، خواش پشتی لە هەردێ نادا و بەردی سارد و گەرمی دەردی ناگوزوری و کەمایەسی ناخاتە بەر و کۆشکی نیازانی سەردەگرێ و باغی ئاواتی بەردەگرێ و گوڵی هیوای دەپشکوێ و سروەی شادی بۆ دەنگوێ و چی بوێ، بۆی دەچێتە سەر. هەر خاوەن پایە و مایەیکیش کە هەر بابی زێڕ و زۆرە و دین بە دنیاوە دەگۆڕێ و لە ڕاست خودا دڵ دەگۆڕێ و سەری لە بەر ناچەمێنێ، لە ئەنجام هەر دادەمێنێ و خودا زۆر زوو لە بنەی دێنێ و دژی لووتبەرزی و بە فیزی، بە بای توورەیی دەڕمێنێ و کوندەبەبووی لێ دەخوێنێ و لەجێ باغچەی بەخت و هاتی، گیا بۆگەنە و کەکرە و گوژاڵك و نوسەکە و دڕك و داڵ و کارگەگولانە دەڕوێنێ و دەکرێتە گەندەڵی بێ‌بەر.

| | |
|---|---|
| کە تۆ ڕێکی‌خەی بەندەیەك سەرکەوێ | سەر و جێ بلندەو بە کەس نانەوێ |
| کەسێکیش هەڵێدێری خۆی ناگرێ | هەزار جار بە لاساری پێ داگرێ! |
| کری تۆیە ئەستوور و باریك بووە | ئەگەر تەنگە کەڵ یان ملی مێرووە |
| ئەتۆی تیژ دەکەی نووکی دڕك و چقڵ | لە پاسی گوڵە و بۆتە پەرژینی چڵ |

مەبەستم لەم پێشدەستیە سەرەتایەك بۆ ژیننامەی خۆش ئەنجامی میرشەرەفی کامڕەوایە. کوڕێکی منداڵ و بێ‌باب کەوتبووە ناو بۆتانیان و لە ئەرۆخدا دەیگوزەراند. هەر وەك لەمەوبەریشەوە بنووسی هونەرپیشەمان بە ژێهاتی بەسەرهاتی بە سەر زوانی لووسیدا هات، میرشامحەمەد ناردی لەوێ هێنایەوە و پەروەراندی. کاتێ ئەویش لە ژێر سەرپۆشی خاك خەوت، لە بریکاری میرئیبراهیم بە سەر هێندێك لەو ناوچانەی سەر بە بدلیس ڕادەگەیشت. دوایە بە یاری ڕۆژەکیان بوو بە فەرمانڕەوای بدلیس و لە پاش مەودایەکی هندك شائیسماعیلی سەفەوی بە لەشکر هاتە سەر مەرعش و عەلائەدەوڵەی زولقەدری دەرۆستی نەهات و شکا. لە پاش شکانی زولقەدری بەرەو دیاربەکر وەرچەرخا و لەو دەمەشدا بابی دایکی نووسەری ئەم ڕووپەڕانە -کە ئەمیربەگی مووسڵو بوو- بە

دیاریەکرێ ڕادەگەیشت؛ خۆی کردەبەرفەرمانی شاو دیاری زۆر و زۆر بەنرخی بە نـاوی پێشکێش بـۆ هێنا. یەك لەوانە پارچە لالێکی «بوکرك[1]» بوو؛ لە گورچیلە مەڕی دەکرد. لـە خەزێنـەی خونکـارانی کەوناراوە کەوتبووە دەست پادشایانی بایەندوری و لەمانەوە بەو ڕەسیبوو. لەو ساوە کە کێوی خـەتلان لە زەمانی عەبباسیاندا لە بەر بوومەلەرزە قەڵشی و ساڵەهای ساڵ لە نـاو گـەرادانی بـەردین، پارچـە لالی وەك منالی ساوای نازدار بە خوێنی جگەر پەروەراند، هێشتان دیدەی خـاس پەسـندی دوڕنـاس و گەوهەرفرۆشان نە بەو ڕەنگە و نە بەو سەنگە و نە بەو ڕندی و قەشـەنگیە لالـی هاوتایـان نـەدیوە و تازەش وێنەی نابێتەوە. شالە خۆشیان هەر خەنی بوو بەگی بۆ گۆڕیەوە بە خان و کردیـە مۆرهـەڵگری شاهی و پلەی لەلەی شاتۆماسبیشی دایە و خوراسان و هیـراتیشی لە بـاتی بەخـشش پـێ بەخـشی و پایە و ڕێزی هاتە ڕیزی هەرە بەرزان. سەرپەرشتی دیاریەکریش بە مـــحەمەدخان ئیـستاجلووی کـوری میـرزا بەگ سپێرا.

هێندێك لـە هـۆزی زولقـەدری لـە دژی «خربـرت[2]» غـەزری بـوون و نەهاتنـە بـەر فەرمانـەوە؛ شائیسماعیل چووە سەریان و بە حەوتەیەك قەڵاکەی لە دەست دەرێنان و لەوێوە بەرەو ئەخلات هات و لە نزیك ئەخلات داوەزی.

میرشەرەف بۆ میوانداری کەوتە خـۆ ئامـادەکردن. خێـوەتی شایستەی شـایان و کـۆنی هـەراوی ڕەنگاوڕەنگ، تاولی هەژدەئەستوندەکی و دەواری بە نەخش و نیگار، سـەریان لـە هـەوران دەسـاوی و وەك هەوری پڕی نیسانێ یەکتـریان پاڵەستۆ دەدا و بەندەئاوریشمی گورزەهۆن لێیان ببووە ناوبژیکەر و سەرانسەریان لە بەر جوانی مەیگێڕانی چاوئاسك و لەشناسك و باسك و زەندی هەڵماڵاوی سپی مینا، بەفر و بلوور و لاوی دەمرووت و لووس و پووس و زەرینەپۆش و مەشرەفخۆش، کە بانگی نۆشانۆشیان بوو، چادر خەرمانی گوڵان و سابات جـێ ڕاوگـەی دڵان بـوون. ئـاوڕووی ترێـی ڕەش ڕژابـوو؛ خـوێنی کرابووە پیاڵەوە و ڕوومەتئاڵان و چاومەستان بەو ئاڵە خۆشە تاڵەوە، بە بەر ڕیزی بەرێزانـدا بـە سـەد

---

١- بوکرك نووسراوە. دەبێ «بوێگرەك»ی تورکی بێ؛ کـە بـە گورچـیلە دەڵـێن. وادیـارە لەعلەکـە هـەر وەك بیـچمی گورچیلەی بووە؛ ڕەنگیشی بەو سووریە بووە. هەژار

٢- ڕەنگە خرت برت (خەرپووت) بێ. جەمیل

 

کریشمە و نازەوە، بۆکڕنۆش دەچەمینەوە و بە لەباری و لە چەمزانی نۆشیگیان و فەرموویان بوو.

ساز لێدەری بەزم سازدەر - لە سەر هەوای گوڵگەشت و دەشت- بە گەواڵ و بلوور و چەنگ، گۆرانیبێژانی خۆشدەنگ، بە بەستە و دلۆ و لاوك و گەلۆ و ئازیزە و پایزە و سوارۆ و درکانە و شەو و نیوەشەو، شەویان کردەڕۆژی خۆشی و ڕۆژیان کردەجێژن و شایی.

| | |
|---|---|
| لە سەر دەستی کیژی زەری کیژی ڕەز | کە هات پیر و دەروێش لە دین بوون وەڕەز |
| سەماکەر لە کوڕدا بە سەد نازەوە | دەسووڕان بە دەم ساز و ئاوازەوە |
| ئەوەندەی لە بالا لەرین زەردەمەم | دڵی ئۆقرە ئۆقرەی نەما زۆر و کەم |
| بە حیلکان و چەپڵەی کچی شۆخ و شەنگ | لە پارێز و ترسان نە ڕوو ما نە ڕەنگ |
| لە بەر لاوك و دیمەنی لاوی لاو | نە گوێ گوێی لە کەس ڕادەداشت و نە چاو |

ناندانەر و خوانوەڕازێن ئەوەندەیان شیو و ئاشتی هەمە ڕەنگەی ئیشتیا بزوێنی لیکاوتکێن بە تەنگەی یەکەوە دابوو کە جیکڵدانەی ئارەزووی چاوچنۆك و خوازەڵۆکیش بە سەدیەکی نەدەگەیشت و پارووڕفێنی تامەزرۆ و زگپەرستی دەرفەت ڕەخسێن، لە زەحفیان سامی ڕێدەنیشت و واقی چلێسی وڕ دەما و هەر بە تماشامڕ دەبوو.

لە پاش فراوین خارن و بە زیاد کردنی زەوادەکە، نۆرەی پێشکەش و دیاری هات. ڕەوە ئەسپ و کەریە پەز و ئێستر و وشتر، بە قەتار پێشکێش کران و گلێنەی پڕ لە بەزەیی مەزنانەیان هەڵازنی و دەفری دڵی دیاری گری شاهانەیان وا ئاخنی کە خەنی بوو؛ فەرمانڕەوانامەی بدلیس و زۆر خەڵاتی گرانبایی دابە میر وسەربەرزی کرد.

جاری دووەم: شائیسماعیل زستانی لە خۆی ڕادەبوراد. میرشەرەف و مەلیك خەلیلی حەسەنکێف و شاعەلی بەگی بۆتانی و میری جزیر و میرداودی خێزانی و عەلی بەگی ساسۆنی و یازدەپیاو ماقولیتریش لە میرەکانی کوردستان، بۆ ڕامووسانی سەر ڕێسمەی بارەگای شاچوونە خزیە و بە ماچی سەردەرانەکەی سەرفراز بوون. دەپێشدا زۆر ڕێزیان لیّنان. محەمەدخان سەرپەرشتی دیاربەکر، کورد زۆریان بە سەر هێنابوو ئازاری لە دەستیان دیبوو. بۆ نموونە دەڵێن کاتێ محەمەدخان ڕوو بە

دیاریەکر دەچوو لە دێی پانشیـن -کە سەر بە ناوچەی بدلیسە- داوەزیبوو؛ کارگوزاری ئەمیرشەرەف -کە شێخ میـری بلباسی بوو- چووە دیدەنی و کاتێ هەستا بـە گۆپاڵەکـەی چـەند جارێـك تەپـەی لـە قالیچە هێنا و بە تووڕەیی تێی ڕاخوڕی ئۆمـحەمەد بەگ! گەرەکە چاڤێن خـۆ وەکـەی؛ تەبــخۆ ئـان مرۆیێن تە د بدلیسێوە ببوورن بە زۆر گیسکێك لە ڕۆژەکیەکی بستێنن، لە چنگی من ڕزگار نابن.

شاقولی سوڵتان ئیستاجلوو چاوشلوو -کە دوایە والی هیـرات بوو- بۆ نووسەری ئەم ڕووپەڕانـەی گێڕاوە، گوتی: باوکم پیاوی ئەو مـحەمەدخانە بوو؛ دەگەڵی دەچووە دیاربەکرێ. لە هـەموو ڕێ و بـە تایبەتی لە لای بدلیس بێ تۆشەیی کارێکی کرد کە هەموو کـەس ئەسـپ و چـەکی خـۆی فرۆشـت و بەنانیان دا. باوکم لە دۆڵی کیفەندور ئەسپەکەی خۆی بە چوارنانی گارس فرۆشت و کەس نەیدەکرا بـە خۆڕایی مەنە جۆیەك یاخۆ نانەکی بتەرسی لە بۆرەپیاگان بستێنێ. شتی لەمانەش پیسـتری بـە چـاو دیبوو کە لە میـرانی دەزانی و لێرە بیلێم دەبێتە درێژدادڕی. جا کە زانی وا میـرە کورد بە سەرجەمی چوونە بەر بارەگای شایی، لە دیاربەکرەوە ڕایسپارد ئەگەر فـەرمانی شـاهانەی بـێ چـەند و چـون بـۆ گرتنی ئەو میـرە کوردستانیانە بێتە دانێ، بەڵێن دەدەم ئەو شوێنانەی کوردستانیش کـە هـیچ کـاتێ نەهاتوونە بەر کەمەندی پادشایانی لە مێژینەش، مـن بـە ماوەیـەکی زۆر هنـدك بیگـرم و بیخەمـە مشتت. کاتێ ئەم پێشنیارەی ئەو لە بەردەمی شادانرا، لە سەر گفتی ئەو کافرە بەرهەڵدایە -جیا لـە شامـحەمەد شێروەیی و عەلی بەگی میـری ساسۆن- خرمچوون هەموویان پێچان و هـەر یـەك لـەوان درانە دەست ئەمیـرێك لە قزڵباشان. میرشەرەفـی دابە ئەمیـرخان مووسلۆ.

لەشکری شاگەلێك پتـر لە دەنکی بارانی غووڕەم کۆ بوونـەوە و بوونـە سـێ قـۆڵ: قۆڵێـك چـاپان سوڵتان بردی کە بدلیسی پێ بستێنێ. دێو سوڵتان ڕۆملووش بە قۆڵێـك ڕووی کردەناوچـەی هـەکاری. یەکان بەگی قۆرچی باشی تکلووش بە تیپە لەشکرێکەوە ڕەوانەی سەر جزیر کـرا. دیـسان باسـی ئـەو گیـرانە و ڕزگار بوونی هێندێك میـران -خودا یار بێ- بە نۆرەی خۆیان لێی دەدوێم.

**پوختەی مەبەست:**

ماوەیەك ئەو ئەمیرانە لە گرتووخانە مانەوە و ڕۆژێك لە پڕ دەنگ داکەوت کە شەیبەکخانی ئوزبەکی بە لەشکرێ بێدادەوە لە ئاوی جەیحوون پەڕیوەوە و دەیەوێ خوراسان بگرێ. بە بیستنی ئەم هەواڵە شائیسماعیل شاش و واش بوو؛ لە گرتنی میر ومەزنانی کوردستان تووشی پەشیمانی ببوو. هێندێکی لێ ئازاد کردن؛ لێشی پرسین سەردار و پێشەواتان کێن؟ هەموو بە دەستیجەم گوتیان میرشەرەف و مەلیك خەلیل. ئەوانی دی هەموو بەردا و ئەو دوانەی بە بەندی هێشتن و دەگەڵ خۆشیا بەرەو خوراسانی بردن.

محەمەدئاغای کەلهۆکی[1] و دەروێش مەحموود کەڵەچێری -کە بە بیری کۆکەرەوەی ئەم پەڕانە بۆ دڵسۆزی و ئاکارچاکی لە ناو هۆزی ڕۆژەکیدا و بگرە لە هەموو کوردستان وەك ئەو دوانە دەس ناکەون- بە بێ ئەوەی کەس بیانناسێ ڕەگەڵ هۆردووی شادەکەون و دەچنە عیراق. هەر لە دۆژی چەند ڕۆژێکدا میوە و خۆراك هەڵدەگرن و دەچنە چادری تورکمانان و سەر لە میرشەرەف دەدەن و کەین و بەینی خۆ دەکەن کە چۆن ڕاکا و کەنگێ هەڵێ.

لەشکری شالە چاڵیکولی سەر بە ڕەی وچانی گرت. محەمەدئاغا و دەروێش مەحموود زانیان هەلە و هەلکەوتووە؛ چەند ئەسپێکیان بە زینەوە لە ئەدیوی هۆردوو ڕاگرت. محەمەدی میرئاخوری پرتاقی -کە لە بەرگی دەروێشاندا خزمەتکاری میرشەرەف بوو- لە شوێنی میرشەرەف خەوت و میرشەرەفیان لە ناو چادری دەست بە سەری هێنا دەر و سواریان کرد و چەند پیاوێکی زۆر بە کاری ڕەگەڵ کەوتن و کوردستانیان کردەڕووگە. بۆ بەیانی لای نیوەڕۆ تورکمانان پێیان زانی و لە خۆبوردوویی و بە جەرگی محەمەدی میرئاخورپیان بە لاوە زۆر پیاوانە بوو، بە ئەترسی خۆیان بەخشی و چیان لێ نەکرد.

محەمەدئاغا و دەروێش مەحموود و میرشەرەف هاتنە مەڵبەندی هەکاری و چوونە گوندێك کە شێخ ئەمیری بڵباسی لە بەر گێچەڵی قزڵباش لە زێدی خۆی تەرە ببوو، لەو گوندەدا خۆی مات دابوو؛ خەریکی گارس چاندن بوو. لەو دەمەدا کە ئەوان چوون، بێڵێکی بە دەستەوە بوو پەلە

---

[1]- لە فارسیەکەی چاپی میسر، لێرە «یارمحەمەدئاغایە» بەلام دوایی هەر «محەمەد»ی بێ یارە. هەژار



گارسەکەی ناو دەداشت. محەممەدئاغا و دەرویش مەحموود لەو لای تەختە گارسەکەوە قاوی لێدەکەن و دەڵێن: وەرە مژدانێمان دەیە تا میرشەرەفت نیشان دەین. باوەڕ ناکا و دەڵێ ئەوە لە ئاوەز بە دوورە. دەڵێن خوا دەرفەتی داوە و لە بەندێ ڕزگار کراوە و دەگەڵ خۆمانمان هێناوە و هیچ گاڵتەشت دەگەڵ ناکەین. بێڵی ئاودێری هەڵداشت و سوژدەی شوکرانەی خوای برد و ڕایکرد خۆی گەیاندەمیر وکەوتە سەر خاك و پایەوە و فرمێسکی شادی هەڵوەراند. مینا یاقوب، کە لە گۆشەی غەمخانەدا لە سوێی یوسف سۆمای نەما و بە بۆی کراس بینا بۆوە، ئەویش بە ماچی دەست و پای میری هەرە خۆشەویستی، چاوی دڵ و دڵی چاوی ڕوون بوونەوە و بە گەشکە داریەوە دەیگوت:

سوپاسم بۆ خودا وا بەختەیارم لەمەولا ڕێك و پێکن کاروبارم

لە ئاسۆ تیشکی دڵشادی پەیا بوو شەوی دەرد و کەسەر تەفروتونا بوو

شەو و ڕۆژێك لەوێ مان و لە سپێدێکدا -کە میری ئیقلیمی چوارەم لە خێوەتی گرتووخانەی شەو دەرکەوت و لە ئاسۆی کۆساران هەڵات و تاری لە کوردستان تاراند- ئەو کۆسوارە ئەسپیان تاودان و چوونە ناو هۆزی ئیسپایرد. شەرەف بەگی ئیسپایردی پێشوازی گەرمی لێ کردن و تا چەند ڕۆژێك بۆ پشوودان و میوانی لەو نێوانەدا مانەوە. شێخئەمیردەگەڵ چەند کەسێك بە پێشڕویی چوونە بدلیس کە مزگێنی هاتنەوەی میراگەیەنن. تا میرگەیشتە بەرەوە، ئاپۆرە و حەشاماتێ زۆر چاوەڕێی میر وفەرمان بوون. دەستە و لەجێ دەورەی قەڵای بدلیس درا.

کورد بەگ شەرەفلوو -کە لە سەر بدلیس و عەدلجەواز و ئەرجیش گزیری شائیسماعیل بوو- کاتێ زانی وا شێخ ئەمیربە دوو هەزار چەکدارەوە دەوری قەڵای بدلیسی دا، دەگەڵ قزڵباشەکانی ناوچەی بارگیری و ئەرجیشدا پەلاماری شێخ میری داو لە گۆك مەیدانی بدلیسێ دوو لەشکر دەگژیەك ڕاچوون. زۆر نەمابوو شنەی شادی سەرکەوتنێ بەرەو ڕۆژەکیانی هەڵکا، کە لە پڕێکا محەممەد بەگی پازۆکی وڵامی نارد: من لە قزڵباش بێزاوم و دێمە هیمدادی خزمانم. بە گزیکاری و ڕێوی بازی فریوی شێخ ئەمیری داو لە جەنگەی جەنگ و تەنگانە -کە تینی بڵێسەی شەڕێ موی عاسمانی هەڵدەپرووزاند- دەگەڵ پێنجسەد کەس پازۆکی لە ئەسکەندەر بۆلاغییەوە هات و پشتی لە شێخ میری سەند و بە شیر دەرۆژەکیان بەربوو!

ڕۆژەکی کە تا ئەو دەمە وەکووو لیزگەی کۆ لێك کۆ بوون، بە دەردی حەوبراله چوون و لێـك بـڵاو بوون! بەختی بنتەمی کورد بەگی وەك ئەستێرەی کاروانکـوژەی لای شـەوەکی گەشـەی کـرد و چـاوی ورەی ڕۆژەکیانی بە شەوارە لە سۆ خست و بە پانەوە شاڵاوی برد.

شێخ میروەك هەسێرەی بنە لە سێرە کرتن نەکەوت و لە مەیدانێ ئاوا نەبوو؛ خەزای کرد و هـەرای کرد تا وێڕای عەلیاغای کوڕی، بەرکی شەهیدانیان پۆشی و مەردانە لە مەیدان کەوتن. قزلباشـان کـە شێخ میـریان ناو لێنابوو: قەرەیەزید، لاشەی ئەو و کورەکەیان لە ناو کۆك مەیداندا سووتاند.

دوای ئەو بەڵا دڵتەزێنە، دۆز لە میرشەرەف ئاڵۆزا و دیـمی دڵخواز لە پـشت پـەردەی ناهومێـدی خۆی مەڵاس داو تا چارەسازی بێچاران دەرەتانی بۆ نەڕەخساند، کرێ کوێرەی ڕەها نەبوو.

**هۆی سێهەم:**

**چیـرۆکی بدلیس ساندنەوە و دوا بەسەرهاتی میرشەرەف**

خـودادای پـاڵ دەوە! هـەرگا خودا دای  لە ناو مەڵبەندی هاتان خێو و کوێخای

دەبەر ئاوزەنـگی تۆدان خـێر و خـۆشی  لە سەر خـەرمانی سووری بێ کڵـۆشی

هەمـوو شوێنـێـك لە تـۆڕا ئـاوەدانـە  مەلیـش ڕامـت دەبـن بـێ ئاو و دانە

میرشەرەف کە لەو هەلەدا بۆی نەڕەخسا بدلیسێ دەسخاتەوە و بە شـوێن چـارەدا دەگـەڕا، کـاتێ زانی کە خونکاری سەرزەمیـنگر (سولتان سەلیمخان) بە نیازە بازێك بەرەو ئێران باوێ و داگیـری کـا، ئەویش وێڕای شۆڕەسواری دنیادیدەو پەسندیدەی هونـەروەران و سـەرتەریدەی بەختـەوەران و شـارەزای هەموو ڕێ و شوێنان و مامۆستای سپی وەخوێنان، لە کڕ و نەخشی دینداریدا تەونگـەری کـرژپیس و نەوەی خواناسانی بدلیس (حەکیم ئیدریس) و دەگەڵ ئامۆژگاری هەڵبژاردەی خانەدانی ناس و دیاردەی (زیانەدین مـحەمەد ئاغای کەلـهۆکی) پەیـمان و گفتی دڵسۆزی و سۆزی دوور لە گەرد و تۆزیان بـە ئاسانەی دەوڵەتـخانەی بەرەی عوسـمانی ڕاگەیاند و بۆ ئـەم مەبەسـتە بیـست کەسـیان لـە مـەزن و میـری کوردستان دەگەڵ خۆدا کردەهەمدەست و نامەی بەندەواری خۆیان بە هۆی مـەولانا ئیـدریس و مـحەمەدئاغای کەلـهۆکی بـۆ ئاسـتانەی هـات هێلانـەی سـوڵتان ڕەوانـە کـرد و سـوڵتانی دۆسـت



لاوێنەوەی دژ و نەیار تاوێنەوە، لە سەر بیر و پێشنیاری میر ومەزنانی کوردستان، بەرەو عەجەمستان بزووت و بۆ ئەرمەن و ئازربایجان بوو بە بزووت و لە سەر سارای چالدێرانێ، شائیسماعیلی بەرخۆ داو تێکیشکاند. میرشەرەف و چەند سەردارێکی کوردستان، جلەوداری کامیاری سوڵتانی بەخت لەبار بوون. خانمحەممەد -سەرپەرشتی دیاربەکر- لەو شەڕە سەری تێداچو؛ سێ برای بوون: قەرەخان و عیوەز بەگ و ئولاش بەگ. قەرەخان بوو بە جێگری و کرا بە والی دیاربەکر و بدلیس . درا بە عیوەز و فەرمانڕەوایی جزیرێش، دیوانی شانایە بەر چەنگی ئولاش بەگ.

کە ئاڵای بەرێزی سوڵتان لە تەورێزەوە بۆ لای ڕۆم ڕووی وەرگێڕا، حەکیم ئیدریس بە سوڵتانی خاوەن شکۆی پێشنیار کرد کە میرەکانی کوردستان لە بەزەیی شاهانەتان چاوەنێڕن، ولگەی باب و باپیرانیان پێ ببەخشێ و یەکێکیشیان هەر لە خۆیان بۆ بکەی بە سەرداری گشتی و بە تێکڕایی هێرش بەرنە سەر قەرەخان و لە دیاربەکری دەرپەڕێنن. سوڵتانی هەموو دنیاگر لە وەرامیاندا فەرموویان هەر کام لەو میر ومەزنانەی کوردستانێ بۆ میری میران دەست دەدا با بۆ خۆیان ناودێری کەن و دابنرێ و میرە کوردەکانیتریش دەژێر فەرمانی ئەودا بن و کۆشش بکەن قزلباش لە ناو بەرن. حەکیم ئیدریس جوابیداوە کە ئەوانە زۆربەیان هێند خۆپەرستن هیچیان سەریان بۆ ئەویتر ناچەمێنێ و ئەگەر تۆ چاوت لەوە بێ قزلباشان لە ناو بەری، وا باشترە نۆکەرێکی بەر بارەگای دنیا پەنا ئەم پلەی پێ بسپێردرێ تا سەردارە کوردەکانیش زوو بێنە بەر فەرمانیەوە و ئەم کارە زووتر کۆتا بێ! لە سەر پێشنیاری مەلا چاوش، محەممەدئاغا -کە بیغلومحەممەدیان پێ دەگوت- کرا بە میری میرانی دیاربەکر و سوپاسالاری کوردستان بۆ گرتنی دیاربەکری ڕەوانە کرد. هەر دوو لەشکر لە قوچحەسار -کە لە ئالی نووسەیبینە- وەك هەوری بە شریخە و گرمە بەرانبەر بە یەك ڕیزیان بەست. یەکەم دەستەی بەر لە هەرکەس بوونە دەستەچیلەی شەڕێ، ڕۆژەکی بوون. ئەوان زووتر هێرشیان کرد و تاج ئەحمەد و قاسم ئەنداکی و میرشاحوسێنی کیسانی و میرسەیفەدین و عومەر جاندار -کە قارەمانی ڕۆژگار و پاڵەوانی هەرە بەکار بوون- لەو ڕۆژەدا شەهید کران.

زۆربەی ئاغای ڕۆژەکیانیش بە تایبەتی میرمحەممەد ناسرەدینی و سەیدسەلمانان قەوالیسی و قەرایادگار و زۆری دیش -کە دادی مەردایەتیاندا- لە مەیدانێدا زامار بوون. قەرەخان لە شەڕدا

کوژرا و لەشکری قزڵباش شکا و زۆربەی زۆریان بە دیل گیـران.

سەری دوژمنانیـان نەوی کـردەوە　　پەری بەختی سڵیان کەوی کردەوە

وڵاتـی گراویـان بە شیـر ساندەوە　　برینیـان بە سەربەستی برژانـدەوە

ئەوسا کە هەر میـرە کوردێك بۆ گرتنی مەڵبەندی خۆیـان بـزوتن، میـــرشەرەفیش بـە هاوکـاری مـحەمەد بەگی حەزوەیی و میـــرداودی مـەزنی خێـزان و میرشامـــحەمەدی شێـــروەیی و میـــرانی مەکس و ئیسپایرد، دەوری قەڵای بدلیسیان دا. ئابڵۆقەدان زۆری کێشاو دژدارە قزڵباشەکان لە قـەڵادا زۆریان بۆهات. گوتیان ئەگەر مـحەمەد بەگی غەرزانی و میرشامـحەمەدی شێروەیی دەستەبەر بن - کە خوێن و ماڵ و منداڵمان دەپارێزرێ- قەڵا بە دەستەوە دەدەین. لە سەر ئەو مەرجە پێـك هـاتن و میرشەرەف ئەو دژدارانەی بە دوو میـرەکە ئەسـپارد و گەیاندیاننـە سـەر سـنووری ئـەرجیش و وان و ڕەوانەی ئێرانیان کردن.

ئیتـــر هــەتا دێرزەمــانێ لـە دیـوانی سـوڵتانەوە و لــە دوای ئـەویش لـە لایـەنی سـوڵتان سولەیمانخانەوە، پارێزگاری ئەو سنوور و کەوشەنانە بە میـرشەرەف سپێرابوو؛ ئەرکی خۆشی زۆر بە باشی ئەنـجام دەدا و هەر دوو لاشی دڵ ڕاگرتبوون و نەیهێشت هیچ لای لێ برەنـجێن.

هەتا ئەو سەروبەندانە کە چوها سوڵتان تکلو ببــووە کوێخـا و هەمــەکارەی شاتۆماسـب و ئۆڵمـە تکلوی خزمی کرا بە سەرپەرشتی ئازربایـجان و بۆ پارێزگاری کەوشەنان زۆرتر کاتی لـە وان و وسـتان ڕادەبوارد. کاتێ حوسێنخانی شاملو دەگەڵ چەند قزڵباشێکدا لە کوێـستانی کەنـدمانی ئیـسفەهانێ، چۆها سوڵتانیان لە ناو برد و خێڵی تکلو لێیـان شـێوا، ئۆڵمـە لـە تـەورێز یـاغی بـوو؛ گەنــجینەی شـاهانەی پـوڕکرد و دارای تـەوریزی ڕووت کـردن و بــە ملـهوڕی مـاڵی زۆری کـۆ کـردەوە و ڕووی کردەمەڵبەندی وان و نامەی تژی لە کۆیلەتی و بەڵێنی زۆر دڵخۆشکەرەی بە پیاوی ڕازداری خۆیدا، بۆ بارەگای سوڵتان سولەیـمانخانێ نارد. کاتێ دەنگ و هەواڵی ناو نامە، وەبەر گوێچکەی خاوەن شکۆی سوڵتان کەوت، بە فەرمانی بێ چەند و چون میرشـەرەف بە لەشکرەوە ڕووی کردەوان کە ئۆڵمە و ماڵ و منداڵ و پیاوەکانی بنێرێتە ئاستانە. ئۆڵمە دەگەڵ دووسەد سوارێك لە پیاوانی هۆزی تکلـو تـا خرکـوم هاتە پێشوازی و لە سەر ڕەخی چۆمی خرکوم چاویان بە یەك ودوو کەوت. ئۆڵمە ڕوی لە میرشەرەف نا

کە لە قەڵای وان میوان بێ و ببێتە میوانی ئۆڵمە و پاش چەند ڕۆژ بچنە بدلیسێ. لەم بەینەدا هێندێك خەڵكی وان و وستان بە میریان گوت: ژنی ئۆڵمە دایەنی شاتۆماسبە و دەگەڵ برایەکی خۆیدا ناردویەتە لای شای ئێران کە نێوانیان خۆش کاتەوە. ئەوەك ئۆڵمە بەگزیکاری ئەو میوانداریەی ساز دابێ و تۆ و ئاغایانی بەردەستت بکاتە دیاری دەستی خۆ و بە بەرتیل بتاندا بە شا. میرشەرەف لەو باس و خواسە تاسا و کەوتە دڵخورتیەوە و خۆی لە چوونە قەڵا گرت و هەرچەند ئۆڵمە تکای لێ کرد بەهرەی نەدا و زۆر بەهانەی هێنانەوە.

لە ئەنجامدا بڕیار درا ئۆڵمە سوڵتان و میرشەرەف لە گوندی خرکوم بمێنن و ئەمیرە بەگی مەحموودی و چەند پیاوێکی ئۆڵمە بچن ماڵ و منداڵ و بارخانەی ئۆڵمە و دەست و پێوندانی لە قەڵای وانێ دەرخەن و پێکەوە بچنە بدلیسێ. میرەبەگ و هاوڕێکانی لە شەوێدا گەینە وانێ و برای ئۆڵمە و چەندێکیتر دەروازەیان قایم کرد و ڕێیان نەدا میرەبەگ و پیاوی ئۆڵمە بچنە ژووری. میرشەرەف کە ئەمەی زانی پێی وابوو چوونە سەر قەڵا و دەورەدانی کەڵکی نیە و لەوانەشە قزلباشی دەورو‌بەریان لێ کۆوە بن و ئۆڵمەش سەری تێدا بچێ. چاری ناچار ئۆڵمە و نزیکەی دووسەد کەس لە پیاوانی -کە بە پیر میرەوە هاتبوون- خستە تەك خۆ و بەرەو بدلیس ڕەوانە بوون.

ئۆڵمە و هاوڕێکانی ئۆڵمە ماڵ و منداڵیان بەجێ ما و عاشتەبایان بۆ دەرنەچوو. هەر بەو کەل و پەلی بەریان و بەو پاییزی سارد و زریان، هەناو بریان و چاو بەگریان و بە ئەسپی بێ زین و لغاو، بوونە هاوڕێی میرشەرەفێ.

محەمەدشەحنەمان قەوالیسی -کۆنە لەلەم- بۆی وەگێڕام گوتی: ئەوسا کە ئۆڵمە و چەند ئاغایەکی هاوکاری هاتنە بەر دەرگای خێوەت و گوتیان کارێکی گرینگمان لە خزمەت میرشەرف هەیە و دەمانەوێ عەرزی بکەین، میرشەرەف فەرمووی بێنە ژوور و لێی پرسین کارەکەو چیە؟ گوتیان ئۆڵمە لە دوای سڵاو عەرزت دەکا: میردەزانێ کە ئەو برا و خزمانەی من چەند بە نزمی جووڵانەوە و دەستیان بە سەر ماڵ و منداڵی مەدا گرت و ئێستاش ئاوا وەك سلقی ڕووت بچینە بەردەمی سوڵتان نە بۆمە جوانە نە بۆ تۆ. یان فەرمان دەمن و هەموو هەواڵانم سەرژێ کەن و سەرەکەمان بکە دیاری و بۆ ئاستانەی خونکاریان بەرێ بکە، یاخۆ بەرماندەبەرەو وان بگەڕێینەوە ئەو ناکەسانە تەمبێ کەین و ماڵ و منداڵەکان بێنین و ئەوسا بە دڵی خاترجەم ڕوو بکەینە خزمەت

سولتان و بە سەربەرزی خۆمان ڕابێین.

میرشەرەف زۆری بۆ ڕاما و فەرمووی: فەرموودەی خودا و پێغەمبەرانیشە کە بۆ کاران ئامۆژگاری بە دۆست و هاوکاران بکرێ. ئێمەش تەگبیرمان دەنێرینە خزمەت سولتان. پیاوی ئۆلمە گەڕانەوە و هەر لەو شەوەدا میرشەرەف چەند ئاغای جێ باوەڕی خۆی کۆکردنەوە و مەبەستەکەی خستە بەریان و هەر کەس چی پێ باش بوو گوتی.

لە دواجار میرشەرەف فەرمووی: لە ڕاستیدا ئەم کابرایەی بەم بیچمەوە بنێرینە خزمەت سولتان، دەیکەینە دوژمنی خۆمان. من بە لامەوە وا باشە سێسەد کەسێك پیاوی ئازا و لاوی بەکار بنێرینە سەر ڕێ وان و ڕێگەی ئۆلمەش بدەین بڕوا. کاتێ کەمێك دوور کەوتەوە هەرا بکەین: ئۆلمە هەلات! هێندێك پیاویشی شوێن بخەین و ئۆلمە و چەند کەسێکی هاورێ بکوژین و سەرەکانیان بە خەبەری ناخۆشەوە بنێرینە ئاستانە و ئەو بەلایەی لە کۆڵ دنیا بکەینەوە. ئەینا ئاوا ئۆلمە بڕوا و بگاتە بارەگای سولتان، ئێمە کردەپەشیمان و تووشی گێچەل و هەرا دێین. هێندێك گوتیان تۆ ڕاست دەکەی؛ بەلام هێندێك ملیان نەدا و گوتیان: میر وچاوەشی بێگانە و سەر بە دەولەت لە ناو لەشکرماندا زۆرن، ئەگەر سبەی ئاشکرا بێ کاری مەیە، سزای زۆر گەورەمان دەدەن و پاکانەی خۆمان پێ ناکرێ. ئیتر نە بەردانی ئۆلمە و نە پلانی میرشەرەفێ بەجێ هاتن. ئۆلمە وەك دۆلمەی هەلۆەشاو هاتە بدلیس و لەوێ پوشتەیان کردەوە و بەوپەڕی ڕێز و قەدرەوە ڕەوانەی ئاستانەیان کرد.

ئۆلمە کاتێ لە بەردەکونەی بدلیسێ چوو بەودیوا، بوو بە دێوێك کە لە ناو غارێ دەرچوبێ یان حەزیایەك کە تامەزرۆی خوێنمژین بێ، ڕك و کینەی لە میرشەرەف لە ناو سینە جێ کردەوە و هەر گەییشتە بەردەم سولتان ڕشایەوە و گلە و گازندەی هەلڕێشتن و گوتی: چونکە دۆستی هەرە باشی قزلباشە، سووکایەتی بە سەر هێنام و تەنانەت نیازیشی وابوو بۆ دلخۆشی شاتۆماسب من بکوژێ. لە بەزەییت چاوەنۆڕم میرشەرەفێ لە کار بخەی و بدلیس بە بەندەبسپێری و خوا یارم بێ هەموو ولاتی عەجەم و مەلبەندی ئازربایجان خۆناگرن و بە زوێکی زوو دەیاندەمە دەست پیاوی تۆ و ئەو کارەش هەربە من دەکرێ و لە لام وەك ئاوخواردنەوەیە. بۆ ڕاست و درۆی قسەشم بنێرن لە دووی میرشەرەف؛ باوەڕ ناکەم بە قسەو بکا. لەو دەمەدا عەلیسەیدان -کە پیاوێ قەوالیسی بوو- دەگەل ئۆلمەیان

ناردبوو؛ هەر لەویٚ بوو. ناردیان هێنایانە دیوان و لێیان پرسی: لە ئاستانەی سوڵتانەوە لە میــرەکەت بگێڕنەوە دیٚ یان نایە؟ کوردی دڵساف و بێگزی گوتی: ئێستا و لەم کاتە هاتنیان بۆ دەرگای بارەگـای بەرز، شتیٚ لە ئاوەز بە دوورە. وەزیران و کاربەدەستان وەرامی عەلی سـەیدانیان کردەبەڵگـەی ڕاسـتی ئۆڵمە و هەرچۆن پیسە، وایان بردەبەردەم سوڵتان و ئەم قسەیان بە نیشانەی یاغی بوون و شۆڕش زانـی و گوتیان دیارە قزڵباشی لە عوسمانی پیٚ باشتـرە. لە سەر ئەمە هەر ئەو دەمـە بـدلیس بـە ئۆڵمـە بەخشرا و زۆر چەکداری ینگیچەری و تازە شەڕکەر بۆ ئۆڵمە کۆ کرایەوە کە بدلیـسی دەگـەڵ بگـرن و فیل یاقوب پاشای میـری میـرانی دیاربەکریان کردەسەرداری لەشکر و ئەویش سیهەزار چەکداری لـە دیاربەکر و کوردستان و مەرعش و حەڵەبیٚ دەنگ داو بردنیە بدلیس گرتنیٚ.

میرشەرەف لەو دەنگ و باسە تاسانی بە سەردا هات و ئارام و حەجـمینی نەما. هەر چەند دیـاری و پاکژیننامەی ناردەبەر بارەگای بەرزی سوڵتان، سوودی نەدا. گەورە وەزیری ئەو دەمە ڕکی کۆنی لـە میرشەرەف دەدڵدا بوو؛ میرشەرەف ئەسپێکی باشی لە شەڕی هۆزی پازۆکی دەگـەڵ تـالانیٚ هێنـابوو، سەرەکوەزیر ڕووی لیٚ نابوو کە ئەسپەی پێشکەش بکا، نەیدابوویـە! ئـەویش تۆڵـەی خـۆی کـردەوە و گوێی بە داد و بێداد نەدا و بەهانەی ئەسپەکەی پێگرت.

میرشەرەف کە ناهومێد بوو، چاری ناچار قەڵای بدلیسی دابەست و سێسەد پیـاوی خـاوەن نـاوی مــەرگکڕی پڵنگـدڕی ڕۆژەکیـانی خـستە بەردەسـت ئیبـراهیم ئاغـای بلباسـی و میـرمـحەمەد ناسرەدینی، کە پارێزگـاری بـدلیس بـن و ئەسـپاباتی قـەڵاداری و ئێـروی ڕۆژی تـەنگانان و هـەموو پێداویستی دانیٚ. میرشەمسەدینی کوڕی خۆی دەگەڵ ماڵ و خێزانیدا ناردەقەڵای ئەختمار و قـەڵاکانی مووش و ئەخلات و کیفەندور و ئامورەك و کەلـهۆك و فەیرووز و سەلـم و گوڵخار و تاتیك و سوی - کە ئەو زەمان ئاوەدان بوون- هەمووی ڕۆژەکی لیٚ دانان و بۆ خۆشی وەك گوتوویانە «دوامیـــن چـارە داغ کردنە»، چەند کەسی دەگەڵ خۆی برد و خۆی گەیاندەئاستانەی شاتۆماسب؛ کـە ئـەو سـایە لـە تەورێز بوو؛ پەنای پیٚ برد و داخوازی هیمداد و کۆمەگی لیٚ کـرد و شـائەو پـەڕی ڕێـزی لـیٚ گـرت و هەرچی میرگوتی، نەیگوت نا.

فیـل یـاقووب و ئۆڵمـە سـاڵی ٩٣٨.ك (١٥٣٢.ز) هـاتن دەورەی بدلیـسیان داو شـەڕ و هـەڵڵا

هەڵاییسا و گڕ و بڵێسە و کوانوی شەڕ لە پشت هەورانیش داییسا. هەموو ڕۆژان کە پاشای شەڕی ئۆغڵەمەی قەڵای عاسمان کەمەندی تیرێژی بە تاو دەبورج و بارووی کونگرەی مەکۆی ئەستێران دەگیراند، گڕمەلای ئایەری جەنگیش دەخزایە ناو گەرمەلان و دەبووە شەڕی پاڵەوانان. هەرگا هەیڤی عاسمان پێو، لە ئاسۆی کێو دەردەکەوت و پاسەوانی دەشتەپانی عابی ڕەنگی بەر دەکەوت و ترێفەی لە سەر کێفەوە پشوودانی ڕادەگەیاند، مەردانی دڵ بەرد و نەبەردانی دەشتی نەبەرد، خوروی سەریان دادەمرکا و دەستیان لە شەڕ هەڵدەگرت و پایان لە گەڕ دەحەساوە و لەشیان دەخستە سەر هەرد و مژۆڵیان تێك دەپەڕاند و پیلوویان بە چاودا دەدا و خەونیان بە خوێنەوە دەدیت. ماوەی سێ مانگ واگوزەرا، بورج و کۆنگرەی شوورەکان بە تۆپی قەڵاڕمێن و مەنجەنیقی کەفر سوتێن وەك ددانی پیرەنەنکان پڕ بوون لە کەلایی و کولێن و هێند نەمابوو کە قەڵا سەر بچەمێنێ، شاتۆماسب لە پاتەختی تەورێزەوە بۆ ڕێزگرتنی میرشەرەف بۆ خۆی ڕووی کردەبدلیس و کاتێ خەبەری هاتنی شاڵە ئەخلات و عەدلجەواز بڵاو بۆوە، فیل یاقووب و ئۆلمە بە جووت دەستیان لە بدلیس هەڵگرت و ڕێ هەڵاتنیان ڕەچاو کرد. بە جۆرێك سەریان لێ شێوا، زۆربەی زۆری گرانبار و خێوەت و دوو تۆپی گەورە -کە لە لای ڕۆژهەڵاتی شار هەمبەری دەرگای تەلیسم، دابەسرابوون و دار و دیواری قەڵایان بەو دوو تۆپانە دەتەپاند -لە دەشتی شەڕگە بەجێ مان. دەگێڕنەوە قەرایادگار کە لە دوایە دورەك[1]یان بە نازناو دایە، هەر بە سواری لە قەڵاوە بازی برد و بە چوار ناڵە ئەسپی تاو داو لە ئەخلاتێ هەواڵی دوژمن هەڵاتی بە بارەگای شاهی گەیاند و بە لاواندنەوەی شاهانە و بە بەخششی شایانی خۆی سەرفراز و بێ نیاز کرا.

میرشەرف بۆ پێشکەشی شا و دیاری هەواڵ و یارانی، فەرمانیدا کە دەو و دووی ماڵ و داهات و مەڕانە و پاتاڵانەی هەموو هۆز و خێڵەکانی ناوچەی بدلیس و هەر شوێنێك کە دەبەردەستی ئەودایە - چ کافر و چ موسوڵمان- هەمووی دەبێ کۆ کرێتەوە. باج ئەستێنی زۆر قیرسیچمە و زبر و تیژی وە ناو خستن و بە سێ ڕۆژان دراوێکی بێدادیان بۆ وەسەر یەکنا. لە ئەخلاتێ بە خۆشی هاتنی شاوە، میوانداریەکی وای سازدا و ئاهەنگێکی وای بەرپا کرد کە هیچکەس وێنەی نەدیوە. حەوتەوانە لەو

---

١- باز، بەڵام بازی مەل، ناو بازی پەل. هەژار

عاسمانە بە هەر حەوتان لە دهۆڵی مانگیان دەدا و بانگیان دەدا و بانگیان لە ئەستێرە دەکرد بێنە سەیرێ. زوهرە وە سەما کەوتبوو؛ خۆی بادەدا. لەیل و مەجرووم بەیتی خۆیان لە بیر چووبوو؛ بەو ئاهەنگەیان هەڵدەگوت. جووتەی کەوان، کەوان ژەن و قرژانگ بە دوو سەر دەهات و سەری خۆی بە شاباش دەدا. گەلاوێژ گلەیی دەکرد کە خۆر ڕێگەی لێ بڕیوە و ڕێ نادا سترانەك بێژێ. کاروانکوژە بە واق وڕی دەکاروانچیانی دەخوڕی کە لەو خوانەدا بەشدار بن. تای تەراز و بە دوو سەرە هەر میوەیان هەڵدەکێشاو هێشوی پیرۆ لە خوای دەویست هێشووە ترێیەکی وا با، کە لەو کۆیەدا خورابا. ڕۆژی گەورە دامێن-دامێن باوەش-باوەش خەڵات پەخشانی زێڕی بوو؛ بەریکی دارودەوەنی ئاخنیبوو؛ ورچی زل و ورچە چوکە -بۆ مل و مۆی تیکە بەرماو- پاسەوانی خێوەتان بوون. بە هەزاران چاو لە کادز لە بەرد و کەڵی ئاورگی بەربەرۆشان پرووش بوون و ئاویان دەکرد. ڕەشماڵی سەد ئەستوندەکی و خێوەتی هەشتا چەڵاکی و کۆنی لە بان چیغی تازەی ئاوریشمچن، هەر یەك بۆ زۆر خۆ نیشاندان، قوتکەی گوڵینگەی کوڵاویان دەورگی عاسمان گیرابوو. لە بەر تەختی زێڕ و زێو و مرواری بەند -کە کەس نەیدەزانی چەندن- هەر ڕێ ڕێداریش نەمابوو. لە هەردەران و دەوەران، داری عود و ئەسپەندەری چاوزاران، لە سەر سکڵان هەڵدەقرچان و بێقل و کەپۆی میوانانیان دەئاخنی و بۆ پێ هەڵکاڵان لەمپەر بوون. سەتان لاوی قەد لاولاوی چاومەست و لە دڵ هەنگیوە بە پیانی زێڕ و زێوەوە و زەردەخەنە بە لێوەوە، هەرای فەرموو بخۆرەوەیان گاڵەی دەکرد و بە تیلەی چاو، خواپەرستی لە زەبریشیان وەردەگەڕاند. گۆرانی بێژانی دەنگخۆش ژانی دڵانیان دەڕەواند و خەمیان بەرەوڕوو دەکەواند و ڕەگی کەسەریان دەخەواند. سەماکەران لە دڵتەڕان و دڵبەران بە بەر دەف و دمەگەوە و بە جلکی هەمەڕەنگەوە، تەنگی دڵیان دەڕەتاند و ئیشتیای گراویان دەبزواند:

چلۆن بانگێشتنێك؟ مەر خوا بزانێ — چ کەس نەیدیگە ئاوا نان و خوانێ

ئەمەندەرێز کرابوو جۆرە ماسی — گەڕی دەریا و چەمیش کەمیان دەناسی

لە ناو ڕۆندا مەلەی قاز و مراوی — بە کوژراوی و بەشی سوورەو کراوی

مریشك هەر نەپرسە چەی بە سەر هات — قرانی پۆپە لار و هێلکەکەر هات

کەڤۆك و کەو ئەوەندەسەر بڕابوو — گمە و قاسپە لە سەر دنیا نەمابوو



قورینگ و پۆڕ و چێرگ و بۆقلە و سیش
چزین و هەلکزانیان بوو لە سەر شیش

لە بەر پیری ئەگەر گۆشتی خورابا
دەبوو گای ژێر زەویش پەل پەل کرابا

پلاو ساوار نەبەس گۆشتی لە بەر بوو
کلاوی دووگەبەرخیشی لە سەر بوو

تەنانەت کار و بەرخی عاسمانیٚ
وەیان زانی خوراون دێر زەمانیٚ

گولاو و ماست و دۆ و دۆشاو و خۆشاو
گز و فتدەر بەزار و بیٚقل و چاو

سجوق و میوژ و هەنگوینی شانە
مەلا و شێخیان دەخستە سەر بەهانە

تریٚ و گندۆر و شفتی و خۆخ و هەرمیٚ
لە خۆرایان دڕاند رووبەندی شەرمیٚ

تا سیٚ ڕۆژان بەزم و ئاهەنگ لە ئارا بوو. لە ناو میوانان کەس نەما لە بەخشش گیرفان پڕ نەکا و هیچ تامەزرۆیەکیش نەبوو لە چێژەی خۆش، خۆی مڕ نەکا. ئەو جار نۆرەی پێشکەشی شاهانە پێشیٚ. شتی وایان لە کۆڕ دانا و دیاری وایان هێنا گۆڕیٚ، کە تا ئێستا نە هیچ چاوێك ئەوەندەی پێکەوە دیوە، نە هیچ گوێیەك باس و خواسی نایابی وای بە بەرگوێدا تێپەڕیوە. دەستە دەستە مەلی ڕاوی لە سەقر و واشەوە بگرە تا شاهێن و تەرلان و باز، ئەسپی کەحیل بەزینی قەلتاغ زێڕەوە، کەوڵەوشەگ، پارچەی حەوڕەنگ، مەخمەر و زێڕبافتی فەڕەنگ، لە بەر چاوی شارێزکران و چاوی پڕ بەزەی شاهانە بە خۆشیەوە سەیری کردن. ئەویش کەمبەرە شیرێکی زێڕ و گەوهەر ویٚ خراو و خەفتانی ئاوریشمی چوار توێی زێڕدۆزی بە خەلات دایە و ئازناوی خانیشی لیٚ نا و یەکجاری سەرفرازی کرد و پلەی سەرداری لەشکر و میری میرانی کوردستانیشی پیٚ بەخشی و فەرمانی پیرۆز و جوانی لەو بارەوە بۆ خستە کار کە وا لێرە ڕای دەگوێزین.

## روونووسی فەرمان

چونکە نیازی بنەڕەتی دەسەلاتی خونکارانی ئاکار تەرز و هەوێنی بەرەوژوور چوونی کاروباری پادشایانی خاوەن شکۆ، چاوەدێری و ڕاهێنانی کۆمەلێك لە سەروەرانە کە ئەوانە دایم و دەرهەم لە پێناوی بیر و بڕوا تێکۆشاون و لە بەر هیچ کۆسپ و لەمپەرێك دانەماون و لە مەیدانی ماندوو بوونیٚ و بۆ نەترسان لە تێچوونیٚ گۆی چالاکیان لە ئامپایان بردۆتەوە، لە ڕای خزمەت گوزاریدا و لە باری

فیداکاریدا هەر سوور بوون و لە خاوی و گزی دوور بوون و هەموو سەرمایەی ژیانیان بۆ دەرگای جیهان پەنامان و بارەگای گەردوون ئاسامان بەخت دەکەن و بە گیانبازی و لە خۆبوردن، کەند و کۆسپی سەر ڕێ ئێمە تەخت دەکەن، لەو بارەوە پالاوی فەرمانڕەوایی و گەشەدەری دام و دەزگای ترۆپ بەرزی حکوومەتمان، سەروەری میرانی مەزن و پوختەی بنەماڵەی گەورە، ژیهاتوی دەستەلاتداری و بەختیاری دین و دنیا (شەرەفخان) زۆر بە دڵسۆزی و بڕواوە بەم خانەدانە بەرزەمان -کە هێلانەی سەربەرزانە- پەناهێنە و وازی لە دوژمن هێناوە و داوێنی چاکە و بەزەیی و پیاوەتی ئێمەی باداوە و وە زوان حاڵ پێمان ئەوشێ:

هاتنی من نە لەبەر ڕێزە نە زێڕوزێوە ترسی دوژمن منی پێچاوەتە ماڵی ئێوە

بە کۆڕی بەرز و پیرۆزمان سەرفراز بوو. بێگومان بەزەیی و چاکەی بێ ئەندازەی شاهانەمان ورەی دڵ و هێز و ڕێزی پێ دەبەخشێ و وەك زانایان بە ڕەوانی فەرمووگیانە:

پەسیو و پەنای بێکەسە ماڵی من کەسێك خۆ بهاوێتە بن باڵی من
لە کەس با نەترسێ بە سوێند و بەڵێن وەناکەم لە گوڵ کاڵتری پێ بڵێن

وا ئەو میرە پەنابەرە لە ژێر سێبەری دووبەر و بەرپانی ئێمەدا ڕێگەی درا و پلە و پایەی نازناوی «خان»ی پێدراو ناومان لێ ناوە «شەرەفخان». پێشەوایی کۆیلەکانی دیوانی بەرزیشمان پێدا و لە ڕێزی خان و میرانی خودان شانی بەر بارەگای سەربڵندا حەساو کرا و کراش بە میری میران و فەرمانڕەوای هەموو میرانی کوردستان. بدلیس و ئەخلات و مووش و خەنووس -وێڕای ئەو شوێنانەیتریش کە ژێردەستەی میری دەسنیشان کراو بوون- بە زەمینی پارێزراوی بریکارانی پیرۆزی شاهانەی خۆمانن زانی و بەو پیاوە شایستەن بەخشی و سەر هەوساری بگرە و بەردەو گیروداری دنیاداری و دارایی ئەو وڵاتەمان دەناو مشتی گرێ گشتی ئەو میرە نا؛ تا هەمیشە وەك دبێژن: «بە چاکە کۆیلە پەیداکە» ئەویش چاکەی لە بەرچاو بێ و لە شارێی خزمەتی شادا ئەمەگدار و دەس بەکار بێ و وەك نۆکەری چاك و دڵسۆز، با چاکی لۆ بکا بەلادا و بۆ هیم پتەوی و هەمرەنگی، ئەوەند هەوڵ و تەقەلادا کە میر ومەزنانی هاوسای گشتیان لاسای ئەو وەکەن و لە سایەی ئەم فیداکاریەی، دەم لە

دوو دەم لە بەرچاومان پەسندتر و لامان خۆشەویستتر دەبێ.

لە سەر هەموو میر وگزیران و سەرکردانی کوردستانە، کە ئەم خانە ناو دراوە، بە میری میران بزانن و سەرکزی بەرفەرمانی بن و هیچ کات و سات و زەمانێ لە بەر فەرمانی دەرنەچن و خاوەخاویشی لێ نەکەن و گوێ بۆ جارەکانی شل کەن و هەر پێداویستێکی بوێ -کە بۆ دەوڵەت بەهرەی بوێ- بۆی پێك بێنن. پادشایان و کۆیخان و بۆرەپیاگ و دانیشتوانی ئەو ناوچانە و سەرکۆمار و خێڵەوار و ئاژەڵداری سەر بەوێنە، گەرەکە خانی ناوبراو بە تەرخانی شابزانن و فەرمانڕەوایان خۆیەسی و هەرچی ئێژێ وەگوێ بکەن و لاری و چەوتی دەگەڵ نەکەن. ئەرکی سەرشانی خانیشە ئەڕای مسکێن و ژێردەستان ڕەفتاری ئەوەندەخاسوێ، نزای بەخێری بۆ بکەن. زۆردار، بێزۆر بەرخۆنەدا و لاسار، هەژار دانەکرۆژێ؛ تا میری دەرودراوسێش چاولێکەری ڕەچاوکەن و بەسەر شۆپی ئەودا بڕۆن.

هەرگا ئەم فەرمانە جوانە بە ئیمزای بەرز و پیرۆزمان ڕازایەوە و نەخشێندرا، ئەوا فەرمان سەپێندرا. بە فەرمانی بەرزەیانە خوای بەرز بەرزتری کا و هەتا هەتایە بیهێڵێ و هەمیشەش دەڕمێندا بێ و دەستی کەسی پێ ڕانەگا.

لە بیستی سەفەرە مانگی ئاخر خێر و لە باو خۆشی ساڵی نۆسەد و سی و نۆ نڤیسەرا.

دوای وەی کە سەرچاوەی بەزەی ڕەوان و ڕوونی شاهانە ئەو فەرمانە جوانەی دەڵاند، شەرەفخان جگەرگۆشەکەی -کە میرشەمسەدینی ناوبوو- لە ئیختیمارەوە هێنا و ڕەگەڵ پیاوەکانی شای خست. ئاڵای لەشکری پادشا ڕووی کردەئازربایجان و لە پاتەختا حەسایەوە.

لەو بەینەدا خەبەریاندا کە عوبێدخانی ئوزبەکی، خوراسانی بەرخۆ داوە و وا نزیکەی ساڵێکیشە لە دەورەی شاری هیراتە و بارام میرزای خستۆەتە ناو تەنگانەوە و پیاوەکانی بارام میرزا لە برسانا هەر چەرمی کوڵاو دەجاون! بەو باسە چەرم برژێنە، شا شڵەژا و میرشەمسەدینی ناردەوە و نامەی پڕ لە دڵدانەوەی بۆ شەرەفخانی نووسین و کاروباری ئازربایجانی پێ سپارد. هێندێك میری قزڵباش وەك: هەڵهەل سوڵتان عەرەبگیرلوو و ئوەیس سوڵتانی پازوکی و ئەجەل سوڵتانی قاجار و ئەمیربەگی مەحموودی و مووسا سوڵتان -کە سەرپەرشتی تەورێز بوو- ڕایسپاردن کە ببنە یار و هاوکاری و

هەرگا لە دوی هەرکامی نارد و کۆمەگی لە کیّ داوا کرد، زۆر زوو بـە دەنگیـەوە بـچن. خۆیـشی بـۆ کێشەی عوبێدخان ڕووی کردە ئالی خوراسان.

لە باوکی خۆم بیست دەیفەرموو: کاتێك کە من مالاواییم لە شاتۆماسبێ دەخواست، فـەرمووی: بچۆ بە باوکی خۆت بلیّ هەتا ئێمە لە لای خوراسان دینەوە، هەر چۆنێك بیّ دەگەلّ عوسـمانیاندا ڕێك بیّ و تێکی نەدا؛ چونکە ئۆلّمە دوژمنیـەتی و لـە بـیّـفـەری و کـەتنگێری و دووزمانیـدا لـە دنیـادا بیّوێنەیە. لەبەر چاومە دنەی عوسـمانی لێدەدا و تووشی گێچەلێکی دەکا. بەلام شـەرەفـخـان گـویّ نەدا بەو ئاموژگاریە باشانە و ویستی تۆلّە لەو کوردانە بکاتـەوە کـە هاوسـای بـوون و وەخـتی خـۆی چووبوونە لای فیل یاقووب پاشا و ئۆلّمەی و هاتبوونە بدلیس گرتنیّ. چووە سەر مـیرداودی خێزانـی و ناوچەکەی لیّ تالان کرد و سیّ ڕۆژانیش دەوری قەلای خێزانی دا؛ کە میـرداودی تێدابوو. لە هـەر دوو لا چەند بریندار و کـوژراویش هـەبوون. لـە پـڕ دەنـگ و بـاس داکـەوت: ئۆلّمـە گەیـشتە بدلیـسیّ. شەرەفـخان قەلای خێزانی واز لیّ هێنا و گەڕایەوە. لە سەر ئەوە میـرە خەیانـەت بارەکـان تـەواو لـە شەرەفـخان سلّ بوون و بە کۆمەلّ چوونە لای ئۆلّمەی. هەر لە ناو ڕۆژەکیانیشدا ئەمیربداغی کیـسانی و برایـماغای بلّباسی کوڕ شێخ ئەمیر وقەلەندەراغای فرزەندی مـحەمەداغای کەلـهۆکی و دەروێـش مەحـموود کەلّەچێری لە شەرەفـخانیّ زیز بوون و تەکیانداوە تەك ئۆلّمەوە.

**پوختەی ئەمەس:** دیـسانەوە دەهـەزار چـەکداری پیـادەو سـوار و تفـەنگوان و کـەوان بەشـان بـە سەرکردایەتی ئۆلّمە و بە کۆمەگی فیل یاقووب و بە هاوکاری ئەو کوردانـە، دەپـایزی سـالّی ٩٤٠.ك (١٥٤٣.ز)دا بە ڕێگەی ناوچەی خێزاندا لەشکریان بـەرەو تاتیـك هـات و لـەو دەمەشـدا چـەکدارانی شەرەفـخانی لە پێنج هەزار پتـر نەبوون. ڕاسپێری شاتۆماسبی هاتە بیـریّ؛ ویستی ڕوو بکاتە ئالەتاغ و ئەلشکوردیّ و پیاو بنێریّ مووسا سولّتان و میـریتر لە تەورێزڕا کۆمەگ و هیمداد بنێـرن و ئەوسـا دەگژ ئۆلّمە ڕاچیّ. بەو بیـرە ئاغای ڕۆژەکی ملیان نەدا و بە تایبەتی سەیدی عەلیاغای پرتـاقی -کـە لەو دەمەدا هەمەکارەی شەرەفـخان و ڕیش چەرموگی ڕۆژەکیان بوو- بە سەررەقی و هیچ نـەزانی لـە کـۆڕی دیوانـدا گـوتی: ڕۆژەکـی ئەگـەر دەخۆیـان ڕانـەبینن کـە بەگـژ ئۆلّمـەدا بـچن، مـن فەلـە و هەرمەنیەکانی ولاتی بدلیس کۆم دەکەم و هەر بەوان ئەو شەڕەی دەکەم! شەرەفـخـان لەمـەڕ زانیـاری

ڕەمل و ئەستێرە ناسیەوە دەستێکی زۆر باڵای هەبوو؛ گوتی لە ڕەملم ڕوانیوە، ئەمجار پلەی بەختی ئۆڵمە زۆر لە سەرە و چارەنووسمان بەرەوژێرەو داکەوتووە؛ بە هیچ جۆرێك ڕەوا نیە لەم دەمەدا دەگژی ڕاچین. بەڵام چەنە بازی زۆر و هەر و گیفی ئەو کوردانە ئامۆژگاری وەبن خۆ دان و پێیان چەقاند کە بەو لەشکرە کەمەوە دەگژ ئەو هەزارە زیلەی ئۆڵمە و فیلە و کوردان ڕاچن!

ئۆڵمە گەیشتە تاتیکێ -کە سەر بە ناوچەی بدلیسە- و هەر دوو لەشکر لەوێندەرێ تووشی یەك بوون. ئۆڵمە پشتی لەشکری خۆی دابووە کەژ و پێشەکەشی زەمینێك بوو هەرزنی لێدا چنابوو. شەوێ ئاوی تێکردبوو، ببووە قوڕ و ڕیزی لەشکری خۆی ڕانا، ینگیچەری و کەواندار کردبووە دوو قۆڵ و لە ناو دڵی لەشکریدا جیێ کردبۆوە.

شەرەفخانیش لە هەمبەر دوژمنی خۆیدا ڕیزی لەشکری خۆی ڕانا و چەکدارەکانی ڕۆژەکی بە بێ ئەوە زۆری دژ و ڕژدی جێگەی بێننە بەرچاو، بە فیز و دەخۆڕادیوی هێرشیان برد و لە هەردوو لا لاوانی لە شەڕ سەرخۆش و کفن پۆش و شیر وەشێن و شێر گورێن، لەو دەشتەدا مەحشەریان بەرپا کردبوو. تۆز و تینی شەڕ و گەڕان ببووە هەور و خوێنی گەرمی لێ دەباری.

| | |
|---|---|
| لە دوو لاوە لاوانی کوردی نەبەز | بەگژ یەکترا چون لە دەشت و ڕەوەز |
| سمی یەکسمان ئاگری هەڵدەکرد | لەهی خوێنی گەش لاش و کەللەی دەبرد |
| کەمەند هەژدیها بو دەهاڵا لە مل | وەبەر خۆی دەدان هەر هەلەی سی و چل |
| مەتاڵ ببووە سندانی ئاسنگەران | درینگەی دەبیسرا لە زۆر هەندەران |
| لە بەر ڕێژەو و گێژەوی تیر و شیر | ئەگەر مار هەبا دەچوە ناو پەلکە سیر |
| تفەنگ دووکەڵی ببووە هەورێك لە بان | برووسکی دەدا دووخی تیخی دەبان |
| لە گشلا مەرگ دادەباری بە تاو | لە گەرمی شەڕێ توانەوە جەرگ و ناو |

لە جەنگەی ئەو هەنگامەدا و لەو تەنگانە بە سامەدا -کە هەموو مەردێکی گەڕناس لێ ڕابوو یان سەری خۆی بدۆڕێنێ یان ئەو شەڕەی بەرێتەوە- ئەمیربەگی مەحموودی کە سەرکردەی باڵی ڕاستی لەشکری شەرەفخانی بوو، کوردەناموسی بەرپێدا و پەڕۆی شینی بێ‌ناموسی لە دوڕ هەنیەی خۆی گرێدا

ئەمەگیان هەر نەبوو یان تۆمی فەوتا　　　پڕ و پووچە ئەگەر دیشت لە خەوتا

بە خۆی و هاوکارانیەوە لە شەرەفخان هەلگەڕاوە و گەیشتە سوپاگەی ئۆلمەی! بە هەلکەوت لەو دەمەشدا گوللەی تفەنگ شانی چەپی خانی پێکا و تێك هەلگلا و خۆی لە سەر ئەسپ بۆ نەگرا و دەستی جلەوی شل بۆوە. ڕۆژەکی کە ئەمەیان دی، هەر یەك بە لایەکدا هەلات. لەو ڕۆژەدا حەوسەد پیاوی پالەوان و لەشکرشکێن دەخوێنی خۆدا شەلال بوون؛ پێنجسەدیان لە ئەمیرزادەو ئاغایانی ڕۆژەکی بوون کە دەگەل سەیدی عەلیاغای بریکار سەریان تێدا چوو. سەکر بەگی کوڕی و هێندێك لە ڕۆژەکیان بە دیل گیران. ئۆلمە لە پاش شەڕ بردنەوە، هەر لەوێوە ڕووی کردەوان و وستانێ و پێی ئەنایە ناوچەی بدلیس. مندالێ و مەزنی ڕۆژەکیان ئەم کارەساتە گەورەیان لە سەیدی عەلیاغا زانی و بە تووك و نەفرین و جوێنان بەری بوونێ و نزای خەلکی لێ گیرابوو بۆرە خزمێتی فەوتان و هەموو کەسیان دوابڕاو بوون.

شەرەفخان کە شەهید کرا، تەمەنی لە چل بەولاوەو تەکی دابوو بە پەنجاوە. سی سالێ پتر فەرمانڕەوای سەربەخۆ بوو؛ میرشەمسەدین تاقانەی بوو؛ کە لە کیژی عەلی بەگی ساسۆنیەوە خودا دابووی. بووکەکەشی کەنیشکی محەمەد بەگیحەزوی بوو؛ کە خۆی بۆی خواست. حەو شەووڕۆژ بەزم و ئاهەنگی بۆ گێڕا و ئاهەنگ لە گۆك مەیدان گیرا؛ نەیهێشت هیچ شتی ناڕەوا و پێچەوانەی دین و ئایین لەو بەزمەدا بێتە کایە و هەرچۆنی شەرع فەرمووبووی و شوێنی موسولمانەتی بوو، ئاوا کرا. بەلام تەرزە نان و خوانێك ڕازایەوە کاکێشانەکەی ئەو سەرە هەزاران چاوی داچەقاند و لە دوورەوە تێی ڕادەما و هەسێرەی جگەرگۆشەی خۆی بۆ شاباش پێشنیار دەکرد و گولێ ئەستێرەی دادەباراند. خێوەت و کۆن بە هەزار جۆر نەخش و نیگار خەملێنرا بوون و هەزاران بۆ گولێ و ریحان بۆ بۆ ویەرامە چێنرابوون و بە سەتان تام شێو لێنرابوون. میرانی مەزنی کوردستان سەیدمحەمەدی هەکاری و شاعەلی بەگی بۆتانی و مەلیك خەلیلی ئەیوبی و حەسەن بەگی پالوهی لەو زەماوەندەبەشدار بوون و زۆری پێ گەش و دلشاد بوون. ئەو سەردەمە گەمەی لاوانی کوردستان گۆیێن و کاشۆبازی بوو؛ یا خۆ



کاڵتەی قەبەقێن[1] بوو. هەروا یاڵتە بەکەزێڕ بوو بە شاباش و بەخشش دەدرا. لە پاش تەواوبوونی گۆوەند، پێشکەش و جیازی زۆر نایاب درا بەو میر ومەزنانە و بە دڵخۆشی گەڕانەوە.

میرشەرەفخان خراپەی لە بیر نەدەچوون؛ هەر کەس لە ساڵ و زەمانان دەگەڵ باب و کاڵانیشی ناهەنجاری لێ ڕوودابێ، دەسەریانەوە نەدەچوو؛ تۆڵەی خۆی لێ دەکردنەوە. بۆ نموونە شائیسماعیل چۆلاقخالیدی پازۆکی کردەسەرداری کوردستان و ئەویش مەڵبەندی ئوچکانی لە ناوچەی مووشێ دابڕی و خستیە سەر ناوچەی خەنووس و دای بە ڕوستەم بەگی برای و زۆری زۆری لە هۆزی ڕۆژەکی دەرکرد و زستانان لە ئۆچکان دەژیا. ساڵی نۆسەدوبیستودوو لە چلەی زستان و سەرمادا، تفت هەڵاویتبا دەیبەست و هاڵاو لە دەم دەرکەوتبا هەردەم و دەست وەهای دەبەست بە ئەڕدێن و سمێڵەوە خلەی دەهات، سمۆرە ئێزنگی دێنا و بەراز پووشی سەر یەك دەنا و قەقنەس باڵی بۆ لێك دەدان، کە شاوری دزانە هەلکەن و تۆزێکیان گەرم بێتەوە، میرشەرەفخان کێسی هێنا و هەزاروپێنجسەد جحێڵی ڕۆژەکیانی تەیار کرد و هەموو لاکان[2]یان کردەپا و ڕوستەم بەگیان پەلامار دا. ڕوستەم بەگیش و دوو کوڕی و چوارسەد زەلامی پازۆکی زۆر ئازایان لە ناو بردن. کوت و کوێرم ناپارێزم، شێر و خەنجەریان هەڵکێشاو بەربوونە گەورە و گچکەیان و جوقەواریان لێ نەهێشتن. هێندێك لە دەستیان دەرچووبوون، چووبوونە ئەشکەوتێکەوە کە لە لای قەڵای ئۆچکانە. ئەوانیشیان بەدووقانگ داو لە دووکەڵدا خنکاندیانن. نووسەری ئەم ڕووپەڕانە لە دۆستانی خۆی بیستووە گۆیا تەنیا پیرێژنێك چووبووە بن هەمبانێکەوە و لەو پازۆکی قڕانەدا تەنیا هەر ئەو ڕزگار بووە. تا بەم جۆرە سزای کردەوەی ناڕەوای ئەو پازۆکیانەی دایەوە! ماڵ و مناڵیان هەرچی بوو بە دیل و تاڵان هێنانی و بە بێزیان گەڕایەوە.

ساڵی سی و نۆ[3] لێ بڕابوو قەڵای ئیختیمار وەستێنێ. ئەو قەڵایە لە مابەینی دەریاچەی وان و

---

١- دەڵێ «قبق انداختن» واتا: کورولەکە هاویشتن؛ کە ئەم گەمەیە نەبیسراوە. ڕەنگە هەر تۆپێنی نیاز بووبێ. هەژار

٢- لاکان پێڵاوێکە بۆ سەر بەفر لە شوڵ دەیچنن و وەك ناڵێکی گەورە وایە و ئەوعە «ئیسکی»یەکە؛ بۆتانی «لیسان»ی پێ دەڵێن. هەژار

٣- لە ماکە فارسیەکەدا: تسع و ثلاثین واتا: ٣٩ نووسراوە. عەونی ٩٣٩ی نووسیوە. ڕۆژبەیانی دەڵێ ڕەنگە ٩٣٩ بێ. من لام وایە «تسع‌مایە و ثلاثین» بووە و مەبەستی ساڵی ٩٣٠ بێ؛ چونکە مێژووی فەرمانی شا ٩٣٩یە و دەڵێ هەر چووە سەر خێزان و لە بەر ئۆڵمە وازی هانی و لە چلیشدا کوژرا. دەشڵێ ساڵی ٩٣٨ کوڕی ناردەئیختیمار ←



ئەرجیشە و هەر زۆر لە مێژینەشەوە بە دەست ڕۆژەکیانەوە بووە. پاشان میـرەکانی شەنبۆ دەستیان بە سەردا گرتبوو. چەند کەشتیەکی ئامادەکرد و بە زۆرداری قەلاکەی لە دەست دەرێنان. ڕوستـەم بـەگی کوڕ مەلیك بەگی هەکاری -کە فەرماندارى قەلا بوو- گوللەیەك پێکای و کوژرا. فـەرمانڕەوای بـۆتی بە زۆر ئەسعردی وەبەر خۆ دابوو، شەرەفخان لێی ئەستاندەوە و دایەوە مـەلیك خـەلیلی فـەرمانڕوای حەسەنکێفا. هەر وەك بەرێش لە چیرۆکی ڕێك و پێکدا باسی کرا، ناوچەی ئەرزەنی لە چنگی مەلیك خەلیل ڕزگار کرد و نایە مشتی مـــحەمەد بـەگی ساسـۆنی. ئەوسـاش کـە هـۆزی مەحـــموودی بـە کۆمەگی قزلباشان چوونە سەر عیزەدین شێری هەکاری، شێخ بلباسی نـارد و مەحـــموودی لـە کـۆڵ کردەوە. وەك گوتیشمان کاتێ کە ئورکەمز سولتان سەرکردەی قزلباشی وان، عیوەز بەگی مەحـموودی گرت، بە زۆری پێی بەرهەلدا کرد.

بۆ خێر و خێرات کردنیش مزگەوتێکی زۆر لەبار و فێرگەیەکی زۆر تەیار و دەروێشدانێکی نازداری هەر لە بدلیس بنیاد ناوە و ناوی ناون «شەرەفییە» و ڕاستەبازاڕ و خانێکی دوو نهۆمی گەورە و چەند گوند و مەزرای زۆر بـاش و چـەند دووکـان و ئاشـێکی هەمیـشە گـەڕ و بـەهرە فـرەی کردەوەقـف و سەرپەرشتی ئەو وەقف و زەوی و زارانـەی داوە بـە وەچـی نێرینـەی، هـەتا دنیـا دەبڕێتـەوە. لـە لای مزگەوتە گەورەکەی شەرەفییە جێ گۆڕی بۆ خۆ دیاری کرد و کە مرد، شابێگی خاتوونی ژنی -کـیژی عەلی بەگی ساسۆن- گونبەزێکی لە سەر کرد و سەریشی گرت. لـە دراوی مەوقووفـەجاتێ، قورعـان خوێن بە کرێ گیـراون هەموو بەیانی و ئێواران لە سەر گۆڕە پیـرۆزەکەی خەریکی قورعان خوێندنن.

## هۆی چوارەم:

### ژیننامەی میرشەمسەدین، کوڕی شەرەفخان

ئەوانەی پیتۆڵ و ژیرن و دوور دەبینن و لە سەر بیـرن و بە چاوی دڵ تیـشکی بـەزەی خوایـان دیـوە و مێشکیان بەژەکی یەزدانی پەروەریوە، لایان ڕوونە هەر کەس خودا دەستی بگرێ و نیـازی بـێ بـەرزی کاتەوە و وەی لاوێنی و دڵخۆشی کا و خەمی لە بیـر بباتەوە، هەروا لە چاولێکنانێکدا تـاجی بـەختی

---

→ کە دیارە هی خۆی بووە. هەژار

لە سەر سەر و لە سەر تەختی کامڕەوا بوونی ڕادەنێ و لە بەرچاوی هەموو کەسێ خۆشەویست و جوان و ڕندەو جێی بڵندی بۆ دادەنێ و خودا بە دەستی توانای خۆی، ڕایدێنێ و دەیپەروەرێنێ و کە فەرموویە «چل بەیان هەر بە دەستی خۆم قوڕی ئادەمم شێلاوە»، ئەم نیازە دەگەیەنێ کە بۆ مرۆ جوانی و شکۆ و بەختەوەری و تێری و نیز، خاکەسەری و کرژی و خاوی و لەز و سستی و بەزەوقین و بەرزی و پەستی و تۆڵە و بەخشین، ساردی و گەرمی و خۆشی و ترشی پەیدا دەبن. گشتی هەر دەسکاری وین و بۆ فەرمانی ئەو سەرنەوین.

کە فەرموویە «بۆیەم ناردی کە دنیات لە بەر وەحەسێ»، فەرمووشیەتی «هیچ شتێك بە دەس تۆ نیە»، مانگی چاردەبەو جوانیە -کە نۆبووکی عاسمانیە- کیران و پەڵەی دێتە سەر. بەهاری واخۆش و ڕەنگین پاییزی سارد و خەمگینی بە شوێنەوە و رنوی بەفران -کە ڕێ دەبڕن- بە بای بەهار دەتوێنەوە و پنجە پووشی بابردەڵە لە زەنوێران دەڕوێنەوە. ئەوانە پەندن بۆ ئێمە و پەندەکەش زەحفە نەکێمە. دەستێکی لە پێوار هەیە ژاری و تەیاری بەش دەکا و بەختیاریت کاری ئەوە و ئەویشە چارەت ڕەش دەکا.

ژیننامەی پڕ لە هەنگامەی میرشەمسەدین، پاژێکە لەم مەبەستەمان. دەپێشدا لە شوێنی باوکی، بوو بە فەرمانڕەوای بدلیس و لە ئەنجامدا بەخت کۆمەگی نەکرد و سوڵتانی خەزاکەر ڕەنجا و لە نیشتمان ئاوارە بوو. درێژەی باسیش ئەمەیە:

لە دوای ئەوەی کە میرشەرەف لە تاتیکێ شەهید کرا، هۆزی ڕۆژەکی چوونە دووی و لە قەڵای ئیختیمارەوە هاوردیانەوە بدلیس و کردیانە فەرمانڕەوای خۆ و سەریان وەبەر باری هێنا و گیرودار و کاروباری دنیاداری خرا ناو لەپی لەباری حاجی شەرەف، کوڕی محەمەدئاغا کەلهۆکی. لە پاش ساڵێك و شەش هەیڤان کە فەرمانڕەوایی دەکرد، لە برانەوەی ساڵی ٩٤١.ك (١٥٣٤و١٥٣٥.ز) لە سەر دنەدانی ئۆڵمە، بە فەرمانی سوڵتان سولەیمانخان، ئیبراهیم پاشای سەروەزیر کرا بە سەردار لەشکر و ڕەوانەی ئازربایجان بوو.

کاتێ ئاڵای بەرزە باڵای لەشکری هەمیشە لە سەر، دیاربەکریان ڕۆشن کردەوە، شەمسەدین بەگ دیاری و پێشکێشی زۆر باشی بە پێشوازی پاشاوە برد. کاتێ گەیشتە سوپاگەی عەسکەری هەرگیز نەبەز و لە خزمەت پاشادابەزی، پاشاگەلێکی ڕێز لێ نا و بۆ خۆی لە بریکاری سوڵتان فەرمانی

فەرمانڕەوایی بدلیسی بۆ ئیمزا کرد و دەگەڵ لەشکری قەت ئەشکاو ئەویش ڕووی کردەتەورێزێ.
شاتۆماسب کە زانیەوە وا عوسمانی هاتوونە سەر، دەستی لە خوراسان بەردا و بە هەڵەداوان هاتەوە ئازربایجان. کە ئیبراهیم پاشابیستی شالە خوراسانەوە هات، زۆر بە پەلە پیاوی ناردەئاستانەی عاسمان ئاسایی سولتانی و پەیکی پاشاوەك ڕەشەبا ڕێی دەپێوا و بە نامەوە خۆی گەیاندەبەر بارەگا.
لە نامەکەدا نووسرابوو: شاتۆماسب خۆی دێتەوە و چەتری عاسمان ڕووشێنی تۆش لە عەجەمستان بێ باشە. ئیتر سولتانی خەزاکەر بۆ شەڕی ئێران کەوتە خۆ و لەشکری ئەوەندەساز داکە لە ئەستێرەی عاسمان و لە ڕەمل و گەڵای دارانیش زۆر پتر بوو. لە پاتەختی بێ چاوێنی ئەستەمبووڵێ وەدەرکەوت و بەرەو تەورێز جووڵەی فەرموو. هەردوك پاشالە مانگێکدا گەیشتنە ئازربایجان. ئەوسا سولتانی خەزاکەر -لە سەر دەستووری عوسمانی- پیکی وەسەر زوڕنای شەڕ خست و وای تێ تووڕاند کە پەردەی گوێی فریشتەی عاسمانیان دڕاند. دەهۆڵی تورکی شەڕانی، دار و بەردی دەهەژاند و زار و زورهانی دەبزداند. سولتان بە گوێی میرە زەلامەکانی کرد؛ ئەو کەسانەی کە زۆر جاران لە زۆر شەڕان سەرکەوتوون و کارامەن و لە کلی مەیدانێ دەرکەوتوون، هەمووی کردن بە پێشەنگی لەشکری بە زەبروزەنگی تا بە هەڵپە و گوڕ و تاویان و شیری جەوهەرداری تازەساویان زراوی عەجەمان بەرن و زۆر زوو بێ سەروبەریان کەن. ڕاستە و چۆپە و دوڕ لەشکری وەك شوورەی ئەسکەندەرتەنی و بە هەوای عیراق دەنگیدان. شاتۆماسب هات گەیشتە سولتانییە و سەر ڕێی سوپای سولتانی گرت. لەو دەمەدا قزلباشان هەر خۆ بە خۆ تێك بەر ببوون؛ سەر و خەمیان لێ شێوابوو؛ لە هەشت هەزار سواری پتر دەگەڵ شای ئێراندا نەبوو. لە بەر ئەوە بۆی نەدەکرا خۆ لە بەر سوپای وەك دەریای سولتان سولەیمان ڕابگرێ و بۆ شەڕ کردن پێ دابگرێ، ناچار بەرەو دەرگەزێن و هەمەدان چوو. پلەی سەرما لە خانەی پلەی تەرازوو شازدەدەرەجە تێپەڕی. لەشکری بەفر و کرێوە و بادەوە و بۆران و تۆفان -کەی کەم نیسەی کەم- داباری و ڕێگە و بانی واتاخنین کە لەشکری پێ و قەدەم خێری عوسمانی نەیدەتوانی هەنگاو بنێ و لە سەرمانا -سەرلە بەریان- وەك مێوژۆکە هەڵدەلەرزین. زیندەورێکی زۆر بێداد لە ڕۆمی و ئەسپ و کەر و چارەوێ و پەرواری لە هۆردووی پیرۆزی سولتان کەسیرە بوون و لە بەر سەرما و بەستەڵەك و بەفری زۆر و بژیوی کەم، بە هیلاك چوون. چونکە عەسکەری ئیسلامێ چاوێنی

کاری لێ کردن!

سوڵتان ناچار ینگیچەری و گرانباری لە تەورێز لە لای ئۆڵمە بەجێ هێشت و بەرەو ئارامگەی بەغدایە وەڕێ کەوت. محەمەدخان شەرەفەدین ئۆغڵی تکلو -کە سەرپەرشتی بەغدا بوو- هەر کە بیستی سولەیمان هات، وەك میرولە عەجەمانە کەوتە پەلە و پەلی ماڵ و منداڵی گرت و بەرەو شوشتەر و دەزفوولێ قاچاندی و ئاوڕی نەداوە. بە بێ هیچ شەڕ و خوێنڕێژی، سوڵتان بەغدای هاتە دەست و زستانی لەوێ گوزەراند.

شەمسەدین بەگ -کە ئەو بەینە هەر دەگەڵ سوڵتانێدا بوو- لە بەغدایە ئیزنی خواست و بەرەو بدلیس گەڕایەوە.

کاتێ سوڵتانی خەزاکەر لە خاکەلێوەی بەهاردا لە خەتی ئاڵتون کۆپریەوە ڕووی کردەئازربایجان و دەنگ و باسی گەڕانەوی بەرەو بارەگای شکۆدار لە گونبەزی ڕەنگاوڕەنگی عاسمانێ دەنگی دایەوە، لە پشت ئەخلات چیغ و چادری بەسبات و سەیوان و ساباتی پڕهات سەریان دەمانگ و ڕۆژ هەڵسوون. لە سۆنگەی گۆڵمەزی ئۆڵمە و وەزیرە پایەبەرزەکان، لە دووی شەمسەدین بەگیان نارد و لە دیوانی سولەیمانی تێیان گەیاند کە پادشاوی نیازە لێت بخوازێ دەست لە بدلیسێ هەڵگری و ناوچەی مەلاتیە و مەرعیش بە مولکایەتی وەرگری. شەمسەدین بەگ وەرامی دانەوە و فەرمووی: موڵك و سەر و ماڵی ئێمە هی پادشایە.

مەحموودعیمادان بایەکی -ئاغایەکی سەرناسی هۆزی ڕۆژەکی- کە لەو کۆڕەدا ئامەی بیست، ڕووی کردەشەمسەدین بەگ و هەر بە کرمانجی دواندی و گوتی: ئەگەر بدلیس داگیر کەن و ئاگردانی خانەدانمان کوێر کەنەوە، ڕۆژەکی ژینیان بۆ چیە؟ میرم ئەگەر تۆ لێمگەڕێی هەر ئێستە ئیبراهیم پاشای گەورە وەزیر بەم خەنجەرەم دەهەنجنم. هەر ئەمڕۆ و لەم دیوانەدا سەدوپەنجا ڕۆژەکی هەن؛ هەمووەمان لە ڕێی ئێوەدا گیانی خۆمان بەخت دەکەین و ژیانی دیلی و ناوی زیند و بەجێ دێڵین. میرشەمسەدین جوابی داوە: پادشاو وەزیر خراپەم دەربارە ناکەن سوچ و تاوان لە ئۆڵمەیە.

لە دوژمن بەخت و هات یەکلایەتی کرد دەنا فەرهاد گەلێك ئازایەتی کرد



بەکر بەگی ڕۆژبەیانی -کە سەرۆکی کۆیلەکانی دیاریەکر بوو؛ لەو دەمەشدا بە سنجەقی عەدلجەواز ڕادەگەیشت- کە هەڕەشە و گەفی کابرای بە گوێ گەیشت، ئەویش هەر بە کوردی گوتی: نەکەی بە قسەی کوردی نەزان بەلایەك بە سەر خۆت بێنی؛ بدلیسیشت لەدەس بچێ. هەر خۆت بێمزەڕەت بمێنی، زۆر پێ ناچێ دیسانەوە دەیسێنیەوە.

کاتێ جوابی دلسۆزانەی شەمسەدین بەگ بە خزمەت پادشاگەیشت، خەلاتی شاهانە و ئەسپی بەزین و لغاو و ڕەشمە و زریزەی زێڕەوە و پسوولەی فەرمانڕەوایی مەلاتیەی بۆ هاتە دەر؛ بدلیسیش درا بە ئۆلمە. شەمسەدین بەگ قەلاکانی ولاتی بدلیسی چۆل کرد و نایە مشت کارگوزارانی سولتان. پازدەکەسی لە سەرناسانی ڕۆژەکی پێش خۆی ناردەمەلاتیە. دوای وەی کاروانی بەودمی بارخانەی سولتان کۆچی کرد، شەمسەدین بەگ مال و خاو و خێزانی برد و نیازی بوو بە ڕێی ساسۆندا بەرەو مەلاتیە بچێ؛ ئەو سەردەمە سولەیمان بەگی عەززانی -میری ولاتی ساسۆن بوو- چوونەکەی شەمسەدین بەگی بە دل نەبوو. کاتێ کە هەر خۆ بە خۆ بوون پێی گوت: لە خانەدانی ئێوەدا هەر تۆ ماوی کەلەبەرێ پڕکاتەوە. ڕۆمی بلحن؛ جێی متمانە و باوەڕیە نین. ئەگەر شرت و گومیان کردی، ئەوسا خانەدانی بدلیس ئاسەواریان دەبڕێتەوە. ئەو قسانە ترسێکی زۆری وەبەر نا و لە مەلاتیەی دوودل کرد.

وا هەلکەوت لەو دەمەشدا شاتۆماسب لە ئەرجیش بوو؛ مونتەشاسولتان و عەبدوللاخان و بەدرخانی ئیستاجلووی هەر سێك ناردن مووش و ئەخلاتی تالان کەن. ترس هەبوو کە لەشکری قزلباش دەربێکی باش لە هۆزی ڕۆژەکی بدەن. ناچار بیری مەلاتیەی گۆڕی و یەکسەر بەرەو قزلباشی باداوە و هاتە بەر بەیداغی شاوە؛ ڕوی کۆچی خستە تەورێزێ و شەش ئاغای هۆزی ڕۆژەکیش ڕەگەل کەوتن. کە ئۆلمە بەم کارەی زانی، ترسا و بدلیسی بەجێ هێشت و لە شوێن سولتانی خەزاکەر خۆی گەیاندەدیاریەکرێ تا ماوەیەك قەلای بدلیس بێ خاوەن و دژدار ماوە. پاشان لە سەر پێشنیاری ئۆلمە، هەر چوار ناوچەی ئامورەك و خوێت و پوغناد و کرنج، لە بدلیس جوێ کرانەوە و ناوی سنجەقیان لێ نرا و دران بە ئیبراهیم بەگی کوڕی شێخ میری بلباسی. ئیبراهیم بەگ قەلاکانی ئامورەك و کەلهۆك و پوغنادی وەرگرت؛ بەلام بەختەکوێتی نەیگرت، دلی ئاغای ڕۆژەکیانیش وەخۆ بگرێ.

قەلەندەراغای لێ ڕەنجا و بە هاوکاری میرمحەمەد ناسرەدینی و دەدەبەگی قەوالیسی و چوارسەد چەکداری ڕۆژەکی، لە میرلیواکەی بدلیسیێ یاخی بوون و خێزان وماڵیان بار کرد و لە زێدیان ئاوارە بوون و ئەویش بۆ ئازربایجان چوون.

لە پاش هاتنی ئەمانە شائۆماسب ناوری لە شەمسەدین داوە و ناوی نا شەمسەدین‌خان و وەکوو میرە مەزنەکانی دەخوێندەوە. سەراب و چەند شوێنیتری پێ سپارد و پاشان ناردیە سەر مەراغە و سەردەمێکیش دەماوەند و دارەلسەرزی دایە و سەرئەنجام بەهرەی جەهرورد و گریهرورد و فەراهانی عیراقی بە مووچە لە بۆ بڕیەوە. شەمسەدین‌خان زۆربەی کاتی -لە زۆزان و گەرمەسێران- لە خزمەت شادا ڕادەبوارد. نزیکەی سەتوپەنجا کەس لە ڕۆژەکیان چوونە ڕیزی پاسەوانە گەورەکان و نۆبەچییە خاوەن پایەکان. دوو لەوانە -کە شێخ ئەمیری بلباسی و دەدەبەگ قەوالیسی بوون- پایەی بەرزی سەرلقایەتیان درایە و بەو پلە سەرفراز کران.

دوای کۆچی قەلەندەراغا و دەدەبەگ و میرمحەمەد، خوسرەوپاشامیری میرانی دیاربەکرێ لە ئیبراهیم بەگ دردۆنگ بوو؛ ناردی کە بێتە دیاربەکرێ. ئیبراهیم بەگ لە خۆی ترسا و خۆی لە قەرەی پاشانەدا و قەڵاکانیشی دابەستن. کاتێ ئەم دەنگ و هەواڵە دەدەورویەری بەرپێچکی تەختی خودان بەخت هاڵا، فەرمانی لە بان سەرانی بۆمیرانی کوردستان نارد هەموو وێکڕا بچنە سەر ئیبراهیم بەگ و دەردەستی کەن. ئەو میرانە لە سۆنگەی ئەو فەرمانەوە، دەوری قەڵای کەلهۆکیان داو دەبرایم بەگیان هەڵپێچا و هێچکیان لێ وێك هێنایەوە و هێندیان تەنگە پێ هەڵچنی خۆی کردەدۆستی دوژمنی و داوای ئاشتی و هێمنی کرد و قاسم‌ئاغای برای خۆشی نارد کە بچێتە لای خوسرەوپاشاو داوای بەخشینی بۆ بکا. پاشافەرمووی: خۆی بێتە لام تا بیبەخشم. برایم بەگ زاتی‌نەکرد خۆی دەداوی پاشابخا. ئەمجارە شێخ میری برای ناردەلای ئەو ئەمیرانە کە دەوری قەڵایان دابوو. ڕووی لێ نابوون کە شێخ میری بگەیەننە خوسرەوپاشاو پێشی بڵێن کە چەند ڕۆژێك مەودا بدەن و دەوری قەڵاکەم چۆڵ بکەن ئەوسا بە خزمەتی دەگەم و هەر چۆنی فەرمووی وادەکەم. ئەمیرەکان لەو بارەوە پرسیان لە خوسرەوپاشاکرد. ملی نەدا و قاسماغای بە سزادانەوە لە شاری دیاربەکرێ کوشت و فەرمانی بۆ میرەکان نارد کە شێخ ئەمیری براشی بە دەردی قاسماغا بەرن و



دەستیش لە قەلا هەلنەگرن. شێخ میرلە دۆستانی خۆی بیست کە دەبێ چی دەگەڵ بکرێ، نوێژی شێوان بە بیانووی دەسنوێژ هەلگرتن لە کۆڕی میران دەرکەوت و خۆی هاویشتە مێشە و لێڕ و ڕای کرد و چووە ناو هەکاریان و لەوێشەوە بەرەو قزلباشان ڕەوی.

برایم بەگ کە زانیەوە قاسماغای برای کوژیاوە و شێخ میرلەو ناوە نەماوە، لە کەلەهۆکێی گوێزایەوە و چووە ناو قەلای ئامورەك و لەوێش حەجیمی بۆ نەما و ڕای ئێرانی گرتە بەر و پەنای بە قزلباش هاورد. گەمارۆ دراوەکانیش دەستە و دامانی میران بوون کە دەس لە خوێنیان بشۆرن. بە هۆی بەهائەدین بەگی حەزۆ، چاویان لە تاوانیان پۆشی و بە سلامەتی دەریانکردن و هەر سێك قەلا وێران کران.

شاتۆماسب و شەمسەدین‌خان ڕوویان بە برایم بەگ نەدا. لە دوای دوو ساڵ هەمیسان هاتەوە ڕۆمێ و شیروکفنی دەستۆ کرد و خۆی هاویشە ژێر سەر ڕێسمەی دەرگای سولتانی خەزاکەر (سولەیمانی دووەم). لە بەر تیشکی بەزەی سولتان گوناهەکانی توانەوە و سنجەقێکیان لە ناوچەی ڕۆمئێلی دایە و هەتا مابوو هەر لەوێ بوو؛ لە دواییدا چەند کۆیلەکی خۆی کوشتیان.

شێخ ئەمیرسەر لە هەوەڵێ زۆری چاکە دەگەڵ کرا و یەکجار زۆری ڕێز لێ نرا و کرا بە سەرلقی بەرزی پاسەوانەکانی شایی و لە دواییدا ئەوەندەی تریاك دەکێشا بە جارێك تامی خۆی بڕی و لە بەرچاوی شاو سوپایی و هۆز و خزم و خۆیی کەوت و هەموو کەس لێی دەتەکیەوە. ساڵی ٩٦٥.ك (١٥٦١.ز) کە منی هەژار کردبوومە بریکاری خۆم، لە شیروان عەمری خودای کرد. دەدەبەگیش لە سەرلقی قۆڵچی تارانیان دەرکرد و وێڕای چڵ قۆڵچی ڕۆژەکی بریکاری و خزمەتکاری باوکی بەڕێزمی دەکرد و ساڵی ٩٥٦.ك (١٥٥٥.ز) لە کوردستان شەهید کرا.

شەمسەدین‌خان یەکجارەکی لە هەمدەمی شاوەڕەز بوو؛ خۆی کردە گۆشەنشین و وای نەدەکرد کەس بیبینێ. سەد تمەن -کە دەکاتە دووسەد هەزار ئاقچەی دراوی عوسمانی- لە باجی شاری ئیسفەهان بە مووچە بۆی بڕایەوە؛ حوکمی تەرخانیشیان دایە. بکە و مەکەی لە سەر نەبێ، دەساڵ لەو شارەدا ڕایبوارد.

کە شائیسماعیلی دووەم لە دژی قەهقەهە دەرکەوت و لە قەزوێن نیشتە بان تەختی پادشایی ئێران



زەمیـن، ناردیە شوێن باوکی بەرێزم و بردیە قەزوێن. تەواوێك بە ناودا چووبوو؛ شێستوحەو پلەی لـە پەیژەی تەمەنی وەبەر خۆ دابوو. زۆربەی کـاتی مـــمبارەکیان بـە کـوڵ و کەسـەر دەبـووری و دەردی سوختە و شیلە و نیگار و تریاك کێشانیش مێشکیان وشك هەڵێنابوو؛ نەیدەپەرژا هاودەمی خونکاران بکا و تێکەڵی کەسی نەدەکرد و هەر هۆگری تەنیایی بوو.

هەتا دڵ بیـری تۆی بێ، کێی لە بیـرە؟      دڵ و مێشـك بـــە بـیـری تـۆوە گیـرە

تەمی لێك دووری و جودایی کوڕ و کیژان و خزمان و هەموو هۆزی ڕۆژەکیانی لێ هاڵابوو؛ ژیانیان لێ تاڵ کردبوو. بە هەڵکەوت ئەو کاتەی کە هاتـە قـەزوێن، زار و زیـچی گـەورە و گـچکە و پیـاوی سەرناسی ڕۆژەکی لە قەزوێن بوون. پێیان شاد و شوکور بۆوە و بە دیداریان گەشایەوە.

هەر لەو سەروبەندانەشدا بەرەبەرە دایە باری زەبوون بوون و هێز و گوڕی بە ناسازی باری کرد و لـە کەنەفتی پەکی کەفت و بانگەوازی «وەگەڕێ بۆ لای خودای خۆت! ڕازیت دەکا»ی بـە گۆشـی هۆشـی شنەفت و مزگێنی «ژیانی خۆشە و ها لە بەهەشتی بەرزدا»ی بە دڵ بیست و گەلێکی لە گیانی خۆش هات و هەر لە قەزوێن غەمنامەی ژینی سوتاند و لە سیایی بەهەشتا نووسرا.

کـەس ناشێ لە چنگ مەرگ ڕەها بێ      وا هـاتـــووە، هـەر ئـەشێ وەهـا بێ<br>
ئـەم ڕێـگـەیە ڕێـڕەوی هـــەمــانـە      گـۆڕخـانـەیـە کـۆڕی هـاودەمـانـــە<br>
ئـەو گـــەیـیە بەهەشت و جێگەخۆشە      بۆ ئێـمە نـــەمـانی جـێـی پـەرۆشـە

دوو کوڕی هەبوون: یەکیان شـەرەف کـە ئـەم پەڕانـە دەنووسـێ، دووەم خەڵـەف بـەگی نـاوە کـە سەردەمێك نۆبەچی شائیسماعیل بوو؛ چەند ساڵێکیش بە شانازی پلەی سـەرلقی درایـە. زۆر دۆسـتی هەمزەمیـرزاش بوو؛ لە پاش ئەوەی میـــرزا کـوژا، سـەری هێنـا بـەر فـەرمانی سـوڵتان مرادخـانی خودابەخشیو. بە پلە و پایەی سنجەقداری ئەلشگورد و مەلازگردێ سەرفراز بوو.

# کۆتایی

ژیننامەی منی هەژاری شکستەباڵی ژیانتاڵ، لە ڕۆژی لە دایکبوونەوە هەتا ئەمڕۆ، کە مێژووی کۆچ لە ساڵی هەزاروپێنج دایە.

منم وەك گۆ لە مەیدانی جیهانا ... بەرانبەر چارەنووس بێهێز و توانا
تلاوتسلمە و لەبەر کاشۆ دەکەم ڕەو ... نە ئارامم هەیە ڕۆژ و نە شەو خەو
بە بیرما دێ بەسەرهاتی ژیانم ... هەلێك دڵخۆش و سەد جار دڵ بە ژانم
مناڵ بووم خۆ نەگرتوو شلك و ساوا ... بە ناز دەژیام لە باوەش دای و باوا
لە پشتی بێشکە نەمدەتوانی هەستم ... گوناهیشم نەبوون، دەستیان دەبەستم
چەچسەم هێزی نەبوو بیکەم لەمەم گیر ... دەمم ڕاهێندرا بۆ مژتنی شیر
بە گاگۆڵکە لە ڕۆیین ڕادەهاتم ... بەرەو پیری بەرەو پیری دەهاتم
بە پا ڕامیان ئەگرت بۆ دارە دارە ... کەم و کوڕ ڕادەوستام لارە لارە
بە پەیتی بوومە خێوی باز و هەنگاو ... لە خاوم خستە دەر بەژن و لەشی خاو
درامە دەستی ماموستا کە فێر بم ... وەکوو بەرخێك نەبم بمخۆن و شێر بم
ئەلف بێ تازە بێنە و کۆنە لابە ... ڕەوانت بێ و لە بەرکە ئاریّ بابە
بە داری ئەو لە زانیین بوومە دارا ... لە بەرچاوم تەمی تاریکی تارا
لە سیسپارە و لە وردەو پردەدەرچوو ... زەمانی سوختەییشم زوو بە سەرچوو
هەمووم زانیین لە زانستی دیاردە ... هونەرمەندێك ڕەنێو هاتم بژاردە

***

دڵم کورکاندی بۆ دەروێشی کردن ... کە لێم ڕوون بن دەراوی ژین و مردن
بەزەی خواهات و ڕایکێشادەسی دڵ ... لە گڵ دەرچووم و گوڵ بووم چوومە سەر چڵ

***

ئـەوێستـەش چـاوەڕێی کۆچباری مەرگـم | بـەرەو گـۆڕ تـێـك نـراوە ساز و بەرگم
لـە هـێـز و تـاوی لاوی بـەش بـڕاوم | مـنـەی کـز بـوون دەکـا سۆمایی چاوم
لـە دووردادوور دەهـۆڵـی گـوێ تەپەی دێ | کوتەی مەرگە و دپەیڤێ هەیـدێ! کەی دێ؟
ددان دەمـیان بە جێهێشتم تـەك و تـووك | لە ناو وێرانـە ورتـەی دێ پـەپووی پووك
ڕەشـانـگـی ڕیـشـی داپـۆشیم کرێوە | لــە لای خـۆم لاوە لای لاوان دزێـوە
لە کڕنوش بـۆ نـەمان پـشتـم چەمـاوە | لـە ئـاواتـی ژیـان چـم لا نـەمـاوە!

هەموو ژیر و زیدەزان و میـرزا چاك و خوێندەوارانی لە زەبر و زیت و دەبنەوەبڕ و دیـمەن کڕ، لـێم تێدەگەن کە نیازم لە ڕیز کردنی ئەم چەند کوچکە پێبازانە، شارەزا بوونی ڕێبوارە تا لە بواری زرێباری پڕ کوڵ و خەم و پەژارەی منی ژاری بێپەروپۆ، نەڕەونەوە و بپەڕنەوە و لەو ڕۆژەوە دنیای ڕوونـم بە چاو دیوە و بوومە هەودا و لە تەونی بێ ڕاهێڵ و پۆی ڕووی ئەم جیهانە کەونەدا تێوە دراوم و تێوە گـلاوم، هەتا وێستام کە لە شەکەتیان وەستاوم و چاوەنۆڕم کەی دەمکاتە بـڕە و بڕسـت و تـاوم لـێ دەبـڕێ و هەڵدەوەرم، لە بەر چاوانی ڕانێم و ژیننامەی پڕ لە هەنگامە و سەمەرەی من، لە نـاو گـۆرکی کـۆڕی گەرمی پیـرەپیاوان، خەمڕەوێن و لە شەونشینی لاواندا، خەوزڕێن بێ.

کاتێ باوی خاوەن ناوی منی هەژار، چارەنووس پاڵی پێوەنا و لە نیشتمانی دڵگیـر و زێدی بـاب و باپیـرانی هەڵوەدابوو، کەوتە عەجەمستانەوە؛ کیژی ئەمیـرخان موسلوی خواست؛ کە ئەو ژنە دایکـی منە. ئەمیـرخانی بابی داکم کوڕی گولابی بەگ، کـوڕی ئەمیربـەگ تۆقـات بایەنـدوڕە؛ کـە زەمـانی دەسەڵاتی حەسەن بەگی بایەندوری میـرێکی پایە پتەو و گەوێکی ئەو زنـجیـرە بوو. کە حەسەن بەگ لە قەرەباغ دەگەڵ سوڵتان ئەبووسەعیدی کورەکان بوو بـە شـەڕیان و ئـەوجارەش کـە دەگـەڵ سـوڵتان مـحەمەدخانی خەزاکەر لە سەر سارای بایبۆرتی پێك هەڵپڕژان، باپیـرم لە هەردوك شەڕان زۆر عەگید و گەڕناس بووە و کرابووە میـری ئەرزنـجان. هێمان شوێنەواری باشی -لە مەر مزگەوت و فێرگەوە- لەو شارۆکەدا هەر ماون.

ساڵی نۆسەدوچلونۆ (١٥٤٣.ز)، کە ساڵیش کەروێشکەساڵ بوو، ژینی دەربـەدەری بـاڤۆ تەمـەنی حەوساڵانە بوو. ئەم مرۆجاوە بێکارە و ئەم قەلەندەر و هەژارە لە ناوچەی قومی عیراقێ لـە شـارۆکەی

گریهڕودێ ڕۆژی بیستی ناو جێژنانێ لە ماڵی قازی ژدێ بووم. بەرەی ئەو ماڵە قازیانەی گریهڕوودی دەچنەوە سەر قازی شوورەیحی کووفەیی و لەوەتا ئاوارە بوون و لەو ناوەدا گیرساونەوە، هەمیشە پیاوی زۆر زانا و بەناوبانگیان لێ هەڵکەوتوون. من کە هەر لە شلکیمەوە تا ئێستا، کە پلەی ژینم چۆتە ئەو دیوی پەنجاوە و پاڵی بە شەستەوە داوە، هۆگری خوێندەوارانم و هاونشینی زانیارانم و هەرگیز خۆم لێ هەڵناواردون، لە پیتی نزای پیرۆزی ئەو بە ودمانەی دەزانم.

هەستە بە لەز خۆ بتەکێنە لە خاك ڕێت بخە سەر شوێن و ڕچەی پیاوی چاك
کێیە زیانبار بێ لە لای پیاوی مەرد؟ پاکۆی لای پاکە نە گەردە و نە دەرد

پادشاهی خوالێخۆشبوو شاتۆماسب کردبوویە خوو، منالی میر ومەزنانی لە تەمەنی بەرابیڕا دەناردەناو ئەندەروونی تایبەتی دەرباری خۆی و شانبەشانی شازادەو نەجیمزادەکان -لە ژێر چاوەدێری خۆیدا- دەبا پەروەردەبوونایە و لەوێ پێیان بخوێندرایە. بە فێرکاری بە ئاکار و دیندار و پسپۆڕ و زانا و دڵسۆزی دەسپاردن و لە تێکەڵی پیاوی هەرزە و دەست و دامێن پیس و نەگریس و زوان شڕی دەپاراستن. تا شلك بوون فێری قورعان و ئایین و خەت و سیوادیان دەکردن. کە لە خەمیش دەرەخسین و دەگەینە پلەی خۆناسین، فێری سوارچاکی و چالاکی و تیرئەندازی و شیروەشێنی و دام و دەستووری سوپایی و ڕەفتاری فەرمانڕەوایی و گەمە و یاری هونەراوی وەك جلیت و شەقێن دەکران. دەیفەرموو: نیگار بکێشن! دەس ڕەنگینی هونەرێکی بە بەهرەیە و فێرە سەلیقەتان دەکا:

خێوی دڵی پاك بەسەرتکاتەوە شادی بە پێك هاتنی ئاواتەوە
چاوێ بگێڕێ لە زەوی پیاوی چاك گوڵ لە دڕك دەردەچێ، گەوهەر لە خاك
تیشکی بەزەی پیاوی خودات وێ کەوێ ڕام بووە بەخت و لە بەرت نارەوێ

بە پێی ئەو باوە گۆڕینە، کە تەمەنی منی هەژار پای نایە ناو نۆ ساڵیەوە، یانێ لە ساڵ نۆسەدوپەنجاوهەشتا (١٥٥٢.ز) بریامە ئەندەروونەوە و شوێنی تایبەتیم پێدرا و ماوەی سێ ساڵ لە ژێر سایەی ئەو پادشاڕەوشت پاکە و لە ڕیزی خزمەتکارانی بە ئاکاریدا ڕامانبوارد.

ساڵی نۆسەدوشەستویەك باوکی پایەبەرز و گەورەم خۆی لە خزمەتی شابوارد و گۆشەنشینی

هەڵبژارد. گەلەکۆی هۆزی ڕۆژەکی ڕوویان لە شاتۆماسب نا کە منیان بەسەرۆ دانێ. پاشالە سەر تکای ئەوان -هەرچەند دوازدەساڵانەش بووم- پلەی میرایەتی دامێ و سالیان و مەحموودابادی لە ناوچەی شیروان پێ بەخشیم. سێ ساڵان لەو ناوەدا مام. کاتێ شێخ میری بلباسی -کە لەلە و بریکارم بوو- عەمری خوای کرد، سالیانیشم لێ گۆڕدرا. منی هەژار لە هاوینەواری حەرقان[1] چوومە لای شا. ئەویش منی بە محەمەد بەگی لالۆم سپارد؛ کە حاکمی هەمەدان بوو. خاڵم -کە لە جێی باوکم بوو- کیژی خۆی لێ مارە کردم و ڕەگەڵ کوڕانی خۆی خستم. شاتۆماسب مووچەی من و بژیوی هۆزی ڕۆژەکی لە ئالی هەمەدان دەدا. سێ ساڵانیش لە هەمەدانێم گوزەراند.

لە هەرای سوڵتان بایەزید، کە هاتبووە لای شاو گیرا و هاتوچۆکەر لە ڕۆمەوە زۆر دەهاتن، ناردیانە شوێنی باوکم و بردیانە شاری قەزوێن و زۆریان دڵخۆشی دایەوە و دیسان کردیانەوە بە میری هۆزی ڕۆژەکی و گریهڕوودی سەر بە قومیان دایە دەست و ناردیانە وێ. بەلام باوکم میرایەتی وای نەدەویست؛ پاش چەند ساڵێك دایە دواوە. شای بەهەشتی دیسانەوە ئەم هەژارەی کردەوە میری ڕۆژەکی و مووچە و ئێروی پیاوەکانمی لە باجی ئیسفەهان دەدا و منیش لە قەزوێن مامەوە و دوو ساڵان هەر لە لای خۆی بووم. لە ئەنجامدا خوا وای ڕەخساند خانئەحمەدی گەیلانی والی «بیە» گرا و شالێ بڕا وڵاتەکەی داگیر بکا. منی دەگەڵ چەند میرێکی قزلباشدا نارد کە بە بیە ڕابگەین. ئەمیرە قزلباشەکان کارێکی وایان نەدەکرد کە دڵی شای پێ وەحەسێ؛ زۆریان دەستدرێژی دەکرد و خەڵکیان وەزاڵە هێنابوو. جگە لە من کە خەڵك و خوام ڕازی دەکرد.

| | |
|---|---|
| پیاوانێ کە کاربەدەستی خوونکارانن | چاکیان ئەوەنە کە هەوری دوو بارانن |
| گا بەردن و سەرشکێنی زۆردارانن | گا مەڵحەمی زامی دڵ بریندارانن |

چاوەدێری دڵسۆزانەی بۆرەپیاگ و ژێردەستانی ئەو ناوەم کرد و هەمیشە تەقالام دەدا کە شادڵی بە من شابێ و بە ئاواتیشم گەیشتم. چەند جارێك بریکاری شافەرمانی جوانی بۆ ناردم دەیانفەرموو: تۆ پیاوێکی دادگەر و گەلپەروەری و ئازایەتی و نەبەردیشت دیاری داوە؛ ڕووسووری هەر دوو دنیا بی.

---

١- ڕەنگە خەرەقان بێ کە لە ئوستانی خوراسانە. هەژار

پوختەی وتار لە سۆنگەی نزای پادشای دادپەروەرم کـارم گەیـیشتە جێگەیـەك مـن چوارسەدوپەنــجا چەکداری سوار و پیادەم بوو، شازادەیەکی گەیلانی -کە نـاوی سـوڵتان هاشـم بـوو- بـە هەژدەهـەزار کەسەوە هاتە سەرم و دەگژی ڕاچووم. خودای گەورە یاریدەیدام و شکاندم. هەزاروهەشتـسەد گـەیلانی لەو مەیدانەدا تـخێلّ بوون. سێ کەڵەکم لە سەرەکانیان هەڵچنی. جگە لەوەش زۆر جاری دیش بـەزەی خودا خوێندمیەوە و لە زۆر کاران هاتە هانام و سەرکەوتـم و زۆر وەڕمیـن و بەوکەوتـم.

هەوای گەیلان زۆر ناخۆش بوو؛ نەخۆشینی زۆر تێدابوو. زۆربەی پیاوی هەرە ئازای ڕۆژەکـی لـەوێ لە ناو چوون. منی هەژار گەیلانـم لە بەر بێزابوو. ئەو بێزاریە و پێشیناری جیٚهێشتنم دەشاگەیاند. لە دوای حەوساڵ کە لەوێ بووم، ئیزنی درکەوتنم بۆ هات و هاتـمە قەزوێن و پادشام لەوێ چاو پێکـەوت و فەرمووی: هەر دەگەڵ خۆمدا دەبـی. قزلّبـاش لێیـان گۆڕابـوو؛ ببوونـە هـەر کـەس هـەر کـەس و دووبەرەکیان دەنایەوە. شاتۆماسب پیـری کەنەفتی کردبوو؛ هاری پـێ زەوت نـەدەبوون. زۆر وێدەچـوو زۆر پێ نەچێ تێك بەر بن و ئاژاوە بتەنێتەوە. بەلامەوە هیچ باش نەبوو بـمێنمەوە؛ لێم داوا کـرد کـە بۆ لایەك لە وڵاتی پارێزراویم بەڕێ بکات. ئەویش لە وڵاتی شیـروانێ چەند جێگەیەکی پێ بەخـشیم و ئازووقەی هۆزی ڕۆژەکی لە باجی مەڵبەندەکانی سەر بە شیـروانێ بڕیەوە. ئەو شوێنانەش تـەراکمان و ئەرش و ئاقداش و قباڵە و باکو و کەناراب بوون.

منی هەژار چوومە شیـروان. هەشت مانگ بوو لە شیـروان دەژیام، کە شامرد و هەرا لە قەزوێندا ڕوویدا و سوڵتان حەیدەرمیـرزا کوژرا و ئیسماعیل میـرزا لـە قـەڵا دەرکـەوت و گەیـشتە پاتـەختی قەزوێن. لە سەر فەرمانی پیـرۆزی چوومە قەزوێن و لەوێنە بە پلەی میـری میـرانی کـورد سـەرفراز بووم. بڕیاریدا کە هەمیشە بە دیداری بەختیار بـم و فەرماندرا میر ومەزنانی کوردستان و لوڕسـتان و گۆران و هەموو کوردی دیش، هەرکێ کاری بە پادشایە، بێتە لام و هەموو کارێك لە سەر دەستی ئـەم هەژارە ببـڕێتەوە. هێندەی دەستی قەدری لێ نام کە لە ئەندازە دەرچووبوو. پیاوی چاونەزێر و چنۆك و نەخوازا قزلّباشەکان گشیان ئێرەییان پێم دەبرد. تا سەرئەنـجام کەتنگێڕان، شایان وا تێگەیاندبوو کـە گوایە من و قزلّباش نیازمان وایە سوڵتان حوسێنمیـرزای برای بکەینە شا. هەر خۆی پیـاوێ وازوازی بوو. لە دواییشدا لە قەلادا فێری تلیاك کێـشان ببـوو؛ ئـاوەزی تـەواو تێـك چـووبوو. دەگـەڵ کەسـا

نەیدەتوانی مانگێك هەڵكا. بەم هۆیەوە گفتی درۆی دوو زمانانی دەربارەی بەندەقۆزیەوە. هێندێ لە قزلباشانی سزا دان و خنكاندنی و هێندێكی لە كار وەدەر نا و بەندی كردن و منیشی بەو بەهانەوە كە نەخچەوانم دەداتێ لە دەوری خۆی دوور خستەوە. پسوولەم دەسەرم چەقاند و ڕەوانەی ئازربایجان بووم. هەر ئەمە خۆی لە لای خواوە بۆ شادی بەڵگە و نیشان و هەوری پێش ڕێژنەباران و مزگێنی دینی یاران و هاتنەوە بۆ نیشتمان بوو. دوای ئەوەی ساڵێك و چوار مانگ فەرمانڕەوای نەخچەوان بووم، لە سۆنگەی خوسرەوپاشاوە -كە میری میرانی وان بوو- لە زەینەلْ بەگی هەكاری و حەسەن بەگی مەحمودی ڕا مژدەم بۆ هات كە لە دەرگانەی خونكاری دنیاداری بەختیار و دادگەر و هەژار بەخێوكەر و قەدرزان بەهەشتی سوڵتان مرادخانی خودا لێخۆشبووی نورانیەوە، فەرمانی فەرمانڕەوایی بدلیسیان پێ ڕەوا دیوی و لە سایەی بەزەیی زۆر و بێ ئەندازەی شاهانەوە، مەزنایەتی خانەدانی باب و كالان هەر بە خۆت بەخشرایەوە و بە بێ دوودڵی و بەخۆشی بگەڕێوە نیشتمانت. وەك فەرموودەس «هەموو شتێك بەرەوماكی وەردەگەڕێ»، سێهەم ڕۆژی شەشەكانی ساڵی ٩٨٦.ك (١٥٧٥.ز) دەگەڵ چوارسەد كەسی هاوڕێم -كە دووسەدیان ڕۆژەكی بوون- لە نەخچەوانێ دەرچووین و بە یاریدەی عەسكەری وان و بە كۆمەگی میر ومەزنانی كوردستان گەییشتینە شاری وان و خوسرەوپاشام چاو پێكەوت. پێشوازی گەرمی لێ كردم و هەتا بڵێی ڕێزی گرتم و هاوردمیە ناو شارەوە و خەوەری هاتنی منی بە پێچكی تەختی بە بەختی شكۆداری سوڵتان گەیاند.

فەرمانی فەرمانڕەوایی بە خەڵاتی شاهانەوە و شیرێكی زێڕ كە لە خەزنەی سوڵتان قەدوانی چەركەسی والی میسرێ[1] گەیشتبووە خەزێنەی دارماڵی سوڵتان، دەگەڵ نامەی پیرۆزبایی وەزیرە پایەبەرزەكان، بە تایبەتی نامەی وەزیری هەرەزل محەمەد پاشاشم بۆ هات و مستەفاچاوەش هێنانی. سەرەڕای ئەمانە هەموو، مستەفا پاشای سەرداری لەشكری هەمیشە لە سەر، شیری زێڕ و خەڵاتی زۆر گرانبایی بۆ ناردم و لە ناو هەواڵ و ئامپایان شانازیم بە خۆم دەكرد و بە دڵشادی و كامڕانی هاتمەوە بنكەی سەرداری باب و باپیرانی مەزن.

---

١- هیچ «قەدوان» ناو لە چەركسان نەبۆتە شا. نۆیەم پاشای كۆیلەكانی دەریایی لە میسرێ «فلاودون» بوو. لەوانەیە فلاودون بوویێتە قەدوان. جەمیل

خوا پێکی هێنا ئاوات و نیازم      کاری ڕاست هێنا و گەیمە دڵخوازم

لەو دەمەوە کە سوڵتانی خاوەن شکۆ سوپای هەمیشە لە سەری بۆ شیروان و گورجستان و مەڵبەندی ئازربایجان نارد، دەساڵان بێ پسانەوە لە زۆربەی شەڕ و هێرشاندا منیش وەك بەخت و پیرۆزی پا بەپا دەگەڵدا بووم و هەرچیەکم پێ سپێراوە، بە دڵ و داو پێکم هێناوە و هێندم دڵسۆزی و گیانبازی لە خۆمەوە پیشانداوە کە سوڵتانی بە هەشتەلان لە بنووسی گەوهەربارییەوە مرواری بۆ باراندوم و هەر بە خەتی ڕەنگینی خۆی چوار جاران منی دواندووە و بە سەردێڕی «دۆستی بە ڕاستیم شەرەفخان» خوێندوومیەوە و درکاندووشیە کە دڵسۆزی و خزمەتکاریت لە بەرچاو و دڵی ڕوون و تیشکدەرمان ئاشکرایە و بە ڕاشکاوی چاوەنۆڕی ئەوپەڕی چاوەدێریم بە.

ساڵ نۆسەدونەوەدویەك (١٥٨٢.ز)، کاتێ فەرهادپاشای سەردار یەریوانی خستە دەست و قەڵایەکی لێ بنیادنا، منی دەگەڵ حەسەن پاشای میری میرانی شامێدا ناردەتفلیس و گورجستان کە ئازووقە و خەزنە بەرین. لەو سەفەرە هێندێك خزمەت لە دەس منی هەژار هاتن. لە پاداشاناوچەی مووش و چەند گوندێکی مولکی خاسەم بۆ خرایە سەر بدلیس و دووسەد هەزار ئاقچەشم بۆ بڕایەوە و مووچەم گەیشتە چوارسەدودەهەزار ئاقچەی عوسمانی.

لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی خونکاران و پادشایانی خانەدانی عوسمانیدا هیچ میر وفەرمانڕەوایەك بە قەی من ڕەپێش نەخراوە و چون خۆم تەماشای نەکراوە.

وا ئیمرۆش کە مێژووی کۆچی لە کلکەی مانگی قوربانی ساڵی هەزار و پێنج دایە، لە سایەی شای سایەچەور و گەورە (ابوالمظفّر) سوڵتان محەمەدخانەوە- خودای مەزن بێبەڵای کا- فەرمانڕەوایی چەند ساڵە لە دەست ئەم هەژارە دایە و ئەرکی دنیاداریەکەشم بە فرزەندی کار پەسند و نۆبەرەی بە بەروبومم ئەبولمەعالی شەمسەدین بەگ سپاردووە؛ خوا دەست دەبن باڵی گرێ و هەمیشە باڵا دەستی کا.

جا وەك باوی نووسەرانە، بە ئەرکی باو و فرزەندی، هەندێ پەند و ئامۆژگاری لە کتێبی «*خردنامە*»ی مەولانای جامی خوابەخشیو ڕادەگوێزم:

وەرە لامەوە کۆرپە شیرینەکەم!      گەشەی باغی ژیسن و گسوڕ و تینەکەم

دڵت بێنە سەر هەست و گوێ شل‌کە بۆم | بە بڕوابە دڵسۆز و خەمخۆری تۆم
هەموو پەندی من وەك دوڕ و گەوهەرە | ئەگەر ژیری گوێ بێنە گەوهەر بەرە
کە بە گوێم بکەی، دەبیە مەردێکی ڕەند | پەسەندی و لە لای هیچ کەسێ نابیە پەند

***

خودای گەورە ڕاستە و گەرکیە بە بست | لە ڕێی ڕاستی خۆی لانەدا خواپەرست
دەسی ڕاست بەشی هێز و پڕکاریە | گەرای ڕاستی ماکی ڕزگاریە
هەتا خوات لە بیرە لە بیری خودای | دەسی پێتەوە و خۆشەویستی لە لای
کەسێ خوا لە بیر کا کلۆڵ هەر ئەوە | هەوا پێوەر و داری بێبەر ئەوە

***

لە چاو و لە دڵ کوێرە نەخوێندەوار | خودا ناوی بردوون لە ریزەی دەوار
گەرەکتە کە باش هەڵکەوی و سەرکەوی | لە فێربوون و خوێندن گەرەك نەسرەوی
هەچی فێرکراشی دەکاری کەوە | بە کار نایە خوێندن بە بێ کردەوە
ئەگەر خوێندەوار ڕێ لە خۆ خوار دەکا | کەرێکە و کتێبان لە خۆ بار دەکا

***

لە مێژووی بەسەرهاتی ڕابردووان | بڕۆنێ چیان بۆ لوا و چۆن لوان؟!
ئەوەند میر وخوێنکار و زۆردارە هات | ئەوەند چەوت و بێبار و لاسارە هات
ئەوەند دەستەڵاتدار لە سەر ڕووی زەمین | بە نابووتی هاتن، بە ڕووتی ڕەوین
هەژاران هەزاران کە چەوسانەوە | لە بێگار بە بێ نان بە لێدانەوە
سەرنجێ بدەی گەر لەوان و لەمان | لە ژێر خاکی ڕەش بوونە تۆز و نەمان
ئەوی ماوە هەر ناوە بۆ پیس و پاك | بە دوویانەوە تا هەیە ئاو و خاك
لکا ناوی بەدفەڕ بە سەد جوێنەوە | هەزار تووك و نەفرینی بە شوێنەوە
بەشی پیاوی باش ئافەریم و نزان | لە خۆشی ژیاندان کە خۆشیان ڕزان
لە خۆت چاکتران هەڵبژێرە بە دۆست | ئەوان نایەڵن بێتە ڕێت کۆسپ و کۆست
هەواڵی هەوالانی بێ‌فەڕ مەبە | برای ڕژدی فێری گزی و گەڕ مەبە



چ هاسان و زوو خۆی خراب فێر دەبی — بەرەو شیوی شێوان سەرەوژێر دەبی

ئەگەر کا لە پاڵ گا بیەسرێتەوە — بەسەزمان لە تووش تووشی دەگرێتەوە

وەخۆ مەگرە دۆستی قزە و نارەسەن — بە زێڕیان بکێشی هەر ئەو ناکەسەن

کەسێکی بلێ دووپشك پەروەرم — لە دیزەی ئەشێ نەبڕێ ماستی گەرم

گەزندەگەزین بۆ تۆ ناکا ڕەها — ئەگەر گەورە بێ مار دەبێتە زەها



پێشووسواری کار و کرت تێك دەدا — سەری بەرد و هێلکەی مرت لێك دەدا

بە تووڕەییەوە هەر کێ خۆی هەڵماند — بەن و ڕیسی ژیری و بەبیری پساند

لە سەرخۆیی ئاڵۆزی یەکلا دەکا — گرێ ڕادەکا و دەردی دڵ چا دەکا

بە بێهنی فرەھ دارە گوێز دێتە بەر — بە فیتووی نەرم مار لە کون دێتە دەر



بە کار و بە کۆشش پلەت سەر بخە — بە باهۆ و مەچەك نسانی خۆت دەر بخە

بەری ڕەنجی خۆت، گەنجی سەربەستییە — بەشی چاو لە دەس، سووکییە و پەستییە

لە پۆرگی دەسی دەسکەنەی نیسك و نۆك — نەویتر دەوەستێ ملی خوازەڵۆك

ببەخشە و بخۆ هەرچی خوا داویە بەش — شتێکیشی پاشقلدەبۆ ڕۆژی ڕەش

نەوەك پەیکی مردن درەنگ بێتە دووت — کوڵ و دەردەپیری و هەژاری بە جووت

بنووسم لە نووسین زمانی سوا — ڕەشاوی لە دەم هات و مووی لێ ڕوا

وشەی باش گەلێکە و لە لای زۆر کەسە — ئەگەر تێگەیشتووی ئەوەندەت بەسە

خوای گەورە یاریدەی دام و بنووسە وردەکارەکەم، بەرمۆری دوڕ و مرواری سەر بهۆرد و ئاسەواری مەزنەکانی کوردەواری، زۆر بە دانستە و لە باری پێوەکرد و لیزگەی ڕێك و تەرز و جوانی سەروەرانی کوردستانی لە بەر خوێندەواران ڕانا و لێرەش پێوە -وەك لە دیباچە لێی دواوم- نیازمە خامەی دەمهەراش و نامەی ڕەوان و پاراوم بۆ ڕووداوی دوانەبڕاوی سوڵتانەکانی عوسمانی و شایانی ئێران و تووران تەرخان بکەم.

| | |
|---|---|
| خـۆشـە بـاسـی کورد و کوردستانی خۆم | باسی خزم و خوێش و خـانـە و لانـی خۆم |
| زۆر سـوپاس کە خوا گەیاندی و رێکی خست | چوومە ریـزەی نـامـەنووسی کوردپەرست |
| پێتـی دەردانـم لـە دڵ کـووژایـەوە | سیـس ببـوو چـیـرۆکی کـورد، بووژایەوە |
| چـی لـە دەسـتـم هـات و هاتە بەر وزەم | ئەرکی خۆم هێنایە دی و دەرچـووم لـە خەم |
| دێـرێ کـۆتـابـوون و پیـتـی دوایـیـە | بشـمـرم چـش پـێـچـی مـاڵاوایـیـە |

*شەرەفنامە لێرەدا دوایی هات*

شەرەفخان لێرەی بڕیەوە. ئەمیـن زەکـیش نـەیکراوە بیخاتـە سـەر. بـەڵام دەڵـێ سـاڵی ١٠٦٦.ك (١٦٧٦.ز) مەلیك ئەحـمەدپاشای والی وانیێ، بڕوبەهانەی دۆزیەوە و بە لەشکرێکی زۆرەوە چووە سەر عەبدالخانی میـری بدلیس. زۆربەی لەشکرەکەشی کوردی دەوری بدلیس بوون. شـەڕی پـێ فرۆشـت و وڵاتی پێ بەجێ هێشت و تاڵانی کرد و ئەو سامان و گەنـجینەی -کـە دەمێـك بـوو تورکـان چـاویان بڕیبوویە- هەمووی هێنا و ئەو میـرنشینیەی لە ناو برد. ئەولیا چەلەبی دەگەڵ لێژنەی تـاڵان نووسـدا بووە و دەڵێ: «حەو باری وشتـر کتێبی بوون. کتێبخانەی تایبەتی میر، پتـر لە چوارهەزار دەسنووسی زۆر نایاب و بەهاداری تێدا هەبوو کە هەموو دەبەرگ گیـراو و نەخـشێنراو بـوون و لەمـەڕ ئاییـن و تاریخ و زمان و جانەوەر وگیا وگژ و بژیشکی و «تشریح» و پێـودانی شـێعر و قافیـە بـوون و دیوانـە شێعریش گەلێك بوون. زۆریش وێنە و نەخشە و تابلۆی نایابی هەبوون. هـەر میربۆخـۆی ٧٦ کتێـب و ١٠٥ نامیلکەی بە فارسی و عەرەبی دانابوون».

ڕەنگە هەر ئەو میـرە بووبێ کە جیهانگەڕی فەڕانسی «مسیۆ بارن تاوانیە» چاوی پـێ کـەوتووە. لـە نێـوان سـاڵانی ١٠٤٥و١٠٧٠.ك (١٦٣٥و١٦٦٠.ز) لـە دەورانـی شاسەفـی و شاعەباسـی دووەم و شاسولەیـماندا -بە بازرگانی- هاتۆتە خاوەرزەمیـن. مسیۆ بارن دەڵـێ: «کـە لـە بدلیـسێ دابـەزیم، گورجێ حاکم پێی زانی و ناردیە شوێنم. دەشـمزانی چۆن دەبێ بچم بۆلای میـر؛ دوو تـۆپ ئەتلەسی خەتخەتی هەودا زێڕین و زێوین و هێندێك دەسرەی ئاوریشم و دوو شەوکڵاوی تورکانە و دەستێ جلـی شەوانەم بۆ برد. زۆری وەبەردڵ کەوتن و ئەویش دوو مەڕی قەڵەو و هێندێك خواردەمەنی تێر و تـراوی دامی و هێشوە ترێیەکی تازەشیان بۆ هێنام؛ کە لەو کژەدا زۆر پێم سەیر بوو هەیە.

لەو دەمەدا کە لە لای بووم، ئەمیـری حەڵەب ناردبووی بژیشکێکی برینگەری فەڕانسی بـۆ بنێرنـەوە؛ کە لە شەڕی کانادیا دیل کرابوو؛ لە حەڵەبەوە ڕایکردبوو پەنای بـە بـدلیس هێنـابوو. میربـە کـابرای ڕاسپاردەی گوت ئەگەر سپاردەنەبای زۆر بە بـێ زەلـەتی دەمکوشـتی؛ بـەلام ڕاسـپاردەناکوژرێن. بـۆ میـری حەڵەبی نووسی دەبێ سوڵتان بەو بێئەدەبیەت بزانێ. ئەگەر ئەویش سزات نەدا، خـوا دەیزانـێ بۆ خۆم تۆڵەت لێدەستێنم. لە ڕاستیشدا میـرێکی زۆر بە بڕشتە؛ ئێرانـی و تـورکی لـێ دەترسێـن و دیاری بۆ دەنێرن. چونکە زۆر باش لە دەستی دێ ڕێگەی نێوان حەڵەب و تەورێز ببەستێ. عوسـمانیش بە بدلیسدا نەبێ ڕێگەیان نیە بچنە وان. دۆڵی بدلیس لە هـەموو شـوێنی دنیـا سەختتـرە. دەکـەس بیگرن، هەزار کەسیان دەرۆست نایە. دوو کەژی ڕژدی هەڵەمووت دەورەی بدلیسیان گرتـووە. قـەلاش لەو ناوەندەدایە و لە سەر کێوێکی خڕ و لووس هەلکەوتووە و تەنیا ڕێیەکی بۆ دەچی و بە سێ شـوورە دەورە دراوە؛ دوانیان نێوانیان هەراوە و شوورەی سێهەم تەنگەبەرە و کۆشـکی میـری دەناودایـە. بـۆ سەرکەوتنی قەلایە، دەبێ ئەسپت زۆر بەکار بێ؛ بەلام هەر میر ومیـراخوڕ دەتوانن بە سواری بیـچنێ. سەرەڕای قەلای قایـمیشی، دەتوانێ بیست تا بیست و پێنج هەزار سـوار و زۆریـش پیـادەی چـەکدار ئامادەکا».

کتێبی *القضیةالکوردیة*، ڕووپەڕ ٤٩ دەڵـێ: «هـەتا سـاڵی ١٣٣١.ک (١٩١٣.ز)ش خـەڵکی بـدلیس کۆڵیـان نـەدا و داوای سـەربەخۆ بوونیـان کـرد. دوامیـن شـۆڕش مەلاسـەلیم و شـەهاب و عـەلی هەڵیانگیـرساند و سەرنەکەوتن. مەلاسەلیم پەنای بە قونـسولـخانەی ڕووس بـرد و لەوێـدا مـا هـەتا تورك و ڕووس بە شەڕ هاتن. عەسکەری تورك ڕژانە ناو قونـسولـخانە و مەلاسـەلیمیان دەرێنـا و لـە خەیابانی بدلیسێ هەڵیانواسی. جەمیل

سەعات حەوتان حەوت کەمی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی، بیستونۆهەمی مانگی ئاب، ساڵی ٦٩ی زایینی -کە حەوتی خەرمانان دەکا- لە گوندی حاجیئۆمەران، وەرگێڕانی شەرەفنامە کۆتایی هات.
خوا یارمەتی دام؛ زۆر شوکور.

هەژار

شەوی هەینی، حەڤدەهەمی مانگی ئەیار، ساڵی ١٩٧٠ -کە وەخت دوو سەعاتونیو لە نیوەشەو تێپەڕیبوو- لە جێهەواری بێخۆڵان، لە لای گوندی مەمیخەلان، لە ناوچەی باڵەکایەتی، وەرگەڕاوی شەرەفنامەکەم نووسیەوە. بەختیارم کە خوای گەورە دەرفەتی داو ئەوەندە وشە کوردیەم لە سەر کاغەز جێکردەوە. بەهومێدم لە ناو نەچن و منداڵانی دوارۆژی کورد بەهرەیەکی لێ ببینن. خوا گەورەیە.

هەژار

سەعات یەك و پێنج دەقیقەی بەیانی، بیستوحەوتەمی ئاداری ساڵی ١٩٧٣ز، واتا حەوتی خاکەلێوە، بۆ دووەمیـن جار منی هەژار شەرەفنامەم پاکنڤیس کرد.

بەغدا، گەڕەکی ئیسکان، هەژار

**مامۆستا زیا شەرەفخان نەوەی شەرەفخانی مەزن، ئێستا لە بێروتی دەژی. زستانی ساڵی ۱۹۷۳ بە هۆی مامۆستا نەجمەدینعەونی پرسیارم لیّ کرد: مەرگی شەرەفخان لە چ ساڵێکدا بووە؟ لە وەرامدا ئەم نامە کلێشەکراوەی بە تورکی بۆ مامۆستا نەجمەدین نووسیوە؛ کە وەرمگێڕاوەتە سەر کوردی. هەژار**

برای خۆشەویست و بەرێزم!

ئەمڕۆ نامە و بەستەکەم وەرگرت؛ سوپاسی پەیوەندیت دەکەم. هێندەی کە بە نەساغیت دڵتەنگ بووم، هێندەپتر بە چا بوونەوەت شادم. حەجیشت پیرۆز. ئاواتمە تەمەن درێژ و لەشساغ بی.

خێزانم ئێستا لە ماڵ نیە؛ بەڵام سڵاوی ئەویشتان لێ دەکەم. سەلامم بۆ خانم ئەفەندی بەرێزتان و چاوی ئازادی کوڕتان ماچ دەکەم. هەر کەس لێمان دەپرسێ و دۆستە، سەلامی لیّ دەکەم.

بە داخەوە ئەو مابەینە کە لەوێ بووم هەژاری شاعیری هێژام نەدی. سوپاسی هەستی دۆستانەی دەکەم و سەرکەوتنی دەخوازم. هەر پرسێکی دەربارەی باپیری خوالێخۆشبوم و خانەدانەکەمانیەوە کردووە ئەوەندەی دەیزانم وەرامی دەدەمەوە و ئەگەر کەم و کوڕیشی تێدابێ لە قەستان نیە و دەبێ بمبەخشن. بەر لە هەموو شتێك دەمەوێ لەو بابەتەوە بدوێم کە شەرەفخان بە نیازی پێکهێنانی دەوڵەتیکورد ئەوکتێبەی نووسیوە. چونکە لەو خانەدانەدا -بەر لە شەرەفخان و دوای شەرەف خانیش- زۆر پیاوی سیاسی و بەنرخ هەڵکەوتوون (*دەستنووسی ئاساندنی تورکی، بەشی بدلیس*).

دەسەڵاتی خانەدان لە ڕۆژگارێکدا گەیشتبووە ئازربایجانیش؛ سکەیان بە ناوی خۆیان لێداوە و خودبەیان بە ناو خوێندراوەتەوە. بیستودوو فەرمانڕەوای سەربەخۆیان بە شوێن یەکدا هاتوون. (تورکجە حیات ئەنسقلوپیدسی، سلیمان دولتلری کلیمەسی).

خوالێخۆشبوو شەرەفخانیپێنجەم، مانگی قوربانی ساڵی ۱٥٤۳.ز لە شاری قوم -کە سەر بە گریهڕوودی عیراقە- لە دایك بووە و ساڵی ۱٦۰۳و ۱٦۰٤.ز وەفاتی کردووە.

شاعیری بەرێز دڵنیابێ کە ئەم نووسراوە ڕاستە و جێی گومان نیە. چاوەنۆڕی هەواڵی دەکەم. دیسان و دیسان چاوتان ماچ دەکەم، برای خۆشەویستم!

براتان: زیا شەرەفخان